# تەفسیری قورئانی پیرۆز

لێکدانەوەی

ماموستا مەلا عثمان عبد العزیز

بەرگی دووەم

چاپی دووەم

٢٠١٠

بیروت - لبنان

ئـەم جزمـی چـوارەمە دەسـت پێـئەکات لـە ئایـەتی(٩٣)ی ﴿آل عمـران﴾ەوە تـا دوایـی لەگەڵ(٢٣) ئایەتی سەرەتای سورەتی ﴿النساء﴾دا.

لەمەی کە ماوە لەم سورەتە ئەبێ بە چوار بەشی سەرەکیەوە:

یەکەم: بریتیـە لـە بەشێك لـە لێکۆڵینـەوەو دەمـەقاڵێی بـەینی نامـەدارو گـەلی موسڵمانی مەدینە.

دووەم: ئەندازێکی زۆر لە سورەتەکە داگیر ئەکاتو خەریك ئەبێت بە ڕووداوی(أُحُد)ەوە.

سێیەم: ئەگەڕێتـەوە بۆ سـەر نامـەدارەکان، باسـی شکاندنی ئـەو پەیمانـەیان ئەکات کە پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵی بەستن هەر لە یەکەم جاری هاتنی بۆ مەدینە، باسـی هێندێ لـە تاوانو خراپـەیان ئـەکات کـە کـاتی خـۆی کردیـان لەگـەڵ پێغەمبـەرەکانیان، فـەرمان ئـەدات بـە بڕوادارەکان بە خۆگریو دامـەزراوی دڵ بەرامبـەر بەو هـەموو ئازارو زیانـەی کە دووچاریان ئەبوو لەلایەن ئەوانو بت پەرستەکانەوە.

چوارەم: باسـی حاڵو بـاری بڕواداران ئەکات لەگـەڵ خـوای خۆیـانو ڕووکردنیـان بۆلای نزاو پاڕانەوە، ئینجا وەرگرتنـی ئـەو نزاو پاڕانـەوە لەلایـەن پـەروەردگارەوە بە لێخۆشبوونو پاداشتی چاك بۆ ئەو بەندە بڕوادارانە.ئەوەیە بە کورتی باسو مەبەستی بەشـی یەکـەمی ئـەم جزمە کە جۆشو پەیوەستە لەگەڵ باسو مەبەستی ئایەتەکانی پێشین لەم سورەتەدا.

ئینجا بەشی دووەمی ئەم جزمی چوارەمە کە لە سەرەتای سورەتی ﴿النساء﴾ەوە دەست پێـئەکات تـا ئایـەتی(٢٣)ی بە یارمـەتی خـوا لـە شوێنی خۆیـدا باسـی ئەکـەین، ئینجا با بە درێژی بێینە سەر ڕوون کردنەوەی ئەو مەبەستانەو تەفسیری ئایەتەکان بە پشتیوانی خوای میهرەبان.

جوولەکەکان هەمیشە لە کەمیندا بوون بۆ دۆزینەوەی هەر شتێ کە ڕەخنـەی پـێبگرن لە ڕاستی پێغەمبەرێتی پێغەمبەرمان(ﷺ) هەموو فڕو فێڵێکیان ئەخستە کار بۆئەوەی لە کونو کەلەبەرێکـەوە ژاری پیـسی خۆیـان بهاوێژنـە نـاو دڵو دەروونـی بـڕواداران و لـەو ڕێگەیـەوە بەدگومانو دوودڵیان بکەن لە ئایینە پیرۆزەکەیاندا، ئینجا کاتێ کە قورئان هاتو فەرمووی: بڕوای هەیە کە لـە تەوراتـدا هـاتووەو تـەوراتی بـە ڕاسـت دانـا، کاتـێ کـە ئـەوەی فـەرموو ئـەو جوولەکانە ملیان قوت کردەوەو وتیان: کەواتە بۆچی قورئان هێندێ خۆراکی حـەڵاڵ کـردووە کە قەدەغەو حەرامە لە ئیسرائیلیەکان؟ بە تایبەتی -وەك لە چەند ڕیوایەتێکدا هەیە- باسی گۆشتو شیری حوشتریان کرد کە قەدەغە بوونو لەم ئایینەدا حەڵاڵن،

كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسْرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوْرَىٰةُ ۗ قُلْ فَأْتُوا۟ بِٱلتَّوْرَىٰةِ فَٱتْلُوهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٩٣﴾ فَمَنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩٤﴾

**ئینجا خوای پەروەردگار دەم كوتی كردن‌و بەرپەرچی دانەوەو فەرمووی: ﴿كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ هەموو خۆراكەكان‌و هەموو جۆرە خواردەمەنیەكانی ئادەمی لە پێشەوە حەڵاڵ بوون بۆ نەوەی ئیسرائیل ﴿إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسْرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ﴾ بێجگە لەوەی كە ئیسرائیل -واتە یعقوب- خواردنیی قەدەغە كرد لەسەر خۆی، ئەوەش بریتی بوو لە گۆشت‌و شیری حوشتر، قەدەغەكردنەكەش هۆی تایبەتی بووە، وەك لە چەند ڕیوایەتێكدا هاتووە كە نەخۆشیەكی سەخت ئەگرێ‌و ئەویش نەزر ئەكات لەسەر خۆی كە ئەگەر خوا ڕزگاری بكات گۆشت‌و شیری حوشتر نەخوات كە لە هەموو خۆراكێك خۆشەویست تر بووە بە لایەوە، ئینجا خوا نەزرەكەی قبوڵ كردو چاك بوویەوە، ئینجا كوڕو نەوەكانی پەیڕەوی باوكیان كردو ئەو قەدەغەیان كرد بە باو لە ناو خۆیاندا، وەك لە ئایەتەكەیشەوە دەرئەكەوێ كە قەدەغە بوو لەسەر ئەوانیش، ئیتر بێجگە لەوە هەموو خۆراك‌و خواردەمەنی تریان بۆ حەڵاڵ بووە ﴿مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوْرَىٰةُ﴾ پێش ئەوەی تەورات بهێنرێتە خوارەوە، بەڵێ لەپاش هاتنە خوارەوەی تەورات خوا هێندێ لە خواردەمەنی تری قەدەغە كرد لێیان كە ئەوەش بە هۆی گوناهو تاوانی خۆیانەوە بوو وەك لە سورەتی ﴿الأنعام﴾دا ئاماژەی بۆ ئەكات، چونكە باوی خوا بۆ ئەوان وا بوو كە هەر جارێ گوناهو تاوانێكیان بكردایە لە تۆڵەی ئەوەدا جۆرێك لە خواردەمەنی لەسەر حەرام ئەكردن، كەواتە هەموو خواردەمەنیەكان لە پێشەوەو لە بنەڕەتدا حەڵاڵن، قەدەغە كردنیان نەبووە مەگەر لەبەر هۆیەكی تایبەتی، هەركاتێ ئەو هۆیانە نەبوون قەدەغە كردن نامێنێ‌و شتەكان ئەگەڕێنەوە بۆ سەر بنەڕەت‌و ئەسڵەكەی خۆیان كە حەڵاڵێتیە، كەواتە كاتێ خوا ئەو شتانەی حەڵاڵ كرد بۆ موسڵمانان كە هۆی قەدەغەكردنیان**

نەما لەم ئوممەتەدا، کەواتە ئەو حەڵاڵ کردنە ڕەخنەی پێناگیرێ لەسەر ئەم شەریعەتە، مایەی گومان و دوودڵی نیە لەسەر ئەم قورئانەو ئەم دواترین شەریعەتەدا، ئینجا بە تەواوی دەم کوتی کردن بەمەی فەرمانی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە بەریان لێ بپرێتەوە بە هێنانی تەورات -کە بە نامەی خۆیانی دەزانن- بیهێنن و بیخوێننەوە، تا بۆیان دەرخات کە هۆی ئەو قەدەغە کردنانە شتێکی تایبەتیە بەوانەوە نەك شتێکی گشتی بێت، تا دەرکەوێ کە ئەو قەدەغە کردنە هەر لە کۆنەوە هاتووەو دەرئەکەوێ بۆیان کە سڕینەوەی(نسخ) هەیەو ڕاستە، کەواتە ئەو جوولەکانە هەرچیان وتووە لەو بارەیەوە هەموو درۆیەو هیچ ڕەخنەیەکیان نیە بە دەستەوە، ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ پێیان: ﴿فَأۡتُواْ بِٱلتَّوۡرَىٰةِ﴾ دەی تەورات بێنن ﴿فَٱتۡلُوهَآ﴾ ئینجا بیخوێننەوە ﴿إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن لە لاف و قسەکانتاندا، جوولەکەکان کە زانیان پێغەمبەر ڕاست ئەکات نەیانتوانی تەورات بێنن، بەڕاستی ئەوەش موعجیزەیەکی گەورە بوو لە موعجیزەکانی پێغەمبەر چونکە ئەگەر خوا ئەو هەواڵەی نەدایە پێی لە کوێ پێغەمبەری نەخوێندەواری عەرەب بزانێ کە ئەوە لە تەوراتدا هاتووە کە تەورات عەرەبیش نەبووە!! ئینجا ئەگەر پشت سوورو پشت پڕ نەبووایە بەڕاستیەکەی خۆی چۆن ئەیتوانی بەو جۆرە بەر بپرێتەوە لەو جوولەکە زانا و تەڵەکە بازانە؟! ئینجا هەڕەشە ئەکات لێیان بەوەی کە ئەوانە ماتووڵ ناتوانن تەورات بێنن ئەبێ لەقسەو لافەکانیاندا درۆیان کردبێ بەدەم خواوە، کەواتە ئەبێ ستەمکارین، تۆڵەو سزای ستەمکاریش زانراوەو وتنی ناوێ. ئەفەرموێ: ﴿فَمَنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ﴾ ئینجا هەرکەس درۆ بە دەم خواوە هەڵبەستێ ﴿مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ﴾ لەپاش ئەوبەر لێبڕینەوەو پەك خستنەو دەرکەوتنی درۆزنی ئەوان ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ هەر ئەوانە ستەمکاری ڕاستەقینەن، ستەمکارن لە خۆیان خستەبەر خەشم و سزای خوا، ستەمکارن لەو کەسانەی کەپێیان هەڵخەلەتان.

قُلۡ صَدَقَ ٱللَّهُۗ فَٱتَّبِعُواْ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٩٥﴾ إِنَّ أَوَّلَ بَيۡتٖ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكٗا وَهُدٗى لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٦﴾ فِيهِ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ

---

ڕخنەی تری جوولەکەکان کە دەمبازیان پێئەکرد بۆ دوو دڵکردنی مەردومان ئەوە بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) کەعبەی کرد بە ڕووگە لەپاش ئەوەی کە بەرەو(بیت المقدس) نوێژی ئەکرد تا شانزە یان حەڤدە مانگ پاش کۆچ کردنی بۆ مەدینە، ئەم مەسەلەیە هەرچەند لە جزمی یەکەمدا لێکۆڵینەوەی تێرو تەواوی لێ کرا، وە ڕوون کرایەوە کە کەعبە شایستە ترە، گێرانی(بیت المقدس) بە ڕووگەلەو ماوەیەدا لەبەر مەبەستو بەرژەوەندیەکی دیاریی بوو کە باس کرا لەوێ. بەڵام جوولەکە لە جوولەکەیی خۆی ناکەوێو ئەوەیان هێنایە کایەوە بۆ تێك دانی دڵی مەردوم، ئینجا خوای گەورە بەرپەچی دانەوە بەم باسە گرنگە: ﴿قُلۡ صَدَقَ ٱللَّهُۗ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: خوا ڕاستی کرد، واتە ڕاستی کرد کە کەعبەی بە شایستە دانا بۆئەوەی ببێ بەڕووگە وەك بە درێژی باس کرا، وە ئێوە درۆئەکەن کە(بیت المقدس) بە شایستەتر دائەنێن، خوا ڕاستی کرد کە فەرمووی: کەعبە ئیبراهیمو ئیسماعیل دروستیان کرد بۆ ئادەمی تا ببێ بە ڕووگەو جێی نوێژ، ﴿فَٱتَّبِعُواْ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ﴾ کەواتە پەیڕەوی ئایینو میللەتی ئیبراهیم بکە کە من بانگتان ئەکەم بۆلای ﴿حَنِيفٗا﴾ لە کاتێکدا کە ئیبراهیم لادەرو ڕوو وەرگێڕە لە هەموو ئایینو ڕێیەکی ناهەقو لادەر، بۆ ئایینی هەقو ڕێی ڕاستی خوا، بەڕێکی دامەزراوو ڕاوەستا لەسەر ئەوەی کە خوا بۆی داناوە بەبێ ڕەوادانی هیچ هاوبەشێك ﴿وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾ هیچ کاتێ لە هاوبەش بڕیار دەران نەبووە.

زۆر لە زانایانی تەفسیر لەسەر ئەوەن کە ئەم ئایەتە پەیوەستە بەدوو ئایەتەکەی پێشیەوە کە هاتوون بۆ بەرپەرچ دانەوەی یەکەم ڕەخنەی کە باس کرا، تەفسیری بەم جۆرە ئەکەنەوە: بڵێ خوا ڕاستی کردووە لەو هەواڵەی کە پێی دام لەبارەی خۆراکی ئیسرائیلیەکانەوە، قسەی من کە سەرکەوت بەسەر قسەی ئێوەدا بە پێی تەورات، کەواتە

پەیڕەوی ئایینی ئیبراهیم بکەن کە من بانگی ئێوەی بۆ ئەکەم، بێگومان بەم جۆرەش ئەگونجێ و ڕێکە، لەسەر ئەم ڕایە بەرپەرچ دانەوەی ڕەخنەی دووەمی جوولەکەکان لێرەوە دەست پێئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ﴾ بەڕاستی یەکەم ماڵێ کە دانراوە بۆ ئادەمیزادو ئامادە کراوە بۆ خواپەرستیان تیای دا ئەو ماڵەیە کەلە(بەککە)دایە، مەککە بە(بەککە)ش ناوبراوە، یان(بەککە) ناوە بۆ ئەو شوێنە تایبەتیە کە ئەو ماڵەی تیا دروست کراوە، ئینجا باسی هێندێ بەهرەو گەورەیی ئەو ماڵە ئەکات:

١- بەجۆرێکە ﴿مُبَارَكًا﴾ پیت دارو پیرۆز کراوە، بەم ڕەنگە خێرو کردەوەی چاك لەوێ بە چەند قات خوا ئەینووسێ و تەماشاکردنی بە خواپەرستی وەرئەگیرێ، لێخۆشبوونی گوناه تیای دا زۆر ترە، لە هەموو لاسەکەوە بەروبوومو میوەی بۆ دێتو هەمیشە بە فراوانی هەیەو هەرزان تریشە لە زۆربەی وڵاتەکان کە ئاوو باخات دارن، لەگەڵ ئەوەدا ئەو شوێنە وشكو بڕینو بێ کشتوکاڵو درەختە.

٢- ﴿وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ﴾ ڕێنموونیە بۆ جیهانیانو مایەی پەیوەستی دڵە بە خواو بە ئایینی خواوە، ئەوەتا خوا خۆشەویستی کردووە لەدڵاندا بە جۆرێ بە هەموو کامەرانیو سۆزی دەروونەوە مەردوم لە هەموو وڵاتانەوە دێنو ئەچن بۆ خواپەرستیو حەجو عەمرەو تەوافی، لە هەموو نوێژەکاندا ڕووی تێ ئەکرێ بە جۆرێ لەشەوو ڕۆژدا کاتو ساتێ نیە کە بڕواداران ڕووی تێنەکەن، چونکە لەبەرئەوەی زەوی خڕە هەمیشە لە ناوچەیەکدا کاتی نوێژو خواپەرستیە، دەی چ ڕێنموونیە لەوە چاکترو بەهێزترە.

٣- ﴿فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ﴾ تیای دا هەیە چەند بەڵگەو نیشانەی ڕوونو ئاشکرا لەسەر گەورەییو پایە بەرزی ئەو ماڵە، لەسەر دەسەڵاتو گەورەیی ئەو خوایە کە ئەو ماڵەی دانا بۆ خواپەرستیو هێشتیەوە چەند هەزار ساڵ، لەسەر ڕاستی ئایینو پێغەمبەرێتی ئیبراهیم کە خوا ئەو ماڵەی لەسەر دەستی ئەودا دروست کرد. لەو شوێنە پیرۆزەدا چەند شتێکی سەیر ئەبینرێو هەستی پێئەکرێ:

أ- به ئاشكرا ئەبینرێ كه كۆترو پەلەور تەقێو ترێز ئەكەن لەو ماڵه بەفەرە، بەم ڕەنگە بە زۆرێو بە كۆمەڵ هەمیشه دێنو ئەچنو ئەفڕنو بە وژم دێنو كه ئەگەنه ئاستی كەعبە ئەگەڕێنـەوە لێـیو بـەم لاو لای دا ئـەڕۆن وەك بەتایبـەتی بـەریان لـێ گیرابـێو بـەر بردرابنەوە.

ب- هــەر كۆترێـك نـەخۆش بێـت بـەكزۆڵی خـۆی ئەنووسـێنێ پێـیـەوە تایبـەتی بـە پلوسكەكەیەوە تا چاك ئەبێتەوە.

ت- سـەگو گـورگو دڕننـه ناچـن بـه گـژ یەكـداو ڕاوناكـەنو لاقـەی ئاسـكو مالاَتـە بـێ دەسەلاَتەكان ناكەن لەگەڵ ئەوەدا ئەگەن بە یەكترو تێكەڵ ئەبن.

پ- هەمیشه هەست ئەكرێ بە ئارامیو ئاسایش، مەردوم لەو ناوچەیەدا دڵنیاو بێباكه لـه هــەر شـتێكی ترسـێنەر كـه ئـەوەش لەگـەڵ زۆریـی میوەو خواردەمـەنی دا بەرهـەمی نزاكەی حەزرەتی ئیبراهیمە(علیە السلام).

ج- هەزارەها ساڵە ڕەجمی شەیتان ئەكرێ لەو سێ شوێنه تایبەتیەدا لەوێ، دەی ئەبوایە ئەو ناوچەیە ببوایە بەژێر ڕێزو وردە بەردەوە، كەچی ئەنـدازێكی زۆر كـەم هەیـەو هـەر پێیەوە دەرناكەوێو لەگەڵ ئەوەدا هۆیەكی ئاشكرا نیه بۆ نەمانی ئەو بەردو ڕێزانه!!

ح- مانەوەی ئەو ماڵو ناوچەیە لەسەر بارو ڕێزی خۆیانو پارێزراویان لـه هـەر ستەمكارو دەسـت درێژیكـەرێك كـه نیـازی خـراپو بـێ ڕێزیـی ئـەو شـوێنە پـیرۆزەی كردبـێو ویستبێتی دەستدرێژیی بكاتەسەر، كردەوەی پیسی(حەجاجی كوڕی یوسف) ـ خوا هەق بسێنێ لەویشو لەو كەسەیش كه ئەوی بەردا وڵات ـ ئەو كردەوە پیسی ئەوە بە نیازی هەتكو دەست درێژیی كەعبە نەبوو، بەڵكو بە نیـازی هـەتكو دەسـتدرێژیی بـوو بۆ سەر(عبداللە ی كوڕی زوبەیر)و كۆمەڵەكەی -خـوا لێـی ڕازی بێ- كـه بەسـەركێشو تاوانباری دائەنان.

ئەو بەڵگەو نیشانانە بە ئاشکرا هەن‌و هیچ کەس ناتوانێ دانیان پیا نەنێ، ئینجا ئایا مەبەست لە ئایەتەکان ئەمانە بن، وەك کۆمەڵێك لەزانایانی لەسەرە؟ یان مەبەست هەر ئەمەیە کە بەدوای دا ئەیهێنێ‌و ئەفەرموێ: ﴿مَقَامُ إِبْرَٰهِيمَ﴾ واتە لەو ماڵەدا هەیە چەند بەڵگەو نیشانەی ڕوون کە بریتیە لە شوێنی وەستانەکەی ئیبراهیم، واتە ئەو بەردەی کەبەسەریەوە وەستا لەکاتی دروست کردنی دیواری کەعبەدا، کە ئەو بەردە چەند هەزار ساڵە هەر ماوەتەوە بە ناو بانگە لەناو مەردومدا کە هەر ئەو بەردەیەو ئێستاش دروشم‌و نیشانەی جێ‌ی پێکانی حەزرەتی ئیبراهیمی پێوەیە(علیه السلام)، ئینجا ناوبردنی ئەو تاقە بەردە بە چەند نیشانەو بەڵگەیەك، یالەبەر ئەوەیە کە ئەو بەردە موعجیزەیەو هەر موعجیزیەك بە تەنیا نیشانەو ڕابەرە لەسەربوونی خواو دەسەلاَت‌و زانین‌و زیندوویی‌و خواهیشی خوا، لەسەر ڕاستی پێغەمبەرو ئەو ئایین‌و شەریعەتەی کە پێ‌ی ڕەوانەکراوە، کەواتە جێگەی چەند بەڵگەو نشیانەیەك ئەگرێتەوەو وەکو چەند ڕابەرو بەڵگەیەك وایە، یا لەبەرئەوەیە ئەو بەردە لە چەند بارو ڕوویەکەوە بەڵگەو نیشانەیە، وەك هێ‌دێ تر ئەفەرموێ:

أ- مانەوەی دروشم‌و نیشانەی جێگە پێکانی حەزرەتی ئیبراهیم(علیه السلام) لەپاش چەند هەزرا ساڵ لەو بەردە ڕەقەدا.

ب- بەقوڵدا چوونی ئەو دوو پێ‌یە تا قولە پێ بەناو ئەو بەردە ڕەقەدا.

ت- نەرم کردنی ئەو بەردە ڕەقە بە ئەندازەی ئەو دوو پێ‌یەو مانەوەی ئەوی تری لەسەر ڕەقی‌و سەختی خۆی.

پ- مانەوەی ئەو موعجیزەیە بە تایبەتی لەناو ئەو هەموو موعجیزانەی کە درا بە پێغەمبەرکانی تر ـ درودی خوایان لێ بێ ـ، کەواتە ئەو بەردە بە فەرە بە تەنیا چەند ڕابەرو بەڵگەیەکی تیدایەو ڕێکە ناوبردنی بە چەند ئایەت‌و ڕابەرێك.

هێندێ ئەفەرموێ: مەبەست ئەوەیە ئەو جێی وەستانە یەکێکە لەو بەڵگەو نیشانانە، واتە لەوماڵەدا هەیە چەند بەڵگەو نیشانەیەك، یەکێ لەوانە ئەو جێی وەستانەیە، هێندێ تر ئەفەرموێ: مەبەست بەو نیشانەو بەڵگەیانە دوو شتە، دوو بە کۆناو ئەبرێو لای خواروەکەیەتی، ئەو دووانەش یەکەمیان ئەو بەردەیەو دووەمیان ئەو هێمنیو ئارامیو بێباکیەیە کە خوا بەخشیویەتی بەو شوێنە پیرۆزە لەسەر نزای حەزرەتی ئیبراهیم. کەواتە ئەو دووەمەش ئەمەیە کە ئەم فەرموودەیە ئەگەیەنێ: ﴿وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا﴾ هەرکەس چووبێتە ئەو شوێنە ئەو کەسە هەمیشە بێباكو دڵ ئارام بووە، ئەم ئەندازەیە

وتمان بەسە لە تەفسیری بەشی یەکەمی ئەم ئایەتەدا، پێویست نیە بە درێژە پێدان بە چەند ڕایەکی وتراوە لەلایەن زانایانەوە، بەڵام ئەم وتەو فەرموودە دواییە ئەندازەیە ڕوون ئەکەینەوە بەم جۆرەی کە دێت:

هێندێ لە زانایان لەسەر ئەوەن کە مەبەست بەم فەرموودەیە فەرمانەو لە ڕواڵەتو دیمەنی هەواڵدا وتراوە، واتە هەرکەس چووە ئەو ماڵەوە بێباك بێو نابێ بترسێنرێو لاقەی بکرێ، تەنانەت پیاوی کوشتبێ نابێ هیچی لەگەڵ بکرێ تا لەوێ دەرئەچێ، وەك حەزرەتی عومەر ئەفەرموێ: ئەگەر کەسێك باوکی کوشتبمو لەو شوێنەدا بێت دەستی لێ نادەم تا لێی دەرئەچێ، هەروەها(ئیبنو عومەرو ئیبنو عەباس)یش وێنەی ئەوەیان فەرمووە ـ خوا لە هەموویان ڕازی بێت ـ، زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کە هەرچۆنێ بە ڕوواڵەت هەواڵە، هەروەها لە ڕاستی دا هەواڵەو مەبەست هەواڵدانە، وەك بەو جۆرە تەفسیرمان کردەوە، ئینجا خاوەنەکانی ئەم ڕایە دووبەرەکین:(ئیمام جەعفەری صادق)–خوا لێی ڕازی بێ– ئەفەرموێ: بێباك ئەبێ لە ڕۆژی دوایی دا لەسزای ئاگر، لە(ئیبنو عەباس)یشەوە حەدیسێ هاتووە لەو بارەیەوە، هەروەها چەند حەدیسێ تریش هاتووە کە هەموویان بێباکی نیشان ئەدەن لە ڕۆژی دوایی دا، بەڵام ئەو حەدیسانە نابن بە بەڵگە لەسەر ئەوە کە ئەبێ ئەم فەرموودەیە بەو جۆرە تەفسیر بکرێتەوە،دڵنیا نین کە ئەوەی ئەیگێڕنەوە لە(ئیمام جەعفەر)ەوە لە ڕاستی دا فەرموودەی ئەو بێو تەفسیری بەوە کردبێتەوە، کەواتە بالەسەر ڕای زۆربەی زانایان بڕین کە

مەبەست هێمنی و بێباکیە لەم جیهانەدا کە ئەوەش شتێکی ئاشکرایەو دۆست و دوژمن ئەزانن کەلەسەر دەم و چەرخی نەفامیشدا ئەو شوێنە پیرۆزە ئارامی و ئاشتی و بێترسی بووە بۆ دانیشتوانی، بەڵکو دانیشتوانی کە ئەچوون بە وڵاتاندا هەر رێزگیراو بوون و دەست درێژیان بۆ نەکراوە، کاروانی زستان و هاوینان بەبێ بیم و ترس بۆ شام و یەمەن بەڵگیەکی روونە لەسەر ئەوە، ئەو ئاشتی و ئارامی و هێمنیەکە خوا بەخشی بەو شوێنەو دانیشتوانی ـ وەك وتمان لەسەر داوای حەرزەتی ئیبراهیم بوو هەر لەیەکەم جارەوە کە فەرمووی: ﴿رَبِّ ٱجۡعَلۡ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنٗا وَٱرۡزُقۡ أَهۡلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ ئەی پەروەردگارم ئەم شارە بگێرە بە شارێکی هێمنی بێباك، رۆزی دانیشتوانی بدە لە هەموو میوەهات، لەپاش هاتنی ئیسلامیش هەورا هاتووەو بێرێزی رووی نەکردووەتە ئەو ماڵە تەنانەت لەکاتی فەتحی مەککەیشدا کە خوا ساتێك حەلاڵی کرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) لەو رۆژەیشدا بێ رێزی رووی نەکردە ئەو بەڵکو ئەوەی کەکرا لەو رۆژەدا لەبەر پاك کردنەوەی ئەو دەورو بەرەبوو لە بت پەرستی کە ئەوپەری رێزی ئەوی تیایە، لەو رۆژەدا ئەو ماڵە پیرۆزە کرا بەیەکێ لە جێی پەنادان، کەواتە بە هیچ کلۆجێ بێ رێزی رووی نەدا بۆ ماڵەکە، بەڵکو لەو رۆژەدا هەرچی کرا هەمووی لەبەر رێزی ئەو شوێنەو دانیشتوانی بوو، بە رێزو بەرزیی ئەوان تەواو بوو، ئینجا ماوەتەوە کردەوە پیسەکەی حەجاج -خوا هەق بسێنێ لە خۆی و لەو کەسەش کە ئەو فەرمانەی پێدا- ئەو کردەوە پیسەی ئەوە بە نیازی بێرێزی کەعبەو ئەو شوێنە پیرۆزە نەبوو، بەڵکو هەر بە نیازی(ئبن و زوبەیر) و ئەو کۆمەڵە موسڵمانە بوو کە لەگەڵی بوون، ئەوەش هەرچەن تاوان و دەست درێژی و رێزشکاندن و نەهێشتنی ئاسایشی تیابوو، بەڵام شتەکە رووداوێکی تەنهاو تایبەتیەو هیچ چاو نادا لەگەڵ ئەو ئارام و هێمنیە زۆرو گشتیەی کە خوا بەدرێژایی کات و چەرخ دای بەو شوێنە پیرۆزەو دانیشتوانی رەخنە ناگیرێ بە شتی وا.

بەکورتی رێزو بەرزیی ئەو ماڵە بەفەرەو دەوروبەری شتێکی ئاشکرایە بۆ هەمووان، رێزو بەرزیەکەی تا ئەو رادەیە دارو درەختی نابڕێ و نێچیری راو ناکرێ و ناتارێنرێ لە جێگەو هێلانەی خۆی، هەموو کەس ئەزانێ کە ئەو رێزو بەهرەیەی کە خوا داوێتی بەو شوێنە نەیداوە بە هیچ شوێنێکی تر.

ئەو ماڵە بەفەڕە خوا لە هەموو بارێکەوە جوێی کردووەتەوە لە هەموو ماڵێکی تر، خوا فەرمانی دا بە دروست کردنی وە جوبرەئیل ئەندازیاری بوو نەخشەی کێشا، ئیبراهیمی خەلیل وەستا بوور ئیسماعیل زەبیح شاگرد بوو، ئەم ئیسلامە ئایین و میللەتی ئیبراهیمە، کەواتە هەر ئەو ماڵە شایستەیە بۆ ئەوەی بکرێ بە ڕووگە بۆ هەموو بڕواداران، نامەدارەکان هەر ڕەخنەیەك بگرن ئەوە هەر نەفامی و نەزانییان بۆ ئەمێنێتەوە، ئینجا باسی بەهرەو ڕێزێ تری ئەو ماڵە بەفەڕە ئەکات کە ئەم بەهرەش هەر بۆ ئەم شایانەو کالای بالای ئەمە، ئەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ﴾ بۆ خوا هەیە بەسەر ئادەمیەوە حەج کردنی ئەو یەکەم ماڵەی کە دانراوە بۆ ئادەمی و خوا ئەو هەموو پیت و بەهرەی ڕشتووە بەسەریدا، واتە لەلایەن خواوە حەجی ئەو ماڵە پێویست کراوە لەسەریان، بەڵام بە پێی میهرەبانی خۆی پێویستی نەکردووە لەسەر هەمووان، بەڵکو ﴿مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً﴾ لەسەر هەرکەسێك کە توانای ڕێکردن و گەیشتنی ببێ بۆلای ئەو ماڵە.

ئەم مەسەلەی توانینە بە درێژی لە کتێبەکاندا باس کراوە لەسەر هەموو مەزهەبەکان، کەواتە لێرەدا بە پێویستی نازانم باس کردنی، بێجگە لەوەش هەرکەس ئەگەر چاوی خۆی لێ نەنووقێنێ خۆی ئەزانێ توانای هەیە یان نا؟ ئەوەی کە شایانی باسە ئەمەیە:

١- ئەم حەجە لە چەرخی حەزرەتی ئیبراهیمەوە تا چەرخی پێغەمبەرمان(ﷺ) هەر بووە، تەنانەت لەو ماوە دوورو درێژەی سەردەمی نەفامی عەرەبدا وازی لێ نەهێنراوەو هەر کراوە بەناوی پەیڕەوی کردنی ئیبراهیمەوە، ئیتر با لەو سەردەمەدا بە جۆرێ نەکرابێ کە خوا فەرمانی پێداوەو پێی ڕازی بووبێ، ئەوەش گەورەترین بەڵگەی گەورەیی و ڕێزی ئەو ماڵەیە بە لای خواوە، ئاشکرا ترین نیشانەیە لەسەر شیاوی و شایستەیی ئەو ماڵە بۆ گێرانی بە ڕووگەی بڕواداران و خواپەرستان، کەواتە هەر ڕەخنەیەك کە نامەدارەکان ئەیانگرت بە دەستەوە لەو بارەیەوە زۆر بێ جێ و بێ نرخە.

٢- پێویست کرنی ئەوحەجە لەم شەریعەتەدا بەڵگەو نیشانەیە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەرمان بە ڕاستی لەسەر ئایین و میللەتی ئیبراهیمە دروودی خوا لە هەردوکیان بێت، کەواتە ئەو نامەدارانە کە خۆیان بە شوێن کەوتوو ئەوەی ئیبراهیم دائەنێنئەبوایە بە هیچ ڕەنگ سەرپێچیان نەکردایە لە شوێن کەوتن و بڕوا هێنان بەم ئایین و شەریعەتە.

وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٧﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٨﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ

**٣- ئەم ئایەتە وا نیشان ئەدات کە حەج فەرزو پێویستە لەسەر ئەو جوولەکانەش کە دەمەقاڵێو بەربەرەکانێ ئەکەنو ڕەخنە ئەگرن لە ڕوو کردنی موسڵمانان بۆلای ئەو ماڵە بەفەڕە، چونکە خوا پێویستی کرد لەسەر ئادەمی، کەواتە ئەوانو هەموو کەسانی تریش ئەگەر خۆیان بە ئادەمیی دائەنێن با یاخی نەبنو سەرپێچی نەکەن لە حەجی ئەو ماڵەو ڕووکردن بۆلای ئەگەر وا نەکەنو فریای خۆیان نەکەون بەری ئەم تەشەرو هەڕەشەیە ئەکەون کە کۆتایی ئایەتەکەی پێ ئەهێنێو ئەفەرموێ: ﴿وَمَن كَفَرَ﴾ وە هەرکەس بڕوای نەهێنابێو بڕوانەهێنێ بەوەی کە لەم ئایەتەدا وتراو پێویست کرا ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ ئەوە خوا بێ نیازو بێ پێویستە بە هەموو جیهانیان، واتە ئەو کەسە خۆی زیانبارو دووچار ئەبێو خوا خەشمی هەیە بۆی، بڕوانەهێنانو گوێڕایەڵی نەکلادنی هیچ زیانێ ناگەیەنێ، بڕواهێنانو گوێڕایەڵی خوای گەورە جیهانیان هیچ سوودو قازانجێ ناگەیەنێ بە خوا، هێندێ ئەفەرموێ: ﴿وَمَن كَفَرَ﴾ واتە: هەرکەسێك حەج نەکات، حەج نەکردن بەبێ عوزر بە بێبڕوایی دائەنێن لەبەر چەند حەدیسێك کە لەو بارەیەوە هاتوون، بەڵام ئەبێ ئەو حەدیسانەش هەر ببڕێن بەسەر ئەو کەسانەی کە بڕوایان بە پێویستیو واجبی حەج نیە، چونکە جەماوەری زانایانو ڕای بەهێزی وەرگیراو لە ئیسلامدا لەسەر ئەوەیە کە بە نەکردنی حەجو کردەوەکانی تر مەردوم بەبێ بڕوا دانانرێ ماتووڵ بڕوای ببێ بە پێویستیو واجبیەکەیان، بەڵام بەڕاستی حەج ئەوەندە بە گرنگ گیراوەو توندو تیژی بەکار هێنراوە لەبارەی نەکردنیەوە ئەوەی کە بەجێی نەهێنێ ئەگەر نەشچێتە ڕیزی بێبڕوایانەوە شتێکی وا جیاوازی نابێ لێیان.**

**خوا میهرەبانی کرد هەرکەسی هەرچەند دەسەڵاتو توانای ببێ، هەرچەند تەمەنی درێژبێت یەك جار حەجی لەسەر پێویست کردووە، ئینجا ئایا هەر لە یەکەم جاری**

دەسەڵاتو توانینەوە وەك پێویست ئەبێ لەسەری ئەبێ دوایشی نەخاتو تەفرەی دروست نیە، یان دروستە؟ زانایان لەوەدا دووبەرەکین بەو شێوەی کەلە کتێبەکانیاندا باسیان کردووە. بێگومان خوشەویست(ﷺ) پێش پێغەمبەرێتیو پاش پێغەمبەرێتی چەند جار حەجی کردووە تا کاتێ کۆچی کرد بۆ مەدینە، ئیتر لەپاش کۆچ کردن حەجی نەکرد تا ساڵی دەهەم کە حەجەکەی ناوبرا بە(حجة الوداع) حەجی ماڵ ئاوایی، چونکە ئەوە دواترین حەجی بوور پاش ئەوە لە دنیا دەچوو(ﷺ)، ئینجا لەچ ساڵێکدا حەج پێویست کرا لەسەر ئەم ئوممەتە، لەمەشدا چەند ڕایەك هەیە بە هێزتریان ئەمەیە کەلە ساڵی شەشەمدا پێویست کراوە.

مەیلی خوا وا بوو سورەتی(حەج)موسڵمان لەپێش ئەم سورەتەوە تەفسیر کردەوە لەو سورەتەدا ئەندازەیە درێژەم دا بەباسی گەورەیی و گرنگیو سوودو بەهرەی حەج، جا لەبەرئەوە لێرەدا بە پێویستم نەزانی لەو بارەیەوە بدوێمو کۆتاییم هێنا بە باسەکە.

لەپاش ئەو هەموو باسو بەیانو لێکۆڵینەوە لەبارەی ڕاستی ئەم ئایینو پێغەمبەرەوە، ئینجا فەرمان ئەدات کە پێغەمبەر(ﷺ) ڕووبکاتە نامەدارەکان بە هەڕەشەو بێزاری دەربڕێ لەسەر هەڵوێستیان بەرامبەر ئەم ئایینە ڕاستەی کە ئایناسنو ئەزانن ڕاستە، کەچی بەرگری ئەکەنو بەدژی هەڵئەسن، بڕوا ناهێنن بە ئایەتەکانیو هیچ گومانیشیان نیە لە ڕاستەیەکەی دا، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ بڵێ: ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ ئەی نامەدارەکان ﴿لِمَ تَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ لەبەر چی بڕوا ناهێنن بە ئایەتەکانی خوا، واتە ئەیەتەکانی قورئان یان ئەو هەموو بەڵگەو نیشانانەی تر لەسەر پێغەمبەرێتی پێغەمبەرەکەی ﴿وَٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا تَعۡمَلُونَ﴾ لە کاتێکدا خوا بە تەواوی ئاگادارەو شایەتە بەسەر هەر کارو کردەوەیەك کە ئێوە ئەیکەن، دەی ئایا ناترسن لەوەی خوا بتانگرێو تۆڵەی سەختتان لێ بسێنێ لەسەر ئەو کردەوە خراپانە کە پیس ترینو گەورەترینیان بڕوا نەهێنانو بەربەرەکانێتانە سەبارەت بەم ئایینە ڕاستەکە ئەشزانن ڕاستە؟

سەر زەنشتو هەڕەشەی ئاڕاستەکردن لەسەر گومڕاییو لادانی خۆیان لەئایینی خوا، فەرمان ئەدا کە هەڕەشەو سەرزەنیشتیان ئاڕاستە بکات لەسەر کردەوەی پیس تریان کە هەوڵدانیانە بۆ گومڕاکردنی خەڵکی، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ بڵێ: ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ ئەی نامەدارەکان ﴿لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لەبەرچی بەرگری ئەکەنو لائەدەن لە ڕێی خوا،

مَنْ ءَامَنَ تَبْغُونَهَا عِوَجًا وَأَنتُمْ شُهَدَآءُ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٩٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن تُطِيعُوا۟ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ كَٰفِرِينَ ﴿١٠٠﴾ وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُۥ

---

﴿مَنْ ءَامَنَ﴾ کەسێك کە بڕوای هێناوە بە ئایینی خواو بڕوای هێنا بەڕاستی ڕێی خوا کە هەرکەس بکەوێتە سەری ئەیگەیەنێ بە ڕەزامەندیو ڕەحمەتی خوا، ﴿تَبْغُونَهَا عِوَجًا﴾ نیازی لاریو ناڕاستی ئەکەن بۆ ئەو ڕێی خوا، ئەتانەوێ بە ناڕاست بیخەنە بەرچاوی هەرکەس کە بڕوتان پێبکاتو پێتان هەڵخەڵەتێ، ﴿وَأَنتُمْ شُهَدَآءُ﴾ لە کاتێکدا کە ئێوە زاناو ئاگادارن بەوەی کە ڕاستەو ڕێی خوایە، ئاگادارن بە موژدەدانی نامەکەتان بە هاتنی ئەو ئایینو پێغەمبەرە، زاناو ئاگادارن بەوەی کەلە تەوراتدا هاتووە کە ئایینی خوا هەر ئیسلامە هەر ئەوە وەرئەگرێ، یا ئێوە لەناو گەلەکەتاندا ئەگیرێن بە شایەتو بڕوا پێکراون، ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ بێگومان خوا بێئاگا نیە لەوەی کە ئێوە ئەیکەن، کەواتە تۆڵەی ئەم تاوانەتان لێ ئەسێنێ ئەگەر کۆتایی نەهێننو نەگەڕێنەوە بۆلای خوا. وا دەرئەکەوێ کە مەبەست بەم تناوانبارانە زاناکانی جوولەکەن کە بەباشی زانا بوون بەڕاستێتی پێغەمبەرو ئەم ئیسلامەی کە هێنای، لەگەڵ ئەوەدا بە هەموو جۆر خەریك ئەبوونو فڕوفێڵو پیلانێکیان ئەخستە کار بۆ گومڕاکردنی مەردومو لادانیان لە ئیسلام، پاڵپێوەنەریان هەر حەسادەت بوو کە نەخۆشیەکی ئەوەندە پیسە ڕوو بکاتە هەر دڵێ مەگەر خوا بەقودرەتی خۆی چارەسەری بکات ـ خوا بەبەزەیی خۆی بمانپارێزێ لێی، ئەوانە بێبڕواییەکەیان ئاشکرا ئەکردو دەریان ئەبڕی، بەڵام پیلانەکەیانیان بەنهێنی ئەکرد، جا کەواتە هەر ئەوە ڕێکە کە هەڕەشەی کرد لەسەر کردەوەی پێشوو بە ﴿وَٱللَّهُ شَهِيدٌ﴾ چونکە شایەتی دان لەگەڵ شتی ئاشکرادا ڕێك ترە، لە هەڕەشەی دووەم فەرمووی: ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ﴾ چونکە شت کە بەنهێنی بکرێ بۆ ئەوەیە پێی نەزانرێ کە لێرەدا ڕێکتر ئەوەیە کە هەڕەشەی لێ بکرێ بە ئاگاداری خوا بەسەر شتە نهێنیەکانیاندا، بەڕاستی هەر بە قورئان ئەکەوێ بدوێو قسەبکات!!

ئینجا لێرەدا کۆتایی ئەهێنێ لە دەمەقاڵێ و لێکۆڵینەوە لەگەڵ نامەدارەکاندا، وە لێیان ئەگەڕێ و ئەیانخاتە پشت کەنار، ڕووی فەرموودە ئەکاتە بڕوادارەکان بە تەمێ و ئامۆژگاری و وریا کردنەوە، بەباسی سیفەت و کارو کردەوەی تایبەتی خۆیان و بەرنامەو بۆچوونیان و ڕێگەی پێك هێنان و بەدی هێنانی ئەو بەرنامەی کە خوا بەستوویەتی بە گەل و کۆمەڵی بڕوادارانەوە. بێگومان خوا ئەیەوێ لە موسڵمانان کە ڕێگەو ڕێبازی خۆیان دامەزرێنن تەنها لەسەر بەرنامەی خوا، بەجۆرێ جیاو جیاواز بن لە هەموو گەل و کۆمەڵێکی تر لە جیهاندا، ئەیەوێ لێیان کە ئەو ئایین و بەرنامەی خوا بچەسپێنن، بە کردەوە بەدی بهێنن لەژیاندا، ئەیەوێ لێیان هەڵسن بەسەرکردایەتی ژیان و جیهان، وە بەبێ هەڵسانیان بەو کارە گرنگە گەل و ئوممەتی موسڵمان نین و بوونیان بە گەل و ئوممەتی بەستراوە بەوەی کە باسکرا، ئەمەی کە باس کرا قورئان لە چەند ئایەتدا ئامارەی بۆ ئەکات و ئەیەوێ هەست و بیرو بڕوای موسڵمانان لەسەر ئەوە دامەزرێ، کەواتە موسڵمانان ئەبێ سەرچاوەی هەموو شتێکیان هەر ئایینەکەیان بێت، عەقیدەو باوەڕیان، خوڕەوشتیان، ڕژێم و یاسایان، نابێ هیچ کام لەمانە لە هیچ کەسێك و لە هیچ لایەکی ترەوە وەرگرن، جالێرەدا موسڵمانان ئەترسێنێ لە شوێن کەوتن و پەیڕەوی کردنی غەیری خۆیان، ڕێگەی ڕاستی خۆیان نەخشەئەکێشێ بۆیان، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی کەسانێ کە بڕوتان هێناوە ﴿إِن تُطِيعُواْ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ﴾ ئەگەر ئێوە گوێڕایەڵی دەستەیەك بن لەوانەی کە نامەیان پێدراوە ــ واتە گاورو جوولەکە ــ ﴿يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ كَٰفِرِينَ﴾ ئەتانگێڕن بە بێباوەڕو لە ئایینەکەتان هەڵتان ئەگێڕنەوە لەپاش ئەوەی بڕواتان هێناو بوون بە بڕوادار، واتە وریا بن و ئاگاتان لە خۆتان بێت و بە گوێیان مەکەن با دووچاری ئەوە نەبن، بێگومان گوێڕایەڵی ئەوانەو وەرگرتنی بەرنامەو یاساو ڕژێمیان، تێك شکانێکی دەروونیە، وە واز هێنانە لەو سەرکردایەتیەی کە ئوممەتی ئیسلامی بۆهاتووە، لەبارێ ترەوە گومان و دوودڵی نیشان ئەدا لە ڕاست و دروستی و بەکاری بەرنامەو ئایینەکەی خوادا، دەی ئەوەش بێبڕواییەکە ئەچێتە دڵیانەوەو بە خۆشیان نازانن. ئینجا لەلایەکی تریشەوە نامەدارەکان بە تایبەتی جوولەکە ئاوات و ئامانجیان گومڕاکردن و لادانی ئەم ئوومەتەیە لە عەقیدەو ئایینەکەی، چونکە ئەوان بەباشی ئەزانن کە بەردی بناغەی ئەم ئوممەتەو هۆی ڕزگاربوونی و سەرچاوەی هێزو

سەرکەوتنی عەقیدەو ئایینەکەیەتی، جا لەبەرئەوە لە کۆن و لە تازەوە بە هەموو هێزو دەسەڵاتیان هەموو چەکێکیان بەکار هێناو بەکاری ئەهێنن بۆ ترازاندنی موسڵمانان لەرێگە ڕاستەکەیان، کاتێ بە ڕواڵەت چەکی ئاشکرایان بەکار نەهێنا نەوەستان لە چەکی نهێنیو هەموو فرت و فێڵ و پیلانێکیان بەکار هێنا بۆ ئەو مەبەستە پیسەیان، بەو پیلان و فرت و فێڵە تاقمێکیان لەناپاکانی بە ناو موسڵمان پێکهێناو بەریان دانە لەشی ئەم ئوممەتەو وەك خۆرە لەناوەوە خواردیان، تا بەو جۆرە دووریان خستنەوە لەپەیڕەوی کردنی ئایین و عەقیدەکەیان، لە ڕێگای ئەو ناپاك و نا موسڵمانانەوە بیروباوەڕو بەرنامەکەی ئەوانیان هێناو خستیانە جێگای ئایین و عەقیدەکەی خوا، جا لەبەرئەوە قورئان لێرەو لە چەند شوێنێکی تردا بڕواداران بێدار ئەکاتەوە بەسەرچاوەی دواکەوتن و ژێرکەوتن و بەدبەختی و بەشی بڕوایان لە هەردوو جیهاندا، وە ئەیانترسێنێ لەوەی کە بەدەستی خۆیان خۆیان دووچار بکەن و دەست بەرداری عەقیدەو ئایینەکەیان ببن و شوێنی دوژمنان و بێ بڕوایان بکەون کە ئاوات و ئامانجی ئەوان ئەمەیە کە ئەمان بێبڕوا بکەن لەپاش ئەوەی بڕوادار بوون، لەگەڵ ئەوەدا دەرد لەوە خراپتر نیەو هیچ زەرەرو زیانێك ناگاتە ئەوە، لەگەڵ ئەوەدا موسڵمانان هەمیشە قەڵغان و بەرگری کەری بێبڕواییان لا هەیە، شتێ کە مایەی نەترازان و لانەدانە، لەبەر دەستیاندایە، کەواتە لادان و بێبڕواییان زۆر تاوانەو بەڕاستی جێی سەرسوڕمانە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ﴾ ئایا ئێوە چۆن بێبڕوائەبن ﴿وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُۥ﴾ لە کاتێکدا ئێوە ئایەتەکانی خوا ئەخوێنرێتەوە بەسەرتاندا، پێغەمبەرو فروستادەکەی لەناوتاندایە. بەڵێ بەڕاستی تاوانێکی زۆر گەورەو بێجێ و بێهۆیە کە بڕوادار لەکات و زروفی وادا بێبڕوابێ و لە ئایینەکەی هەڵگەڕێتەوە، بەڕاستی زۆر جێی سەرسوڕمانە!! ئینجا لەپاش کۆچ کردن و لە دنیادەرچوونی پێغەمبەریش(ﷺ) کارەکە هەروایە، چونکە ئایەتەکانی خواو وتارو کردارو ڕەوشتی پێغەمبەر(ﷺ) هەر وەك خۆی ماوەو ئەمێنێ، ئێمەی ئەمڕۆو هەموو کەسێکی تر لە داهاتوودا تا ڕۆژی دوایی ئەم قورئان و حەدیسەمان ئاراستە کراوە، بەوێنەی یەکەم چین کە یەکەم جار ئاراستەکران، ڕێی پەناو پارێزگاری ڕوونە بۆ هەمووان، ئاڵاکەی بەرزەو بە ئاسمانەوە ئەشەکێتەوە،

وەکو دەست نیشانمان بۆ ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ﴾ هەرکەس پەنا ببا بە خواو دەست بگرێ بە ئایینی خواوە ﴿فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ بێگومان ئەو کەسە ڕێنموونی کراوە بۆ ڕێیەکی ڕاست کە هەرکەس بکەوێتە سەری و پیا بڕوا هەرگیز ون نابێ و مەترسی نابێ لە هەڵدێران و تیاچوون، بەڵێ بەڕاستی تەنها پەنا بە خواو دەست گرتن بە ئایینەکەیەوە ڕزگارکەرو پارێزەرە، خواو ئایینەکەشی هەر هەن و هەر ئەمێنن، کەواتە بڕوادار ئەبێ هەمیشە دڵ بەهێزو پشت پڕبێ، وەهیچ بڕوبیانوویەکی نیە.

مەسەلەی وەرگرتنی بیروباوەڕو بەرنامەو بۆچوون تەنها لە خوا، هەرچۆنێ قورئان زۆر بە گرنگ گرتوویەتی و توندو تیژیی تیا بەکار هێناوە، هەروەها پێغەمبەریش(ﷺ) زۆر بە توندی گرتوویەتی:(ئیمامی ئەحمەد) حەدیسێ ئەهێنێ لە(عبدالله ی کوڕی سابت)ەوە کە ئەڵێ:(حەزرەتی عومەر)–خوا لێی ڕازی بێ– جارێ ئەچێتە خزمەت پێغەمبەرو ئەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا داوام کرد لە برادەرێکی جوولەکەی قورەیزە هێندێ شتی گرنگی تەوراتی بۆ نووسیم، ئایا بۆت باس نەکەم؟(عبدالله) ئەڵێ: ڕووی پێغەمبەر(ﷺ) بەو قسە تێك چوو، ئینجا عومەر وتی: من بڕوام هەیەو دڵنیام بە خوایەتی خواو بە ئایینی ئیسلام و بە پێغەمبەرێتی محمد، ئەڵێ بەو وتەی عومەرە ڕووی هاتەوە سەر خۆی و فەرمووی: سوێند بە کەسێك کە گیانی منی بەدەستە ئەگەر ئێستا موسا بێتە ناوتان و ئینجا ئێوە شوێنی بکەون و واز لە من بهێنن ئێوە گومڕا ئەبن، چونکە بێگومان ئێوە بەشی منن لەناو گەلانی جیهاندا، منیش بەشی ئێوەم لەناو هەموو پێغەمبەراندا ـ سەلامی خوایان لێبێ ـ هەروەها(حافظ) حەدیسێ ئەهێنێ لە(جابر)ەوە کە ئەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پرسیاری هیچ شتێ مەکەن لە نامەدارەکان، چونکە هەرگیز ئەوان ڕێنموونیتان ناکەن لە کاتێکدا کە خۆیان گومڕابوون، ئێوە ئەو کاتە یا ئەبێ بڕوا بکەن بە شتی ناهەق، یا هەق بە درۆ بزانن، سوێند بە خوا ئەگەر ئێستا موسا زیندووبێتەوە لەناوتاندا ئەبێ هەر پەیرەوی من بکات، لە ڕیوایەتێکی تردا: ئەگەر موسا و عیسا زیندووببنەوە لەناوتاندا هیچ ڕێیان نیە بێجگە لە پەیڕەوی و شوێن کەوتنی من. ئەمەیە بڕیاری ڕوون و بێ پێچ و پەنای پێغەمبەرەکەمان(ﷺ) سەبارەت بە بەربەست کردن و قەدەغەکردنی فێربوون و وەرگرتنی موسڵمانان لە نامەدارەکانەوە بۆ هەرکارێ لەبارەی بیروباوەڕو بۆچوون و بەرنامەو شەریعەتەوە، بێگومان

کاتێ وەرگرتنی ئەوانە لە نامەدار قەدەغەبێت، چاکتر قەدەغەیە وەرگرتنیان لە غەیری نامەدارەوە، بەڵێ هیچ قەدەغەنیەو هیچ زیانی نیە لەفێربوون و وەرگرتنی هەر زانین و زانیاری و پیشەسازیەك کە پەیوەندیان نەبێ نەبە عەقیدەو نە بەرنامەی ژیان و نەبە ڕژێم و یاسای ژیانەوەو نەبە خووڕەوشت و نەبە فەلسەفەو بۆچوونەوە، بە مەرجێ ئەوەش کە ڕەوایە وەرگرتنی، ئەبێ لەسەر بەرنامەی بڕوا بە خواو عەقیدەی پاك و خاوێنی ئیسلام بێ کە ئەو شتانەو ئەو هێزو وزەیانە هینی خوان و خوا ژێرباری کردوون بۆ ئادەمی، ئەبێ ئەو فێربوون و وەرگرتنە بە نیازی خێرو خۆشی هەمووان بێت و بۆ کامەرانی و بەختەوەری هەمووان بێت، ئەبێ سوپاسی خوای لەگەڵ بێت لەسەر ژێربار کردنی ئەو هەموو هێزو وزەیەو ئینجا ڕێبردن و دۆزینەوەو فێربوونی بەکار هێنانیان، سوپاس کردنی خوا بە پەرستنی و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی، سوپاس کردنی بە بەکار هێنانی ئەو هێزو وزەیانە بۆ خێرو خۆشی بەندەکانی خوا.

ئەوەی کە قەدەغەیە وەرگرتنی لە غەیری ئیسلامەوەو ئەوەی کە دروست و ڕەوایە دوو شتی جیاوازن، وەك دەست نیشانمان بۆکردن، بەڵام زۆر بە داخەوە زۆر کەس ئەو دوو شتە لێ ناکاتەوەو لای وایە هەرچۆنێ دروستە لە بێگانەوە وەرگرتنی پیشەسازی و زانیاری ڕووتی کاروباری ماددی ئەم جیهانە، هەروەها دروستە بۆچوون و بیروباوەڕو یاساو ڕژێمیشیان لێ وەرگیرێ، بەڵکو زۆر سەر لێ شێواو هەیە هەر بەدوای وەرگرتنی بیرو باوەڕەکەیاندا ئەگەڕێ و لای وایە ئەو پێشکەوتنەی کەبێگانە هەیەتی لە کاروباری پیشەسازی و ماددەدا لەبیروباوەڕەکەیەوە دەستکەوتی بووە، کەواتە با لە پێشەوە بیروباوەڕەکەی وەرگرێ!!

خواو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمان و تەمێ و ئامۆژگارییان بەو جۆرەیە، بەڵام زۆر بە داخەوە ئێمەی ئەمڕۆ کە خۆمان ناو ناوە موسڵمان دوای بێگانەی دژمن کەوتین و بۆچوون و فەلسەفەمان لە ئیغریقیەکان و ڕۆمان و ئەورووپاو ئەمریکاوە ڕژێمی ژیان و یاساو قانوونەکەمان وەرئەگرین. لەو سەرچاوە بێنۆخ و بێکارانەوە! ڕەوشت و ئاداب وەرئەگرین لەو قوڕاوو زەلکاوە بۆگەنەوە کەلەسەر بنەڕەتێکی بێئایینی دامەزراوە، ئەوە ئەکەین و ئینجا خۆیشمان بە موسڵمان دائەنێن! بەڕاستی ئەمە گوناهێکی زۆر گەورەیە گوناهی ئەمە گەورەترە لە بێبڕواییەکی ئاشکرا کە دەری بڕین و جاڕی بدەین لە خۆمان، چونکە ئەو شوێن کەوتنەمان شایەتی دانە لەسەر بێکەڵکی و بێنرخی ئیسلام، دەی ئەوانەی کە بە

ئاشـكرا موسـڵمان و بـێبڕوان ئـەو شـایەتیە نـادەن و ئـەوە دەرنـابڕن! بێگومـان ئیـسلام بەرنامەیـە، بەرنامەیـەکی جیـاوازی دیـاری یـە بـە چـەند نیـشانەو دروشمێکـی تایبەتیـەوە، جیاوازە لە هەموو بارو ڕوویەکەوە.

لەبارەی بیروباوەڕو بۆچوونەوە، لەبارەی یاساو قانوونەوە، لەبارەی ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتیەوە، بەرنامەیەکە هاتووە بۆ سەرکردایەتی هەموو جیهان و ژیان، کەواتـە پێویـستە بوونی گەل و کۆمەڵێك کە ئەم بەرنامەیە بگرێتـە گـەردن و سەرکردایەتی پـێ بکـات، بێگومـان ئەوەش ناگونجێ کاتێ ئەو گەل و کۆمەڵە فەرمان و تـەمێ لـە غـەیری ئایینەکەیـەوە وەرگـرێ. ئـەم ئیـسلامە هـاتووە بـۆ خێـرو خۆشـی جیهـان و جیهانیـان، ئەوانـەی کـە ئـەمڕۆ داوای گەڕانـەوەی ئیـسلام ئەکـەن مەبەسـتیان گەڕانـەوەی خێـرو خۆشیە بـۆ هـەمووان، هـیچ ڕزگـار کـەرێك نیـە لـە دەسـت ئـەو هـەموو سزاو ستەم و تاوانـەی کـە ئـادەمی تیـا ئـەژی بێجگـە لـەو بەرنامەی خواییەی کە پێویستە بێتـەوە کایـە جارێکـی تـریش وەك یەکـەمجار تـا ئـەمجارەش فریـای جیهان و جیهانیان بکـەوی، وەك یەکەمجار فریایان کەوت و مرۆڤایەتی گـەیاندە پـۆپـەی هـەرە بـەرزی خـۆی. بـەڵێ بێگومـان لـەم چـەرخ و سـەردەمە تازەیـەدا ئـادەمی پـێش کـەوت لـە بەکار هێنان و ژێر بار کردنی هێزو وەزەکانی بوونـەوەردا، تابێـت هـەر بـەرو بـەرز بوونـەوەو پێشکەوتن ئەڕوا، لە جیهانی پیشەسازی و تەندروستیدا شتی وای داهێنا کە هـەموو کـەس سەرسامە لێـی، بـەڵام ئایـا چ فـەڕو بەرهـەمێکی بوو لـە ژیـانی دا؟ ئایـا بەهـەرمی چـی بوو لـە چارەسەرکدنی ئەو دەردو نەخۆشیە دەروونیانەوە کە ئارامیان لێ بڕیوە؟ ئایا خۆشبەختی و کامـەرانی دەسـت کـەوت؟ ئایـا ئـارمی و ئاسایـشی وەرگـرت؟ ئایـا ئاشـتی دەسـت کـەوت و دوورکەوتـەوە لـە جـەنگ و ئاژاوە؟ نـەخێر نـە واللە، بـەڵکو بە پێچەوانەوە چـەندە نەخۆشـی و دەردو بێ ئارامی و بەد بەختی هەبوو، چەند چەندانە بوویەوە، ستەم و تـاوان و خراپـەکاری و کوشـتن و بـڕین زۆر بـە پـان و فـراوان ڕووی زەوی داگیرکـرد! هـەروەها پـێش نەکـەوت لـە بۆچوون و تێگەیشتن لە مەبەست و ئامـانج لـەبوونی ئادەمی و ژیـانی ئادەمی، ئەو بۆچوون و تێگەیشتنەی کە ئیسلام ئەیدا موسڵمانی ڕاستەقینە، کاتێ ئەو بەراوردە بکرێ دەرئەکەوێ کە ئەم پێشکەوتن و شارستانێتی ئەمڕۆ شتێکی زۆر بێنرخ و قیزەونە! بەڵکو دەرئەکەوێ کە بەد بەختی و چارە ڕەشیەك بوو هات بەسەر ئادەمی دا، سەد خۆزگە هەر نەبوایە تا مـەردوم ئـاوا وێڵ و سـەرگەردان نەبوایـە، نـە پـەروەردگاری بناسـێ و نـەتێبگات لـە خـۆی و لـەبوونی خۆی، نەبزانێ ژیان چیەو مەبەست لە ژیانی ئادەمی دا چیە.

بەهۆی خوا نەناسی و دوور لە خواییەوە هەست و دڵ و دەروونی تاریکە، کەواتە بەو تۆزە زانیاری و پێشکەوتنە بە تەواوی یاخی و لە خۆ گۆڕاو بوو، لە کاتێکدا ئەگەر خواناس بوایە باشتر مل کەچ و گوێ ڕایەڵی خوا ئەبوو، تا زانین و زانیاریەکەی زۆر تر بوایە چاو لەبەر ئەبوو بۆ خوا و ئەوکاتە بە سۆزو بەزەیی دارئەبوو بۆ بەندەکانی خوا، زانینەکەی بەکار ئەهێنا لە خێرو خۆشی و کامەرانی هەمووان‌دا، لەترسی خوا نەی ئەتوانی بەکاری بێنێ لەشەڕو خراپە و بێ ئارامی مەردومدا، لە هەموو کاتێکدا و بۆ هەمووکارو مەبەستێك دنیا و دوا ڕۆژی ئەبەستن بە یەکەوە و چاودێریی هەردووی ئەکرد، ڕژێمێکی ئەبوو کە یەکێتی و ڕێك و پێکی ئەخستە نێوان هەموو هێزو وزەکان و جیهان و ڕۆژی دوایی و گەل و ئەندامەکانی.

ئەو بەرنامەی کە خوا ناردی بۆ ئەم ئادەمیە میانەیەو هەموو شتێ لە ناوەڕاستی تەرازووە ڕاستەکەی ڕاگیر ئەکات و لەڕادەی خۆی دا ئەیوەستێنێ بەبێ کەم و کوڕی و زیادەڕەوی، ئەو بەرنامە شیرینە ــ زۆر بەداخەوە ــ هێندێ لەم ئادەمیە هەوڵ و تێکۆشانی هەمیشە بۆ بەرگریەتی و ئەیەوێ مەردوم لێی بێ بەش بن، هەوڵ دان بۆ گێڕانەوەی ئەو بەرنامەیە ناو ئەبەن بە دواکەوتن! وا گومان نەبەن کە ئەوە شتێ بوو هات بۆکاتی تایبەتی خۆی و مەبەست و ئامانجی گەڕانەوە بۆلای! بەلام ئێمەی موسڵمان کە بانگی جیهانیان ئەکەین بۆ گەڕانەوە بۆلای ئەو بەرنامەیە، ئەزانین ئەو بەرنامەی هەمیشەییە لەگەڵ ئەم ژیان و جیهانەدا، هەر ئەوە بەکارەو شیاو و گونجاوە لەگەڵ ژیان و جیهاندا، بەوێنەی هەمیشەیی و بەکاریی و شیاویی و گونجاوی ڕژێمی ئەم بوونەوەرە گەورەیە، هەمیشە ئەو بەرنامەیە تەڕو تازەیە و تاقانە ڕزگار کەرە لە هەموو تەنگ و چەڵەمەو گرێیەکی ژیان، تەنیا ئەو ئەم ئادەمیە دەرئەهێنێ لەو قوڕاو و زەلکاوە بۆگەنەی کە ئەم مەردومەی تیا ئەژی، تەنها ئەو بەرزکەرەوەیە بۆ ئاسۆو پلەی هەرە بەرزی مرۆڤایەتی، جڵەو و سەرکردایەتی ئادەمی ئەگەر نەدرێتەوە دەستی و نەگێڕێتەوە بۆلای هەتا بێت ئادەمی بەرەو پەستی و لاری و دواکەوتن ئەڕوا لە مەیدانی پیاوەتی و مرۆڤایەتی دا، جا یەکەم هەنگاو بۆ ئەو مەبەستە پیرۆزە ئەمەیە کە ئەو بەرنامەیە تاقانەو جیاوازبێت و هیچ جۆرە دەست کاری و تێکەڵ و پێکەڵی بەسەر نەهێنرێ، هەڵگرانی ئەو بیروباوەڕو بەرنامەیە لە هیچ سەرچاوەو لایەکی ترەوە هیچ بیروباوەڕو عەقیدە بۆچوون و ڕژێم و یاسایەك وەرنەگرن و خۆیان و بەرنامەکەیان بە پاك و پوختەیی ڕاگیر کەن تا خوا ڕێکی ئەخات گەڕانەوە بۆلای ئەو بەرنامەیە جارێکی تریش، خواو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) داوای ئەوە ئەکەن لە بڕواداران، بەم جۆرەیە ئەم ئایەتەی کە

ئێستا لەگەڵی ئەژین و بەو جۆرەیە ئەو حەدیسەی کە تێپەڕی کردو باسمان کرد لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا، بەم جۆرە فەرمووەیانە یەکەم تاقمی موسڵمان تەمێ کران و فێرکران، ئەوانیش ئەو تەمێ و فەرمانەیان بەڕێکی وەرگرت و فەرمانبەریان کرد تا بە ماوەیەکی کەم ئەم بەرنامەیە بوو بەخێوەتی ڕەحمەت و هەڵدرا بەسەر زۆربەی جیهان و جیهانیانەوە.

لە چەند ڕوایەتێکدا هاتووە کە ئەم دوو ئایەتە لەگەڵ دوو ئایەتەکەی پێشیان هاتوونەتە خوارەوە دەربارەی چەند جوولەکەیەك کە ویستیان دوژمنایەتی کۆنی بەینی ئەوس و خەزرەج هەڵگیرسێننەوە و دانیان بەگژیەکدا، تا پەلاماری یەکتریان داو لەپاشدا پێغەمبەر(ﷺ) هاتە ناویان و ئامۆژگاری کردن و ئەو ئاگرەی کوژاندەوە، بەجۆرێ گریان و دەستیان کردە ملی یەکتر، لەبەرئەوە زۆربەی زانایانی تەفسیر ئەم ئایەتانە ئەبڕن بەسەر ئەو تاقمە لە جوولەکە لەگەڵ هاوەڵەکانی ئەوس و خەزرەجدا، بەڵام بە پێی یاسای عیلمی اصول فقە ئایەت تایبەتی ناکرێ بەهۆی هاتنە خوارەوەیەوە، بەڵکو لەسەر گشتێتی خۆی ئەهێڵرێتەوە، بەڵێ ئەوەش هەیە کە ئەو ڕووداوەو هۆی هاتنە خوارەوە مەبەستی یەکەمە لە ئایەتەکەدا، بەڕاستی هەر ئەم ڕایەش ڕاست و بەجێیە، جا لەبەرئەوە هێندێ لەزانایان لە تەفسیری ئەم ئایەتانەدا هیچ باسی هۆی هاتنە خوارەوەکە ناکەن و ئایەتەکان تەفسیر ئەکەنەوە لەسەر ڕواڵەت و ڕووکەشە گشتیەکەیان، وەك(قەتادە) لێرەدا ئاماژە ئەکات بۆ ئەو گشتێتیە کە ئەفەرموێ: لەم ئایەتەدا دووشت، وتراوە کە بەرگری ئەکەن لەکەوتنە ناو بێبڕوایی، یەکێکیان خوێندنی قورئان، دوومیان بوونی پێغەمبەر(ﷺ) لەناو بڕوادارانداو، پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆی بۆلای ڕەزاو ڕەحمەتی خوا، بەڵام قورئانەکە هەر ئەمێنێ تا دنیا دنیایە، هێندێ تر ئەفەرموێ: مەبەست بوونی خودی پێغەمبەر(ﷺ) نیە لەناو بڕواداراندا، بەڵکو مەبەست کردارو ڕەوشت و بەرهەم و نیشانەکانی پێغەمبەرێتیەکەیەتی کە ئەمیش وەك قورئانە کە هەر ئەمێنێتەوە تا ڕۆژی دوایی، ئەفەرموون خوێندنی ئەو قورئانە لە لایەن هەرکەسێکەوە بەسەو باشەو چارەسەرە.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا

---

**لەپاش جڵەوگیری کردن کە گوێڕایەڵی و شوێن کەوتنی نامەدارەکان و قەدەغە کردنی وەرگرتنی بیروباوەڕو بۆچوون و یاسایانەوە، لەپاش ئەوە ئینجا بانگی بڕواداران ئەکات و فەرمانیان پیا ئەدا بەدوو شتی زۆر گرنگ کە بنەڕەتن و ژیان و بەنامەکەیان لەسەر ئەو دووانە ڕاگیرئەبێ و ڕائەوەستێ، بەهۆی ئەو دووانەوە ئەم ئوممەتە ئەتوانێ هەڵسێ بەو سپاردە گەورەیەی کە خراوەتە ئەستۆی و هەر لەبەرئەوە هاتووەتە ئەم جیهانە، ئەو دووشتەش یەکەمیان بڕوایە بە خواو سام و بیم لێی و خۆپاراستنە لە نا فەرمانی، چاودێریی خوا لە هەموو کارو فەرمانێکدا، دووەمیان برایەتیە لەگەڵ بڕواداراندا، بەجۆرێ بن بە یەك کۆمەڵ و یەك پارچە تا بتوانن فەرمان بدەن بە چاکە و جڵەوگیری بکەن لە خراپە و ژیان ڕایگربکەن لەسەر چاکە و پاکی بکەنەوە لەچڵك و چەپەڵی تاوان و خراپە، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ﴾ زانایانی دووبەرەکین لەم فەرموودەیەدا:(سەعیدی کوڕی جوبەیرو قەتادە) و تاقمێکی زۆر لەسەر ئەوەن کە سڕاوەتەوە بە ئایەتی: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ﴾ تاقمێکی تر لەسەر ئەوەن کە نەسڕاوەتەوە و مەبەست بە هەردوو فەرموودەکە هەریەکە، جا بە گوێرەی ئەو دوو ڕایە بە دوو جۆر تەفسیر کراوەتەوە: لەسەر ڕای یەکەم: واتە بترسن لە خواو خۆتان بپارێزن لێی بە ترسان و خۆپاراستنێ کە شایان و شایستەی گەورەیی خوایە، دیارەی ئەوەش ناگونجێ بۆ بەندە و لە توانای نیە و بەهیچ ڕەنگ بەندە ناگات بەوەدا ئەگەر هەموو کات و چرکەکانی ژیانی بەخت بکات تیای دا، جا لەبەرئەوە ــ وەك(سەعیدی کوڕی جوبەیر) ئەفەرموێ ــ کاتێ ئەم ئایەتەهات موسڵمانەکان کەوتنە تەنگی، ئەوەندە ئەوەستان لەنوێژدا تا پێیان ئەئاوسا، ئەوەندە سوژدەیان تا تەوێڵیان زامداربوو، ئینجا خوا ئەرکی سووك کردن، بەم ڕەنگە سڕی یەوە و فەرمووی: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ﴾ لە خوا بترسن و خۆتان بپارێزن لێی تا ئەتوانن و بە پێی تواناتان، وە لەسەر ڕای دووەم: واتە خۆتان بپارێزن بە خۆپاراستنێکی ڕاست و پێویست لەسەرتان کە ئەوەش ئەوەیە بە پێی توانا بێت و توانین بەخت بکرێ لە هەڵسان بە پێویست و دوور کەوتنەوە لە حەرام و قەدەغە، وەك بەو ئایەتە ڕوونی کردووەتەوە، ئینجا**

ئەو دیاریی نەکردنە لێرەدا دڵو دەروون ئەخاتە تێکۆشان بۆ گەیشتن بەو پلەیە هەرچۆن بگونجێ و پێ ی بکرێ، هەتا لەسەری بڕواو قووڵ بۆی داچێ چەند ئاسۆیەکی بۆ دەرئەکەوێ و سۆزو پەرۆشی تازەو بەهێزتر ئەبێ بۆ گەیشتن بەو ئاسۆیانە، هەتا بەو خۆپارێزیە نزیك بکەوێتەوە لە خواوە باشتر هەوڵئەدا بۆ پلەی بەرزتر، تا ئەگاتە پلەیەك کە دڵ هەمیشە بێدار ئەبێتو هەرگیز ناخەوێ! ﴿وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ مەمرن لەسەر هیچ بارو حاڵێ مەگەر لەسەر بارێ کە ئێوە مل کەچ بن بۆ خواو دڵتان پاكو خاوێنو یەکبار بکەن بۆ خوا بەبێ هیچ جۆرە هاوبەشێك، بێگومان مردن شتێکی نهێنیو غەیبیەو کەس نازانێ کەی پێ ی ئەگات، کەواتە هەرکەسێك ئەیەوێ بەو موسڵمانێتیە بمرێ ڕێگەی ئەوەیە کە هەر لە ئێستاوە بەو جۆرە موسڵمان بێتو لە هەموو کاتێکدا موسڵمان بێت، باسی ئیسلامو هێنانی بەدوای لە خواترسیو خۆپارێزی لە خوا ئەوە نیشان ئەدا کە مەبەست بە ئیسلام بارو شێوە پانو فراوانەکەیەتی کە بریتیە لە مل کەچیو گوێڕایەڵی بۆ خواو پەیڕەوی بەرنامەکەی، گەڕانەوە بۆلای ئاینو نامەکەی لە هەموو شتێکدا، کە بەم شێوەیەش ئەم سوورەتە لە هەموو شوێنێکدا ڕوونی ئەکاتەوەو ئەیەوێ بیچەسپێنێ لە دڵو دەروونەدا. ئەوە بوو بنەڕەتی یەکەم بۆ گەلو کۆمەڵی موسڵمان کەلەسەری کۆببنەوە تا بتوانن بە هەڵسانیان بەو سپاردە گەورەیەی کە خراوەتە سەرشانیان. بنەڕەتی دووەم بریتیە لە برایەتی لەبەر خواو لەڕێی خوادا، لەسەر بەرنامەی خوا، بۆ بەدی هێنانی بەرنامەی خوا، ئەفەرموێ:

﴿وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا﴾ هەمووتانو پێکەوە دەست بگرن بەهۆی پەیوەستیتان بە خواوە، واتە قورئان، وەك لە چەند حەدیسێکدا ئەفەرموێ، یەکێ لەوانە حەدیسی(ئەبو سەعیدی خدری) یە کە ئەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(کتاب الله هو حبل المدود بین السماء والأرض) نامەی خوا حەبلە بەردراوەکەی خوایە لەنێوان ئاسمانو زەوی دا، واتە هۆی پەیوەستی بەندەیە بە خواو گەیشتنی بە خواو هۆی پەیوەستی زەوی بە ئاسمانەوە، کەواتە کۆبوونەوە ئەبێ هەر لەسەر ئەو نامەو بەرنامەی خوا بێ، نەك لەسەر هیچ بیروباوەڕێکی تر، نەك لەسەر هیچ ئامانجو مەبەستێکی تر، نەك لەسەر هیچ هۆی پەیوەستیەکی تر کەلە نەفامی کۆنو تازەدا نەفامان دەستیان پێوە گرت دەستی پێوەئەگرن لەنێوان ئادەمی دا کە هەر هەموویان ڕەگەزپەرستیەو سەریان لەتاوانو دەست درێژیەوە دەرئەچێو دژی پێچەوانەی مرۆڤایەتین.

وَلَا تَفَرَّقُوا۟ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٠٣﴾

---

**﴿وَلَا تَفَرَّقُوا۟﴾ جویێ مەبنەوە لەوەی کە فەرمانتان پێدراوە بە دەست پێوەگرتنی، دەستی لێ بەرمەدەن و پیا بنووسێن، یا مەبەست ئەوەیە دووبەرەکی مەبن مەپچێڕێن لە یەك و ئاژاوەکەن، بێگومان واتاو مەبەستی پێشوو، ئەم مەبەستەش ئەگرێتەوە، چونکە تا بەڕاستی هەموو دەست بگرن بەوەی کە فەرمانی پێداوە هەرگیز دووبەرەکی و ئاژاوە ڕوونادا لەناویاندا.**

**ئەو برایەتی و یەکێتی و پەیوەستە بە خواوە گەورەترین چاکەو بەهرەی خوایە، ئەیبەخشێ بە هەر تاقم و دەستەیەك کە شایستەو شیاوی ئەوەبن، تام و خۆشیەکەی بە تەواوی بۆ کەسانێ دەرئەکەوێ کە سزاو ئازارو ناڕێکی پێش دەست پێوە گرتنەکەیان چەشتبێ وەك ئەوس و خەزرەج، ئەو دوو خێڵ و هۆزەی کەلە مەدینەدا بوون و هیچ کەس لەوان دووبەرەکی و دوژمن تر نەبوو لەسەردەمی نەفامیاندا ئێجگار بەهۆی ئەوەوە ئاوسێی جوولەکەکان بوون و ئەوانیش بەپێی باوی و سروشتی ناپاکی خۆیان هەمیشە ئاگری دووبەرەکی و دوژمنایەتیەکەیان تاو ئەدان، یان هۆزو تیرەکانی عەرەب لە پێش ئیسلام دا کە ئەوانە هەموو ئیسلام کردنی بە کۆمەڵێکی وا کەلە مێژووی ئادەمی دا وێنەیان نەبووە لە برایەتی و پاکی و ڕێکی دا، جالێرەدا قورئان ئەو چاکەیان بیرئەخاتەوەو ئەفەرموێ: ﴿وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ﴾ بیربکەنەوەو سوپاسی چاکەی خوا بکەن بەسەرتانەوە ﴿إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً﴾ لە کاتێکدا کە ئێوە دوژمن بوون بۆ یەکتر ﴿فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ﴾ ئینجا خوا هۆگری خستە نێوان دڵەکانتان و بەهۆی ئیسلامەوە یەکی خستن و پەیوەستی کردن ﴿فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا﴾ ئینجا گەڕان بەبرای یەکتر بەهۆی ئەو چاکەی خۆیەوە کە ڕشتی بەسەرتاندا، بەم ڕەنگە گێڕانی بە موسڵمان کە هەر ئیسلام بەڕاستی ئەتوانێ دڵە تۆراوو تاراوەکان یەك بخاتەوە، ئەتوانێ پاك**

بكاتەوە لە چڵك‌و چەپەڵی‌و ژەنگی کینەو حەسادەت‌و دوژمنایەتی‌و ڕەگەزپەرستی، ئینجا چاکەیەکی تریان بیرئەخاتەوە کە زۆر گەورەو گرنگترە کە بریتیەلە لە ڕزگارکردنییان لە ئاگری دۆزەخ، ئەفەرموێ: ﴿وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ النَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا﴾ وەئێوە لەسەر لێواری چاڵێ بوون لە ئاگر ئینجا خوا ڕزگاری کردن لێی، واتە ئێوە بێبڕواو بێ ئایین بوون، هەرکەسیش دەنگی بانگی خوای پێ بگات‌و بڕوا نەهێنێ کە مرد لەئاگردایە، مردنیش هەمیشە لەسەر ڕێیەو چاوەڕوانی ئەکرێ، کەواتە ڕاستە بەسەر لێوی دۆزەخەوە بوون، ئینجا خوا ڕزگاری کردن بە ئیسلام، بەڵێ بەڕاستی چاکەو منەتی خوا بەسەر بڕوادارانەوە زۆر گەورەو گرنگ‌و بەنرخە، بەتایبەتی ئەو چین‌و تاقمەی کە یەکەم جار ئەم قورئانەیان چوو بە گوێچکەدا، ئەوەتا بەو نەفامی‌و نەزانی‌و بێبڕوایی وێڵیە ڕزگاری کردن تا کردنی بەو گەل‌و کۆمەڵە تاقانە لە ڕووی زەوی دا کە دوژمنیش ناتوانێ ئەو شایەتیەیان بۆ نەدا، ئینجا کردنی بەو گەورەو کاربەدەست لە زەوی دا، ئینجا بەپێی بەڵێنی خوا ڕزگاریشیان ئەکات لە ئاگرو ئەیان گەیەنێ بە نازو ڕێزی نەبڕاوەی بەهەشت، کەواتە بەهرەمەندو سەربەرزو ڕووسووری هەردوو جیهانی کردن. هەروەها بەپێی بەڵێنی خوا هەرگەل‌و کۆمەڵێکی تریش کە ڕێبازی ئەوان بداتە بەرو وەك ئەوان دەست بگرێ بە ئیسلام‌و قورئانەکەی خواوە، خوا ئەوا بەهرەمەندی هەردوو جیهاتیات ئەکات، ئەم فەرموودەی کە ئاڕاستەی ئەوانی کرد لە یەکەمجارەوە، پەندو ئامۆژگاریە بۆ هەموو تاقم‌و چینەکانی پاش ئەوان، ﴿كَذَٰلِكَ﴾ بەو جۆرە ڕێك‌و ڕەوانە ﴿يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ﴾ ڕوون ئەکاتەوە بۆتان بەڵگەو نیشانەو ئایەتەکانی ﴿لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ بۆئەوەی بەردەوام بن لەسەر ڕێنموونی‌و دامەزران لەسەر ڕێی خواو لانەدەن بۆ ڕێ‌و کردەوەی نەفامی، لەم ئایەتە پێشووەدا ئەو دوو بنەڕەتە سەرەکیەی باس کرد بۆ گەلی بڕوادار ئینجا لێرەدا کارو فەرمانیان دیاریی ئەکات کەلەسەر ئەو دوو بنەڕەتە هەڵسن پێی،

وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿١٠٤﴾

---

ئەفـەرموێ: ﴿وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ﴾ زانایـانی ئیـسلام دووبـەرەکین کـە ئایـا ئـەم فـەرموودەو فەرمانە ئاڕستەی هەموو باڵغو عاقڵو ژیرەکانی ئوممەت کراوەو بەڵام بە هەڵسانی هێندێ پێی لە کۆڵی ئەوی تر ئەکەوێ، یان هەر لە ڕێوە ئاڕاستەی هێندێ کراوە؟ یان بۆ هەمووەو ئەبێ هەموویش پێی هەڵسن؟ زۆربەو جەماوەر لەسەر ڕای یەکەمن، تاقمێکی زۆریش هەن کەلەسەر دووەمن، کەمێکیش کە(ئەبو جەعفەری ئیمامی) لەوانە لەسەر ڕای سێیەمن، کەواتە با بەپێی ئەو ڕایانە تەفسیری بکەینەوە: لەسەر ڕای یەکەمو سێیەم ئەڵێین: با ئێوە گەلو میللەتێك بن کە هەڵسن بەم سێ شتە:

١- ﴿يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ﴾ بانگ بکەن بۆ خواناسیو خواپەرستی بەتەنیا کە کانگاو سەرچاوەی هەموو خێرو چاکەیەکەو هەر ئەوە خێرو چاکەی ڕووتە، یان مەبەست پەیڕەوی قورئانو هەموو خێرو چاکەیەکەو هەر ئەوە خێرو چاکەی ڕووتە، یان مەبەست پەیڕەوی قورئانو ڕەوشتی پێغەمبەرە(ﷺ) وەك لە(ئیمامی محمدی باقر)ەوە هاتووە –خوا لێی ڕازی بێ–، یان هەر شتێ کە چاکەو خۆشی هەردوو جیهانی تێدا بێ، وەك هێندێ لە زانایان ئەفەرموێ، هەرکام لەم سێ ڕایە هەر باشنو ڕێكو ڕاستە.

٢- ﴿وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ﴾ فەرمان بدەن بە چاکەو هەر شتێکی شەرعی کەبە سروشت ناسراوەو باوە لای ژیری.

٣- ﴿وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ﴾ جڵەوگیری بەکەن لە خراپەو ناشەرعی کە بەسروشت بێزراوەو نەناسراوە لای ژیری.

هەرچەند یەکەم لەسەر هەر بار گشتیە بۆ دووەمو سێیەمو ئەیان گرێتەوە، بەڵام بەتایبەتی باس کردنو هێنانی بە دوای یەکەمدا، تا دەرئەکەوێ نرخو زیادە پێویستی بەم دووانە. بەڵێ بەڕاستی ئەم دووانە زۆر بەنرخو بەکەڵکنو پێویستە بەتایبەتی بکرێنو ئامارە بکرێ بۆ کەڵكو نرخیان، چونکە بەبێ ئەم دووانە هیچ ڕژێمو یاسایەك سەرناگرێ، هیچ میللەتێ بەمیللەت ناونابرێ، ئایینو بەرنامەی خوا هەرگیز بەدی نایەت بەبێ فەرمانداڕو

فەرمان ڕەوایەك كە سەرپەرشتی و چاودێری مەردومان بكات، چونكە بەرنامەی خوا تەنها پەندو ئامۆژگاری و ڕێ نیشان دان نیە، بەڵكو ئەوە بەشێكیەتی و ئەو بەشەكەی تری هەڵسانە بە دەسەڵات و فەرمان ڕەوایی بەسەر بەدی هێنانی چاكەو دوور خستنەوەی خراپە لە ژیانی ئادەمی، پارێزگاری باوو ڕەوشتی كۆمەڵی چاك لەوەی هەر نیاز بەدو خراپەكارێ بە ئارەزووی خۆی و لەبەرژەوەندی خۆی بەرگری و بەربەست و دەستكاری بكات، دیاریی كردنی چاكەو خراپە، تا هەركەس بەئارەزووی خۆی بە ڕاوبۆچوونی خۆی چاكەو خراپەكاری نەكات، بەڵكو چاكەو خراپە ئەوەن كە خوا لەئایینی خۆی دا دیاریی كردوون و بێگومان هەموو ژیرییەكیش بڕوای بەوە هەر هەیە كە خوا دیاریی كردووە، كەواتە بانگ كردن بۆ خێرو چاكەو ڕێی خواو فەرمان بە چاكەو جڵەوگیریی لە خراپە هەروا سووك و ئاسان نیە، بەڵكو كۆسپ و گرێ و دڕك و داڵی زۆری لە ڕێدایە، بێگومان ئەو بانگ كردن و فەرمان دانە ئەدا لە دەماخی گەلێ كەس، ئەدا لە ئارەزووی نەفس و بەرژەوەندی تاقمێك، ئەدا لە هەموو تاوانبارو دەست درێژی كەرێك، ئەدا لە هەموو بەدخوو بەد كردارێك، ئەدا لەوانەی كە سروشتیان ترازاوەو چاكە بە خراپە دائەنێن و خراپە بەچاكە، هەرگیز میللەت ڕزگار نابێ و مرۆڤایەتی بەدی نایەت، تا خێرو چاكە زاڵ نەبێ، چاكەو خراپە نەناسرێن و دیاریی نەكرێن، دەی ئەوەش ناگونجێ تا كار بەدەست و فەرمان ڕەوایەك نەبێ كە یارمەتی خێرو چاكە بدات و بیچەسپێنێ و جڵەوگیریی بكات لە خراپەو لە پێش چاو ونی بكات و دووری بخاتەوە، كەواتە پێویستی و ناچاری هەیە بەبوون و پێك هێنانی گەل و كۆمەڵێك كە دامەزرابن و یەك بگرن لەسەر بڕوا بە خواو برایەتی لەبەر خوا، تا هەڵسن بەوكارە گرنگە كە زۆر گرانەو كۆسپ و گرێی زۆری لە ڕێدایە، هەڵسن پێی بەهێزی بڕواو لە خواترسی و ئینجا بەهێزی خۆشەویستی و هۆگری ناو خۆیان، كەواتە ئەو گەل و كۆمەڵە پاك و خاوێنن و مەردومیش پاك و خاوێن ئەكەنەوە، كەواتە هەر ئەوانە شایستەن بەمەی كە ئەفەرموێ: ﴿وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ هەر ئەوانە ڕزگارو گەیشتوون بە ئامانج، بەڵێ بەڕاستی هەر ئەمانەن و هیچ كەسێكی تر ناگاتە ڕادەو پلەی بەرزی ئەوانە، چونكە هەر ئەوانە نموونەو نوێنەری ئایین و بەرنامەی خوان، هەر بەوانەو بەناو ئەوانەدا ئایین و بەرنامەی خوا ئەژی و ئەحەوێتەوە بەڕاستی.

وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُوا۟ وَٱخْتَلَفُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٥﴾

يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ۚ

ئەو گەل و کۆمەڵە بەرێزە لە شیرین ترین شێوەی دا پێکهات لە موسڵمانانی یەکەمجاری مەدینە منەوەرەدا، پێکهات لەسەر ئەو دوو پایەو بنەڕەتە، لەسەر بڕوا بە خوا، لەسەر ئەو بارو شێوە ڕاستەقینەی کە قورئان هێنای، لەسەر ئەو یەکێتی و خۆشەویستیەی کە گەیشتە ڕادەیەك کە لە هەموو تەمەن و مێژووی ئادەمیدا شتی وا نەبینراوە، ڕاستی و برایەتیەکەیان گەیشتە پلەیەك کە بە خەورو خەیاڵی هیچ کەسێکدا نەهاتووە، ئەگەر لە واقیعدا نەبوایە هیچ کەس بڕوای نەئەکرد کە شتی وا ئەگونجێ و ئەبێ!! بێگومان بەرنامەو ئایینی خوا هەر بە تاقم و کۆمەڵی ئاوا بەدی دێت لە هەموو چەرخ و چینێکداو لە هەموو وڵاتێکدا، جا لەبەرئەوە گەل و کۆمەڵی بڕوادارانی جڵەوگیری کرد لە ئاژاوەو دووبەرەکی و پچڕینی برایەتی و یەکێتی، ترساندنی و هەڕەشەی لێ کردن بە وێنەی دواڕۆژو چارەنووسی ئەو نامەدارانەی کە بەرنامەو ئایینی خوایان بە سپاردە درایە دەست و لە پاشدا دووبەرەکی بوون و یەکێتی و برایەتیەکەیان پچڕی و ئینجا خوایش ئەو سپاردە گەورەیەو ئەو ئاڵا بەرزەی لێ سەندنەوە لە جیهانداو دای بە گەلی موسڵمان و ئەوانی لێ خست و ئەمانی خستە شوێنیان، ئەوەی بەسەرهێنان بێجگە لە سزای ڕۆژی دوایی کە ئاماژە ئەکات بۆ بەشێکی لێرەدا، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُوا۟﴾ مەبن بە وێنەی ئەوانەی کە بەش بەش بوون و یەکێتییان نەما – واتە نامەدارەکان– ﴿وَٱخْتَلَفُوا۟﴾دووبەرەکی بوون لە ئایینەکەیاندا ﴿مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ﴾ لەپاش ئەوەی بەڵگەو نیشانە ڕوونەکانیان بۆ هات لەسەر ڕێ ڕاستەکەی خوا کە بەهۆی ئەوە ئەبوایە یەك ڕاو یەك قسە بوونایەو لایان نەدایە لە تاقە ڕێگەکەی خوا.(ئیبن و ماجە) حەدیسێ ئەهێنێ لە(عەوفی کوڕی مالیك)ەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: موساییەکان بوون بە حەفتاو یەك تاقم، یەکێ لەوانە لە بەهەشتدایەو حەفتایان لە دۆزەخدایە، عیساییەکان بوون بە حەفتاو دوو تاقم، حەفتاو یەکیان لە ئاگردایەو یەکێکیان لە بەهەشتدایە، سوێند بە کەسێ کە گیانی منی بەدەستە ئوممەتی منیش ئەبن بە حەفتاو سێ تاقم، حەفتاو دوویان لە ئاگردایە یەکێکیان لە بەهەشتدایە، مەبەست ئەوانەن کە دووبەرەکی لەم دووەمەدا زیانی نیەو ئەوەش هەڵەی کردبێ هەر ئەجری هەیە لای خوا، بەڵام ئەجرێکی هەیە، ئەوەی هەڵەی

نەکردنێ دوو ئەجری هەیە، بەڵام پێویستە دووبەرەکیەکەیان نەبێتە هۆی ئاژاوەو کینەو ڕەگەزایەتی تیا بەکار نەهێنرێ، ئینجا مەبەست لە بوونی ئەم حەفتاو دووە لە ئاگرداو ڕزگار بوونی یەکێکیان ئەمەیە -وەك جەلالی دەوانی ئەفەرموێ- حەفتاو دووەکە لەسەر بیرو باوەڕو عەقیدەکەیان ئەسوتێنرێن هەرچۆنێ لەسەر کردەوەی خراپیان سزا ئەچەژن، ئەو یەك تاقمە ڕزگار ئەبن لەبارەی عەقیدەو بیرو باوەڕەکەیانەوە، ئیتر با لەسەر کردەوەی خراپیان سزا بدرێن، ئینجا با بزانرێ کە ئەو حەفتاو دووە ناو ئەبرێن بە ئەهلی بیدعەت و هەر بە موسڵمان دائەنرێن و لە ڕیزی بڕواداران دەرناکرێن، چونکە بیرو ڕاکانیان دژی دەقی ئایەت و حەدیس نین و تەئویلیان هەیەو هەرکەس بەڵگەیەکی بە دەستەوە هەیە، ئیتر با هەموو هەڵە بن و لە ڕێی ڕاست ترازابن،(شێخی ئەشعەری) -خوا لێی ڕازی بێ- لە کاتی مردنیدا وەسیەتی کردو فەرمووی بە هاوەڵو قوتابیەکانی: ئێوە شایەتیم بۆ بدەن لە ڕۆژی دوایی دا کە من هیچ کام لەو تاقمانە بەبێ بڕوا دانانێم، بەڵام ئەوانەی کە دووبەرەکی بوون لە نامەدارەکان و لایاندا لە ڕێی ڕاستی پێغەمبەرەکانیان، ئەوانە لە ڕیزی بڕوادارەکاندا نەمان و بەبێبڕوا دائەنرێن، وەك دەرئەکەوێ لەم هەڕەشە سەختەی کە ئاڕاستەی ئەوانی ئەکات و بڕوادارانی ئەم ئوممەتەی پێ ئەترسێنێ کە ئەفەرموێ: ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾ بۆ ئەوانە هەیە سزایەکی گەورە ﴿يَوۡمَ تَبۡيَضُّ وُجُوهٞ وَتَسۡوَدُّ وُجُوهٞ﴾ لە ڕۆژێکدا کە چەند ڕوویەك سپی ئەبێت و چەند ڕوویەك ڕەش ئەبێ، واتە لە ڕۆژی دوایی دا بەهەشتیان نیشانە دار ئەکرێن بە سپێتی و ڕووناکی و بریقەی ناوچاویان و لەشیان، دۆزەخیانیش نیشانە دار ئەکرێن بە ڕەشی و تاریکی دەمو چاوو لەشیان، ئیتر ئەو سپێتی و ڕەشێتیە لەسەر بارە ئاشکراو ڕووکەشەکەیان مەبەست بن، وەك زۆریەو جەماوەری لەسەرە، یان مەبەست بە سپێتی خۆشی دڵ و کەیف خۆشیەك بێت کەهەستی پێبکرێ لە ڕووو ناوچاواندا، مەبەست بە ڕەشی داخ و خەم پەژارەیەك بێت کەلە ڕووو ناوچاواند دەرئەکەوێ، وەك کۆمەڵێك ئەفەرموون. ئایا مەبەست سپێتی بێ بۆ هەموو بەهەشتیان و ڕەشی بۆ هەموو دۆزەخیان، یان سپێتی بۆ ئەو نامەدارانەی کەلایان نەدا لە ڕێبازی پێغەمبەرەکانیان، ڕەشیش بۆ لادەرو دووبەرەکی کەرەکان بێت، بەتایبەتی لەسەر ئەو لادان و دووبەرەکی کردنەیان، هەرکام لەمانە کۆمەڵێ زانایانی لەسەرەو هەرکام ئەگونجێ و هەڵئەگرێ، ئینجا بەدرێژ تر باسی ئەو دوو تاقمە ئەکات،

فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ فَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿١٠٦﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبْيَضَّتْ وُجُوهُهُمْ فَفِى رَحْمَةِ ٱللَّهِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١٠٧﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ

---

ئەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ﴾ ئینجا ئەوانەی کە ڕووو ناوچاوانیان ڕەش ئەبێت ﴿أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ﴾ پێیان ئەوترێ ئایا ئێوە بێبڕوا بوون لەپاش بڕوا هێنانیان؟ واتە بەڵێ. ئەگەر مەبەست بەو ڕوو ڕەشانە هەموو دۆزەخیان بێت ئەبێ بڵێین: ئایا بێبڕوا بوون لەپاش ئەو بڕوا سروشتیەی کە خوا داویێتی بە هەموو مەردومێکی ژیر، ئەگەر مەبەست پێیان ڕوو ڕەشانی نامەداران بێت، ئەبێ بڵێین: ئایا بێبڕوا بوون بە محمد کاتێ کە ڕەوانە کرا لەپاش بڕوا هێنانتان پێی لە پێش هاتن‌و ڕەوانە کردنی دا؟ ﴿فَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ﴾ کەواتە بچەژن سزاکەتان بەهۆی بێبڕواییەکەتانەوە لەجیهاندا، واتە سەرە ڕای ڕوو ڕەششەکەیان سەرزەنشت‌و تەشەریان ئاڕاستە ئەکەن‌و بێئابڕوویان ئەکەن بۆ سزادانی دەروونیشیان ــ خوا پەنامان بدات ــ، ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبْيَضَّتْ وُجُوهُهُمْ﴾ ئەوانەی کە ڕوویان سپی ئەبێت ﴿فَفِى رَحْمَةِ ٱللَّهِ﴾ ئەوانە وان لە ڕەحمەتی خوادا، واتە بەهەشت‌و ناز‌و نیعمەتی خوا، لەسەر هەربار بە میهرەبانی خوا ئەوەیان دەست ئەکەوێت ئەگینا هیچ کەس هیچ ماف‌و هەقێکی بەلای خواوە نیە.

لەکتێبە باوەڕ پێکراوەکانی حەدیسدا هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هیچ کام لە ئێوە کردەوەی نایخاتە بەهەشت، عەرزیان کرد تەنانەت تۆیش ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی تەنانەت منیش مەگەر خوا دام پۆشێ بە ڕەحمەت‌و میهرەبانی خۆی. خۆشتر لە هەموو شت بۆ ئەو خوا پێداوانە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ ئەوانە لەو بەهەشت‌و ڕەحمەتی خوادا هەر ئەمێننەوە هەتا هەتایە، ئینجا دڵنیایی ئەکات لەسەر ئەم باس‌و بڕیارانە بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿تِلْكَ﴾ ئەم ئایەتە گرنگانەی کە هاتن لەو باس‌و بڕیارو پەندو فەرمان‌و بەڵێن‌و هەڕەشەدا ﴿ءَايَٰتُ ٱللَّهِ﴾ ئایەتەکانی خوان ﴿نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ﴾ ئەیانخوێنینەوە بە سەرتدا بەڕاستی‌و ڕاستیان پێیە، یان بەدادەوە هاتوون‌و دادیان پێیە بە هەر شتێکدا کە نیشانی ئەدەن‌و ڕای ئەگەیەنن

﴿وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعَٰلَمِينَ ۝١٠٨ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ۝١٠٩﴾

﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾

---

**﴿وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعَٰلَمِينَ﴾ خوا ستەمو شتی بێ جێی ناوێ بۆ جیهانیانو نایەوێ شتی نارەوایان بەسەر بێنێ، بەڵکو بە دانانی پاداشتو تۆڵە ئەیەوێ دادو ڕاستی بەدی بێت بەرامبەر هەموو کارو کردەوەیەك، ﴿وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ هەر بۆ خوایەو هینی خوایە هەرچی لە ئاسمانەکاندایەو هەرچی لەزەویدایە، هەر خوا خاوەنو داهێنەری هەموویەتیو هەر خوا کاربەدەستی هەموویەتی ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ﴾ هەر بۆ لای خوا ئەگێڕێنرێتەوە هەموو کارەیان، کەواتە پاداشتو پاشە ڕۆژی هەموو کردەوەکان بە ئەوپەڕی دادو ڕاستی ئەنجام ئەدرێ.**

**ئینجا لەم چەند ئایەتی داهاتووەدا باسی میللەتی موسڵمان ئەکات، ناونیشانو کارو پیشەی خۆی ئەخاتە بەرچاو، تا خۆی بناسێو تێبگات لەپایەو پلەو جێو شوێنو نرخی خۆی، ئینجا باسی نامەدارەکانیش ئەکاتو بە تەواوی دەریان ئەخاتو موسڵمانان بێباكو دڵ ئارام ئەکات لێیان، دیارە بە مەرجێ کە ئەمان لائەدەن لە بەرنامەکەی خوا، ئەفەرموێ:**

**﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾ ئێوە باشترین ئوممەتێك بوون لەزانینی خوادا کە دەرخرانو فەراهەم هێنران بۆ ئادەمیزاد، واتە دەستی قودرەتی خوا ئێوەی لەتاریکی نەبوون دەرهێناو ئاشکرای کردنو هێنانیە کایە لەبەر ئەوەی فریای ئادەمی بکەونو بەو ئایینو بەرنامەی کە خوا پێی بەخشین، یان ئێوە باشترین ئوممەتێکن کە هێنرایە کایە بۆ ئادەمی، واتە هەموو ئوممەتی پێغەمبەران هاتوون بۆ چاکەی ئادەمی، ئێوە چاکترینی هەموو ئەو ئوممەتانەن، بەم جۆرەش هەر جوانەو تەفسیرکراوەتەوە، بەڕاستی وتەو فەرموودەیەکی ئێجگار بەرزو پیرۆزە، چونکە ئەمە شایەتیە لەلایەن پەروەردگارەوە لەسەر ئەوەی ئەم ئوممەتە چاکترینی جیهانە، بۆ ئەوەش هاتووە فریای ئادەمی بکەوێو چارەسەری هەموو کۆسپو گرێو ناتەواویەکی بکات، جا چ بەهرەو ڕادەو پلەیەك لەوە بەرزترو پیرۆزترە؟!**

**ئەم فەرموودەیە لەیەکەمجارەوە ئاڕاستەی ئەو چینو گەلی یەکەمە کرابە سەرکردایەتی پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام تایبەتی نیە هەر بەوانەوە، بەڵکو لەپاش ئەوان تا ڕۆژی دوایی هەر چینو تاقمێك پەیڕەوی ئەوان بکاتو ڕێبازی ئەوان بداتە بەر بەشدارو هاوبەشی ئەوانە، وەك**

دەرئەکەویّ بە ڕوونی لە چەند حەدیسێکەوە کە بە ناوبانگن‌و پێویست نیە بە هێنانیان، یەکێ لەو حەدیسانە ئەوەیەکە(ئیمامی ئەحمەد) هێناویەتی بە(ئیمامی عەلی)یەوە -خوا لێی ڕازی بێ- کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: چەند شتێکم پێدراوە کە بەهیچ کەس لە پێغەمبەران نەدراوە. یەکێ لەوانە ئەوە بوو کە فەرمووی: (ئوممەتەکەم کراوە بە چاکترینی هەموو ئوممەتەکان) دەی شتێکی ئاشکرایە کە ئوممەتی ئەو هەر ئەویەکەم چینە نیە، بەڵکو ئوممەتی ئەو ناوە بۆ هەموو بڕواداران هەتا ڕۆژی دوایی، حەزرەتی عومەر -خوا لێی ڕازی بێ- لەوتارێکی دا فەرمووی: ئەی خەڵکینە هەرکەس پێی خۆشە لەو ئوممەتە بێت با هەڵسێ بەم مەرجەی کەلەم ئایەتەدا بۆی دانراوە، واتە فەرمان بە چاکەو جڵەوگیری لە خراپە، پێویستە لەسەر ئەم ئوممەتە خۆی بناسێ‌و تێبگات لەخۆی بەو جۆرو شێوەیە کە ئەم ئایەتە ئاماژەی بۆکرد، ئەو کاتە ئەزانێ کە پێویستە لەسەری هەمیشە پێشەواو مامۆستا بێت بۆ جیهان‌و جیهانیان، جڵەوو سەرکردایەتی هەر بەدەست ئەمەوە بێت، پێویستە لەسەری کەبیروباوەڕو یاسا و لە هیچ کەس‌و لە هیچ لایەکی تر وەرنەگرێ، بەڵکو ئەبێ تەمێ‌و ئامۆژگاری هەموو گەل‌و ئوممەتەکانی تر بکات، بەشیان بدات‌و فێریان بکات لەوەی کە خوا پێی بەخشیوە، لەبیروباوەڕی ڕاست‌و بۆچوونی ڕاست‌و ڕژێمی ڕاست‌و کردارو ڕەوشتی ڕاست‌و ناسین‌و زانینی ڕاست.

ئەم چاکترین ئوممەتە ئەبێ بەو جۆرە سەرکردەو پێشەواو چاودێر مامۆستاو ڕێ نیشاندەر بیت، دیارە ئەوەش بەرزترین پایەو پلەیە لەم زەویەدا، گرانترین ئەرکەو لە خۆڕایی ناکرێ‌و دەست کەوت نابێ‌و بەڕێوە نابرێ، کەسێکی ئەوێ کە شایستە بێت، بێ‌گومان ئەم ئوممەتە شیاوو شایستەیە بۆی بەهۆی بۆچوون‌و بیروباوەڕی ڕێك‌و پێك‌و ڕژێمی ڕاست‌و ڕەوای کۆمەڵایەتیەکەیەوە، ماوەتەوە پێش کەوتنی لەبارەی زانین‌و زانیاری‌و شارستانێتی‌و ئاوەدان کردنەوەی وڵات‌و ڕێ بردن‌و بەکار هێنانی هێزو وزەکان لە دەست خستن‌و وەرگرتنی خێرو بێرەکانی ئەم زەویەی کە کراوە بەجێنشین تیای دا، بێ‌گومان لەم بارەیشەوە هەر ئەم پێشەواو پێش کەوتووبوو، وە ئەم قاپی شارستانێتی‌و ئاوەدانی‌و زانیاری کردەوە لە جیهانی ئەم سەردەمەو مێژوو شایەتی ئەدات بەسەر ئەوە، هەرکەس ئێستاش تەماشای شارەکانی قورتوبەو غەرناتەو ئەشبیلیەو شوێنەکانی تر بکات لە ڕۆژئاوای وڵاتی ئیسلام، قاهیرەو دیمەشق‌و بەغدادو گەلێ لەشارەکانی تری ڕۆژهەڵاتی

ئیسلام، ئەو حەقیقەتەی بۆ دەرئەکەوێ، کەلەو چەرخەدا هەموو ئەورووپا لەتاریکی نەزانی و نەوپەڕی دواکەوتن و ویڵی و بێ ڕژێمی دا ئەژیا، دوو نموونە لەم ڕووەوە باس ئەکەم:

١- لەچەرخی هیشامی سێیەمدا خەلیفەی موسڵمانان لە ئەسپانیا و ئەندەلوس دا کە کتێبی مێژوو بۆمان باس ئەکات و ئەڵێ پادشای بەریتانیا کە کۆنترین دەوڵەتی ئەورووپا بووە تاقمێکی نارد بەسەرۆکایەتی خوشکەزایەکی خۆی بۆلای خەلیفە بە نووسراوێکی خۆیەوە، لەونووسراوەدا ئەڵێ: لەبەرئەوەی وڵاتی ئێمە لە تاریکی نەزانی دا بەسەرگەردانی ئەژی، وڵاتی ئێوە بە ڕووناکی زانین و زانیاری ئەدرەوشێتەوە، ئەوا ئەمانەم نارد بەڵکو لەژێر چاودێری تۆدا فێری زانین و زانیاریی ببن! لە خوارەوەی نامەکەدا ئەونووسێ: بەندەی گوێ ڕایەڵتان فلان و ئیمزای ئەکات.

٢- ڕووداوی بەناو بانگی مێژوویی لە چەرخی خەلیفە هارون الرشید، کە پادشای فەرەنسە تاقمێکی ناردە خزمەتی خەلیفە بە چەند دیارییەکەوە بۆ دەربڕینی بچووکی و گوێڕایەڵی خۆی، ئینجا کە گەڕانەوە خەلیفە بەدیاریی کاتژمێرێکی بۆنارد بە خەڵات. ئینجا کاتێ کە ئەو کاتژمێرەیان بینی هەموو سەریان سووڕما و ژیرو لێ زانەکانیان کۆکردەوە تا بزانن سڕی ئەمە چیەو هۆی ئەم گەڕان و دەنگە دنگە چیە؟ ئینجا لەسەرەنجام دا هەموو بڕیاریاندا کە جنۆکەی تیایەو جنۆکە ئەو کارە ئەبا بە ڕێوە!! ئینجا موسڵمانەکان سەریان کردە عەیش و نۆش و ڕابواردن و خەوی سەرەمڕی بێئاگاییان لێ کەوت، بێگانەکانیش کە تالاوی نەزانی و دواکەوتنیان زۆر نەچەشتبوو کەوتنە تێکۆشان تا مەکۆکەیان لەمان دزی، ئینجا ئەوەندەش سپڵە بوون لە هەموو بارو ڕوویەکەوە بە پیلان و فڕو فێڵ ڕوویان کردە ناو وڵاتی ئیسلام تا تێکیان دان و بەریان دانە یەك، ئینجا ئەوەیان بە هەل زانی، ڕوویان کردە وڵاتەکەیان بە زۆرو بە لەشکر ژێر دەستیان کردن و ئەو وڵات و جیهانە پان و پۆڕەیان دابەش کردن بەسەر خۆیاندا تا وای لێ هات کە بینراو ئەبینرێ.

کەواتە دەرکەوت کە هۆی سەرکەوتن و پێشکەوتنی ئەم ئوممەتە لە هەموو مەیدانێکدا هەر دەست گرتنیانە بە ئایین و بەرنامەکەیانەوە، هەرچۆنێ هۆی دواکەوتن و ژێرکەوتن و ژێر دەستەییەکەیان هەر دەست بەرداربوونیانە لە ئایین و بەرنامەکەیان، ئەم چاکترین ئوممەتە هات -وەك قورئان ئاماژەی بۆکرد- بۆ ئەوەی فریای ئادەمیزاد بکەوێ، کەواتە ئەبێ هەڵسێ بە پارێزگاری ژیانی لە خراپەو خراپەکاریی و چاکەو چاکەکاری بچەسپێنێ لە ژیان و لە جیهاندا، بێگومان ئەوەش بە بێهێزو دەسەڵاتێك ناگونجێ، جا لەبەرئەوە ئەمەی کرد بە نیشانەو هۆی ئەو چاکترێتیە کە ئەفەرموێ: ﴿تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ فەرمان ئەدەن بە چاکە ﴿وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾ جڵەوگیری ئەکەن لە خراپە، بێگومان هەڵسان بەم کارە زۆر سەخت و گرانەو کۆسپ و گرێی زۆر لەو ڕێگەدا هەیە. ئەوە لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە دۆزینەوەو دیاری کردنی چاکەو خراپە نابێ حەواڵەی باوو ئارەزووی خەڵکی بکرێ، بە پێی بۆچوون و بڕیاری ئەوان دیاری ناکرێن، چونکە هەریەکێ و هەر تاقمێك باوو بۆچوونێکی تایبەتی هەیەو هەرگیز یەك ناگرن و کۆ نابنەوە، کەواتە پێویستی هەیە بە ترازوویەکی ڕاست کە بە هیچ ڕەنگ سەرنەکات و بەو ترازووە چاکەو خراپە هەڵسەنگێنرێن و دیاری بکرێن، ئاشکرایە کە ئەو ترازووەش تەنها لای خوا دەست ئەکەوێ و هەر بریتیە لە شەریعەتی خوا، کەواتە هەڵسان بەم کارەی کە ئەم ئوممەتەی بۆ هاتووە بە بێبڕواییەکی ڕێك و ڕاست بە خوا ناگونجێ و ناکرێ، پێویستە بوونی ئەو بڕوایە تا ئەم ئوممەتە گوێڕایەڵ و فەرمانبەر بێت و کۆڵ نەدات لە فەرمانبەرێتی خۆی، خۆگر بێت لەسەر هەر ئەرك و زەحمەتێك کە ڕووی تێبکات لە ڕێی خوادا، بتوانێ خۆی بەخت بکات و فیداکاریی بکات لەو ڕێگەیەدا، بە تەماو چاوەڕوانی ئەجرو پاداشتی لای خوا، پێویستە بوونی ئەو بڕوایە تا لانەدا لە ڕێی خواو بێجگە لە تەرازووەکەی خوا هیچ شتێکی تر بەکارنەهێنرێ، کەواتە هەرچۆنێ چاکترینی ئەم ئوممەتە بە بێ ئەو بڕوایە بەدی نایەت، هەروەها هەڵسانی بەو کارو فەرمانەش کە بۆی هاتووە ناکرێ و ناگونجێ بەبێ ئەو بڕوایە،

لەبەرئەوە ئەفەرموێ: ﴿وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ﴾ بڕوا ئەهێنن بە خواو بڕواتان هەیە پێی، دیارە مەبەست ئەو بڕوا ڕاستەقینەیە کە ئەبێ دەرکەوێ لە کردەوەداو خاوەنەکەی تێی ئەگەیەنێ لە خۆیو مەبەست لە بوونی خۆی، تێی ئەگەیەنێ لەم بوونەوەرەو لە ژیان، پەروەردگاری پێ ئەناسێو زانای ئەکات بە پەیوەندی خۆی بە خواو بە ژیانو بەم بوونەوەرەی کە تێیدا ئەژی، بڕوایەکی وا زاڵیو دەسەڵاتی خوا لە دەروونداا جێگیرو دامەزراو ئەکات، پاڵی پێوە ئەنێ بۆ هەوڵدان لەڕێی ڕەزامەندی خواداو خۆپاراستن لە هەرشتێ کە مایەی خەشمو ناڕەزایی ئەوە، مل کەچو گوێڕایەڵی ئەکات بۆ شەریعەتەکەی خوا لە هەموو بارو ڕوویەکەوە، بەڵێ‌ی بەڕاستی بەبێ ئەو بڕوایە ئەم ئوممەتە ناتوانێ هەڵسێ بەو کارو فەرمانەی کە بۆی ڕەوانەکراوە، ناتوانێ بانگ بکات بۆ خێرو چاکەو فەرمان بدا بە چاکەو جڵەوگیریی بکات لە خراپە، لە کاتێکدا کە ئەو هەموو کۆسپو گرێو دڕکو داڵەی دێتەڕێ، لە کاتێکدا کە هێزی ستەمو ستەمکاران بەرهەڵستی ئەوەستن، لە کاتێکدا پێ ئەگیرێ بەدەست هێزو دەسەڵاتی خراپەکارانەوەو ئەبینێ هیچ یارمەتی دەرو چەکێکی نیە کەلەو جۆرە کاتانەشدا هیچ چەکێك کەڵکی نیەو بەکار نایەت بێجگە لەچەکی بڕوا!

لەمەو پێش لە ئایەتی(١٠٤)دا فەرمانی دا بەم ئوممەتە کە ئەبێ هەمیشە لە ناویاندا دەستەیەك ببێ کە هەڵسن بە بانگ کردن بۆ خواپەرستیو ئاییني ئیسلامو بە فەرماندان بە چاکەو جڵەوگیریی لە خراپە، بەڵام لێرەدا ئەوە ئەکات بە سیفەتو نیشانەی ئەم ئوممەتە. بۆ ئەوەی تێبگەن کە بەبێ ئەو سیفەتو نیشانەیە ئەم ئوممەتە نیەو بوونی بۆ دانانرێ، کەواتە ئەگەر هەڵسا بەم کارو فەرمانە سەرەکیەی خۆی، ئەو سیفەتو نیشانەی پێوە دەرکەوت لەناو گەلانی جیهاندا ئەوا ڕاستەو هەیەو ئوممەتێکی موسڵمانە، ئەگەر وا نەبوو ئەوا لەڕووی ڕاستی دا نیەو سیفەتو نیشانەی ئیسلامی تیا نیە.

لە چەند شوێنێکی تر لە قورئان دا ئەم مەبەستە هەیە بە ڕوونی، بە یارمەتی خوا لە هەرشوێنێ پێی گەیشتین ئاماژەی بۆ ئەکەین، هەروەها لەحەدیسدا زۆر بە گرنگ گیراوەو ئاماژەی بۆکراوە، بۆ نموونە چەند حەدیسێك ئەهێنین:

١- حەدیسی(موسلیم)لە(ئەبو سەعیدی خودری)یەوەکەئەفەرموێ:بیستم لە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەرکەس لە ئێوەبێ شەرعیەکی بینی با بیگۆڕێو بەرگری بکات بەدەستو بەزۆر، ئینجا ئەگەر بەوە نەیتوانی ئەبێ بە قسەو بەزمانی بەرگری بکات، ئینجا ئەگەر

بەوەش نەیتوانی ئەبێ بەدڵی بەرگری بکات، ئەم پلەی سێیەمە لاوازترین پلەی براوەیە، کەواتە لەوە بەو لاوە بڕوا نامێنێ، واتە ئەگەر بەدڵیش ئەو بێشەرعیەی پێناخۆش نەبوو ئەوا بڕوای نامێنێ وەك لە ڕیوایەتێکی تردا ئەمەش هەیە:(**وليس وراء ذلك حبة خردل من إيمان**)، لەوە بەولاوە بە قەد ناوکە خەرتەلەیەك بڕوا نیە.

٢- حەدیسی(ئەبو داودو تیرمزی) لە(ئیبن و مسعود)ەوە -خوا لێی ڕازی بێ- کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کاتێ کە ئیسرائیلیەکان کەوتنە ناو گوناهو بێ شەرعی، زاناکانیان جڵەوگیرییان کردن، ئینجا ئەوان هەر کۆتاییان نەهێنا، لەپاش ئەوە زاناکان نەپچڕان و دوور نەکەوتنەوە لێیان، بەڵکو لەگەڵیان دائەنیشتن و خواردن و خواردنەوەیان لەگەڵ ئەکردن، بەهۆی ئەوەوە خوا دڵی ئەمانیشی مۆر کرد لەگەڵ ئەوان، نەفرینی کرد لە هەردوو تاقم لەسەر زمانی داودو عیسای کوڕی مەریەم. لەو کاتەدا کە ئەوەی ئەفەرموو پاڵی دابووەوە لەپاش دا هەڵسایەوەو دانیشت و فەرمووی: سوێند بە کەسێك کە گیانی منی بەدەستە نابێ واز بێنن لەو خراپەکارانە هەتا ڕاستیان ئەکەنەوەو ئەیانگێڕنەوە لە خراپە.

حەدیس لەم بارەیەوە زۆرەو ئەم دووانە بۆنموونە بەسن، هەموو ئەو حەدیسانە ئەوە ڕوون ئەکەنەوەکەئەو نیشانەو سیفەتە سەرەکی و بنەڕەتە لەناو گەلی موسڵماندا، پێویستەو ناچاری هەیە پێی ئینجا ئەگەڕێینەوە بۆسەر بەشی دووەمی ئایەتەکە، لە یەکەمجارەوە هانی ئەو نامەدارانە ئەدات لەسەر بڕوا هێنان بەو جۆرەی کە خوا ئەیەوێ کە ئەوەش ئەوەیە بەشداریی موسڵمانەکان بکەن تا بێنە ڕیزی ئەمان و بێ بە چاکترین ئوممەت، ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ ءَامَنَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم﴾ ئەگەر نامەدارەکان و بڕوایان بهێنایە، واتە ئەگەر هەموویان بڕوایان بهێنایە بە وێنەی بڕوای ئێوە ئەو باشتر بوو بۆیان، باشتر بوو لەو دەسەلاتوسەرۆکایەتیەی کەئێستاهەیانەلەناوژێردەستەکانیاندا و مەترسی ئەکەن لەنەمانی ئەگەر بێنە ڕیزی ئێوە، ئەوە باشتر بوو لەوەی کە ئەوانی لەسەرن و بە بڕوای ئەزانن، باشتر بووبۆیان لەجیهاندا، ڕزگاری ئەکردن لەودووبەرەکی و ئەو بۆچوونە هەڵانەی کەوان لەسەری، ڕژێم و بەرنامەیەکی ڕێك و پێکیان ئەبوو، بێگومان بۆ ڕۆژی دواییشان هەر ئەوە چاکترە، ئەم فەرموودەیە توانج و پلارێکی دڵ تەزێنی تیایە بۆیان، چونکە ئەوە نیشان ئەدات کە ئەوانە هەرچەند لافی بڕوا لێ بدەن و خۆیان بە بڕوادار دابنێن هیچ نرخی نیەو لای خوا بڕوادار نین. بەڵێ، ئەگەر بڕوایان بهێنایە ئەوە چاك بوو بۆیان، بەڵام هەمووشیان بێبڕوا نەبوون،

مِنۡهُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿١١٠﴾ لَن يَضُرُّوكُمۡ إِلَّآ أَذٗىۖ وَإِن يُقَٰتِلُوكُمۡ يُوَلُّوكُمُ ٱلۡأَدۡبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١١١﴾

---

بەڵكو ئەم بەم جۆرە بوون: ﴿مِنۡهُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾ هێندێ لەوان بڕواداران و بڕوایان هێنا، وەك(عبدالله كوڕی سەلام و ئەسەدی كوڕی عوبەیدو سەعلەبەی كوڕی شوعبەو كەعبی كوڕی مالیك)، ﴿وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ زۆربەی ئەوان لە فەرمان و گوێڕایەڵی خوا دەرچوون و بڕوایان نەهێنا. درەچوون و مل پێچیان كرد لەو بەڵێن و پەیمانەی كە خوا وەری گرت لە پێغەمبەران - درودی خوایان لێ بێ- دەرچوون لە فەرمانی خوا كە لەنامەكەی خۆیان هات و داوای بڕوا هێنانی لێ كردن بەم دواترین پێغەمبەرە(ﷺ)، دەرچوون لەوەی كە خوا ویستی و بڕیاری داكە دواترین پێغەمبەر لە نەوەی ئیسرائیل ڕەوانە نەكات، بێگومان ئەو نامەدارانە ــ واتە جوولەكەكانی مەدینە- تا ئەو كاتە هێزو دەسەڵاتێكی فراوانیان بوو، موسڵمانەكانی مەدینە لە چەند بارێكەوە پەیوەستیان بوو لەگەڵیان و هێندێ لەو موسڵمانانە بیم و ترسیان بوو لە دوژمنایەتی ئەو جوولەكانە، لەبەرئەوە قورئان ئەو جوولەكانەی بێنرخ كرد لەدڵی ئەو موسڵمانانەداو باقری دەرخستن كە ئەوانە بەهۆی بێبڕوایی و تاوانی زۆریانەوە لاوازن و خوا سەر شۆڕیی و ژێر دەستەیی لەسەر داناون، ئەفەرموێ: ﴿لَن يَضُرُّوكُمۡ إِلَّآ أَذٗىۖ﴾ هەرگیز ئەوانە زیانتان پێناگەیەنن مەگەر زیانێكی كەم و سووك، بە قسەو بە هەڕەشەو تانەو تەشەرو ئەو جۆرە شتانە كە هەر ئازارێكی دڵ و دەروونی تیایە، ﴿وَإِن يُقَٰتِلُوكُمۡ يُوَلُّوكُمُ ٱلۡأَدۡبَارَ﴾ ئەگەر تێ جەنگن و جەنگتان لەگەڵ بكەن هەڵدێن و پشتتان تێئەكەن، واتە ئەشكێن و دەرەقەتتان نایەن ﴿ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ﴾ واتە لەپاش هەواڵدان بە تێك شكانیان لە جەنگدا، ئینجا هەواڵتان ئەدەمێ بەوەی بەهەرحاڵ و لەسەر هەربار یارمەتی نادرێن و زاڵ ناكرێن. واتە تێجەنگن یان نا؟ ئەوە حاڵیانە. ئەم ئایەتە - وەك دەست نیشانمان بۆ كرد- هاتە خوارەوە لەبارەی جوولەكەكانی مەدینەوە:(بەنی قەینوقاع و بەنی نەضیرو بەنی قورەیزە وە جوولەكەكانی خەیبەر) هەر سێ مزگێنیەكە بەدی هات، بەم ڕەنگە ئەوانە نەیانتوانی زیان بگەیەنن بەو بڕوادارانە، مەگەر بە دەم و زمانە پیس و ناپاكەكەیان كە خستیانە كار بۆ ئازاردانی دڵی ئەو بڕوادارانە بە دەلەسەو فاك و فیك، لەكاتی تێجەنگاندا هەر تێك شكان و خۆیان بۆ نەگیرا،

﴿ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ أَيْنَ مَا ثُقِفُوٓا۟ إِلَّا بِحَبْلٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَحَبْلٍ مِّنَ ٱلنَّاسِ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْمَسْكَنَةُ﴾

---

ئیتر لەپاش ئەوەش هیچ کەس پشت گیریی لیّ نەکردن و یارمەتی نەدران لەلایەن هیچ کەسێکەوە هیچ ئالآیەکیان بۆ نەمایەوە کە هەڵی کەن: ﴿ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ﴾ هەڵدراوە بەسەریانەوە سەر شۆڕی و ژێر دەستەیی و دەورە دراون پیّی بەوێنەی هەڵدانی ماڵ و خێوەتێك بەسەریانەوە و دەور دانیان پیّی، یان سەر شۆڕیی و ژێر دەستەیی خراوەتە سەریان و نوسێنراوە پیّیانەوە و مۆر کراون پیّی ﴿أَيْنَ مَا ثُقِفُوٓا۟﴾ لە هەر شوێنێك بن و دەستکەون، کەواتە ڕزگار بوونیان نیە لەوە بە هیچ کلۆجێك ﴿إِلَّا بِحَبْلٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَحَبْلٍ مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾ مەگەر بەهۆی بەڵێن و پەنادانێك لەلایەن خواو لەلایەن مەردومەوە، واتە ئەوانە هەر بەش خوراو و ماف داگیر کراون لە هەر جێگەیەك بن، لەلایەن خۆیانەوە هۆی ڕزگاربوونیان نیەو ڕزگار نابن مەگەر بە پەیمان و بەڵێنێك لەلایەن خواوە، کە ئەوەش ئەوەیە خوا دایناوە لەشەریعەتەکەدا کە ئەگەر ئەوەلەن بەر حوکمی ئیسلام بوون ئەبێ مافیان بپارێزرێت و یەکسان بکرێن لەمافدا لەگەڵ موسڵمانان و بەهیچ ڕەنگ دەست درێژیان لیّ نەکریّ، مەگەر بەهۆی پەیمان و بەڵێنێك لەلایەن خەڵکیەوە کە ئەوەش ئەوەیە موسڵمانان بەپیّی شەریعەتی ئیسلام بەشدارییان کردوون لەژیان و مامەڵەو کڕین و فرۆشتن و گەلیّ کاردا بە هەموو ئازادیی و سەربەستیەکەوە، تەنانەت لەو کاتانەدا کە ئیسلام لەکاردا بووبیّ، واتە هەر چۆنیّ ئیسلام مافی تەواوی بۆ دانان و قەدەغەی کرد ژێر پیّکردنی مافیان، هەروەها موسڵمانانیش بەو پیّیە ڕەفتاریان لەگەڵ کردن، ئەوەیان لە سەرەتای ئیسلامەوە بۆ دامەزرا، ئەوەتا پێغەمبەر(ﷺ) هەر خۆی قەرزو مامەڵەی لەگەڵ کردن و شتی خۆی بەبارمتە لادانان، بەسە بۆ نموونە ڕووداوێك بگێڕینەوە کە لە کتێبە باوەڕپیّکراوەکاندا هاتووە وەك(رياض الصالحين) کە ئەفەرمویّ: جارێك قەرزی جوولەکەیەکی بەلاوە بوو، جوولەکەکە بەپیّی باوی پیسی خۆیان زۆر بەبیّ شەرمی و ناپیاوی و بەدەم درێژیی داوای قەرزەکەی کردەوە بە جۆریّ کاری کرد لە دڵی هاوەڵەکاندا نیازیان کرد هەڵسن بۆی سزای بدەن، لەپاش دا پێغەمبەر(ﷺ) بەپیّی باوی پاك و شیرینی خۆی جڵەوگیری کردن وتە بەناوبانگەکەی خۆی ئاڕاستەکردن: خاوەن هەق مافی قسە کردنی هەیە، لیّی گەڕێن، بەڵکو ئامۆژگاری ئەو بکەن کە

داواکردنەکەی بەباشی بکات، ئامۆژگاری منیش بکەن کەبەباشی هەقەی بدەمەوە!! هەروەها بەسە بۆ مێژوو ڕووداوێکی تریش باس بکەین هەر لەم بارەیەوە لە چەرخی جێنشینی دووەمدا: کە(ئیمامی عەلی) -خوا لێی ڕازی بێ- شتێکی گوم بووی خۆی ناسیەوە لەلایی جوولەکەیەك و نەیدایەوە، ئینجا(ئیمامی عەلی) شکاتی لێ کرد لەدادگای عومەر، لەسەرەنجامدا عەلی شایەتی نەبوو، عومەر ماڵەکەی دا بە جوولەکەکە! هەر لەو ڕووداوەدا ئەمەش هەیە کەلەکاتی محکمەکەدا عومەر بانگی عەلی کرد بە نازناوی(ابو الحسن) عەلیش بەوە تێك چووو فەرمووی: بۆچی فەرقمان ئەکەیت و ڕێزی من ئەگریت و بە نازناو بانگم ئەکەیت، بەناوە ڕووتەکەی خۆم بانگم بکەو بڵێ: عەلی!! ئینجا لەپاش ئەوە موسڵمانان ئەو ڕێبازەیان دایە بەرو مافی ئەو دوژمنانەیان پاراست تەنانەت لەو کاتانەشدا کە ئیسلام بە حوکمڕان نەما لەناو موسڵماناندا، ئینجا بەهۆی ئیسلام و موسڵمانانەوە ئەو پەنادان و پاراستنی مافەیان بۆ نیشت تا زۆربەی گەلانی جیهانیش بەو جۆرە ڕەفتاریان لەگەڵ کردن لە پاش ئەوەی کەلە هەموو لایەکەوە لە ژێر چەپۆکەدا بوون و ئەتارێنران، ئینجا لەوەش تێپەڕیان کرد تا ئەو ڕادەیە بە پیلانی دەوڵەتە گەورەکانی جیهان و لەپەنای ئەواندا میریەکیان بۆ فەراهەم هێنان لەناو جەرگەی خاکی ئیسلام دا لەپاش جەنگی جیهانی دووەم. ئێستا ئەو میرییە بچکۆلەی ئەوانە لەپەنای دەوڵەتە گەورەکانی ڕۆژئاوادا بە تایبەتی ئەمریکا سەریان بەرزکردووەتەوە بە ڕاست و بە چەپ و بە هەر چوار پەل ناوەستن خەریکی تاوان و دەست درێژین بەو جۆرەی کە جیهان ئەزانێ و ئەبینێ و پێویست بەباس ناکات، بەڵام هەموو کەس ئەزانێ ئەوە لە خۆیانەوە نیە و بە ئازایی خۆیان نیە، بەڵکو بەهۆی خەڵکیەوەیە و لە پەنای خەڵکیدایە، تا ڕۆژێ دێ ـ بە ئیزن و یارمەتی خوا ـ هیچ کەس فریایان ناکەوێ لەژێر هێرش و چەپۆکەی موسڵماناندا تۆڵەیان لێ ئەسێنرێ و لەناو ئەچن. ﴿وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ ئەو جوولەکانە لە هەڵس و کەوتیاندا گەڕانەوە بە خەشمێکی گەورە لەلایەن خواوەو شایستەی ئەوە بوون ﴿وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْمَسْكَنَةُ﴾ هەڵدرا بەسەریانەوە هەژاری دەروون و چاو برسێتی هەرچەند بە سامان و بە دەسەڵات بن، چوار دەور دراون بەوە، یان زەبوونی و ترسنۆکی دەروونیە کە پێیانەوە دەرئەکەوێ لە قسە و کردەوەیشیاندا، بە هەرکام مەبەست بێت جوولەکە وان،

ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿١١٢﴾ ۞ لَيْسُوا۟ سَوَآءً ۗ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُسَـٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١١٤﴾

---

**هۆی ئەوەش كەباس كرا ئەمەیە كە ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ﴾ ئەوەی كە باس كرا بۆیان بەهۆی ئەوەیە كە ئەوانە بێبڕوا بوون بە ئایەتەكانی خوا ﴿وَيَقْتُلُونَ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ﴾ پێغەمبەرانیان كوشت بە ناهەق ﴿ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ﴾ ئەو بڕوا نەهێنان و كوشتنە ناهەقەشیان بەهۆی ئەوەوە بوو كە ئەوانە یاخی بوون و مل پێچیان كرد لە فەرمانی خوا، بەهۆی ئەوەوە بوو كە هەمیشە دەست درێژییان ئەكردو خەریكی گوناهو خراپەكاری بوون، واتە ئەوانە لە یەكەمجارەوە دەستیان كرد بە گوناهو بێشەرعی، ئینجا ئەوەش ڕای كێشان بۆ گوناهە گەورەكان تا وایان لێ هات پێغەمبەرەكانیان كوشت و بڕوایان نەما بە ئایەتەكانی خواو بە تەواوی لە ئایین دەرچوون و بێبڕوا بوون، ئینجا ئەو گوناهو تاوان و بێبڕواییەش بوو بەهۆی ئەوە خوا ئەوەیان بەسەربێنێ كە باس كرا، بێگومان ئەو تۆڵە سەختە تایبەتی نیە بەو جوولەكانەوە، بەڵكو گشتیەو هەر گەل و تاقمێكی تریش كە ئەو هۆیانەیان تیا بەدی بێت خوا ئەو تۆڵەیان لێ ئەسێنێ، بوونی وێنەی ئەو هۆیانە لەناو بەناو موسڵمانەكانی ئەمڕۆدا شایستەی كردوون بە وێنەی ئەو سزاو تۆڵەی كە خوا دای بەسەر ئەو جوولەكانەدا، موسڵمانەكان لەپاش ئەوەی كە خوا سەری خستن و زاڵی كردن، بە هۆی گوێڕایەڵیان بۆ خوا، لەپاش ئەوە بەرەبەرە دەستیان كرد بە گوناهە بچووكەكان، ئینجا ئەوە ڕای كێشان بۆ گوناهی گەورەتر تا وایان لێ هات قورئانەكەی خواو ڕەوشتە پاكەكەی پێغەمبەریان فڕێدا، دووریان خستنەوە لە ژیانی خۆیان، ئینجا بەشی زۆریان هەر بڕوایشیان پێیان نەماو چەند ڕێبەران و بانگ كەرانی خۆیان كوشت، تا خوا خەشمی لێ گرتن و سەر شۆڕیی و ژێر دەستەیی و بێ دەسەڵاتی هەڵدا بەسەریانەوە، مافیان ژێر پێ كراو ماڵ و دارایی و نیشتمانیشیان داگیركرا وەك بە چاو ئەبینرێ، بەڵكو ئەگەر ورد بینەوە خراپتر لە جوولەكەیان بەسەرهات، ئەوەتا بەشێكی زۆر گەورەو گرنگ كەوتە ژێر دەستی دوژمن و**

بێگانەو بە تەواوی بەماڵاتو سەرو بەریانەوە قوت دران‌و ناوی ئیسلامیشی بەسەرەوە نەما، بەڵکو سەیرتر ئەوەیە کە پارچەیەکی زۆر بەنرخ‌و پیرۆز لە وڵاتەکەیان جوولەکە داگیری کرد ناوی ئیسلامی لێ سڕیەوەو ناوی خۆی خستە سەرو باقی ئەوە بە هەموو جۆر لاقرتی ئەکات بە بەناو موسڵمانەکان‌و ئەمان هەر ئەچنە پێشەوەو ئامادەن بۆ دۆستایەتی‌و ئەو جوولەکە بەد بەختانە هەر دەریان ئەکەن‌و ڕازی ئەکەن‌و ڕازی نابن لێیان!!

ئەوە باوی خوایەو باوی ئەویش گۆڕانی بۆ نیە، داخی سەخت تر ئەوەیە کە ئەم خەشم لێ گیراوانە کە بە ناوی ڕووت موسڵمانن هێشتا خۆیان بە موسڵمان دائەنێن‌و گلەیی ئەکەن لە خوا کە چۆن‌و لەبەرچی خوا یارمەتیان نادات؟!

ئەم چەند ئایەتی ڕابردووە هەرچەند باسی نامەدار ئەکات بە شێوەی گشتی‌و بەبێ دیاریی کردن، بەڵام لە تەفسیرەکەدا شوێنی زۆربە کەوتین‌و کە تایبەتیان کرد بە جوولەکەوە، چونکە بەو جۆرە ڕێك ترە لەگەڵ شوێن‌و ئایەتەکانی تردا کە وێنەی ئەم باسانەیان تیایەو تایبەتی ئەکرێن بە جوولەکەوە، لەبەر هێندێ لەو سیفەت‌و کردەوە پیسانە ـ وەك کوشتنی پێغەمبەران بێ ـ هەر لەوان ڕووی داو گاورەکان شتی وایان نەکردووە.

لەپێشەوە بە کورتی ئاماژەی کرد بەوەی کە هەموو ئەو نامەدارانە چوون یەك نین، بەڵکو هێندێ لەوان بڕواداران‌و زۆربەیان یاخین‌و لە سنووری خوا دەرچوون، ئینجا ئەوا لێرەدا باسی ئەو دەستە بڕوادارە ئەکات‌و بەڵێن ئەدا پێیان‌و ئینجا بەدوای ئەوەدا هەڕەشە ئەکات لە بێبڕواییان، ئەفەرموێ: ﴿لَيْسُوا سَوَآءً﴾ هەموو نامەدارەکان یەکسان‌و چوون یەکنین، واتە هەموو بێبڕواو یاخی نین، بەڵکو بڕوادارو پیاوچاکیان هەیە وەکو ئەفەرموێ: ﴿مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ﴾ لەناو نامەدارەکاندا دەستەیەك هەیە ڕاست‌و ڕێك لەسەر بڕواو گوێڕایەڵی بۆ خوا ﴿يَتْلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ﴾ ئایەتەکانی خوا ئەخوێنن لەکاتەکانی شەودا ﴿وَهُمْ يَسْجُدُونَ﴾ لەکاتێکدا کە نوێژ ئەکەن‌و خەریکن بە شەونوێژەوە کە نیشانەی ڕاستی‌و خوا ناسیانە ﴿يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ بڕوا ئەهێنن‌و بڕوایان هەیە بە خواو ڕۆژی دوایی ﴿وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾ فەرمان ئەدەن بە چاکەو جڵەوگیری ئەکەن لە خراپە ﴿وَيُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ﴾ بەبێ دواکەوتن چەسپانی ئەکەن لە هەموو جۆرە کردەوە باشەکاندا کە بۆیان بکرێ‌و بە دەستیانەوە بێت ﴿وَأُو۟لَٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ ئەوانە لە کۆمەڵی چاکانن بەلای خواوەو شایستەی ڕەزامەندی‌و وەسف‌و سەنای خوان.

وَمَا يَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ﴿١١٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَن تُغْنِىَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَـٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۚ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿١١٦﴾ مَثَلُ مَا يُنفِقُونَ فِى هَـٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَثَلِ رِيحٍ فِيهَا صِرٌّ أَصَابَتْ حَرْثَ قَوْمٍ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فَأَهْلَكَتْهُ ۚ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَـٰكِنْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿١١٧﴾

---

﴿وَمَا يَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُ﴾ هەر خێرو چاكەیەك بكەن هەرگیز بێبەش ناكرێن لە ئەجرو پاداشتەكەی، بەڵكو ئەجرو پاداشت بە تەواوی وەرئەگرن، دیارە ئەوانە لە خواترس و خۆپارێزەرن ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ﴾ خواش بە باشی زاناو ئاگایە بە لە خواترس و خۆپارێزەران، كەواتە كردەوە چاكەكانیان وەرئەگرێ و پاداشتی شایستەیان ئەداتەوە، ئینجا بەرامبەر ئەم خوا پێداوانە لە نامەدار، ئاماژە ئەكات بۆ بێبڕواو بەش بڕاوەكانیان، كە زۆر كەشخەو شانازییان ئەكرد بە ماڵ و سامانی زۆرو بەكوڕو ئەولادەوە، هیچیشیان فریایان ناكەنەون و دووچاری سزای ئاگری نەبڕواوە ئەبن، باسیان ئەكات بە شێوەی بڕیارو یاسایەكی گشتی بۆ هەموو بێبڕوایان كە ئەمان لێرەدا یەكەم و سەردەستەن، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ بێگومان ئەوانەی كە بڕوایان نەهێنا لەم جیهاندا ﴿لَن تُغْنِىَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَـٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا﴾ هەرگیز نە ماڵیان و نە ڕۆڵەكانیان سوودیان پێناگەیەنن و بەرگری هیچ شتێ لە سزایان لێ ناكەن لە لای خواوە ﴿وَأُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ﴾ ئەوانە هاوەڵ و هاوڕێكانی ئاگری دۆزەخ ئەبن، واتە ئەنووسێن بەو ئاگرەوە، ﴿هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ﴾ ئەوانە لەو ئاگرەدا ئەمێننەوە بە هەمیشەیی و بێبڕانەوە، بێگومان بێبڕوایان ماڵ و دارایی بەخت ئەكەن لە خێرو چاكەدا، ئیتر بە نیازی پیاوەتی و بەزەیی هاتنەوە بە هەژاراندا، یان بۆ ڕووپامایی و بە نیازی بڵاوبوونەوەی ناوو شۆرەت، یان نیازی خواو لەبەر خوا لە دەروونی

خۆیاندا، ئینجا لەوانەیە کەسێك گومان ببا بۆ کەڵك و سوودی ئەو جۆرە بەخت کردنانەو سوودو کەڵکی ئەو جۆرە ماڵ و دارایییانایان، جا لەبەرئەوە بێ کەڵکی و بێنرخی ئەوانەشی ڕوون کردەوە بەم چیرۆکە، ﴿مَثَلُ مَا يُنفِقُونَ فِي هَٰذِهِ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ وێنەو سیفەتی ئەو ماڵ و دارایییەی کە ئەو بێ بڕوایانە بەختی ئەکەن لەم ژیانی جیهانەدا، وێنەو سیفەتی ئەوە لە بێ کەڵکی و بێ سوودی دا: ﴿كَمَثَلِ رِيحٍ فِيهَا صِرٌّ﴾ وەك وێنەو سیفەتی بایەکە کە سەرماو سۆڵەیەکی زۆر سەختی پێوەبێ و ﴿أَصَابَتْ حَرْثَ قَوْمٍ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ﴾ دابێتی لە کشتوکاڵی تاقمێك کە ستەمیان لە خۆیان کردبێ بە بێبڕوایی و تاوان کردن ﴿فَأَهْلَكَتْهُ﴾ ئینجا ئەو باو سەرمایە کشتوکاڵەکەی لەناو بردبێ، واتە هەرچۆنێ گەل و تاقمێکی بێبڕوا کشتوکاڵێکی ببێ و خوا بە خەشمەوە بایەکی وای بۆ بنێرێ ئەو کشتوکاڵە لەناو ئەبات و خاوەنەکانی هیچ سوودی لێ وەرناگرن، هەروەها هەر بەخت کردن و بەخشینێ بکەن کە بەڕواڵەت باش بێت لێیان وەرناگیرێ، بای خەشمی خوا لەناوی ئەبات و بێ کەڵکی ئەکات، چونکە ئەو بەخشین و بەخت کردنە لە بڕواوە نەهاتووەو بەپێی بەرنامەی خوا نەکراوە، ئینجا ئەو بێبڕوایانە کە سوود وەرناگرن لە بەخشین و بەخت کردنەکەیان، وەك خاوەن کشتوکاڵە کە سووچ و خەتای خۆیانە ﴿وَمَا ظَلَمَهُمُ اللَّهُ﴾ خوا ستەمی لێ نەکردوون ﴿وَلَٰكِنْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ بەڵکو خۆیان ستەمیان لە خۆیان کردووە کە بڕوایان نەبووەو بەپێی بەرنامەی خوا ڕەفتاریان نەکردووە، چونکە خۆیان بە خواهیش و مەیلی خۆیان لائەدەن لەو بەرنامەی کە هەموو خێرو چاکەیەکی تیایە، خۆیان لادا لە ڕێی ڕاست و گومڕاییان بۆ خۆیان هەڵبژاردو دەستیان نەگرت بەو ئایین و شەریعەتەی کە تەنها ئەوە مایەی گەیشتن و پەیوەستیە بە خواوە، کەواتە کردەوەکانیان هەرچەندە بە ڕواڵەت خێرو چاکە بێت پچڕاوە لە خواو پەیوەندی پێوەنیە، دەی ئەبێ گەردی ئەو کردەوانە بچێ بەباو هەرچیان چاندبێ بسووتێ و بەرهەمیان نەبێ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا وَدُّواْ مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ ٱلْبَغْضَآءُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ وَمَا تُخْفِى صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ ۚ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١١٨﴾ هَٰٓأَنتُمْ أُوْلَآءِ تُحِبُّونَهُمْ وَلَا يُحِبُّونَكُمْ وَتُؤْمِنُونَ بِٱلْكِتَٰبِ كُلِّهِۦ وَإِذَا لَقُوكُمْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْاْ عَضُّواْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَنَامِلَ مِنَ ٱلْغَيْظِ ۚ قُلْ مُوتُواْ بِغَيْظِكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١١٩﴾

---

**ئینجا لە کۆتایی ئەم باسە دوورو درێژەی کە تێپەڕی کرد لە سورەتەکەدا، باس‌و بڕیارێك دەرئەکات سەبارەت بە لاریی‌و نالەباریی‌و بەدنیازی نامەدارەکان‌و بێ‌بڕواکان لەگەڵ بڕواداران‌و، کەواتە با ئەمانیش وریای خۆیان بن‌و هەرگیز لێیان ئەمین نەبن‌و نەیانکەن بە دۆستی گیانی بەگیانی خۆیان‌و نهێنی خۆیانیان لانەدرکێنن، ئەم تەمێ‌و ئاگادار کردنەوە ئاڕاستەی بڕواداران ئەکات بە شێوەیەکی گشتی هەمیشەیی، کەلە هەمووکات‌و ولاّتێکدا ڕاست‌و ڕەوایی ئەو هەواڵ‌و تەمێیە دەرئەکەوێ بۆ بڕواداران: ئەفەرموێ:** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ **ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە** ﴿لَا تَتَّخِذُواْ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ﴾ **دامەنێن بۆ خۆتان لە غەیری خۆتان دۆستی گیانی بە گیانی کەجێی ڕازو نیازتان بێت‌و نهێنی خۆتانیان لابدرکێنن، ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ چەند شتێك کە هۆی ئەم جلەوگیرییەن:**

١- ﴿لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا﴾ **ئەوانە قسووریان لێ ناکەن لە هیچ شەڕو خراپەو زیانێك، ئەوەی لە دەستیان بێت پێتان ئەکەن.**

٢- ﴿وَدُّواْ مَا عَنِتُّمْ﴾ **پێیان خۆشەو ئاواتە خوازی ناخۆشی‌و ناڕەحەتیتانن.**

٣- ﴿قَدْ بَدَتِ ٱلْبَغْضَآءُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ﴾ **بێ‌گومان خەشم‌و قینی بەتینیان لێتانە، بۆتان دەرکەوتووەو دەرئەکەوێ لە قسەکانیانەوە کەلە دەمیان دەرئەچێ.**

واته خەشم و دوژمنایەتیان ئەوەندە بەتینە، لەگەڵ ئەوەدا ئەیانەوێ بیشارنەوەو دەری نەبڕن، بەڵام خۆیان پێناگیرێ و دەمیان ئەترازێ و لە قسەکانیانەوە وەرئەگیرێ ﴿وَمَا تُخۡفِي صُدُورُهُمۡ أَكۡبَرُۚ﴾ لە کاتێکدا ئەو خەشم و دوژمنایەتیەی کەلە دڵەکانیاندایەو شاردومانەتەوە گەورەتر لەوەی کەلە دەمیانەوە دەرئەکەوێ ﴿قَدۡ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۖ﴾ بەڕاستی بەڵگەو نیشانە ڕوونەکانمان باس کرد بۆتان، بەڵگەو نیشانە لەسەر ڕاست و بەجێی جڵەوگیری لەخۆشویستن و دۆستایەتی دوژمنانی خواو پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر پێویستی ڕاستی لەئاین و دۆستایەتی بڕواداران و دوژمنایەتی دوژمنانیان ﴿إِن كُنتُمۡ تَعۡقِلُونَ﴾ ئەگەر ئێوە ژیربن. واتە ئەگەر ئێوە ژیربن ئەوەتان بەسەو ڕێی ڕاستی خۆتانی پێئەدەنە بەر ﴿هَٰٓأَنتُمۡ أُوْلَآءِ تُحِبُّونَهُمۡ﴾ بێدار بنەوە ئێوە ئەوان کە ئەوانتان خۆش ئەوێ ﴿وَلَا يُحِبُّونَكُمۡ﴾ لە کاتێکدا کە ئەوان ئێوەیان خۆش ناوێ ﴿وَتُؤۡمِنُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ كُلِّهِۦ﴾ ئێوە بڕواتان هەیە بە نامەی خوا هەمووی نەک وەک ئەوان کە بڕوای وایان نیە، ﴿وَإِذَا لَقُوكُمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا﴾ کاتێ ئەوان پێتان بگەن ئەڵێن: بڕوامان هێناوە ﴿وَإِذَا خَلَوۡاْ﴾ کاتێ لێتان جوێ بوونەوەو خۆیان کەوتنەیەک ﴿عَضُّواْ عَلَيۡكُمُ ٱلۡأَنَامِلَ مِنَ ٱلۡغَيۡظِۚ﴾ سەرە پەنجەکانی خۆیان ئەگەزن لەسەرتان لەبەر قین و خەشمیان لێتان ﴿قُلۡ مُوتُواْ بِغَيۡظِكُمۡۗ﴾ بڵێ پێیان: بمرن بە داخ و خەشمی خۆتانەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ بەڕاستی خوا ئاگاو زانایە بە هەر شتێ کە لەسنگ و دڵەکاندایە، واتە خوا زانایە بە شاراوەتر لەو کینەو داخ و خەشمەی کە ئێوە ئەیشارنەوە لە بڕوادارەکان و بەنهێنی لەناو خۆتاندا دەری ئەبڕن، کەواتە تۆڵەتان لێ ئەسێنێ.(ئیبن و عەباس) -خوا لێی ڕازی بێ- ئەفەرموێ: هێندێ لە موسڵمانان خزمایەتی و دۆستایەتی و سوێند خواریان هەبوو لەگەڵ جوولەکەکانی مەدینەدا، ئەم دوو ئایەتە لەگەڵ ئایەتی داهاتوودا هاتنە خوارەوە لەوان و ئەو جوولەکانەدا.(موجاهید) ئەفەرموێ: هاتنە خوارەوە دەربارەی هێندێ لە بڕواداران کە ئەو

تێکەڵی و دۆستایەتییەیان بوو لەگەڵ ناپاکەکانی مەدینەدا، چونکە دەربڕینی بڕوا بە ناپاکی کەلە ئایەتی دووەم دایە پیشەی ناپاکەکان بوو، بەڵام ـ وەك چەند جارێك وتمان ـ ئایەتەکان تایبەتی ناکرێن بە ڕووداوو هۆی هاتنە خوارەوەیانەوە، کەواتە وەکو زۆر بە ئەفەرموێ، چاکتر ئەوەیە کە ئەم دوو ئایەتەش تایبەتی نەکەین بە هیچ کامەوەو هەر بە شێوەی گشتی تەفسیریان بکەینەوە، ئەو سیفەتەی کەلە ئایەتی دووەم دا باسی ئەکات لە هێندێ لە جوولەکەکانیش دا بووە، کەواتە نابێ بە بەڵگە لەسەر تایبەتی کردنیان بە ناپاکانەوە، ئینجا بە هەر حاڵ و لەسەر هەربار ئەم ئایەتانە ـ وەك چەند ئایەتی تر ـ جڵەوگیری بڕواداران ئەکات بە دۆستایەتی و خۆش ویستن و پشت بەشتن بە بێبڕوایان کە دوژمنی خواو پێغەمبەرو قورئانی خوان. ئەمە جیاوازە لەگەڵ پێویست کردنی کردەوەی چاك و بەکارهێنانی ئەوپەڕی داد لەگەڵ ئەو بێبڕوایانەی کە جەنگ لەگەڵ موسڵمانان ناکەن و ئاوارەو دەربەدەریان نەکردوون و یارمەتی دژو دوژمنی موسڵمانانیان نەداوە، ئێمە با خۆشمان نەوێن و نەیان کەین بەبراو دۆستی گیانی خۆمان، لە هەمان کاتدا کردەوەو ڕەفتاری چاکیان لەگەڵ ئەکەین و داد بەکار نەهێنین و لەگەڵ ئەوانە بە پێی فەرمانی خواو پێغەمبەر(ﷺ). ئەم ئایەتانەو ئایەتەکانی تر هیچ خودپەسەندی و ڕەگەزایەتی تیانیە دەربارەی ئەو بێبڕوایانە، بەڵکو بەپێی فەرمانی خوا خۆپاراستن و خۆپارێزیی تیایە لەلایەن بڕوادارانەوە بۆئەوەی بڕواداران دوور بن لەشەڕیان و دووچار نەبن پێیانەوە، ئەوان خەتابارن کە ئەوەندە بەدکردارو بەدنیازن دەربارەی بڕواداران، ئێمەی بڕوادار درۆیان بۆ هەڵنابەستن، بەڵکو پەروەردگار هەواڵی پێ داوین کە ئەوانە بەو جۆرە پیس و دوژمنمانن دەی ئیتر چۆن ڕەوایە ئەوانەمان خۆش بوێ و بیانکەین بەدۆستی گیانی خۆمان و پشتیان پێببەستین و بیانکەین بەجێگەی ڕازو نیازی خۆمان!!

إِن تَمۡسَسۡكُمۡ حَسَنَةٞ تَسُؤۡهُمۡ وَإِن تُصِبۡكُمۡ سَيِّئَةٞ يَفۡرَحُواْ بِهَاۖ وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔاۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ﴿١٢٠﴾

---

ئایا ئێمە چۆن ئەوانمان خۆش بوێ‌و بە دۆستیان بزانین لە کاتێکدا کە ئەوان لەگەڵمان بەم جۆرەن کە خوا هەواڵمان ئەداتێ‌و ئەفەرموێ: ﴿إِن تَمۡسَسۡكُمۡ حَسَنَةٞ تَسُؤۡهُمۡ﴾ ئەگەر هەر چاکەو خۆشیەکتان پێبگات، ئەوان غەمبارو ناڕەحەت ئەکات ﴿وَإِن تُصِبۡكُمۡ سَيِّئَةٞ يَفۡرَحُواْ بِهَاۖ﴾ ئەگەر ناخۆشیەك دووچارتان ببێ، ئەوان بەوە گەش ئەبنەوەو پێیان خۆشە، بەڕاستی ئەوە ئەوپەڕی دوژمنایەتی‌و دڵپیسیە، ئیتر چۆن ئێمە دڵمان پاك بێت لێیان‌و بیانکەین بەدۆست‌و خۆشەویست؟!!

خوای میهرەبان هەرچۆنێ بڕوادارانی ئاگادار کرد بەسەر ئەوپەڕی دڵ پیسی‌و دوژمنایەتی بێبڕواکان دەربارەیان، هەروەها ئاگاداری کردن بەسەر ڕێی ڕزگار بوون لەشەڕو پیلانیان، ئاماژەی کرد بۆ چەك‌و قەڵغانی کە بەرگری پێبکەن لە خۆیان‌و بەربەستی پیلانی ئەوانی پێبکەن، فەرمووی: ﴿وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ﴾ ئەگەر ئێوە بە ئارام بن‌و خۆتان بگرن لەسەر گوێڕایەڵی خواو ئەرکی تێکۆشان لەڕێی خوادا، بەرامبەر پیلان‌و ئازاری ئەوان، خۆتان بپارێزن لەوەی کە خوا قەدەغەی کردووە لەسەرتان، ئەگەر ئێوە ئاوا بن ﴿لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔاۗ﴾ پیلانی ئەوان زیانی هیچ جۆرە شتێکتان پێ ناگەیەنێ‌و هیچ جۆرە زیانێکتان پێناگەیەنێ، نە زۆرو نەکەم، چونکە ئەو خۆگریی‌و خۆپاراستنە ئەیانخاتە سایەو پەنای خوا، هەکەسیش بکەوێتە سایەو پەنای هیچ شتێ ناتوانێ زیانباری بکات.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ﴾ بەڕاستی خوا بە دەسەڵات‌و بەزانین دەورەی داوە بە هەرچی کە ئەوان ئەیکەن، کەواتە ڕێی ڕزگار بوون لە پیلان‌و شەڕو خراپەی بێبڕوایان، چەك‌و قەڵغان بۆ بەرگرییان بریتیە لە خۆگریی‌و دامەزراویی لەسەر فەرمانبەری‌و گوێڕایەڵی خوا، نەك ڕووخان‌و شکان بەرامبەر پیلان‌و هێزی بێبڕوایان، خۆگریی‌و دامەزراویی لەسەر عەقیدەو ئایین، نەك واز هێنان‌و دەست نان بەئایین‌و عەقیدەوە لەبەر خۆپارێزی لەشەڕو خراپەی دوژمن، یا لەبەر دەست کەوتی خۆشەویستی‌و دۆستایەتی دوژمن، کە هەرگیز ڕاستیشمان لەگەڵ ناکەن لە دەربڕینی خۆشەویستی‌و دستایەتی دا، ڕێگەی ڕزگاریی‌و چەك‌و قەڵغان

خۆگریی و لەخوا ترسانە، یەکێتیو یەك گرتنی موسڵمانانە لەدەست گرتن بە ئایینی خوا کە هەر ئەوەش مایەی پەیوەستیە بە خواوە کە ئەم ئوممەتە بە درێژایی مێژووی هەرکاتێ دەستی گرتبێ بەو ئایینە پیرۆزەیەوە بەرێکی هەر زاڵو سەرکەوتوو بووە، بە پێچەوانەوە هەرکاتێ دەستی بە مایەی پەیوەستیە بە دوژمنانەوە، گوێی گرتبێ لە پەندو ئامۆژگاری ئەوان، ئەوانیان کردبێ بەجێی ڕازو نیازیانو دۆستو کۆمەكو پرس پێکراویان ئەو دوژمنانە بووبێ، هەرکات بەم جۆرە بووبن بەشیان هەر سەر شۆڕیی و داوماویی و بەش خوراویی بووە، مێژوویش شایەتی لەسەر ئەو باوی خوا، جا هەرکەس خۆی لەوە کوێر بکاتو ئەو کەسە چاوی هیچ نابینێ بێجگە لەوەی کە مایەی تێك شکانو سەر شۆڕییە.

لەم دواترین ئایەتەدا بەڵێنی دا ئەگەر بڕواداران خۆگرو لە خواترسو خۆپارێزەر بن پیلانی دوژمنان کاریان لێ ناکات، کەواتە ئەگەر وا نەبن کاریان لێ ئەکات، ئینجا بەدوای ئەو ئایەتەدا دەست نیشان ئەکات بۆ دوو ڕووداو کە ئەو باوی خوای تیا بەدی هات بە هەردوو جۆرەکەیەوە.

دەست نیشان ئەکات بۆ ڕووداوی(أحمد) کە بڕواداران زۆر بوون بەڵام هەموویان خۆگرو گوێڕایەڵ نەبوون بەهۆی ئەوە ئەو تێك شکانە ڕووی دا کە بەدرێژی باسی ئەکەین، بۆ ڕووداوی(بدر) کە موسڵمانەکان زۆر کەمتر و بێ دەسەڵات تر بوون، بەڵام هەموو خۆگرو گوێڕایەڵ بوون بەهۆی ئەوەوە خوا زاڵی کردن بە شێوەیەك مەردوم سەرسامە تیایدا. بێجگە لەوەش بەشی یەکەمی سورەتەکە تا ئەگاتە ئێرە باسی قۆناغی یەکەم ئەکات: قۆناغی بەربەرەکانێ و ئاژاوەو تێ جەنگین لەگەڵ دوژمندا بە قسەو بەدەم، ئینجا دێتە سەر قۆناغی دووەم کە قۆناغی بەربەرەکانێ و جەنگە بە شیرو تیرو خوێن ڕشتن، کەواتە لەم دووبارەوە پەیوەستیەکی بەهێز هەیە لە نێوان ئایەتەکانی ڕابردووو ئایەتەکانی داهاتوودا.

پێش ئەوەی دەست بکەین بە قۆناغی دووەم بەجوانی ئەزانم بە کورتی باسێکی لێ بوردنو چاوپۆشی ئیسلام بکەم کە ئاماژەی بۆکرد لەم چەند ئایەتەی دوایی قۆناغی یەکەمدا: فەرمانی دا کە موسڵمانان ئەو دوژمنانە نەکەن بە خۆشەویستو دۆستی گیانی بەگیانی خۆیان، بەڵام هانی نەدان لەسەر ئەوەی کە ڕەفتاریان لەگەڵ بکەن بەوێنەی کردەوەی ئەوان، بەم ڕەنگە ئەمانیش کینەو خەشمو پیلان بەکار بێنن لەگەڵیان، بەڵکو فەرمانی پێدان بە خۆپاراستنو دوور کەوتنەوە لەشەڕو پیلانو خراپەیان، فەرمانی دا بە خۆپاراستن لە پیلانی ئەوان نەك ئەمانیش پیلانو فێڵبکەن لەگەڵ ئەوان، بەڵکو بە

چاوپۆشی ئیسلام هاوکاری بکەن لەگەڵ مەردومدا، بە پاکی ئیسلام و خێر خواهی ئیسلام ڕەفتار بکەن، مەگەر ناچار بکرێن، بەم ڕەنگە جەنگیان لەگەڵ بکرێ، سزاو ئازار بدرێن لەسەر ئایین و عەقیدەکەیان، بەرگری بکرێن لەڕێی خوا، ڕێ بگیرێ لە بڵاوبوونەوەی ئایین و بەرنامەکەی خوا، ئەوکاتە داوایان لێ ئەکرێ لەلایەن خواوە کە جەنگ بەکەن لەبەر خواو لەڕێی خوادا، کۆسپ و گرێ لە ڕێی ئایینەکەی خوادا لابەرن، جەنگ بکەن لەبەر تێکۆشان لەڕێی خوادا، نەك لەبەر هیچ نیازو مەبەستێکی تر، لەبەر ویستنی خێرو چاکە بۆ ئادەمیزاد نەك لەبەر تۆڵەسەندن و داخی دڵڕشتن بەو کەسانەی کە سزاو ئازاریان داون، لەبەر نەهێشتنی ئەو کۆسپ و گرێیە کە بەرگری گەیشتنی ئەو خێرو ڕووناکیە نەکات کە خوا ناردی بۆ هەمووان، نەك لەبەر زاڵبوون و داگیرکردنی خاك و وڵات، لەبەر بەدی هێنانی ڕژێمێکی ڕێك و ڕاست هەمووان لەسایەی بحەسێنەوە بەدادو بەخۆشی و ئارام و ئاشتی، نەك بەرز کردنەوەی ئاڵایەکی نەتەوایەتی و دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتێك!!

ئەمەی کە گوترا شتێکی ڕاستە کە دەقی قورئان و حەدیسی پێهاتووە لە چەند شوێنێکدا، مێژووی ئەوانە شایەتەکە لە زەوی دا بەگوێرەی دەقی قورئان و حەدیس و ڕەوشتی پاکی پێغەمبەر(ﷺ) ڕەفتاریان کرد تا بوون بە ئاوێنەیەکی باڵانما بۆ قورئان و حەدیس و ئەم ئایینە پیرۆزە، بێگومان ئەم بەرنامە پیرۆزەو باش ترو پڕ سوود ترە بۆ جیهان و جیهانیان، هەرکەس بیەوێ بەرگری و بەربەستی بکات لە هەموو دوژمنێك دوژمنترە بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی، کەواتە پێویستە دەست بەستن و دوورخستنەوەو نەهێشتنی ئەو یەکەم دوژمنە ناپەسەندە.

ئەو یەکەم گەلی موسڵمانە بەسەرکردایەتی پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسان بەو ئەرکەو ئەو پێویستیەیان بەجێهێنا لە یەکەمجارەوە لە بەرزترین پلەو شێوەی دا، گەلی موسڵمان لە هەموو چەرخ و چینێکدا پێویستی سەرشانیەتی ڕێبازی یەکەم گەل و کۆمەڵ بداتە بەر، چونکە ئەو هەوڵ و تێکۆشانی ئەوانە ئەبێ هەر بکرێ و نەسڕاوەتەوە تا ئەم جیهانە هەیە

پێش ئەوەی دەست بکەین بە تەفسیری ئایەتەکان چاك وایە کورتەو پاڵفتەیەك باس بکەین لەبارەی ڕوداوی(احمد)ەوە، بەپێی ئەوەی کەلە کتێبە باوەڕپێکراوەکانەوە هاتووە: لەساڵی دووەمی کۆچی دا ڕووداوی(بدر) ڕووی داو خوا موسڵمانەکانی تیا زاڵکرد بە شێوەیەك وەك موعجیزە وابوو، لەسەر دەستی ئەو تاقمەکەمەی موسڵمانان قوڕەیشی شکاندو پێشەواو سەرۆکایەتی بت پەرستی و بێبڕوایی لەناو برد، ئینجا لەپاش

گەڕانەوەیان بەسەر شۆڕیی و شکاوی(أبو سفیان) بوو بەسەرۆك و دەمڕاستی قوڕەیش، ئینجا دەستی کرد بە هاندانی قوڕەیش بۆ هەق سەندنی خۆیان لە موسڵمانان، لە قوڕەیش و سوێند خوارەکانیان سێ هەزار چەکداری پێکەوە ناو لەمانگی شەوالی ساڵی سێیەمی کۆچی دا هێنانی بۆسەر مەدینە، ئافرەتیشیان لەگەڵ خۆیان هێنا بۆئەوەی لەبەر غیرەت و پاراستنی نامووسیان کەس ڕانەکات و پشت نەکاتە ئەو جەنگە، بەو جۆرە هاتن تا لەنزیکی شاخی(أحد)دا خستیان، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) پرسی کرد لە هاوەڵەکانی: ئایا لە مەدینە دەرچن و بەرەو ڕوویان بڕۆن، یان لە مەدینەدا بمێننەوە با ئەوان بێنە سەریان؟ خۆی ڕای لەسەر ئەوەبوو کە دەرنەچن و محکەم بکەن لە مەدینەدا، ئینجا ئەگەر ئەوان هاتنە سەریان کوچە و کۆڵانەکانیان لێ ئەگرن و ئافرەتانیش لەسەر بانەکانیاوە بیان دەنە بەر بەرد، سەرۆکی ناپاکەکان(عبدالله کوڕی ئوبەی کوڕی سولول) لەسەر ئەم ڕایە بوو، بەڵام تاقمێکی زۆر لە هاوەڵەکان ـ کە زۆربەیان گەنجەکان بوون و لەساڵی پێشوودا بەشدار نەبوون لە ڕووداوی(بدر)دا ـ ڕایان وا بوو دەرچن و داوای دەرچوونیان کرد زۆر بەسۆز و تاسەوە، دەکەوت کە زۆربە لەسەر ئەو ڕایەن، لەبەرئەوە هەڵسا و تەشریفی بردەوە بۆ ماڵەوە ـ ماڵی عائیشە خوای لێ ڕازی بێت ـ پۆشاکی جەنگی پۆشا و هاتەوە بۆ ناو هاوەڵەکانی، لە کاتێکدا کە ئەوان پەشیمان بوو بوونەوە و وتیان: ئێمە زۆرمان بۆ هێنا لەسەر بڕیاری دەرچوون! لەبەرئەوە هاتنە خزمەتی و وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر تۆ مانەوەت پێ خۆشە وابکە، ئەویش فەرمووی: هەر پێغەمبەرێك پۆشاکی جەنگ بپۆشێ و چەك هەڵبگرێ ڕەوا نیە بۆی دانانی هەتا خوا حوکمی خۆی ئەکات لە بەینی ئەو و دوژمنەکەی دا، بەوە دەرسێکی بەرزی دادان، کە پرس و ڕا وەرگرتن کاتی خۆی هەیە، کاتێ وەختەکەی دوایی هات و بڕیاردرا لەسەر بارێك تازە ئیتر نابێ بگۆڕرێ، بەڵکو ئەبێ لانەدرێ لەو بڕیارە و بەجێ بهێنرێ و پشت بە خوا ببەسترێ و هەرچی بکات ئەیکات. با بزانرێ کە پێغەمبەر(ﷺ) لەخەودا بینی کە کەڵی یەك کەوتە شمشێرەکەی و چەند ڕەشە وڵاخێکی بینی سەربڕان، خۆیشی دەستی خستە ناو زرێ و تاس کڵاوێکی قایم، خەو پەرژینی بەو جۆرە کرد: کەڵاییەکەی دانا بە شەهیدبوونی یەکێك لە ئەهل و بەیتی خۆی، ڕەشە وڵاخەکانی دانا بە چەند کەسێك لە هاوەڵەکانی کە شەهید ئەکرێن، زرێ قایمەکەشی دانا بە شاری مەدینە، کەواتە دواڕۆژی جەنگەکەش ئەبینێ لەگەڵ ئەوەدا هەر لەسەر بڕیاری شەڕاکە ڕۆیشت و تێکی نەدا، چونکە ئەیویست گەل و ئوممەتێك پێك بهێنێ و پەروەردەی بکات، گەل و

ئوممەتیش بە بەسەرهاتو ڕووداوو تاقی کردنەوە پێك دێتو پێ ئەگەیەنرێ، لە پاش ئەوە ئەیویست بە پێی قەزاو قەدەری خوا بجوڵێتەوە، ئەو قەزاو قەدەرەی کە هەستی پێکردبوو.

پێغەمبەر(ﷺ) لە مەدینە دەرچوو بە هەزار کەسەوە، (ئیبن و ئوم مەکتوم)ی دانا بەسەر مەدینەوەو کردی بە جێنشینی خۆی پێشنوێژی بکات بۆ ئەوانەی کە لە مەدینە ئەمێننەوە، ئینجا کاتێ گەیشتنە بەینی مەدینەو(أحد) سەرۆکی ناپاکەکان(عبدالله کوڕی ئوبەی) گەڕایەوە بەکۆمەڵێ لە شوێن کەوتوانیەوە کە نزیکەی یەك لەسەر سێی لەشکرەکە ئەبوون، بیانووی ئەوە بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) بەگوێی ئەوی نەکردو بەگوێی کوڕو کاڵ و گەنجەکانی کرد! ئینجا(عبدالله ی کوڕی عەمر) -خوا لێی ڕازی بێ- کەوتە شوێنیان بە تانەو تەشەر لێدانیان لەسەر ئەو گەڕانەوەیان، فەرمووی پێیان: وەرن جەنگ بکەن لە ڕێی خوادا، یا لەبەر بەرگری لە خۆتان و وڵاتەکەتان، ئەوانیش ئەیانوت: ئەگەر بمانزانیایە ئێوە جەنگ ئەکەن نەئەگەڕاینەوە! ئینجا ئەویش وازی لێ هێنان و گەڕایەوە لێیان بە جوێن و قسە پێوتنەوە.

تاقمێك لە موسڵمانە مەدینەییەکان داوایان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) کە داوای کۆمەکی بکات لەو جوولەکانەی کە سوێند خواریانن، ئەویش ڕێی نەداو نەیکرد، چونکە جەنگەکە جەنگی بەینی بڕواو بێبڕواییە کەواتە چۆن داوای بەشداریی و کۆمەکی بکرێ لە جوولەکە؟ سەرکەوتن و زاڵبوون لای خوایەو ئەو ئەیدا کاتێ کە پشت هەر بەو بەستراو دڵیەك باربوو بۆی، ئینجا ڕۆیشتن هەتا خستیان لەبەرزایی قەراخی شیوەکەی(أحد)و پشتیان کردە شاخەکە، جڵەوگیریی کرد لە جەنگ هەتا خۆی فەرمان ئەدات، ئینجا کاتێ ڕۆژ بوویەوە لەشکرەکەی ئامادەکردو دای مەزراندن،(عبدالله کوڕی جوبەیر)ی کرد بە سەرۆکی پەنجا کەس لە تیرەندازو داینان لە پشتی لەشکرەکەوەو فەرمانی پێدان کە بەهیچ کلۆجێك لە شوێنی خۆیان نەترازێن، فەرمانی دا کە بێبڕواکان بدەنە بەر تیر نەوەك بێن و پشتیان لێ بگرن، بەیداخی دا بەدەستی(مصعبی کوڕی عومەیر)ەوە، (زوبەیرو مونزیری کوڕی عەمر)ی کرد هەرکام بەسەرکردەی کۆمەڵێك بۆ ئەم لاو ئەولای لەشکرەکە، کوڕە گەنجەکان هاتن بۆئەوەی وەریان گرێ، هەرکامی بە منداڵ دانایە وەری نەئەگرت و هەرکامی بە شیاو ئەزانی وەری ئەگرت، قوڕەیش خۆیان ئامادە کرد بە لەشکرێکی سێ هەزار کەسیەوە کە دووسەد سواریان تیا بوو،(خالد)یان کرد بەسەر کردەی لای ڕاست و(عیکرەمەی کوڕی ئەبو جەهل) بۆلای چەپ، لەو ڕۆژەدا پێغەمبەر(ﷺ) شمشێرەکەی خۆی دایە دەستی(ئەبو دجانە) کە

پاڵەوانێکی چالاك بوو لە جەنگداو فیزو کەشخەی ئەنواند، یەکەم کەسێ لە بێبڕواکان کە هاتە پێشەوە(ئەبو عەمری فاسق) بوو کەلەسەر دەمی نەفامی دا پێیان ئەوت(ئەبو عەمری ڕاهیب) سەرۆکی ئەوس بوو لە مەدینەدا، ئینجا کاتێ ئیسلام هات بوو بە دوژمنێکی ئاشکرای پێغەمبەر(ﷺ) لە مەدینە دەرچوو، ڕۆشت بۆ ناو قورەیش‌و هانی دان لەسەر جەنگ کردن، بەڵێنی پێدان بەوەی کە ئەگەر خزم‌و گەلەکەی ئەم ببینن گوێڕایەڵی ئەبن‌و لەدەوری کۆئەبنەوە. لەبەرئەوە یەکەم کەس بوو هاتە پێشەوەو خۆی نیشاندا، ئینجا گەل‌و خزمەکەی پێیان ووت: ئەی فاسق خوا نەتژیەنێ‌و کەست پێ دڵخۆش نەکات، ئەویش ووتی: بەڕاستی لەپاش من گەلەکەم دووچاری شەڕ بوون، ئینجا جەنگ هەڵگیرساو موسڵمانەکان جەنگێکی بەتینیان کردو بەتایبەتی تاقمێکیان هونەری گەورەیان نواند، ئەوانەش وەك(حەمزەو عەلی‌و ئەبو دوجانەو تەڵحەو نەزیری کوڕی ئەنەس‌و سەعدی کوڕی ڕەبیع) -خوا لێیان ڕازی بێ-.

کە دەست کرا بە جەنگ لە بەیانی موسڵمانەکان زاڵ بوون، حەفتا کەسیان لە گەورەکانی ئەوان کوشت، دوژمنەکانی خوا شکان‌و ڕایان کرد، هەتا خۆیان کردەوە بە ناو کۆمەڵی ئافرەتەکانیاندا، ئافرەتەکانیش قۆڵیان لێ هەڵکردو وەك پیاوەکان بەرەو دوا ڕایان کرد، ئینجا کاتێ کە تیرەندازی موسڵمانەکان ئەوەیان بینی، ئەو شوێنەیان بەجێ هێشت کە پێغەمبەر(ﷺ) داینابوون تیای دا، وە بانگیان کردە یەکتر کە فریا کەون بگەن بە غەنیمەتەکەدا!! هەرچەند سەرۆکەکەیان فەرمانەکەی پێغەمبەری بیرخستنەوە سوودی نەبوو نەیان بیست، لایان وابوو کە بێبڕواکان تازە گەڕانەوەیان نابێ! لەبەرئەوە چوون بۆ چنینەوەی غەنیمەت‌و ئەو شوێنەیان چۆڵکرد، بێجگە لە سەرۆکەکەیان‌و چەند کەسێك، ئینجا لەوێدا(خالدی کوڕی وەلید) بەخۆی‌و سوارەکانیەوە هەڵمەتیانداو ئەو شوێنە گرنگەیان گرت‌و ئەو موسڵمانانەیان شەهید کرد! ئینجا بەهۆی ئەوەوە جەنگەکە گۆڕا بە پێچەوانەی ئەوساو سەر شێوا لە لەشکری موسڵمانەکان‌و ترس‌و بیم کەوتە ناویان، ژمارەیەکی زۆریان لێ شەهید کرا، بێبڕواکان پەلاماری ئەو شوێنەیان دا کە پێغەمبەری(ﷺ) تیا بوو کە لەوکاتەدا چەند کەسێکی کەمی بە دەوردا مابوو کە بە پەنجەری دەست ئەژمێرران، ئەوانەش -خوا لێیان ڕازی بێ- خۆیان فیدای کردو شەهیدکران، دەم‌و ڕووی بەفەڕی زامدار کراو ددانێکی شەهیدکرالەلای ڕاستیەوە، تاش کڵاوەکەی شکێنرا بەسەری دا، بێبڕواکان دایانە بەر هەتا کەوت بەسەر لاداو کەوتە ناو چاڵێ لەو چاڵانەی

کە(ئەبو عامیری فاسیق) لە پێشەوەهەڵی کەند بوون، سەرەکانی داپۆشین بۆئەوەی لەناکاودا موسڵمانەکانی تێکەون، ئینجا لەم کاتە زۆر سەخت‌و نالەبارەدا جارچیەك جاڕی داو ووتی بێگومان محمد کوژرا. ئەم جارە بە تەواوی هێزی بڕی لە دڵی موسڵمانەکان، بەهۆی ئەوەوە هێزی جەنگ کردنیان نەماو بەشکاوی پاشەکشێیان کرد بە نائومێدی‌و پەك کەوتوویی!

لەو کاتەدا(ئەنەس کوڕی نەزیر) نەشکا -خوا لێی ڕازی بێ- هەڵساو ڕۆشت بۆلای عومەرو تەڵحەو چەند کەسانێکی تر لە کۆچ کەران‌و مەینەییەکان کە بەداماویی‌و دەستە ئەژنۆ دانیشتبوون! پێی فەرموون: لەبەر چی دانیشتوون؟ ئەوانیش ووتیان: پێغەمبەر(ﷺ) کوژرا، ئەویش فەرمووی: دەی ئیتر ئێوە لەپاش ئەو ژیانتان بۆچیە؟ هەڵسن‌و بمرن لە سەر ئەوەی کە ئەوی لەسەر مرد، ئینجا پەلاماری دا بەرەو بێبڕواکان‌و توشی(سەعدی کوڕی مەعازبوو) بوو پێی فەرمووی: ئەی سەعد هاوار بۆ بۆنی بەهەشت کە دێت بەسەرمدا لە لای(أحد)ەوە، ئینجا دەستی کرد بە جەنگ هەتا شەهیدکرا، حەفتاو ئەوەندە زامی پێوە بوو، هیچ کەس نەی ئەناسیەوە بێجگە لە خوشکەکەی کە بەهۆی سەرە پەنجەکانیەوە ناسیەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ڕووی کرد بەرەو لای موسڵمانەکان، یەکەم کەسێك کە ناسیەوە لە دوورەوە(کەعبی کوڕی مالیك) بوو ئینجا بە بەرزترین دەنگ بانگی کرد: ئەی کۆمەڵی موسڵمانان، موژدە بێت ئەمە پێغەمبەرە(ﷺ)، ئینجا ئەویش بەدەست ئاماژەی بۆکرد کە بێدەنگ بە، موسڵمانەکان کۆبوونەوە بە دوای داو لە خزمەتی دا ڕۆشتن بەرەو شیوەکەو ئینجا بەرز بوونەوە بە شاکەداو لەوێدا پێغەمبەر(ﷺ) گەیشت بە(ئوبەی کوڕی خەلەف) سواری ولاغێك بوو کە ناوی(عود)بوو، لە مەککە دایبەستبووو ئەیوت‌و بە سواری ئەمە محمد ئەکوژم، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی بیستەوەو فەرمووی: نەخێر من ئەو ئەکوژم ـ إنشا ءالله ـ ئینجا لەوێدا پێی گەیشت شمشێرەکەی وەرگرت لە(حاریسی کوڕی سەمحە)و ملی(ئوبەی) پێ زامدار کرد، ئینجا ئەوەیش وەك گا بۆڕاندی، بێگومان بوو کە بەوە ئەمرێ، چونکە کاتی خۆی لە مەککە خەوی دیبوو لە خەوەکەی دا پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووبوو کە من تۆ ئەکوژم، بەهۆی ئەوەوە بڕوای وا بوو کە ئەیکوژێ‌و لەناو ماڵ‌و منداڵی دا گێڕابوویەوەو وتبووی کە من محمد وای پێ وتووەو بێگومان ئەم کوژێ، چونکە محمد هەرگیز درۆناکات، خەوەکەشی بەدی هات‌و بەم زامە ڕۆیی لەڕێی گەڕانەوەدا! (ئەبو سوفیان) لەسەر شاخەکەوە بانگی کرد: ئایا(محمد)تان لەناودایە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: وەڵامی مەدەنەوە، ئینجا ووتی: (ئەبوبەکر)تان لەناودایە؟ هەر وەڵامیان نەدایەوە، ئینجا

ووتی:(عومەری کوڕی خەتاب)تان لەناودایە؟ پرسیاری هەر لەم سیانە کرد، ئینجا ڕووی کردە کۆمەڵەکەی و ووتی: بزانن کە ئەم سیانەتان لەناوبردووە، ئینجا لەوێدا حەزرەتی عومەر -خوا لێی ڕازی بێ- خۆی پێنەگیراو ووتی: ئەی دوژمنی خوا بەڕاستی ئەو سیانەی کە باست کردن ماون، ئەوەی دڵت غەمباربکات هێشتوویەتیەوە! ئینجا ووتی: لەناو کوژراوەکاندا هینی وا هەیە لەپاش دەستکاری لەشی کراوە بەبڕین و لەت کردن، نە فەرمانم بەوە داوە و نە پێشم ناخۆش بووە(مەبەستی ئەو کردەوە پیسەبوو کە هیندی ژنی کردی دەربارەی جەستەی پیرۆزی حەرزەتی حەمزە، کەلە پاش شەهید بوونی سکی دڕی و جگەری دەرهێنا و جوی و تفیەوە!) ئینجا(ئەبو سوفیان) ووتی:(أعل هبل) واتە ئەی(هوبل) کە بتی ئەوان بوو بڵند بە! پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا وەڵامی نادەنەوە؟ ئەوانیش عەرزیان کرد بەچی وەڵامی بدەینەوە؟ فەرمووی: بڵێن:(الله أعلى وأجلّ) خوا بڵندو گەورەترە لە هەموو شت و لە هەموو کەس، ئینجا ووتی:(إن لنا العزى ولا عزى لكم) بێگومان ئێمە(عوزا) مان هەیە و ئێوە(عوزا)تان نیە! پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: ئایا وەڵامی نادەنەوە! ئەوانیش وتیان بەچی وەڵامی بدەینەوە؟ فەرمووی بڵێن:(الله مولانا ولا مولى لكم) خوا دۆست و یارمەتی دەری ئێمەیە و ئێوە یارمەتی دەرتان نیە، ئینجا(ئەبو سوفیان) ووتی: ئەم ڕۆژەمان لەباتی ڕۆژی(بدر)، جەنگ بە نۆبەیە، ئینجا(عومەر) فەرمووی: نەخێر وەك یەك نین. کوژراوانی ئێمە لە بەهەشت دایە و کوژراوانی ئێوە لە ئاگردایە.

کاتێ کە جەنگەکە دوایی هات بت پەرستەکان ڕۆشتن، ئینجا موسڵمانەکان گومانیان وا برد کە نیازی مەدینەیان کردووە بۆ گرتنی ژن و منداڵ و تاڵانی ماڵ و سامان، بەهۆی ئەوەوە غەمیان لێهات، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بە(علی) -خوا لێی ڕازی بێت- بڕۆ و شوێنیان کەوە تا بزانە چی ئەکەن و نیازی چیان هەیە، ئەگەر سواری حوشترەکانیان بوون و وڵاغە سوارییەکانیان ئەدەنەبەر ئەوا نیازی مەککەیان کردووە، ئەگەر سواری وڵاغەکانیان بوون و حوشترەکانیان ئەدەنە بەر ئەوا نیازی مەدینەیان کردووە. سوێند بە کەسێ گیانی منی بە دەستە ئەگەر نیازی مەدینەیان کردبێ ئەڕۆم بۆیان و بەرهەڵستیان ئەوەستم و ئەجەنگم لەگەڵیان، عەلی ئەفەرموێ: دەرچووم و کەوتمە شوێنیان و بەو نیشانەدا بۆم دەرکەوت کە بۆ مەککە ئەگەڕێتەوە. ئینجا کاتێ کە ئەگەڕێتەوە لە ڕێگەدا لەناو خۆیاندا ئەکەونە مشت و مڕو سەرزەنشتی یەکترو هێدێکیان ئەڵێن: هیچیان نەکرد، داتان لەدەسەڵات و شەوکەتیان، لەپاشدا بەجێتان هێشتن لەکاتێکدا کە چەند سەرۆکێکیان ماونەتەوە و خەڵکتان بۆ کۆ

ئەکەنەوە، کەواتە بگەڕێنەوە هەتا لە ڕیشەیان ئەهێنن، ئینجا ئەو قسەو باسە ئەگات بە پێغەمبەر(ﷺ) ئینجا ئەویش جاڕ ئەدات بانگی موسڵمانەکان ئەکات‌و فەرمان ئەدات بە ڕۆیشتن بۆ بەرەنگاری دوژمن‌و ئەفەرمووێ: هەر ئەوانە بێت لەگەڵمان کەلە جەنگەکەدا بوون، ئینجا(عبدالله ی کوڕی ئوبەی) ئەڵێ: من لەگەڵت دێم، ئەویش ئەفەرمووێ: نەخێر نابێ بێیت، ئینجا ئەوانە کە بەشداری جەنگەکە بوون بەو هەموو ترس‌و زامە سەخاتنەوە دێنە پێشەوەو ئەڵێن: بیستمان‌و گوێڕایەڵین، بەس(جابری کوڕی عبدالله) -خوای لێ ڕازی بێت- ئەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ڕۆژی(احد)دا باوکم داینام بە دیاری کچەکانیەوە، من پێم خۆشە ئامادە بم لەگەڵ تۆ لە هەر جەنگێك کە تۆی تیا بێ، کەواتە ئیزنم بدە با بێم، ئەویش ئیزنی دا، ئینجا هەموورۆیشتن تا گەیشتنە شوێنی کە ناوی(حمرا ءالاسد)ە لەوێ دا(معبدی ئەبو معبدی خوزاعەیی) بە موسڵمانێتی دێت بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، ئینجا ئەمیش فەرمانی پێ‌ئەدا کە بچێتەوە بۆلای(ئەبو سوفیان)و بیترسێنێ‌و پەشیمانی بکاتەوە لە نیازی گەڕانەوەی بۆ جەنگ، بەڵکو بڕواتەوە بۆ مەککە، ئینجا ئەمیش ئەگەڕێتەوە بۆ لای‌و ئەویش نەیزانیوە بە موسڵمان بوونی، ئەڵێ: ئەی(معبد) دەنگ‌و باس چیە؟ ئەمیش ئەڵێ: محمدو هاوەڵەکانی زۆر بەداخ‌و بڵێسەیان دێت لێتان، بەلەشکرێکەوە هات کە هێشتا لەشکری وای نەبووە، ئەوانەش کە نەهاتبوون پەشیمان بوونەتەوە لەو نەهاتنەو بە تێکڕایی هاتن، ئینجا(ئەبو سوفیان) ئەڵێ: دەی چی ئەڵێیت؟ ئەویش ئەڵێ: بەڕاستی من ڕام وایە بگەڕێیتەوە بۆ مەککە،(ئەبو سوفیان)یش ئەڵێ: سوێند بە خوا ئێمە هەموو بڕیارماندا کە بگەڕێینەوە سەریان تا لە ڕیشەیان ئەهێنین، ئەمیش ئەڵێ: شتی وا نەکەیت بەڕاستی من بەڕاستی ئامۆژگاریت ئەکەم! ئەوانیش ئەگەڕێنەوە بۆ مەککە، لە ڕێگەدا تووشی یەکێ لە بت پەرستان دێت کە نیازی مەدینەی هەیە،(ئەبو سوفیان) پێی ئەڵێ: هەواڵێکم هەیە بۆ لای محمد ئەگەر بیگەیەنی‌و بێیتەوە بۆ مەککە حوشترەکەت بۆ بار ئەکەم لە مێووژ. ئەویش ئەڵێ: باشە، ئەڵێ: ڕایگەیەنە بە محمد کە ئێمە بڕیارمان داوە کە بگەڕێینەوە سەریان تا خۆی‌و هاوەڵەکانی لە ڕیشە ئەهێنین، ئینجا کاتێ کە ئەو کابرا ئەو هەواڵە ئەگەیەنێ پێیان ئەوانیش ئەڵێن:(حسبنا الله‌و نعم الوکیل). خوامان بەسەو خوا وەکیلی چاکە بۆمان. ئەو هەواڵە هیچ نایانترسێنێ. سێ ڕۆژ لەو شوێنەدا ئەمێننەوەو چاوەڕوانیان ئەکەن، لە پاشدا ئەزانن کە گەڕاونەتەوە بۆ مەککە، ئەمانیش ئەگەڕێنەوە بۆ مەدینە.

ئەم کورتەیە کە باس کرا لەبارەی ئەو جەنگەوە زۆر لە بەسەرهاتو ڕووداوەکانی تیا نەبوو، لەبەرئەوە هێندێکی گرنگیان ئەهێنین بەدوای ئەو باسەدا تا باشتر شێوە ڕاستەقینەکەی ئەو جەنگەمان بۆ دەرکەوێ: لەو کاتە سەختو سامناکەدا کە هات بەسەر موسڵمانانو هەموو ژیرێکی سەرسامو سەرگەردان کرد، لەو کاتە سەختەدا موسڵمانەکان پتر بڵاوبوونەوەو پێغەمبەر(ﷺ) تەنیا کەوت(عەمری کوڕی قمیئە) پەلاماری پێغەمبەری دا(ﷺ) لەو کاتەدا(ئومو عمارە) -خوای لێ ڕازی بێت- بە چاوەوە بوو کە ئەوەی دی بە شمشێرەوە بەرهەڵستی ئەو پیسە وەستاو چەند جارێ دای لێی، بەڵام زرێو تاسەکەی نەیهێشت کاری لێ بکاتو ئەو بۆی ڕێك کەوتو زامێکی بەتینی لەم کرد. لەو کاتەدا(ئەبو دوجانە) هاتە پێشەوە پشتی خۆی کرد بە قەڵغان بۆ هەر تیرو بەردێ کە بهاتایە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) بە هیچ ڕەنگ جوڵەی نەئەکردونەی ئەهێشت پێغەمبەر(ﷺ) دەرکەوێو هیچ شتێکی بەرکەوێ.(تەڵحەی کوڕی عەبدوڵلا) هاتو خۆی کرد بە قەڵغان هەتا ئەوەندە زامدار بوو لە هۆشی خۆی چوورو کەوت،(ئیبنو حەبان) حەدیسێ ئەهێنێ لە دایکی ئیمانداران(عائیشە)وە کە ئەفەرمووێ: ئەبوبەکری باوکم ووتی: من یەکەم کەسێك بووم کە گەڕامەوە بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) کە تەماشام کرد یەکێ لەبەردەمی دا وەستاوەو بەرگریی لێ ئەکات، ئەیپارێزێ. منیش لە دوورەوە ووتم: دەی(تەڵحە) بێت، باوكو دایكم بە قوربانت بێت، دەی(تەڵحە) بێت، دایكو باوکم فیداکارت بێت! ئینجا تەماشام کرد(ئەبو عوبەیدە) وەك باڵدار بە چەسپانی هات بە دوامداو هەردووکمان گەیشتینە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەزانین پیاوەکە(تەڵحە) بوورو کەوتووە لەبەردەمی دا، ئینجا پێی فەرموویین: براکەتان بگرن بەڕاستی خۆی شایستە کردو ئەوەی لەدەستی هات کردی، ئینجا ئەزانین کوڵمی پێغەمبەر(ﷺ) زامدار کراوەو ئەڵقەیە لە ئەڵقەکانی تاسەکەی گوم بووە لە گۆنایدا،(ئەبو بەکر) ئەفەرمووێ: دەست بەجێ پەلامارمدا کە ئەو ئەڵقەیە دەربێنم،(ئەبو عوبەیدە) ووتی: سوێندت ئەدەم بە خوا لێی گەڕێ بۆ من. ئەفەرمووێ: ئینجا(ئەبو عوبەیدە) قەپی کرد بە تیرەکەدا بە ددانیو وورده وورده جوڵە جوڵی پێکرد تا پارچەیەکی دەرهێناو ددانێکی شکا، ئینجا منیش چووم کە ئەو پارچەکەی تری دربێنم،(ئەبو عوبەیدە) سوێندی دامەوە کە خۆی ئەویش دەربێنێ، ئەویشی هەر بەو جۆرە دەرهێناو دانێ تریشی شکا، ئینجا چووینە سەر(تەڵحە) بۆ چارەسەرو تیماری کە سەرنجمان دا چوارده پازده زامی پێوەیە!(عەلیو فاتمە) -خوای لێیان ڕازی بێت- دەستیان کرد بە شۆرینی زامەکەی پێغەمبەر(ﷺ) ئینجا کە

خوێنەکەی نە ئەوەستایەوە پارچە حەسیرێکیان هێنا و سووتاندیان و خۆڵەکەیان دا لە زامەکەی تا خوێنەکەی وەستایەوە.(مالیکی باوکی ئەبو سەعید) -خوای لێ ڕازی بێت- زامەکەی مژیو دەمی پیا گرت تا پاکی کردەوە بە دەمو خوێنەکە چووە دەمی، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خوێنەکە بتفەرەوە. ئەویش ووتی: والله ی هەرگیز نایتفمەوەو ڕۆیشت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەرکەس ئەیەوێ تەماشای پیاوێکی بەهەشتی بکات با تەماشای ئەمە بکات.

(ئیمامی موسلیم) حەدیسێ ئەهێنێ کە پێغەمبەر(ﷺ) لەو جەنگەدا بە تەنیا ئەمێنێتەوە لەگەڵ حەوت کەس لە ئەنصارو دوو کەس لە کۆچ کەران، ئینجا کاتێ بێباوەڕەکان پەلاماری ئەدەن ئەفەرمووێ: ئایا کێ ئەمانە ئەگێڕێتەوە لێمو بەهەشت بۆ ئەو ئەبێت؟ یەکێ لە ئەنصارەکان ئەچێتە پێشەوەو جەنگیان لەگەڵ ئەکات هەتا شەهید ئەکرێ. هەروەها تا هەر حەوت کەسەکە شەهید ئەبن، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێ: دادمان بەکار نەهێنا لەگەڵ هاوڕێکانمان، ئینجا(تەڵحە) بەر هەڵستیان ئەوەستێ هەتا دووریان ئەخاتەوە لێی،(ئەبو دوجانە)ش پشتی ئەکات بە قەڵغان بۆی وەك باسمان کرد، هەتا ئەو تەنگیو تەنگانەیە نامێنێ، شەکەتیو ماندوویی پێغەمبەر(ﷺ) ئەگاتە ڕادەیەك لەوکاتەدا کە بەرز ئەبێتەوە بۆ سەر شاخەکە، ئەیەوێ سەرکەوێ بەسەر بەردێکی گەورەدا کەچی ناتوانێ هەتا(تەڵحە) پشتی بۆ دائەنەوێنێ، لەو کاتەدا نوێژ دێتە پێشەوە بە دانیشتان پێش نوێژیەکەیان بۆ ئەکات. هێندێ لە ڕووداوەکانی ئەو جەنگە ئەمەیە: کە(حەنزەڵەی ئەنصاری) کە نازناوە بە(حەنزەڵەی الغسیل) هەڵمەت ئەبات بۆ(ئەبو سوفیان)، ئینجا کاتێ بەگیری ئەهێنێ(شدادی کوڕی ئەسوەد) پەلاماری ئەداتیو شەهیدی ئەکات. ئەو شەهیدە لەشی گران ئەبێت، چونکە لەو کاتەدا کە دەنگی جەنگ ئەبیستێ لەگەڵ خێزانی دا ئەبێت، فریای خۆ شۆرین ناکەوێو هەر بە لەش گرانی ئەکەوێتە جەنگەکە تا شەهید ئەبێ بەلەش گرانی، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ئەبینێ کە مەلائیکە ئەیشۆرن، شەهیدیش ناشۆردرێ، لەبەرئەوە سەرسام ئەبێ لەو شۆرینەو ئەفەرمووێ: پرسیار بکەن لە خێزانی کە کاری ئەو چی بووە؟ خێزانیشی هەواڵ ئەدات کە بەو جۆرە پێکەوە بوونو فریای خۆ شۆرین نەکەوت!! کەواتە شۆرینی مەلائیکە لەبەر لەش گرانیەکەی بووە.

(زەیدی کوڕی سابت) ئەفەرمووێ: لە ڕۆژی(أحد)دا پێغەمبەر(ﷺ) ناردمی هەواڵی(سەعدی کوڕی ڕەبیع)ی بۆ بزانم، ئەفەرمووێ: منیش چووم لەناو شەهیدەکاندا

ئەگەڕام و دۆزیمەوە لە دواگیاندا بوو، پێم ووت: پێغەمبەر(ﷺ) سەلامی لێ ئەکردی و ئەیفەرموو: هەواڵی خۆیم پێبدا کە ئایا چۆنە؟ ئەویش فەرمووی: سەلام لەسەر پێغەمبەر بێت عەرزی بکە کە بۆنی بەهەشت ئەکەم، بڵێ بە خزم و کەس و کارم تا یەکێکیان گیانی تیا بێت و بیەڵن هەر شتێ ڕوو بکاتە پێغەمبەر هیچ عوزرو بەهانەیەکیان نابێ لای خوا. ئیتر دەست بەجێ گیانی دەرئەچێ -خوای لێ ڕازی بێت-.

یەکێ لە هاوەڵی کۆچ کەران ڕائەبووری بەلای یەکێ لە هاوەڵی ئەنصاری کە خەڵتانی خوێن ئەبێ، ئینجا پێی ئەڵێ: ئەی فلان ئەزانی کە پێغەمبەر شەهید کرا؟ ئەویش ئەفەرمووێ: ئەگەر ئەو شەهید کرابێ بێگومان ئەو گەیشتووە بە جێی خۆی و ئەوەی لەسەری بوو گەیاندی، دەی ئێوەش جەنگ بکەن لەسەر ئایینەکەی.

(عبدالله ی کوڕی عەمر) ئەفەرمووێ: لەپێش جەنگی(أحد)دا(موبەشیری کوڕی مونزیر)م بینی لە خەودا پێی ووتم: لەم ڕۆژانەدا دێیت بۆلامان، منیش ووتم: تۆ لە کوێیت؟ ئەویش ووتی: من لە بەهەشتدام، ئەگەڕێین تیای دا چۆن ئارەزوو بکەی. منیش ووتم: تۆ شەهید کرای لە ڕۆژی(بەدر)دا؟ ئەویش ووتی: بەڵێ. لەپاشدا زیندوو کرامەوە، (عبدالله) ئەفەرمووێ: ئەو خەوەم باس کرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش فەرمووی: ئەوەیە شەهیدیی ئەی(ئەبو دوجانە).

(خیسمە) ئەفەرمووێ: لە خەودا کوڕەکەم بینی کەلە(بەدر)دا شەهیدکرا بوو لە جوانترین شێوەدا بە بەهەشتدا ئەگەڕا لە ناو باخات و ڕووبارەکانی دا، ووتی پێم: وەرە بۆ لای ئێمە بە خۆشی ڕابوێرین لەبەهەشتدا، ئینجا هاتمە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) ئەم خەوەم بۆ گێڕایەوە و عەرزم کرد داوام بۆ بکە لە خوا کە شەهیدیم بە نسیب بکات و هاوڕێتی سەعدی کوڕم لە بەهەشتدا، ئەویش داوای بۆ کردم، ئینجا(خیسمە) لەو جەنگی(أحد)ەدا شەهید کرا.

(عبدالله ی کوڕی جحش) لەو ڕۆژەدا ووتی: ئەی خوایە داوات لێ ئەکەم کە سبەینێ جەنگ بکەم لەگەڵ دوژمناندا، ئینجا بم کوژن و سکم هەڵدڕن و لوت و گوێم ببڕن، ئینجا تۆیش لە ڕۆژی دواییدا پرسیارم لێ بکەیت کەلە چی دا وام بەسەر هات؟ منیش بڵێم لە ڕێی تۆدا!

(عەمری کوڕی جەموح) پیاوێکی زۆر شەل بوو، چوار کوڕی گەنجی بوو کە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) ئەچوون بۆ هەر جەنگێ کە ڕووی بدایە، ئینجا لە جەنگی(أحد)دا ویستی کە ئەویش دەرچێ بۆ ئەو جەنگە، ئینجا کوڕەکانی پێیان ووت: باوکە تۆ خوا جەنگی لەسەر هەڵگرتووی، کەواتە تۆ دانیشە ئێمە لەباتی تۆ ئەچین و پێویستی تۆ دەرئەکەین، ئینجا

ئەویش هات بۆ شکات لێیان لە خزمەت پێغەمبەردا، ووتی: ئەمانە ڕێم لێ ئەگرن کە لەگەڵ تۆ بێم، سوێند بە خوا من بەهیوام شەهید بکرێم، ئینجا ئەم پێ شەلەم بخەمە ناو بەهەشت، پێغەمبەریش(ﷺ) پێی فەرمووی: تۆ خوا جەنگی لەسەر هەڵگرتووی، فەرمووی بە کوڕەکانیشی: چیتان بەسەریەوە؟ بەڵکو خوا شەهیدیی بە نسیب بکات، ئینجا لەگەڵیان ڕۆشت و شەهیدکرا! (یەمانی باوکی حوزەیفە) لەو ڕۆژەدا کەوتە ناو کوڕو نەناسرا، بەهۆی ئەوەوە موسڵمانەکان خەریکی کوشتنی بوون،(حوزەیفە)ش سەرنجی ئەدان و بانگی کردن ئەوە باوکمە نەکەن، ئەوانیش لە قسەکەی نەگەیشتن هەتا کوشتیان. ئینجا ووتی خوا لێتان ببورێ: ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ویستی خوێنەکەی بدات،(حوزەیفە)ش ووتی: ئەوا خوێنەکەم بەخشی بە موسڵمانان، بەهۆی ئەوەوە(حوزەیفە) ڕێزی زیاتر بوو لای پێغەمبەر(ﷺ).

لەپاش شەهید بوونی حەرزەتی(حەمزە) -خوای لێ ڕازی بێت-(هیندی ژنی ئەبو سوفیان) سکی دڕی و جگەری دەرهێنا و خستیە دەمی و جوی و بۆی نەخورا تفیەوە. لە پاشدا پێغەمبەر(ﷺ) کە هات و جەستەی پیرۆزی(حمزە)ی بینی زۆر غەمبار بوو و فەرمووی: هەرگیز ئێشی وام پێناگەیەنرێ، هیچ کاتێ هیچ هەڵوێستێکم نەبووە کە لەم هەڵوێستە ناخۆش ترو خەشمناک تر بێ. ئینجا فەرمووی: ئایا هیچی لە جگەری خواردووە؟ عەرزیان کرد نەخێر، فەرمووی: خوا نایەڵێ هیچ شتێك لە(حەمزە) بچێتە ئاگر. ئینجا فەرمانی دا کە شەهیدەکانی(أحد) لە جێگای شەهید بوونیاندا بنێژرێن. نەبرێنەوە بۆ گۆڕستانی مەدینە، تەنانەت هێندێکیان کە برابوونەوە فەرمانی دا بە گێڕانەوەیان و هێنانیانەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان، ئینجا وەستا بەدیاری ناشتنیانەوە، هەر دوان و سیان ئەخرانە گۆڕو لادرێك. وە پرسیاری ئەکرد: کە کامیان قورئانی زۆرتر لەبەرە، ئەوەیانی ئەخستە پێشەوە،(عبدالله ی کوڕی جابرو عەمری کوڕی جەموح) خرانە پاڵ یەك، چونکە یەکتریان خۆش ئەویست، فەرمووی: ئەم دوانە کەلە جیهاندا یەکتریان خۆش و ویستووە بیانخەنە گۆڕێك.

ئەمەی کە باس کرا هێندێ بوو لە ڕووداوەکانی ئەو جەنگ و غزایە، کە سەرکەوتن و شکان ڕووی دا تیای دا، سەرکەوتن و زاڵبوون لەکاتی گوێڕایەڵی تەواودا، دەست بەجێ وەر گەڕانی ئەو زاڵی و سەرکەوتنە کاتێ کەلەڕێ ڕاستەکە ترازان ڕووی دا لەلایەن هێندێکەوە، ئارەزووی نەفس هاتە پێشەوە و تێکەڵی کارەکە بوو، جا با لەوەوە تەمێ وەرگیرێ و ئەمە بکرێ بەسەرمەشق بۆ موسڵمانان هەتا هەتایە! ئینجا با سەرنج بدەین کە چۆن قورئان چارەسەری ئەو ڕووداوو هەڵوێستەی کرد بەو جۆرو تەرزە تاقانەی خۆیە؟!

وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ ٱلْمُؤْمِنِينَ مَقَٰعِدَ لِلْقِتَالِ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٢١﴾ إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا ۗ

قورئـان لـەم باسـانەدا مەبەسـتی گێڕانـەوە ڕووت نیـە، بـەڵكو مەبەسـتی تـەمێ و پـەروەردەكردن و پێگەیانـدنی دڵ و دەروون، بـەجۆرێ ئـەبێ بـە سەرمەشـق بـۆ هـەموو تـاقم چینێ لە هـەموو كات و چەرخێكدا، ئینجا لەبەر ڕووناكی ئەم سەرەتاو پێشەكیە با بێینە سەر تەفسیری ئایەتەكان، ئەفەرمووێ: ﴿وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ﴾ باسـی ئـەو كاتـە بكە كە بـەیانی زوو دەرچـوویت لـەلای مـاڵ و خێزانـت، ئـەوەش بـەیانی ڕۆژی شـەممەی حەوتـەمی مـانگی شـەوالی سـاڵی سـێیەمی كۆچی بـوو لـەماڵی عائیشە دەرچوو بە پیادە تـا گەیشـتە(احد) وەك(موجاهیـدو واقیـدی) ئەفـەرموون، لـەوێدا ﴿تُبَوِّئُ ٱلْمُؤْمِنِينَ مَقَٰعِدَ لِلْقِتَالِ ۗ﴾ بڕوادارەكانـت نیشتەجێ كردو داتمەزراندن لە چەند شوێنێكدا بۆ جەنگ كـردن لەگـەڵ بێبڕواكـان، شوێنێ بۆ تیرەندازەكان و شـوێنێ بـۆ سـوارەكان و شـوێنێ تـر بـۆ ئـەوانی تـر، كەواتـە مەبەسـت تـەنها كاتی دەرچوونەكە نیە، بەڵكو مەبەست بەو كات و ماوەیە كەلەو دەرچوونەوە دەستی پێكردو ئەوكارو كردەوانەی تیا كراو ڕووی دا، ئەو دەرچوونی پێغەمبەر(ﷺ) بەو جۆرو شێوەیە كە ئامـاژەی بـۆ كـرد شـتێكی زانـراوو بینـراو بـوو لای ئـەو بڕوادارانـەو لـە بیریـان بـووو چـەند ڕۆژێكی كـەم بەسـەری دا تێپـەڕی كردبوو، كەواتـە مەبەسـت تـەنها بیرخسـتنەوەی ئـەوە نیـە، بەڵكو مەبەست ئاگادار كردن و بیرخستنەوەی ئامادەبوونی خوایەو ئاگادار بوونی بـە سـەر ئـەو هـەموو تـەدبیرو ڕاوێـژو قسەو باس و نیازی دڵ و دەروونـەدا كەلـەو ڕووداوەدا وتـران و كران، ئەو ئاگادار كردن و بیرخستنەوەش بەمە ئەكات كە ئەفەرمووێ: ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ خـوا بیسـەری زانایە، واتە بیسەرە بۆ هەموو شتێ كە یەكەم: مەبەسـت لێرەدا ئـەو ڕاوێـژو قسـەو باسانە بوون كە كران، زانایە بە هەموو شتێ كە یەكەم مەبەست لێرەدا ئەو نیازو خەتەرانە بوون كـە بـەدەروونی ئەوانـدا هـاتن و گوزەریـان كـرد، بێگومـان بیرخسـتنەوەی ئەمـەو بێدار

بوونەوەی دەروون بەوە زۆر گرنگ و پێویستەو گەورەیی و گرنگی ئەدا بە بەسەر هات و ڕووداوەکە، بیم و ترس و شەرم ئەخاتە دڵ لەسەر هەر قسەو باس و نیازێکی ناڕەوا کە ڕووی دابێت، بێجگە لەوە لەو باس و بیرخستنەدا ئەو ترس و لاواز بوونە نیشان ئەدات کە ڕووی کردە دەروونی هێندێ لە بڕواداران تا خوا فریایان کەوت و هێزو چالاکی خستە دڵیان، وەکو ئەفەرمووێ: ﴿إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا﴾ واتە باسی ئەوکاتە بکەن، یا خوا بیسەری زانا بوو لەو کاتەدا کەدوو دەستە لە ئێوە بە خەتەرە بە دڵیاندا هات کە بترسن و لاواز بن لە جەنگ کردن، ئەوەش کاتێ بوو کە(عبدالله ی کوڕی ئوبەی) بە خۆی و سێ یەکێکی لەشکرەکەوە گەڕایەوەو دەری بڕی کە بەشداری جەنگەکە ناکات لەو کاتەدا خەریك بوو ترس و لاوازی داگیریان بکات، ئەوەش بە گوێرەی سروشتی ئادەمی کەلە کاتی تەنگی دا ئەو جۆرە بەسەرهاتە بۆ زۆر کەس پەیدا ئەبێ، بەڵام ئەوانە بەڕاستی بوون لەبەرئەوە خوا خاوەنداری کردن و یارمەتی دان و نەچوون بەدەم ئەو خەیاڵ و خەتەرەوە، وەکو ئەفەرمووێ: ﴿وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا﴾ خوا کاردبەدەست و یارمەتی دەری ئەوانە بووو دڵ ئارام و دامەزراوی کردن.

ئەو دوو دەستەیە(بنو سەلەمەی ئەوسی و بنو حارسەی خزرج) بوون کە کرا بوون بە هەردوو باڵی لەشکرەکە.(بوخاری و موسلیم) هەواڵێ ئەهێنن لە حەزرەتی عومەرەوە کە ئەفەرمووێ: لە(جابر)م بیست -خوای لێ ڕازی بێت- کە فەرمووی: ئەم ئایەتە لە ئێمەدا هاتە خوارەوە، واتە کۆمەڵی مەدینەیی، فەرمووی: ئەو دوو دەستەیە ئێمە بووین و حەز ناکەین کە نەهاتایەتە خوارەوە لەبەرئەوەی خوا ئەفەرمووێ: ﴿وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا﴾ خوا دۆست و یارمەتی دەریان بوو، ئا بەو شێوەیە ئەو خەتەرو خەیاڵەی ئەوانی دەرخست کە بێجگە لە خۆیان کەس ئاگای لێ نەبوو، ئینجا خوا پاراستنی و ئەو خەتەرەو خەیاڵەی لێ دەرکردن، بێگومان ئەگەر خوا میهرەبانی نەکردایە ئەو ترس و لاوازیە کاری لێ ئەکردن و تیا ئەچوون، کەواتە ئەبێ بۆ هەموو شتێ هەر پەنا بە خوا ببرێ و پشت هەر بەو ببەسترێ،

وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٢٢﴾ وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ ﴿١٢٤﴾ بَلَىٰٓ ۚ إِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَٰذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴿١٢٥﴾

---

وەکو ئەفەرمووێ: ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ بڕواداران با پشت هەر بە خوا ببەستن‌و چاوەڕوانی هەموو شتێ هەر لە خوا بکەن، کەواتە بڕوادار ـ ئەگەر بەڕاستی بڕوادارە ـ ئەبێ هیواو پاڵپشتی هەر خوا بێت.

ئا بەو جۆرە قورئان لەم دوو ئایەتە کورتەدا ئەم دوو ئامۆژگاریە گەورەو بنەڕەتیە ئیسلامیەی ئاڕاستەکرد: ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾، ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾. ئەم دوو ئامۆژگاریە گرنگە لەکات‌و شوێنی ڕێك‌و پێکی خۆی دا ئاڕاستەی کرد، کە دڵ‌و دەروون ئامادە بوو بۆ وەرگرتن‌و گوێڕایەڵی.

ئا بەو جۆرە دەستی کرد بە گێڕانەوەی ئەم ڕووداوە کە موسڵمانەکان هەرچەند لە یەکەمجارەوە زاڵبوون، بەڵام لەپاشدا زاڵنەبوون‌و کارەکە پێچەوانە بوویەوە بەهۆی هەڵەی هێندێکەوە، ئینجا پێش ئەوەی کەلەسەر ڕووداوو بەسەرهاتەکە بڕواو تەواوی بکات، پێش ئەوە ڕووداوێ تریان بیرئەخاتەوە کە موسڵمانەکان تیای دا زاڵبوون بە جۆرێکی موعجیزە ئاسا کە هەمووانی سەرسام کرد، چونکە کارەکە بەبێ هەڵە بەسەر براو بەهیچ کلۆجێ لە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) لانەدرا، ئەم ڕووداوەی لەم کاتەدا هێنا تا ئەم دوو بەسەرهات‌و ڕووداوە بەراورد بکرێن‌و بدرێن لەیەك، بیربکرێتەوە لەهۆی زاڵبوون‌و تێك شکانەکە، ئەفەرمووێ: ﴿وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ﴾ بێگومان خوا ئێوەی زاڵکرد لە ڕووداوی(بەدر)دا ﴿وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ﴾ لەکاتێکدا کە ئێوە لاوازو بێ دەسەلات بوون، چونکە وەك باس کرا لەسەرەتای سورەتەکەوە خۆراك‌و توێشوو کەم بوو وە ژمارەی خۆیان‌و چەك‌و وڵاخیان هەر کەم بوو، بەڵام لەبارەی بڕواو لە خوا ترسی‌و گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەریەوە تێرو تەواوبوون ﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ کەواتە لە خوا بترسن‌و خۆتان بپارێزن لێی بەدوور کەوتنەوە لە گوناهو بە خۆگریی لەسەر

گوێڕایەڵی ﴿لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ بەڵكو بەوە سوپاسی خوا بكەن و هەڵسن بە سوپاسی خوا لەسەر ئەو یارمەتی و زاڵكردنەی كە پێی بەخشین، یان بەڵكو بەهۆی ئەوەوە خوا چاكەی ترتان لەگەڵ بكات و ئینجا ئێوەیش سوپاسی بكەن لەسەر چاكەكەی. واتە بەڵكو ئەمجارەیش زاڵتان بكات بەهۆی خۆپارێزیەوە، وەك لە(بەدر)دا زاڵی كردن بەو هۆیە، ئینجا ئەفەرمووێ: ﴿إِذۡ تَقُولُ لِلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ زانایانی تەفسیر لێرەدا دوو دەستەن. دەستەیەك لەسەر ئەوەن كە ئەم وتن و بەڵێنە لە ڕۆژی(احد) دا بوو، كە ئەمە ڕای(ئیبن و عەباس و كەلەبی و واقیدی و مقاتل و محمدی كوڕی ئیسحاق)ە، لەسەر ئەم ڕایە وتەی ﴿إِذۡ﴾ بەستراوە بەوەی كە وتەی ﴿إِذۡ هَمَّت﴾ی پێوە بەستراوە. دەستەی دووەم كە ڕای زۆربەیە ئەم وتن و بەڵێنە لە ڕۆژی(بدر) دا بووە. لەسەر ئەم ڕایە وتەی ﴿إِذۡ﴾ بەستراوە بە ﴿نصر﴾ەوە، هەركام لەم دوو دەستەیە بەڵگە ئەهێننەوە لەسەر ڕای خۆی و لێكۆڵینەوەی زۆریان تیا كردووە و بە پێویستی نازانم درێژەدان بەوە، بەڵكو ئاماژە ئەكەم بۆ تەفسیری ئایەتەكە لەسەر هەردوو ڕاكە:

لەسەر ڕای یەكەم: بڕوادارەكانت ئامادە كردو داتمەزراندن ﴿إِذۡ تَقُولُ لِلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ لەكاتێكدا وتت بە بڕوادارەكان: ﴿أَلَن يَكۡفِيَكُمۡ أَن يُمِدَّكُمۡ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ﴾ ئایا چارەسەریان ناكات و پێویستتان دەرناكات ئەوەی كە پەروەردگار بەهێزتان بكات و كۆمەكتان بكات بەسێ هەزار فریشتە كە بهێنرێنە خوارەوە لە ئاسمانەوە بۆتان؟

لەسەرڕای دووەم: خوازاڵی كردن لەڕۆژی(بەدر)دالەوكاتەداكە ووتت بە بڕواداران... هتد.

لەسەر هەركام خۆی وەڵام ئەداتەوە، ئەفەرمووێ: ﴿بَلَىٰٓ﴾ واتە بەڵێ چارەسەرتان ئەكات و پێویستتان دەرئەكات، ئینجا بەڵێن ئەدا بە زیاتر لەوە بەو مەرجەی كە ئەفەرمووێ: ﴿إِن تَصۡبِرُواْ﴾ ئەگەر ئێوە خۆتان بگرن و بە ئارام بن ﴿وَتَتَّقُواْ﴾ خۆتان بپارێزن لە گوناهو نافرمانی ﴿وَيَأۡتُوكُم مِّن فَوۡرِهِمۡ هَٰذَا﴾ ئەوان بێن بۆتان بەم توندو تیژیی و لەم كاتانەدا لە چەسپانی، ﴿يُمۡدِدۡكُمۡ رَبُّكُم بِخَمۡسَةِ ءَالَٰفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ﴾ پەروەردگارتان بەهێزتان ئەكات و یارمەتیتان ئەدات بە پێنج هەزار فریشتە كە خۆیان یا وڵاخەكانیان نیشانە دار كردووە.

لەسەرڕای یەكەم:ئەوانەی كەبێن بریتین لەولەشكرەی كەئەبوسوفیان هێنای بۆئەوجەنگە.

لەسەر ڕای دووەم: مەبەست كۆمەڵی(كورزی كوڕی جابیر)ە كە لە جەنگی(بەدر)دا ویستی بێت بۆ یارمەتی دانی قوڕەیش، موسڵمانەكان بەو هەواڵە تەنگەتاو بوون، بەڵام لەپاش دا

نـەهاتن کاتـێ کەهـەواڵی شـکانی قورەیـشیان پێگەیـشت. لـەبارەی ژمـارەی هـەموو ئـەو فریشتانەوە کە بەڵێن درا بە هاتنیان چەند ڕایەك هەیە:

١- ئەگەر ئەم ئایەتە ببڕین بەسەر ڕووداوی(بدر)دا ئەبێ ژمارەیان نۆ هەزار بێت، چونکە لە سورەتی ﴿الأنفال﴾دا باسی یەك هەزاری کردووە، لێرەشدا سێ و پێنجی باس کردووە کە هەمووی ئەکاتە نۆ.

٢- ئەگەر ببڕین بەسەر ڕووداوی(احد)دا ئەوا ئەبێ هەشت هەزار بن، چونکە بۆ ئەم هەر ئەم سێ هەزارو پێنج هەزارەیە.

٣- ژمارەیان هەر پێنج هەزارە، بەم جۆرە ژمارە کەمەی ئەخەینە ناو ژمارە زۆرەکە کە پێنج هەزارەکەیە. یان بەم ڕەنگە کە(حسن) ئەفەرمووێ: مەبەست ڕووداوی(بەدر)ەو یارمەتی دانەکە بە یەك جار نەبوو، بەڵکو بەرە بەرە، لە یەکەم جارەوە یەك هەزار بوون ئینجا بوون بە دوو، ئینجا بوون بە سێ، ئینجا بوون بە پێنج، یارمەتیەکە بەو پێنجە تەواو کرا. هەروەها لەبارەی بەدی هاتنی ئەو یارمەتی دانە چەند ڕایەك هەیە: بەهێزترینی ئەو ڕایانە ئەمەیە ـ وەك ئیبن و جەریر ئەفەرمووێ ـ کە هیچ بەڵگەیەکی بەهێزی دڵنیا کەر لەم دوو ئایەتەدا نیە لەسەر بەدی هاتنی یارمەتی دان، وەك یارمەتی نەدانیش ناگەیەنن، کەواتە ئەگەر حەدیسی صەحیح دەست کەوت لەسەر هەر بارێ ئەوا چاکەو ئەگەر دەستیش نەکەوت، ئەوا لە خۆمانەوە هیچ ناڵێن و لێی بێدەنگ ئەبین. بەس ئەوەندە هەیە ئەگەر ئایەتەکان ببڕین بەسەر(احد)دا باری یارمەتی نەدان لەدڵدا بەهێزترە، چونکە ئەگەر یارمەتی ببوایە ئەو شکستە نەئەبوو، مەگەر بڵێین یارمەتی دان لە یەکەمجارەوە بوو تا ئەو تاقمە تیرەندازە کەوتنە ئەو هەڵەی کە کردیان، ئینجا لەوێدا وازیان هێنا لە یارمەتی دان، هەروەها یارمەتی نەدانی پێنج هەزارەکە لە دڵدا بەهێز ترە با ئایەتەکە ببڕین بەسەر(بەدر)یشدا، چونکە یارمەتی دانی ئەوانی بەسترا بوو بە چەند مەرجێکەوە کە بێگومان هەموو بە دی نەهات، ماوەتەوە یارمەتی نەدانی هەزار فریشتەکە لە جەنگی(بەدر)دا، بەڕاستی ئەوە ئایەتێکی سورەتی ﴿الأنفال﴾ بەڵگەو ڕابەرێکی بەهێزە لەسەری وەك بە یارمەتی خوا لە سورەتی ناوبراودا بە خزمەتی ئەو ئایەتە ئەگەین، هەروەها بە ئیزنی خوا لەو سورەتەدا مەبەست بەو یارمەتی دانەو جۆرو شێوەی ڕوون ئەکەینەوە بە پێی ڕای زانایانی ئیسلام.

﴿وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١٢٦﴾﴾

بێگومان بەندێ لە بەندە سەرەكیەكانی ئەم ئاینێ و عەقیدەی ئیسلامە، یاسایەك لە یاسا بنەڕەتیەكانی ئەمەیە كە هەموو شتێ و هەموو كاروبارو ڕووداوێك ئەگەڕێتەوە بۆلای خواو هەموو شت بە دەست ئەوەو بە ویستو خواهیشی وەوە، جالەبەرئەوە قورئان لە چەند سوێنێكدا ئاماژە ئەكات بۆ ئەو مەبەستە گرنگەو سەرنجی بڕوادارانی بۆ ڕائەكێشی: وەك لێرەدا ئەفەرمووێ: ﴿وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ﴾ ئەو یارمەتی دانە بە فریشتەیە یان ئەو ووتنو بەڵێنی پێغەمبەر ﷺ، خوا كردیو گێڕای هەر لەبەر موژدەدان پێتانو تا بەوە دڵخۆش ببن ﴿وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ﴾ بۆئەوەی كە بەوە دڵتان ئارام بگرێو ترسو بێئارامی داگیرتان نەكات بەهۆی بێدەسەلاتیو لاوازی خۆتانو زۆریـیو هێزو دەسەلاتی بێبڕواكانەوە، واتە ئەگینا نە بە ئەوەندەو نەبە هیچ شتێكی تر زاڵبوون نابێ، بەڵكو هەر بە خوا ئەبێ وەكو ئەفەرمووێ: ﴿وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ﴾ زاڵ كردنتان لە(بەدر)دا، یان زاڵ كردنو سەرخستن لەهەر كاتێكدا ببێ لە لایەن هیچ كەسێكو هیچ شتێكەوە نیە مەگەر لەلایەن خواوە كە ناوی ﴿ٱللَّهِ﴾یەو كار دروستو لێ زانە لە هەموو كارێكدا.

ئا بەو شێوەیە قورئان لێرەو لە چەند شوێنێ تردا هەموو كاروبارێ ئەگێڕێتەوە بۆلای خواو هەر خوا بە خاوەن كارو ئیش كەرو بەدی هێنەری ڕاستەقینە دائەنێ‌ئەو شتانەی كە هۆی هەركارێكنو بەڕواڵەت بە ئیش كەرو بە بەدی هێنەردائەنرێن، هەموو ئەو شتانە لە ڕووی ڕاستی دا چەكو كەرەسەیەكن بەدەستی مەیلو خواهیشی خواوە، ئەیان بزوێنێو كاروكردەوەكانی خۆی لەوانەدا نیشان ئەدات. قورئان زۆر سوورە لەسەر داڕشتنو جێگیر كردنی ئەو بەندو یاسایە لە دەروونو لە بۆچوونی مەردوومدا، بۆئەوەی بەندە لە ڕێوەو یەكسەر پەیوەستی ببێ بە خوای خۆیەوە، دڵی بڕوادار هەموو كاروبارێ هەر لە خوا بناسێو هەر لەوێوە بزانێ، كە بڕوا بە تاكو خوا بەبێ ئەوە نابێ.

ئا بەو هەموو تەمێو ئامۆژگاریە جۆر بەجۆرە، ئەو تاكیو تەنیایی خوا دامەزراوو جێگیربوو لەدڵو دەروونی موسڵمانە ڕاستەقینەكانی ئەم ئوممەتەدا زۆر بە ووردیو قوڵیو بە ئارامی دڵو جۆرێكی نایاب.

لِيَقْطَعَ طَرَفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَوْ يَكْبِتَهُمْ فَيَنقَلِبُوا۟ خَآئِبِينَ ﴿١٢٧﴾ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٩﴾

---

ئەو خوا پێداوانە زانیان کە هەر خوا بە تەنیا کارو کردەوە ئەکات، زانیان کە بەندەیانی خوا پێیان سپێردراوە کە تێکۆشان بکەن‌و دەسەڵات‌و خواهیشی خۆیان بەکار بێنن لەگەڵ هەموو هۆو کەسەرەیەك کە ڕەوا بێت‌و لە دەستیان بێت، بەو جۆرە گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەرییان کرد. ئینجا مەبەست‌و هۆی ئەو زاڵ کردن‌و سەر خستنەمان بۆ باس ئەکات: ئەفەرمووێ: ﴿لِيَقْطَعَ طَرَفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟﴾ واتە خوا زاڵی کردن لە(بەدر)دا یان زاڵ کردن هەر لەلای خوایەو بەدی ئەهێنێ لەبەرئەوە بپچڕێ‌و کەم بکاتەوە بەشێك لەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە، بەشێك لە ژمارەی خۆیان بە کوشتن‌و بەدیل گرتن، یا بەشێك لە خاك‌و وڵاتیان بەفەتح کردن‌و گرتن، یا بەشێك لە زۆرو دەسەڵاتیان بەزاڵبوون بەسەریانداو ژێر دەست کردنیان، یا بەشێك لە سامان‌و داراییان بە غەنیمەت گرتن، یا بەشێك لە چالاکی‌و لێ هاتنیان بە شکاندنیان لە جەنگدا، ئەم جۆرانە هەموو ئەگونجێن‌و ڕوویشیان داوە، ﴿أَوْ يَكْبِتَهُمْ﴾ یان بۆئەوەی سەر شۆڕو ڕیسوایان بکات‌و داخی سەخت بدا لەدڵ‌و جگەریان‌و پێیان بچەژێ ﴿فَيَنقَلِبُوا۟ خَآئِبِينَ﴾ بەهۆی ئەوەوە بگەڕێنەوە بە نائومێدیی‌و بەش بڕاویی.

قورئان لێرەدا چوار شت باس ئەکات کە یەکێ لەوانەیان هەر چواریان‌و هەریەکێ بۆ تاقمێك لە بێباوەڕییان مەبەست‌و هۆیە لە زاڵکردنی بڕواداران بەسەر بێبڕواکاندا، لەو چوارەئەوەبوو دوانیان تێپەڕیان کرد، ئینجا لە ناوەندی ئەم دووانە کە پەیوەندییان بەم جیهانەوە هەیەو ئەو دوانەکەی تری داهاتوو کە پەیوەندیان بە ڕۆژی دواییەوە هەیە، لە ناوەندی ئەمانەدا بە تێ هەڵکێش ئەفەرمووێ: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ﴾ ئینجا ئەگەر ئەم

ئایەتانە ببڕین بەسەر ڕووداوی(بەدر)دا ئەو کاتە لە تەفسیرەکەی دا ئەڵێین: ئەو زاڵ کردنە هەر لەلای خواوەیەو لەبەر یەکێ لەو چوار هۆیەیە کە خوا ئەیکات، تۆ ئەی پێغەمبەر لەو کارەدا هیچ شتێك بۆ نیەو بە دەست تۆ نیە، واتە ئەو زاڵکردنە هەر چۆنێ بە دەست ئەو فریشتانە نیە، هەروەها بە دەست کەسێکی تریش نیە تەنانەت تۆیش کە پێغەمبەری، چ جای بڕواداران، یان مەبەست ئەوەیە: هەر خوا خاوەن‌و کاربەدەستی ئەوانەیەو ئێوەی زاڵکرد بەسەر ئەو بێباوەڕییانەدا لەبەر هەرکام لەو چوار هۆیە، هیچ کارێکی ئەوان بە دەست تۆ نیەو تۆ هەر بەندەیەکی فەرمانت پێدراوە بە ترساندن‌و تێکۆشان لەگەڵیان.

ئەگەر ئایەتەکان ببڕین بەسەر ڕووداوی(بەدر)دا بەو جۆرە تەفسیری ئەکەینەوەو مەبەست لە هێنانەکەی ئەوەیە کە ئاماژەمان بۆ کرد، وە ئەگەر ئایەتەکان ببڕین بەسەر ڕووداوی(احد)دا ئەو حەلە ئەڵێین: مەبەست جۆرە سەرزەنشتێکی پێغەمبەرە(ﷺ) لە هێندێ کارو بەرگری کردنیەتی لە هێندێ شت کە لەلایەن خۆیەوە ڕووی دا کە پەیوەندی هەیە بە ڕووداوی(احد)ەوە، وەك نزای شەڕ کردنی لە بێبڕواکان بە شێوەی گشتی، یان نەفرین کردنی لە هێندێکیان بەتایبەتی، هەروەها چەند شتێ تر لەو بابەتانە کە ڕیوایەت کراون، واتە هیچ ڕەنگ کاری دروست کراوەکان‌و بەندەکانم بە دەست تۆ نیەو عائیدی تۆنیە، بەڵکو هەر بەدەست خۆمەو بەپێی زانین‌و کار دروستی خۆم بڕیاریان تیا ئەدەم، تۆئەی پێغەمبەر هەر ئەوەت لەسەرە کە بڕیاری من جێبەجێ‌بێنی‌و بەدی بێنی تیایاندا. لەسەر هەر بار ئەم تێهەڵکێشە هات بە دوای ئەم دووانە پێشووەدا کە لەوانەن دەخلی پێغەمبەریان تیا بێت(ﷺ)و لە ژێر دەسەڵاتی ئەودا بن،کەواتە لە جێیە ئەمانەی بەدەست نەبێ باشتر ئەو دووانەکەی تری بەدەست نیە کە ئەفەرمووێ: ﴿أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ﴾ واتە ئەو زاڵکردنە بەسەریاندا لەبەرئەوەیە تۆبەو گەڕانەوەیان لێ وەرگیرێ، بەم جۆرە ئەو زاڵ بوونە ببێ بەتەمێ‌و ئامۆژگاری‌و ڕایان کێشێ بۆ موسڵمان بوون، خوایش ئەو تۆبەو موسڵمان بوونەیان لێ

وەرگرێ، ﴿أَوْ يُعَذِّبَهُمْ﴾ یان لەبەرئەوەیە سزایان بدات، سزای جیهان بە ژێر دەست کردنو بەدیل گرتنیان، یان سزای ڕۆژی دوایی، بەهۆی مردنیان لەسەر بێباوەڕیی کە ئەیانخاتە سزای نەبڕاوەی دۆزەخ، ﴿فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ﴾ چونکە بەڕاستی ئەوانە ستەمکارن، ستەمکارن بەوەی بێباوەڕنو ئەو ڕێگە بەدەیان داوەتە بەر، ستەمکارن بەوەی سزای بڕواداران ئەدەن، ستەمکارن بەوەی کە خراپە لە زەوی دا بڵاوئەکەنەوە، ستەمکارن بەوەی ڕێگری چاکەو خێری خوان کە لەم ئیسلامەدا ناردی، هەروەها ستەمکارن لە هەموو بارو ڕوویەکەوە.

ئەو جۆرە تەمێو ئامۆژگاریانە کاری کرد لە موسڵمانەکان، دڵو هەستو دەروونیان بەو بۆچوونو تێگەیشتنە قورئانییانە ڕەنگیان گرت، بەهۆی ئەوەوە لە زاڵبوونو سەرکەوتنەکانیاندا خۆیان نەئەبینیو هەردەستی قودرەتی خوایان ئەبینی، ئەو کەشخەو شانازییو لە خۆ گۆڕانە کە ڕوو ئەکاتە خەڵکی تر لەکاتی زاڵبوونو دەسەڵاتدا، ڕووی نەئەکردە ئەوان، هەروەها لەکاتی زەبوونیو بێ دەسەڵاتیو لێ قەوماندا نە ئەپسانو ئەیانزانی هەموو کارێ بەدەست خوایەو بە ویستو خواهیشی خواو بەپێی لێزانیو کاردروستی ئەو بەرپا ئەبێ! ئینجا باسەکە دوایی ئەهێنێ بە دەرکردنی یاسایەکی گشتی کە هەموو کاروباری بوونەوەر ئەگێڕێتەوە بۆلای خوا، بەوە دڵنیایی ئەکات لەسەر ئەوەی کەلە ئایەتی پێشوودا باسی کردووە ئەم ئەبێ بە ڕابەر لەسەر ئەوەی لە ئایەتی پێشوودا فەرمووی، ئەفەرمووێ: ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾ هەر هینی خوایە هەرچی وا لە ئاسمانەکانو هەرچی وا لەزەوی دا ﴿يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ﴾ ئەبورێو خۆش ئەبێ لە هەرکەس کە خوا خۆی ئەیەوێ ﴿وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ﴾ سزای هەرکەسیش ئەدات کە خوا خۆی ئەیەوێ ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ خوا لێ بووردەی میهرەبانە، بێگومان لێ بووردنو میهرەبانیەکەی وەك هەموو کاروبارێکی تری بە پێی حیکمەتو کاردروستی خۆیەتیو هەرچی ئەو بیکات هەر ئەوە ڕاستو ڕێکە.

ئينجا پێش ئەوەی بچێتە ناو كۆڕی باسەكەو ئامـاژە بكـات بۆ چەند ڕووداوو بەسەرهاتێكی جەنگەكە ــ جەنگی احدــ پێش ئەوە تەمێ و فەرمانێك ئاڕاستە ئەكات لە بارەی جڵەوگیریی لەسوودو سووخۆری، وە لەبارەی لە خواترسی گوێڕایەڵی خـواو پێغەمبەرەوە(ﷺ) وە لەبارەی چەند خووو ڕەوشتێكەوە كە دڵ و دەروونیان پێ پاك و خاوێن ئەبێتەوە، لەوانە مەردوم زاڵ ئەبێ بەسەر ئارەزواتی نەفسدا، بەوانە ئامادە ئەبێ بۆ بەربەرەكانێ و جەنگی تیرو شیر! لەم جۆرە باس و تێكەڵكردنی چەند شتی جۆربەجۆرەوە دەرئەكەوێ یەكێتی و گشتیەتی ئەم ئایین و عەقیدەیە بۆ هەموو ناوچە جیاوازو جۆر بە جۆرەكانی ژیان، دەرئەكەوێ كە ئیسلام هەموو شتەكانی پەیوەستن پێكەوەو دەست نادەن بۆ جوێ كردنەوەو بەش بەش كردن، بەڵكو بەو هەمووە ئیسلام پێك دێت، ئەفەرمووێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی كەسانێ كە بڕواتان هێناوە ﴿لَا تَأْكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضْعَـٰفًا مُّضَـٰعَفَةً﴾ سوود مەخۆن بە چەند قات و چەند چەندانە كراو، واتە وەری مەگرن و ئەو مامەڵەیە مەكەن. ئەندازێك دواین بە درێژیی لەبارەی سوودو ڕژێمی سووخۆریەوە لە جزمی سێ‌یەمدا، كەواتە با سەرنجی ئەوێ بدرێ و هیچ ئەوە دووبارە ناكەینەوە، بەڵام ئەندازێك لێكۆڵینەوە ئەكەین لە وتەی ﴿أَضْعَـٰفًا مُّضَـٰعَفَةً﴾ چونكە زۆر كەس لەم چەرخ و سەردەمە دواییەدا ئەیانویست و ئەیانەوێ دەست بگرن بەم وتەوەو لە پەنای ئەم وتەیەدا خۆیان داشارن و سوودی قەدەغە كراو ببڕن بەسەر ئەم شێوەداو ئیتر چوارو پێنج و هەشت و دە لە سەد قەیناكات و قەدەغەنیە! بێ‌گومان ئەوانەی كە هەوڵ و تەقەلای ئەوە ئەدەن چاوی خۆیان ئەنوقێنن لە ئاستی و بەدەست قەست لاڕێ ئەگرن، ئەگینا مەسەلەكە ڕوونەو نارەوایی ئەو ڕایە ئاشكرایە، چونكە:

١- بێجگە لەو هەموو حەدیسە صەحیحانە كە هاتوون و هەموو جۆرە سوودێكیان قەدەغە كردووە، وە بێجگە لە بڕیاری زانایانی ئیسلام لەسەر ئەو قەدەغە كردنە تا ڕادەیەك ئەم حەدیسەیان گێڕاوە بە بەندو یاسایەك لە كتێبەكانیاندا:(كل قرض جر نفعا فهو ربا) هەر قەرزێك هەر دەستكەوت و قازانجێك ڕاكێشێ ئەوە سوودە، واتە قەدەغەیە. بێجگە لەمانەو لە پێش ئەمانەدا ئایەتی سورەتی ﴿البقرة﴾ كە لەپاش ئەم ئایەتە هاتووەتە

خوارەوە، بەڵکو لە دواترین ئایەتەکانی ئەحکامە، ئەو ئایەتە بە ڕێکیو بێ پێچو پەنا هەموو جۆرە سوودێکی قەدەغە کردووە بەبێ مەرجو بەبێ سنوور.

٢- ئەم وتەیە لێرەدا ﴿أَضۡعَـٰفٗا مُّضَـٰعَفَةٗ﴾ مەرج نیە بۆ قەدەغە کردنەکە ــ وەك زانا بەرزەکانی ئیسلام فەرموویانە ــ بەڵکو ئەو باوو حاڵەتە درەئەخات کە مەردومان لەسەری بوون لە سەردەمی نەفامی دا، وەك لە چەند ڕیوایەتێکدا هاتووەو بەناوبانگەو کورتەی هەموویان ئەمەیە: لەو سەردەمەدا یەکێ قەرزێکی ئەدا بە سوو تا ماوەیەك، ئینجا کە ماوەکە دوایی ئەهاتو هەژارەکە قەرزەکەی بۆ نەئەدرایەوە، خاوەن قەرز پێی ئەوت ماوەکەت بۆ درێژئەکەمو تۆیش سووەکەم بۆ زیاد بکە، ئینجا چەند جار ئەوەیان ئەکرد تاوای لێ ئەهات قەرزکە چەند قات ئەبوویەوە، جا ئایەتەکە ئاماژە ئەکات بۆ ئەو باوە پیسەو مەبەست بێزاری دەربڕینە لەو باوەو سەرزەنشتی ئەوانەیە کە ئەوە باوەیان بووە تا بەهۆی ئەوەو بڕواداران دوور بکەونەوە لەو کردەوەو باوە نارەوای نەفامیە، وەك(ئیبنو جەریر) دەست نیشانی بۆ ئەکات لە تەفسیری ئایەتەکەدا کە ئەفەرمووێ: خوا ئەفەرمووێ: ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە بە خواو پێغەمبەری خوا لە پاش ئەوەی خوا ڕێنموونی کردن بۆ ئیسلام سوومەخۆن بە چەند چەندانە لەکاتی موسڵمان بوونتاندا، وەك لەکاتی نەفامیتاندا ئەتانخوارد، سووخۆری لەو چەرخەدا ئاوا بەئاشکرا ئەو تاوانە گەورەی تیا بوو، هەژارەکە ئەبوو بە ژێرەوەو ڕزگار نەئەبوو، بەڵام ئەگەر تۆزێ وورد بینەوە تێئەگەین کە ئەو ڕژێمە پیسە لەسەر هەر ڕادەو ڕێژەیەك ببێ هەر سەری لەو تاوانەوە دەرەئەچێو ئەو سیفەتە پیسە شتێکی سروشتیو هەموو کاتیە بۆی، چونکە بە پێی ئەو ڕژێمە ئەبێ گەڕانو چەرخەی ماڵو سامان لەناو هەمووان لەسەر ئەو بنەڕەتە بێت، کەواتە لە هەر لایەکەوە هەر مامەڵەو کڕینو فرۆشتنی بوو بەشێك لە قازانج ئەگەڕێتەوە بۆ سەرمایەدارو ئەو برابەشی هەموو ئەبێ!! بێگومان ئەو ڕژێمە بۆگەنە ژیانی دەروونیو ڕەوشتی تێك ئەدا، هەرچۆنێ ژیانی ئابووریو ڕامیاریش تێك ئەشێوێنێ. وەك دەست نیشانمان بۆ کرد لە جزمی سێیەمدا، ئیسلامیش پاکیو خاوێنی ئەوێ لە ژیانی دەروونیو ڕەوشتی دا، هەرچۆنێ ئەیەوێ ژیانی ڕامیاریش بێگەردو لەکە بێت کەواتە هەرکەس لە خوا ترس بێتو لە تۆڵەو سزای خوا بترسێ دوور ئەکەوێتەوە لەو ڕژێمە پیسە.

کەواتە زۆر ڕێك و بەجێیە کە ئەفەرمووێ: ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ خۆتان بپارێزن لە خەشمی خوا کە یەکێ لەهۆی خەشمی خواو کەوتنە ناو ئاگر سوو خواردنەو بەزەیی نەهاتنەوەیە بە هەژاراندا، ﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ بەئومێدی ئەوە ڕزگار بن و بگەن بە ئامانج ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱلنَّارَ ٱلَّتِىٓ أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ﴾ خۆتان بپارێزن لە ئاگرێك کە ئامادە کراوە بۆ بێبڕواکان کە سپڵەن لەگەڵ خوای خۆیان و دڵ ڕەق و بێبەزەیین لەگەڵ بەندەکانی خوادا کە جێگەی بەزەیی و میهرەبانی نین، مەبەست بەو ئاگرە ئامادە کراوە چینە تایبەتیەکانە بەوانەوە، نەك ئەو تەبەقەی کە سووك ترە و سزای بڕوادارانی گوناهباری پێئەدرێ، یان مەبەست ئاگرە بە شێوەی گشتی کە ئاگر لە خۆی داو لە بنەڕەتدا هەر بۆ بێبڕوا دروست کراوەو سزادانی بڕواداری گوناهکار پێی بە تەبیعەتی بێبڕوایانەوەیە، بە هەر جۆرو لەسەر هەربار ئەم ئایەتە ـ وەك ئیمامی حەنەفی ـ ئەفەرمووێ: ـ سامناکترینی ئایەتەکانی قورئانە، ئەوەتا بڕواداران ئەترسێنێ بە ئاگرێك کە ئامادە کراوە بۆ بێباوەڕیان، ئەگەر بڕواداران خۆیان نەپارێزن لەقەدەغەکانی خوا، کە لێرەدا سوو خۆران یەکەم و سەر دەستەن!! هەروەها ئەم ئایەتە وا نیشان ئەدات کە سوو خواردن نزیکە لە بێباوەڕییەوە، وە سووخۆران خۆیان ناپارێزن لە خواو ناترسن لە ئاگری دۆزەخ، بەڵێ بەڕاستی هەرکەس بڕوادار بێ ناتوانێ سوو بخوات و خۆی بخاتە ڕیزی بێباوەڕانەوە، بڕوا قسەی ڕووت نیەو بەدەم بوترێ، بەڵکو لە ڕووی ڕاستی دا بڕوا بە پەیڕەوی بەرنامەی خوا دەرئەکەوێ و بەدی دێت، بەهیچ ڕەنگ بڕواو ڕژێمی سوو خۆری کۆ نابنەوە لە شوێنێکدا، بێگومان ئەم ئایەتە لە خۆڕایی جڵەوگیریی لە خواردنی سووی کۆنەکردووەتەوە لەگەڵ فەرمان دان بەلە خواترسی و خۆپارێزی لە خواو لەو ئاگرەی کە ئامادە کراوە بۆ بێباوەڕیان، ئەو کۆکردنەوە بۆ دامەزرانی ئەو مەبەستەیە کە باسمان کرد لە دڵ و بۆ چوونی بڕواداراندا، هەروەها ئومێدی ڕزگاربوون و گەیشتن بە ئامانج بەهۆی دوورکەوتنەوە لە سوو خواردن و بەهۆی لە خواترسی، ئەوەش لە خۆڕایی نیەو دەست نیشانی تیایە بەو مەبەستەی کە ئاماژەمان بۆ کرد،

وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٣٢﴾ ۞ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِى ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلْكَٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ

---

ئینجا دواترین دڵنیایی ئەکات لەسەر ئەو جڵەوگیریی و فەرمان دان بە لە خوا ترسیە، ئەفەرمووێ: ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ﴾ گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەربن ﴿لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ بە ئومێدو چاوەڕوانی ئەوەی کە میهرەبانیتان پێبکرێ. ئەم فەرمانە هەرچەند بە ڕواڵەت گشتیەو چاوەڕوانی میهرەبانی خوا لەو گوێڕایەڵیە گشتیەدایە، بەڵام هێنانی ئەم فەرمانە بەدوای ئەو جڵەوگیرییەدا مەبەستێکی تایبەتی نیشان ئەدا، کە ئەمەیە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر(ﷺ) بەدی نایەت لەناو کۆمەڵێك دا کە ڕژێمی سوو خۆری تیا بێت، گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر(ﷺ) نیە لە دڵی کەسێکدا کە سوو خۆر بێ بە هەر جۆرو شێوەیەك، ئەوە نیشان ئەدات بێجگە لەوەی کە ئەم فەرمانە پەیوەندیەکی تایبەتی هەیە بەو ڕووداوەی کە لەم جەنگەدا نافەرمانی پێغەمبەری(ﷺ) تیا کرا وەك لە پێشەوە باس کرا.

هەرچۆنێ لە جزمی سێیەمدا باسی سووو باسی خێرو صەدەقەی کۆ کردەوە بەرامبەر یەکتر، لەم ڕووەوە کە دووباری دژو جیاوازی یەکترن لە کۆمەڵیەتی و ئابووری دا، دوو جۆرە ڕژێمن کە زۆر لە یەکتر و هەرگیز کۆنابنەوە، هەرچۆنێ لەوێ وای کرد ئەوا لێرەشدا بەدوای جڵەوگیریی لە سووخواردن و ترساندنی سوو خۆران لە ئاگرێك کە ئامادە کراوە بۆ بێباوەڕیان، لەدوای ئەوە ئینجا فەرمان بە چەسپانی کردن بۆلای لێ بووردنی خواو ئەو بەهەشتەی کە ئامادە کراوە بۆ لە خواترسەکان، کە یەکەم نیشانەو سیفەتیان ماڵ بەخت کردنە لە ڕێی خوادا، کەواتە ئەمانە تاقم و دەستەیەکن دژو جیاواز لەدەستەو تاقمی سووخۆران.

ئەوە لە بارێکەوە، لەبارێکی ترەوە باوی قورئان وایە هەڕەشەو ترساندن بەڵێن و موژدە ئەهێنێ بەدوای یەکتردا کە ئەوەش زۆر بەکارە لەپەندو ئامۆژگاریی و تەمێ دادانـدا،

ئەفەرمووێ: ﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ چەسپانی بکەن بۆ لای لێ بووردنێکی گەورەو سڕینەوەی گوناهەکانتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە ﴿وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ﴾ بۆلای بەهەشتێك کە پانایی و فراوانی ئەو بەهەشتە وەك پانی و فراوانی ئاسمانەکان و زەوی وایە، واتەچەسپانی بکەن بۆشتێك کەهۆی گەیشتن و دەستکەوتنی ئەو دووانەیە، ئەو شتەش بە نۆ جۆر تەفسیر کراوەتەوە، یەکەم و بەهێزترینیان بریتیە لە بەجێ‌هێنانی فەرمان و دوورکەوتن لەوەی قەدەغەیەو جلەوگیریی لێ کراوە، ﴿أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ﴾ ئەو بەهەشتەی کە ئامادە کراوە بۆ لە خواترس و خۆپارێزەرەکان، ئایا مەبەست بەهەشتە بەتێکڕایی، یان مەبەست بەرزو بەڕێزترین تەبەقەیە لە بەهەشتدا کە تایبەتییە بەو لە خوا ترسانەوە کە خاوەنی ئەم سیفەتانەی داهاتوون، لەسەر باری یەکەم ـ وەك لە باسی ئاگردا وترا ـ ئەڵێن: بەهەشت هەربۆئە مانە ئامادەکراوەو غەیری ئەمان کە بچن لە پەنای ئەمان و لە تەبەعیەتی ئەمانەوە تێی ئەچن، ئینجاسیفەت ونیشانەی ئەولەخواترسانەباس ئەکات بەم شێوەی کەدێت:

١- ئەفەرمووێ: ﴿ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ﴾ کەسانێك ماڵبەخت ئەکەن و ئەیدەن لە ڕێی خوادا لەکاتی بوون و دەسەڵات دا، لەکاتی نەبوونی و دەست تەنگی دا، لەکاتی خۆشیدا، لەکاتی ناخۆشیدا، واتە بە هەمیشەیی و دامەزراون لەسەر ئەو بەخت کردن و بەخیشنە، نە دەسەڵات و خۆشی یاخی و بێ‌ئاگایان ئەکات، نە ناخۆشی و نەبوونی بێزاریان ئەکات تا ئەوەیان لە بیربچێ، بەڵکو لە هەموو کاتێکدا هەست ئەکەن بە پێویستی سەر شانیان، چرووکی و چاو برسێتی داگیریان ناکات، لە خواترسیەکەیان پاڵیان پێوە ئەنێ و زاڵیان ئەکات بەسەر هەر شتێکی تردا.

٢- ﴿وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ﴾ کەسانێکن ڕقی بەتینی خۆیان ئەخۆنەوە لەگەڵ دەسەڵاتدا، بەگوناه داخی سارێژ ناکەن، دیارە ئەوەش لەبەر خوایەو لە ترسی خوایەو بەرهەمی لە خوا ترسیەکەیانە. بێ‌گومان ڕق خواردنەوەی ڕووت بەس نیەو بەڵکو زۆر جار لەو ڕق خواردنەوەو بێ‌دەنگ بوونەوە خەشم و کینەیەکی سەختی دەروونی پەیدا ئەبێ کە زۆر خراپترە لە نەخواردنەوەی ڕقەکە جالەبەرئەوە بەدوای ئەوەدا ئەم سێیەمەش ئەهێنێ.

٣- ﴿وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ﴾ ئەوانەی کە ئەبوورن لە مەردومان و چاوپۆشیان لێ ئەکەن و دڵیان پاك ئەکەنەوە لە ئاستیان لەبەر خوا.

٤- ئەم چاو پۆشی و لێبووردنە لە چەند ڕوویەکەوە شتێکی شیرین و بەکەڵکە:

أ- چاکە و پیاوەتی و مرۆڤاتیە لەگەڵ لێ بووراوەکە.

ب- پەند و تەمێیە بۆ تاوانبارەکە کە شەرم بیگرێ و ئیتر خراپە و دەست درێژی نەکات، هەروەها پەند و تەمێیە بۆی کە ئەویش لێ بوودەبێت لە خەڵکی.

ت- ئەو ڕق و خەشمەی کە ئەخورێتەوە بارێکی قورس و گرانە بەسەر دڵەوە، تەم و تاریکیە لە دەروندا ئاگرێکی بڵێسە دارە بەسەر نەفسەوە، کابرای داخ لە دڵ بەو لێ بووردنە ئەو هەموو نارەحەتیە لەسەر خۆی لا ئەبا، کەواتە ڕێگەی بەختەوەری هەر ئەمەیە کە قورئان نەخشەی کێشاوە.

(ئیمامی ئەحمەد) حەدیسێ ئەهێنێ لە(ئەنەس)ەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: هەر کەس ڕقی بخواتەوە کە بتوانێ بەجێی بێنێ خوا دڵی پڕ ئەکات لە ئارام و بڕوا،(ئیبن و جەریر) لە(حەسەن)ەوە کە خوا لە ڕۆژی دوایی دا ئەفەرمووێ: باڕاست بێتەوە هەرکەس کە ئەجری لەسەر خوایە، ئینجا هەرکەسێك ڕاست ئەبێتەوە کە لێ بووردە بێ لە جیهاندا لەبەر خوا. بێگومان ئەو کەسانە کە ماڵ بەخت ئەکەن لەبەر خوا لە خۆشی و ناخۆشی و لە کاتی دەسەڵات و دەست تەنگی دا، ئەو کەسانەی کە ڕقی خۆیان ئەخۆنەوە و لێ ئەبوورن و چاوپۆشی ئەکەن لەبەر خوا، ئەو کەسانە چاکە کارو کردەوە چاکن ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾. خوایش چاکەکاران و چاك کردەوەکانی خۆش ئەوێ، واتە ئەوانەی کە کردەوەیان بە جۆرێکی شیرین و شایستەیە وەك لە حەدیسی(بوخاری و موسلیم)دا فەرمووی: ئەوەی کە خوابە جۆرێ بپەرستێ، وەك بە چاو ببینێ، چونکە ئەگەر تۆ ئەو نابینی ئەو تۆ ئەبینی.

ئینجا لێرەدا مەبەست هەر ئەو خاوەن سیفەتانەن، یان بە تێکڕایی مەبەستەو دیارە خاوەنی ئەو سیفەتانە لێرەدا سەردەستەن و لە یەکەمجارەوە بەر ئەکەون؟ بە هەرکام ڕێکەو ئەگونجێ و هێنانی ئەم وتەیە بەرزیی و بەڕێزیی ئەو سیفەتانە نیشان ئەدات، بەڕاستی جێی خۆیەتی ئەو سیفەتانە بەو جۆرە نیشان بدرێن، چونکە هەر گەل و کۆمەڵێك دەست گیرۆیی و چاوپۆشی و لێبووردنی تیا بلاو ببێتەوەو پاك بێ لەکینەو ڕق، هەر ئەو گەلە بەختەوەری ڕاستەقینەیە لە هەردوو جیهاندا، وە شیاوی ئەوەن کە خۆشەویستی خوا بن.

شیرینی و بەرزیی ئەم سیفەتە قورئانییانە دەرئەکەوێ کە بڕواداران هەڵسن پێیان و لەژیاندا بەدییان بێنن، لەبارەی هەڵسان بەم سیفەتانی ئێرە(ئیامامی بەیهەقی) هەواڵێ ئەهێنێ، بەڕاستی زۆر سەرسوڕهێنەرە، هەر لەدەست قورئان دێت پەروەردە کردن و پێگەیاندنی ئەم هەڵکەوتووانە کە پێگەیێن لەژێر چاودێریی ئەم قورئانەدا! ئەو ئیمامە ئەفەرمووێ:(عەلی کوڕی حەرزەتی حسین) –خوای لێ ڕازی بێت– کەنیزەکێکی بوو، جارێ مەسینەیەکی هێنا ئاو بکا بەسەر سەرو دەم و چاوی عەلی دا، مەسینەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە سەری شکاند، ئەویش سەری بەرز کردەوە بۆلای کە بۆچی وای کرد، کە نیزەکەکەیش وتی: خوا ئەفەرمووێ: ﴿وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ﴾ دەست بەجێ عەلی فەرمووی: ئەوا ڕقەکەم خواردەوە، ئینجا وتی: خوا ئەفەرمووێ: ﴿وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ﴾ عەلیش فەرمووی: ئەوا خوا لێت ببوورێ، ئینجا وتی: خوا ئەفەرمووێ: ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ عەلیش فەرمووی: کەواتە بڕۆ ئازاد بەلە ڕێی خوادا!!

ئەم تەفسیرەی کە کردمان بۆ ئەم وتەیە: ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ لەسەر ئەمە بوو کە ئەم وتە دەست نیشان نیە بۆ سیفەتێکی تری جیاواز، ڕای زۆربەش لەسەر ئەوەیە، هێندێ لە زانایان ئەفەرموون: دەست نیشانە بۆ سیفەتێکی چوارەم و بەرزترە لە دوو سیفەتەکەی پێشی، ئەم هەواڵەی(بەیهەقی) کە هێنامان یارمەتی دەرە بۆ ئەم ڕایەو ئەیگەیەنێ،

وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُواْ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾

---

**کەواتە لەسەر ئەم ڕایە ئەڵێن: سیفەتی پێنجەم ئەمەیە کە ئەفەرمووێ: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً﴾ ئەو لە خوا ترس و پارێزەرانە کەسانێکن کە کاتێ کردەوەیەکی زۆر ناشیرین بکەن، واتە گوناهە گەورەکان یان ئەو گوناهانەی کە دەست درێژیان تیایە بۆ سەر مەردوم ﴿أَوْ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ﴾ یا ستەم بکەن لە نەفسی خۆیان، واتە گوناهە بچووکەکان بکەن یا ئەو گوناهانەی کە دەست درێژیان تیا نیە بۆ سەر مەردوم، کاتێ هەرکام لەوانە بکەن ﴿ذَكَرُواْ ٱللَّهَ﴾ بیری گەورەیی خواو هەڕەشەو تۆڵەو پرسیارو سزای ئەکەنەوە. ﴿فَٱسْتَغْفَرُواْ لِذُنُوبِهِمْ﴾بەهۆی ئەو دەست بەجێ داوای سڕینەوەو لێ بووردن ئەکەن بۆ گوناهەکانیان، واتە تۆبەو گەڕانەوەیەکی شەرعی ئەکەن، نەك ووتنی دەمی ڕووت، وەك هێندێ لە نەفامان بەوە هەڵخەڵەتاون کە بێگومان ئەو وتنە دەمییە مەبەست نیە لێرەداو نە لە هیچ شوێنێکی وێنەی ئێرەدا، ﴿وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ﴾ ئایا کێ ئەبورێ لە گوناهەکان بێجگە لە خوا! ئەم تێهەڵکێشە چەند شتێك نیشان ئەدات.**

**یەکەم: داوای لێبووردن ئەبێ هەر لە خوا بێ.**

**دووەم: هاندان لەسەر ئەو داوایە.**

**سێیەم: دەست نیشان بۆ بەڵێن و وەرگرتنی داواکە.**

**چوارەم: موژدە دان و دڵخۆش کردنی گوناهباران.**

**خاوەنی(روح المعانی) دەشتی گرنگی باس کردووە لە هێنانی ئەفەرمووێ: تێهەڵکێشەدا، ئینجا ئەوانە پەیشمان ئەبنەوەو داوای لێبووردن ئەکەن ﴿وَلَمْ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ﴾ نامێننەوە لە سەر ئەوکردەوە خراپانەی کە کردوویانە، واتە نامێننەوە بەبێ تۆبەو داوای لێ بووردن، ئیتر بە تەواوی واز وەهێنن یا ئەگەر دووچار بوونەوە دەست بەجێ بەدڵ نەگەڕێنەوەو بڕیاری نەگەڕانەوە ئەدەن، بەم جۆرەش هەر وەرنەگیرێنەوە، وەك لە حەدیس دا**

ئەفەرمووێ:(وإن عاد اليوم سبعين مرة) بابگەڕێتەوە بۆ سەر گوناهەکەی لە ڕۆژێکدا حەفتا جار، بەڵام با کەس بەمە هەڵنەخەڵەتێ و لای وابێ هەموو جارێ بە دەم بگەڕێتەوە کاری تەواوە، نە خێر وانیەو خوا ئاگادارە بە نیازو خەتەرەی دڵ، بەڵکو وەك وتمان ئەبێ بەدڵ پەیشمان ببێتەوەو بەدڵ و بەڕاستی بڕیاری کۆتایی هێنان و نەگەڕانەوە بدات، ﴿وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ﴾ ئەوانە نامێننەوە لەسەر ئەوەی کە کردەوەیانە لەکاتێکدا کە ئەزانن گوناهەو خوا جڵەوگیریی لێ کردووە، کەواتە مانەوە لەسەر گوناهێك کە خاوەنەکەی بە گوناهی نەزانێ و بیانووی ببێ لەو نەزانینەدا، وەك کەسێك کە تازە موسڵمان بووبێ یان کەسێك دوور بێ لە زانایانەوەو گوناهەکەشی گەورەو ئاشکرا نەبێ لە ئایینی ئیسلام دا، ئەو جۆرە گوناهانەو مانەوە لەسەریان قەیناکات، هەروەها گوناهێك کە زانایان کردبێتیان و بە هەوڵ و تێکۆشان و بیرکردنەوەی خۆیان ڕابەرو بەڵگەیەکیان بە دەستەوە ببێ و نەزانن هەڵەن، ئەو جۆرە گوناهانەش خوا لێیان ناگرێ وەك ئەو جەنگ و کوشتارەی کە ڕووی دا لەناو هاوەڵەکانی پێغەمبەردا(ﷺ)، ئەوە کە ڕووی دا لەناویاندا هەرکام لەوان بە هەوڵ و تێکۆشان و بیرکردنەوەی خۆی، خۆی بەڕاست و لەسەر هەق ئەبینێ، هەرکاتێ بۆی دەرکەوتایە لەسەر ناهەقە وازی ئەهێنا، ئەوەتا(حەرزەتی زوبەیر) -خوای لێ ڕازی بێت- لەکاتێکدا خەریك بوو جەنگ دەستی پێ ئەکردو بەرامبەر وەستابوون، لەوکاتەدا بۆی دەرکەوت کە(حەزرەتی عەلی) لەسەر هەقە، ئیتر دەست بەجێ وازی هێناو گەڕایەوە، ئەوەش بەهۆی ئەوەوە بوو کە(حەزرەتی عەلی) پێی فەرموو: سوێندت ئەدەم بەخوا لە بیرتە کە جارێ پێغەمبەر(ﷺ) باڵی خستە سەر شانی من و فەرمووی بە تۆ: تۆ جەنگ ئەکەیت لەگەڵ ئەم و تۆ ستەمی لێ ئەکەیت،(زوبەیر)یش فەرمووی: ڕاست ئەکەیت، ئیتر بەوە وازی هێنا.

خوای میهرەبان لە ئایەتی پێشوودا ڕێنموونی بڕوادارانی کرد بۆ ڕق خواردنەوەو لێ بووردن و چاوپۆشی کردن لەناو خۆیاندا، ئینجا لەم ئایەتەدا ئاگاداریان ئەکات بەسەر بەشێك لە لێ بووردن و چاوپۆشی خۆی لێیان تا ئەوانیش لەبەر تیشك و ڕووناکی ئەوە فێربن و بەخۆشی و پەرۆشەوە هەڵسن بەوەی کە ڕێنموونی بۆ کردن، بەڕاستی هەق وایە

هەموو کەس لەحاستی ئەم ئایەتە شەرم بیگریّو لە تریقیدا سەر داخات، وەرە برای بڕوادار بیربکەرەوە لەم میهرەبانیو چاوپۆشیە: تاوانباری خراپەکار کاتێ بگەڕێتەوەو داوای لێ بووردن بکات. ئەو خوای میهرەبانە ئەیخاتە ڕیزی لە خواترسە خۆپارێزەرەکان کە وان لە پلەی هەرە بەرزدا، ئەم تاوانبارانە دواناخات، بەڵکو بەرزیان ئەکاتەوە بۆ پلە بەرزەکەی ئەوان بەو مەرجەی کە لە ئایەتەکەدا دایناوە باسمان کرد!!

ئەم ئایینە پیرۆزە ئەزانێ ئەم ئادەمیە ـ بێجگە لەوەی کە خوا پاراستبێتی ـ لاوازە بەرامبەر هێزی ئارەزووەکانی بە جۆرێ دووچاری کردەوەی پیسو ناشیرینی ئەکەن، ئەزانێ هێزی ئەو ئارەزووانە بە تینە، لەبەرئەوە ئەوانەی کە ژێر ئەکەونو ئەچن بەدەم ئەو ئارەزووانەوە توندو تیژییو ڕەقی بەکار ناهێنێ لەگەڵیان، چەسپانی ناکات بۆ دەرکردەنیان لە میهرەبانی خوا بەهۆی ئەو کردەوە پیسو ناپەسەندانەوە، بەڵکو ئەیانگێڕێتەوە لای خۆیو ڕادەو پلەیشیان بەرز ئەکاتەوە، بەو مەرجەی کە باس کرا!

قاپی تۆبەو گەڕانەوەی لێ داناخات، وازی لێ ناهێنێ بەسەر گەردانی بگەڕێو بخولێتەوە، بەڵکو ڕێگەی ڕاستی نیشان ئەداتو دەستی ئەگرێو ئومێدو چاوەڕوانی لێبووردمی ئەخاتە بەرچاو بۆئەوەی بگەڕێتەوە بۆ سایەو پەنای خوا، هەرکات گەڕایەوە وەری ئەگرێ، مەگەر کاتی مردنو نائومێدی لە ژیان کە تازە ئەوە کاتی گەڕانەوە نیەو هەر گەڕانەوەیەك لەو کاتەدا ببێ بە ناچاریی هیچ منەتێکی تیا نیە.

مەبەست لەم ئایەتە ڕێ بەرەڵاکردن نیە بۆ خراپەکاریی، مەبەست ڕەوادانی نیەو نیشاندانی بەشتێکی ناچارییو سروشتی، وەك تاقمی واقیعییەکان ئەڵێن: بەڵکو مەبەست ـ وەك لە پێشەوە وتمان ـ دەرخستنی فراوانی چاوپۆشیو میهرەبانی خوایە تا ئەو ڕادەیە لە کاری زۆر پیسو ستەم ئەبوورێ، کەواتە هەرکەس مەرد بێو مرۆڤایەتی تیابێ بە بیستنی ئەم ئایەتە شەرم ئەیگرێو دوور ئەکەوێتەوە لە خراپەکارییو کردەوە بە پێچەوانەی فەرمانی خوای میهرەبان.

أُوْلَـٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَجَنَّـٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَـٰمِلِينَ ﴿١٣٦﴾

---

له خوا ترسه‌كانی كرد به‌دوو تاقم: تاقمی پاكانی بێ‌تاوان‌و تاقمی تاوانباری تۆبه‌كار. هه‌رچه‌ند ڕاده‌و پله‌ی تاقمی یه‌كه‌م به‌رزتره، به‌ڵام ـ میهره‌بانیه‌كه‌ی به‌ زیاد بێت ـ دووه‌می برده‌ ڕیزی ئه‌وان‌و به‌ تێكڕایی ده‌رباره‌ی هه‌ردوو ئه‌فه‌رمووێ: ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ﴾ ئه‌و له‌ خوا ترسانه ﴿جَزَآؤُهُم مَّغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡ﴾ پاداشتیان لێ بووردنه‌ لێیان له‌لایه‌ن په‌روه‌ردگاریانه‌وه‌ ﴿وَجَنَّـٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَـٰرُ﴾ چه‌ند باخات‌و به‌هه‌شتێكه‌ كه‌ ڕووباره‌كان دێن‌و ئه‌چن له‌ ژێریاندا ﴿خَـٰلِدِينَ فِيهَاۚ﴾ له‌كاتێكدا ئه‌وا له‌ خواترسانه‌ ئه‌مێننه‌وه‌ له‌و به‌ هه‌شتانه‌دا به‌ هه‌میشه‌یی‌و به‌ ئێجگاریی.

تاقمی دووه‌م ئه‌باته‌ ڕیزی یه‌كه‌م، چونكه‌ به‌و تۆبه‌و گه‌ڕانه‌وه‌ خراپه‌كانیان ئه‌سڕنه‌وه‌و وه‌ك هه‌ر نه‌یان كردبن، به‌ وێنه‌ی ئه‌وانیشن له‌ كرده‌وه‌ چاكه‌كاندا، وه‌ك وه‌رئه‌گیرێ له‌م فه‌رمووده‌وه‌ كه‌ ئه‌یهێنێ به‌ دوای به‌ڵێنه‌كه‌داو به‌رزیی‌و پیرۆزییه‌كه‌ی نیشان ئه‌دا، ئه‌فه‌رمووێ: ﴿وَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَـٰمِلِينَ﴾ ئه‌وه‌ی به‌ڵێنی پێ درا زۆر باشه‌ به‌ ئه‌جرو كرێی ئه‌و ئیش كه‌رانه‌، كه‌واته‌ تاقمی دووه‌میش وه‌ك یه‌كه‌م خاوه‌نی كرده‌وه‌ی چاكن. به‌ڵێ بێ‌گومان تاقمی یه‌كه‌م گه‌وره‌ترن‌و پایه‌و پله‌یان به‌رزتره‌ به‌لای خواوه‌، وه‌ك ئاماژه‌ ئه‌كات بۆنه‌وه‌ كه‌ كۆتایی ئایه‌ته‌كه‌ی هێنا به‌وه‌ی كه‌ فه‌رمووی: ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ واته‌ خوا ئه‌وانه‌ی خۆش ئه‌وێ كه‌ ئه‌و ویستنه‌ ئه‌وپه‌ڕی ڕاده‌و پله‌ی به‌رزه‌ كه‌ بڕوادار پێی بگات، به‌ پێی ئه‌م ته‌فسیره‌كه‌ تێپه‌ڕی كرد ئه‌م ئایه‌ته‌ سه‌ربه‌خۆ نیه‌ به‌ڵكو به‌ستراوه‌ به‌ ئایه‌تی پێشه‌وه‌، ئه‌مه‌ ڕای هێندێكه‌ له‌ زانایانی ته‌فسیر، له‌ یه‌كه‌مجاره‌وه‌ بڕوام به‌و ڕایه‌ به‌هێز تر بوو له‌به‌رئه‌وه‌ هه‌ڵم بژارد، به‌ڵام ئێستا دڵم گۆڕاو ڕای ئه‌وانه‌م به‌ دڵه‌ كه‌ ئه‌فه‌رموون: ئه‌م ئایه‌ته‌ سه‌ربه‌خۆیه‌و هه‌ركام له‌م دوو ئایه‌ته‌ حاڵ‌و باری ده‌سته‌یه‌ك له‌ بڕواداران ده‌رئه‌خات، ئایه‌تی پێشوو باسی بڕوادارانی خۆپارێزه‌ری دوور له‌ گوناهو تاوانه‌، ئه‌م ئایه‌ته‌ش باسی بڕوادارانی تاوانباری تۆبه‌كاران ئه‌كات، ماوه‌ته‌وه‌ تاقمی سێ یه‌م كه‌ بڕواداری نه‌گه‌ڕاوه‌ی تۆبه‌ نه‌كه‌ره‌ كه‌ ئه‌م ئایه‌ته‌ ده‌ست نیشانی بۆ ئه‌كات، كه‌ فه‌رمووی: ﴿وَلَمۡ يُصِرُّواْ﴾ كه‌واته‌ بڕواداری وا هه‌یه‌ هه‌ر واز ناهێنێ‌و

ئەمێنێتەوە لەسەر خراپە، ئەم تاقمە کە بێ دەنگە لێی حاڵو باری دەرناخات بەلای موعتەزیلەوە وان لە ئاگرداو ڕزگارنابن، بەلای ئێمەوە سەرەنجامو پاشە ڕۆژیان هەر بەهەشتەو کاریان حەواڵەی خوایە، ئەگەر ویستی سزای هەرکەس ئەداو لەپاشدا ئەیخاتە بەهەشت، ئەگەر مەیلی هەر کامی بوو بەبێ سزا ئەیخاتە بەهەشت، ئەم تاقمە ئەوەندە پیاون ڕێز بگیرێن و موژدەیان پێبدرێ، وە بەهۆی بڕواکەیشیانەوە نائومێد ناکرێن، بێگومان ئەم ڕایە ڕێکە لەگەڵ چەند حەدیسی زۆرو زەبەندەدا، ڕێکە لەگەڵ فراوانی میهرەبانی خوادا.

لەپێشەوە ئاماژەم کرد بۆ پەیوەندی پەیوەستی ئەم چەند ئایەتەی کە هاتن لە پێش دەست پێکردن بەباس و بەسەرهات و چۆنێتی جەنگەکەوە، ئینجا لەپاش تەفسیری ئەو چەند ئایەتە بە جوانی هێندێ تر ئەو پەیوەندیو پەیوەستیە ڕوون بکەمەوە، هۆی هێنانی ئەو فەرمان و تەمێ و ئامۆژگاریو سیفەت و نیشانانە باش تر دەرخەم، بێگومان ڕژێمی سووخۆریو دەق گرتن بە سووخواردنەوە پیاو لەپیاوداری ئەخات، چونکە هەمیشە دڵو دەروونی خەریك ئەکات و هەموو مەبەست و ئاواتی ئەبەستێتەوە بە زۆر کردن و کۆکردنەوەی سامان و پەرژانی ناهێڵێ بۆ هیچی تر، کەواتە هەر بە خەیاڵیشیاندا نایەت تێکۆشان و بەربەرەکانێی دوژمنانی خوا، هەروەها زاڵبوون بەسەر چرووکیو چاوچنۆکی، زاڵبوونی بەسەر ڕق و خەشمدا، زاڵبوون بەسەر گوناهو تاواندا، گەڕانەوە بۆلای خوا بەتۆبەو ئامان و داوای لێ بووردن و ڕەزامەندی خوا کە بەو ئایەتانە ڕێنموونی کردین، هەموو ئەوانە پێویستن بۆ زاڵبوونی موسڵمانان بەسەر دوژمناندا! چونکە دوژمنایەتی موسڵمانان ئەبێ لەگەڵ کەسانێ بێت کە یاخین لە خواو نە خۆیان و نە ئارەزوویان و نە ڕژێمی ژیانیان مل کەچ ناکەن بۆ خوا، ئەو دوژمنانە نموونەو وێنەی بەدخوییو تاوانن، هیچ هۆیەکی تریان نیە بۆ دوژمنایەتیو تێکۆشان و جەنگ کردنی موسڵمانان، موسڵمان ئەبێ هەر لەبەر خواو لەڕێی خوادا بەربەرەکانیو دوژمنایەتیو جەنگ بکات. کەواتە پەیوەستی ئەو ڕێنموونیو تەمێو ئامۆژگاریەی کەلەو ئایەتانەدا هات زۆر بەتین و بەهێزە لەگەڵ ئەو بەسەرهات و ڕووداوانەی کە لەو جەنگەدا بەدی هاتن کە بریتی بوون لە جوڵانەوەی هێندێ بە پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) بە ئومێدو ئارەزووی دەست کەوت و غەنیمەت، خود پەسەندیو شوێن کەوتنی ئارەزووی نەفس لەلایەن(ئیبن و ئوبەی)و کۆمەڵەکەی، لاوازیو خۆنەگریی لەلایەن ئەوانەی کە خۆیان بۆ نەگیراو تێك شکان و ڕایان کرد.

قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُمۡ سُنَنٞ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾ هَٰذَا بَيَانٞ لِّلنَّاسِ وَهُدٗى وَمَوۡعِظَةٞ لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿١٣٨﴾ وَلَا تَهِنُواْ

---

لە پاش ئەوسەرەتاو پێشەكیە ئینجا دەست ئەكات بەدوان لەبەسەرهاتی جەنگەكەو نیشاندانی چۆنێتیەكەی، لە یەكەمجارەوە دەست نیشان ئەكات بۆ باوی خوا دەربارەی بێباوەڕیان، بۆئەوەی موسڵمانان تێبگەیەنێ كە زاڵبوونی ئەو بێباوەڕیانە لەو جەنگەدا شتێكی هەمیشەیی و دامەزراو نیەو باوی خوا لەسەر ئەوە نیە، بەڵكو ئەوە ڕووداوێكی كاتی بوو، لەبەر هۆیەكی تایبەتی، ئەگینا باوی خوا هەر لەسەر دوا ڕۆژی خراپ و لە ناوچوونە بۆ بێباوەڕیان، ئینجا فەرمانیان پیا ئەدا بەخۆگریی و ئینجا دڵخۆشی و دڵنەواییان ئەكات، ئەفەرمووێ: ﴿ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُمۡ سُنَنٞ﴾ بێگومان تێپەڕی كردو ڕۆیشت لەپێش ئێوە چەند ڕێ و ڕەوشت و باوێك لەبارەی دوا ڕۆژو چارەنووسی بێ بڕوایانەوە بە درێژایی مێژوو، لە بارەی تێهەڵچوون و بەربەرەكانێی هەق و بەتاڵ، گۆڕانی چەرخ و ڕۆژگار هەرجار بەبارێكدا، لەبارەی تاقی كردنەوە بۆ پاڵفتەكردن، تاقی كردنەوەی هێزی خۆگریی لەكاتی تەنگ و چەڵەمەدا، شایستەیی خۆگران بۆ سەركەوتن و بێباوەڕیان بۆ لەناو بردن و خەشمی خوا. واتە لەپێش ئێوە چەند گەل و میللەت هاتن و تێپەڕیان كرد، بڕوادارو بێبڕواكانیان بەر بەرەكانێیان كرد لە لەناو یەكداو لەپاش دا بێبڕواكان ژێر كەوتن و لەناو چوون، بڕواداران زاڵ و سەركەوتوو بوون، هەر سەكەروتن و ژێر كەوتنێك كە ڕووی دابێ ـــ وەك هەموو كاروباری ئەم بوونەوەرەـــ لە خۆڕایی و گۆترەكاری نەبووە، بەڵكو هەموو شتێ ڕێ و هۆی تایبەتی خۆی بووەو هەیەو ئەبێ هەر لەو ڕێیەو هۆ تایبەتیە بەدی هاتبێ و بەدی بێت، هەموو شتێ ڕژێمی دامەزراو یاسای نەگۆڕاوی خۆی هەیە بە پێی باوو بڕیاری خواو لێ زانین و كار دروستی خوا، قورئان سەرنجی موسڵمانان ڕائەكێشێ و ئەیانگێڕێتەوە بۆ باوو ڕەوشتەكانی وا كە تێپەڕیان كردو ئەفەرمووێ: ﴿فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ ئینجا بڕۆن بگەڕێن بە زەوی دا ﴿فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ﴾ بەهۆی ئەوەوە سەرنج بدەن ببینن ئایا چۆن بوو دوا ڕۆژی بێبڕواكان؟ بگەڕێن و سەرنج بدەن بەبیرو ژیریی یا بە لەش و جەستەش تا بە چاو

شوێنەواری ئەو بێباوەڕیانە ببینن وەك(عادو سەمود) و گەلەکەی(لوط) و باقی تر، کە ئەوانە زانراوو بەناو بانگ بوون بەتایبەتی لەلای ئەو یەکەم چینەی کە ئەم قورئانەیان چوو بە گوێچکەدا، چەند جار لە کاتی کاروانی هاوینو زستان گوزەریان ئەکرد بەلای ئەو شوێنە چۆڵو وێران بوانەدا، بە دەماو دەمو بە مێژوو بەناو بانگ بوو کە دانیشتوانی ئەو شارو وڵاتانە یاخی بوون لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکانیان، بێبڕوا بوون تا خوا ئەوەی بەسەر هێنان، هەروەها داستانو بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەرانەو شوێن کەوتووەکانیان بەناو بانگ بوو کە چۆن سزاو ئازار دران و ئەوانیش هەر خۆیان گرتو تاڵاویان چەشتو فیداکاریان کرد لە ڕێی ئایینی خوادا، کەواتە بەو سەرنج ڕاکێشانو بیرخستنەوە لە لایەکەوە بڕواداران دڵخۆشو دڵنیا ئەکات بەسەرکەوتنی ئەوانو ژێر کەوتنو لەناو چوونی دوژمنەکانیان، لەلایەکی ترەوە هانیان ئەدات لەسەر خۆگریی و فیداکاریی لە ڕێی ئایینەکەیاندا، لەسەر نەگۆڕانو لە نەدان لە ڕێگە ڕاستەکەی خۆیان، نەدۆڕانو هەڵنەخەڵەتانیان بەهیچ هێزێو بەهیچ شتێ، ئامۆژگاری بەو جۆرە قورئان ڕابردووی ئادەمی پەیوەست کرد بە حاڵو باری ئێستاو ئامادەیان، بەهۆی ئەوەوە دەست نیشانیان بۆ ئەکات بەبارو حاڵو چۆنێتی داهاتوویشیان، یەکێتی ئەخاتە نێوان ئەو دوو حاڵ وبارە تا مەردوم تەمێ خواربێ بەداستانو بەسەرهاتی ڕابردوو، بێگومان مەردوم لە جیهاندا بە تایبەتی ئەو یەکەم چینە، ئەو یەکێتی بارو ئەو پەیوەندیو پەیوەستیەی بە دڵدا نەئەهاتو هەر بیری لێ نەئەکردەوە ئەگەر قورئان نەهاتایەو ئاوا زاناو تێگەیشتووی نەکردنایە.

قورئان بەو جۆرە سەرنجی ڕاکێشانو ئینجا ئەفەرمووێ: ﴿هَٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ﴾ ئەمە ڕوون کردنەوەو سەرنج ڕاکێشانێکە بۆ خەڵکی بە تێکڕایی، بەڵام هەموو کەس سوودی لێ وەرناگرێ، بەڵکو هەر بڕواداری لە خواترس ەك ئامادەنو دڵیان کراوەیە بۆ وەرگرتنی پەندو ئامۆژگاری، سوود وەرئەگرن لەبەرئەوە ئەفەرمووێ: ﴿وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ﴾ ڕێنموونیو ئامۆژگاریە بۆ لە خواترسە خۆپارێزەکان ئینجا ڕووی فەرموودەی کردە بڕوادارەکان بە بەهێزکردنو دڵنەوایی، فەرمووی: ﴿وَلَا تَهِنُوا﴾ سستو دڵ لاواز مەبن لە جەنگ کردنو تێ جەنگین لەگەڵ دوژمندا، لە تێکۆشانو فیداکاری لە ڕێی خوادا.

وَلَا تَهِنُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ ٱلْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُۥ

---

﴿وَلَا تَحْزَنُوا۟﴾ غەمبار مەبن لەسەر ئەوی کە دووچاری ئەبن‌و بەسەرتان دێت لەو ڕێگەیەدا، واتە ئەو تێك شکان‌و زام‌و کوشتنەی کە بەسەرتان هات لەو جەنگی(احد)ەدا با بێ‌هێزو سست‌و غەمبارتان نەکات ﴿وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ﴾ لەکاتێکدا کە هەر ئێوە بەرزو بڵند ترن، عەقیدەو بیروباوەڕتان بەرزو بڵندترە، بەرنامەتان بەرزو بڵندترە، کارو فرمانتان بەرزو بڵندترە، چونکە ئێوە هەر خوا ئەپەرستن، لەسەر بەرنامەی ئەون، ئێوە ڕێ نیشان دەرو ئامۆژگاری کەری هەموو جیهانیانن، لەکاتێکدا کە دوژمنانتان خوا نەپەرسەو لای داوە لە ڕێ‌و بەرنامەی خواو سەر لێ تێك چووو گومڕایە، پادەو پلەی ئێوە بەرزو بڵند ترە لە زەوی دا، چونکە ئێوە جێگرو جێنشینی هەموو پێغەمبەران‌و خواناسانن، میرات‌و کەلەپوور وەرگری ئەوانن‌و خوا بەڵێنی ئەوەی پێ‌داون، ئەوان بەرەو نەمان ئەڕۆن، کەواتە هەر ئێوەیش زاڵ‌و سەرکەوتوو ئەبن بە مل ئەواندا، چونکە ـ وەك دەست نیشانی بۆ کرد ـ باوی خوا هەروا هاتووە. ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە بڕواداران، واتە ئەگەر ئێوە بەڕاستی بڕواداران ئەبێ سست‌و دڵ لاواز نەبن، غەمبار نەبن لەسەر هەرچی دووچاری ئەبن. وە ئەگەر ئێوە بڕواداری ڕاستەقینەن هەر ئێوە بەرزو بڵندو زاڵ‌و سەرکەوتوون. ﴿إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ ٱلْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُۥ﴾ ئەگەر ئێوە زامتان لێ ئەکەوێ‌و زامدار ئەبن، بێ‌گومان زام کەوت لەو کۆمەڵە دوژمنە بە وێنەی زامی ئێوەو ئەوانیش زامداربوون لە ساڵی پێشوودا لە(بەدر)دا، یان هەر لەو جەنگی(احد)ەدا کەلە یەکەمجارەوە موسڵمانەکان زاڵ‌بوون بەسەر ئەو دوژمنانەداو ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن‌و زامی زۆریان لێ کردن، تا لایاندا لە گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەریی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوکاتە کارەکە پێچەوانە بوویەوە، وەك دەست نیشانمان بۆ کرد لە سەرەتاوە لە مەو پاش لە ئایەتەکانەوە ڕوون ئەبێتەوە، واتە نابێ کوژران‌و زامدار بوونی ساڵی(بەدر) وە نەبە کوژران‌و زامدار بوونی ئەم جەنگی(احد)ە، یان مەبەست ئەوەیە: دڵگران‌و تەنگە تاو مەبن بەم کوشتن‌و زامدار بوونە، چونکە ئێوەش وێنەی ئەوەتان بەسەر بێ‌بڕواکان هێنا لە(بەدر)دا یان هەر لە(احد)یش دا، ئینجا هەمیتر دڵنەواییان ئەکات بە باوێك لە باوەکانی،

**ئەفــەرمووێ: ﴿وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ﴾ ئــەو چــەرخ و ڕۆژگــاری زاڵبــوون و سەرکەوتنانەی ناو ئادەمی، ئێمە ئەیانگۆڕین لە ناویاندا، هەر جارێ بە بارێکداو هەر دەمە بەدەستەو تاقمێکی ئەدەین، واتە باوی ئێمە هەر وا بووە کە بە نۆبە سەرکەوتن و زاڵبوونمان داوە بە مەردومان، ئەویش بە پێی باوێکی تری خوایە کە هۆی زاڵبوون و سەرکەوتن و تێك شکان و ژێر کەوتنی داناوە لەم جیهانەدا هەرکەس دەستی گرت بەهۆی هەر کامەوەو هەرکامی هەڵبژارد بۆ خۆی خوا ئەوەی بۆ ئەکات، هەروەها بە پێی لێزانی و کار دروستی خوایە لە هەموو کاروباری ئەم بوونەوەرەدا، لەبەرئەو مەبەست و بەرژەوەندیانەی کە خوا خۆی باش ئەزانێ، وەك هێندێکمان بۆ دەرئەکەوێ بەم چەند خاڵەی کە لێرەدا ئاماژەیان بۆ ئەکات بەبۆنەی ئەم تێك شکانەی کە لەم جەنگەدا ڕووی دا:**

**أ- ئەفەرمووێ: ﴿وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا﴾ واتە باوی ئێمە بەو جۆرە هات لەبەر چەند بەرژەوەندیەك، لەبەرئەوەی خوا بزانێ بەوانەی کە بڕوایان هێناوە بە جۆرێ کە جیا ببنەوە لە بێبڕواو ناپاکان، واتە لەم جەنگەدا تێك شکان بۆ ئێوە بوو تا بەهۆی ئەوەوە دەرکەوێ ئەوانەی کە بڕواداران، بێگومان بە پێی ئایینی ئیسلام خوا هەموو شتی زانیوە لە پێش دروست کردنی ئەم بوون و بوونەوەرە بەبێ سەرەتا بۆ زانینەکەی، بەهیچ کلۆجێك ناگونجێ کە خوا زانینێکی تازەی بۆ فەراهەم بێت، جالەبەرئەوە ئەم ئایەتەو هەموو وێنەکانی لا ئەدرێن لە ڕووکەش و ڕواڵەتەکانیان، ئەبێ بەجۆرێکی شایستەو گونجاو ڕاڤەو تەفسیر بکرێن، زانایانی ئیسلام ئەم بارو جۆرەیان باس کردووە بە چەند شێوەیەك، لێرەدا دوانیان باس ئەکەم:**

**١- مەبەست ئەوەیە تا دەرکەوێ ئەوەی کە خوا زانیویەتی، واتە خوا زانیویەتی کە کێ بڕوادارەو کێ ناپاك و بێبڕوایە؟ بەڵام ئەو زانراوە دەرنەکەوتووەو کەسی تر زانا نەبووە پێی، بەهۆی ئەو جەنگ و ڕووداوەوە دەرکەوتووە بۆ مەردوم و زانا بوون پێی.**

**٢- هەموو شتێ کە پەیدا ببێ زانایە پێی لە پێش پەیدا بوون و لەپاش پەیدا بوون. مەبەست بەم زانینە لێرەدا زانینی پاش پەیدا بوونە، واتە خوا بزانێ لە بڕوای بڕواداران بە بەدی هاتوویی.**

وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَآءَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَيَمْحَقَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٤١﴾ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٢﴾

---

ب- ﴿وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَآءَ﴾ واته ئەو تێك شكانە بۆئەوە بووە خوا لە ئێوە چەند كەسێك هەڵبژێرێ بۆ خۆی‌و بیگیرێ بەشەهید، كەواتە ئەو كوژرانە بۆ ئەوانە سەرشۆڕیی نیە، بەڵكو سەربەرزی‌و خەڵات كردنە.

ئەو خوا پێداوانە شایەتی ڕاستەقینەن لە سەر ڕاستی ئەو ئایینە ڕاست‌و پیرۆزەی كە خوا بۆی ناردوون، ئەوانە بە هەموو تێكۆشان‌و بەخوێن‌و بە ماڵ‌و بەگیانیان شایەتی ئەدەن لەسەر ڕاستی ئەو ئایینە، بەو شایەتیە دەری ئەخەن‌و ڕوونی ئەكەنەوە كە بڕوای ڕاستەقینەیان هەیە بەو ئایینە، خۆیان یەكبار كردووە‌و بەڕاستی لێ بڕاون بۆ خواو بۆ ئایینەكەیان. ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ خوا ستەم كارانی خۆش ناوێ، واتە خەشمی هەیە لێیان، ئیتر ئایا مەبەست بەم ستەم كارنە لێرانە ناپاكەكان بێت بە سەرۆكایەتی(ئیبن‌و ئوبەی) كە پشتی موسڵمانەكانیان چۆڵكرد لەو كاتە تەنگەدا وەك باسمان كرد، یان مەبەست بت پەرستەكان بێت؟ بە هەر حاڵ‌و لەسەر هەر بار قوتار بوونی ئەو ناپاكانە لە كوشتن‌و زامدار بوون، نیشانەی خۆش ویستنیان نیە بەڵكو بە پێچەوانەوە نیشانەی خەشمی خوایە كە خوا بێبەشی كردن لە ئەجرو پاداشتی تێكۆشان لە ڕێی خوادا، هەروەها زاڵكردنی لەشكری بت پەرستان نیشانەی یارمەتی دان‌و میهرەبانی خوا نیە لەگەڵیان، بەڵكو بە پێچەوانەوە ئەو زاڵكردنە لە شەرعدا پێی ئەوترێ:(إستدارج) ئەبێ بە مایەی زیادە گومرایی‌و لانەدانیان لەو ڕێ چەوتەی كە داویانەتە بەر، هەم ئەو تاقی كردنەوە بۆ بڕواداران هۆی پاڵفتە كردنیان بوو، وەك لەم خاڵەیشەوە دەرئەكەوێ.

ت- کە ئەفەرمووێ: ﴿وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ بۆئەوەی ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە خوا پاكو خاوێنو پاڵفتەیان بکات لە گوناهو لە هەر چڵكو چەپەڵیو شتێکی ناشایستەی دەروونی، وەك ئاڵتوونی تێزاب کە بە بوتە پاكو پاڵفتە ئەکرێ لە هەر ژەنگو چڵكو گەدرێكو هەر ئاڵتوونە کە ئەمێنێتەوە بە سافی.

زۆر جار مەردوم خۆی ناناسێو بێئاگایە لە هەر عەیبو لەکە یەك کە هەیە شاراوەیە لەناو چرچو لۆچو کونو قوشبنی دڵو دەروونی دا، لەکاتی ئارامیو خۆشی دا خۆی بە پاكو خاوێن دائەنێ، بۆ وێنە: زۆر لە موسڵمانان وایە کە هەموو شتیان هەر بۆ خوایە هیچ هێزێك نیە بیانترازێنێ لە ڕێی ڕاست، لایان وایە کە ئاسانە لەسەریان فیداکاری بە ماڵو بەگیان لە ڕێی خوادا، لایان وایە بەهێزو مەردو چالاکنو باکیان هەر لە خوا هەیە، بەلام لەکاتی تەنگیو ترسو ناخۆشی دا، لەکاتی کردەوەدا بە پێچەوانەوە دەرچوون، ئەوەتا ئەو تاقمە تیرەندازە کە چاویان کەوت بەو ماڵو غەنیمەتە خۆیان بۆ نەگیرا فەرمانەکەی پێغەمبەریان(ﷺ) لە بیرنەماو شوێنەکەی خۆیان چۆڵ کرد، ئەوە بوو زۆر لە موسڵمانەکان پرژو بلاو بوونەوەو ڕایان کرد لە کاتی سەختیو تەنگی دا، بێهێزییو لاوازیی زاڵبوو بەسەر دڵیاندا، بەڵکو هێندێ نائومێدیی دڵی داگیرکردن! کەچی لەپاش ئەم پاڵفتە کردنە هەر ئەمانە بانگ کران کە بچنەوە بە پیریی لەشکرەکەی قورەیشەوە، ئەمانە لەپاش ئەوە بەو هەموو زامەوە زۆر بە چالاکیو سۆزو بلێسەوە هاتنە پێشەوەو ڕۆیشتن تا گەیشتنە ئەو شوێنەی کەناوی(حمرا ءالاسد)ە.

خوای گەورە ئەو کۆمەڵەی پەروەردەکرد کە هەڵی بژاردن بۆ سەرکردایەتی ئادەمی، جالەبەرئەوە بەو جۆرە پاڵفتەو پاكو خاوێنی کردن، تا شیاوو شایستەی ئەو ڕادەو پلە بەرزەبن، وە بۆئەوەی لەسەر دەستی ئەواندا بەدی بێت، شکانو کەمو کوڕی بێباوەڕیانو بێ دەسەلاتیو لەناو چوونیان، ئەوەش بە پێی باوی خوا کە هەرکاتێ هەق بە پاكو

خاوێنی بێت و بەئاشکرا دەرکەوێ، ناهەق و هەڵگرانی ئەشکێنێ و بە نائومێدیی ون ئەبن لەبەرچاوو لەناو ئەچن، بەجۆرێ بوون و نەبوونیان یەکسان ئەبێت، وەك دەست نیشانمان بۆ ئەکات لەم خاڵی چوارەمەدا:

پ- کە ئەفەرمووێ: ﴿وَيَمۡحَقَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ واتە خوا ئەو سەختی و تێك شکانەی هێنا بەسەر موسڵمانەکان، بۆئەوەی پاڵفتەو پاکو خاوێنیان تا بەهۆی ئەوەوە بێبڕواکان لەناو بەرێ و لاوازو بێنرخیان بکات، بەپێی ئەم تەفسیرە ئەم خاڵی چوارەمە ـ وەك سێ خاڵەکەی پێشوو ـ هۆی ئەو تێك شکانەو بەسەر هاتە سەخت و تەنگە بوون کە هاتن بەسەر موسڵمانەکان، ئەمە دەستەیەکە لە زانایان، زۆربە ئەفەرموون: ئایەتی پێشوو وای گەیاند کە شکان و زاڵبوون بە نۆبەیە وەك باسکرا، وە سێ خاڵە پێشووەکە کە ئاماژەیە بۆ هۆی تێك شکانی موسڵمانان و زاڵبوونی بێبڕوایان، ئەم خاڵی چوارەمە هۆی تێك شکانی بێباوەڕیانەو زاڵبوونی موسڵمانان بەسەریاندا، ئەو کاتە ئەڵێن: خوا موسڵمانەکان زاڵئەکات و بێبڕوایان تێك ئەشکێنێ بۆئەوەی بێبڕواکان نائومێد بکات و کەم و کوڕو لاوازیان بکات، یان لە ڕیشەیان بێنێ و بە تەواوی لەناویان بەرێ، وەك ئەو کۆمەڵەی کە جەنگیان کرد لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ئەو بارە بەردەوام بوون و پەشیمان نەبوونەوە، بێگومان بەم جۆرەش باشەو ئەگونجێ. شتێکی زۆر سەیرو سەرسوڕهێنەرە کە زۆربەی ئایەتەکانی قورئان چەند بارو ڕوویەك هەڵئەگرن و هەمووش هەر گونجاوو ڕێکن و بەدی هاتوون!

لەپاش دڵخۆشی دانەوە بەو خاڵانەی کە تێپەڕیان کرد، ئینجا بەبێزارییەوە شێوە پرسیارێك ئاڕاستەی تێك شکاوەکانی(احد) ئەکات، بۆ ئاماژەکردن بە مەبەست و ئامانجی هەرە بەرز کە گەیشتنە بە بەهەشت، بۆ ڕاست کردنەوەی چەند بۆچوونێکی هەڵەیان لەبارەی باوو ڕەوشتی خوا لە بانگەوازەکانی دا، لە زاڵ کردن و لەبارەی کردەوەو پاداشت و تۆڵەی،

دەست نیشانیان بۆ ئەکات کە ڕێگەی بەهەشت کۆسپ و گرێی زۆری تیا هەیە، توێشووی ئەو ڕێیە هەر ئارامی و خۆگری لەسەر سەختی و ناڕەوحەتی ئەو ڕێیە، توێشووی بریتی نیە لە ئومێدو ئاوات کە لەکاتی تەنگانەو تاقی کردنەوەو پاڵقتە کردندا بەهیچ ئەچن و کەڵك و نرخیان نابێ، ئەفەرمووێ: ﴿أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ﴾ ئایا ئێوە وا گومانتان بردووە کە ئەچنە بەهەشت ﴿وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ﴾ لەکاتێکدا کە هێشتا زانا نەبووە بە وانەتان کە تێکۆشان و جەنگی کردبێ ﴿وَيَعۡلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ هێشتا زانا نەبووە بە خۆگرەکانتان، واتە هێشتا تێکۆشان و خۆگرییتان نەبووەو بەدی نەهاتووە، چونکە هەر شتێك خوا زانا نەبێ پێی ئەو شتە نیە، یان مەبەست ئەوەیە: هێشتا خوا زانا نەبووە پێیان بە بەدی هاتوویی، بەڵکو زانا بووە پێیان بە بەدی نەهاتوویی، دیارە چوونی بەهەشت بەستراوە بە بەدی هاتنیانەوە، واتە شایستە نیە بۆ ئێوە ئەو گومانە بەرن و لاتان وابێ کە بەسە بۆتان بەدەم خۆتان بە تێکۆشەرو خۆگر دابنێن، بەڵکو ئەبێ بزانن کە کردەوە مەرجەو بەبێ کردەوە کارەکەتان ناڕوا، ئەبێ بزانن کە تێکۆشانی تەنیاش بەس نیە، بەڵکو ئەبێ خۆگریی لەگەڵ بێت، ئەبێ بەردەوام بن لەسەر خۆگرییەکەشتان، خۆگری نەك تەنیا لەسەر جەنگ و کوشتار، بەڵکو خۆگریی لە سەر هەر ئەرکو زەحمەتێکی تری لەشی و دەروونی کە زۆر جار ئەمانە سەخت و بەتین ترن لە جەنگ و کوشتار، ئینجا ڕووی فەرموودە ئەکاتە ئەو تاقمەی کەلەساڵی پێشوودا ئامادەی جەنگی(بەدر) بوون، بەهۆی ئەوەوە ئاواتە خواز بوون بۆ مردن لە ڕێی خوادا وەك ئەوانەی(بەدر) کاتێ جەنگی(احد) هاتە پێشەوە بڵێسەیان لێوە ئەهات بۆ مردن و فیداکاریی، کەچی کاتێ جەنگەکە کە هەڵگیرسا و زۆریان بە گوێرەی قسەو ئاواتەکەیان دەر نەچوون، ئەم فەرموودەیە هەرچەند ئاڕاستەی ئەوانە کراو سەرزەنشتیان ئەکات، بەڵام بە شێوەی گشتی ئاڕاستەی ئەکات تا ببێ بە ئاگادارکردنەوەو تەمێ دادانی هەموو بڕوادارێك کە بەهیچ ڕەنگ لاف و گزاف لێ نەدات و وریای خۆی بێت،

وَلَقَدۡ كُنتُمۡ تَمَنَّوۡنَ ٱلۡمَوۡتَ مِن قَبۡلِ أَن تَلۡقَوۡهُ فَقَدۡ رَأَيۡتُمُوهُ وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ ﴿١٤٣﴾

ئەفـەرمووێ: ﴿وَلَقَدۡ كُنتُمۡ تَمَنَّوۡنَ ٱلۡمَوۡتَ مِن قَبۡلِ أَن تَلۡقَوۡهُ﴾ بێگومـان ئێـوە ئـاواتی مردنتـان خواست لە پێش ئەوەی پێی بگەن ﴿فَقَدۡ رَأَيۡتُمُوهُ﴾ دەی بێگومان بینیتان هۆکەی کە ئەو جەنگە سەختە بوو ﴿وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ﴾ لەکاتێکدا کە بەچاوی خۆتان بینیتان بەئاشکراو بەبێ پەردە، واتە دەی بۆچی بە گوێرەی ئاواتەکەتان دەرنەچوون و خۆتان پێنەگیرا، بێگومان بۆ خوا هیچی تێ نەئەچوو کە هەر لە یەکەمجارەوە ئایینەکەی سەرخستایەو پێغەمبەرەکەی زاڵکردایە بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە ئەرك و کردەوەیەکی بخستایەتە سەرشانی بڕوادارەکان، خوا ئەیتوانی فریشتە بینێرێتە خوارەوە بۆ جەنگ و یارمەتی دانی موسڵمانان، وە ئەیتوانی ئەو گەل و کۆمەڵە لە ڕیشە بهێنێ بە وێنەی گەلی(عادو سەمود) و ئەوانی تر، بەڵام مەسەلەکە تەنیا سەرخستن و زاڵکردن نیە، بەڵکو مەسەلەی پەروەردە کردن و پێگەیاندنی موسڵمانانە بۆ ئەوکارە زۆر گرنگەی کە پێیان سپێردراوە، کاری سەرکردایەتی ئادەمی، ئادەمی بە هەموو کەم و کوڕی و لاوازیەکەوە، بە هەموو لاریی و نالەباریی و نەفامی و نەزانی و لاجانێکیەوە، سەرکردایەتیە کە سەرکردایەتیەکی ڕاست و دروست و تێرو تەواو لە هەموو بارو ڕوویەکەوە، کە ئەوەش بەبێ ئامادەییەکی تێرو تەواو نابێ و ناگونجێ، وە ئەوەش داخوازە بۆ چالاکی و هێزو توانای لەش و بۆ دامەزراویی و نەگۆڕان، خۆگریی لەسەر هەموو ناخۆشی و ماندوویی، بۆ وریایی و لێزانی لە هەموو کارێکی پێویست دا، بۆ ناسین و دۆزینەوەی چارەسەر بۆ هەر کۆسپ و گرێیەك کە ڕووبداو بێتە پێشەوە، جالەبەرئەوە خوای پەروەردگار کار دروست ئەو کۆمەڵە موسڵمانەی پەروەردە کردو پێی گەیاندو قۆناغی ژیانی پێبڕیی بەو هەموو جۆرە بەسەرهات و ڕووداوە جۆربەجۆرانە، تاقی کردەوەو پاڵفتەی کردن بەخۆشی و بە ناخۆشی، بەسەرکەوتن و بەتێك شکان، بێگومان ڕووداوو جەنگی(احد) بەشێکی گەورە بوو لەو پەروەردەو پێگەیاندنە... لە هەموو شت ناخۆش ترو سامناکتر ــ وەك لەسەرەتایەوە ئامارەمان بۆکرد ــ ئەوە بوو کەیەکێ بەدەنگی بەرز جاڕی داو ووتی: ئاگاداربن کە بێگومان محمد کوژرا.

﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ كِتَـٰبًا مُّؤَجَّلًا ۗ﴾

---

ئەو هەواڵە سامناکە دڵی موسڵمانانی بە تەواوی داخست، بەجۆرێ هیچ کەس هۆشی لامانە، وە زۆریان بە نائومێدیی وازیان هێناو گەڕانەوە بۆ مەدینە بە شکاوی، ئەگەر خوا میهرەبانی نەکردایە کار لە کار ئەترازا، بەڵام پێغەمبەری بەهێزو دامەزراو کرد(ﷺ) لەگەڵ دەستەیەکی کەم لە هاوەڵەکانی، بانگی کردە موسڵمانەکان، هەتا گەڕاوە بۆ لای، خوا دڵی ئەوانیشی بەهێزکردو وە نەوزێکی هێنا بەسەریاندا تا ئەو ناڕەحەتیەی لەسەر لابردن‌و ئارامیی‌و بێباکی بۆ هێنانەوە، وەك لەمەو پاش باسەکەی دێت، جا قورئان لێرەدا ئاماژە ئەکات بۆ ئەو ڕووداوەو ئەیهێنێ‌و تەمێ‌و سەرزەنشتی موسڵمانەکانی پێ‌ئەکات، بەوەی نابێ بە نەمانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوان واز بێنن لە ئایینەکەیان، چونکە ئەوان خواپەرستن‌و خوایش هەر هەیەو نەمانی نابێ، محمد پێغەمبەرێکە وەك ئەو پێغەمبەرانەی کە نەمان‌و پاش خۆشیان ئایینەکەیان هەر مایەوەو بڕواداران وازیان لێ نەهێنا. ئەفەرمووێ: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ﴾ محمد هەر پێغەمبەرەو نابێ نەمانی بە دوور دابنرێ جێی سەرسوڕمان بێت، وەك ئێوە بەو جۆرەی دائەنێن وتێ‌ی گەیشتوون، یان مەبەست ئەوەیە: محمد هەر پێغەمبەرێکە کە ﴿قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ﴾ لە پێش ئەو پێغەمبەرەکانی تر هاتوون‌و تێپەریان کردو نەمان، واتە ئەمیش یەکێکە لەوان‌و ئەبێ نەمێنێ‌و لەپاش خۆی ئەبێ واز نەهێنن لە ئایینەکەی وەك بڕوادارانی پاش ئەوان وازیان نەهێنا ﴿أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ﴾ دەی ئایا ئەگەر محمد بمرێ‌یان بکوژرێ، ئێوە پاشەوپاش وەر ئەگەڕێنەوە بۆ بارو حاڵەتی لەوەو پێشتان‌و واز ئەهێنن لە ئایینەکەتان؟ واتە نابێ شتی وا بکە ﴿وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ﴾ هەرکەس هەڵئەگەڕێتەوە ﴿فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا﴾ هەرگیز ئەو کەسە هیچ جۆرە زیانێك ناگەیەنێ بە خوا، واتە ئەو کەسە خۆی زیانبارە، چونکە خوا پێویستی نیە نە بەهیچ کەس‌و نەبەهیچ شتێ،

بەڵکو خوابە میهرەبانی خۆی ڕێی ڕاستو بەرنامەی ڕاستی داناوە بۆ بەندەکانی، بۆ خۆشبەختی ئەوانو بەهرەمەندییان لە هەردوو جیهاندا، کەواتە ئەو ڕێو بەرنامەیە گەورەترینو بەنرخ ترینی چاکەی خوایە بەسەر بەندەکانیەوە، ﴿وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ﴾ بێگومان خوا پاداشتی سوپاس کەرانی ئەو چاکەو بەهرەیە ئەداتەوە.

ئەوانەی کە ڕێزو نرخی ئەو چاکەو بەهرەیە ئەزانن، بەهۆی ئەوەوە سوپاسی ئەکەن بە شوێن کەوتنو دانە بەری ئەو ڕێ ڕاستە، بەوە وەسفو سەناو یادی ئەو پەروەردگارە میهرەبانە، وەك خوا ویستبێتی بەم ڕووداوەو بەم ئایەتە موسڵمانەکان بپچڕێ لەوەی پشت ببەستن بە خودی پێغەمبەر(ﷺ) بەڵکو پشت هەر بە خوا ببەستن، وەبیان بەستێتەوە بە فەرمانو ئایینەکەی خواوە، بەو سەرچاوەی کە هەر خوا هەڵی قولاندو پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە بەس بۆ ئەوەی دەست نیشانو ڕێنموونی بکات، مەردوم بانگ بکات بۆ سەری، هەرەچۆنێ پێغەمبەرانی تریش لەپێش ئەمەوە هەر بۆئەوە هاتوون! وەك خوا ویشتبێتی دەستیان بگرێو بیبەستێتەوە بەو حەبلە نەپچڕاوەی کەلە ئاسمانەوە دای هێشتە خوارەوەو تاقانە هۆی بەرزبوونەوەو گەیشتنە بە خوا، پێغەمبەر(ﷺ) هیچ دەخلێکی نیە تیای دا، بەڵکو هاتووە هەر بۆئەوەی ڕێنموونی بکات بۆیو ئەو حەبلە بخاتە دەستیان! وەك خوا ویستبێتی کە پەیوەستی موسڵمانەکان لە ڕێوەو یەکسەر بە ئیسلامەوە ببێ، لە ڕێوە دەستو پەیمانیان لەگەڵ خوا بدەن، خۆیان لێپرسراوبن لەو دەستو پەیمانە لە بەدەم خوادا، هەتا هەست بکەن بەبارو ئەرکی سەرشانی خۆیان، کە ئەوان لە ڕاستی دا پەیمانیان هەر لەگەڵ خوا بەستووە، ئەوان لێپرسراون لەبەردەم خوادا! وەك خوا ویستیبێتی بەو ڕووداوە سەختە موسڵمانان ئامادە بکاتو ڕامیان بکاتو فێری ئەوە ببن جارێکی تر دانەچڵەکێنو سەرگەردان نەبن بەهیچ شتێك، لە هەموو بەسەرهاتو ڕووداوێکدا بەستراوو پەیوەست بن هەر بە خواو بەبانگو بانگەوازەکەی خواوە، پێویستە لەسەر موسڵمانان کە بۆچوونو تێگەیشتنیان بەو جۆرە بێت، بزانن کە ئاینو بانگەوازەکەیان گەورەترە لە بانگ کەران، بەردەوام ترە لەوان، ئەوان هاتنو چوونو دێنو ئەچن، بانگو بانگەوازەکە هەر مایەوەو ئەبێ هەر بمێنێتەوە، وە شوێن کەوتووەکانی ئەمێننەوە بە پەیوەستی بە یەکەم

سەرچاوە کە پێغەمبەرەکانی ڕەوانە کردو خۆی هەر هەیەو هەر ئەمێنێ‌و بڕواداران هەر ئەبێ ڕوو بکەنە ئەو.

دەی کە ماتووڵ کاری بڕواداران بەو جۆرەیە، ئیتر چۆن ئەبێ هەڵگەڕێنەوە لە ئایین‌و ڕێنمونی خوا؟! چۆن بە نەمانی سەرکردە ئەبێ واز بێنن لە بانگ‌و بانگەوازەکەی خوا؟! وە چۆن ئەبێ بپسێن‌و دەستە پاچەبن؟! نەخێر نابێ بەڵکو پێویستە هەموو وەك(ئەنەسی کوڕی نەضر) بن کە لەپاش بیستنی هەواڵی نەمانی پێغەمبەر(ﷺ) چەکی هەڵگرت‌و پەلاماری دوژمنی دا تا شەهید کراو گیانی خۆی بەخت کرد، وەك لەسەرەتاوە باسمان کرد -خوای لێ ڕازی بێت- یان وەك(ئەبو بەکری صدیق) کەلەپاش لەدنیا دەرچوونی پێغەمبەر(ﷺ) چووە سەر مینبەرو لەپاش سەنا و سوپاسی خوا وتە بەناو بانگەکەی خۆی وت: ئاگاداربن هەرکەس محمدی پەرستووە ئەوا محمد مرد، هەرکەس خوای پەرستووە ئەوان خوا زیندووەو نامرێ. ئینجا ئەم ئایەتی ئێرەی خوێندەوە بەسەر موسڵماناند، خوا ڕازی بێ لە یاری غار بەو وتە پیرۆزانە فریای ئوممەت کەوت، هێزو هۆشی هێنایەوە دڵی موسڵمانان‌و لاوازیی‌و سەرگەردانی نەهێشتن! ئینجا دەست کاریەکی دڵنەکات بۆ لابردن‌و نەهێشتنی مەترسی لەمردن، ئەوەش بەباس کردنی یاسای مردن‌و ژیان‌و ڕوون کردنەوەی باری ڕاستەقینە لە مردن‌و ژیان‌و دوای مردن‌و ژیان‌و ئەو تاقی کردنەوەو تۆڵەو پاداشتەکەی کە لە ژیان‌و پاش ژیان بەدی دێت،ئەفەرمووێ: ﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ نەبووەو ناگونجێ بۆ هیچ کەسێك بمرێ، مردن بۆ هیچ کەسێك پەیدا نەبووە بە هیچ کلۆجێ‌و لەبەر هیچ هۆیەك مەگەر بەئیزن‌و مەیل‌و خواهیشی خوا، ﴿كِتَابًا مُّؤَجَّلًا﴾ خوا نووسیویەتی بە نووسێنێ کە ماوەی ژیان‌و کاتی مردنەکەی دیاریی کراوە، نە دوا ئەکەوێ‌و نەپێش، کەواتە نەترس‌و خۆلادان ماوە کە درێژ ئەکات، نە پەلامار دان‌و چالاکی کورتی ئەکاتەوە.

هەر دڵێ ئەوەی تیا جێگیربوو هەمیشە زاڵ ئەبێ بەسەر ترس‌و داچڵەکاندا‌و ترس‌و بیمی مردن خەریکی ناکات لە هەڵسان بە ئەرك‌و پێویستی سەرشانی، ڕێگەی ڕاستی خۆی ئەداتە بەر بەئارامی‌و خۆگریی‌و دڵنیایی، پشت ئەبەستێ بەو خوایەی کە هەر خۆی خاوەنی مردن‌و ژیانەو دیاریی کەری ماوەی ژیانە.

ئەم فەرموودەیە هاندانی تیایە لەسەر تێکۆشانو سەرزەنشتی ئەوانەی کە واز ئەهێنن لێی لە ترسی مردنو کوژران، هەروەها سەرزەنیشتی ئەوانەی کە بەو جۆرە دەستە پاچەو داماو سەرگەردان بوون بەهۆی بیستنی هەواڵی نەمانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) هەرچۆنێ دەم کوت کردنی ناپاکەکانی تیایە لەپاش بیستنی ئەو هەواڵە ئەیان ووت بە موسڵمانەکان: بگەڕێنەوە بۆ سەر ئایینەکەی ئەوساتان، مەبەستیان ئەوە بوو کە ئەگەر ئایینەکەی ڕاست بوایە نەئەکوژرا، یان ئەیان ووت ئەگەر بەگوێی ئێمەتان بکردایەو لای ئێمە بوونایە واتان بەسەر نەئەهاتو ئەوانەتان نەئەکوژران، قورئانیش دەم کوتیای ئەکات بەوەی کە نەمردنو نەکوژران نیشانەی ناڕاستی ئایینەکەیان نیە، نابێ بەهۆی وازهێنانو هەڵگەڕانەوە لێی، هەرکەسێ ماوەی ژیانی لای خوا دیاریی کراوە، بەبێ دواو بەرئەبێ لەو کاتە دیاریی کراوەدا بمرێ لە هەر شوێنێ بێ. ئینجا هەنگاوێکی تر ئەنێ بەدڵو دەروونیان، دەست نیشان ئەکات بەوەی کە ماتووڵ ماوەی ژیان دیاریی کراوەو ناگۆڕێ، کەواتە با هەرکەس بیرێك بکاتەوە لە دوا ڕۆژی خۆی، بابزانێ چی ئەکاتو بەدوای چی دا ئەگەڕێ، ئایا ئەیەوێ واز بێنێ لە ڕۆژی دوایی و هەر بۆ ئەم ژیانە بژی؟ یان ئەیەوێ چاو هەڵخا بۆ ئاسۆی هەرە بەرز، بۆ ژیانێکی گەورەتر لە ژیانی ئەم جیهانە؟ لەگەڵ ئەوەدا بەدوا گەڕانی ئەو دوو مەبەستە هەر لەم جیهانو ژیانەدا ئەکرێو یەکسانن بۆ ئەم ژیانە؟! ئەفەرمووێ: ﴿وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا﴾ هەرکەسێك پاداشتو دەستکەوتی جیهانی ئەوێو تێکۆشانو کردەوەی بۆ ئەوە ئەکات هێندێ لەوەی پێ ئەدەین، ﴿مِنْهَاۚ﴾ هەرکەسێك پاداشتی ڕۆژی دوایی ئەوێو هەوڵو تێکۆشانی بۆئەوەی بەشی ئەدەین لێی. بەڵام ئەو دوو مەبەستەو ئەو دوو ژیانە جیاوازنو دوورن لە یەکتر. یەکەم تاقم ئەژی لەم جیهانەدا بەژیانێكو خەریك بوونێکی ئاژەڵیو گیانلەبەریی! ئینجا لەکاتی دیاریی کراوی خۆی دا ئەمرێ، تاقمی دووەم ئەژی بە ژیانێکی مەردیو وەك ئەو ئادەمیە ئەژی کە خوا ڕێزداری کردووەو باوی داوە بەسەر دروست کراوەکانی تردا، ئینجا ئەمیش وەك یەکەم لەکاتی دیاریی کراوی خۆی دا ئەمرێ.

وَسَنَجۡزِي ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٥﴾ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٞ فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ

---

به یەکەم فەرمووده پلار ئەدات لەوانەی کە لەو جەنگەدا نیازی دەستکەوتو غەنیمەت خەریکی کردن لە گوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ)و لە بەرژەوەندی ئیسلام، تا لەسەرەنجامدا ئەو تێك شکانە دڵ تەزێنە ڕووی دا، بە فەرمودەی دووەمو وەسفو سەنای ئەوانە ئەکات کەلەو ڕۆژەدا بەئارامو دامەزراو بوون لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) وەك دەست نیشان ئەکات بەم بەڵێنە گەورەیە پێیان ئەفەرمووێ: ﴿وَسَنَجۡزِي ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ بێگومان پاداشتی سوپاس کەران ئەدەینەوە، ئەوانەی کە چاولەبەری خوانو ڕێزو نرخی چاکەو بەهرەکانی خوا ئەزانن، بەهۆی ئەوەوە سوپاسی خوا ئەکەن بە گوێڕایەڵیو فەرمانبەریی، ئیتر مەبەست بەمانە لێرەدا هەر ئەوانە بن کەلەو جەنگەدا گوێڕایەڵو دامەزراو بوون. یان بە شێوەی گشتی مەبەست بێت کەلەم شوێنەدا ئەوانە یەکەمو سەر دەستەن.

لەدیاریی نەکردنی جۆرو ئەندازەی کە گەورەییو گرنگی ئەوا پاداشتە وەرئەگیرێ تا ڕادەیەك نەیەتە باسو ژمارە!! ئینجا وێنەو نموونەیان بۆ ئەهێنێتەوە لە بڕوادارانی پێش خۆیان، لەوانەی کە ڕاستیان کرد لەگەڵ خوای خۆیانو بە تەواوی لێ بڕان بۆی، وە پەیڕەوی پێغەمبەرەکانیان کرد لە جەنگو تێکۆشانیان بە لەڕێی خوادا بە هەموو ئارامیو دامەزراویەك، بە شەرمو بیمو ترسەوە داوای لێ بووردنیان ئەکرد لە خوای خۆیان لە هەر گوناهو کەمو کوڕیەکیان، کەواتە ئەم وێنەیەش ئەبێ بەسەرزەنشت بۆ ئەوانەی کە لەو جەنگەدا خۆ نەگر بوون، هەرچۆنێ ئەبێ بەدڵنەوایيو هاندەرێکی بەهێز بۆ خۆگرو دامەزراوەکان. ئەفەرمووێ: ﴿وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ﴾ پێغەمبەری زۆر بووە لەمەوبەر کە: ﴿قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٞ﴾ لەگەڵ هەرکام لەو پێغەمبەرانە تاقمی خواناسو بۆ خوا لێ بڕاوی زۆر جەنگو کوشتاریان کردووە لە ڕێی خوادا. وتەی ﴿قَٰتَلَ﴾ بە ﴿قتل﴾ەش خوێنراوەتەوە، ئەو کاتە ئەڵێن: پێغەمبەری زۆر کوژراوە لەکاتێکدا کە کۆمەڵی خواناسی زۆریان لەگەڵ بووە، ﴿فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ ئینجا ئەو خواناسانە سستو دەستە پاچە نەبوون لە جەنگو تێکۆشان لەبەرئەو کوشتنو بڕینەی کە دووچاریان بوون لەڕێی خوادا، یان نەترسان،

وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا ٱسْتَكَانُواْۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُواْ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِيٓ أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْأٓخِرَةِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٤٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾

---

﴿وَمَا ضَعُفُواْ﴾ بێهێزو لاواز نەبوون و وازیان نەهێنا ﴿وَمَا ٱسْتَكَانُواْ﴾ سەریان شۆڕ نەکرد بۆ دوژمن، ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ خوا خۆگرانی خۆش ئەوێ، واتە ئەو خواناسانەی کە باس کران، یان هەموو خۆگران بە شێوەی گشتی کە ئەوانە لێرەدا یەکەم و سەردەستەن.

ئەوانە بەو جۆرە بەرامبەر دوژمن بەهێزو چالاك بوون، لەڕێی بەرز کردنەوەی ئایینی خوا کۆڵ نەدەرو فیداکار بوون، وە لە هەمان کاتدا شەرم و وتەیان لەگەڵ خوای خۆیان بەم جۆرە بوو کە ئەفەرمووێ: ﴿وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُواْ﴾ هەر ئەمە وتەی ئەوان بوو کە ئەیان گوت: ﴿رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا﴾ ئەی پەروەردگارمان ببورە لێمان و بسڕەوە بۆمان گوناهەکانمان ﴿وَإِسْرَافَنَا فِيٓ أَمْرِنَا﴾ وە زیادە ڕەویمان لەکاروبارماندا، ﴿وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا﴾ پێمان بەهێزو دامەزراو بکە لەسەر ڕێگە ڕاستەکەی خۆت ﴿وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ زاڵمان بکە بەسەر کۆمەڵە بێبڕواکاندا، ئەوانە لەو کاتی تەنگەتاوی و فیداکاریەدا غەم و پەژارەی گوناهەکانیان داگیری کردبوون، لەبەرئەوە لە یەکەمجارەوە لە ڕوویان نەئەهات داوای زاڵبوون بکەن، بەڵکو داوای لێ بووردن و سڕینەوەی گوناهیان ئەکرد کە گوناهو تاوان مایەی بەدبەختی و بەش بڕاویە لە هەردوو جیهاندا، ئەو خواناسانە داوای نازو نیعمەتیان نەئەکرد، بەڵکو داوای ئەجرو پاداشتیان نەئەکرد لەوکاتی خۆبەخت کردن و فیداکاریەشدا، چونکە بە شەرم بوون و لە ڕوویان نەئەهات، لەبەرئەوە هەر داوای لێ بووردن و دامەزراویان ئەکردو زاڵبوون بەسەر بێباوەڕیاندا نەك لەبەر خودی خۆیان، بەڵکو لەبەر شکاندنی بێباوەڕیی و تۆڵە سەندن لە بڕوایان! ئەوانە کە بەو جۆرە بوون خوا بەم جۆرەی کرد لەگەڵیان کە ئەفەرمووێ: ﴿فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا﴾ بەهۆی ئەوەوە خوا پاداشتی جیهانی پێبەخشین، بەزاڵکردن و بە غەنیمەت و بە دەسەڵات و کاربەدەستی لەزەوی دا ﴿وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْأٓخِرَةِۗ﴾ پاداشتی چاك و ڕۆژی دواییش بە بەهەشت و ڕەزامەندی و خۆشنوودی خۆی لێیان، خوای میهرەبان ئەو دوو جۆرە پاداشتەی

دانەوە، چونکە ئەوانە بە کردەوە کانیان نیازی بەختیاری هەردوو جیهانیان کرد، پاداشتیش بە گوێرەی نیازو کردەوەیە، ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ خوا چاکە کەرانی خۆش ئەوێ کە خۆش ویستنی خوا کانگای هەموو پیت و فەڕێکە بۆ هەردوو جیهان، لێرەیشدا مەبەست ئەو خواناسانەیە بەتایبەتی، یا هەموو چاکەکەران کە لێرەدا ئەوانە یەکەم و سەردەستەن، بێگومان ئەو تێك شکانە لەو جەنگەدا ڕێی بەرەڵا کرد بۆ بێبڕاو ناپاك و جوولەکەکانی مەدینە کە زمانی ژاراوی خۆیان بخەنەکار بۆ بێئارام کردن و دوو دڵ کردنی بڕواداران و بێ هێزکردنی دڵ و دەروون و لاواز کردنی یەکێتی و ڕیزیان، جالەبەرئەوە مێهرەبان بەم چەند ئایەتی داهاتووە بڕواداران و وریا و بێدار ئەکاتەوە، تەمێ و ئامۆژگاریان ئەکات بەوەی کە چارەسەروپێویستە،دەست نیشان ئەکات بۆ هەر هەڵە و بۆچوونێکی نارەوایان لەو جەنگەدا، هەڵە و بۆچوونەکانیان ڕاست ئەکاتەوە، لە یەکەمجارەوە ئەفەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە ﴿إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەگەر ئێوە گوێڕایەڵی ئەوانە بن کە بڕوایان نەهێناوە بە ئایینی ئیسلام، واتە ناپاکەکان وەك(ئیمامی عەلی) ئەفەرمووێ: یان(ئەبو سوفیان)و تاقمەکەی وەك(سوددی) ئەفەرمووێ: یان جوولەکەو گەورەکان وەك (ئیبن و جورەیج) ئەفەرمووێ. ئەگەر بەقسەی ئەوانە بکەن کە بڕوایان نیە بە ئایینەکەتان ﴿يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ﴾ ئەتانگێڕنەوەپاشەوپاش بۆ سەر ئەوەی کەلە پێشەوە لەسەری بوون، واتە بۆ بت پەرستی و بێباوەڕیی ﴿فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ﴾ ئینجا ئێوەیش ئەگەڕێنەوە بە زیانباریی خێرو خۆشی جیهان و بەختیاریی ڕۆژیی دوایی کە ئەوەش گەورەترین زیانبارییە. بەڵێ سەرەنجامی گوێڕایەڵی و بەگوێکردنی بێبڕوایان هەر ئەو زیانبارییە گەورەیە، کەواتە بڕوادار یا ئەبێ ڕێی ڕاستی خۆی بداتە بەرو دژی بێبڕوایی و بێبڕوایان بێت و بەپێی توانا تێکۆشان بکات لە بەرگریی و بەرەنگاریی بێبڕوایی و بێبڕوایاندا، یان ئەترازێ و لە ڕیزی بڕواداران دەرئەچێ، بەهیچ ڕەنگ ناگونجێ بۆ بڕوادار بەبێدەنگ بۆ خۆی دانیشێ و هەقی بەسەر هیچەوە نەبێ، بەئارام و ئاشتی ڕێك کەوێ لەگەڵ دوژمنی ئایینەکەی دا، لەگەڵ ئەوەدا وا بزانێ کە ئایین و عەقیدەو بڕواکەی خۆی ڕاگیر کردووە، ئەو کەسەی کە بڕوا و عەقیدەی نەپارێزێ لە گوێڕایەڵی بێبڕوایان و لە گوێگرتن و بەقسە کردنیان، لەپشت پێبەستن و بڕوا پێکردنیان، ئەوکەسە لە ڕاستی دا وازی هێناوە لەئایین و عەقیدەو بڕواکەی و پاشەوپاش هەڵگەڕاوەتەوە.

بَلِ ٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡۖ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلنَّٰصِرِينَ ﴿١٥٠﴾ سَنُلۡقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعۡبَ بِمَآ أَشۡرَكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ سُلۡطَٰنٗاۖ

بەڕاستی گوێگرتن و بە قسە کردنی بێبڕوایان، گوێگرتن بۆ پڕو پاگەندەو فاك و فیکیان و وەرگرتنی پەندو تەمێیان، بەڕاستی ئەوە تێك شكانێكی گیانی و دەروونیەو بێئاگاییو لە داخوازی ئایین و بڕواکەی، ئیتر بەخۆی ئەزانێ یان نا؟ بێگومان بڕوادار بەهۆی ئایین و عەقیدەو سەرکردایەتیەکەیەوە هیچ پێویستی نیە بە پرس و ڕاو تەمێی دوژمنی ئایینەکەی، کەواتە هەرکات گوێی گرت لەو دوژمنەو پشتی پێبەست و بەقسەی کرد ئەو کاتە تڕازاوەو لای داوە بۆ ڕێگەی ئەوو وازی هێناوە لە ڕێ ڕاستەکەی خۆی و هەڵگەڕاوەتەوە لە ئایینەکەی خۆی. بێگومان زۆرجار لەکاتی بێ دەسەڵاتی و ژێر دەستەیی و تێك شكاندا بڕوادار دووچاری ئەو هەڵەیە ئەبێت و مەیلی دڵی ئەبێ بەو دوژمنە بێ بڕوایە بە ئومێدی پارێزگاری و یارمەتی دان، لەبەرئەوە قورئان ڕوو وەر ئەگێڕێ لەو ئومێدو هیوایەی ڕاستەقینە نیشان ئەدات، ئەفەرمووێ: ﴿بَلِ ٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡۖ﴾ واتە بێبڕوایان دۆستی ئێوە نین تا گوێڕایەڵی بکرێن و بە قسەیان بکرێ، یارمەتیتان نادەن، بەڵکو هەر خوا یارمەتی دەرتانە، کەواتە هەر گوێڕایەڵی خوابن ﴿وَهُوَ خَيۡرُ ٱلنَّٰصِرِينَ﴾ خوا باشترینی هەموو یارمەتی دەرانە، هەرکەسێکی تر بەیارمەتی دەر ناوببرێ و دابنرێ لە ڕووی ڕاستی دا یارمەتی دەر نیە، چونکە هەموو شتێ هەر بەدەست خوایەو خوا ئەیکات و لەسەر دەستی بەندەکانی دا دەری ئەخات، کەواتە تاقانە کەسێ کە شایستەبێت بۆئەوەی یارمەتی لێ داوا بکرێ هەر خوایە، هەرکەس خوا یارمەتی دەری بێت ئیتر پێویستی بە هیچ کەس نیە، ئینجا دڵی موسڵمانەکان بەهێزو دامەزراوو ئەکات و مزگێنیان پێئەدات بەوەی ترس و بیم ئەخاتە دڵی دوژمنەکانیان و لە دوا ڕۆژدا دووچاری سزای ئاگریان ئەکات، ئەفەرمووێ: ﴿سَنُلۡقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعۡبَ﴾ بێگومان ترس و بیمی بەتین ئەخەینە دڵی ئەوانەی بڕوایان نەهێناوە ﴿بِمَآ أَشۡرَكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ سُلۡطَٰنٗاۖ﴾ بەهۆی گێڕانیان بە هاوبەشی خوا شتێ ـ واتە بت پەرستەکانیان ـ کە خوا ڕابەرو بەڵگەی نەناردووەتە خوارەوە لە ئاسمانەوە لەسەر ئەو گێڕان و هاوبەش دانانە.

مەبەست ئەوەنیە کە بەڵگە هەیە لەسەری و بەڵام خوا نەینا ردووەتە خوارەوە، هەروەها مەبەست ئەوەنیە کە شتی وا هەیە کە بەڵگەو ڕابەر هەیە لەسەری، چونکە ئاشکرایە کە یەکەم بەندی هەموو ئایین و شەریعەتەکانی خوا بریتیە لە بڕوا بە تاك و تەنیایی خواو بەدرۆ خستنەوەی هەموو جۆرە هاوبەشێك لەسەر هەر بارو شێوەیەك، بەڵکو مەبەست سەرزەنشت و پلار دانە لەو نەفامانە کەلە خۆیانەوە شوێنی ئارەزووو خەیاڵی بەتاڵی خۆیان کەوتوون لە عەقیدەو ئایین و بڕوایاندا کە گرنگ ترو گەورە ترین مەبەست بۆ مەردوم، لەکاتێکدا کە خوا پێویستی کردووە کە عەقیدەو ئایین و چۆنێتیەکەیان ئەبێ هەر لە خواوە وەربگیرێ بەهۆی پێغەمبەرەکانەوە، وێنەی ئەم سەرزەنشت و پلارانە لە قورئان زۆرەو زۆر بەکاریشن بۆ هەموو ژیرێك کە کۆتایی بێنن و بگەڕێنەوە لەو بیروباوەڕو کردەوانە کە بە نەفامی ئەخرێنە گەردن و ئەکرێن. هێندێ لە زانایانی تەفسیر ئەفەرموون ئەم بەڵێنە تایبەتیە بەو جەنگەوە، وەك وایش دەرئەکەوێ لە هەواڵێکەوە کە(ئیبن و جەریر) ئەیهێنێ لە(سوددی)یەوە کە ئەفەرمووێ: کاتێ کە(ئەبو سوفیان) ئەگەڕێتەوە بەرەو مەکە، لە ڕێگەدا پەشیمان ئەبنەوەو لەناو خۆیاندا ئەڵێن: خراپتان کرد، با بگەڕێنەوە سەریان لە ڕیشەیان بێنین، ئینجا خوا ئەو هەواڵە ئەگەیەنێ بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش جەنگ کەرەکان کۆئەکاتەوەو دێن بەرەو لەشکرەکەی(ئەبو سوفیان) تا ئەگەنە(حمرا ءالاسد) ئینجا خوا ترس و بیم ئەخاتە دڵی بێبڕواکان و پەشیمان ئەبنەوەو ئەڕۆنەوە بۆ مەککە، ئینجا خوا ئەم ئایەتە ئەهێنێتە خوارەوە. بەڵگەی ئەم کۆمەڵە ئەم هەوڵەیە، هەروەها تێك شکان لە ڕووداوی(حنین)دا، بێجگە لەوانەش ئەوەتا ئەبینین بە درێژایی مێژوو چەند جار جەنگ بەرپا بووە لە نێوان موسڵمانان و بێبڕوایانداو ئەوان زاڵ بوون و بیم و ترسیشیان لێ دەر نەکەوتووە. تاقمێ تر لە زانایان ئەفەرموون: بەڵێنەکە تایبەتی نیە، وەك ڕواڵەت و ڕووکەشی ئایەتەکە نیشانی ئەدات، هەروەها ڕواڵەت و ڕووکەشی ئەم حەدیسەی(ئیمامی موسلیم) ئەیهێنێ لە(ئەبو هورەیرە)وە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:(نصرت بالرعب) یارمەتی دراوم و زاڵ کراوم بە بیم و ترسی بەتێن کە بێم ئەکرێ. ئەم حەدیسەی کە(ئیمامی ئەحمەد)و غەیری ئەو ئەیهێنن لە(ئەبو سوفیان)ەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:(نصرت بالرعب مسیرة شهر یقذف في قلوب أعدائي) یارمەتی دراوم و زاڵکراوم بەبیم و ترسی بەتێن کە ئەخرێتە دڵی دوژمنەکانم ماوەی مانگێ ڕێگە. بەڵکو ئەم بەڵێنە هەمیشەییەو بۆ هەموو کاتە لەپاش چەرخی پێغەمبەریش(ﷺ) وە باوێکە لە باوەکانی خوا، بەڵام بەدی هاتنی ئەو بەڵێنە

بەستراوە بە چەند مەرجێکەوە کە هەرکات ئەو خوا، بۆ وێنە: ئەو هەموو دەواو دەرمانە کە بەپێی باوی خوا کار ئەکەن و چارەسەرن هەرکام بۆ نەخۆشیەك، بەڵام هەرکام خوا چەند مەرجێکی بۆ داناوە بەبێ ئەوانە کارکردن و چارەسەرەکەیان نابێ.

یەکێ لە مەرجی ئەو بەڵێنە پشت بەستنە تەنها بە خواو پچرینی دڵ لە هەر شتێکی تر کە مەردوم پشتی پێ ئەبەستێ، دەی لە ڕۆژی(حنین)دا لە لایەن هێندێکەوە پشت بەسترا بە زۆری موسڵمانەکان بەهۆی ئەوەوە ئەو تێك شکانە ڕووی تێکردن لە یەکەمجارەوە، تا خوا میهرەبانی کرد ئارامی و دامەزراویی ڕشت بەسەر پێغەمبەرو موسڵمانەکانداو بەهۆی ئەوەوە چارەسەری تێك شکانەکەنی کردن، ئەم ئایەتە بەڕوونی ئاماژە ئەکات بۆئەوەی کە وتمان:

﴿وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْئًا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَنزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ یەکێتر لەو مەرجانە باو نەدانی دەست کەوت و سامانی جیهانەو دووبەرەکی نەکردن، کە ئەم باودان و دووبەرەکێ کردنە هۆی سەرەکی بوون لە تێك شکانی جەنگی(احد)دا وەك بۆمان دەرئەکەوێ لەمەو پاش لە ئایەتەکانی داهاتوودا، یەکێتر لەو مەرجانە، نەترسانە لە مردن و بێزار نەبوون لێی،(ئەبو داود) حەدیسێ ئەهێنێ لە(ئەبو هورەیرە)وە -خوای لێ ڕازی بێت- ئەم دوو مەرجەی لێ وەرئەگیرێ، ئەفەرمووێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نزیکە گەل و ئوممەتەکان پەلامارتان بدەنێ، هەرچۆنێ بخۆران پەلاماری خوانی خۆیان ئەدەن، واتە ئوممەت و وڵاتی ئیسلام داگیر ئەکەن و دابەشی ئەکەن لەناو خۆیاندا، ئینجا ئەڵێ: عەرزمان کرد لەو ڕۆژەدا ئێمە کەمین؟ ئەویش فەرمووی: نەخێر زۆرن، بەڵام بێ کەڵك و بێنرخن وەك ئەو پوش و پەڵاشەی کە لافاو ئەیهێنێ، ئینجا فەرمووی: سام و بیمی ئێوە لەدڵی دوژمناندا ناهێڵێ و سستی و ولاوازی ئەخاتە دڵی ئێوە، ئەڵێ: وتمان: سستی و لاوازی چیە؟ ئەویش فەرمووی: خۆش و ویستنی جیهان و بێزاریە لە مردن. هەرکاتێ ئەم ئوممەتە بەڕێکی پەیڕەوی قورئان و ڕەوشتی پێغەمبەر(ﷺ) کردبێ و بیکات هەر زاڵ و سەرکەوتووە و دوژمنی بیمی لێ کردووە و لێی ئەکات، وە هەرکات و بەو جۆرە نەبووبێ و نەبێ ئەوە بێگومان پەیڕەویەکەی ناتەواوە.

وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ۚ وَبِئْسَ مَثْوَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٥١﴾ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ

**خوای گەورە لە جیهاندا بیم و ترسی موسڵمانە ڕاستەکانی خستە دڵی خوانەپەرستان، لە ڕۆژی دواییشدا بەم جۆرەن کە ئەفەرمووێ: ﴿وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ﴾ جێ و شوێنی گەڕانەوەی ئەوان هەر ئاگرە ﴿وَبِئْسَ مَثْوَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ئاگر جێ و شوێنی نیشتەجێیەکی بەدو خراپە بۆ ستەمکاران، نەیفەرموو: شوێن و جێی نیشتەجێی ئەوان بۆئەوەی بە وتەی ﴿لظَّٰلِمِينَ﴾ توندو تیژییان لەگەڵ بکات و لەکەداریان بکات بەو تاوانە پیسە، لەگەڵ ئەوەدا دەست نیشان بکات بەهۆی ئەو سزا سەختە، واتە ئاگر جێی مانەوەی ئەوانە لەبەرئەوەی ستەمکارن، وەك لەسەرەتای باسەکەوە ئاماژەمان بۆکرد، موسڵمانەکان لە یەکەمجارەوە زاڵبوون و کوشتارێکی زۆریان کرد لە بێبڕواکان هەتا شکان و ڕایان کرد، چەك و شتومەکەکانیان بەجێ هێشت و ئاڵاکەیان کەوت و هیچ کەس نەیتوانی ڕاستی بکاتەوە تا ئافرەتێ بۆ ڕاست کردنەوە! کارەکەیان هەر بەو جۆرە ڕۆیشت و شکان ڕووی تێنەکردن هەتا کاتێ کە تیرەندازەکان ـ کەمێکیان نەبێ ـ ئەو شوێنەیان بەجێهێشت کە پێغەمبەر(ﷺ) بۆی دیاریی کردن، دووبەرەکی کەوتە ناویان لەسەر ئەوە، ئەو تاقمە لەبەر دەستکەوت و غەنیمەت گرتن فەرمانەکەی پێغەمبەریان(ﷺ) شکاند، تا بەهۆی ئەووە زاڵ بوونەکەیان وەرگەڕا بەو تێك شکانە دڵ تەزێنە. جا لێرەدا قورئان ئەو هەڵوێست و بەسەرهاتانەیان ئەخاتەوە بیرو بەرچاو و هێندێ هەڵەو بۆچوونی ناڕاستیان ڕاست ئەکاتەوە، ئەفەرمووێ: ﴿وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ﴾ بێگومان خوا ڕاستی لەگەڵ کردن لە بەڵێنەکەی دا کە پێی دان بەزاڵ کردنتان لەو جەنگەدا، ئەو بەڵێنەی بەدی هێنا ﴿إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ﴾ئەو کاتەی کە ئەوانتان کوشت و هەستتان لێ بڕین بەئیزنی خواو ڕێك خشتنی خوا ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ﴾ هەتا کاتێ کەبێ هێزو لاواز بوون و خۆتان بۆنەگیرا بەرامبەر ئەو دەستکەوت و غەنیمەتەی کە بێبڕواکان بەجێیان هێشت**

وَتَنَـٰزَعۡتُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ وَعَصَيۡتُم مِّنۢ بَعۡدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنۡيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۚ ثُمَّ صَرَفَكُمۡ عَنۡهُمۡ لِيَبۡتَلِيَكُمۡۖ وَلَقَدۡ عَفَا عَنكُمۡۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٥٢﴾ ۞ إِذۡ تُصۡعِدُونَ

---

**﴿وَتَنَـٰزَعۡتُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ﴾ ئاژاوەو دووبەرەكیتان كرد لەكاری جەنگەكەدا، یان فەرمانەكەی پێغەمبەردا(ﷺ) بەم ڕەنگە هێندێكتان وتتان: بت پەرستەكان شكان ئیتر بۆچی ئێمە بمێنین لێرە، هێندێ ترتان وتتان: نافەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) ناكەین و هەر لێرە ئەبین ﴿وَعَصَيۡتُم﴾ نافەرمانیتان كرد ﴿مِّنۢ بَعۡدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَۚ﴾ لەپاش ئەوەی كە خوا نیشانی دان ئەوەی كە ئێوە پێتان خۆشە، كە زاڵبوونی ئێوەو شكانی بێبڕواكانە ﴿مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنۡيَا﴾ هێندێ لە ئێوە نیازی جیهانی كردووە بەدوای دەست كەوتی جیهاندا ئەگەڕا، وەك ئەوانەی كە شوێنەكەی خۆیان بەجێهێشت لەبەر غەنیمەت گرتن ﴿وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۚ﴾ هێندێكتان نیازی ڕۆژی دوایی كردو بەدوای پاداشتی ئەوا ئەگەڕا، وەك ئەوانەی كە مانەوە لە شوێنەكەی خۆیان هەتا شەهید كران، كەواتە ڕیزەكەیان شێواو هەموو نەمانەوە لەسەر یەك بار، بوون بەدوو تاقم لە مەبەست و ئامانجدا، كاری ئاین و عەقیدەیش جیاوازە لە هەموو شتێكی تر، لەبەربەرەكانی و جەنگی عەقیدەو ئاییندا هەركەسانێ زاڵ ئەكات كە نیازو دەروونیان پاك و خاوێن بكەن تەنها بۆ خوا، ئەوانەی كە ئەیانەوێ ئاڵای ئاین و عەقیدە بەرزبكەنەوەو لە دڵیاندا نیازو مەبەستێكی تر ببی بێجگە لە خوا ئەوانە هەرگیز خوا یارمەتیان نادات و زاڵیان ناكات مەگەر خۆیان پاك و خاوێن بكەن و لێ ببڕێن تەنها بۆ خوا، ئەو پاك و خاوێن كردنەش بەلاف و بەدەم پێك نایەت، بەڵكو لەتاقی كردنەوەدا دەرئەكەوێ. ئا بەوجۆرە قورئان نیازو ئامانجی ئاشكرا كردن و دەست نیشانی كرد بە حیكمەت و بەرژەوەندیی لەو ڕووداوە سەخت و دڵ تەزێنەدا، فەرمووی: ﴿ثُمَّ صَرَفَكُمۡ عَنۡهُمۡ لِيَبۡتَلِيَكُمۡۖ﴾ لەپاش ئەوەی كە باس كرا ئینجا خوا ئێوەی بەرگری كرد لەوان هێزو زۆری ئێوەی لادا لەوان هەتا بارتان گۆڕا لەزاڵبوونەوە بۆ ئەو تێك شكانە سەختە لەبەرئەوە تاقیتان بكاتەوە بەوەی كە بەسەرتان هات تا دەركەوێ دامەزراوو دانەمەزراو، ئەوەی لێ بڕاوە بۆ خواو ئەوەی نیازو مەبەستێكی تری تێكەڵكردووە.**

قورئان لەچەند شوێندا بۆچوونی ڕاستو دروستمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە، تێمان ئەگەیەنێ کە هەموو ڕووداوو هەموو شتێ ئەگەڕێتەوە بۆ بڕیارو قەزاو قەدەری خوا، هەموو شتێ پەیدا ئەبێ بەپێی هۆی تایبەتی خۆی، هەموو هۆو خاوەن هۆکان هێنی خوانو بە تەدبیرو کاردروستی فەراهەم دێت، ئەو موسڵمانانە لە یەکەم جارەوە خوا یارمەتی دانو زاڵی کردن، بەپێی حیکمەتو کاردروستی خۆی ئەو زاڵکردنە ڕێكو بەجێبوو، ئینجا کاتێ کە لاواز بوونو ئاژاوەو دووبەرەکیان کردو نافەرمان بوون، خوا هێزو چالاکیەکی لێ سەندنەوەو لای دان لە بێبڕواکان، ئەو تیرەندازانەی لادا لەو کەلەبەرە گرنگەی کە بۆیان دیاریی کرابوو، جەنگ کەرەکانی لادا لە جەنگ کردنو هەڵهاتنو ڕایان کرد، هۆی ئەوەش ئەو کردەوە ناڕاستانەی خۆیان بوو، لە هەمان کاتدا ئەمانەش بە تەدبیری خوا بوو بۆئەوەی تاقیتان بکاتەوە بەو بیمو ترسو تەنگیو تێك شکانو کوشتنو زامداو کردنە، تا بەهۆی ئەوەوە پاڵفتەو پاكو خاوێنیان بکاتو چڵكو چەپەڵیەکانی دڵو دەروونیان ئاشکرا بکات، لەگەڵ ئەوەدا هەر گوناهو خراپەیە کە ببێ بەندە تاوانبارەو سووچو خەتا لە خۆیەتی، چونکە بە خواهیشو دەسەڵاتو هەڵبژاردنی خۆی گوناهو خراپە ئەکات، ئەم بۆچوونە ڕێكو ڕاستەو هیچ ناڕێکیو دژایەتی تیا نیە. ئەو موسڵمانانە ئەو شتە ناشایستانەیان کرد بەڵام لەنیازی خراپەوە نەبوو و سوورو بەردەوام نەبوون لەسەر خراپە، لەسنووری بڕواو مل کەچی بۆ خوا دەرنەچوو بوون، لەبەرئەوە خوای میهرەبان ئەم موژدە گەورەی پێدان: ﴿وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ﴾ بێگومان خوا لێتان بوورد ﴿وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ خوا خاوەنی بەهرەو چاکەیە بەسەر بڕوادارانەوە، هێندێ لە چاکەو بەهرەکانی بەسەریانەوە ئەوەیە کە ببورێ لەهەڵەو تاوانیان کەلە ڕووی سەرکێشیو بێ شەرمیەوە نەبووبێ، بەڵکو لەڕووی لاوازیو دەستە پاچەییەوە بووبێت بەرامبەر نەفسو ئارەزووەکانی نەفس، ئینجا شێوەی شکانو ڕاکردنو دوور کەوتنەوەکەیان ئامادە ئەکات بۆئەوەی شەرم بیانگرێ لە کردەوەکەیانو لەو لاوازیو خۆ نەگرییو نافەرمانیەی کە بەسەریان هاتو ئەو تێك شکانەی بەسەر هێنان، ئەفەرمووێ: ﴿إِذْ تُصْعِدُونَ﴾ واتە باسی ڕووداوی ئەو کاتە بکەنو بیر لەوە بکەنەوە کە ئێوە بەڕاکردن ڕۆیشتنو دوور کەوتنەوە لەمەیدانی جەنگەکە،

وَلَا تَلْوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِىٓ أُخْرَىٰكُمْ فَأَثَٰبَكُمْ غَمًّۢا بِغَمٍّ لِّكَيْلَا تَحْزَنُوا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٥٣﴾ ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ

---

**﴿وَلَا تَلْوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ﴾ بەڕێی کەس نەئەوەستان و لاتان نەئەکردەوە لەهیچ کەس و گوێتان لە هیچ کەس نەبوو لەترسدا ﴿وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِىٓ أُخْرَىٰكُمْ﴾ لەکاتێکدا کە فروستادەو نێرراوەکەی خوا ـ واتە محمدـ(ﷺ) بانگی لێ ئەکردن و لەدواتانەوە، یان لە ناو تاقمەکەی ترتاندا، یان لەناو کۆمەڵی دوایی و پایەتی لەشکرەکەتاندا، بانگی لێ ئەکردن بەم جۆرە: بەندەکانی خوا وەرن بۆلای من، من فروستادەو نێرراوی خوام، هەرکەس بێت و هەڵمەت بدا بەهەشت جێیەتی، بانگی ئەکردن کە پرژو بڵاو نەبنەوەو بگەڕێنەوە بۆ دەوری خۆی! یا بۆ ئەوەی دڵنیا بن لەمانی، هەواڵی کوشتن و نەمانی درۆیە.**

**ئەو بانگی لێ ئەکردن و ئێوەیش گوێتان نەئەگرت و هەر ڕاتان ئەکرد، لەکاتێکدا کە پێویست بوو فەرمان بەریی، پێویست بوو پەیڕەوی کردنی لە خۆگریی و دامەزراوییدا، بەڵام زۆریەتان بەو جۆرە نەبوون ﴿فَأَثَٰبَكُمْ غَمًّۢا بِغَمٍّ﴾ ئینجا لەسەرنجام و بەدوای ئەوەدا دووچاری کردن بەداخ و خەفەتێ کە پێی چەشتن و بردییە دڵتان بە زاڵبوونی دوژمن و ئەو هەموو کوشتن و زامەی کە لێتان کرا، کەلە هەموو شت ناخۆشتر هەواڵی کوشتنی پێغەمبەری ئازیزبوو(ﷺ) کە بەجارێ دڵی داخستن و پشووی لێ بڕین، هەروەها داخ و خەفەتی لەدەست دەرچوونی زاڵ بوونتان کە بە تەمای بوون لەگەڵ داخ و خەفەتی ڕاکردن و بەجێهێشتنی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو هەموو داخ و مەراقەی پێ چەشتن بەهۆی ئەو داخ و مەراقەی کە بردتانە دڵی پێغەمبەرەوە(ﷺ) بەو خۆ نەگری و نا فەرمانی و گوناهەی کە کردتان، یان مەبەست ئەوەیە خوا پێی چەشتن داخ و خەفەتی زاڵبوونی دوژمن و کوشتن و زام لێ کردنی بۆتان لەگەڵ داخ و خەفەتی گەورەتر کە چووە دڵتانەوە بەهۆی هەواڵی کوشتنی پێغەمبەرەوە(ﷺ)، بێگومان واتەی ﴿فَأَثَٰبَكُمْ﴾ لەباوو عورفدا پاداشت دانەوەی لێ وەرئەگیرێ، پاداشتیش بۆ خێرو خۆشیەو داخ و خەفەتیش بە خێرو خۆشی دانانرێ، کەواتە بەکار هێنانی ئەو وتەیە یا بە گوێرەی باوو عورف نەگیراوە، بەڵکو بەگوێرەی ئەسڵەکەی گیراوە لەزمانی عەرەبدا کە**

بریتیە لە سەرەنجامی کردەوە ئیتر خێرو خۆشی بێت یان نا، یان وەك(زەمەخشەری) ئەفەرمووێ: بۆ لاقرتی پێکردنە کە ئەوەش زیادە تەمێ و سەرزەنشتی تیایە، یان لەبەرئەوەیە ئەو داخ و خەفەتە سەری لە خێرو چاکەوە دەرچوو، چونکە بەوە پاڵفتەکران و تەمێ خوار بوون و بوو بەهۆی ئەوە کەلە داهاتوودا خۆگرو بەئارام بن، بەو هەموو داخ و مەراقە گەورانە داخ و مەراقی بچووکیان نەمێنێ کە بریتی بوو لە داخ و مەراقی لەدەست دەرچوونی غەنیمەت و ئەوەی بەسەریان هات وەکو ئەفەرمووێ: ﴿لِّكَيْلَا تَحْزَنُوا عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا مَا أَصَابَكُمْ﴾ واتە ئەو داخ و خەفەتە گەورەی پێچەشتن بۆ ئەوەی غەمبار نەبن لەسەر ئەو سوودو دەست کەوتەی کەلە دەستتان چوو، وە لەسەر ئەو زام و ناڕەحەتیەی کە دووچارتان بوو ﴿وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ خوا ئاگادارو بەخەبەرە بەهەر کردەوەیەك کە ئێوە ئەیکەن، زانایە بە هەموو کردەوەکانتان و بە هەموو هۆو پاڵ پێوە نەرو نیازو مەبەستتان، کەواتە هیچ پینەو پەڕۆو عوزرو بەهانەیەك نرخ و سوودی نیەو هیچ شتێ لەخوا ون نابێ.

لەپاش ئەو تێك شکانە سەختەو ئەو ترس و بیمە بە تینە موسڵمانەکان گەڕانەوە بۆلای خواو پێغەمبەرەکەیان(ﷺ) بەهۆی ڕاستیان لەو پەشیمانی و گەڕانەوەدا خوا ئارام و ئاسایشی خستەدڵیان، وەکو ئەفەرمووێ: ﴿ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّن بَعْدِ الْغَمِّ أَمَنَةً﴾ لەپاش ئەو غەم و خەفەتەی کە پێی چەشتن، ئینجا هێنایە خوار بۆ سەرتان و پێی بەخشین ئارام و بێباکیەك ﴿نُّعَاسًا﴾ کە بریتی بوو لە وەنەوزێك کە ﴿يَغْشَىٰ طَائِفَةً مِّنكُمْ﴾ دەستەیەك لە ئێوەی داگیر کردو دای بە ملی دا، واتە ئەوانەتان کە بڕواداری ڕاستەقینەبوون و دوور بوون لە ناپاکی،(ئیبن و عەباس) ئەفەرمووێ: ئەوانە کۆچ کەران بوون لەگەڵ زۆربەی مەدینەییەکاندا.

بەڕاستی بەسەرهاتێکی زۆر نایابی سەرسوڕهێنەر بووە، میهرەبانی خوا نیشان ئەدات بەو کۆمەڵە بەختەوەرە، ئەو وەنەوزە با ماوەکەی زۆر کەمیش بێت کاتێ ڕوویکاتە هەرکەسێکی شەکەتی تەنگەتاوی ترساو، کاری لێ ئەکات و بارو حاڵەتی ئەگۆڕێ، ئارامی و ڕەحەتی وبێباکی ئەڕژێنێ بەسەر دڵ و دەروونی دا، وەك هەرکەسەکەی لەوەو پێش نەبووبێ وایە، ئەوە شتێکی ڕاستی تاقی کراوەیەو نایش زانرێ چۆن وای لێ دێت و ئەوەی بەسەر دێت!

﴿وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِاللَّهِ غَيْرَ الْحَقِّ ظَنَّ الْجَاهِلِيَّةِ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ الْأَمْرِ مِن شَيْءٍ قُلْ إِنَّ الْأَمْرَ كُلَّهُ لِلَّهِ يُخْفُونَ فِي أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبْدُونَ لَكَ﴾

---

ئەوان خوا ئەو وەنەوزەی دا بەسەریاندا بەم جۆرە کەلەم حەدیسەدا باسی ئەفەرمووێ: کە(تیرمزی و نەسائی و حاکم) ئەیهێنن لە(ئەبو تەڵحە)وە کە ئەفەرمووێ: لە ڕۆژی(احد)دا سەرم بەرز کردەوەو سەرنجمدا کە ئەبینم هەرکام لەوانە لار ئەبێتەوە بەم دیوو ئەو دیودا لەبەر وەنەوزە کوتێ. لە ڕیوایەتێکی تردا ئەفەرمووێ: وەنەوز داگیری کردین، بەجۆرێ خۆم شمشێرەکەم لەدەست ئەکەوت و هەڵم ئەگرتەوەو ئەکەوت و هەڵم ئەگرتەوە.

ئەوانەی کە بڕواداری ڕاستەقینە بوون بەو جۆرە میهرەبانی لەگەڵ کردن و هیچ بیم و ترس و شەکەتی نەهێشتن، بەڵام ئەوانی تر بڕوای تێرو تەواویان نەبوو، ئیتر لەناپاکان، یان بڕوا لاوازەکان، پاک و خاوێن نەبوون لە بۆچوونی نەفامێتی، مل کەچی تەواو نەبوون بۆ خواو بۆ بڕیارو قەزاو قەدەری خوا، دڵئارام نەبوون بەوەی کە دووچاری هەرچی بێن تاقی کردنەوەیەو بۆ پاڵفتە کردنیانە، لەبەرئەوە نیە کە خوا وازی هێنابێ لە دۆستەکانی لەبەر دوژمنەکانی، بۆ ئەوە نیە کە یارمەتی بێبڕوایی و بەتاڵ و ناهەقی بدات و زاڵی بکات بەسەر بڕواو خێرو ڕاستی دا، وەك دەرئەکەوێ لەمەی کە ئەفەرمووێ: ﴿وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ﴾ دەستەو تاقمێکی تر بێگومان هەرخۆیان مەبەست بووو هەر غەمی خۆیان ئەخواردو ئیتر بیریان بەلای هیچ کەس و هیچ شتێ ترەوە نەبوو، ئیتر ئەوانە لە ناپاکەکان بووبن وەك زۆربە ئەفەرموون، یان لە چەند کەسانێکی تریش کە بڕوا لاوازبوون وەك هێندێ ئەفەرموون، ﴿يَظُنُّونَ بِاللَّهِ غَيْرَ الْحَقِّ﴾ لەکاتێکدا گومانی ناڕاست و ناهەق ئەبەن بە خوا ﴿ظَنَّ الْجَاهِلِيَّةِ﴾ گومانی نەفامێتی و کۆمەڵ و میللەتی نەفامان، بەم ڕەنگە لایان وابوو کە خوا یارمەتیان نادا و ڕزگاریان ناکات و بەتەواوی سەریان تیا ئەچێ و ئەبن بە نێچیری دەست دوژمن، یان

گومانیـان وا بـوو کـه ئەگـەر ئایینەکـەیان ڕاسـت بـێ ئـەبێ هـەر سـەرکەوێن و دووچاری ئـەو کوشتن و بڕینە نەبن! ﴿يَقُولُونَ﴾ بە بێزاریەوە بە شێوەی پرسیار ئەڵێن: ﴿هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَيْءٍ﴾ ئایا ئێمە لـەم کـارەدا هـیچ شتێکمان بۆ هەیـەو هیچمان بەدەستە؟ واتـه نـەخێر، ئەمـەی کـه ئێمـەی تێکـەوتین بەخۆشـی خۆمـان و لەسـەر تـەدبیرو ڕای خۆمـان نـەبوو، بـەڵکو بەناچـاری ئەمـەمان پـێکرا تاوامـان بەسـەر هـات، ڕەنگـه ئەمانـه لـەو کەسـانه بـوون کـه ئەیانویست لە مەدینە دەرچن و ڕای(ئیبن و ئوبەی) یان پەسەند ئەکرد، یان ئایا ئێمە هیچ بەشێکمان بۆ هەیە لەو یارمەتی دان و زاڵبوونی کە بەڵێنمان پێدرا؟ واتە نەخێر، کەواتـه لەسـەر هـەر بـارو شـێوەیەك پرسـیارەکەیان ئەگەڕێتـەوە بـۆ ڕەخنـەگرتن و بـڕوا نـەبوون بەسەرکرداتیەکەی پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەوەش ئەوپەڕی بێ شـەرمی و نەفامیـەو لەگەڵ بڕوادا ناگونجێ، ئینجا پێش ئەوەی گومان و خەتەرە نارەواکانیان باس بکات، چەسپانی ئـەکات بـۆ ڕاست کردنەوەی گومان و بۆچوون و هەڵوێستەکەیان، ئەفەرمووێ بە پێغەمبـەر(ﷺ): ﴿قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ﴾ بڵـێ بەوانـه: بێگومـان کـارو بـار هـەمووی بـۆ خوایـەو هینـی خوایـە، کەواتـه نەئەوان و نـه غـەیری ئـەوان هـیچ کاروبارێکیـان بـۆ نیـەو بـه دەسـت نیـە، لـه جێیـه خـوا بـه پێغەمبەری فەرموو: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَيْءٌ﴾ هیچ شتێکت بۆ نیـەو بەدەسـت نیـە، ئیتر ئـەبێ هەرکەسێکی تر چی بەدەست بێت؟!! بێجگە لەوەی کەبە دەم ئەیان ووت، لە دەروونیشیان دا شـتی وابوو کـه دەریـان نەئـەبڕی، بـەڵام خـوا ڕاسـتی لـێ وتن و ئاشـکرای کـرد: فـەرمووی: ﴿يُخْفُونَ فِىٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبْدُونَ لَكَ﴾ ئەیـشارنەوە لـەدەروونی خۆیانـدا ئـەوەی کـه دەری نـابڕن بۆت، واتە لەدڵیاندا چەند خەتـەرەو خـەیاڵی نـارەواو چەند ڕەخنەیـەکیان هەیە کە دەری نابڕن لای تۆ، ئیتر با لەناو خۆیاندا دەری بڕن و بیڵێن بە یەکتر، کەواتە ئەو شێوە پرسیارەی کەئاڕستەیانکردلەنیازودڵێکی پاکەوە نەبوو، وە مەبەستیان هەر ڕەخنەو تانەو تەشەر بوو،

يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَيْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا ۗ قُل لَّوْ كُنتُمْ فِي بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقَتْلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ ۖ وَلِيَبْتَلِيَ ٱللَّهُ مَا فِي صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِي قُلُوبِكُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٥٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْا۟ مِنكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا۟ ۖ وَلَقَدْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٥٥﴾

---

﴿يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَيْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا﴾ ئەوانە ئەڵێن: ئەگەر هیچ شتێك بۆ ئێمە ببوایە لەم مارووبارەدا ئێمە نە ئەكوژراین لێرەداو ئەمەمان بەسەر نەئەهات، واتە ئەگەر بەشێكمان ببوایە لەو بەڵێنی سەركەوتن و زاڵبوونەی كە پێمان درا، یان لە تەدبیرو ڕاوێژی ئەم جەنگەدا، ئەمەمان بەسەر نەئەهات و نەئەكوژراین لێرەدا، ئەو مەبەستەی كە لەم وتەیە وەرئەگیرێ جیاوازە لەگەڵ ئەوەی كە وەرئەگیرێ لەو پرسیارەی كە ڕابوورد، ئەمە دووبارە كردنەوەی ئەو نیە، چونكە ئەگەر مەبەست بە وتەی ﴿ٱلْأَمْرِ﴾ لە هەردوو شوێنەكەدا یەك شت بێ لەو دووبارەی كەلە تەفسیرەكەدا وتمان، ئەوا مەبەست بەم وتەی ئێرەیان ڕەخنەگرتن و بەرپەرچ دانەوەی ئەو وەڵامەیە كە ئاماژەی بۆ كرد و فەرمانی دا كە پێغەمبەر(ﷺ) ئاڕاستەیانی بكات، ئەگەر مەبەستەكەش لە هەردوو لایەك شت نەبێ ئەوا ئاشكرایە جیاوازی ئەم دوو وتەیەو دووبارە كردنەوە نیە، بێجگە لەوەی كە وتمان مەبەست بەم وتەی ئێرە ڕابەرو بەڵگە هێنانەوەیە لەسەر نەبوونی ئەوەی كە پرسیاریان لێ كرد، كەواتە بە هەر جۆرو لەسەر هەر بار ئەم وتەی دوومەیان جیاوازە لە وتەی یەكەمیان كە بە پرسیار ئاڕاستەیان كرد.

ئەوانەی كە ئەم وتەیان ئەوت هەڵەبوون و بۆچوونێكی ناڕەوایان هەبوو، جالەبەرئەوە بەرپەرچی وتەكەیان ئەداتەوە. ئەفەرموێ: ﴿قُل لَّوْ كُنتُمْ فِي بُيُوتِكُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە: ئەگەر ئێوە لە ماڵەكانی خۆتاندا بوونایە بەئارامی و خۆشی و بەبێ جەنگ ﴿لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقَتْلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ﴾ بێگومان ئەوانەی كە كوژرانیان لەسەر نووسرابوو لەو جەنگەدا دەرئەچوون بۆلای ئەو شوێنانەی كە بڕیار درابوو كوژران و كەوتن و ڕاكێشانیان

تیایانـدا، واتـه ئەگـەر ئێـوه دەرنەچـوونایه بـۆ ئـەو جەنگـه لەسـەر فـەرمانی پێغەمبـەرو کاروبارتان بەپێی خواستو خواهیشی خۆتان بووایه، بێگومان ئەو کەسانەی کە کوژرانیـان لەلایـەن خـواوه بڕیـار درابـوو، ئـەبێ ئـەو کەسـانه بـەپێی خۆیـان دەرچـوونایه بـۆ شـوێنی کوژرانەکەیانو لەو شوێنە تایبەتیانەدا بکەوتنایه بە کوژراوی، چونکە هەموو کەس ئەجەلو ماوەی ژیانیو شوێنی مردنی دیاریی کراوەو بەهیچ کلۆجێك ناگونجێ دواو بەرو لادان لـەو دیـاریی کراوانـە، ئینجـا ئامـاژه ئـەکات بـۆ کاردروسـتی خـوا لـەو ڕووداوه سـەختەدا، ئەفەرمووێ: ﴿وَلِيَبۡتَلِيَ ٱللَّهُ مَا فِي صُدُورِكُمۡ﴾ واتە خوا ئەوەی کرد کە کردی لەبەر چەند هۆو بەرژەوەندیـە، بۆئـەوەی تـاقی بکاتـەوه ئـەوەی کەلـە سـنگتاندا هەیـه لـه هێـزو بـێهێزیی بڕواکـەتان، تـا بـەکردەوەی خۆتـان ئاشـکرای بکـات ئـەوەی کـه هـەرخوا خـۆی زانیویـەتیو نەزانراو بووه لای مەردمان، ئەوەی بۆ ئەوەکرد، نەك بۆئەوەی گوێی نـەبێ لـه دۆستەکانیو یارمـەتی دەری ئایینەکـەی، ﴿وَلِيُمَحِّصَ مَا فِي قُلُوبِكُمۡ﴾ بۆئـەوەی پاڵفتـەو پـاکو خـاوێن بکـات نیازو عەقیدەو بڕوایەك کەلە دڵەکانتان دایە لە هەر خەتەرەو ناڕاستیو بۆچوونێکی نـاڕەوا، بێگومـان تـەنگیو سـەختی بەسـەرهاتی خـراپ سـەنگی مەحەکـە بۆئەودەرخسـتنو پاڵفتەکردنە، ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ خوا بەڕێکی زانایە بە هـەر نیـازو خەتـەرەو شتێکی نهێنی کەلە دڵو دەروون دایە.

ئەم فەرموودەیـە لەلایەکەوه دڵخۆش کـەرو ئومێد بەخشە، لەلایـەکی تـرەوه ترسێنەرە، دەست نیشان ئەکات بەوەی کە خوا خۆی هیچ پێویستی نیە بەو تاقی کردنەوه، بەڵکو ئەو پـەڕی دادو میهرەبـانی بـەکار ئـەهێنێ، ئـەوەتا بـەپێی زانینەکـەی خـۆی تۆڵـه ناسێنێ لـه تاوانباران هەتا خۆیان بەکردەوه بەدی نەهێنن، بێجگە لەوەیش بەو تاقی کردنـەوه ڕێگـەی هیچ بڕو بیانوویەك نامێنێ بۆیان، لەلایەکی تریشەوه هێندێ لە بەندەکانی پێپاكو خاوێنو پاڵفتـه ئەبێتـەوه. ئینجـا ئامـاژه ئـەکات بـۆ هـۆی ئـەو تێـك شـکانه کـه هـات بەسـەر ئـەو موسڵمانانەدا، ئاگاداریان ئەکات کە سووچی خۆیان بووەو لە کردەوەی خراپی خۆیانـەوه پەیدا بووەو لەگەڵ ئەوەدا خوای میهرەبان لێیان بورد، ئەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوۡاْ مِنكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ﴾ بەڕاسـتی ئەوانـەتان کـە هـەڵهاتنو پـشتتان کـرده جەنگەکـه لـەو ڕۆژەی کـه

هـەردوو کۆمـەڵ گەیـشتن بـە یـەك‌و تێـك ڕژان ﴿إِنَّمَا ٱسۡتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِبَعۡضِ مَا كَسَبُواْۖ﴾ هـەر شەیتان هەڵی خلیسکاندن‌و ئەوەی پێ‌کردن بەهۆی هێندێ لەو گوناهانەی کەلەوەو هەر کردیان، واتە ئەوانە لە پێشەوە گوێڕایەڵی شەیتانیان کرد لە هێندێ گوناهدا، بەهۆی ئەوەوە ئـەم گوناهەشـی پـێ‌کردن، چـونکە گونـاه ڕاتەکێـشێ، لەسـەر ئـەم بـارە لادان‌و هەڵخلیـسکانەکەیان ئـەو هـەڵهاتن‌و ڕاکردنەیـە، زۆربـە لەسـەر ئـەوەن کـە لادان‌و هەڵخلیسکانەکەیان ئەو گوناهانەیە کەلە پێشەوە کردیان، لە تەفسیرەکەی دا ئەفەرموون: هۆی ئەو ڕاکردن‌و پشت تێ‌کردنە هەر ئەوەبوو کە شەیتان لەوەو بەر هێندێ گوناهی پێ‌کردن، بە هۆی ئەوەوە هێزی دڵ‌و دامەزراویان لێ گیرایەوەو خۆیان پێ‌نەگیراو ڕایان کـرد، ﴿وَلَقَدۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهُمۡۗ﴾ بێ‌گومـان خـوا لێیـان بـوورد، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٞ﴾ چـونکە بەڕاسـتی خـوا لـێ بـووردەی پەلەنەکـەرە لـە تۆڵـە سـەندندا، ئینجا ئایا مەبەست بەو هێندە گوناهـە گونـاهی بەجێ هێشتنی تیرەنـدازەکان بێـت‌و پـەلاماردانیان بـۆ غەنیمـەت‌و دەست کـەوت‌و گومانی نارەوایان کە ئەگەر نەڕۆن لەپاشدا پێغەمبەر(ﷺ) بێ بەشیان ئەکات، یان گوناهی تری لەوەو بەریان کە سستی‌و لاوازی فەراهەم ئەهێنێ لەدڵ‌و دەروونـدا، یان وەرگرتن‌و ڕازی بوون بە شکست‌و تێك شکان کە شەیتان شیرینی کرد لەپێش چاویان، یان هەر جۆرە گوناهێکی تر مەبەست بێت؟ بەهەرکام لەمانە وتراوە لەلایەن زانایانەوە، هەرکام دەست ئـەدات، بەهـەر حـاڵ‌و لەسـەر هـەر بـار ئـەوە نیشان ئـەدات کـە گونـاه مایـەی بەدبـەختی‌و دووچاربوونە لە هەردوو جیهاندا، هۆی پچڕانی پەیوەستیە بە گرتنەوەی کۆمەکی‌و یارمەتی خوا، خوا بە میهرەبانی خۆی پەنامان بدات، هەرچەند هەموو شتێ‌و هەموو کردەوەیەك چاك بێت یان خراپ بەدەست خوایەو لە ڕاستی دا خوا ئەیکات، بەڵام پێویستە شەرم بکرێ‌و کە خراپە بەهینی شەیتان یان بەهینی بەندە دابنرێ، جا بەو پێیە ئایەتە کە فەرمووی: ﴿إِنَّمَا ٱسۡتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ چونکە شەیتان هۆو بوو بۆی. ئینجا هەمیتر مەسەلەی مردن‌و ژیان ڕوون ئەکاتـەوە، لەگـەڵ پـڕو پووچی بۆچوونی بێبڕوایان‌و ناپاکـان لـەو بارەیـەوە، بـانگ ئـەکات بڕواداران کە نابێ بۆچوونی ئەمان وەك بۆچوونی ئەوان وابێ،

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَقَالُواْ لِإِخْوَٰنِهِمْ إِذَا ضَرَبُواْ فِي ٱلْأَرْضِ أَوْ كَانُواْ غُزًّى لَّوْ كَانُواْ عِندَنَا مَا مَاتُواْ وَمَا قُتِلُواْ لِيَجْعَلَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ حَسْرَةً فِي قُلُوبِهِمْ وَٱللَّهُ يُحْيِۦ وَيُمِيتُ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١٥٦﴾

---

**ئەفەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی کەسانێ بڕواتان هێناوە ﴿لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ وەك ئەوانە مەبن کە بڕوایان نەهێناوە ﴿وَقَالُواْ لِإِخْوَٰنِهِمْ﴾ ئەیان وت دەربارەی برادەرەکانیان‌و ئەڵێن: ﴿إِذَا ضَرَبُواْ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ کاتێ کە بڕۆن بە لایەك داو دووربکەونەوە بەسەرفەر بۆ بازرگانی یان بۆ هەرچی تر، ئینجا لەو سەفەرەدا بمرن ﴿أَوْ كَانُواْ غُزًّى﴾ یا غەزاکەر بن‌و بچن بۆ جەنگ‌و غەزاو بکوژرێن، ئەو ناپاك‌و بێبڕوایانە دەربارەی ئەم مردووو کوژراوانە ئەڵێن: ﴿لَّوْ كَانُواْ عِندَنَا مَا مَاتُواْ وَمَا قُتِلُواْ﴾ ئەگەر ئەوانە نیشتەجێ بوونایە لای ئێمەو دەرنەچوونایە، نەئەمردن‌و نەئەکوژران، ئەو وتە نارەوایە ئەڵێن: ﴿لِيَجْعَلَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ حَسْرَةً فِي قُلُوبِهِمْ﴾ تا لەسەرەنجامدا ئەوە بگێڕێ بەداخ‌و مەراق لەدڵی ئەوانەی کە براو برادەرەکانیان مردن‌و کوژران، داخ‌و مەراقی ئەوەی کە کاتی خۆی جڵەوگیرییان نەکردن لەدەرچوون. واتە ئەی بڕواداران ئەو وتە نارەوایە مەڵێن‌و بڕواتان پێی نەبێ کە ئەوە وتەو بڕوای بێباوەڕانەو سەرەنجامی خراپیشی هەیە، مردن‌و ژیان نەبەستراوە بەو جۆرە شتانەوە، بەڵکو بە خوایەو بە دەست خوایە، وەك ئەفەرمووێ: ﴿وَٱللَّهُ يُحْيِۦ وَيُمِيتُ﴾ خوا گیان ئەداو گیان ئەسێنێ، هۆی ژیان‌و مردن ئەو فەراهەمی ئەهێنێ، خوا بیەوێ کەسێ بژیەنێ هەرچەند هۆی ژیان‌و کامەرانی زۆر فراوان بێت، ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ خوا بینایە بەهەر کردەوەیەك کە ئێوە ئەیکەن، کەواتە گوێڕایەڵی بکەن‌و دووربکەونەوە لە هەموو گوناهێك، دووربکەونەوە لە هەموو وتەو کردەوەو بۆچوونی بێبڕوایان‌و ناپاکان.**

**بەگوێرەی شوێنەکە وا دەرئەکەوێ کە ئەو وتەو بڕوا ناڕاستەی هینی ناپاکەکانی مەدینە بێت، کە گەڕانەوە پێش بەرپا بوونی جەنگی(احد) هەروەها ئەو بت پەرستانەی مەدینە کە هێشتا بڕوایان نەهێنابوو، ئەوانە ئەو کوشتن‌و ڕووداوە سەختەیان گرت لەدەستەوە بۆ تەشەرلێدان‌و ئازار دانی دڵی بڕوادارەکان کە بەگوێی ئەوانیان نەکردو خۆیان خستە ناو ئەو**

جەنگە، بێگومان ئەو وتەو تەشەرە زۆر کاریگەر بوو لە دڵو دەروونـدا، چالەبەرئەوە قورئان بەرپەرچی دانەوەو دەم کوتی کردنو ئەو بۆچوونە ناڕاستانەی ڕاست کردەوە بەم ئایەتە پیرۆزە.

ئەو دڵەی کە ڕەنگی گرتبێ بەبیرو بڕوای قورئانی زۆر جیاوازە لە هەر دڵێکی تر کەبێ بەشە لەو بیروبڕوا پیرۆزە، خاوەنی ئەو بیروبڕوا قورئانیە تێگەیشتووە لە باوەکانی خوا کە مردنو ژیانو ڕووداوەکانی جیهانی لەسەرە بە خۆشیەکانیەوە، ئەزانێ دووچاری هیچ شتێ نابێ بێجگە لەوەی کە خوا نووسیویەتیو بڕیاری داوە، هەرچی خوا بڕیاری داوە ئەبێ هەر ببێو هەرچی بڕیاری نەبوونی دابێ ئەبێ هەرگیز نەبێ، لەبەرئەوە دڵ ئارامە بەبڕیارو قەزاو قەدەری خوا، لەبەرئەوە لەکاتی تەنگیو ناخۆشی دا دنیای لەسەر تەنگ نابێتەوە، لە کاتی خۆشیو کامەرانی دا لەپەت بەرەڵا نابێتو لە هەر دووبارەکەدا خۆگرو بەرگەگر ئەبێ، لەپاش ڕوودانی ناخۆشی یەکە ناڵێ ئای کاشکێ وام بکردایەو وام نەکردایە، چونکە لەپاش ڕوودان بۆی دەرئەکەوێ کە بڕیارو قەزاو قەدەری خوا لەسەر ئەوە هاتووەو دەست نادا بۆ نەبوونو گۆڕان! ئەزانێ کاتێ هەر هەوڵو تەدبیرو ڕاوێژێك بۆ هەر شتێ پێش ڕوودانیەتی.

ئا بەو جۆرە هاوکێشیو هاوتایی پەیدا ئەبێ لەنێوان پێویستی هەوڵو کردەوەی مەدروەو مل کەچیەکەی بۆ خواهیشو بڕیاری خواو لەنێوان پێویستی هەوڵو کردەوەو پێویستی پشت بەستن بە خواو دڵ بەستن بەبڕیارو قەزاو قەدەری خواوە، بەڵام ئەوەی کە بێبەش بێت لەو بیروبڕوا پیرۆزە، بەهەمیشەیی بێئارمەو بەرگەی هیچ شتێ ناگرێ، هەمیشە بۆ هەموو کارێکی ناخۆش داخو مەراق ئەخواتو پەشیمانە.

ئەو وتەیەی کەلەم ئایەتەدا قورئان جڵەوگیریی لێ کرد، وتەی کەسانێك کە هەر ڕووکەشو ڕواڵەت ئەبینن و بێئاگان لەهێزی ئیش کەری ڕاستەقینە لەم بوونەوەرەدا، یان ئاگاییەکی لاوازیان هەیەو بەهۆی ئەوەوە ئەو هێزە ئیش کەرە فەرامۆش ئەکەن لەبەرئەوە ئەکەونە هەڵەو بۆچوونی ناڕەوا دڵیان داگیر ئەکات.

لەپاش ڕاست کردنەوەی بۆچوون لەبارەی مردنو ژیانەوە، ئینجا بێدارمان ئەکاتەوە لەسەرئەوەی کە بەمردن یان کوژران کارمان دوایی نایەت، بەڵکو ئەوەی کە بمرێ یان بکوژرێ لەرێی خوادا ژیانی ڕاستەقینەو کامەرانی لەوێوە دەست پێئەکات، کەواتە ئەو مردنو کوژرانە چاکترە لەم ژیانی جیهانە، وە چاکترە لە هەرچی هۆی کامەرانی ئەم جیهانو ژیانە،

﴿وَلَئِن قُتِلْتُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوْ مُتُّمْ لَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحْمَةٌ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿١٥٧﴾ وَلَئِن مُّتُّمْ أَوْ قُتِلْتُمْ لَإِلَى ٱللَّهِ تُحْشَرُونَ ﴿١٥٨﴾ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾﴾

---

**ئەفەرمووێ: ﴿وَلَئِن قُتِلْتُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوْ مُتُّمْ﴾ سوێند بە خوا ئەگەر ئێوە بکوژرێن لەڕێی خوادا، یان بمرن لەو ڕێگەیەدا بەبێ کوشتن ﴿لَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحْمَةٌ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾ بێگومان لێبوردنێك لەلایەن خواوە لێتان و میهرەبانیو بەرزەییەکی ئەو چاکترە لە سامانو داراییەکەیان، چاکترە لە ڕێزو دەسەلاتو هەر خۆشیەکی ئەم زەیو جیهانە، واتە ئێوە کە کوژرانیان مردنو لەو ڕێگەدا خوا لێتان ئەبورێو میهرەبانیتان لەگەلْ ئەکات بەدوور خستنەوەتان لەئاگرو خستنتان بۆ ناو ئەو بەهەشتو نازو ڕێزەی کە نەبڕاوەیەو وێنەی لەم جیهانەدا نیە، دەی ئەوەلە کوێو هەرچی وا لەم جیهانەدا لە کوێ؟ ﴿وَلَئِن مُّتُّمْ أَوْ قُتِلْتُمْ لَإِلَى ٱللَّهِ تُحْشَرُونَ﴾ سوێند بە خوا ئەگەر ئێوە بمرن، یان بکوژرێن بە هەر جۆرو لەسەر هەر ڕێگەو بارێك بێگومان هەر بۆ لای خوا کۆ ئەکرێنەوە بەزیندوویی لە ڕۆژی دوایی دا، واتە ئەبێ هەمووتان ئەم جیهانە جێبێڵن بە مردنی سەر جێگە یان بەکوشتن، دوا ڕۆژو چارەنووستان هەر دەرچوونە لەم جیهانەو زیندوو کردنەوەو کۆکردنەوەتان لای خوا، دەی کەواتە با مردنو کوژانەکەتان لەڕێی خوادا بێت تا سەرەنجامی ئەو لێ بووردنو میهرەبانیەبێت، نەك بە جۆرێ بێت کە سەرتان لە خەشمو نەفرینی خواو سزای ئاگری دۆزەخەوە دەرچێ.**

**ئا بەو جۆرە قورئان تێمان ئەگەیەنێ لە مردنو ژیان لەسەر باوو شێوە ڕاستەقینەکەی خۆیان، تێمان ئەگەیەنێ لە قەزاو قەدەری بەهۆی ئەوەوە دلْ دائەمەزرێو بەئارام ئەبێ بەرامبەر هەر تاقی کردنەوەیەك کە قەزاو قەدەر پێی هاتبێ، بەرامبەر حیکمەتو لێزانیو کاردروستی خوا لە هەموو کاروبارو بڕیارەکانی دا.**

لەم چەند ئایەتی داهاتووەدا گەڕان و گەردشێکی تازە ئەکات بەدڵ و دەروون بەناو چەند شتێکی گرنگی ئیسلامیدا ئەخولێتەوە بەدەوری شەخصی پێغەمبەر(ﷺ) و بەدەوری پێغەمبەرێتی یەکەی داو کەڵك و نرخی لەژیانی هەموو ئادەمی دا بەگشتی و ژیانی ئەم ئوممەتەدا بەتایبەتی، لە یەکەمجارەوە وەسف و سەنای پێغەمبەر(ﷺ) ئەکات لەبارەی ڕەوشت و کردەوەی بەرامبەر هاوەڵەکانی کەبەهۆی کردەوەی ناڕەوای هێندێکیانەوە لەم جەنگەدا ئەو هەموو بەسەر هات و ڕووداوە دڵ تەزێنانە هاتن بەسەر موسڵماناندا، تەنانەت شەخسی پێغەمبەر(ﷺ) یەکێ بوو لەوانە کە دووچاری سزاو زام و ناڕەحەتی هات، وەسف و سەنای ئەکات لەسەر ئەو دڵفراوانی و نەرم و نیانیەی کە بەکاری هێنا لەگەڵ ئەوانەی کە کەوتنە ئەو هەڵە گەورانە، ئەفەرمووێ: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ﴾ واتە ئەوانە ئەوەیان کرد کە کردیان کە بەپێی باوو سروشتی ئادەمی ئەبوایە سەرزەنشت و توندوتیژیت ئاڕاستە بکردنایە و خەشمت لێ بگرتنایە، کەچی هەر بەهۆی میهرەبانیەکی گەورە و گرنگ لەلایەن خواوە تۆ ئەی پێغەمبەر نەرم و نیانیت بەکار هێنا بۆیان. بەڵێ بەڕاستی هەر میهرەبانی خوا بوو کە ئەو دڵە بەفەرەی نەرم و بەزەیی دار کرد ئەگیان هۆی خەشم و دڵگرانی زۆر بوو لەو جەنگ و ڕووداوەدا وەك دەست نیشانمان بۆکرد لەمەوپێش. بەڵێ میهرەبان ئەو پێغەمبەرە ئازیزەی هەر بە میهرەبان و دڵنەرم هێنا، ڕووخۆش و دەم بەزەردەخەنە بوو لەگەڵ مەردومدا مەگەر بێشەرعی ببینیایە، هەمیشە دەست و دڵفراوان و کراوە بوو بەبێ چاوەڕوانی و پێویستی بەو خەڵکە، هەریگز خەشم و قینی لەبەر خۆی نەئەبوو کە تێکەڵی بوون و لەگەڵی بوون، هەرکەس لەگەڵی و هاوڕێی بوایە پڕی دڵ و دەروونی ئەبوو لە خۆشەویستی ئەو پێغەمبەر خۆشەویستە(ﷺ) وە بەهۆی ئەو خووڕەوشتە بەرزو شیرینانەوە ئەو موسڵمانانە کۆ ئەبوونەوە لەدەوری و فیداکاری بوون و ئەگەر ئەو بەو جۆرە نەبوایە ئەوانیش بەو جۆرە نەئەبوون وەکو ئەفەرمووێ: ﴿وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ﴾ ئەگەر تۆ کەسێکی بەد خوو قسە ڕەق و دڵڕەق بوویتایە، ئەوانە بڵاوەیان ئەکرد و بەدەورت دا نەئەمان و ئەتاران لێت، دیارە ئەو کاتە کارو فەرمانەکەی خۆی بۆ بەسەر نەئەبراو مەردومیش دووچاری بەدبەختی و سەرگەردانی ئەبوون. لە میهرەبانی خوا بە زیاد بێت کە پێغەمبەرەکەی

میهرەبان‌و قسە خۆش‌و ڕەوشت شیرین کرد، ﴿فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ﴾ کەواتە ببورە لێیان لەو شتانەی کە پەیوەندی بە خۆتەوە هەیەو مافی خۆتە ﴿وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ﴾ داوای سڕینەوەو لێ بوردنیان بۆ بکە لە خوا لەو شتانەی کە مافی خوان‌و پەیوەندییان بە خواوە هەیە، ﴿وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ﴾ ڕاوێژو تەدبیریان لەگەڵ بکە لەکاروباری جیهانیان ئایینی ئەگەر سورش(وحی) نەهاتبێ. ئەم فەرموودەیە بەم ڕوون‌و ڕەوانیە فەرمان‌و بڕیاری دا لەسەر پێویستی تەدبیرو ڕاوێژ لە ڕژێمی حوکمڕانی دا لەکاتێکدا کە پێغەمبەر(ﷺ) خاوەن‌و کاربەدەستەو پێویستی نەبووە بەهیچ کەس، چونکە هەواڵ‌و سروشی بۆ ئەهات لە خواوە بۆ هەرکارێك کە پێویست بوایە، ئەوەی پێویست کردو فەرمانی پێدا تا ئوممەت لەپاش دا ئەوە بکەن بە باوو پەیڕەوی بکەن، وەك(بەیهەقی) لە(حسن)ەوە ئەگێڕێتەوە کە دەربارەی ئەم ئایەتە فەرموویەتی: خوا زانیویەتی کە پێغەمبەر(ﷺ) هیچ پێویستی نەبووە لە پرس‌و ڕای ئەو خەڵکە، بەڵام ویستی کە ئەوە بکرێ بە باوو لەپاش ئەو پەیڕەوی بکرێ. ئەو فەرموودەی(حسن)ە ڕێکەو بەهێز ئەبێ بەم حەدیسەی کە(ئیبن و عدی‌و بەیهەقی) ئەیهێنن لە(ئیبن‌و عەباس)ەوە -خوای لێ ڕازی بێت- کە فەرموویەتی: کاتێ ئەم هاتە خوارەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئاگاداربن کە بێگومان خواو پێغەمبەرەکەی بێ نیازو پێویستێ بەوە، بەڵام خوا ئەوەی دانا و گێڕای بە ڕەحمەت بۆ ئوممەتەکەم. کەواتە هەرکام لەوان پرس‌و ڕاوو ڕاوێژبکات ڕێنوومایی‌و ڕێی ڕاست دانە بەری لەکیس نەچووە، هەرکەس نەیکات‌و وازی لێ بێنێ ئەو کەسە ون بوون‌و لادان لە ڕێی ڕاست بەشیەتی.ئەم فەرمان‌و فەرموودەیە هیچی تیا نەهێشتووەتەوەو هیچ کەس ڕێی گومان‌و دوو دڵی نیە لەوەدا کە تەدبیرو ڕاوێژ بیرو باوەڕێکی بنەڕەتیەو ڕژێمی ئیسلام ئەبێ هەر لەسەر ئەوە دابمەزرێ‌و ڕاگیربکرێ، ئینجا ئیتر بە هەر شێوەو لە هەر ڕێگەیەکی ڕاست‌و ڕەوا پێك بهێنرێ‌و بەدی بێت چاکەو ڕەوایەو هیچ شێوەو ڕێگەیەکی تایبەتی بۆ دیاریی نەکراوەو وازی لێ هێنراوە بۆ ئوممەت کەلە هەر چەرخ‌و سەردەمێك دا بە پێی بەرژەوەندی‌و گۆڕانی بارو ڕووی ژیان‌و جیهان، شێوەو ڕێگەی بۆ هەڵبژێرن. بێگومان بەکار هێنانی ئەم بیروباوەڕی تەگبیرو ڕاوێژە لەو جەنگەدا بەرهەم‌و سەرەنجامی خراپی بوو بەدیمەن‌و ڕووالەت، چونکە بوو بەهۆی دووبەرەکی‌و تێك چوونی یەکێتی ئەو لەشکرە تا ئەو

ڕادەی کە(کوڕی ئوبەی) لەو کاتە تەنگەدا گەڕایەوە بۆ مەدینە لەگەڵ یەك لەسەر سێی لەشکرەکە، ئەوەش بوو بەچاو شکێن بۆ موسڵمانەکان و نزم کردنەوەی ورەیان، هەروەها سەری لەو تێك شکان و کوشتن و زامەوە دەرچوو، لەکاتێکدا کە پێغەمبەر(ﷺ) بە گوێرەی خەوەکەی خۆی کە باسمان کرد ئاگادار بوو بەم ڕووداوە سەختانە، کەواتە بەپێی تێگەیشتنی ئێمە ئەبوایە پێغەمبەر(ﷺ) ئەو تەدبیرو ڕاوێژی بەکار نەهێنایە بۆ جارێکی تر، کەچی لەپاش ئەم جەنگەو ئەم ڕووداوە سەختانە ئەم فەرمان و فەرموودەیە هاتە خوارەوە، پێغەمبەر(ﷺ) لەماوەی ژیانی دا ڕەفتاری پێ کرد، چونکە ویستی لەسەر بەرنامەی قورئان ئوممەتێك پێك بێنێ و پەروەردەی بکات و پێی بگەیەنێ و ئامادەی بکات بۆ سەرکردایەتی مرۆڤ و مرۆڤایەتی، بێگومان باشترین هۆو ڕێگەیەك بۆ ئەو پەروەردەو پێگەیاندن و ئامادە کردنە، بەدی هێنانی ئەم بیرو باوەڕی تەدبیرو ڕاوێژەیە، فێرکردن و ڕام کردنە لەسەر هەڵگرتنی ئەرك و باری سەرەنجامی کردەوە، لەسەر ڕاست کردنەوەی هەڵەیەك کەڕوو بدا، لەو ڕێگەیەدا هەر هەڵەو زیانێك ڕوو بدا دڵ ناگرێ و نابێ بەکۆسپ و چاونادا لەچاو ئەو دەست کەوتە گرنگەدا کەبریتیە لەو پێگەیاندن و ئامادە کردنەی کەباس کرا، بێگومان مەبەست لە تەدبیرو ڕاوێژو ئاڵو گۆڕێ بیرو ڕای ئەو گەل و کۆمەڵەیە، هەڵبژاردنی بارو ڕایەك، ئینجا کاتێ کە کار گەیشتە ئەوە ئیتر نۆبەی کردەوەو هەڵسانە بە بارو ڕای هەڵبژێرراو، کردەوەو هەڵسان بەبێ سەر لێ کردنەوەو دوو دڵی، بە پشتیوانی خواو پشت بەستن بە خوا، بەستنەوەی کارەکە بەقەزاو قەدەری خواو وازهێنانی بۆ هێزو خواهیشی خوا، وەکو ئەفەرمووێ بە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی(ﷺ) ﴿فَإِذَا عَزَمْتَ﴾ واتە دوای تەدبیرو ڕاوێژ کردنەکەت، ئینجا کاتێ کە دڵت دابەست لەسەر کردەوەو بڕیاری ئەو بارە هەڵبژێرراوەتدا ﴿فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ﴾ ئەوکاتە پشت ببەستە بە خواو کاری خۆت حەواڵەی ئەو بکە، چونکە هەر خوا ئەزانێ چی چاکترو شایستەترە ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ﴾ بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش ئەوێ کە پشت بە خوا بەستن، ئەو سیفەتەی کە خوا خۆشی بوێ و خاوەنەکانی خۆش بوێ، ئەبێ بڕواداران زۆر سووربن لەسەری، ئەبێ بیکەن بە نیشانەیەکی جیاکەرەوەیان.

﴿إِن يَنصُرْكُمُ ٱللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمْ ۖ وَإِن يَخْذُلْكُمْ فَمَن ذَا ٱلَّذِى يَنصُرُكُم مِّنۢ بَعْدِهِۦ ۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٦٠﴾﴾

ئینجا دەست نیشان ئەكات بۆ هۆی ئەو پشت بەستن بە خواو فەرمان پێدانیو پێویست كردنی، ئەفەرموویٚ: ﴿إِن يَنصُرْكُمُ ٱللَّهُ﴾ ئەگەر خوا بیەویٚ یارمەتیتان بداتو زاڵتان بكات، وەك لە ڕۆژی(بەدر)دا ویستی، چونكە لانەدرا لە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەگەر خوا ئەوەی بویٚ ﴿فَلَا غَالِبَ لَكُمْ﴾ هیچ كەسێكی زاڵ نیە بۆ ئێوە، واتە هیچ كەس زاڵ نابیٚ بەسەرتاندا ﴿وَإِن يَخْذُلْكُمْ﴾ ئەگەر واز بێنیٚ لە یارمەتیو كۆمەكیتانو نەیەویٚ زاڵتان بكات، وەك لە(احد) داوای كرد بەهۆی لادانو كردەوەی هێندیٚ لە موسڵمانەكانەوە، ئەگەر خوا بەو جۆرەتان لەگەڵ بكات ﴿فَمَن ذَا ٱلَّذِى يَنصُرُكُم مِّنۢ بَعْدِهِۦ﴾ ئایا كیٚیە ئەو كەسەی كە یارمەتی ئێوە بداتو زاڵتان لەپاش خواو وازهێنانی خوا لێتان؟ واتە هیچ كەس نیە.

لە ئایینی ئیسلام دا هەموو شت بەدەست خوایەو هەر خوا فەراهەم هێنەرو بەدی هێنەری هەموو شتێكە، باوی خوا لەم جیهانەدا وایە كە هەرشتیٚ هۆو سەبەبی خۆی هەیە، بەڵام ئەو هۆو سەبەبانە ئیش كەر نین، بەڵكو هەر خوا ئیش كەرە لە هەردوودا، بەندە لەسەریەتی هەوڵو تیٚكۆشانو شوێن كەوتنی بەرنامەی گوێڕایەڵی تەمیٚو فەرمانەكانی خوا خۆی، هەڵسانی بەهەرداواو ئەركیٚ كەخراوەتەسەرشانی، ئینجاپشت ببەستیٚ بەخوای خۆی وەكوئەفەرموویٚ: ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾بابڕواداران پشت هەربەخوا ببەستنو كاروباریان حەواڵەی خوا بكەن، هەركاتیٚ بەندە ئەم بۆچوونە ئیسلامیەی بۆ پەیدا بوو ئەو كاتە داوا هەر لە خوا ئەكات، دڵی هەر لە ڕێوە پێویست ئەبیٚ بەخواوەو هەموو شت هەر لەو ئەناسیٚو دڵئارام ئەبیٚ بە هەر شتیٚ كە خوا بڕیاری دابیٚ، بیٚگومان هێندیٚو لەو شتانەی كە پاڵی نا بەتیرەندازەكانەوە تا شوێنەكەی خۆیانیان بەجیٚهێشت، مەترسیان بوو لەوەی كەلە پاش دا پێغەمبەر(ﷺ) بەشیان بۆ دانەنیٚ لەدەست كەوتو غەنیمەت! وە هەروەها هێندیٚ لە ناپاكەكان باسی ئەوەیان كرد كە هێندیٚ لە غەنیمەتی(بەدر) لەساڵی پێشوودا شاردراوەو دەرنەخرا، وە شەرمیان نەئەكرد لەناو خۆیاندا بەچپەو لە ژێر لێوەوە پێغەمبەریان(ﷺ) ناو ئەبردو(تاوانبار) ئەكرد. جا بەو بۆنەیەوە ئەوا لێرەدا بە شێوەی گشتی هەموو پێغەمبەران دوور ئەخاتەوە لەوەی كە جێگەی ئەوەبنو گومانی وایان پیٚ ببریٚ، پاكیو دەست پاكیان ئاشكرا ئەكات،

ئەفەرمووێ: ﴿وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ﴾ نەبووەو ناگونجێ بۆ هیچ پێغەمبەرێك كە دزیو خیانەت بكات لە غەنیمەتو دەست كەوتی جەنگ، واتە سروشتی پاكو خاوێنی پێغەمبەر(ﷺ) بەهیچ ڕەنگ ناگونجێو دەست نادا بۆئەوەی دزیو دەست پیسی ڕووی تێبكات، هەر كەسێكی تر بەڕاست یا بە درۆ ئەگەر جێگەی ئەو گومانە بێت، بەهیچ كلۆجێك پێغەمبەر شایستەی ئەوە نیە، كەواتە مەبەست باسی حەرامیو حەلاڵی نیە، چونكە حەرامی ئەوە ئاشكرایە بۆ هەر كەس، ئیتر پێغەمبەر بێت یان نا؟ كەواتە كەس ڕێی ڕەخنەی نیە بەمەی بڵێ: ئەم ئایەتە وا ئەگەیەنێ كە غەیری پێغەمبەر بۆی هەیە ئەو دزیو خیانەتە بكات. بە شێوەیەكی گشتی هەڕەشەیەكی زۆر سەخت ئاڕاستەی ئەوانە ئەكات كە دزیو خیانەت لەماڵو سامانی گشتیان دەست كەوتو غەنیمەتەكانی جەنگ ئەكەن، ئەفەرمووێ: ﴿وَمَن يَغْلُلْ﴾ هەركەس دزیو خیانەت بكات لەماڵو سامانی گشتیان لە غەنیمەت ﴿يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾ ئەوەی كە دزیویەتیو دایشاردووە ئەیهێنێتەوە لە ڕۆژی دوایی دا،(ئیمامی ئەحمەد) حەدیسێ ئەهێنێ لە(ئەبو حمیدی ساعیدی)ەوە كە ئەفەرمووێ: پێغەمبەر(ﷺ) پیاوێكی ئەزدی بەئیشكەر بەسەر زەكاتو سەدەقەوە كە كۆی بكاتەوە، ئینجا كە هاتەوە ئەیوت: ئەمە هینی ئێوەیەو ئەمە بەدیاریی پێم دراوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) هەستا چووە سەر مینبەرو فەرمووی: ئەوە چیە كرێكار ئەنێرن بۆ سەر كارێك، لەپاشدا كە دێتەوە ئەڵێ: ئەمە هینی ئێوەیەو ئەمە بە دیاریی پێم دراوە، دەی با دانیشتایە لە ماڵی باوكو دایكی داو ستەمكار ەرنج بدا ئایا دیاریی بۆ ئەنێررێ یان نا؟ سوێند بە كەسێ كە گیانی محمدی بەدەستە، هەركام لە ئێوە شتێك لەوانە دابنێ بۆ خۆی لە ڕۆژی دوایی دا ئەیهێنێتەوەو ئەیگرێ بەسەر شانو ملیەوە، ئەگەر حوشتر بێبۆڕەی هەیە، ئەگەر ڕەشەوڵاخ بێت قوڕەی هەیە، ئەگەر بزنو مەڕ بێبارەی هەیە. ئینجا هەردوو دەستی بەرز كردەوە تا ڕەنگی هەردوو بن باخەڵمان بینی، ئەی خوایە ئەوا ڕام گەیاند.(ئیمامی بوخاریو موسلیم)یش ئەم حەدیسەیان هێناوە،(ئیمامی ئەحمەد) لە ڕیوایەتێكی تردا لە(ئەبو هورەیرە) ئەمە ئەهێنێ كە

پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژێك وەستا لەناومانداو باسی دزیو دەست پیسی کرد لە غەنیمەت، زۆر بە گەورە گرتیو بە گوناهێکی گەورە نیشانی دا، لەپاش فەرمووی: با هیچ کەس لە ئێوە نەبینم بەجۆرێ کەلە ڕۆژی دوایی دا بێتو حوشترێکی بەبۆڕە بۆڕ نابێ بەسەرشانیەوەو ئینجا هاواری لێ هەڵسێو بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا فریام کەوەو بێبە هاوارمەوە، ئینجا منیش ئەڵێم: هیچ شتێکم بەدەست نیە بۆت لەلایەن خواوە کاتی خۆی پێم ڕاگەیاندی، با هیچ کەس لە ئێوە نەبینم لە ڕۆژی دوایی دا بێتو ماین یا ئەسپێکی بەسەر شانەوە بێت بە حیلە حیلو هاوار بکات ئەی پێغەمبەری خوا بێ بەهاوارمەوەو منیش بڵێم: هیچ شتێکم پێ ناکرێ بۆت لای خوا کاتی خۆی پێم ڕاگەیاندی، با هیچ کەس لە ئێوە نەبینم لە ڕۆژی دوایی دا بێتو شتێکی بێ گیانی بەسەرشانەوە بێتو بڵێ: بێبە هاوارمەوەو منیش بڵێم هیچم پێ ناکرێ بۆت لای خواو لە پێشەوە پێم ڕاگەیاندی. ئەم ڕیوایەتە(ئیمامی بوخاریو موسلیم)یش ئەیهێنن لە حەدیسی(ئەبو حبان)ەوە.(ئیمامی ئەحمەد) حەدیسێ ئەهێنێ لە(عەدی کوڕی عومەیرەی کیندی)ەوە کە ئەفەرمووێ: پێغەمبەر(ﷺ) لەناوماندا هەستاو فەرمووی: ئەی خەڵکینە: هەرکەس لە ئێوە ئیشێکمان بۆبکات، ئینجا دەرزیەکمان لێ بشارێتەوە یا کەمتر یان زیاتر، ئەوە خیانەتو دزیە، لە ڕۆژی دوایی دا ئەیهێنێتەوە...هتد.

ئەم ئایەتو ئەم حەدیسانە خۆیان کاری خۆیان کرد لە پەروەردە کردنی کۆمەڵی موسڵماناندا، هەتا وایان لێ هات کارو کردەوەی زۆر نایابو سەرسوڕهێنەریان کرد، هەتا کۆمەڵێکی وای هێنا کە بوون بەنموونەو وێنەی پاکیو وەرعو خۆ پارێزەری، بەجۆرێ کە کرۆی ئادەمی شتی وای بەخۆیەوە هەرگیز نەدیوە، پیاوی وا بوو هەژارو بێ نەوا لە شوێنی چۆڵدا کە هیچ کەس پێی نەئەزانی، ڕێی ئەکەوت لەشتی زۆر بەنرخ لەماڵی غەنیمەت، کەچی بەڕێکی ئەیهێنا بۆ سەرۆکەکەی بەبێ ئەوەی بەدڵی دا بێت هیچ شتێکی لێ لابدا، چونکە ئەترسا لە هەڕەشەی ئەم ئایەتە، ئەترسا لەوەی کە پێغەمبەرەکەی لە ڕۆژی دوایی دا بیبینێ بەو شێوەی ڕیسواییو بێئابڕووییە کە لە حەدیسەکاندا باس کرا! ڕۆژی دواییو ئەو وێنەو شێوە بێئابڕووییە ئەهاتە بەرچاوی، وەك ئەمڕۆ ئەو کاتە بێت، لەبەرئەوە سامو بیم داگیری ئەکردو دائەچڵەکا، ڕۆژی دوایی بەبەڵێنێکی دوور دائەنا بەڵکو زۆر بەنزیك دای ئەناو لەبەرچاوی بوو،

ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦١﴾ أَفَمَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِ كَمَنۢ بَآءَ بِسَخَطٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٦٢﴾ هُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٣﴾

لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ

---

**بە بێگومان‌و دوو دڵی بڕوای بوو بەمەی کە ئەفەرمووێ: ﴿ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ﴾ ئینجا لەپاش دا هەموو نەفسێ هەرچی کردبێ لە جیهاندا پاداشتی ئەدرێتەوە، واتە هەموو کەسێکی داوا لێ کراو(مکلف) ئەجرو پاداشت‌و تۆڵەی پێئەدرێ ﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ ئەوانە ستەمیان لێ ناکرێ بە کەم کردنەوەی ئەجرو پاداشت یان بە زیاد کردنی سزاو تۆڵە، ئەوانە بڕوای ڕاست‌و دامەزراویان بەم فەرموودەیە بوو لەبەرئەوە کردەوەکانیان زۆر سەر سوڕهێنەربوو.**

**لەپاش جەنگی قادسیە غەنیمەتیان کۆکردەوەو هێنایان بۆ خزمەت خەلیفە(عمر) -خوای لێ ڕازی بێت- کە سەرنجی دا تاج‌و زێڕو زیوەرو جل‌و بەرگی کیسرای تیا بوو کە نرخ‌و قیمەتی نەئەزانرا لەبەر زۆریی، ئینجا خەلیفە زۆر بە شادومانیەوە فەرمووی: بەڕاستی ئەوانەی کە ئەمەیان هێناوە پاک‌و دەست پاکن.**

**ئا بەو جۆرە ئیسلام موسڵمانانی پەروەردەکردو فێری جۆرە کردەوەیەکی کردن، هەرکەس باسی بکات لەوانەیە بڕوای پێنەکرێ‌و بە ئەفسانەو دەلەسە دابنرێ، ئینجا بەبۆنەی باسی غەنیمەت‌و دزی‌و دەست پیسی تیای دا، دەست نیشان ئەکات بۆ شتێ کە هەر ئەوە بە نرخەو بەوەی کە دڵ خەریك بێ پێیەوە، ئەو یاسا گشتیەی کە ئایەتەکەی پێ دوایی هێنا بەدرێژتر ڕوون ئەکاتەوە، بەو بۆنەیەوە کە باس کرا بەبێزاریەوە ئەم پرسیارە ئاڕاستە ئەکات: ﴿أَفَمَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِ﴾ دەی ئایا هەرکەسێ کە شوێنی ڕەزامەندی‌و خۆش نوودی خوا بکەوێ‌و هەوڵ‌و تێکۆشان بکات بۆ پێك هێنانی، بە گوێڕایەڵی‌و پەیڕەوی فەرمانەکانی کە لێرەدا دوور کەوتنەوەو جڵەوگیریی لەدزی‌و شاردنەوەی غەنیمەت مەبەستێکی سەرەکیە، ئایا هەرکەسێك بەو جۆرە بێت لە جیهاندا دڵئارامەو لە ڕۆژی دوایش دا لە بەهەشتدایە ﴿كَمَنۢ بَآءَ بِسَخَطٍ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ وەك کەسێك وایە کە بگەڕێتەوە بە خەشمێکی گەورەی بەتین لەلایەن خواوە ﴿وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ﴾ چارەنووس‌و جێ‌و شوێنی ئەو**

دۆزەخ بێت ﴿وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ﴾ دۆزەخ چارەنووسێکی بەدو خراپە بۆ ئەو کەسە، بێگومان ئەم دوو کەسەو ئەم دوو چارەنووسە زۆر دوورو جیاوازن لە یەکتر، هەرکەس بێبەش نەبێ لەبیرو ژیریی خۆی ئەخاتە ڕیزی یەکەم‌و دوور ئەکەوێتەوەو پەنا ئەگرێ بە خوا کە وەك دووەمی بەسەربێت.

ئا بەو جۆرە قورئان دەستکاری دڵ‌و دەروون ئەکات، ئاسۆی تێگەیشتن‌و بۆچوونی بەرزو فراوان ئەکات، خەریك بوونی گرنگ‌و بەرێز ئەکات، ﴿هُمۡ﴾ ئەوانەی کە شوێن ڕەزامەندی خوا کەوتوون لە جیهاندا یان ئەوانەی کە ئەگەڕێنەوە بەخەشمی بەتینی خواوە، یان هەردوو تاقم، ئەوانە یەکسان نین، بەڵکو ﴿دَرَجَٰتٌ عِندَ ٱللَّهِۗ﴾ خاوەنی چەند پادەو پلەو شوێنێکی جیاوازن لەبەرزی‌و پەستی دا بەلای خواوە لەزانین‌و بڕیاری خۆی کە شایستەیە بۆی بەپێی کردەوەی خۆی ﴿وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ﴾ خوا بینایە بە هەر کردەوەیەك کە ئەوان ئەیکەن، کەواتە هەر خوا خۆی ئەزانێ کێ شایستەی چیە؟

لەپاش دەم کوت کردن‌و بەدرۆ خستنەوەی ئەوانەی کە گومانی ستەم‌و حەشاردانی غەنیمەتیان برد بە پێغەمبەر(ﷺ) لەپاش ئەوە ئینجا زیاتر دڵنیایی ئەکات لەسەر پاکی‌و ڕاستی‌و دووری ئەوا زاتە پاکە، هەر بەوەوە ناوەستێ کە پاك‌و بێ خیانەت بووە، بەڵکو بوون‌و ناردنی ئەو چاکەو بەهرەی گەورەو منەتی خوایە بەسەر بڕوادارانەوە، چەند سیفەتێکی گەورەی بۆ باس ئەکات کە مایەی بەختەوەری هەردوو جیهانیانە، ئەفەرمووێ:

﴿لَقَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ سوێند بە خوا، خوا منەتی نا بەسەر بڕواداراندا‌و چاکەو بەهرەی خۆی ڕشت بەسەریاندا ﴿إِذۡ بَعَثَ فِيهِمۡ﴾ کاتێ کە ڕەوانەی کرد لە ناویاندا ﴿رَسُولٗا مِّنۡ أَنفُسِهِمۡ﴾ فروستادەو نێرراوێك کە لە نەفسی خۆیانە، واتە لە تیرەی خۆیانە بەم ڕەنگە عەرەبە وەك ئەوان، یان ئادەمیەکە وەك ئەوان، کەواتە هۆگری یەکن، نەك لە فریشتە یان جنۆکە بێت کە ئەو کاتە سڵ ئەکرا لە یەکترو بە زەحمەت هۆگری یەك ئەبوون، بەڵێ بەڕاستی منەتەکە زۆر گەورەیە، هەر لە دەریای بێ پەیی بەخشایشی خوا دێت چاکەو بەهرەی ئاوا بڕێژێ بەسەر بەندەکانی دا بەبێ ئەوەی هیچ پێویستی یەك ببێ لەلایەن پەروەردگاری بەخشندەی میهرەبانە وە.

منەتەکە زۆر گەورەیە کە خوا فروستادەی بنێریَ بۆلای ئەم بەندەیانە، ئینجا ئەو فروستادەش لەنفسی خۆیان بێت کە ئەو تەعبیرە زۆر قووڵ و دڵگیرە، واتە ئەو فروستادە تەنها ئەوە نیە کە یەکێ بێ لەوان و بەس، بەڵکو بەهۆی بڕواکەیانەوە پەیوەستی و پەیوەندیەکەیان بەرز ئەبێتەوە بۆ ڕادەی گیانی بەگیانی. ئینجا ئەو بەهرەو منەتە ئاشکرا تر ئەکات بەم چەند ڕستەو وتەیە:

١- ﴿يَتْلُوا عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ﴾ کە ئەو فروستادەیە ئەخوێنێتەوە بەسەریان دا ئایەتەکانی خوا کە سەرنجیان ڕائەکێشێ بۆ ئایەتە بوونەوەرییەکان کە بێگومان هەرکەس چاوی بیری و ژیری کوێر نەبێ بەتەواوی، بەو ئایەت و نیشانە بوونەوەرییانە خوای خۆی ئەناسێ و ڕێگەی ڕاست ئەداتە بەر.

بەڕاستی هەرکەس بەڕێکی بیربکاتەوە لەم بەهرەو منەتە گەورەیە هەق وایە لە خۆشی دا هەموو گیان و لەشی بکەوێتە هەشکۆکەو لەرزە! بیربکاتەوە لەوەی کە خوای پەروەردگار بەبێ هیچ جۆرە پێویستیەك ڕێزو نرخ بدا بەبەندە لاوازەکانی، تا ئەو ڕادەیە ڕووی فەرموودەیان تێبکات قسەیان لەگەڵ بکات، بدوێ لە ژیان و کردەوەو نیازو خەتەرەی دڵیان، بدوێ لەگەڵیان و بانگیان بکات بۆشتێ کە زیندوویان ئەکاتەوەو بەبێ ئەوە مرۆڤایەتیان مردووە، بۆ شتێ کە چارەسەرە بۆ هەموو لاریی و نالەبارییان و دەرمانی هەموو زام و دەردێکیانەو تیمار هەموو نەخۆشیەکی دەروونی و کۆمەڵاتییانە، بانگیان بکات بۆ بەهەشتێك کە بێوێنەو نەبڕاوەیە! ئای هاوار بۆ ئەو منەتە! ئای هاوار بۆ ئەو میهرەبانی و بەخشایشە! ئای هاوار بۆ ئەو ڕێزو نرخ پێدانە کە بەهیچ دەم و پێنوسێك سوپاسی تەواو نابێ لە لایەن هەموو بەندەیانەوە!!

٢- ﴿وَيُزَكِّيهِمْ﴾ پاك و خاوێنیان ئەکاتەوە، دڵ و دەروون و بۆچوون و هەستیان لە چڵك و چەپەڵی بت پەرستی و نیازو مەبەستی بەدو هەموو بیروباوەڕو شتی پڕوپووچ و ئەفسانەوە ماڵ و خێزان و ناموس و پەیوەندی پەیوەستی و کاروباری ژیان و کۆمەڵایەتیان چاك و خاوێن ئەکاتەوە لە هەموو لەکەو پیسی و باوی ناشیرینی نەفامی و نەزانی و هەموو سەردەمە نەفامی و نەزانیەکان، بێگومان هەموو سەردەمە نەفامیەکانی جیهان چڵك و چەپەڵی و نالەباریی تایبەتی خۆی بووە، سەردەمی

عەرەبیش چەپەڵی و ناڵەباریی تایبەتی خۆی بووە، هێندێ لەو چەپەڵی و ناڵەباریی عەرەبە ئەوە بوو کە(جعفری کوڕی ئەبوتالیب) -خوای لێ ڕازی بێت- باسی کرد بۆ(نجاشی) حەبەشە، بە بەرچاوی دوو فروستادەکەی قوڕەیشەوە کە ناردنیان بۆلای(نجاشی) بەدیارییەکی زۆرەوە، بۆئەوەی(نجاشی)(جعفرو هاوەڵەکانی) بداتەوە بەقوڕەیش،(نجاشی)ش ئەو موسڵمانانەی بانگ کردو وتی: بۆچی لە ئایینی باوك و باپیرتان لاتان داوەو ئەم ئایینە تازە چییەکە کەوتوونەتەسەری؟(جعفر)یش -خوای لێ ڕازی بێت- فەرمووی: ئەی پادشا، ئێمە گەلێکی نەفام بووین، دارو بەردو بتمان ئەپەرست، گۆشتی مردارەوە بوومان ئەخوارد، کاری پیس و داوێن پیسیمان ئەکرد، بێ بەزەیی بووین و دەست دارمان بێدەستی ئەخواردین، تا خوا لە خۆمان پێغەمبەرێکی بۆ ناردین، خۆی و نەسەب و نەژادی ئەناسین، ئاگادارین بەسەر ڕاستی و پاك و خاوێنی و ڕەوشتی شیرینی دا، ئینجا ئەو فروستادەیە بانگمان ئەکات بۆ پەرستنی خوا بە تاك و تەنیا، واز هێنان لە پەرستنی هەموو دارو بەردو بتێك، فەرمانمان پێئەدات بە ڕاستگۆیی و سپاردە دانەوەو سیلەی ڕەحم، بە چاکەکردن لەگەڵ دراوسێدا، بە خۆگرتنەوە لە حەرام و خوێن ڕێژیی و جلەوگیرییمان ئەکات لە کاری پیس و داوێن پیسی، لەوتەی درۆ، لە خواردنی ماڵی هەتیو، لەبوهتان کردن بۆ ئافرەتە داوێن پاکەکان، فەرمانمان پێئەدا کە خوا بپەرستین بەبێ ئەوەی هیچ شتێك بکەین بە هاوبەشی، فەرمانمان پێئەدا بە نوێژو ڕۆژووو زەکات.

لەبارەی داوێن پیسیەوە بەو جۆرە بوون لە صەحیحی بوخاری دا ئەگێڕێتەوە لە دایکی ئیمانداران(عائیشە)وە -خوای لێ ڕازی بێت- کە ئەفەرمووێ: یەك کەوتنی پیاوو ئافرەت چوار شێوەی بووە: یەکێکیان ڕێك بووە، وەك ئێستا باوە، پیاو داوای ئافرەتی ئەکرد لەکەس و کاری، ئەویش پێی ئەدا، ئینجا مارەیی بۆ دائەناو مارەی ئەکرد، جۆری دووەم ئەمە بوو کە یەکێ ژنی خۆی ئەنارد بۆلای پیاوێکی تێرو تەواوی بۆ شناخ لەپاش پاك بوونەوەی لە حەیز، ئەینارد بۆ ئەمەی بچێتە لای و بەڵکو منداڵکی چاك بێنێ، ئینجا ئەو مێردە دوور ئەکەوتەوە لە ژنەکەی تا دەرئەکەوت گرتوویەتی و سکی بووە لەو پیاوەی ترا لەپاش دەرکەوتنی سکەکەی ئەچووە لای ئەگەر مەیلی ببوایە، جۆری سێیەم ئەمە بوو کە دەستەیەك لەپیاوان کەمتر لەدەکەس ئەچوونە لای ئافرەتێك یەك بە یەك، ئینجا کە سکی پڕ ببوایەو منداڵەکەی لێ ئەبوو ئەینارد بە شوێنی ئەو پیاوانەدا، هەموو ئەهاتن و نەیان

ئەتوانی سەرپێچی بکەن، ئینجا پێی ئەوتن ئێوە ئەزانن کە چیتان کردووە لەگەڵ من، من ئەم منداڵەم بووە، ئینجا هەر کامی پێ خۆش بوایە ئەیدا بەسەری داو ئەیوت: هینی تۆیەو ئەویش هیچ مل پێچی پێنەئەکراو مناڵەکە ئەدرا بە سەری دا، جۆری چوارەم ئەمەبوو کە هێندێ ئافرەتان خۆیان بەرەڵا ئەکرد بۆ هەرکەس ئارەزووی ئەکرد، ئاڵایەکیان بەرز ئەکردەوە بەسەر ماڵەکانیاندا تا بناسرێن و هەرکەس ئەڕوا بۆ لایان با بڕوا، ئینجا کاتێ کە منداڵیان ببوایە سەر ناس و شێوە ناسیان بۆ بانگ ئەکردن و ئەوانە ئەو منداڵەیان بدایە بە مل هەرکەس دا تازە بەمنداڵی ئەو ئەناسراو کابرایش سەرپێچی پێنەئەکرا! هەرکام لەم سێ جۆرو شێوە پیسە بەسە بۆ بەڵگەو نیشانە لەسەر ئەوپەڕی پەستی ئەو گەلە نەفامەو دوورکەوتنەوەیان لە مرۆڤایەتی و ئادەمێتی و چوونیان بۆ ڕیزی ئاژەڵ و چوارپێ.

بەڕاستی ئەوە قوڕێکی ڕەش و بۆگەن بوو کە ئەو گەلەی تێکەوتبوو نوقم بوو بوون تیای دا تا بناگوێیان، ئیسلام هات، دەری هێنان و پاک و خاوێنی کردن! ئەو قوڕە ڕەشەی کە تێی کەوتبوون لەم بارەوە، بەشێ بوو لەو تێڕوانین و بۆچوونەیان کەبوویان بەرامبەر ئافرەت، مامۆستای بەڕێز(شیخ ابو الحسن الندوی) لە کتێبی(ماذا خسر العالم)دا ئەفەرمووێ: ئافرەت لەسەردەمی نەفامی دا نیشانە بوو بۆ زیان و ستەم، مافەکانی ئەخورا، ماڵ و دارایی داگیر ئەکرا، لە میراتی و کەلە پوور بێبەش ئەکرا، لەپاش مردنی مێردی یا تەڵاق دانی بەرگری ئەکرا لەوەی کە بە ئارەزووو پێ خۆش بوونی خۆی شوو بکات، ئەکرا لە کەلەپوور وەك هەموو دارایی و سامانی تر.

ئەو گەلە نەفامە بێزار بوون لە ئافرەت تا ڕادەیەك کە زیندە بەچاڵیان ئەکردن،(مەیدانی) ئەگێڕێتەوە لە(هەیسەمی کوڕی عەدی) یەوە کە ئەو زیندە بەچاڵ کردنە لەناو هەموو تیرەکانی عەرەبدا بەکار ئەهێنرا، بەم جۆرە یەکێ ئەیکردو دەکەس نەیئەکرد تا ئیسلام هات و هەر لەسەرەتای هاتنیەوە دژی هەڵسا تا بە تەواوی نەیهێشت و قەدەغەی کرد، لەبەر چەند هۆیەك ئەو ستەمە گەورەیان ئەکرد، هینی وا بوو لەبەر زیادە غیرەت و ئەترسا لەوەی داوێن پیسی بکات و کەس و کاری بێئابڕوو بکات، هینی وا بوو ئەوەی ئەکرد لەبەر ئەوەی کچەکەی ڕەش و ناشیرین بوو یان چاو شین بوو یان بەڵەك یان شەل بوو، لای وابووە ئەوانە نیشانەی بەدبەختی و نەگبەتین، هینی وایش بوو ئەیکرد لەبەر ڕەزیلی و چاوچنۆکی و لەبێنەوایی ئەترسا، ئەو کردەوە پیسەشیان ئەکرد بە ئەوپەڕی ناشیرینی و دڵ ڕەقی، هەر خۆیان لەلایەن خۆیانەوە شتی وایان ئەگێڕایەوە کە بەڕاستی دڵتەزێنەو موچڕکە بەلەش دا

ئـەهێنێ، هێـنـدێکی تـر لـە پـیس و چـەپەڵی ئـەوان بـت پـەرستیەکەیان بـوو کەلـە ڕاسـتی دا بنەڕەت و سەرچاوەی هەموو چەپەڵی و پیسیەکانی تریان هەر ئەمە بوو، بت پەرستیەکەیان بەم شێوەبوو کە مامۆستا نەدەوی لە کتێبی ناوبراوی دا بە کورتی باسی فەرمووە.

(ئەو گەلە چوون بە قوتدا لە پەرستنی بتدا بە ناشیرین ترین جۆرو شێوە، بەم ڕەنگە بۆ هـەموو تیرەو بـەرەو شارو ناوچـەیەك بتێکـی تایبـەتی هـەبوو، بەڵکو بۆ هـەموو ماڵێك بتـی تایبەتی هەبوو،(کەلەبی) ئەفەرمووێ: هـەر خـاوەن ماڵێ لـە مەککـەدا بتێکـی تایبـەتی هـەبوو لەماڵەکـەی خۆیـدا ئەیپەرسـت، هـەرکام لـەوان کاتـێ دەرچـوایە لـە مـاڵ بـۆ سـەفەرێك، یـان بگەڕایەتەوە دەستی پیا ئەهێنا و ئەیسوی بەسەرو لەشی دا، گەلی عەرەب لەو سەردەمەدا ناوبـانگی دەرکـرد لـە پەرسـتنی بتـدا، بـەم ڕەنگـە هـیچ کـام بێ‌بـت نـەبوو، هینـی وابـوو خانوویـەکی تایبـەتی دروسـت ئـەکردو بـت پەرستی تیا ئـەکرد، هینـی وا بـوو هـەر بتەکـەی ڕائـەگرت، هینـی وابـوو بـێ دەسـەڵات بـوو بـەردێکی ڕووبـەڕووی حـەرەم یـان غـەیری حـەرەم دائەنا و بەدەوری دا ئەگەڕاو تەوافی ئەکرد وەك تەوافی بەبت، وە لە ناو ماڵی کەعبەدا ـــ ئەو ماڵەی کە بەفەرمانی خوا دروست کرا بۆ خوا پەرستی ـــو لەدەوری ئەو ماڵەدا(٣٦٠) بت ئەپەرستران، لە بت پەرستی دا زیادە ڕەوییان کرد تا ئەو ڕادەیە هەر بەردێکیان بەدڵ بوایە ئـەیان پـەرست، وەك(ئیمامی بوخـاری) ئەگێڕێتـەوە لـە(بورجـای عتـاردی)ەوە، کـە ئـەڵێ: ئێمـە بەردێکمان ئەپەرست، ئینجا بەردمان دەست کەوتایە چاکتر لەو ئەومان فڕێ ئەداو ئەمیترمان ئەپەرست، ئینجا ئەگەر بەردمان دەست نەکەوتایە کۆمەڵێ خۆڵمان ئەنا پێکەوە، ئینجا مـەڕ یــان بزنێکمــان ئەدۆشــی بەســەری داو ئینجــا تــەوافمان بــەدەوری دا ئــەکرد،(کەلــەبی) ئەفەرمووێ: هەرکەس بچوایە بۆ سەفەرێك و لە شوێنێکدا بیخستایە، چوار بەردی ئەهێنا و هەرکامی بەلاوە باش بوایە ئەیپەرست و ئەو سیانەکەی ئەکرد بە ئاگردان بۆ دیزەو مەنجەڵی چێشتی، وە کاتێ ئەو شوێنەی بەجێ ئەهێشت بتەکەی واز لێ ئەهێنا و بەجێی ئەهێشت لەو شوێنەدا.

(عـەرەب لـەو سـەردەمی نەفامیـەدا ـــ وەك هـەموو گەلـە بـت پەرستەکانی تـر لـە هـەموو چەرخ و وڵاتێکی تردا ـ چەند پەرستراوێکی تریشی هـەبوو لە فریشتە و جنۆکەو ئەستێرە، باوەڕیان وا بوو کە فریشتە کچی خوان بەهۆی ئەوەوە بە تکا کاریان دا ئەنان بۆلای خوا، ئەیان کردن بە واسیتەو وەسیلەی خۆیان، جنۆکەشیان دائەنا بەهاوبەشی خواو بڕوایان بوو بـە توانـاو دەسـەڵاتیان و ئـەیان پەرسـتن،(کەلـەبی) ئەفـەرمووێ: لـەناو خزاعـەدا(بـەنو ملـیح)

جنۆکەیان ئەپەرست، خاوەنی(طبقات الأمم) ئەڵێ:(حمیر) خۆپەرست بوون،(کنانة) مانگی پەرست، تەمیم دەبران، لخم و جذام مشتري، طی گەلاوێژ، قیس وشیعرەو ئەسەد عەتارد، وە لەبارەی جەنگ و خوێن ڕێژییەوە بە جۆرێ بوون، لەسەر شتی زۆر بێنرخ جەنگی دوورو درێژ بەرپا ئەبوو، جەنگێکی چل ساڵی بەرپا بوو لە بەینی(بکر)و(تغلب)دا لەسەر شەقازلەیە جەنگی بەناو بانگی(داحس)و(الغبرا) ڕوویدا.

بەکورتی بێجگە لەمانە کە باس کران ئەو گەلە لە هەموو بارو ڕوویەکی تری ژیانەوە دووچاری هەموو نەخۆشیەکی دەروونی و کۆمەڵایەتی و ڕەوشتی ئابووری بوو بوون و لە هەموو ناڕەواییەکدا تێرو تەواو بوون، هەرکەسێك چاوێ بگێڕێ بە مێژووی ژیانی ئەو سەردەمەیانداو سەرنجێکی چەرخی پاش ئیسلامیان بدا، ئەو کەسە تێئەگات لەو شۆڕشە گەورەو گرنگەی کە ئیسلام پێی هەڵسا لەناو ئەو گەلەدا، لە یەکەمجارەوەو ئینجا پەلی هاویشت بۆناو گەلانی تر، تێئەگات لەو وەرگێڕان و گواستنەوە زۆر گەورەی کە ئیسلام هێنای بەسەر ئەو گەلەدا، تێئەگات لەئەندازەی مەبەستی ئەو وتە پیرۆزە: ﴿وَيُزَكِّيهِمْ﴾ کە ئێستا لەگەڵی ئەژین و خەریکین بە تەفسیرەکەیەوە، بێگومان کاتی کە دڵی مەردومان چۆڵ و بۆش بوو لە عەقیدەو باوەڕێکی ئاسمانی کە بۆچوون و زانینیان بگرێتە ژێر دەست، بۆش و خاڵی بوو لە یاساو شەریعەتێك کەلەو عەقیدەو باوەڕە هەڵقوڵێ و کاروباری ژیانیان بگرێتە دەست، کاتێ کە ئەوانە نەبوون، بێگومان نەفامی و سەردەمی نەفامی دێتە پێشەوە لەوێنەو شێوەیەك لەوێنەو شێوە زۆرەکانی، ئەو جۆرو شێوە نەفامیەی کە ئەمڕۆ ئادەمی تێ چەقیوە لەگەڵی بارو ڕووەوە پیس ترو بۆگەن ترە لەو نەفامیانەی کە پێش ئیسلام عەرەب و گەلانی تری تیا چەقی بوون، ئیسلام هات ڕزگاری کردن و پاك و خاوێنی کردن لێی.

ئادەمی کاتێ کە عەقیدەو باوەڕی ئاسمانی پێنەبوو ئەترازێ لە سروشتە پاکەکەی، ئەو کاتە ئادەمێتی و مرۆڤایەتیەکەی نامێنێ و زۆر پەست ترو بێنرخ تر ئەبێت لەچوار پێ و گیان لەبەرەکانی تر، ئەوان لەسەر سروشتی خۆیان و ڕێی سروشتی خۆیانیان داوەتە بەر، وە ئەمان لایان داوە.

وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾ أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا

٣- ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ﴾ فێری قورئان‌و شەریعەتی خوایان ئەکات‌و هەرشتێ کە ڕاست‌و ڕێك‌و ڕەوا بێت لە هەموو بارو ڕوویەکەوە، لە ڕێگەی خواو ئایینی خواوە نەبێ وەرناگیرێن.

ئەو یەکەم گەلەی کە یەکەمجار ئەم قورئانەی چوو بە گوێچکەدا، گەلێکی نەزانی نەخوێندەوار بوون، نەزانی‌و نەخوێندەواریی نووسین، نەزانی‌و نەخوێندەواری ژیریی، هیچ جۆرە زانینێکیان نەبوو کەلە بازاری جیهاندا نرخ داربێت، هیچ زانیارییەکیان نەبوو کەلە جیهاندا برەوی ببێ با هەوڵی بۆ بدرێ‌و چاوەڕوانی بکرێ، ئینجا ئەم ئایین‌و پەیامە ئاسمانیە هات کردنی بە مامۆستاو فێرکەری جیهان، گێڕانی بە حەکیم‌و لێزان‌و کاردروست بۆ هەموو جیهانیان، کردنی بە خاوەن‌و سەرچاوەی بەرنامەیەکی عەقیدەیی‌و بیریی‌و ژیریی‌و کۆمەڵایەتی، کەلە جاری یەکەم دا بوو بەفریاد ڕەس‌و ڕزگار کەری ئادەمێتی‌و مرۆڤایەتی لەو چەرخ‌و سەردەمەدا، فریاد ڕەس‌و ڕزگار کەر لە نەفامی کۆن، چاوەڕوانی ئەکرێ لەم جاری دووەمیش دا بێتەوە بە هاورای ئادەمێتی‌و مرۆڤایەتیەوە ـ بە یارمەتی خوا ـ ڕزگاری بکات لە نەفامی تازە کە زۆر بە زیادە جێگرو جێنشینی نەفامی لەبارەی بیروباوەڕو بۆچوونی لارو کاروباری کۆمەڵایەتی بەدو ناڕەوا! هەرچەند لەبارەی زانیاری‌و پیشەسازی‌و ماددەوە زۆر بەرزو پێشکەوتووە.

خوای میهرەبان بەم نێرراوو ئایینە ئەو بڕوادارانەی پاك‌و خاوێن‌و زاناو لێزان کرد ﴿وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ﴾ لەکاتێکدا کە بێگومان ئەوانە لەپێش ئەم فروستادەو پەیامەدا لە گومڕاییەکی ڕوون‌و ئاشکرادا بوون، گومڕایی عەقیدەو بیروباوەڕ، گومڕایی لە مەبەست لە ژیان، گومڕایی لە نیازو ئامانجدا، گومڕایی لەباوو کردارو ڕەوشتدا، گومڕایی لە ڕژێم‌و یاساو کۆمەڵایەتی دا.

ئەو بڕوادارانە بەختەوەرانە زۆر جار بیریان ئەکردەوە لە ڕابردووی ژیان‌و هەموو بەسەر هات‌و کاروباریان، بەراوردیان ئەکردن لەگەڵ پاش موسڵمان بوونیان، بەهۆی ئەوە ئەوان

باشتر لە هەموو کەس نرخ و ڕێزی ئەو بەهرەو منەتە گەورەیان ئەزانی کە خوا ڕشتی بەسەریاندا بە ناردنی ئەو پێغەمبەرو پەیامە.

ئەو خوا پێداوانە ئەیانزانی کە هەر بەهۆی ئیسلامەوە پیرۆزو بەهرەمەند بوون، هەر بە هۆی ئیسلامەوە گەیشتن بە پۆپەو پلەی هەرە بەرزی ئادەمێتی و مرۆڤایەتی و هەر بەهۆی ئیسلامەوە بوون بە گەل و ئوممەت، جانە تەنها ئوممەت، بەڵکو گەل و ئوممەتێك کە ئەبێ ببن بەسەرکردە بۆ جیهان، نەخشەی هەموو کاروباریَ ئەبێ ئەمان بیکێشن، ئەمان بەرنامەی ژیان دابنێن، ئەمان ڕژێمی ژیان دیاری بکەن، بەجۆرو شێوە یەك کەلە هەموو مێژووی ئادەمیدا شتی وا نەزانراوو نەناسراوبوو!

ئەم بەهرەو منەتە گەورەیە لە یەکەمجارەوە خوا ڕشتی بەسەر گەلی عەرەبدا، ئەو یەکەم چینەش کە خوا ئەو میهرەبانیەی لەگەڵ کردن، بەڕاستی چاولەبەری خوا بوون و ڕێزونرخی ئەو منەتە گەورەیان زانی، بەم ڕەنگە چوونە ژێر سایە، لیَ بڕان بۆی و دەس بەرداری هەموو شتیَ تر بوون، تا ڕادەیەك بوون بەنوێنەرو ئاوێنەیەکی باڵانما بۆی، بە جۆریَ بە بینینی ئەوان مەردومی ناشارەزا تیَ ئەگەیشت لە ئیسلام، ئینجا ئەو بەهرەمەندانە چوون بەو وڵاتانەداو ئەو ئایینە پیرۆزە ئەو بەهرە گەورەیان کرد بەدیاری دەستیان بۆ گەلانی جیهان زۆر بەسۆزو پەرۆش و کەشخەو شانازیەوە لێیان وەرگرتن و ئەوانیش خۆیانیان پیَ بەهرەمەند کرد، بە ماوەیەکی زۆر کەم تیشك و ڕووناکی ئیسلام گەیشت بە زۆربەی ئاوەدانی ڕووی زەوی، لەسەرەنجامی ئەوەداهەمووگەلانی جیهانی عەرەبیان ناسی، ڕێزوخۆشەویستی عەرەب لە دڵیان دا جێگیربوو، تا ڕادەیەك بەچاوی مامۆستایی و برا گەورەیی سەرنجیان دان، ئێستا لە پاش تێپەڕ کردنی چواردە سەدە ئەو خۆش ویستن و ڕێزەی یەکەم چینە هەر وەك خۆی ماوەتەوەو لەدڵی موسڵمانانی جێگیرو دامەزراوە، تەنانەت لەپاش ئەو هەموو لادان و نالەباریەی کە ڕووی ئێستاش هەموو موسڵمانانی جیهان بە ئاواتە کە عەرەبی ئەمڕۆ بگەڕێتەوە بۆ ڕێگە ڕاستەکەی پێشووەکانیان و هەر مامۆستا و برا گەورەبن!!

بەڕاستی پێویستە لەسەر عەرەب کە بزانیَ و ئەوەی لە بیربیَ کە هەر ڕێزو نرخ و گەورەییە کەدەست کەوتی پێشووەکانیان بوو هەر بەهۆی ئیسلام و هەر لە ڕێی ئیسلامەوە بوو، وە بێجگە لە ئیسلام هیچ شتێکیان نەبووە ـ وەك لە ئێستا و داهاتوویشدا ـ کە بیدەن و مەردومی پیَ چاولەبەر بکەن، هیچ شتێکیان نەبووەو نیە بێجگە لە ئیسلام بێجگە لەم بەرنامە تاقانە، بێجگە لەم بەهرەو منەتە گەورەیە کە خوا لەیەکەمجارەوە خەڵاتی ئەوانی

کردو ڕێزداری کردن پێی، لەسەر دەستی ئەواندا گەلانی جیهانیشی ڕزگارو بەهرەمەند کرد، کەواتە ئەگەر عەرەب خۆی خۆش ئەوێ و نرخ و ڕێزی خۆی ئەوێ با واز لە هەموو شتێتر بێنێ و بگەڕێتەوە بۆ ئیسلام و پەیڕەوی کردنی یەکەم جێن.

ئەمەی کە وترا شتێکی ڕاستەو دەست نادا بۆ گومان و دوو دڵی و دەمەقاڵێ، کەواتە ئایا چۆن عەرەب بیر ناکەنەوە لەو شتە ڕاستەو چۆن بە دەربەستی خۆیانەوە نین؟ ئایا چ شەیتانێکی پیس لایان ئەدالەوڕێگەڕاستەو ئەو ڕێزو گەورەیی و بەرزی بەیان لە کیس ئەدا؟

زۆر بەداخەوە چ شەیتانێك ئەمەیان پێئەکات؟!! بێگومان شەیتان دوژمنەو داوامان لێ کراوە بە گوێی نەکەین و بیتارێنین، کەواتە با بە هەموومانەوە دەری کەین و بیتارێنین، ئینجا هێندێ تر ڕووداوو بەسەرهاتی جەنگەکە ئەخاتە بەرچاوو هەر بۆچوونێکی ناڕاستیان بووبێ لەو بارەیەوە ڕاستی ئەکاتەوە، ئەو موسڵمانانە سەرسام بوون و سەریان سووڕما لەو کوشتن و زامدار بوونەوەی کە بەسەریان هات، چونکە لایان وابوو ماتووڵ ئەمان موسڵمانن و لە ڕێی خوادا جەنگ ئەکەن، دوژمنەکانیان بت پەرست و بێبڕوان و جەنگ لەگەڵ خواو پێغەمبەردا ئەکەن، ماتووڵ کارەکە بەو جۆرەیە چۆن ئەبێ تێبشکێن و ئەوەیان بەسەر بێت؟! لەگەڵ ئەوەدا خوا بەڵێنی داوە بە یارمەتی دان و زاڵ کردنی دۆستەکانی.

ئەوانە ئەوکاتە نەیان ئەزانی کە بەڵێنی خوا بەستراوە بە چەند مەرجێکەوە ــ وەك لەمەوپێش ئاماژەمان بۆ کرد ــ هەرکات ئەو مەرجانەی بەدی هاتن بەپێی باوی خوا ئەو یارمەتی دان و زاڵکردنە بەدی دێت، بەڵام کاتێ کە بەندەکانی خوا هەڵنەسان بەو مەرجانە، ئەو کاتە سووچ و خەتا کەلە خۆیانەوەیەو ئەبێ سەرزەنشتی خۆیان بکەن و خۆیان چاك و ڕێك و پێك بکەنەوە، وەك بۆمان ڕوون ئەکاتەوە کە ئەفەرمووێ: ﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ﴾ ئایا کەی موسیبەت و بەسەرهاتێکی خراپ دووچارتان بوو، لەلایەن بێبڕواکانەوە، واتە ئەو کوشتن و زامدار کردنی ئەم جەنگە ﴿قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا﴾ کە ئێوە دوو قاتی ئەوەتان دووچاری ئەوان کرد، بەم ڕەنگە ئێوە حەفتا کەستان لێ کوژرا لەم جەنگەدا، لە ساڵی پێشوو لە(بەدر)دا ئێوە حەفتا کەستان لەوان کوشت و حەفتا کەسیشتان لێ بەدیل گرتن کە ئەوەش وەك کوشتن وایە، یان ئەوان یەك جار ئێوەیان شکاند، بەڵام ئێوە دووجار ئەوانتان شکاند، یەکەم لە ساڵی(بەدر)داو دووەم لە یەکەمجاری ئەم جەنگەدا، یان لەم کاتەدا کە کارەکە بەو جۆرە بوو،

﴿قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٦٥﴾ وَمَآ أَصَٰبَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَلِيَعۡلَمَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٦٦﴾ وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُواْۚ وَقِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ قَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدۡفَعُواْۖ قَالُواْ لَوۡ نَعۡلَمُ قِتَالٗا لَّٱتَّبَعۡنَٰكُمۡۗ

**﴿قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ﴾ وتتان: ئەمەی کە بینیمانو بەسەرمان هات لە کوێرە هاتو دووچارمان بوو، شتی وا جێی سەر سووڕمانەو نە ئەبوایە ببوایە؟! واتە ماتووڵ دووچاربوونی دوژمنان دوو قاتە نە ئەبوو دڵگران بوونایەو قسەی واتان بکردایە، بەڵکو ئەبوایە دڵخۆش و شادمان بوونایە، ئەو دوو یارمەتیو زاڵکردنەتان لەبیربووایە، یان مەبەست ئەوەیە: نەئەبوو سەرسام بوونایە لەم بەسەر هاتانەدا، چونکە کردەوەی خۆتان هۆی ئەم بەسەر هاتە بوو، لەسەر هەربار ئەوا فەرمان ئەدا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە هۆی بەسەرهاتەکەیان بۆ ڕوون بکاتەوە تا ئەو سەر سووڕمانەیان نەمێنێ، ئەفەرمووێ: ﴿قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ﴾ بڵێ: ئەوەی کە دووچارتان بوو لەلایەن خۆتانەوە پەیدا بوو، خۆتان هۆی ئەوە بوون، خۆتان کە هەر لە یەکەمجارەوە هەڵە بوون کە لە مەدینە دەرچوونو بە گوێی پێغەمبەرتان نەکرد کە ئەو مانەوەی لە مەدینەدا هەڵبژارد، خۆتان کە دووبەرەکی بوونو ئاژاوەتان کرد تا سەرنگەرەکەتان چۆڵکرد کەمێکتان نەبێ، ئەو سەنگەر چۆڵ کردنەش بوو بەهۆی ئەو تێك شکانە سەختە، خۆتان کەبە پێچەوانەی پێغەمبەر(ﷺ) جووڵانەوە لەبەر غەنیمەتو دەست کەوتێکی کەمی ئەم جیهانە، کەواتە هەر ئەبێ بەخەتای خۆتانی بگرنو نابێ سەرتان سووڕبمێنێ لەو ڕووداوە سەرختەو بڵێن کە ئەمە لە کوێوە هاتو پەیدابوو؟! ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ بەڕاستی خوا توانایە بەسەر هەموو شتێکدا، هێندێ لەو شتانە ئەوەیە کە زاڵکردو تێك شکان بەدی ئەهێنێ بە پێی باوی خۆی لە جیهاندا، هەموو کاروباریێ بە پێی لێزانیو کاردروستیو مەیلی خۆی بەجێ ئەهێنێ.**

**بەم فەرموودەیە خۆیانی خەتابار کردو کردنی بەهۆی ئەو ڕووداوە، بەڵام لەبەرئەوەی هەموو شتێ ئەگەڕێتەوە بۆلای دەسەڵاتو مەیلو خواهیشی خوا، بەندە هەر چەند دەسەڵات**

دار بێ سەر بەخۆ نیەو لە ڕاستی دا کارو کردەوەکانی خوا ئەیانکات، لەبەر گەیاندن‌و نیشاندانی ئەو بۆچوونە ڕاستەکە لە زۆر شوێن دا ئامارژەی بۆ ئەکات، ئەوا لێرەیشدا ئەفەرمووێ: ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ﴾ ئوەی کە دووچارتان بوو لەو ڕۆژەدا کە هەر دوو کۆمەڵ گەیشتن بەیەك‌و تێك ڕژان لەم جەنگەدا ﴿فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾ ئەوە بەئیزن‌و مەیلی خوا دووچارتان بوو، بەبڕیارو قەزاو قەدەری ئەوبوو، بەکردەوەو فەراهەم هێنانی ئەو بوو، بە ڕێکەوت نەبوو، لەبەر بێ دەسەلاتی نەبوو، لە خۆڕاییش نەبوو، بەڵکو لەبەر بەرژەوەندی‌و حیکمەتێك بوو کە ئامارژەی بۆ ئەکات بەمەی کە ئەفەرمووێ: ﴿وَلِيَعۡلَمَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ واتە دووچار بوونتان لەبەر ئیزن‌و مەیلی خوا بوو، مەیل‌و ئیزنەکەی خوایش لەبەرئەوە بوو کە بڕواداران دەرخات بۆ خەڵکی‌و بڕواکەیان ڕوون بکاتەوە ﴿وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُواْ﴾ لەبەرئەوە بوو کە ئاشکرا بکات ئەوانەی کە ناپاك بوون‌و بەدەم لافی بڕوایان لێ ئەداو لە دڵەوە بڕوایان نەهێنابوو.

لەسەرەتاوە باسمان کرد کە ئەو ناپاکانە بەسەرۆکایەتی(عبداللە ی کوڕی ئوبەی) لە ڕێگەدا گەڕانەوە بۆئەوەی ورەی موسڵمانەکان ببەن‌و دووبەرەکی بخەنە ناویان، ئینجا هێندێ لە موسڵمانان چوون بە دوایانداو بانگیان کردن کە بگەڕێنەوە لەبەر خوایان لەبەر دونیا، ئەوانیش نەگەڕانەوە، جالێرەدا بێجگە لەوەی کە بەناپاك ناویان ئەبات، ئەو هەڵوێستە پیسەیشیان ئەخاتەوە بەرچاو بۆ زیادە تەشەردان لێیان، ئەفەرمووێ: ﴿وَقِيلَ لَهُمۡ﴾ ئەوانەی کە وترا پێیان: ﴿تَعَالَوۡاْ قَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ وەرن با جەنگ بکەین لەڕێی خوادا ﴿أَوِ ٱدۡفَعُواْۖ﴾ یا بەرگریمان لێ بکەن بەوەی کۆمەڵمان زۆر بکەن، ئەگەر جەنگ ناکەن، یان مەبەست ئەوەیە ئەگەر لەڕێی خوادا جەنگ ناکەن بەرگری لە خۆتان‌و وڵات‌و ماڵ‌و نیشتمانتان بکەن، ئەوانیش نەگەڕانەوەو بەدرۆو دەلەسە خۆیان قوتار کرد بەم ڕەنگە ﴿قَالُواْ﴾وتیان: ﴿لَوۡ نَعۡلَمُ قِتَالٗا لَّٱتَّبَعۡنَٰكُمۡۗ﴾ ئەگەر بمانزانییایە جەنگ بەرپا ئەبێ ئەگەڕاینەوەو شوێنتان ئەکەوتین، واتە ئەزانین هیچ ڕوو نادا لەبەرئەوە ناگەڕێینەوەو دواتان ناکەوین.

هُمۡ لِلۡكُفۡرِ يَوۡمَئِذٍ أَقۡرَبُ مِنۡهُمۡ لِلۡإِيمَٰنِۚ يَقُولُونَ بِأَفۡوَٰهِهِم مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يَكۡتُمُونَ ﴿١٦٧﴾ ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ وَقَعَدُواْ لَوۡ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْۗ قُلۡ فَٱدۡرَءُواْ عَنۡ أَنفُسِكُمُ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٦٨﴾ وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢاۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ

---

ئەوان ویستیان بەو درۆو دەلەسەیە ناپاکیەکەیان بشارنەوە، نەیانزانی خوا ئابڕوویان ئەبات و ڕاستیان لێ ئەڵێ. نەیانزانی کە خوا دەربارەیان ئەفەرمووێ: ﴿هُمۡ لِلۡكُفۡرِ يَوۡمَئِذٍ أَقۡرَبُ مِنۡهُمۡ لِلۡإِيمَٰنِۚ﴾ ئەوانە لەو ڕۆژەدا کە ئەوەیان ئەوت، لە بێبڕواییەوە نزیك تر بوون تا بڕوا هێنان، واتە لەوەو بەر بەلاڤی خۆیان و بە ڕواڵەت لە بڕواوە نزیك تر بوون، چونکە بەڵگەیەکی ئاشکرا نەبوو لەسەر بێبڕواییان وە نەیانزانی کە بەتەواوی ناپاکیەکەیان ئاشکرا ئەکەن و دەربارەیان ئەفەرمووێ: ﴿يَقُولُونَ بِأَفۡوَٰهِهِم مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡۚ﴾ ئەوانە بە دەمیان شتێ ئەڵێن کەلە دڵیاندا نیە، واتە دڵیان بە پێچەوانەی دەمیانەو ئەوەی کەلە دڵیاندایە بەزمان دەری نابڕن ﴿وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يَكۡتُمُونَ﴾ خوا لە هەموو کەس زانا ترە بەوەی کە ئەوانە ئەیشارنەوەو دەری نابڕن، بەو جۆرە خوا ڕاستی لێ وتن و بێ ئابرووی کردن، ئینجا لەسەریان ئەڕواو هەڵوێستی نارەوای تریان دەرئەخات لەبارەی هەوڵدانیان بۆتێك دانی ڕیزی موسڵمانان و تێك دانی دەروونیان، ئەفەرمووێ: ﴿ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ﴾ ئەوانە کەسانێکن کەوتیان بەبرادەرو کەس وکاریان کەلەو جەنگەدا شەهیدکران ﴿وَقَعَدُواْ﴾ لەکاتێکدا کە خۆیان دانیشتن و دەرنەچوون لەگەڵ موسڵمانەکان بۆ جەنگ، ئەوانە دەربارەی ئەو شەهید کراوانە ئەیان ووت: ﴿لَوۡ أَطَاعُونَا﴾ ئەگەر ئەوانە بە گوێڕایەڵی ئێمە بوونایە لە جەنگ نەکردندا ﴿مَا قُتِلُواْۗ﴾ نەئەکوژران، وەك ئێمە ئەوە تا جەنگمان نەکردو نەکوژراین.

ئەو ناپاکانە هەر بەوە وازیان نەهێنا کە جەنگیان نەکردو لەو کاتە ناسکەدا گەڕانەوە، کە ئەو گەڕانەوەش بێ ئارامی خستە دەروونی موسڵمانەکانەوەو ورەی زۆریانی برد، تەنها

بەوە وازیان نەهێنا، بەڵکو لەدوای ئەو جەنگ و تێك شکانە بێ ئارامی و داخی سەختیان ئەبردە دەلی کەس و کاری شەهید کراوەکان، بەو وتە ناڕاست و ناڕەوایە، وە جەنگ نەکردنەکەی خۆیان دائەنا بە شتێکی ڕاست و ڕەواو پڕ لە بەرژەوەندی، جەنگ کردن و گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەریان(ﷺ) نیشان ئەدا بە کارێك ناڕەواو مایەی زیانباریی، لە هەموو شت خراپتر ئەوە بوو کە بۆچوونێکی ناڕاست و ناڕەوایان نیشان ئەدا لەبارەی قەزاو قەدەری خواو مردن و ژیان و پەیوەستیان تەنها بەو قەزاو قەدەرەو دەست نەدانی ئەجەل بۆ گۆڕان و زیادو کەم، جالەبەرئەوە کوتی کردن و بەرپەرچێکی تێرو تەواوی دانەوە، کەلە بارێکەوە پیلانەکەیانی پووچ و بێنرخ کرد، لەبارێکی ترەوە ئەو بۆچوونە ناڕاستەی ڕاست کردەوە، بەم جۆرە فەرمووی بە پێغەمبەر(ﷺ) ﴿قُلْ﴾ بڵێ پێیان: ﴿فَادْرَءُوا عَنْ أَنفُسِكُمُ الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ کەواتە بەرگری مردن لە خۆتان بکەن ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن لەوەدا کەوتتان، واتە لە قسەکەتانەوە دەرئەکەوێ کە ئەتوانن بەگری کوشتن بکەن لەو کەسەی کە کوژرانی لەسەر نووسراوە، دەی کەواتە بەرگری مردن بکەن لە خۆتان کەلە هەموو کەس خۆشەویست ترە بە لاتانەوە، مردنیش وەك کوژرانی ئەوانە هەر نووسراوە لەلایەن خواوە، دەی ئەگەر بتوانرێ بەرگری ئەو نووسراوە بکرێ ئەبێ بتوانرێ بەرگری ئەم نووسراوەش بکرێ، کەواتە نەکوژرانی ئێوە لەبەرئەوەیە کە لەلایەن خواوە بڕیار نەدراوەو نەنووسراوە، ئەگەر بڕیار بدرایەو بنووسرایە بەرگریتان پێ نەئەکرا، وەك بەدرێژ تر ڕوون کرایەوە لە ئایەتەکانی(١٥٤-١٥٦) لەم سورەتەدا.

بەو جۆرە دەم کوتی ئەو ناپاکانەی کردو پیلانەکەی بەهیچ دەرکردن، وە ئارامی دابە دڵ و دەروونی ئەو موسڵمانانە، ئینجا لەپاش ئەوە شتێکی زۆر گرنگ کەبەدڵی هیچ کەس دا نەهاتبوو دەری ئەخات، کە بریتیە لە زیندوویی ئەوانەی کە شەهیدن و لەڕێی خوادا کوژراون، کەواتە ئەو کوژراوانەی کە ئەوان ئەیانەوێ خۆیانی لێ بپارێزن بەهرەو دەست کەوتێکی گەورەیەو هەق وایە بەربەرەکانێی بۆ بکرێ، ئەفەرمووێ: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا﴾ ئەوانەی کە کوژراون لەڕێی خوادا گومان نەبەبت کە مردوون و بە مردوویان دانەنێیت ﴿بَلْ أَحْيَاءٌ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ بەڵکو ئەوانە زیندوون لای پەروەردگاریان، یان مەبەست

ئەوەیە: ئەوانە زیندوون، ئەوانە لای پەروەردگاریانن، بەم ڕەنگە نزیکن لێیەوە بە نزیکی ڕێزو شەرەف، وە خاوەنی پادەو پلەی بەرزن لای خوا.

ئایەتی(١٥٤) لە سورەتی ﴿البقرة﴾ قەدەغەی کردناوبردنی شەهیدان بەمردوو، ئەم ئایەتی ئێرەیش قەدەغەی کرد کە بە مردوو دابنرێن، کەواتە هیچ بڕوادارێك نابێ بەمردوو ناویان ببات و بەمردوویان دابنێ، ئینجا چەند ڕایەك هەیە لەبارەی مەبەست بەم زیندوویییە، بەم جۆرەی کە دێت: (موعتەزیلە) ئەڵێن: مەبەست ئەوەیە لە ڕۆژی دوایی دا زیندوو ئەبن، بەڵام ڕووکەش و ڕووالەتی ئایەتەکان وا ئەگەیەنن کەلە کاتی کوژرانەکەیانەوە زیندوون، بێجگە لەوەش ئەم زیندوویییە زیادە بەهرەیەکە خوا ئەیدا بەوانەی کە گیانی خۆیان بەخت ئەکەن لە ڕێی خواداو دەست هەڵئەگرن لە هەموو شتێ لە پێناوی ڕەزامەندی خوادا، ئەو زیندوو بوونەوەی کە(موعتەزیلە) ئەیڵێن گشتییە بۆ هەمووان، کەواتە قسەو ڕاکەیان پووچە، هێندێ تر ئەڵێن:مەبەست ناوو باسی باشە کەلەپاش مردنیان ئەمێنێتەوە، بەڵام ئەمەش هەر تایبەتی نیەو ڕێکیش ناکەوێ لەگەڵ ڕووالەتی دوایی ئایەتەکەو دوو ئایەتەکەی پاش ئەم ئایەتە: ﴿يُرْزَقُونَ، فَرِحِينَ ﴾... هتد، هێندێ تر ئەڵێن: ئەوانە پاش کوژرانیان لە گۆڕەکانیاندا زیندوو ئەکرێنەوە وەك زیندووی ئەم جیهانە ئەخۆن و ئەخۆنەوەو کاری ژن و مێردیش ئەکەن، بەڕاستی ئەم ڕایە ئەوەندە دەلەسەو ئەفسانەیە مەدروم بە گێڕانەوەشی تەریق ئەبێتەوە، هێندێ تر ئەڵێن: لە پاش مردنیان لاشەکانیان بەرز ئەکرێنەوە بۆ ئاسمانەکان و بۆلای چەند چرایەك لە ژێر عەرشدان، ئەمەش دووبارە زۆر جیاوازی نیە لە ڕای پێشوو، چونکە بەئاشکرا بینراوە لەشی زۆر لە شەهیدان لە جیگای شەید بوونیاندا کەس پێی نەزانیون تا کرم و شت خواردوونی، یا بەو جۆرە لە گۆڕەکانیاندا بینراون، هێندێ تر ئەڵێن: ئەوانە لەپاش مردنیان دێنەوە ئەم جیهانەو وەك ئێمە زیندوون و ڕائەبوێرن، بەڵام ئێمە نایان بینین، ئەم ڕایەش هیچ ڕابەرو بەڵگەیەکی لەسەر نیەو قسەی پووچی بێنرخە، هێندێ تر ئەڵێن: مەبەست ئەمەیە کە لەشیان هەر ئەمێنێتەوەو ناڕزێ، ئەمەش هەر ناڕێکە، چونکە لەشی تەنیا و بێگیان بەزیندوو دانانرێ و مردوو هەر بریتیە لە لەشێکی بێگیان، بێجگە

لەوەش هیچ بەڵگەو ڕابەرێکی شەرعی نیە لە سەر نەرزانی لەشی هیچ کەس بێجگە لە پێغەمبەران -سەلامی خوایان لێبێ- کەلەصەحیحی بوخاری دا ئەفەرمووێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(إن الله حرم على الأرض أن تأكل أجساد الأنبياء) بێگومان خوا قەدەغەی کردووە لەسەر زەوی کەلەش‌و جەستەی پێغەمبەران بخوات، کەواتە ئەم ڕایەش بەهیچ دەرنەچێ، هێندێ تر ئەفەرموون: مەبەست ئەوەیە کە گیانەکانیان ئەکرێن بەبەری چەند پەلەورێکی سەوزدا، یان ئەبرێنە شێوەی ئەو پەلەورانەو بە بەهەشتدا ئەسوڕێنەوەو ڕائەبوێرن تا ڕۆژی دوایی، بەڵگەو ڕابەریان لەسەر ئەم ڕایە حەدیسێکە کە هاتووە بە چەند ڕیوایەتێك، یەکێ لەوانە ئەوەیە کە(ئیمامی ئەحمەد)و کۆمەڵێك ئەیهێنن لە(ئیبن‌و عەباس)ەوە -خوای لێڕازی بێت- کە ئەفەرمووێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کاتێ کە براکانتان شەهید کران لە(أحد)دا خوا گیانەکانی خستنەوە ناو سکی چەند پەلەورێکی سەوز لە ڕووبارەکانی بەهەشت ئەخۆنەوەو لە میوەکانی ئەخۆن‌و ئەگەڕێنەوە بۆلای چەند چرایەکی گرنگ لە ئاڵتوون کە هەڵواسراون لە ژێر سێبەری عەرشدا، ئینجا کاتێ کە ئەو خۆشی‌و ڕابواردنە ئەبینن ئەڵێن: کاشکێ براکانمان بیانزانیایە بەمەی کە خوا لەگەڵی کردین، ئەم ڕیوایەتەو ڕیوایەتەکانی وێنەی هەرچەند بەهێزبن هەر ئەوە ئەگەیەنن کە خوا ئەو ڕێزو بەهرەیە ئەبەخشێ بە شەهید، بەڕێکی ئەوە ناگەیەنێ کە مەبەست بەزیندوویەکەیان ئەوەیە، کەواتە هەر ئەوە چاکە کە زۆر لەزانایان ئەفەرموون: ئەمە شتێکی غەیبی‌و نادیارییەو ئێمە بارە ڕاستەقینەکەی نازانین‌و بەڵام بڕوای تێرو تەواومان هەیە پێی بەو جۆرەی کە خوا فەرموویەتی‌و بارو چۆنێتیەکەی حەواڵەی خوا ئەکەین، وەك ئەو هەموو شتە نادیاری‌و غەیبیانەی تر، بەبێ زیادو کەم لە سنووری دەقەکەدا ئەوەستین، ئەم ئایەتە تێمان ئەگەیەنێ کە زیندوویی هەر ئەم جۆرە نیە کە ئێمە ئەیزانین، وە ئەزانین ئەو شەهیدانە ئەم ژیانی ئێمەیان نەماو ئەو مردنەی کە ئێمە ئەیزانین بەسەریان هاتووە،

يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا۟ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٧٠﴾ ۞ يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٧١﴾ ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلْقَرْحُ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ مِنْهُمْ وَٱتَّقَوْا۟ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾

---

بەڵام لەبەرئەوەی ئەوان دەست بەرداری هەموو شتێك بوون لە ڕێی خواداو گیانی خۆیان بەخت كرد لە ڕێی خواداو گیانی خۆیان بەخت كرد لە ڕێی ڕەزامەندی خوادا، لەبەرئەوە ڕێزی گرتن بەم چەند شتەی كە تایبەتین بە زیندووانەوە:

١- ﴿يُرْزَقُونَ﴾ ڕۆزیی و خۆراك ئەدرێن.

٢- ﴿فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ﴾ لەكاتێكدا شادمان و دڵخۆشن بەوەی كە خوا پێی بەخشیون بە لوتف و فەزڵی خۆی، یا پێی بەخشیون بەهرەو چاكەی خۆی، ئیتر ئەوە بریتی بێت لەو ڕۆزیی و خۆراكە، یان بێجگە لەوە ئەو هەموو بەهرەو چاكەی تر كە خوا ئەیدابەشەهیدان، یان دڵشادن بەوشەهیدییەی كەخواپێی دان وبەوەبەهرەمەندی كردن.

٣- ﴿وَيَسْتَبْشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا۟ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ﴾ زۆر دڵخـۆش و مـوژدە بەخـشن بـە بـرا تێكۆشەرەكانیان كە هێشتا نەگەیشتوون بەوان و نەهاتوونەتە ڕیزیان و بەجێ ماون لە پاشیان و هێشتا شەهید نەكراون و لەسەر ڕێبازی ئەمانن، دڵخۆشن و موژدە بەخشن ﴿أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ بەمـەی هـیچ مەترسـیەكیان لەسـەر نیـە، ئەوانـە غەمبارنین، مەترسی و غەمبارییان بۆئەوەی كەبە جێی ئەهێڵن لە ئەولادو لەماڵ، یان هیچ مەترسیەكیان لەسەر نیە بۆ داهاتوویان و ئەوەی بۆی ئەڕۆن، چونكە بە شەهید بوونەكەیان خوا لە هەموو گوناهیان بووردووە، غەمباریش نین بۆ ئەو جیهانەی كە بەجێیان هێشتووە لەبەر خۆشی ئەو جیهانیان، یان مەترسییان نیە بۆ داهاتوو لە دووچار بوونی هیچ ناخۆشیەك، وە غەمی لەدەست چوونی هیچ خۆشیەكیان نیە، واتە ئەو شەهیدانە پەیوەندیان ناپچڕێ بەو برا زیندووانەی ئەم جیهانیان و دڵیان خەریكە

پێیانەوە، لەبەرئەوەی ئەزانن کە ئەوانیش دوای شەهید بوونیان ئەگەن بەم نازو ڕێزەی کە خۆیان پێی گەیشتوون، لەبەرئەوە زۆر دڵخۆش و مژدە بەخشن پێیان،(قەتادەو ئیبن و جورەیج) بەم جۆرە ئەم ئایەتەیان تەفسیر کردووە، بە دوو جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام بەڕاستی لەبەرئەوەی ڕاکەی ئەمان بەبێ قۆرت و گرێ ئەچێتە دڵەوە لەگەڵ ڕواڵەتی ئایەتەکەدا بەڕێك تری ئەزانم، لەبەرئەوە هیچ کام لەو دوو ڕاکەی ترم باس نەکرد. ﴿يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ﴾ زۆر دڵخۆش و مژدە بەخشن بەپاداشتی گەورە لەلایەن خواوە، وە بە زیاد لەپاداشت کە خوا میهرەبانی خۆی ئەیدا پێیان، ﴿وَأَنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ بەمەی کە خوا ئەجرو پاداشتی بڕواداران زایە ناکات و بە تەواوی پێیان ئەبەخشێ، بڕواداران بە شێوەی گشتی کە لێرەدا شەهیدان یەکەم و سەر دەستەن، ئینجا ئایا ئیتر چی ماوەتەوە لە سیفەت و نیشانەی زیندووان کە نەدرابێ بە شەهیدان؟ بەچی جوێ بکرێنەوە لەزیندووانی تر، بێجگە لەوەی کەلە پێش چاوی زیندووانی ئەم جیهانە ون بوون و دیار نین؟ ئایا مردن و دیار نەبوونی ئاوا، کەی جێگەی داخ و غەم و پەژارەیە بۆ ئەوانەی کە بەجێ ماون لەپاش ئەوان؟ بەڕاستی ئەبێ جێگەی خۆشی و دڵشادی بێت، مایەی فەخرو شانازی بێت، ئەبێ بەربەرەکانێ بکرێ بۆ شەهیدبوون. هەر بەپێی ئەم بۆچوون و تێگەیشتنە بوو، ئەو چەند نموونەیە کە لەسەرەتای باسی ئەم جەنگەوە هێنامان -خوای لێیان ڕازی بێت- ئینجا باسی ئەوانە ئەکات کەلەو جەنگەدا شەهید نەکران و بەڵام لەسەر ڕێبازی شەهیدەکان بوون و ئەوان زۆر دڵخۆش و مژدە بەخش بوون بەو ئەجرو پاداشت و پلە بەرزەی کە خوا بۆی ئامادە کردبوون، ئەفەرمووێ: ﴿الَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِلَّهِ وَالرَّسُولِ﴾ ئەوانەی کە گوێڕایەڵ بوون بۆ خواو پێغەمبەر ﴿مِن بَعْدِ مَا أَصَابَهُمُ الْقَرْحُ﴾ لەپاش ئەوەی زامدار بوون و زامیان لێ کەوت لەو جەنگەدا ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا مِنْهُمْ وَاتَّقَوْا أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ بۆ ئەوانە هەیە کە کردەوەی چاکیان کرد زۆر بە ڕێکی، خۆیان پاراست و مەترسییان ئەکرد ناتەواوی و کەم و کوڕی کردەوەیان، بۆ ئەوانە هەیە ئەجرو پاداشتێکی گەورە، واتە ئەوانەی کە گوێڕایەڵ بوون هەموو بەو جۆرە کردەوە چاك و

خۆپارێزەر بوون، یان مەبەست ئەوەیە کە هەموو بەو جۆرە نەبوون، ئەو بەڵێنە هەر بۆ ئەوانەیان کە بەو جۆرە بوون، بە هەردوو بار هەر باشەو ئەگونجێ.

ئەو بەڵێن پێدراوانە ئەوانە بوون ـ وەك لەسەرەتاوە بە درێژیی باس کران ـ کەزامی زۆریان لێ کەوت لەو جەنگەدا، زۆر بەزەحمەت ڕزگاربوون لە کوژران و مردن لە ڕۆژی پێشوودا، دووچاری ئەو تێك شکانە دڵ تەزێنە بوون، کەس و کارو خۆشەویستیان کوژران و لە دەست دەرچوون و بە کەساسی و دڵ ڕەنجەیی گەڕانەوە بۆ مەدینە، لە ڕۆژی دووەم دا پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کردنەوەو فەرمانی دا بە دەرچوون و بەپیرەوە چوونی لەشکرەکەی(ئەبو سوفیان) و تێ جەنگین لەگەڵیان دووبارە، ئیزنی نەدا کە کەسی تر بەشداریان بکات، ئەوانیش خوا لێیان ڕازی بێت گوێڕایەڵیان کرد بۆ ئەو بانگ کردن و فەرمانەکە بانگ کردن و فەرمانی خوایش بوو، ئەو بانگ و فەرمانە چەند شتی گەورەو گرنگی لێ وەرئەگیرێ:

١- دوور خستنەوەو لەبیربردنەوەی هەستی تێك شکان و دڵڕەنجەییەکەیان، بەم ڕەنگە هانی دان بۆ پەلامار دان و بە شوێندا گەڕانی قوڕەیش: تا دڵنیا ببن بەوەی کە ئەوەی بەسەریان هات تاقی کردنەوەیەك بوو، ئەو ڕووداو بەسەرهاتە شتێکی کاتیەو ئەوان لە پاشدا بەهێزو سەرکەوتوو ئەبن، دوژمنەکەیان بێ نرخ و لاوازە.

٢- با قوڕەیش بە کەشخەو با فیشەوە نەگەڕێنەوەو لای وابێ کە هیچی نەهێشتووەتەوەو موسڵمانەکانی پەك خستووە، ئەوەتاهەرئەوانەئەواپەلامار ئەدەن و بەدوایاندا ئەگەڕێن.

٣- با موسڵمانەکان و هەموو کەس بەردەوریاندا بزانن کە ئایین و عەقیدەیەکی تازە هاتووتە جیهان کە هەر ئەو شتەو بەنرخە لەدڵی خاوەن و هەڵگرەکانی دا، هیچ مەبەست و ئاوات و ئامانجێکی تریان نیە بێجگە لەو ئایین و عەقیدەیە، ژیان و جیهانیان هەر لەبەرئەوە ئەوێ، بەبێ ئەوە نەژیان و نەگیان و نە جیهانیان ناوێ، هیچ بەڵگەو نیشانەیەك لەو کاتەدا لەوە بەهێزتر نەبوو لەو گوێڕایەڵی و ڕاپەڕین و دەرچوونی ئەو کۆمەڵە لەو کاتە تەنگ و سەختەدا، بەبێ سەر لێ کردنەوەو گوێ دان بە هیچ شتێك و بە هیچ کاڵەو کیفە پڕو چاگەندەیەك کە نێرراوو فروستادەی(ئەبو سوفیان) هەڵسا پێی، بەڵکو پشتیان تەنیا بە خوا بەست.

ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدۡ جَمَعُواْ لَكُمۡ فَٱخۡشَوۡهُمۡ فَزَادَهُمۡ إِيمَٰنٗا وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ فَٱنقَلَبُواْ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ لَّمۡ يَمۡسَسۡهُمۡ سُوٓءٞ وَٱتَّبَعُواْ رِضۡوَٰنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَظِيمٍ ﴿١٧٤﴾

وەكو ئەفەرمووێ: ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ﴾ ئەوانەی گوێڕایەڵیان کرد کە کەسانێ بوون کە مەردوم پێی ووتن، واتە(نعیمی کوڕی مسعودی ئەشجەعی)و چەند کەسانێ تر کە(ئەبو سوفیان) بە کرێی گرتن‌و داوای لێ کردن بچنە مەدینەو پێغەمبەرو موسڵمانەکان پەشیمان بکەنەوە لەنیازی جەنگ کردن، چاوو ڕاویان لێ بکەن‌و بیانترسێنن ــ وەك لە سەرەتاوە باسمان کرد ــ ئەوانیش هاتن‌و وتیان پێیان: ﴿إِنَّ ٱلنَّاسَ﴾ بەڕاستی مەردمان ــ واتە ئەبو سوفیان‌و هاوەڵەکانی ــ ﴿قَدۡ جَمَعُواْ لَكُمۡ﴾ لەشکرو کۆمەڵی زۆریان کۆکردووەتەوە بۆتان بۆئەوەی لەناوتان بەرن‌و لە ڕیشەتان بێنن ﴿فَٱخۡشَوۡهُمۡ﴾ کەواتە بترسن لێیان‌و مەچن بۆ جەنگ لەگەڵیان ﴿فَزَادَهُمۡ إِيمَٰنٗا﴾ کەچی ئەو وتەو قسە کە پێیان وترا زیاتری کردن لە بارەی بڕواوە، واتە هیچ گوێیان نەدا بەو چاوو ڕاوو ترساندنە، بەڵکو بەوە بڕوایان بەهێزتر بوو، غیرەتیان باشتر هاتە جۆش بۆ ئیسلام، پشت بەستنیان بە خوا قایم تر بوو ﴿وَقَالُواْ﴾ وتیان: ﴿حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ﴾ هەر خوامان بەسەو خوا پشت پێبەستراوو وەکیلێکی چاکە بۆمان کەکارو باری خۆمان حەواڵە بکەین بۆلای‌و بیدەینە دەستی.

ئەوان بەو جۆرە لێ بڕان بۆ خوا بەم ڕەنگە بەبێ ترس‌و سەر لێ کردنەوە، بەو هەموو زام‌و ئێش‌و ئازارەوە دەرچوون لە مەدینە بەرەو ئەو لەشکرە زۆرە، خوایش چارەسەری ئەمانی کرد بەم ڕەنگە ترسی خستە دڵی(ئەبو سوفیان)و لەشکرە زۆرەکەی‌و گەڕانەوە بۆ مەککە ﴿فَٱنقَلَبُواْ بِنِعۡمَةٖ﴾ ئەمانیش گەڕانەوە بۆ مەدینە بەچاکەی گەورە ﴿مِّنَ ٱللَّهِ﴾ لەلایەن خواوە، بەسەلامەتی‌و دامەزراوی لەسەر بڕواو گوێڕایەڵی‌و سەر شۆڕ کردنی دوژمن هەر لە دوریشەوە ﴿وَفَضۡلٖ﴾ گەڕانەوە بە زیادە بەهرەی گەورەوە کە بریتیە لە پاداشت‌و ئەجری ڕۆژی دوایی کە بۆیان نووسرا، یان بریتیە لە قازانج‌و دەست کەوتی بازرگانیە کەلە ڕێی

گەڕانەوەدا دەست کەوتیان بوو، وەك(بەیهەقی) ئەگێڕێتەوە لە(ئیبن و عەباس)ەوە -خوای لێ ڕازی بێت- کە ئەفەرمووێ: لەو سەرەوە کاروانێك تێپەڕ ئەکات و پێغەمبەر(ﷺ) ئەیکڕێ و قازانج ئەکات و ئەویش دابەشی ئەکات بەسەر هاوەڵەکانی دا، گەڕانەوە بەو جۆرەو ﴿لَّمۡ يَمۡسَسۡهُمۡ سُوٓءٞ﴾ لەکاتێکدا کە هیچ کوژران و زانداری و ئازارو سزایەك دووچاریان نەبوو ﴿وَٱتَّبَعُواْ رِضۡوَٰنَ ٱللَّهِۗ﴾ ئەوانە شوێنی ڕەزامەندی خوا کەوتن کە سەرچاوەو کانگای هەموو فەڕو خێرکە ﴿وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَظِيمٍ﴾ خوا خاوەنی بەهرەو چاکەی گەورەیە، ئەوەتا ئەو هەموو چاکەو بەهرەی ڕشت بەسەر ئەو خوا پێداوانەدا، ئەم فەرموودەیە پلارێکی سەختی تیایە دەربارەی ئەوانەی کە دواکەوتن و سستیان کرد لە گوێڕایەڵیدا، بەوەی کە خۆیان زیانبار کردو خۆیان بێبەش کرد لەو هەموو بەهرەو چاکەی خوا، خۆیان بێبەش کرد لەو هەموو ڕێزو وەسف و سەناشیرینەی کە ئەم قورئانە هێنای و دانی بەگوێچکەی مەردومانداو دەنگ ئەدەنەوە لەناو ئەم بوونەوەرە گەورەدا! بەڕاستی زۆر سەرسوڕ ئەمێنێ لەو گۆڕان و وەرگەڕانە گەورەو گرنگەی کە هات بەسەر ئەو کۆمەڵەدا لەماوەی شەوو ڕۆژێکدا، ڕۆژی پێشوو ئەو هەڵوێست و بێئارامی و سەرگەردانی بۆچوونە ناڕەوایەیان بوو کەلە ئایەتەکانی ڕابردوودا دەست نیشانیان بۆ کراو لە تەفسیرەکانیاندا ڕوون کرایەوە، وە لە ڕۆژی دووەمدا گۆڕان و وەرگەڕان بەم بارە ڕێك و ڕاست و ڕەوادا کە ئەم ئایەتانەی دواییە ئاماژەی بۆ کردن، بەڕاستی بەهرەو چاکەی خوا بەسەریانەوە ئێجگار گەورەو گرنگ بوو کە ڕشتی بەسەریاندا بە هۆی ئەو ڕووداوە سەختەو ئەو تاقی کردنەوە تاڵەی کە هێنای بەسەریاندا، کەواتە با بڕواداران باشتر دڵنیا بن لەکاردروستی خوا، با بەم هەست و بۆچوونەوە بچن بەپیری هەرچی کە خوا ئەیکات و ئەیهێنێ بەسەر بەندەکانی دا، ئینجا ئاماژە ئەکات بۆ هۆی ترس و بێئارامی و داچڵەکانی بڕوادارەکان لە دوژمنە بێبڕواکان، ئاگاداریان ئەکات کە هۆی ئەوە هەر سەیتانەو ئەیەوێ دۆستەکانی خۆی سامناك بکات و بەخاوەنی هێزو دەسەڵات نیشانیان بدات، کەواتە با بڕوادارەکان تێبگەن و وریا بن لە فڕو فێڵی شەیتان، هەوڵ و تێکۆشانەکەی بەبێ هودە دەرکەن، بەم ڕەنگە ترسیان نەبێ لە دۆستانی شەیتان، بەڵکو هەر لە خواترسن،

فەرمووی بە بڕوادارەکان: ﴿إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ﴾ ئەوەی کە دڵتان سست ئەکات‌و خاوی ئەکاتەوە لە تێکۆشان لە ڕێی خواداو گوێڕایەڵی پێغەمبەر، ئەو کەسە هەر شەیتانە، کە خەتەرەو خەیاڵی ناڕەواو ترس ئەخاتە دڵیان، ئەگەر مەبەست بەم شەیتانە شەیتانی ڕاستەقینە بێت کە شەیتانی جنۆکەیە ـ وەك زۆر لە زانایان ئەفەرموون ـ، ڕوواڵەت‌و ڕووکەشەکەیش هەروا نیشان ئەدات، بەدرۆ و فاك‌و فیك‌و چاوو ڕاو لێ کردن، ئەگەر مەبەست شەیتانی ئادەمی بێت ـ وەك کۆمەڵێ لەزانایان ئەفەرمووون ـ: مەبەست ئەوانەیە کە(ئەبو سوفیان) ناردنی بۆ ئەو مەبەست بۆگەنە، لەبەر هەر بارو مەبەست‌و ئامانجی ئەو شەیتانە ئەمەیە: ﴿يُخَوِّفُ أَوْلِيَآءَهُۥ﴾ ئەتان ترسێنێ لە دۆست‌و یارمەتی دەرەکانی، ئەیەوێ بە خاوەنی هێزو دەسەڵات نیشانیان بدات، تا کەس نەتوانێ بە دژیان هەڵسێ‌و بە پێچەوانەیان ڕەفتار بکات، بێگومان هەموو شەیتانێ ـ بە تایبەت شەینانی ڕاستەقینە ـ گرنگترین ئامانج‌و گەورەترین ئاواتی ئەوەیە کە دۆست‌و لەشکرو یارمەتی دەرانی تەقێ لێ کراوو سامناك بن، کەس نەتوانێ بەرهەڵستیان بکات‌و بوەستێ، تا بەهۆی ئەوەوە هەموو خراپەیەك بڵاوببێتەوەو تۆوی چاکە ئەمێنێ لە جیهاندا، کەواتە با بڕواداران هەمیشە خەریك بن‌و هەوڵ بدەن بۆ تێك دانی پیلانەکانی شەیتان، هیچ باکیان نەبێ لەهیچ کەس‌و بەڕاستی فەرمانبەرو گوێڕایەڵ بن بۆ ئەمەی کە خوا کردی بە چارەسەری تەواو بۆیان‌و فەرمووی پێیان: ﴿فَلَا تَخَافُوهُمْ﴾ ئینجا ئێوەش نەترسن لەو دۆست‌و یارمەتی دەرانی شەیتانە، چونکە لەڕاستی دا هیچیان بە دەست نیە ﴿وَخَافُونِ﴾ لە من بترسن، چونکە هەموو شت هەر بەدەست منە ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە بڕوادارن ئەبێ بەو جۆرە بن، بەڵێ بەڕاستی بڕوادار ئەبێ هەر بەو جۆرە بێت ئەگەر بەڕاستی بڕوادارە، چونکە هەموو بڕوادارێ ئەبێ بزانێ‌و دڵنیا بێت کە تاقانە هێزو دەسەڵاتی کە شایستەی تەقێ لێ کردن‌و لێ ترسان بێت، هەر هێزو

دەسەڵاتی خوایە، لەڕاستی دا هیچ جۆرە هێزو دەسەڵاتێك نیە، نەبۆ شەیتانو نەبۆ دۆستو لەشكرو یارمەتی دەرانی، كەواتە بۆ ئەبێ هەر لە خوا نەترسێو بێباك نەبێ لە غەیری خوا؟ ئەم ئایەتە بەجۆرێ تریش تەفسیر كراوەتەوە، بەڵام بەبیركردنەوەو شی كردنەوە دەرئەكەوێ كە تەفسیرێكی لاوازە، لەبەرئەوە باسم نەكرد، ئەم ئایەتە چەند شتێك نیشان ئەدات:

١- بڕواداری ڕاستەقینە نابێ ترسنۆك بێ، بەڵكو ئەبێ چالاكو ئازابێت، هەموو جیهان ئەزانن كەلەشكری موسڵمانان لە هەموو چەرخێكدا هەر ئازاو چالاك بووە لەگەڵ ئەوەیشدا زۆرتر بڕوا لاوازو نەزانو بێئاگا بووبن لەئایینەكەیاندا.

٢- مەردوم ئەتوانێ بەرگری هۆی ترس بكاتو دایڕنێ لە خۆیو خۆی چالاك بكات.

٣- هەركات بیمو ترس ڕووی كردە هەر كەس پێویستە لەسەری خۆی نەدا بە دەمیەوە، تا جێگیر نەبێ لە دەروونیداو بەهێز نەبێ، بەڵكو پێویستە لەسەری بكەوێتە بەربەرەكانیو زۆرانبازی لەگەڵ ئەو شتانەی كە هۆی ترسەكەیەتی، یەكەمو سەردەستە بە یادی خواو بیركردنەوە لە قەزاو قەدەری خواو نەگۆڕانی، دووەم خەیاڵ نەداتە ئەو شتانە، بەڵكو دڵو دەروونی خۆی بكات بە دژو پێچەوانەی ئەو هۆیانەوە، ئەمانەش شتێكن ئەگونجێ بۆ مەردوم بە ئاسانی، لەبەر ئەوە خوا فەرمانی پێداو داوای كرد لە بەندەكانی، ئینجا لە دوا دوایی باسەكەدا ڕووی فەرموودە ئەكاتە پێغەمبەر(ﷺ) لە دڵخۆشی دانەوەو دڵنەوایی كردنی لەسەر ئەو داخو دووەی كە ڕووی ئەكردە دڵی بەفەڕی، بەو ڕووداوە سەختەی جەنگی(احد)ەوە هەموو هەوڵو تەقەلای كە ئەیدا لەگەڵ ئەو بێبڕوایانە، لەگەڵ ئەوەدا ئەوانە سوورتر ئەبوونو بە چەسپانی بەرەو بێبڕوایی ئەچوون، لەگەڵ ئەوەیشدا خوا مۆڵەتی ئەدان، لەم چەند ئایەتەی داهاتوودا، دڵنەوایی ئەكاتو هۆی ئەو مۆڵەت دانەی تێئەگەیەنێ، لێ زانیو كاردروستی خۆی دەرئەخات بۆی لەو تاقی كردنەوە سەختەی كە دووچاری بڕوادارانی كرد، لەو مۆڵەت دانەی كە بەكاری هێنا لەگەڵ ئەو بێبڕوا دوژمنانەدا،

ئەفـەرمووێ: ﴿وَلَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلْكُفْرِۚ﴾ بـا دڵ غـەمگینت نەکـەن ئەوانـەی کـە چەسپانی ئەکەن لە بێبڕواییدا، بە چەسپانی خۆیانی تێئەخەن بە کەشخەو خۆشیەوە وەك پێش بڕکێ بکەن بۆ لای مەبەستو ئامانجێکی گرنگ یان چەسپانی ئەکەن لە ڕێی یارمەتی دانی بێبڕوایی و بە گرنگ گرتنی و بەرگری کردنی بڕواو بڕواداران دا، مەبەست بەوانە ناپاکەکانە کە بەجێمانو پشتی موسڵمانەکانیان چۆڵکرد، وەك(مجاهدو ئیبن و ئیسحاق) ئەفەرموون، یان مەبەست دەستەو تاقمێکە لە عەرەب کە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام لەپاش تێك شکانی جەنگی(احد) وەك(ئەبو عەلی) ئەڵێ: یان مەبەست هەموو بێبڕوایانە وەك(حەسەن) ئەفـەرمووێ، یـان مەبەسـت ناپاکەکانـە لەگـەڵ دەسـتەیەك لـە جوولەکـە وەك هێنـدێ تـر ئەفەرموون، هـەرکام مەبەسـت بێتو لەسـەر هـەر بار، واتـە گوێ مـەدە بەوانـەو غـەمبار مەبە بەوەی مەترسی بکەیت لەوەی ئەوانە بتوانن زیان بگەیەنن بە تۆو بە ئایینەکەت، چونکە: ﴿إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔاۗ﴾ بێگومان ئەوانە هەرگیز هیچ زیانێك ناگەیەنن بە خوا، واتە بە تۆو بە بڕواداران، بەڵام بەو جۆرەی فەرموو لەبەر زیادە ڕێزو نرخ دان بەو دۆستو بڕوادارانە بەوەی خوا زیانی ئەوانی بەزیانی خۆی نیشان داوە، بێگومان لەوەیش دا ئەوپەڕی دڵخۆش کـردنو دڵنـەوایی هەیـە. بـەڵێ بەڕاسـتی هـۆی غـەمباری زۆرو بـەهێزبوو، ئـەو تێـك شـکانە دڵتەزێنە کە بوو بەمایەی فاكو فیكو لاقرتی کردنو تەشەر دانی جوولەکەو ناپاکەکانو بوو بـەهۆی کەشـخەو شـانازی(ئـەبو سـوفیان)و هاوەڵـەکانی لەگـەڵ ورەبـردنو چاوشـکاندنی عەرەبەکانی تر کە نەوێرن موسڵمان بن، بەڵێ بەڕاستی زاڵبوونی بێبڕوایـانو سـەرکەوتنیان بـە هـەموو کەشـخەو فیزێکـەوە، وە تێـك شـکانی بـڕواداران و گەڕانـەوەیان بـە کەساسـی و دڵزامداریـەوە زۆر زۆر سـەختو سـامناکە لـە دڵو دەروونـی بڕوادارانـدا، پیـاوی پیاوانـەی ئەوێ کەبتوانێ خۆی بگرێ لەژێر ئەوبارە گرانەدا خەتەرەو خەیاڵی ناڕەوا ڕوو نەکاتـە دڵـی، پیاوی بەهێزو دامەزراوی ئەوێ کە دڵبەستێ بە قەزاو قەدەری خواوەو سەرگەردان نـەبێو بەسـەر سامیەوە نـەڵێ، ئەگـەر ئێمـە هیچمان بە دەست بوایە بوایە وامان بەسـەر نەئـەهات؟ پیاوی بەهێزو دامەزراوی ئەوێ کە دڵی لەخشەنەکاتو دڵئارام بێبە هەموو کارەکانی خواو بەکاردروستی خوا لە هەموو کارو کردەوەیەکی دا، جالەبـەر سـەختی وسـامناکی ڕووداوەکە خوای میهرەبان بەو هـەموو جۆرەو لە هـەموو ڕووەوە تیمـارو دەست کاری دڵـی بڕوادارانـی کردو داخ و دووەکەی سارێژ کردن،

يُرِيدُ ٱللَّهُ أَلَّا يَجۡعَلَ لَهُمۡ حَظّٗا فِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلۡكُفۡرَ بِٱلۡإِيمَٰنِ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗا وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٧٧﴾ وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ خَيۡرٞ لِّأَنفُسِهِمۡۚ إِنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ لِيَزۡدَادُوٓاْ إِثۡمٗاۚ

وە ئاگاداری کردن بە کاردروستی و لێزانی خۆی لەمەدا کەلەو دوژمنانە گەڕا تا بەو جۆرە سەربکەنە بێبڕوایی و چەسپانی بکەن تیای دا ئەفەرمووێ: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ أَلَّا يَجۡعَلَ لَهُمۡ حَظّٗا فِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ﴾ خوا ئەیەوێ کە هیچ بەشێکیان بۆ بڕیار نەدا لە ڕۆژی دوایی داو بەش بڕاویان بکات لە بەهەشت ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ لەگەڵ ئەو بەش بڕاوییەدا بۆیان هەیە سزایەکی گەورە کە ڕادەو ئەندازەکەی دیاریی ناکرێ و مەگەر بۆ خوا. ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆئەوەی کە بۆچی خوا ئەوەی ئەوێ بۆ ئەوانە. ئەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلۡكُفۡرَ بِٱلۡإِيمَٰنِ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە بێبڕواییان کڕی لەم جیهانەدا بەبڕوا، واتە بەخواهیش و خۆشی خۆیان بێبڕواییان هەڵبژارد بۆ خۆیان لەباتی بڕوا هێناندا، ئیتر مەبەست بەمانە هەر تاقمی پێشوو بێت یان بە شێوە گشتیە و بەڵام ئەوان لێرەدا یەکەم و سەردەستەن، ئەوانە ﴿لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗا﴾ هەرگیز هیچ جۆرە زیانێك ناگەیەنن بە خوا ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ بۆیان هەیە سزایەکی ئێش و ئازار دەر. ئەوانە ئەیانتوانی بڕوا بهێنن، بەڵگەو نیشانە ڕوونەکانی بڕوا بە زۆری و بەڵشاوو پرژو بڵاوبوونەتەوە لەلاپەڕەکانی ئەم بوونەرە پان و فراوانەدا کە هەمیشە وان بەبەرچاوەوە، هەروەها هەستیان پێ ئەکرد لە قوڵایی سروشتدا، ئینجا لەپاش ئەوە بانگ کردن بۆ بڕوا لە لایەن پێغەمبەرانەوە دەستی پێ کردووە کە هاتوون بە بەڵگەو موعجیزەی ڕوون و مەردوم ناچارکەرەوە، ئەو بڕوایەش ڕێك و پێکە لەگەڵ ژیریی و سروشتدا، شیاو ترو شایستە ترە لە هەموو شتێ لەگەڵ ئادەمی و ژیاندا. بەڵێ بڕواهێنان بەو جۆرو شێوەیە ڕێك و گونجاوو لە ژێر دەسەڵات و تواناادا بوو، کەچی ئەوانە بە خواهیشی خۆیان وازیان لێ هێنا و بێبڕواییان بۆخۆیان هەڵبژارد، لەبەرئەوە خوایش لێیان گەڕاو یارمەتی نەدان و نەیخستنە سەر ڕێگەی بڕوا تاخۆیان بەش بڕاوودووچاری سزای سەختی ڕۆژی دوایی کرد.

لەئایەتی پێشوودا باسی تاوانی زۆر گەورەی ئەوانەی کرد، کەواتە ناوبردنی سزاکەیان بە زۆر گەورە ڕێك و پێکە، لەم ئایەتی ترەدا باسی کڕین و فرۆشتنێکیان بۆ ئەکات کە زیانبار

بوون تیای دا، لە زیانباریی وایشەوە ئێش و ئازار ئەگات بە دڵ، کەواتە لێرەدا ناوبردنی سزاکەیان بە سزایەکی ئێش و ئازاردەر ڕێك و بەجێیە، بێجگە لەوەیش ئەوانە ئێش و ئازار دەر بوون بە بڕواداران، کەواتە با سزاکەیان بەو جۆرە بێت، ئەم قورئانە بەو جۆرەیە، هیچ وتەو وشەیەکی دەست نادات بۆ گۆڕان و گۆڕینەوە!! بێگومان زۆر جار دوژمنی ئایینی خوا ئەبینرێ، بە هەموو فیزو کەشخەیەکەوە ڕائەبوێرێ، ماوەیەکی دوورو درێژئەژی بە هەموو هێزو دەسەڵاتێکەوە بەرامبەر بڕواداران، بەبێ ئەوەی درکێ بێتە ڕێگەی! بێگومان ئەوەش گرێیەکی سەختەو مایەی چەند خەتەرەو خەیاڵی ناڕەوایە لەدڵی زۆر کەسدا، هۆی بەد گومانی و دوودڵیە بۆ هێندێ کە بڕوایان لاوازەو بۆچوونی ئیسلامیان ناتەواوە، بەڵکو سەر لە هێندێ بڕوادارانیش تێك ئەدات و لە دڵەوە ئەکەونە گلەیی لە خوا کە چۆن نایەتە جواب لە سەر ئەو هەموو ستەم و تاوان و ناهەقیە؟! چۆن خوا جڵەو شل ئەکات بۆ ئەو دوژمنە ستەمکارانەو ماوەیان ئەدا؟! یەکێ لەو ڕووداوانە کە بوو بە مایەی ئەو جۆرە خەتەرەو قسەو باسانە ڕووداوی ئەم جەنگی(احد)ەبوو، جا بەو بۆنەیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە بۆ کردنەوەی ئەو گرێیەو بەرگری ئەو گومان و خەتەرە ناڕاستانە، فەرمووی: ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ خَيْرٌ لِّأَنفُسِهِمْ ۚ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوەو لەزانینی خوادا تێپەڕی کردووە کە بڕوا ناهێنن، ئەوانە باوا نەزانن و گومان نەبەن کە مۆڵەت دانی ئێمەو لێ گەڕان و جڵەو شل کردنمان بۆیان چاکە بۆیان و بەرژەوەندی ئەوانی تیایە، نەخێر چاك نیە بۆیان، بەڵکو شەڕو خراپەی ڕووتە بۆیان وەکو ئەفەرمووێ: ﴿إِنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِثْمًا ۚ﴾ مۆڵەت دان و جڵەو شل کردنمان بۆیان هەر لەبەرئەوەیە گوناه زیاد بکەن، واتە ئەوانە بە خواهیش و ویست و ئارەزووی خۆیان بێبڕواییان هەڵبژارد بۆ خۆیان، وە بەچەسپانی سەریان کردە بێبڕوایی و تێکۆشانیان تیادا کرد! کەواتە شایستەی ئەوە نەبوون کە خوا بێداریان بکاتەوەو دایان چڵەکێنێ لەو خەوی بێئاگاییە، بەڵکو شایستەی ئەوە بوون کە لێیان گەڕێ و جڵەویان بۆ شل بکات تا بە ئارەزووی خۆیان کۆڵ و باری خۆیان قورس بکەن لە گوناه و خراپە، خۆیان چاکەیان ناوێ و بێزارن لێی و ڕووی لێ وەرئەگێڕن، دەی چۆن خوا بە زۆر بیانگێڕێتەوە، ئەگەر وای بکردایە ئەو کاتە چاك و خراپ وەك یەك وا ئەبوون و جیا نەئەکرانەوە وە نەئەبوایە دۆزەخ دروست بکرایە، ئەو ئیرادەو خواهیش و سەربەستیە ــ کە دراوە بە ئادەمی ـ هیچ نرخ و سوودی نەئەبوو! ئەو جڵەو شل کردن و مۆڵەت دانە لە شەرعدا پێی ئەوترێ(استدراج).

وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴿١٧٨﴾ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمۡ عَلَيۡهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلۡخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطۡلِعَكُمۡ عَلَى ٱلۡغَيۡبِ

---

ئەوانە لە جیهاندا بەو جۆرە ئەژین، بەڵام لە ڕۆژی دوایی دا بەم جۆرەن کە ئەفەرمووێ: ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ﴾ بۆ ئەوانە هەیە سزایەکی ڕیسواکەری ئابڕوو بە کە سزای وا زۆر ڕێك و هەڵئەسان پێ ی، لەگەڵ ئەو ڕێزو گەورەییەی کە بەدوای دا ئەگەڕان.

لێزانین و کاردروستی خواو چاکەو میهرەبانی خوا لەگەڵ بڕواداران داخوازی ئەوە بوون کە ئەو بڕوادارە پاك و خاوێنانە جیا بکاتەوە لەو ناپاکانەی کە تێکەڵیان بوون و هاتنە ڕیزیان، لەبەر چەند مەبەست و ئامانجێکی بەدو بێ نرخ، نەك لەبەر خۆش ویستنی ئیسلام ـ وەك لە سەرەتای جزمی یەکەمدا بەدرێژیی باس کرا ـ ئەو ناپاکانە لە پەنای ئەو تێکەڵیەدا زیانی زۆریان ئەگەیاند بە ئیسلام و موسڵمانان، لەگەڵ ئەوەدا بەشداریشیان بوون لە هەموو قازانج و دەست کەوتێکیاندا، کەواتە پێویست بوو جیاکردنەوەی پیس لە پاك، جالەبەرئەوە خوا ئەو ڕووداوی(أحد)ەی کرد بەترازووو سەنگی مەحەك و لەو ڕێگەوە پیسەکانی جیاکردەوە، وەك ئاماژەئەکات بۆئەوەکە ئەفەرمووێ: ﴿مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمۡ عَلَيۡهِ﴾ خوا نەیویستووەو نایەوێ واز لە بڕواداران بێنێ لەسەر ئەو بارەی کە ئێوە وان لەسەری، واتە ئەو تێکەڵیەو بەبێ جیاکردنەوە بە جۆرێ ناپاکان خۆیان بشانەوە لە ناوتاندا، خوا واز ناهێنێ ﴿حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلۡخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِۗ﴾هەتا جیا ئەکاتەوە پیس لەپاك، واتە بێبڕواو ناپاك لە بڕوادار، بێگومان خوا ئەو ئوممەتەی پێك هێناو هێنایە کایە بۆ ئەوەی فریای ئادەمی بکەوێ، بەمەی گەورەترین بەرنامەی خوای تیا بچەسپێنێ، وە لەزوی دا ڕژێمێکی تازەی کەس نەدیووو بێوێنە دابهێنێ، بەکورتی گەورەترین و بەرزترین ئەرك و فەرمانی پێسپێراوە لە زەوی داو بەرزترین پایەو پلەی پێدراوە لە ڕۆژی دوایی دا، کەواتە ئەبێ ئوممەتەکەس بە هەموو بارو ڕوویەکەوە شیاو و شایستەی کارو فەرمان و پایەو پلە بەرزەکەی بێ، دەی بێگومان ئەوەش داخوازە بۆئەوەی ئەو ئوومەتە پاڵفتە بکرێ، بەوێنەی ئاڵتوون بخرێتە بۆتەو بتوێنرێتەوە تا هەرچی کەرەسەی قەڵب و بێگانەی لێ دەرئەچێ، بەوێنەی لەش و جەستەیەکی ناساغ بدرێ لە کارەباو ئەتۆم تا هەموو ناساغی و میکرۆبێکی دەرئەکەوێ، جالەبەرئەوە پێویست بوو خوای میهرەبان پیس جوێ بکاتەوە لە پاکەکان نەئەبوو وازیان

لیّ بێنیّ بەبیّ جویّ کردنەوە، وەك بەو شێوە بوون لە پێش ڕووداتی(احد)دا، ئینجا ئەو جویّ کردنەوەش لەم ڕێگەوە نەبوو کە خوا بڕواداران ئاگادار بکات بەسەر ئەو ناپاکی‌و بیّبڕواییەی کەلە دڵی ناپاکەکاندایە،چونکە ئەوەی کەلە دڵ دایە لەو جۆرە نهێنی‌و غەیبییانەیەکەزانینیان تایبەتیە بە خواوە لەبەرئەوە ئەفەرموویّ: ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى الْغَيْبِ﴾ خوایش نەیویست‌و نایەویّ ئێوە ئاگادار بکات بەسەر ئەو غەیبە تایبەتیانەدا.

لەسەرەتای سوورەتی ﴿البقرة﴾ بەکورتی دەست نیشانم بۆ جۆرەکانی غەیب کرد، لە دوا دوایی سورەتی ﴿نمل﴾دا کەلە پێشەوە تەفسیرم کرد زۆر بەدرێژیی باسی ئەو جۆرانەم کرد‌و ئەوانەیان کە تایبەتیّ بە خواوە، باسەرنجی ئەو باسە درێژە بدریّ، چونکە پاڵفتە‌و کورتەی ڕای زانا بەرزەکانی ئیسلامە‌و زۆر پێویستیشە زانینی ئەو باسە، لێرەدا بەکورتی هەر باسی جۆرە تایبەتیەکە ئەکەم‌و نیشانی ئەدەم:

ئەم بەشەیان ئەو شتانەیە کە هیچ نیشانە‌و بەڵگەیەك نیە لەسەریان، نەبە ژیریی ئەزانریّ‌و نەبە ویژدان‌و لەدەروونـدا هەستیان پیّئەکریّ، ئەوەش وەك زانینی کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی‌و زانینی بەسەر هات‌و ڕووداوی داهاتوو‌و چارەنووسی مەردومان.

بەندە ئامادە نەکراوە بە سروشت بۆ زانینی ئەم جۆرە شتانە، کۆئەندامی سروشتیی زانینیان دانەڕێژراوە لەسەر وەرگرتنی ئەم جۆرە زانینە، کەواتە ئەو زانینە دەست نـاداو ناگونجیّ بۆ بەندە، مەگەر خوا بە میهرەبانی‌و لیّزانی خۆی هەر ئەندازێك – کە خۆی ئەزانیّ پێویستە‌و بەرژەوەندی تیایە– بیبەخشیّ بە هێندیّ لە بەندەیانی کە پێغەمبەرەکانن، کۆئەنـدامی سروشـتیی زانینـی لـە ئادەمیـدا داڕێـژراوە بـۆ هەڵـسانی بـە کـارو بـاری جێنشینیەکەی لە زەویداو هەڵسانی بەوەیش پێویستی نیە بە زانینی ئەو جۆرە غەیبانە، مەگەر ئەو ئەندازەی کە دراوە بە پێغەمبەرەکان(ﷺ) بەڵکو ئەگەر دەرگای ئەو زانینە بکرایەتەوە لە ئادەمی کاروباری جێنشینیەکەی ئەوەستاو بەسەر نەئەبرا، چونکە زۆربەی کەس کە خەریکە‌و ناوەستیّ لەکاروباری ژیان‌و ئاوەدان کردنەوەی وڵات، گیانی بەوەیە نازانیّ بەسەر هات‌و ڕووداوی داهاتووە‌و چارەنووسی چۆنە، بێجگە لەوەیش زانینی ئەو جۆرە شتانە مایەی بیّئارامی‌و سەر شێوان‌و خەریك بوونی دەروونە پیّیانەوە، کەواتە هەر ئەوە بەجیّیە کە خوا بەندەکانی ئاگادار نەکردووە بەسەر ئەو جۆرە غەیبانەدا، ئینجا کەواتە با بزانیّ خوا لە چ ڕێگەیەکەوە ئەو پیسانەی جویّ کردەوە لە پاکەکان‌و ئەو پاکانەی زانا کرد بە حاڵو باری پیسەکان؟

**خوای گەورەدەست نیشان ئەکات بۆئەوەکە ئەفەرمووێ: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجْتَبِي مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُۖ﴾ بەڵام خوا هەرکەسێکی بوێ هەڵی ئەبژێرێ لە فروستادەو نێرراوەکانی، کە ئاگاداریان ئەکات بە هێندێ لە غەیب کە پێویست بێت، واتە لە ڕێگەی ئەو فروستادانەوە پاك‌و پیس جوێ ئەکاتەوە، بەم ڕەنگە خوا فروستادەکە ئاگادار ئەکات بەو بڕواو بێ‌بڕواییەی کەلە دڵی پاك‌و پیسەکاندا هەیەو ئەویش بڕواداران ئاگادار ئەکات، بەم ڕەنگە هەرکەس بڕوای هێنا بەنێرراوو فروستادەی خوا ئەو پاکەو هەرکەس نەیهێنا ئەوە پیسە، وە هەرکەس تێکۆشانی کردو پەیڕەوی فروستادەکەی کرد ئەوە پاکەو هەکەرس نەیکرد ئەوا پیسە، وە هەرکەس لەتاقی کردنەوەی ئەو ڕێی تێکۆشان‌و فیداکاریەدا، دەرچووو خۆگربوو ئەوە پاکەو هەرکەس دەرچنەچووو خۆگر نەبووو پشتی تێ کرد ئەوە پیسە، بە هەموو ئەمانە پیس لەپاك جوێ ئەبێتەوە بۆ بڕواداران. ﴿فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۚ﴾ کەواتە بڕوای ڕاستەقینە بێنن پاك‌و خاوێنی بە خواو بە نێرراوەکانی ﴿وَإِن تُؤْمِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ ئەگەر بەو جۆرە بڕوابێنن‌و بترسن لە خواو خۆتان بپارێزن لەناڕەزایی خوا، بۆ ئێوە هەیە پاداشتێك زۆر گەورە، ئا بەو جۆرو شێوەیە باسە جەنگی(احد)ی کرد.**

**ئینجا ئەم جەنگەو ئەو ئایەتانەی کە هاتن لەبارەی ئەم جەنگەوە چەند شتی گرنگی جۆر بەجۆر ئەدەن، کە بەزەحمەت دێنە ژماوەو باسێك کە پڕ بەپڕ شایستەبێت، لەبەرئەوە ئاماژە ئەکەین بە کورتی بۆ چەند خاڵێك کە بە کەڵك ترو ئاشکراتریانن:**

**١- تێگەیاندن‌و ئاگادارکردنەوەی مەردوم بەسروشتی ئەم ئایینە کە بەرنامەیەکی خواییەو هاتووە بۆ ژیانی مرۆڤو ئادەمی، تێگەیاندن‌و بێدارکردنەوە بە ڕێگای کارکردنی ئەم ئایینە لە ژیان، سروشتی ئەم ئایینەو ڕێگەی کارکردنی هەرچەند ئاشکرایە، بەڵام زۆر جار لەیاد ئەچن، یان هەر لە یەکەمجارەوە بە هەڵە وەرگیراون، بەهۆی ئەوە هەڵەیەکی زۆر گەورە پەیدا ئەبێ لەبارەی ئایینەوە: هەڵە لە حەقیقەت‌و بارە ڕاستەکەی دا، هەڵە لەکارو پیشەی دا بۆ ڕابردووو ئێستاو داهاتوودا، بێ‌گومان هێندێ وا ئەزانێ‌و چاوەڕوانی ئەکات لەم ئایینە ـ ماتووڵ لای خواوە هاتووە بۆئەوەی ببێ بە بەرنامەی ژیان ـ کە ئەبێ خۆی بە خۆی کار بکات لە ژیاندا بە شێوەی**

موعجیزەو بەبێ پێویست شتێكی تر! ئینجا كاتێ كە ئەبینن بەو جۆرە نیەو كاروباری بەستراوە بەهێزو توانا و هەوڵ و تێكۆشانی مەردومەوە، بەوێنەی بەرنامەكانی تر پێویستی هەیە بە هەموو جۆرە چەك و كەرەسەی پێویست، كاتێ كە بەو جۆرە ئەم ئایینە ئەبینن بێگومان یان دڵ ساردو نائومێد ئەبن، یان بڕوایان بێهێز ئەبێ بەرێك و پێكی و شایستەیی ئەو بەرنامەیە! یان دووچاری گومان و دوو دڵی ئەبن لە ڕاستی ئایینەكەدا! هەركام لەم هەڵەیانە پەیدا ئەبێ لە تێگەیشتن لە سروشتی ئەم ئایینەو ڕێگەو ڕێبازی ئەم ئایینە، یان لەیاد چوونی ئەو تێگەیشتنە.

شتێكی ئاشكرایە كە ئەم ئایینە بەرنامەیە بۆ ژیانی ئادەمی، بەدی هێنان و پێك هێنانی لەژیاندا ئەبێ بەپێی تێكۆشانی ئادەمی بێت، لە سنووری توانای خۆیاندا، لەگەڵ بەكار هێنانی هەر چەك و كەرەسەیەكی پێویست بێت. سیفەت و نیشانەی تایبەتی ئەم بەرنامەیە ئەوەیە لە هەموو كات و لە هەموو قۆناغ و هەنگاوێكی تێپەڕ ناكات لە سروشتی ئادەمی، لە سنووری توانی دەرناچێ، هەمیشە سەرنجی بارو حاڵەتی كاروباری ماددی ئادەمی ئەدات و بەپێی ئەوە ڕەفتاری لەگەڵ ئەكات، لە هەمان كاتدا هەر كاتێ ئادەمی بەڕاستی دەستی گرتبێ بەم بەرنامەیەوە، بەرز بووەتەوە بەرامبەر ڕادەو پلەو پۆپەیەك كە بەهیچ بەرنامەیەكی تر نزیكی ئەو ڕادەو پلەو پۆپە نەكەوتووەتەوەو ناكەوێتەوە، چ جای ئەوەی پێی بگات!! بێگومان خوا توانایە كە سروشتی ئادەمی بگۆڕێ، توانا بوو كە ئادەمی لەسەر سروشتێكی تر دروست بكردایە، بەڵام ویستی و ئیرادەی كرد كە ئادەمی دروست بكات بەم سروشتە تایبەتیە، ویستی و ئیرادەی كرد كە ڕێنوومایی ئادەمی بەرهەمی تێكۆشان و گوێڕایەڵی خۆی بێ، ویستی و ئیرادەی كرد كە هەمیشە سروشتی ئادەمی بخرێتە كارو لەئیش نەخرێ، ویستی ئادەمی لە هەموو ئەمانەدا پێبگات بە ئەندازەی هەوڵ و تێكۆشان و لە سنووری بەسەر هات و حاڵەتەكانی ژیانی. هیچ كەسێك ڕێی نیە پرسیار بكات كە بۆچی ویستی خوا بەو جۆرە هات؟ چونكە هیچ كەسێكی تر زانا نیە ــ دەست نادا كە زانا بێ ــ بەو ڕژێمە گشتیەی كە خوا داینـاوە بۆ ئەم بوونەوەرە، بە داخوازی ئەو ڕژێمە لە سروشتی هەرچی هەیە لەم بوونەوەرەدا، بەو حیكمەت و كار دروستیەی كە نادیاریە لە ئێمەوەو هەیە لەبوون و پەیدا بوونی هەموو شتێ لەم بوونەوەرەدا لەسەر ئەم بارو شێوەی كە داڕێژراوە لەسەری!

پرسیار لەو جۆرە شتانە هەرگیز بڕواداری ڕاستەقینە نایکات، چونکە شەرم ئەیگرێ‌و خۆی ئەناسێ‌و ئەزانێ کە خۆی کوڕی ئەو مەیدانە نیە، هەروەها بێ‌بڕوایش ئەو پرسیارە ناکات، چونکە ئەوەندە نەزان‌و نەفامە، بڕوای نیە! بڕوادارێکی تێ نەگەیشتوو ئەو پرسیارە ئەکات، جالەبەرئەوە شایانی ئەوە نیە گوێی پێ‌بدرێ‌و بەهیچ دابنرێ‌و سەرنج بدرێ، بەڵێ هێندە کەسێك ئەو پرسیارە ئەکات کە نەزانەو نازانێ خوایەتی چیەو مەبەست بەو خوا کامەیە؟ ئەو جۆرە کەسانەش نابێ لە ڕێوە وەڵام بدرێنەوە، بەڵکو ئەبێ لە ڕێوە هەوڵ بدرێ خواو خوایەتی پێ‌بناسرێ، بەڵکو تێ‌بگات‌و بڕوا بێنێ‌و ئیتر واز ئەهێنێ، ئەگەر تێ‌نەگەیشت‌و بڕوای نەهێنا ئیتر گوێی پێ‌نەدرێ، چونکە شایستەی وەڵام دانەوە نیە!

کورتەو پاڵفتەی باسەکە ئەمەیە: ئەو بەرنامەی ئیسلامە بەدی نایەت لە جیهاندا، هەربەمەی کەلە لایەن خواوە هاتوو، وە بەدی نایەت تەنها بە ڕاگەیاندن‌و ڕوون کردنەوە لە جیهاندا، خوا نەیوست کە بەزۆری خۆی بەدی بێنێ بەوێنەی بەدی هاتنی کاروباری ئەم زەوی‌و ئاسمان‌و ئەستێرانە، بەڵکو ئەم بەرنامەیە بەدی دێت کە کۆمەڵێك لە ئادەمی هەڵی گرێ‌و بیگرێتە گەردن، بڕوای تێرو تەواوی پێ‌بێنێ، بەڕێکی دامەزراو بێت لەسەری ـ بەپێی توانا ـ بیکات بەکارو پیشەی ژیانی‌و ئەو پەڕی ئاوات‌و ئامانجی، هەوڵ‌و تێ‌کۆشان بکات بۆ دامەزراندن‌و بەدی هێنانی لەدڵی مەردومانی تردا، هەروەها لە ژیانی دا بەکردەوە، ئەو تاقم‌و کۆمەڵە نەوەستن‌و هەرچی لە توانایاندا هەیە بەکاری بێنن‌و بەختی بکەن لەو ڕێگەیەدا، بەرەنگاری هەموو ڕێگرێ بوەستن، چ ڕێگری دەروونی‌و چ ڕێگری دەرەوە، ئینجا ئەو تاقم‌و کۆمەڵە هێندێ جار زاڵ‌ئەبن‌و سەر ئەکەون لەو تێ‌کۆشان‌و جەنگ‌و بەربەرەکانێدا، هێندێ جار ئەشکێن، بە گوێرەی باوی خوا لەم جیهانەدا، کە ئەوەش بەپێی بەکار هێنانی هەر شتێکە کە هۆی سەرکەوتن‌و تێك شکانە، لە پێش هەموو شتێکەوە پێش هەموو تێ‌کۆشان‌و پێش هەموو هۆیەك شتێکی گرنگ هەیە، کە بریتیە لە لێ بڕانی ئەو کۆمەڵە بۆ ئەو مەبەستەو داڕنینی هەر شتێکی تر لە خۆیان، بەڕاستی دەست گرتنیان بەو بەرنامەیەوە، تا ڕادەیەك ببن بە نوێنەرو ئاوێنەیەکی باڵانما بۆی، هەمیشە پەیوەست بن بە خواوەو پشت هەر بەو ببەستن، ئەوەیە حەقیقەتی ئەم ئایینەو ئەوەیە ڕێگەی ئەم ئایینە. ئەمە بوو کە خوا ویستی نیشانی ئەو کۆمەڵە بڕوادارەی بدات‌و زاناو ئاشنایان بکات پێی، لەکاتێکدا کە

ڕووداوەکانی جەنگی(احد)ی بەسەر هێنان و لە ئایەتەکاندا باسی کردن و تەمێ و ئامۆژگاریەکانی ئاڕاستەکردن، وەك ڕابواردن و تێپەڕیان کرد بەسەرماندا. هەرکات ئەو کۆمەڵە کەم و کوڕییان بوو لەنوێنەریان بۆ ئەو بەرنامەی خوا، کەم و کوڕیان لە هێندێ هەڵوێستیان لە جەنگ و بەربەرەکانێکانیاندا، کاتێ کەم و کوڕیان بوو لە بەکار هێنانی ئەو شتانەی کە بەپێی باوی خوایی ویستی، کاتێ بێ ئاگا بوون لە سروشتی ئایینەکەیان و لایان وا بوو کە ماتووڵ موسڵمانی ئیتر ئەبێ هەر زاڵ و سەر کەوتوو بن، ئیتر با بۆچوون و کردەوەیان هەر جۆربێ و لەسەر هەربارێك بێ، لەو کاتەدا خوا لێیان ئەگەڕێ تا دووچاری تێك شکان ئەبن و ئێش و ئازارەکەی ئەچەژن! بێگومان بەدی هاتنی ئەم بەرنامەیە لە ڕێگەی هەوڵ و تێکۆشانی ئادەمیەوە خێرو فەڕی تیایە، چونکە بەوە ژیانی مەردوم ئەکەوێتە کارو ناوەستێ، سروشتی ئادەمی بێدار ئەبێتەوە و گەشە ئەکات و لە ڕێگە ڕاستەکەی خۆی لانادا، ئەوەش لەبەرئەوەیە کە بڕوا بەتێرو تەواوی لەدڵدا جێگیر نابێ هەتا خاوەن بڕوا نەکەوێتە تێکۆشان بەدەست و بەزۆر بۆ بەرگریی و بەربەست کردنی هێزی ستەمکار لە ڕێگەی بڕوا و ڕینوومایی دا، هەتا لەم تێکۆشانەیش دا دووچاری تاقی کردنەوە نەبێ بەخۆگریی لەسەر تێکۆشانەکەی، خۆگر بێ لەسەر ئەشکەنجە و ئازار، خۆگر بێ لەسەر تێك شکان، خۆگر بێت لەسەر زاڵبوون و سەرکەوتن، چونکە خۆگریی لەسەر زاڵ بوون بەتین ترو گرانترە لە خۆگریی لەسەر تێك شکان. تا بەهۆی ئەو تاقی کردنەوانەوە دڵ پاك و خاوێن و پاڵفتە ببێ، ڕیزی چاکان و پاکان جوێ ببێتەوە، کۆمەڵ بەڕێکی لەسەر ڕێگە ڕاستەکەیان دامەزرێن، بڕۆن بەڕێی خۆیانداو بەرزببنەوە بەرەو ڕادەو پلەی بەرزی بەرزی خۆیان بەپشتیوانی خوا.

خوای میهرەبان ویستی کەئەوکۆمەڵە موسڵمانە ئاشنا و زانا بکات بە ئایینە پیرۆزەکەیان لەسەربارەڕاستەقینەکەی، لەکاتێکداکەپەروەردەو تەمێ کردن بە ڕووداوەکانی ئەو جەنگە.

٢- لەو خاڵە گرنگ و ئاشکرایانە ئەمەیە: بڕوادار ناتەواوی هەیە و بێ کەم و کوڕی نابێ، بەڵام لە هەمان کاتدا دەست ئەدا بۆ گەشەکردن و بەرزبوونەوە، هەتا ئەگاتە ئەوپەڕی پلەو ڕادەیەك کە بۆی دانراوە لەم زەویەدا! ئەوەتا ئەبینین لەناو ئەو کۆمەڵەدا ـ کۆمەڵی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) ـ کە چاکترین ئوممەت و گەلێك بوون خوا هێنانیە سەر زەوی، ئەبینین تیایاندا بوو کە ئایەتەکانی ئەم جەنگە هاتە خوارەوە لەنەنگ و

ڕەخنەیانـدا، لـە کـەداری کـردن بـەلاوازیی و بـەترس‌و بـەگوناهو هەڵخلیسکان بـەهۆی شـەیتانەوە، ئەوانـە بـڕوادارو موسـڵمانیش بـوون، بـەڵام تـازە کەوتبوونـە سـەر ڕێ‌و یەکەمجاریان بوو، هێشتا لە قۆناغی پەروەردەکردن‌و پێگەیاندندا بوون، بەڵام بەڕاستی لـێ بڕابوون، هـەمووکاروباری خۆیـان سپاردبووبەخوا،هەربە سـەرکردایەتی ئـەو ڕازی بوون، هـەر مل کەچی فـەرمانی ئـەوبوون، جالەبەرئـەوە لەپـەنای خـۆی دەری نـەکردن، بەڵکو میهرەبانی لەگەڵ کردن‌و لێیان بورد، فەرمانی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە چاوپۆشی بکات لێیـان‌و داوای لـێ بوردن بکـات لـە خـوا بۆیـان، فـەرمانی پـێدا کـە پـرس‌و ڕاوو تـەدبیرو لێکۆڵینـەوەیان لەگـەڵ بکـات، لـەپاش ئـەو هـەموو ڕووداوو کردەوانـەی کـە لێیانـەوە ڕووی دا، لـەپاش ئـەو هـەموو بەسـەر هاتـەی کەپەیـدا بـوون، لـە ئـەنجامی ئـەو تەدبیرو پرس‌و ڕای کەکرا دەربارەی ئەو جەنگە لە یەکەمجارەوە! بەڵێ خوا لێیان گـەڕا تا دووچاری ئەو بەسەرهات‌و تاقی کردنەوە سەختەی کردن. بـەڵام ڕێـز دەری نـەکردن، نەیفەرمووپێیان تازەئێوەکەڵکی ئەم کارەتان نەمالەپاش ئەوەی کەلەم تاقی کردنـەوەدا دەرنەچوون، بەڵکو چاوپۆشی کرد لەلاوازی‌و کەم‌و کوڕیەکەیان، بە ئەوپـەڕی بـەزەیی‌و میهرەبانیەوە تەمێ‌و ئامۆژگاری کردن، لاوازیی‌و کەم کوڕیەکەیان‌و نیازو خەتـەرەکانی دەرخستن، نەك بۆئەوە بێئابڕووو ڕیسوایان بکات، بۆئەوەی تەنگەتاویان بکات‌و باری قورس بخاتە سەرشانیان، بەڵکو بۆئەوەی کە دەستیان بگرێ، بڕوایـان بـەخۆیان پەیـدا ببێ‌و خۆیان بەسووك‌و بێنرخ سەیرنەکەن‌و نائومێد نەبن لە گەیشتن بە ئاسۆو پلـەی بەرزیان، تا ئەوان بەڕاستی دەست بگرن بەئاین‌و بەرنامەکەی خـواوە، ئینجا سـوپاس بۆ خوا بەزوویی پێگەیشتن، ئەوەبوو هـەر لـە ڕۆژی یەکـەمی پـاش تێك شکانەکە، بەو هـەموو زامـەوە دەرچـوون لەگـەڵ پێغەمبـەردا(ﷺ) بـەبێ باك‌وبـەبێ دوودڵـی‌و گوێـدان بەچاووڕاوو فاك‌و فیکـی پڕوپاگەنـدە چیان، دەرچـوون بـۆ بـەرەنگاریی‌وتێك جـەنگین لەگەڵ لەشکری دوژمنی زۆری زۆرداردا،وەك بەدرێژیی باسکرا.

هەتا تۆڵو خامەو ناسك بوون، بەو نەرمی‌و ناسکیە ڕەفتاریان لەگەڵ کرا، بـەڵام کاتـێ کـە گەورەو بەهێزو ڕەق بوون، بەڕەقی ڕەفتاریـان لەگـەڵ کـرا! هەرکـەس بـیەوێ بکاتـەوەو چاوێك بگێڕێ بە ئایەتەکانی سورەتی ﴿التوبة﴾دا کـە هاتنـە خـوارەوە دەربـارەی ئـەو چـەند کەسـەی

که بەجێمان و دەرنەچوون بۆ غەزای تەبوك، ئەو ئایەتانەی کە ئەو هەموو توندو تیژییەی بەکار هێنا لەگەڵ ئەو بەجێماوانەدا، هەرکەسێك چاوێ بگێڕێ بەو ئایەتانەدا تێئەگات کە جیاوازیەکی زۆر هەیە لە ڕەفتار کردن لەگەڵ ئەوان و ئەماندا، هەرچۆنێ بارو حاڵی موسڵمانەکان لە(احد)دا زۆر جیاوازبوو لەگەڵ بارو حاڵیان لەکاتی ڕووداوی(تبوك)دا، کۆمەڵی موسڵمانان لەم هەر دووکاتەدا هەر کۆمەڵی موسڵمانان و هاوەڵان بوون، بەڵام لەکاتی ڕووداوی(احد)دا هێشتا موسڵمانەکان تووڵ و خامە بوون و پێ نەگەیشتبوون، لەپاش ئەوە تا کاتی(تبوك) ئیسلام پەروەردەی کردن و پێی گەیاندن تا گەیشتنە ئەو ئاسۆو پلەبەرزە، لەگەڵ ئەوەیش دا هەر ئادەمی بوون هەر بە ئادەمێتیش مانەوە، هەرچۆنێ لە پێشەوە لاوازی و کەم و کوڕی و هەڵەیان بوو، لەپاشانیش هەر ئەو جۆرە شتانە ڕووی تێئەکردن، بەڵام تۆبەو داوای لێ بووردن و گەڕانەوە بۆلای و خوا هەر بوو.

ئەم بەرنامەیە کە گیرایە گەردن هەمیشە چاودێریی و پارێزگاریی سروستی ئادەمی ئەکات و پێ ی ئەگەیەنێ و پەروەردەی ئەکات، نەك ئەیگۆڕێ، یان لەکاری ئەخات، یان بارێکی بدا بەسەردا کە پێ ی هەڵنەگیرێ، ئیتر یا بەرزی بکاتەوە بۆ ڕادەو پلەیەك کە بەدڵی کەس دا نەهاتبێ: ئەم بۆچوون و تێگەیشتنە بەم جۆرەی کە وترا زۆر بەکارو بەنرخە بۆئەمەی کە هیواو ئومێدێکی هەمیشەیی بخاتە دڵی موسڵمانان، تا بەهۆی ئەوەوە هەوڵ و تێکۆشان بکەن و لە سایەو پەنای ئەم بەرنامەیەدا پێبگەن و ڕادەو پلەی کە بۆیان دانراوە، هەروەها بەم بۆچوون و تێگەیشتنە حاڵی ئەبین کە پێك هاتن و بەدی هاتن و بەرز بوونەوە بە شێوەی موعجیزەو بە پێچەوانەی باو نەبووە، بەڵکو بە هەوڵ و تێکۆشانێك بووە کە بەپێ ی سورشتی ئادەمی بووەو لە سنووری دەسەڵات و توانا و سروشت دەرنەچووە، کەواتە لەهەر چەرخێکدا هەر تاقم و چینێکی تر وەك ئەوان لێ بنەوێ و بەڕاستی پەیڕەوی ئەوان بکات خوا ئەیانگەیەنێ بەوان و ئەیانخاتە ڕیزی ئەوان.

٣- ئەمەیە: لەم بەرنامەی خوادا پەیوەستیەکی بەتین هەیە لە بەینی هەموو بارو حاڵی موسڵمانان و هەموو جەنگ و تێهەڵچوونێك لەگەڵ دوژمنەکانیان لە هەموو مەیدانێکدا، پەیوەستی عەقیدەوبۆچوون وڕەوشت وڕامیاری وئابوری وکۆمەڵایەتیان،لەگەڵ زاڵ بوون وتێك شکانیان لەهەموو جەنگ وبەربەرەکانێیەکان، واتە بوونی هەرکام لەمانە هۆیش

کەرەلەزاڵ بوون وسەرکەوتندا، نەبوونی هەرکام هۆو ئیش کەرە بۆ تێك شکان و ژێر کەوتن، وەك دەست نیشان کرا بۆ ئەم مەبەستە لە کاتی تەفسیری ئایەتەکاندا.

٤- لەبارەی سروشتی بەرنامەی پەروەردەکردنی ئیسلامیەوە، ئیسلام ئەدوێ و ئەکۆڵێتەوە لە هەموو بەسەرهات و ڕووداوەکانی کۆمەڵی موسڵمان، لە بەرهەم و سەرەنجامی ئەو ڕووداوانە، ئەگەڕێ بەدوای هەموو کون قوشبنی دڵ و دەروونـدا، داشاردراوەکانی دەئەخات، ئینجا بەهۆی ئەوەوە هەموو ئەوانە پاڵفتە و پاك و خاوێن ئەکاتەوە، هەموو هەست و بۆچوونە ناڕاستەکان ڕاست ئەکاتەوە، هەر بیرو باوەڕێك کە ڕێك و ڕەوایە و ژیانی ئیسلامی لەسەر ڕاگیرە ئەیهێڵێتەوە و دانی پیا ئەنێ.

٥- ئەم بەرنامەی ئیسلامە شتێکی خەیاڵی نیە، بیروباوەڕەکانی تەنها بۆ بیر لێ کردنەوە و تێ ڕوانین نین، واز ناهێنێ بە تەنها ڕاگەیاندن و تەمێ کردن، بەڵکو ئەوەی کە وتی و دایهێنا ئەبێ بەکردەوە بەدی بهێنرێ لەژیاندا، ئاشکرا ترین بەڵگە و نیشانە لەسەر ئەوە لەم جەنگی(أحد)ەدا، هەڵوێستی پێغەمبەر(ﷺ) بوو بەرامبەر بیروباوەڕی مەشوەرەت و پرس و ڕا وەرگرتن، بێ گومان پێغەمبەر(ﷺ) ئەیتوانی ئەو مەبدەئەبەکار نەهێنێ و هەر بەپێی ڕای خۆی ڕەفتاری بکردایە، بە تایبەتی بە گوێرەی ئەو خەوەی کە بینی و خەو پەرژینیشی کرد ــ وەك لەسەرەتاوە باس کرا ــ ئەبوایە هەر بەپێی ڕاکەی خۆی ڕەفتاری بکردایە، چونکە ئەو کاتە دوور ئەبوون لەو هەموو بەسەرهات و ڕووداوە سەخت و دڵ تەزێنانە، بێ گومان ئەگەر ئەو بیویستایە هەر بەقسە و ڕاکەی خۆی بجوڵایەتەوە هیچ کەسیش نەئەبوو دژی ئەوە بوایە و ڕازی نەبێ پێی، بەتایبەتی پاش ئەوەی کە کۆڕو کۆمەڵەکە پەشیمان بوونەوە لەڕاو بڕیارەکەی خۆیان و پێغەمبەر(ﷺ) کە سەرەنجامی کارەکانی ئەزانی هەر لەسەر ئەو مەبدەئە ئەڕۆیشت و هەڵی نەوەشاندەوە، چونکە لەسەر ڕۆیشتن و بەدی هێنانی ئەو مەبدەئەی بە گرنگ و بەنرخ تر دانا لە دوور کەوتنەوە لەو هەموززیان وڕووداوەسەختانە کە بوون بە سەرەنجام و بەرهەمی ئەو مەبدەئە لەو جارەدا! ئینجاوەك ئەم ئەو مەبدەئەی بە گرنگ تر دانا، ئەوەبوو لەپاش لێ بوونەوە لە جەنگەکە و لەپاش ئەو ڕووداوە سەختانە،

فەرمانی خوا هات بە بەکار هێنانی ئەو مەبدەئە، لەپاش ئەوانە فەرمووی: ﴿فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ﴾ وەك تێپەڕی کرد بەسەرماندا.

٦- ئەمەیە کە: بەرنامەکەی خوا شتێکی دامەزراوە، هەرشتێ ئەو نرخی بۆ دانابێ هەر ئەوە پیرۆزەو نرخ دارە، ئینجا هەر هەڵەو لادانو ترازانێك ڕوویدا ڕوو ناکاتە بەرنامەکەو نا سەپێنرێ بەسەر ئەوا، بەڵکو هەمووی ڕووی ئەکاتە بڕواداران و هینی ئەوانە کە بەڕێکی پەیڕەوی بەرنامەکەی خوایان نەکردووە، کەواتە پێویستە لەسەر موسڵمانان هەمیشە ئاگایان لەپاکیو خاوێنی بەرنامەکەیان بێتو هەرگیز شێوەو وێنەی شیرین و پاکی لەکەدارو ناشیرین نەکەن بەهۆی هەڵەو لادانو ترازانی هیچ هەڵە کەرو لادەرو ترازاوێك ـ هەرچەند پلەو پایەی بەرزبێت ـ بەڵکو بەبێ پێچو پەنا هەر لەکەو ڕەخنەیەك بوو بەهینی مەردومەکان دابنرێ، نەك بەهینی بەرنامەکە، چونکە بەرنامەکە بەنرخ ترو گرنگ ترو گەورەترە لەوەی کەلەبەر خاتری مەردومو لەپەنای مەردومدا لەکە دارو ڕەخنە دار بکرێ، کەواتە مێژووی ئیسلام بریتی نیە لە هەر کردەوەو بارێ کە موسڵمانان کردبێتیانو دایان هێنا بێ، بەڵکو مێژووی ئیسلام هەر کردەوەو بارێ کە موسڵمانان پێی هەڵسا بن بەپێی بەرنامەکەی خواو ڕێكو دەقی بیروباوەڕە دامەزراوەکانی ئەو بن، مێژووی ئیسلام مێژووی ئەو موسڵمانانە نیە کە هەر بەناوو بە زیانو بەدەم موسڵمانن! مێژووی ئیسلام هەر مێژووی بەدی هێنانێکی ڕاستەقینەیە بۆ ئیسلام، لەبۆچوونی موسڵمانانو کردەوەو ڕەوشتیانو هەموو بارو ڕوویەکی ژیانیان.

ئەمە بوو کە خوا ویستی گەلو ئوممەتی موسڵمانی پێ ئاشنا بکات، لەکاتێکدا کە هەڵەکانی ئەو تاقمە موسڵمانەی دەرخستو کەمو کوڕیو لاوازیەکەی ئاشکرا کردن، لە پاش ئەوە میهرەبانی لەگەڵ کردنو لێیان بوورد، لەپاش ئەوەی سەرەنجامی کردەوەکانی خۆیانی پێ چەشتن لە مەیدانی تاقی کردنەوەدا.

باسی جەنگو بەربەرەکانی(احد) دوایی هات، بەڵام بەربەرەکانی دوژمنەکانی تر کە بەدەوروبەری مەدینەدا بوون ـ بەتایبەتی جولەکە ـ کە ئەوان ئیش کەرو هۆی سەرەکی بوون لە هەڵگراندنی جەنگی(احد)دا، بەربەرەکانێی ئەوان هێشتا هەر دوایی نەهات،

بەربەرەکانێ بەدەم بازی‌و پڕوپاگەندەو پیلان لە هەر بارێکەوە کە بەدەستەوە بێت، بۆ تێک دانـی ڕێـزو کۆمـەڵی موسـڵمانان‌و دوو دڵ کـردن‌و بـێ ئـارام کردنـی دەروونیـان، ئـەم بەربەرەکانیە کە بەشی گەورەو زۆربەی ئەم سورەتەی داگیر کرد.

هەرچەند پێغەمبەر(ﷺ) (بنی قینقاع)ی دوور خستەوە لە مەدینە لەپاش پیلان‌و ناپاکی کەلێیانەوە دەرکەوت، وەلەپاش هەڵوەشاندنەوەی پەیمانێ کە پێغەمبەر(ﷺ) بەستی لەنێوان خۆی‌و جوولەکـەکانی مەدینـەدا، لەسـەرەتای هـاتنی بـۆ مەدینـە، هەرچـەند ئـەو دەرکـردن‌و دوورخستنەوەبوو، بەڵام جوولەکـەکانی تـری مەدینـە:(بنـو نـضير و بنـو قريظـة) بـەوە تـەمێ خـوار نـەبوون، بـەڵکو لەگـەڵ جوولەکـەکانی خـەیبـەرو هـەموو جوولەکـەکانی نیـوە دوورگـە دەسـتیان تێکـەڵ کـردو شـانیان کـرد بـەکردەوەی خـراپ‌و پـیلان گێـڕی، پەیوەنـدی‌و پەیوەستیان بەست لەگەڵ ناپاکەکانی مەدینەو لەگەڵ بت پەرستەکانی مەککەو دەورو بەری مەدینـەو بـەبێ وەسـتان شـانیان کـرد بـە خراپـەکاریی‌و پـیلان گێـڕان، جـا لـەم چـەند ئایـەتی داهاتووەدا هێندێ لەو وتارو کرداری پیسی ئەو جوولەکانە ئەخاتە بەرچاو ــ وەك دای بە ناوچاوی خۆیـشیانداو شـەرمەزاری کـردن پێیـان ــ ئـەو وتـارو کردەوانـەیان کـە ئەوپـەڕی بێشەرمیان تیایە دەربارەی خوا وەك بەد کرداریی‌و پەیمان شکاندنە لەگەڵ موسڵمانەکاندا.

هەڵوێستی بەدو ناڕاستی ئەو جوولەکانە داخوازبوو، بۆ ئەو دەرخستن‌و ئابڕو بردنەیان، هەرچۆنێ پەروەردە کردن‌و پێگەیاندنی موسڵمانان داخوازبوو بۆیان، تا موسڵمانەکان وریا بن‌و ئامادە بن بۆ بەربەست کردنـی پیلانـەکانیان‌و دوور کەوتنـەوە لـە هـەر حـاڵ‌و داوێك کە ئەوان هـەڵی کـەنن‌و بینێنـەوە بۆی، ئـەو تـەمێ‌و ئامۆژگاریانـە کەلـە مەدینـەدا ئاڕاستەی ئـەو موسڵمانانە کران، تەمێ‌و ئامۆژگاری‌و ئاگادار کردنەوەن بۆ هەموو موسڵمانانی پاش ئەوان تا ئێستاو تا داهاتوویش، ئەگەر موسڵمانانی ئێستاو چەند چەرخێ لەمەوبەر ئەو تـەمێ‌و ئامۆژگـاری‌و ئاگـادار کردنـەوەیان لەبیربوایـە نەئەکەوتنـە تەپکـەو داوی دوژمنـەکانیان لـە صـەلیبی صـەهیۆنی‌و شـیوعیەتی جیهـانی، ئـاوا ژێـر پـێ‌و پێـشێل نەئـەکران، ئینجـا گـوێ بگرین لە قورئانی پیرۆز ئەو شتە گرنگانەمان بدا بە گوێچکەدا.

وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرًا لَّهُم ۖ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ ۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا۟ بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٨٠﴾ لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ۘ سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا۟ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ

لــه یەكــەمجارەوە ئەفــەرمووێ: ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرًا لَّهُم﴾ ئەو كەسانەی كە ڕەزیلن‌و چرووكی ئەكەن بەوەی كە خوا پێ‌ی بەخشیوون بە چاكەو منەتی خۆی‌و بەبێ ئەوەی ئەوان لە ڕاستی دا خاوەنی بن، بەبێ ئەوەی مافی ئەو پێ‌بەخشینەیان ببێ، ئەوكەسانەی كە چرووكی ئەكەن، بەم ڕەنگە مافی خوای لێ نادەن، با ئەوانە گومان نەبەن كە ئەو چرووكیە چاكترە بۆیان لەبەخت كردنی لە ڕێ‌ی خوادا ﴿بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ﴾ بەڵكو ئەوە خراپەو شەڕێكی گەورەیە بۆیان، وەك ڕوونی ئەكاتەوە كە ئەفەرمووێ: ﴿سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا۟ بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ بێ‌گومان ئەوەی كە چرووكیان پێ‌كردووە لە جیهاندا، تەوق ئەكرێن پێ‌ی‌و ئەكرێتە تەوقی گەردنیان لە ڕۆژی دوایی دا، ئینجا ئایا ئەم هەڕەشەیە ڕووكەش‌و ڕواڵەتەكەی مەبەستە، وەك كۆمەڵێك ئەفەرموون، لەبەر چەند حەدیسێك كە لەم بارەیەوە هاتووەو دەست نیشان ئەكات بۆئەوە؟ یان مەبەست ئەوەیە وەك(مجاهد) ئەفەرمووێ: لە ڕۆژی دوایی دا داوایان لێ ئەكرێ كە ئەوەی نەیانداوە بیهێننەوەو لەو ڕۆژەدا بیدەن، ئاشكرایە كە ئەوەیان پێ‌ناكرێ؟ یان مەبەست ئەوەیە: سزاو تۆڵەكەی ئەنووسێنرێ پێ‌یانەوەو ڕزگار بوون نابێ لێی بەوێنەی تەوقێ كە بكرێتە گەردن؟ بە هەرحاڵ‌و لەسەر هەربار، بەڕاستی هەڕەشەیەكی زۆر شامناكەو ئەوە ئەگەیەنێ كە بەخشینی ئەو شتە فەرزو پێویست بووە لەسەریان، وەك زۆر لە زانایان ئەفەرموون: كە ئەم ئایەتە هاتووەتە خوارەوە دەربارەی ئەوانەی كە زەكات نادەن یان وەك(ئیبن‌و جەریرو ئیبن‌و ئەبی حاتەم) ئەگێڕنەوە لە(ئیبن‌و عەباس)ەوە ــ خوایان لێ ڕازی بێت كەئەم ئایەتە هاتووەتە خوارەوە لە نامەدارەكاندا كە ئەوەی ئەیانزانی لەبارەی پێغەمبەرێتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) ڕایان نەئەگەیاندو ئەیان شاردەوە، بێ‌گومان ڕیوایەتێكی بەهێزی دڵنیا كەر نەهاتووە كە ئەم هەڕەشە لێ كراوانە دیاریی بكات، بەڵام بەپێی جێ‌و شوێنەكەی وا دەرئەكەوێ كە دەربارەی

جوولەکەکان هاتبێتە خوارەوە کە چرووکی لەناو ئەواندا باو بووە، هەروەها وا دەرئەکەوێ کە لەگەڵ ئەم چەند ئایەتانەی داهاتووەدا هاتبنە خوارەوە بە بۆنەی بانگ کردنی ئەو جوولەکانە بۆ هەڵسانیان بەو ماف و ماڵەی کەلە گەردنیاندا بووو پێویست بوو لەسەریان بیدەن، بەپێی ئەو پەیمانەی کە بەستیان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) و بەپێی ئەو بەڵێنەی کە پێیاندا، هەروەها بەبۆنەی بانگ کردنیان بۆ بڕوا هێنان بە پێغەمبەر(ﷺ) و بۆ بەخت کردنی ماڵیان لەڕێی خوادا، ئینجا هەرچەند بەبۆنەی ئەو جوولەکانەوە هاتبن، بەڵام واتا و شێوەی ئەم ئایەتەی کە خەریکین پێیەوە گشتیە بۆ ئەوانیش و بۆ هەرکەسانێکی تریش کە ئەو چرووکیە بەکار بێنن و دەست بگرن بەسەر ماف و ماڵی مەردوم دا کە خوا پێویستی کردوون، ئینجا هانی سامانداران ئەدا لەسەر بەخشین و دوور کەوتنەوە لە چرووکی، ئەفەرمووێ: ﴿وَلِلَّهِ مِيرَاثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ هەرچی کەلەپوورو میراتی ئاسمانەکان و زەوی هەیە هەر هینی خوایەو موڵکی خوایە، کەواتە چۆن چرووکی بکرێ لە شتێکدا کە هینی ئەوە، ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی تیایان دایە هەمووی ئەگەڕێتەوە بۆلای خواو هیچ بۆ هیچ کەسێك نامێنێتەوە بێجگە لەوەی کەلە ڕێی خوادا دراوە، تەنها ئەوە ئەمێنێتەوە لای خواو ئەبێ بە زەخیرە بۆ مەردوم لەباتی ئەوەی کە بکرێ بە تەوقی گەردن، ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ خوا ئاگادارو باخەبەرە بەهەرچی کە ئێوە ئەیکەن، لە بەخت کردن و چرووکی، کەواتە وریای خۆتان بن شتێ بکەن کە مایەی ڕەزامەندی خوا بێت. ئینجا هەڕەشە ئەکات لەو جوولەکانە کە خوا ماڵ و سامانی پێدابوون و کەچی خۆیان بەبێ پێویست دائەنا، بە خواو بە پاداشتی خوا، زۆر نەفامی و بێشەرمیان بەکارئەهێنا لەگەڵ خوادا و ئەیان ووت: چیە خوا داوای قەرزمان لێ ئەکات لەماڵی خۆمان و ئەیەوێ بە چەند قات قەرزەکەمان بداتەوە، لەکاتێکدا کە ئەو جڵەوگیریی ئەکات لە سوود خواردن؟! ئەوەش لاقرتی کردنە بە ئایەتی خواو ئەوپەڕی نەفامی و بێشەرمیە، ئەفەرمووێ: ﴿لَّقَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوۡلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ﴾ سوێند بە خوا خوا بیستی وتەی ئەوانەی کە وتیان: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٞ وَنَحۡنُ أَغۡنِيَآءُ﴾ بەڕاستی خوا بێ نەوایەو ئێە دەوڵەمەندو بێ پێویستین، بەپێی ڕیوایەتی(ئیبن و ئیسحاق و ئیبن و ئەبی حاتەم) لە(عیکرەمە) و ئەویش لە(ئیبن و عەباس)ەوە -خوای لێ ڕازی بێت-، ئەو وتە سامناکە هینی(فنحاسە) کە یەکێ بوو لە زانا و عابیدەکانی جوولەکە، بەپێی ڕیوایەتی(إبن المنذر) لە(قەتادە)وە وتەی(حەبەیی کوڕی اخطبە)، بەپێی ڕیوایەتی(سەعیدی کوڕی جوبەیر)

له(ئیبن و عەباس)ەوە -خوای لێ ڕازی بێت- وتەی کۆمەڵی جوولەکەیە، کەواتە لەسەر دوو ڕیوایەتەکەی پێشوو کەیەك کەس وتوویەتی و قورئان بەکۆ ئەیگێڕێتەوە، لەبەرئەوەیە کە ئەوانی تریشیان ڕازی بوون بەو وتەیە، بە هەرحاڵ و هەرچۆن بووبێ سروشتی لاری جوولەکەو بۆچوونی ناڕەواو کرداری بەدو بەد شەرمیان شتێکی بەناوبانگەو لەنامە دەست کاری کراوەکانیاندا بلاوبوونەتەوە، بەڵام بەڕاستی ئەم وتەیان ئەوپەڕی گرتووە لە بۆچوونی بەدولەبێشەرمیدا، لەبەرئەوە ئەوەندە بە توندی گرتی و ئەم هەموو هەڕەشەی ئاڕاستە کرد:

١- بەسوێند لەسەر خواردن و دڵنیایی لەسەرکردنەوە فەرمووی: خوا وتەی ئەوانەی بیست، کە هەواڵدان بە بیستنی ئەو وتەیە لەتایبەتی لەگەڵ ئەوەدا خوا هەموو شت ئەبیستێ - ئەو هەواڵدانە لێرەدا هەڕەشەی لێ ئەبارێ - سوێند لەسەر خوارەوەکەیش ئەوە نیشان ئەدا کە ئەو وتەیە ئەوەندە دوورو خراپە لەوانەیە هیچ کەس بڕوانەکات بەوەی کە شتی وا ئەوترێ، لەوانەیە خاوەنەکانیشی دانی پیا نەنێن و ئینکاری وتنی بکەن بەتوندی، کەواتە بەپێی یاسای ڕەوان بێژی پێویستی هەیە بەو سوێن و دڵنیایی لەسەر کردنە.

٢- فەرمووی: ﴿سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا﴾ بێگومان ئەوەی کە وتیان ئەینووسین. واتە ئاگادارین پێی و هەرگیز لە بیرمان ناچێ و پشت گوێی ناخەین و وازی لێ ناهێنین، کەواتە دووچاری سزاو تۆڵەی سەختی ئەو وتەیە ئەبن.

٣- ئەم وتەیان کۆئەکاتەوەو هاوسەری ئەکات لەگەڵ کوشتنی پێغەمبەرەکانیان، بۆ ئەوەی کە بیگەیەنێ کە ئەم دوو تاوانە وەك یەك وان لە گەورەییدا، بێداریی ئەکات لەسەر ئەوەی کە ئەم وتەیە یەکەم تاوانیان نیە، هەرکەس بتوانێ پێغەمبەران بکوژێ ئەتوانێ هەموو تاوانێکی تر بکات، ئەفەرمووێ: ﴿وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ﴾ ئاگادارین و هەرگیز لە بیرمان ناچێ و پشت گوێی ناخەین کوشتنی ئەوانە بۆ پێغەمبەرەکانیان بە ناهەق و خۆیشیان ئەیانزانێ کە ناهەقە، کە ئەوەیش ئەوپەڕی تاوان و دەست درێژییە، وە ئەوپەڕی بێشەرمی و بەربەرەکانیە لەگەڵ خواو ئایینی خوادا! بێگومان پێشووەکانیان ئەو تاوانی کوشتنەیان کرد، کەواتە دانانی بە تاوان و کردەوەی ئەم دواییانە لەبەرئەوەیە ئەمان خۆشنوودو ڕازی بوون بەو تاوانەی کە ئەوان کردیان، هەرکەس ڕازی بێت بە هەر گوناهو بێشەرعیەك کە هەرکات کرابێ و بکرێ لە هەر جێگەو شوێنێك ئەو کەسە بەشدارە لەو گوناهو تاوانەدا بەپێی ئایینی پاکی ئیسلام.

وَنَقُولُ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿١٨٢﴾

---

مێژوو باسی چەندێ لە پێغەمبەرانمان بۆ ئەکات کە جوولەکەی نەفرین لێ کراو شەهیدی کردن، دواترینی هەموویان عیسا پێغەمبەر بوو کە بە هەموو جۆر هەولی کوشتنیان داو بەلام خوا پاراستیو ڕزگاری کرد لە دەستیان، ئێستاش هەر ئەوان لافی کوشتنی ئەدەن بە شانازیەوە ـ نەفرینی خوا بباریێ بەسەریاندا ـ.

٤- ئەمەیە کەلە ڕۆژی دوایی دا لەکاتی سزادانەکەیاندا سزای دەروونیش ئەدرێن بەمەی کە ئەفەرمووێ: ﴿وَنَقُولُ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ﴾ ئەڵێن پێیان: بچەژن سزایەکی سووتێنەر،کەئەم وتەیە زۆر سەختو سامناکو کاریگەرە، ئەم وتەیە ئەوپەڕی خەشم ئەگەیەنێ لەو سزا دراوە، ئەم وتەیە بەکار ئەهێنرێ بۆ گەیاندنی نائومێدی لەڕزگاربوونو بەزەیی هاتنەوە بەو سزادراوەدا، بەکار ئەهێنرێ بۆ گەیاندنی بێنرخیو ڕیسواکردنیان، ئینجا سەر باقی ئەوە تەشەریان لێ ئەدرێ بەمەی کە گیرۆدەو کوژراوی دەستو کردەوەی خۆیانن، بەم ڕەنگە پێیان ئەوترێ: ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەوسزا سەختەی کە ئەچەژن ﴿بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ﴾ بەهۆی کردەوەی خراپی کە پێشتان خست لە جیهاندا، واتە خۆتان بە ئارەزووو دەسەلاتو خواهیشی خۆتان، وەك ئەو وتە بەدەو کوشتنی پێغەمبەران ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ﴾ ئەو سزایە بەهۆی ئەوەیە کە بێگومان خوا ستەمکار نیەو ستەم ناکات لە بەندەکانی بێگومان لەنەبوونی ستەمەوە داد پەیدا ئەبێ، دادیش داخوازە بۆ پاداشت دانەوەی چاکان بە چاکەو تۆڵە سەندن لە

تاوانباران، کەواتە نەبوونی ستەم هۆی ئەو تۆڵەو سزا سەختەیە لەو جوولەکە نەفرین لێ کراوانە، ئەو سزا سەختە ڕێكو سەرو بەرە لەگەڵ تاوانەکەیاندا، ئەوانە بەندەیەك بوون لە بەندەکانی، ئیتر چۆن وێرایانو توانیان ئەو وتە ناڕەوایە بەکار بێنن بۆ خاوەنو پەروەردگاریانو پێغەمبەرەکانی بکوژن؟!

ئەگەر وتەی ﴿بِظَلَّامٍ﴾ بۆ زیادە ڕەوی(مبالغە) نەبێ، وەك(عطار)و(تمار) کە مەبەست خاوەنی عەترو خاوەنی خورمایە، بەبێ زیادەڕەوی، هەروەها وێنەی ئەم دووانە زۆر زۆرە لەزمانی عەرەبدا، ئەگەر ئەم وتەیە بەم جۆرە مەبەست بێت، واتە خاوەن ستەم، ئەوا هیچ جێگەی قسەو باس نیەو هیچ گرێیەکی تیا نیە، بەڵام ئەگەر زیادەڕەوی مەبەست بێت ئەوا ڕووکەشەکەی گرێیە، چونکە ئەو کاتە وا ئەگەیەنێ کە خوا ستەمکارە، بەڵام زۆر ستەمکار نیە، ئاشکرایشە کە بە هیچ کلۆجێك ستەم بۆ خوا ناگونجێ، بۆ کردنەوەی ئەم گرێیە زانایان چەند شتێکیان فەرمووە پێویستە ئاماژە کردن بۆ هێندێکیان:

١- مەبەست دڵنیایی کردنە لەسەر ڕاستو ڕەوایی ئەو سزاو تۆڵەیەو ناڕەوایی و نەگونجانی یەکسان کردنی ئەو تاوانبارانە لەگەڵ چاکاندا، واتە ئەو یەکسان کردنو تۆڵە نەسەندنە شایستە نیە مەگەر لەلایەن کەسێکەوە کە زۆر ستەمکار بێت، کەواتە ئەبێ تۆڵە بسێنێو یەکسانی نەکات.

٢- مەبەست دڵنیای کردنە لەسەر ئەوەی کە هەرچەند ڕەوابێ بۆ خوا سزادانی بەندەکانی بەبێ تاوان، بەڵام هەرگیز ئەوە ناکاتو ناگونجێ بۆ خوا، دڵنیایی ئەکات لەسەر ئەوە بەوەی دەری ئەخاتو نیشانی ئەدات لە شێوەی زیادە ڕەوی لە ستەمدا.

٣- مەبەست گەیاندنی زۆر گەورەییو سەختی ئەوسزایە، بەجۆرێ ئەگەر ڕەواو شایستە نەبوایە ستەمێکی زۆر گەورە ئەبوو.

ﭐلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ عَهِدَ إِلَيۡنَآ أَلَّا نُؤۡمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأۡتِيَنَا بِقُرۡبَانٖ تَأۡكُلُهُ ٱلنَّارُۗ قُلۡ قَدۡ جَآءَكُمۡ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِي بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَبِٱلَّذِي قُلۡتُمۡ فَلِمَ قَتَلۡتُمُوهُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٨٣﴾ فَإِن كَذَّبُوكَ فَقَدۡ كُذِّبَ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِكَ جَآءُو بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُنِيرِ ﴿١٨٤﴾ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ

---

چەندوەڵامی تریش دراوەتەوە،بەڵام لام وایەئەوئەندازەیەبەسە. ئەو جوولەکانەی کە باس کران، ﴿ٱلَّذِينَ﴾ کەسانێکن کە ﴿قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ عَهِدَ إِلَيۡنَآ﴾ وتیان: بەڕاستی خوا فەرمانی پیا داوین و وەسێتی کردووە بۆمان لە تەورات دا ﴿أَلَّا نُؤۡمِنَ لِرَسُولٍ﴾ بەمەی کە بڕوا نەهێنین بە هیچ نێرراو فروستادەیەك ﴿حَتَّىٰ يَأۡتِيَنَا بِقُرۡبَانٖ تَأۡكُلُهُ ٱلنَّارُ﴾ هەتا قوربانی و خێرێکمان بۆ ئەهێنێ کە ئاگر بێتە خوارەوەو بیسووتێنێ، بەو شێوەی کە موعجیزەی هێندێ لە پێغەمبەرانی ئیسرائیلیەکان بووە، ئیتر ئەو خێرو قوربانیە لە چوارپێ و ماڵات بووبێ کە سەریان ئەبڕی، یان هەر شتێکی تر کە دایان ئەنا و ئینجا پێغەمبەرەکە نزاو داوای لە خوا ئەکردو بە فەرمانی خوا ئاگرێك ئەهاتە خوارەوەو ئەیسووتاند، واتە فەرمانی داوە پێمان کە بڕوا نەهێنین بە هیچ فروستادەیەك هەتا موعجیزەیەکی وامان نیشان نەدات، ماتووڵ محمد ئەوەمان نیشان نادا ئێمە بڕوای پێ‌ناهێنین و لەسەر فەرمان و پەیمانی خوای خۆمان ئەبین.

ئەو موعجیزەی کە باسیان ئەکرد شتێکی ڕاستەو ڕووی داوە لەلایەن هێندێ لە پێغەمبەرانی خۆیانەوە، بەڵام ئەمەیان دەلەسەۆ دەست هەڵبەست بوو کە ئەیان ووت: خوا لە تەوراتدا ئەو فەرمانەی پیا داوین. مەبەستیان هەر بڕوبیانوو بوو، ئەگینا پێغەمبەر(ﷺ) ئەو موعجیزەشی نیشان بدانایە هەر بڕوایان نەئەهێنا، ئەوەتا بڕوایان نەهێنا بەو پێغەمبەرانی خۆیانەو بەڵکو کوشتیان چ جای هێنان پێ‌یان، وەك قورئان هەر بەو جۆرە دەم کوتی کردن و بەری لێ بڕینەوەوفەرمووی: ﴿قُلۡ﴾ئەی پێغەمبەربڵێ بەوانە﴿قَدۡ جَآءَكُمۡ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِي﴾بێ‌گومان هات بۆتان چەند پێغەمبەرێك لەپێش منەوە ﴿بِٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾ بە چەند موعجیزەو ڕابەرو بەڵگە ڕوونەکانەوە ﴿وَبِٱلَّذِي قُلۡتُمۡ﴾ بە ئەو تایبەتیەی کە وتتان ــ واتە ئەو قوربانیەی کە باس کرا ــ ﴿فَلِمَ قَتَلۡتُمُوهُمۡ﴾ دەی بۆچی ئەو پێغەمبەرانەتان کوشت ﴿إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە

ڕاست ئەکەن کە ئەڵێن: هۆی بڕوا نەهێنانتان ئەوەیە، ڕاست ئەکەن وانیشان ئەدەن، ئەگەر ئەو موعجیزەیە بەدی بێت بڕوا ئەهێنن، بەڕاستی دەم کوت کردنێکی زۆر بەهێزەو ڕێی هیچ دەمبازیەکی نەهێشتن. ئینجا ڕووی فەرمووده ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) بەدڵنەوایی کردن و دڵخۆشی دانەوەی بەوەی ئەو لاریی و ناڵەبارییە هەر دەربارەی ئەو نەکراوە، بەڵکو برا پێغەمبەرەکانی عەینی شتیان دەربارەی کراوە. ئەفەرمووێ: ﴿فَإِن كَذَّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ﴾ ئەگەر ئەوانە بڕوا ناهێنن و تۆ بە درۆزن دا ئەنێن، بێگومان بڕوا نەهێنراوە بە چەند پێغەمبەرو فروستادەیەك لە پێش تۆو بەدرۆزن دانراون، کە ئەو فروستادەو پێغەمبەرانە ﴿جَآءُو بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ خاتوون بە چەند موعجیزەو بەڵگە ڕوونەکانەوە ﴿وَٱلزُّبُرِ﴾ بە چەند نامەو ڕووپەڕە کە تەمێ و پەندو ئامۆژگاریان تیا بوو لەلایەن خواوە ﴿وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ﴾ هاتن بە نامەی ڕوون یان ڕوون کەرەوە، کە بریتیە لە تەورات و ئینجیل، واتە تۆ یەکەم کەس نیت کە بڕوات پێنەهێنرابێ، کەواتە غەمبار مەبەو سەرت سووڕ نەمێنێ، چونکە ڕێگەی پێغەمبەران هەروا بووەو هەر وا هاتووە، پڕ لەدڕك و داڵ و کۆسپ و گرێ، ئەوان لەو ڕێیەدا دووچاری ئەرك و مەینەت و ماندوویی زۆر بوون!!

ئینجا ڕووی فەرمووده ئەکاتە کۆمەڵی موسڵمانان، ئاماژە ئەکات و سەرنجیان ڕائەکێشێ بۆ ئەو شتانەی کە پێویستە هەوڵی بۆ بدەن و سووربن لەسەری و فیداکاری بۆ بکەن، بۆ لابردنی دڕك و داڵ و ئێش و ئازاری ڕێگەکەیان، داوای خۆگری و خۆپارێزییان لێ ئەکات، ئەفەرمووێ: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ﴾ هەموو کەس لەم جیهاندا مردن ئەچەژێو ئەبێ بمرێ و لەو پیاڵەیە بخواتەوە کە ئەگەڕێ بەسەر هەمواندا، زۆر زۆر پێویستە جێگیر بوونی هەست بەم شتە ڕاستە لەدەروندا، ئاوا نەبوونی لەدڵ، پێویستە هەموو کەس هەمیشە ئەمەی لە یاد بێ کە ژیان لەم زەوی جیهانەدا شتێکی کاتیەو ماوەی دیاریی کراوەو ئەبێ دوایی بێت. چاك ئەمرێ و خراپ ئەمرێ، تێکۆشەر ئەمرێ و تەمەڵ و تەوەزەل ئەمرێ، ئەو کەسەی کە سەربەرزەو شانازیی بە عەقیدەو بڕواوە ئەکات ئەمرێ و ئەو کەسەی کە سەر شۆڕە بۆ بەندەیەکی وەك خۆی هەرئەمرێ. ئازاوچالاك کەسەرداناخات بۆستەم ئەمرێ،ترسنۆك کەهەر ژیانی ئەوێ وسوورەلەسەرژیان بەهەربریتی ونرخێك، ئەوانەکەکاری گرنگ ئەکەن ومەبەست و ئامانجی بەرزیان هەیە ئەمرن، وە ئەوانەی کە بێنرخ و بێسوودن و هەر ڕابواردنیان ئەوێ هەر ئەمرن، لەو مردنەدا هەموو یەکسانن، جیاوازییان لەدوا ڕۆژو چارەنووسدا هەیە،

﴿وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا مَتَاعُ الْغُرُورِ (١٨٥) لَتُبْلَوُنَّ فِي أَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا أَذًى كَثِيرًا وَإِن تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ (١٨٦)﴾

---

جیاوازن لەمەدا کە ئەفەرمووێ: ﴿وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ ئەجرو پاداشتو سەرەنجامی کردەوەکانتان ــ چ چاكو چ خراپ ــ بەتێرو تەواوی هەر لە ڕۆژی دوایی دا پێتان ئەدرێ، کەواتە هەرچی خۆشیو ناخۆشیو شادمانیو سزاو ئازارێك کە ببێ لە پێش ئەو ڕۆژی دواییەدا هەمووی هێندێکە لە ئەجرو پاداشتو سەرەنجامی کردەوە ﴿فَمَن زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ﴾ ئینجا هەرکەس لەو ڕۆژەدا ڕاکێشرێو دوور خرێتەوە لە ئاگری دۆزەخ، بخرێتە بەهەشت ئەو کەسە بەختەوەرەو ڕزگارەو ئەگات بە ئامانجی تەواوو ڕاستەقینە، ﴿وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا مَتَاعُ الْغُرُورِ﴾ ژیانو خۆشی جیهان هیچ شتێك نیە بێجگە لە خۆشیو سوود گەیەنەری کاتی خەڵەتێنەر، بەم ڕەنگە ڕووکەشو ڕواڵەتەکەی شیرینو جوانەو لەناوەوە تاڵەو قێزەون، یان وەك(ئیمامی عەلی) فەرمووی: نەرمو ناسکە لە دەستداو ژارەکەی کوشندەیە، بێگومان ئەمە بۆ کەسێکە کەباوی بدا بەسەر ژیانی ڕۆژی دوایی دا، بۆ کەسێکە کە خەریکی بکاتو ژیانی ڕۆژی دوایی لەبیر بباتەوە ئەگینا خۆشیو ژیانی ئەم جیهانە چاکەو بەهرەی خوایە، هەرکەس بەگوێرەی بەرنامەی خوا ڕەفتار بکات هەموو ژیانو خۆشیەکەی ئەم جیهانەی ئەبێ بە خوا پەرستی وپلەی ڕۆژی دوایی پێ بەرز ئەبێتەوە!!

لەم کاتەدا کە خۆشیو ژیانی ئەم جیهانە بەم شێوە ناسراو بەم چاوە قورئانیە سەرنج درا، لەم کاتەدا کە دەروونی بڕوا دار ئامادە ئەبێ بۆ خۆگرتن لەسەر بەسەرهاتی سەختو گران کە بێتە ڕێی، ئامادە ئەبێ بۆ تاقی کردنەوە بەو ڕووداوو بەسەرهاتانە، لەم کاتەدا ئەفەرمووێ: بە بڕواداران: ﴿لَتُبْلَوُنَّ فِي أَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ﴾ سوێند بە خوا دووچار

ئەكرێن و تاقی ئەكرێنەوە لەبارەی سامان و داراییەكانتانەوە، بە هەر شتێ كە هۆی كەم و كوڕی و زیان و نەمانیان بێ، لەبارەی خۆتانەوە بە ئێش و ئازارو زیان و نەمان ﴿وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ سوێند بە خوا ئەبیستن لەوانەی كە نامەیان پێدراوە لەپێش ئێوە ـ واتە جوولەكەو گاورەكان ـ ﴿وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا﴾ لەوانەی كە هاوبەشیان بۆ خوا داناوە، وەبیستن لەوانە ﴿أَذًى كَثِيرًا﴾ ئازارو ئەزیەتی زۆر، واتە وتەو وتاری زۆر كە ئەزیەت ئەگەیەنێ پێتان، ﴿وَإِن تَصْبِرُوا﴾ ئەگەر ئێوە خۆتان بگرن لەسەر ئەو زیان و ئازارو نارەحەتیانە ﴿وَتَتَّقُوا﴾ خۆتان بپارێزن لەهۆی خەشم و نارەزایی خوا، بە گوێڕایەڵی فەرمانەكانی و دوور كەوتنەوە لە قەدەغەكانی ﴿فَإِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ﴾ بێگومان ئەو خۆگری و خۆپارێزییە لەو كارانەیە كە شایستەیە هەموو كەس نیازیان بكەن و بەدوایاندا بگەڕێن، یان لەو كارانەن كە خوا پێویستی كردوون لەسەر بەندەكانی، بێگومان باوو ڕەوشت و ڕێگەی ئایین و بانگ و بانگەوازەكانی خوا هەر بەو جۆرە پڕ لە دەردو ئەشكەنجەو زیان و سزاو ئازار بووە هەر بەو جۆرەش ئەبێ، چونكە ڕێگەكە ڕێگەی بەهەشتە كە پەرژین كراوە بەو شتانەی كە نەفس ئارەزوویان ئەكات. ئینجا هەر ئەوەش تاقانە ڕێیە، بۆ پێك هێنان و پەروەردەكردنی كۆمەڵێك كە بتوانێ ئەو ئاڵای خوا بەرز بكاتەوە، ئەو ئەركە گەورەیە بخاتە سەرشان، ئەوەش بەو جۆرە ئەبێ تا ئەو ئاڵا هەڵگرانە پاك و خاوێن و پاڵفتەبێن و لە هەموو تاقی كردنەوە یەك دەرچن، ئەو كاتە شایستە ئەبن كە بكرێن بە ئەمیندار بەسەر گەورەترین سپاردەدا. ئەبێ ئەو هەموو تاڵی و سوێرییە بچەژن تا بەهیچ ڕەنگ و بە هیچ هێزێك دەست بەرداری ئەو سپاردەو دەست كەوتەیان نەبن، چونكە هەر شتێك بە ئەرك و مەینەت و فیداكاری دەست كەوت ببێ هەرگیز وازی لێ ناهێنرێ و دەستی لێ هەڵناگیرێ، هەركەسێك بەو ئەرك و مەینەت و پاڵفتەكردنە پێبگات بەهێزو دامەزراو چارنەكراو ئەبێ و ئامادە ئەبێ بۆ بەربەست و بەرهەڵستی هەموو دژو ڕێگرێك. پێویستە ئەو هەموو نارەحەتی و

بارەگرانە هەڵگرن تا خاوەنانی ئەو بانگەوازە خۆیان بەچاکی بناسن، بەباشی ئاشناو زانا بن بەدڵ و دەروونی تێبگەن لەو شتانەی کەلە دەروونندا هەن، تێبگەن کە چۆن و لە چ ڕێگەیەکەوە دوژمن ئەتوانێ ڕێیان لێ بگرێ و بیروباوەڕەکەیان لێ وەرگرێ، هەروەها زاناو ئاگادار بن بەو کون و کەلەبەرانەی کە شەیتان پێیاندا دێت بۆ ناو دڵ و دەروون، بزانن بە شوێنێ هەڵخلیسکان و لادان لە ڕێگە ڕاستەکەیان، بەهۆی چیەوە گومڕاو سەرگەردان ئەبن! پێویستە چەشتنی ئەو هەموو سزاو ناڕەحەتیەو هەڵگرتنی ئەو بارە گرانانە، تا دژو دوژمنەکان بیرێك بکەنەوەو تێبگەن کە بەرگە گرتن و خۆگریی ئەم بڕوا دارانە لە خۆڕایی نیەو ئەبێ ئەو ئاین و بیروباوەڕەی ئەوانە زۆر گرنگ و بەنرخ بێت و شایستەو شایانی ئەو فیداکاریە بێت، ئەو کاتە لەوانەیە زۆر لەو دژو دوژمنانە وەرگەڕێن بە دۆست و بڕوادارو بێنە ریزی فیداکاران! پێویستە لەسەر بانگ کەرانی ڕێگەی خوا بەو جۆرە خۆگرو دامەزراوو لە خواترس و خۆپارێزبن، ئەگەر بەو جۆرە بن لەڵێنی خوا بۆیان مسۆگەرە، کۆمەڵی یەکەمجاری ئەم ئوممەتە تێپەڕیان کرد بە هەموو قۆناغە سەختەکانداو هەموو گرێ و کۆسپەکانی ڕێگەکەیان تەخت کرد، تا بەو جۆرە سەرکەوتوو و سەربەرزی هەردوو جیهان بوون، با بزانرێ کە تا ڕۆژی دوایی هەر گەل و کۆمەڵێك ڕێبازی ئەوان بداتە بەر خوا بەوێنەی ئەوانیان لەگەڵ ئەکات، هەروەها با بزانرێ کەلە هەموو چەرخێکدا ڕێی ئەم بانگ و بانگەوازە هەر ئاوا سەخت و پڕ لەئەرکە، ڕێبوارانی ئەو ڕێگەیە ئەبن بە نیشانە بۆ هەموو تیرو پیلانەکانی دوژمن و هەموو سزاو ئازارێکیان ئاڕاستە ئەکرێ، ئەبێ تاقی بکرێنەوە بە ماڵ و بەگیان و هەموو قسەیەکی ناخۆش و جەرگ بڕبیستن لەلایەن دوژمنەوە، چارەسەر بۆ هەموو ئەوانە هەر ئەم تەمێ و ئامۆژگاریەیە کە ئاڕاستەی یەکەم چینی ئەم ئوممەتەکرا، کەواتە ئەبێ بانگ کەرانی ڕێگەی خوا دڵئارام و کەیف خۆش و موژدە بەخش بن بە هەر سزاو ناخۆشیەك کە دێتە ڕێیان، چونکە ئەزانن کە بەڕاستی بوون بە ڕێبواری ئەو ڕێگە پیرۆزە.

وَإِذۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكۡتُمُونَهُۥ فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمۡ وَٱشۡتَرَوۡاْ بِهِۦ ثَمَنٗا قَلِيلٗاۖ فَبِئۡسَ مَا يَشۡتَرُونَ ﴿١٨٧﴾ لَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡرَحُونَ بِمَآ أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحۡمَدُواْ بِمَا لَمۡ يَفۡعَلُواْ فَلَا تَحۡسَبَنَّهُم بِمَفَازَةٖ مِّنَ ٱلۡعَذَابِۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٨٨﴾ وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿١٨٩﴾

---

**ئینجا کۆتایی باسەکە ئەهێنێ بەهەڵوێستی بەدو خراپی نامەدارەکان سەبارەت بەو بەڵێنو پەیمانەی کە خوا لێی وەرگرتن، ئەفەرمووێ: ﴿وَإِذۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ باسی ئەو کاتە بکە کە خوا پەیمانی بەتینی ئەوانەی وەرگرت کە نامەیان پێ بەخشرابوو ـ واتە زاناکانی ئیسرائیلیەکان ـ بەم جۆرو شێوەیە: ﴿لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ﴾ سوێند بە خوا ئەو نامەیە بە ڕوونی باس ئەکەن بۆ مەردومان ﴿وَلَا تَكۡتُمُونَهُۥ﴾ نایشارنەوە لێیان، واتە پەیمانی لێ وەرگرتن کە هەموو هەواڵو بڕیارەکانی ئاشکرا بکەن، کە هێندێ لەوانە باسو بڕیاری پێغەمبەرێتی محمد(ﷺ).**

**ئەم سورەتە زۆر لەکردارو وتاری ناڕاستو ناڕەوای ئەو نامەدارانە بەتایبەتی جوولەکەی باس کرد، لەلای سەرووی ئەو کردارو وتارانە ئەو هەقو ڕاستیانە بوون کە زاناو ئاگادار بوون پێیانو شاردنیانەوە، بۆ سەر تێك دانو چەواشەکردنی مەردوم، ئەوانە تەوراتیان لەبەر دەست دا بوو بەهۆی ئەوەوە ئەیانزانی ئەمەی کە پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی ڕاستەو لەو سەرچاوەیەوە هاتووە کە تەوراتی لێ هاتووە. جالێرەدا بە تەواوی هەڵوێستەکەیان بەدو ناشیرین تر ئەکات کە ئەو پەیمانەشیان ئاشکرا ئەکات، کەواتە ئەبوایە ئەو ناپەسەندانە لە خوا بترسانایە، وە ئەو پەیمانەیان نەشکاندایە ﴿فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمۡ﴾ کەچی ئەو پەیمانەیان فڕێ دایە پشتی خۆیان، واتە بەهیچ ڕەنگ گوێیان پێ نەداو بە تەواوی ڕوویان لێ وەرگێڕا، هۆی ئەو کردەوە پیسەیشیان ئەمە بوو کە ئەفەرمووێ: ﴿وَٱشۡتَرَوۡاْ بِهِۦ ثَمَنٗا قَلِيلٗاۖ﴾**

بەو نامەیە کڕییان شتێکی کەم لە جیفەی دنیاو مەبەستێ لە مەبەستەکانی ئەم زەوی‌و جیهانە کە هەر ماوەیەکەو ئیتر ئەڕۆن‌و نامێنن، کەواتە هەرچەند بە زۆرو ماوە درێژ سەیر بکرێن‌و دابنرێن، لە ڕاستی دا هەر کەم‌و کەم نرخن ﴿فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ﴾ کەواتە شتێکی خراپیان کڕی! بێگومان ئەوانە هەموو نامەکەیان نەئەشاردەوە، بەڵکو هەر ئەوەیان ئەشاردەوە کە دژی بەرژەوەندی‌و مەبەستی خۆیان بووبێ، بەڵام ئاینێ‌و نامەی خوا دەست نادەن بۆ دابەش کردن، بڕوا بە هەر شتێکی نەبوو یان دەسکاری هەر یەشێکی بکرێ، یان هەر بەشێکی بشاردرێتەوە، وەك بڕوا بە هەمووی نەبێ‌و دەسکاری هەمووی کرابێ‌و هەموو شاردرابێتەوە وایە.

ئەم ئایەتە هەرچەند لە زانایانی گاورو جوولەکەدا هاتووەتە خوارەوە، بەڵام ئاشکرایە کە بۆ زانایانی موسڵمانیشە، کەواتە ئەبێ ئەمانیش بە ڕوون‌و ڕەوانی‌و بەبێ شاردەنەوەو پێچ‌و پەنا هەمووی باس بکەن‌و دەری بخەن بۆ هەمووان، بڕوادارو بێبڕوا بە پێی توانا، ئیتر داوایان لێ بکرێ یان نا؟ پرسیاریان لێ بکرێ یان نا؟ لەبەر هەر مەبەستێ لە مەبەستە بێنرخەکانی ئەم جیهانە واز بێنن لەو ڕوون کردنەوەو دەرخستنە، بێگومان ئەمانیش بەری ئەو هەڕەشانە ئەکەون کە کران لەزانایانی جوولەکەو گاور! ئینجا باسی حاڵەتێکی تری هێندێ لە نامەدارەکان ئەکات کە قورئان هەڕەشەیەکی سامناك ئاڕاستەیان ئەکات لەسەر ئەو حاڵەت‌و کردەوەیانە، ئەفەرمووێ: ﴿لَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَوا﴾ گومان مەبەو وا دامەنێ ئەوانەی کە شادمانن‌و کەشخە ئەکەن بەوەی کردیان ﴿وَيُحِبُّونَ أَنْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا﴾ پێیان خۆشە وەسف‌و سوپاس بکرێن بە شتێك کە نەیان کردووە﴿فَلَا تَحْسَبَنَّهُمْ بِمَفَازَةٍ مِنَ الْعَذَابِ﴾ گومان مەبەو ئەوانە دامەنێ بە ڕزگار لەسزای ڕۆژی دوایی، یان دایان مەنێ بەمەی لە شوێنێکدان کە ڕزگار ئەبن تیای دا لەسزا ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ بۆیان هەیە سزایەکی ئازار دەری گەورەی هەمیشەیی.

له پێشەوە دەست نیشانی کرد کە ڕزگار نابن لەسزا. ئیتر بەبێ ئەوەی بڕیاری لەسەر دەرکات و چۆنێتی دیاریی بکات، بەڵام لێرەدا هەواڵی دا بە دووچار بوونیان بەسزا کە ئەوە بڕیاری تەواو ئەگەیەنێ، جۆرەکەیشی دیاریی کرد کە سزایەکی سەخت و ئازار دەرەو هەمیشەییە، بێجگە لەوەیش هەڵئەگرێ مەبەست بەسزای پێشوو سزای ئەم جیهانە بێت کە سزای ڕیسوایی و بێئابڕوییانەو دووچاری ئەبن پێش سزای دواییان کە لێرەدا هەواڵی پێدا، لەسەر هەر بار ئەم هەواڵ و بڕیارە جوان و بەجێیە، بەپێی چەند ڕیوایەتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لە جوولەکەدا، یەکێ لەو ڕیوایەتانە ئەوەیە کەلە(بوخاری)دا هاتووە لە(ئیبنِ و عەباس)ەوە -خوای لێ ڕازی بێت- کە ئەفەرمووێ: پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری شتێکی کرد لە جوولەکە، ئینجا ئەوانیش ئەوەی کە ڕاست بوو شاردیانەوە لێی و هەواڵیان پێدا بە شتێکی ترو وایان نیشاندا کە هەواڵیان پێداوە بەوەی کە پرسیاری لێ کردووە، ویستیان بکات بەوە، ئینجا ئەوانە کەیف خۆش بوون و کەشخەیان ئەکرد بەو کردەوە ناڕەوای خۆیانە. بەپێی ڕیوایەتێکی تری(بوخاری) لە(ئەبو سەعیدی خدری)یەوە، هاتووەتە خوارەوە دەربارەی چەند کەسێك لە ناپاکان کە خۆیان ئەدزیەوە لە دەرچوون بۆ غەزا لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) و بەوە کەیف خۆش و شادمان ئەبوون، کاتێ کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەڕایەوە ئەچوونە خزمەتی و عوزرو بەهانەیان ئەهێنایەوەو سوێندیان بۆ ئەخوارد، پێیان خۆش بوو سوپاس کرێن بەوەی کە نەیانکردووە.

هەر کام لەم دوو بارە ئەگونجێ و لەسەر هەرکام ئەم ئایەتە پەیوەستی هەیە بە ئایەتەکانی تری سورەتەکەوە، مەبەست لە شێوەی گشتی سورەتەکە، چونکە لەم سورەتەدا باسی کردارو ڕەوشتی پیس و پیلانی بەدی جوولەکە زۆر کراوە، هەروەها لەبارەی ناپاکەکانەوە، هەردووبار ـ وەك وتمان ـ دەست ئەدەن، بەڵام لەسەر ئەوەی چەند ڕیوایەتێك هاتووە قۆڵگیری یەکەمە، لەسەرەتاوە ووتم: ئەم ئایەتە باسی حاڵەتێکی تری نامەدارەکان ئەکات، ئینجا بەهەر حاڵ و لەسەر هەر بار کەشخەو شانازی ئەوانە بەبێ بڕوایی و کرداری

بەدو ناپاکیان لەگەڵ خواو پێغەمبەری خواو بڕواداران دا، کەشخەو شانازیان بە شتێ کە مایەی قاری بەتین‌و خەشمی خوایە، ئەو کەشخەو شانازیە هۆی ئەم هەڕەشە گەورەیە بوو کە تێپەڕی کرد لەلایەن کەسێکەوە کە خاوەن‌و کاربەدەست‌و پادشای ئاسمانەکان‌و زەویەو توانا و دەسەڵات دارە بەسەر هەموو شتێکدا، کەواتە ڕزگار بوون‌و ڕاکردن نیە لێی، وەك دەست نیشانی کرد بۆئەوەی کەلە پاش هەڕەشەکە فەرمووی: ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ هەر بۆ خوایە پادشایەتی‌و هاوەنداریی ئاسمانەکان‌و زەوی ﴿وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ ئەو خوایە بەسەر هەموو شێکدا توانا و دەسەڵات دارە.

پێخۆش بوون‌و کەشخە کردن بە گوناهو تاوانەوە بەو جۆرەیە کە باس کرا، بەڵام پێخۆش بوون‌و شانازی کردن بەبڕواو گوێڕایەڵی خواو غەمبار بوون بە گوناهو بێشەرعی نیشانەی هێزو ڕاستیە لە بڕوادا، بەڵام بە مەرجێ لە خۆی نەگۆڕێ‌و کەشخە نەکات بە ملی مەردومدا، وە ڕووپامایی نەکات بە دەربڕینی ئەو پێخۆش بوون‌و غەمباریە، ئینجا کۆتایی سورەتەکە ئەهێنێ بە چەند ئایەتێك کە زۆر ڕێك‌و پەیوەستە لەگەڵ مەبەست‌و ئامانجی سورەتەکەدا، وەك بۆمان دەرئەکەوێ لەکاتی تەفسیری ئایەتەکاندا، لە یەکەمجارەوە سەرنجی ژیریی‌و دڵ ڕائەکێشێ بۆ وورد بوونەوەو بیرکردنەوە لەم بوونەوەرە پان‌و پۆڕە کە نامەیەکی کراوەی خوایە بە هەمیشەیی، لەگەڵ هەموو خاوەن زمانێك ئەدوێ‌و ئەوەی تیا نووسراوە هەموو ژیرێك ئەیخوێنێتەوە، کە هەمووی ڕابەرو نیشانەو بەڵگەیەکی ئاشکران لەسەر ئەو دەستە قودرەتە کار دروستی کە ئەم بوونەوەرەی داهێناوەو کاروباری ئەبات بەڕێوە، لەسەر ئەوەی کەلە خۆڕایی‌و بەگزاف دروست نەکراوە، بەڵکو مەبەستێکی زۆر گرنگ هەیە لەدروست کردنەکانیاندا، هەروەها ڕابەرو بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە بوون‌و ژیان لەم جیهانەدا هەمیشەیی‌و نەبڕاوە نیە، بەڵکو لەپاش ئەم جیهانێکی تری نەبڕاوە هەیە کە ببێتە جێی بوون‌و ژیانێکی تری نەبڕاوە، بەڵام ئەم ڕابەرو بەڵگەر نیشانانە کەسانێك وەری ئەگرن‌و تێی ئەگەن کەخاوەنی ژیرییەکی تێرو تەواون،

إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ

**ئەفەرمووێ:** ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ بەڕاستی لە دروست کردن و داڕشتنی ئاسمانەکان و زەوی دا لەسەر ئەم بارو شێوە زۆر گرنگە ﴿ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ ﴾ لە گۆڕانی شەوو ڕۆژو بە دواهاتنیان بۆ یەکترو جیاوازیان، چەند ڕابەرو نیشانەی ڕوون هەیە لەسەر تاک و تەنیایی خواو ڕێکی و بەجێی هەموو کارو کردەوەکانی، بێگومان ئەگەر ببوایە یەکێك بەم فام و هەست و هۆشەوە کە هەیە، لە یەکەمجارەوە بهاتایەتە ئەم جیهانە، چاوی هەڵتەقایە بەم چەشمەندازو شێوە شیرین و دڵڕفێنەی کە خوا دای ڕشتووە لەم زەوی و ئاسمانەدا، ئەو کەسە سەرسام و چوار چاو ئەبوو ئەکەوتە دڵە لەرزە تا ڕادەیەك لەوانە بوو ژیریی نەمێنێ و شێت ببێ. بەڵام ئێمە بەبێ فام و هۆش و ژیرییەوە ئەکەوینە ئەم جیهانەوە، بەرەبەرە ئەم شتە نایانە ئەکەونە بەرچاوو ژیریی مان و دەقی پێوە ئەگرین، بەهۆی ئەوانە سەرسام نابین و ئاوامان بەسەر نایەت و بێئاگا ئەبین و ئەم هەموو بەڵگەو ڕابەرە ڕوونانە فەرامۆش ئەکەین، جالەبەرئەوە قورئان ناو بەناو دڵمان دائەچڵەکێنێ و سەرنجمان ڕائەکێشێ تا بێینەوە هۆش و بێدار بینەوەو سوود وەرگرین لەو ڕابەرو بەڵگەیانە، بێجگە لەوە ـــ هەر چەند ئەم ڕابەرو بەڵگە ئاشکرایانە بەسن بۆ هەر کەسێك کە چاوی دڵی بینا بێت ـ خوای میهرەبان کارێکی وای کرد کە هیچ کەس بڕوبیانووی نەمێنێ، ئەوە هەمیشە بەڵگەو ڕابەری تەڕو تازەی دەق پێوەنەگیراوو ئامادەو لەبەر دەستدا بێت، ئەوەتا لەڕێگەی زانیاریی تازەوە بەرەبەرەو ڕۆژ بە ڕۆژ بەڵگەو ڕابەرە نهێنییەکان دەرئەخات بۆ بەندەکانی، وەك بەڵێنی بەوەدا بەئایەتی(٥٣) لە سورەتی ﴿فصلت﴾: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلْءَافَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾ بێگومان نیشانیان ئەدەین ڕابەرو نیشانە ڕوونەکانی خۆمان لە ئاسۆو ناوچەکاندا، لە نەفسی خۆیشیاندا هەتا بۆیان دەرکەوێ کە هەر خوا یان قورئان هەق و ڕاستە.[1]

[1] ئەو سورەت و ئایەتەم تەفسیر کرد لە پێش تەفسیری ئێرە، لەوێ دەست نیشانم کرد بۆ هێندێ لەو بەڵگەو ڕابەرانە کە خوا نیشانی بەندەکانی دا، کەواتە با تەماشای ئەوێ بکرێ و لێرە پێویست نیە هیچ بڵێم.

له میهرەبانی خوا بە زیاد بێت کارێکی وای کرد، بەرە بەرە هەوری ڕەش و تاریکی بێبڕوایی و(مادديەتی) ـ کە پیس ترین و بۆگەن ترین بیروباوەڕ بوو لەکاتی بێئاگاییدا هاتە جیهان و بوو بەکوشندەترین دەرد بۆ مرۆڤایەتی ـ خوا کارێکی وای کرد ئەو باوەڕە ڕەشە خەریکە بە تەواوی بکشێتەوە لە جیهانداو نەمێنێ، بەتایبەتی لەو کاتەوە کە گەشتە ئاسمانیەکان دەستی پێکرد کەلەو گەشتانەدا هیچ ڕێگایەك نامێنێ بۆ ئەو باوەڕە، جالەبەرئەوە کە تائێستا دوو کەشتیەوانی پەروەردەی وڵاتی بێبڕوا بەرز بوونەوە ـ هەر چەند نەگەیشتنە مانگ و گەشتەکەیان زۆر ناتەواو تر بوو ـ ئەو دووانە هاتنەوەو گەڕانەوە بەبڕوا هێنان بە داهێنەری ئەم ئاسمان و جیهانە!! یەکەمیان(گاگارین) کەلە ساڵی ١٩٦٢ دا هەڵسا بەو کارە گرنگەو یەکەم کەس بوو، دووەم:(شاتالۆڤ) کەلە ساڵی ١٩٧٧ دا ڕۆیشت و بەڵێ بەڕاستی بەڵگەوڕابەری زۆر هەیە لە داهێنان و داڕشتنی ئەم زەوی و ئاسمانانەو هاتنی شەو و ڕۆژ بەدوای یەکتردا، بەڵام ئەوڕابەروبەڵگەیان سوودی هەربۆئەوانەهەیەکەخاوەنی ژیریی پاك وخاوێنن،لەبەرئەوەفەرمووی:﴿لَأٓيَٰتٖ﴾ئەوبەڵگەونیشانانەیان تیایە﴿لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ بۆ خاوەن ژیریە پاك و خاوێنەکان، ئەوانەی کە ئەو ژیرییەیان نیەو ئەو ڕابەرو بەڵگانە نابینن، بە وێنەی کەسێکی کوێر کە هەست بە خۆر ناکات با هەمیشە بە بەر خۆرەوەبێت.

له هەموو شت سەیر تر ئەوەیە کە بەڵگەو ڕابەرەکانی قورئان ئاشکراو ڕوون و ڕەوان و وان بەبەرچاوەوەو بۆ هەموو کەسێك دەست ئەدەن! ئەو کەسەی کە نەخێندەوار بێت و دوور بێت لە زانین و زانیاری ئەم دیمەن و شێوە شیرینەی کە خوا دای ڕشتووە لەم بوونەوەردا یەم ڕێك و پێکی و ڕژێمە تێرو تەواوەوە، بۆ ئەو جۆرە کەسانە تەنها ئەمەی بەسە ئەگەر چاوی دڵ و ژیرییەکەیان بە تەواوی کوێرو نابینا نەبێت، وە ئەو کەسانەش کە خوێندەوارو زانان، هەتا پادەو پلەیان بەرزو فراوان تر بێت بەڵگەو ڕابەری بەهێزتری لێ وەرئەگرن! ئینجا ناونیشانی ئەو خاوەن ژیریيانەمان بۆ باس ئەکات، ئەفەرمووێ: ﴿ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ﴾ کەسانێکن کە باس و یادی خوا ئەکەن بە پێوەو بەدانیشتنەوەو بە ڕاکشان و کەوتن بەسەر تەنیشتیاندا، ئەگەر مەبەست باس و یادی خوا بێت بە نوێژ کردن، وەك لە ڕیوایەت و فەرموودەی هەندێك لە هاوەڵان و زانایانەوە دەرئەکەوێ، ئەو کاتە دەست نیشانە بۆئەوەی کە ئەبێ بە پێی توانا بێت، ئەگەر باس و یادی خوا بێت بە شێوەی گشتی، ئەو کاتە مەبەست ئەوەیە کە بە شێوەی گشتی و لە زۆربەی کات و حاڵەتیاندا بێئاگا نین لە خوا. ﴿وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ بیر ئەکەنەوە لە دروست کردن وداڕشتنی

ئاسمانەکان‌وزەوی لەسەر ئەم بارو شێوەیە کە هەر ئەمە شیاوو گوناجوە بۆ ژیان، لە هەموو باروڕوویەکەوەتێروتەواوەوەدەست نادابۆگۆڕین‌و دەست تێ خستن، بێگومان بیرکردنەوە لەم نامەی بوونەوەرە نایابە سەرسوڕهێنەرە، وە بەچاوی دڵ سەرنج دانی ئەو دەستە قودرەتەی کە ڕاگیری کردووەو هەمیشە ئەی بزوێنێ‌و لاپەڕەکانی ئەم دیوو ئەو دیو پێ‌ئەکات.

ئەو بیرکردنەوەیە بە شێکە لە ناوەڕۆکی خواپەرستی، وە بەشێکە لە ناوەڕۆکی یادی خوا، ئەم بیرکردنەوەیە هۆی لابردنی هەموو تەم‌و تاریکیەکە بەسەر دڵ‌و دەروونەوە، مایەی جێگیربوونی گەورەیی خوایە لەدڵی بەندەکانی دا، زاخاودەرو تەڕو تازە کەرەوەی بڕوای بڕوادارانە، کەواتە مافی خۆیەتی کە ئەوەندە بە گرنگ گیراوە لە ئیسلام دا، ئەوەتا لە چەند شوێن لە قورئان دا ئاماژەی بۆ کراوەو نەنگ‌و ڕەخنەو هەڕەشەی سەخت ئاڕاستەی ئەو کەسانە کراوە کە بیرناکەنەوە، هەروەها لەو هەموو حەدیسانەی ڕیوایەت کراون کە ئەوەندە زۆرن بە ئاسانی نایەنە ژمارەو باس. بۆ نموونە ئەم حەدیسە ئەهێنین کە(ئیبن‌و حەبان‌و ئیبن‌و عساکر)و چەند کەسێکی تر ئەیهێنن لە(عطا)وە کە ئەفەرمووێ: ووتم بە(عائیشە) – خوای لێ ڕازی بێت– هەواڵم بدەرێ بە نایابترین شتێك کە دیوتە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەویش فەرمووی: جا چونکە کردەوەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) نایاب نەبووە؟ شەوێك هات بۆلام‌و فەرمووی: لێم گەڕێ با خوای خۆم بپەرستم. ئینجا هەستاو دەست نوێژی گرت‌و ئینجا نوێژی کردو گریا فرمێسك هاتە خوارەوە بۆ سەر سنگی، ئینجا چوو بە ڕکوعداو گریاو سەری بەرزکردەوەو هەر گریا، ئینجا چوو بە سوژدەدا هەر گریا، ئینجا سەری بەرز کردەوە هەر گریا، هەر بەو جۆرە بەردەوام بوو هەتا بیلال هات‌و هەواڵی دایە بە نوێژ. ئەفەرمووێ: منیش ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا لەبەرچی ئەگریت لەکاتێکدا کە خوا لێت خۆش بووە لەهینی لەوەر پێش‌و بە هینی لەمەو پاش. ئەویش فەرمووی: دەی با بەندەیەکی سوپاس کاربم. من چۆن بەو جۆرە نەکەم لەکاتێکدا ئەم شەو ئەم دوو ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ .....وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾ ئینجا فەرمووی: وەیل بۆ کەسێك کە ئەیخوێنێ‌و بیری لێ ناکاتەوە.(ئیمامی عەلی) –خوای لێ ڕازی بێت– ئەفەرمووێ: پێغەمبەر(ﷺ) شەو کە هەڵئەسا بۆ شەو نوێژ سیواکی ئەکردو ئینجا سەرنجی ئاسمانی ئەداو ئەم ئایەتەی ئەخوێند. لەبەر داهێنانی ئەم بیرکردنەوەو جووت کردنی لەگەڵ باس‌و یادی خوادا دوو شتی گرنگ وەرئەگیرێ:

١- ئەو هەموو زانا بوونەوەریانەی کە باسی داڕشتنی ئەم بوونەوەرەیان کردو بە دوای هێزو وزە نهێنیی و شاراوەکانیاندا گەڕان، تا ئاشنا بوون بە زۆر شتو بەرو بوومیان وەرگیراو مەردومیان پێ بەهرەمەندبوو، ئەگەر ئەوانە زانین و زانیاریەکەیان پەیوەست بوایە بە پەروەردگاری ئەم بوونەوەرەو لەگەڵ باس و یادی ئەودا بوایە، لەگەڵ هەست کردن بوایە بە گەورەیی و دەسەڵات و میهرەبانی ئەو، ئەگەر بەو جۆرە بوونایە زانین و زانیاریی و خەریك بوونەکەیان ئەبوو بە خواناسی و خواپەرستیەکی پاك و خاوێن، بەهۆی ئەوەوە ژیان ئەکەوتە سەر ڕێبازی ڕاستەقینەی خۆی، کامەرانی و بەختەوەریی ڕووی زەوی داگیر ئەکرد. بەڵام زۆر بەداخەوە بێبڕوایی ماددیەتی بوو بەهۆی بەرهەڵستو بەربەستو نەیهێشت ئەو پەیوەستیە ببێ، بەهۆی ئەوەوە زانین و زانیاریەکە بەهرەو بەخشینێکی شیرینە لەلایەن خواوە بە تەوقی لەعنەتو چووە گەردنی مرۆڤو مرۆڤایەتی، جیهانی لەسەر تەنگو تاریك کردن و ژیانێکی دانەمەزراوی بێئارامیی کرد بە بەریاندا، بەجۆرێ مەردومانی بێبەش کرد لە ڕابواردن و نۆش کردنی ئەو هەموو خێرو خۆشیە!

٢- ئەو ڕابەرو بەڵگە ڕوونانەی کە پەروەردگار لەم بوونەوەرەدا داینـاون، لەسەر بارە ڕاستەقینەکەی خۆیان هەر بۆ ئەوانە دەرئەکەون کە بە هەمیشەی و بە شێوەی گشتی باس و یادی خوا ئەکەن و بیر ئەکەنەوە لەو دروست کردن و داڕشتنە سەرسوڕهێنەرە.

هەر ئەوانە بەباشی تێیەگەن لە کاردروستیەکەی خواو لەو شتە نیهێنیانەو لەو حەقیقەتە گەورە گەورانەی کەلە دروست کردنی ئەم بوونەوەرەدا هەن، وە هەر ئەوانەن کە لەپاش ئەو تێگەیشتنە مل کەچ ئەکەن بۆ پەروەردگارو خۆیان ئەبەستنەوە بە بەرنامەی خواوە کە هەر تەنیا ئەو بەرنامەیە دەست گرو گەیەنەری مەردومانە بۆ ڕزگاریی و بەختەوەریی و خێرو خۆشی هەردوو جیهان. بەڵام ئەوانەی کە بەستراون بە ڕووکەش و دیمەنی ئەم ژیانی جسهانەوەو هەر خەریکی ئەوەن، بە هەوڵ و تێکۆشان ڕێیان بردووە لە هێندێ نهێنیی و هێزەکانی بوونەوەر ـ بەبێ پەیوەندیی و پەیوەستی بە خواو بە بەرنامەی خوا ـ ئەوانە بەو ڕێ بردن و دەست کەوتەیان خۆیشیان و ژیانیشیان بەریاد کردو لە ڕەگ و ڕیشە هێنا، ژیانیان گێڕا بەم ژیانە تەنگ و تاریك و پڕ لە ستەم و ناڕەوایی و بێئارامیەی کە بەچاو ئەیبینین. ئینجا لە دوا ڕۆژیشدا خۆیان ئەخەنە بەر خەشم و سزای نەبڕاوە خوا!!

رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾

---

ئەوانەی کە دەمو دڵیان خەریکە بە باس و یادی خواوە، لەسەر ئەو بارە بیرئەکەنەوە لەزەوی و ئاسمانەکانی خوا، ئەوانە تێئەگەن کە خوا لە خۆڕایی و بێهودە ئەمەی دروست نەکردووە، بەڵکو کاری گەورەو مەبەستی گرنگ هەیە لەو دروست کردن و داڕشتنەدا، ئەوانە خوای خۆیان ئەناسن و ئەزانن کە کاری بێنرخ و بێهودە بەهیچ ڕەنگ ناگونجێ بۆ خواو شایستەی ئەو نیە، کەواتە بە هەموو بڕواو دڵنیاییەکەوە ئەڵێن: ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا﴾ ئەی پەروەردگارمان ئەم دروست کراوە گرنگەت دروست نەکردووە کە بە تاڵ و لە خۆڕایی و بێ هودە بێت ﴿سُبْحَٰنَكَ﴾ پاکی بۆ تۆو ئێمە بە پاك ڕائەگرین لەدڵ و لەزانین و لە ژێریماندا لە هەر شتێك کە شایستەو شیاو نەبێ بۆت.

ئەوانە بەو بیرکردنەوە بۆیان دەرئەکەوێ کە ژیان نابێ هەر ئەم ماوە کەم و کورتە بێت، بەڵکو دادو میهرەبانی و کاردروستی خوا داخوازن بۆئەوەی ئەم بەهرەو چاکەی بوون و ژیان دوایی نەیەت و بێسەرو شوێن نەڕوا، ئەم ژیان و جیهانە بۆ ئەوە هاتووە کەببێ بە پێشڕەو بۆ ژیان و جیهانێکی تازەی نەبڕاوە کە هەرکەس بگات تیای دا بە بەرهەم و سەرەنجامی کردەوەی ئەم جیهانەی کە جێگەی کردەوەو تاقی کردنەوەیە، جالەبەرئەوە مەترسی ئەکەن لە دووچار بوونی تۆڵەو سەرەنجامی کردەوەی بەدی ئەم جیهانە، ئەم نزاو لاڵەیانە ئەکەن و ئەڵێن: ﴿فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾ کەواتە بمانپارێزە لە سزای ئاگر، بەم ڕەنگە یارمەتیمان بدە بۆ کردەوەی چاك و خۆپارێزی لە کردەوەی خراپ. ﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ﴾ ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی هەرکەسێك تۆ بیخەیتە ئاگر، بێگومان ئەو کەسە ڕیسواو سەر شۆڕو بێئابرووی ئەکەیت لە ئەوپەڕی ڕادە. ﴿وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ﴾ نیە بۆ ئەو ستەمکارانە هیچ کۆمەك و یارمەتی دەرێك.

رَبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعۡنَا مُنَادِيٗا يُنَادِي لِلۡإِيمَٰنِ أَنۡ ءَامِنُواْ بِرَبِّكُمۡ فَـَٔامَنَّاۚ رَبَّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرۡ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلۡأَبۡرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخۡزِنَا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ إِنَّكَ لَا تُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾ فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ

---

**بەڕاستی ئەو ڕیسوایی و بێئابڕوویی و داماوی بەبێ کەس و بەبێ یارمەتی دەر بگارە ئەدا لەسزای ئاگرەکەو ئێجگاری بارەکە گران تر ئەکات، خوا پەنامان بدات، ﴿رَبَّنَآ﴾ ئەی پەروەردگارمان ﴿إِنَّنَا سَمِعۡنَا مُنَادِيٗا يُنَادِي لِلۡإِيمَٰنِ﴾ بەڕاستی ئێمە بیستمان و گوێمان بە بانگ کەرێکی گەورە بوو ـ واتە پێغەمبەر(ﷺ) یان قورئان ـ بانگی ئەکرد بۆ بڕوا هێنان ﴿أَنۡ ءَامِنُواْ بِرَبِّكُمۡ﴾ بەم ڕەنگە ئەیوت: بڕوا بێنن بە پەروەردگارمان ﴿فَـَٔامَنَّا﴾ دەست بەجێ ئێمەش بڕومان هێنا ﴿رَبَّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا﴾ پەروەردگارمان بۆمان داشارە گوناهە گەورەکانمان ﴿وَكَفِّرۡ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا﴾ بسڕەرەوە لێمان گوناهە بچووکەکانمان ﴿وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلۡأَبۡرَارِ﴾ بمان مرێنە لەسەر ڕێگەو ڕێبازو کردەوەی چاکان. ﴿رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ﴾ ئەی پەروەردگارمان لەپاش مردن پێمان ببەخشە ئەوەی کە بەڵێنت پێدایِن لەسەر بڕواهێنان و شوێن کەوتنی فروستادەکانت. یان بەڵێنت پێدایِن لەسەر زمانی فروستادەکانت. ﴿وَلَا تُخۡزِنَا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ﴾ ڕیسواو بێ ئابڕوومان مەکە لە ڕۆژی دوایی دا! ﴿إِنَّكَ لَا تُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ﴾ بێگومان تۆ بەڵێنت بەدی ئەهێنی و بە پێچەوانەوە ڕەفتار ناکەیت. ئەوان ئەو نزاو داوا درێژەیان پێشکەش کرد بە بارەگای پەروەردگاریان، ئەمیش بە میهرەبانی خۆی نزاو لالەکانی وەرگرتن و بە گوێرەی داواکەی ئەوان درێژەی دا بە باسەکە و کارەکەیانی ڕوون کردەوە، ئەفەرمووێ: ﴿فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ﴾ ئینجا پەروەردگاریان نزاکانی وەرگرتن و بەپێی مەبەستی خۆیان وەڵامی دانەوە ﴿أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ﴾ بەمەی بێگومان من زایە ناکەم کارو کردەوەی هیچ ئیش و کار کەرێك لە ئێوە لە نێر یان مێتان، واتە پیاو یان ئافرەتتان وەك یەك هیچ کردەوەیەکیان زایە ناکرێ،**

بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ثَوَابٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ

---

**چونکە ﴿بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ﴾ ئێوە لەیەکترن و هەر هێندێکیتان لەوی ترتانە، بەم ڕەنگە هەموو لەیەك بنەڕەتەوە هاتوون، لەپاش ئەوە پیاو لە ئافرەت پەیدا ئەبێ و ئافرەت لە پیاو، واتە یەکن و یەکسانن لە مرۆڤایەتی دا، بێجگە لەوەش بڕواداران پەیوەست و بەستراون پێکەوە و یەکێتی ئایینییان هەیە کەلە هەموو یەکێتی و پەیوەستیە بە هێزترە، کەواتە ئەبێ یەکسان بن و وەك یەك وابن لە زایە نەکردنی کردەوەکانیاندا، ئیسلام بەو جۆرە پایەو پلەی ئافرەتی بەرز کردەوە و هاوشان و هاوسەری کرد لەگەڵ پیاودا لە هەموو مافێکدا بێجگە لە هێندێ شتی تایبەتی بە پیاوەوە کە لەگەڵ سروشتی ئافرەتدا ناگونجێ، یان بە ڕێکی بە ئافرەت بەدی نایەت، وەك بەدرێژی لە شوێنی تایبەتی دا ئەو باسە بە تێرو تەواوی کراوەو ئێرە شوێنی ئەو درێژە پێدانە نیە،ئینجا باسی هێندێ لە کردەوە زۆر چاکەکانیان ئەکات لەگەڵ پاداشتی بڵندیان، لەبەر وەسف دان و ڕێز پێدانیان و هاندانی مەردومان لەسەر ئەو کردەوانە، ئەفەرمووێ: ﴿فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ﴾ بەم ڕەنگە ئەوانەی کە کۆچییان کردووە لەوڵات و نیشتمانیان ﴿وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ﴾ دەرکراون لە جێ و شوێن و ماوایان ﴿وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي﴾ ئەشکەنجەو ئازار دراون لە ڕێی من داو لەبەر من و ئایینی من ﴿وَقَٰتَلُواْ﴾ وە تێ جەنگیون و جەنگیان کردووە لەگەڵ بێبڕوایاندا ﴿وَقُتِلُواْ﴾ کوژراون لە ڕێی مندا ﴿لَأُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ﴾ ئەوانە سوێند بە خوا ئەسڕێنەوە لێیان خراپەکانیان، بەم ڕەنگە نیشانەو دروشمیان نامێنێ پێیانەوە، یان لە دەفتەری کردەوەکانیاندا ئەسڕێتەوە و لە جێگاکانیاندا چاکە ئەنووسرێ بۆیان، ﴿وَلَأُدۡخِلَنَّهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ ئەیانخەمە بەهەشتانێکەوە کە ڕووبارەکان دێن و ئەچن لە ژێریاندا ﴿ثَوَابٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ﴾ واتە لەچاداشتیان ئەدەمەوە بە پاداشت دانەوەیەك کە لای خوایە و هەر لای ئەو دەست کەوت ئەبێ و هیچ کەسێکی تر توانای نیە پێی.**

وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلثَّوَابِ ﴿١٩٥﴾ لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ﴿١٩٦﴾ مَتَٰعٞ قَلِيلٞ ثُمَّ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴿١٩٧﴾ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا

---

وەكو ئەفەرمووێ: ﴿وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلثَّوَابِ﴾ خوا هەر لای ئەو هەیە پاداشتو بەخششی شیرین، واتە هەر ئەو دەسەڵاتی هەیە بەسەری دا.

ئەم ئایەتانە هەرچەندە هاتنە خوارەوە لەشانی یەکەم تاقمی کۆچ کەراندا کە یەکەمجار ئەم قورئانەی چوو بە گوێچکەدا، بەڵام لە ڕاستی دا ئەوەیە ڕێگەو وێنەو شێوەی هەڵگرانی ئەم ئایینو بیروباوەڕە لە هەر چەرخو لە هەر وڵاتێکدا، لە یەکەمجارەوە هەر ئەبێ چەند کەسێکی کەمی بێ دەسەڵات ڕاست بینەوە لەناو گەلێکی نەفامدا، بکەونە هەوڵو تێکۆشان بۆ نەهێشتنی نەفامێتیو هەرچی کردەوەو باوی نەفامی هەیە کە ئەو گەلە ڕام بوون لەسەریو دەقیان پێوە گرتبێ، لە هەمان کاتدا بەرژەوەندی زۆربە لەو بارەدا بێن کە هۆگری بوون، ڕێكو پێك بێت لەگەڵ هەواو ئارەزوویشیاندا، دیارە ئەوکاتە ئەبێ ئەو گەلە لێیان هەڵسنو ئەوەی لە دەستیان دێت بەکاری بێنن لەگەڵ ئەو تاقمە کەمەدا، ئەمانیش کە خاوەنی ئایینی ڕاستو بیرو باوەڕێ ڕاستن ئەبێ خۆیان بگرن فیداکاری بکەن بە گیانو بەماڵو بە هەر شتێك کە ڕێز دارو بەنرخە لەم جیهانەدا، ئینجا لەسەر ئەو تێکۆشانو خۆگریە خوا بەشداریان ئەکات لەو بەڵێنو پاداشتەی کە دای بەو یەکەم تاقمە.

سروشتی ئەم ئایینەو هەڵگرانی هەر وابووەو هەر وایش ئەبێ کەواتە با تێکۆشەرانی ئەم ڕێ ڕاستە خۆگرو دامەزراو بن، با کامەرانو دڵشاد بن بەم بەڵێنو پاداشتە گەورەیە! بێگومان ئەو تاقمە کەمەی کە یەکەمجارە ـ وەك هەموو تاقمە کەمەکانی یەکەمجار لە هەر چەرخێکدا ـ داماو دەستە پاچەو بێنەواو هەژار بوون، دوژمنە بێبڕواکانی شادمانو کامەرانو بە دەسەڵات بوون، بەڕاستی ئەوەش زۆر سەختو کاریگەرە لەدڵو دەروونـدا،

لەبەرئەوە خوا دڵنەوایی ئەكات و هۆی ئارامی و خۆگرییان ئاڕاستە ئەكات، ئەفەرمووێ: ﴿لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِى ٱلْبِلَٰدِ﴾ ئەی بڕوادار، یان ئەی پێغەمبەر، مەبەست ئوممەتەكەیەتی، وەك باوە كە سەرۆك و كاربەدەست بانگ ئەكرێ لەباتی شوێن كەوتووەكانی، با هەڵت نەخەڵەتێنێ هات و چۆو گەڕانی بێبڕواكان لە وڵاتاندا بە خۆشی و كامەرانی بۆ بازرگانی و هەر شتێك كە ئارەزووی ئەكەن، واتە بەوە هەڵ مەخەڵەتێ و غەمبار مەبە و دڵت گەرد نەگرێ، چونكە ﴿مَتَٰعٌ قَلِيلٌ﴾ ئەوە خۆشی و ڕابواردنێكی كەمە، ماوەكەی كەمە، دواییشی دێت و هەرچی دوایی بێت كەمە و زۆر ئەوەیە كە دوایی نەیەت، وە هەرچەند ماوەی زۆر بێ و بە زۆر دابنرێ هەر زۆر كەمە كاتێ كە بەراورد بكرێ لەگەڵ ئەو نازو ڕێزە نەبڕاوەی كەلە دەستیان دەرئەچێ، لەگەڵ ئەو سزا سەختە نەبڕاوەی كە دووچاریان ئەبێ لە ڕۆژی دواییدا، وەك ئاماژەی بۆ ئەكات كە ئەفەرمووێ: ﴿ثُمَّ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ﴾ ئینجا لەپاش نەمانی ئەو ماوە كەمەو ئەم جیهانە، شوێن و جێگای نیشتەجێی ئەوانە دۆزەخە كە ڕادەی سەختی سزاكەی نایەتە باس بۆ ئێمە، ئیتر ئەوان هەر لە خۆشی دا مابنەوە تا مردن، یان هەر لە جیهانیشدا دووچار بووبن بە سزای تر، ﴿وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ﴾ دۆزەخ جێ و شوێنێكی زۆر بەدە بۆیان كە بەدەستی خۆیان سازاندیان بۆ خۆیان! ناوی ئەبات بە ﴿ٱلْمِهَادُ﴾ كە ناوە بێ جێ و بانی خۆش و جێگەی حەوانەوە، لەبەر لاقرتی كردن پێیان كە ئەوە سزایەكی دەروونی تیایە، خوا پەنامان بدات بە بەزەیی خۆی، بەڵێ بێبڕواكان هەر خۆشیەكیان ببێ هەر ئەو ماوە كەمەی ئەم جیهانەیەو لەپاشان نیشتەجێن لەئاگردا ﴿لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ﴾ بەڵام ئەوانەی كەلە خواترسن و خۆیان پاراستووە لەنا فەرمانی پەروەردگاریان، ئەوانە لە جیهاندا هەرچۆن بووبن، لە ڕۆژی دوایی دا ﴿لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ بۆیان هەیە باخات و بەهەشتانێك كە ڕووبارو جۆگەكان دێن و ئەچن بە ژێریاندا ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ لەكاتێكدا ئەو لە خواترسانە هەمیشەیین لەو بەهەشتانەدا بە بێبڕانەوە، ئەو بەهەشتانەیان بۆ هەیە

نُزُلًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۗ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّلْأَبْرَارِ ﴿١٩٨﴾ وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ لَمَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَـٰشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشْتَرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ۗ

**﴿نُزُلًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ بە میوانداربیەك لەلایەن خواوە، واتە ئامادە كراوە بۆیان بەوێنەی ئەو نان و خوان و جێ و بانەی كە ئامادە كراوە و ئەكرێ بۆ میوان و ئەمانیش بە هەموو خۆشیەك و بەبێ ئەرك و زەحمەت كێشان بۆ ئامادەكردنی ئەچنە سەری و نۆشی ئەكەن! ﴿وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّلْأَبْرَارِ﴾ ئەوەی كەلای خوا هەیە چاكترە بۆ چاكان كە بەزۆری و بە لێشاو كردەوەی چاك ئەكەن، ئیتر ئایا لێرەدا مەبەست لە خواترس و خۆپارێزەرەكان بن كەلە پێشەوە باسی كردن، یان مەبەست بەمان تاقمێ ترن كە لەوان بەرزترن؟ ئایا مەبەست بەمە هەر بەڵێنە پێشووەكەبێت، یان ئەمە بەڵێنە بە نازو رێزی تر زیاد لە پێشوو؟ هەركام ئەگونجێ و هەڵئەگرێ، لەسەر هەر بار هیچ كەس گومانی نیە كە ئەمە باشترە نەك تەنیا لەو خۆشی و ڕابواردنە كەمەی بێبڕواكان، بەڵكو باشترە لە هەموو جیهان و هەرچ وا لە جیهاندا، گومانی نیە بۆ هیچ كەس و هەر كەس باوی ئەوە بدا كەلای خوایە بەسەر هەر شتێكی تردا هەر ئەو كەسە ژیرە و هەر ئەو كەسە گرەوی بردووەتەوە!**

**خوای پەروەردگار لەكاتی پەروەردەكردن و پێگەیاندنی بڕوادارەكانداو لەكاتی چاندنی بڕواو دامەزراندنی بۆچوونی ئیسلامی دا، لەوكاتانەدا بەڵێنی سەركەوتن و زاڵ بوون و گرتنە دەستی كاروباری وڵاتی نەدا بە بڕوادارەكان، بەڵێنی هیچ شتێكی ئەم جیهانەی پێنەدان، كەلەكاتی تردا ئەو جۆرە بەڵێنانەی پێدان. لەم كاتەدا هەر بەڵێنی تەنیا شتێكی پێدان كە بریتیەلە پاداشتی ڕۆژی دوایی و ئەوەی پێیان ئەبەخشێ لەو جیهان، كەواتە هەر ئەوە بناغە و بنەڕەتە لەم بانگ و بانگەوازی خوادا، چونكە خوا ئەیەوێ بەندە ڕاستەقینەكانی خۆی خۆیان ڕووت بكەن لە هەموو مەبەست و ئامانجێك، تەنها مەبەست و ئامانجیان هەر گەیشتن بێ بە ڕەزامەندا خواو ئەوەی كە بۆی داناون لە ڕۆژی دوایی دا، تەنانەت با خۆیان ڕووت بكەن لە مەبەست و ئامانجی زاڵبوون و سەركەوتنی ئایینی خوا، با ئەو مەبەستەشیان نەبێ و پشت بەوە نەبەستن، سەركەوتن و سەرنەكەوتنەكەی هەر حەواڵەی خوا بكەن، چونكە ئەو كاتە لێ بڕانی تەواو بۆ خوا بەدی دێت.**

ئەم ئایین و عەقیدەیە خۆی بە تەنیا بەهرەو بەخششی خوایەو خۆی بە تەنیا دەست کەوتێکی تێرو تەواوەو هەرچی تربێ زیادەو بەهرەیەکە ئەیبەخشێ، هەر کاتێ بڕواداران بەو جۆرە لێ بڕان و خۆیان ڕووت کرد لە هەر مەبەست و ئامانجێکی تر، ئەو کاتە زاڵبوونیش ئەبێ، سەرکردایەتی و گرتنە دەستی کاروبارییش ئەبێ. پەیمانی(عبقة) هەر لەسەر ئەوە دابەسترا، بەڵێنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆیان تەنها بەهەشت بوو، وەك(محمدی کوڕی کعب) ئەگێڕێتەوە لە(عبدالله ی کوڕی ڕەواحە)وە کە ئەگێڕێتەوە لە شەوی ئەو پەیمانەدا عەرزی پێغەمبەری کرد(ﷺ): چۆن ئارەزوو ئەکەیت مەرجمان لەسەر دابنێ بۆ خواو بۆ خۆت، ئەویش فەرمووی: مەرجم بۆ پەروەردگارم ئەمەیە: کە بیپەرستن و هیچ شتێك نەکەن بە هاوبەشی. مەرجم بۆ خۆیشم ئەمەیە: بەرگریم لێ بکەن لە هەر شتێك کە بەرگری خۆتان و ماڵتانی لێ ئەکەن. ئینجا(عبدالله) عەرزی کرد: ئەگەر ئێمە ئەوەمان کرد ـ واتە هەڵساین بەو مەرجانە ئایا ئێمە ژیمان بۆ هەیە؟ ئەویش فەرمووی: بەهەشت. ئینجا ئەوانیش وتیان: مامەڵەو کڕین و فرۆشتنەکەمان قازانجی کرد، ڕازی نین بە هەڵوەشاندنەوەی و داوای هەڵوەشاندنەوەی ناکەین، بەڵێ بەڵێنی هەر بە شتێکدا! ـ بەڵێنی تری نەداـ نەسەکەوتن و زاڵبوون و نەهێزو نە دەسەڵات و سەرکردایەتی و نە سامان و نەخۆشی و نەهەر بڵندیەك کەلە پاش دا خوا پێی دان و پێی بەخشین، ئەمانە هیچ کام لەو پەیمان و مامەڵەیەدا نەبوو!

ئا بەم جۆرو شێوەیە خوا ئەو تاقم و کۆمەڵەی پەروەردەکرد کە بڕیاری دابوو کلیلی زەوی بخاتە دەستیان، جڵەوی سەرکردایەتی بدا بە دەستیانەوەو بیان کات بە هەڵگری سپاردەی هەرە گەورە لەپاش ئەوەی کە ئەوان خۆیان داڕنی لە هەموو خواست و نیازو ئارەزوویەکی تر بێجگە لە ڕەزامەندی خواو هەڵسانیان بە فەرمانی خوا.

لەپاش ئەوەی لەم سورەتەدا باسی پیلان و خراپی و بەد کرداریی نامەدارەکانی کرد، ئینجالەدواییدائەگەڕێتەوەسەریان وباسی تاقمێکی چاکیان ئەکات کەهاتنەژێرسایەی ئیسلام وریزی موسڵمانان،ئەفەرمووێ:﴿ وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ﴾بێگومان لەناو نامەدارەکاندا هەیە﴿لَمَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ﴾ کەسێك کەبڕوانەهێنێ وبڕوای هەیە بە خوا ﴿وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُمْ ﴾ بەو نامەی کەهێنراوەتەخوارەوەبۆلای ئێوە﴿وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِمْ﴾بەونامەی کەهێنرایەخوارەوە بۆ لای خۆیان، بڕوایان هەیە بە جۆرێ ﴿ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ ﴾ بیم دارو مل کەچن بۆ خوا ﴿لَا يَشْتَرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ ناکڕن بە ئایەتەکانی خوا شتێکی کەم لە مەبەست و دەست کەوتی ئەم جیهانە،

أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿١٩٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصۡبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٢٠٠﴾

---

﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡۗ﴾ ئەو نامەدارانە بۆیان هەیە ئەجرو پاداشتی تایبەتی خۆیان، کە بریتیە لە ئەجرو پاداشتیان لەسەر بڕوا هێنانیان بە نامەکەی خۆیان لەپێش هاتنی قورئان دا، بڕوا هێنانیان بە قورئانیش کاتێ هاتە خوارەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ﴾ بێگومان خوا بە حیسابو پرسیاری چەسپانەو بەزوویی دێتو تێپەڕئەکاتو لەکاتێکی کەم دا کردەوەی هەموو دەرئەخاتو ئەیانخاتە بەرچاو! بیرکردنەوە لەم فلیمانەی کەلەم چەرخانەدا داهاتوونو ڕووداوو بسەرهاتەکان نیشان ئەدەنو بەڕێکیو بە چەسپانی ئەیانخەنە بەرچاو، بیرکردنەوە لە مانە ئەندازەیەك خاوەن بیرتێئەگەیەنێ لە چۆنێتی ئەو حیسابو پرسیاری خوا، سەرسوڕمان ناهێڵێ لەدڵی ئەوانەی سەریان سووڕ ئەمێنێ لە شتی وا، ئینجا سورەتەکە دوایی ئەهێنێ بە ئایەتێك کە زۆر پەیوەستە بە هەموو سورەتەکەوە، وەك کورتەیەك وایە بۆی، ئەفەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ خۆگر بنو دان بگرن بەخۆتاندا. خۆگرین لەسەر چەند شتی زۆر کە دێتە ڕێتانو دووچاری ئەبن: لەسەر خواستو ئارەزووە نارەواکانی نەفس، لەسەر هەموو ڕووداوو بەسەرهاتێکی ناخۆشو ئێشو ئازار دەر، لەسەر پەلەپەل کردن بۆ ڕزگاربوونو گەیشتن بە ئامانج، لەسەر لاریو نالەباریو خواستو ئارەزووی نارەوای مەردومان، لەسەر بۆچوونی بەدو نەفامیو نەزانیو پەلەپەل کردنیان بۆ گەیشتن بە ئامانج، خۆگرین لەسەر کەشخەو بافیش کردنی بەتاڵو ناهەقو دەسەڵاتو زاڵبوونیان بە ڕواڵەت، لەسەرنەبوونی کۆمەكو یارمەتی دەر، لەسەر درێژیی ڕێگەو درێژە کێشانی پەستیو ناخۆشی، لەسەر مەتەرەو خەیاڵێك کە شەیتان ئەیخاتە دڵەوە لەو کاتە ناخۆشانەدا، خۆگرین لەسەر تاڵیو سوێری تێکۆشان لەو مەیدانەدا، لەسەر باس بوونو بێزاریو نائومێدی، ئینجا لەپاش ئەوانە ئەبێ بڕوادار خۆگربێت لەسەر جڵەوگرتنەوەی نەفس لەکاتی سەرکەوتنو زاڵی دا، بە مل کەچیو

سوپاسـەوە بـچن لـەپێری خۆشـی و دەسـەڵاتەوە، بـەبێ لـە خـۆ گـۆڕان و پـەلاماردان بـۆ تۆڵەسـەندن، بـەبێ تێپـەڕکردن لەهـەق و ڕاسـتی بـۆ دەسـت درێـژیی کـردن! خـۆگر بێـت لـە خۆشی و ناخۆشی دا لەسەر یادی خواو پەیوەستی دڵی بە خواوە، مل کەچی بۆ بڕیارو قـەزاو قـەدەری خـوا، گێڕانـەوەی هـەموو کارێـك بـۆلای خـوا بـەئارامی دڵ و مـل کەچـیەوە، خـۆگریی لەسـەر ئەوانـەو هـەر شـتێکی تـر شـتێك نیـە بـە وتـن و بـە وتـەو وتـار دەربخـرێ و بگەیەنرێ، بەڵکو کەسێك تێ ئەگات لە واتاو مەبەست بە خۆگریی کە دووچاری ئەو شتانە بووبێ لە ژیانداو تاڵی و توونی ژیان و ڕێگەی خوای چەشتبێ!

ئـەو یەکـەم چـین و تاقمـەی یەکـەمجاری ئـەم ئوممەتـە زۆر زۆریـان لـەو بابەتانـە بەسـەر هاتبوو، تاڵی و سوێرییان چەشتبوو، کەواتە ئەوان ئاشـنا تـر بـوون بـە تـام و بـۆنی ئـەم بـانگ کردنە کەلەم ئایەتەدا هات، ئەوان باش تێئەگەیشتن لە مەم بەو خۆگرییەی کە خوا فەرمانی پێدان. ﴿وَصَابِرُوا﴾ بەربەرەکانێ بکەن و نەبەزێن لە خۆگرییدا، نە بەرامبەر ئەو بەسەرهات و ڕووداوە سـەختانەی کـەباس کـران، نـە بەرامبـەر دوژمـن کـە بـە هـەموو هێزیـان ئەیانـەوێ بڕواداران پـەك بخـەن و بیـان بـەزێنن، کەواتـە بەدرێـژایی تێکۆشـانیان خۆگرییەکـەیان دوایـی نەیـەت و هـەر بەردەوام بێـت، بـەڵکو ئـەبێ خـۆگرتـوو و بەهێزتربن لـە دوژمنـی دەروونـی و لـە دوژمنـی دەرەوەیـان، بـەڵێ بەڕاسـتی بـڕوادار ــ کەلەسـەر حـەق و ڕاسـتیە ــ ئـەبێ بـەهێزو خۆگرتـوو و سـوورتر بێـت لـە دوژمـن کەلەسـەر ناهـەقی و ناڕاسـتیەو سـوورە لەسـەری.

﴿وَرَابِطُوا﴾ نشتەجێ و دامـەزراوبن لەهـەر جێگاو شـوێنی تێکۆشـان لـەڕێی خـوادا، لەسـەر سنووری وڵات و لە هـەر کـون و کەلەبـەرێك کـە شـوێنی پـەلاماردانی دوژمـن بێـت، نیشتەجێ و دامـەزراوبن بـە وریـایی و ئامـادەیی، بـۆ بەربەسـت کـردن و بـەرگریی دوژمـن، بەرامبـەر دوژمـن ڕاوەستن و جەنگیان لەگەڵ بکەن لەسەر ئەو بارو شێوەی کە ئـەوان جـەنگتان لەگـەڵ ئەکـەن، کەواتە لەم چەرخەدا پێویستە هەوڵدان بۆ پەیداکردن و لە دەست گرتنـی هـەر جـۆرە چەکێك کە ئەوان جەنگی پێئەکەن، ئیتر چەکی ئاسمانی یان دەریایی یان وشکانی، گـەلی موسـڵمانی شـوێنکەوتووی قورئـان هـەرگیز نەخـەوت و چـاوی نـەنا بـە یەکـدا بەرامبـەر دوژمـن! چـونکە

هـەرگیز لـە دوژمنایـەتی خـۆی نەوەسـتاوەو هـەرگیز نـایش وەسـتێ، هـەرگیز یـەك ناكـەوێ لەگەڵی و بەسەر هیچ هەلێكی خۆیدا تێپەڕ ناكات، كەواتە گەلی موسڵمانی ڕاستەقینە ئەبێ هەمیشە ئامادە بێت و نەخەوتوو بێت هەتا دنیا دنیایە!

ئەم ئایینە پیرۆزە بەرەنگاری ئادەمی نەوەستێ بە بەرنامەیەكی تایبەتی كە ئەبێ بەدی بێت لـە ژیانـدا، بەرنامەیـەك كـە ئـەبێ هـەموو شـتێك بگرێتـە دەسـت، كاربەدەسـت بێـت لـە دەروونی مەردومدا، هەرچۆنێ كاربەدەست بێت لە دارایی و سامانیاندا، هەرچۆنێ لـە ڕژێمـی ژیـان و گوزەرانیـان، بەرنامەیـەكی ڕێـك و ڕاسـتی دادپـەروەر، هەرچـەند ئـەو بەرنامەیـە پـاك و خاوێن و بێگەردو لەكە بێت، بەڵام ناهەقی و هەڵگرانی ناهەقینەو بەرنامەیـەیان نـاوێو بێـزارن لێی، بەتاڵ و هەڵگری بەتاڵ تەنگەتاوە بە خێرو دادو ڕاستی، ستەمكارو سەركێشان بڕوایـان نیـەو ملكەچ ناكـەن بـۆ دادو ڕێـزو یەكسانی ئـادەمی، جالەبەرئەوانە چەند دوژمنێـك ڕاست ئەبنەوەو ڕائەپەڕن بۆ جەنگ كردن و شەڕ فرۆشتن لەگەڵ ئەم ئایینـەو هـەڵگرانی ئاڵای ئـەم ئایینـە ڕائەپـەڕێ و ئـەو كەسـانەی كـە خـوێن مـژن و هەمیـشە بـە دوای سـوودو دەسـتكەوتدا ئەگەڕێنبـە هـەر جـۆرو لـە هـەر ڕێگەیەكـەوەو نایانـەوێ واز لـەوە بێـنن، ڕاسـت ئەبنـەوە لێیـان ئەوانەی كە سەركێش و لوت بەرزن و خۆیان بە زل ئەزانن و نایانـەوێ كۆتـایی بێـنن لـەو خـوو ڕەوشـتە پیـسەی خۆیـان، وە پـەلاماریان ئـەدەن ئەوانـەی كـە بێنامووسـن و هەمیـشە بـەدوای بـەرەڵایی و كـاری بێشـەرەفی دا ئەگـەڕێن و نایانـەوێ بێنـە ڕیـزی پاكـان و ڕەوشـت پاكـان، بێگومان ئەم ئایینەش بۆ ئەوە هاتووە كە هـەموو لاری و ناڕەواییـەك نـەهێڵێ و مـەردوم پـاك و خاوێن بكاتەوە لە هەموو چڵك و چەپەڵی، كەواتە پێویستە بڕواداران بە هـەموو توانا بكەونـە تێكۆشـان بـۆ بەربەسـت كـردن و نەهێـشتنی ئـەو هـەموو شـتە بـەدو ناڕەوایانـە، پێویـستە لەسـەریان خـۆگری و بەربـەرەكانێ و پـاس كـردن و پاسـەوانی، بۆئـەوەی گـەل و ئوممـەت لـە ناكاودا نەگیرێن لەلایەن دوژمنەكانەوە كە سروشتێ و هەمیشە هـەن لـە هـەموو كات و چین و چەرخێكدا.

ئەمەی سروشتی ئەم ئایینە، ئەمەیە ڕێگاکەی، بێگومان ئەم ئایینە دەست درێژی ناکاتە سەر هیچ کەس و هیچ شتێك، بەڵکو ئەیەوێ بەرنامە ڕاستەکەی و ڕژێمە پاکەکەی بچەسپێنێ و ڕاگیری بکات کە سەرانسەر خێرو خۆشی هەموو کەسی تیایە چونکە دۆست، چ دوژمن، بێگومان ــ وەك باسمان کرد ــ هەمیشە ئەو کەسانە بێزارن لەو ڕاستی و پاك و خاوێنیە، بە هەموو هێز ئەوەستن و ئەبن بە کۆسپ و گرێ لەو ڕێگە ڕاستەدا، کەواتە ئەبێ ئەو بەربەرەکانێ و جەنگ و ئاژاوە بەرپا ببێ و هەڵگرانی ئاڵای ئایین هەڵسن بەوەی کە پێویست کراوە لەسەریان لە ڕێی ئایینەکەیاندا، بێگومان هەڵسان بەوەیش ئەرکی هەیە و قورس و گرانە لەسەر نەفس، کەواتە مەردوم پێویستی هەیە بە پاڵ پێوەنەرو پاسەوان، بەهێزترین و چاکترین پاسەوان و پاڵپێوەنەر هەستی خۆپارێزی و ترسە لە خوا، لەبەرئەوە ئەفەرمووێ: ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ خۆتان بپارێزن لە خوا، واتە لە خەشم و لە نارەزایی و لە تۆڵە و سزای خوا. ﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ بەڵکو بگەن بە ئامانج و مەبەستتان. داواکارین لە خوای میهرەبان کە بەشدارمان بکات لەو هەستە پیرۆزەدا لە هەموو کات داو بۆ هەموو کارو کردەوەکانمان. امین.

**وصلى الله مسلم على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.**

دوایی هات تەفسیری ئەم سورەتە بەفەڕە لە بەیانی یەك شەممە ١٤٠٦/٢/٢٠ هـ خوا یارمەتیمان بدات بۆئەوەی کە ماوە و لێشمان وەرگرێ. هەر لەم ڕۆژەدا دەستمان کرد بە تەفسیری سورەتی ﴿النساء﴾

# سورەتی ﴿النساء﴾
## مەدینەییەو(١٧٦) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتە درێژترین سورەتی قورئانە لەپاش سورەتی ﴿البقرة﴾ وە لەپاش سورەتی ﴿الممتحنة﴾وە هاتووەتە خوارەوە بەبۆنەی ڕووداوی حودەیبییەوە، ئینجا وەنەبێ هەموو سورەتێ بەیەك جارو لەیەك كاتدا هاتبێتە خوارەوە، بەڵكو وا ئەبوو چەند ئایەتێك ئەهاتە خوارەوە لە چەند سورەتێك، لەپاشدا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی ئەدا بە دانانی هەر ئایەتێك لە شوێنو سورەتی تایبەتی خۆی دا، جا بەپێی ئەوە وا ئەبوو تەنیا سورەتێك هێندێكی لێ ئەهاتە خوارەوە، ئینجا ئایەتێ تر ئەهاتە خوارەوە، لەپاش چەند ماوەیەك ئایەتەكانی سورەتە پێشووەكە ئەهاتن، بەڵكو سورەتی وا هەیە بە چەند ساڵێك ئایەتەكانی بە تەواوی هاتنە خوارەوە، بۆنموونە: سورەتی ﴿البقرة﴾ چەند ئایەتێكی تیایە كەلە دوادوایی چەرخەكەدا هاتوون. كاری ئەم سورەتەش هەر وایە، هێندێ لە ئایەتەكانی لە ساڵی شەشەمو هەشتەم دا هاتوون، زۆریشیان لەسەرەتای كۆچ كردن بۆ مەدینەوە هاتوون، بەهەرحاڵ وا دەرئەكەوێ هاتنە خوارەوەی ئایەتەكانی درێژەی كێشابێ لە ساڵی سێیەمەوە تا دوای ساڵی هەشتەم، بۆ نموونەیەك لەسەر درێژە كێشانی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكانی ئەم سورەتە، باسی ئایەتێ ئەكەین لەم سورەتەدا كە هاتە خوارەوە لەبارەی ئەو ئافرەتانەی كە داوێن پیسنو دەست نیشان ئەكات بە چاوەڕوانی كردن بۆ هاتنی بڕیاری تۆڵەیان لە داهاتوودا، لەپاش دا لەو بارەیەوە ئایەتی سورەتی ﴿نور﴾ هات لە ساڵی پێنج یان چواردا، هەروەها چەند نموونەی تر هەیە.

ئەم سورەتە بەشێك لەو تێكۆشانە دەرئەخات كە ئیسلام بەكاری هێنا لە داهێنانو پێكهێنانی گەلو كۆمەڵی موسڵماندا، لەپاراستنو سەرپەرشتیو چاودێریی ئەو گەلو كۆمەڵەدا تا بوو بەو ئوممەتە كەلە مێژوودا وێنەی نەبووە! سروشتی ئەم بەرنامە ئاسمانیە ڕوون ئەكاتەوە كە ئەو گەلو كۆمەڵەی لەسەر داڕێژرا، ئوممەت ئاگادار ئەكاتەوە لەسروشتی دوژمنانی ئەم بەرنامەو ئەم ئوممەتە، وریاو ئاگاداری ئەكات بە پیلانو ڕێگای جۆر بەجۆری دوژمنایەتیەكەیان، هەروەها ئاشنای ئەكات بە پڕوپووچی بیرو باوەڕەكانیان. ئەم سورەتە هەوڵو تێكۆشان ئەكات لەسڕینەوەی نیشانەو دروشمی گەلو چەرخی نەفامی لە گەلو

دروست کرا؟ پرسیارەکەی زۆر بێجێیە، چونکە ئەو دەستە قودرەتەی کە ئادەمی لەخاك دروست کرد ئەتوانێ(حواء) دروست بکات لە پەراسووی ئادەم، بێجگە لەوەیش ئەو پرسیارکەرە ئەگەر بیربکاتەوە لە دروست کردنی ئەو هەموو دارو درەختە لە دانەوێڵە، یان بیربکاتەوە لە دروست کردنی گۆپکەو کەڵبەو بەرو میوەکە لەو دارە ڕەقانە دێنە دەرەوە، هەرکەی بیرێك لەو جۆرە شتانە بکاتەوە نابێ سەری سووڕبمێنێ لە دروستکردنی(حوا ) لە پەراسووی ئادەم، بەڕاستی سەرسوڕئەمێنێ لە هەرکەسێك کە خۆی بە بڕوادار دابنێ و تێگەیشتبێ لەمانای خوایەتی، کەچی لەگەڵ ئەوەدا سەری سووڕبمێنێ و سەر بکاتەوە لەو جۆرە شتانە، هەروەها سەرسوڕئەمێنێ لە هێندێ قسەی لەق و لۆق کەلە بارەی دروست کردنی(حوا ع) لە ئادەمەوە کراوە کە هەموو ئەو قسانە لە خەتەرەو وەسوەسەی شەیتانە، وەك ئەوەی کە وتراوە ئایا بۆچی لەخاك یان شتی تر دروست نەکراوە؟ ئایا چ سوودێك هەی لەوەدا کەلە ئادەم دروست کرابێ؟ یان ئەگەر لەو دروست کرابێ ئەو کاتە وەك ئادەم کچی خۆی خواستبێ وایە! بەڕاستی زۆر جێگەی سەرسووڕمانە بڕوادار شتی وا پڕوپووچ بەدەمی دا بێت، چونکە:

١- ئێمە نابێ بکەین لەوەی کە خوا کردوویەتی و ئەیکات، پرسیاری وا ناگونجێ لەگەڵ بڕوای ڕاستەقینە بە خوا.

٢- ئەبێ ئێمە خۆمان بناسین و سنووری زانینی خۆمان بزانین و نابێ بە تەمای ئەوە بین کە تێبگەین و ئاشنا بین بەسرو هۆی کردەوەکانی خوا، ئێمە دروست کراوین لەم زەویەداو ئەندازەی پێویست زانین و توانینمان پێدراوە.

٣- کاردروستی و دەسەڵات و توانینی بێسنووری خوا لەمەدا باشتر دەرئەکەوێ کە لە تەنیا کەسێك ئەم هەموو نەوەو وەچەیە دروست بکات کە نایەنە ژمارە بۆ خوا نەبێ، ئەو هەمووەش جیاواز بن لەدەنگ و شێوەو سروشتدا!

٤- گێڕانەوەی ئەم هەمووە بۆ یەك بنەڕەت هۆو پاڵ پێوەنەرێکی زۆر بەهێزترە بۆ یەکێتی نەوەو وەچەکان و نەهێشتنی ڕەگەزایەتی لەناویاندا.

ئینجا ڕەخنەگرتن بەکچێتی(حواء) زۆر پوچ و بێنرخە، چونکە ئەو دروست کردنە جیاوازە لە شێوەی دروست کردنی کچ لە باوك، ئەگەر جیاوازیش نەبێ کچ قەدەغەیە لەباوك بە

فەرمان و جڵەوگیریی خوایە لەبەر چەند هۆو بەرژەوەندیەك، لەو كاتەدا ئەو هۆو بەرژەوەندیە نەبووەو لەبەر ناچاریی خوا ڕەوای داو فەرمانی پێدا، وەك لەبەر ناچاریی ڕەوای دا خواستنی كوڕەكانی ئادەم كەلە سكێكی جیاواز بووبن بۆ ئەو كچانەی كەلە سكێكی تر بووبن، واتە سروشتی كارەكە وایەو بێجگە لەوە دەست ناداو ناگونجێ. كەواتە بابترسێن و خۆمان بپارێزین لە پەروەردگامان كە ئێمەی دروست كرد لە تەنیا كەسێك كەلە پێشەوە دروستی كردو ئینجا هاوسەرەكەی لێ دروست كردو ئینجا لەو دووانە پیاوو ئافرەتی زۆری دروست كرد بە زاوزێ و بەو جۆرە هێنای تا گەیشتە ئێمەو هەروەها تا ئەم جیهانە هەیە، كەواتە دروست كردنی هەموومان گەڕایەوە بۆ ئەو تەنیا كەیە. بترسێن و خۆمان بپارێزین لە نا فەرمانی ئەو پەروەردگارە، چونكە خاوەنی ئەو دەسەڵات و توانینەیێ هاوتاو بێوێنەیە، خاوەنی ئەو بەهرەو چاكە گەورەیە كە بریتیە لە دروست كردنمان بەم شێوەی كە هەیە، كە هەرچۆنێ دەسەڵات و توانینەكەی ئەبێ جڵەوگیرمان بێت لە نا فەرمانی، هەروەها چاكەو بەهرەكەیشی ئەبێ پاڵ پێوەنەرمان بێت بۆ بەندەیی و فەرمانبەریی.

(ئەبوموسلیمی ئەسفەهانی)كە یەكێكە لەخاوەن تەفسیرو موعتەزیلەیە ئەڵێ: هاوسەرەكە لەو تەنیا كەسە دروست نەكراوە، مەبەست لەوتەی ﴿وَخَلَقَ مِنۡهَا﴾ ئەمەیە لە وێنەو جۆرە ئەوە، چەند كەسێكی تریش شوێنی(ئەبو موسلیم) كەوتوون لەمەدا، بەڵگە ئەهێننەوە لەسەر ڕاكەیان بە چەند شتێك كە بەڕاستی زۆر لەق و لۆقن. ئەم ڕایە لەگەڵ ئەوەدا دژو پێچەوانەی چەند حەدیسێكی بڕوا پێكراوە، دژو پێچەوانەی ڕای كۆمەڵ و جەماوەری موسڵمانانە، لەگەڵ ئەوەدا لادانە لە ڕووكەش و ڕواڵەتی ئایەتەكە بەبێ هیچ هۆیەك، نایش گونجێ لەگەڵی. چونكە بەپێی ئایەتەكە ئێمە لە تەنیا كەسێك دروست كراوین، دەی ئەگەر هاوسەرەكە لەو دروست نەكرابێ ئەبێ ئێمە لەدوو كەس دروست كرابێن!!

كۆو كۆمەڵ و جەماوەری زانایانی موسڵمانان لەسەر ئەوەن كە هەریەك ئادەم بووەو یەكەم و باوكی هەموو ئینسان هەر ئەم ئادەمەیە كە بەناوبانگە، بەڵام هێندێ لە صوفیە ئەڵێن: پێش ئەم ئادەمە ئادەمی تر بووە.(شیخ محی الدین العربی) لە كتێبی(فتوحات)دا ئەڵێ: لە پێش ئەم ئادەمەدا بەچل هەزار ساڵ ئادەمی تر بووە. شیعەی ئیمامیە ئەڵێن: ئادەمی تری زۆر بوون تا ئەم ڕادەیە خاوەنی(جامع الاخبار) لە فصلی ١٥ دا هەواڵێكی

دوورو درێژ ئەهێنێ و لەو هەواڵەدا ئەڵێ: لە پێش ئادەمی باوکمان دا ٣٠ ئادەمی تربوون، کە بەینی هەر دوو ئادەمێك هەزار ساڵبووە، لەپاش ئەوانە پەنجا هەزار ساڵ ئەم جیهانە وێرانە لەپاش دا ئاوەدان بووەتەوە پەنجا هەزار ساڵی تر، ئینجا ئادەمی باوکمان دروست کراوە،(ئیبن و بابەویە) لە کتێبی(التوحید)ی دا ئەڵێ و هەواڵێ ئەهێنێ کەلە پێش ئادەمی باوکمان دا یەك ملیۆن ئادەمی تر بووە، هەروەها چەند هەواڵێکی تریش هەن، بەڵام ئەهلی سوننەت و کۆمەڵی زانایان بڕوایان بەهیچ کام لەو هەواڵانە نیە، چونکە هیچ کام لەسەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراوەوە نەهاتووە، ئەم هەواڵە غەیبیانەش کە لەسەرچاوەی باوەڕ پێکراوەوە نەهاتبن پشتیان پێنابەسترێ، ئەگەر بە ترازووی ژیریی لێکۆڵینەوەیەك بکەین ئەبێ بڕوامان بەو هەواڵانە نەبێ، چونکە ئەگەر ئەوانە جیاواز بووبن لە ئادەم و ئادەمی ئێمە لە سروشت و سیفەتە تایبەتیەکانی دا ئەبێ بە ناوی ئەمان ناو نەبرێن و بەوێنەی ئەمان دانەنرێن، ئەگەر جیاواز نەبووبن و هەر وەك ئەمان وابووبن لە سروشت و هەموو نیشانەو سیفەتەکانیاندا، ئەوکاتە پێویست نەئەبوو بەدانانی ئەمان بە جێنشین، دەی خۆ پێویستیش بووە، چونکە وەك لە قورئانەوە وەرئەگیرێ ئەمان دروست کراوێکی تایبەتین و بۆ چەند مەبەستێك دروست کراون کە هەر بەمان ئەکرێ، هەر لەمەیشەوە دەرئەکەوێ کەلە پێش ئەماندا وێنەی ئەمان دروست نەکراوە. بەڵێ لە قورئانەوە وەرئەگیرێ کەلەپێش ئێمەدا روست گیانداری تر بووە، بەڵام وای پیشان نادا کە ئادەمین، بەڵکو هەر فریشتەو تیرەی جان باس ئەکات کە زۆر جیاوازن لە ئادەمی و ئێمەیش بڕوامان بە بوونیان هەیە، ئینجا ئەمەی کە زانایانی تازە ئەیڵێن و لە پەراوەکاندا بڵاوبووەتەوە کە بەپێی دۆزینەوەی ئەو نیشانەو دروشمانەی کە دەستیان کەوتووە لەناو سکی زەوی دا، بۆیان دەرکەوتوون کە چەند تیرەو بەرەیەکی تر بووە لە ئینسان لە پێش ئێمەدا، هەموو ئەوانە دوایی هاتوون و بنەبڕ بوون و لەپاش ئەوان ئێمە پەیدا بووین، ئەم قسەی ئەوانە نابێ بە بەڵگەو پشتی پێ نابەسترێ، چونکە ئەو نیشانەو دروشمانە یان هینی گیانلەبەرانی ترن کە لەپێش ئێمەدا بووبن و ڕەنگە لە هێندێ شتدا وەك ئینسان وا بووبن، وەك ئێستاش گەلێ لە گیانلەبەران هەیە کەلە زۆر نیشانەو سیفەتدا وێنەی ئێمەن، یان ئەو نیشانەو دروشمانە هینی چەند گەل و چینێکن لەم ئادەمیەن کەلە چەرخە دوورەکانی ڕابووردوودا خوا پێغەمبەرانی بۆ ناردن و ئەوانیش

سەرکێشیان کرد تا لەناوی بردن و لەریشەی هێنان، بەوێنەی عادو سەمودو ئەوانی تر کەلە قورئاندا باسی کردوون، بێجگە لەوانە چەند گەل و تاقمی تر بوون کە هەر خوا خۆی ئەزانێ. وەك لە سورەتی ئیبراهیمدا ئەفەرمووێ: ﴿لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا اللَّهُ﴾ نایانزانێ بێجگە لە خوا. دەست نیشانی کردووە بە بوونیان و بەسەرهاتیان. کەواتە هەر بەپێی ئەم فەرموودەیە تەنها خوا ئەزانێ مێژووو سەرەتاو تەمەنی ئەم ئادەم و ئادەمێتیە. هەرکەسێك هەرچی و تووەو هەرچی بڵێ لەم بابەتانەوە هەمووی گۆترە کاریەو دژوپێچەوانەی ئەم ئایەتەیە کە وتمان. ئەوە کە لە چەند ریوایەت دا هاتووەو لە کتێبەکاناد بڵاوبوونەتەوە هەمووی دەلەسەیەو لە ئیسرائیلیاتن، وەك باس کراوە لە کتێبە باوەڕ پێکراوە تایبەتیەکاندا، یەکێ لەو ریوایەتانە کە بەئاشکرا دەرکەوت دەلەسەیە ئەو ریوایەتەیە کە تەمەنی ئەم جیهانە دائەنێ بە حەوت هەزار ساڵ، ئینجا لە هاتنە خوارەوەی ئادەم بۆ سەر زەوی تا ڕەوانە کردنی پێغەمبەر(ﷺ) دائەنێ بە(٦٠٤٧) ساڵ، کەواتە بە پێی ئەوە ئەبێ چەند ساڵە ئەم جیهانە وێران بووبێ و ئێستا ڕۆژی دوایی بێت!! وە هەروەها ئەو ریوایەتانەی کە نەسەب و نەژادی پێغەمبەرەکان دیاری ئەکات و هەمووی بە چەند پشتێ ئەگاتە سەر حەزرەتی ئادەم ـ درودی خوایان لێ بێت ـ لەبەرئەوە(ئیبن و عەباس) یان(ئیبن و مەسعود) -خوای لێیان ڕازی بێت- ئەفەرمووێ:(كذب انسابون) درۆنەکەن ئەوانەی کە ئەو نەسەب و نەژادانە باس ئەکەن.

ئینجا با بگەڕێینەوە بۆ سەر ئایەتەکەو بدوێین لە هێندێ لە مەبەستە زۆر گرنگەکانی: خوای پەروەردگار ڕووی فەرموودەی کردە ئادەمی بەناوی ئادەمێتی و مرۆڤایەتیەکەیەوە بۆئەوەی بیانگێڕێتەوە بۆلای ئەو خوایەی کە ئەوانی دروست کرد لە تەنیا کەسێك کە هاوسەرەکەیشی هەر لەو کەسە دروست کرد، لەو دوو کەسەیش پیاوو ئافرەتی زۆری دروست کرد، ئەگەر ئادەمی بەڕاستی گوێ و دڵیان بدەنە ئەم فەرموودەیە، بێگومان کاریان لێ ئەکات و ئەمەیان بەسە بۆئەوەی بیانخاتە سەر ڕێی ڕاست و دووریان بخاتەوە لە زۆر نەفامی و ڕێی نەفامان.

ئەم فەرموودە کورتە مەیدانێکی پان و فراوان ئەخاتە دڵ کە بگەڕێ تیای داو بیربکاتەوەو چەند شتێکی لێ وەرگرێ کە مایەی بەختەوەریی و کامەرانی هەردوو جیهانە:

١- ئەو سەرچاوە ئەخاتە بەرچاو کە ئادەمی لێ هات، ئەیانگێڕێتەوە بۆلای ئەو پەروەردگارەی کە دروستی کردن‌و دای هێنانلەم زەویەدا، ئەوەش شتێکی ڕوون‌و ئاشکرایەو بەڵام مەردوم لە بیری ئەچێتەوەو بەهۆی ئەوەوە هەموو شتێکی ڕاستی لەبیر ئەچێ‌و هەموو کارێ ئەترازێ لە ڕاستە! بێگومان ئەم ئادەمیە کەوا لەم جیهانەداو بەم شێوە ژیان بەسەر ئەبات تیای دا، بە ڕێکەوت‌و لە خۆیەوە نەهاتووە، خۆیشی خۆی دانەهێناوە، کەواتە ئەبێ کەسێکی تر دای هێنابێ‌و کردبێتی بەم ئادەمیە سەرسووڕهێنەرە کە ئەم لەگەڵ بوونەوەرەو بوونەوەر لەگەڵ ئەم ڕێك‌و پێکی‌و هاوکاریی تەواویان هەیە بەبێ دەسەڵات‌و ئاگاداریی ئەم ئادەمیە! دەی ئەگەر ئادەمی ئەم شتە ڕاست‌و ئاشکرای لە بیربێ، بێگومان هەر لە یەکەمجارەوە دووچاری هیچ هەڵەیەك نابێ، ئەگەر دووچاریش ببێ بە گورجی ئەگەڕێتەوە بۆسەر ڕێی ڕاست، چونکە ئەگەر ئەوەی لە بیربێ ئەزانێ ئەو کەسەی کە ئەمی بەم جۆرە دروست کردو دای هێنا. هەر ئەو کەسە ئەبێ خاوەنی هەموو کارو بارێکی بێت، هەر ئەو کەسە مافی ئەوەی هەیە نەخشەی ڕێی ژیانی بۆ بکێشێ‌و ڕژێم‌و یاسای بۆ دابنێ، ئەبێ گەڕانەوەی هەر بۆ لای ئەو بەرنامەیە بێت کە داینـاوە بۆی، ئەو کاتە هەر ڕێ ڕاستەکەی پەروەردگاری ئەداتە بەرو دووچاری هیچ هەڵەیەك نابێ.

٢- دەست نیشان ئەکات بەوەی ئەم ئادەمیەی کە بەئیرادەو خواهیشی یەك پەروەردگار هاتووە، هەموو یەك بنەڕەتیان هەیەو کۆئەبنەوە لە یەك نەژاددا، هەموو لە سەرەتادا براو خوشکی باوك‌و دایکێن.

دەی ئەگەر ئادەمی ئەمەیان لەبیربێت ئەبێ لەپێش چاویان ون ببێ هەرجۆرە جیاوازیەك کەلە پاش یەکەمجار پەیدا بووو کرا بەهۆی پچڕینی پەیوەستی‌و یەکێتی ئەندامەکانی‌و سەرلێشێوانی ئەو هەموو ئادەمیە کە لە ڕاستی دا یەك خێزان‌و یەك بەرە بابن، بەڵێ لەبیر نەچوون‌و جێگیر بوونی ئەو یەکێتیە لەدڵی ئادەمیدا مایەی دوور خستنەوەی ئاژاوەو بەربەرەکانێی ڕەگەزایەتیە کە مرۆڤو مرۆڤایەتی دووچاری ئەو هەموو دەست درێژیی‌و کوشتن‌و بڕینە کرد کە دڵئەهێننە لەرزەو موچڕکە بەلەشدا ئەهێنن، ئەو ڕەگەزایەتیەی کەلەم چەرخی نەفامی تازەیشدا هەر ماوەتەوەو جیاوازیی‌و دژایەتی هەیە لەبەر ڕەنگ‌و بەرەو تیرە،

گوێ نادرێ بەو یەکێتیەی کە قورئان هێنای بۆ هەمووان و ئەیەوێ دایان ڕێژێ لەسەر ئەو بنەڕەتە، هەروەها دامەزران و جێگیر بوونی ئەو یەکێتیەی کە ئیسلام هێنای هۆی نەمێشتن و دوور خستنەوەی بیروباوەڕی چینایەتیە کە باوە لە هینداو بووەتەهۆی کۆیلەیی و بەندەیی هێندێ بۆ هێندێکی تر، لەدەوڵەتە شیوعیەکاندا بوو بەهۆی خوێن ڕشینێکی وا کە لەوانە بوو لافاوی لێ هەڵسێ، هەموو مەبەست و ئامانجیان ئەوەیە کە چینێ زاڵببێ و هەموو تاقم و چینەکانی تر پێشێل و داماو بکەن، ئیتر هیچ گوێیان لەوە نیە کە ئەو چینە دەست درێژیی کەرە لەگەڵ ئەوانی تردا لە یەك بنەڕەتەوە هاتوون و یەك پەروەردگاریان هەیە!

٣- ئەو یەکێتیەی کە ئەم ئایەتە دەست نیشانی بۆ ئەکات ئەگەر ئادەمیزاد لە بیریان بوایە هەرگیز نەئەکەوتنە ئەو هەموو هەڵەو ناڕەواییەی کە کردیان دەربارەی ئافرەت، وەك مێژوو بۆمان باس ئەکات کەلە نەفامی کۆندا بۆچوونی جۆربەجۆری پڕو پووچیان زۆر بووە دەربارەی ئافرەت: لە هێندێ چەرخدا بەگیانلەبەریان دانەناون، لە هێندێ چەرخی تردا دایان ناون بەگیانلەبەرێکی تر نەك بە ئادەمی، ئینجا لەپاشدا هاتنە سەر ئەوەکەلەتیرەی ئادەمیە بەڵام زۆر ڕادەو پلەی پەستەو هیچ مافێکی نیەو وایان دائەنان کەکانی هەموو پیسی و چەپەڵیەکن، بنەڕەتی هەموو شەڕو خراپەیەکن. ئینجا لەپاشدا بیریان کردەوەو ویستیان چارەسەری ئەو هەڵە گەورەیە بکەن، لەچارەسەر کردنەکەیش دا هەر هەڵەی زۆر گەورەیان کرد، بەم ڕەنگە ئافرەتیان بەرەڵا کرد بە تەواوی و جڵەویان دایە دەست خۆیان، ئەمەیان لە بیرنەبوو کە ئافرەت ئادەمیەکەو دروست کراوە بۆ ئادەمی، لەگەڵ پیاودا دوو هاوسەرن و یەکتر تەواو ئەکەن نەك دوو شتی وێنەو یەکسانن. ئەمەی کە ئیسلام هێنای ڕێك و ڕاست و میانەیەو چارەسەر هەر ئەمەیە.

٤- ئەم ئایەتە دەست نیشان ئەکات بەوەی کە بنەڕەت و یاسای ژیانی ئادەمی لەسەر خێزانە، ئەوەتا هەر لەسەرتاو یەکەمجارەوە ئادەمێتی دامەزرا لەسەر خێزانێك کە پێك هات لەو دوو هاوسەرە، ئینجا لەو دووانەوە پەرەی سەند. ئەگەر بیویستایە هەر لە یەکەمجارەوە چەند پیاو و ئافرەتی دروست ئەکردو دوو دوو ئەیکردن بە هاوسەرو چەند خێزانێکی پێك ئەهێنا، کە هیچ خزمایەتی نەئەبوو لە ناویاندا، وە هیچ

پەیوەندیو پەیوەستیەك نەئەبوو لە نێوانیاندا بێجگە لەوەی کەیەك پەروەردگاریان ئەبوو، بەڵام بەو جۆرەی ئەویست لەبەرئەوەی پەیوەستیو پەیوەندیەکە دووقات بێت: یەکەم لەبارەی تاکە پەروەردگارەوە، دووەم لەبارەی ڕەحمو خزمایەتیەوە. جالەبەرئەوە ئیسلام ئەوەندە چاودێرییو سەرپەرشتی خێزان ئەکاتو ئەوەندە بە گرنگ گرتیو ویستی کە پارێزراو بێت لە هەر شتێك کە زیانی پێبگەیەنێو کۆشکەکەی بێهێزو لاوازبکات.

لەم سورەتەو لە چەند سورەتێکی تردا دەرئەکەوێ ئەو بە گرنگ گرتنو گوێپێدانەی کە ئیسلام پێی هەڵسا سەبارەت بە خێزان، هیچ کام لەو بارو کردەوەی کە نەفامی کۆنو تازە پێی هەڵسا شایستەو شیاو نەبوو لەگەڵ ئافرەتو خێزاندا، جالەبەرئەوە ئیسلام هیچ کامی ڕەوا نەداو قەدەغەی کردن.

٥- ئەم ئایەتە سەرنج ڕائەکێشێو دەست نیشان ئەکات بۆ ئەو هەموو جیاوازیو جۆر بەجۆریەی کە هەیە لە ئەندامەکانی ئەم ئادەمیەدا کەلە بنەڕەتدا لەیەك خێزانو لە تەنیا کەسێك جوێ بوونەتەوە، جیاوازیو جۆر بەجۆریی لە دەنگو لە ڕەنگو شێوەو وێنەو لە هەموو نیشانەو سروشتو خوو ڕەوشتو هەستو هەموو سیفەتەکانی تری دەروونداو ئاشکراو پەنهانی، بەجۆرێ بەدرێژایی هەموو چەرخو چینەکانی ئەم ئادەمیە هیچ دوو کەسێك دەست نەکەوتووەو دەست ناکەوێ کە یەکسانو وێنەی تەواوی یەکتربن!! بێگومان تێڕوانینو بیرکردنەوەیەك لەم ئادەمیە سەرسوڕهێنەرە شایستەیە بۆئەوەی کە دڵو دەروونو مێشكو دەماخ پڕبکات لە بڕوای بەهێز بەو پەروەردگارەی کە ئەم دەست کردە نایابەی داهێنا، بڕوا بەکار دروستیو زانینو توانینی بێوێنەو بێسنووری، بڕوای ئاوایش گەورەترین دەست کەوتە، چونکە خۆراكو پێبژێوی ڕۆحەو مایەی لە خواترسیو خۆ پارێزیە لەخوا، هەر بەوەیش بەندە بەختەوەر ئەبێو ئەگات بە خێرو خۆشی هەر دوو جیهان! ئینجا ئایەتەکە دوایی ئەهێنێ بە فەرماندا بەلە خواترسیو خۆپارێزی لە خواو خۆپارێزی لە ڕەحمو خزمایەتی کە هەمووی پەیوەست کردوون پێکەوە.

وَاتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ وَءَاتُوا۟ ٱلْيَتَٰمَىٰٓ أَمْوَٰلَهُمْ ۖ وَلَا تَتَبَدَّلُوا۟ ٱلْخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِ ۖ

ئەفەرمووێ: ﴿وَاتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ﴾ خۆتان بپارێزن لەو خوایەی کە داوا ئەکەن لە یەکتر بەوو بەناوی ئەو ئەپارێنەوە لەیەکتر، سوێندی پێ ئەخۆن و سوێندی یەکتری پێ ئەدەن و بەناوی ئەو پەیمان و مامەڵە ئەکەن، واتە ئەو خوایە کە بەلاتانەوە ئەوەندە گەورە و گرنگە شایستەیە بەوەی گوێڕایەڵ و فەرمانبەری بن ﴿وَٱلْأَرْحَامَ﴾ خۆتان بپارێزن لەکەس و کارو خزمەکان، چ دوورەکان.

خۆپاراستن لەخوا ناسراوو زانراوە و مەردوم باش تێئەگات لێی، بەڵام خۆپاراستن لەمان هەر قورئان دای هێناوە و بەدڵی کوسدا نەهاتووە، ئاشکرایشە کە مەبەست بەم جیاوازەو لەجۆری خۆپاراستن لە خوا نیە، بەڵام(تعبیر)ە کە هەر زۆر نایابە و ئەو پەیوەندیە زۆر گرنگ و پیرۆزو بەرێز ئەکات! خۆتان بپارێزن لێی بەم ڕەنگە بە پەرۆشەوە هەست بکەن بەو پەیوەستیە، هەست بکەن بەو مافەی کە خوا بۆی داناوە، خۆتان بپارێزن لە دەست درێژیی و ژێر پێکردنی، لەرێز نەگرتن و زامدار کردنی، بەسۆزو بەزەیی بن لەگەڵ کەس و کارو خزمەکانتان.

وتەی ﴿وَٱلْأَرْحَامَ﴾ بەژێرە و بۆرەش خوێنراوەتەوە، لەسەر خوێندنەوەی بەژێرە لە تەفسیرەکەی دا ئەڵێن: خۆتان بپارێزن لەو خوای کە ئێوە داوا ئەکەن و ئەپارێنەوە لە یەکتری پێی، داوا ئەکەن و ئەپارێنەوە لەیەکتر بەو ڕەحمە و خزمایەتیەی کە هەیە لە بەینتاندا، لەسەر بۆرە بەم دووبارە تەفسیر کراوەتەوە، واتە خزم و خوێشەکانیش هەروەها خۆپارێزیان لێ ئەکرێ، یان هەروەها داوایان پێئەکرێ لە یەکتر، بە هەر بارو لەسەر هەرکام ئەبێ گوێڕایەڵی خوا بکرێ، چونکە خوا ئاگادارە بەسەر هەموو کردەوەکانداو هیچی لێ ون نابێ، وەکو ئەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ بەڕاستی خوا هەمیشە ئاگادارە بەسەرتانداو هیچ کردەوەیەکتانی لێ ون نابێ. کەواتە ئەبێ ئێمە گوێڕایەڵ بین و هەرچی بکەین هەر لەبەر خوا بێت و نیازو مەبەستمان هەر فەرمانبەریی و ڕەزامەندی ئەوبێت.

لەپاش ئەو سەرەتا بەهێزەو دانانی بناغەو بنەڕەتە گەورەیە، ئینجا دەست ئەکات بە دامەزراندن و ڕاست کردنەوەی چەند یاسایەك کە ڕژێمی کۆمەڵ و ژیانی کۆمەڵی لەسەر ڕاگیرە کە بریتین لە هاوکاری و قوڵگیری و دەستەبەرەیی خێزان و کۆمەڵ لەناو خۆیاندا، چاودێری و پاراستنی مافی لاوازو بێ دەسەڵاتەکانیان، پاراستنی مافی ئافرەتان و ڕێزیان، پارێزگاری ماڵ و سامانی گەل و کۆمەڵ بە شێوەی گشتی، دابەش کردنی کەلەپوور بەسەر خاوەن مافەکاندا بە شێوەیەك کە دادو ڕاستی تێدایە بۆیان و خێرو بەرژەوەندی گەل و گشتی، وەك ئەمانە هەموو دێن لەم ئایەتانی داهاتووەدا.

لەیەکەمجارەوە فەرمان ئەدا بەوانەی کە کاربەدەست و چاودێرو سەرپەرشتی کەری هەتیوانن، بەمەی هەرکات باڵغ بوون ماڵ و سامانەکانیان بدەنەوە بە ڕێك و پێکی، ئەفەرمووێ: ﴿وَءَاتُوا۟ ٱلْيَتَٰمَىٰٓ أَمْوَٰلَهُمْ﴾ هەتیوەکان لەپاش باڵغ بوونیان ماڵ و سامانەکانیان بدەنەوە کە خرابووە ژێر دەستتان بۆ چاودێری و پارێزگارییان ﴿وَلَا تَتَبَدَّلُوا۟ ٱلْخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِ﴾ پیس مەگۆڕنەوە بەپاك و لەباتی پاکدا پیس بەکار مەهێنن، بەم ڕەنگە لەباتی ماڵی حەڵاڵی خۆتان ماڵی ئەوان بخۆن کە حەرامە لێتان، وەك(فەڕاو زەجاج) ئەفەرموون. یان بەم ڕەنگە لەباتی کاری پاك و خاوێندا کە پارێزگاریی ماڵی هەتیوەکەیەو دوور کەوتنەوە لە خواردنی، کاری پیس بکەن کە پچڕین و داگیرکردنیەتی، وەك هێندێ ئەفەرموون یان ماڵی چاکی بەنرخی ئەوان وەرگرن بۆ خۆتان و ماڵی خراپ و کەم نرخی خۆتان بخەنە جێگەی، کە ئەوە باو بوو لەچەرخ و سەردەمی نەفامی دا، وەك(ئیبن و جەریر) ئەگێڕێتەوە لە(سوددی)یەوە کە ئەفەرمووێ: کاربەدەستی هەتیو، بزن یان مەڕی قەڵەوی هەتیوەکەی هەڵئەگرت بۆ خۆی و لە ڕی خۆی لە جێگەی دا دائەنا، وە ئەیووت: ئەمە لەباتی ئەو، درەمی چاکی ئەوی هەڵئەگرت و درەمی قەڵبی خۆی لەباتیدا دائەنا و ئەیوت: درەمێك لەباتی درەمێکدا، (نەخەعی و زەهری ئیبن و المسیب) لەسەر ئەم ڕایەن. مەبەست جڵەوگیرییە لە هەر کردەوەیەك کە زیان بگەیەنێ بەهەتیوەکە، بەتایبەتی باسی ئەوەی کرد، چونکە ئەو کردەوە ناڕەوایە باو بووە لەو چەرخەدا، وەك بەتایبەتی دەست نیشان ئەکات بۆ کردەوەیەکی ناڕەوای تریان بۆ سەرزەنشت و بێئابڕوو کردنیان، کە ئەمە بوو: لەگەڵ ئەوەدا ماڵ و سامانیان هەبوو و پێویست نەبوون، کەچی هەر تەماعیان ئەکردە ماڵی هەتیوەکەو وەك ماڵی خۆیان سەرف ئەکرد بەبێ جیاوازی کە ئەوەش کردەوەیەکی زۆر پیس و قیزەونە،

وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَهُمْ إِلَىٰٓ أَمْوَٰلِكُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ حُوبًا كَبِيرًا ﴿٢﴾ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا۟ فِى ٱلْيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ فَوَٰحِدَةً

---

ئەفەرمووێ: ﴿وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَهُمْ إِلَىٰٓ أَمْوَٰلِكُمْ ۚ﴾ ماڵەکانی ئەوان مەخۆن لەگەڵ ماڵەکانی خۆتان. بەم ڕەنگە بەبێ سڵەمینەوەو دەست گێڕانەوە بیانهێننە ڕیزی ماڵەکانی خۆتان لە خەرج کردن و سەرف کردندا، وەك ئەویش حەڵاڵ بێت بۆتان، شتی وا نەکەن، چونکە ﴿إِنَّهُۥ كَانَ حُوبًا كَبِيرًا﴾ بێگومان ئەو خواردنە گوناهێکی گەورەیە، ئەو جۆرە کردەوە ناڕەوایانە ئەکران لەناو ئەو یەکەم چینەدا کە تازە هاتبوونە دەرەوە بە پەستی و بەد خوویی سەردەمی نەفامیی، ئەو جۆرە کردەوە ناپەسەندانەیان هێنی باوی کۆنیان بوو، لە هەموو سەردەمێکی نەفامی دا ئەبێ ستەم و ناڕەوایی بە زۆریی ببێ لە هەموو بارو ڕوویەکەوە، وەك ئێستاش لەم سەردەمی نەفامی تازەدا ئەبینین لە هەموو لایەکەوە جیهان پڕە لەو هەموو ستەم و خراپەکارییە، ئەبینین هەرکەس دەستی بڕواو بۆی ڕێك کەوێ ـ مەگەر لە خوا ترسان ـ ماڵ و مافی یەکتر داگیر نەکەن، ئیتر لێ داگیر کراو با هەتیوی بێ چارە بێت، ئەم جۆرە کردەوە خراپانە بە قانوون و یاساو زۆری و میری کاربەدەست چارەسەر ناکرێن. نەخێر بە هیچ شتێك لە ڕیشە ناهێنرێن بەتەنیا یەك شت نەبێ کە ترسانە لە خواو هەست کردن لە دەسەڵات و ئاگاداریی خوا بەسەر هەموو شتێکدا.

خوای پەروەردگار کە هەر ئەو ئاگادارە بە سروشت و دەروونی بەندەکانی، زانیویەتی کەچی شیاوو شایستەیە بۆ بەندەکانی، بەچی لاریان ڕاست ئەکرێتەوە و چارەسەر ئەکرێن، جالەبەرئەوە ڕەوای نەدا کە بێجگە لە خۆی هیچ کەسێکی تر دانەری یاساو قانوونیان بێت و هیچ کەسێکی تر خاوەنی ڕژێم و بەرنامەیان بێت، چونکە ئەوکاتە بڕواداران گوێڕایەڵی ئەکەن زۆر بەرێك و ڕاستی لە ئاشکراو پەناهنی دا. بەڵام هەر یاساو بەرنامەیەکی تر هەرچەند زۆری لەپاڵدا بێت هەر لە ئاشکراو لە ڕوودا گوێڕایەڵی ئەکرێت، ئەویش بە بێزاریی و پێناخۆش بوونەوە.

ئینجا جڵەوگیریی ئەکات لەکارو کردەوەیەکی تری خراپی سەردەمی نەفامی کەلە پاش هاتنی ئیسلامیش هەر بەکا ئەهێنرا، ئەوەیش ئەمە بوو کە کاربەدەستی ئافرەتی هەتیو، ئەو ئافرەتە عەتیوەی مارە ئەکرد نەك لەبەرئەوەی حەزی لێ بکات، بەڵکو لەبەرئەوەی ماڵی

هەبوو، لەپاش خواستنەکەی خراپ ئەبوو لەگەڵی و چاوەڕوانی ئەوەی ئەکرد کە بمرێ و ماڵەکەی بەمیراتی وەرگرێ، ئەمە قسەی(حسن)ەو چەند کەسێکی تریش لە دایکی ئیمانداران(عائیشە)وە ئەیگێڕنەوە -خوای لێ ڕازی بێت-. لە ڕێگەیەکی ترەوە کە(بوخاری و موسلیم و نەسائی و بەیهەقی) ئەیهێنن لە(عوروەی کوڕی زوبەیر)ەوە -خوای لێ ڕازی بێت- کە(عوروە) پرسیار ئەکات لە دایکی ئیمانداران، ئەویش لە وەڵامی دا ئەفەرمووێ: ئەی خوشکەزای خۆم وا ئەبوو ئافرەتی هەتیوی ماڵدار کاربەدەستەکەی حەزی ئەکرد لە خۆی و ماڵەکەی، لەبەرئەوە ئەیویست مارەی بکات، بەڵام بەبێ ئەوەی مارەیی تەواوی پێبدا، لەبەرئەوە جڵەوگیریی کران لە خواستنیان مەگەر کاتێ کە ئەوپەڕی مارەیی خۆیانیان بدەنێ، فەرمانیان پێدرا لەخواستنی ئافرەتانی تر،ئینجا بەبۆنەی هەرکام لەم دوو کردەوە ناڕاستەی کەباس کرا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تُقۡسِطُواْ فِي ٱلۡيَتَٰمَىٰ﴾ ئەگەر مەترسی ئەکەن لەمەی ستەم بکەن و داد بەکار نەهێنن لەبارەی ئافرەتە هەتیوەکانەوە ﴿فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ﴾ ئەوا ئەوان مارە مەکەن و ئافرەتانی تر بخوازن کە حەڵاڵە بۆتان، یان دڵتان ئەیانگرێ.

ئەو ستەم و بێدادیەی کە ئایەتەکە باسی ئەکات نەبەستراوە بەهیچ بارێکی تایبەتەوە، کەواتە جڵەوگیریی ئەگەیەنێ لەکاتی مەترسی لەستەم کردن لەگەڵ ئەو هەتیوە بێچارانەدا، ئیتر ستەم لەمارەییان یان داگیر کردنی ماڵیان یان بە هەر جۆرێکی تر، وەك ئەوەی کاربەدەستەکە تەمەنی گەورە بێت و هەتیوەکەش زۆر منداڵ بێت و بەدڵ حەز نەکات و لەشەرم و ناچارییدا دەنگ یان لەبەر هەر شتێکی تر. بەهەرحاڵ و لەبەر هەرچی هەرکاتێ کاربەدەستانی هەتیوەکان دڵنیا نەبوون لەداد کردن ئەبێ لادەن لە خواستنی ئەو هەتیوانە و ئافرەتی تر بخوازن.

ئەم ئایەتە بەسێ جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە، ئەوانیش هەر جوان و گونجاون، بەڵام ئەمەی کەوتمان ئەو ڕیوایەتانە و چەند ڕیوایەتێکی تر بەهێزی ئەکات لەبەرئەوە هەڵم بژارد، تا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ژمارەیەکی تایبەتی و دیاریی نەکراوبوو بۆ خواستن و کۆکردنەوەی ئافرەتان، بەڵکو هەرکەس هەرچەند ژنی ببوایە دروست و ڕەوا بوو، ئینجا بەم ئایەتە ژمارە و سنوور دیاریی کرا بۆ کۆکردنەوەیان بە چوار. فەرمووی: ﴿مَثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ﴾ بخوازن دوو دوو سێ سێ و چوار چوار. ﴿فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تَعۡدِلُواْ﴾ ئینجا ئەگەر مەترسی ئەکەن لەوەی بە داد ڕەفتار نەکەن لەگەڵ زیاد لە یەك ژن ﴿فَوَٰحِدَةً﴾ هەریەك ئافرەت بێنن لەئازادان،

﴿أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ﴾ یان ئەو ئافرەت و کەنیزەکانەی کە موڵکتانن، ئەگەر ئەوانە زۆریش بن هەر دروستەو ڕەوایە، چونکە ئەرکیان سووك ترەو چوونە لایان بەرەو ئازاد کردن ئەیانبات، چونکە هەر لەگەڵ منداڵیان بوو ئیتر قەدەغەیە فرۆشتنیان و بە مردنی خاوەنەکانیان ئازاد ئەبن، کەواتە زۆرییەکەیان بەرژەوەندی خۆیانی تێدایە!

لەپاش تەواو کردنی تەفسیری سورەتی ﴿الأحزاب﴾ کەلەپێش ئێرەدا تەفسیرم کرد، باسێکم نووسی لەبارەی ڕەوادانی ئیسلام بۆ خواستن و کۆکردنەوەی زیاد لەیەك ئافرەت، لام وایە خوا بۆی ڕێك خستم باسێکی چاکم نووسیوە کە هەرکەسێك نەشارەزاو ژیر بێت ئەو باسەی بەسە، بەڵام لەبەرئەوەی هێندێ لەنەزان و هەڵخەڵەتێنراوانی بێگانە لەبەر خۆیانەوە ـ وەك وڕێنەبکەن ـ دەم درێژیی ئەکەن و ڕەخنە ئەگرن لەو ڕەوادانی ئیسلامە، لەکاتێکدا کە زۆر لە نووسەرو زاناکانی بێگانە بڕوایان هێناو بڵاویان کردەوە لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی خۆیاندا کە ئەو ڕەوادانە زۆر ڕاست و بەجێیە، لەبەرئەوەی نەزان و شوێن کەوتووەکان لە وڵاتی موسڵمانانەدا هەر لەوڕێنە نەکەوتوون. بەباشی ئەزانم لێرەشدا ـ کەجێی ڕاستەقینەی خۆیەتی ـ ئەندازەیەك بدوێم لەو بارەیەوە بە یارمەتی خوا. بێگومان هەرکەسێك لافی بڕوا بە خوا لێ بداو خۆی بە بڕوادار دابنێ هەرگیز سەرناکاتەوە لە هەر کارو بڕیارێکی خوا، ئیتر با بەهیچ ڕەنگ تێنەگات لە هۆو بەرژەوەندی ئەوکارو بڕیارە، چونکە ئەزانێ هەر ڕەخنەو دوو دڵی و سەر لێ کردنەوەیەك نەفامیەو نەزانیەو گومڕاییەو ئەوپەڕی بێشەرمیەو لەگەڵ بڕواکەی دا کۆ نابێتەوە، بەڵێ ئەوانەی کە بڕوای ڕێك و ڕاستیان هەیە بەبێ گومان بێ ڕەخنە گرتن، بەڵام حەز ئەکەن تێ بگەن لە بەشێك لە کاردوستی و حیکمەتی خوا لە هێندێك لەکارو کردەوەکانی، ئەو حەزکردنەی زۆر ڕەواو بەجێیە، کەواتە با ئەم دوو جۆرە مەردومانە بەباشی گوێ بگرن لەم باسە بەڵکو بەئیزنی خوا بەهرەمەند ببن پێی! بێگومان و هەموو مێژوو شایەتە کە ئیسلام خواستنی زیاد لە یەك ژنی دانەهێناوە، بەڵکو لەپێش ئیسلام دا هەر باو بووە ـ بەبێ ڕەخنە لێ گرتن ـ خواستن و کۆکردنەوەی هەرچەند لە ئافرەت بەپێی توانا و ئارەزوو، تا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە سنووری دیاریی کردو مەرجی بۆ دانا، وەك

ئاماژەیان بۆکرد. ئینجا با بزانین ئایا بۆچی قەدەغەی نەکردو لەم مەرج و سنوورەدا هێشتیەوە؟ ئیسلام ڕژێمێکە بۆ ئادەمی، ڕێك و پێك و گونجاوە لەگەڵ سروشتی و لەگەڵ هەموو پێویست و داخوازەکانی، لەگەڵ هەموو بارو بەسەرهاتە جیاوازکانی کە ئەگۆڕێن بەپێی کات و چەرخ و چین و شوێن.

ئیسلام ڕژێمێکی ڕاست و ڕێك و میانەیەو هیچ شتێکی دژو نەگونجاو نیە لەگەڵ سروشتی ئادەمی دا، سروشت ڕاگیر ئەکات لەڕادەی خۆی دا بەبێ زیادە ڕەوی و کەم و کوڕی. ڕژێمێکە زۆر بە گرنگ سەرنجی خوو ڕەوشت ئەدات و چاودێریی ئەکات، مەبەست و ئامانجی پاك و خاوێنی گەل و کۆمەڵە، کەواتە بە هیچ ڕەنگ ناگونجێ لەگەڵ بێبڕوایی و ماددێتی دا، کە ئەخلاق و ڕەوشت ناهێڵێ و گەل و کۆمەڵ چەپەڵ ئەکات. جا کاتێ ڕژێمی ئیسلامیمان بەو جۆرە ناسی و بەو شێوەیە وەرمان گرت، لەکاتێکدا کە سەنجی ئەم مەسەلەیە بدەین ـ مەسەلەی زیاد لەیەك ئافرەت بۆپیاوێك ـ ئەبینین:

یەکەم: زۆر لە گەل و کۆمەڵەکانی ئادەمی لە زۆر کاتدا ژمارەی ئافرەتەکانی کە دەست بدەن بۆ شووکردن زۆر ترو زیاد ترە لە ژمارەی ئەو پیاوانەی کە دەست بدەن بۆ ژنهێنان، بەپێی مێژوو نەبیستراوە ڕادە ڕێژەی ئەو زیادی یەتییە ڕەت بکات لە چوار قات، بەڵکو هەمیشە لەو سنوورەدا بووە. دەی ئایا لەو جۆرە کۆمەڵانەدا چۆن چارەسەری ئەو گرێیە بکەن؟ بێگومان پێویستە بۆ ئەوە ڕژێمێك ببێ، پێویستە کارو کردەوەیەك بەکار بهێنرێ. بێگومان بەرامبەر ئەو گرێیە ئەبێ یەکێ لەم تیرو بارانە بەکاربهێرێ:

١- هەر پیاوێك ئافرەتێك لەوانە بێنێ، ئینجا ئەوەی کە زیادە بەش بڕاو بێ و بەبێ مێردو ماڵ و حاڵ بمێنێتەوە!

٢- هەر پیاوێك یەکێ لەو ئافرەتانە بێنێ بە پاك و خاوێنی و بەشەرعی، بەداوێن پیسی بجوڵێتەوە لەگەڵ ئەو ئافرەتانەی کە زیادن، ئیتر بەئاشکرا یان بەنهێنی!

٣- هەموو پیاوەکان یان هێندێکیان زیاد لە یەك ژن بێنن تا هەر ئافرەتێك کە بیەوێ شوو بکات بێبەش نەبێ لەماڵ و مێردو ڕۆڵەی شەرعی خۆی! بێگومان تیرو باری یەکەم دژی سروشتە و ستەم و تاوانێکی گەورەیە بەو ئافرەتە بەش بڕاوانە، ئەوەی کە هێندێ لە چەند باران ئەیڵێن کە ئافرەت ئەتوانێ بەکارو کردەوە لە کارگەکاندا خۆی بژیەنێ

بەبێ پێویست کردن بە پیاو، هەموو کەس ئەزانێ کە چارەسەر نیە، چونکە بە تەنها پوول‌و پارەو خۆراك‌و پۆشاك كاری ئافرەت تەواو نابێ، ژیانی سروشتی پێك نایەت بەبێ بەدی هاتنی هەموو پێویست‌و داخوازەكان، چ لەشی‌و چ دەروونی‌و چ ڕۆح‌و چ ژیریی، ئەوەتا پیاویش كارو كردەوەو پوول‌و پارەی دەست كەوت ئەبێ، بەلام بەسۆزو هەڵە داوان ئەگەرێ بەدوای هاوسەری ژیانی دا، ئافرەتیش وەك پیاو وایە لەوەدا، چونكە لە یەك كەس دروست كراون. تیرو باری دووەم دژو نەگونجاوە لەگەڵ ئەو پاكی‌و خاوێنیەی كە ئیسلام ئەیەوێ بۆ گەل‌و كۆمەڵ‌و دژی ڕێزی ئافرەتەو ژێر پێ‌كردنی مافی ئافرەتی تێدایە. تیروباری سێیەم ئیسلام هەڵی بژارد بە چارەسەر، هەڵی نەبژارد بەو مەرجە نەبێ كە باس كرا. كە هیچ چارەسەرێكی تر نیە لەو كاتانەدا كە ژمارەی ئافرەت زۆرتر بێت.

دووەم: ئەبینین لەناو هەموو گەل‌و كۆمەڵەكاندا لە كۆن‌و تازەو لە ئێستاو لە داهاتوویشدا بارو حاڵەتێك، كە ڕێگە نیەو ئەبێ دانی پیا بنرێ، ئەوەش ئەمەیە: ئافرەت لە تەمەنی پەنجاو دەورووبەری لە سك‌و بەرە ئەوەستێ‌و منداڵی نابێ، لەكاتێكدا پیاو تا تەمەنی حەفتاو بەرەو ژوویش هەر دەست ئەدا بۆ ئاوس كردنی ئافرەت، بێ‌گومان مەبەستی گەورەو سەرەكی لە یەك گرتن‌و گەیشتنی پیاوو ئافرەت بەیەك، پەیدا بوونی منداڵ‌و زاوزێیە، درێژە دان بە ژیان‌و ئاوەدان كردنەوەی وڵات، دەی ئایا هیچ گوێ نەدەین بەو بیست ساڵە زیادەی پیاوەو هەروا بەبۆشی بڕوا؟ نەخێر نابێ‌و شتی وا ڕاست نیە، بەڵكو ڕاست ئەمەیە كە یاسایەك دابنرێ كە ڕێ بدات بە هێنانی ژنی تر تا ئەو ماوە ژیانەی نەڕوا بە فێرو بەبێ بەر، هەروەها ڕێ بدات - باشتر - بە هەر پیاوێك كە ژنەكەی نەزۆك بێت، نەك بەرگری بكرێ تابێبەش ببێ لە منداڵ، یا ڕەوا بدرێ دەست لە نەزۆكە كە هەڵگرێ‌و یەكێ تر بێنێ كە ئەوە شتێكی زۆر ناڕەوایەو مایەی تف‌و نەفرینە لە لایەن مەردومانەوە! بێجگە لەمانەش زۆر جاری وا هەیە پیاو وا لە جۆشی هێزاو ئارەزووی ژن‌و مێردیی زۆر بەتینە، بەلام ژنەكەی — لەبەر پیری یان نەخۆشی — هیچ ئارەزووی نیەو بێزارە لەو كارە، هەردووكیان حەز ناكەن بەجوێ بوونەوەو پچڕینی ئەو پەیوەندیەی كە هەیانە، دەی ئایا لێرەدا چی بكەین؟ بەرگری بكەین لە ژن هێنان‌و بەزۆر بەرگری بكەین لە بەجێ‌هێنانی كاری

سروشتی چارنەکراوی خۆی‌و پیشی پێ بخۆینەوە تا بە ژیانی تاڵ‌و سەختەوە ئەمرێ؟ بێگومان ئەوە ستەمێکی گەورەیە‌و دژی دادە. ئەی ئایا ڕێی نەگرین تا بەبێ نامووسی‌و داوێن پیسی ئارەزووی خۆی بمرێنێ؟ بێگومان ئەوە کاری ئادەمیانە نیە‌و هەر شایستەی چوارپێ‌و گیانلەبەرانی ترە. کەواتە هەر ئەوە مایەوە کە ڕێی بدەین بە شەرعی ژنی تر بێنێ، بەداد ڕەفتار بکات لەگەڵ ژنی پێشوو‌و تازەدا، تا بەوە چارەسەری ئارەزووە سروشتیەکەی بکات بەبێ چەپەڵ بوون‌و دووچار بوون‌و دووچار بوونی بێ نامووسی، لام وایە ئەم ئەندازەیە بەس بێ بۆ هەرکەسێك کە بەدوای ڕاستی دا بگەڕێ.

بەدرێژیی لە چەند سورەتێکدا کەلە پێش ئێرە تەفسیرمان کردوون باسی مەسەلەی بەندەمان کردووە‌و ڕاو بڕیاری ئیسلاممان ڕوون کردووەتەوە بە جۆرێ ڕێگەنەماوەتەوە بۆ هیچ ڕەخنەیەك. کەواتە لێرەدا هیچ ناڵێین، با باسەکە زۆر درێژی نەبێ با تەماشای ئەو سورەتانە بکرێ: ﴿مؤمنون، نور، معارج﴾ بەم ئەندازە بیرکردنەوە‌و لێکۆڵینەوە دەرئەکەوێ بۆ هەرکەسێك کە بێ بەش نەبێ لە ژیریی، دەرئەکەوێ گەورەیی‌و بەرزی‌و پاکی ئەم یاسای کە قورئان هێنای دەربارەی خواستن‌و کۆکردنەوەی زیاد لەیەك ئافرەت، کەواتە هەرکەس ڕێزی خۆی بەلاوە هەرگیز دەمبازیی ناکات لەم مەسەلەدا با هەموو نەشارەزایەك بزانێ کە هەموو کارو بڕیارەکانی ئیسلام هەر بەم جۆرە بەرزو پاکە‌و بێجگە لە ئیسلام هیچ شتێکی تر چارەسەر نیە!! ئینجا لە کۆتایی ئایەتەکەدا ئاماژە ئەکات بۆ هۆو حیکمەتی بڕیارو فەرمانەکان، ئەفەرمووێ: ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەوەی کە باس کرا، وات دوور کەوتنەوە لە مارە کردنی هەتیوەکان لەکاتی مەترسی لە جەورو ستەم کردن، وە مارە کردنی ئافرەتانی تر تا چوار، تەنیا ئافرەتێك، ئەگەر مەترسی بوو لەستەم کردن لەهێنانی زیاد لە یەك ئافرەت‌و کەنیزەکەکان مولکن. ﴿أَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُواْ﴾ نزیك ترە لە ستەم نەکردنتان، واتە مەبەست بەو فەرمانە پاراستنتانە لە جەورو نزیك کەوتنەوەتان لەدادو دادپەروەریی، بێگومان ئەم ئیسلامە بۆ ئەوە هات کە ستەم لە ڕیشە بێنێ‌و داد بەدی بێنێ لە شوێنی دا!!

وَءَاتُوا۟ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَـٰتِهِنَّ نِحْلَةًۚ فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَىْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيٓـًٔا مَّرِيٓـًٔا ﴿٤﴾ وَلَا تُؤْتُوا۟ ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ ٱلَّتِى جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ قِيَـٰمًا وَٱرْزُقُوهُمْ فِيهَا وَٱكْسُوهُمْ .

---

ئینجا هەمیتر ئەڕوا لەسەر هێندێکی تر لەمافی ئافرەت، پێش ئەوەی لەباسی هەتیوان ببێتەوە، باسی مارەییەکەی ئەکات و ئەیگێڕێ بەمافی تایبەتی خۆی، بەوە ئەدا لەهەر جۆرە ستەمێك کە کراوە لە ئافرەت لەو بارەیەوە. ئەفەرمووێ: ﴿وَءَاتُوا۟ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَـٰتِهِنَّ نِحْلَةًۚ﴾ ئەو ئافرەتانەی کە ڕەوایە مارە کردنیان و مارەیان ئەکەن، مارەییەکانیان بدەنێ بەخۆشی و پێخۆش بوونی دڵەوە، یان بیاندەنێ لەکاتێکدا کە ئەو مارەییانە بەخششێکن پێویست کراون لەلایەن خواوە. ﴿فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَىْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا﴾ ئینجا ئەگەر ژنەکانتان بە دڵ پێیان خۆش بوو و وازیان هێنا لە هەر شتێك لە مارەییەکانیان بۆتان ﴿فَكُلُوهُ هَنِيٓـًٔا مَّرِيٓـًٔا﴾ ئەو کاتە ئێوەیش بیخۆن و سوودی لێ وەرگرن چۆن حەز ئەکەن، بیخۆن بە پاك و حەڵاڵی و بە نۆشەوە بەبێ ئەوەی دوا ڕۆژی خراپی ببێ نەلە جیهان و نەلە ڕۆژی دوایی دا، واتە بەخشین و پێدانی ڕووت هیچ نیە، بەڵکو ئەبێ بەدڵ و بەپێخۆش بوون بیدا بەبێ زۆر پێهێنان یان لە ڕوو دامان، کەواتە پێویستە لەسەر مێردەکان ئیحتیات بکەن و تا نەزانن بەدڵ داویانە نەیخۆن.

لەپێشەوە بە کورتی فەرمانی دا بە دانەوەی ماڵی هەتیوەکان بە خۆیان لەپاش باڵغ بوونیان، ئینجا بەبۆنەی مارەکردنی ئافرەتە هەتیوەکانەوە باس و بڕیارێکی گشتی هێنا سەبارەت بە مارەکردنی لە یەك ئافرەت، لەپاش ئەوە ئەگەڕێتەوە بۆ سەر ماڵی هەتیوەکان بەدرێژی باسی چۆنێتی دانەوەی ماڵەکانیان ئەکات. لە یەکەم جارەوە ئەفەرمووێ: ﴿وَلَا تُؤْتُوا۟ ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ ٱلَّتِى جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ قِيَـٰمًا﴾ ماڵ و داراییەکانتان کە خوا گێڕاویەتی بۆتان بەهۆی ژیان و ڕاگیر بوونی کاروبارتان، ئەو ماڵ و داراییە بە نرخە مەدەن بەوانەی کە ژیر نین و بەفیڕۆ بەبێ جێ ماڵ بەخت ئەکەن، ئیتر ئەوانە نێر بن یان مێ، هەتیووبن، یا باوك دار، گەورە بن یان منداڵ، کەواتە مارەیی ئافرەتەکانیش بە مەرجێ ئەدرێ بە خۆیان کە ژیرن و ماڵ بەفیڕۆ سەرف نەکەن، هەروەها بەم مەرجە بەخشینی مارەییەکانیان بە مێردەکانیان، ڕاست و ڕەوایە بۆ مێردەکان. فەرمووی: ماڵەکانتان و نەیفەرموو ماڵەکانیان، لەبەر چەند هۆیەك وەك زانایان فەرموویانە:

١- ئەگەرماڵی گێلەكان بدەنەوەبەخۆیان وئەوانیش لەناوی بەرن، ئەبێ هەركاربەدەستە-كانیان بیانژیەنن، كەواتەوەك ماڵی خۆیانیان پێدابن و ئەوانیش لە ناویان بردبێ وایە.

٢- ئەوانەكاتێ بەژێریی ماڵەكانیان درایەوەبە بەرهەمی ئەهێنن و گەشەی پێئەدەن و زۆری ئەكەن، وە لەبەرژەوەندی تایبەتی وگشتیدا بەختی ئەكەن، ئەو كاتە كاربەدەستەكانیان بەهرەمەندو سوود بەخش ئەبن، كەواتە وەك ماڵی خۆیان بێ لایان وایە.

٣- ئیسلام یەكێتی و دەستەبەرەیی(التكافل) داناوە چ یەكێتی و دەستە بەرەیی ناو خزم و خێزان،وە چ یەكێتی ودەستەبەرەیی گشتی ئوممەتدا، بەرژەوەندی هەركەسێكی داناوە بە بەرژەوەندیی ئەوانی تر.كەواتە ماڵ و دارایی هەركام وەك هینی ئەوانی تر بێت وایە.

٤- ماڵ ودارایی ئەوگێل وناتەواوانە ئەبێ لە ژێر دەستی خاوەن و كار بەدەستەكانیان بێت، هەمووكاروبارو تەسەڕوفێك بەدەست ئەمانە، لەبەرئەوە ڕێكەو ناوبردنی بە ماڵی ئەمان.

ئەسڵ لەماڵ و ساماندا ئەمەیە كەلە یەكەمجار هینی گشتی بێت، وەك بە ڕووكەش وانیشان ئەدات كە ئەفەرمووێ: ﴿خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا﴾ دروستی كردووە بۆتان هەرچی وا لە زەوی دا بە تێكڕایی، وەك كۆمەڵ خاوەنی ئەمان بێت، وەلە كۆمەڵەوە بگات بەدەستی یەكە یەكەو ئەندام، ئەمان وەك جێنشین و جێگیری ئەوان وان، كەواتە لەسەر هەر بارێك ڕاستە ناوبردنی بە ماڵی خاوەن و كاربەدەستەكان، زۆر پڕ تام و مەزەیە كە ئەفەرمووێ: ﴿أَمْوَٰلَكُمُ ٱلَّتِى جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ قِيَـٰمًا﴾، كاتێ پێویستێ بەو لێكۆڵینەوەو قسەو باسەكە ئەو گێل و ناژیرانە نەبرێن بەسەر ژن یان منداڵیان یان هەردووی خاوەن و كاربەدەستەكاندا، وەك لەسەر ئەو بارە تەفسیرمان هێناو دڵیش هەر بەوە بە ئارامەو زۆربەو جەماوریشی لەسەرە. ئەگەر لەسەر ڕای هێندێ بڕۆین كە ئەیبڕن بەسەر ئەوانەدا، ئەو كاتە هیچی ناوێ و جێی هیچ قسەو باسێك نیە، چونكە مەبەست بەو ماڵە ماڵی باوكەكانیانەو مێردی ژنەكان، بەهەر حاڵ و لەسەر هەربار ئەفەرمووێ: ﴿وَٱرْزُقُوهُمْ فِيهَا وَٱكْسُوهُمْ﴾ ڕۆزی و خۆراك و پۆشاكیان بدەن لەناو ئەو ماڵ و سامانەداو ئەو ماڵ و سامانە بكەن بەجێ و شوێنی ڕۆزی و پۆشاكیان، بەم ڕەنگە مامەڵەو بازرگانی بكەن پێیان و لە بەرهەم و قازانجیان بە خێویان بكەن، مەبەست ئەوە نیە كە ئەبێ هەر لەبەرهەم و قازانج بەخێویان بكەن، بەڵكو مەبەست ڕێنموونیە بۆ ئەوەی كە باشتر ئەوەیە ئەو ماڵ و سامانە نەوەستێنن و بیخەنە ئیش با تەواو نەبێ و ئەو كاتە بێ نەواو دەستە پاچەبێن!! هەركەس ژیرو شارەزا بێت ئەزانێ ڕێگەی بەختەوەریی هەر ئەوەیە كە ئیسلام بۆی هێناین.

وَقُولُواْ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٥﴾ وَٱبْتَلُواْ ٱلْيَتَٰمَىٰ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُواْ ٱلنِّكَاحَ فَإِنْ ءَانَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَٱدْفَعُوٓاْ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ ۖ وَلَا تَأْكُلُوهَآ إِسْرَافًا وَبِدَارًا أَن يَكْبَرُواْ ۚ وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ ۖ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ

---

﴿وَقُولُواْ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا﴾ وه قسه‌و وته‌یه‌کیان له‌گه‌ڵ بکه‌ن که باش بێت‌و پێی دڵخۆش ببن، قسه‌یه‌کی وابێ که ویستراوو ئاره‌زووکراو بێت، به‌م ڕه‌نگه به هه‌تیوه که بڵێ: ئه‌مه ماڵی تۆیه‌و لای منه‌و من ئه‌میندارم به‌سه‌ریه‌وه هه‌ر کات باڵغ بویت ئه‌یده‌مه‌وه پێت، یان به‌ڵێنی شتی چاکی پێبدا، ئه‌گه‌ر گێله ئامۆژگاری بکات‌و هانی بدات له‌سه‌ر خواپه‌رستی‌و بیترسێنێ له ماڵ به‌خت کردن له خۆڕایی‌و به‌فیڕۆ، هه‌موو قسه‌ی چاکی تر وه‌ك زانایان فه‌رموویانه: ئینجا باسی کات‌و مه‌رجی دانه‌وه‌ی ماڵی هه‌تیوه ئه‌کات، ئه‌فه‌رمووێ: ﴿وَٱبْتَلُواْ ٱلْيَتَٰمَىٰ﴾ هه‌تیوه‌کان تاقی بکه‌نه‌وه له‌کارو کرده‌وه‌ی جیهانیاندا به‌لای(ئیمامی حه‌نه‌فی)ه‌وه، له ئایینیشدا به‌لای(ئیمامی شافیعی)ه‌وه ئیتر تاقی کردنه‌وه به‌وه بێ‌کڕین‌و فرۆشتنیان پێبکرێ وه‌ك(حه‌نه‌فی) ئه‌فه‌رمووێ، یان به‌وه‌ی بێت له‌پێش چاویان ئه‌و کردەوانه بکرێ‌و دووچاری پرسیاریان لێ بکات له‌چاکی‌و خراپی ئه‌و کرده‌وانه تا به‌وه ژیریی‌و وریاییان ده‌رکه‌وێ، وه‌ك(شافیعی) ئه‌فه‌رمووێ. ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُواْ ٱلنِّكَاحَ﴾ هه‌تا کاتێك باڵغ ئه‌بن‌و ئه‌گه‌نه ئه‌و ڕاده‌ی ژن بێنن یان شوو بکه‌ن ﴿فَإِنْ ءَانَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا﴾ ئینجا ئه‌گه‌ر هه‌ست بکه‌ن لێیانه‌وه به‌ژیریی‌و ڕێ بردنیان به به‌رژه‌وه‌ندی‌و کاروباری خۆیان ﴿فَٱدْفَعُوٓاْ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ﴾ ئه‌وکاته به‌بێ ته‌فره دان ماڵه‌کانیان بده‌نه‌وه به خۆیان‌و بیخه‌نه ژێر ده‌ستی خۆیان، که‌واته مه‌رجی ئه‌و ماڵ دانه‌وه دووشته: باڵغ بوون، هه‌ست کردن به‌وه‌ی که فێربوون‌و لێ زانیه‌کیان هه‌یه‌و ئه‌زانن کاروباری خۆیان ببه‌ن به ڕێوه، ئیتر با ناته‌واویشیان ببێ، وه‌ك ده‌رئه‌که‌وێ له‌وته‌ی ﴿رُشْدًا﴾ه‌وه، که بۆ که‌مترین به‌کار ئه‌هێنرێ، له باڵغ بووندا چه‌ند ڕایه‌ك هه‌یه له‌لایه‌ن زانایانه‌وه با سه‌رنجی کتێبی مه‌زهه‌به‌کان بدرێ‌و پێویست نیه لێره‌دا ئه‌و درێژه پێدانه. ئینجا جڵه‌وگیریی ئه‌کات له دووجۆر زایه کردن‌و ماڵی هه‌تیوه‌کان که باوبوون له‌و چه‌رخه‌دا،

هەروەها لەهەر چەرخێکدا کە پاك نەبووبێتەوە لە کردەوەو باوی نەفامی، زیادە ڕەوی بەفیڕۆ بەخت کردنی ماڵی هەتیو با بۆ خۆیشی سەرف بکرێ.

پەلەکردن و پێش برکێ بە هێندێ تسەڕوف و کردەوە لە ماڵی هەتیوەکەدا، تا گەورە نەبووەو ماڵەکەی وەرنەگرتووەتەوە، ئەفەرمووێ: ﴿وَلَا تَأۡكُلُوهَآ إِسۡرَافٗا وَبِدَارًا أَن يَكۡبَرُواْۚ﴾ ماڵەکانیان مەخۆن بەبێ جێ و بە زیادە ڕەوی کردن و بەفیڕۆ، بابۆ هەتیوەکانیش بێت، بە پەلە کردن و پێش برکێ لەوەی هەتیوەکان باڵغ و تەمەن گەورە بن و لە دەستتان وەرنەگرنەوە، واتە هێندێ کردەوەو تەسەڕوف مەکەن لە مامەڵەکانیاندا کە سوودی خۆتانی تیایەو هیچ سوودی ئاوانی تیا نیەو ئەتانەوێ دەست پێشخەریی بکەن لەوەی کاتی وەرگرتنەوەیان بێت. بێگومان زایە کردن و لەناو بردنی ماڵی هەتیو بە ناهەق قەدەغەیە، ئیتر بەهەرجۆرو شێوەیەك ببێ، پاش ئەم دوو جۆرە لێرەدا بە تایبەتی دەست نیشانی تیایە بەپلارلێدان و سەرزەنشت کردن لەسەر هەڵسان بەو دوو جۆرە کارە بەدە.

خواردن و لەناو بردنی ماڵی هەتیو بەو جۆرانەی کەباس کران قەدەغەن، بەڵام ئەگەر لەباتی و لە کرێی سەرپەرشتی و ئەرکی بەخێوکردنی ماڵەکەیاندا بێت ئەوە بەم جۆرەیە کە ئەفەرمووێ: ﴿وَمَن كَانَ غَنِيّٗا فَلۡيَسۡتَعۡفِفۡۖ﴾ ئەگەر هەرکەس لەکار بەدەست و وەسیەکان دەوڵەمەندو بێ پێویستە با خۆی بگرێ و خۆی بکات لەو خواردنەو دڵئارام بێت بەوەی کە خوا پێی داوەو ئەجرو کرێی لە خوا داوا بکات. ﴿وَمَن كَانَ فَقِيرٗا فَلۡيَأۡكُلۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ﴾ هەرکەس لەوان بێ نەوایەو پێویستی هەیە با بخوا بە ئەندازەیەك کە پێویستەو ناچارە پێی وەك(عطا قتادة) ئەفەرموون. یان بە ئەندازەیەك خزمەت و سوودی بۆ هەتیوو ماڵەکەی، وەك(تەبەرانی) ئەگێڕێتەوە لە(ئیبن و عەباس)ەوە -خوای لێ ڕازی بێت- بە مەرجێ زیادە ڕەوی نەکات، یان بە ئەندازەیە کە بەسیەتی، بەڵام بە نیازی قەرزو هەرکات بەدەستی هات بیداتەوە، وەك(سەعیدی کوڕی جوبەیرو مجاهدو ئەبو العالیەو زەهەری و سلمان و ئیمام محمدی باقر) ئەفەرموون. بەهەر حاڵ حەڵاڵە بۆ ئەو فەقیرە، وە بە ڕای بەهێز ـ کە چەند حەدیس و ڕیوایەتێکی لەسەرە ـ دروستە با بە قەرزیش نەبێ.

فَإِذَا دَفَعْتُمْ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ فَأَشْهِدُوا۟ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴿٦﴾ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ

---

﴿فَإِذَا دَفَعْتُمْ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ فَأَشْهِدُوا۟ عَلَيْهِمْ﴾ ئینجا کاتێ ماڵی هەتیوەکانتان دایەوە پێیان شایەتیان لەسەر بگرن کەوا ماڵەکەی خۆیان وەرگرتەوە، تا دەرکەوێ کە ئێوە هیچتان لا نەماوەو ڕێگەی داواو ئاژاوە نەمێنێ، ئەم شایەت گرتنە فەرزو پێویستە بەلای(شافیعیەکان و مالیکیەکان)ەوە، وە سوننەتە بەلای(حەنەفی) و زۆربەوە، ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا﴾ بەسە خوا بە ئاگادارو شایەت بەسەرتانەوە، یان بەسە بەمەی ئاگادارەو حسابتان لەگەڵ ئەکات، واتە خوا لە هەموو کەس ئاگادار ترەو شایەتی خوا بە تین ترە لە شایەتی هەموو کەس، یان موحاسەبەی خوا بەهێزترو سامناك ترە لەمینی هەموو کەس. لەسەر هەرکام هەڕەشەی لێ وەرئەگیرێ لەسەر هەر ناپاکی و ستەم و کردەوەیەکی ناڕەوا کە بەکاربهێنرێ لەو دانەوەو وەرگرتنەدا، ئەو هەموو توندو تیژییەو ئەو هەموو ترساندن و ئامۆژگاریەی کەبەکاری هێنا لە مەسەلەی ماڵی هەتیوەکاندا، دەست نیشان ئەکات بەو هەموو ستەم و دەست درێژییە کە باو بووە کردن و بەکار هێنانی دەربارەی هەتیوو بێ دەسەڵات و ولاوازەکان.

ئا بەو جۆرە ئەم بەرنامەی خوا هات و هەموو نیشانەو دروشمی سەردەمی نەفامی سڕیەوە لە گەل و ئەندامانی گەل، نیشانەو دروشمەکانی ئیسلامی لە جێگەی ئەواندا دامەزراند، شێوەو وێنەی نەفامی سڕیەوە لە ڕووی گەل، شێوەو وێنەی ئیسلامی لە جێگایاندا دانا، دڵ و دەروون و هەست و باوو کردارو یاسای گەلی تازەی داڕشت، لە ژێر سایەی لە خوا ترسی و هەست کردن بە ئاگاداریی خوا لە هەموو شتێکدا، ئەمەی گێڕا بە پارێزگەر بۆ ئاین و شەریعەتی خوا، پاڵ پێوەنەر بۆ فەرمانبەریی و هەڵسان بە فەرمانەکانی خوا، هیچ بەرنامەو یاسایەك بەبێ ئەم ترس و هەستە جێگیر نابێ و فەرمانەکانی بە ڕاستی پەیڕەوی ناکرێ.

لەسەردەمی نەفامی دا ئافرەت و منداڵ بێبەش کران ـ مەگەر بەشێکی زۆر کەم ـ لەمیراتی و کەلەپوور، چونکە ئەمانە جەنگ ناکەن و ناتوانن و بەرگریی دوژمن بکەن، ئینجا ئیسلام هات هەموو خزم و خوێشی بەشدار کرد لە کەلەپووردا بەو جۆرو شێوەی کەلە

کتێبەکانی ئیسلامدا باس کراوە، ئەوەیش بەپێی بیروباوەڕە ڕاست و ڕەواکەی خۆی کە بریتیە لە(تکافل) دەستەبەرەیی لەبەینی ئەندامانی یەك بەرەو خێزاندا، دەستە بەرەیی گشتی لە ئادەمیێتیدا، بێ ئەواو هەرارو داماوان ئەبێ لە یەکەمجارەوە کەس و کاریان بەخێویان بکەن و ئەرکیان بکێشن، لەپاش ئەوان ئەبێ گەل و موسڵمانانی تر، هەروەها لە یەکەمجارەوە خزم و خوێش ئەبێ یارمەتی یەکتر بدەن لە خوێن و بژاردنی زام و دەست درێژییەك کە بکەوێتە سەر هەرکامیان، لەپاش ئەوان ئەو خوێن دان و بژاردنە ڕوو ئەکەنە میریی کە نوێنەریی گەل و گشتیە، کەواتە زۆر ڕێك و بەجێیە کە ئیسلام کەلەپوورو میراتی لە یەکەمجارەوە ئەدا لەکەس و کار، لەپاش ئەوان ئەیکات بە ماڵی گشتی و دەوڵەت وەری ئەگرێ و بەختی ئەکات لە پێویست و بەرژەوەندی دا، بێگومان هەرکەسێك تێگەیشتبێ لە ڕژێمی کۆمەڵایەتی ئیسلام و ئەو بنەڕەتە ڕاست و ڕەوای کە ئەو ڕژێمەی لەسەر داڕێژراوە، هەرکەسێك لەوانە تێگەیشتبێ ئەزانێ کە هەرکەسێك ژیرو تێگەیشتوو بێت هەرگیز لانادات لەوەی کە ئیسلام دایناوە، هەرگیز هیچ گومان و دوو دڵی و ڕەخنەیەك ڕووی تێناکات.

یاسای ڕژێمی کۆمەڵایەتی ئیسلام بریتیەلەدەستەبەرەیی، بەردی بناغەکەی دەستەبەرەی یە لە چوار چێوەی خێزان و خزم و خوێشدا کە خوا مەیل و سۆزو بەزەیی تایبەتی خستووە ناویان، لەپاش ئەوە دەستە بەرەیی لە چوار چێوەی گەل و کۆمەڵی ناوچەکە ناسراوی هەیە لە نێوانیاندا، ئینجا دەستەکاریی دەوڵەت دێتە پێشەوە کە نوێنەری هەموانە، هەموو ئەرك و چارەسەرێك ڕوو ئەکاتە ئەو، بە پێك هێنانی ئەو دەستە بەرەییانە یەکێتی ئەچەسپێنێ لەناو هەمووانداو هەموو جۆش ئەدات پێکەوە، هەموو کەس هەست ئەکات بەوەی بەشدارە لە ماف و ماڵی یەکترو گشتی دا، وەك گەل و گشتی بەشدارە لە ماف و ماڵی یەکە و ئەندامەکاندا! ئینجا بەڕێزو سۆزەوە گوێ شل کەین بۆ ئەم ئایەتە پیرۆزانەی کە هاتنە خوارەوە دەربارەی یاسای کەلەپوورو دابەش کردنی کەلەپوور بەسەر ئەوانەی کە شایستەن، لە یەکەمجارەوە زۆر بە سۆزەوە گوێبگرین لەم ئایەتەی کە بیروباوەڕو باوی چەرخی نەفامی تووڕدا کە ئافرەتی بێبەش ئەکرد لە کەلەپووردا، ئەم ئایەتە هات لە یەکەمجارەوە جاڕی بەشداریی ئافرەتی دا هەرچۆنێ پیاو بەشدارە، فەرمووی: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ﴾ بۆ پیاوان هەیە بەش لەو کەلە پوورەی کە باوك و دایك و خزمە زۆر زۆر نزیکەکانیان بەجێیان هێشتبێ لەپاش مردنیان،

وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿٧﴾ وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُوْلُواْ ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينُ فَٱرْزُقُوهُم مِّنْهُ وَقُولُواْ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٨﴾ وَلْيَخْشَ ٱلَّذِينَ لَوْ تَرَكُواْ مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَٰفًا خَافُواْ عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُواْ ٱللَّهَ

---

﴿وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ﴾ بۆ ئافرەتانیش هەیە بەشێك لەوەی كە باوك و دایك و خزمە زۆر نزیكەكان بەجێیان هێشتبێ لەپاش مردنیان. ئەو بەشەیان بۆ هەیە ﴿مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ﴾ لەو جێ ماوە كەم بێ یان زۆر، هەروەها بۆ پیاوانیش هەر بەم جۆرەیە، بەڵام بە بۆنەی ئێرەوە لەباسی پیاواندا نەیفەرموو، مەبەست بەم وتەیە ئەمەیە هیچ كەس گومان نەبات كە هێندێ كەلە پوور تایبەتیە بە هێندێ لە میرات بەرانەوە، وەك وڵاغی سواریی و چەك كە دابنرێ هەر بۆ پیاوان، بەڵكو هەرچی بەجێ مابێ بۆ میرات بەرانە ﴿نَصِيبًا مَّفْرُوضًا﴾ بە بەشێكی دراوی پێویست كراو، بێگومان - وەك لەمەو پاش دەرئەكەوێ - ڕژێم و یاسای كەلەپووری هێندێ لە خزم و خوێش بێبەش ئەكات، چونكە نزیك تر لەوان هەیە، جالەبەرئەوە ئەوا بەش و مافێكیش بۆ ئەوانە دائەنێ، بۆ دڵخۆش كردنیان و دڵگران نەبن لەو بێبەش كردنە، لەبەر پارێزگاریی ئەو پەیوەستی خزمایەتیە و ئەو سۆز و خۆشەویستیەی كەلە دڵدا هەیە، هەروەها ئەو ماف و بەشە دائەنێ بۆ هەتیوو هەژارانێ كە ئامادەن لەكاتی دابەش كردنی كەلەپوورەكەدا، ئەوەش بەپێی دەستەبەرەیی گشتی كە ئیسلام بڕیاری داوە، ئەفەرمووێ: ﴿وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ﴾ كاتێ ئامادەی دابەش كردنی كەلەپوورەكە بوون ﴿أُوْلُواْ ٱلْقُرْبَىٰ﴾ خاوەن خزمایەتیەكان كە میرات بەرنین، ﴿وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينُ﴾ هەتیوو هەژارە بێگانەكان ﴿فَٱرْزُقُوهُم مِّنْهُ﴾ لەو كەلەپوورە ڕۆزی و بەشیان بدەن ﴿وَقُولُواْ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا﴾ وتەو قسەی باشیان ئاراستەبكەن كە ویسترابێت و دڵ حەزی لێ بكات، وەك ئەوەی نزایان بۆ بكەن و منەت نەخەنە سەریان و ئەوەی كە ئەیاندەنێ بەكەم و بێنرخ نیشانی بدەن و دڵنەواییان بكەن. ئەم بەشە دیاریی نەكراوە و كەوتووەتە ڕاو بڕیاری دابەش كەرانەوە. ئینجا

ئایا ئەم فەرمانە سڕاوەتەوە یان نا؟ ئەگەر نەسڕاوەتەوە، ئایا پەیڕەوی کردنی فەرزو پێویستە یان سوننەتە؟ ئیتر بە مەرجێ میرات بەرەکان گەورەبن یان منداڵیش بن؟ بۆ هەرکام لەم ڕایانە دەستەیەك لە زانایان هەیە کە بڕوای پێبێ و پەسەندی بکات، بەڵام ڕای سڕینەوەی زۆر لاوازەو هیچ ڕابەرو بەڵگەیەك نیە لەسەری، زۆربە لەسەر ئەوەن کە پەیڕەوی کردنی ئەو فەرمانە سوننەتە. بەڵام لە ڕووی ڕاستی دا ئەمیش بەڵگەی لەسەر نیەو چاك وایە لە ڕووکەش و ڕواڵەت لانادرێ و بە فەرز دابنرێ، هەر ئەمەش ڕێکە لەگەڵ دەستە بەرەییە گشتیەکەی ئیسلامدا.

ئینجا ئەوەی دەست بکات بەدیاری کردنی بەشی میرات بەرەکان، ئەگەڕێتەوە بۆ جڵەوگیریی کردن و ترساندن لە خواردنی ماڵی هەتیوان، لە دووبارەوە دەست کاریەکی بەهێزی دڵی مەردومان ئەکات تا بەهۆی ئەوەوە دووربکەونەوە لەو خواردنە:

یەکەم: سۆزو بەزەیی باوکێتی و سۆزو بەزەیی سروشتی بۆ منداڵ و ساوا لاوازەکان ئەخاتەوە بیرو هەڵی ئەگیرسێنێ لەگەڵ بیم و ترس لە خوای ئاگادار.

دووەم: سام و بیم لە ئاگری بڵێسە دارو هەڵگیرێنراوی دۆزەخ کە دووچاری ماڵ خۆرانی هەتیو ئەبێ، لەبارەی دەست کاریەکەیەوە ئەفەرمووێ: ﴿وَلْيَخْشَ الَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَافًا خَافُوا عَلَيْهِمْ﴾ ئەوانەی کە کراون بە وەسی و کاربەدەستی هەتیو با بترسن لە خوا یان لە زایە بوونی هەتیوەکانی ژێر دەستیان کە جاڵی خۆیان وایە ئەگەر لەکاتی مردندا بوونایەو چەند ساواو منداڵێکی لاوازیان بەجێ هێشتایە بۆ پاش خۆیان مەترسیان ئەکردو غەمبار ئەبوون لەسەریان، کەواتە هەرچۆنێ غەمی منداڵی خۆیان ئەخۆن و بەزەییان دێتەوە پێیانداو مەترسی ئەکەن لەوەی زایە بێن و بێباوك و بێ ناز بکەون، هەروەها باغەمی منداڵانی مەردومیش بخۆن کە کەوتوونەتە ژێر دەستی ئەمان و بێ نازو بێ باوك کەوتوون. ﴿فَلْيَتَّقُوا اللَّهَ﴾ کەواتە با بترسن لە خواو خۆیان بپارێزن لە نافەرمانی خوا دەربارەی هەتیوەکانی ژێر دەستیان و ماڵی هەتیوەکان،

﴿وَلۡيَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدًا ٩ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا إِنَّمَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ نَارٗاۖ وَسَيَصۡلَوۡنَ سَعِيرٗا ١٠﴾

﴿وَلۡيَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدًا﴾ باقسەی ڕاستو ڕەوایان لەگەڵ بکەن بە تەمیٚ و ئامۆژگاری چاكو نازیان ببەن بەڕێوە وەك کوڕو منداڵی خۆیان.

ئەم ئایەتە بەسێ جۆریٚ تریش تەفسیرکراوەتەوە، ئەو جۆرانەش هەر دەست ئەدەن، بەڵام ئەم تەفسیرەمان هەڵبـژارد، چونکە باشتر ئەچێتە دڵەوەو ڕای زۆر کەسی بـڕوا پێ کراویشی لەسەرە، لەبارەی دەست کاریی دووەمەوە ئەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا﴾ بەڕاستی ئەو کەسانەی کە ماڵی هەتیوەکان ئەخۆن بەستەمو ناهەقی ﴿إِنَّمَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ نَارٗاۖ﴾ ئەوانە پڕ بەسکی خۆیـان هەر ئاگر ئەخۆن، واتە ئەوەی کە ئێستا ئەیخۆن سەری لە ئاگرەوە دەرئەچیٚ، کەواتە وەك ئاگر بخۆن وایە، یان هەر ڕووکەشو ڕواڵەتەکەی مەبەستە بەم ڕەنگە لە ڕۆژی دوایی دا ئاگری دەرخوارد ئەدریٚ وەك لە چەند حەدیسێك دا هاتووە، بەڵام ڕای یەکەم باشتر ئەچێتە دڵەوە، چونکە ڕواڵەتی ﴿يَأۡكُلُونَ﴾ بۆ ئێستایەو لەپاش ئەوە ئەفەرمووێ: ﴿وَسَيَصۡلَوۡنَ سَعِيرٗا﴾ لەمەو پاش ــ واتە لە ڕۆژی دوایی داـ ئەچنە ناو ئاگرێکی بەتین کە سەختیەکەی باس ناکریٚو نایەتە باس، دەی لەوە وا وەرئەگیریٚ کە خواردنەکە لەم جیهانەدایە، ئەو خواردنەش لەم جیهانەدا نیە بەو جۆرە نەبیٚ کەلە ڕای یەکەمدا وتمان: یان بڵێین: خواردنەکە لە گۆڕدا ڕوو ئەدات لەپێش هاتنی ڕۆژی دوایی. بەهەرحاڵ ولەسەرهەرباربەڕاستی هەڕەشەیەکی زۆر سەختو دڵ داچڵەکێنەرە، هەق وایە بەبیر لیٚ کردنەوەی هەموو دەمار بکەوێتە لە رزە، تیکە لە گەورەدا بگیریٚ!

ئەم قورئانە بەو جۆرە کاری لە دەروونی موسڵمانان، ڕزگاری کردن لەو هەموو باوو ڕەوشتە خراپانەی کە بە درێژایی چەندەها چەرخ دەقی پێوەگیرابوو، بیمو ترسێکی وای

خستە دەروونیان هیچ کام زاتی نەما نزیکی قەدەغەکانی خوا بکەوێتەوە، بۆ وێنە: کاتێ ئەم ئایەتە سامناکە هاتە خوار دەربارەی خواردنی ماڵی هەتیو ناهەق، بە جارێ ئارامی لە دڵیان بڕی‌و بەهیچ جۆر نەیان وێرا نزیکی ماڵی هەتیو بکەونەوە،(عطا) لە(سعیدی کوڕی جبیر)و ئەویش لە(ئیبن‌و عەباس)ەوە ئەگێڕێتەوە -خوای لێ ڕازی بێت- کە ئەفەرمووێ: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، ئەوانەی کە هەتیویان لا بوو بێ پەروا پەلاماریان دا خۆراك‌و ئاوو نانیان جوێ کردەوە لێیان، هەر خواردەمەنیەکیان لێ بمایەتەوە هەڵیان ئەگرت بۆیان تا ئەیانخوارد، یان بەکار نەئەما، ئینجا ئەوە بوو بە ئەرکێکی گەورە بەسەریانەوە، تا باسەکە کرا بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئینجا خوا ئایەتی سورەتی ﴿البقرة﴾ی ناردە خوارەوە: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ﴾ پرسیارت لێ ئەکەن لەبارەی هەتیوەکانەوە ﴿قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ ﴾ بڵێ: خەریك بوون‌و هاوکاریی لەگەڵیان بۆ چاك کردن‌و بەرژەوەندیان چاکترە لەوەی دوور بکەونەوە لێیان ﴿وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ ﴾ ئەگەر تێکەڵیان بکەن ئەوانە براتانن، واتە برایش هەقی تێکەڵی هەیە لەگەڵ برای خۆی دا...هتد، ئینجا ئاوو نانیان تێکەڵ کردنەوە.

ئا بەو جۆرە قورئان ئەو دەروونانەی ڕووناك کردەوەو بەرزی کردنەوە بۆ ئەو ئاسۆ بەرزانە، پاکی کردنەوە لە هەموو چڵك‌و چەپەڵی سەردەمی نەفامی!!

ئینجا دێتە سەر باسی ڕژێم‌و یاسای میرات‌و کەلەپوور، لە یەکەمجارەوە دەست پێ ئەکات بە فەرماندانی خواو وەسیەت کردنی بە باوك‌و دایك، دەربارەی ڕۆڵەکانیان، ئەو فەرمان‌و وەسیەتەش ئەوە نیشان ئەدا کە خوا میهرەبان ترو خاوەن چاکە ترو داد پەروەر ترە لەباوك‌و دایك بۆ ڕۆڵەکانیان، هەرچۆنێ ئەمەش نیشان ئەدات کە ڕژێم‌و یاساکە هینی خوایە، کەواتە تەنیا خوا بڕیار ئەدا لە بەینی باوك‌و دایك‌و ڕۆڵەکانیاندا، لەبەینی خزم‌و خزمەکانیاندا، ئەمان هەر ئەوەیان بۆ هەیە کە فەرمانبەر بن‌و هەڵسن بە فەرمانەکانی خوا، ئایین هەر بریتیە لەوە، وەك لەسەرەتاوە دەست نیشانی بۆ کرا.

لـەم یەکـەمجارەدا بـڕواو یاسـایەکی گـشتی ئـەهێنێ کـە دابـەش کردنـی کەلـەپوور ئەگەڕێتەوە بۆ ژێر ئەم بڕواو یاسایە، لێرەدا دوو ئایەت ئەهێنێ و لە دوایی سوورەتەکەیش دا ئایەتێك، ئەم سێ ئایەتە هەموو بنەڕەتی عیلمی(فرائض)ی تێدایە، ئینجا لق و پەل و پۆکانیشی هێندێکیان لە حەدیسدا هاتووە، هێندێ تری زانایانی ئیسلام ـ خوا پاداشتیان بداتەوە ـ دەریان هێناوە لەم ئایەت و حەدیسانەوە، وەك بەدرێژیی لە کتێبەکانی فیقهدا باس کراون، کەواتە لێرەدا هیچ پێویست نیە بێجگە لە تەفسیری ئایەتەکان و ڕوون کردنەوەیان، فەرمووی: ﴿يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَٰدِكُمْ ۖ﴾ خوا وەسیەتتان بۆ ئەکات دەربارەی ڕۆڵەکانتان، واتە فەرمانتان پیا ئەدات و پێویستی ئەکات لەسەرتان لەبارەی دابەش کردنی کەلەپوور بەسەر ڕۆڵەکانتاندا، بەم جۆرە: ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۚ﴾ بۆ نێرەیە وێنەی بەشی دوو مێ، ئەگەر ڕۆڵەکان لە هەردوو جۆر بوون، بیروباوەڕی سەردەمی نەفامی عەرەب ـ وەك لە پێشەوە دەست نیشانمان بۆ کرد ـ لەسەر ئەوە بوو ئافرەت و منداڵ بێ بەش ئەکران، چونکە ناتوانن جەنگ بکەن و بێکەڵکن، ئەو بیروباوەڕە لەپاش هاتنی ئیسلامیش لە دڵی گەلێ کەس دا هەر مابوو تا لە پاشدا مل کەچ بوون و تێگەیشتن کە خوا باش ئەزانێ و هەر بڕیاری ئەو ڕاست و ڕەوایە،(ئیبن و ئەبی حاتەم و ئیبن و جەریر) ئەگێڕنەوە لە(عوفی) و ئەویش لە(ئیبن و عەباس)ەوە -خوای لێ ڕازی بێت- کە ئەفەرمووێ: کاتێ ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە مەردوم پێیان ناخۆش بوو و ئەیان ووت: ژن چوارەیەك یان هەشت یەکی پێ ئەدرێ، کچێك نیوەی سامان، منداڵی بچووك بەشی ئەدرێ لەکاتێکدا کە ئەوانە جەنگ ناکەن! بێدەنگ بن لەم قسە، بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) لەبیری بچێ، یان بڵێن پێی کە بڕیارەکەی بگۆڕێ! ئینجا وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، کچ نیوەی کەلەپووری باوکی وەرئەگرێ، لەکاتێکدا سواری چارەوی نابێ، جەنگ ناکات لەگەڵ دوژمندا، منداڵ کەلەپووری پێئەدرێ لەکاتێکدا کە هیچ کەڵك و سودێکی نیە، ئەفەرمووێ: لەسەردەمی نەفامی دا ئاوایان ئەکرد، کەلەپووریان نەئەدا لە کەسێ نەبێ کە جەنگ بکات و ئەیاندا بە گەورەتر لە دوای گەورەتر. بۆچوون و تێگەیشتنی نەفامی ئێستایش زۆر جیاوازی نیە لەو، ئەوەتا ئەڵێن: چۆن کەلەپوور بدەین بە منداڵە وردەکان کە هیچ ئەرك و زەحمەتێکی نەکێشاوە تیای دا؟ خاوەنی ئەم هەردوو بۆچوونە نەزان و بێ شەرمە لەگەڵ پەروەردگارداو خۆی ناناسێ، لەبەرئەوە ئەو جۆرە قسەو

خەیاڵانە ڕوویان تێ ئەکات، وەك ئەوانەی کە هێشتا تێ ناگەن و سەرسام ئەبن لەوەی خوا بەشی کوڕی دووقاتی بەشی کچ کردووە، ئەوانە بیرێك ناکەنەوە لەوە کە خوا زیادە میهرەبانی کردووە لەگەڵ ئافرەت و بەشی زۆرتری بۆ داناوە، ئەوەتا پیاو ژن ئەهێنێ و ئەرکی خۆی و ژنەکەو هەر منداڵێکیان ببێ لەسەرشانیەتی، وە ژنەکە هیچی لەسەر نیە. بەڵام ئافرەت یان هەر خۆی ئەژیەنێ و ئەرکی تەنیا خۆی لەسەرە، یان ئەژیەنێ و ئەرکی هیچ کەسیشی لەسەر نیە، کەواتە بە هەر حاڵ و لەسەر هەر بار ئەرکی پیاو گرانە، وە لە هێندێ جاردا چەند قاتی ئەرکی ئافرەتە، ئەمە شتێکی ئاشکراو ڕوونە کەواتە هەرکەس ڕەخنە بگرێ لەم یاسایە هەر نەفامی و تێکەیشتن و بێ شەرمی بۆ ئەمێنێتەوە ـ خوا پەنامان بدات لە نەفامی و بێشەرمی ـ ئەم فەرموودەیە:(لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ) وا نیشان ئەدا کە بەشی ئافرەت شتێکی دامەزراوی ناسراوەو هەواڵ ئەدا کە بۆ نێر هەیە وێنەی بەشی دوو مێ، وا نیشان ئەدا کە بەشی ئافرەت بەهێز ترو بە گرنگ ئەگەیەنێ، لەوەی بیوتایە:(للأنثى مثل نصف حظ الذكر) بۆ مێ هەیە نیوەی بەشی نێر، یان بیفەرموایە: (للأنثيين مثل حظ الذكر) بۆ دوو مێ هەیە وێنەی بەشی نێرێك. ئەو بە گرنگ گرتنە زۆر پێویستە بۆ لەڕیشە هێنانی باوی سەردەمی نەفامی، کە ئافرەتیان بەش بڕاو ئەکرد، بەڵگە لەسەر ئەوە ئەمەیە کەلەم دوو ئایەتەدا بەشی ئافرەتان زۆر بەڕوونی باس ئەکات و لەیەکەمجارەوە دەست ئەکات بەو، بێجگە لەوەیش تەعبیری قورئانە کە ئاوازەی زۆر خۆشەو زۆر پێگرێ و قوڕت ئەچێتە ناو گوێ! بێگومان چەند شتێك هەن ڕێگرن لەمیرات وەرگرتن بە پێی حەدیس و ئیجماعی زانایان، وەك جیاوازی ئاینێ و کوشتن و بەندەیی، کەواتە ئەوانەی هەرکام لەو ڕێگرانەیان ببێ لە گشتی ئایەتەکە دەرئەکرێن و میرات نابەن، هەروەها لە هەموو یاساکانی تری ئەم سێ ئایەتەدا کە هاتوون لەبارەی میرات و کەلەپوورەوە، هەروەها پێغەمبەری ئازیزیش(ﷺ) بەری گشتی ئەم ئایەتە نەکەوتووە، چونکە فەرموویەتی:(نحن معاشر الأنبياء لا نورث) ئێمە ـ واتە کۆمەڵی پێغەمبەران ـ میراتمان لێ وەرناگیرێ، هەر لەبەر ئەم حەدیسە(حەزرەتی ئەبوبەکر) ـخوای لێ ڕازی بێت ـ(حەزرەتی فاتیمە)ی بێبەش کرد لە(فدك) کاتێ کە داوای کرد صلى الله على أبيها و عليها وسلم. برادەرانی شیعە لایان وایە پێغەمبەر(ﷺ) لە گشتی ئایەتەکە دەرناکرێ و ئەو کردەوەی خەلیفەی یەکەمە بە ناڕەوا دائەنێن و ئەیکەن بە تانەو لەکەیەکی گەورە بەسەریەوە، چەند شتێك ئەکەن بە بەڵگە:

١- ئەم حەدیسە هەر ئەبوبەکر ڕیوایەتی کردووە، ئەگەر کەسی تریش ڕیوایەتی کردبێ ناگاتە ڕادەی(تواتر) کەواتە ڕەفتاری پێناکرێ بەرامبەر قورئانەکە.

٢- قورئان باسی کەلەپوور وەرگرتنی هێندێ لە پێغەمبەران ئەکات، ئەوەتا ئەفەرمووێ: ﴿وَوَرِثَ سُلَيْمَنُ دَاوُدَ﴾ سلێمان کەلەپووری لە داود وەرگرت، وە ئەفەرمووێ: زەکەریان وتی: ﴿فَهَبْ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا ۝ يَرِثُنِي﴾ ئەی پەروەردگارم پێم ببەخشە لەلایەن خۆتەوە بە میهرەبانی خۆت کوڕێك کە کەلەپوور بەرم بێت، کەواتە ئەبێ ئەم حەدیسە ڕەفتاری پێ نەکرێ. بەڵام بەڵگەکانیان زۆر بێهێزو لاوازن و شایستەی ئەوە نین پشتیان پێ ببەسترێ.

٣- ئەو حەدیسە هەر(ئەبوبەکر) ڕیوایەتی نەکردووە، بەڵکو(حوزەیفەی کوڕی یەمان و زبیری کوڕی عەوام و ئەبو الداردا و ئەبو هورەیرەو حەزرەتی عباس و عەلی و عوسمان و عبدالرحمن ی کوڕی عەوف و سعدی کوڕی ئەبی وەقاس) یش ڕیوایەتیان کردەوە.(ئیمامی بوخاری) لە(مالیکی کوڕی ئەوس)ەوە ئەڵێ: کە(عمری کوڕی خەتاب) بە حوزوری کۆمەڵی هاوەڵان کە(عباس و علی و عوسمان و عبدالرحمن و زبیرو سعد) یشیان تیا بوو، لەناو ئەو کۆمەڵەدا وتی: سوێندتان ئەدەم بە خوایە کە ئاسمان و زەوی بە ئیزنی ئەو ڕاوەستاوە، ئایا ئەزانن کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(لا نورث ماترکنا صدقة) ئێمە میراتمان لێ وەرناگیرێ و هەرچی بەجێ بهێڵین خێرو صەدەقەیە؟ هەموو لە وەڵامدا وتیان: ئەرێ والله ئەزانین. لەپاشدا بە تایبەتی ڕوو ئەکاتە عباس و علی -خوای لێیان ڕازی بێت- ئەڵێ: سوێندتان ئەدەم خوا ئایا ئەزانن کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی فەرموو؟ ئەوانیش ئەفەرموون: ئەرێ والله ئەزانین، کەواتە ئەوە ڕاست نەبوو کە وتراوە تەنیا(ئەبو بەکر) ئەو حەدیسەی ڕیوایەت کردووە. بەڵکو لەکتێبی باوەڕ پێکراوی شیعەدا شتێ ڕیوایەت کراوە کە ئەو حەدیسەی(ئەبوبەکر) ئەگرێتەوە، ئەوەتا(کلینی لە کافی دا)لە(ئەبو البختری)یەوە ڕیوایەتێ ئەهێنێ لە(ئیمامی جعفری صادق)ەوە کە ئەفەرمووێ:(إن العلماء ورثة الأنبياء) بەڕاستی زاناکان میرات بەری پێغەمبەران(وذلك ان الأنبياء لم يورثوا درهما ولا دينارا) ئەوەش لەبەرئەوەیە کە پێغەمبەران نەردهەم و نە دینار یان بە میراتی بەجێ نەهێشتووە(وإنما ورثوا احاديث فمن اخذ بشيء من ذلك فقد اخذ بحظ وافر) بەڵکو هەر چەند حەدیسێکیان بە میراتی بەجێهێشتووە، کەواتە هەرکەس شتێك لەوەی وەرگرتبێ

بێ‌گومـان بەشـێکی فراوانـی وەرگرتـووە، بێجگـە لـەوەش بـەبڕیاری هـەموو زانایـانی سـیرەت‌و حـەدیس‌و مێـژوو تاقمێـك لـە ئـاڵ‌و بـەیت کـە جێگـەی بـڕوان بـەلای هـەموو موسـڵمانانەوە، وەك(ئیمـامی عـەلی‌و حسن‌و حسین علـی کـوڕی حسـن‌و حسـنی کـوڕی حـسن) -خـوای لێیـان ڕازی بێـت- ئـەو تاقمـە ڕەفتاریـان بـەو حەدیـسی(ئەبوبـەکر)ە کـردووە، ئـەوەتا هەرچیان دەست کـەوتبێ لـە کەلـەپووری پێغـەمبەر(ﷺ) هیچیان لـێ نـەداوە نـە بـەعباس‌و نـەکوڕانی عبـاس لـەپاش خـۆی، وە نـە بـە هیـچکام لـەدایکی ئیمانداران، دەی ئەگەر میرات ببرایە لێی ئەبوایە بەشی ئەوانە بدرایە بەبێ گیرو گرفت، کەواتە ئەو حەدیسە بوو بە(متواتر)و ئایەتەکەی پێ‌تایبەتی ئەکرێ، بێجگە لـەوەش حەدیسی صەحیح با نەگاتە ڕادەی(تواتر) هەر ئایەتی عامی پێ‌تایبەتی ئـەکرێ بـەلای زۆربـەی زانایانـەوە، وەك شـتی زۆر کـە هەیـەو لـە شـوێنی تایبـەتی دا بـاس کـراوەو پێویست نیە لێرەدا باسیان بکەین، بەهەرحاڵ پێویست بووە لەسەر خەلیفەی یەکەم کـە ڕەفتـاری پێ‌بکـات، چـونکە خـۆی بـە گوێـچکەی خـۆی حەدیسـەکەی بیسـتووە لـە پێغەمبەر(ﷺ) وە ئەو بیستنە لە(تواتر) بەهێزتر بوو بۆئەو.

٤- مەبەست بەو کەلەپوورەی کە ئەو ئایەتانە ئاماژەی بۆ ئەکەن، کەلـەپووری ماڵ‌و شت‌و مەکی ئەم جیهانە نیە، بەڵکو ئاشکرایە کە مەبەست کەلـەپووری پێغەمبـەرێتی‌و زانین‌و حیکمەتـە، وەك لـە چـەند ڕیوایـەتی تـردا ئـەو وتەیـە هـاتووەو مەبەسـت پـێ‌ی بـاری دوومەو نەك یەکەم: ﴿ ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ﴾ بە کەلەپوور نامەمان داوە - واتەقورئان - بەوبەندەیانەمان کە هەڵمان بژاردن، ﴿وَإِنَّ الَّذِينَ أُورِثُوا الْكِتَابَ ﴾...(کلینی) کە یەکێکە لەزانا باوەڕ پێ‌کراوەکانی برادەرانی شیعە ڕیوایەت ئەکات لە(ئەبو عبدالله) وە کـە (سـلیمان) کەلـەپووری (داود)ی وەرگـرت،(محمـد)یـش کەلـەپووری(سـلیمان)ی وەرگرت، کەواتە ئەویش هەر باوەڕی وا بووە کە مەبەست لـە کەلـەپوور پێغەمبـەرێتی‌و زانین‌و حیکمەتە، چونکە بەهیچ جۆرێ ناگونجێ بۆ پێغەمبـەرمان(ﷺ) کە لەسـەر ئـەم بارە نەبێ.

قسەو لێکۆڵینەوەی زۆر هەیە، لەم مەسەلەیەدا، بەڵام لام وایە ئەم ئەندازەیە بەس بێت بۆ هەرکەسـێك کـە سەرکێـشی نـەکات‌و بـەوای ڕاسـتی دا بگـەڕێ، وە حـەزم کـرد بەبۆنـەی شوێنەکەوە ئەم ئەندازە باسەبکەم.

﴿فَإِن كُنَّ نِسَآءً فَوْقَ ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ وَإِن كَانَتْ وَٰحِدَةً فَلَهَا ٱلنِّصْفُ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٌ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٌ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِى بِهَآ أَوْ دَيْنٍ﴾

---

**ئینجا با گەڕێینەوە بۆلای ئایەتەکە کە بەشی بەشدارەکانمان بۆ دیاری ئەکات، ئەفەرمووێ: ﴿فَإِن كُنَّ نِسَآءً فَوْقَ ٱثْنَتَيْنِ﴾ ئەگەر ڕۆڵەو منداڵەکانتان چەند ئافرەتێك بوون زیاد لەدووان ﴿فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ﴾ ئەوا بۆیان هەیە دوو لەسەر سێی ئەوەی کە مرووە کە بەجێی هێشتووە﴿وَإِن كَانَتْ وَٰحِدَةً فَلَهَا ٱلنِّصْفُ﴾ ئەگەر یەك ئافرەت بوو ئەوا بۆی هەیە نیوەی کە بەجێی هێشتووە. دەقی ئایەتەکە بێدەنگە لە دیاریی کردنی بەشی دوو کچ، بەشی دووانیش دوولەسەر سێیە، بەڵگە لەسەر ئەوە دوو شتە:**

**١- حەدیسێك کە(ئەبو داودو تیرمزیو ئیبن و ماجە) ئەیهێنن لە(جابر)ەوە -خوای لێ ڕازی بێت- کە ئەفەرمووێ:(ژنی سەعدی کوڕی ڕەبیع) هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم دووانە کچی(سەعدی کوڕی ڕەبیع)نوێژ کە لەگەڵ تۆدا بووو شەهیدکرا لە ڕۆژی(احد)دا، مامەکەیان هەموو ماڵەکەی بردووەو هیچی بەجێ نەهێشتووە بۆیان، ئەمانیش شوویان بۆ ناکرێ بەبێ ماڵ، ئەویش فەرمووی: خوا بڕیار ئەدا لەوەدا، ئینجا ئایەتی میرات هاتە خوارەوە، ئینجا ناردی بەدوای مامەکەیانداو پێی فەرموو: دوو لەسەر سێی ماڵەکەی(سعد) ئەدەی بە دوو کچەکەی، یەك لەسەر هەشتی بە ژنەکەی، وە هەرچی مایەوە بۆ تۆ، کەواتە دوو کچیش هەر دوو لەسەر سێیان بۆ هەیە.**

**٢- لە ئایەتی دوا دوایی سورەتەکەدا دوو لەسەر سێی داوە بەدووخوشك، کەواتە باشتر ئەبێ ئەو بەشەبدا بە دوو کچ، وە ئەم جۆرە بەڵگەیە زۆر بەهێزەو لای زانایان ناوبراوە بە(قیاس الاولی) هێندێ بە زانایان قسەیەکی خۆش ئەکەن، ئەفەرمووێ: کچ و خوشك وەك یەك وان لەبەش دا،**

جالەبەرئەوە لێرەدا باسی بەشی دوو کچی نەکردووە بە نیشانەی ئەوێ، لەوێش باسی بەشی زیاد لەدوو خوشکی نەکردووە بەنیشانەی ئێرە، کەواتە بەهەردوو ئایەتەکە بەشی هەموو جۆرە کانی کچ و خوشك دیاریی کرا، ئەمە یاسایەکە لە یاساکانی ڕەوانبێژیی کە ناوبراوە بە(احتباك).(ئەبو موسلیمی ئەسفەهانی) ئەڵێ: بەشی کچ وەرئەگیرێ لەسەرەتای ئایەتەکەو پێویست نیە باس بکرێ لێرەدا، چونکە لەوێ زانراوە کە تەنیا کچێك لەگەڵ کوڕێکدا یەك لەسەر سێی ماڵەکە ئەبات، کەواتە دوو کچ کە کوڕیان لەگەڵ نەبێ ئەبێ دوولەسەر سێی ماڵەکە ببەن، بەشی کچی بەو جۆرە دیاریی کردو هەرچی لەوان مایەوە ئەدرێ بە نزیك ترین نێرینەی پشتی وەك باوك یان باپیر یان برای باوکی و دایکی یان باوکی و هەروەها.

ئینجا دێتە سەر باسی بەشی باوك و دایکی مردوو کە بکەونە پاش مردووەکە، ئیتر مردووەکەیان هەر کوڕی ببێ یان هەر کچی ببێ یان هەر دووکیان وە جاغ کوێر بن، ئەفەرمووێ: ﴿وَلِأَبَوَيۡهِ لِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٞ﴾ بۆ هەرکام لە باوك و دایکی مردووەکە هەیە یەك لەسەر شەش لەوەی کە بەجێی هێشتووە، ئەگەر منداڵی ببێ، ﴿فَإِن لَّمۡ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٞ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ﴾ ئینجا ئەگەر مردووەکە منداڵی نەبوو، هەر دایك و باوکی میرات بەری بوون ئەوە بۆ دایکەکەی هەیە یەك لەسەر سێی ماڵەکەی و دوو لەسەر سێی هینی باوکەکەیە ﴿فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخۡوَةٞ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُ﴾ ئینجا ئەگەر چەند براو خوشکێك بوو بۆ مردووەکە ئەوا دایکەکەی یەك لەسەر شەشی هەیە، ئیتر ئەو مردووە باوکی ببێ یان نا؟

باوك و دایك چوار باریان هەیە:

١- مردووەکەیان هەر منداڵی میرات بەریان ببێ، لەم کاتەدا هەر کام لە باوك و دایك یەك لەسەر شەش ئەیەن، وە هەرچی مایەوە ئەدرێ بە منداڵەکان ئەگەر کوڕ بن یان کوڕو کچ، وە ئەگەر هەرکچی بوو هەرچی مایەوە لەپاش بەشی کچ ئەدرێتەوە هەر بە باوکەکە زیاد لە یەك لەسەر شەشەکەی وە دایك هەر یەك لەسەر شەشی هەیە، کە بەشی کچ یەك لەسەردووەئەگەریەکێك بوو، وە دوولەسەرسێیە ئەگەرزیادلەیەك بوون.

٢- مردووەکەیان هیچ میرات بەرێکی تری نەبێ، لەم کاتەدا یەك لەسەر سێی ئەدرێ بەدایکەکەو ئەوی تری بۆ باوکەکەیە، کەواتە باوکەکە دووقات ئەبات.

٣- مردووەکەیان پیاو بێ و ژنیشی لە شوێن بەجێمابێ، یان ئافرەت بێت و مێردیشی بەجێمابێت، لەم کاتەدا بەشی مێردەکە یەك لەسەر دووە وە بەشی ژنەکەی کە یەك لەسەر چوارە دەرئەکرێ لەسەر سێی ئەدرێ بە دایکەکەو هەرچی مایەوە بۆ باوکەکە ئەبێ، ئەمە بەلای کۆو جەماوەری هاوەڵەکان و زانایانی ئیسلامەوە، بەلای(ئیبن و عەباس)ەوە -خوای لێ ڕازی بێت- لەم دوو مەسەلەدا دایك یەك لەسەر سێی هەموو ماڵەکەی هەیە، وە بەلای هێندێ ترەوە لەگەڵ مێرددا یەك لەسەر سێ ئەبات لەپاش بەشی مێردەکە، وە لەگەڵ ژندا یەك لەسەر سێی هەموو ماڵەکەئەبا.

٤- مردووەکە یان چەند براو خوشکێکیان ببێ، دووان یان زیاتر بەلای کۆمەڵ و جەماوەرەوە، وە لەدوو بەرەو ژوور بەلای(ئیبن و عەباس)ەوە -خوای لێ ڕازی بێت- ئیتر ئەو براو خوشکانە باوکی و دایکی بن، یان هەر باوکی، یان هەر دایکی بن، لەم کاتەدا هەر چەند براو خوشکەکان هیچ نابەن، بەڵام دایکەکە لە یەك لەسەر سێی ئەگێڕنەوە بۆ یەك لەسەر شەش، بەکورتی لەو کاتەدا ماڵەکە ئەکرێ بەسێ بەشەوە یەك لەسەر شەشی بۆ دایك و ئەوی تر بۆ باوکەکە ئەبێ.

ئەو بەشانە بەو جۆرە بدەن بە خاوەنەکانیان ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِي بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ﴾ لە پاش دەرکردنی شتێك کە وەسیەتی پێکرابێ، یان قەرزێك کە بەلای مردووەکەوە بووبێ، واتە هەرکام لە وەسیەت و قەرزیان هەردوو پێش ئەخرێن لەبەشی میرات بەرەکان، بەڵام با بزانرێ کە قەرزیش پێش ئەخرێ لەوەسیەت بەپێی بڕیاری زانایانی ئیسلام لە چینی پێش و لە چینەکانی پاش، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) بەو جۆرە بڕیاری دا، وەك(ئیمامی عەلی) ئەگێڕێتەوە لێیەوە -خوای لێ ڕازی بێت- هەم لەبەر ئازاد بوونی مردووەکە کەلەو ماڵەی کەوا بە لایەوەو لە مەردومی قەرز کردووە.

ئیسلام مەسەلەی قەرزی زۆر بە گرنگ گرتووە وەك وەرئەگیرێ لە چەند حەدیسێك كە لە كتێبە باوەڕ پێكراوەكاندا ڕیوایەت كراون. بەڵام وەسیەت بەو جۆرە نیەو بەو جۆرە بە گرنگ نەگیراوە، ئەوەتا ئەگەر كابرا وەسیەت نەكات هیچ گوناهبار نابێ، بەڵكو زۆر كەس وا ئەبێ نیازێكی پاكی نابێ لەوەسیەت كردنداو ئەیەوێ بەشی میرات بەرەكانی كەم بكاتەوە یان باوی هێندێ لە میرات بەران بدا بەسەر ئەوانی تردا، یان هەر بێ بەشیان بكات. جالەبەرئەوە ئیسلام ڕێی ئەو نیازە بەدانەی بەست، بەم ڕەنگە قەدەغەی كرد وەسیەت بۆ میرات بەران بكرێ، وە قەدەغەی كرد وەسیەت بە زیاد لە یەك لەسەر سێبەبێ ئیزنو ڕەزای میرات بەران. ئینجا لەبەرئەوەی قەرز گرنگ ترەو هەرئەبێ بدرێتەوەو میرات بەران سەرپێچیان پێناكرێ تا ئەو ڕادەی ئەگەر قەرزەكە زۆر بێو هەموو كەلەپوورەكە داگیر بكات نە وەسیەت بەجێ ئەهێنرێو نەمیرات ئەدرێ، وە لەبەرئەوەی زۆرتر میرات بەران بێزارن لە وەسیەتو وائەزانن بەشیان لێ داگیر كراوە ــ كەواتە لەوانەیە سەرپێچی بكرێ لە بەجێهێنانی وەسیەت ــ لەبەرئەوە زانایان ئەفەرموون: لەوتندا وەسیەت پێش خراوە لە قەرز، تا بە گرنگ سەیر بكرێو سەرپێچی تیا تیا نەكرێ. ئینجا ئایەتەكە دوایی ئەهێنێ بە چەند وتەیەك كە هەركام لە بارێكەوە دەستكاریی دڵ ئەكەنو پاڵی پێوە ئەنێن بۆ فەرمانبەریی بڕیارەكانی ئایەتەكە:

١- ئەفەرمووێ: ﴿ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ لَا تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًاۚ﴾ باوكەكانتانو كوڕەكانتان ــ واتە باوكو دایكو ڕۆڵەكانتان ــ ئێوە نازانن كامەیان سوودو قازانجیان نزیك ترە بۆتان، سوودو قازانج لە جیهاندا یان لە ڕۆژی دوایی دا یان لە هەردوودا، واتە دابەش كردنی كەلەپوور بەو جۆرە كرا، نەك بەو جۆرەی كە ئێوە پێتان خۆشەو پەسەندی ئەكەن، چونكە ئێوە نازانن كام لەوان نزیك ترە سوودو قازانجی بۆتان، كەواتە نازانن كام دابەش كردن شایستە ترە بۆتان، هەركامتان جۆرو بارێكتان پێ خۆشە بەپێی زانینو تێگەیشتنی خۆتان، كەواتە ئەگەر ئەو دابەش كردنە بخرایەتە دەستی ئێوە بەڕێكو ڕەوا دەرنەئەچوو، كەواتە لێی گەڕێن بۆ خواو هەر ئەوەبە چاك بزانن.

فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١﴾ ۞ وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَٰجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌۚ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَۚ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍۚ

---

٢- ئەفەرمووێ: ﴿فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِۗ﴾ ئەو دابەش كردنە بە پێویست كراوەو بڕیار دراوە بەبڕیاردان لەلایەن خواوە، كەواتە مەسەلەكە جێی سەر لێ كردنەوەو ئارەزووكاری بەندە نیەو ئەبێ بەبێ گیرو گرفت گوێڕایەڵی بكرێ، واتە تەنها خوا باوكو كوڕەكانتانی دروست كردووە، تەنها خوا ڕۆزیو ماڵ ئەبەخشێ، تەنها خوا بڕیار ئەداو دابەش ئەكات، تەنها خوا مافی دانانی یاساو شەرعی هەیە، بەندەكانی خوا مافی ئەوەیان نیە شەرعو یاسا دابنێن بۆ خۆیان، بەپێی هەواو ئارەزووی خۆیان بڕیار دەركەن، هەرچۆنێ نازانن بەرژەوەندی خۆیان لە چی دایە!

٣- ئەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ بەڕاستی خوا هەمیشە زاناو لێزانو كاردروستە، واتە ئەو دابەش كردنەوەی كە خوا داینا و بڕیاری دا لێزانیو كاردروستیەوە هاتووە، كەواتە هەر ئەبێ ئەوە بەڕاستو ڕەوا دابنرێ، وە گوێڕایەڵی هەر بۆ ئەوە بكرێ، ئاوا بەو تەرزو شێوەیە دەستكاری دڵو دەروونەكانی كردین، تا بەسۆزو ڕەزامەندیەوە فەرمانەكانی وەربگرینو فەرمانبەر بین بۆیان. ئینجا بەشو خاوەن بەشەكانی تریش دیاریی ئەكات بە پێی ئەو زانینو كاردروستیەی خۆی، ئەفەرمووێ: ﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَٰجُكُمْ﴾ بۆ ئێوە هەیە ـ واتە ئەی مێردەكان ـ نیوەی ئەوەی كە ژنەكانتان بەجێیان هێشتبێ، ﴿إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌۚ﴾ ئەگەر بۆ ئەو ژنانەتان منداڵ نەبێ لە پاش خۆیان. ﴿فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَۚ﴾ ئینجا ئەگەر منداڵیان بوو ئەوە بۆ ئێوە یەك لەسەر چوار هەیە لەوەی كە بەجێیان هێشتووە ئیتر ئەو منداڵانە لە مێردێكی ترین، هەروەها كوڕەزاكان هەر مێرد لە یەك لەسەر دووەوە وەرئەگێڕن بە یەك لەسەر چوار لەپاش مردنی باوكیان ﴿مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍۚ﴾ لەپاش شتێك كە وەسیەتتان پێكردبێ یان قەرزێك كە بە لاتانەوە بێت،

وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكۡتُمۡ إِن لَّمۡ يَكُن لَّكُمۡ وَلَدٞۚ فَإِن كَانَ لَكُمۡ وَلَدٞ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكۡتُمۚ مِّنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ تُوصُونَ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٖۗ وَإِن كَانَ رَجُلٞ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمۡرَأَةٞ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوۡ أُخۡتٞ فَلِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُۚ فَإِن كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمۡ شُرَكَآءُ فِي ٱلثُّلُثِۚ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصَىٰ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ غَيۡرَ مُضَآرّٖۚ

---

﴿وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكۡتُمۡ إِن لَّمۡ يَكُن لَّكُمۡ وَلَدٞۚ﴾ بۆ ژنەكانتان هەیە یەك لەسەر چوار لەوەی كە بەجێتان هێشتبێ ئەگەر ئێوە منداڵتان نەبێ لەو ژنە مردووە یان ژنی ترتان ﴿فَإِن كَانَ لَكُمۡ وَلَدٞ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكۡتُمۚ﴾ ئینجا ئەگەر بۆ ئێوە منداڵ بوو لەوژنانە یان لە ژنی تر ئەو كاتە یەك لەسەر هەشت هەیە بۆ ژنەكانتان، هەروەها كوڕەزایشتان لە كاتی نەبوونی كوڕدا، ﴿مِّنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ تُوصُونَ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٖۗ﴾ لەپاش شتێك كە وەسیەتتان پێكردبێ یان قەرزێك كە بەلاتانەوە بێت، ئینجا با بزانرێ كە ژنێك تا چوار ژن هەر ئەو یەك لەسەر چوارو یەك لەسەر هەشتەیان هەیە.

لەپاش دیاریی كردنی بەشی باوك و دایك و منداڵەكانیان و دیاری كردنی بەشی ژن و مێرد، ئینجا بەشی براو خوشكی دایكی دیاریی ئەكات، ئەفەرمووێ: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٞ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمۡرَأَةٞ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوۡ أُخۡتٞ فَلِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُۚ﴾ ئەگەر پیاوێك كە میراتی لێ ئەبرێ كەسێك بوو نەباوك و نەمنداڵی بەجێ نەهێشتبوو، یان ئافرەتێك بەو جۆرە بوو، بۆ ئەو پیاوە مردووە یان ئافرەتەكە برایەك یان خوشكێك بوو ـ واتە دایكی ـ بۆ هەركام لەو براو خوشكە هەیە یەك لەسەر شەش، ﴿فَإِن كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمۡ شُرَكَآءُ فِي ٱلثُّلُثِۚ﴾ ئینجا ئەگەر

زیاتر بوون لەوە ـ واتە یەك برا یان یەك خوشك زیاتر بوون ـ ئەو كاتە ئەوانە هاوبەشن لەیەك لەسەر سێی ئەو ماڵەی كە مردووە كە بەجێی هێشتووە، بە كورتی براو خوشكی دایكی ئەگەر تەنها یەكێك بوو یەك لەسەر شەشی هەیە، وە ئەگەر زیاد لەیەك بوون تا هەرچەند، یەك لەسەر سێیان هەیە ئیتر برای ڕووت یان خوشكی ڕووت یان تێكەڵ لە هەردوو، خزمایەتیەكەیان لاوازە هەر ئەوە هەڵئەگرن، ئەمانە جیاوازن لە میرات بەرانی تر لەسێ بارەوە:

١- نێرو مێیان یەكسانن.

٢- بەش نابەن لەگەڵ بوونی باوكو باپیرو منداڵو كوڕەزای مردوودا.

٣- بەشیان لە یەك لەسەر سێ زیاد ناكات.

ئەمانیش دیارە بەش ئەبەن ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصَىٰ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ﴾ لەپاش وەسیەتێك كە كرابێ یان لەپاش قەرزێك كەلای مردووەكەیان بێت. ﴿غَيۡرَ مُضَآرّٖۚ﴾ لەكاتێكدا بەبێ زیان گەیاندن بە میرات بەرەكان لەلایەن وەسیەت كەرەوە، بەم ڕەنگە وەسیەت بكات بە زیاد لە یەك لەسەر سێیان بەمە دان بنێ بەوەدا كە هەموو ماڵەكەی یان هێندێكی هینی كابرایەكی ترە، یان دان بنێ بەدرۆ بە قەرزێكدا. یان دان بنێ بە قەرزێكی كە بووە لای یەكێ وەری گرتووەتەوە لێی، یان بەوەی كە فلانە شتی فرۆشتووە بە نرخێكی كەم، یان ئەو شتەی كڕیوە زۆر بەگران، مەبەستی لەمانە بێبەش كردنو زیان گەیاندن بێت بە میرات بەرەكان.

وَصِيَّةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴿١٢﴾ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٣﴾ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدْخِلْهُ نَارًا خَٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٤﴾

---

**﴿وَصِيَّةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ﴾ خوا وەسیەتتان بۆ ئەکات بەوانە بە وەسیەتێك لەلایەن خواوە، کەواتە زۆر شایستەیە بە مل کەچ کردن بۆیان و هەڵسان پێیان، ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ﴾ خوا زانایە بە هەموو شتێك کە یەکێ لەوانە زیان گەیاندنەو زیان نەگەیاندنە، یان یەکێ لەو شتانە کە تەگبیری کەلەپوورە بەو جۆرو شێوەی کە باس کرا، ﴿حَلِيمٌ﴾ مۆڵەت دەرو پەلە نەکەرە لە تۆڵە سەندن و سزادانی ئەوانەی کەسەرکێشن و یاخی ئەبن لە گوێڕایەڵی، کەواتە با هەڵنەخەڵەتێن بە هۆی دواکەوتنی تۆڵەو سزادانیان.**

**ئا بەو جۆرە قورئان بڕیارەکانی بە گرنگ ئەگرێ و بە گرنگ نیشانیان ئەدات، تا بەندەکانی خوا بە توندیی بیانگرن و گوێڕایەڵیان بن، هەروەها ناو بەناو سەرنجمان ڕائەکێشێ و ئاوڕمان پێئەداتەوە بۆلای یاسایەك لە یاسا سەرەکی و بنەڕەتیەکانی ئەم ئایینەو هەموو ئایینەکانی خوا، کە بریتیە لەوەی ئەبێ هەموو بیروباوەڕو بڕیارو شەریعەتێك تەنها لە خوا وەرگیرێ، ئەبێ پەرستراو و حاکم تەنها خوا بێت، گوێڕایەڵی کراو تەنها ئایین و شەریعەتی ئەوبێ، ئینجا ئەگەر لە هەر شوێنێکدا کار بەو جۆرە بوو ئەوا ئایین و ئیسلام هەیە، وە ئەگەر لەوە لادرا ئەوا لادراوەو نە ئایین هەیەو نە ئیسلام، وەك بە ڕوونی ئاماژەئەکات بۆ ئەوە لەم دوو ئایەتەدا کە ئەفەرمووێ: ﴿تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۚ﴾ ئەو یاسا و بڕیارانەی کە تێپەڕیان کر لەبارەی دابەش کردنی کەلەپوورەوە، وەك(ئیبن و عەباس) ئەفەرمووێ-خوای لێ ڕازی بێت- یان هەموو بڕیارەکانی تریش وەك کۆمەڵێك ئەفەرموون. ئەو یاساو بڕیارانە سنوورەکانی خوان، دایناون بۆئەوەی گوێڕایەڵی بکرێن و لەو سنوورانە تێپەڕ نەکرێ. ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ هەرکەسێك گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بێت ﴿يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ خوا ئەیخاتە ناو بەهەشتانێك کە ڕووبارەکان**

دێن و ئەچن بە ژێریاندا ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ﴾ بەجۆرێ ئەوانە ئەمێننەوە لەو بەهەشتانەدا بەبێ بڕانەوەو دوا هاتن ﴿وَذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾ هەرچۆن لەسەر ئەو بارە گەیشتنە بە ئامانج و خێری زۆر گەورە. ﴿وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ هەرکەسێك یاخی بێت لە خواو پێغەمبەرەکەی و سەرپێچی بکات لە فەرمانیان ﴿وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ﴾ دەست درێژیی بکات لە سنوورەکانی خواو بیان شکێنێ ﴿يُدۡخِلۡهُ نَارًا خَٰلِدٗا فِيهَا﴾ خوا ئەوکەسە ئەخاتە ناو ئاگرێکی زۆر گەورەو سەخت، بەجۆرێ ئەمێنێتەوە تیای دا ﴿وَلَهُۥ عَذَابٞ مُّهِينٞ﴾ بۆی هەیە سزایەکی ڕیسواکەری ئابڕووبەر، کەواتە دوو جۆر سزای هەیە: سزای لەشی بە سوتاندن، سزای گیانی بەو ڕیسواکردن و ئابڕونەهێشتنە ــ خوا پەنامان بدات لە خەشم و سزای خۆی ــ، لە ئایەتی پێشوودا فەرمووی(خالدین) بە کۆوە لێرەدا فەرمووی(خالدا) بەتاك. لەوێ بەپێی مەعنا و واتاکەی(من) وە لەلێرە بەپێی وتەکەی، بەهەرکام لە هەردوو شوێنەکەدا دروستە بەپێی باوو ڕێزمانی عەرەب، ئینجا هۆی هەڵبژاردنی یەك لەئایەتی پێشووداو دووەم لەم ئایەتەدا لای هێندێ لە زانایان ئەمەیە: کە مانەوەکەی بەهەشت لەبەر چاو شیرین بکات، وە مانەوەکەی دۆزەخ سەخت و سامناك تر بکات، چونکە ئاشکرایە ژیان بە کۆمەڵ لە شوێنی خۆشدا خۆش ترە، هەرچۆنێ تەنیایی لە شوێنی سزادا سەخت و سامناك ترە.

ئێمە وەك(خوارج و معتزله) بەزەیی و لێ بووردنی خوا کەم و کورو تەنگ ناکەینەوە، بەم ڕەنگە خاوەنی گوناهە گەورەکان بابڕوا داریش بن هەربڵێین هەمیشەیین لە دۆزەخدا بە وێنەی بێبڕواکان، بەڵکو ئەڵێین: هەرکەسێك هەرچەند گوناهی زۆرو گەورە بێت ئەگەر بە بڕواوە بمرێ هەمیشەیی نابێ لە دۆزەخدا، بەڵکو ئەکەوێتە دەست مەیل و خواهیشی خوا یان ئەبووری لێی یان بە ئەندازەی گوناهو تاوانی سزای ئەدات و لەپاش دا ئەیخاتە بەهەشت، کەواتە مەبەست بەم کەسە لەم ئایەتەدا کەسێکە کە ئەوسنور شکاندنە بە ڕەواو حەڵاڵدابنێ، دیارە ئەو کاتە بێبڕوایەو لە ئیسلام دەرئەچێ، یان مەبەست کەسێکە کە هەموو سنوورەکانی خوا بشکێنێ، وەك وەرئەگیرێ لەوتەی(حدوده) کە بە کۆ فەرموویەتی و ئیزافەیشی کردووە کە ئەو گشتی نیشان ئەددات، بێگومان هەرکەس هەموو سنورەکانی خوا بشکێنێ لە ڕیزی بڕواداران دەرئەچێ.

بەڕاستی هێنانی ئەم هەڕەشە سامناکە بەدوای ئایەتەکانی میراتدا، دەست نیشانە بە زۆر گەورەیی کاری میرات، وە سەرنج ڕاکێشی هەموو بڕواداریکە بۆئەوەی ئاگای لە خۆی بێت، دووچاری تاوانو ستەم نەبێ تیای دا، وەك لەو بابەتە حەدیسی سەختو سامناکیش هاتووە،(ئیبنو ماجە) حەدیسێ ئەهێنێ لە(ئەنەسی کوڕی مالیك)ەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: هەرکەس هەر بەشو میراتێ ببڕێ کە خواو پێغەمبەرەکەی بڕیاریان دابێ، خوا بەشو میراتی ئەو کەسە ئەبڕێ لەبەهەشتدا!! پێویستە لەم جۆرە شوێنانەدا بیرێك بکەینەوە لەوەی کە بۆ ئەبێ گوێڕایەڵی لەم جۆرە حوکمو بڕیارانەدا ببێ بەهۆی ئەو بەڵێنو پاشە ڕۆژە نەبڕاوە، وە سەرپێچیان مایەی ئەو هەڕەشە گەورەیەو ئەو دوا ڕۆژو چارەنووسە سامناکە بێت؟! بێگومان هەرکەسێك نەشارەزا بێت لە ئاینێ، ئەم پاشە ڕۆژو چارەنووسانەی بە لاوە زۆر زیادەو گەورەترن لەکردەوەکان. بەڵام هەرکەسێك شارەزاو تێگەیشتبێ لە مەبەستو مانای ئاینو بڕوا بە مەرجەکانیان، ئەو کەسە هیچ سەرناکاتەوە سەری سووڕنامێنێو ئازانێ ئەو بەڵێنو هەڕەشەو دوا ڕۆژو چارەنووسانە ڕێكو ڕەواو سەروبەرن لەگەڵ کردەوەکاندا، جابۆئەوەی نەشارەزا ئەو سەرسوڕمانەی نەمێنێ پێویستە ئەندازەیەك بەڕوون کردنەوەو دەرخستنی مەسەلەکە، بێگومان کارو مەسەلەی ئایینی خوا لەیەکەم جاریەوە تا دواترینی، ئەگەڕێتەوە بۆ بڕوا بەتاكو تەنیایی خواو گێڕانی تەنیا خوا بەپەرستراوو کاربەدەستو حاکم لە هەموو کاروبارێکدا، وە دوورخستنەوەی هەر جۆرە هاوبەشێك لەزاتی داو لە سیفەتو نیشانەکانیو لە کردەوەو بڕیارەکانی دا، ئەو بڕواو گێڕانو دوور خستنەوەش بەمە ئەبێ کە بەندەکانی خوا مل کەچیو بەندەییو گوێڕایەڵییان تەنها بۆ خوابێت، وە تەنها شوێنی بەرنامەکەی خوا بکەون، بەهیچ ڕەنگ بڕوایان نەبێ بەهیچ یاساو بەرنامەیەکی ترو ڕەوای نەدەن، ئیتر با بڕواو بڕیاری هەموو جیهانیانی لەسەربێ، جا کەواتە هەرکاتێ بەندەکانی خوا بەم جۆرە بوون کە باس کرا، ئەو کاتە ڕاستە خوا پەرستێ بە تەنیاو هەر بە خوایەتی خوا ڕازین، وەیاخی نابن لە خوا، بەڵکو مل کەچو گوێڕایەڵ ئەبن، ئەو کاتە خوای میهرەبانیش بەو جۆرە پاداشتیان ئەداتەوە کەلە ئایەتی پێشوودا باسی کرد، وەهەرکات بەندەکان ئەو بیروباوەڕە پاکەیان نەبووو یاخی بوون لە خوا، سەرپێچیان کرد لە بڕیاری خوا، ئەوکاتە خواپەرست نینو ڕازی نینو بە خوایەتی خوا، کەواتە شایستەی ئەو تۆڵە سەختە ئەبن کەلە ئایەتی دووەمی پێشوودا باسی کرد.

وَٱلَّٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةً مِّنكُمۡۖ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا ﴿١٥﴾ وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا مِنكُمۡ فَـَٔاذُوهُمَاۖ فَإِن تَابَا وَأَصۡلَحَا

---

بەشی یەکەمی سورەتەکە چارەسەری دانا بۆ پاك کردنەوەی کۆمەڵ و گەلی موسڵمان لە هێندێ ستەم و ناڕەوایی کە باوبوون لەچەرخ و سەردەمی نەفامی دا، دەربارەی هەتیوو و بێ دەسەلات و لاوازان کە ماڵ و مافیان ئەخوراو ژێر پێ ئەکران، بە تایبەتی لە کەلەپووردا بێ بەش ئەکران. ئینجا لەم بەشی دووەمەدا چارەسەر دائەنێ بۆ پاك کردنەوەی گەل و کۆمەڵی موسڵمان لەکارو کردەوەی بێناموسی و داوێن پیسی، ئینجا لەوەوە ئەڕوا بۆ ڕزگار کردنی ئافرەت لەو هەموو ناڕەوایی و ستەم و کۆت و زنجیەی کە تیای دا ئەژیا بە درێژیی چەندەها چەرخ لەسەردەمی نەفامی دا، تا ماڵ و خێزان لەسەر بنەڕەتێکی پتەوو پاك دامەزرێ، ئینجا بەهۆی ئەوەوە کۆشکی گەل پێك بێت زۆر بەمەحکەمی و پاکی لەو خێزانانە کە هەرکام خشتێکن لەو کۆشکەدا، ئینجا هەر بەو بۆنەیەوە ئەو ئافرەتە دیاریی ئەکات کە خواستنیان قەدەغەیە لە ئیسلام داو ئیتر بێجگە لەوانە ڕەوایەو حەڵاڵە، ئەفەرمووێ: ﴿وَٱلَّٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ﴾ ئەوانەی کە کاری زۆر پیس و ناشیرین ئەکەن ـ واتە زینا و داوێن پیسی ـ لەکاتێکدا لە ئافرەتانی خۆتانن ـ واتە بڕواداران یان ژنتانن ـ ﴿فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةً مِّنكُمۡ﴾ داوا بکەن چوار پیاو لە خۆتان ـ واتە چوار پیاوی موسڵمانی ئازاد ـ شایەتیان لەسەر بدەن،(زەهری) ئەفەرمووێ: ڕەوشتی پێغەمبەر(ﷺ)، وە هەردوو جێنشینەکەی لەسەر ئەوە بوو کە ئافرەت وەرنەگیرێ بە شایەت لەم شتانەدا کە شەرع بۆی داناون وەك کوشتن و زینا و دزی.

﴿فَإِن شَهِدُواْ﴾ ئینجا ئەگەر ئەو چوارە شایەتی بدەن لەسەریان بە کردنی ئەو کارە پیسە ﴿فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ﴾ ئەو کاتە بەندیان بکەن لە ماڵەکانتاندا ﴿حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ﴾ هەتا مردن گیانیان ئەکێشێ ﴿أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا﴾ یان خوا ڕێگەیەك دائەنێ بۆیان، بەم ڕەنگە بارو حاڵیان ئەگۆڕێ، یان تۆڵەو سزاکەیان ئەگۆڕێ، یان بە هەرجۆرێکی تر کەبیەوێ،

بەهەرحاڵ دەست نیشان ئەکات بەوەی کە ئەمە بڕیارێکی هەمیشەیی نیە، بەڵکو بۆ ماوەیەکی تایبەتیە، لەپاش ئەو ماوەیە بڕیاری هەمیشەیی نەگۆڕاوو دێت، وەك بەو جۆرە هات، بڕیاری تەواوی هەمیشەیی هات لەسەرەتای سورەتی ﴿النور﴾دا، لەحەدیسی پێغەمبەردا(ﷺ). (ئیمامی ئەحمەد) حەدیسێ ئەهێنێ لە(عبادەی کوڕی صامت)ەوە -خوای لێ ڕازی بێت-، کە ئەفەرمووێ: کاتێ کە(وحی) سروش بهاتایەتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ) کاری تێ ئەکردو ناڕەحەت ئەبووو ڕەنگی ئەگۆڕا، ئینجا ڕۆژێك خوا سروشی(وحی) هێنایە خوارەوە بۆ سەری، ئینجا کەلێ بوویەوە فەرمووی: لێم وەرگرن، ئەوا خوا ڕێگەی دانا بۆ ئافرەتەکان: کوڕی ژن نە هاوەر لەگەڵ کچی شوونەکەردا تۆڵەی زینایان سەد دارە لەگەڵ دوور خستنەوە لەجێ و شوێنی خۆیان. پیاوی ژن هاوەرو ژنی شووکردوو سەددارو بەردەبارانە،هەروەها(ئیمامی موسلیم)و خاوەن سونەنەکان ئەم حەدیسەیان هێناوە.

ئیسلام لە هەموو حاڵەتێك و لە هەموو تۆڵەیەکدا دووربینی تەواوی کردووە، بەجۆرێك ستەمو هەڵە ڕوونەداو لە خۆڕایی بە ناڕەوا مەردوم دووچار نەکرێ، ئەوەتا لەیەکەم جارەوە ئەو ئافرەتانە دیاریی ئەکات کەبەری ئەو بڕیارو تۆڵە ئەکەون: ئەبێ موسڵمان، ئینجا ئەو شایەتانەش ئەبێ موسڵمان بن، ئینجا یەکەم جاری تۆڵەی ئافرەتە داوێن پیسەکانی گێڕا بە بەند کردنی لەماڵدا تا تێکەڵی موسڵمانانی تر نەکەن و پیسی بڵاو نەبێتەوە، وە بەو بەندکردنە تەمێ خوار بێ و دوورکەونەوە لەو کردەوە زۆر پیسە، ئینجا دوای ئەوە تۆڵەی دیاریی کردن بەو جۆرەی کە باس کرا، مەبەست لەو تۆڵانەش پاراستنی گەل و کۆمەڵە لە چەپەڵ بوون، وە پارێزگاریی پاکی و خاوێنیە بۆیان.

﴿وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا مِنكُمۡ﴾ هەر دووکەسێك لە ئێوە کە ئەو کارە پیسە بکەن. مەبەست بەم دوو کەسە هەردوو کەسێکی نێری باڵغی ژیرن کە نێربازی بکەن، وەك(مجاهد) ئەفەرمووێ -خوای لێ ڕازی بێت- ﴿فَـَٔاذُوهُمَا﴾ ئازاریان بدەن بە تەشەر لێ دان و سەرزەنشت و هەڕەشە لێ کردن، وەك(مجاهدو قەتادەو سدی) ئەفەرموون، وە بە لێدانیش پێڵاوونەعل وەك(ئیبن و عەباس و سعیدی کوڕی جبیر)و چەند کەسێکی تر ئەفەرموون. ﴿فَإِن تَابَا وَأَصۡلَحَا﴾ ئینجا ئەگەرئەودووانەگەڕانەوەلەوکردەوەپیسەوتۆبەیان لێکردوخۆیان وکردەوەی خۆیان چاك کرد،

﴿فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمَآۚ﴾ ئەو كاتە وازبێنن لێیان‌و ئازاریان مەدەن نەبە قسەو نەبەکردەوە. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابٗا رَّحِيمًا﴾ چونکە بەڕاستی خوا ئەوپەڕی ڕادە تۆبە وەرگرو بەزەیی دارو میهرەبانە بە بەندەکانی، وەسزاو هەڕەشەکەشی هەر میهرەبانیەو ئەیەوێ بەندەکانی بگەڕێنەوەو سەرنەکەنە خراپەکاریی تا دووچار نەبن لە هەردوو جیهاندا. بەم وتە پیرۆزە لە دووبارەوە تەمێ دائەدات‌و دەست کاری دڵی بڕواداران ئەکات:

١- دەست نیشان ئەکات کە خوا خۆی ئەو تۆڵەی داناوە، وە هەر ئەویش فەرمان ئەدات بە واز هێنان لێیان لەکاتی گەڕانەوەو خۆ چاك کردنیاندا، موسڵمانانیش هەر گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەریان لەسەرە، دەی کاتێ کە خوا تۆبە وەرگرو میهرەبانە لەوانە ئیتر ئەبێ بەندەکانی خوا باشتر وازیان لێ بێنن.

٢- سەرنج ڕائەکێشێ بۆئەوەی کە ئەبێ بەندەکانی خوا ڕووناکی وەگرن لە سیفەت‌و ڕەوشتی خوا بۆ کردارو ڕەفتاری ناو خۆیان، واتە پێویستە لەسەریان چاوپۆشی‌و لێ بووردن‌و خۆچاك کردنیان بە دوا هێنابێ، ئینجا با بزانرێ وازهێنان لەو تۆبە کەرو خۆچاك کەرانە بەوە ئەبێ ئیتر باس نەکرێن‌و تەشەریان لێ نەدرێ بەو تاوان‌و خراپە کە تێپەڕی کردو تۆبەی لێ کرا، وە پێویستە کۆمەکی بکرێن لەسەر دەست پێکردن سەر لەنوێ بە ژیانێکی پاك‌و بێ‌لەکە. ئینجا بابزانرێ کە ڕای زانایان جیاوازە لە دواترین بڕیاری تۆڵەی ئەم کردەوە پیسەدا، هێندێ لەزانایان ئەفەرمووێ: دواترینتۆڵەی زینایان دەربارەئەکرێ، وە هێندێ تر ئەفەرموون: تۆڵەی ئەمانە کرا بە کوشتنی هەردووکیان، ئەوەش بەپێی ئەم حەدیسەی کە خاوەن سونەنەکان ڕیوایەتی ئەکەن لە(ئیبن‌و عەباس)ەوە -خوای لێ ڕازی بێت- کە ئەفەرمووێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەرکەستان بینی کە کردەوەی گەلەکەی(لوط) پێغەمبەر بکات هەردووکیان بکوژن: بکەرەکەو پێ‌کراوەکە.

ئەم دوو ئایەتەمان بەم جۆرە تەفسیر کردەوە کە ڕای چەند کەسێکی بڕوا پێ‌کراوی لەسەرەو لەدڵیشماندا زۆر جێگیرەو دڵنیاین پێی، بێجگە لەم ڕایە سێ‌ڕای تریش هەیە، ئەوانیش هەر ئەگونجێن‌و وەرئەگیرێن، کەواتە باش وایە ئەو سێ ڕایەش باس بکەین:

١- ڕای کۆمەڵو جەماوەر ئەمەیە: ئایەتی پێشوو بەو جۆرەیە کە تەفسیرمان کرد، بەڵام مەبەست بە ئایەتی دووەم هەردوو پیاوو ئافرەتێکە کە زینا بکەن، وە باوی پیاوەکەی داوە بەسەری داو لە پەنای ئەوا وتەی ﴿وَٱلَّذَانِ﴾ی بەکار هێناوە بۆ هەردوو، کەلە زمانی عەرەبدا هەر بۆ دوو نێر دانراوە، ئینجا سەبارەت بەهۆی دووبارە کردنەوەی باسی ئافرەت شەش شت وتراوە دوانیان بەنزیك و بەهێز ئەزانم:

أ- مەبەست لە ئایەتی پێشوودا ئافرەتە شوو کردووەکانە، وە مەبەست لەم ئایەتەدا پیاوو ئافرەتی عازەبە، جالەبەرئەوە تۆڵەی پێشووەکان سەخت تر دانراوە، وە تۆڵەی ئەمان سووك ترە.

ب- هۆی دووبارە کردنەوەکە ئەوەیە کە ئافرەت تۆڵەیەکی تایبەتی هەیە لە پێشەوە باس کراوە کە بەند کردنیانە لە ماڵدا، وە تۆڵەیەکیشیان هەیە بە هاوبەشی پیاوان کە لەم ئایەتی دووەمەدا باس کراوە.

٢- ڕای دووەم کە هینی هێندێکە ئەمەیە: لە ئایەتی یەکەمدا وەك تەفسیرەکەو ڕای جەماوەرە، بەڵام لە دووەم دا ئەڵێ: مەبەست هەردوو پیاوێکە کە زینا بکەن یان نێربازی، لەسەر ئەم دوو ڕایە بڕیاری هەردوو ئایەتەکە سڕراوەتەوە بە ئایەتی سورەتی ﴿النور﴾و حەدیسی بەردەباران، وەك لە تەفسیری ئایەتی پێشوودا باسمان کرد.

٣- ڕای سێیەم کە(ئەبو موسلیمی ئەصفەهانی)و هێندێکی لەسەرە ئەمەیە: مەبەست بەو ئافرەتانە لە ئایەتی پێشوودا ئەوانەن کە سواری یەکتر ئەبن و ئەو کارە پیسە ئەکەن کەلە زمانی عەرەبدا پێی ئەوترێ(سحاق)وە مەبەست بە ئایەتی دووەم ئەوانەن کە نێربازی ئەکەمو سواری یەکتر ئەبن، لەسەر ئەم ڕایە بڕیاری هەردوو ئایەتەکە نەسڕاوەتەوە، وە بڕیاری تۆڵەی زینا ئەوەیە کە لە ئایەتی سورەتی ﴿النور﴾و حەدیسدا هاتووە، ئەم ڕای(ئەبو موسلیمە) هەرچەند لە هێندێ بارەوە بەهێزە ـ وەك بە درێژیی باس کراوە لە شوێنی تایبەتی خۆی دا ـ بەڵام ناگونجێ لەگەڵ چەند ڕیوایەتێك و ڕای زانایان و کردەوەی ئوممەتەدا، چونکە ئەگەر بڕیاری ئەو دوو ئایەت نەسڕرایەتەوە ئەبوایە بە درێژایی تەمەنی ئەم ئوممەتە ڕەفتاری پێبکرایە، کەواتە با وازی لێ بێنین، وەك دیار نیە با هەر ون بێت، خاوەنی تەفسیری(روح المعانی) زۆر بەدرێژیی لەسەری ڕۆیشتووەو بە لاوازی دەرکردووە. بەهەرحاڵ ئاشکرایە تا چ

ڕادەیەك ویستویەتی گەڵ موسڵمان پاك و خاوێن بکاتەوە لە هەموو کارو کردەوەیەکی چەپەڵ، هەر لە یەکەمجاری هاتنیەوە ئەو هەوڵ و تەقەلای داوە، لەکاتێکدا کە ئەیزانیوە و چاوەڕوانی ئەوە نەبوو کە دێتە مەدینەو دەوڵەت و دەسەڵاتی ئەبێ بەسەر چەسپاندن و بەدی هێنانی شەریعەتەکەی. ئەوەتا لە سورەتە مەککەییەکاندا جڵەوگیریی کرد لەم کردەوە پیس و چەپەڵانە: وەك لە سورەتەکانی ﴿الإسراء، المؤمنون، المعارج﴾دا، بەڵام لەو کاتەدا هەر جڵەوگیریی کردو لەپێش چاو چەپەڵی کردن و ڕێنموونی کرد بۆ دوور کەوتنەوە لێیان، ئیتر دەوڵەت و دەسەڵاتی نەبوو تا تۆڵەیان لەسەر دانێ، وە ئەیزانی کە تەنها جڵەوگیریی و پەندو ئامۆژگاری چارەسەر نیە بۆ بەرگری تاوان و خراپە، هەر چۆنی ئەیزانی کە ئاینێ بەبێ دەوڵەت و دەسەڵات ڕاگیر نابێت و بەدی نایەت، چونکە ئاینێ تەنها بیروباوەڕێکی دەروونی و هەست و ویژدان نیە، بەڵکو بەرنامەو ڕژێمێکە کە ئەبێ ژیانی لەسەر دامەزرێ و ڕاگیر بکرێ، هەموو ئاینەکانی خوا هەر وا بوون، بە پێچەوانەی ئەوەی کە بە هەڵە لە دڵی هێندێ نەشارەزادا هەیە کە هێندێ لە ئاینەکانی خوا هاتوون بەبێ شەریعەت و بەبێ ڕژێم و بەبێ دەسەڵات، نەخێر ئەوە بۆچوونێکی ناڕاستە و گومانێکی هەڵەیە!

ئاینێ بە شێوەی گشتی بەرنامەی ژیانە، بەرنامەیەکە کە ئەبێ بەدی بێت لە ژیاندا بەکردەوە، وە ئەبێ مەردوم لەو ئاینەدا هەر بۆ خوا مل کەچ بکەن، بیروباوەڕو هەموو بۆچوون و خوو ڕەوشت و یاسا و شەریعەتێك هەر لە خواوە وەرگرن، ئەبێ دەوڵەت و دەسەڵاتێك ببێ پاسەوانی ئەو ئاینێ و شەریعەتەبێت و بیچەسپێنێ و بەدی بێنێ لە ژیانداو هەڵسێ بە تەمێ و تۆڵەی ئەوانەی کە دژی ئەو ئاینێ و شەریعەتەن و ڕێگرن لەڕێیدا، گەڵ و کۆمەڵ بپارێزن لە چڵك و چەپەڵی و کرداری بەدی نەفامی بۆئەوەی ئاینێ و مل کەچی تەنها بۆ خوا بێت، بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێکی تر نەبێ لە هیچ جۆرو شێوەیەکی دا، هیچ پەرستراوێکی تر نەبێ کە یاسا و قانوون دابنێ بۆ بەندەکانی خوا، هەرکەسێك لافی ئەوە لێ بدا کە مافی دانانی یاسا و ڕژێم و بەرنامەی هەیە بۆ مەردوم، ئەو کەسە لافی خوایەتی لێ ئەدا، ئیتر بەدەم بڵێ یان نا، کەواتە هەر ئاینێ کە هاتبێ لەلایەن خواوە ئەبێ شەریعەتێکی بووبێ، وە ئەبێ دەسەڵاتێکی بووبێ بۆ بەجێهێنانی ئەو شەریعەتە. جا هەر بەو پێیە کە ئیسلام هاتە مەدینەو دەوڵەت و دەسەڵاتی پەیدا کرد، دەستی کرد بە بەجێهێنانی شەریعەتەکەی، بەرامبەر هەر تاوان و کردەوەیەك تەمێ و تۆڵەی تایبەتی خۆی دانا،

بیستمان و بینیمان ئەو بڕیارانەی دانا لە یەکەمجارەوە بۆ ئەو کردەوە پیسانەی کەلەم دوو ئایەتەدا بە درێژیی تێپەڕیان کرد، لە پاش دا گۆڕان بە بڕیارێکی ترو ئیتر لەسەر ئەوە دامەزراو جێگیر بوو، وەك ئاماژەمان بۆکرد. بێگومان زۆر جێی خۆیەتی ئەو بە گرنگ گرتن و توندو تیژییەی کە ئیسلام بەکاری هێنا بۆ بەرگری کردنی ئەو کارە زۆر چەپەڵەو پاك کردنەوەی گەل و کۆمەڵ لێی، چونکە ئیسلام هات بۆ نەهێشتنی هەموو جۆرە نەفامیەك بە هەموو نیشانەو دروشمەکانیەوە، دەی یەکەم نیشانەی نەفامی لە هەموو چەرخەکانی دا ــ وەك چەرخی نەفامی ئێستامان ــ ئەو بەرەڵایی و تێك بەربوونە بەبێ سەر گیرو بەرگیر، بەوێنەی چوارپێ و گیانلەبەرەکانی تر!! لە هەموو شت سەیرتر ئەوەیە ئەو بەرەڵایی و بێناموسیەش ناوئەبەن بە ئازادی و سەربەستی، هەرکەس دژی بێت ناوی ئەبەن بە دواکەوتوو و کۆنەپەرست!! لەگەڵ ئەوەدا شتێکی ئاشکرایە کە ئەو بەرەڵاییە دژی مرۆڤایەتیە و هۆی داڕزان و لەکار کەوتنی گەل و کۆمەڵە، وە مایەی نەمان و لەناو چوونی حەزارەو شارستانێتی گەلانی جیهانە لە کۆن و تازەوە ــ وەك ڕووی دا لەناو ئیغریقییەکان و ڕۆمانیەکان و فارسەکانی کۆن ــ هەروەها ڕووی داوە لەناو گەلەکانی ئەورووپا و ئەمریکادا، ئەوەتا بەرەبەرەو پەستی دێن، لەگەڵ ئەو هەموو پێشکەوتنەدا هەیانە لە جیهانی(ماددە)و پیشەسازی دا، وە هەست کردن بەو پەستی و نەمانی مەردایەتی و مرۆڤایەتیە، بووەتە ترس و بیمی ژیرەکانیان و نائومێدییان لە چارەسەرکردنی ئەو دەردە کوشندە، نازانن چی بکەن و هاوار بۆ کوێ ببەن؟! ڕۆژنامە نووس و خاوەن گۆڤارەکان زۆرجار هاواریان لێ هەڵئەسێ لەدەست ئەو هەموو نەخۆشی و دەردانەی کە وڵاتی داگیر کردوون: نەخۆشی و دەردی دەروونی و جەستەیی و کۆمەڵایەتی، بەڵام هیچ کەسێك نیە بێت بە هاواریانەوە.

هەرکاتێ بیرلەم جۆرە شتانە بکرێتەوە، وە هەرکەسێك بە تەواوی تێبگات لە قووڵی مەسەلەکە ئەو کاتە دەرئەکەوێ بەشێك لە گەورەیی ئیسلام و دوور بینی ئیسلام لەو بەرگری و توندو تیژییەی کە بەکاری هێناوە بۆ بەرگریی و نەهێشتنی ئەو کارە چەپەڵە لە ناو گەل و کۆمەڵدا، وەك دەرئەکەوێ گەورەیی تاوانی ئەوانەی کە ئەیانەوێ مرۆڤایەتی لەناوبەرن بەبڵاو کردنەوەی ئەو بەرەڵایی و بێناموسیە لە جیهاندا، ئەو کارە پیسە شیرین ئەکەن لەبەر چاوی نەفامان و بێهۆشان بەوەی ناوی سەیر سەیری لێ ئەنێن: ئازادی مرۆڤ، سەربەستی، پێشکەوتن!

إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٖ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿١٧﴾ وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمۡ كُفَّارٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴿١٨﴾

---

**ئایەتەکەی دوایی هێنا بەوەی کە خوا زۆر وەرگری تۆبەو گەڕانەوەیە، ئینجا لەم ئایەتەدا بۆمان ڕوون ئەکاتەوە کە وەرگرتنی تۆبە هەروا بە تێکڕایی نیەو بەبێ کاتو مەرج نیە، بەڵکو لەگەڵ کاتو مەرجی خۆی دا وەرئەگیرێو بەبێ ئەوە وەرناگیرێ، وە هانی گوناهباران ئەدات لەسەر ئەو گەڕانەوەی ڕاستیە بە جۆرێ وەرگرتنی تۆبەکەیان پێویست ئەکات لەسەر خۆی کە ئەوە ئەوپەڕی بەکارهێنانی میهرەبانیە، ئەفەرمووێ:** ﴿إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ﴾ **وەرگرتنی تۆبە کەلەسەر خوایە ــ واتە خوا بە میهرەبانی خۆی بڕیاری لەسەر داوەو بەڵێنی داوە بە وەرگرتنی ــ هەر بۆ ئەوانەیە کە گوناه ئەکەن بە نەفامیو بە گومڕایی، بەم ڕەنگە سەرنجامو دوا ڕۆژی خراپی لەیەک نادەنەوە،** ﴿ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٖ﴾ **ئینجا پاش ئەوە ئەگەڕێنەوە بۆلای خواو داوای تۆبەی لێ ئەکەن لە کاتو ماوەیەکی نزیکدا** ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۗ﴾ **بەهۆی ئەوەوە ئەوانە خوا تۆبەیان لێ وەرئەگرێ** ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا﴾ **خوا هەمیشە ئەوپەڕی ڕادە زانایە بە هەموو شت، کەواتە زانایە بەتۆبەی ڕاستی تۆبەکەران،** ﴿حَكِيمٗا﴾ **کاردروستەو هەموو کارو کردەوەی بەجێیە، کەواتە تۆبەی ڕاستان وەرئەگرێو تۆڵەیان لێ ناسێنێ.**

**خوا میهرەبانەو بەندە لاوازەکانی خۆی ناتارێنێ، کاتی کە گەڕانەوە بەڕاستی بۆلای دەریان ناکات، بە مەرجێك گەڕانەوەکەیان لەکاتی خۆی دا بێت، بەم ڕەنگە ماوەی خۆ چاك کردن بمێنێ یا بە نیازو بڕیاری ڕوونیش بێت، نەك هیچی بە بەرەوە نەما بێت لە ناچاری دا بگەڕێتەوە کە ئەوە لە ڕاستی دا گەڕانەوەنیە، کەواتە ئەوە وەرناگیرێ، وەك دەرئەکەوێ لەمەدا کە ئەفەرمووێ:** ﴿وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ **تۆبە نیە بۆ ئەوانەی کە**

هەموو گوناهەكان ئەكەن، ئەوەی دەستیان پیا بگات بەبێ سەر لێ كردنەوەو پەشیمان بوونەوە ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ﴾ هەتا كاتێ كە مردن ئامادەی هەر یەكێكیان ئەبێ و ئەكەوێتە گیان كەنشت و گیان ئەگاتە گەرووی ﴿قَالَ إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٔـٰنَ﴾ لەو كاتەدا ئەڵێ: بەڕاستی من ئێستا تۆبە ئەكەم و ئەگەڕێمەوە ﴿وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمۡ كُفَّارٌ﴾ بۆ ئەوانەش نیە كە ئەمرن لەكاتێكدا بێبڕوان و بەبێ بڕوایی ئەمرن.

ئەم دوو تاقمە تۆبەیان بۆ نیە، دووەمیان ئاشكرایە، چونكە لەماوەی ژیانی دا پەیوەستی خۆی بە خواوە ئەپچڕێ و بە تەواوی هەڵی گەڕانەوەو لێ بووردن بۆ خۆی زایە ئەكات، بە جۆرێك دەم تۆبەیشی نیە، یەكەمیش هەر دەم تۆبەیەكی ڕووتەو لەناچاری دا ئەیڵێ، نەك بە خۆشی و خواهیشی خۆی، تازە پێ ی ناوەتە ڕۆژی دوایی و كەوتووەتە جیهانی پاداشت و تۆڵەو لە جیهانی كردەوە دەرچووە، مەرج و بەرهەمی تۆبەی بە تەواوی لەدەست دەرچووە، كە بریتیە لەنیازو بڕیاری نەگەڕانەوە بۆ گوناهەكان و خۆچاك كردن و بە سەروگرتنی هەر ماف و هەقێ كەلەسەریەتی، كەواتە لە ڕووی ڕاستی دا تۆبەی بەدی نایەت، وە دەم تۆبە ناچاریەكەشی هیچ نرخێكی نیەو وەك هەر نەبێ و نەیڵێ وایە، كەواتە مافی خۆیانە كە جووت و هاوەل كراون لەگەڵ تاقمی دووەمدا لە ئایەتەكەدا، وە دەربارەی هەردوو وەك یەك ئەفەرمووێ: ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ ئەوانەی كە باس كران لە هەردوو تاقم ئامادەمان كردووە بۆیان سزایەكی گەورە كە ئێش و ئازار دەرە. ئەگەر مەبەست بە تاقمی یەكەم جۆرێك بێت لە بێبڕوایان ـ وەك زۆر كەس لەسەر ئەوەن ـ بەم ڕەنگە ئەمان ببڕێن بەسەر ئەو بێبڕوایانەدا بە ئاشكرا جاڕی بێبڕواییان نادەن، وە تاقی دووەم ئەوانەن كە بە ئاشكرا لافی بێبڕوایی لێ ئەدەن، ئەوا هیچ گرێیەك پەیدا نابێ، چونكە بێبڕواییان بە هەموو جۆرەكانیەوە وان لە ئاگرداو ڕزگار بوونیان نیە، بەڵام ئەگەر مەبەست پێیان بڕواداری زۆر تاوانبار بێت، ئەو كاتە گرێ پەیدا ئەبێت، چونكە وا نیشان ئەدات كە بڕواداری خاوەن گوناهی گەورەش هەر ئەبێ سزا بدرێ و بێگومان خوا لێی نابوورێ، دەی ئەوەش پێچەوانەی ڕای زۆربەو ئەهلی سوونەتە، بۆ كردنەوەی ئەو گرێیە لەلایەن زانایانەوە وتراوە: ئەمانە تۆبەیان لێ وەرناگیرێ، دەی لازم ناكات لەوەوە سزادانیان، بەڵكو

ئەکەونە مەیل و خواهیشی خوا، سزایان بدات یان نەیدا خۆی ئەزانێت، هەروەها لە هەرەشەکرن لێیان بە ئامادە کردنی سزا بۆیان لازم ناکات سزا دانیان. یان ئەڵێن: سزا دانیان کاتێ ئەبێ ئەگەر خوا لێیان نەبووری، وەك دەرئەکەوێ لە ئایەت و حەدیسەوە، لەپاش ئەمانە ئەگەڕێنەوە بۆ سەر ئایەتی پێشوو بۆئەوەی بزانین مەبەست چیە بەو کات و ماوە نزیکەی کە تۆبەکەران تیای دا ئەگەڕێنەوە؟

کۆمەڵ و جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن کە مەبەست پێش گەیشتنە بەکاتی گیان کەنشت و گەیشتنی گیان بەگەروو، وە بەڵگەیان لەسەر ئەوە چەند حەدیسێکە. یەکێ لەوانە حەدیسێکە کە(ئیمامی ئەحمەدو تیرمزی) هێناویانە لە(ئیبن و عمر)ەوە -خوای لێ ڕازی بێت- کە ئەفەرمووێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بێگومان خوا تۆبەی بەندەی وەرئەگرێ تا نەگاتە غەرغەرە، واتە تا پێش ئەوەی گیان بگاتە گەرووی،(ئیبن و جەریر) لە(ئیبن و عەباس)ەوە -خوای لێ ڕازی بێت- ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ئەو کاتە نزیکە ماوەی بەینی گوناهەکەیە تا کابرا فریشتەی گیان کێشان ئەبینێ، وە بەڵگەیەکی تریان ئەمەیە لەم ئایەتەدا کاتی ئامادەبوونی مردن و گیان دەرچوونی داناوە بەکاتی وەرنەگرتنی تۆبە و ئەم کاتەی هێناوە لە بەرامبەر لەو کاتە نزیکەوە، کەواتە بێجگە لەم کاتی مردنە هەر بەری کات و ماوە نزیکەکە ئەکەوێ و بەڵێنی وەرگرتن ئەیگرێتەوە، بێجگە لەوەش هەموو تەمەن هەرچەند درێژە بکێشێ هەر کەمە و نزیکە ئیتر بابوەستێ کە مەردوم هەموو هەناسەیەك لەڕێی مردندایە، وە هەرچیش وا بێ بەنزیك دائەنرێ، کۆمەڵ و جەماوەر بەو جۆرە ئەفەرموون. وە هێندێ لەزانایان ئەفەرموون: مەبەست بەو کاتە نزیکە ئەو ماوەیەیە کە ڕق و ئارەزووەکەی ئەنیشێتەوە و نامێنێ، وە ئەفەرموون: ئایەتی سێیەم ئەو کاتە نزیکەی دیاریی کردووە بۆ وەرگرتنی تۆبە لە هەموو گوناهبارێك، بە جۆرێکی قەتعی و بێگومان، وە ئایەتی دووەم کاتی گیان دەرچوونی دیاریی کردووە بۆ وەرگرتنی تۆبە بە شێوەیەکی قەتعی و بێگومان، بێدەنگ بووە لە بەینی ئەو دوو کاتە، کە کاتی ئومێد و ترسە و تا زووتر تۆبە بکرێ هیوای وەرگرتن بەهێز ترە و تا تەفرە بدرێ هیوا کەمترە و مەترسی وەرنەگرتن بەهێزترە، بەڕاستی

هەرچەند ڕای یەکەم بەڵگەی زۆری لەسەرەو ڕێك ترە لەگەڵ فراوانی لێ بووردن‌و بەزەیی خوادا، بەڵام ئەم ڕای دووەمە زۆر بەهێزەو لەدڵدا زۆر جێگیرە.

ئینجا ئەگەڕێینەوە بۆ سەر باسە سەرەکیەکەی لەمەبەر، کە باسی ئافرەت بوو، هێندێ بڕیاری تر دەرئەکات لەبارەیانەوەو هێندێ تر لە تاوان‌و ستەمی تر قەدەغە ئەکات کەلەسەردەمی نەفامی دا دەربارەیان ئەکرا. لەو سەردەمە نەفامیەدا ئەم چەند شتە ناڕاست‌و ناڕەوایانە باو بووە:

١- هێندێ باویان وابوو ئەگەر پیاوێکیان لێ بمردایە کەس‌و کاری مردووەکە ژنەکەیان بەمیراتی‌و کەلەپوور وەرئەگرت، وەك ماڵ‌و منداڵەکەی! ئەگەر مەمیلیان ببوایە ئەیانخواست، وە ئەگەر کەسێك ئارەزووی بکردایە ئەیدا بەشووو مارەییەکەی وەرئەگرت بۆ خۆی، یان ڕاگیری ئەکرد لە ماڵدا بەبێ بەشوودان هەتا ئافرەتەکە ناچار ئەبوو خۆی ئەکڕی لێی بە شتێك.

٢- هێندێ تر باوی وابوو کە یەکێ بمردایە خاوەنەکەی جل‌و بەرگی خۆی ئەدا بە ملی ژنەکەی دا، بەوە ئەیکرد بەماڵی خۆی، ئینجا ئەگەر جوان بوایە ئەیهێنا، ئەگەر ناشیرین بوایە ڕاگیری ئەکرد هەتا ئەمردو ئینجا ماڵەکەی ئەبرد بە میراتی، یان ئافرەتەکە خۆی لێ ئەکڕی بە شتێك کە پێی ڕازی بوایە! بەڵام ئەگەر ئافرەتێك زوو فریا کەوتایە پێش ئەوەی جل‌و بەرگی بدایە بەملی دا، بگەیشتایەتە ماڵی باوکی ئەوە ڕزگاری ئەبووو ئیتر خاوەن مردووەکە هیچی بۆ نەئەکرا!

٣- هێندێکی تر باوی وا بوو ژنەکەی خۆی تەڵاق ئەدا، بە مەرجێك شوو نەکات بە هەرکەسێك کە ئەم حەز ئەکات، مەگەر خۆی لێ بکڕیایە بە هەر ماڵ‌و مارەییەك کە کابرا پێی دابوو!

٤- ئافرەتی وا بوو کە مێردەکەی ئەمرد ڕاگیر ئەکرا بە دیار منداڵێکی ساواوە هەتا گەورە ئەبووو وەری ئەگرت!

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرۡهٗاۖ وَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ لِتَذۡهَبُواْ بِبَعۡضِ مَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ﴾

پیاوی وا بوو ئافرەتێکی هەتیوی لە ژێر دەست دا ئەبوو، ڕاگیری ئەکرد بەدیاری کوڕێکی منداڵی خۆیەوە تا گەورە ئەبوو، ئەیخواست و ماڵەکەیشی وەرئەگرت! هەروەها چەند ناڕەوایی تریش کە هەموو نارێك و نەگونجاوون لەگەڵ مرۆڤایەتی و ئادەمێتی دا، ئینجا ئیسلام هات ئەو هەموو ناڕەوایی و ناڕاستیەی لابرد و ڕێزو مافی ئافرەتی بە تەواوی دەرخست و دای. ئینجا با گوێ شل کەین بۆ ئایەتە پیرۆزەکان تا بڕیارە پاك و خاوێنەکەی خۆی بدا بە گوێچکەمان دا، ئەفەرمووێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە، ﴿لَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرۡهٗاۖ﴾ ڕەواو حەڵاڵ نیە بۆتان ژنی مردووەکانتان بە کەلەپوورو میراتی وەرگرن بۆ خۆتان و چۆن مەیلتان بوو وایان لەگەڵ بکەن، لەکاتێکدا ئەو ئافرەتانە پێیان ناخۆشە و زۆریان پێ ئەهێنن، ﴿وَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ﴾ تەنگەتاویان مەکەن و توندو تیژیان لەگەڵ مەکەن یان ڕێی شوو کردنیان لێ مەگرن ﴿لِتَذۡهَبُواْ بِبَعۡضِ مَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ﴾ بۆئەوەی هێندێ لەو ماڵ و مارەییەی کە پێتان داون بیبەن بۆ خۆتان، بەم ڕەنگە ناچاریان بکەن تا دەست لەو ماف و ماڵەی خۆیان هەڵگرن بۆ ئێوە و خۆیان بکڕن لێتان پێی، لە هیچ کاتێکدا، یا لەسەر هیچ بارێك یا لەبەر هیچ هۆیەك ئەوەیان لەگەڵ مەکەن ﴿إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ﴾ مەگەر کاتێ کە کردەوەیەکی زۆر ناشیرینی ئاشکرا بکەن، کە بریتیە لەسەرپێچی و بەدخویی و بێشەرمی و قسەی ناشیرین، یان زینایان کرد، واتە لەم کاتەدا کە ئەوان تاوانبارن و خەتا لای ئەوانە، ئێوەیش ئەتوانن کارێکی وابکەن کە ئەوان تەلاق وەرگرن لەسەر هێندێ یان هەموو ئەوەی کە پێتان داون. فەرمووی: کردەوەی زۆر ناشیرینی ئاشکرا، بۆئەوەی هەر وا لە خۆڕایی و بەبێ بەڵگەیەکی ڕوون ستەم تەکرێ لەو ئافرەتانە.

ئەم ئایەتە بەدوو جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام ئەم جۆرەی کە وتمان بەهێزترە لە دڵداو ڕای زۆربەی لەسەرە و ڕێك و پێکیشە لەگەڵ ئەو ڕیوایەتانەی کەلە پێشەوە گوتمان.

﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ﴾ ڕەفتاریان لەگەڵ بکەن و ژیانیان لەگەڵ ببەنە سەر بە شێوەیەك کە ژیریی و مرۆڤایەتی ئەیەوێ و شەرع داوای ئەکات،

﴿فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا ﴿١٩﴾ وَإِنْ أَرَدتُّمُ ٱسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا۟ مِنْهُ شَيْـًٔا ۚ أَتَأْخُذُونَهُۥ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٢٠﴾ وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا ﴿٢١﴾

---

﴿فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ﴾ ئینجا ئەگەر خۆشتان ناوێن و بێزراون لاتان و حەز ناکەن بە خاوسەریی و ڕاگیرکردنیان، بەبێ ئەوەی هیچ هۆیەك ببێ بۆ ئەوە لەلایەن ئەوانەوە ﴿فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا﴾ ئەو کاتە هەر خۆتان بگرن و دەستیان لێ هەڵمەگرن، چونکە نزیکە ئێوە شتێکتان پێ ناخۆش بێ و کەچی خوا خێرو بەهرەی زۆری تێ بخات، واتە ئەو خۆش نەویستن و بێزاریتانە مەکەن بەهۆی جیا بوونەوەتان لێیان، چونکە ئێوە نازانن، بەڵکو لەمانەوەی ئەو ئافرەتانەدا خێری زۆری ئێوەی تیا بێت، بەم ڕەنگە ئەو بێزاریە بگۆڕێ بە سۆزو خۆشەویستی و ژیانێکی خۆش و کامەرانی پەیدا ببێ بۆیان، وە نزیکە منداڵی باشیان ببێ لێیان کە خێرو خۆشی لە قاپی خوا بۆ هەموو شتێکی تریشەو تایبەتی نیە بە ئافرەتەوە، وەك ئایەتەکەیش تایبەتی نەکردووەو فەرمووی: شتێکتان پێ ناخۆش بێ، وە نەیفەرموو: ئافرەتێك... بێجگە لەوەش خۆگرتن لەسەر هەر شتێکی ناخۆش لەبەر خوا پڕە لە پیت و فەڕ.

ئا بەو جۆرو شێوە شیرینە ئیسلام پەیوەندی ژن و مێردیی بەهێز ئەکات و ئەیەوێ نەپچڕێ لە خۆڕایی، چونکە ماڵ و خێزان ئەکات بەهۆی ئارامی و ئاسایش و ئاشتی، وە پەیوەندی ژن و مێردی داناوە بە مایەی خۆشەویستی و سۆزو بەزەیی، کەواتە تا دەست بدات و بگونجێ ئەبێ ئەو پەیوەندیە بپارێزرێت و ڕاگیر بکرێ لەسەر بارو شێوە شیرین و ڕاستەقینەکەی خۆی. ئینجا ئەی برای بڕوادار، ئەی ژیرەوەر بیرێك بکەرەوەو بەراوردێکی ئەم ئایەتە بکە لەگەڵ ئەو پەستی و بێناموسیەی کە(پێش کەوتووەکان) ڕەوای ئەدەن کاتێ کە ژن و مێرد یەکتریان خۆش نەوێ بە لایانەوە ڕەوایە نەك جیا بوونەوەو تێك دانی ئەو ماڵ و خێزانە، بەڵکو ئافرەتێك کە پیاوەکەی خۆش نەویست بەدزیەوە خۆی ڕێك بخات لەگەڵ

هەرکەسێك کە دڵی ئەیگرێ و کاری ژن و مێردی لەگەڵ بکات، چونکە ناچارەو مێردەکەی خۆی ناوێ، هەروەها مێردەکەشی ئەگەر حەزی لە ژنەکەی نەکرد!! ئینجا ئەگەر لەپاش ئەو هەموو هەوڵ و خۆگرتنە، دەرکەوت کە ژیانی ژن و مێردیی هەر ناگونجێ و ئەبێ دەست هەڵگرێ لەو ئافرەتە، ئەو کاتە ناچارە دەستی لێ هەڵگرێ و هەر ماڵ و مارەییەکەی داوەتێ بیداتێ با زۆر زۆریش بێ، وەکو ئەفەرمووێ: ﴿وَإِنْ أَرَدتُّمُ ٱسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ﴾ ئەگەر ویستتان هێنانی ژنێکی تازە لە شوێن ژنە پێشووەکەتان کە حەزی لێ ناکەن و ئەتانەوێ دەستی لێ هەڵگرن ﴿وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا﴾ لەکاتێکدا کە هەرکام لە ئێوە ماڵێکی زۆرتان دابێ بە هەرکام لەو ژنە پێشووانەتان، ئیتر وەریان گرتبێ یان لە گەردنتان دا نابێتەوە ئەبێ بیاندەنێ، ﴿فَلَا تَأْخُذُوا۟ مِنْهُ شَيْـًٔا﴾ هیچ شتێك لەو ماڵە زۆرە وەرنەگرنەوە، نەکەم و نەزۆر، بەڵکو بە تەواوی با بیبەن بۆ خۆیان، چونکە ئەو گۆڕین و دەست لێ هەڵگرتنەتان لەبەر بەرژەوەندیی و پێخۆش بوونی خۆتانەو بەبێ هیچ گوناهو خراپەیەك لەلایەن ئەوانەوە، کەواتە لەبەرچی هیچیان لێ بسێننەوە؟ واتە بە هیچ ڕەنگ مافی ئەوەتان نیە، ئینجا بە توندی بێزاری دەرئەبڕێ لەو کردەوەو سەرزەنشتیان ئەکات لەسەری، ئەفەرمووێ: ﴿أَتَأْخُذُونَهُۥ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا﴾ ئایا وەری ئەگرنەوە بە درۆو بوختانێکی زل بە ستەم و گوناهێکی ئاشکرا؟ پیاوی وابووە کە ویستبێتی ژنەکەی تەڵاق بدات بوختانی داوێن پیسی بۆ کردووە، تا ناچار بووە دەستی لە مارەییەکەی هەڵگرتووە، ئینجا خوایش ئەو باوی سەردەمی نەفامیەی قەدەغە کرد بەو توندییە. بێجگە لەوەش ئەو وەرگرتنەوە هەر بوختان و درۆی زلە، چونکە کاتی خۆی بڕیاری داوەو پێویستی کردووەو ئێستا کە ئەیسێنێتەوە، واتە بڕیار نەدراوەو پێویست نەکراوە، وە هەم کاتی خۆی بڕیارو بەڵێنی داوە بەدانی بە تەواویی دەی کەلێی گل بداتەوە قسە پێشووەکەی بەدرۆو بوختان دەرئەکات، هەروەها لە چەند بارێکی تریشەوە هەر بە بوختان و درۆ دەرئەچێ وەك(ئیمامی ڕازی) ئەفەرمووێ.
ئینجا هەمی تر بێزاری دەرئەبڕێ و سەرزەنشتی تریان ئاراستە ئەکات، ئەفەرمووێ: ﴿وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ﴾ ئایا ئێوە چۆنی وەرئەگرنەوە ﴿وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ﴾ لەکاتێکدا کە هێندێکتان گەیشتووە بە هێندێ ترتان و بە تەواوی تێکەڵی یەکتر بوون، واتە کاری ژن و مێردییتان لەگەڵ کردوون، وەك(ئیبن و عەباس و مجاهدو سوددی) ئەفەرموون. بێگومان ئەو

کەیشتن و تێکەڵیە لە هەموو شتێکی تر بەهێزترو تێرو تەواو ترەو چەندەها پێکەیشتن و تێکەڵی تریش ئەگرێتەوە: هەموو بزوتنەوەی ئارەزووو خۆشەویستی و هەموو سەرنج دان و نزیك بوونەوە و یەك گرتن و لێ کەوتنێك بەخۆشی و خۆشەویستی، هەموو، کەواتە زۆر جێی سەرسوڕمانە بۆ هەرکەسێك کە بیر لەوانە نەکاتەوە و لە ڕووی بێت هەر شتێك لەو ماڵ و مارەییە وەرگرێتەوە لەو ئافرەتە بێچارە کە خاوەنی ئەو هەموو ماف و چاکەیە بەسەریەوە!!

ئینجا سەر باقی ئەو هۆیانە هۆیەکی تر باس ئەکات بۆ ئەو وەرنەگرتنەوە کە بەڕاستی زۆر گرنگەو ئەبێ موسڵمان پێچەوانەی ڕەفتار نەکات، ئەفەرمووێ: ﴿وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَاقًا غَلِيظًا﴾ ئەو ئافرەتانە وەریان گرتووە لێتان عەهدو پەیمانێکی بەتین کە ئەو وتەی مارە کردنەیەکە خوا دایناوە و ئەوانی پێ حەڵاڵ کردووە، وەك(مجاهد) ئەفەرمووێ. یان بریتیە لە ئایەتی سورەتی ﴿البقرة﴾: ﴿فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾ وەك تەفسیر کرایەوە لەوێ. کە ئەو وتەیە لە کاتی مارە بڕینەکەیشدا ئەوترێ. وەك(قەتادە و ضحاك) و چەند کەسێکی تریش ئەفەرموون. دەی کەسێك ئەو پەیمانەی دابێ چۆن ئەبێ زاتی ببێ پێچەوانەی ڕەفتار بکات، ئاشکرایەکە وەرگرتنەوەی هەر ئەنداز لەو مارە ییە بە فێڵ و تەڵەکە و بەبێ ڕەزامەندی ئافرەتەکە دژو پێچەوانەیە!

هێندێ لە زانایان ئەم ئایەتەیان کردووە بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە زیادە ڕەوی دروستە لە مارەییدا، بێگومان بەپێی دەسەڵات و ڕەزامەندی دروستەو سنوورێکی تایبەتی بۆ دیاریی ناکرێ، وەك وەر ئەگیرێ لەو هەواڵەیشەوە کە(ئەبو یعلی) ئەیهێنێ لە(عمری فاروق)ەوە -خوای لێ ڕازی بێت- کە جارێك لە فەرموودەیەکی دا جڵەوگیریی کرد لەوەی مارەیی زیاتر بکرێ لە چوارسەد درهەم، لە پاشان ئافرەتێکی قورەیشی لێی هەڵپەڕی و بەرپەرچی دایەوە بەمەی لەم ئایەتەدا ئەفەرمووێ: ﴿وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا﴾ کە ﴿قِنطَارًا﴾ بریتیە لە ماڵێکی زۆر زۆر، ئینجا(حەزرەتی عمر)یش فەرمووی: ئەی خوایە داوای لێ خۆش بوونت لێ ئەکەم. هەموو کەس زانا ترە لە(عمر)، ئینجا پەشیمان بوویەوە لەو بڕیارەی کە دای و چووە سەر مینبەرو فەرمووی: من جڵەوگیریی ئێوەم کرد لەوەی کە مارەیی زیاد بکەن لە چوار سەد درهەم، ئینجا ئەڵێم: هەرکەس هەرچەندی پێ خۆشە لەماڵی خۆی بیدات لە مارەیی دا با بیدات. بەڵێ بێگومان ئافرەت و خاوەن ئافرەت بە سووك و ئاسان و کەم ئەرکی

بێنە پێشەوە باشترو خێرە، وەك(ئیبن و حەبان) لە صحیحەكەی دا ئەگێڕێتەوە لە(ئیبن و عەباس)ەوە -خوای لیَ ڕازی بێت- كە ئەفەرمووێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: لە چاك هەڵبژێراوی ئافرەتانە ئەوانەیان كە مارەییان سووك و ئاسان تر بێت، وە ئاشكرایە كە گرانی مارەیی و زیادە ئەرك ئەبێ بەهۆی كەم بوونەوەی ژن هێنان و شووكردن، كە ئەوەیش شەڕو خراپەی زۆر زۆری لیَ پەیدا ئەبێ.

ئەو ڕووداوەی(حەزرەی عمر) نەفام كردوویانە بە ڕەخنەو لەكە بەسەریەوە، بەڵام با بزانن ئەو جۆرە شتانە ئەبێ هەر ڕوو بدەن لە ئادەمیەوە، مەگەر زۆر زۆر بە دەگمەن دەست كەوێ كەسێك هەڵەی نەبووبێ،(ئیبن و جەریر) ئەڵێ(محمد كوڕی كعب) ئەفەرمووێ: جارێك پیاوێك پرسیار ئەكات لە(ئیمامی عەلی) لە مەسەلەیەك، ئەویش وەڵامی ئەداتەوە، لەپاش دا پیاوەكە ئەڵێ: نەخێر وانیە، بەڵكو بەم جۆرەیە، لە پاشان ئیمام ئەفەرمووێ: تۆ ڕاست ئەكەیت و من هەڵەم كرد، قورئان باسی مەسەلەیەكمان بۆ ئەكات كە(حەزرەتی داود) هەڵەی كرد تیای داو(حەزرەتی سلیمان) ڕێی پیَ برد ــ سەلامی خوا لە هەردووكیان ــ. كەواتە هەركەسێك پیاو بێت ئەو ڕووداوەی(حەزرەتی) عمر)ە ئەكات بە بەهرەو هۆی گەورەیی بۆی نەك بە لەكەو ڕەخنە.

لە پێشەوە جڵەوگیریی كرد لەوەی كە ژنی مردووەكان بە كەلەپوورو میراتی وەرگیرێن، ئیتر بۆ ئەوە بیانخوازن بە زۆرو پیَ ناخۆشی، یان بۆئەوەی بیاندەن بە شووو مارەییەكانیان وەرگرن، وەك بەدرێژیی باس كرا، ئینجا لێرەدا بە تایبەتی جڵەوگیریی ئەكات لە باوێكی پیس لە باوەكانی سەردەمی نەفامی، كە بریتی بوو لە داگیركردن و مارەكردنی باوەژن لە پاش مردنی باوكەكە، كە ئەمە جیاوازەو بەهیچ كلۆجێك دروست نیە با هەردوو تەرەف ڕازی بن، لەسەر ئەم بارە ئەم ئایەتە پەیوەستە بە ئایەتی پێشووەوە كە فەرمووی: ﴿لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا۟ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا ۖ﴾، هەڵنەگرێ كە ئەم ئایەتە لەگەڵ ئایەتی داهاتوودا هاتبێ بۆباسی ئەو ئافرەتانەی كە مارەكردنیان قەدەغەیە، ئینجا لەبەرئەوەی مارەكردنی باوەژن بە تایبەتی مارەكردنی باوەژنی جویَكردەوەو بە ئایەتێكی تایبەتی زۆر بە توندی قەدەغەی كرد تا بە تەواوی بدا لەو باوە پیسەو لە ڕیشەی بێنێ،

وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَۚ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَمَقْتًا وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٢٢﴾ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّٰتُكُمْ وَخَٰلَٰتُكُمْ وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ وَأُمَّهَٰتُكُمُ ٱلَّٰتِيٓ أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَٰعَةِ

---

فەرمووی: ﴿ وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ﴾ مارە نەكەن ئەو ئافرەتانەی كە باوكەكانتان مارەیان كردوون، واتە مارەكردنیان مایەی تۆڵەو سزایە ﴿إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَۚ﴾ مەگەر ئەوەی كە تێپەڕی كردبێ و كرابێ لە پێش ئەم قەدەغە كردنەدا، چونكە پێش قەدەغە كردنی خوا هیچ شتێك قەدەغە نابێ، ئەگێڕنەوە لە(ئەبی كەعب)ەوە كە فەرموویەتی: مارە نەكەن ئەو ئافرەتانەی كە باوكتان مارەی كردوون مەگەر ئافرەتێك لەوەو بەر مردبێ، بێگومان ئافرەتی ئاوا دەست نادا بۆ مارە كردن، كەواتە مەبەست زیادەڕەویە لە قەدەغە كردنەكەداو زیادە دڵنیاكردنە لەسەری، بۆئەوەی بە تەواوی ڕێگە بگرێ لەوباوە پیسەو لە ڕیشەی بێنێ، ئینجا ئەو كردەوەو باوە پیسە بە تەواوی چەپەڵ و بێزراو ئەكات كەلە هۆی جڵەوگیرییەكەی دا ئەفەرمووێ: ﴿إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَمَقْتًا﴾ چونكە بەڕاستی ئەو مارەكردنە كردەوەیەكی زۆر پیس و چەپەڵ و خەشم لێ گیراو و بێزراوەو هەر وا هاتووە لە زانین و بڕیاری خوادا، بەم ڕەنگە هەرگیز ڕەوای نەداوە ﴿وَسَآءَ سَبِيلًا﴾ ڕێگەیەكی زۆر خراپ و بەدە كە دراوەتە بەر(ئیمامی ڕازی) -خوای لێ ڕازی بێت- ئەفەرمووێ: كردەوەی ناشیرین سێ جۆرە: ناشیرینی ژیریی، ناشیرینی شەرعی، ناشیرینی باو و عادەتی. خوای گەورە ئەو مارە كردنەی بە ناشیرین دەركردووە لە هەرسێ بارەكەوە: بەم ڕەنگە ناوی بردووە بە

﴿ فَٰحِشَةً ﴾ كە ئەوە خراپیەكەی ئاشكرایە بەلای هەموو ژیرێكی ساغەوە. وە ناوی بردووە بە ﴿ وَمَقۡتًا ﴾ كە ئەوەیە بێزراوبێ لای خواو خەشمی بەتینی ببێ لێی، وە ناوی بردووە بەرێگەیەكی بەدو خراپ كە دژو پێچەوانەی باوی ناو مەردانە، وە هەر كردەوەیەك لەم سێبارەوە چەپەڵو ناشیرین بێ، بێگومان گەیشتووەتە ئەوپەڕی پلەی پیسی، بەسە بۆ پیسیو گەورەیی ئەو گوناهە كە(ئیمامی ئەحمەدو حاكمو بەیهەقی) حەدیسێك ئەهێنن لە(بەرائی كوڕی عارەب)ەوە-خوای لێ ڕازی بێت- كە ئەفەرمووێ: گەیشتم بە خاڵم بەیداهێكی پێبوو، ووتم: نیازی كوێت هەیە؟ ئەویش ووتی: پێغەمبەر(ﷺ) ناردومی بۆسەر پیاوێك كە پاش باوكی باوەژنەكەی مارەكردووە، وە فەرمان پێداوم كە بدەم لە گەردنیو ماڵەكەی بێنم!!. بێگومان ئەم قەدەغە كردنە تایبەتی نیە بۆ مارە كردن لەپاش مردنی باوك، بەڵكو كشتیە بۆ مارەكردنی تەڵاق دراوی باوكك لەكاتی ژیانیشی دا، بەڵكو خراپیو بەدی ئەم جۆرەیان زۆر ترە، چونكە ئەو باوەژنە لەجێی دایكە، وە خواستنی بەپێش چاوی باوكەوە ئەوپەڕی بێ شەرمیو بەربەرەكانێی تیایە بەرامبەر باوكەكە، هۆی دژایەتیو دوژمنایەتیەكی بەتینە، ئینجا دێتەسەر باسی ئافرەتە قەدەغەكانی تریش، ئەفەرمووێ: ﴿ حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمۡ أُمَّهَٰتُكُمۡ ﴾ قەدەغەو حەرام كراوە لەسەرتان مارەكردنی دایكەكانتان، ﴿ وَبَنَاتُكُمۡ ﴾ مارەكردنی كچەكانتان، ﴿ وَأَخَوَٰتُكُمۡ ﴾ خوشكەكانتان، ﴿ وَعَمَّٰتُكُمۡ ﴾ پورەكانتان كە خوشكی باوكتانن ﴿ وَخَٰلَٰتُكُمۡ ﴾ پورەكانتان كە خوشكی دایكتانن ﴿ وَبَنَاتُ ٱلۡأَخِ ﴾ كچەكانی براتان ﴿ وَبَنَاتُ ٱلۡأُخۡتِ ﴾ كچەكانی خوشكتان ﴿ وَأُمَّهَٰتُكُمُ ٱلَّٰتِيٓ أَرۡضَعۡنَكُمۡ ﴾ ئەو دایكانەتان كە شیریان پێداون. ﴿ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَٰعَةِ ﴾ خوشكەشیرییەكانتان،

وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِى دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلَٰٓئِلُ أَبْنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنْ أَصْلَٰبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُوا۟ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٣﴾

---

﴿وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمْ﴾ **دایکـەکانی ژنـەکانتان** ﴿وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِى فِى حُجُورِكُم﴾ **کوڵـە بەسەکانتان کەلە ژێر چاودێریتان دانو سەرپەرشتیان ئەکەن** ﴿مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِى دَخَلْتُم بِهِنَّ﴾ **لەکاتێکدا لـەو ژنانـەتان بن کە چووبوونە لایـان،** ﴿فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ **کەواتـە ئەگـەر نەچووبوونە لایان ئـەوا هیچ گوناهو ئەرەجێکتان لەسەر نیە لە مـارەکردنی ئـەو کوڵەبەسـانەدا لـەپاش ئـەوەی دایکـەکانیان لـە ژێـر ڕکێفتانـدا نـەمابنو پەیوەستی مارە کردنەکەیان پچڕا بێ، ئینجا با بزانرێ کە قەدەغـە کردنـی ئـەو کوڵـە بەسانە نەبەستراوە بەوەی کەلای باوە پیارەکانیان بنو لە ژێر چاودێریی ئەواندا بن وەك ڕووکـەشو ڕواڵـەتی ئایەتەکـە کـە ئەیگەیـەنێ، بـەڵکو بەهـەر جـۆر قەدەغـەن لای کۆمـەڵو جـەماوەری زانایانەوە، بەڵام لەبەرئەوەی کوڵە بەس زۆرتر لای باوە پیارەکانیانن لە ئایەتەکەدا بەو جۆرە هــات،** ﴿وَحَلَٰٓئِلُ أَبْنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنْ أَصْلَٰبِكُمْ﴾ **قەدەغــە کــراوە لەســەرتان ژنــانی ئــەو کوڕانەتان کەلە پشتی خۆتان کنراوون، نەك ئەو کوڕانەی بەدەم کردووتانن بە کوڕی خۆتـان، وەك(زەیدی کوڕی حاریسە) -خوای لێ ڕازی بێت- کە پێغەمبەر(ﷺ) لە پێشەوە بڕیـاری دا بە کوڕی خۆی بەپێی باوی لەوەو پێشی عەرەب، ژنانی ئەو کوڕە دەمیانە کاتێ لە ژێـر ڕکێفیاندانەمان دروستە مارە کردنیان بۆ باوکە دەمیەکانیان.** ﴿وَأَن تَجْمَعُوا۟ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ﴾ **قەدەغە کراوە لەسەرتان کۆکردنەوەتان لە بـەینی دوو خوشك لـە مـارە کردنـدا، واتـە دروست نیە دوو خوشك مارە براوی پیاوێك بن پێکەوە، بەڵکو ئەگەر بەجارێ هـەردووی مـارە کردبـێ هـەردووی بەتاڵـە، ئەگـەر دواو بـەر بـووبن دووەمەکـەیان بەتاڵـە. وە هـەموو کۆکردنەویـەك لـە**

بەینیاندا قەدەغەیەو مایەی سزای خوایە ﴿إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ﴾ بێجگە لەوەی کە کرابێ لە پێش هاتنی ئەم ئایەت ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ بێگومان خوا لێ بووردەی میهرەبانە بە هەمیشەیی، کەواتە ئەبورێو میهرەبانی بەکار ئەهێنێ لەوجۆرە شتانەدا کە کراون لە پێش قەدەغەکردندا.

ئەم ئافرەتانەی کە قەدەغە کراون لەم ئایەتەو لە ئایەتی پێشووو لە ئایەتی پاش ئەم ئایەتەدا، هێندێکیان بەهۆی خزمایەتیو نەسەبەوەیە، وە هێندێکیان بەهۆی شیر خواردنەوەیەو ئەوی تریان بەهۆی دەستو پێوەندی ژن خواستنەوەیە، بێجگە لە مانە چەند قەدەغە کراوی تریش هەن لە هەرسێ جۆرەکە لە حەدیسدا قەدەغەکراون، لەبەرئەوەی بە درێژیی باس کراون لە کتێبەکانی هەموو مەزهەبەکاندا بە پێویستم نەزانی لێرەدا درێژە دان بەو باسە، هەروەها بە پێویستم نەزانی باسی ئەو هۆیانە کە باس کراون لەبارەی قەدەغەکردنی ئەو قەدەغە کراوانەوە، چونکە لام وایە هەر ژیرییەك تێك نەچووبێتو هەر سروشتێك نەترازا بێت لەسەر بارو تەوەرەی خۆی، خۆیان هەست ئەکەن بەڕاستو ڕەوایی ئەم قەدەغەیانەی کە ئیسلام هێناونی، وە ژیرییو سروشت خۆیان بە خۆیان قێزئەکەنەوە لە مارەکردنی ئەمانەی کە ئیسلام قەدەغەی کردوون، بێجگە لەوەش هەرکەسێك بڕوادار بێت هەرگیز سەر ناکاتەوە لە هیچ بڕیارێکی ئیسلام، بەڵکو هەموو وەرئەگرێ بەوپەڕی دڵنیاییو ئارامی دەروونەوە، ئیتر تێبگات لە هۆو حیکمەت یان نا؟ ئینجا شتێك ماوەتەوە کە سەرنج ڕاکێشە، پێویستە ئاگادار کردنەوە لەسەریو بیر لێ کردنەوەی ئەوەیش ئەمەیە کە بێگومان ئەم قەدەغە کراوانەی کە باس کران هەموو هەر قەدەغە بوون لە سەردەمی نەفامیشدا بێجگە لە دووانیان: مارەکردنی باوەژن، کۆکردنەوەی دوو خوشك لەمارە کردندا، کەواتە بەپێی زانینی ئێمە ئەبوایە هەر باسی قەدەغەکردنی ئەم دووانەی بکردایەو پێویست نەبوو بەباسی قەدەغە کردنی ئەوانی تر، بەڵام ئەبێ بزانین کە ئیسلام هەر بڕیارێکی دابێ لەهەر بارو ڕوویەکەوە، هەمووی لەلایەن خۆیەوە هاتووە، بەبێ گوێ پێدانو چاو لێ کردنو پشت بەستن بەهیچ بڕیارو بڕیاردەرێکی تر لە جیهاندا، چونکە لە ئایینی ئیسلام دا

بڕیاردەرکردن‌و ڕەوا دان‌و قەدەغە کردن هەر مافی خوایەو ئەبێ هەر لە لایەن ئەوەوە دەرچێ بەبێ هاوبەش، وە هەرکەسێك لای وابێ کە هیچ کەسێکی تر ڕێی بڕیار دەرکردن‌و قەدەغەکردنی هەیە، ئەو کەسە بڕوادار نیەو هاوبەش بۆ خوا دائەنێ هەرچەند خۆی بە موسڵمان دابنێ، وە هەرکەسێك لافی ئەو مافە لێ بدا بۆ خۆی ئەو کەسە لە ڕاستی دا لافی خوایەتی لێ ئەدا هەرچەندە بە دەم نەیڵێ. بە کورتی‌و پاڵفتەیی باسەکە ئەمەیە: حەڵاڵ کردن‌و ڕەوادان‌و قەدەغەکردن تەنها ئەبێ لە خواوە وەرگیرێ، بێجگە لە خوا هیچ کەسێکی تر مافی ئەوەی نیە، نەلە مارە کردنداو لە خواردەمەنی‌و خۆراکداو نەلە پۆشاکدا، وە نەلە هیچ کردارو ڕەفتارو مامەڵەو کڕین‌و فرۆشتندا، وە نەلە هیچ پەیوەندی‌و پەیوەستی‌و هیچ کاروبارێکی تری ژیان‌و جیهاندا، مەگەر لەسەر ئیزن‌و ڕەزامەندی خوا، بەپێی شەریعەتی خوا، کەواتە هەموو بڕیارەکانی ئیسلام یەکسەرو سەربەخۆ لەلایەن خۆیەوە هاتووە، تەنانەت ئەو بڕیارانەشی کە بەدیمەن ڕێك بن لەگەڵ ڕاو باوو کرداری مەردومدا، وەك قەدەغە کردنی مارەکردنی ئەو ئافرەتانەی کەلە سەردەمی نەفامیشدا هەر قەدەغەبوون، نابێ دەربارەی ئەم جۆرە شتانە بڵێین: ئیسلام دانی نا بە باوو بڕیارەکانی ئەوانداو تێکەڵی شەریعەتەکەی خۆی کردن، بەڵکو پێویستە بڵێین: ئیسلام هات لەلایەن خۆیەوەو سەربەخۆ ئەم بڕیارانەی دا. ئەم بیروباوەڕو بۆچوونە قورئان زۆر بە گرنگ گرتوویەتی‌و پێویستە بڕواداران پارێزگاریان لەسەر بکەن.

دوایی هات بە یارمەتی خوای گەورە ئەم جزمی چوارە لە ١٤ی ربیع الثاني ١٤٠٦ بەرامبەر ١٩٨٥/١٢/٢٦ وە هەر لەم ڕۆژەدا ئەوا بە یارمەتی خوا دەست ئەکەین بە جزمی پێنج. سا خوا بە میهرەبانی خۆی یارمەتی دەرو وەرگری کردەوەکەمان بێت ــ آمین ــ

﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ كِتَٰبَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمْ أَن تَبْتَغُوا۟ بِأَمْوَٰلِكُم مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ فَمَا ٱسْتَمْتَعْتُم بِهِۦ مِنْهُنَّ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَٰضَيْتُم بِهِۦ مِنۢ بَعْدِ ٱلْفَرِيضَةِ﴾

**ئەم ئایەتانەی کە دێن لەبارێکەوە تەواوکەرن بۆ ڕێك و پێك کردنی ماڵ و خێزان لەسەر یاسا و بنەڕەتی سروشت کە داخوازە بۆ پاك و خاوێن کردن و پاراستنی ماڵ و خێزان لە تێکەڵ و پێکەڵی نەژاد و هەر ناپاکییەك لە نێوان ژن و مێرددا، ئەم ئایەتانە لەبارێکەوە تەواوکەرن بۆ ئەو مەبەستە وە لە بارێکی ترەوە تەواوکەرن بۆ دیاریی کردنی ئافرەتانێ کە خواستنیان قەدەغە کراوە، بەڵام قەدەغە کردنیان بە وێنەی هەموو تاقمی پێشوو نی یە کە بە هیچ جۆر دەست نەدەن بۆ حەڵاڵ بوون، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە لە ژێر نیکاحی کەسی تردان و هۆی قەدەغەکردنیان هەر ئەوەیە، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ﴾ قەدەغە کراوە لەسەرتان ئافرەتانی بێگانە کە مێردار بن بێجگە لەوانەی کە موڵکتان بن، ئەبو سەعیدی خودری ئەفەرموێ چەند ئافرەتێکمان دەست کەوتبوو لە گیراوەکانی(ئەوطاس) و مێرددار بوون لەبەر ئەوە پێمان ناخۆش بوو بچینە لایان، ئینجا کە پرسیارمان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە بو بەهۆی ئەوەوە بە حەڵاڵمان دانان. ئەو ئافرەتە دیلانە حەڵاڵن لەپاش ئەوەی دابەش بکرێن و ئینجا یەك حەیز بەسەریان دا بڕوا و بکەونە پاکی تا دەرکەوێ سکیان نییە، بەوە حەڵاڵ ئەبن بە نیکاح کردن، ئەگەر موسڵمان نەبوون حەڵاڵ ئەبن بە موڵکایەتی، لە چەند شوێنێك دا بە درێژیی باسی دیل و بەندەمان کرد کە بە ئەوپەڕی داد و دادپەروەریی ڕەفتاریان لەگەڵ دەکرێ، ئەگەر ئەو دیلانە ئافرەت بوون بە نیکاح کردنیان حەڵاڵ ئەبن ئەگەر موسڵمان بوون، بە موڵکایەتیش حەڵاڵ ئەبن ئیتر موسڵمان بن یان نا بێگومان هەرچۆنێ پێویستی هەیە بە سروشت بە خۆراك و پۆشاك هەروەها پێویستیشیان هەیە بە مامەڵەی ژن و مێردی لەبەر ئەوە ئیسلام چارەسەری ئەوەیشی کردووە بەو شێوە پاك و خاوێنە نەك بە وێنەی باوی نەفامی کۆن و تازە کە بەرەڵا بکرێن بۆ هەرکەس کە ئارەزووی بکات، ئینجا قورئان ئەو حەرام کردن و حەڵاڵ کردنە ئەبەستێتەوە بە تاقانە سەرچاوەیەکەوە، ئەفەرموێ: ﴿كِتَٰبَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ﴾ ئەوانەی کە حەرام کراون و حەڵاڵ کراون نوسراو و پێویست کراوی خوان کە بڕیاری داوەو نووسیویەتی لەسەرتان، کەواتە**

ئارەزوو کاری نییە یا باو و عورف و تەقالید نییە بەڵکو هەموو حەرام کردن و حەلاڵ کردنێك ئەبێ بە پێی بەرنامە و شەریعەتی خوا بێت، هیچ حەرام کردن و حەلاڵ کردنێکی تر نرخی نی یە و اعتباری پێ ناکرێ، بۆ وێنە زۆربەی ئەو حەرام کراوانە لە عورف و باوی خەڵکی دا هەر حەرام بوون بەڵام خوا اعتبار بەوانە ناکات، بەڵکو بە بڕیاری سەربەخۆی تازە حەرامی کردن و فەرموی: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ﴾ تەنانەت لە هەر کاتێك دا زانایانی ئیسلام اعتباریان کردبێ بە عورف لە پێشەوە شەرعی یەتیان بۆ ئەنجام داوە و گێراویانەتەوە بۆلای بەڵگەیەکی شەرعی. گێڕانەوەی هەموو بڕیارو بۆچوونێك بۆلای بڕیاری خواو دەقە قورئانی یەکان روونیان کردووەتەوەو دڵنیایی یان لەسەر کردووە لەهەموو بڕیارو تەشریعەکانیان دا، بەڵام لە کاتێك دا باسی بڕیارو و بۆچوونی جاهیلێتی کردبێ لەزۆر جێگەدا بەرپەرچی داوەتەوە بەوەی کە خوا ئیزنی نەداوەو هۆی بەتاڵی و ناڕەوایی یەکەی ئەوەیە لە سەرچاوەی بڕیارەوە نەهاتووە، تەنانەت ئەمەی کە ئەسڵە لە هەموو شتێك دا حەلاڵی یە هەتا بڕیاری شەرع بێت بە خیلاف ئەم قاعدە و یاسایەش هەر شەرع هێناویەتی. ئینجا لەپاش ئەوە باسی قەدەغە کراوەکانی کرد و پەیوەستی کردن بە بڕیاری خواوە، لەپاش ئەوە ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ رێگای پاك و خاوێن لە چارەسەر کردنی کاروباری ژن و مێردی دا کە پێویستی یەکی سروشتی یە ئەفەرموێ: ﴿وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَاءَ ذَٰلِكُمْ﴾ حەلاڵ کراوە بۆتان بێجگە لە قەدەغە کراوەکانتان ﴿أَن تَبْتَغُوا بِأَمْوَالِكُم﴾ کە بە ماڵەکانتان پەیدا بکەن تا چوار یان جاری یە و کەنیزە هەرچەند مەیلتان هەبێ لە کاتێك دا ﴿مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ﴾ واتە بە نیکاحی شەرعی و پاك و خاوێن بەکاریان بێنن نەك بە زینا و داوێن پیسی بکەن لەگەڵ ئافرەتان، دایکی ئیمانداران عائشة – خوای لێ رازی بێت – ئەفەرموێ لە سەردەمی نەفامی دا ژن و مێردی چوار شێوەی هەبوو، یەکێکیان وەك ئەم شێوەی کە ئێستا باوە بە خوازبێنی و عەقد بەستن و مارەیی بۆ دائەنرا، جۆری دووەم ئەمەبوو کابرا فەرمانی ئەدا بە ژنەکەی لەپاش پاك بوونەوەی لە حەیز کە پیاوێکی نەجیبی هەڵکەوت بنێ لەخۆی ئینجا مێردەکەی ئەوەستا تا بۆی دەرکەوت ژنەکەی سکی پڕ بووە ئینجا کاری ژن و مێردی ئەکرد لەگەڵ ژنەکەی و ئەو منداڵەی کە ئەبوو دای ئەنا بە کوڕی خۆی!! جۆری سێ یەم: ئافرەتێك خۆی بەرەڵا ئەکرد بۆ هەشت نۆ پیاوێك ئینجا کە منداڵێکی ببوایە ئەیگوت بەو کۆمەڵە پیاوە ئێوە ئەزانن کە چیتان کردووە لەگەڵم وە ئەم منداڵەی ئەدا بە مل هەرکام کە ئارەزووی بکردایە و ئەویش مخالەفەی پێ نەئەکرا. جۆری

چوارەم: ئافرەتێك خۆی بەرەڵا ئەكرد بۆ هەركەس كە ئارەزووی بكردایە، بەیداخی ئەنا بەسەر ئەوماڵەی كە تێیدا دائەنیشت، ئینجا كە منداڵێكی ببوایە ئەوانە كە پێ یان ئەگوترا ئەهلی قیافە و بە نیشانە و دروشم خەڵكیان ئەناسی. لەچەرخی نەفامی دا ئەم سێ جۆرە بۆگەنە هەبوو ئیسلام هات گەلی پاك كردەوە لێ یان. جۆری سێ یەم و چوارەم زینا و داوێن پیسی یە، یەكەم پاك و خاوێنی یە كە فەرمان ئەدات بە ئەنجام دانی، بەڵام دووەمەكە نازانین چ ناوێكی لێ بنێین؟!! قورئان شێوە پاكەكەی ناو ئەبا بە(إحصان) كە پاك و خاوێن كردنە بۆ پیاوەكە و بۆ ئافرەتەكە و بۆ منداڵەكان و بۆ بنەماڵە و خێزانەكە، ئەویتر ناو ئەبات(سیفاح) واتە هاوبەشی كردنی پیاو و ئافرەتەكە لە زایە كردنی ئەو ئاوەو قیزەون كردنی ئەو ئاوە كە هۆی ژیان و پەرەسەندن و گەشە پێدانی ئادەمی یە، ئینجا كاتێ لێ بویەوە لە نەخشە كێشانی ئەو شێوە پاكە كە ماڵ و سامانی تێدا بەخت بكرێ لەمارەییدا، لەپاش ئەوەئەگەرێتەوەبۆروونكردنەوەی چۆنێتی ئەوبەخت كردنە،ئەفەرموێ: ﴿فَمَا ٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهِۦ مِنۡهُنَّ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةٗ﴾ واتە هەركەس بیەوێ لەزەت و خۆشی وەرگرێ لەو ئافرەتە حەڵاڵانە كە باس كران پێویستە لەسەری مارەییەكەی بدا بە جۆرێ كە فەرزە لەسەری نەك بە پیاوەتی و إحسان وە بۆی نی یە ئەو ئافرەتە بە كەلەپوور وەرگرێ وەك لە سەردەمی نەفامی دا ئەكرا، هەروەها بۆی نی یە كە ئافرەتەكە بكات بە مارەیی بۆ ئافرەتێك كە ئەیەوێ بیخوازێ وەك ئەو دوو ئافرەتە دوو ولاخ بن و ئاڵ و گۆڕ بكرێن. ئا ئەمەیە رێزو ماف دان بە ئافرەت، لە پاش ئەوەی ئەو مافەی فەرز كرد بۆ ئافرەت ئینجا پیاو و ئافرەتەكە سەربەست ئەكات بۆ ئەوەی هەركام رازی بن لە زیادو كەم كردنەوە لەو ئەندازەدا كە بڕیار دراوە و پێویست كراوە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ فِيمَا تَرَٰضَيۡتُم بِهِۦ مِنۢ بَعۡدِ ٱلۡفَرِيضَةِ﴾ هیچ ئەرەج و گوناهێكتان لەسەر نی ی لەوەی لە بڕیارو رەزامەندیتان پێك هات لەسەری لە پاش ئەو ئەندازە مارەیی یەی كە پێویستتان كرد لەسەر مێردەكە و هەردوولا پێ ی رازی بوون، واتە بۆ هەر كامتان هەیە وازهێنان و زیاد و كەم كردن، بۆ ئافرەتەكە هەیە دەست هەڵگرێ لە هەمووی یان هێندێكی، بۆ پیاوەكەش هەیە زیاتر بدات بە ئافرەتەكە. ئەمەش پەیوەست ئەكات بە خواوە كە هەر ئەو سەرچاوەی بڕیارە،

إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٢٤﴾ وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۚ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِكُم ۚ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ ۚ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ

---

**ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ بەڕاستی خوا هەمیشە زاناو کاردروستە، هەر ئەو خاوەنی بڕیارو حوکمێکە و هەموو بڕیارەکانی لە زانین و کاردروستی و لێزانی یەوە دەرچووە. لە پێشەوە سەرنجی راکێشا بۆ مارەکردنی ئافرەتی حوڕ و ئازاد، ئینجا لێرەدا ئاماژە ئەکات بۆ ئەوەی ئەگەر دەسەڵات بۆ مارەکردنی ئافرەتی حوڕ نەبوو ئەو کاتە غەیرە حوڕ بخوازن ئەگەر خۆی بۆ نەئەگیرا و مەترسی ناڕەحەتی ئەکرد یان دووچار بوون بە زینا و داوێن پیسی ئەکرد، ئەفەرموێ: ﴿وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾ هەرکەس لە ئێوە کە توانای مارەیی ئافرەتە ئازادە ئیماندارەکانی نەبوو ئەتوانێ لە کەنیزە ئیماندارەکان مارە بکات، ﴿وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِكُم ۚ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ﴾ خوا زاناترە لە هەموو کەس بە ئیمان و باوەڕەکەتان، واتە ئەوەی کە بە زاهیر و دیمەن ئیماندار بێت ئێوەش بە ئیمانداری دابنێن و سەیری بکەن. بەڵام هەر خوا زانا و ئاگایە بە ئیمانەکەتان، ئێوە هەمووتان لە یەکترن و هەمووتان لە نەوەی ئادەمن و لە یەك نەفس پەیدا بوون، کەواتە خۆتان بە زل مەزانن و خواستنی ئافرەتە غەیرە ئازادەکان بە عەیب و لەکە دابنێن. ﴿فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ کەواتە ئەوانە مارە بکەن بە ئیزنی خاوەنەکانیان و مارەییەکانیان بدەنێ، ناوی خاوەنەکانیان بە ئەهل و کەس و کار ئەبات و بەوە ڕێزیان بۆ دائەنێ و دڵنەوایی تێدایە بۆیان، ئەم ئایینە ئەدوێ لەگەڵ ئادەمی دا لە سنووری سروشت و توانای دا، دەستی ئەگرێ بۆ ئەوەی بەرزی بکاتەوە لە**

ژیانی پەستی و نەفامی یەوە بۆ پلەی هەرە بەرزی ژیانی ئادەمێتی یەوە کە ئەوەش هەر لای ئیسلام دەست کەوت ئەبێ. ئەم ئایینە کە ئەوە دەکات چاودێریی هەموو بارو روویەکی ژیان ئەکات، دان ئەنێ بە هەموو پێویستی یەکی دا، لەناو یەکەم کۆمەڵی موسڵمانی یەکەمجار بەندەو کۆیلە هەبوو لە سەرەنجامی جەنگ دا و بۆ ئیسلام نەئەگونجا قەدەغە کردنی رەفتار کردن بە یاسا راستەقینەکەی سەبارەت بە دیلەکانی جەنگ کە ئەو یاسایە شتێکی راست و رەوایە تا دنیا دنیایە و لە سورەتی(محمد) دا هاتە خوارەوە: ﴿فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً﴾ نەئەگونجا رەفتار بەوە بکات، چونکە دوژمن رەفتاری پێ نەئەکرد بەهۆی ئەوەوە کۆیلەیی قەدەغە نەکرا، بێگومان لەناو ئەو دیلانەدا ئافرەت هەبوو، ئەو ئافرەتانە ئەبێ چارەسەری پێویستی جنسی یان بکرێ. ئەوەش چارەسەر کرا بەمەی ئەگەر مێرددار بێ ئەبێ حەیزێکی بەسەردا تێپەڕ بکات تا دەرکەوێ سکی نی.یە، ئینجا ئەگەر موسڵمان بوو بە نیکاح کردن ئەگەر موسڵمان نەبوو بە موڵکایەتی بۆ خاوەنەکەی رەوایە مامەڵەی ژن و مێردی یان لەگەڵ بکرێ. ئەو مارەیی یەش هەر هینی ئافرەتەکەیە نەك بۆ خاوەنەکەی، بەو شێوە شەرعی یە ژن و مێردییان لەگەڵ ئەکرێ نەك وەك باوی چەرخی نەفامی کە خاوەنەکانیان ئەیاندان بە کرێ و بەرەڵایان ئەکردن بۆ هەرکەس کە مەیلی ببوایە و کرێکەیشیان بۆ خاوەنەکەیان. سەرۆکی ناپاکان لە مەدینە(عبدالله ی کوڕی سەلول) بەو جۆرەی ئەکرد. هەرکات بەراوردی ئەو باوە پیسە بکرێ لەگەڵ ئەو رێزو پاکی یەی کە ئیسلام بەکاری ئەهێنا لەگەڵ ئەو ئافرەتە دیلانەدا، ئەو کاتە روون ئەبێتەوە کە ئیسلام چ گۆڕانکاری یەکی گەورەو گرنگی کرد و چ شان و شەرەفێکی دا بەم ئادەمی یە و ئەو دیلانەی جیا نەکردەوە لە ئافرەتە ئازادەکانی خۆی و ناوی نەبردن بە دیل و کۆیلە، بەڵکو فەرموی: ﴿فَتَيَـٰتِكُمُ ٱلْمُؤْمِنَـٰتِ﴾ رێزی پێدان بە پاك و خاوێنی کاری ژن و مێردی یان لەگەڵ بکرێ،

مُحْصَنَٰتٍ غَيْرَ مُسَٰفِحَٰتٍ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخْدَانٍ فَإِذَآ أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَٰحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى ٱلْمُحْصَنَٰتِ مِنَ ٱلْعَذَابِ

---

بەم رەنگە ﴿مُحْصَنَٰتٍ غَيْرَ مُسَٰفِحَٰتٍ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخْدَانٍ﴾ ﴿مُسَٰفِحَٰتٍ﴾ جیاوازە لە ﴿مُتَّخِذَٰتِ أَخْدَانٍ﴾، ﴿سافحات﴾ داوێنی پیسە و بەرەڵایە بۆ هەرکەس مەیلیان بکات ﴿مُتَّخِذَٰتِ أَخْدَانٍ﴾ ئەو ئافرەتە پیسانەن کە دۆستی تایبەتی و ژێر بە ژێریان هەیە. ئینجا دەربارەی ئەو ئافرەتە دیلانە کە ژن و مێردی شەرعی یان لەگەڵ کرا ئەگەر داوێن پیسی یان کرد تۆڵەیان سووك ترە لە ئافرەتە ئازادەکانی موسڵمانان وەك ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَآ أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَٰحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى ٱلْمُحْصَنَٰتِ مِنَ ٱلْعَذَابِ﴾ ئینجا کاتێ ئەو ئافرەتە دیلانە بە شووکردن یان بە موڵکایەتی کاری ژن و مێردی یان لەگەڵ کرا بە شەرعی، ئینجا ئەگەر زینا و داوێن پیسی یان کرد ئەوانە نیوەی سزاو تۆڵەی ئافرەتە ئازادەکانیان لەسەرە، واتە پەنجا جەڵدەیان لێ ئەدرێ کەواتە رەجم ناکرێن، چونکە ئەم تۆڵەیە دەست نادات نیوەی بەکار بهێنرێ، ئەمەش میهرەبانی یەکە لەگەڵ ئەو ئافرەتە دیلانەدا کە زۆرتر هۆی کاری زینا و بێ ناموسی یان هەیە بەمەی هەستیان بە کەرامەت و شەرەف لاوازە بەهۆی کۆیلەیی یەتی یەکەیان و بەهۆی نەبوونی عائیلە و بنەماڵەیان، بەڵام ئافرەتە حوڕەکان زۆرتر شەرمی کەس و کارو بنەماڵەکانیان ئەیانگرێ و دووچاری بێ ناموسی نایەن. ئیسلام تۆڵەی بەتین ترە دەربارەی حوڕ و ئازادەکان و دەربارەی کۆیلەکان کە ژێر دەستە و پەستن میهرەبانی بەکار ئەهێنێ بە پێچەوانەی جوولەکە کە کاتێ لایان دا لە رێگە راستەکەی خوا سەرۆکەکان عەفو ئەکران لە حەدو تۆڵە و ژێر دەستە و بێ هێزەکان سزا ئەدران و تۆڵەیان لێ ئەسێنرا. ئیتر چ یاسای یۆنانی یەکان و چ یاسای هیندی یەکان و چ هەموو یاسا و قانوونی نەفامی یەکان.

ئینجا کۆتایی باسەکە ئەهێنێ بەوەی کە مارە کردنی دیلەکان روخسەتێکە بۆ ئەوانەی کە مەترسی ئەکەن لەوەی دووچاری خۆنەگرتن و نارەحەتی و دووچاری زینا و داوێن پیسی بن. کەواتە هەرکەس خۆی بۆ ئەگیرێ با خۆی بگرێ تا خوا دەسەڵات ئەدات بۆ خواستنی ئافرەتە حوڕەکان، ئەوەش لەبەر رەگەزایەتی نی یە و بەکار هێنانی چینایەتی نی یە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە زروفی دیلەکان جیاوازە و لەوانەن دووچاری کاری داوێن پیسی بن یا گومانی ئەوەیان پێ ببرێ.

ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ ٱلْعَنَتَ مِنكُمْ وَأَن تَصْبِرُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٥﴾ يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ وَيَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦﴾ وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُواْ مَيْلًا عَظِيمًا ﴿٢٧﴾

---

**وەك ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ ٱلْعَنَتَ مِنكُمْ وَأَن تَصْبِرُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ ئەو روخسەت دانە بۆ کەسێکە کە مەترسی بکات لە ناڕەحەتی یان دووچار بوونی کاری بەد، ئەگەر ئێوە خۆتان بگرن ئەوە چاکترە بۆتان. خوای میهرەبان لەو هەموو حوکم و بڕیاردانەدا لێ بوردن و میهرەبانی بەکار هێناوە وەك ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ هەروەها خوای میهرەبان ئەیەوێ رێگای راست نیشانی بەندەکانی بدات و ئەیەوێ رێنموونی بەندەکانی بکات بۆ رێگە و رەوشتی چاکان و خواناسان کە هاتن و لەسەر ئەو رێگە راستە ژیانیان بردە سەر وەك ئەفەرموێ: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ وَيَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ وَٱللَّهُ *يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ﴾ خوا ئەیەوێ گەڕانەوەتان بۆلای خۆی لێ وەرگرێ و ئەوانەی کە گومڕان ئەیانەوێ کە ئێوە بە تەواوی لادەن لە رێگە راستەکەی خوا وەك ئەفەرموێ: ﴿وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُواْ مَيْلًا عَظِيمًا﴾ ئەوانەی کە شوێنی ئارەزووی نەفسی خۆیان کەوتوون ئەیانەوێ ئێوە لادەن لە رێنموونی یەکەی خوا بە لادانێکی گەورەو بە تەواوی، خولاسە ئەم بەرنامەی کە خوا دایناوە بەرنامەی هەموو بڕوادارانە لە یەکەمجارەوە تا ئێستا و لە هەموو چەرخێك دا شوێن کەوتووەکانی شەیتان کە لە دوا رۆژدا ئەبن بە سووتەمەنی دۆزەخ، وەك خۆیان گومڕان و ئەیانەوێ خەڵکیش بکەن بە هاوڕێی خۆیان، کەواتە با هەموو ژیرێك ئاگای لە خۆی بێت و بە گوێی دوژمن نەکات، داواکارین کە خوا یارمەتیمان بدات و بمانپارێزێ لە ئاگری دۆزەخ. آمین. والحمد لله رب العالمين.**

يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْۚ وَخُلِقَ ٱلْإِنسَـٰنُ ضَعِيفًا ﴿٢٨﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَـٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَـٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْۚ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْۚ

---

ئینجا دواترین دەست كاری دڵ دەكات بەوەی لەو یاسا و بڕیارانەدا میهرەبانی بەكار ئەهێنێ لەگەڵ بەندەكانی دا و خۆی دەزانێ بەندەكانی لاوازن لەبەر ئەوە باری شانیان قورس ناكات و ئەركی گران ناخاتە سەرشانیان، ئەفەرموێ: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ﴾ خوا ئەیەوێ سوك و ئاسانیتان لەگەڵ بكات و ئەركی گرانتان لێ دوور بخاتەوە، ﴿وَخُلِقَ ٱلْإِنسَـٰنُ ضَعِيفًا﴾ هۆی ئەوەش ئەوەیە ئادەمی بە لاواز دروست كراوەو بەرگە نەگرە. زۆركەس ئەڵێن و بەلایانەوە وایە بەرنامەی خوا قورس و گرانە و نابرێ بەڕێوە بە تایبەت لەبارەی كاری جنسی و ژن و مێردی یەوە، بەڵام سەرنج دانێكی ئەو گەل و كۆمەڵ و وڵاتانە كە بە تەواوی خۆیان بەرەڵا كرد لە ئاین و ئەخلاق و باوەڕ، بە وێنەی وڵاخ و ئاژەڵ كاری جنسی و ژن و مێردی یان بەجێ هێنا، سەرنج دانێكی ئەوانە بەسە بۆ ئەوەی كە بۆچوونی ئەوانە زۆر بێ جێ و هەڵەیە و ئەو گەل و وڵاتانە لە ئادەمێتی دەرچوون و بوون بە گیانلەبەرێكی تر بێجگە لەوەی دووچار بوون بە چەند نەخۆشی سامناك لە سەرەنجامی ئەو بەرەڵایی یە ژیرەكانیان لە گۆڤار و رۆژنامەكان دا هاوار ئەكەن بۆ چارەسەر كردن و گەڕانەوە بۆ مارە كردن بە شێوەیەكی پاك و شەرعی، چەند جار بە تجربە دەركەوت ئەو جۆرە گەل و وڵاتانە كیان و پیاوەتی یان نامێنێ و بەرگە ناگرن لە جەنگ و چالاكی دا و لەبەر درێژە پێ نەدان لە بارێكەوە، لەبەر ئەوەی وتە و نوسراوی ئەو ژیرانە بەناوبانگن لەبەر ئەوە بە پێویستم نەزانی قسە و هاواری ئەو ژیرانە لێرەدا بهێنم. لەم بارەوە خاوەنی(فی ظلال القران) بە درێژیی دواوە هەركەس ئەیەوێ با تەماشای بكات لەم شوێنەدا.

ئەم بەشی سێ یەمە لەم باس و دەرسەدا بەشێك لە پەیوەندی ماڵ و رێك و پێك كردنی باس ئەكات بۆ گەل و كۆمەڵی موسڵمان بۆ پاك و خاوێن كردنی مامەڵە لەگەڵ هەموان دا، چ

پیاو و چ ئافرەت، هەروەها بۆ رێك و پێك کردنی ماڵ و نەمانی زوڵم و لایەنگرتن کە باو بووە لە چەرخی نەفامی و یەکەم جاری هاتنی ئیسلام و داهێنانی مەسەلەی میرات و کەلەپوور بێت. جا بە پێی مەبەستی ئەم باس و دەرسە جڵەوگیریی ئیمانداران ئەکات لەمەی بە بەتاڵ و ناهەقی ماڵ و سامانی یەکتر بخۆن، لە هەمان کات دا ئەمە بەشێکە لەو سووك و ئاسان کردنەی کە لە ئایەتەکانی پێشوودا دەست نیشانی بۆ کرد لەبەر لاوازی و بەرگە نەگرتن و خۆنەگری ئادەمی، ئینجا با گوێ شل کەین لە قورئانەکەمان دەست نیشان ئەکات بۆ ئەو مەبەستە گرنگانە، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ﴿لَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ﴾ ماڵ و سامانەکەتان مەخۆن لەناو خۆتان دا بە ناهەق. بەم بانگ کردنە بە سیفەتی ئیمان دڵ و دەروونە ئەهێنێتە سۆزو پەرۆش بۆ بە پیرەوە چوون و گوێ رایەڵی، خواردنی ماڵ بە ناهەقی و غەش و خیانەت و بەرتیل و سوود و هەموو جۆرە مامەڵەیەکی تر کە شەرع رەوای نەدا دژی فەرمانی خوایە، ئینجا ئەم ئایەتە ئەگەر لە پاش ئایەتی قەدەغە کردنی سوو هاتبێ ئەوا ئەویش و هەموو قەدەغەکراوەکانی تریش ئەگرێتەوە، ئەگەر لە پێشەوە هاتبێ ئەوا ئەبێ بە سەرەتا بۆ قەدەغەکردنی کە لە باوی نەفامی دا زۆر پەیرەو بوو وە لە زیان دا یەکەم و سەر دەستەیە بۆ قەدەغە کردنی ئەو تاوانە بۆگەنە، ئینجا مەسەلەی بازرگانی یەکەم ئەبێ رەزامەندی هەردوو تەرەف ئەنجام بدرێ جیای ئەکاتەوە کە ئەوە چاکە ئەفەرموێ: ﴿إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٖ مِّنكُمۡۚ﴾ بەلام ئەگەر ئەو ماڵ و سامانە لە بازرگانی یەکەوە بەکار بهێنرێ کە بە رەزامەندی نێوان خۆتان بێت ئەوە چاك و دروستە و داخل نی یە لەو جۆرانەی کە ئایەتەکە جڵەوگیریی لێ کردووە، ئینجا لەپاش جڵەوگیریی لە خواردنی ماڵ و سامان بە ناهەقی و بە بەتاڵ، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡۚ﴾ خۆتان مەکوژن، بەوە دەست نیشان ئەکات بەوەی خواردنی ماڵ و سامان بەو جۆرە ناهەقانەی کە باس کران کارێکی بەد و کوشندەیە بۆ ژیانی گەل و کۆمەڵ،

إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٢٩﴾ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ عُدْوَٰنًا وَظُلْمًا فَسَوْفَ نُصْلِيهِ نَارًا ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿٣٠﴾ إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا ﴿٣١﴾

---

﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾ **بەڕاستی خوا میهرەبان و خاوەن بەزەیی یە پێتان، خوا میهرەبانە بە بەندەکانی ئەیەوێ بەو جڵەوگیریی یە بتان پارێزێ لەو دەردە کوشندەیە. بێگومان ئەو جۆرە مامەڵە بەدانە کە باس کران کوشندەن بۆ هەر گەل و کۆمەڵێك کە هەڵسن پێ یان، چونکە ڕەحم و بەزەیی و ویژدان نامێنێ تیایان دا و هەمیشە وان لە کەمین دا بۆ زیان گەیاندن بە یەکتر. خوای میهرەبان بەو جۆرە ڕێی ڕاست نیشانی بەندەکانی ئەدات کە مایەی خۆش بەختی یە بۆیان کەواتە هەرکەس ڕووی وەرگێڕا لەوە شایستەیە بۆ ئەم هەڕەشە سامناکە کە ئەفەرموێ:** ﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ عُدْوَٰنًا وَظُلْمًا فَسَوْفَ نُصْلِيهِ نَارًا﴾ **هەرکەس ئەو کارە بەدانە بکات بە زوڵم و دوژمنایەتی – نەك بە هەڵە و نەزانی – بێگومان ئەو کەسە ئەسوتێنین لە ئاگردا** ﴿وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا﴾ **ئەوەش شتێکی ئاسانە لەسەر خوا، ئا بەو جۆرە قورئان لە کاتێك دا ڕێنموونی یان ئەکات و تەمێ ئەکات چواردەوری خەڵکی ئەدات بۆ ئەوەی گوێ ڕایەڵی بکەن، ئینجا بەرامبەر ئەو هەڕەشە سامناکە لەو سەرکێشانە، موژدە ئەدات بەوانەی کە خۆیان ئەپارێزن لە گوناهە هەرە گەورەکان موژدەیان ئەداتێ بە سڕینەوەی گوناهە بچووکەکان، میهرەبانی یان پێ ئەکات لەبەر زەعیفی و لاوازی یان ئەفەرموێ:** ﴿إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ﴾ **ئەگەر ئێوە دوور کەونەوە و خۆتان بپارێزن لەو گوناهە گەورانەی کە جڵەوگیریتان لێ کراوە** ﴿نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ﴾ **ئەسڕینەوە لێتان گوناهە بچووکەکانتان** ﴿وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا﴾ **ئەتانخەینە جێ و شوێنێکی پیرۆزو بەڕێز، واتە بەهەشت کە تێیدا هەیە ئەوەی نە هیچ چاوێك دیویەتی و نە هیچ گوێچکەیەك ناوی بیستبێ و نە بە خەیاڵی هیچ کەس دا هاتبێ. خوا بە میهرەبانی خۆی بەشدارمان بکات لەوەدا، ئینجا ئایا گوناهە گەورەکان کامانەن، ئەوە شتێکە زانایان تێیدا خیلافیان هەیە، هێندێ ئەفەرمون: ئەو حەوت گوناهەن کە بەناوبانگن.**

هێندێ تر ئەفەرمون: هەر گوناهێ کە هەڕەشەی لێ کرابێ. هێندێکی تر ئەفەرمون: هەر گوناهێکی بچووك کە دەوامی لەسەر بکرێ. هێندێ تر ئەمە پەسەند ئەکەن کە لە کتێبی(ئوصول) دا گوتراوە: ﴿کل جریمة توذن بقلة اکتراث مرتکبها بالدین﴾ هەر گوناهێك وا بگەیەنێ کە خاوەنەکەی کەم موبالاتە بە دین لە ئایەتەکانی رابردوودا لە یاسای میراتی و کەلەپووردا ئافرەت نیوەی بەشی بۆ دانراوە ئەوەش لەوانەیە ببێ بەهۆی حەسادەت وەك لە چەند ریوایەتێك دا هاتووە، جا ئەوا لێرەدا جڵەوگیریی ئەکات لەو حەسادەتە و ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَتَمَنَّوۡاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعۡضَكُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ﴾ ئاوات مەخوازن بۆ ئەوەی کە خوا باوی هێندێکتانی پێ داوە بەسەر هێندێکی ترتان دا، ئینجا با هێندێ لەو ریوایەتانە بهێنین: ئیمامی ئەحمەد لە(مجاهد) هوە ئەگێڕێتەوە کە(ام سلمة) – خوا لێ ی رازی بێت – گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا پیاو غەزا ئەکات و ئێمە غەزا ناکەین، لە میرات دا نیوەی پیاومان بۆ هەیە. ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە. لە ریوایەتێکی تردا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە جەنگ ناکەین تا شەهید ببین، میراتی تەواومان پێ نادرێ و(سدی) ئەفەرموێ: پیاوان گوتیان: ئێمە ئەمانەوێ ئەجرمان دوو قاتی ئەجری ئافرەتان بێت وەك چۆن دووبەشمان هەیە لە میرات دا، ئافرەتان گوتیان: ئێمە ئەمانەوێ ئەجری شەهیدمان ببێ چونکە ئێمە ناتوانین جەنگ بکەین و ئەگەر جەنگ قەرز بکرایە ئەو ئەجرەمان ئەبوو. بەهۆی ئەوەوە ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە و فەرموی: ئەوە نابێ و بەڵام داوای فەزڵ و بەهرەی من بکەن.(علی کوڕی طلحة) لە(ئیبن و عباس) هوە – خوایان لێ رازی بێت – ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی دەربارەی ئەم ئایەتە با هیچ پیاوێ ئاوات نەخوازێ و بڵێ کاشکێ ماڵی فلان و ئەهلی فلان هینی من بوایە. بەڵکو داوای فەزڵی خوا بکات.(حسن و محمد و ئیبن و سیرین و ضحاك و عطا) ش وێنەی ئەمەیان گوتووە. ریوایەتە پێشووەکان وا نیشان ئەدەن کە هێندێ لە بۆچوونی چەرخی نەفامی لە کایەدا بووە لە دڵ و بۆچوون دا، هەرچۆنێ لەناو ئافرەتە مەدینەیی یەکان دا وا دەرئەکەوێ کە بەربەرەکانێ و مونافەسە بووە لەناو پیاو و ئافرەتان

دا، ئەوەش لەو ئازادی و سەربەستی یەوە فەراهەم هاتووە کە ئیسلام دایهێنا، بەڵام ئیسلام لایەنگیریی هیچ لایەکی نەکردووە، بەڵکو ئیسلام بە یەك چاو سەرنجی ئادەمی داوە بە ئەوپەڕی دادو دادپەروەری. ئیسلام لە دانانی کارو فرمان و دابەش کردن دا بە پێی سروشت جووڵاوەتەوە لەگەڵ هەمووان دا، هەروەها لە دانان و دیاریی کردنی بەش بۆ پیاو و ئافرەت. ئیسلام و جیهاد و جەنگی پێویست نەکرد لەسەر ئافرەت لەبەر ئەوەی ئافرەت لەناو نەچێ و پیاوی لێ ببێ و پەروەردەی بکات بۆ ئەو کارو ئیشانەی کە گونجاو و شیاون بۆ پیاو کە جیهاد و جەنگ یەکێکە لە کارە شیاوەکانی، هەرکەس بە باشی تێ بگات لە بەرنامەکەی بۆی روون ئەبێتەوە کە ئەوەی ئیسلام هێناویەتی دەربارەی هەموو ناوچەکانی ئادەمی ی و ژیان هەر ئەوە راستە و دەست نادات بۆ بژارە و دەست کاری کردن، هەرکەس دەمە دەمێ بکات سەری ئەدا لە سەنگ. بۆ نموونە: نەفامان ئەڵێن: ستەم کراوە لە ئافرەتان کە نیوەی بەشی پیاوانیان پێ ئەدرێ، بەڵام با نەفامان تۆزێ بیر بکەنەوە کە ئیسلام زیادە ریعایەتی ئافرەتی کردووە و بەشی زۆری بە ئافرەت داوە، ئەوەتا ئافرەت شوو ئەکات و پێویستە لەسەر مێردەکەی بیژیەنێ و نان و بەرگ و پێویستی جێ بەجێ بکات، بەڵام پیاو ئەبێ ژن بێنێ و ئەو هەموو ئەرکەی بکەوێتە سەر، پیاوێ بمرێ سێ هەزار دۆلار بەجێ بهێڵێ بۆ کوڕو کچێك، هەزار ئەدرێ بە کچەکە و دوو هەزار ئەدرێ بە کوڕەکە، ئینجا کوڕەکە ژن دێنێ بە دوو هەزار دۆلار و کە ئەرکی ژن هێنانەکەی لە کۆڵ ناخات چ جای ئەرکی ژیانی خۆی و ژنەکە، کچەکە هەزارەکە هەڵئەگرێ بۆ خۆی کە شوو بکات دوو هەزاری تێدا سەرف ئەکرێ و ئەبێ مێردەکەش بەخێوی بکات، ئیسلام هەموو مافێکی راست و رەوای داوە بە ئافرەت بە بێ ئەوەی ئافرەت داوای کردبێ و ئاگای لێ بێ یان بەتەما بێ، لەم بارەیەوە نووسەران لە موسڵمانەکان و غەیرە موسڵمانەکان ئەوەندەیان نووسیوە کە بە باشی دەم کوتی هەموو نەفامانی کردووەتەوە، یەکێ لەو نووسەرانە(دکتۆر عبدالباقی) یە لە پەڕاوی(حقوق الإنسان) دا لەبارەی مافی ئافرەت لە ئیسلام دا – خوا پاداشتی بداتەوە – هەرکەس ئەیەوێ با تەماشای بکات. وەك شەهید سید قطب هێناویەتی لە سورەتی(النساء) جزمی(٥)ئەوەی هێنالەگەڵ چەند شتێکی زۆر گەورەو گرنگ کە هیچی تێدا نەهێشتووەتەوە.

لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبُواْ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَ وَسْـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٣٢﴾ وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَٰلِىَ مِمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَٱلَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَـَٔاتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ

---

ئیسلام مافێکی زۆر تێرو تەواوی دا بە ئافرەت مافی موڵکایەتی وەك ئەم ئایەتە نیشانمان ئەدات: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبُواْ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَ﴾ بۆ پیاوان هەیە بەش لەوەی کە بە کردەوەو کۆشش فەراهەمیان هێنابێ وە بۆ ئافرەتانیش هەیە بەش لەوەی کە بە کردەوە فەراهەمیان هێناوە، کە ئەم مافە عەرەب لە هەموو چەرخە نەفامی یەکانی کۆن لەمەوپێش رەوا نەئەدرا مەگەر بە دەگمەن هێشتا هەوڵ و تەقەلا ئەدرا کە بە حیلە و فێڵ بێبەش بکرێن یان تا بگونجێ ماف و بەشەکەیان کەم بکرێتەوە، ئینجا کۆتایی ئایەتەکە ئەهێنێ بەم فەرمودەیە: ﴿وَسْـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا﴾ واتە حەسادەت مەبەن بەوەی کە خوا داوێتی بە خەڵکی، بەڵکو داوا بکەن لە خوا کە بە فەزڵ و میهرەبانی خۆی بەشتان بدات لە غەزنەکانی موڵکی ئەو کە هەرگیز دوایی نایەت و خوا هەمیشە زاناو ئاگادار بووە بە هەموو شتێ و بە پێی ئەو زانینە هەموو شتێکی دابەش کردووە بەسەر بەندەکانی دا، کەواتە هەموو کارو کردەوەکانی ئەو راستە و ئاوات و حەسادەت بردن بە بەخشینەکانی خوا زۆر بێ جێ و نەفامی یە و هەر ئەوە راستە کە هەر روو بکرێتە قاپی یەکەی ئەو. لە ئایەتەکانی رابردوودا چۆنێتی دابەش کردنی کەلەپووری باس فەرمو بەو شێوەی کە چوو بە گوێچکەمان دا کە لەسەر بنەرەتی خزمایەتی دابەش ئەکرا لە کاتێك دا بە پێی پەیمانێ کە ناوبراوە بە پەیمانی(ولاء) کە لەوەو بەر رەفتاری پێ ئەکراو ئەویش هۆی بەشدار بوون بوو لە میراتی و کەلەپووردا کە لەم دوایی یەدا ئەوە لابرا و سڕرایەوە بە ئایەتی ئاخری سورەتی(الأنفال). هۆی بەشدار بوون لە میراتی و کەلەپوور هەر کرا بە خزمایەتی و ژن و ژن خوازیی.

جا ئەوا لەم ئایەتەدا بە پێی ئەو باوی لەوەو پێشە ئەو پەیمانە دێنێ و ئەفەرموێ: ﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَٰلِىَ مِمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَٱلَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَـَٔاتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ﴾ ئەو خاوەن ماف و بەشانە لە هەرکام و تاقمێ بەش و مافی خۆیانیان بدەنێ،

إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا ﴿٣٣﴾ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ ۚ فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ حَٰفِظَٰتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُ ۚ وَٱلَّٰتِى تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهْجُرُوهُنَّ فِى ٱلْمَضَاجِعِ وَٱضْرِبُوهُنَّ

---

**فەرمانەکە بە توندو بەهێز ئەکات بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا﴾ بەڕاستی خوا هەمیشە ئاگادار و شایەتە بەسەر هەموو شتێك دا. کەواتە ئەبێ بەندەکانی نەتوانن گوێ ڕایەڵ نەبن.**

**ئینجا دێتە سەر دواترین مەبەست لەم دەرسەدا کە بریتی یە لە ڕێك و پێك کردنی ماڵ و خێزان و دابەش کردنی کارو فرمان بەسەر ئەندامان دا، هەرکەس بە پێ ی شایستەیی و شیاوی خۆی، هەروەها دانانی یاسا بۆ پارێزگاریی ئەو ماڵ و خێزانە لە تێك چوون، ئەفەرموێ: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ﴾ تا ئەگاتە ئایەتی(٣٥). پێشەکی پێویستە ئەندازەیە بدوێین لەبارەی بۆچوون و بڕیاری ئیسلام دەربارەی خێزان و ڕێك خستنی ماڵ و خێزانەوە. بەرنامەی ئیسلام لە دروست کردن و پارێزگاری ماڵ و خێزان کە گەل و کۆمەڵ ئەبێ لە ماڵ و خێزان پێك بێت بە وێنەی خانوو و کۆشك کە پێك دێت لە بەردو خشت و کەرەسەکانی تر. ئەو خوای پەروەردگارە سروشتی ئەم ئادەمی یەی لەسەر بنەڕەت و بناغەی نێرو مێ و زاوزێ دامەزراندووە، وەك هەموو ئەم بوونەوەرە کە دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوە کە ئەفەرموێ: ﴿وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾، گەشتنی نێرو مێ ی ئادەمی گەشە پێدان و پەرەسەندنی بە شێوەیەکی تایبەتی فەراهەم هێناوە کە جیاوازە لە گیانلەبەرانی تر بەم ڕەنگە وای داڕشتووە کە گەل و کۆمەڵێکی لێ پەیدا ببێ کە جیهان ئاوەدان بکەنەوەو بەخێرو بێری ئەم بوونەوەرە بەختەوەر بن، ئەوەش بەوە ئەبێ کە ڕێکخستن و دامەزراندنی بنەماڵەکان بە شێوەیەکی تایبەتی بێت و یاسا و قانوونێکی هەبێ و ماڵ و خێزانەکان هەڵسن بەکارو فرمانی شیاوی خۆیان،**

**جا لەبەر ئەوەی پێویست کراوە پیاو کە هەڵسێ بە ئەرکی بەخێو کردنی ژن و خێزانەکە ئەبێ پیاو کاربەدەست و چاودێر بێ لەبەر ئەوە ئەفەرموێ: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ﴾**

پیاوەکان کاربەدەست و چاودێرن بەسەر ئافرەتەکانەوە، واتە کارو فرمانی شیاو بۆ پیاوان ئەوەیە، هۆی ئەوەش ئەوەیە:

١- ﴿بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ﴾ بەهۆی ئەوەوە خوا باوی هێندێکی داوە بەسەر هێندێکی تریان دا، واتە باوی پیاوانی داوە بەسەر ئافرەتان دا لە هێندێ کارو فرمان دا، خاوەنی هێزو بازووە و ئەتوانێ کارو کردەوەی سەخت بەجێ بێنێ و بگەڕێ بە دەشت و دەردا و هێزو وزەی هەیە بۆ بەرگری لەو ماڵ و منداڵ و خێزانە، ئافرەتیش لە بارێکی ترەوە باوی هەیە بەسەر پیاوان دا کە ئەتوانێ هەڵسێ بە ئەرکی سك و منداڵ بوون و بەخێو کردن و شیر دانی منداڵ و بێچووەکان لەبەر ئەوە خوا بەزەیی و میهرەبانی و سەبر و خۆگریی پێداوەو بە هەردووکیانەوە کاری ئەو ماڵ و خێزانە ئەڕوا بەڕێوە.

٢- ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ هۆی دووەم بۆ کاربەدەستی و چاودێریی پیاوان، ئەفەرموێ: ﴿وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡۚ﴾ واتە پیاو کاربەدەست و چاودێرە بەهۆی ئەوەی ماڵ و سامانەکانیان سەرف ئەکەن و بەخت ئەکەن و ئەرکی نان و نەفەقە و بەخێو کردنیان لەسەرە.

لەپاش روون کردنەوەی پێویستی سەرشانی پیاو سروشت و کارو فرمانی ئافرەتیش ئەخاتە بەرچاو ئەفەرموێ: ﴿فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ حَٰفِظَٰتٌ لِّلۡغَيۡبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُۚ﴾ ئینجا ئافرەتە ساڵحەکان بە خۆشی و ئارەزووی خۆیان گوێ رایەڵن و پارێزەرن بۆ پاکی و داوێن پاکی خۆیان لە نهێنی و پاش ملەی هاوسەرەکانیان بەهۆی پارێزگاری خوا کە ئیمان و لە خوا ترسی پێداون، یا بەهۆی ئەوەی کە خوا مافی ئەوانە پاراستووە. ئافرەتە ساڵحەکان بەو جۆرەن کە باس کران و بە پێچەوانەی ئەوان ئافرەتە ناساڵحەکان کە گوێ رایەڵ نین و سەرپێچی ئەکەن و هەڵناسن بە مافی مێردەکانیان، بۆ ئەوانە چارەسەر ئەمەیە کە لەم ئایەتەدا دەست نیشانی بۆ ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ وَٱضۡرِبُوهُنَّۖ﴾ ئەو ئافرەتانەی کە مەترسی ئەکەن لە سەرپێچی یان:

١.ئامۆژگاری یان بکەن.

٢.جێگایان لێ جوێ بکەنەوە و لەگەڵیان مەخەون، ئەوە زۆر بەکارە لە تەمێ کردنیان دا.

٣.لێ یان بدەن، بەڵام بە لێدانێکی سووك و دەست لەسەر و چاو بپارێزن.

فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا۟ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا ﴿٣٤﴾ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَٱبْعَثُوا۟ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصْلَٰحًا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيْنَهُمَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا ﴿٣٥﴾ وَٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا

---

﴿فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا۟ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا ۗ إِصْلَٰحًا﴾ ئینجا ئەگەر بەوە تەمێ خوار بوون و گوێ رایەڵی یان کرد، ئیتر هیچ ڕێگەیەك مەدەنە بەر بە دژیان و وازیان لێ بێنن. ئیمامی علی – خوای لێ رازی بێت – ئەفەرموێ: ئامۆژگاری بکات بەدەم بەم رەنگە – وەك ئیمامی شافیعی ئەفەرموێ – پێ ی بڵێ: لە خوا بترسە، چونکە من مافم هەیە بەسەرتەوە و فەرزە لەسەرت گوێ رایەڵی، جا ئەگەر بەو ئامۆژگاری یە کۆتایی هێنا ئیتر نابێ هیچی دەربارە بکرێ، ئەگەر بەوە گوێ رایەڵ نەبوو جێگای لێ جوێ بکاتەوە کە ئەوە زۆر بەکارە بۆ تەمێ خواری، ئەگەر بەوەش کۆتایی نەهێنا ئەوا لێ ی بدات بە لێدانێکی سووك و زامداری نەکات و دەست لەسەر و چاوی بپارێزێ، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا﴾ چونکە خوای گەورە بەرزو بڵندو گەورەیە، لەبەر ئەوە ئەم بڕیارانەی فەرز کرد، ئەگەر بەوەش کۆتایی نەهێنا ئینجا حەکەم لەلایەن هەردووکیانەوە وەك ئەفەرموێ: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا﴾ ئەگەر لە دژایەتی و یەك نەکەوتن و بەر بەرەکانێ ی نێوانیان، ئیتر هەرکام یان هەردووکیان ﴿فَٱبْعَثُوا۟ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ﴾ ئەو کاتە حەکەمێك لە کەس و کاری پیاوەکە و حەکەمێك لە کەس و کاری ئافرەتەکە دیاریی بکەن و بیان نێرن بۆ سوڵح و یەك خستنیان، ئیمامی شافیعی – خوا لێ ی رازی بێت – ئەفەرموێ: حاکم دوو پیاوی عادل دیاریی ئەکات ئیتر با بێگانەش بن بەڵام باش ئەوایە لە خزم و کەس و کاریان بن ئەوان باشتر حاڵیان ئەزانن و دڵسۆزتریشن، ئینجا ئەو دوو حەکەمە بە جوێ جوێ کۆبوونەوە بکەن لەگەڵ ژن و مێردەکەدا، ئینجا ﴿إِن يُرِيدَآ إِصْلَٰحًا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيْنَهُمَآ﴾ ئەگەر ئەو دوو حەکەمە سوڵح و چارەسەریان بوێ لە نێوان ئەو ژن و مێردەدا خوا یەك کەوتن و یەك قسەیی ئەخاتە نێوانیان و مەبەستەکەیان پێك دێت، یان

مەبەست ئەوەیە ئەگەر ئەو دوو حەکەمە بەڕاستی لەبەر خوا بیانەوێ ئەو پیاو و ئافرەتە یەك بخەن خوا ئەو پیاو و ئافرەتە یەك ئەخات و دڵیان نەرم ئەکات بۆ یەکتر، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا إِصۡلَٰحًا﴾ بێگومان خوا زاناو بە خەبەرە بە هەموو شتێ و هەموو فەرمان و بڕیارەکانی لە زانینەوە دێت، ئا بەو جۆرو شێوەیە خوای میهرەبان ڕێنموونی بەندەکانی ئەکات بۆ ڕێی ڕاست. بەو جۆرە دامەزراندنی ماڵ و خێزانی بە گرنگ گرتووە. پەیوەندی ئەم ئایەتانەی داهاتوو بە مەبەستە ئەساسی یەکانی ئەم سورەتەوە بە تێکڕایی، بە مەبەستی ئایەتەکانی ڕابردوو لەم جزمەدا لە چەند بارێکەوە هەیە. ئەم ئایەتانەی داهاتووە گەردش ئەکات بە دڵ و دەروون لەبارەی هۆنینەوەو ڕێك و پێك کردنی ژیانی گەل و کۆمەڵی بڕواداران، ڕزگار کردنی لە بیرو باوەڕ و بۆچوونی چەرخی نەفامی کە دەقی پێوە گیرا بوو، ڕازاندنەوەی بە نیشانە و دروشمەکانی ئایینی پاکی ئیسلام،ئەم ئایەتانی داهاتووە دەست پێ ئەکەن بە قاعیدە و یاسایەکی بنەڕەتی و سەرەکی کە خواپەرستی یە بە تاك و تەنیا و پەیوەست کردنی هەموو کارو کردەوەو بۆچوونێك بەو تاك و تەنیایی خواوە و گێڕانی خوا بە یەکەم سەرچاوە بۆ ئەو کارو کردەوەو بۆچوونانە وەك تەمێمان ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ﴾ خوا بپەرستن هیچ شتێ مەکەن بە هاوبەشی، هەموو تەمێ و ئامۆژگاری و بڕیارو یاساکانی ئەبێ هەڵقوڵێ لە باوەڕ بە تاك و تەنیایی خوا و لە زات و سیفات و ئەحکام و بڕیارەکانی دا، تەنها ئەو تاك و تەنیایی یە سەرچاوە و بنەڕەتە بە بێ هاوبەش و هیچ وێنەیەك. هەر کارو بیرو باوەڕ و کردەوەیە: لەو سەرچاوەیە هەڵنەقوڵابێ وەرناگیرێ و خوا نایەوێ و بەتاڵە. فەرمانی یەکەم پەرستنی خوایە و جڵەوگیریی لە هاوبەش ڕەوادان لە هەر بارێکەوە، ئیسلام لەپاش فەرماندان بە پەرستنی خوا و جڵەوگیریی لە هاوبەش ڕەوادان لە چەند شوێنێك دا فەرمان ئەدات بە پەیوەندی و چاکە کردن لەگەڵ بەندەکانی خوادا، ئاشکرایە کە باوك و دایك ئەبێ سەر دەستە بن وەك ئەفەرموێ: ﴿وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا﴾ چاکە بکەن لەگەڵ باوك و دایکتان،

وَبِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡجَارِ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخۡتَالٗا فَخُورًا ﴿٣٦﴾ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِ وَيَكۡتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ

---

**ئینجا ﴿وَبِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ﴾ چاكە بكەن لەگەڵ ئەوانەی كە خاوەن خزمایەتین، ﴿وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡجَارِ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ﴾ لەگەڵ هەتیوان و هەژار و بێ نەوایان و هاوسێ خزمەكان و هاوسێ بێگانەكان ﴿وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ﴾ هاوڕێی نیشتەجێ یان مەبەست حەلاڵ و هاوسەرە ﴿وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ ئەو رێبوار و سەفەری یانەی كە داماون و پارە و خەرجی یان نی یە ﴿وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۗ﴾ ئەو ئەسیر و دەست گیراوانەی كە كراون بە موڵكتان، ئینجا لەپاش فەرمان دان بە چاكە و دەست گیرۆیی ئەوانە كە باس كران، بە دوای ئەوەدا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخۡتَالٗا فَخُورًا﴾ بەڕاستی خوا ئەو كەسەی خۆش ناوێ كە خۆ بە زل زان و لوت بەرزە لە ئاستی خەڵكی و كەشخە و شانازی ئەكات بە ملی خەڵكی دا، ﴿ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِ﴾ ئەوانەی كە رژد و چروكن و فەرمان ئەدەن بە چروكی ﴿وَيَكۡتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ﴾ ئەو هەق و راستی یەی كە خوا بە فەزڵ و چاكەی خۆی پێ ی بەخشیون ئەوان كەتمی ئەكەن و ئەیشارنەوە، یان ئەو نیعمەت و سامانەی كە پێ ی بەخشیون ئەوان چاكە و دەست گیرۆیی پێ ناكەن یان بە رووپامایی ئەیدەن لەبەر ئەوەی كەشخە و شانازی پێوە ئەكەن، چونكە بێجگە لەوە مەبەستێكی تریان نی یە و باوەڕیان نی یە بە ئەجرو پاداشت لای خوا، ئا بەو جۆرە ئەخلاق و رەوشتی ئیمان و باوەڕ و خو رەوشتی كوفرو بێ باوەڕی دیاریی ئەكات و جوێ یان ئەكاتەوە لە یەكتر، لە چەند ریوایەتێك دا هاتووە كە ئەم ئایەتانە هاتوونەتە خوارەوە لە كۆمەڵێ لە جوولەكەكانی مەدینە، ئەم سیفەتە بۆگەنانە رێك و پێكە لەگەڵ جوولەكەدا، مەبەست بە وتەی ﴿لا یحب﴾ دەركردن و سزادان و تۆڵە سەندنە لێ یان و ئەوانە كافرو بێ باوەڕن،**

وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ۗ وَمَن يَكُنِ ٱلشَّيْطَٰنُ لَهُۥ قَرِينًا فَسَآءَ قَرِينًا ﴿٣٨﴾ وَمَاذَا عَلَيْهِمْ لَوْ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِهِمْ عَلِيمًا ﴿٣٩﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ ۖ

---

**دەربارەی هەموو بێ باوەڕان و خاوەنی ئەو سیفەتانە ئەفەرموێ:** ﴿وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا﴾ **ئامادەمان کردووە بۆ ئەو بێ باوەڕانە سزایەکی ریسواکەر بەرامبەر خۆ بە زل زانی و کەشخەکەیان. ئینجا لەسەر خراپی و بەدی یان ئەڕواو ئەفەرموێ:** ﴿وَٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ﴾ **ئەوانەی کە ماڵ و سامانیان بەخت ئەکەن و ئەیدەن لەبەر رووپامایی خەڵکی** ﴿وَلَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ﴾ **باوەڕیان نی یە نە بە خواو نە بە رۆژی دوایی، ئەو کەسانە هاوسەری شەیتانن و هەمیشە بە گوێرەی مەبەستی بەدی ئەو ئەجووڵێنەوە** ﴿وَمَن يَكُنِ ٱلشَّيْطَٰنُ لَهُۥ قَرِينًا فَسَآءَ قَرِينًا﴾ **هەرکەس شەیتان هاوڕێ و هاوسەری بێ ئەو کەسە هاوسەرێکی بەدو خراپی هەیە و لەو بارەیەوە زۆر بەدە. خوا بمانپارێزێ لەو سیفەت و کردەوە بەدانە آمین. ئینجا لەپاش ئەوەی ئەو هەموو سیفەت و کردەوە بەدانەی ئەوانەی روون کردەوە ئینجا بە بێزاری دەربڕینەوە ئەم شێوە پرسیارە ئاراستە ئەکات و لەبەر بەدی و خراپی یان رووی فەرمودەیان تێ ناکات و ئەفەرموێ:** ﴿وَمَاذَا عَلَيْهِمْ لَوْ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ﴾ **ئایا چی هەیە بۆ ئەوانە و چ زیان و ئەرك و بەرگری کەرێك هەیە بەسەریانەوە و لە چی مەترسی ئەکەن لەوەی کە باوەڕیان بهێنایە بە خواو بە رۆژی دوایی و لەو ماڵ و رۆزی یەی کە خوا پێی داون و کردوویە بە بەشیان بەخشین بکەن** ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِهِمْ عَلِيمًا﴾ **لەکاتێك دا خوا بەتەواوی زاناوئاگایە پێیان؟** ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ﴾ **بێگومان خوا بەئەندازی زەرەو بچوکترین شت زوڵم وناهەقی ناکات وپاداشتی هیچ چاکەیەك زایەناکات،**

وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفۡهَا وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمًا ﴿٤٠﴾ فَكَيۡفَ إِذَا جِئۡنَا مِن كُلِّ أُمَّةِۭ بِشَهِيدٖ وَجِئۡنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدٗا ﴿٤١﴾ يَوۡمَئِذٖ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَعَصَوُاْ ٱلرَّسُولَ لَوۡ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضُ وَلَا يَكۡتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثٗا ﴿٤٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ

---

**﴿وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفۡهَا﴾ واته ئایا له چی مەترسی ئەکەن لە کاتێك دا خوا ئاگاداره به خۆیان و به کردەوەکانیان، وه له کاتێك دا که خوا زوڵم ناکات له بەندەکانی به جۆرێ ئەگەر خراپە بکەن تۆڵەیان هەر بە ئەندازەی کردەوه خراپەکەیانە، ئەگەر چاکە بکەن چەند چەندانەیان ئەکاتەوه لای کەمی بە دە قات تا حەفتا و حەوت سەدو حەفتا هەزار و تا بە بێ ژمارەو حیساب؟!!! ﴿وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمًا﴾ ئەدات لە لایەن خۆیەوه پاداشتێکی گەورە، کە بەهەشتە و بەڕاستی پاداشتێکی گەورەیە. ئینجا بەدوای ئەو فەرمان و جڵەوگیریی و هاندان و سەرنج راکێشانەدا شێوەیە لە شێوە و بەسەرهاتە سەختەکانی رۆژی دوایی ئەهێنێ و رووی فەرمودە ئەکاتە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿ فَكَيۡفَ إِذَا جِئۡنَا مِن كُلِّ أُمَّةِۭ بِشَهِيدٖ﴾ واتە دەی ئایا چۆن ئەبینن رۆژی دوایی کاتێ کە خوا هەموو ئوممەتێك پێغەمبەرێك ئەکات بە شایەت لەسەر کردەوەکانیان و ﴿وَجِئۡنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدٗا﴾ تۆش ئەهێنین بە شایەت لەسەر ئەو بێ باوەڕانە کە چرووك و بێ نمەك و بێ بەزەیی بوون و بە رووپامایی بوون وەستاون لە ساحەی دادگای خوادا، ئەبێ ئەوانە چی بکەن و چی بڵێن و بۆ کوێ بڕۆن؟ ئەوانە وان لە حوزووری پەروەردگاردا و هیچ کەس ناتوانێ هیچ تکایەك بکات بۆیان!! ئەوا قورئان هێندێ لە حاڵەتی بەدو سەختیان نیشان ئەدات کە ئەفەرموێ: ﴿ يَوۡمَئِذٖ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَعَصَوُاْ ٱلرَّسُولَ لَوۡ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضُ وَلَا يَكۡتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثٗا﴾ لەو رۆژەدا ئەوانەی کە بێ**

باوەڕ بوون و سەرکێشی یان کردووە لە پێغەمبەر(ﷺ) لەم جیهانەدا پێ یان خۆشە و ئاواتە خوازن کە کاشکێ زەوی یان پێ تەخت بکرێ و بخرێتە ژێر خاك، واتە زیندوو نەکرایانەتەوە، یان هەر نەبوونایە، لەو ڕۆژەدا هیچ قسە و باسێ ناشارنەوە لە خوا، واتە ناتوانن دان نەنێن بە تاوان و خراپەکانیان دا، چونکە پێست و ئەندامەکانیان شایەتی یان لێ ئەدەن، خوا پەنامان بدات. بەڕاستی بەسە بۆ بەدی و سەختی حاڵیان کە بگەنە ئەو رادەیە بەو شێوە ئاوات بخوازن، ئای لە سەختی ئەو ڕۆژە هەق وایە بە بیر لێ کردنەوەی و لە کاتی خوێندنی ئەم ئایەتانەدا فرمێسك دارێژرێ وەك پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) فەرموی بە(ئیبن و مەسعود) قورئان بخوێنە بەسەرم دا، ئەویش عەرزی کرد: قورئان بۆ سەر تۆ هاتووە و تۆ منت فێر کردووە، ئەویش فەرموی: پێم خۆشە لە غەیری خۆم بیبیستم.(ئیبن و مەسعود) ئەفەرموێ: دەستم کرد بە خوێندنی سورەتی(النساء) تا گەیشتمە ئەم ئایەتە: ﴿وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا﴾ لەوێدا پێغەمبەر(ﷺ) دەستی کرد بە گریان و منیش وەستام.

ئەم ئایەتانی رابردووە دەستیان پێ کرد بە فەرماندان بە پەرستنی خواو جڵەوگیریی نافەرمانی و هاوبەش ڕەوادان، بێگومان نوێژ بۆ بەجێ هێنانی ئەو مەبەستە زۆر بەکارە، کەواتە چەند بەجێ یە لەم کاتەدا باسی نوێژ بێتە پێشەوە و هێندێ لە ئەحکامەکانی باس بکرێ، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ﴿لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ﴾ نزیکی نوێژ مەکەونەوە لە کاتێك دا کە ئێوە سەرخۆش بن﴿حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ﴾ هەتا بزانن ئەوەی دەیڵێن. ئیتر ئایا مەبەست جێگای نوێژ بێت، واتە مزگەوت، وەك بەم جۆرە رێك ترە لەگەڵ وتەی ﴿إِلَّا عَابِرِى سَبِيلٍ﴾ چونکە گوزەر کردن بە مزگەوت دا ئەکرێ، یان بە گوێرەی دیمەنەکەی مەبەستە،

﴿وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا ۚ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ الْغَائِطِ أَوْ لَامَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٤٣﴾

---

**به هەرکام باشە و ئەگونجێ ﴿وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ﴾ نزیك مەکەونەوە مەگەر لە کاتێك دا گوزەر بکەن بەناو مزگەوتەکەدا بە بێ وەستان، نزیك مەکەونەوە کاتێ لەش گران بن و غوسڵتان لەسەر بێ. ﴿حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا﴾ هەتا غوسڵ ئەکەن و خۆتان دەشۆرن. ئینجا هێندێ تر لە ئەحکامی نوێژمان بۆ باس ئەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ﴾ ئەگەر نەخۆش بوون یان لەسەر سەفەر بوون ﴿أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ الْغَائِطِ﴾ یان هەرکەس لە ئێوە هاتەوە لە شوێنێ کە جێگای دەست بە ئاو گەیاندنە واتە دەست نوێژتان شکا ﴿أَوْ لَامَسْتُمُ النِّسَاءَ﴾ یان دەستتان کەوت لە ئافرەتان و پێستتان کەوت لە یەکتر ﴿فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً﴾ ئاوتان دەست نەکەوت لەو حاڵەتانەدا دەست نوێژتان لەسەر نی یە، بەڵکو لە باتی ئەوە تەیەممومم بکەن، وەك ئەفەرموێ: ﴿فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ﴾ ئەو کاتە نیازی خۆڵێکی پاك بکەن و ئینجا بەو تۆز و خۆڵە مەسحی دەم و چاوتان و دەستتانی پێ بکەن، خوای میهرەبان لەو کاتانەدا کارەکەی ئاسان کردووە بۆ بەندەکانی وەك ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا﴾ واتە خوا ئەوەی ئاسان کردو تەنگەتاوی نەکردن، چونکە خوا هەمیشە لێ بوردە و سڕەرەوەی گوناهەکانە. هێندێ لە نووسەران لەبارەی دەست نوێژ و غوسل و ئەحکامەکانی تریشەوە ئەیانەوێ بە گوێرەی بۆچوون و فامی خەڵکی یەوە حیکمەت و هۆی ئەو ئەرکانە باس بکەن. بۆ وێنە پاك و خاوێنی ئەکەن بە حیکمەت و هۆی دەست نوێژو غوسل، کەواتە ئەو نوێژ نەکەرانەی کە لە شەو و رۆژێك دا چەند جار دەست و دەم و چاویان بە سابوون ئەشۆرن و رۆژی نا رۆژێ ئەچنە حەمام ئەبێ دەست نوێژ و غوسڵیان لەسەر نەبێ. بێگومان ئاشکرایە کە پێویستە لەسەریان دەست نوێژو غوسڵ، بەڵێ ئیسلام لە هەموو بارێکەوە پاك و پوختە و**

خاوێنی پێویست کردووه. بەڵام بە تایبەتی دەست نوێژ و غوسڵیشی فەرز کردووه. فەرز کردنی تەیەممووم لە کاتی نەبوونی ئاودا بۆچوونی ئەو نووسەرانە بە ناڕاست دەرئەکات، کەواتە لەو بڕیارو ئەحکامانەی کە پێ یان ئەگوترێ(تعبدی) پێویستە لەسەرمان بەجێ ی بێنین و گوێ رایەڵی یان بکەین بە بێ چەندو چوون. یان ئەگوترێ حیکمەتی نوێژ وەرزشە، ئەمەش هەر هەڵەیە، چونکە ئەگەر ئەوە راست بێت ئەبێ وەرزش کارەکان پێویستیان بە نوێژ نەبێ! ئینجا چۆنێتی تەیەممووم و هۆیەکانی و کام جۆر لە تەیەممووم نوێژی لە کۆڵ ئەخات و قەزای ناوێ و کام ئەبێ کە قەزا بکرێنەوە ئەمانە لە کتێبەکانی(فقه) دا باس کراوە و هەرکەس ئەیەوێ با تەماشای ئەو کتێبانە بکات، ئینجا ئایا دەست نوێژ ئەشکێ بە لێکەوتنی پیاو و ئافرەت بە بێ جیماع یان کاتێ ئەشکێ کە ئەو لێکەوتنە بە جیماع بێت. بە کورتی ئایا مەبەست بە ﴿لامستم﴾ جیماعە یان هەر لێکەوتنە بە هەر جۆر ئەوەش شتێکی خیلاف یە، بەپێ ی فیقهی حەنەفی یەکانی مەبەست جیماعە کە یەکێ لە ئەدەبەکانی قورئانە کە شتی ناجۆر بە زەقی باس ناکات، بە پێ ی فیقهی شافیعی و زۆر ئیمامانی تر بە پێ ی مانا زاهیرەکەی ئەگیرێ کە لێکەوتنی رووتە، جا لەبەر ئەوەی قورئان بە زمانی عەرەبی هاتووە بە بێ بەڵگە نابێ لادرێ لە مانا عەرەبی یەکەی بە تایبەت لێرەدا کە ئایەتەکە بە ﴿لمستم﴾ یش هاتووە کە زۆرتر لێکەوتنی لێ وەرئەگیرێ بە هەرحاڵ چاك وایە بە جۆرێ بیگرین کە خیلاف تێدا نی یە، واتە بیبڕین بەسەر لێکەوتن دا بە هەر جۆر وەك حەدیس وا فەرمان دەدا: ﴿دع ما يريبك إلى ما لا يريبك﴾. لە ئایەتەکانی رابردووا تەمێ و ئامۆژگاری بڕوادارانی کرد لەبارەی عەقیدە و ئەخلاق و پەیوەندی یان بە خواوە بەهۆی ئەوانەوە بوون و کیان و شەخسی یەتی ئیمانداران دێتە کایە، ئینجا لەم ئایەتانی داهاتووەدا ئاگاداریان ئەکاتەوە لە پیلان و مؤامرەی دوژمنەکانیان کە لەو کاتەدا سەرۆك و سەر دەستەی دوژمنان لە مەدینەدا جوولەکە بوون.

أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يَشْتَرُونَ ٱلضَّلَٰلَةَ وَيُرِيدُونَ أَن تَضِلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴿٤٤﴾ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِأَعْدَآئِكُمْ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَلِيًّا وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ نَصِيرًا ﴿٤٥﴾ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَيَقُولُونَ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَٱسْمَعْ غَيْرَ مُسْمَعٍ وَرَٰعِنَا لَيًّۢا بِأَلْسِنَتِهِمْ وَطَعْنًا فِى ٱلدِّينِ ۚ وَلَوْ أَنَّهُمْ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَٱسْمَعْ وَٱنظُرْنَا لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَقْوَمَ وَلَٰكِن لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٤٦﴾

---

له یەكەمجارەوە بە شێوەی سەر سوڕهێنان لە كردەوە بەدەكانیان ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ ئایا نەتزانیوە و ئاوڕێكت نەداوەتەوە بۆلای ئەوانەی كە بەشێ لە نامەی خوایان پێدراوە كە بە پێی ئەوە ئەبوو بانگی خەڵكیان بكردایە بۆلای خوا كەچی بە پێچەوانەوە ﴿يَشْتَرُونَ ٱلضَّلَٰلَةَ وَيُرِيدُونَ أَن تَضِلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ﴾ بە ئارەزووی خۆیـان گومڕایی بۆ خۆیـان هەڵئەبژێرن، ئەوەتا بە بێگومان ئەزانن پێغەمبەری خوایە(ﷺ) كەچی دانی پیا نانێن و ئەو بەڵگە و نیشانانەی كە ئەیزانن لەسەر راستی پێغەمبـەرێتی یەكەی ئەیشارنەوە، سەرباقی ئەوە ئەیانەوێ كە ئێوەش گومڕا ببن و رێگە راستەكەی خوا نەدەنەبەر – نەفرینی خوایان لێ بێ – چ كردەوەیەك لەوە بەد ترە كە ئەوانە پێی هەڵئەسن: گومڕایی خۆیان و گومڕا كردنی خـەڵكیش ﴿وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِأَعْدَآئِكُمْ﴾ خـوا لـە هـەموو كـەس ئاگـادار تـرە بە دوژمنـەكانتان كەواتـە ئێوەش ئەبێ بە دوژمن تەماشایان بكەن ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَلِيًّا وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ نَصِيرًا﴾ بەسە خوا بە دۆست و كاربەدەست بۆتان و بەسە خوا بە یاریدەدەر بۆتان. واتە ئەو جوولەكانە هەرچەند بەو جۆرە دوژمنن. بەڵام كە خوا كاربەدەست و دۆست و یارمەتی دەرتانە ئەبێ هەر پشت بەو ببەستن و باكتـان نـەبێ لـەو دوژمنـە بـێ نرخانـە. ﴿مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ﴾ لـەناو جوولەكەكان دا دەستەیەك هەن كە كەلام و فەرمودەكانی خوا لە تەورات دا ئەگۆڕن و تەفسیر ئەكەنەوە بە غەیری مەبەست و فەرمانی خوا بە دەستی قەست و بە دوژمنایەتی، بۆ وێنە وەك نیـشانە و سـیفەتەكانی پێغەمبـەر(ﷺ) و شـاردنەوەی ئایـەتی رەجـم، ﴿وَيَقُولُونَ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا﴾ ئەڵێن بیستمان و سەرپێچی دەكەین، ﴿وَٱسْمَعْ غَيْرَ مُسْمَعٍ﴾ دەربارەی پێغەمبـەر(ﷺ)

ببیسته له کاتێك دا شت ئەدرێ بە گوێچکەتان دا - ئەم وشەیە دەست ئەدات بۆ نزای خەیر و بۆ نزای شەڕ، بەڵکو لە ئەسڵ دا بۆ خێرە. بەڵام ئەو نەفرین لێ کراوانە نیازی شەڕیان مەبەست بووە، واتە یاخوا کەڕبێت یان بمرێت، ﴿وَرَاعِنَا﴾ دەڵێن(راعنا) کە ئەو وشەیەش هەڵئەگرێ بۆ مەبەستی چاك بەڵام بە پێی جوولەکەیەتی خۆیان نیازی مەبەستە بەدەکەیان ئەکرد کە بریتی یە لە لاقرتی پێ کردن و نیسبەتی نەفامی بۆ پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) - لعنة الله علی الیهود -، ئەفەرموێ: ﴿لَيًّا بِأَلْسِنَتِهِمْ وَطَعْنًا فِي الدِّينِ﴾ لادانی وتەکە لە هەق و راستی بۆ ناهەق و ناڕاستی و تەشەردان لە ئایینەکە واتە لە وتەکەیاندا دەمیان لار ئەکردەوە تا نەزانرێ مەبەستە پیسەکەیان، ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ قَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَاسْمَعْ وَانْظُرْنَا لَكَانَ خَيْرًا لَهُمْ وَأَقْوَمَ﴾ ئەگەر ئەوانە بیانگوتایە بیستمان و گوێ رایەڵین، بوەستە و چاودێریمان بکە و پەلەمان لێ مەکە تا ئەوەی پێمان ئەڵێیت وەری گرین چاك بوو بۆیان و ئەوە راست بوو. ﴿وَلَكِنْ لَعَنَهُمُ اللَّهُ بِكُفْرِهِمْ﴾ بەڵام خوا نەفرینی لێ کردن و لە رەحمەتی خۆی بێبەشی کردن بەهۆی کوفر و بێ باوەڕی یەکەیانەوە ﴿فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ کەواتە باوەڕ ناهێنن مەگەر کەمێك - واتە باوەڕێکی کەم و لاواز کە سوودی نی یە ئەوەش ئەوەیە کە باوەڕیان هەیە بە هێندێ لە نامەی خواو هێندێ لە پێغەمبەران.(ئیبن و عطیة) ئەفەرموێ جوولەکەی نەفرین لێ کراو ئەو جۆرە قسە بەدانە باوە لەناویان دا لەگەڵ موسڵمانان وتەیە بەکار ئەهێنن کە دەست ئەدات بۆ چاك و بۆ خراپ، بەڵام نیازی بارە بۆگەنەکەیان هەیە و منداڵیان لەسەر ئەوە رام ئەکەن و فێریان ئەکەن.

لەپاش ئەوەی لە ئایەتی پێشوودا سەری سوڕهێنا لە کردەوەی زۆر بەد و ناڕەوای ئەوانەی کە بەشێك لە نامەیان پێ بەخشرا بوو، ئینجا رووی فەرموده ئەکاتە جوولەکەکان بە شێوەی گشتی و بانگیان ئەکات بۆ بڕوا هێنان بە قورئان کە بڕوای هەیە بە تەورات و رێکە لەگەڵی و راستی تەوراتی خوا دەرئەخات، هەڕەشەیان لێ ئەکات بە سڕینەوەی وێنەو شێوەی شیرینی ئادەمێتی یان ئەگەر بڕوا نەهێنن، بە نەفرین لێ کردنیان بە وێنەی تاقمەکەی پێشوویان،

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ ءَامِنُواْ بِمَا نَزَّلۡنَا مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبۡلِ أَن نَّطۡمِسَ وُجُوهٗا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدۡبَارِهَآ أَوۡ نَلۡعَنَهُمۡ كَمَا لَعَنَّآ أَصۡحَٰبَ ٱلسَّبۡتِۚ وَكَانَ أَمۡرُ ٱللَّهِ مَفۡعُولًا ﴿٤٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ

---

ئەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ ئەی کەسانێ کە نامەی خواتان پێ بەخشراوە ﴿ءَامِنُواْ بِمَا نَزَّلۡنَا مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُم﴾ بڕوا بێنن بەوەی کە ئێمە بەرە بەرە و بە وەجبە وەجبە هێنامانە خوارەوە، واتە قورئان. لە کاتێك دا کە بە راست گێڕو رێك و پێکە لەگەڵ ئەو نامەی کە لەگەڵتانە، واتە تەورات وەك لە سورەتی(البقرة) دا باسمان کردن.

ئەوانەی کە ئەم بانگەیان لێ کرا نامەدار و شارەزا بوون، ئەو خوایەی کە ئەو نامەی پێ بەخشی بوون و ئەو بانگەی لێ ئەکردن، ئەوانە بەڵگە و نیشانەی ئاشکرایان بەدەستەوە بوو بۆ بڕوا هێنان، بەڵام چی ئەکەیت لە جوولەکە کە داخ لە دڵ و سەرکێشن، بە سروشت لارو نالەبارن؟! جا بەهۆی ئەوەوە بڕوایان نەهێنا، لەبەر ئەوە ئەم هەڕەشە سەخت و ڕەقەی ئاراستە کردن: ﴿مِّن قَبۡلِ أَن نَّطۡمِسَ وُجُوهٗا﴾ واتە بڕوا بێنن پێش ئەوەی چەند روو و دەم و چاوێك بسڕینەوە و کوێریان بکەینەوە، بەم رەنگە چاو و برۆ و لوت و دەم ونیشانە و دروشمی ئادەمێتی پێیانەوە نەهێڵین و ئەو شێوەو نەخشە شیرینە بەرین کە قەڵەمی قودرەت کێشاویەتی، تا بە وێنەی سمی حوشتر و وڵاخیان لێ بێت. وەك(ئیبن و عەباس) ئەفەرموێ – خوایان لێ رازی بێت – ﴿فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدۡبَارِهَآ﴾ بەهۆی ئەوەوە ئەو روانە بگێڕینەوە سەر وێنە و شێوەی پشت و پشت ملەکانیان کە ئەو نیشانە و دروشمانەیان پێوە نی یە و جێگەی رواندنی تووك و مون. یان لە پاش سڕینەوەی لە رووەکان، وێنە و شێوەی رووەکان وەرگێڕین بۆ پشت مل و شێوەی پشت مل وەرگێڕین بۆ رووەکان، کە هەرکام لەو سڕینەوە و هاڵ و گۆڕە زۆر ئابڕو بەرو ئێش و ئازار دەرە ، زۆر رێك و پێکە لەگەڵ تاوان و کردەوەی گۆڕاندن و سڕینەوەی ئەو وتەو زانینە راستانەی کە لایان بوو بە پێچەوانەیان رەفتاریان

ئەکرد!!(مجاهد) لە تەفسیری ئەم هەڕەشەیەدا ئەفەرموێ: چەند روویەك كوێر ئەبن و لایان ئەدەین لە رێی راست و وەریان ئەگێڕین بۆ دوواوە و بۆ پاشیانەوە لە گومڕایی دا، هەروەها(سدی و ضحاك) یش وێنەی ئەوە ئەفەرمون، كەواتە لەسەر رای ئەمان مەبەست سڕینەوەو كوێر كردنەوەو وەرگێڕانێكی ئاشكرایان نی یە بەڵكو نهێنی و مەعنەوی یە، هەروەها بە چەند جۆرێكی تریش تەفسیر كراوەتەوە، هەرچەند ئەمانە هەموو ئەگونجێن و هەڵئەگرن، بەلاّم رای یەكەم بەهێزترە و لە دڵ دا جێگیر ترە، چونكە زۆرتر تۆڵە و سزاكانی ئەو جوولەكانە لەم جیهانەدا بە شتێكی ئاشكرا بووە كە ئەوانی پێ ریسوا كراوەو مەردومی تریشیان پێ تەمێ خوار بووە. فەرموێ: بڕوا بێنن پێش ئەوەی چەند روویەك بەو جۆرە لێ بكەین، ﴿أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّآ أَصْحَٰبَ ٱلسَّبْتِ﴾ یان نەفرینیان لێ بكەین هەرچۆنێ نەفرینمان كرد لە پێشووەكانیان كە بە فێڵ راوە ماسییان كرد لە رۆژی شەممەدا كە لەو رۆژەدا قەدەغە بوو لەسەریان، وەك باسەكەی دێت لەمەوپاش – بە یارمەتی خوا – لە سورەتی(الأعراف) دا، ئیتر مەبەست بەو نەفرینە ئەمە بێت كە وەك ئەوان بە شێوەی مەیموون و بەرازیان بەسەردا بكێشرێ و شێوەو وێنەی ئادەمێتی یان بسڕرێتەوە وەك(مقاتل) و چەند كەسێكی تر ئەفەرمون. یان – وەك زۆربە ئەفەرمون – مەبەست بە نەفرین ئەوە بێت كە باوەو بەناوبانگە كە بریتی یە لە دەركردن لە میهرەبانی خواو جاڕ لێدانی ئەوە و گێڕانەوەی ئەوە لێ یان لەسەر زمانی مەردومان دا، یان مەبەست هەر سێ جۆرەكە بێت. چونكە ئەو پێشووانەیان دووچاری هەر سێ جۆرەكە بوون بەلای زۆربەوە. بێگومان ئەم ئایەتە ئەوە ئەگەیەنێ كە ئەوانە دووچار ئەبن بەو هەڕەشەی كە لێ یان كراوە ئەگەر بڕوا نەهێنن، ئاشكرایشە كە چەند كەسێك لەوانە بڕوایان هێناوەو زۆربەیان بڕوایان نەهێنا، دەی ئایا ئەم هەڕەشەیە بەدی هات یان نەء؟ ئەگەر بەدی نەهاتبێ وەلاّم چی یە و ئەم گرێ یە چۆن ئەكرێتەوە؟ لە وەلاّم دا ئەڵێین:

١- ئەو هەڕەشەیە بۆ ڕۆژی دوایی یە و لەوێ بەدی دێت، واتە لەو ڕۆژەدا وێنەو شێوەی ئادەمێتی یان ئەسڕرێتەوە و ئەکرێن بە عیبرەت و بێ ئابڕو ئەکرێن و ئەخرێنە دۆزەخ لەسەر ئەو بارەو بێبەش ئەکرێن لە بەزەیی و میهرەبانی خوا.

٢- ئەڵێین: ئەو هەڕەشەیە یەکێکە لەو دووبارە: ئەگەر یەکەمیان بەدی نەهاتبێ دووەمیان کە دەرکردنیان بێت لە بەزەیی خوا بەدی هاتووە.

٣- ڕای(مجاهد و ضحاك و سدی) هەڵئەبژێرین لە تەفسیری هەڕەشەکەدا، وەك باس کرا، لەسەر ڕای ئەوان هیچ گرێ یەك نی یە و بێگومان بەدی هاتووە.

٤- ئەو هەڕەشەیە بەستراوە بە بڕوا نەهێنانی هەموو ئەو هەڕەشە لێ کراوانە، دەی ئاشکرایە کە هێندێ لەوانە بڕوایان هێنا وەك(عبدالله ی کوڕی سەلام) و چەند کەسێکی تریان، بێجگە لەو وەڵامانە چەند وەڵامی تریش دراوەتەوە، بەڵام بە پێویستم نەزانی باس کردنیان.

بەهەرحاڵ و لەسەر هەر بار ئەبێ ئەوەی کە خوا بڕیاری دابێ بەدی بێت وەك ئایەتەکە دوایی ئەهێنێ بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا﴾ فەرمانی خوا بە هەرشتێك یان ئەوەی کە خوا بڕیاری دابێ کراوە و بەدی هێنراوە و ئێستا یان لەمەوپاش کە ئەوەی هەڕەشەی کردووە لەوانە لێرەدا یەکەم مەبەست و سەردەستەیە، ئینجا بەدوای هەڕەشەی پێشوودا هەڕەشەیەکی تر ئەهێنێ بۆ ڕۆژی دوایی یان بە لێ خۆش نەبوون و نەسڕینەوەی تاوانی هاوبەش بڕیار دەران بۆ خوا، لەگەڵ قاپی کردنەوەی میهرەبانی خوا بەرامبەر گوناهەکانی تر بۆ هەرکەسێك کە خوا خۆی بیەوێ. ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ﴾ بێگومان خوا خۆش نابێ لەوەی هاوبەشی بۆ دابنرێ و هیچ شتێك بکرێ بە هاوبەشی. وتەی(شرك) بە دوو جۆر بەکار ئەهێنرێ لە شەرع دا: جۆرێکی تایبەتی کە بریتی یە لە بڕوا بە بوونی هەر هاوبەشێك بۆ خوا لە زات و سیفەتی دا یان لە کردەوەو حوکم و بڕیاری دا، جۆرێکی گشتی کە هەموو بێ بڕوایی ئەگرێتەوە.(ئیبن و عەباس) – خوایان لێ ڕازی بێت – ئەفەرموێ: لێرەدا بەم جۆرە گشتی یە مەبەستە، هەروایش بەناوبانگە لەناو زانایانی

تەفسیردا، هاتنە خوارەوەی ئایەتەکە لە جوولەکەدا تایبەتی ناکات بە بێ بڕوایی ئەوانەوە، بەهەرحاڵ و لەسەر هەربار بێ بڕوایی جوولەکە ئەگرێتەوە و مەبەستی یەکەم سەرەکی یە لێرەدا، چونکە ئایەتەکە – وەك دەست نیشانمان بۆ کرد – لەوان دا هاتە خوارەوە، هەرچەند لێرەدا باسی هیچ وتەو کردەوەیەکی نەکردوون کە بیانگێڕێ بە هاوبەش ڕەوا دەر، بەڵام لە چەند شوێنێکی تردا باسی کردووە: ئەوەتا ئەگێڕێتەوە لێ یانەوە کە ئەڵێن عوزەیر کوڕی خوایە، هەرچۆنێ ئەگێڕێتەوە لە گاورەکانەوە کە ئەڵێن: عیسا کوڕی خوایە، کە بێگومان ئەوە هاوبەش بڕیاردانە بۆ خوا. هەروەها ئەگێڕێتەوە لێ یانەوە کە زاناکان و عابیدەکانیان ئەکەن بە خوای خۆیان بەمەی کە گوێ ڕایەڵن بۆیان لەو حوکم و بڕیارانەی کە بۆیان دەر ئەکەن لەلایەن خۆیانەوە، نەك لەلایەن خواو بەناوی خواوە، واتە ماڧی دانانی یاسا و شەریعەت ڕەوا ئەدەن بۆ ئەو زاناو عابیدانەیان کە ئەو مافەیش تایبەتی یە بە خواوەو ڕەوادانی بۆ هەرکەسێکی تر ڕەوادانی هاوبەشە بۆ خوا: بێجگە لەوەش بیروباوەڕی جوولەکە لەو سەردەمەدا کە ئەم قورئانە هاتە خوارەوە پڕبوو لە بت پەرستی و لای دابوو لە بیروباوەڕی تاك و تەنیایی خوا، کەواتە ئەم ئایەتە پلار ئەدا لە جوولەکە و تاوانباریان ئەکات بە تاوانی بت پەرستی و هاوبەش ڕەوادان، هەڕەشەیەکی ئاراستە کردن و بانگیان ئەکات بۆ خواپەرستی و وازهێنان لە هاوبەش ڕەوادان. بێگومان هاوبەش ڕەوا دان مایەی پچڕانی پەیوەندی بەندەیە بە پەروەردگاریەوە بە تەواوی، کەواتە لەگەڵ ئەو پچڕانەدا هیواو ئومێدی لێ خۆش بوون نامێنێ لە هەرکەسێك لە جیهان و ژیان دا پەیوەندی خۆی بپچڕێ تا ماوەو پەشیمان نەبێتەوەو نەگەڕێتەوە و پەیوەندی نەکاتەوە لە ژیان دا، ئەو کەسەی کە بەو جۆرە پەیوەندی خۆی بپچڕێ بێگومان سروشتی تێك چووە، ئەو هەموو رابەرو بەڵگە روون و ئاشکرایانە نابینێ کە پرژ و بڵاو بوونەتەوە لە لاپەڕەکانی ئەم بوونەوەرە پان و پۆڕەدا، ئەو کەسە بێبەش و بەش بڕاوە لە هەموو خێرو بێرێ و چاوەڕوانی چاکەی لێ ناکرێ، کەواتە تاوانەکەی دەست نادا بۆ چاوپۆشی و لێ بوردن، بەڵام بێجگە لەو تاوانە زۆر گەورەو ئاشکرایە، بێجگە لەو شتە پیس و بۆگەنە دەست ئەدا بۆ چاوپۆشی و لێ خۆش بوون،

وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم ۚ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ

**وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ﴾ خۆش ئەبێ لە هەر گوناهێك بێجگە لەوەو ئەیسڕێتەوە لە هەرکەسێك کە خوا خۆی بیەوێ و مەیلی بکات، واتە بێجگە لەو گوناهو تاوانە زۆر گەورەی کە باس کرا، ئیتر هەر گوناهێکی تر هەرچەند زۆر گەورە بن لە سنووری لێ بوردن دەرناچن، تۆبەیان لێ بکرێ یان نەکرێ، ماتووڵ بەندە هەست بکات بە گەورەیی خوا، و نائومێد نەبێ لە بەزەیی و لێ بوردنی خوا، بزانێ کە خوا بە دەسەڵاتە و هەرچی ویست ئەیکات، لێ بوردنی خوا گەورەترو فراوان ترە لە گوناهەکانی، ئا بەو جۆرە ئەبێ سەرنجی بەزەیی و بێ سنوور و دوایی نەهاتووی خوا بدرێ، سەرنجی لێ بوردنە پان و فراوانەکەی بدرێ کە دەرگای پێوە نادرێ و قاپی یەوانی بەسەرە نەوەستاوە! ئیمامی بوخاری و موسلیم حەدیسێك ئەهێنن لە(ئەبو زەری غەفاری) یەوە هاتووە، ئەفەرموێ: شەوێك لە شەوان دەرچووم، کە سەرنجم دا پێغەمبەر(ﷺ) بە تەنیا ئەگەڕێ و کەسی لەگەڵ نی یە، ئەڵێ منیش وا گومانم برد کە پێی ناخۆشە هیچ کەسی لەگەڵ بێت، لەبەر ئەوە لە سێبەری مانگەشەودا ئەگەڕام، ئینجا لای کردەوە و منی بینی و فەرموی: تۆ کێی؟ منیش وتم: خوا بمکات بە قوربانت. ئەبو زەڕم، فەرموی: وەرە، منیش ساتێك لەگەڵی ڕۆیشتم: ئینجا فەرموی: بێگومان ئەوانەی کە لە جیهان دا زۆریان هەیە لە ڕۆژی دوایی دا کەمیان هەیە، مەگەر ئەوانەی کە خوا ماڵ و سامانێکی پێ بەخشیون و ئەوانیش بەلای ڕاست و چەپ و هەموو لایەك دا ئەیبەخشن و بڵاوی ئەکەنەوە، کردەوەی خێری تیا ئەکەن، ئەبو زەڕ ئەڵێ: ئینجا ساتێ تر لەگەڵی ڕۆیشتم، ئینجا فەرموی: لێرەدا دانیشە، دانیشم لە دەشتێك دا کە چوار دەوری بەرد بوو، دانیشم لەوێ دا و فەرموی: لێرەدا دانیشە هەتا ئەگەڕێمەوە بۆلات، ئەڵێ ئەو ڕۆیشت هەتا لەبەرچاوم گوم بوو، ئینجا نەهاتەوە تا ماوەیەکی زۆری پێ چوو، ئینجا کاتێ ئەگەڕایەوە گوێم لێ بوو ئەیفەرموو: با زینا بکات و با دزی بکات، ئینجا کاتێ گەیشتە بەرەوە خۆم پێ نەگیرا و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا – خوا بم کات بە قوربانت – ئایا لەگەڵ کێ قسەت ئەکرد؟ من گوێم لێ بوو یەکێك قسەی لەگەڵ ئەکردی، فەرموی ئەوە جوبرەئیل بوو، لەولایە دەرکەوت لێمەوە، ئینجا پێی وتم: موژدە بدە بە ئوممەتەکەت کە**

هەرکەسێك بمرێ و هیچ شتێك نەکات بە هاوبەشی خوا ئەچێتە بەهەشت. منیش وتم ئەی جوبرەئیل با زینای کردبێ و با دزی کردبێ؟ وتی: بەڵێ. دوبارە وتم: با زینای کردبێ و با دزی کردبێ؟ فەرموی بەڵێ: با ئارەقیشی خواردبێ. ئیبن و ئەبی حاتەم حەدیسێك ئەهێنێ لە(جابر) ەوە - خوای لێ رازی بێت - ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: هەرکەسێك بمرێ و هیچ شتێکی نەکردبێ بە هاوبەشی خوا دەست ئەدات و هەڵئەگرێ بۆ لێ خۆش بوون، ئەگەر خوا ویستی سزای ئەدات و ئەگەر مەیلی بوو لێ ی خۆش ئەبێ. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ﴾. هەروەها ئەگێڕنەوە لە(ئیبن و عمر) ەوە - خوایان لێ رازی بێت - کە ئەفەرموێ: ئێمە کە هاوەڵەکانی پێغەمبەر بووین گومانمان نەبوو لەوەدا کە خۆش نابێ لە پیاو کوژوماڵی هەتیو خۆر و ئەو کەسەی کە بوختانی ناهەق ئەکات بۆ ئافرەتی داوێن پاك، ئەو کەسەی کە شایەتی ناهەق ئەدات، هیچ گومانمان نەبوو لەوەدا هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ﴾.(طبرانی) حەدیسێك ئەهێنێ لە(ئیبن و عەباس) ەوە - خوایان لێ رازی بێت - کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ص) ئەفەرموێ: خوا ئەفەرموێ: هەرکەسێك بزانێ کە من بە توانا و بە دەسەڵاتم بەسەر لێ خۆش بوونی گوناهەکانی دا لێ ی خۆش ئەبم و گوێم لێ ی نی یە، ماتووڵێ هیچ شتێك نەکا بە هاوبەشم. لەم حەدیسەی دوایی یەدا دەرئەکەوێ ئەوە کە گرنگ بێت ناسینی خوایە و هەست کردنە بە ئاگاداری خواو ترس و شەرم لە خوا و ئومێد پێ ی، ئینجا کە گوناە روو بدا ئەو هەست و حاڵەتانە هۆی لێ خۆش بوونن و قاپی بەزەیی خوا ئەکەنەوە، ئینجا دەست نیشان ئەکات بەهۆی لێ خۆش نەبوونی ئەو تاوانە گەورەیە، ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفۡتَرَىٰٓ إِثۡمًا عَظِيمًا﴾ هەرکەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێ ئەو کەسە گوناهێکی زۆر گەورەی کردووە و ئەیکات کە بە هیچ رەنگێك شایستەی کردن نی یە و دەست نادات بۆ لێ خۆش بوون.

ئینجا هەمیتر ئەڕوا لەسەر ئەو جوولەکانە و خراپەی تریان ئەخاتە بەرچاو، سەری مەردوم سووڕ ئەهێنێ لەوەی کە ئەوانە وەسف و سەنای خۆیان ئەکەن و بە پاك و خاوێن خۆیان نیشان ئەدەن و لاف ئەوە لێ ئەدەن کە گەلی هەڵبژێرراوی خوان، کەچی ئەوانە وتە و فەرمودەی خوا ئەگۆڕن و درۆ بەدەم خواوە ئەکەن و چەند تاوانی تر. ئەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُمۚ﴾ ئایا سەرنجت نەداوە و ئاوڕێکت نەداوەتەوە بۆلای ئەوانەی کە خۆیان بە پاك و خاوێن دائەنێن و لاف ئەوە لێ ئەدەن کە هیچ کارو کردەوەیەکی ناشیرینیان نی یە،

واتە سەرنجیان و سەرت سوڕبمێنێ لێ یان کە لاف پاکی خۆیان لێ ئەدەن لە کاتێك دا کە بە دەمی خۆیان پاك نابنەوە ﴿بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ﴾ بەڵکو خوا پاك و خاوێن ئەکات هەرکەسێك کە خوا بیەوێ پاك و خاوێنی بکات، چونکە خوا هەموو شت ئەزانێ و بەندەی خۆی ئەناسێ و ئەزانێ کام لە بەندەیانی پاکە و شایستەی پاك کردنەوەیە، بێگومان گەلی ئیسرائیلی لە کاتی خۆی دا خوا هەڵی بژاردن بۆ هەڵگرتنی سپاردەو پەیامی خۆی، بەهرەمەندی کردن و باو و ڕێزی دان بەسەر جیهانی یانی چەرخی خۆیان دا، فیرعەون و کۆمەڵەکەی بۆ لەناو بردن ، ولاّتی پاك و پیرۆزی پێدان، بەلاّم لەگەڵ ئەوەدا لایان دا لە بەرنامەی خوا، تاوان و سەرکێشی گەورەیان کرد، زانا و عابیدەکانی خۆیانیان کرد بە خوای خۆیان و شوێنیان کەوتن لە یاسا و شەرعێك دا کە دەست هەڵبەستیان کرد بۆیان بە بێ ئیزن و ڕەزامەندی خوا، سوودیان خوارد و ڕەوایان دا، لەگەڵ ئەو هەموو لادان و تاوان و خراپەدا لاف زلە زلەیان لێ ئەدا، وەك قورئان بۆمان باس ئەکات و تێپەڕمان کرد بەلای زۆر لەو ئایەتانەدا: ئاگر نایان سوتێنێ مەگەر چەند ڕۆژێکی کەم ئیتر هەرچەند گوناهو خراپە بکەن. هەرکەس یەهودی نەبێ ڕێنموونی وەرناگرێ، وەرناگیرێ لای خوا، ئەیانوت: ئێمە کوڕ و خۆشەویستەکانی خواین. بەو جۆرە سەر لێ شێواو و لە خۆ گۆڕاو بوون، نەیان ئەزانی کە نەسەب و نەژادی ڕووت هەرچەند گەورە بێت هیچ سوودی نابێ، ئەوەی کە سوودی ببێ و کەڵکی لێ وەرگیرێ عەقیدە و بڕوای پاکە و کردەوەی چاك و دامەزرانە لەسەر بەرنامە و ڕێگەی خوا، زۆر بەداخەوە موسڵمانەکانی ئەمڕۆیش وەك جوولەکەیان لێ قەوماوە و بەسەرهاتووە، کە خۆیان بە ئوممەتی پێغەمبەر(ﷺ) دائەنێن، بە تەمای ئەوەن کە خوا یارمەتی یان بدات و زاڵیان بکات بەسەر دوژمنان دا، جوولەکەیان بۆ دەرکات لەو زەوی یە داگیر کراوەدا، لەگەڵ ئەوەدا ئەم موسڵمانانە بە تەواوی لە ئیسلام دەرچوون کە بەرنامەی ژیانە بۆیان، دایان ڕنیوە لە ژیانیان، پەیوەندی یان نەماوە بە قورئان و ڕەوشتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) لە هیچ بارو ڕوویەکی ژیانیانەوە، هەر ئەمەیان هەیە کە ناوی موسڵمانانەیان هەیە و ئەژین لە خاکێك دا کە لە کاتی خۆی دا موسڵمانی ڕاستەقینەی تیا بووە کە ئایینی خوایان بە تەواوی ڕاگیر کردووە تیای دا، بەرنامەکەی خوایان کردووە بە حاکم و کاربەدەست لە ژیانیان دا!

وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا انظُرْ كَيْفَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٠﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ

---

خوای پەروەردگار سەری پێغەمبەر(ﷺ) سوڕئەهێنێ لە کاری ئەو جوولەکانە و کاری موسڵمانەکانی ئەمڕۆ بەتین تر و زیاتر هۆی سەرسوڕمانە!! ئەفەرموێ: پاك و خاوێن ئەوانە نین کە لاف پاکی لێ ئەدەن بۆ خۆیان، شایەتی ئەدەن لەسەر چاکێتی و نزیکیان لە خواوە، بەڵکو پاك و چاك ئەوانەن کە خوا بە پاکیان دابنێ، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا﴾ واتە ئەوانە تۆڵەیان لێ ئەسێنرێ لەسەر ئەو لاف و کردەوە بەدەیان، لە تۆڵە و سزاکەیان دا کەم و کوڕی ناکرێ بە ئەندازەی کەمترین شت هەرچۆنێ زیادە ڕەوی تیا ناکرێ. یان ئەو کەسانەی کە خوا پاکیان ئەکاتەوەو بە پاك دەریان ئەخات، ئەوانە لەگەڵ ئەوەدا ئەجرو پاداشتیان کەم ناکرێتەوە، بەڵکو بە تەواوی پێ یان ئەدرێ لە ڕۆژی دوایی دا، یان بە شێوەی گشتی هەردوو تاقم شایستەی چی بن خوا لەگەڵیان ئەکات بە بێ کەم و کوڕی، کەواتە با هیچ کەسێك هیچ لافێك لێ نەداو کاری خۆی حەواڵەی خوا بکات، ئەو زانا و ئاگایە بە هەموو کردەوەو بە دڵەکان و نیازو مەبەستی دڵەکان. با هەموو کەس ڕوو بکاتە خواو کردەوەی چاکە بکات بە بێ لاف لێدان، ئەگەر مەردومان کردەوەی چاك بکەن بە مل کەچی و بە شەرمەوە بێگومان خوا هیچ کردەوەیەکی چاکیان زایە ناکات و پاداشتی تەواوی وەرئەگرن. وتەی ﴿فتیل﴾ بۆ دوو شت بەکار ئەهێنرێ: شتێك وەك دەزوو وایە و لە بەینی دوو لەتی ناوکە خورمادایە، چڵکێك کەولەرە ئەبێت وەك دەزوو لە بەینی پەنجەکان دا، لە زمانی عەرەب دا وێنە و چیرۆکە بۆ بچووك ترو بێ نرخ ترین شت، لەبەر ئەوە بەو جۆرەمان وت لە تەفسیرەکەی دا. ئینجا ئەو جوولەکە لاف لێدەرانە بێ ئابروو ئەکات بەمەی بە درۆیان ئەخاتەوەو تاوانەکەیان زۆر بە گەورە نیشان ئەدات و سەرنج ڕائەکێشێ بۆلای و سەر سوڕ ئەهێنێ لێی، ئەفەرموێ: ﴿انظُرْ﴾ سەرنج بدەو تەماشاکە ﴿كَيْفَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ﴾ چۆن درۆ

دەست هەڵبەست ئەکەن بەدەم خواوە، ئەوەش بەو لافە درۆینانە کە ئاماژەمان کرد بۆ هێندێکیان، کە ئەو لافانەیان بەناوی ئایین و نامەیخواوە لێ ئەدا، ﴿وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثۡمٗا مُّبِينًا﴾ بەسە ئەو دەست هەڵبەست و درۆیە بە گوناهێکی روون و ئاشکرا کە ناشاردرێتەوە، کەواتە زۆر گەورە و بێزراوە!!

بەڕاستی ئەو هەڕەشە و سەرزەنشت و بێ ئابروو کردنە باشتر روو ئەکاتە ئێمەی موسڵمانی ئەمڕۆ کە لاف موسڵمانێتی لێ ئەدەین، بەڵام زۆر بەداخەوە ئیسلام لە شیو و دۆڵێك دایە و ئێمە لە شیو و دۆڵێکی تردایین. زۆر بەداخەوە ئێمەی ئەمڕۆ شێوەو ناوبانگی ئیسلاممان ناشیرین کردووە، بە جۆرێك نەشارەزا ئێمە ببینێ دوور ئەکەوێتەوە لە ئیسلام و بێزار ئەبێ لێی!

بەڕاستی هەق وایە لە ئاستی ئەم ئایەتە سەری شەرمەزاری داخەین و موچرکە بێت بە لەشمان دا و وا بزانین ئاراستەی ئێمەیش کراوە، خوا بە میهرەبانی خۆی پەنامان بدات لە خەشمی خۆی، بێگومان شتێکی ئاشکرایە کە ئایینی خوا بەرنامەی ژیانە، گوێ رایەڵی خوا بەوە ئەبێ کە ئەو بەرنامەیە بکرێ بە حاکم و کاربەدەست لە ژیان دا، نزیك کەوتنەوەیش لە خوا هەر بە گوێ رایەڵی ئایینەکەی ئەبێ، دەی با سەرنجێك بدەین ئایا ئێمە لە کوێ و ئایین و بەرنامەکەی خوا لە کوێ؟ ئینجا با سەرنج بدەین ئایا ئێمە ئەمڕۆ چ جیاوازی یەکمان هەیە لەو جوولەکانەی کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە دەربارەیان!!!

ئینجا هەروەها سەرسوڕ ئەهێنێ لە کارو کردەوەی بەدی ئەو جوولەکە لاف لێ دەرانە کە بڕوا ئەهێنن بە بت و بە شتی بەتاڵ و ناهەق، شایەتی ئەدەن بۆ بت پەرستەکان بەمەی رێی ئەوان راست ترە لە رێی موسڵمانەکان، ئینجا لەپاش ئەو لەکەدار کردن و بێ ئابڕو کردنە هەڕەشەیەکی زۆرسامناکیان لێئەکات، ئەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبٗا مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ ئایا ئاوڕێکت نەداوەتەوە بۆلای ئەوانەی کە بەشێك لە نامەی خوایان پێ دراوە لەگەڵ ئەوەدا بێبەشن لە رێنموونی ئەو نامەی خوا،

ئەوەتا ﴿يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡجِبۡتِ وَٱلطَّٰغُوتِ﴾ بڕوا ئەهێنن بە بت و شتی بێ نرخ، بە شەیتان و بەرنامە و شەریعەتی غەیری خوا، یان بە جادو و جادوگەران، - ئەم دوو وتەیە بە چەند جۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە و هەموو هەر یەك ئەگرنەوە لەمەدا کە دژو پێچەوانەی ئایین و ڕەزامەندی خوان – بە هەرحاڵ و لەسەر هەربار ئەوانە کە شارەزا بوون و بەشدار بوون لە نامەی خوادا، ئەبوایە لە هەموو کەسانێکی تر باشتر شوێنی ئەم قورئانە بکەوتنایە، باشتر دژی بت و بت پەرستی بوونایە، شوێنی ناهەق و بەتاڵ نەکەوتنایە، بەلاّم ئەو جوولەکانە کە خۆیان بە دۆست و خۆشەویستی خوا دائەنا، هەمیشە ڕێی لارو چەوتیان ئەدایە بەرو شوێنی شتێك ئەکەوتن کە دژو پێچەوانەی ئایین و ڕەزامەندی خوا بوو، جا لەبەر ئەوە بەو جۆرە قورئان سەر سوڕ ئەهێنێ لەو کرەوە ناڕاست و ناپەسەندانەیان، ئەوانە بێجگە لەو بڕوا لارو ناڕاستەیان هەڵوێستێکی زۆر بەدیشیان بوو، بەمەی چوونە ریزی بت پەرستەکان و هانیان ئەدان لەسەر جەنگ و دوژمنایەتی یان بۆ موسڵمانان ﴿وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەڵێن دەربارەی ئەوانەی کە بڕوایان نەهێنابوو – واتە بت پەرستەکان – ﴿هَٰٓؤُلَآءِ أَهۡدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ سَبِيلًا﴾ ئەو بێ بڕوا و بت پەرستانە ڕێ و ڕێباز و ئایینیان ڕاست ترە لەوانەی کە بڕوایان هێناوە – واتە ئەوانەی کە شوێنی پێغەمبەر(ﷺ) کەوتوون!!(ئیبن و ئیسحاق) هەواڵێك ئەهێنێ لە(ئیبن و عەباس) ەوە – خوا لێ یان ڕازی بێت – ئەفەرموێ:(حوبەی کوڕی ئەخطب و سەلامی کوڕی حقیق و ئەبو رافع و ربیعی کوڕی حقیق) کە لە هۆزی(بنی نضیر) بوون، ئەمانە چوون بۆ مەککە بۆ کۆکردنەوەو هاندانی قورەیش و غطفان کە بێن بۆ سەر مەدینە بە یارمەتی دانی(بني قريظة) لە جوولەکەکانی مەدینە کە مابوونەوە لە مەدینەدا، زۆر و بە دەسەلاّتیش بوون، ئینجا کە گەیشتنە مەککە، قورەیش وتیان: ئەمانە زانا و شارەزاکانی یەهودن، خاوەنی تەوراتن، کەواتە پرسیاریان لێ بکەن: ئایا ئایینی ئێمە

چاكتره یان ئایینی محمد؟ ئینجا له پاش پرسیارەكه ئەم جوولەكه بەدانه وەڵامیان دانەوە كه ئایینی ئێوە چاكتره و ئێوە ڕێ و ڕێبازتان ڕاست تره! ئینجا ئەم ئایەته هاته خوارەوە، ئەو نەفرین لێ كراوانه بەو جۆره ئەو كۆمەڵ و لەشكره گەورەیان هان دا تا هاتنه سەر مەدینه و ڕووداوی خەندەق و ئەحزاب بەرپا بوو تا خوا به میهرەبانی خۆی ئەو ئاگرەی كوژاندەوە بەسەر شۆڕی بت پەرستەكان و لەناوبردنی جوولەكەكان – سوپاس بۆ خوا – بەڵێ بەڕاستی زۆر جێی سەرسوڕمانه كه پیسی و ناپاكی ئەوانه گەیشته ئەو ڕادەیه كه بتوانن بڵێن: ئایینی ئەو بت پەرستانه چاكترەو ڕێ و ڕێبازی ئەوان ڕاست و ڕێك تره!! بەڵام جوولەكه كه دڵ پیس و داخ له دڵ و خود پەسەند و ڕەگەز پەرستن ئەبێ هەروا بن، چونكه ئەو مەبەست و ئاوات و ئامانجه پیسەی ئەوان له لاق هەق و ئەهلی هەق دەست كەوت نابێ و هەر لای بەتاڵ و ئەهلی بەتاڵ دەست كەوتیان ئەبێ! ئەو لاری و نالەباریی یه بارو حاڵێكی هەمیشەیی یه بۆیان، كەواته ئەو كاته چۆن بوون دەربارەی ئیسلام، ئێستاش و لەمەولایش هەروان و هەروایش ئەبن، لەو كاته و ئێستا داهاتوویش دا هەموو فڕو فێڵ و پڕوپاگەندەیەكیان بەكار هێناوە و بەكاری ئەهێنن به دژی هەموو بزووتنەوەو ڕاپەڕینێكی ئیسلامی ڕاستەقینه، كۆمەك و یارمەتی دەرن بۆ هەموو دژو دوژمنێكی موسڵمانان و ئیسلامی ڕاستەقینه به وێنەی هەڵوێستیان بەرامبەر یەكەم چین كه ئەم قورئانه هاته خوارەوە و چوو به گوێچكەیان دا. بەڵام لێزان و شەیتانن زۆر جار لەم چەرخانەدا به ئاشكرا یارمەتی و وەسف و سەنای ناهەق و ئەهلی ناهەق نادەن، بەڵكو له باتی ئەوە هەر خەریكی پیلان و پڕوپاگەندە ئەبن دەربارەی هەق و ئەهلی هەق، لەو ڕێگەیەوە كۆمەكی و یارمەتی ناهەق و ئەهلی ناهەق ئەدەن، بەڵكو هێندێ جار دوژمنایەتی دەرئەبڕن دەربارەی ئەوانەی كه به كرێ گیراوی خۆیانن تا نەناسرێن و كەس بەد گومان نەبێ لێ یان، ئەمانیش به ئارەزووی خۆیان ئەو جوولەكانه دەست و دەم ئەوەشێنن له ئیسلام و له موسڵمانان.

جوولەکە هەر بەو چەشنە بووە و هەر بەو چەشنەشە و هەموو چین و تاقمەکانی یەك سروشتیان هەیە بە درێژایی چەرخ و رۆژگار، کەواتە با هەمیشە موسڵمانان هەر بەو جۆرەی کە قورئان ئەفەرموێ جوولەکە بناسن و سەرنجیان بدەن. خوای گەورە بەرامبەر ئەو بەد کرداریی و پیلانی ئەوانە فەرموی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُۖ﴾ ئەوانە کەسانێکن کە خوا نەفرینی لێ کردوون و دووری خستوونەتەوە لە میهرەبانی خۆی و دەری کردوون لە بەزەیی خۆی ﴿وَمَن يَلْعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا﴾ هەرکەسیش خوا نەفرینی لێ بکات، هەرگیز دەست ناکەوێ هیچ یارمەتی دەرێك بۆی کە بەرگری سزای خوای لێ بکات لە رۆژی دوایی و لە جیهانیش دا. ئەم بەڵێن و هەڕەشەیە بەدی هات سەبارەت بەو یەکەم چین و تاقمەی کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە دەربارەیان، ئەوە بوو بە ریسوایی لەم جیهانەدا خوا لەناوی بردن و بەو تاوان و بێ بڕوایی یەوە چوون بەرەو ئاگر و سزای سەختی خوا بە بێ ئەمەی هیچ بەرگری کەر و یارمەتی دەرێکیان ببێ لە جیهان دا، وەك لە رۆژی دواییش دا نایانبێ. ئینجا نابێ سەرمان سوڕ بمێنێ لە جوولەکەکانی ئەمڕۆ کە یەك سروشتیان هەیە لەگەڵ یەکەم چین و تاقم دا، بەوێنەی ئەوان دوژمنی ئیسلام و موسڵمانانن، لەگەڵ ئەوەدا ئەو هەموو دەوڵەت و میریی یانە یارمەتی دەریانن. نابێ سەرمان سوڕ بمێنێ لەوە، چونکە:

١- خوای پەروەردگار بەم ئایەتانە دڵنەوایی و مزگێنی بە گەل و ئوممەتی بڕواداری راستەقینە دا کە بە رێکی شوێنی بەرنامەی خوا کەوتن و شەریعەتی خوا حاکم و کاربەدەستیان بوو، مزگێنی پێدان بە بێ نرخی دوژمنەکانیان – جوولەکە – و یارمەتی دەریان، بە زاڵ بوون و سەرکەوتنی ئەو بڕوادارانە بەسەریان دا لەبەر ئەوەی کە جوولەکەن و یارمەتی دەریان نی یە، ئەو بەڵێنە بەدی هات، هەر بەدیش دێت بۆ بڕواداری وەك ئەوانە وشوێن کەوتووی راستەقینەی ئەوان، کە هەرکاتێك پەیدا ببێ و بێتە پێشەوە، بەڵێنی خوا بۆ گەل و ئوممەتێك نابێ کە بەدەم لاف موسڵمانێتی لێ بدات و بە کردەوە دوژمنی ئیسلام و موسڵمانان بێت!!

٢- یارمەتی دەری راستەقینە تەنها خوایە، نەك دەوڵەت و میریی با خاوەنی ساروخ و بۆمبای هایدرۆجینی بێت، کەواتە مانەوەی ئیسرائیل بەو هەموو تاوان و دەست درێژیی یەوە بە هۆی ئەو دەوڵەتانەوە نی یە، بەڵکو بەهۆی نەبوونی گەل و کۆمەڵی

موسڵمانی راستەقینەوەیە، هەرکات ئەو گەل و کۆمەڵە پەیدا بوو هیچ کەس و هیچ دەوڵەتێك فریای ناکەوێ، وەك ئەو موژدەیە بە روونی هەیە لەو حەدیسەدا کە بەناوبانگە و لە(ریاض الصالحین) دا هێناویەتی لە سەرچاوە سەحیحەکانەوە: ﴿لا تقوم الساعة حتي تقاتل المسلمين اليهود فيختبيء اليهود من وراء الشجر و الحجر فيقول الشجر و الحجر: يا مسلم أو يا عبدالله هذا يهودي ورائى فاقتله إلا الغرقد فإنه من شجر اليهود﴾ رۆژی دوایی بەرپا نابێ هەتا جوولەکە جەنگ نەکەن لەگەڵ موسڵمانان دا، ئینجا جوولەکە ژێر ئەکەون و خۆیان ئەشارنەوە لە پەنای درەخت و بەردا، ئینجا دارو بەردەکە بانگ ئەکەن و ئەڵێن: ئەی موسڵمان: ئەمە جوولەکەیە لە پەنام داوەرە بیکوژە، هەموو درەختێك ئەو بانگ و هاوارە ئەکات بێجگە لە داری(غەرقەد)، چونکە ئەو لە درەختی جوولەکەیە، کەواتە با موسڵمانەکان هەوڵ بدەن تا ببنەوە بە موسڵمانی راستەقینە تا بە چاوی خۆیان ببینن بەڵێنی خواو پێغەمبەرەکەیان(ﷺ).

لەپاش سەر سوڕهێنان لە کارو کردەوەی ئەو جوولەکانە و هەڵوێستی خراپ و وتەی بەد و ناڕەوایان، جاڕدان و نەفرین لێ کردنیان، ئینجا بێزاری دەرئەبڕێ لە هەڵوێستیان بەرامبەر بە پێغەمبەر(ﷺ) و قین و خەشمیان لەوەی کە خوا ئەو بەهرە گەورەی رشت بەسەری دا، منەتی نا بەسەری دا بە ئایین و یارمەتی دان و زاڵ کردن، داخ و حەسادەتیان لەو هەموو چاکە و بەهرەیەی کە پێی بەخشی، ئەوەش خوا پێی داوە لەلایەن خۆیەوە و لەوانە نەسەنراوەتەوە بۆ ئەو، چاوچنۆکی و خود پەسەندی یان ئاشکرا ئەکات، بەجۆرێ هەرکەسێکی تر هەر بەهرەو چاکەیەکی پێ بدرێ ئەوان بە زۆری ئەزانن و لایان وایە لە قەد ئەو نی یە، لەگەڵ ئەوەدا خوا بەهرەو چاکەی زۆری رشت بەسەر خۆیان و باوك و باپیریان دا، کەچی هێشتا بەوەیش فێری پیاوەتی نەبوون و لە چاوبۆری و حەسادەت نەکەوتن.

ئەفەرموێ: ﴿أَمۡ لَهُمۡ نَصِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُلۡكِ﴾ ئایا بۆ ئەوانە هەیە بەشێك لە دەسەڵات و موڵکی خوا؟ واتە ئەوانە کە پێ یان ناخۆشە خوا چاکە و بەهرەی خۆی بڕێژێ بەسەر بەندەیەك لە بەندەکانی دا، ئایا ئەوانە هاوبەشی خوان؟ ئایا هیچ بەشێکیان هەیە لەو موڵکی خوادا، کە لێ ی ئەبەخشێ و مەردومی لێ بەهرەمەند ئەکات؟ واتە نەخێر بێبەشن لەوە، ئەگەر بەشدار بن و ئەو دەسەڵاتەیان ببێ،

﴿فَإِذًا لَّا يُؤْتُونَ ٱلنَّاسَ نَقِيرًا ۝٥٣ أَمْ يَحْسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۖ فَقَدْ ءَاتَيْنَآ ءَالَ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَءَاتَيْنَـٰهُم مُّلْكًا عَظِيمًا ۝٥٤ فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ بِهِۦ وَمِنْهُم مَّن صَدَّ عَنْهُ﴾

---

**﴿فَإِذًا لَّا يُؤْتُونَ ٱلنَّاسَ نَقِيرًا﴾ ئەو كاتە کەمترین شت نادەن بە مەردوم!(نقير) کونە بچکۆلەیەکە وەك جێگە دەنووك وایە بە پشتی ناوکی خورماوە کە لەوێوە ئەڕوێ، لە زمانی عەرەب دا بە وێنە و چێوۆك ئەهێنرێ بۆ کەمترین شت، واتە ئەوانە چرووك و چاوچنۆکن تا ئەو رادەیە ئەگەر شت بە دەست بن کەمترین شت رەوا نابینن بۆ هیچ کەسێکی تر بێجگە لە خۆیان!! بەڵام سوپاس بۆ خوا کە ئەوەیان بەدەست نی یە، ئەگینا هەموو مەردومان تیا ئەچوون، هێندێ ئەفەرمون: مەبەست بێزاری دەربڕینە لە چرووکی و چاوبرسێتی ئەو جوولەکانە کە خاوەنی دەسەڵات و سامان و باخات بوون لە مەدینەدا، کەچی لەگەڵ ئەوەدا کەمترین شتیان لێ نەئەدا بە هەژار و بێ نەوایان. بێجگە لەم دوو جۆرە بە سێ جۆری تریش ئەم ئایەتە تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام جۆرێکیان نەگونجاوە، ئەو دووانەکەیان هەرچەند گونجاو بێت بەڵام ئەم دوو جۆرەی کە وتمان بەهێزترە لە دڵ دا و رای زانایانی لەسەرە.**

**لە پاش بێزاری دەربڕین و نەنگ گرتن و سەرزەنشتیان لەسەر چرووکی و چاوچنۆکی یان، ئینجا ئەگوێزێتەوە بۆ بێزاری دەربڕین و سەرزەنشتیان لەو داخ و حەسادەتەی کە دڵی داگیر کردبوون، ئەفەرموێ: ﴿أَمْ يَحْسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ﴾ ئایا ئەوانە حەسادەت ئەبەن بە مەردومان لەسەر ئەوەی کە خوا لە بەهرەی خۆی پێ ی بەخشیون و بەهرەمەندی کردوون؟ بەلای زۆربەوە مەبەست بە وتەی(الناس) پێغەمبەرە(ﷺ) بە تەنیا کە خوا بەهرەمەندی کرد بە گەورەترین بەهرە و گەورەترینی بەندەیانی خوایە و لە گەورەیی دا بە تەنیا وەك ئوممەتێك وایە، یان مەبەست بەو وتەیە ئەویش و هەموو موسڵمانانیشە، ئەو بەد خووانە پێ یان ناخۆش بوو و ئاواتە خواز بوون کە خوا ئەم بەهرەو چاکەی نەدایە بەمان، ئەم ئاین و شەریعەتە گەورەی ئیسلامە ئەماتایە کە بۆ هەموو جیهانی یانە و ئەوانیش بە بێ جیاوازی، ئەگەر پەیڕەوی بکەن وەك ئەمان بەهرەمەند ئەبن. هەرچەند حەسادەت خۆی لە خۆی دا شتێکی بەدو ناڕەوایە، بەڵام حەسادەتەکەی ئەوانە ناڕاست و ناڕەوا ترە لە چەند بارێکەوە:**

١- ئەگەر ئەم بەهرەو چاکەی خوا تەنها بە پێغەمبەرمان(ﷺ) بدرایە، لە پێش ئەمەوە هیچ کەسێکی تر بەهرەمەند نەکرابێ ئەوا بەهەرحاڵ پێ یان ناخۆش بێ بۆ ئەم، دەی وا نی یە، ئەوەتا خۆیشیان ئەزانن کە خوا چ بەهرەو چاکەی گەورەی رشت بەسەر ئیبراهیم و بەرەکەی دا، کەواتە با بۆ ئەمیش ببێ وەك ئەوان.

٢- هەرکەسێك بێ بەهرەو بەش براو بێت لەوانەیە حەسادەت ببا بە بەشدار و بەهرەمەند، دەی ئەوانە خۆیان بە نەوەو بەرەی ئیبراهیم دائەنێن، هەمیشە لاف گەورەیی لێ ئەدەن بەو نەسەب و نەژادە پاکەوە، کەواتە بۆ ئەبێ پێ یان ناخۆش بێ خوا کەسێکی تریش بەهرەمەند بکات! بەڕاستی حەسادەتی ئاوا بەدتر و ناشیرین ترین حەسادەتە و زۆر جێگەی سەرسوڕمانە!!

٣- هیچ کەسێك نی یە دان نەنێ بەوەدا کە پێغەمبەرمان(ﷺ) لە نەوەی ئیبراهیمە، کەواتە هەرچۆنێ سەریان سوڕ نامێنێ لە چاکە و بەهرەی خوا بەسەر ئیبراهیم و بەرەکەیەوە و ئەوەیان پێ ناخۆش نی یە، بەڵکو شانازی پێوە ئەکەن، دەی با سەریان سوڕ نەمێنێ و پێ یان ناخۆش نەبێ، ئەو چاکە و بەهرەی کە خوا دای بە پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان، بەڵکو ئەبوایە شانازیشیان پێوە بکردایە، چونکە ئەم و ئەوان لە یەك بنەماڵەوە هاتوون.

ئەم سێ بارەی کە کردمان بەهۆی زۆر خراپی و ناشیرینی حەسادەتەکەیان وەرئەگیرێ لەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿فَقَدْ ءَاتَيْنَآ ءَالَ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَءَاتَيْنَٰهُم مُّلْكًا عَظِيمًا﴾ واتە با ئەو حەسادەتە نەبەن و حەسادەتەکەیان زۆر ناڕەوایە، چونکە ئێمە بەخشیومانە بە ئال و بەرەی ئیبراهیم نامەی خۆمان وەك تەورات و ئینجیل و زەبوور و زانین و پێغەمبەرێتی، دەسەڵات و پادشایەتی یەکی زۆر گەورە، ئەوەتا ئەو هەموو پێغەمبەرەی لێ هەڵکەوتن، پادشای وەك یوسف و داود و سلیمان ی لێ هەڵکەوتن. ﴿فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ بِهِۦ وَمِنْهُم مَّن صَدَّ عَنْهُ﴾ ئینجا لەناو بەرەو نەوەی ئیبراهیم دا هینی وابوو کە بڕوای هێنا بە ئیبراهیم و ئەو ئایینەی کە ئەوی لەسەر بوو، وە بەو نامە و پێغەمبەرێتی یەی کە بەخشیمان بە نەوەو بەرەی ئیبراهیم. وە هینی وایشیان بوو کە رووی وەرگێڕا لێ ی و بڕوای نەهێنا، واتە ئەوانە هەموویان چاولەبەری ئەو هەموو بەهرەو چاکەی خوا نەبوون، بەڵکو بوون بە دوو تاقم، کەواتە ئەی محمد دڵگران مەبەو سەرت سوڕ نەمێنێ لە بڕوا نەهێنانی ئەم جوولەکەو نامەدارانە، چونکە لە باوك و باپیریانەوە هەروا هاتوون هێندێکیان بڕوایان نەهێناوە،

وَكَفَىٰ بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا ﴿٥٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿٥٦﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ لَّهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ ۖ وَنُدْخِلُهُمْ ظِلًّا ظَلِيلًا ﴿٥٧﴾

---

﴿وَكَفَىٰ بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا﴾ بەسە دۆزەخ بە ئاگرێکی بڵێسەداری هەڵگیرساو بۆ سزادانی ئەو بێ بڕوایانەی کۆن و تازەیان و پێشووان و پاشووانیان!! ئینجا بەم بۆنەیەوە یاسایەکی گشتی ئەهێنێ لەبارەی تۆڵەی بێ بڕوایان و ئەجرو پاداشتی بڕوادارانەوە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە لە جیهان دا بڕوایان نەهێناوە بە ئایەتەکانی ئێمە – واتە قورئان یان هەموو نامەو موعجیزە و بەڵگە روونەکانی تریش کە قورئان یەکەم و سەردەستەیانە – ﴿سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا﴾ ئەیانخەینە ناو ئاگرێکی گەورە و ناهەموار و ئەیانسوتێنین پێی، بێگومان هیچ لەشێك بەرگەی ئەو ئاگرە ناگرێ و دائەڕزێ و ئەتوێتەوە، جا لەبەر ئەوە ئەفەرموێ: ﴿كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم﴾ هەموو جارێك کە پێستەکانیان دائەڕزێن ﴿بَدَّلْنَٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا﴾ بۆیان ئەگۆڕین بە چەند پێستانێکی تر لە جێی ئەو پێستە داڕزیوانەدا، ئیتر ئەم پێستانە پێك بهێنرێتەوە لە کەرەس داڕزاوەکان و سەر لە نوێ خوا تازەیان بکاتەوە، یان پێك بهێنرێتەوە لە کەرەسەی تازە، بە هەرحاڵ ئەگونجێ و رێی رەخنەی نی یە بەمەی کە ئەم پێستە تازانە ئەگەر کەرەسە کۆنەکان نەبن چۆن سزا ئەدرێن لەگەڵ ئەوەدا هیچ تاوانێکیان نەکردووە، ئەم رەخنە لەسەر ئەم بارەش هەر بێ جێ یە، چونکە سزاکە گیانەکە ئەیچێژێ و لەش و کەرەسەی لەش خۆی لە خۆی دا هیچ سزایەك ناچەژن و هەست بە هیچ ناکەن بەهۆی بوونی ئەو خانانەوە نەبێ کە لە شوێنی سزادانەدا هەیە، وەك لە کاتی تاوان و گوناهەکەیش دا هەر گیانەکە ئەیکات بە لەشەکان، ئەم جۆرە قسانە کە کراون و ئەکرێن لەم جۆرە شوێنانەدا بەڕاستی وەك وڕێنەی تادار وان!! خوای دەسەڵات دار ئەوە ئەکات ﴿لِيَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ﴾ بۆ ئەوەی سزاکە بچەژن، واتە بۆ ئەوەی بەردەوام بێت و نەبڕێتەوە و کەم و کوڕی

رووی تیٰ نەکات، چونکە بەو داپزانە ئەو پێستانە ئەمرن و هەستیان کەم ئەبێتەوە یان هەر نامێنیٰ و بەو گۆڕین و تازە کردنەوە هەست و چەشتنەکە دووبارە ئەبنەوە وەك یەکەمجار، خوا پەنامان بدات بە میهرەبانی خۆی لە خەشم و سزای خۆی، بەڕاستی ئایەتێکی زۆر سامناکی داچڵەکێنەرە،!! خوا بەو جۆرە تۆڵە ئەسێنیٰ و سزای ئەو بیٰ بڕوایانە ئەدات، چونکە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ بەڕاستی خوا هەمیشە هەر زاڵ و دەسەڵات دارێکی وایە بەرگری ناکریٰ لە هەر شتێك کە بیەویٰ، لێزان و کاردروستە و هەموو کارو کردەوەیەکی راست و بەجیٰ یە. ئینجا بەرامبەر ئەو سزا سامناکە دەربارەی بیٰ بڕوایان، بەڵێن و بڕیاری بۆ بڕوادارانی راستەقینە ئەمەیە کە ئەفەرمویٰ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان هێنـاوە﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ کـردەوە چاکەکانیـشیان کـردووە، ﴿سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ ئەیانخەینە باغ و بەهەشتانێك کە رووبارەکان دێن و ئەچن بە ژێریان دا ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾ لە کاتێك دا کە ئەوانە ئەمێننەوە لەو بەهەشتانەدا بە هەمیشەیی و بیٰ بڕانەوە هەتا هەتایە، ﴿لَّهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ﴾ بۆیان هەیە لەو بەهەشتانەدا حەڵاڵ و هاوسەرانیٰ کە پاك و خاوێن کراون لەهەر شتێك کە بێزراو بێت و دڵ پیٰی ناخۆش بێت، ﴿وَنُدْخِلُهُمْ ظِلًّا ظَلِيلًا﴾ ئەیانخەینە سێبەرو سەهەندێکی خۆش و فێنك کە نە سارد بێت و نە گەرم، خوا بێبەشمان نەکات لیٰ ی. ئینجا دوو ئایەت ئەمێنیٰ کە بنەڕەتێکی زۆر گرنگن لە دەوڵەتە گەورەو گشتی و نەبڕاوەکەی ئیسلام دا، بەڕاستی ئەگەر بێجگە لەم دوو ئایەتە هیچ ئایەتێکی تر نەهاتایەتە خوارەوە، رەفتار کردن بەم دووانەو بەدی هێنانیان لە ژیان دا بەس بوو بۆ هەموو جیهان و جیهانی یان وەك بۆمان دەرئەکەویٰ لەکاتی تەفسیریان دا، بەڕاستی ئەو دوو ئایەتە و وێنەیان – کە زۆریشن – بە تەنیا موعجیزەیەکی زۆر گەورەن و بەسن بە رابەر و بەڵگەی روون و ئاشکرا لەسەر پێغەمبەرێتی پێغەمبەری ئازیزمان(ﷺ) بەس بۆ هەرکەسێك کە بێبەش نەبیٰ لە ژیریی و تێگەیشتن. ئەگینا بە دڵی کێدا ئەهات و کیٰ ئاگای لەم جۆرە ئایەتانە و ئەو مەبەستە گرنگانە بوو کە هەر ئەمانە دەست ئەدەن بکرێن بە دەستوورو یاسای هەموو جیهان لە هەموو چەرخ و چینەکانی دا هەتا هەتایە!!

خوای پەروەردگار بەم قورئانە لەناو هەموو جیهانی سەر لێ شێواو و سەرگەردانی ئەو چەرخ و سەردەمەدا، بە تایبەتی لەناو گەل و ناوچەیەکی نەخوێندەواری دوور لە زانین و زانیاری و شارستانی دا، لەناو ئەوانەدا ئوممەتێکی هێنایە کایە کە بوون بە مامۆستای هەموو جیهان و ڕێ نیشاندەریان، قاپی زانین و داد و هەموو فەڕو خێرێکیان خستە سەر پشت بۆ هەر کەسێك کە خۆی کوێر نەکات و بەدوای بەختەوەری دا بگەڕێ، لە قوتابخانەی ئەم قورئانەدا ئەو هەموو قوتابی یانە دەرچوون و هەتا هەتایە بە ئاسمانی مرۆڤایەتی یەوە ئەدرەوشێنەوە وەك ئەستێرەی بەرەبەیان. بێگومان شتێکی ئاشکرایە کە هاتنی ئەم قورئانە ئادەمێتی یان هێنایەوە کایە و لە بنەڕەتەوە کۆشکی مرۆڤایەتی دارشت لە بەرزترین و شیرین ترین شێوەی دا، کەواتە هەموو ئادەمی بە شێوەی گشتی و عەرەب بە تایبەتی زۆر زۆر قەرزدار و سەرشۆڕی چاکە و بەهرەی ئەم قورئانەن و ئەبوایە بە هەموو سۆزو پەرۆش و چاو لەبەریی یەوە هەمیشە کەمەر بەستە بوونایە لەبەردەم ئەم قورئانەدا و دەستیان هەڵگرتایە لە هەموو شتێکیان لە پێناوی ئەم قورئانەدا، بەڵام بەداخەوە زۆربەی ئادەمی بە گشتی و عەرەب بە تایبەتی سپڵە و بەد نمەکن!!

ئینجا با بگەڕێینەوە بۆ ژێر سایەی ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە و دڵی بۆ بکەینەوە، بەڵکو هێندێك لە پیت و فەڕی بڕژێنێ بەسەر دڵەکانمان دا تەم و تاریکی یەکەیان لابا، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا﴾بەڕاستی خوافەرمانتان پێئەدات بەدانەوەی سپاردەکان بە خاوەنەکانیان و گەیاندنیان بە جێگە و شوێنی شایستەی خۆیان ﴿وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِ﴾ فەرمانتان پێ ئەدات بە حوکم و بڕیاردان بە داد و ڕاستی و یەکسانی ی کاتێ کە حوکمڕانی ئەکەن لە نێوان مەردومان دا، ئیتر ئایا حوکمڕانی گشتی بن یان تایبەتی، یان کرابن بە حەکەم لە هەر مەسەلەیەك دا، ئەگێڕنەوە کە جارێك دوو منداڵ نووسراوێك ئەنووسن و ئەچنە لای ئیمامی حسن کە حەکەم بێت و کامیان بە خەت خۆشتر دابنێ، ئیمامی علی – خوایان لێ ڕازی بێت – چاوی لێ ئەبێت، ئینجا ئەفەرموێ: ئەی کوڕی خۆشەویستم بزانە چۆن بڕیار ئەدەیت، چونکە ئەوە حوکم و بڕیار دانە و خوا پرسیارت لێ ئەکات لە ڕۆژی دوایی دا!! بەکورتی ئەمەیە ئەرك و پێویستی سەرشانی گەل و کۆمەڵی موسڵمان، ئەمەیە کردار و ڕەوشت و خوی، دانەوەی سپاردەکان و گەیاندنیان بە جێ و

شوێنی خۆیان، بڕیاردان بە داد لەناو مەردومان دا، بە پێی فەرمان و بەرنامەی خوا و فێرکردنی خوا.

ئەم ئایەتە لە هەرچی دا و بە بۆنەی هەر شتێکەوە هاتبێتە خوارەوە، نەبەستراوە بە هیچ شتێکی تایبەتی یەوە، بەڵکو فەرمانێکی گشتی یە و بۆ گشتی یە و بە شێوەی گشتی هاتووە: ئەم سپاردانە دەست پێ ئەکەن لە سپاردەی هەرە گەورەوە، ئەو سپاردەی کە خوا کردی بە شتێکی سروشتی لە ئادەمی دا، ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان هەڵیان نەگرت و لێ ی ترسان، ئادەمی هەڵی گرت و گرتی یە گەردن، سپاردەی ڕێنموونی و ناسین و بڕوا هێنان بە نیازو خواهیش و هەڵبژاردن و تێکۆشان، ئەمەیە سپاردەی سروشتی کە تایبەتی یە بە ئادەمی یەوە، ئیتر بێجگە لە ئادەمی هەموو دروست کراوەکانی تر بڕوا هێنان و ناسین و ڕێنموونی و گوێ ڕایەڵی یان بە خواهیش و هەوڵ و تێکۆشانی خۆیان نی یە، بەڵکو بەس بە ڕێنموونی و ڕام کردن و فێرکردنی خوایە، بە بێ نیاز و خواهیش و هەوڵی خۆیان، تەنها ئادەمی جیاکراوەتەوە بەوەی کە گوترا، لەم سپاردە گەورەیە و سپاردەکانی تر ئەکەونە سەر شانی ئادەمی کە خوا لەم ئایەتەدا فەرمانی داوە بە دانەوەیان، جا هێندێ لەو سپاردانە کە لە گەردنی مەردم دایە، سپاردەی شایەتی دانە بۆ ئەم ئایینە، شایەتی دان لە یەکەمجارەوە لە دەروون دا بە هەوڵ و تێکۆشان لەگەڵ دڵ و دەروون تا ببن بە ئاوێنەیەکی بالاَ نما بۆ ئەم ئایینە، بە جۆرێ مەردوم شێوەی شیرینی ئەو ئایینە بەدی بکەن لەو دڵ و دەروونەدا و هەست بکەن بە جوانی و پاك و خاوێنی و کەڵك و نرخی بڕوا بەو ئایینە، شایەتی دان بۆی بە بانگ کردنی مەردوم بۆلای ئەو ئایینە، روون کردنەوەی پیت و فەڕو نرخی ئەو ئایینە لە پاش ئەوەی کە لە دەروونی بانگ کەرەکەدا پەیدا بوو و بەدی ئەکرا، کەواتە ئەگەر بانگی مەردومانیش نەکات تەنها بڕواو ناسینە دەروونی یەکەی خۆی بەس نی یە و شایەتی دانەکەی بەوە تەواو نابێ تا سپاردەی بانگ کردن و ڕاگەیاندن و روون کردنەوەیشی لەگەڵ نەبێت. ئینجا شایەتی دان بۆ ئەم ئایینە بە هەوڵ و تێکۆشان بۆ چەسپاندنی لە وڵات دا بە بەرنامە بۆ بڕواداران، بەرنامە بۆ هەموو ئادەمی بە تێکڕایی، هەوڵ و تێکۆشان بەوەی کە لە دەسەڵات و توانادایە لە لایەن کۆمەڵ و ئەندامی کۆمەڵەوە، چونکە لەپاش بڕوا هێنان گەورەترین سپاردە بریتی یە لە بەدی هێنان و چەسپاندنی ئەم بەرنامەیە لە ژیانی ئادەمی دا، چاوپۆشی ناکرێ لەبارەی ئەم سپاردەوە لە هیچ کەسێك نە لە گەل و نە لە ئەندامی گەل، جا لەبەر ئەوەیە کە لە حەدیسی سەحیح دا هاتووە: ﴿الجهاد فريضة ماضية إلي يوم

القيامة﴾ هەوڵ و تێکۆشان لە ڕێی ئیسلام دا فەرزێکی نەبڕاوەی هەمیشەیی یە تا ڕۆژی دوایی، ئینجا بەشێك لەو سپاردانەی کە لەم ئایەتەدایە سپاردەی مامەڵە و هاوکاری لەگەڵ مەردومان دا، دانەوەو گەیاندنی هەر سپاردەیەك بە خاوەنی خۆی: هەر شت و مەکێك کە یەکێ بە سپاردە دایناب لای یەکێکی تر، سپاردەی ڕاست کردن و دڵسۆزی لەگەڵ میللەت و مەردوم و سەرۆك و شوانی گەل و میللەت، سپاردەی پەروەردەکردن و بەخێوکردنی منداڵ و ساواکان و هەموو لاواز و بێ دەسەلاًت و ژێر دەستەکان. سپاردەی پارێزگاریی ماڵ و نامووس و هەموو کون و کەلەبەرێکی گەل و کۆمەڵ، هەروەها هەر پێویستی و ئەرکێکی کە ئەم شەریعەت و بەرنامەی خوا هێنای و خستی یە گەردنی مەردوم لە هەموو بارو ڕوویەکی ژیان و جیهانەوە، وەك ئەو هەموو وەزیفە و کارو کاربەدەستی و بەڕێوەبەرایەتی یەی کە لەم جیهانەدا هەن، ئەبێ ئەوانە بدرێن بە دەست کەسانێکەوە کە شایستە و شیاوی ئەوانە بن، وەك ئەوانەش کە ئەوانەیان بدرێتە دەست بدرێتە دەست ئەبێ بە ڕاست و ڕێکی پێی هەڵسن، هەموو ئەمانە کە باس کران بەشێکن لەو سپاردانەی کە لەم ئایەتەدا خوا فەرمانی دا بە دانەوەو گەیاندنی بە خاوەن و جێ و شوێنی خۆیان. ئینجا فەرمانی دووەمی ئایەتەکە فەرمان ئەدات بە داد و دادپەروەریی، ئەمیش هەر بە شێوەی گشتی دایناوە، ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿بين الناس﴾ لە نێوان ئادەمی دا بە تێکڕایی و بە بێ جیاوازی، بڕوادار و بێ بڕوا، دۆست و دوژمن، ڕەش و سپی، عەرەب و عەجەم، ئوممەت و کۆمەڵی موسڵمانان چاودێر و کاربەدەستە بۆ هەڵسان بەو دادو دادپەروەریی یە – کاتێ کە حوکم و بڕیار بدا – ئەو دادو دادپەروەری یەی کە هەرگیز مێژووی ئادەمی نەیدیتووە – لەسەر ئەم بارو شێوە تایبەتی یە – مەگەر هەر لەسەر دەستی ئیسلام دا، مەگەر هەر لە کاتی حوکمڕانی ئیسلام دا، مەگەر هەر لە چەرخ و سەردەمی سەرکردایەتی ئیسلام دا بۆ ئادەمی!!

بناغە و بنەڕەتی حوکم و حوکمڕانی لە ئیسلام داهەر ئەو دادپەروەری یەیە، هەرچۆنێ سپاردەدانەوە – لەسەر ئەو بارو شێوە گشتی یە – هەر ئەوەیە بناغە و بنەڕەتی ژیان لەناو گەل و کۆمەڵی ئیسلامی دا، واتە ئەو گەل و کۆمەڵەی کە بەڕاستی هەر ئیسلام کار بەدەست و حوکمڕانی بێت.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ٥٨ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ﴾

---

خوای میهرەبان لەم ئایەتە کورتەدا ئامۆژگاری کرد بەو شتە گرنگ و گەورەیە کە بەدی هێنانیان بەسە بۆ بەختەوەری و کامەرانی ژیان لە هەردوو جیهان دا، ئینجا دڵ و دەروون ئەهێنێتە سۆزو پەرۆش بۆ گوێ ڕایەڵی و فەرمانبەریی کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓ﴾ بەڕاستی زۆر چاکە ئەوەی کە خوا ئامۆژگاری کردن پێ‌ی کە بریتی بوو لە دانەوەو گەیاندنی سپاردەکان بۆ جێ و شوێنی خۆیان و حوکمڕانی و بڕیاردان بە داد و دادپەروەریی، خوا فەرمانی دابەم دووانە و پێویستی کردن، بەڵام ناوی برد بە ئامۆژگاریی تا باشتر گوێ ڕایەڵی یان بۆ بکرێ و زۆرتر بە سۆز و پەرۆشەوە فەرمانبەریی و پێشوازی یان لێ بکرێ. ئینجا لە داڕشتنی فەرمودەکەیش دا شێوەیەکی سەیری بەکار هێناوە، بەپێ‌ی باو و تێگەیشتنی سادەی ئێمە و پێش بیر کردنەوە لەهۆی داڕشتنەکەی ئەبوایە بەم جۆرە بوایە: ﴿إنە نعما يعظكم الله بە﴾ بەڵام کە بیر ئەکرێتەوە دەرئەکەوێ کە ئەوەی قورئان فەرمویەتی شتێکی ترە: ئەوەتا لە فەرمودەکەی قورئان دا وتەی بەفەڕی ﴿الله﴾ پێش کەوتووە کە مافی ئەوەی هەیە لە هەموو شتێکی خێروچاکەدا هەر لە پێشەوە بێت و یەکەم بێت، ئینجا ئەوە نیشان ئەدات کە پەیوەستی بەتین هەیە لە نێوان خواو ئەوەی کە ئامۆژگاری ئێمەی پێ ئەکات.[1] ئینجا ئایەتەکە دوایی ئەهێنێ بە فەرمودەیەك کە دڵ و دەروون بێدارو وریا ئەکاتەوە بۆ فەرمانبەریی و گوێ ڕایەڵی، چونکە بەڵێن و هەڕەشەی لێ وەرئەگیرێ. بەڵێن بە گوێ ڕایەڵان و هەڕەشە لە سەرپێچی کەران، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا﴾ بەڕاستی خوا هەمیشە شنەوای بینایە، کەواتە هیچ کردەوەیەکی لێ ون و شاراوە نابێ، بێگومان هەر دڵێك ئەم بڕوایەی تیا جێگیر ببێ هەرگیز ناتوانێ ناپاکی بکات لە

---

[1] چونکە ﴿الله﴾ کراوە بە ئیسمی(إن) کە لە ئەسڵ دا موبتەدایە، ڕستەکەش کراوە بە خەبەری کە لە ئەسڵ داخەبەری موبتەدایە، موبتەداو خەبەریش ئەبێ ئەوپەڕی یەکێتی یان ببێ.

سپاردەکان دا، ناتوانیٚ بە دادو نەجولێتەوە. لەم ئایەتەدا فەرمانی دا بە کاربەدەستان بە دانەوەو گەیاندنی سپاردەکان بەجیٚ و شوێنی خۆیان، بە دادو داد پەروەریی لە بڕیاردان و حوکمڕانی دا، ئینجا لە ئایەتی داهاتوودا فەرمان ئەدات بە گویٚ رایەڵی کردن بۆ ئەو کاربەدەستانە لە ژێر سایەی گویٚ رایەڵی کردن بۆ خوا و پێغەمبەر(ﷺ) کاتیٚ کە ئەو کاربەدەستانە هەڵسان بە پێویستی سەرشانی خۆیان، وەك ئیمامی عەلی – خوای لیٚ رازی بێت ئەفەرمویٚ – پێویستە لەسەر کاربەدەست و پێشەوای موسڵمانان کە بڕیارو حوکمڕانی بکەن بە گوێرەی ئەوەی کە خوا ناردویەتی یە خوارەوە، سپاردەی خۆیان بەجیٚ بهێنن، ئینجا کاتیٚ کە ئەو ئەوەی کرد پێویستە لەسەر رەعیەت و ژێر دەستە کە بیستن و گویٚ رایەڵ بێت. لە بارێکی ترەوە فەرمانی دا بەو دوو شتە، بێگومان ناسینی ئەو دووانە و چۆنێتی هەڵسان پیٚ یان نابیٚ لە مەردومانەوە وەرگیرێن و باو و زانین و ژیریی ئەمان بکرێن بە ترازووی ئەوە، چونکە شتێکی ئاشکرایە کە ئەنداز و رادەی زانین و ژیریی مەردومان زۆر جیاوازەو لە زۆر شت دا دوورن لە یەکتر و کۆنابنەوە، بێجگە لەوەیش دامەزراو نین و لەسەر بارێك ناوەستن. کەواتە پێویستە بوونی ترازوویەکی نەگۆڕاوی نەدۆڕاوی هەڵە نەکەر کە ئەوەش تەنها خوا دەست ئەکەویٚ و ئەبیٚ هەر ئاین و شەریعەتی خوا بکریٚ بەو تەرازووە، لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی هێنا بەدوای ئایەتی رابردوودا: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی کەسانیٚ کە بڕواتان هێناوە ﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ﴾ فەرمانبەر و گویٚ رایەڵی خوابن، ﴿وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ﴾ گویٚ رایەڵی پێغەمبەر بن، – واتە محمد(ﷺ) – ﴿وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ﴾ گویٚ رایەڵی خاوەن فەرمان و فەرماندارەکان بن لە خۆتان، واتە بڕوادار بن و بە پیٚی شەریعەتی خوا فەرمان بدەن کەواتە ئەبیٚ زانای تەواو بن کە ناو ئەبرێن بە(مجتهد) واتە ئەصڵ وایە ئەگەر لەو رادەیەدا نەبوو ئەوە ناچاری یە و ئەگەر بە پیٚی شەرع بڕیار بدا قەیناکات. شتێکی ئاشکرایە لە ئایینی ئیسلام دا کە دانانی یاسا و شەریعەت تایبەتی یە بە خواوەو ئەبیٚ رەفتار هەر بە یاسا و شەریعەتی خوا بکریٚ. خوا دواترین شەریعەتی خۆی نارد لەم قورئانەدا، فروستادەیەکی پیٚ رەوانە کرد کە ئەم قورئانە راگەیەنیٚ و روونی بکاتەوە بۆ بەندەکانی خوا، هەرچی راگەیاندبیٚ لە ئارەزووی خۆیەوە نەهاتووە، کەواتە هەرچی راگەیاندبیٚ لە خواوە هاتووە،

ڕەوشت و کرداری بەشێکە لە شەریعەتەکەی خوا، کەواتە گوێ ڕایەڵی یەکەیشی بەشێکە لە گوێ ڕایەڵی کردن بۆ خوا، کەواتە لەپاش خوا ئەبێ گوێ ڕایەڵی فروستادەکەی بن، ئینجا پێویستە گوێ ڕایەڵی کاربەدەستان لەم ڕووەوە کە فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی(ص) بەدی ئەهێنن و ڕەفتاری پێ ئەکەن و فەرمانی پێ ئەدەن.

خوای پەروەردگار گوێ ڕایەڵی بۆ پێغەمبەری داناوە بە گوێ ڕایەڵی کردن بۆ خۆی، لەبەر ئەوە قورئان گوێ ڕایەڵی کردن بۆ پێغەمبەریشی بە گرنگ گرت وەك سەربەخۆ نیشانی دا وێنەی گوێ ڕایەڵی کردن بۆ خوا، بەم ڕەنگە بە تایبەتی فەرمانی دا بە گوێ ڕایەڵی کردن بۆی، بەڵام گوێ ڕایەڵی بۆ کاربەدەستانی بەو جۆرە بە گرنگ ئەگرت و بە سەربەخۆ نیشانی نەدا، ئەوەتا بە تایبەتی فەرمانی پێ نەداو بۆ ئەویش دووبارەی نەکردەوە، چونکە گوێ ڕایەڵی بۆ کاربەدەستان لە زاتی خۆیانەوە هەڵناقوڵێ و لەبەر خۆیان نی یە، بەڵکو لە پەنای گوێ ڕایەڵی و فەرمانبەری یان دایە بۆ خواو بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هەر کاتێ بەو جۆرە نەبوون دروست نی یە گوێ ڕایەڵی کردن بۆیان بە پێی چەند حەدیس و بڕیاری هەموو زانایانی ئیسلام، کەواتە هەرکەس لە ئوممەت لە دەوڵەتی ئیسلام دا ئازاد و سەربەستە و پێویستە لەسەری بە پێی شەرع ڕەخنە بگرێ لە کاربەدەست لە هەر کارو کردەوەیەکی بێ شەرعی دا و نابێ گوێ ڕایەڵ بێت لەوەدا، ئیسلام بەهۆی ئەوەوە هەموو کەسێکی گێڕاوە بە ئەمیندار بەسەر شەریعەتەکەی خواوە، ئەمیندار بەسەر بڕواو ئایینەکەی خۆیەوە، ئەمیندار بەسەر نەفسی خۆی و ژیریی و چارەنووس و پاشەڕۆژی خۆی لەبارەی هەردوو جیهانی یەوە، نایگێڕێ بە وێنەی ماڵات و چوارپێ کە هەر مل کەچ و گوێ ڕایەڵ بێت، بۆ هەر شوێنێ بیرێ و لە هەر جێگایەك بوەستێنرێ و ڕاگیر کرێ! بەرنامەکەی ڕوونە و سنووری گوێ ڕایەڵی دیاریی کردووە، ئەو شەریعەتەی کە پەیڕەوی ئەکرێ تەنیا یەکێکە بۆ هەموان، بە بێ جیاوازی و گۆڕان و لایەنگیریی، هیچ کەسێك سەرگەردان نابێ و ئەزانێ چی بکات و بە چ بارێك دا بڕوا!

ئەو گوێ رایەڵی کردنە بە بێ قسە و باس و سەر لێ کردنەوە لە هەر شتێك دایە کە دەقێکی قورئان یان حەدیسی لەسەر بێت بە روونی، ئەو مەسەلە و رووداوانەی کە بەو جۆرە نەبوون بەم رەنگە هیچ دەقێك دەست نەئەکەوت بۆیان، یان چەند دەقێك هیچیان روون و ئاشکرا نەبوون تیایان دا و بۆچوون و تێگەیشتن و ژیریی مەردوم جیاواز بوون بۆیان و جێگەی دووبەرەکی و ئاژاوە بوون، ئەم جۆرە رووداو و مەسەلانەشی چارەسەر کردووە و بەرنامەی داناوە بۆ دۆزینەوەی یاسا و بڕیاری، وەك ئاماژەی بۆ ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾ ئینجا ئەگەر ئاژاوە و دووبەرەکیتان بوو لە شتێك دا لە بارەی حوکم و بڕیاری یەوە، ئەو کاتە بیگێڕنەوە بۆلای نامەکەی خواو وتارو کرداری پێغەمبەر(ﷺ) بەم رەنگە حوکم و بڕیارەکەی وەرگن لە دەقی ئایەت و حەدیسێك کە ئەو رووداو و مەسەلەیە ئەگرێتە، ئەگەر دەقێکی ئاوا دەست نەکەوت ئەو کاتە بیگێڕنەوە بۆ یاسا و بیرو باوەڕە گەورەو گشتی یەکان کە وەرئەگیرێن لە ئایەت و حەدیسەکان و رۆحی بەرنامە و شەریعەتەکەی خوا نیشانیان ئەدات، کەواتە هەرچی مەسەلە و رووداو لە جیهان دا بوو بێ و ببێ لە داهاتوودا پەیدا ببێ، هەرکام یان دەقی قورئان و حەدیسی پێ یان هاتووە یان وێنەی وەرئەگیرێ لە دەقەکانەوە یان لەو یاسا و بیروباوەڕە گشتی یانەی کە لە شەریعەتەکەی خوا وەرئەگیرێن، بە هەرحاڵ ئەم ئوممەتە گەورەو جیهانی و هەتا هەتایی یە رۆژێ لە رۆژان دانەماوە و دانامێنێ بۆ هەر حوکم و بڕیارێك! تا پێغەمبەری ئازیز لە دنیادا بوو(ﷺ) پرس بەو ئەکرا و دامان نەئەبوو، لە پاش لە دنیا دەرچوونی ئەگەر دابمانایە و دەقی قورئان و حەدیسیان دەست نەکەوتایە هەرکام لە چوار یاری گەورە لەسەر پرس و رای هاوەڵەکانی تر – خوا لە هەموویان رازی بێت – لەبەر تیشك و رووناکی قورئان و حەدیس دا حوکم و بڕیاریان بۆ ئەدۆزی یەوە، ئینجا لە پاش ئەوان زانایانی ئوممەت خوا پاداشتیان بداتەوە، کارەکەیان ئاسان کردو چارەسەری هەموو گرێ و کۆسپێکیان کرد کە لەو بارەیەوە بێتە رێی هەرکەسێك لەم ئوممەتەدا، بەم رەنگە لە ئایەت و حەدیس و راو بڕیاری جێنشین و هاوەڵەکان و لەو زانین و فام و تێگەیشتنەی کە خوا دابووی بە خۆیان، لەو هەمووە ئەم(فقە) ە پان و پۆڕ و فراوانەیان دانا و کردیان بە کتێب و بڵاو بوویەوە لە جیهان دا – وەك ئەبینین – بە جۆرێك هەرکەسێك بۆ هەرچی دابمێنێ دەست ئەکەوێ لە کتێبەکانی ئەوان دا.

تەنانەت دوژمن و بێ بڕواکانیش بەهرەمەند بوون لە کتێبەکانی ئیسلامەوە، زۆربەیانیان وەرگێڕایە سەر زمانەکانی خۆیان خوا پاداشتی پێشەواو زاناکانمان بداتەوە ئەو ئەرکە گەورەیان خستە ئەستۆی خۆیان و ئەو خزمەتە گەورەیان کرد، بەڕاستی ئەگەر ئەوە نەبوایە سەرگەردان و سەر لێ شێواو ئەبووین و دووچاری ئەوە ئەبووین کە هەرکەس بە گوێرەی ئارەزوو و هەوای نەفس رەفتاری بکردایە و وەڵامی مەردومیشی بدایەتەوە، ئەو کاتە وەك خۆی گومڕایە موسڵمانانیشی گومڕا ئەکرد، وەك – خوا پەنامان بدات – لە گەلێ لا ئەو دەردە گرانە رووی داوە، ئەوەتا ئەبینین زۆر کەس هەن نەزان و بێ ئاگا، ئەگەر چەند ساڵ هەوڵ بدەن ئینجا لەوان تێ بگەن لە راو بڕیارو کتێبەکانی ئەو زاناو پێشەوایانە، کەچی گاڵتەیان لێ دێ و لاقرتێ ئەکەن بەو راو بڕیارو کتێبانە و بەو پێشەوایانە، بەو هەموو نەزانی خۆیانەوە هەر پرسیارێکیان لێ بکرێ بە بێ وەستان و بە بێ باك و بیم وەڵام ئەدەنەوە بە هەواو ئارەزووی خۆیان، بێگومان هۆی ئەوەش نەزانی یە و ئەگەر زانا بوونایە ئەترسان و لە خۆیانەوە دەمیان بەرەڵا نەئەکرد، خوا بە میهرەبانی خۆی زانامان بکات و رێنموونیمان بکات بۆ سەر رێگە راستەکەی ئەم ئوممەتە آمین. خوای پەروەردگار فەرمانی دا بە گوێ رایەڵی کردنمان بۆ خۆی و بۆ پێغەمبەرەکەی و کاربەدەست و فەرمان رەواکانی موسڵمانان، بە گێڕانەوەی هەر شتێك کە ئاژاوەو دووبەرەکیمان بوو تیای دا، ئینجا ئەو فەرمانە زۆر بە گەورە و گرنگ نیشان ئەدات بەم رەنگە گوێ رایەڵی کردنەکەی ئەبەستێتەوە بە بڕوا بە خوا و بە رۆژی دوایی یەوە، ئەفەرموێ: ﴿إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ﴾ ئەگەر ئێوە بڕواتان هێناوەو بڕوادارن بە خوا و بە رۆژی دوایی. ئاشکرایە کە رووکەش و رواڵەتی ئایەتەکە وا نیشان ئەدات کە گوێ رایەڵی نەکردنی فەرمانەکە نیشانەی بێ بڕوایی یە و لەگەڵ بڕوادا کۆ نابێتەوە، بێگومان ئەگەر گوێ رایەڵی نەکردنەکە لەبەر سەرکێشی و ناڕەزایی بێت بە فەرمانەکانی خوا ئەوا ئەبێتە بێ بڕوایی و مەردومی پێ دەرئەچێ لە ئیسلام، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێ و کابرا خۆی بە خراپ و تاوانبار دابنێ و بڕوای ببێ بە راست و رەوایی فەرمانەکانی خوا ئەوا کۆمەڵ و جەماوەری زانایان لە ریزی بڕواداران دەری ناکەن، بەڵام بە هەرحاڵ ئەگەر بڕوای ببێ و دامەزراو بێ ئەبێ ئەو بڕوایە لە کردەوە و گوێ رایەڵی دا دەرکەوێ.

ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٥٩﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓا۟ أَن يَكْفُرُوا۟ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿٦٠﴾

لەپاش ئەوەی ئەو گوێ ڕایەڵی و فەرمانبەریی یەی بەست بە بڕوا بە خوا و بە ڕۆژی دوایی یەوە، ئینجا هانمان ئەدات لەسەری و خۆشەویستی ئەکات لە دڵ دا بەمەی لە شێوەی ئامۆژگاری دا نیشانی ئەدات و ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەو گوێ ڕایەڵی و گێڕانەوەی کە باس کران – وەك کۆمەڵێك ئەفەرمون – یان مەبەست هەر گێڕانەوەکەیە، چونکە گوێ ڕایەڵی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) لەو شتانەدا کە دەقیان لەسەر هاتووە جێگەی قسە و باس و سەر لێ کردنەوە نی یە لەلایەن بڕوادارانەوە، بەڵکو ئەوانەی کە دەقی ئایەت و حەدیسیان پێ نەهاتووە لەوانەیە هەڵە و ئارەزووکاری یان تیا بکرێ لەبەر ئەوە بە گرنگ تر گیراوە، وەك کۆمەڵێکی ترئەفەرمون. بەهەرحاڵ ومەبەست هەرکام بێت. بێگومان ئەوە ﴿خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾ چاکترە لە هەموو شتێکی تر و شایستە ترە، دوا ڕۆژی باشترە، بێگومان هەر ئەوە چاکە لە هەردوو جیهان دا، هەر ئەوە بەختەوەری و بەرژەوەندی تیایە، واتە خێرو چاکە و بەرهەمی تەنها بۆ ڕۆژی دوایی نی یە بەڵکو بۆ هەردوو جیهانە. بێگومان هەرکەسێك بێبەش نەبێ لە فام و ژیریی و بڕوای هەیە بەوە، چونکە ئەو بەرنامەیە کە خوا داینـاوە بۆ ئێمە پاك و بێگەردە لە هەموو لەکەیەك، پاکە لە نەزانی و ئارەزووکاری و لاوازی و ناتەواوی و لایەنگیریی و هەر نەنگ و ڕەخنەیەك، ئەو بەرنامەیە هینی خوایە کە پەروەردگار و داهێنەری ئەم ئادەمی یە، کەواتەهەرئەو ئەزانێ چی چاك و بەفەڕ و شایستەیە بۆی. بەرنامەی کەسێکە کە داهێنەرو ڕاگیر کەری ئەم بوونەوەرەیە، زانین و دەسەڵاتی بێ سنووری هەیە و بەزەیی دارو میهرەبانە بە بەندەکانی، کەواتە بە هەموو هێزی بڕواوە ئەڵێ: ﴿ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾.

لەپاش ئەوەی ئەم یاسا گەورەو گشتی یەی دانا و ڕوونی کردەوە و بەستی بە بڕوا و ڕۆژی دوایی یەوە، ئینجا ئاوڕێکمان پێ ئەداتەوە بۆلای ئەوانەی کە لاف بڕوا هێنان لێ ئەدەن لە بڕیارو شەریعەتی خوا و بە ڕاو بڕیاری تر ڕەفتار بکەن لە کاتێك دا کە پێویستە بڕوایان نەبێ تەنها بە یاسا و شەریعەتی خوا نەبێ. ئاوڕمان پێ ئەداتەوە بۆلای ئەوانە بۆ ئەوەی سەرمان سوڕ بێت لێ یان و بێزاری دەربڕین لە کردەوەو ڕەفتارەکەیان، بۆ ئەوەی

ئەوانە بترسێنێ لەوەی کە شەیتان ئەیەوێ ئەوانە بە تەواوی گومڕا بکات، ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ﴾ ئایا نەتزانیوە و ئاوڕێکت نەداوەتەوە بۆلای ئەوانەی کە ﴿يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ﴾ ئەڵێن و لاف لێ ئەدەن بەوەی بڕوایان هێناوە بەو بەرنامەی کە هێنراوەتە خوارەوە بۆلای تۆ، بەو نامەی کە هێنراوەتە خوارەوە لە پێش تۆ، واتە سەرت سوڕ بمێنێ و بێزار بە لەوانەی کە ئەو لافە لێ ئەدەن، هۆی بێزاری و سەر سوڕمانەکەش ئەمەیە کە لەگەڵ ئەو لافەدا ﴿يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ﴾ ئەیانەوێ دادو بڕینەوەی ئاژاوە بەرن بۆلای کەسێك کە زۆر سەرکێش و ستەمکارە و حوکم و بڕیار لە ئاین و شەریعەتی خوا وەرناگرێ، بەڵکو بە پێی هەواو ئارەزووی خۆی شەیتان بڕیار دەرئەکات، ئەو کارە بەدە ئەکەن ﴿وَقَدْ أُمِرُوا أَن يَكْفُرُوا بِهِ﴾ لە کاتێك دا فەرمانیان پێ دراوەو پێویست کراوە لەسەریان کە بڕوایان نەبێ بەو سەرکێشە ستەمکارە، کەواتە کردەوە بەدەکانیان لە نەزانینەوە نی یە و بەڵکو بە ئارەزوو و دەستی قەستە، جا لەبەر ئەوە لاڤ بڕوا هێنانەکەیان دژی کردەوەکەیانە و بە هیچ کلۆجێك ئەو دوو شتە یەك ناگرن و هەرکام بوو نابێ ئەویتر ببێ! ئینجا هۆ و پاڵدەریان بۆ ئەو کردەوە بەدەیان ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا﴾ شەیتان ئەیەوێ کە ئەوانە ون و گومڕا بکات بە گومڕاکردنێکی دوور، واتە ئەو شەیتانەی کە لە دەروونی مەردوم دا پاڵدەریەتی بۆ هەموو لادان و ناهەقی یەك، ئەو شەیتانە ئەیەوێ بەو کردەوە بەدە ئەوانە زۆر دوور بخاتەوە لە هەق و ڕێی ڕاست بە جۆرێك ڕێ ی پێ نەبەنەوە، ئەم هۆ و پاڵدەرەی دەرخست، بەڵکو ئەوانە بێدار ببنەوە و بگەڕێنەوە، بۆ ئەوەی بڕواداران بزانن بە کارەکە و خۆیان بپارێزن لە شەیتانی دوژمن. چەند ڕیوایەتێك هاتووە لەبارەی دیاریی کردنی ئەوانەی کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە دەربارەیان کە ئایا تاقمێك بوون لە جوولەکەکان، یان لە ناپاکەکان، بەلاّم لە ئایەتی داهاتوودا وا دەرئەکەوێ کە ئەوانە تاقمێك بوون لە ناپاکەکان. هەرچۆنێ سەرەتای ئایەتەکەش هەروا نیشان ئەدات، چونکە جوولەکەکان لاڤ بڕوا هێنانیان لێ نەئەدا بە قورئان، بەڵکو هەر ناپاکەکان ئەو لافەیان لێ ئەدا، ئەگەر بڵێن لە ناپاکێك دا هاتووە کە لە پێشەوە جوولەکە بووەو بە ناپاکی لاڤ بڕوا هێنانی دابێ وەك ئەبو موسلیم ئەڵێ – ئەگەر ئەوە وابێ ئەوا ڕیوایەتەکانیش یەك ئەگرن و دژایەتی یان نامێنێ– بەهەرحاڵ ولەسەرهەربارلەم چەندئایەتەوەزۆربەڕوونی ئیسلام و بڕواو سنووروەرجیان دەرئەکەوێ،وەك بەڕوونی لەمەو پاش دەست نیشان و ئاماژەی بۆ ئەکەین.

وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيْتَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا ﴿٦١﴾ فَكَيْفَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ثُمَّ جَآءُوكَ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّآ إِحْسَٰنًا وَتَوْفِيقًا ﴿٦٢﴾

---

ئینجا زیاتر حاڵی ئەم تاقمە دەرئەخات ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ﴾ کاتێ بگوترێ پێ یان: وەرن بۆلای ئەوەی کە خوا ناردویەتی یە خوارەوە بۆلای پێغەمبەر کە رەوانە کراوە بۆ ئەوەی حوکم بکات بەوەی کە خوا ناردویەتی ﴿رَأَيْتَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا﴾ ئەبینی ناپاکەکان روو وەرئەگێرن لێت بە وەرگەڕانێکی تەواو و بێ پێچ و پەنا، مەبەست بەم ناپاکانە ئەو تاقمەن کە ئەم ئایەتە دەربارەیان هاتە خوارەوە، بەم شێوەیە ناوی بردن تا تاوانبار و لەکەداریان بکات بەم رەوشت و سیفەتە زۆر بەدە، دەست نیشان بکات بەهۆی روو وەرگێڕانیان، واتە رووت لێ وەرئەگێرن لەبەر ناپاکی یەکەیان.

لە ئایەتی پێشوودا سەری سوڕ ئەهێنا لەوەی کە ئەوانە لەگەڵ لاف بڕوادا ئەیانەوێ رەفتار بکەن و داد و ئاژاوەی خۆیان ببەن بۆلای حوکم و بڕیاری ناهەق و ستەم، بە ساف و بێ پەردە نەیفەرمو: روو وەرئەگێڕن لە حوکم و بڕیاری خوا، بەڵام لەم ئایەتەدا لەکەدار و تاوانباریان ئەکات بەوەی کە بە بێ پێچ و پەنا روو وەرئەگێڕن لە حوکم و بڕیاری خوا کە گەورەیی ئەم تاوانە روون و ئاشکرا ترە، کەواتە ئەم ئایەتە جیاوازە لە ئایەتی پێشوو، دووبارەکردنەوەی ئەو نی یە، بەڵکو بەم ئایەتە هۆی سەرسوڕهێنانەکەی بەتین تر و بەهێزتر ئەکات، پلەیەك بەرزتر ئەبێتەوە لە تاوانبارکردنیان دا!

ئینجا وێنە و شێوەیەکی ناپاکی یەکەیان دەرئەخات لە هێندێ بەسەرهات و کردەوەیان دا، کاتێ کە ئەکەونە زیان و تەنگ و چەڵەمەیەك و ئەیانەوێ خۆیان پاك بکەنەوە و عوزرو بەهانە ئەهێننەوە، هەواڵەکەیان ئەدا بە پێغەمبەر(ﷺ) و بە درۆیان ئەخاتەوەو بێ ئابڕویان

ئەکات، بەو بۆنەیەوە شێوە پرسیارێك ئاراستە ئەکات کە بەدی و خراپی بارو حاڵیان نیشان ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿ فَكَيۡفَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ ﴾ دەی ئایا چۆنە حاڵ و باری ئەوانە – کاتێك کە بەسەرهاتێکی خراپ دووچاریان ببێ – بەهۆی کردەوەی خراپی لەوەوبەری خۆیان، کە لادانیان لە شەریعەتی خوا و ڕۆیشتنیان بۆلای حوکم و بڕیاری ناهەق و شەیتان یەکەم و سەردەستەیە لێرەدا، ئیتر ئەو بەسەرهاتە سەختەیان ئەمە بێت کە لەو کاتەدا دەرکەوتن بۆ بڕواداران و بە ناپاك ناسران و بەهۆی ئەوەوە شەرمەزار و بێ ئابڕو بوون لەناو ئەو گەل و کۆمەڵە پاکەدا، یان بەسەرهاتە سەختەکەیان ئەوە بێت کە بەهۆی لادانیان لە شەریعەتی خوا زیانبار ببن و ستەمیان لێ بکرێ لەو ڕژێمە ناهەقەدا کە بۆی چوون، ئەو کاتە پەشیمانی و زیانباریی ئەبێ، یان ئەوە بێت کە خوا دووچاری دەردو ناڕەحەتیان بکات بەڵکو تەمێ خوار ببن و بگەڕێنەوە بۆ ڕێگە ڕاستەکەی خوا.

بەسەرهاتەکەیان هەر جۆر ببێ، قورئان بە شێوەی بێزاری دەربڕین لە کارو کردەوەکەیان فەرموی: ئایا چۆنە حاڵ و باری ئەوانە کاتێ کە بەسەرهاتێکی بەد دووچاریان ئەبێ بەهۆی کردەوەی خراپی خۆیان کە لە پێشەوە کردوویانە ﴿ثُمَّ جَآءُوكَ يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ﴾ لەپاشان دێن بۆ لای تۆ بۆ پینە و پەڕۆ و عوزر هێنانەوە لە کاتێك دا سوێند ئەخۆن کە ئێمە ﴿إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّآ إِحۡسَٰنٗا وَتَوۡفِيقًا﴾ هیچ نیازێکمان نەبووە لەو ئاژاوە بردنەدا بۆلای ناهەق بێجگە لە چاکە کردن و بڕینەوەی ئاژاوەکە بە شێوەیەکی جوان و یەك خستنمان لەگەڵ ئاژاوە کەران دا، نەك نارازی بووبین بە بڕیاری تۆ و مەبەستمان ڕەفتار کردن بێت بە پێچەوانەی ڕاو بڕیاری تۆ! بەڕاستی تەریق بوونەوەو شەرمەزاری یەکەیان زۆر سەختە، نازانن چی بکەن و بە چ جۆرێك سەر هەڵێن و پینە و پەڕۆ بکەن، ئەیانەوێ بە سوێندی درۆ خۆیان پاك بکەنەوە و ئەوەیشیان بۆ ناکرێ، ئەوەتا قورئان ڕاستی یان لێ ئەڵێت و بە درۆیان ئەخاتەوە!! خوا پەنامان بدا، سەرەنجامی ناپاکی ئەبێ هەر ئەوە بێت لە جیهان و لە ڕۆژی دوایی دا.

أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَعِظۡهُمۡ وَقُل لَّهُمۡ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَوۡلَۢا بَلِيغٗا ﴿٦٣﴾ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ

---

**لەهەموو چەرخ و سەردەمێك دا زۆر لەوانەی کە لائەدەن لە حوکم و بڕیاری خوا و رەفتار ئەکەن بە حوکم و بڕیاری نەفامی و ناهەقی، زۆر کەس لە کاربەدەست و لە هەرکەسێکی تر ئەو بەهانە ناڕاست و بێ جێ یە ئەهێننەوە و ئەڵێن: نیازمان چاکە و ئەمانەوێ لە پێشەوە دووچاری کۆسپ و گرێ نەبین و ئەو هەموو تاقم و چینە کە بیروباوەڕی دژو جیاوازیان هەیە یەك بخەین و یەکێتی بخەینە ناویان، جا لەپاشان هەموو ئەگەڕێنەوە بۆلای بڕیارو شەریعەتی خوا، ئەوانەی کە لاێ بڕوا بە خوا لێ ئەدەن - بڕواداریش نین - ناپاکەکان هەمیشە ئەو جۆرە قسە ناڕاست و نارەوایانە ئەگرن بە دەستەوە و ئەیکەن بەهۆی لادانەکەیان، بەلام خوا ئەو یەکەم تاقمەی بە درۆ خستەوەو دەری خستن بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەبێ ئەو دەرخستن و بە درۆ خستنەوە بەس بێت لە پاش ئەو بۆ هەموو بڕواداران سەبارەت بەو یەکەم تاقمە و وێنەی ئەوان تا رۆژی دوایی، نابێ هیچ بڕوادارێك بخەڵەتێ و ئەو قسە پڕو پووچ و ئەو بەهانە ناڕاستانە وەرگرێ لە هیچ لادەرێك لە شەریعەتی خوا، خوا فەرموی بە پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بەو ناپاکانەی یەکەمجار ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ ﴾ ئەوانە کەسانێکن کە خوا ئەزانێ و ئاگایە بەوەی کە لە دڵیان دایە، ئاگایە بە بێ بڕوایی و ناڕاستی و کینەی دڵیان، ئاگایە بەوەی کە ناپاکن و دەم و دڵیان یەکسان نی یە، ئاگایە کە نیازو مەبەستیان ئەوە نی یە کە بەدەم ئەیڵێن، لادانەکەیان لەبەر بێ بڕوایی و ناپاکی یانە! بەڵام لەگەڵ ئەوەدا فەرموی: ﴿فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ﴾ کەواتە گوێ یان مەدەرێ و چاوپۆشی بکە لێ یان و ئەوەی ئەیزانی مەیدە لە روویان، بەڵکو ئەوە ببێ بە هۆی کۆتایی هێنانیان لە دوژمنایەتی و خراپەکاری، یان مەبەست ئەوەیە روویان لێ وەرگێڕە و قسە و بەهانەکەیان وەرمەگرە، ﴿وَعِظۡهُمۡ﴾ ئامۆژگاری یان بکە بە کۆتایی هێنان لە ناپاکی و پیلان و درۆ و**

حەسادەت، بە ترساندنیان لە سزاو تۆڵەی سەختی ڕۆژی دوایی ﴿وَقُل لَّهُمْ فِيٓ أَنفُسِهِمْ قَوْلًا بَلِيغًا﴾ ئەم وتەیە بە سێ جۆر تەفسیر کراوەتەوە:

١- بڵێ پێ یان لەبارەی دەروونی پیس و خراپی خۆیانەوەو وتەیەکی بەکار کە بگاتە مەبەست و بدا لێ ی، بەم ڕنگە بڵێ: خوا ئاگایە بەوەی کە لە دڵتان دایە و شاردنەوەی هیچ سوودێکتان پێ ناگەیەنێ، کەواتە دڵتان پاك بکەنەوە لە ناپاکی ئەگینا خوا خراپتان بەسەر دێنێ هەرچۆنێ خراپی هێنا بەسەر ئەوانەی کە بە ئاشکرا بێ بڕوان.

٢- بڵێ پێ یان: وتەیەك کە کاربکات لە دەروونیان و دڵیان چڵەکێنێ و ترس و بیم بخاتە دڵیان، لەسەر هەرکام ڕێکە و بەڵگە هەیە لەسەری و لە ئایەتەکە و لە ڕەوشتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەم سێ بارە وەرئەگیرێن، لەسەر هەر بار شێوەی فەرمودەکە شێوەیەکی تایبەتی یە و وا نیشان ئەدات کە ئەو وتەیە بە جۆرێك بێت وەك لە ڕێوە بخرێتە دەروون و جێگیر بکرێ لە دڵەکانیان دا! ئینجا هان ئەدا لەسەر گوێ ڕایەڵی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) بەمەی گوێ ڕایەڵی کردن بۆ پێغەمبەران – درودی خوایان لەسەر بێ – یاسایەکی گشتی یە و بۆ ئەوە نێرراون نەك هەر بۆ ڕاگەیاندنی ڕووت و تەنیا ئامۆژگاری، ئەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾ هیچ فروستادە و پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە لەبەر هیچ هۆیەك مەگەر لەبەر ئەوەی کە گوێ ڕایەڵی بکرێ بەهۆی ئیزن و فەرمانی خوا، واتە خوا فروستادەکانی خۆی هەر بۆ ئەوە ناردووە کە ئایینی خوا ڕاگەیەنن و گوێ ڕایەڵی بکرێن لەلایەن ئەوانەی کە ئەو پێغەمبەرانەیان بۆ ڕەوانە کراون، ئەو گوێ ڕایەڵی بۆ کردنەیشیان لەسەر فەرمانی خوایە، چونکە ئەوان لەلایەن خواوە هاتوون و فەرمانی خوا ڕائەگەیەنن، کەواتە هەرکەسێك گوێ ڕایەڵی ئەوان بێت گوێ ڕایەڵی خوایە، ئەم فەرمودەیە زۆر گرنگ و بە نرخە و پێویستە بڕوادار بە وردی بیری لێ بکاتەوە تا تێ بگات و هەڵنەخەڵەتێ بە قسەی ئەوانەی کە ئەیانەوێ مەردوم هەڵە بکەن لە سروشتی ئایین و پێغەمبەران، یان ئەوانەی کە تێ نەگەیشتوون لە مەبەست بە ئایین و ئەڵێن و لایان وایە کە کارو ئیشی

پێغەمبەران هەر ئەوەیان لەسەرە ئامۆژگاری بکەن و راگەیەنن و قسەی خۆیان بکەن و بڕۆن کە ئەو قسەیە لە راستی دا دژی ئایینە و ناگونجێ لەگەڵی، چونکە ئاین و بەرنامەی ژیانە و ئەبێ بەدی بهێنرێ بە کردەوە لە هەموو ناوچە و کون و قوشبنی ژیان دا، ئەبێ ئاین شۆڕش بێت بەسەر هەموو یاسا و بەرنامەیەك دا کە لەلایەن خواوە نەهاتبێ، دەی ئاشکرایە ئەوەش بە قسەی رووت و راگەیاندنی تەنیا پێك نایەت، بەڵکو پێویستە ئەو پەیام و پەیام هاوەرە دەسەڵاتدار بێت و بتوانێ ئەو بەرنامەیە بەدی بێنێ، و مەردوم مل کەچ بکات بۆی، بە کورتی خوا فەرمانی وایە کە هەر بەرنامەی خۆی ببێ لە ژیان دا، پێغەمبەرانی هەر بۆ ئەوە ناردووە کە بەرنامەی خوا بەدی بێنن و بیچەسپێنن، ئەوەش بە بێ زۆرو دەسەڵات ناگونجێ، جا لەبەر ئەوە مێژووی ئیسلام هەروەك خۆیەتی و یەکەمجار، هەر بریتی یە لە بانگ کردن و راگەیاندن، رژێم و حوکم، لە پاش ئەوە جێنشینی پێغەمبەر(ﷺ) بەرپا ئەبێت و راگیر ئەبێ بە هێزی شەریعەت و رژێم دائەمەزرێ لەسەر بەدی هێنان و بەجێ هێنانی شەریعەت و رژێم. بۆ پێك هێنانی گوێ رایەڵی یەکی هەمیشەیی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و پێك هێنانی مەبەست لە ناردنی پێغەمبەر، بێجگە لەوە شێوەیەکی تری نی یە کە پێی بگوترێ: ئیسلام. یان پێی بگوترێ: ئایینی خوا، بەڵکو ئایینی خوا و ئیسلام هەر بریتی یە لە گوێ رایەڵی پێغەمبەر(ﷺ) کە بەدی بێت لە بارو شێوەیەك دا، ئینجا ئەو بارو شێوەیە وێنە و دیمەنی جیاواز بووە بە پێی کات و چەرخ و چینەکانی ئادەمی کە خوا خۆی زانیویەتی چۆن چاکە و بەرژەوەندی لەچی دایە، وێنەو دیمەنەکە جیاوازبووە، بەڵام ئەسڵەکە هەریەکەو دامەزراو و نەگۆڕاوە کە بریتی یە لە مل کەچی بۆ بەرنامەی خوا، پێك هێنان و بەدی هێنانی ئەو بەرنامەی کە پێغەمبەرەکەی هێناویەتی، گەڕانەوەی هەموو کاروبارێك بۆلای شەریعەتی خوا، لانەدان بۆلای هیچ حوکم و بڕیارێکی تر لە جیهان دا.

﴿وَلَوۡ أَنَّهُمۡ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ جَآءُوكَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسۡتَغۡفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابٗا رَّحِيمٗا ٦٤﴾

خوای گەورە چەند ناوو سیفەتێكی هەیە ئەبێ بەرو بەرهەمیان بەدی بێت، جا دوان لەو ناوو سیفەتانەی(تواب) و(رحیم) ە، واتە وەرگری تۆبە و گەڕانەوەی بەندەكانی یەتی، میهرەبانە پێ یان، لەبەر ئەوە قاپی میهرەبانی خۆی خستووەتە سەر پشت بۆ بەندە گوناهبارەكانی كە كاتێ بەڕاستی بگەڕێنەوە بۆلای، ئەو گەڕانەوەیان لێ وەرگرێ تا نەگەنە كاتی نائومێدی لە ژیان. جا هەر بەو پێ یە قاپی میهرەبانی كردەوە لەوانەی كە لایان دا لە شەریعەتی خوا و چوون بۆلای حوكم و بڕیاری ناهەق بەو مەرجانەی كە لەم ئایەتەدا فەرموی: ﴿وَلَوۡ أَنَّهُمۡ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ جَآءُوكَ﴾ ئەگەر ئەوانە كاتێ كە ستەمیان كرد لە خۆیان بە لادانیان لە شەریعەتی خواو رۆیشتنیان بۆلای بڕیاری ناهەق، ئەگەر ئەوانە بهاتنایەتەوە بۆلای تۆ – ئەی محمد – ﴿فَٱسۡتَغۡفَرُواْ ٱللَّهَ﴾ ئینجا داوای لێ بوردنیان بكردایە لە خوا ﴿وَٱسۡتَغۡفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ﴾ فروستادەكەی خوایش داوای لێ بوردنی بكردایە بۆیان ﴿لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابٗا رَّحِيمٗا﴾ بێگومان ئەیانزانی كە خوا زۆر وەرگری تۆبە و گەڕانەوەی زۆر میهرەبانە. یان خوایان دەست ئەكەوت بە تۆبە وەرگر و میهرەبان، لەسەر هەركام واتە خوا تۆبە و گەڕانەوەكەی لێ وەرئەگرتن بە تەواوی و بە میهرەبانی خۆی دای ئەپۆشین، گوناهو ستەمەكەی ئەوانەی ئەو سەردەمە تەنها بۆ سەر خۆیان نەبوو، بەڵكو دەست درێژیش بوو بۆ سەر مافی پێغەمبەر(ﷺ) چونكە ئەو لەناودا بوو، كەواتە پێویست بوو بچنە خزمەتی و مل كەچی خۆیان دەربڕن و داوای فەرمان و بڕیاری لێ بكەن و ئاژاوەكەیان لای ئەو ببڕنەوە، دەی كە نەچووبن بەشێك لە تۆبەكەیان ئەوەبوو بەو جۆرە بگەڕێنەوە بۆلای، بەڵام لەپاش ئەو هەر گەڕانەوەی راستی بۆ قاپی خوا بەسە بەو مەرج و شێوەی كە لە شەریعەتی ئیسلام دا باس كراوە، ئەو بەڵێنی خوا هەر هەیە تا رۆژی دوایی. لە میهرەبانی یەكەی بەزیاد بێت. ئینجا بڕیارێكی زۆر گرنگ و بەهێز دەرئەكات، بەمەی سوێند ئەخوات بە زاتی پاكی خۆی كە هیچ كەس بڕوادار نی یە تا پێغەمبەر(ﷺ) نەكات بە حەكەم و حاكم لە هەموو كاروباری دا، ئینجا رازی و خۆش نوود بێ بە حوكم و بڕیارەكەی، بە تەواوی مل كەچ بێت بۆی بە بێ هیچ جۆرە بێزاری و نیگەرانی یەك بەرامبەر بڕیارەكەی.

فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِن دِيَارِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ ۖ وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا ﴿٦٦﴾ وَإِذًا لَّآتَيْنَاهُم مِّن لَّدُنَّا أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٦٧﴾ وَلَهَدَيْنَاهُمْ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٦٨﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ﴾ سوێند بە خوای پەروەردگارت - ئەی محمد - ﴿لَا يُؤْمِنُونَ﴾ ئەوانەی کە لاف بڕوا لێ ئەدەن بڕوادار نین و بڕوایان نابێ ﴿حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾ هەتا تۆ نەکەن بە حەکەم لە هەر ئاژاوەو دووبەرەکی یەك کە بەرپا بووبێ لە نێوانیان دا ﴿ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ﴾ ئینجا پاش ئەوە دەستیان نەکەوێ لە دەروونی خۆیاندا هیچ بێزاری ودڵتەنگی ودوو دڵی یەك لە هەر حوکم و بڕیارێك کە تۆ داوتە ﴿وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾ مەل کەچ بکەن بۆ بڕیارەکەت بە مل کەچ کردنێکی راست و لە دڵەوە هەڵقوڵێ.**

**خوای پەروەرگار لەم ئایەتەدا سێ مەرجی دانا بۆ بوون و بەدی هاتنی بڕوای بڕواداران، بە سوێند دڵنیایی لەسەر کرد:**

**١- گێڕانی پێغەمبەر(ﷺ) بە حەکەم و وەستان بە دیاری حوکم و بڕیاری ئەو لە هەموو کاروبارێك دا.**

**٢- خۆشنوودی و رەزامەندی دڵ بە حوکم و بڕیارەکەی، بەم رەنگە دڵی لەسەر ئەوە دامەزرێ کە هەر بڕیارەکەی ئەو رێك و راست و بەجێ یە، ئیتر با کابرا زیانبار ببێ لەم جیهانەدا.**

**٣- هەرچۆنێ بەڕاست و رەوای دائەنێ سەرپێچی و سەرکێشی لێ نەکات، وەك هێندێ لە بت پەرستەکان و زۆر لە نامەدارەکان کە بە باشی بڕوایان هەبوو بە راستی پێغەمبەر(ﷺ) کەچی دانیان پیا نەئەنا بە عیناد و سەرکێشی، کەواتە هەرچۆنێ مل کەچی دەروونی پێویستە هەروەها مل کەچی ئاشکراو رواڵەتیش پێویستە بۆ بەدی هاتنی بڕوا.**

ئەمانە مەرجەکانی بوون و بەدی هاتنی بڕوای بڕواداران کە بە روون و ڕەوانی باس کراون، کەواتە هەرکەسێك لاف بڕوا لێ ئەدا با بەم تەرازووە خۆی بکێشێ، ئەگەر ڕێك دەرچوو ئەوا سوپاسی خوا بکات، هەرکەسێك ڕێك دەرناچێ ئەوا با فریای خۆی بکەوێ و هەوڵ بدا بۆ چارەسەرکردنی خۆی پێش ئەوەی ئەم هەل و هەڵکەوتەی ژیانی لە دەست دەرچێ، بێگومان مەبەست لە گێڕانی پێغەمبەر(ﷺ) بە حەکەم لە چەرخی خۆی و لەکاتی ژیانی ئەم جیهانەیش دا هەر گێڕانی ئەو شەریعەتەیە کە پێ ی ڕەوانە کراوە، کەواتە بڕیاری ئەم ئایەتە هیچ جیاوازی نی یە و نەبەستراوە بە هیچ کات و چەرخێکەوە و بە هیچ تاقم و کۆمەڵ و چینەکانی ئەم ئوممەتەوە هەتا ڕۆژی دوایی، هەرکەسێك بڵێ: مەبەست گێڕانی زاتی خۆیەتی لە چەرخی خۆی دا و هەر دەربارەی ئەو تاقمە هاتووە کە لە پێشەوە باس کرا، هەرکەسێك ئەوە بڵێ یان زۆر نەفام و نەزانە، یان لە ئیسلام هەڵگەڕاوەتەوە و پەیوەندی بە ئیسلامەوە نی یە، چونکە بە پێ ی ئەو قسە ناڕەوا ئەبێ تەمەنی ئەم ئاین و شەریعەتە، ماوەی ڕەفتار پێ کردنی هەر ماوەی ژیانی پێغەمبەر بێت(ﷺ) لەگەڵ نەمانی ئەودا ئەبێ ئەمیش نەمابێ و هەڵگیرابێ!! دەی ئایا ئەو قسەیە پیس تر نی یە لە هەڵگەڕانەوەو پاشگەز بونەوەی ئەو خێڵە عەرەبانەی کە لە پاش پێغەمبەر(ﷺ) سەرپێچی یان کرد لە زەکات دان و بەهۆی ئەوەوە دانران بە بێ بڕوا و هەڵگەڕاوە لە ئیسلام و جێنشینی یەکەم – خوا لێ ی ڕازی بێت – لەشکری بۆ ناردن و غەزای کردن و فەرموی: سوێند بە کەسێ گیانی منی بەدەستە جەنگیان لەگەڵ ئەکەم لەسەر پەتە گوریسێك، یان کارژەڵەیەك کە دابێتیان بە پێغەمبەر و ئێستا نەیدەن؟!!

لەپاش ئەو بڕیارە گەورەو گرنگەی کە لەم ئایەتەدا ئاراستەی کرد، ئینجا ئاماژە ئەکات بۆ ئەوەی ئەم شەریعەتەی کە پێویست کراوە و مل کەچی بۆ و بە هیچ کلۆجێك ڕەوا نەدراوە لادان لێ ی، ئەم شەریعەتە بەرنامەیەکی سووك و ئاسانە و خاوەنی چاوپۆشی یە و زۆر بەزەیی دارو میهرەبانە، داوای شتێك ناکات لە مەردوم کە لە دەسەڵات و تواناتدا نەبێت، هیچ کەسێك تەنگەتاو ناکات، داوا ناکات بە فیداکاری لە خۆڕایی، چونکە خوا خۆی ئەزانێ کە ئەم ئادەمی یە لاوازە، بەزەیی دێتەوە بە لاوازی یەکەی دا، ئەزانێ ئەگەر داوای کارو کردەوەی زۆر گرانی لێ بکردایە، مەگەر کەم کەس هەڵسایە پێ ی، ئەویش نایەوێ تەنگەتاویان بکات، نایەوێ بکەونە گوناهو نافەرمانی، لەبەر ئەوە شتێکی لێ داوا کردن و ئەرکێکی خستە سەرشانیان کە بە باشی پێ یان بکرێ، ئەگەر هەڵسن بەو ئەرکە سووکەی

که خستی یه سەر شانیان خێرو بەهرەی گەورەیان دەست ئەکەوێ لە هەردوو جیهان دا، خوایش کۆمەکی یان ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ﴾ ئەگەر ئێمە پێویستمان بکردایە لەسەریان کە ئەبێ خۆتان بکوژن، وەك پێویستمان کرد لەسەر ئەو ئیسرائیلی یانەی کە گوێرەکە پەرستی یان کرد لەو ماوەیەدا کە موسا پێغەمبەر(ص) بەجێی هێشتن و چوو بۆ شاخی توور، ئەو خۆ کوشتنەی کرد بەهۆی وەرگرتنی تۆبەکەیان لەو تاوانە گەورەی کە کردیان. ﴿أَوِ اخْرُجُوا مِن دِيَارِكُم﴾ یان پێویستمان بکردایە ئەبێ دەرچن لە وڵات و نیشتمانەکەتان، هەرچۆنێ پێویستمان کرد لەسەر ئیسرائیلی یەکان دەرچوون لە میسر، ئەگەر ئێمە داوای شتی وامان بکردایە لەم ئوممەتەدا ﴿مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ﴾ ئەو پێویست کراوەیان نەئەکرد مەگەر کەمێك لەوان، کە بڕواداره راستەقینەکانن.(ئیبن و ئەبی حاتەم) ئەگێڕنەوە لە(عامری کوڕی عبدالله) وە کە کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ئەبوبەکر – خوای لێ رازی بێت – فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر فەرمانم پێ بدەیت بە کوشتنی خۆم ئەیکەم، ئەویش فەرموی: ئەی ئەبوبەکر راست ئەکەیت، هەروەها ئەگێڕنەوە لە(شریحی کوڕی عبید) ەوە کە کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە پێغەمبەر(ص) دەست نیشانی کرد بۆ(عبدالله ی کوڕی رەواحە) و فەرموی: ئەگەر خوا ئەوەی پێویست بکردایە ئەمە لەو تاقمە کەمە ئەبوو، سوپاس بۆ خوای میهرەبان کە ئەو فەرمانەی بدایە ئەمان کرد، کەواتە سوپاس بۆ خوا کە لەوە رزگاری کردین. بەڵێ هەموو سوپاس و سەنایە بۆ خوای میهرەبان وەك ئەو فەرمانەی نەداو ئەرکی سەرشانمانی سووك کرد ئەم مزگێنی یە خۆشەیش ئەدا لەسەر بەجێ هێنانی ئەم ئەرکە سووکەیش، ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ﴾ ئەگەر ئەوانە گوێ رایەڵ بوونایە و هەڵسانایە بەوەی کە داوایان لێ ئەکرێ و ئامۆژگاری ئەکرێن پێ ی لەم جیهانەدا، ﴿لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ﴾ بێگومان ئەوە زۆر چاك بوو بۆیان لە جیهان و لە رۆژی دواییش دا ﴿وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا﴾ ئەوە بەتین تر بوو بۆ دامەزراندنیان لەسەر هەق و راستی و بەتین تر بەرگری ئەکردن لە گومرایی، بڕوای بەهێز و دامەزراوتر ئەکردن و دووری ئەخستنەوە لە دوو دڵی. ﴿وَإِذًا لَّآتَيْنَاهُم مِّن لَّدُنَّا أَجْرًا عَظِيمًا﴾ ئەو کاتە پێمان ئەبەخشین لەلایەن خۆمانەوە ئەجرو پاداشتێکی زۆر گەورە ﴿وَلَهَدَيْنَاهُمْ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا﴾ ئەمان خستنە سەر رێ ی راست و دامەزراومان ئەکردن لەسەری، ئیتر مەبەست ئایینی ئیسلام بێت، یان رێ ی کردەوەی چاك لەسەر باری راستەقینەی خۆی، یان مەبەست رێ ی بەهەشت بێت، یان رێ ی ئەوانە کە خوا

چاکە و بەهرەی خۆی رشت بەسەریان دا، بە هەموو ئەمانە تەفسیر کراوەتەوە. ئەم ئایەتانە بە دوو جۆریٚ تریش تەفسیر کراوەتەوە:

١- مەبەست هەر ناپاکەکان بیٚت وەك لە چەند ئایەتی رابردوودا هەر ئەوان مەبەست بوون.

٢- لە سەرەتای ئایەتی ﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا﴾ تا ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ﴾ هەموو ئوممەت و گشتی مەبەست بیٚ، و ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ... مُّسْتَقِيمًا﴾ مەبەست ناپاکەکان بیٚت، ئەم دوو جۆرەش هەر ئەگونجیٚن، بەلاٚم ئەوەی کردمان بە تەفسیر دلٚ زۆر بە ئارام ترە پیٚی، بە هەر جۆر و لەسەر هەر بار بیٚگومان ئەم شەریعەتە پیرۆزە، ئەرکەکانی سووك و ریٚکە لەگەلٚ سروشت و توانادایە، نابیٚ گویٚ بگیریٚ لەوانەی کە سروشتیان تیٚك چووە و چەقیون لە قوڕداو داوای بەرەلاٚیی و ئاژەلٚی ئەکەن!!

ئەم ئایینە پیرۆزە ئەرك و رەحمەتی تیایە، بەلاٚم دەست کەوتەکەی لە هەردوو جیهان دا ئەوەندە زۆر و فراوان و پڕ سوودە، ئەرك و گرانی یەکەی هیچ چاونادا لە ئاستی، بە بیٚ ئەم ئایینە ئادەمیٚتی و مرۆڤایەتی بە هیچ کلۆجیٚك دەست کەوت نابیٚ. ئەم شەریعەتە لە کاتی تەنگی و نارەحەتی دا سووك و ئاسانی بەکار ئەهیٚنیٚ کە ئەو جۆرە بڕیارانەی ناوبراون بە(رخصة)، وەك کورت کردنەوەو کۆکردنەوەی هیٚندیٚ لە نویٚژەکان، نەگرتنی رۆژوو لە کاتی سەفەردا، وەك خواردنی شتی حەرام لە کاتی ناچاری دا، بەلاٚم نابیٚ ئەوانە بە جاریٚ کۆبکریٚتەوە و بکریٚن بە بەرنامەی ژیان، چونکە ئەو جۆرە بڕیارانە ئەسلٚی نین و هۆ و کاتی تایبەتی خۆیان هەیە، زۆربەی بڕیارەکانی کە ناو ئەبریٚن بە عەزیمە و هۆی تایبەتی نی یە بۆ گۆڕانیان، ئەوانە شەریعەتی ئەسلٚین و بنەڕەتی شەریعەتەکەن، کەواتە ئەبیٚ هەردوکیان نیشان بدریٚن پیٚکەوە، نەك وەك هیٚندیٚك لە نیازپاکان کە بانگی مەردوم ئەکەن بۆ ئیسلام بۆ راکیٚشانی دلٚ و دلٚخۆش کردنیان هەر باسی روخسەتەکانیان بۆ ئەکەن، نەخیٚر شتی وا راست نی یە و ئیسلام هەردوو جۆرەکەیە و زۆربە و بنەڕەتەکە ئەو بڕیارانەیە کە روخسەت نین، وەك وتمان. ئەوانەشیان کە روخسەت نین هەر ئاسانن و لە توانادان، هەموو بڕیارەکانی ئیسلام وەك بەرو میوەی باخات هەر یەکە تام و بۆنی تایبەتی خۆیان هەیە و هەریەکە لە باریٚکەوە پیٚویستن، هەروەها بڕیارەکانی خوا هەموو دەست کردی خوان و بەرو میوەی باغ و بیٚستانی میهرەبانی خوان و لە ژیٚر چاودیٚریی و پەروەردەی خواداان، کەواتە هەمووی هەر چاکە و پیٚویستە و پیت و فەڕیان پیٚ یە.

وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ذَٰلِكَ ٱلْفَضْلُ مِنَ ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ عَلِيمًا ﴿٧٠﴾

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ خُذُواْ حِذْرَكُمْ

---

**لەم چەند ئایەتەدا کە رابوردن چەند جارێك فەرمانی دا بە گوێ رایەڵی کردن بۆ خواو پێغەمبەر(ﷺ) و لادان و سەرپێچی لە فەرمانی ئەوانی زۆر بە ناشیرین دەرکرد، هانی مەردومانی دا لەسەر گوێ رایەڵی و فەرمانبەری و زۆر شیرینی کرد لەدڵ و دەروون دا، لە پاش هەموو ئەوانەدا ئینجا هەمیتر ئەگەڕێتەوە سەر ئەو مەبەستە و دڵ و دەروون ئەهێنێتە سۆزو پەرۆش بۆی بە بەڵێن دان بە گەورەترین و شیرین ترین پاداشتی ئەو گوێ رایەڵی کرنە کە بریتی یە لە هاوڕێ یەتی پێغەمبەران و شەهیدان و چاکان لە بەهەشت دا، ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ﴾ ئەگەر هەرکەس گوێ رایەڵی خوا بکات بە رێك و راستی ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم﴾ ئەوانە لە رۆژی دوایی دا لەگەڵ ئەو کەسانەن کە خوا چاکە و بەهرەی خۆی رشت بەسەریان دا، کە دیارییان ئەکات بەم چوار تاقمە: ئەفەرموێ:**

١- ﴿مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾ **لە پێغەمبەران.**

٢- ﴿وَٱلصِّدِّيقِينَ﴾.

٣- ﴿وَٱلشُّهَدَآءِ﴾.

٤- ﴿وَٱلصَّٰلِحِينَ﴾.

**یەکەم ئاشکران و بە بێ دووبەرەکی ناسراون، بەڵام ئەو سیانەکەی تر بە چەند جۆرێك راڤە و تەفسیریان بۆ باس کراوە، لەبەر ئەوەی بە کورتی بیبڕمەوە یەکێکم هەڵبژارد کە بڕوام بەهێزتر بوو پێ ی: مەبەست بە(الصدیقین) هاوەڵە گەورەکانی پێغەمبەرانن کە زۆر راست و نیاز پاك و خاوێن بوون لە وتار و کرداریان دا و پێش کەوتوون لە بڕوا هێنان دا. مەبەست بە(الشهداء) ئەوانەن کە گیانی خۆیانیان بەخت کردبێ لە گوێ رایەڵی خوا و بەرزکردنەوەی ئایینی خوادا، کەواتە ئەوانە شایەتی ئەدەن لەسەر رێ ی راستی ئایینەکەیان بە زمان و بە کردەوە و بە گیان. مەبەست بە(الصالحین) ئەوانەن کە تەمەن و ماڵی خۆیان بەکار ئەهێنن لە گوێ رایەڵی و رەزامەندی خوادا.**

ئەم چوار تاقمە هەڵبژێرراوی بەندەیانی خوا لەگەڵ جیاوازی رادەو پلەیان دا، لە هەموو ئوممەتەکانی رابوردوودا بوون، جا لەم دواترین ئوممەتەدا خوا زیادە میهرەبانی ئەکات، بەم رەنگە رادەو پلەی گوێ رایەڵەکانی بەرز ئەکاتەوە و ئەیانکات بە هاوڕێی ئەوانە ﴿وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا ﴾ ئەو تاقمە پایە بەرزانە زۆر شیرینن لەبارەی هاوڕێ یەتی یەوە و هاوڕێ یەتیان زۆر خۆش و شیرینە، بەڵام با بزانرێ کە مەبەست ئەوە نی یە ئەو گوێ رایەڵانە ئەبرێنە رادە و پلەی ئەوانە و پاداشتی ئەمان وەك پاداشتی ئەوانە. نابێ هیچ کەس گومانی ئاوا نارەوا ببات، چونکە ئەوە لەگەڵ رووکەشی ئایەت و حەدیس دا رێك ناکەوێ. بەڵکو مەبەست ئەوەیە هەرچەند جێ و شوێن و نازو رێز و پایە پلەیان جیاوازە لەوان، بەڵام هەرکات ئارەزوو بکەن پەیوەندی و بینین و هاتوچۆی ئەوانیان بۆ دەست ئەدات، ئەم هاوڕێ یەتی یە بەرهەم و پاداشتی کردەوەی خۆیان نی یە، بەڵکو وەك ئەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ الْفَضْلُ مِنَ اللَّهِ ﴾ ئەو پاشە رۆژو بەهرە گەورەیە کە باس کرا بۆ ئەو گوێ رایەڵانە هەر لەلایەن خواوەیە و بە لوتف و میهرەبانی خوایە، چونکە هیچ کام بە کردەوە و گوێ رایەڵی یەکەی ناگاتە ئەو رادەو پلە بەرزە ئەگەر ئەو لوتف و میهرەبانی یە نەبوایە! ﴿وَكَفَىٰ بِاللَّهِ عَلِيمًا ﴾ بەسە خوا کە زانایە بە هەموو شتێ، زانایە بە پاداشتی ئەوانەی کە گوێ رایەڵی بوون، بە ئەندازە و رادەی ئەو بەهرەی کە ئەیبەخشێ بەوانەی کە شیاو و شایستەن، بە پێی بەڵێنی خۆی، کەواتە با بڕواداران دڵخۆش و دڵنیا بن بە بەڵێنی خوا و بە ئاگاداری و زانینی خوا و ئیتر گوێ یان لە هیچی تر نەبێ. بەڕاستی هەر دڵێك نەمردبێ و بێبەش نەبێ لە هۆش و ژیریی، هەر دڵێك تۆمە و کەرەسەی خێرو چاکەی تیا بێ، ئەبێ بکەوێتە سۆزو پەرۆش بۆ ئەم جۆرە بەڵێن و میهرەبانی یە! بەڕاستی بەهرەکە زۆر بەرزو بەنرخ و گەورەیە: هاوڕێ یەتی گەیشتن بەو هەڵبژێراوانی خوا بە تایبەتی پێغەمبەری ئازیزمان(ﷺ) کە هەموو بڕوادارێك لە پاش خوا نابێ لەو خۆشەویست تری ببێ، هاوەڵە بەڕێزەکانی تام و بۆن و لەزەتی ئەو هاوڕێ یەتی یەیان چەشتبوو لە جیهان دا، لەبەر ئەوە ئاوات و ئامانجیان ئەوە بوو کە لە رۆژی دواییش دا هەر بەهرەمەند بن پێی، تا ئەو رادەیە هێنی وایان بوو خەریك بوو خەوو خۆراکی لا هەڵگیرێ لە ماتەمی ئەوەدا نەوەك لە رۆژی دوایی دا دەست کەوتی نەبێ، لەو بارەیەوە چەند ریوایەتێك هاتووە. یەکێ لەوانە ئەمەیە کە(ئیبن و مەردەویە) ئەیهێنێ لە دایکی ئیمانداران(عائشة) ەوە – خوای لێ رازی بێت – ئەفەرموێ: پیاوێك هاتە خزمەت

پێغەمبەر(ﷺ) وتی ئەی پێغەمبەری خوا، بەڕاستی تۆ خۆشەویست تری لام لە خۆم و ماڵ و منداڵم، من وا ئەبێ لە ماڵ دا ئەبم و بیری تۆ ئەکەمەوە خۆم پێ ناگیرێ هەتا دێم بۆلات و سەرنجت ئەدەم، کاتی بیری مردنی خۆم و تۆ ئەکەمەوە، ئەزانم تۆ رادەو پلەت بەرز ئەکرێتەوە لەگەڵ پێغەمبەران دا، من ئەگەر بچمە بەهەشتیش ئەترسم تۆ نەبینم، ئەویش وەڵامی نەدایەوە هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، یەکێ تر لەو ریوایەتانە(ئیبن و جەریر) ئەیهێنێ لە(سعیدی کوڕی جوبەیر) ەوە کە ئەفەرموێ: پیاوێك لە ئەنساری یەکان دێتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) بە غەمباری و ماتەمی یەوە، ئەویش ئەفەرموێ: ئەوە چی یە بە غەمبار ئەتبینم؟ ئەمیش عەرزی ئەکات ئەی پێغەمبەری خوا بیر لە شتێك ئەکەمەوە، ئەویش ئەفەرموێ: چی یە ئەوەی کە بیری لێ ئەکەیتەوە؟ ئەمیش ئەڵێ: ئێمە ئێوارەو بەیانی دێینە خزمەتت و سەرنجی رووی تۆ ئەدەین، لەگەڵت دائەنیشین، لە رۆژی دوایی دا تۆ بەرز ئەکرێتەوە لەگەڵ پێغەمبەران دا، کەواتە ئێمە پێت ناگەین، ئەویش وەڵامی نەدایەوە. ئینجا جوبرەئیل ئەم ئایەتە ئەهێنێ، لە پاشان پێغەمبەر(ﷺ) ئەنێرێ بە دوای ئەو پیاوەدا و موژدەی پێ ئەدات. هاوەڵە بەڕێزەکان کە تام و خۆشی ئەو هاوڕێ یەتی یەیان چەشتبوو لەم جیهانەدا، ئا بەو جۆرە غەم و پەژارە و دڵ و گیانی داگرتبوون کە نەوەك لە رۆژی دوایی دا بێبەش بن لێ ی، خوا بە میهرەبانی خۆی خۆشەویستی خۆی و پێغەمبەرەکەی لە دڵمان دا بەهێزو جێگیر بکات لە ژیانی جیهان دا و لە رۆژی دواییش دا بەهرەمەندمان بکات لەوەی کە هاوەڵەکان غەم و پەژارەیان بوو بۆی، بۆ خوا ئەوە هیچی تێ ناچێ. بێگومان لەناو گەلی موسڵمانی مەدینەدا چەند کەسێك هەبوو کە بە تەواوی پێ نەگەیشتبوون و وەك میوەیەکی کاڵ وا بوون، بەڵکو هینی وا هەبوو کە ناپاك بوو لە دڵەوە هەر بڕوایشی نەهێنا بوو، کەواتە پێویست بوون بە تێکۆشانێکی گرنگ بۆ پەروەردە کردن و پێگەیاندنیان تا هیچ کون و کەلەبەرێك نەمێنێ و بە هەموویانەوە بتوانن هەڵسن بەو ئەرکە زۆر گرانە کە خرابووە سەرشانیان، ئەو گەورەترین سپاردەیە بگەیەنن بەجێ و شوێنی خۆی، جا بۆ ئەو مەبەستە گرنگە لەم(١٦) ئایەتی داهاتووەدا ئەوەی کە پێویست بێت لە تەمێ و ئامۆژگاری و راست کردنەوەی هەر بۆچوونێکی ناڕاست و روون کردنەوەی هەر هەڵە و شتێکی ناشایستە و هاندان بۆ بارو رێگە راستەکەی ئیسلام، لەم ئایەتانەدا دەست نیشان و ئاماژە کرا بۆ ئەو مەبەست و پێویستی یانە. بێگومان ئەم قورئانە گەل و کۆمەڵی موسڵمانی خستە کارو تێکۆشان لە چەند مەیدانێك دا: تێکۆشان و بەربەرەکانێ ی دەروون بە دژی خەتەرە و

خەیاڵی ناڕاست و بۆچوونی هەڵە و نارەواو باوی سەردەمی نەفامی و ترس و لاوازی کە بە سروشت روو ئەکەنە مرۆڤ، ئینجا رامیاری کردن بە بەرنامەکەی خوا تا بەهێزو دامەزراو و رێك و پێکیان بکات، ئەوەی کرد چونکە گەل و کۆمەڵ هەرچەند پیاوی زۆر بەهێزی تیا بێ کاری بە تەواوی ناڕوا ماتووڵ چەند ناتەواو و لاوازێك تێکەڵی بووبێ و ریزەکەی ناشیرین و لەکەدار کردبێ، ئینجا با گوێ بگرین بۆ ئەو ئایەتانە دەست نیشان بکات بۆ ئەو نەخۆشی یانەی کە باسمان کردن و روو ئەکەنە گەل، لەگەڵ تیمار و چارەسەرەکەی دا، لە یەکەمجارەوە بڕواداران وریا و بێدار ئەکاتەوە بەوەی ئاگایان لە خۆیان بێت و خۆیان نەدەن بەدەم دوژمنانەوە، بە تایبەتی ئەو دوژمنانەی کە خۆیان دەرنەخستووە بە ناپاکی خۆیان کردووە بەناو کۆڕ و کۆمەڵیان دا و ئەیانەوێ کەندەیان لێ بکەن بۆ رووخاندنیان، ئەفەرموێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿خُذُواْ حِذۡرَكُمۡ﴾ وریایی و خۆپارێزیی خۆتان بگرنە دەست و وەری گرن، واتە ئەو وریایی و خۆپارێزیی یە بکەن بە چەك و قەڵغانی دەستتان بۆ بەرگری زیانی دوژمن، بەم رەنگە هەمیشە وریا بن و رێ یان نەدەن کە کارتان لێ بکەن، دیارە ئەوەش بەمە ئەبێ کە بڕواداران ئاگادار بن بەسەر بارو حاڵی دوژمن دا، بزانن ئەندازە و رادەی هێزو دەسەڵاتیان، بە گوێرەی توانا هێزو چەك و هەرچی پێویستە ئامادەی بکەن بۆ بەرگری شەڕو زیانیان، چونکە دوژمنمان هەمیشە وا لە کەمین دا و بۆ هەر هەل و هەڵکەوتێك ئەگەڕێ لەسەرمان و هەرچۆنی بۆ بکرێ دەست ناگێڕێتەوە، بە کورتی ئەوەی کە پێویست بێت بۆ بەرگری دوژمن ئەبێ بەکاری بێنن، بە بێ ئەوە گوێ رایەڵی فەرمانی ئەم ئایەتە نەکراوە و ناکرێ، کەواتە پێویستە لەسەر موسڵمانی ئەمڕۆ دروست کردن و گرتنە دەستی هەموو چەکی سووك و قورس لە هەموو جۆرو بابەتەکانی ئەمڕۆ، بە بێ ئەوە ئوممەت تاوانبارە و لایداوە لە رێی راستی خۆی، بەس ئەوەندە هەیە ئێمە هیچ چەکێك نابێ بەکار بێنین لە دەست درێژیی و ستەم و ناهەقی دا، بەڵکو نیازمان هەر بەرگری دەست درێژیی و ستەم و ناهەقی یە لەخۆمان و لە هەر لاواز و بێ دەسەڵاتێکی تر، ئەمەی کە وتمان شتێکی ئاشکرایە و دەست نادات بۆ لێکۆڵینەوە و دووبەرەکی کردن تیای دا.

ئینجا فەرمانی تر هەڵئەسێنێ و ئەیهێنێ بە دوای ئەو فەرمانەدا کە مەبەست و هۆیە بۆی یان تەواوکەری یەتی،

فَٱنفِرُواْ ثُبَاتٍ أَوِ ٱنفِرُواْ جَمِيعًا ﴿٧١﴾ وَإِنَّ مِنكُمْ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ فَإِنْ أَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَالَ قَدْ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَىَّ إِذْ لَمْ أَكُن مَّعَهُمْ شَهِيدًا ﴿٧٢﴾ وَلَئِنْ أَصَٰبَكُمْ فَضْلٌ مِّنَ ٱللَّهِ

---

**ئەفەرمویٚ:** ﴿فَٱنفِرُواْ ثُبَاتٍ أَوِ ٱنفِرُواْ جَمِيعًا﴾ **ئینجا دەرچن بۆ جەنگ و بەربەرەکانیٚ ی دوژمن بە تاقم تاقم نەك بە هەمووتان بە جاریٚ ئەگەر بەو جۆرە پێویست بێت، وەك بە درێژیی زانایانی ئیسلام ئەو جۆرو بارەیان باس کردووە لە کتێبەکانیان دا، کەواتە نابیٚ بە بیٚ زانین و خۆ ئامادە کردن لە خۆیانەوە دەرچن و مل بنێن، نابیٚ بە تاك و تەرا و تەنیا بڕۆن یان پرژ و بلاو ببنەوە کە بە ئاسانی دوژمن زیانیان پیٚ بگەیەنیٚ و لەناویان بەریٚ، هەرچەند ئەم فەرمانە وەرئەگیریٚ لە شێوە گشتی یەکەی فەرمانی پێشوو، بەلاٚم لەبەر گرنگی ئەم بە روونی و بە درێژیی باسی کرد. ئا بەو جۆرە ئەم فەرمانانە هاتن لە سەرکردایەتی هەرە بەرزەوە، ریٚ و رچە و بەرنامەی نەخشە کێشا بۆ جەنگ و بەربەرەکانیٚ یان لەگەلٚ دوژمن دا، ریٚ و رچە و بەرنامەیەکی گشتی یە و بۆ هەموو چەرخ و چینێك دەست ئەدات و رێك و راستە. ئەم قورئانە تەنها فەرمانی نەدا بە نوێژ و رۆژوو و نیشانەکانی تری خواپەرستی، یان تەنها خو و رەوشت و هێندیٚ کردارو رەفتار، بەڵکو لەپاڵی ئەوانەو لەگەلٚ ئەوانەدا هەموو بەسەرهات و بارو روویەکی ژیانی گرتە ژێر چنگ و ریٚ و رێباز و بەرنامەی تێرو تەواوی بۆ ئەوانە و بۆ هەموو شتیٚ دیاریی کرد و نەخشەی کێشا، جا لەبەر ئەوە ئەم قورئانە داوای کاربەدەستی و سەرکردایەتی و چاودێریی و بەرێوەبەرایەتی ئەکات بەسەر ژیان و جیهان دا، بە هیچ کلۆجێك ریٚی گەلی موسلٚمان و هیچ موسلٚمانێك و هیچ کەسێك نادات کە هیچ بەرنامەیەکی تر دابنیٚ بۆ ژیانی، یان تێکەلٚ و پێکەڵی بکات بەم رەنگە ژیانی شەخسی و عیبادەت و رەوشت و هێندیٚ شت لە بەرنامەی خواوە وەرگریٚ، کاروباری مامەڵە و ئابوری و کۆمەلاٚیەتی و رامیاری و دەوڵەتی وەرگریٚ لە نامەیەکی تر و هەر بیر و باوەڕێکی تر لەم جیهان و زەوی یەدا! ئەوەی کە ئادەمی ریٚی دراوە هەر ئەمەیە: هەرشتێك دەقی قورئان و حەدیسی لەسەر بووبیٚ بە بیٚ سەر لیٚ کردنەوە و بیر لیٚ کردنەوە گویٚ رایەلٚ بێت، وە ئەوەی دەقێکی لەسەر نەبیٚ ئەبیٚ هەولٚ و تێکۆشان بکریٚ لە وەرگرتن و گێرانەوەی دا بۆ لای**

قورئان و حەدیس، به درێژیی روونمان کردەوە لە تەفسیری ئایەتی(٥٩) ی ئەم سورەتەدا ئەگەر وا نەکرێ نە ئیسلام هەیە و نە بڕوا بە ئیسلام. هەرچەند بەدەم هەر لافێك لێ بدرێ هەرکەسێك بەو جۆرە نەکات و بیەوێ بەرنامەی ژیانی لە هەر بارێکەوە وەرگرێ لەهە لایەکی ترەوە، ئەو کەسە دانی نەناوە و بڕوای نەهێناوە بە ئیسلام، بڕوای نەهێناوە بـ یەکەم بەندی ئیسلام و سەرکردەی هەموو بەندەکانی ئیسلام کە بریتی یە لە(لا إله إلا الله) ک ئەم بەندە داخوازە بۆ ئەوەی کە هیچ حاکم و بڕیار دەرێك نی یە بێجگە لە خوا، هیچ دانەر داهێنەر نی یە بۆ شەریعەت و یاسا بێجگە لە خوا، با بۆ نموونە ئەم ئایەتە بگیرێ بـ دەستەوە کە بەم شێوە ئەم خیتەیەی دانا و نەخشەی کێشا بۆ موسڵمان، کە رێك و پێک لەگەڵ هەڵوێستی ئەو کاتەیان، لەگەڵ ژیانیان لەناو ئەو هەموو دوژمنە زۆرەدا لە ناوخۆ دەرەوەیان دا!! ئینجا رووی فەرمودەی کردە ئەو کۆمەڵی بڕوادارانە بە شێوەی گشتی کـ ناپاك و بڕوا لاواز و ترسنۆك تێکەڵیان بوو، پێی فەرمون: ﴿وَإِنَّ مِنكُمْ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ﴾ بەڕاستی لەناو ئێوەدایە و هێندێکە لە ئێوە کەسێك کە سوێند بەخوا سستی ئەکات و دوا ئەکەوێ لـ دەرچوون لەگەڵتان. یان مەردوم سست ئەکات و دوای ئەخات بە ترس نانە بەر و دڵ سارد کردنەوە، وەك(ئیبن و ئوبەی) بەو جۆرەی کرد لە جەنگ و رووداوی(أحد) اد، بەهەرحاڵ و شێوەی وتە و رستەکەی وا ئەگەیەنێ کە زۆر سوورن لەسەر ئەو کردەوە خراپە و بە هەموو هێز ئەیانەوێ هەڵسن پێی، ئیتر لەبەر ئەوە نی یە ناپاکن و دوژمنی ئیسلام و موسڵمانانن یان لەبەر ئەوە ترسنۆك و بڕوا لاوازن، بەهەرحاڵ ئەوانە هەر بەدوای بەرژەوەندی خۆیان د ئەگەڕێن و ئیتر گوێ یان لە هیچ نی یە، وەك بەو شێوە دەریان ئەخات و نیازو مەبەستیان ئاشکرا ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿فَإِنْ أَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةٌ﴾ ئینجا ئەگەر بەسەرهاتێکی خراپ و ناخۆش دووچاری ئێوە ببێ لەلایەن دوژمنەوە وەك کوشتن و شکان، ﴿قَالَ﴾ ئەو کەسە دو کەوتووە ئەڵێ: ﴿قَدْ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَىَّ﴾ بەڕاستی خوا چاکە و بەهرەی رشت بەسەرم دا ﴿إِذْ لَمْ أَكُن مَّعَهُمْ شَهِيدًا﴾ کاتێ کە من لەگەڵیان ئامادە نەبووم لەم جەنگەدا تا منیش دووچاربوومایـ وەك ئەوان! ﴿وَلَئِنْ أَصَٰبَكُمْ فَضْلٌ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ ئەگەر بەهرەیەکتان لەلایەن خواوە بۆ ببێ وەك زال بوون و دەست کەوتی جەنگ،

لَيَقُولَنَّ كَأَن لَّمْ تَكُنۢ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُۥ مَوَدَّةٌ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ مَعَهُمْ فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧٣﴾ فَلْيُقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يَشْرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَمَن يُقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيُقْتَلْ أَوْ يَغْلِبْ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٧٤﴾

﴿لَيَقُولَنَّ﴾ سوێند بەخوا ئەو کەسە ئەڵێ: ﴿كَأَن لَّمْ تَكُنۢ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُۥ مَوَدَّةٌ﴾ وەك لە نێوان ئێوەو ئەودا هیچ خۆشەویستی و دۆستایەتی یەك نەبووبێ، ئەڵێ: ﴿يَٰلَيْتَنِى كُنتُ مَعَهُمْ﴾ ئای کاشکێ لەگەڵ ئەوان بوومایە ﴿فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ تا بەهۆی ئەوە بگەیشتمایە بە ئامانجی گەورەو دەست کەوتی گەورەم ببوایە، واتە کاشکێ سستیم نەکردایە و لەگەڵ ئەوان دەرچوومایە بۆ جەنگ تا منیش بەشدار بوومایە لە ئامانج و دەست کەوتەکەی ئەوان دا! ئەو بەش براوە لەو کاتەدا ئاوات ئەخوازێ بۆ بەجێ نەمان و هاوڕێ یەتی ئەوان لەکاتێك دا کە خۆی بەدەستی خۆی ئەوەی بەسەر خۆی هێنا، ئەگینا باوەك ئەوان مەرد بوایە و لەگەڵیان بوایە وەك لە پێش دەرچوون دا لەگەڵیان بوو، لاف یەکێتی و خۆشەویستی لێ ئەدا، دەی با بە پێی ئەو لاف و گەزافەی خۆی بوایە و لەگەڵیان دەرچووایە تا لە پاشان بەو جۆرە پەشیمان نەبوایەتەوە و ئەو ئاواتەی نەخواستایە، کەواتە ئەو وتەو رستە تێهەڵکێشە دەست نیشانی تیایە بە سەرزەنشت و تەریق کردنەوەیەکی زۆر سەخت و دڵ تەزێن.

ئەو جۆرە کەسانە لە هەموو کات و لە هەموو شوێنێك دا هەن، ئەوانە دێنە ناو گەل و کۆمەڵ بە ناپاکی و دڵ لاوازی و لار و پێچی، دڵیان هەمیشە بەستراوە بە بەرژەوەندی تایبەتی خۆیانەوە و چاویان هەر بۆ ئەو شتە کەم نرخانە ئەڕوانێ، لەکاتی تەنگانە و مەترسی دا خۆیان ئەگرنە دواو خۆیان ئەشارنەوە، بەڵام لەکاتی ئارامی و خۆشی دا سنگ دەرئەپەڕێنن و لاف و گزاف لێ ئەدەن، بۆچوون و تێگەیشتنیان بەو جۆرەیە کە لێرەدا دەست نیشانی بۆ کرد کە ئەگەر موسڵمانان دووچاری بەسەرهاتی خراپ بوون لە رێی خوادا و ئەمان بە سەلامەتی مانەوە شادمان ئەبن و رزگار بوونیان بە چاکە و بەهرەی خوا دائەنێن! بەڵێ رزگار بوون لە ناخۆشی چاکە و بەهرەی خوایە، بەڵام نەك لە هەموو کات دا و بۆ هەموو کەس، رزگار بوونێك کە دەست کەوت ببێ بەهۆی خۆ شاردنەوە لە جەنگ و تێکۆشان لە رێی خوادا، رزگار بوونی ئەوا هەرگیز چاکە و بەهرە نی یە، بەڵکو مایەی سزاو سەرشۆڕی و شەرمەزاری یە لە هەردوو جیهان دا، رزگاری و سەلامەتی ئاوا چاکە و بەهرەی

بەلای کەسێکەوە کە نەفام و نەزان و بێ ئاگایە لە ژیانی راستەقینە و مەبەست لە ژیان، نازانن کە خوا بۆ چ شتێکی دروست کردوون، ئەوانە لەو بارەوە بەو جۆرە هەڵەن و بۆچوونێکی ناڕاستیان هەیە، وەك لەم بارەکەی تریشەوە هەر هەڵە و نەزانن کە پەشیمان بوونەوەکەیان لەبەر لە دەست دەرچوونی شتێکی گەورەو بەنرخ نی یە کە ئەجرو پاداشت و رەزامەندی خوایە، بەڵکو لەبەر بێبەشی و بەشدار نەبوونیانە لەو شت و مەکە کەم و کورەی کە لە جەنگەکەدا گیراوە و دەست کەوت بووە، ئەوان هەر ئەوە بە مەبەست و ئامانجی گەورە دائەنێن و چاویان هەر بریوەتە ئەو!! ئیسلام ئەیەوێ کە موسڵمانان بەرز بکاتەوە بۆ ئاسۆی هەر بەرز و دووربن لەو رادە و پلە پەستەی کە دەست نیشانی بۆ کرد سەبارەت بەو تاقمە لەرو لاوازو ناپاکەی کە تێکەڵی موسڵمانان بوون و خۆیان کرد بەناو کۆڕ و کۆمەڵیان دا، وێنەی نەخشە کێشان تا موسڵمانان لە هەموو چەرخێك دابیاننناسن و خۆیان لێ بپارێزن و بەبوونی ئەوانەلەناویاندا ئەمان سەرلێ شێواو ونائومێدنەبن. بەڵکو وریا و ئاگادار بن لێیان.

ئینجا ئەیەوێ ئەوانەش بەرز بکاتەوە و دەریان بێنێ لەو قوڕەی کە تێی چەقیون! هەست و هۆشیان داچڵەکێنێ تا ئەوانیش چاو هەڵخەن بۆ ئاسۆی هەرە بەرز و بە دوای مەبەستێك دا بگەڕێن کە چاکترە و دوانەهاتووە، کە ئەوەش دەست کەوتی رۆژی دوایی یە، با ئەم ژیانە کەم و کورە بفرۆشن بە ژیانی نەبڕاوەی ئەو جیهان، ئەفەرموێ: ﴿فَلْيُقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ کەواتە با جەنگ بکات لە رێی خوادا ﴿ٱلَّذِينَ يَشْرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْءَاخِرَةِ﴾ کەسانێ کە ژیانی جیهان ئەفرۆشن بە رۆژی دوایی و بەم ژیانە ئەو ئەکڕن، واتە لە رێی خوادا دەست لەم ژیانە هەڵئەگرن و فیداکاری پێ ئەکەن لە رێی رەزامەندی خوادا و ئەو ئەجرو پاداشتەی رۆژی دوایی یە کە خوا بەڵێنی پێداوە هەڵئەبژێرن بۆ خۆیان. ئەفەرموێ: لە رێی خوادا، چونکە ئیسلام دان نانێ بە هیچ جەنگێك دا و رەوای نادا مەگەر جەنگێك کە هەر لە رێی خوادا بێت، نەك لەبەر هیچی تر و بە هیچ نیازێکی ترەوە، نە لەبەر دەست کەوت، نە زاڵ بوون و داگیر کردن، نە لەبەر ناو و شۆرەت و بەرز بوونەوەی شەخسی جەنگ کەر یان گەل و نەتەوەکەی، نە لەبەر داگیر کردنی وڵات و دەست گرتن بەسەر خێرو بێری دا، نە بۆ پێك هێنانی بازاڕ و سەرمایەداریی، نە بۆ ئەمانە و نە بۆ هیچ مەبەست و ئامانجێکی تر، بەس تەنها لە رێی خودا و بۆ بەرزکردنەوەی ئالاّ و وتەی خوا لە زەوی دا و دامەزراندن و چەسپاندنی بەرنامەی خوا لە ژیان و جیهان دا، بۆ ئەوەی ئادەمی بەهرەمەند ببێ بە خێرو بێرو خۆشی ئەم بەرنامەیە و داد و دادپەروەری یەکەی، ئیتر پاش ئەوەی کە هەر ئالاّی خوا

بەرز کرایەوە، هەر ئایین و بەرنامەکەی ئەو کاربەدەست و حوکمڕان بوو، پاش ئەو ئیتر هەرکەس ئازاد و سەربەستە بۆ گرتنە گەردنی هەر بیرو باوەڕێك کە دڵ ئارام و دڵنیایە پێ ی، لە ژێر سایەی ئەو بەرنامە گشتی یە جیهانی یەی خوادا.

موسڵمان هەرکاتێ لە ڕێ ی خودا جەنگ بکات بەو جۆرەی کە وتمان، ئینجا بکوژرێ لەو جەنگەدا، ئەو موسڵمانە شەهیدە، لای خوا پلەو پایەی شەهیدانی هەیە، لەبەر هەر مەبەستێکی تر و بە هەر نیازێکی ترەوە جەنگ بکات و بکوژرێ، لە ئیسلام دا ناونابرێ بە شەهید، ئەجرو پاداشتی لای خوا نی یە، بەڵکو هەر لای ئەو مەبەست و شتەیە کە جەنگەکەی بۆ کردووە، ئەو کەسانەی ئەوە بە شەهید ناوبەرن تاوانبارن و درۆ بە دەم خواوە ئەکەن، بەڵام هەرکەسێك کە جەنگ بکات هەر لە ڕێ ی خوادا، ئیتر بکوژرێ یان زاڵ ببێ، ئەو کەسە خوا پاداشتی گەورەی ئەداتەوە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يُقَـٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ هەرکەسێك جەنگ بکات لە ڕێ ی خوادا ﴿فَيُقۡتَلۡ أَوۡ يَغۡلِبۡ﴾ ئینجا بکوژرێ یان زاڵ ببێ ﴿فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمًا﴾ بێگومان لە پاش دا ئەجرو پاداشتێکی زۆر گەورەی پێ ئەدەین. هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەم موژدە و بەڵێنە لەدڵیان دا دامەزراو جێگیر بوو، بەهۆی ئەوەوە لە گەرمەی جەنگ دا بە خۆشی وم پێکەنینەوە پەلاماریان ئەداو ئەیانگوت:(إما الغنيمة و إما الآخرة) یان زاڵ ئەبین ئەو کاتە دەست کەوت و غەنیمەتمان هەیە، یان ئەکوژرێین ئەو کاتە ئەجرو پاداشتی ڕۆژی دواییمان هەیە!! ئا بەو جۆرە بەو دەست کاری کردنە قورئان ئەو دڵ و دەروونانە بەرز ئەکاتەوە، سەرنجیان ڕائەکێشێ هەر بۆلای خواو چاوەڕوانی بەهرەو ڕەزامەندی خوا، لە هەرکام لەم دووبارەدا: سەرکەوتن یان کوژران لە ڕێ ی خودا، هەرکام لە کوشتن و دەست کەوت وەك یەك سووك و ئاسان ئەکات لەبەرچاو! چونکە ژیان و دەست کەوتی شت و مەکی ئەم جیهانە هیچ ناهێنێ لە چاو ئەو بەهرە گەورەیە کە خوا بەڵێنی پێ ئەدا. وتەی ﴿يشرون﴾ ەمان بە فرۆشتن بەکار هێنا وەك زۆر لە زانایان ئەفەرمون. لە زمانی عەرەب دا بۆ کڕینیش بەکار ئەهێنرێ، لەبەر ئەوە هێندێك لە زانایان بەم جۆرە تەفسیریان کردووەتەوە، جا لەسەر باری پێشوو هاندانی تیایە بۆ ئەو کەسانەی کە ئەو مامەڵە و کڕین و فرۆشتنە ئەکەن، هەرچۆنێ لەسەر ئەم بارە ئەو وتەیە سەرزەنشتی تیایە بۆ ئەو کەسانەی کە ژیانی جیهان ئەکڕن و ئەجرو پاداشتی ئەو جیهان و دەست بەرداری ئەو شتە گەورەو بەنرخە ئەبن لە پێناو ئەم ژیانە بێ نرخ و پڕوپووچەدا، بەڕاستی هەر لە دەستی قورئان دێت ئەم جۆرە کردەوەو دەست کاری کردنانە کە کردی!!

وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴿٧٥﴾

---

ئينجا لايەك ئەكاتەوە بۆلای بڕواداران و رووی فەرمودەیان تێ ئەكات و مەردایەتی و مرۆڤایەتی یان ئەهێنێتە جۆش و سۆز و پەرۆش بەرامبەر ئەو پیاو و ئافرەت و منداڵانەی كە مابوونەوە لە مەككەدا و پێ گیرا بوون لە ژێر باری سەختی سزاو ئازاری بت پەرستە تاوانبارەكان دا، داوا ئەكەن لە خوا كە دەروویەكیان لێ بكاتەوە، لایەك ئەكاتەوە بۆلای ئەو بڕوادارانە و بە بێزاری دەربڕینەوە ئەم پرسیارەیان ئاراستە ئەكات: ﴿وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ﴾ ئایا چی هەیە بۆ ئێوە، ئایا چ بەهانە و بیانوویەكتان بۆ هەیە كە جەنگ ناكەن ﴿فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ﴾ لە رێی خوادا، لە رێی رزگار كردنی ژێر دەست كراوان و بە لاواز دانراوان دا ﴿مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ﴾ لەو پیاوان و ئافرەتان و منداڵانە ﴿ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ﴾ كە كەسانێكن داما و پێ گیراون و ئەڵێن: ﴿رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا﴾ ئەی پەروەردگارمان دەرمان كە لەم شارەی كە خاوەن و دانیشتوانی ستەمكارن، بە ستەمی گەورە كە بت پەرستی یە و رێ گرتن لە رێ و ئایینی خوا، بە سزا و ئازاردانی موسڵمان و بێ تاوانان، ﴿وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا﴾ بگێڕە بۆمان لەلایەن خۆتەوە دۆست و خاوەن و كاربەدەستێك كە خاوەنداریمان بكات و بمانپارێزێ لە ستەمكار و دوژمن ﴿وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا﴾ بگێڕە بۆمان لەلایەن خۆتەوە یارمەتی دەرێك كە یارمەتیمان بدات و زاڵمان بكات بەسەر دوژمن دا، ئەوانە چەند موسڵمانێك بوون مابوونەوە لە مەككە لەبەر ئەوەی بت پەرستەكان بەرگری یان كردبوون لە كۆچ كردن تا خۆیان بێ دەسەڵات و لاواز بوون و كۆچیان پێ نەئەكرا، ئەوانە مابوونەوە لە ژێر سزاو ئازاری ئەو ستەمكارانەدا، بەو جۆرە نزایان كردە لای پەروەردگاریان، ئەویش بە میهرەبانی خۆی نزاكەی وەرگرتن بەم رەنگە بۆ هێندێكیانی رێك خست دەرچوون، ئەوانەیان كە دەرچوونیان بۆ رێك نەكەوت، باشترین كاربەدەست و خاوەن یارمەتی دەری بۆ ناردن، بەم رەنگە خوا بە سووك و ئاسانی پێغەمبەری زاڵ كرد تا رووناكی ئیسلامی هێنا بۆ مەككە و پاكی كردەوە لە بت پەرستی والحمد لله رب العالمین.

ئەم ئایەتە پیرۆزە دڵ و دەروونی هەموو مەردێك ئەهێنێتە جۆش و سۆز و پەرۆش بۆ ئەو جەنگ کردن و فیداکاری یەی کە بیر ئەکاتەوە لەو داماوانە لە منداڵ و پیاو و ئافرەتی پیرو پەك کەوتوو کە دابمێنن لەناو گەل و کۆمەڵێکی ستەمکاری بێ بەزەیی دڵ رەق، کە رێ یان بەرەڵا بێت بە بێ بەرگری و دەست گرتن لەوەی هەر جۆر بە هەر شێوەیەك سزاو ئازاری ئەو داماوانە بدەن، سووچی ئەو داماوانەش هەر ئەوە بێت کە هەر خوا بپەرستن بە تاك و تەنیا!! بەڕاستی هەر دڵێك پیاوەتی و بەزەیی و مرۆڤایەتی تیا بێت ئەبێ بکەوێتە بزووتنەوە و ئارامی لێ ببڕێ بۆ رزگار کردنی ئەوانە، هەرکەسێك بڕواداری راستەقینە بێت هەرگیز بێ دەنگ نابێ و دانانیشێ تا دەسەڵاتی ببێ، ئەم ئایەتە بۆچوونی بڕواداران دیاریی و روون ئەکاتەوە بەرامبەر بە خاك و وڵات و نیشتمان، بێجگە لەمەی ئەم نیشانی ئەدا ناڕاست و نارەوایە و لادانە لە بڕیارو فەرمانی ئیسلام: ئەو شارەی کە لەو کاتەدا ئیسلام داینا بە ناوچەی جەنگ و پێویستی کرد کە موسڵمانان جەنگ بکەن بۆ رزگار کردنی ئەو داماوانە لێ ی، ئەو شارە مەککەی پیرۆز بوو، وڵات و نیشتمانی ئەو هاوەڵە کۆچ کەرانە بوو، کە ئاوا بە گەرمی داوا کرا لێ یان جەنگ کردن لەگەڵ دانیشتوانە بت پەرستەکانی، هەر ئەو شارە بوو کە ئەو دانیشتووە داماوانە پاڕە و لاڵەیان ئەکرد کە خوا دەریانکات لێ ی! هۆی ئەوەش ئەوە بوو کە ئەو شارە لەو کاتەدا شاری ئیسلام نەبوو، بەرنامەو شەریعەتی خوا لەوێ دا کاری نەئەکرد، بڕوادارانی تیا سزا ئەدرا لەسەر ئایین و عەقیدەکەیان، لەبەر ئەوە ئەو وڵات و نیشتمانە بە وڵات و نیشتمانی ئەو کۆچ کەرانە نەما کە پێویست بێت بەرگری لێ بکەن، بەڵکو گەڕا بە ناوچە و شوێنێ کە ئەبێ جەنگی تیا بکەن بۆ ئازاد کردن و رزگار کردنی برا بڕوادارەکانیان، کەواتە ئەو ئاڵایە کە موسڵمان بەرگری لێ بکات هەر ئایین و عەقیدەکەیەتی، نیشتمانەکەی ئەو نیشتمانەیە کە ئاڵای شەریعەتی خوای تیا بەرز کرابێتەوە، خاك و وڵاتێ کە ئەبێ بەرگری لێ بکات هەر ئەبێ ئەو خاك و وڵاتە بێت کە بەرنامەی ژیان تێیدا هەر بەرنامەکەی خوا بێت، ئیتر بێجگە لەوەی کە وترا هەر بۆچوونێکی تر دابنرێ بۆ خاك و نیشتمان هیچی ئیسلامی نی یە و لە ئیسلامەوە نەهاتووە و ئیسلام دانی پیا نانێ و رەوای نادا، کەواتە با موسڵمانان ئاگایان لە خۆیان بێت نەچن بە هەدەردا.

ئینجا هەمیتر دەست کاری یەکی تری دڵ و دەروون ئەکات بۆ هێنانە جۆش و سۆز و پەرۆش بۆ جەنگ کردن لە ڕێی خودا، ڕێگە روون ئەکاتەوە و مەبەست و ئامانج دیاریی ئەکات بۆ جەنگی موسڵمان و بێ بڕوایان، ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە و بڕوادارن ﴿يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ﴾ جەنگ ئەکەن لەگەڵ دوژمنان دا لەبەر ڕەزامەندی خواو لە ڕێی خوادا، ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە و بێ بڕوان ﴿يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ﴾ جەنگ ئەکەن لە ڕێی شتی زۆر ناهەق و ناڕاست و ناڕەوادا، لەم فەرمودەیەدا بە ڕوونی دوو ڕێگە و دوو ئاڵای دیاریی کرد بۆ جەنگ کەران، جەنگ کەرانی کرد بە دوو تاقم و دوو کۆمەڵ: مەبەست و ئامانجی هەردووکی دیاریی کرد:

١- کۆمەڵ و تاقمی بڕواداران کە جەنگ ئەکەن لەبەر خوا و لە ڕێی خوادا و لە ژێر ئاڵای خودا، بۆ پێك هێنان و بەدی هێنانی بەرنامەی خوا، دامەزراندن و ڕاگیر کردنی شەریعەتی خوا ڕاگیر کردنی تەرازووی دادو دادپەروەریی خوا لە جیهان و لەناو بەندەکانی خودا، هەر بە ناوی خواوە نەك بە ناوی هیچ کەس و هیچ شتێکی تر، لەبەر ئەوەی هەر خوایە بە تاك و تەنیا، کەواتە تەنها ئەو حاکم و حوکمڕانە.

٢- تاقم و کۆمەڵی بێ بڕوایان کە جەنگ ئەکەن لە ڕێی ناهەقی و ناڕاستی دا، بۆ پێك هێنان و بەدی هێنانی هەر بەرنامەیەکی تر - بێجگە لە بەرنامەی خوا - دامەزراندن و ڕاگیر کردنی هەر یاسا و شەریعەتێکی تر - بێجگە لە یاسا و شەریعەتی خوا - و دانان و بەرز کردنەوەی هەر تەرازوویەکی تر بێجگە لە تاقانە تەرازووە ڕاستەکەی خوا، کەواتە تاقم و کۆمەڵی دووەم دۆست و یارمەتی دەری شەیتانن.

ئینجا فەرمان ئەدات بە تاقم و کۆمەڵی یەکەم کە تێ جەنگن و جەنگ بکەن لەگەڵ تاقم و کۆمەڵی دووەم دا، باکیان نەبێ لە پیلان و فڕوفێڵی شەیتان، چونکە پیلانی ئەو هەر لاوازەو بە لاوازی هاتووە، خوایش دۆست و یارمەتی دەری ئەوانە.

فَقَٰتِلُوٓاْ أَوۡلِيَآءَ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ إِنَّ كَيۡدَ ٱلشَّيۡطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا ﴿٧٦﴾ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمۡ كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقِتَالُ إِذَا فَرِيقٞ مِّنۡهُمۡ يَخۡشَوۡنَ ٱلنَّاسَ كَخَشۡيَةِ ٱللَّهِ أَوۡ أَشَدَّ خَشۡيَةٗۚ وَقَالُواْ رَبَّنَا لِمَ كَتَبۡتَ عَلَيۡنَا ٱلۡقِتَالَ لَوۡلَآ أَخَّرۡتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٖ قَرِيبٖۗ

---

**ئەفەرموێ: ﴿فَقَٰتِلُوٓاْ أَوۡلِيَآءَ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ﴾ کەواتە ئەی دۆستەکانی خوا جەنگ بکەن لەگەڵ دۆستەکانی شەیتان دا، واتە پشت بەخوا ببەستن و باکتان نەبێ لێ یان، چونکە ﴿إِنَّ كَيۡدَ ٱلشَّيۡطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا﴾ بەڕاستی پیلانی شەیتان هەمیشە لاوازە و بە لاوازی هاتووە لە خۆی دا چ جای بەرامبەر بە هێزو دەسەڵاتی بێ سنووری خوا کە پیشتیوان و یارمەتی دەری دۆستەکانی خۆیەتی. پیلانەکانی شەیتان ئەوەیە کە ستەم و تاوان و ناهەق و خراپە لەبەرچاوی دۆستەکانی خۆی شیرین ئەکات و ئەیڕازێنێتەوە، بە پێچەوانەی خێرو چاکە و هەق و ڕاستی لە پێش چاویان ناشیرین ئەکات. باوی خوایش وایە کە پاشەڕۆژی سەرکەوتن و زاڵ بوون ئەدا هەر بە دۆستەکانی، کە ئەوانەش هەر ئەوانەن کە بە ڕاستی شوێن کەوتووی ئایینەکە و پێغەمبەرەکەینی. ئینجا لەم حەوت ئایەتی داهاتووەدا باسی چوار تاقم ئەکات بە چەند سیفەت و ناو و نیشانێکەوە، لەبارەی مەبەست بەم تاقمانەدا سێ را هەیە:**

**١- مەبەست ئەو تاقمەیە کە لە پێشەوە باسی کردن بەمەی دوا ئەکەون و خۆیان ئەدزنەوە لە جەنگ، ئیتر ئایا مەبەست بەو تاقمە ڕابردووە هەر ناپاکەکان بێت، یان ئەوانیش و بڕوا لاوازانیش. لێرەش دا ئەم چەند وتارو کردارەیان لێ وەرئەگرێتەوە.**

**٢- مەبەست بە تاقمی یەکەم لە ئایەتی یەکەم دا موسڵمانە دڵ لاوازەکانە کە هێشتا پەروەردەکردنیان تەواو نەبوو، پێ نەگەیشتبوون، بە بۆنەی ئەوانەوە ئەچێت بۆ باسی ئەو سێ تاقمەکەی تر لە ناپاکان کە تێکەڵی بڕواداران بوو بوون و لاف بڕوایان لێ ئەداو بە بڕوادار سەیر ئەکران.**

**٣- مەبەست بە هەر چوار بڕواداری لاوازە کە هێندێ بۆچوون و وتاریان بووە دوور لە بڕواو موسڵمانێتی، بەڵام هێندێ لەو بۆچوونانەی کە باسی ئەکات لەگەڵ بڕوادا ناگونجێ، وەك ئەوەی کە ناڕەحەتی و بەسەرهاتی خراپیان لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) بناسن، لەبەر ئەوە ئەم ڕایە ناچێتە دڵەوە، مەگەر لەسەر ئەو بارەی کە لەمەوپاش ئەیڵێین لە کاتی تەفسیری ئەو ئایەتەی کە باسی ئەو بۆچوونەی تیایە، ئەی ڕای سێ**

یەمە بەم جۆرەیە و دڵ پێی بە ئارام نی یە، بەڵام رای یەکەم ئەگونجێ و ئەچێتە دڵەوە، بەم رەنگە ئەو تاقمە دواکەوتووەی کە باسیان تێپەڕی دوو جۆربن: بڕوا لاواز و ناپاك. ئەو کاتە ئایەتی یەکەم ئەبڕین بەسەر هێندێ لە بڕواداران کە ترس و لاوازی روویان تێ کردبن، و ئایەتەکانی تر ئەبڕین بەسەر ئەوانەی کە لە راستی دا بڕوادار نەبوون و ناپاك بوون، وەك لەسەر رای دووەمیش هەر وائەکەین. بەڵام ئالێین: مەبەست بەم چوار تاقمە ئەو تاقمەیە کە تێپەڕی کرد، بەڵکو ئەڵێین: ئایەتی یەکەم سەربەخۆیە و هات بۆ سەرزەنشت و سەرسوڕهێنان لە حاڵی هێندێ لە بڕواداران، کە کاتی خۆی لە مەککەدا ئەوەندە داخی بێ بڕواکانیان لە دڵ دا بوو، داوایان کرد کە فەرمان بدرێ پێ یان بە جەنگ کردن لەگەڵیان. بەڵام لەو کاتەدا فەرمان نەدرا، لە پاشان کە هاتنە مەدینە و حەوانەوە تیای دا بە بێ بیم و ترس فەرمان درا بە جەنگ و کوشتار، ئەوانیش دەستەیەکیان فەرمانەکەیان لەسەر شان قورس بوو،ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ﴾ئایاسەرنجت نەداوەو ئاوڕێکت نەداوەتەوە بە سەرسوڕمانەوە بۆلای کەسانێك کە ﴿قِيلَ لَهُمْ﴾ گوترا پێ یان: ﴿كُفُّوا أَيْدِيَكُمْ﴾ دەستتان بەرگری بکەن لە جەنگ و کوشتار ﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ﴾ بە رێکی نوێژ بەجێ بێنن، زەکات بدەن، لە پێشەوە پەلەیان ئەنایەوەو ئەیانویست فەرمانیان پێ بدرێ بە جەنگ و کوشتار ﴿فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ﴾ کەچی کاتێ کە جەنگیان لەسەر نووسرا و پێویست کرا ﴿إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ﴾ ئیتردەست بەجێ دەستەیەك لەوانەفەرمانەکەیان پێ ناخۆش بوو ﴿يَخْشَوْنَ النَّاسَ﴾ ئەترسن لەخەڵکی، واتەلەبێ بڕواکان﴿كَخَشْيَةِ اللَّهِ﴾ بەوێنەی ترسانیان لە خوا ﴿أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً﴾ بەڵکو بەتین ترلە ترسانیان لەخوا، بەم رەنگەباوی جەنگ نەکردن ئەدەن لەبەرکردنی دا لەگەڵ ئەوەدا کە خوا پێویستی کردووە لەسەریان ﴿وَقَالُوا رَبَّنَا﴾ ئەڵێن: ئەی پەروەردگارمان ﴿لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا الْقِتَالَ﴾ ئایا لەبەرچی جەنگت پێویست کرد لەسەرمان لەم کاتەدا ﴿لَوْلَا أَخَّرْتَنَا إِلَىٰ أَجَلٍ قَرِيبٍ﴾ با دوات بخستینایە تا ماوەیەکی تری نزیك، واتە تا کاتی دیاری کراوی مردنمان و بە مەرگی خۆمان بمردینایە نەك بە جەنگ و کوشتار، یان ئێستا ئەو فەرمانەت نەدایە تا ماوەیەکی تر کە خۆمان تیا ئامادە بکردایە و بەم زوانە ئەو فەرمانەت نەدایە. بە هەرکام مەبەست بێت،

قُلۡ مَتَٰعُ ٱلدُّنۡيَا قَلِيلٞ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظۡلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧٧﴾ أَيۡنَمَا تَكُونُواْ يُدۡرِككُّمُ ٱلۡمَوۡتُ وَلَوۡ كُنتُمۡ فِي بُرُوجٖ مُّشَيَّدَةٖۗ وَإِن تُصِبۡهُمۡ حَسَنَةٞ يَقُولُواْ هَٰذِهِۦ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةٞ يَقُولُواْ هَٰذِهِۦ مِنۡ عِندِكَۚ قُلۡ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۖ فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلۡقَوۡمِ لَا يَكَادُونَ يَفۡقَهُونَ حَدِيثٗا ﴿٧٨﴾ مَّآ أَصَابَكَ مِنۡ حَسَنَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٖ فَمِن نَّفۡسِكَۚ

---

**خـوا فـەرموی بـە پێغەمبـەر(ﷺ) ﴿قُلۡ﴾ بڵـێ بەوانـە ﴿مَتَٰعُ ٱلدُّنۡيَا قَلِيلٞ﴾ خۆشـی جیهـان و هەرشتێك كە لـەزەتی لـێ وەرئـەگیرێ لـەم جیهانـەدا شتێكی كەمـە، واتـە بێزاریتـان لـە جـەنگ لەبەر بێزاریتانە لە مردن و حەزكردنتان لەمانەوەی ئەم جیهانـە، دەی هـەموو خۆشـی جیهـان شتێكی كەمی دوا هـاتووە ﴿وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ﴾ رۆژی دوایـی چاكترە بۆ هـەركەسێك كـە لـەم جیهانـەدا خـۆی پاراستـبێ لـە هـۆی خەشـم و سزای خـوا كـە لـەو رۆژەدا ئـەجرو پاداشـت ئەدرێنـەوە لەسـەر كـردەوە چـاكەكانتان ﴿وَلَا تُظۡلَمُونَ فَتِيلًا﴾ كـەم و كورپیتـان لـێ نـاكرێ بـە ئەنـدازی دەزوویـەك كـە لـەناو دوولـەتی خورمادایـە، كـە ئـەوە بـە وێنـە ئەهێنرێتـەوە بـۆ بچووكترین شت، كەواتە بێزار مەبن لە جەنگ و كوشتار لە رێی خوادا كە لە پۆپەی كـردەوە چاكەكانە، ئینجا با وا نەزانن كە خۆشاردنەوە و دوا كەوتنیان لـە جـەنگ ماوەی ژیانیـان دوا ئەخات و تەمەن درێژتر ئەبن، نە پەلامار و رۆیشتنتان بۆ جەنگ مەرگتان پێش ئەخات بەڵكو ﴿أَيۡنَمَا تَكُونُواْ يُدۡرِككُّمُ ٱلۡمَوۡتُ﴾ لە هەر شوێنێك بن مردنتـان پـێ ئەگـات ﴿وَلَوۡ كُنتُمۡ فِي بُرُوجٖ مُّشَيَّدَةٖ﴾ با لەناو چەند كۆشكێكی بەرز و محكەم دا بن، یان لـەناو چـەند قەڵایـەكی محكـەمی داڕێـژراودا بن. واتـە هـیچ شـتێك بـەرگری مردن ناكـات و ئـەبێ لـە كـاتی دیـاریی كـراوی خـۆی دا بێـت، پەیوەندی نە بە جەنگ و ئاشتی یەوە هەیە نە بە جێ و شوێنی محكەم و نامحكەمەوە هەیـە، بەس مردن و مان وەك هەموو شتێكی تر هەر بەستراوە بە خواهیش و بڕیاری خواوە، كەواتـە لـە راسـتی دا هـیچ هۆیـەك نـی یـە بـۆ ئـاوات خواسـتنی دواخسـتنی فـەرمان بـە جـەنگ، هـیچ هۆیەك نی یە بۆ ترسان لە مەردوم و لە هەر شتێكی تر بێجگە لە خوا.**

ئا بەم جۆرە دەست کاری کردنە قورئان چارەسەری ئەو خەتەرە و خەیاڵانە ئەکات کە دڵ و دەروون داگیر ئەکەن، ترس و بێ ئارامی فەراهەم ئەهێنن، مەبەست ئەمە نی یە کە بڕوادار پاڵی لێ بداتەوە و وریا نەبێ و ئەوەی کە لە توانایان دا هەیە بەکاری نەهێنێ بۆ پاراستنی خۆی، هەرکەس وا تێ بگات، ئەو کەسە دوورە لە ئیسلامەوە، بە چەند ئایەتێك لەمەو پێش فەرموی: ﴿خذو حذركم﴾ وەك تەفسیرمان کردەوە، هەروەها ئەو هەموو ئایەت و حەدیسانەی تر کە فەرمان ئەدەن بە خۆ ئامادە کردن و گرتنە دەستی هۆی پێك هێنانی هەر شتێك کە ڕەوا و شەرعی بێت، بەڵام ئەمانە شتێکی ترن و جیاوازن لەوەی کە مردن و نەمردن پەیوەست بکرێ و ببەسترێتەوە پێ یانەوە، ئینجا دێتە سەر باسی حاڵەت و بۆچوونێکی بەدتریان، ئەفەرموێ: ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ﴾ ئەوانە ئەگەر خێرو خۆشی و زاڵ بوون و دەست کەوتێکیان بەرکەوێ و بۆیان ببێ ﴿يَقُولُواْ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ ئەڵێن: ئەمە لە لایەن خواوەیە ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ﴾ ئەگەر خراپە و ناخۆشی یەکیان دووچار ببێ وەك گرانی و قات و قڕی و کوشتن و زامدار بوون و شکان ﴿يَقُولُواْ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِكَ﴾ ئەڵێن: ئەمە لەلایەن تۆوە بوو ئەی محمد و بەهۆی تۆوە ئەمەمان بەسەرهات!! باوەڕو بۆچوونی یەکەم هەرچەند لە خۆی دا ڕاست و ڕەوایە، بەڵام ئەوانە بە نیازێکی پاکەوە نەیان ئەوت: بەڵکو مەبەستیان بەوەیش هەر پلار دان بووە لە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ئەگەر بەو نیازەش نەگوترابێ بۆچوونەکەیان ناڕاستە کە سەرچاوەی یەکەم ئەکەن بە خواو دووەم ئەکەن بە پێغەمبەر(ﷺ)، کەواتە لەسەر هەربار وتنەکەی ئەوان بەد و ناڕاستە، وەك دەریش ئەکەوێ لەوەی کە خوا فەرمان ئەدات کە پێغەمبەر(ﷺ) دەم کوتیان بکات و بەرپەرچیان بداتەوە لەم جۆرەی کە ئەفەرموێ: ﴿قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: هەردووەکە لەلایەن خواوەیە، بە خواهیش و بە مەیلی خوایە، بە دەسەڵات و داهێنان و دروست کردنی خوایە هیچ کەسێك بێجگە لە خوا ناتوانێ هیچ دروست بکات و دای بهێنێ ﴿فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلْقَوْمِ﴾ کەواتە ئایا چی هەیە و ڕووی کردووەتە ئەو کۆمەڵە جوولەکە و ناپاکانە بە جۆرێ ﴿لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا﴾ نزیك نین تێ بگەن لە باس و وتەیەك کە ئامۆژگاری ئەکرێن پێ ی، واتە قورئان، یان نزیك نین تێ بگەن لە هەر وتە و قسەیەك کە ئاراستە بکرێن، واتە وەك ولاخ و چوار پێ وان، یان لە هەر ڕووداوێك تا بزانن کە داهێنەر و بەدی هێنەری هەیە، بە هەرحاڵ سەرزەنشتیان ئەکا و تەشەریان لێ ئەدا بە

نەزانی و کەودەنی و تێنەگەیشتن. ئەمەی کە لەم ئایەتەدا ئاماژەی بۆ ئەکات بەشێکە لە مەسەلەیەکی گەورە، ئەو مەسەلەی کە دووبەرەکی یەکی زۆر گەورەی تێدا پەیدا بوو لەناو موسڵمانان دا، ناو براوە بە مەسەلەی قەزاو قەدەر، یان(جبرو اختیار) قورئان لێرەو لە چەند شوێنی تردا دەست نیشانی بۆ ئەکات، ئەگەر موسڵمانان لەو راستە شەقامە و رێی قورئان لانەدەن دووچاری هیچ گیرو گرفت و دووبەرەکی نابن، چونکە ئەوەی کە قورئان دەست نیشانی بۆ ئەکات ئەمەیە: کە داهێنەرو بەدی هێنەری هەر شتێك لەم بوونەوەرەدا خوایە بە تەنیا، مەردوم هەر هەوڵ و پەلاماردان و گرتنە دەستی ئەسباب و هۆکانی بەدەستە، ئیتر دوای ئەوە ئەگەر خوا مەیلی بوو بەدی ئەهێنێ و ئەگەر مەیلی نەبوو ئەوا هیچ، بە کورتی: هەموو شت هەر خوا ئەیکات و هەرچی ئەو نەیکات هەرگیز نابێ، بەندە هەر کارو کردەوەو کەسبی بە دەستە، دەی ئەم بیرو باوەرو ئەم بڕوایە شتێکی زۆر رێك و شایستە روون و رەوانە، لە راستە شەقامی قورئانەوە هەر ئەمە وەرئەگیرێ، کەواتە گێڕانەوەی بەدی هاتنی هەر شتێك، بۆلای هەرکەسێکی تر بێجگە لە خوا – وەك گێڕانەوەی زیان و ناخۆشی و بەسەرهاتی خراپ بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) – لەلایەن ئەو کۆمەڵە بەدەی کە باس کران، گێڕانەوەی بەدی هێنانی ئەمە و هەرشتێکی تر بۆلای غەیری خوا نەزانی یە و نەفامی و تێنەگەیشتنە، وەك بەو جۆرە قورئان لەکەداری کردن و تەشەری لێ دان. لەپاش دەم کوت کردنیان بەو شێوەی کە فەرموی: ئینجا مەبەست و مەسەلەیەکی تر باس ئەکات کە ئەمیش زۆر گرنگە و بڕواکردن پێی زۆر پێویستە، ئەفەرموێ: ﴿مَّآ أَصَابَكَ مِنۡ حَسَنَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِ﴾ هەر خۆشی و چاکە و بەهرەیەکت بۆ بووبێ و بەرت کەوتبێ – ئەی مەردوم – ئەوە لەلایەن خواوەیە و هەر بە میهرەبانی خۆی پێی بەخشیوی. ﴿وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٖ فَمِن نَّفۡسِكَ﴾ ئەوەی کە دووچارت بووبێ لە زیان و ناخۆشی ئەوە لەلایەن خۆتەوەو بە هۆی خۆتەو لە سووچی خۆتەوە دووچارت بووە. بێگومان خوا بەرنامەیەکی داناوەو رێگەیەکی نەخشە کێشاوە، رێنموونی بەندەکانی کردووە بۆ خێرو چاکە، جڵەوگیریی کردووە لەشەڕو خراپە و هەڕەشەی کردووە لەسەری، کاتێ مەردوم شوێنی بەرنامەکەی نەکەوت، رێگەکەی نەدایە بەر، هەوڵی نەدا بۆ ئەو خێرو خۆشی یەی کە رێنموونی بۆ کردووە، خۆی لانەدا و نەپاراست لەو شەڕو خراپەی کە ترساندوویەتی لێ ی، لەو کاتەدا دووچاری شەڕو خراپەکە ئەبێ، ئەو شەڕو خراپەی کە

لەسەر دەستی ئەم دا ئەبێ بە شەڕو خراپەی راستەقینە، چونکە لای بەندە هیچ بارێکی تری نی یە بێجگە لە بارە خراپەکەی، بەڵام کە لە دەستی قودرەتی خوا دەرئەچێ شەڕو خراپە نی یە، چونکە کردەوەکەی ئەو چەند بەرژەوەندی و کاردروستی تیایە کە بە شەڕو خراپە نایهێڵێتەوە، جا مەردوم کە ئاگای لە هیچ بارێکی تر نی یە بێجگە لە بارە خراپەکە کاتێ بە مەیل و ئارەزووی خۆی هەوڵی ئەدا بۆ لادان و خۆی نەپاراست لەو شەڕو خراپەیە دووچاری ئەبێ، ئیتر لە جیهان دا یان لە ڕۆژی دوایی دا یان لە هەردوودا پێکەوە، ئینجا با بزانرێ ئەمەی کە لێرەدا وتمان هیچ دژایەتی تیا نی یە و رێك و پێکە لەگەڵ ئەوەی کە لە پێشەوە فەرموی: هەردووەکە لەلایەن خواوەیە، چونکە مەبەست بەوە ئەمەیە — وەك دەست نیشانمان بۆ کرد — کە هەموو شتێك لەم بوونەوەرەدا بە خواهیش و دەسەڵات و داهێنان و دروست کردنی خوایە، مەبەست بەمەی ئێرە ئەمەیە کە مەردوم مەیل و خواهیش و دەسەڵاتی خوا هەیە لە هێندێ کارو کردەوەکانی دا، بەهۆی ئەوەوە خوا ئەو کارو کردەوانەی بەدی ئەهێنێ، بە کورتی: قورئان پێمان ئەفەرموێ: کە هەموو کارو کردەوەو رووداوێك دروست کەرو بەدی هێنەری هەیە و لەسەر ئەوە حیساب و پرسیاری هەیە، جا هەرکەسێك تێ ئەگات لەو دوو شتە ئەوا چاکە، هەرکەسێك تێ ناگات با بزانێ ئەم دوو شتە قورئان بە روونی ئەیانفەرموێ، بێگومان نابێ قورئان هێندێکی دژو پێچەوانەی هێندێکی تری بێت، کەواتە بڕوادار ئەبێ بڕوای بە هەردوو فەرمودەکە ببێ، ئیتر ئەگەر تێ ناگات لە چۆنێتی و گونجاوی ئەو دوو فەرمودەیە ئەوا ئەم خۆی تێ ناگات ئەگینا ئەوان هەردوو هەر راستن، بێگومان بڕوادار ئەبێ سنووری ژیریی و زانینی خۆی بزانێ، نابێ ژیریی و زانینی خۆی بکات بە تەرازوو و هەموو شتێك هەر بەوە هەڵسەنگێنێ و تاقی بکاتەوە، ئەو هەموو دووبەرەکی و ئاژاوەیە کە کەوتە ناو ئەم ئوممەتە هۆکەی ئەگەڕێتەوە بۆ خۆمان و نەفامی و سنوور دانەنان بۆ ژیریی و زانین. بەهۆی ئەوەوە ژیریی و بۆچوونی کەم و کوڕی بەندە کرا بە حەکەم و حاکم بەسەر قورئان دا تا ئەو هەموو دووبەرەکی و لادان و ترازانە بەرپا بوو!! ئینجا کارو پیشەی پێغەمبەر(ﷺ) لە بارەی پێغەمبەرێتی یەکەیەوە دیاریی ئەکات، لەگەڵ کردەوەو هەڵوێستی بەرامبەر بە خەڵکی و هەڵوێستی ئەوان بەرامبەربەخۆی، ئینجالەدواییدا هەموو کارەکان ئەگێڕێتەوە بۆلای خوا،

وَأَرْسَلْنَاكَ لِلنَّاسِ رَسُولًا ۚ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا (٧٩) مَّن يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ ۖ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا (٨٠) وَيَقُولُونَ طَاعَةٌ فَإِذَا بَرَزُوا مِنْ عِندِكَ بَيَّتَ طَائِفَةٌ مِّنْهُمْ غَيْرَ الَّذِي تَقُولُ

---

**ئەفەرموێ: ﴿وَأَرْسَلْنَاكَ لِلنَّاسِ رَسُولًا﴾ تۆمان ڕەوانە کردووە بە فروستادە بۆ هەموو ئادەمی ﴿وَكَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا﴾ بەسە خوا بە شایەت لەسەر پێغەمبەرێتی و فروستادەیی تۆ. ﴿مَّن يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ﴾ هەرکەس گوێ ڕایەڵی فروستادەکەی خوا بێت ئەو کەسە گوێ ڕایەڵی خوایە ﴿وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا﴾ هەرکەس ڕوو وەرئەگێڕێ لە گوێ ڕایەڵی کردن ئەوا تۆیش گوێ مەدەرێ و پشتی تێ بکە، چونکە ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە بە زاڵ و پارێزەر و چاودێر بەسەر ئەوانەوە کە موحاسەبەیان بکەیت لەسەر کردەوەکانیان و تۆڵەیان لێ بسێنی، بەڵکو تۆ هەر ڕاگەیەنەر و موژدەدەرو ترسێنەری بۆیان.**

**بەم جۆرە بە ڕوونی و ڕەوانی ئەم چەند مەبەستە گرنگانەی ئاراستە کرد بۆ ڕاست کردنەوەی هەر بۆچوونێکی هەڵە و ناڕەوا لە بارەی فروستادەکەی خوا و مەردومانەوە، بۆ ئەوەی نەشارەزا باش زاناو شارەزا ببێ دەست نیشان ئەکەین بۆ ئەم چەند خاڵانەی کە وەرئەگیرێن لەم وتەو فەرمودانەوە:**

**١- کارو پیشەی فروستادەکەی خوا بەجێ هێنانی فروستادەیی یەکەیەتی، نەك بەدی هێنان و فەراهەم هێنانی نە خێرو نە شەرو ناخۆشی، بەڵکو ئەوە کارو کردەوەی خوایە و لە ژێر دەسەڵات و زانینی فروستادەدا نی یە.**

**٢- خوا خۆی شایەتە لەسەر ئەوە کە پێغەمبەرەکەی ڕەوانە کردووە بۆ بەجێ هێنانی کارو پیشەی خۆی.**

**٣- مەردومان بەرامبەر بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەبێ بەم جۆرە بن گوێ ڕایەڵی ئەو دابنێن بە گوێ ڕایەڵی کردن بۆ خوا، لەو بارەیەوە جیاوازی ئەخەنە نێوان خواو پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، فەرمان و وتەی ئەم جوێ ئەکەنەوە لە فەرمان و وتەی خوا لە بڕوا پێ کردن و گوێ ڕایەڵی بۆ کردن دا.**

٤- هەرکەس بڕوا نەهێنێ و سەرکێشی بکات لە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) کاری ئەو کەسە لە بارەی موحاسەبە و تۆڵە لێ سەندنەوە بە دەست خوایە، پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەوە رەوانە نەکراوە کە زۆری پێ بهێنێ و ناچاری بکات لەسەر بڕوا هێنان، بۆ ئەوە نەنێرراوە کە مەردوم بپارێزێ لە گوناهو گومڕایی، ئەم جۆرە شتانە نە کارو فرمانی ئەوەو نە لە ژێر دەسەلاتی ئەودایە، پێغەمبەر(ﷺ) هەرچەند پلەو پایەی بەرزترە لە هەموو کەس بەلای خواوە. بەلام بەندەی خوایە و نابێ بە بەشدار بزانرێ لەو شتانەدا کە تایبەتین بە خواوە، نابێ نزیکی سنووری خوایەتی بخرێتەوەو لە سنووری بەندەیی خوا دەرکرێ. بڕواو بۆچوونی موسلمانان ئەبێ لەسەر ئەم بناغە و بنەڕەتە دارێژرێت.

ئینجاباسی هێندێ حاڵ وکردەوەی دەستەیەکی تر ئەکات - لەناو ریزی موسلمانان دا- یان ئەمانیش هەر لە ناپاکەکانن و ئەمەی کە لێرەدا باسی ئەکات حاڵ و کردەوەیەکی تریانە بێجگە لەوانەی کە لەمەوبەر باس کراون، ئەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُونَ طَاعَةٌ ﴾ ئەوانە ئەڵێن: کاری ئێمە گوێ رایەڵی یە. واتە کاتێ کە لە رووبن و هەر فەرمانێ ببیستن لە تۆ ئەی پێغەمبەر بەو جۆرە گوێ'رایەڵی خۆیان دەرئەبڕن بە بێ رەخنە و سەر لێ کردنەوە، ﴿فَإِذَا بَرَزُوا مِنْ عِندِكَ ﴾ ئینجا کاتێ کە دەرچوون لای تۆ ﴿بَيَّتَ طَآئِفَةٌ مِّنْهُمْ غَيْرَ الَّذِي تَقُولُ﴾ تاقمێك لەوان - واتە سەرۆکەکانیان - یان مەبەست ئەوەیە کۆمەڵی موسلمانان ئەوە ئەڵێن. بەلام دەستەیەك کە ناپاکە و تێکەڵی ئەوانە لە دڵی خۆیان دا - لە دەروونی خۆیان دا پیلان و بەکار ئەهێنن بۆ بەجێ نەهێنانی فەرمانەکەی تۆ و رزگار کردنی خۆیان لێ ی، یان مەبەست ئەوەیە: لە دەروونی خۆیان دا لە شەودا تەگبیری پێچەوانەی ئەوە ئەکەن کە تۆ پێی یان ئەڵێیت، بە هەر جۆرمەبەست بێت ئەواخوا پێغەمبەر(ﷺ) دڵنیاو دڵئارام ئەکات، لەگەڵ بڕواداره راستەکاندا، بەمەی کە خوا بە چاوەوەیە و ئاگادارە بە پیلانەکەی ئەوان، بێگومان هەست کردنی بڕواداران بەوە مایەی دامەزرانی دڵ و ئارامی دەروونە، چونکە ئەو کاتە هیچ مەترسی نامێنێ لەو پیلان گێرو نیاز پیسانە،

وَٱللَّهُ يَكۡتُبُ مَا يُبَيِّتُونَۖ فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٨١﴾ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَۚ وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخۡتِلَٰفٗا كَثِيرٗا ﴿٨٢﴾

---

وەك لە بارێكی تریشەوە هەڕەشەی سەخت و سامناك وەرئەگیرێ كە ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ يَكۡتُبُ مَا يُبَيِّتُونَۖ﴾ خوا ئەنووسێ هەموو ئەوەی كە ئەوان لە دەروونی خۆیان دا بڕیاری ئەدەن و پیلان بازی پێ ئەكەن ﴿فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ﴾ بەهۆی ئەوەوە چاوپۆشی بكە و پشتیان تێ بكە و تۆ تۆڵەیان لێ مەسێنە، یان گوێ یان مەدەرێ و هیچ باكت نەبێ لێ یان، چونكە خوا چارەی دەردیان ئەكات.

خوای پەروەردگار فەرمانی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) كە بە گوێرەی رووكەش و رواڵەت رەفتار بكات لەگەڵ ئەو ناپاكانەدا، نەك بە گوێرەی نیازو دەروونیان، كە هەر بەوە لە دوایی دا كوشتنی، سووك و بێ ئابڕووی كردن، بە جۆرێ هەركامیان مانەوە لە شەرمەزاری و ریسوایی دا خۆیان ئەشاردەوە، ئینجا لەگەڵ ئەو فەرمانی چاوپۆشی و گوێ پێ نەدانەدا دڵنیای كرد بە چاودێریی و پارێزگاری خۆی، فەرموی: ﴿وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ﴾ پشت بە خوا ببەستە و پاڵ بدە بە ئەوەوەو كاروباری خۆت بەو بسپێرە و حەواڵەی ئەوی بكە، ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا﴾ بەسە خوا بە وەكیل و كار پێ سپێرراو. بەڵێ بەڕاستی خوا بەسە بۆ ئەوەی كە مەردوم كاروباری خۆی پێ بسپێرێ، هەركەس خوا كار پێ سپێرراوی بێت، ئەو كەسە زیانی پێ ناگەیەنرێ، هیچ پیلان و تەگبیرێكی خراپ كاری لێ ناكات.

ئەو تاقمەی كە لە رووی پێغەمبەردا(ﷺ) لاف گوێ رایەڵ یان لێ ئەدا و كەچی كە دەرئەچوون كردەوەو رەفتاریان دژی لافەكەیان بوو، پاڵ پێوەنەری ئەوانە گومان و بێ بڕوایی یان بووە بەم قورئانە كە موعجیزەی پێغەمبەرێتی پێغەمبەرە(ﷺ)، بەڵگە و نیشانەی راستی یەتی، دەی دیارە كە ئەو گومانەش بوو گوێ نادرێ بە فەرمانەكانی خوا، جا ئەوا سەرنجیان رائەكێشێ بۆلای ئەو قورئانە و فەرمان ئەدا بە بیر لێ كردنەوەی تا هەر لە قورئانەكەدا بەڵگە و نیشانەی راستی یەكەی وەرگرن، ئینجا كە قورئان راست بوو ئەبێ پێغەمبەریش(ﷺ) راست بێت، كەواتە ئەبێ گوێ رایەڵی بكرێن، ئەفەرموێ: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ

﴿الْقُرْءَانَ﴾ ئەی ئایا ئەوانە بیر ناکەنەوە و ورد نابنەوە لە قورئان؟ واتە با ورد ببنەوە و بیری لێ بکەنەوە تا بۆیان دەرکەوێ کە لەلایەن خواوە هاتووە. ﴿وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللَّهِ﴾ ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن هەرکەسێکی ترەوە بهاتایە بێجگە لە خوا ﴿لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا﴾ بێگومان ئەیانبینی و دەستتان ئەکەوت جیاوازی و دژایەتی زۆر تیایدا، چونکە:

١- هیچ کەسێکی تر نەی ئەتوانی وێنەی ئەم قورئانە بێنێ و باسیان بکات و بیانگێڕێتەوە، بە بێ ئەوەی هیچ جۆرە درۆ و دژایەتی و پێچەوانەیی یە روو بدات، ئیتر چ لە بارەی هەواڵەکانی رابردووی کە هیچ کەس لەو سەردەمەدا ئاگای نەبووە لێ یان و مێژوویان، چ لەبارەی هەواڵەکانی داهاتووی کە لە ماوەی ژیانی پێغەمبەردا(ص) زۆربەیان بەدی هاتن بە رێکی و بەو شێوەی کە هەواڵی پێدان، چ لەبارەی گەلێ شتی نادیاریی شاراوەی ئەو کات و چەرخە تەنانەت نیازو خەتەرەی دڵ، بۆ نموونە: وەك ئەو تەگبیرو نیازە دەروونی یە کە هەواڵی پێدان لە ئایەتی پێش ئەم ئایەتەدا دەربارەی ئەو دەستە ناپاکە.

٢- هیچ کەسێکی تر نی یە بتوانێ وێنەی ئەم قورئانە بێنێ لەمەدا کە بناغە و بنەڕەت دابنێ بۆ بڕوا و عەقیدە و شەریعەت، لەگەڵ یاسای ئاداب و رەوشت و رامیاری گەل و نەتەوەکان بەبێ ئەوەی دژایەتی و ناڕێکی روو بدات لەوانە و لەفەرع و پەل و پۆکان دا.

٣- هیچ کەسێکی تر نەیتوانیوە کە وەك قورئان بدوێ لەو هەموو شتی جۆر بەجۆرە، وەك ئاسمانەکان و زەوی و باو باران و هەورو ئەستێرەکان و رژێمەکەیان، هەروەها گیان لەبەران و دەریاکان و ئەو هەموو بەڵگە و نیشانە روون و ئاشکرایانە، لەگەڵ ئەوەدا هیچ پێچەوانەیی و دژایەتی یەك نی یە لەو باسانەدا، باس و لێ دوینەکانیش لەسەر بارێکن کە گونجاو و وەرگیراون لە هەموو چەرخ و لەناو هەموو چینێك دا، ئەگەر ئەوە لەلایەن خواوە نەبوایە بە دەیان ناڕێکی و دژایەتی روویان ئەدا.

٤- ئەم قورئانە لەماوەی(٢٣) ساڵ دا هاتە خوارەوە بە بەش بەش و وەجبە وەجبە، سورەتەکانی پێك هاتن لەو بەش و وەجبەیانە لەسەر فەرمان و رێنموونی پێغەمبەر(ﷺ) وا ئەبوو چەند ئایەت و وەجبەیەك ئەهات بۆ سورەتێك، لە پاشان چەند ئایەت لە سورەتانی تر بەدوای دا، بەڵکو سورەتێك یان چەند سورەتێك ئەهات، لە

پاش ئەمانە ئایەتی سورەتە پێشووەکە نەهات و تەواو نەکرا، شتێکی ئاشکرایە لای هەمووان کە پێغەمبەر(ﷺ) نووسەرو خوێندەوار نەبوو تا بە ڕێز ئایەت و سورەتەکان دیاریی بکات و لای خۆی بە نووسین، بەڵکو لەبەری ئەکردن، بە پێی باوی ئادەمی هەرگیز ناگونجێ و دەست نادات کە ئەو هەموو شتە جیاوازە لە بیر بمێنێ و لێ ی تێك نەچێ، کەواتە ئەگەر لە خواوە نەبوایە ئەبوو ناڕێکی و تێکەڵ و پێکەڵی زۆر رووی بدایە لە قورئان دا.

٥- بە پێی باوی جیهان هەرگیز ناگونجێ کەسێکی تر کتێبێکی ئاوا گەورە و زۆر دابنێ، لەگەڵ ئەوەدا هیچ کەسێك نەتوانێ لە رووی راستی دا رەخنەی لێ بدۆزێتەوە، دەی ئەوە قورئان هات و بەری بڕی یەوە لە هەموو کەس، دوژمن بە هەموو هێز هەوڵ و تەقەلای دا و هیچی بۆ نەکرا، هەر شتێکی بە نەفامی وت دەم کوت کرا و سەری خەجاڵەتی پێ داخرا، هیچ کەسێك نەیتوانی هەواڵێکی بخاتەوە بە درۆوە، هیچ کەسێك نەیتوانی دژایەتی و ناڕێکی و نەگونجاوی بدۆزێتەوە لە هیچ وتەو باس و بڕیارێکی دا، بەڵکو تا جیهان بەرەو پێشکەوتن و زانیاری بڕوا گەورەیی و پاکی و بێ وێنەیی قورئان ئاشکرا تر ئەبێ!!

٦- هیچ بیرو باوەڕ و ڕژێم و یاسا و بەرنامەیەکی ئەم جیهانە نی یە کە بگونجێ و دەست بدات بۆ ئەوەی دامەزراو و نەگۆڕاو و هەمیشەیی بێت و بۆ هەموان بێت، بەڵام قورئان لە پاش چواردە سەدە لە یەکەمجار تەڕو تازەتر و ڕێك و گونجاو ترە، بە جۆرێ بە ناچاریی هەموو جیهان بەرەو گەڕانەوە دێت بۆ بیر و باوەڕو بەرنامەکەی قورئان!!

٧- ئەم کتێبە زۆر گەورەیە لەبارەی هۆنینەوەو داڕشتن و رەوانبێژیی یەوە بەری بڕیەوە لە هەموو قسەزان و رەوانبێژەکان – کە دوژمنیش بوون و ئەیانویست لە نەتاشیو شت بتاشن –، کە بتوانن رەخنەی لێ بگرن و وێنەی کەمترین سورەتی بڵێن، هەوڵیشیان دا و چەند وتەو وتاریان هۆنی یەوە و لە سەرەنجام دا هیچیان پێ نەکراو هەر تەریق بوونەوەو سەرشۆڕی یان بۆ مایەوە!! کەواتە ئەبێ هەر لەلایەن خواوە هاتبێ.

٨- ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن خواوە نەهاتایە ئەبوایە جیاوازی و ناڕێکی زۆر رووی بدایە تیای دا، جیاوازی و ناڕێکی لە هۆنینەوە و داڕشتنەکەی دا، بەم رەنگە هێندێکی

بـەهێز هێنـدیٚ تـر بـیٚ هێـزو لاواز، هێنـدێکی رێـك و گونجـاو لەگـەڵ هێنـدێکی تـر لەلایەکەوە، نارێك و نەگونجاو لەلایەکی ترەوە، هێندێکی روون و ئاشکرا لە گەیاندنی واتاو مەبەست دا، هێندێکی تری شاراوەو وەرنەگیرا و قۆرت و پێچ دار، وەك بە زۆری ئەم جۆرە رەخنە و لەکەیانە روو ئەدەن لە وتەو وتاری ئادەمی دا هەرچەند پلەو پایەی بەرز بێت لە زانین و قسە زانین و رەوانبێژیی دا، جیاوازی و نارێکی لەو بەرنامەی کە رای ئەگەیەنیٚ، بەرنامەی پەروەردەکردنی دەروونی ئادەمی، بەرنامەی هۆنینەوە و رێك و پێك کردنی کارو کردەوەی ئادەمی بۆ هەموو چین و چەرخەکانی، بەرنامەی راست کردنەوەی بۆچوون و زانینی ئادەمی، بەرنامەی رێکخستن و رێك و پێك کردنی ئەم ئادەمی یە و لابردنی تارمایی و قەبارەی نارێکی و دژایەتی لەگەڵ ئەم بوونەوەرەی کە ئەم ئادەمی یەی تیا ئەژی، کە لەبەر نەفامی و تێنەگەیشتن ئەو تارمایی و قەبارە نارێکە ئەکەوێتە بەرچاو، ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن خواوە نەهاتایە ئەم جۆرە جیاوازی و نارێکی یە بە زۆری روویان ئەدا، بەڵام ئەوە قورئانەکەی خوا لەبەر دەست و بەرچاودایە هیچ ناحەز و دوژمنێك منەتی نەبیٚ بگەڕیٚ و ورد ببێتەوەو هەوڵ بدات بۆ دۆزینەوەی هەرکام لەو رەخنە و لەکەیانە و هەر جۆرە لەکەو رەخنەیەکی تر!! کەواتە هەرکەسێك کە بێبەش نەبیٚ لە ژیریی و مرۆڤایەتی با بێتە پێشەوە و بڕوا بێنیٚ بەم قورئانەو بەو کەسەی ئەم قورئانەی نارد و ئەو کەسەی کە ئەم قورئانەی هاتە سەر.

ئینجا حاڵ و باری دەستەیەکی تر نەخشە ئەکێشیٚ، یان باسی کردەوەیەکی نارێکی دەستەیەکی تر ئەکات کە لەناو موسڵمانەکان دا بوون کە ئەو جۆرە کردەوەیە زیانی زۆرە و زۆرجاریش روو ئەدا و دووبارە ئەبێتەوە، کەواتە پێویستە باس کردن و جڵەوگیریی کردن لیٚ ی، ئیتر ئەم دەستەیە لە ناپاکەکان بووبن وەك لە(ئیبن و عباس و ضحاك و ئەبو معاذ) ەوە ریوایەت کراوە، یان لە بڕوا لاوازەکان وەك(حسن) و زۆربەی زانایانی تەفسیر ئەفەرمون. یان لە هەردوو تاقم بووبن وەك(ئیبن و عطية) ی لەسەرە، لەسەر هەربار ئەمانە کەسانێك بوون قسەیان لەدەم دا نەئەوەستا و هەر هەواڵێکیان پیٚ بگەیشتایە - خۆش بوایە یان ناخۆش - بلأویان ئەکردەوە،

وَإِذَا جَآءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ ٱلْأَمْنِ أَوِ ٱلْخَوْفِ أَذَاعُوا۟ بِهِۦ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ

---

ئەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا جَآءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ ٱلْأَمْنِ أَوِ ٱلْخَوْفِ أَذَاعُوا۟ بِهِۦ ﴾ کاتێ بێت بۆ ئەوانە و پێ یان بگات هەواڵێك لەبارەی ئاسایش و خۆشی و سەرکەوتنەوە، یان لە بارەی بێ ئارامی و بیم و ترس و ناخۆشی یەوە، بڵاوەی پێ ئەکەن و بڵاوی ئەکەنەوە، ئیتر ئەو هەواڵە خۆش یان ناخۆشە سەبارەت بەو لەشکرە بوو بێت کە دەرئەچوون بۆ غەزا وەك هێندێك ئەفەرمون: یان مەبەست گشتی یە و سەبارەت بە هەر شتێك کە ئەو جۆرە کارانە پەیوەندی یان بە گشتی یەوە هەیە، وەك هێندێکی تر ئەفەرمون. بێگومان ئەو دەم نەوەستان و بڵاوکردنەوە لە چەند بارێکەوە زیانی هەیە:

١- ئەوە نیشانەی بێ سەرو پێ ی و بێ رژێمی یە کە هەر کۆمەڵ و لەشکرێك ئەوەی تیا بێت سەر ناکەوێ و ناگات بە ئامانج.

٢- ئەو هەواڵە ئەگەر خۆش بێت ئەبێت بەهۆی پاڵ لێدانەوە و بێ باکی هێندێ کەس لە دوژمن، ئەو کاتە وریایی و ئامادەیی یان نامێنێ بەرامبەر دوژمن، هەرچۆنێ ئەگەر هەواڵێکی سامناك و دڵتەزێن بێت ئەبێت بەهۆی بێ هێزی و لاوازیی و دڵ شکانی دەروونی هێندێ کەس کە هەرکام لەو دووانە مایەی ناڕێکی و تێك چوونی ریزی موسڵمانانە و بە قازانجی دوژمن تەواو ئەبێ.

٣- ئەو هەواڵانە کە بە سادەیی و بێ سەرو پێ ی لەدەم دەرچن، درۆو زیادە رەویی یان تیا ئەکرێ کە درۆیش شتێکی پیسە و شایستەی موسڵمانان نی یە، بێجگە لەوەیش ئەو درۆو زیادە رەوی یانە کە لە پاش دا دەرکەوتن ئەبن بەهۆی دوودڵی و نەمانی بڕوا بە قسەی یەکتر کە ئەوەش دەردێکی کوشندەیە لەناو گەل و کۆمەڵ دا.

٤- هێندێ هەواڵ نهێنی یە و نابێ بڵاو بکرێتەوەو هەموو کەس و گشتی ئاگادار بکرێن پێ ی بە تایبەتی پێویستە شاردنەوەی لە دوژمن، کەواتە ئەگەر جڵەوگیریی نەکرێ دەم نەوەستاوان ئەو هەواڵانە ئاشکرا ئەکەن، ئەو کاتە بەرژەوەندی گشتی ئەڕوا و بە زیانی موسڵمانان تەواو ئەبێ.

بەهەرحاڵ ئەو دەم نەوەستاوانە نیشانەی بێ رژێمی و بێ سەرو پێ ی یە، یان نیشانەی نەویستن و ناڕەزایی یە بە سەرکردایەتی سەرکردەی موسڵمانان یان نیشانەی هەردووەکەیە، وا دەرئەکەوێ کە لەو کاتەدا کۆمەڵ و لەشکری موسڵمانان ئەو دوو نەخۆشی یەی تێدا بووبێ، بەهۆی ئەوەی کە چەند تاقم و تیرەی تێدا بووبێ کە رادەی بڕواو راستی و لێزانی و تێگەیشتنیان جیاواز بووبێ، جا لەبەر ئەوە قورئان دەست نیشانی بۆ کرد و رێنموونی موسڵمانانی کرد بۆ رێگەی راست: فەرموی: ﴿وَلَوۡ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ﴾ ئەوانەی کە ئەو هەواڵەیان پێ گەیشتبوو، ئەگەر هەواڵەکەیان بگێڕایەتەوە بۆلای پێغەمبەرو حەواڵەی ئەویان بکردایە، کاتێ کە ئەویان لەگەڵ بوایە، ﴿وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنۡهُمۡ﴾ بۆلای کار بەدەست و فەرماندە کاتێ خۆیان یان ئەوانەی کە لێزان و کارزان و بڕوا پێ کراون و پرس و رایان پێ ئەکرێ لە کاروباردا، کە لەو چەرخەدا بریتی بوون لە هاوەڵە گەورەکان، لەپاش ئەوان ئەوانە لە ئیسلام دا پێ یان ئەوترێ:(اهل حل و عقد) بە گوێرەی تازە ئەتوانین بڵێین(مجلس شوری و پەرلەمان). ئەگەر ئەوانە بەو جۆرەیان بکردایە و خۆیان لێ ی بێ دەنگ بوونایە ﴿لَعَلِمَهُ﴾ بێگومان ئەو کاتە هەواڵەکە و تەگبیرو چارەسەرەکەی ئەزانی. ﴿ٱلَّذِينَ يَسۡتَنۢبِطُونَهُۥ مِنۡهُمۡ﴾ ئەوانەیان کە ئەتوانن هەواڵەکە بزانن لەسەر بارە راستەقینەکەی خۆی و ئەتوانن وەری گرن و دەری بهێنن لە بنج و بنەوانەوە، واتە ئەگەر ئەو دەم نەوەستاوانە بەو جۆرەیان بکردایە کە دەست نیشانی بۆ کرا، بێگومان پێغەمبەر و ئەوان بە شتەکەیان ئەزانی و ئەو کاتە چارەسەر و تەگبیریان ئەکرد کە چۆن بکرێ چاکە و بەرژەوەندی لەوەدایە بڵاوە بکرێ بەو هەواڵە یان نا؟ کەواتە کارو پیشەی سەرباز ئەبێ ئەوە بێت کە هەر هەواڵ و دەنگ و باسێکی ئاوای پێ گەیشت دەست بەجێ بیگەیەنێ بە کاربەدەست و فەرماندەکەی، نەک ئەوەی کە بێ پرس بڵاوەی پێ بکات و بیگێڕێتەوە لەناو هاوڕێکانی دا یان بۆ کەسانێك کە هیچ کارو پەیوەستی یەکیان نی یە بەو هەواڵەوە، چونکە سەرکردایەتی یە بڕوادارەکەی ئەتوانێ باری راستەقینە وەرگرێ، ئەتوانێ بەرژەوەندی دیاریی بکات بۆ کارە گشتی یەکان، ئەم وتەو فەرمودەیە بە سێ جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە، وەك بە درێژیی لە کتێبەکانی تەفسیردا هەن، ئەو جۆرانەش هەر ئەگونجێن، بەلام بڕوام بەم جۆرە بەهێزتر بوو کە کردم بە تەفسیری. ئا بەو جۆرە قورئان مەردوم پەروەردە ئەکات، بەم رەنگە ئەنێژێ لە دەروونی دا بڕواو دۆستایەتی و راستی لەگەڵ سەرکردایەتی یە بڕوادارەکەی دا، رژێمی سەربازێتی فێر ئەکات.

وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ لَٱتَّبَعۡتُمُ ٱلشَّيۡطَٰنَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٨٣﴾ فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَۚ وَحَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأۡسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ وَٱللَّهُ أَشَدُّ بَأۡسٗا وَأَشَدُّ تَنكِيلٗا ﴿٨٤﴾ مَّن يَشۡفَعۡ شَفَٰعَةً حَسَنَةٗ يَكُن لَّهُۥ نَصِيبٞ مِّنۡهَاۖ وَمَن يَشۡفَعۡ شَفَٰعَةٗ سَيِّئَةٗ

ئینجا سەرنجی بڕواداران ڕائەکێشێ بۆلای ئەو بەهرە و میهرەبانی یەی کە خوا کردی لەگەڵیان کە ڕێی ڕاستی خۆی نیشاندان، تەمێ و ئامۆژگاری کردن تا لای دان لە شوێن کەوتنی شەیتان، ئەفەرموێ ﴿وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ﴾ ئەگەر بەهرەو میهرەبانی خوا نەئەبوو بەسەرتانەوە بەو هەموو ڕێنموونی و ئامۆژگاری یە ﴿لَٱتَّبَعۡتُمُ ٱلشَّيۡطَٰنَ إِلَّا قَلِيلٗا﴾ بێگومان شوێنی شەیتان ئەکەوتن و پەیڕەویتان ئەکرد مەگەر کەمێك، کەمێك لە ئێوە کە ئەوانەن لەسەر سروشت و هەست و هۆشێکی پاك دروست کراون، یان کەمێك لە شوێن کەوتن، واتە شوێنی شەیتان ئەکەوتن لە هەموو کردەوەکانتان دا مەگەر کەمێك نەبێ.

لە پاش ئەوەی فەرمانی دا بە تێکۆشان و جەنگ و کوشتار، زۆر بە گرنگی هانە و هونەی دا لەسەری، باسی کەم مەیلی و حەز نەکردنی ناپاکەکانی کرد، بەڵکو هەوڵ و تێکۆشانیان لە سست کردن و خاوکردنەوەی دڵی بڕواداران لێ ی، لەپاش ئەوانە ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ سەر فەرماندان بە جەنگ و کوشتار، بە جۆرێ دڵی هەموو بڕوادارێك ئەهێنێتە سۆزو پەرۆش، بەم ڕەنگە رووی فەرمانەکە ئەکاتە شەخسی پێغەمبەر(ﷺ) و وا نیشان ئەدات کە ئەبێ هەڵسێ بەو کارە با خۆی تەنیا بێت و هیچ کەسێکی تر یارمەتی نەدات، ئەفەرموێ: ﴿فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ واتە کاتێ کە ناپاکەکان و دڵ لاوازەکان بەو جۆرەن و نایانەوێ جەنگ بکەن، یان ئەگەر ئەوان جەنگ ناکەن دەی تۆ - ئەی پێغەمبەر - جەنگ بکە لە ڕێی خوادا ﴿لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَۚ﴾ لە کاتێك دا داوات لێ ناکرێ بێجگە لە کردەوەی خۆت و پرسیاری کردەوەی ئەوانت لێ ناکرێ ﴿وَحَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ﴾ هانی بڕواداران بدە، واتە پێویستە لەسەرت جەنگ کردن لە ڕێی خوادا بە تەنیاش بێت، پێویستە لەسەرت هاندانی بڕوادارانیش لەسەر ئەو ئایەت و فەرمانانەی کە هاتوون لەلایەن خواوە، چونکە ئەوەش بەشێکە لەو ڕاگەیاندنەی کە پێویستە لەسەرت، ئینجا ئەگەر بڕواداران گوێ ڕایەڵ نەبوون، ئەواخۆیان تاوانبار و زیانبار ئەبن، تۆ زیانبار نابی و پرسیاری نافرمانی ئەوانت لێ ناکرێ.

لە پاش فەرماندان ئینجا دڵخۆش ئەکات و بەڵێن ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأْسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ ئومێدو چاوەڕوانی هەیە کە خوا بەرگری هێزی ئەوانە بکات کە بڕوایان نەهێناوە، واتە خوا بەڵێن ئەدات بەوە، چونکە وتەی ﴿عسى، لعل﴾ لەلایەن خواوە بەڵێنی تەواوە، وەك بەدیشی هێنا لەو سەردەمەدا کە قورەیش ترسیان لێ نیشت و زاتیان نەبوو بێن بەدەم داد و پەیمانەکەیانەوە کە لە پاش رووداى احد بڕیار بوو بۆ ساڵی دوایی جارێکی تریش بێنەوە بۆ جەنگ کردن، لە بەدری دووەم دا، ئینجا کە هاتن و گەیشتنە(مر الظهران) خوا ترسی خستە دڵیان و گەڕانەوە بۆ مەککە، بەلاّم پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) بە لەشکرەکەیەوە هاتنە(بدر) و هەشت رۆژ مانەوەو هەر ماڵێکی بازرگانی یان پێ بوو فرۆشتیان و بەخێرو خۆشی یەکی زۆرەوە گەڕانەوە بۆ مەدینەی منەوەرە سوپاس بۆ خوا. ﴿وَٱللَّهُ أَشَدُّ بَأْسًا وَأَشَدُّ تَنكِيلًا﴾ خوا بەتین ترە لە بارەی هێزو دەسەلاّتەوە، بەتین ترە لەبارەی تۆڵەسەندن و سزادانەوە، بەجۆرێ کە مەردومی تری پێ ژێر بکات، واتە هێزی خوا لە هەموو هێزێك بەتین ترە، سزادان و تۆڵەسەندنی بەتین ترە لە هەموو تۆڵە و سزادانێکی تر، خوا پەنامان بدات بە میهرەبانی خۆی لە تۆڵە و سزادان.

بە بۆنەی هاندانی بڕواداران بۆ جەنگ و تێکۆشان لەلایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ)، بە بۆنەی باسی ئەوانەی کە دڵی بڕوادارانیان خاو ئەکردەوە، بە بۆنەی ئەو دوانەوە یاسایەکی گشتی ئەهێنێ کە هەر ئامۆژگاری و هەوڵ و هاندان و کۆمەکی یەك ئەگرێتەوە، ئەفەرموێ: ﴿ مَّن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً حَسَنَةً﴾ هەرکەسێك داواو واسیتەگەری یەکی چاك بکات، بەم رەنگە بۆ شتێك بێت کە رەزامەندی و خۆشنوودی خوای تیا بێت، لەبەر خوایش بیکات. وەك هەوڵدان بۆ دەست کەوتن و گەیاندنی مافێکی شەرعی بە خاوەنی، یان بەرگری زیان و ستەمێك لە هەرکەسێك کە شیاوی ئەوە بێت، کەواتە تکاو لاڵەی بۆ مەردومان لە رۆژی دوایی دا بەشێکە لەوە. ﴿يَكُن لَّهُۥ نَصِيبٌ مِّنْهَا﴾ بۆ ئەو کەسە هەیە بەشێکی زۆر لە ئەجرو پاداشتەکەی، ﴿وَمَن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً سَيِّئَةً﴾ هەرکەسێك داواو واسیەتەگەری یەکی بەدو خراپ بکات، بەم رەنگە بۆ شتێك بێت کە خەشم و نارەزایی خوای تیا بێت، وەك هەوڵ دان بۆ بەرگری تۆڵەیەکی شەرعی، یان ژێر پێ کردنی مافێك، یان دەست خستنی هەرکەسێك و هەر شتێك کە رەواو شایستە نی یە بۆی،

يَكُن لَّهُۥ كِفۡلٞ مِّنۡهَاۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقِيتٗا ﴿٨٥﴾ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٖ فَحَيُّواْ بِأَحۡسَنَ مِنۡهَآ أَوۡ رُدُّوهَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ حَسِيبًا ﴿٨٦﴾

---

﴿يَكُن لَّهُۥ كِفۡلٞ مِّنۡهَا﴾ بۆ ئەو کەسە هەیە بەشێکی مسۆگەر لە تاوان و خراپەکەی کە هاوکێش و سەربەسەری بێت بە بێ کەم و کوڕی. کەواتە ئەو کەسەی کە ئامۆژگاری ئەکات و هان ئەداو کۆمەکی ئەکات لەسەر جەنگ لە ڕێی خوادا، بۆ ئەو کەسە هەیە لە ئەجرو پاداشتی ئەو هاندان و بانگ کردنە و بەرهەمەکانی، ئەو کەسەی کە دڵی مەردوم خاو ئەکاتەوە و هانی ئەدا لەسەر وازهێنان لە تێکۆشان و جەنگ لە ڕێی خوادا، بۆ ئەو کەسە هەیە تاوان و تۆڵەی ئەو وتارو کردارەی و هەموو سەرەنجام و بەرهەمەکانیان. ئەمە یاسا و بیرو باوەڕێکی گشتی یە بۆ هەموو داوا و واسیتە گەری یەکی چاك و شەرعی و بەد و بێ شەرعی، بە بۆنەی ئەو دوو شتەوە هێنای کە ئاماژەمان بۆ کردن لەسەرەتای تەفسیری ئایەتەکەدا، ئەوەش بە پێی باوی بەرنامەکەی قورئان، کە یاسای گشتی دەرئەکات و ئەیهێنێ بە بۆنەی ڕووداوی تایبەتی یەوە، شتێ تاك و تایبەتی پەیوەست ئەکات بە بیرو باوەڕی گشتی یەوە، هەرچۆنێ هەموو شتەکان پەیوەست ئەکات بە خواوە و ئەیانگێڕێتەوە بۆلای خوا، وەك لێرەدا ئایەتەکە دوایی ئەهێنێ بەم وتە پیرۆزە: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقِيتٗا﴾ خوا بە بێ سەرەتا و هەمیشە توانا و دەسەڵات دارە بەسەر هەموو شتێك دا، یان ئاگادار و پارێزە، کەواتە هەرکەس شایستەی هەر بەشێك بێ پێی ئەدات، هەرکەس شیاوی هەر شتێك بێت بۆی ئەنجام ئەدا و فەراهەمی ئەهێنێ، لەپاش ئەوەی فێری کردین و هەواڵی پێداین بە واسیتە گەری شەرعی و ناشەرعی کە ئەوە یەکێکە لە هۆی پەیوەستی نێوان مەردوم، ئینجا باوی ڕێزگرتن و سلاوومان فێر ئەکات دەربارەی یەکتر ئەمیش یەکێ ترە لە هۆی پەیوەندی و پەیوەستی، یەکێکە لە داواو واسیتەگەریی چاك، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٖ﴾ بێگومان باوێك لە باوەکانی مرۆڤایەتی هەر لە کۆنەوە ئەمە بوو کە مەردومان لەکاتی گەیشتن بە یەك، بە ڕێزەوە وتەیەکی شیرین ئاراستە ئەکەن بۆ یەك، وەك لەناو عەرەب دا باو

بووه لە كۆنەوە ئەیانوت: انعم صباحا یان مساء، صباح الخیر یان مساء الخیر. یان هەر وتەیەكی تر بە هەر زمانێ تر، وەك رۆژباش و شەوباشی ناو كورد كە ماوەیەكە كراوە بە باو، بەلاَم كە ئیسلام هات – كە ئایینی ئاشتی و ئارامی و میهرەبانی یە – بڕیاری دا كە ئەو وتە شیرینە یان بریتی بێ لە سلاَو كردن لە یەكتر، كەواتە لەبەر ئەوە لە تەفسیرەكەی دا ئەلَێن: كاتێ سلاَوتان لێ كرا ﴿فَحَيُّواْ بِأَحۡسَنَ مِنۡهَآ﴾ ئێوەیش وەلاَم بدەنەوە بە چاكترو شیرین تر لە سلاَوی سلاَو كەران. بەم رەنگە ئەگەر سلاَو كەر وتی: السلام علیكم. لە وەلاَم دا بگوترێ: وعلیكم السلام ورحمة الله. ئەگەر ئەو وتی: السلام علیكم ورحمة الله، لە وەلاَم دا بگوترێ: وعلیكم السلام ورحمة الله و بركاته. وەك بەو جۆرە لە حەدیس دا هاتووە و بەناوبانگە لە ناو زانایان دا، ﴿أَوۡ رُدُّوهَآ﴾ یان لە وەلاَم دا وێنەی وتەی سلاَوكەر بلَێتەوە بۆی، واتە پێویستە لەسەرتان وەلاَم دانەوە بە یەكێ لەم دوو جۆرە، بەلاَم بێگومان یەكەم چاكترە لەبەر ئەوە ئەو پێش خراوە، لەسەر دیمەن و روالَەتە گشتی یەكە ئەلَێن: كاتێ رێزگیران بە هەر وشەیەك، ئێوەش رێزی رێزگر بگرن و وەلاَمی بدەنەوە بە چاكتر لە وتەكەی خۆی یان بە وێنەی وتەكەی كە رێز دەبێت، بە درێژیی زانایان باسیان كردووە كە سلاَو لەسەر كێ دەكرێ و ناكرێ، كێ لە یەكەمجارەوە سلاَو ئاراستە بكات، بە درێژیی ئەمانە باس كراون، كەواتە پێویست نی یە ئێمە لێرەدا ئەو باسە بكەین، رووكەش و روالَەتی ئایەتەكە وا نیشان ئەدات كە هەرچۆنێ وەلاَم دانەوەی سەلام پێویستە، هەروەها وەلاَم دانەوەی هەر نزاو وتەیەكی شیرینی تریش كە ئاراستەی مەردوم بكرێ هەر پێویستە، بێگومان وەلاَم نەدانەوە مایەی خەشم و دلَ رەنجاندنە، كەواتە ئەبێ پەیڕەوی رووكەش و روالَەتی ئایەتەكە بكرێ لەسەر بارە گشتی یەكە. ئەبێ بترسین و پەیڕەوی ئەم فەرمانە بكەین لەسەر بار و شێوە گشتی یەكەیشی، چونكە ئایەتەكە دوایی پێ ئەهێنێ بەم وتە سامناكە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ حَسِيبًا﴾ بەڕاستی خوا لێ پرسەرەوەو چاودێرە لەسەر هەموو كردەوەیەكیان كە یەكێ لەوانە ئەم وەلاَمی رێزو سەلامەیە كە لەم ئایەتەدا فەرمانی پێدا، لە كۆتایی ئەم ئایەتەدا با هێندێك بوەستین لە بەردەمی دا و بیر بكەینەوە لەم خالاَنەی كە ئەیانخاتە دلَمان و سەرنجمان رائەكێشێ بۆیان:

١- ئیسلام ئەیەوێ گەلی موسڵمان لە هەموو بارو روویەکی یەوە شێوەو نیشانە و دروشتی تایبەتی خۆی ببێ، ئەوەتا هەرچۆنێ عەقیدە و بیرو باوەڕ و رژێم و یاسای تایبەتی خۆی هەیە هەروەها ئەیەوێ رێزو وتەی رێزیشیان هەر تایبەتی بێت. وەك دەست نیشانمان بۆ کرد بۆ ئەوە بە درێژیی لە سورەتی(البقرة) دا لە باسی گۆڕانی رووگە و دیاریی کردنی رووگەی تایبەتی بۆی، با سەرنجی ئەو باسە بدرێ.

٢- ئیسلام بە هەمیشەیی هەوڵ ئەدات بۆ بەهێزکردنی پەیوەنی خۆشەویستی و خزمایەتی لە نێوان ئەندامەکانی گەلی موسڵمان دا کە بڵاو کردنەوەی سەلام و وەڵام دانەوەی بە چاکترو شیرین تر دەستێکی باڵایان هەیە لە داهێنان و بەهێزکردنی ئەو پەیوەندی یانەدا، وەك بە ئاشکرا هەست ئەکرێ بەو بەرهەمە گرنگە.

٣- هێنانی ئەم ئایەتی سەلامە لە ناو بەناوی ئەم ئایەتانی جەنگ و کوشتارە لە پێش و پاشەوە، هێنانی ئەم ئایەتە نەسیم و هەناسەیەکی نەرم و ناسك و بۆن خۆش دەرئەخات، رەنگە دەست نیشان بێت بۆ یاسا بنەڕەتی یەکەی ئیسلام کە بریتی یە لە ئاشتی و ئارامی و نەهێشتنی بیم وترس، چونکە لە راستی دا ئیسلام ئایینی ئاشتی ماڵ و خێزان، ئارام و ئاشتی گەل، لە پاش دا ئارامی و ئاشتی هەموو جیهان و جیهانی یان، کە ئەم ئارام و ئاشتی یەش تەنها لە ئیسلام دا هەیە و هەر لە بەدی هێنانی بەرنامەی ئیسلام دا دەست کەوت ئەبێ!! بێگومان بڕوا بە تاك و تەنیایی خوا یەکەم بنەڕەتە بۆ هەموو ئایین و شەریعەتەکانی خوا و هەموو بڕیارو کاروبارێك ئەبێ سەرچاوەکەی ئەو بیرو باوەڕە بێت، ئینجا بڕوا بە رۆژی دوایی و تۆڵە و پاداشتەکەی زۆر بەکارو بەهێزەو پاڵدەرێکی گرنگە بۆ مل کەچی و گوێ رایەڵی کردنی بڕیارەکانی خوا، جا بەهۆی ئەوەوە ناو بەناو و بە زۆریی قورئان ئەو دوو بنەڕەت و بەندە گرنگە ئەهێنێ و سەرنجیان بۆ رائەکێشێ تا بەندەکانی خوا مل کەچ بکەن بۆ ئەو فەرمان و بڕیارانەی کە لەگەڵ ئەم دوو بەند و بنەڕەتەدا هاتوون بە تێکەڵی،

جا لەسەر ئەو باوە ئەوا لێرەدا چەند فەرمان و بڕیارێك ئەهێنێ و ئەو دوو بەندو بنەڕەتە ئەكات بە سەرەتا بۆیان و ئەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ ئەو كەسەی كە ناوی(الله) یە هیچ خوایەك نی یە بێجگە لەو ﴿لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ سوێند بەخوا كۆتان ئەكاتەوە لە رۆژی دوایی دا، رۆژی هەڵسان و راست بوونەوەتان بە زیندوویی لە گۆڕەكانتان بۆلای پرسیار و حیسابی ئەو رۆژە كە ﴿لَا رَيۡبَ فِيهِۗ﴾ هیچ گومان و دوو دڵی یەك نی یە لەو رۆژەدا، واتە هاتنی ئەو رۆژە راستە و هیچ جێی گومان و دوودڵی نی یە، چونكە خوا بەڵێن و هەواڵی داوە بە هاتنی ﴿وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا﴾ ئایا كێ لە خوا راست ترە لەبارەی قسە و باس و هەواڵەوە، واتە هیچ كەس، چونكە قسە و هەواڵی خوا لە زانینی تەواوەوە هاتووە و دەست نادا بۆ لەیاد چوون و لێ گۆڕان و درۆو دەلەسە، بێجگە لەوەیش لەیاد چوون و لێ گۆڕان و دەلەسەیە بە هیچ رەنگ ناگونجێ لەگەڵ خوایەتی دا، بەلاَم هەر قسە و هەواڵێك كە لەلایەن خواوە نەهاتبێ ئەگونجێ و دەست ئەدات بۆ دەلەسە و لەیاد چوون و لێ گۆڕان. بەڵێ، وەك لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ كرد یەكەم هەنگاوی بەرنامەی ئیسلام لە تاك و تەنیایی خواوە دەست پێ ئەكات، ئیتر ئایا ئەو بەرنامەیە لەبارەی پەروەردە كردنی دەروونەوە بێت یان لەبارەی راست كردنەوەو راگیر كردنی گەل و كۆمەڵ و دانانی یاسا و رێك و پێك كردنی یەوە، ئایا ئەو یاسایانە لەبارەی كاروباری ناوخۆی كۆمەڵی موسڵمانانەوە بێت یان لەبارەی كاروباری دەرەوە بێت، كە لەسەر ئەوە گەلی موسڵمان كردەوەو رەفتار بكات لەگەڵ ئەو گەل و كۆمەلاّنەدا، جا لەبەر ئەوە ئەم یەكەم هەنگاوەی كرد بە بنەڕەت و سەرەتا بۆ چەند ئایەتێك كە چەند یاسایەكی گرنگیان تیایە سەبارەت بە كردەوەو رەفتار لەگەڵ ناوخۆ و دەرەوەی گەل و كۆمەڵی موسڵمان، هەروەها بەرنامەی ئیسلام دەست پێ ئەكات لە بڕوا بە رۆژی

دوایـی و کۆکردنـەوەی بەنـدەکانی خـوا بـۆ حیساب و پرسـیار لـە کردەوەکـانی جیهانیـان، دەست پێ ئەکات لەم بنەڕەت و بەندەیشەوە، بۆ پەروەردەکردن و ئامادەکردنی دەروون، بۆ هەڵگیرساندنی هەست و سۆز و پەرۆش بەرامبەر یاسا و بڕیارو فەرمانەکانی خوا، وریا کردن و بێدارکردنەوەی بەرامبەر هەموو کارو کردەوەکانی ئەم ژیانی جیهانە  کە لەم رۆژەدا تاقی کردنەوە هەیە و لە رۆژی دوایی دا سەرەنجام و بەرهەم وەرئەگیرێ، بێگومان ئەم بڕوا و هەست و هۆشە زۆر کارکەرو ئیش کەرێکی بەتین و بەهێزە لە دەروونی دا، ئەو یاسا و بڕیارانەی کە لەم چەند ئایەتانەدا دێن بەشێکن لەو هەموو یاسا و بڕیارانەی کە لەچەند سورەتێکی تردا هاتوون و بە هەموویانەوە یاسا و قانونێکی تێرو تەواون بۆ رێك و پێك کردن و هۆنینەوەی کردەوەو رەفتاری کۆمەڵی موسڵمان، لەگەڵ هەموو میری و کۆمەڵ و لەشکرەکانی تر، بە پێی هەموو رووداو و بەسەرهاتەکانیان: جەنگ کەر بن، یان کۆتایی هێنەر بن، یان دۆست و سوێند خواربن، یان بێ لایەن بن، یان دۆست و پەیوەست بن بە دوژمن و جەنگ کەرەوە یان سوێند خوار بن لەگەڵ دوژمن و جەنگ کەر، یان بێ لایەن لەگەڵی... هتد.

ئەم یاسا و قانوونە تێرو تەواوە ئیسلام دای هێنا لە یەکەمجاری مێژووی جیهان و ئادەمی یەوە بۆ ئەو مەبەستە گرنگە، نەك هەر تیرو شیر لە ئارادا بێت و هەر بەوە رەفتار کرێ وەك باو بووە لە پێش هاتنی ئیسلام دا، لە پاش هاتنیشی ئەورووپا هەر بەو جۆرە نارەوا رەفتاری ئەکرد و بڕوای هەر بەوە بوو تا چەرخی حەڤدەهەمی زایینی و یازدەهەمی کۆچی، لەوێ دا بیرێکیان کردەوەو روویان کردە ئەوە رەفتار بە یاسا بکەن، بڕیاریان لەسەردا، بەڵام هەر بە قسە و نووسینی رووت و لە ناچاری دا بەهۆی جەنگ و ئاژاوەی زۆر کە بەرپا بوو لە نێوان دەوڵەتە بەهێزەکان دا کە هاوکێشی یەکتر بوون لە هێزو دەسەڵات دا، بەڵام هەرکاتێ دەسەڵات و زۆر پەیدا بوو و هاتە ئارا، ئەو کاتە تووڕ ئەدرێ و وەك پەندی

پێشینانی کوردی ئەڵێ: هەنگ و هەنگی تەور تیژە! ئەوە شتێکە مێژوو شایەتە و بە چاوی خۆیشمان گەلێکمان بینی و ئەبینین!! بەڵام ئیسلام کە ئایینی خوایە و هاتووە بۆ بەدی هێنانی هەق و راستی، هەر لە یەکەم چەرخی خۆی کە لە چەرخی حەوتەمی زایینی دا بوو، لەلایەن خۆیەوە و بەبێ ناچاریی، ئەو یاسا و بنەڕەتانەی داهێنا بۆ ئەوەی بەکاری بێنێ، بۆ ئەوەی رەفتاری پێ بکات و بە پێی ئەو یاسایانە گەلی موسڵمانی خۆی پەیوەندی ببێ لەگەڵ هەموو کۆمەڵ و لەشکرەکانی تردا، تا بەهۆی ئەوەوە ئاڵای دادو دادپەروەریی هەڵکات و بەرزی بکاتەوە بەسەر جیهان و جیهانی یان دا، ئیتر هەرچەند کۆمەڵ و میریی یەکانی تر بەو جۆرو شێوەیە کردەوەو رەفتارێ نەکەن لەگەڵ کۆمەڵ و میریی ئیسلام دا.

لێرەدا پێویستمان نی یە بە هێنان و باسی هەموو ئەو بیرو باوەڕە و یاسایانە، چونکە ئەوە باسێکی سەربەخۆی ئەوێ کە یەکێکی زۆر لێزان بە تایبەتی باس و نامەیەکی بۆ تەرخان بکات، بەڵکو لێرەدا باسی هەر ئەو ئەندازەیە ئەکەین کە لەم چەند ئایەتە وەرئەگیرێن، کە ئەوانەش پەیوەندی یان هەیە بەم چەند تیرەو بەرەوە:

١- ناپاکەکانی دەرەوەی مەدینە.

٢- ئەوانەی کە پەیوەستن بە کۆمەڵێکەوە کە پەیمانیان هەیە لەگەڵ موسڵمانان دا.

٣- ئەو بێ بڕوایانەی کە بێ لایەنن و بێزارن لە جەنگ کردنی موسڵمانەکان لەگەڵ کۆمەڵ و نەتەوەکەیان یان ئەمان لەگەڵ ئەوان.

٤- ئەوانەی کە لاقرتی ئەکەن بە ئایین و عەقیدەکەیان، کە هاتنە مەدینەو موسڵمانێتی دەرئەبڕن و کە گەڕانەوە بۆ مەککە بێ بڕوایی دەرئەبڕن.

٥- ئەو موسڵمانانەی کە بە هەڵە یان بە دەستی قەست مەردوم بکوژن.

چەند حوکم و بڕیارێکمان بە روونی دەست ئەکەوێ بۆ ئەمانەی کە باس کران لەم چەند ئایەتانەی داهاتوودا کە بەشێکن لەو بیروباوەڕە دەوڵەتی یانە. لە یەکەمجارەوە باسی ناپاکەکان ئەکات و بێزاری دەرئەبڕێ لە بڕواداران کە بەرامبەر ئەو ناپاکانە گورج و گۆڵ و یەك قسە و یەك بڕیار نین، بەڵکو دووبەرەکین لەگەڵ ئەوەدا کاروباری ئەوانە روون و ئاشکرایە، ئەفەرموێ: ﴿فَمَا لَكُمْ فِي ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِئَتَيْنِ﴾ واتە ماتووڵ خوا فەرمانی داوە بە جەنگ کردن لە رێی ئەودا، هەڕەشەی کرد لەوانەی کە ئاواتە خوازن بۆ ئەوەی فەرمان دان بە جەنگ و کوشتار دواخرایە، هەروەها هەڕەشەی کرد لەوانەی کە دوا ئەکەون لە جەنگ کردن یان دڵی مەردوم خاو ئەکەنەوە لێ ی، ماتوڵ تەنها خوایەك هەیە و هەموو کۆئەکاتەوە لە رۆژی دوایی دا بۆ پرسیارو تۆڵەو پاداشت، ماتووڵ کارەکە بەو جۆرەیە ئەبێ هەر فەرمانبەریی و گوێ رایەڵی ئەو خوایە بکرێ، کەواتە ئایا چی هەیە بۆ ئێوە لەبارەی ئەو ناپاکانەوە کە دووبەرەکین و دوو دەستە و دووبەشن؟ چی هەیە بۆ ئێوە کە بڕیاری تەواو نادەن لەسەر بێ بڕوایی یان ﴿وَٱللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓاْۚ﴾ لە کاتێك دا کە خوا وەری گێڕاونەتەوە بۆ بێ بڕوایی بەهۆی کردەوەی خراپی خۆیانەوە، واتە ئەبوایە توندو تیژ بوونایە و بە بێ سەر لێ کردنەوە بڕیاریان بدایە لەسەر بێ بڕوایی ئەوانە کە ئاشکرایە ناپاکن.

سەبارەت بەم ناپاکانە چەند ریوایەتێك هاتووە، گرنگتریان دوانیانە:

١- ریوایەتێك کە ئیمامی ئەحمەد ئەیهێنێ تا ئەیباتە سەر زەیدی کوڕی سابت – خوا لە هەموان رازی بێت – کە زەید ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوو بۆ جەنگی(احد) لەوێدا کۆمەڵێك گەڕانەوە و لەگەڵی نەچوون، ئینجا هاوەڵەکان سەبارەت بەوانە بوون بە دوو تاقم: تاقمێك ئەیانوت: ئەوانە ئەکوژین، تاقمێکی تر ئەیانوت: نەخێر ئەوانە بڕوادارن! ئینجا خوا ئەم ئایەتەی هێنایە خوارەوە.

٢- ریوایەتی عوفی لە(ئیبن و عەباس) ەوە – خوایان لێ رازی بێت – کە ئەفەرموێ: ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لە تاقمێك دا کە بەدەم موسڵمانێتی یان دەرئەبڕی، پشتیوانی بت پەرستەکانیان ئەکرد، ئەوانە بۆ کارو پێویستی یەکی خۆیان جارێك لە مەککە دەرچوون، ئینجا وتیان: ئەگەر هاوەڵەکانی محمد تووشمان بن ئەوا هیچ مەترسی یەکمان نابێ لێ یان، ئینجا بڕوادارەکانی مەدینە کە بیستیان ئەوانە لە مەککە

دەرچـوون، تاقمێکیـان وتیـان: سـواربن بـا بـچین ئـەو ترسـنۆکانە بکـوژین، چـونکە پشتگیریی دوژمن ئەکەن، تاقمێکی تر وتیان: چۆن ئەوانە ئەکوژن لە کاتێك دا ئێوە چی ئەڵێن ئەوانیش ئەڵێن: واتە موسڵمانن، ئایا هەر لەبەر ئەوە کە کۆچیان نەکرد و وڵاتی خۆیان بەجێ نەهێشتووە ئێمە خوێن و ماڵیان حەڵاڵ بکەین؟ کەواتە بوون بە دوو تاقم سەبارەت بەوانە، پێغەمبەریش بە دیاریانەوە بوو جڵەوگیریی لە هیچ کام نەکرد، ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە.

ئینجا لەگەڵ ئەمەدا پیاوانی ریوایەتی پێشوو بەهێزترن، بەڵام ریوایەتی دووەم باشتر ئەچێتە دڵەوە، چونکە لەم ئایەتەدا فەرمان ئەدا بە جەنگ کردن لەگەڵ ئەم ناپاکانە – وەك لە دوایی ئایەتەکەدا دێت – دەی نەبیستراوە کە فەرمان درابێ بە جەنگ و کوشتار لەگەڵ ناپاکەکانی مەدینەدا، پێغەمبەر(ﷺ) نە کوشتوونی و نە جەنگی لەگەڵ کردوون، بەڵکو هەر چاوپۆشی لێ کردن تا بۆ خۆیان نەمان و توانەوە، هەروەها بەڵگەیەکی تری بەهێز هەیە لەسەر ئەوە کە مەبەست بەوانە تاقمێکی ترن کە نیشتەجێ ی مەدینە نین، بەڵگەکەش ئەمەیە لەم ئایەتەدا ئەفەرموێ: بە دۆستیان دامەنێن هەتا کۆچ ئەکەن لە رێی خوادا، واتە کۆچ ئەکەن بۆ مەدینە، کەواتە مەبەست بەوانە تاقمێکی ترن کە نیشتەجێی مەدینە نەبوون و ئیتر لە مەککە بوون یان لە دەوروبەری، وە هێشتا فەتحی مەککە رووی نەدابوو، ئینجا با بگەڕێینەوە بۆلای ئایەتەکە بۆ ئەمەی بیرێك بکەینەوە لەوەی کە زۆر بە سەختی و توند و تیژیی بێزاری و سەرسوڕ هێنانی دەربڕی لە هەڵوێستی ئەو بڕوادارانە کە بەو جۆرە شل و شۆڵ بوون دەربارەی ئەو ناپاکانە، کە ئەو شل و شۆڵی یە زیانێکی گەورەی هەیە لەناو ریزی موسڵمانان دا، نیشانەی شل و شۆڵی و کەم هێزی بڕواکەیشیانە، هەرچۆنێ نیشانەی کەم و کوڕی تێگەیشتنیانە لە ئیسلام بە جۆرێ بڕوادار و بێ بڕوا جیا ناکەنەوە لە یەکتر، ئەم هەڵوێستە جیاوازە لە هەڵوێستی چاوپۆشی ناپاکەکانی مەدینە، چونکە ناپاکەکانی مەدینە ئەناسران و بە چاوی ناپاکی سەرنج ئەدران و جیا ئەکرانەوە لە پاکان و بەرگری یان نەئەکرا، بەڵکو بەرژەوەندی لەوەدا بوو کە چاوپۆشی یان لێ بکرێ و بە گوێرەی رووکەش و رواڵەتەکەیان وەك بڕوادار رەفتاریان لەگەڵ بکرێ. جا لەبەر ئەوە لێرەدا ئەو بێزاری یە سەختەی دەربڕی لە هەڵوێستی ئەو تاقمە بڕوادارە سەبارەت بەو تاقمە ناپاکە، ئینجا هەر بەوەوە نەوەستایەوە لێ یان،

أَتُرِيدُونَ أَن تَهۡدُواْ مَنۡ أَضَلَّ ٱللَّهُۖ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلٗا ﴿٨٨﴾ وَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ كَمَا كَفَرُواْ فَتَكُونُونَ سَوَآءٗۖ فَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ أَوۡلِيَآءَ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ

---

**بەڵكو بێزاری یەكی تریشی دەربڕی لێ یان و فەرموی: ﴿أَتُرِيدُونَ أَن تَهۡدُواْ مَنۡ أَضَلَّ ٱللَّهُ﴾ ئایا ئێوە ئەتانەوێ ڕێنموونی كەسێك بكەن كە خوا گومڕای كردبێ؟ واتە شتی وا نەگونجاوەو نیازی ئەوە نەكەن، كەواتە نیازەكەیش نابێ بكەن چ جای كردنی، ئایا ئێوە ئەوەتان ئەوێ لە كاتێك دا ﴿وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلٗا﴾ هەركەسێك كە خوا گومڕای بكات هەرگیز دەست ناكەوێ بۆ هیچ ڕێگەیەك، واتە هەركەسێك بە ویست و ئارەزووی خۆی ڕێی گومڕایی بداتە بەر، خوا گومڕایی و بێ بڕوایی بۆ فەراهەم ئەهێنێ، ئەو كاتە هەموو قاپی ڕێنموونی لێ دائەخرێ، بەم ڕەنگە دوور ئەكەوێتەوە لێ ی، ڕێ یەكی تر ئەداتە بەر، كۆمەكی و ڕێنموونی وەرناگرێ، سەرنجی نیشانە و دروشمی ڕێی ڕاست نادات! ئینجا هەنگاوێكی تر ئەنێ لە دەرخستنی هەڵوێستی بەد و خراپیان دا، بەم ڕەنگە تەنها بە گومڕایی خۆیانەوە ناوەستن، بەڵكو ئاواتە خوازن بۆ گومڕایی بڕوادارانیش، ئەفەرموێ: ﴿وَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ كَمَا كَفَرُواْ﴾ ئەو ناپاكانەی كە ئێوە نیازی خێرتان هەیە پێ یان و چاوەڕوانی خێریان لێ ئەكەن، ئەو ناپاكانە پێ یان خۆشە و ئاواتە خوازن كە ئێوە بێ بڕوا بن هەرچۆنێ خۆیان بڕوایان نەهێناو بێ بڕوان، ﴿فَتَكُونُونَ سَوَآءٗ﴾ تا بەهۆی ئەوەوە ئێوەو ئەوان یەكسان بن لە بێ بڕوایی دا، ئەو ئایینەی كە ئێوە وان لەسەری نەمێنێ لە رووی زەوی دا. ئا بەو جۆرە قورئان بێ بڕوایی و نیازی بەد و پیسی دەرخستن، كەواتە ئەو بڕوادارانەی كە ئەو ناپاكانەی بە بڕوا دارو دۆست دائەنان، ئەو بڕوادارانە هەڵەبوون، بە دەرخستنی ئەو نیازو ئاواتە بەدەیان بڕوادارەكانی وریا كردەوەو دڵی داچڵەكاندن و گورج و گۆڵی كردنەوە، دڵی هێنانە جۆش بەمەی ئەوانە ئەیانەوێ ئەمان بەش بڕاو بن لەو ئایین و بڕوایەی كە بە نرخ ترو خۆشەویست ترە لە هەموو شت بەلایانەوە، چونكە تازە لە تاریكی نەفامی و بێ بڕوایی هاتبوونە دەرەوە بۆ ناو زانین و رووناكی بڕواو ئیسلام، كەواتە زۆر بەهێز و بە**

توندی و بە سۆز و پەرۆشەوە ئامادە بوون بۆ فەرمانبەریی و گوێ رایەڵی بۆ ئەم فەرمودەی کە ئاراستەی کردن ﴿فَلَا تَتَّخِذُوا۟ مِنْهُمْ أَوْلِيَآءَ حَتَّىٰ يُهَاجِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ کەواتە لەوانە دۆست و یارمەتی دەر دامەنێن هەتا کۆچ ئەکەن لە ڕێی خوادا، واتە هەتا بڕوا ئەهێنن لە ڕاستی و بڕواکەیان بە ڕاست ئەگێڕن بە کۆچ کردنیان لە ڕێی خوادا بێ هیچ نیازو مەبەستێکی تر.

لەم ئایەتە وا وەرئەگیرێ کە لەو کاتەدا هێشتا پەیوەندی و پەیوەستی دڵی هێندێ لە بڕواداران بە بێ بڕواکانەوە نەپچڕابوو بە تەواوی، پەیوەندی خزمایەتی و نەژاد، پەیوەندی بەرژەوەندی یەك لە بەرژەوەندی یەکانی جیهان، لەبەر ئەوە قورئان چارەسەری ئەو جۆرە شتانەی کرد، بڕوادارانی فێرکرد و تەمێی کردن کە گەل و کۆمەڵی ئیسلام نابێ دامەزرێ لەسەر هیچ کام لە پەیوەندی یەکانی ئەم زەوی و جیهانە، بەڵکو ئەبێ دامەزرێ تەنها لەسەر بڕواو عەقیدە و لەسەر ڕژێمێکی کۆمەڵایەتی کە لە بڕواو عەقیدەوە هەڵقوڵابێ، جا لەبەر ئەوە نابێ دۆستایەتی و یارمەتی دان ببێ لەلایەن ئەو موسڵمانانەی کە لە وڵاتی ئیسلام دان، لەگەڵ ئەوانەی کە لە وڵاتێك دا بن کە جەنگ ئەکەن لەگەڵ ئیسلام دا، ئەو وڵاتەی کە لەو کاتەدا جەنگی هەبوو لەگەڵ ئیسلام دا، مەککە بوو کە جێگەو نیشتمانی کۆچ کەران بوو، نابێ دۆستایەتی و یارمەتی دانیان ببێ لەگەڵ ئەوانەی کە لەو کاتەدا لە مەککەدا بوون، هەرچەند بەدەم موسڵمان بوون و موسڵمانێتی یان دەرئەبڕی، نابێ هەتا کۆچ نەکەن لە مەککە و نەیەن بۆ لای گەل و کۆمەڵی موسڵمان لە مەدینە، ئەبێ کۆچ کردنەکەیشیان لەبەر خوا بێت و لە ڕێی خوادابێت، لەبەر پێك هێنانی گەل و کۆمەڵێکی موسڵمان بێت کە بە پێی بەرنامەی خوا بژی. ئینجا ئەگەر بەو جۆرەیان کرد، بەم ڕەنگە دەستیان هەڵگرت لە کەس و کارو ماڵ و سامان و نیشتمان و هەموو بەرژەوەندی یەکیان و بەجێ یان هێشتن، کۆچیان کرد بۆ وڵاتی ئیسلام هەر لەبەر ئەوەی کە بژین بە پێی بەرنامەکەی ئیسلام، ئەگەر بەو جۆرەیان کرد ئەوا ئەبن بە ئەندام لە گەل و کۆمەڵی ئیسلام، ئەبن بە هاونیشتمانی موسڵمانەکان، ئەگەر بەو جۆرەیان نەکرد و سەرپێچی یان کرد لەو کۆچ کردنە، ئەوا هیچ نرخێك نی یە بۆ قسەی ڕووت کە کردەوە بە درۆی بخاتەوە،

﴿فَإِن تَوَلَّوْاْ فَخُذُوهُمْ وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَلَا تَتَّخِذُواْ مِنْهُمْ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٨٩﴾ إِلَّا الَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ أَوْ جَاءُوكُمْ حَصِرَتْ صُدُورُهُمْ أَن يُقَاتِلُوكُمْ أَوْ يُقَاتِلُواْ قَوْمَهُمْ﴾

وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَإِن تَوَلَّوْاْ﴾ ئینجا ئەگەر روویان وەرگێرا لە کۆچ کردن کە نیشانەی بڕوا هێنانی راستەقینەیە، واتە کۆچیان نەکرد و هەر مانەوە لە وڵاتی جەنگ و بێ بڕوایی دا ﴿فَخُذُوهُمْ﴾ ئەو کاتە بەدیل بیانگرن کاتێ بەردەستتان کەوتن ﴿وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ﴾ بیانکوژن لە هەر شوێنێك دەستتان کەوتن، با خاکی حەرەمیش بێت، چونکە ئەوانە وەك بت پەرستەکان وان، ﴿وَلَا تَتَّخِذُواْ مِنْهُمْ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا﴾ هیچ دۆست و یارمەتی دەرێك لەوان وەرمەگرن و هیچ کامیان مەکەن بە دۆست و یارمەتی دەر، واتە بە تەواوی لێ یان دوورکەونەوە ئەگەر ویستتان دۆستایەتی و یارمەتیتان پێشکەش بکەن لێ یان وەرمەگرن، وەك لە پێشەوە دەست نیشانمان کرد، ئەم حوکم و بڕیارە بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ئەوە کە مەبەست بەم ناپاکانەی ئێرە ناپاکەکانی مەدینە نین، چونکە ئاشکرایە کە ئەوان چاوپۆشی یان لێ کرا و هیچ کاتێ بەم جۆرە رەفتاریان لەگەڵ نەکراوە. بێگومان ئیسلام چاوپۆشی ئەکات لە خاوەن بیرو باوەڕەکانی تر کە دژی ئیسلامیشن، زۆریان پێ ناهێنێ لەسەر موسڵمان بوون، ئەوانە بۆیان هەیە بە ئاشکرا بیروباوەڕی خۆیان دەربڕن، تەنانەت لەو کاتەدا کە لە وڵاتی ئیسلام و لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیش دابن، بە مەرجێك بانگی موسڵمانان نەکەن بۆ بیر و باوەڕەکانی خۆیان، رەخنەو تەشەر ئاراستەی ئیسلام نەکەن، بەسە بۆ ئەوان کە ئیسلام زۆریان لێ ناکات لەسەر موسڵمان بوون، پارێزگاری ماڵ و خوێن و ناموسیان ئەکات، بە بێ جیاوازی رێ یان لێ ناگرێ لە هیچ خێرو بێرێکی نیشتمان و وڵات، وەك موسڵمانەکان، لێ یان ئەگەرێ کە بە پێی یاسا و شەریعەتی خۆیان رەفتار بکەن بۆ ناوخۆی خۆیان.

ئیسلام تا ئەو رادەیە چاوپۆشی ئەکات لەگەڵ ئەوانەی کە بە ئاشکرا دژو دووبەرەکین لەگەڵ ئیسلام دا لە بیروباوەڕدا، بەڵام چاوپۆشی ناکات و واز ناهێنێ لەوانەی کە بەدەم موسڵمانێتی دەرئەبڕن و بە کردەوە دژی ئیسلامن، چاوپۆشی ناکات لەوانەی کە بە دەم شایەتمان ئەهێنن، ئینجا دان ئەنێن بە هەر بیروباوەڕێکی تردا، دان ئەنێن بەوەدا کە هیچ شتێکی تر بێجگە لە خوا مافی حاکمێتی و دانانی یاسای هەیە. ئەو چاوپۆشی یە ناکات

دەربارەی ئەو کۆمەڵە ناپاکە کە بەدەم موسڵمانێتی دەرئەبڕن، ئینجا ئەمێننەوە لە وڵاتی بێ بڕوایی و جەنگ دا و یارمەتی و پشتیوانی دوژمنانی ئیسلام ئەکەن! ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە ئەوە چاوپۆشی نی یە، بەڵکو ئەوە شل و شۆڵی بەکار هێنانە لەگەڵ ئیسلام دا، راستە کە ئیسلام بیرو باوەڕی چاوپۆشی یە، بەڵام ئەمەش هەر راستە کە ئیسلام بیرو باوەڕی شل و شۆڵی و بێ کارەیی نی یە!

ئینجا لەو بڕیارو فەرمانی بەدیل گرتن و کوشتنە دوو تاقم دەرئەکات لەو کۆمەڵە ناپاکانەی کە باس کران:

١- ئەوانەی کە لە وڵات دەرچن و پەنا ئەهێنن بەگەل و کۆمەڵێك کە لەگەڵ موسڵمانان دا پەیمانێکیان بەستووە، لەم کاتەدا ئەچنە ریزی ئەو گەل و کۆمەڵە و بە وێنەی ئەوان رەفتاریان لەگەڵ ئەکرێ.

٢- ئەوانەی کە ئەیانەوێ بە بێ لایەن بمێننەوە و جەنگ لەگەڵ هیچ لایەك ناکەن.

دەربارەی یەکەم ئەفەرموێ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٌ﴾ واتە ئەو ناپاکانەی کە باس کران بەدیل بیانگرن و بیانکوژن لەهەر شوێنێك دەستتان کەوتن، مەگەر ئەوانەیان کە لەناو دوژمنەکان دەرچن و بگەنە ناو گەل و کۆمەڵێك کە لە نێوان ئێوە و ئەوان دا پەیمانێك هەبێ، واتە تێکەڵی ئەوانە ببن و بچنە ریزی ئەوان. دەربارەی دووەم ئەفەرموێ: ﴿جَآءُوكُمۡ حَصِرَتۡ صُدُورُهُمۡ أَن يُقَٰتِلُوكُمۡ أَوۡ يُقَٰتِلُواْ قَوۡمَهُمۡ﴾ بێجگە لەوانەی کە هاتن بۆلای ئێوە لە کاتێك دا کە دڵیان بێزار و تەنگ بێت لەوەی کە جەنگتان لەگەڵ بکەن یان جەنگ بکەن لەگەڵ کۆمەڵ و تیرەکەی خۆیان، واتە هەرکام لەو دوو بارەیان پێ ناخۆشە لەبەر ئەوە ئەیانەوێ بێ لایەن بن. بێگومان ئیسلام ئایینی ئارامی و ئاشتی یە و دژی جەنگ و کوشتارە، مەگەر یەخەی بگرێ و ناچار بێ، بەم رەنگە بەرگری بکرێ لە راگەیاندن و بانگ کردنی مەردوم بۆلای، بانگ کردن و بانگەوازەکەی بوەستێنرێ، یان سزاو ئازاری موسڵمانەکان بدرێ، لەم دوو کاتەدا ناچارەو ئەبێ رێگەکەی پاك بکاتەوە. لەو درك و چڵ و چێوەی کە رێی لێ ئەگرن، دەی خۆ ئاشکرایە ئەم دوو دەستەیە کە دەری کردن هیچ کام لەو دوو تاوانەیان نی یە، کەواتە زۆر رێك و رەوایە جوێ کردنەوەیان لە تاوانبارەکان و رەوا نەدرێ نە بە دیل گرتن و نە کوشتنیان، بەڵام لەبەر ئەوەی یەکەم تاقم ئەچێتە ریزی پەیماندەران، پاراستنی پەیمان لەلایەن بێ بڕواکانیشەوە بە رێك و رەوا سەیر کراوەو هیچ جێی قسە و باس و سەر لێکردنەوە نییە، لەبەرئەوە پێویست نەبووزیادەقسەی لەسەربکات وشیرینی بکات لەبەرچاو،

وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ فَلَقَـٰتَلُوكُمْ ۚ فَإِنِ ٱعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْا۟ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلًا ﴿٩٠﴾ سَتَجِدُونَ ءَاخَرِينَ يُرِيدُونَ أَن يَأْمَنُوكُمْ وَيَأْمَنُوا۟ قَوْمَهُمْ كُلَّ مَا رُدُّوٓا۟ إِلَى ٱلْفِتْنَةِ أُرْكِسُوا۟ فِيهَا

**بەڵام تاقمی دووەم ناگاتە رادەی ئەو، لەبەر ئەوە ئەم بارەی روونتر کردەوەو بڕیارەکەی شیرین کرد وفەرموی: ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ﴾ ئەگەر خوا بیویستایە ئەوانەی بەتین و بەهێز ئەکرد بەرامبەرتان، سام و بیمی ئێوە نەئەهێشت لەدڵیان دا، ﴿فَلَقَـٰتَلُوكُمْ﴾ بەهۆی ئەوەوە جەنگتان لەگەڵ ئەکردن، واتە خوا میهرەبانی کرد کە ترس و بیمی ئێوەی خستە دڵی ئەمان تا خۆیان جویێ کردەوە لە کەس و کارە جەنگ کەرەکانیان و بێ لایەن بوون، کەواتە ئێوەش لێ یان گەڕێن و ئاشتی یان لەگەڵ بکەن و مل کەچی بڕیارو فەرمانەکەی خوا بن و زیاد لەوە رێی هیچتان نی یە وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَإِنِ ٱعْتَزَلُوكُمْ﴾ ئەگەر ئەوان کەناگیر بن لێتان و بێ لایەن بن ﴿فَلَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ﴾ بەم رەنگە جەنگیان لەگەڵ نەکردن، ﴿وَأَلْقَوْا۟ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ﴾ مل کەچی یان ئاراستە کردن و جڵەوی کاری ئاشتی یان دایە دەستتان، ئەگەر ئەوان بەو جۆرەیان کرد ﴿فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلًا﴾ ئەو کاتە خوا هیچ رێگەیەکی دانەناوە بۆ ئێوە بەسەر ئەوانەوە، واتە خوا رێتان نادا کە بیانکەن بە دیل و بیانکوژن، ئەو بڕیارەی کە دای بەرامبەر جەنگ کەران نابێ بەکاربهێنرێ بۆ ئەمان. ئا بەو جۆرە گرنگە دەست کاری دەروونی ئەو موسڵمانانەی کرد کە زۆر بە غیرەت بوون لەسەر ئایینەکەیان و لەوانە بوون کە دڵیان بێ ئارام بێت بەرامبەر ئەو بڕیارو هەڵوێستە، دەست کاری یان ئەکات بەو بەهرەو میهرەبانی خوا کە کارێکی وای کرد کە بەرگری ئەوانەی کرد و ژمارەی دوژمنەکانی کەم کرد و ئەرکی موسڵمانەکانی کەمتر کرد و دەست نیشانی کرد بەوەی کە خێر لەمەدایە، کەواتە با ئەم رێگەیە بدەنە بەر، بە دوای ئەو شەڕو جەنگەدا نەگەڕێن کە خوا دووری خستووەتەوە لێ یان، ماتووڵ هیچ زیان و سەرشۆڕی یەکی تیا نی یە، نە بۆ خۆیان و نە بۆ ئایینەکەیان، بەڵێ، بێگومان ئیسلام جڵەوگیریی ئەکات لە ئاشتی یەك کە ماڤ لە مافەکانی ئیسلامی تیا ژێر پێ بکرێ، یان هۆی زیان و سەرشۆڕی بێت بۆ گەل و کۆمەڵی موسڵمانان، ئیسلام فەرمان ئەدات بە جەنگ و کوشتارو پێویستی ئەکات – وەك چەند جار ئاماژەمان بۆ کرد –**

کاتێ کە رێ بگیرێ لە راگەیاندن و بلاو کردنەوەی ئایینەکەی خوا، کاتێ کە مەردوم نەتوانێ بە ئازادی و سەربەستی ئاییني خوا بگرێتە گەردن، کاتێ کە موسلمان بخرێتە ژێر ئەشکەنجە و سزاو ئازار، ئیتر بێجگە لەم کاتانە ئاشتی و جەنگ نەکردن یاسا و داخوازی ئیسلامە.

تاقمێك لە زانایانی تەفسیر لەسەر ئەوەن کە رستەی ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ﴾ تا دوایی ئایەتەکە گشتی یە بۆ هەردوو تاقمەکە و هۆی راست و رەوایی دەرکردنی هەردووە لە حوکم و بڕیاری جەنگ کەرەکانە. بەلام تەفسیرەکەم لەسەر رای ئەوانە کردەوە کە ئەو وتەو رستەیە تایبەتی ئەکەن هەر بە تاقمی دووەمەوە لەبەر دووشت:

١- وەك لە پێشەوە وتمان: دەستەی یەکەم ئەچنە ریزی پەیماندەران، وە پەیمان دەرانیش بە بێ سەر لێ کردنەوە جەنگیان لەگەل ناکرێ بەلای هەمووانەوە.

٢- وتەی ﴿ٱعْتَزَلُوكُمْ﴾ لەگەل دووەم دا رێك و پێك ترە، لەگەل ئەوەیش دا هیچ دژی ئەوە نیم ئەگەر بگیرێن بە گشتی وەك ئەو تاقمە زانایانەی لەسەرە.

ئیسلام بەو جۆرە چاوپۆشی ئەکات لەوانەی کە باس کرا، بەلام دەستە و تاقمێکی تر هەن ئەو چاوپۆشی یەیان لێ ناکات، چونکە ئەمانە ناپاکێکی بەدن، هیچ پەیمانێکیان نەبەستووە لەگەل موسلمانان دا، پەیوەندیشیان نی یە بە پەیمان دارانەوە، ئیسلام بەرامبەر بەمانە رێ ئەدا کە رەفتاریان لەگەل بکرێ بە وێنەی یەکەم تاقمی ناپاکانی پێشوو، ئەفەرموێ: ﴿سَتَجِدُونَ ءَاخَرِينَ﴾ چەند کەسانێکی ترتان دەست ئەکەوێ. واتە جیاوازن لەو دەستە و تاقمانەی تر کە باس کران، ئەمانە دوو روو و رێبازن ﴿يُرِيدُونَ أَن يَأْمَنُوكُمْ وَيَأْمَنُواْ قَوْمَهُمْ﴾ ئەیانەوێ کە بێ ترس و بێ باك بن لە ئێوەو، بێ ترس و بێ باکیش بن لەگەل خزم و خوێشەکەی خۆیان دا، ﴿كُلَّ مَا رُدُّوٓاْ إِلَى ٱلْفِتْنَةِ﴾ هەرجارێ بانگ بکرێن بۆ هاوبەش رەوادان بۆ خوا وەك(سدی) ئەفەرموێ. یان بۆ جەنگ کردن لەگەل موسلمانان وەك هێندێ تر ئەفەرمون.

﴿أُرْكِسُواْ فِيهَا﴾ وەرئەگێرێنرێنەوە تیای دا زۆر بە خراپی و ناشیرینی، واتە ئەگەڕێنەوە بۆی زۆر بەتین و تیژیی، لە(ئیبن و عەباس) ەوە ئەگێرنەوە کە ئەفەرموێ: یەکێ لەوانە گەل و کۆمەلەکەی پێ یان ئەوت: ئایا تۆ بڕوات بە چی هێناوە؟ ئەویش ئەیوت: بڕوام هێناوە بەم مەیمونە. بەم دووپشکە، بەم قۆلانچەیە. واتە بەو شێوە زۆر پیسە ئەگەڕایەوە بۆ بێ بڕوایی و وتەی پیسی بەدەم دا ئەهات و لاقرتی ئەکرد بە ئاییني ئیسلام،

﴿فَإِن لَّمْ يَعْتَزِلُوكُمْ وَيُلْقُوٓاْ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ وَيَكُفُّوٓاْ أَيْدِيَهُمْ فَخُذُوهُمْ وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ ۚ وَأُوْلَٰٓئِكُمْ جَعَلْنَا لَكُمْ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿٩١﴾﴾

**ئەوانە بار و حاڵیان وابوو لەبەر ئەوە ئیسلام چاوپۆشی لیٚ نەکردن و دەربارەیان فەرموی: ﴿فَإِن لَّمْ يَعْتَزِلُوكُمْ﴾ ئینجا ئەوانە ئەگەر کەنارگیر نەبوون لێتان ﴿وَيُلْقُوٓاْ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ﴾ مل کەچی یان ئاراستە نەکردن و جڵەوی ئارام و ئاشتی یان نەدایە دەستتان ﴿وَيَكُفُّوٓاْ أَيْدِيَهُمْ﴾ بەرگری خۆیان نەکردو دەستیان نەکێشایەوە لە جەنگ کردن لەگەڵتان ﴿فَخُذُوهُمْ﴾ ئەو کاتە بیانگرن بەدیل ﴿وَٱقْتُلُوهُمْ﴾ بیانکوژن ﴿حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ﴾ لەهەر شوێنێك بەردەستتان کەوتن و بۆتان گونجا ﴿وَأُوْلَٰٓئِكُمْ﴾ ئەوانەی کە باسمان کردن بۆتان ﴿جَعَلْنَا لَكُمْ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا﴾ گێڕاومانە بۆتان بەسەریانەوە رابەرو بەڵگەیەکی روون لەسەر راست و رەوایی کوشتن و بەدیل کردنیان، واتە دوژمنایەتی و بیٚ بڕوایی و غەدرو ناپاکی یەکەیان بەڵگەیەکی ئاشکرایە بە دەستتانەوە بۆ ئەوەی ئەو کوشتن و بەدیل گرتنەیان بەسەر بێنن. یان دەسەڵاتێکی ئاشکرامان پێداون بەم ئیزنە و فەرمانمان داون بە گرتن و کوشتنیان.**

**ئیسلام لەگەڵ دەستەی پێشوودا چاوپۆشی و ئارام و ئاشتی بەکار هێنا. بەڵام لێرەدا لیٚ نەبوردن و توندو تیژیی بەکار هێنا، چونکە ئیسلام لە هەموو کاروباری دا هەمیشە لە ناوەڕاست دا ئەوەستیٚ و میانەیە، بە بیٚ زیادە رەوی و کەم و کوڕی، نەرمی و چاوپۆشی بەکار ئەهێنیٚ لە کات و شوێنی خۆی دا، کەواتە ئەو کەسانەی کە لە هەموو کارو کاتێك دا غیرەت ئەیانگریٚ و رائەپەڕن و ئەیانەویٚ توندو تیژیی و سەختی بەکار بهێنریٚ. ئەوانە هەڵەن و لایان داوە لە ناوەڕاستی رێگە راستەکەی ئیسلام! هەروەها ئەوانەش کە شل و شۆڵ و دڵ لاوازن و ئەیانەویٚ لە هەموو کارو کاتێك دا کزی و نەرمی بەکار بهێنریٚ و وا نیشان ئەدەن کە ئیسلام هەر لەسەر ئەم بارەیە، جا لەبەر ئەوە چەند عوزرو بەهانە ئەهێنێتەوە بۆ ئیسلام کە جیهادی پێویست کردووە، وەك ئیسلام کەسێك بێت لەناو قەفەزی دادگا پیٚ**

گیرابێ و ئەمانیش بە ناچاریی بەرگری لێ ئەکەن و ئەیانەوێ بە هەرجۆر بووە تەبری یەی بکەن و تاوانەکەی بشارنەوە! ئەو دڵسۆزانە بەرگری لێ ئەکەن و ئەڵێن: ئیسلام سەراسەر لێ بوردن و چاوپۆشی و ئاشتی یە، تەنها ئەیەوێ بەرگری بکات لە خاك و وڵاتەکەی و لە گەل و کۆمەڵی موسڵمانان و ئیتر هەقی بەسەر هیچ کەسێکی ترەوە نی یە و دەست درێژیی ناکات.

ئەو دڵسۆزانە کە بەو جۆرە پینە و پەڕۆ و بەهانە بەکار ئەهێنن، بێگومان ئەوانەش هەر هەڵەن و لایان داوە لە ڕێ ڕاستەکەی ئیسلام، ئیتر تێنەگەیشتوون لە ئیسلام یان تێگەیشتوون، بەڵام دڵ لاواز و بڕوا لاوازن و ئەیانەوێ خۆپارێزیی بکەن و بە ئارام و ڕەحەتی سەربکەنە خەو و خواردن و ڕابواردنی خۆیان!! موسڵمانی ڕاستەقینەی نەترازاو لە ناوەڕاستی ڕێگە ڕاستەکەی ئیسلام بە هەموو کەشخە و سەربەرزی و شانازی یەوە ئەڵێ ئیسلام ئایین و شەریعەتی خوایە، هاتووە بۆ ئەوەی چاودێر و کاربەدەست و حوکمڕانی جیهان و جیهانیان بێت، ڕژێم و بەرنامەیەکی وایە کە لە ژێر سایەی دا هەموو کەس بحەوێتەوە و ماف و ئازادی و سەربەستی پارێزراو بێت، بە بڕوادار و بێ بڕواوە، بە بێ لایەنگیری و جیاکردنەوە، ئیسلام نەبەستراوە بە وڵات و نیشتمانێکی تایبەتی یەوە، بەڵکو هاتووە بۆ بەرگری کردن لە مافی هەموو کەس، ئازادکردنی هەموو ناوچە و وڵاتێك لە هەموو ستەم و ناهەقی یەك، ئینجا ئەگەر هەموو جیهان و جیهانی یان بێتە ژێر سایەی ئیسلام و بیگرنە گەردن و بڕوای پێ بێنن هێشتا ئیسلام کاری تەواو نابێ، چونکە ئەو کاتە ئەبێ چاودێر و پاسەوان بێت و ماوەنەدا بۆ هیچ لادان و ترازان و لاری یەك کە بە سروشت بنەبڕ ناکرێن و جیهان پاك ناکرێتەوە لێ یان، کەواتە تێکۆشانی ئیسلام هەرگیز دوایی نایەت تا جیهان جیهانە! ئەبێ ئیسلام بەم شێوەیە سەرنج بدرێ و بڕوای پێ بهێنرێ، هەرکەسێك بۆچوون و بڕوای بە ئیسلام لەسەر ئەو بارە نەبێ کە باسمان کرد، ئەو کەسە نە موسڵمانە و نە لە ئیسلام حاڵی بووە.

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا ۚ وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُوا۟ ۚ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ﴾

---

لەم چەند ئایەتی رابردووەدا باسی پەیوەندی موسڵمانان کرا لەگەڵ ئەو چوار تاقم و کۆمەڵەدا کە روون کرانەوە، باسی کەسانێك کرا کە کوشتنیان حەڵاڵ بێت، ئینجا دێتە سەر باسی پەیوەندی بڕواداران لەگەڵ یەکتردا، باسی کوشتنیان ئەکات بۆ یەکتر ئیتر بە هەڵە یان بە دەستی قەست کە ئەمەیان زۆر ناڕاست و ناڕەوایە، لەبەر ئەوە روودانی زۆر بە دوور نیشان ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا﴾ هیچ کاتێ شایستە نەبووە و کارو پیشەی بڕوادار ئەوە نی یە کە بە ناهەق بڕوادار بکوژێ، چونکە بڕواکەی جڵەوگیرو بەرگری یەتی لە کاری وا ناڕەوا، مەگەر بە هەڵە و لە کاتی هەڵە کردن دا کە مرۆڤ بە سروشت هەڵەبازەو هەڵە ئەکات. واتە نابێ شتی وا لە بڕواوە روو بدا مەگەر بە هەڵە کە لە ژێر دەسەڵات دا نی یە. ئینجا ئەم کوشتنە هەڵەیە سێ بار و جۆری هەیە:

١- کوشتنی بڕوادارێك کە لە وڵاتی ئیسلام دا بێت و کەس و کاریشی بڕوادار بن.

٢- کوشتنی بڕوادارێك کە لە وڵاتی دوژمنانی ئیسلام دا بێت و کەس و کاری بێ بڕوا و جەنگ کەر بن لەگەڵ موسڵمانان دا.

٣- کوشتنی کەسێك کە گەل و کۆمەڵەی پەیمانیان بەستبێ لەگەڵ موسڵمانان دا. ئیتر پەیمانی ئاشتی و جەنگ نەکردن یان پەیمانی رازی بوون بە سایەداری ئیسلام و ژیانیان لە سایەی دەوڵەتی ئیسلام دا.

کەواتە باگوێ شل کەین بۆ حوکم و بڕیاری خوا سەبارەت بە هەرسێ جۆرەکە: دەربارەی یەکەم ئەفەرموێ: ﴿وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا﴾ هەرکەسێك بڕوادارێك بکوژێ بە هەڵە ﴿فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ﴾ ئەوە لەسەریەتی ئازاد کردنی مەردومێکی بڕوادار کە ماڵی بکوژ بێت ئیتر ئایا مندال بێت و بڕیاری بڕواداریی درا بێ بە هۆی بڕواداریی باوك و دایکی یان یەکێکیان

﴿وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦٓ﴾ لەسەریەتی خوێنێك – واتە ماڵێك – كە بدرێ بە خوێن ڕەس و كەلەپوور بەری كوژراوەكە دابەشی بكەن لەناو خۆیان دا بەو جۆرەی كە شەرع كەلەپووری مردوو دابەش ئەكات. ئەو بكوژە پێویستە لەسەری ئازاد كردنی یەكێك – كە ئازاد كردنی وەك زیندوو كردنەوەی وایە – لە باتی ئەوەی كە یەكێكی لەناو بردووە لەگەڵ و كۆمەڵی موسڵمان، ئەو خوێنەش بدرێ بۆ هێواش كردنەوەو ئارام دان بە دڵی ئەو كەس و كارە كە یەكێكیان لە دەست دەرچووە، هەم لەباتی هەر سوود و قازانجێك كە لەوانە بێت دەست كەوتیان ببێ لەلایەن كوژراوەكەیانەوە، ئا بەو جۆرە ئیسلام دوور بینی و چاودێری ئەكات بۆ هەموو بەرژەوەندیی بەندەكانی خوا، ئەگەر ئەوان گوێ ڕایەڵ بن و پەیڕەوی بكەن ئەو خوێنە لە ڕێوە ئەكەوێتە سەر بكوژ. بەڵام بەلای كۆمەڵ و جەماوەری زانایانەوە كەس و كاری پشتی ئەیدەن ئەگەر ئەوانە نەبوون لەسەر(بیت المال) ە، واتە دەوڵەتی ئیسلام ئەیدات، ئەگەر ئەوەیش نەبوو ئینجا ئەبێ بكوژ بیدات، بەهەرحاڵ ئەو خوێنەی لەسەرەو ئەبێ بدرێ بە كەلەپوور بەران، ﴿إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُواْ﴾ مەگەر ئەوان بە خێرو سەدەقەی خۆیان ببورن. ئەو ماڵە لە ڕێوە حوشترە ئەگەر ئەوە نەبوو نرخی حوشتر، حوشترین سەد سەرە بۆ خوێنی پیاو و ئافرەت بە بێ جیاوازی بەلای هێندێ لە زانایانەوە، وەك رووكەش و ڕواڵەتی ئایەتەكەش وائەگەیەنێ، بەلای زۆربەی زانایانەوە خوێنی ئافرەت نیوەی خوێنی پیاوە، چونكە ئیمامی عمرو علی و ئیبن و مەسعود بەو جۆرە بڕیاریان داوە، هەم لە شایەتی و كەلەپوور بردن دا نیوە ئەبەن، هەم بە كوشتنی پیاو زیانی كەس و كار و زۆرتر و گەورەتر بە شێوەی گشتی و لە زۆربەی كات دا. دەربارەی تاقمی دووەم ئەفەرموێ: ﴿فَإِن كَانَ مِن قَوۡمٍ عَدُوٍّ لَّكُمۡ﴾ ئینجا ئەگەر ئەو كوژراوە لە كۆمەڵێك بوو كە دوژمنە بۆ ئێوە ﴿وَهُوَ مُؤۡمِنٞ﴾ لە كاتێك دا كە خۆی بڕوادارە ﴿فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مُّؤۡمِنَةٖ﴾ ئەوە لەسەریەتی ئازاد كردنی مەردومێكی بڕوادار، لە باتی ئەو بڕوادارە كە كوژرا و لە كیسی موسڵمانان چوو، بەڵام خوێنی لەسەر نی یە، چونكە كەس و كارەكەی دوژمنی ئیسلام و موسڵمانانن و جەنگیان لەگەڵ ئەكەن، كەواتە ناڕەوایە ماڵیان پێ بدرێ و ئەوانی پێ بەهێز بكرێ و یارمەتی بدرێن لەسەر دوژمنایەتی یەكەیان،

وَإِن كَانَ مِن قَوْمِۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ

---

دەربارەی سیٚ یەم ئەفەرموێ: ﴿وَإِن كَانَ مِن قَوْمِۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌ﴾ ئەگەر ئەو کوژراوە لە گەل و کۆمەڵێك بوو کە لە نێوان ئێوەو ئەوان دا پەیمانێك هەیە، ﴿فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ﴾ ئەوە لەسەریەتی خوێنێك کە بدریٚ بە کەس و کاری لە باتی ئەو زیانەی کە لیٚ یان کەوتووە بەهۆی کوشتنی یەکێکیان ﴿وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ﴾ ئازادکردنی مەردومێکی بڕوادار. لەم سیٚ یەمەدا نەیفەرموو: کوژراوەکە بڕوادار بیٚ، لەبەر ئەوە هێندیٚ لە زانایان بە شێوەی گشتی ئەیگرن و ئەفەرمون: ئەگەر کوژراوەکە بیٚ بڕوایش بێت هەر پێویستە خوێنی بدریٚ و یەکێکیش ئازاد بکریٚ لە باتی دا، چونکە پەیمانەکەیان خوێن و ماڵیان ئەپارێزیٚ بە وێنەی پاراستنی موسڵمانان، بەڵام لەبەر ئەوەی باسەکە هەر لە یەکەمجارەوە باسی کوشتنی بڕوادارە بە هەڵە، دووبارە پێشووەکە بڕیویەتی بەسەر بڕواداردا، کەواتە سیٚ یەمیش هەروەك دووانە پێشووەکە بێت چاکترە و دڵ بۆ ئەوە باشتر ئەڕوا، رووکەشی ئایەتەکەیش هەروا ئەگەیەنیٚ، چونکە ئەو راناوەی کە لە(کان) ەدا هەیە ئەبیٚ بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە پێشی یەوە باس کراوە و ئەویش هەر کوژراوی بڕوادارە، بەڵگەیە تریش لەسەر ئەوە کە مەبەست کوژراوی بڕوادارە ئەمەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) خوێنی بڕیار دا بۆ هێندیٚ لە کوژراوانی بیٚ بڕوای پەیماندار، باسی ئەوە نەکراوە لەو ریوایەتەدا کە ئازاد کردنی مەردومی پێویست کردبیٚ لەسەر کوشتنی ئەوانە، کەواتە ئەوەی پێویست بێت بۆ بیٚ بڕوا هەر خوێن دانە، ئەوەیش لە کردەوەی پێغەمبەرەوە(ﷺ) وەرگیراوە نەك لەم ئایەتەوە، ئەوەی کە لەم ئایەتەدا هاتووە هەر بۆ بڕوادارە. ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ﴾ ئینجا هەرکەس دەستی نەکەوت لەبەر بیٚ دەستی یان لەبەر نەبوونی بەندە یان هەر رژێمی کۆیلەیی نەما، لەبەر هەرکام ﴿فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ﴾ ئەوە لەسەریەتی رۆژووی بۆ نەئەگیرا ئایا لەباتی ئەوەدا خۆراك ئەدات وەك کەفارەی ظهار یان نا؟ رای زانایان بە چەند جۆرێکە با سەرنجی کتێبەکان بدریٚ ﴿تَوْبَةً مِّنَ ٱللَّهِ﴾ واتە خوا ئەوەی دانا لەبەر وەرگرتنی تۆبە لەو بکوژە یان لەبەر سووك کردنی کارەکە لەسەر ئەو بکوژە،

وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٩٢﴾ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴿٩٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُوا۟ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَٰمَ

لەلایەن خواوە ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ خوا زانایە بە هەموو شتێ کە یەکێ لەوانە حاڵ و باری ئەو بکوژەیە، کاردروست و لێزانە لە هەموو کارو کردەوەو بڕیارەکانی دا، کە یەکێ لەوانە ئەم بڕیارانە بوون کە لەبارەی کوشتنی هەڵەوە بێت.

ئینجا دێتە سەر باسی کوشتنی بڕوادار بە ناهەق و بەدەستی قەست، گەورەیی ئەوانە بە جۆرێ باس ئەکات کە هەرکەسێك بڕوادار بێت هەرگیز ناتوانێ نیازیشی بکات چ جای کردنی، ئەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا ﴾ هەرکەسێك بڕوادارێك بکوژێ بە ناهەق و بە دەستی قەست بەم رەنگە نیازی کوشتنی بکات و بەشتێك بێ کە لەوانە بێت مەردوم بکوژێ و، بیشزانێ کە ئەو نیاز کراوە موسڵمان و بڕوادارە ﴿فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ﴾ تۆڵەی ئەو کەسە دۆزەخەکە تیای دا بێت ﴿خَٰلِدًا فِيهَا﴾ بە هەمیشەیی تیای دا بە بێ دواهاتن و برانەوە، یان بە مانەوەیەکی زۆر دوورو درێژ تا ئەو کاتەی خوا ئەیەوێ و بڕیاری ئەوەی لەسەرداوە ﴿وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ﴾ خوا خەشمی هەیە لەسەری و خەشمی لێ گرتووە ﴿وَلَعَنَهُۥ﴾ نەفرینی لێ کردووە و دووری خستووەتەوە لە میهرەبانی خۆی ﴿وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا﴾ ئامادەی کردووە بۆی سزایەکی زۆر گەورە، لە دۆزەخ دا. بەڕاستی هەڕەشەیەکی ئێجگار سەخت و سامناك و دڵ داچڵەکێنەرە – خوا پەنامان بدات – لەم بارەیەوە حەدیسی زۆریش ریوایەت کراوە کە وەك ئایەتەکە سەخت و سامناکن، جا لەبەر ئەوە موعتەزیلە و خەوارج لایان وایە بەم بکوژە تۆبەی بۆ نی یە و هەمیشەیی ئەبێ لە دۆزەخ دا بە بێ رزگار بوون و دواهاتن وەك رواڵەتی ئایەتەکەیش ئەیگەیەنێ، بێجگە لەو دوو کۆمەڵە چەند کەس لە زانایانی تریش لەسەر ئەوەن – وەك لە(ئیبن و عەباس) یشەوە ریوایەت کراوە خوایان لێ

رازی بێت – ئەفەرمون: ئایەتی سورەتی(الفرقان) کە بڕیاری تۆبە ئەدا بۆ ئەو بکوژانە جیاوازە و نابێ بە بەڵگە لەسەر ڕەوادانی تۆبە بۆ ئەم بکوژەی کە لێرەدا باسی ئەکەین، چونکە ئایەتی ئەوێ بۆ ئەو بکوژانەیە کە بێ بڕوا بن و لە کاتی بێ بڕوایی دا مەردومیان کوشتبێ و لەپاش دا موسڵمان بووبن، ئەو موسڵمان بوونەیان ئەبێ بەهۆی وەرگرتنی تۆبەیان، کەواتە ئەو کوشتنەی کە کردوویانە بە نەفامی و نەزانی و خوانەناسی بووە، بەڵام مەبەست بە بکوژەی ئێرە ئەو بکوژەیە کە بڕوای هێناوەو پاش بڕوا هێنان بڕوادار ئەکوژێ و ئەو پەیوەستی یە پیرۆزو بەڕێزە ئەپچڕێ لە پاش بڕوا هێنان و خواناسی مل پێچی و سەرکێشی ئەکات لە خوای میهرەبان، کەواتە ئەم جیاوازە و وەك ئەوی تر نی یە بەڵام کۆمەڵ و جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن کە تۆبەی بۆ هەیەو قاپی تۆبە داناخرێ تا مردن و کاتی نائومێدی وەك لە چەند حەدیسی زۆرو زەبەنەدا هاتووە چ دەربارەی ئوممەتەکانی رابردوو، چ دەربارەی ئەم ئوممەتە کە بێگومان بەڕێزترینی هەموانە و لە هەمووان زیاتر جێگەی لێ بوردن و میهرەبانی خوایە، سەبارەت بە ئایەتەکە وا نیشان ئەدات ئەو بکوژە هەمیشەیی ئەبێت لە دۆزەخ دا، چەند وەڵامێك دراوەتەوە:

١- مەبەست بەم بکوژە کەسێکە کە ئەو کوشتنە بە حەڵاڵ دابنێ، دەی دیارە بە حەڵاڵ دانانی هەرشتێك کە خوا حەرامی کردبێ کوفرو بێ بڕوایی یە.

٢- مەبەست کەسێکە کە بڕوادارە کە بکوژێ لەبەر ئەوە کە بڕوادارە. دەی بێگومان هەرکەسێك بەو جۆرە بێت موسڵمان نی یە و دژی ئیسلامە و هەرکەسیش بەو جۆرە بێت پەیوەندی بە ئیسلامەوە نی یە.

٣- مەبەست لە ئایەتەکە ئەوەیە: تۆڵەی ئەو بکوژە ئەوەیە، ئیتر با ئەو تۆڵەیەی لێ نەسێنرێ و ئەوە بکرێ هەر بە تۆڵەی بێ بڕواکان.

٤- لە زمانی عەرەب دا وتەی(خلود) بە دوو جۆرە بەکار ئەهێنرێ:

أ- نەبڕانەوەو دوانەهاتن.

ب- درێژەکێشانی زۆر، ئەوەتا بەکارئەهێنرێ بۆ بەند کردنی دوورودرێژو ئەوترێ:(سجن مخلد)، جا لێرەدا مەبەست دووەمە بە بەڵگەی ئەوە کە ئایەت و حەدیسەکانی تر مەبەستی یەکەم هەر بۆ بێ بڕوا بەکار ئەهێنن، هەرچەند ئەم وەڵامانە هەڵئەگرن بۆ رەخنە و لێکۆڵینەوە، بەڵام بە هەموویانەوە ئارام ئەدەن بەدڵ.

ئەم ئایەتانە دوو جۆر کوشتنیان باس کرد: هەڵە، دەستی قەست. ئینجا حەدیس جۆرێکی تری باس کرد کە پێی ئەوترێ: شبه العمد. واتە وەك دەستی قەست. کە ئەوەیە بەشتێك کوشتنەکە بکرێ کە زۆرتر کوشندە نەبێ، ئەمەیش هەر هۆی خوێن سەندنە. کوشتنی ناهەقی و دەستی قەست تۆڵەی تری هەیە کە بریتی یە لە رەوادانی کوشتنەوەی وەك لە سورەتی ﴿البقرة﴾ دا تێپەڕی کرد، کەواتە با فەرامۆش نەکرێت. ئینجا لەبەر بەرگری کردنی کوشتن با بە هەڵەش بێت، لەبەر پاك کردنەوەی دڵی بڕواداران لە هەر نیازو مەبەستێکی تر بێجگە لە نیازی رەزامەندی خوا، خوا فەرمان ئەدات بە بڕوادارەکان کە کاتێك دەرچوون بۆ غەزاو جەنگ لە رێی خوادا، لە یەکەم جارەوە ئەمان دەست نەکەن بە جەنگ و کوشتار هەتا بۆیان دەرئەکەوێت کە ئەو کەسە ئەیکوژن و جەنگی لەگەڵ ئەکەن بێ بڕوایە کە شایستەی ئەوەیە، هەرکەس بە رووکەش و رواڵەت بڕوادار بوو بە بێ لێکۆڵینەوە وازی لێ بێنن. ئەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە ﴿إِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ کاتێ کە دەرچوون بۆ جەنگ کردن لە رێی خوادا ﴿فَتَبَيَّنُواْ﴾ هەوڵ بدەن و بەدوای ئەوەدا بگەڕێن کە کاروبارتان بۆ روون ببێتەوە لە هەرشتێك دا کە ئەیکەن. واتە پەلە مەکەن و لە خۆتانەوە مەنیشنە مل بۆ هەر کارێك کە ئەیکەن هەتا بۆتان دەرئەکەوێ کارێکی شایستەیە و هیچ کەس مەکوژن تا دەرئەکەوێ بۆتان کە بێ بڕوایە و جەنگ ئەکات لەگەڵتان ﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَنۡ أَلۡقَىٰٓ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَٰمَ ﴾ نەڵێن بەو کەسانەی کە سڵاوی موسڵمانانەتان لێ ئەکەن. یان کەسێك کە مل کەچی و ئاشتیان ئاراستە ئەکات،

لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ فَتَبَيَّنُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿٩٤﴾

---

نەڵێن بەو کەسە: ﴿لَسْتَ مُؤْمِنًا﴾ تۆ بڕوادار نیت و لە ترس دا ئەوە ئەڵێت. بەڵکو ئەوەی کە دەری ئەبڕێ لێ ی وەرگرن و بە پێ ی ئەوە ڕەفتاری لەگەڵ بکەن، واتە بەناوی بێ بڕوایی یەوە مەیکوژن لە کاتێك دا ﴿تَبْتَغُونَ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ بە دوای شت و مەك و سامانی ئەم جیهانەدا ئەگەڕێن و نیازی ئەوە ئەکەن کە ئەوەش شتێکە بە زوویی نامێنێ و لە دەست دەرئەچێ، بەم ڕەنگە ئەو کەسە بکوژن و ماڵ و دارایی یەکەی داگیر بکەن شتی وا ئەکەن و بە دوای ئەوەدا ئەگەڕێن ﴿فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ﴾ چونکە لای خوا دەست کەوتی زۆر هەیە، کەواتە داوای دەست کەوت لە خوا بکەن و شتی وا نەڵێن بەو کەسە چونکە ﴿كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ﴾ ئێوەیش هەروەك ئەو کەسە وابوون لە پێشەوەو لە سەرەتای موسڵمان بوونتان دا، شایەتومان و وتەی موسڵمانێتیتان لێ بیستراوە هەر بەوە موسڵمان دانران، ئەو وتەتان لێ وەرگیرا و بە بێ ئەوەی چاوەڕوانی بکرێ ئایا بەدڵ ئەیڵێن یان هەر بەدەمی رووتە، یان مەبەست ئەوەیە: ئێوەش وەك ئەو کەسە وابوون لەسەرەتای هاتنی ئیسلام دا، بە ئاشکرا موسڵمانێتیتان دەرنەئەبڕی لە ترسی کەس و کارتان ﴿فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ﴾ ئینجا خوا منەتی نا بەسەرتان دا بە دامەزراندنتان لە ئیسلام و جێگیر کردنی بڕوا لە دڵتان دا، بەناوبانگ پەیدا کردن بە بڕوادار و پێشکەوتن لە ئیسلام دا، یان منەتی نا بەسەرتان دا بە کۆچ کردن و هێزو دەسەڵات تا موسڵمانێتی خۆتان دەربڕی و یارمەتی ئیسلامتان دا. یان مەبەست بیر خستنەوەی بارو حاڵی سەرەمی نەفامی یانە کە لێ پرسینەوەتان نەبوو پەلەتان ئەکردو بە دوای تەماع و دەست کەوت دا ئەگەڕان، واتە ئێوە لە پێش ئیسلام دا بە خوویی ڕژێم و بێ سنوور بوون، ئینجا خوا منەتی نا بەسەرتان دا بە ئیسلام، کەواتە مەگەڕێنەوە بۆ بارو حاڵی سەردەمی نەفامی، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿فَتَبَيَّنُوٓاْ﴾ هەڵئەگرێ ئەمە هەر دووبارە کردنەوە بێت بۆ فەرمانە پێشووەکە، بۆ بەهێزکردنی دڵنیا کردن لەسەری هەڵئەگرێ لە مەبەست دا جیاواز بێ لە پێشووەکە، واتە کاتێ کار بەو جۆرەیە کە وتمان، کەواتە هەوڵ بدەن تا دەرکەوێ حاڵی ئەو کەسە، حاڵی ئەو بەراورد بکەن لەگەڵ حاڵی خۆتان دا،

کردەوەیەکیان لەگەڵ بکەن کە لەگەڵ خۆتان کراوە لەسەرەتای موسڵمان بوونتان، کە ئەو وتەتان لێ وەرئەگیرا بێ هەوڵدان بۆ دەرکەوتنی ئەوەی کە لە دڵتان دایە، یان ورد ببنەوەو کاروبارتان روون بکەنەوە تا نەگەڕێنەوە بۆ بارو حاڵی سەردەمی نەفامی، یان مەبەست ئەوەیە: لە داهاتوودا شت بە روونی وەرگرن و بیکەن تا نەگەڕێنەوە بۆ وێنەی ئەم کردەوەی کە کردتان. ئینجا بەڵێن ئەدا بە گوێ رایەڵانی ئەم فەرمانە و هەڕەشە ئەکات لە نافەرمان و سەرکێشان، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا﴾ بەڕاستی خوا هەمیشە ئاگادار و هەر ئاگادار بووە بە هەر کردەوەیەك کە ئێوە ئەیکەن، هەموو نیازو وتارو کردارتان ئاشکرایە لای. چەند ریوایەتێکی زۆر هاتووە لە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەدا: کورتەو پاڵفتەی هەموویان ئەمەیە کە دەستەیەك لە موسڵمانان دەرئەچن بۆ غەزا، تووشی پیاوێك ئەبن لەو وڵاتەدا، بڕکەیەك ئاژەڵی لەگەڵە، ئینجا ئەو کابرایە سڵاو ئەکات لێ یان بۆ ئەوەی بە موسڵمانی دابنێن، ئینجا یەکێ لەو موسڵمانانە لای وا ئەبێ کە ئەو وتەیە بە دەمی رووت ئەڵێ و مەبەستی رزگار بوونە لەدەستیان، لەبەر ئەوە ئەیکوژێ. ئینجا بەو بۆنەیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە و بێزاری دەربڕی لەو کردەوەو جڵەوگیریی کرد لە کردەوەی وا، ئا بەو جۆرو شێوە قورئان دەست کاریی دڵەکان ئەکات، بۆ ئەوەی زیندوو ببنەوە و خۆیان بپارێزن و بیر بکەنەوە لە چاکە و بەهرەی فراوانی خوا بەسەر بڕوادارانەوە، لەسەر بنەڕەتی هەست و هۆش و وریا بوونەوە و خۆپارێزی یاسا و بڕیارەکانی دائەمەزرێنێ، لە پاش راگەیاندنیان بە روونی ئا بەو جۆرو شێوە نایابە قورئان چواردە چەرخ لەمەو بەر ئەم چەند یاسا دەوڵەتی یانەی داهێنا و چەسپاندی و بە کردەوە بەدی هێنا لە ژیان دا.

بێگومان مەبەستی گرنگ و سەرەکی لە ئایەتەکانی رابوردوودا ئەگەڕایەوە بۆ باسی تێکۆشان و جەنگ و فیداکاری لە رێی خوادا، ئینجا هەر لەسەر ئەو بنەڕەتە چەند ئایەتێك دێت کە مەبەستی سەرەکی و بنەڕەتی بریتی یە لە باسی پێویستی کۆچ کردن بۆ وڵاتی ئیسلام، هاندانی ئەوانەی کە دواکەوتوون و بەجێ ماون، لەسەر راپەڕین و کۆچ کردن و هاتنیان بۆ رێزی ئەو موسڵمانانەی کە تێکۆشەرن بە گیان و بە ماڵ لە رێی خوادا، کەواتە مەبەستەکان زۆر پەیوەستن پێکەوە تا رادەیەك وەك یەك مەبەست وان، لە یەکەمجارەوە دوو ئایەت ئەهێنێ کە زۆر پاڵدەر و هاندەرن لەسەر فیداکاریی و تێکۆشان، لەسەر راپەڕین و وازهێنان لە دانیشتن و تەمەڵی و سستی کردن،

لَا يَسْتَوِى ٱلْقَـٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِى ٱلضَّرَرِ وَٱلْمُجَـٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ فَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَـٰهِدِينَ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى ٱلْقَـٰعِدِينَ دَرَجَةً

**ئەفەرموێ: ﴿لَّا يَسْتَوِى ٱلْقَـٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ دانیشتوان لە تێکۆشان لە ڕێی خوادا لە کۆمەڵی بڕواداران کە ﴿غَيْرُ أُوْلِى ٱلضَّرَرِ﴾ خاوەن زیان نەبن. واتە کوێرو شەل و نەخۆش و دەستە پاچەن، ئەوانە ﴿وَٱلْمُجَـٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ﴾ تێکۆشەران بە ماڵیان و بە گیانیان لە ڕێی خوادا یەکسان نین و چوون یەك نین، بەڵکو بەم جۆرەن کە ئەفەرموێ: ﴿فَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَـٰهِدِينَ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ﴾ ئەو تێکۆشەرانە بە ماڵیان و بە گیانیان خوا باوی داون ﴿عَلَى ٱلْقَـٰعِدِينَ دَرَجَةً﴾ بەسەر ئەو دانیشتەوانەدا کە دەستە پاچە و زیاندار نین بە باودانێکی زۆر گەورە و گرنگ، یان بە یەك رادە و پلە کە پلەی کردەوەکەیانە. واتە تێکۆشەران و دانیشتوان وەك یەك بڕوادارن بەڵام تێکۆشەران رادەو پلەیەکی زیادیان هەیە کە کردەوەو تێکۆشانەکەیانە.**

**دەقی ئەم ئایەتە وانیشان ئەدات کە لەو کاتەدا لەلایەن هێندێ لە موسڵمانانەوە گیرو گرفت بووبێ لەبارەی فیداکاری و گیان و ماڵ بەخت کردن لە ڕێی ئیسلام دا، ئیتر ئەو موسڵمانانە ئەوانە بووبن کە دواکەوتن لە کۆچ کردن لەبەر پارێزگاری گیان و لەشیان لە سزاو ئازار و بەند کردنیان لەلایەن ئەو بێ بڕوایانەوە، ئایا مەبەست ئەو موسڵمانانە بووبێ – وەك لە رووکەش و رواڵەتی ئایەتەکەدا هاتووە ئەوە وەرئەگیرێ – یان مەبەست هێندێ لە موسڵمانانی مەدینە بووبێ کە سستی یان تیا بوو نەك وەك ئەوانی تر کە زۆر بە سۆزو پەرۆش بوون بۆ فیداکاریی، یان مەبەست هەردوو تاقمەکە بووبێ، لەسەر هەربار ئایەتەکە لەوانەدا هاتووەتە خوارەوە، بەڵام – وەك باوی خۆی – ئایەتەکە بە یاسایەکی گشتی هات بە بێ ئەوەی ببەسترێتەوە بە هیچ کات و هیچ بارو هیچ دەستە و تاقمێکەوە، بەم رەنگە بڕیاری دەرکرد کە تێکۆشەران و دانیشتوانی ساغ و لێ هاتوو چوون یەك نین، بەڵکو بەو جۆرەی کە بیستمان باوی یەکەمی دا بەسەر دووەم دا، ئینجا ئەو تاقمە دانیشتووە هەرچەند کەم و کوڕی یان بووە و نەگەیشتوونەتە رادەو پلەی تێکۆشەران، هەرچەند وا بووبێ، بەڵام بڕوادار و دڵسۆز بوون بۆ ئیسلام، ئەو بڕواو دڵسۆزی یەش زۆر بەنرخە، بەهۆی بڕواو دڵسۆزی یەکەیانەوە چاوەڕوانی خێرو چاکە و تێکۆشانیان لێ ئەکرێ.**

وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَفَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٩٥﴾ دَرَجَٰتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةً ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٩٦﴾

جا لەبەر ئەوە شایستەی ئەوەن کە بەشداریان بکات لەگەڵ ئەو تێکۆشەرانە لەم بەڵێنەدا کە ئەفەرموێ: ﴿وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ﴾ هەرکام لەو دوو تاقمە خوا بەڵێنی پاداشتێکی جوان و شیرینی پێ ئەدا، واتە بەهەشت وەك(قتادة) و چەند کەسێکی تر ئەفەرمون. ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ سەر یاسا گشتی یەکە روونتر و دامەزراوتری ئەکات، دڵنیایی لەسەر ئەکات، بە فراوانتر نیشانی ئەدات، بە گرنگتر هان ئەدا و سەرنج ڕائەکێشێ بۆ ئەو ئەجرو پاداشتەی کە بەهۆی تێکۆشان و فیداکاری یەوە دەست کەوت ئەبێ، ئەفەرموێ: ﴿وَفَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ خوا باوی ئەو تێکۆشەرانەی داوە بەسەر ئەو دانیشتوانە، ئینجا ئەو ئەجرو بەهرە گەورەیە روون ئەکاتەوە بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿دَرَجَٰتٍ مِّنْهُ﴾ باویان ئەدات و پاداشتیان ئەداتەوە بە چەند رادەو پلەیەکی گەورە و گرنگە لەلایەن خۆیەوە، ئەو رادەو پلەیانە لە چەند حەدیسێك دا ئاماژەیان بۆ کراوە، یەکێ لەوانە حەدیسی بوخاری و موسلیمە کە لە(ئەبو سەعیدی خودری) یەوە ئەیهێنێ کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: بێگومان لە بەهەشت دا سەد پلە هەیە کە خوا ئامادەی کردووە بۆ تێکۆشەرانی ڕێگەی خۆی، ماوەو نێوانی هەموو دوو پلەیەك وەك نێوان ئاسمان و زەوی وایە: لەمەوپێش بڕوامان ئەهێنا بەم جۆرە فەرمودەیانە و بۆچوون و تێگەیشتنمان پەی پێ نەئەبردن، بەڵام خوا کارێکی وای کرد، ئەوەندە شتی نهێنی نایابی بوونەوەرەکەی دەرخست بۆمان ئێستا بۆچوون و تێگەیشتنی ئەم جۆرە شتانە هیچ ئەرك و قورسی یەکی نەماوە لە دەروون دا، ئەوەتا ئێستا گەورەیی و فراوانی ئەم بوونەوەرە دەرکەوت تا رادەیەك کە ئەڵێن: لە ڕێگەی زانیاری یەوە دەرکەوتووە کە رووناکی و تیشکی ئەستێرەی وا هەیە بە سەدان ساڵ رووناکی ئەگاتە ئێمە یان ئەستێرەیەکی تر!!

خوای گەورە باوی ئەو تێکۆشەرانە ئەدات و ئەو رادە و پلەیانەیان پێ ئەبەخشێ ﴿وَمَغْفِرَةً﴾ سڕینەوەو لێ بوردن لە هەڵە و کەم و کوڕی یان بە جۆرێ کە ئەوە تایبەتی بێت بەوانەوەو بۆ دانیشتووان نەبێ ﴿وَرَحْمَةً﴾ میهرەبانی یەکی گەورەیان لەگەڵ ئەکات و پێ یان ئەبەخشێ، ﴿وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ خوا هەمیشە لێ بوردەی میهرەبانە، کەواتە ئەو تێکۆشەرانە بەهرەمەند ئەکات بەو سڕینەوەو میهرەبانی یە. ئەو دانیشتوانە لە بڕواداران کە دەستە پاچە و زیانبار ئەبن بەو جۆرە خوا باوی تێکۆشەران ئەدات بەسەریان دا، بەڵام دانیشتوانێك کە دەستە پاچە و زیانبارن و تێکۆشانیان پێ ناکرێ، بەڵام بە سۆز و پەرۆشن بۆی، نیازو نیەتیان پاکە ئەوانە خوا ئەیانباتە ریزی تێکۆشەران و یەکسانیان ئەکات وەك لە چەند حەدیسێکەوە دەرئەکەوێ: یەکێ لەو حەدیسانە حەدیسی ئیمامی موسلیمە کە ئیمامی نەوەوی لە(ریاض الصالحين) دا ئەیهێنێ لە ئەنەسەوە - خوای لێ رازی بێت - کە ئەفەرموێ: کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) لە تەبووك گەڕایەوە نزیکی مەدینە بوونەوە، فەرموی: بێگومان چەند کەسێك هەن لە مەدینەدا ئێوە هەر رۆیشتنێکتان کردبێ و هەر شیوێکتان بڕیبێ ئەوانتان هەر لەگەڵ بوون، ئەوانیش عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خوا ئەوان وان لە مەدینەدا؟ ئەویش فەرموی: بەڵێ. وان لە مەدینەدا عوزرو نەتوانین بەندی کردن تا نەیانتوانی بێن. تەفسیرەکەمان لەسەر ئەوە کردەوە کە مەبەست بە دانیشتوان لە هەردوو شوێنەکەدا دانیشتوانی ساغ و لێ هاتوون کە بەم جۆرە لە دڵ دا جێگیر ترە و رای زۆرتر لە زانایانی باوەڕ پێ کراوی لەسەرە، هێندێ لەسەر ئەوەن کە لە هەردوو شوێنەکەدا مەبەست دانیشتوانی دەستە پاچەی زیانبارە. مەبەست بە دووەم دەستە پاچەی ساغی لێ هاتووە، هەروەها پایەو پلەکانیش بە چەند جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام لە راستی دا زۆربە و حەدیس یارمەتی ئەو ئەدەن کە ئێمە کردمان بە تەفسیر، لەسەر هەربارو بەهەرحاڵ ئەو هەموو مزگێنی و بەڵێنە گەورەیە لێرەدا دەربارەی تێکۆشەران دوو شت نیشان ئەدەن:

١- لەم ئایەتانەوە دەرئەکەوێ - لە پێشیشەوە وتمان - کە لەناو ئەو گەل و کۆمەڵە موسڵمانەدا ناتەواوی و کەم و کوڕی بووە و ئەم ئایەتانە هاتن بۆ چارەسەری ئەو ناتەواوی و کەم و کوڕی یە، ئینجا لەمەوە باشتر تێ ئەگەین لە دەروون و سروشتی

ئادەمی، بۆمان دەرئەکەوێ کە گەل و کۆمەڵ هەرچەند لە بڕوا و پەروەردە کراوی دا تێرو تەواو و بەرز بێت، هەمیشە پێویستی هەیە بە ئامۆژگاری و وریا کردنەوە بۆ بەرگری و چارەسەرکردنی هەر لاوازی و کەم و کوڕی یەك کە رووی تێ بکات بەرامبەر ئەرك و تەکلیفاتێ کە ئەخرێتە سەر شانی، بە تایبەتی ئەرکی تێکۆشان و فیداکاریی بە ماڵ و بە گیان، لەگەڵ نیاز پاکی و لێ بڕان بۆ خوا، ئینجا بوونی ئەو ناتەواوی و کەم و کوڕی یە نابێ ببێ بەهۆی نائومێدی و واز هێنان لەو گەل و کۆمەڵە ماتووڵ ئەندامی پاك و خاوێن و تێرو تەواو هەبێ لەناویان دا، مەبەست لە داننان بە بوونی ئەو ناتەواوی و کەم و کوڕی یانەدا ئەوە نی یە کە بوونی ئەوانە شتێکی سروشتی یە و بە ناچاری هەن و نابێ بکرێن بە رەخنە و پێویست نی یە بە چارەسەر کردن، بەڵکو مەبەست ئەوەیە نابێ سەرسوڕ بمێنێ لە بوونی ئەو جۆرە شتانە، نابێ وازیشیان لێ بهێنرێ و چارەسەر نەکرێن.

٢- لەم ئایەتانەوە بۆمان دەرئەکەوێ نرخ و گرنگی تێکۆشان و فیداکاری لە رێی خوادا، وەك بۆمان دەرئەکەوێ کە تێکۆشان و فیداکاریی شتێکی سەرەکی و بنەڕەتی یە لەم ئایینەدا و بە بێ ئەوە کاروباری ناڕوا و بەدی نایەت، خوا پێویستی کردووە و نووسیویەتی لەسەر بڕواداران، چونکە خوا زانایە بە هەموو شتێ، زانا و ئاگایە بە سروشتی رێگەکە، بە سروشتی ئادەمی، بە سروشتی دوژمنەکانی ئەم ئایینە، ئینجا شتێکی ئاشکرایە کە ئەو تێکۆشان و فیداکاری یە شتێکی کاتی و تایبەتی نەبووە بەو سەردەمەوە، بەڵکو شتێکی پێویستە بە ناچاری و لەگەڵ ئەم بانگ و بانگەوازی خوادا هات و هەمیشەیی یە تا رۆژی دوایی وەك لە حەدیسی سەحیح دا هاتووە و وەرگیراوە لەناو زانایان دا: ﴿الجيهاد فريضة ماضية إلي يوم القيامة﴾ تێکۆشان لە رێی خوادا پێویست کراوێکی بەردەوامە هەتا رۆژی دوایی!

مەسەلەی ئەو تێکۆشانە بەم جۆرە نی یە – وەك هێندێ گومانی بردووە – کە ئیسلام هات لە چەرخی ئیمپراتۆری یەتەکان دا، کە خاوەنی هێزو لەشکرو چەکی فراوان بوون، بەهۆی ئەوەوە موسڵمانەکانیش لەوانەوە فێر بوون و بۆچوونیان لەسەر ئەوە دامەزرا کە

پێویستە بۆ ئەمانیش هێزێکی چەکداری زاڵ بۆ بەرگری دەست درێژیی دوژمن. بەڕاستی ئەم ئایەتە و وێنەیان شایەتن لەسەر ناڕاستی و ناڕەوایی ئەو جۆرە قسە و گومانە پڕو پووچانە، لەسەر ئەوەی ئەو گومانبەرانە یان دوژمنی ئیسلامن و ئەیانەوێ بە ناوی ئیسلام و لە دیمەنی ئیسلام دا موسڵمانە نەشارەزاکان هەڵە بکەن و دووریان بخەنەوە لە ئیسلام و موسڵمانان بخەوێنن تا دوژمن خۆیان و وڵاتیان داگیر ئەکات – وەك رووی دا بەهۆی وازهێنان لە تێکۆشان – یان ئەو گومان بەرانە زۆر دوورن لە ئیسلام و بە هیچ جۆر حاڵی نەبوون لە ئیسلام. ئەگەر تێکۆشان لە رێی خوادا شتێکی کاتی و تایبەتی بوایە، ئەو هەموو ئایەتە نەئەهاتە خوارەوە، هەروەها ئەو هەموو حەدیسە لەبارەیەوە نەئەهاتن، بەو جۆرە گرنگ نەئەگیرا و ئەو هەموو دڵنیایی یەی لەسەر نەئەکرا. ئەگەر ئەوەندە پێویست و گرنگ نەبوایە ئەو حەدیسە سامناکەی لەبارەوە نەئەهات کە خاوەنی(مصابیح السنة) لە کتێبە سەحیحەکان دا دەری هێناوە: ﴿من مات و لم یغزو ولم یحدث نفسه بغزو مات علی شعبة من النفاق﴾ هەرکەسێك بمرێ و غەزای نەکردبێ و، لە دەروونی خۆی دا باسی نەکردبێ و مەیلی نەکردبێ، ئەو کەسە لەسەر شێوەو رێگەیەکی ناپاکی ئەمرێ. ئینجا ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) لە هێندێ کات دا لەبەر هۆیەکی تایبەتی فەرمانی نەدابێ، وەك ئەوەی کە لە حەدیسی سەحیح دا هاتووە کە پیاوێك عەرزی پێغەمبەری کرد(ﷺ) کە ئەمەوێ جەنگ بکەم لە رێی خوادا، ئەویش فەرموی: ئایا باوك و دایکت هەیە؟ پیاوەکەش وتی: بەڵێ. ئەویش فەرموی: کەواتە تێکۆشان بکە دەربارەی باوك و دایکت. شتی وا کە بووبێ شتێکی تایبەتی و لەبەر هۆیەکی تایبەتی یە و ناوەستێ لەبەردەم ئەو یاسا گشتی و هەمیشەیی یەدا، کۆمەڵی موسڵمانانی تێکۆشەران دانامێنن و دەستە پاچە نابن بە نەبوونی تەنیا کەسێك، ئینجا پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) کە ئاگادارو شارەزا بووە بە بارو حاڵی یەکە یەکەی هاوەڵەکانی، بێگومان بۆی دەرکەوتووە کە حاڵ و باری ئەوانە داخوازە بۆ ئەوەی کە بەو جۆرە بفەرموێ و فەرمان بدات. کەواتە با هیچ کەس نەڵێ و گومانی وانەبێ کە تێکۆشان شتێکی کاتی و تایبەتی بووە بەو چەرخ و سەردەمە تایبەتی یەوە، بەڵکو با تێ بگات لە گرنگی تێکۆشان و لەسەر بارە راستەقینەکەی خۆی بیناسێ و تێی بگات. ئەوەش لەبەر

ئەوە نی یە کە ئیسلام ئەبێ بگرێ بە دەستەوە و بەم لاو لادا مەردوم داپاچێ، نەخێر بێگومان وا نی یە و ئیسلام بەزەیی دارو میهرەبانە، بەڵکو لەبەر ناچاری یە و واقیعی ژیان و سروشتی بانگ کردنەکە ناچاری ئەکات کە شمشێر و چەك بەکار بێنێ و هەمیشە وریای خۆی بێت! بێگومان خوا زانیویەتی کە زۆرداران و ستەمکاران دژی ئەم ئایینە ئەبن، زانیویەتی کە ئەوانە جیاوازو دژی یەکترن، یەك ناکەون و یەکگرتنیان نەبووە و نی یە و نابێ هەرگیز. خوا زانیویەتی کە شەڕ و ناهەقی سەرکێش و یاخی یە، هەرگیز ناتوانێ دان بنێ بە هەق و خێرو راستی دا، هەرگیز وازناهێنێ و بێ دەنگ نابێ لەوەی کە خێرو هەق و راستی گەشە بکات و لە رێی خۆیەوە بڕوا – هەرچەند خێرو راستی رێی ئاشتی بدەنەبەر – چونکە تەنها گەشە کردنی خێر خەتەرە بۆ سەر شەڕ، تەنها بوونی هەق خەتەرە بۆ سەر بەتاڵ. بێگومان ئەبێ شەڕ دەست بکات بە دوژمنایەتی و دەست درێژیی، ئەبێ بەتاڵ بکەوێتە تێکۆشان بۆ بەرگری لە خۆی بە نەهێشتن و خنکاندنی هەق و راستی. شتێکی روون و ئاشکرایە کە سروشتی کارەکە بەو جۆرەیە، پێویستە بوونی تێکۆشان لە هەموو بارو شێوەیەکەوە، پێویستە لە دەروونەوە دەست پێ بکات، ئینجا دەرکەوێ لە رووی راستی و لە ژیان دا، پێویستە بەرەنگاری شەڕی چەکدار بە خێری چەکدار، پێویستە بەرگری و بەرەنگاری ناهەق و بەتاڵی بەهێز بە چەك و بەهێز، ئەگینا ئەبێتە خۆکوشتن و خۆ لەناوبردن بە بێ سوود و بێ هودە کە ئەوەش دروست نی یە، یان ئەوە ئەبێ بە لاقرتی و گاڵتە کردن کە شایستە نی یە بۆ بڕواداران! پێویستە فیداکاری بە ماڵ و بە گیان، وەك خوا داوای کردووە لە بڕواداران، وەك خوا ئەیکڕێ لە بڕواداران و لە باتیدا بەهەشتیان پێ ئەدات، ئینجا ئەو بڕوادارە یان خوا زاڵی ئەکات، کەواتە بڕوادار یەکێ لەو دوو شتە چاکەی. بۆ ئەبێ لەلایەن خواوە، بێگومان هەموو کەس ئەبێ بمرێ دەی بۆچی بە شەهیدی نەمرێ. مەسەلەکە بەو جۆرەی کە گوترا روون و رەوان و ئاشکرایە و ناشاردرێتەوە و هەرکەسێك هەر دەمە قاڵێ یەکی تیا بکات هەر دەمبازی بۆ ئەمێنێتەوە.

إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَالُواْ فِيمَ كُنتُمۡۖ قَالُواْ كُنَّا مُسۡتَضۡعَفِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ قَالُوٓاْ أَلَمۡ تَكُنۡ أَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٗ فَتُهَاجِرُواْ فِيهَاۚ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ

---

ئینجا قورئان باسی دەستەیەك ئەكات كە تێكۆشان ناكەن و ئەمێننەوە لە ولاتی بێ بڕوایی دا و كۆچ ناكەن بۆ ولاتی ئیسلام، ماڵ و سامان و بەرژەوەندی ئەم جیهانەیان راگیری كردوون و هێشتوونی یەتەوە، یان ئەیانەوێ تووشی ماندوویی نەبن و باری رەحەتی لە خۆیان تێك نادەن، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە ئەتوانن كۆچ بكەن. بەڵام نایكەن تا كاتی مردنیان دێت و ئەو كاتە فریشتەی گیان كێشان دێتە سەریان بۆ گیان كێشانیان، قورئان باسی ئەو دەستەیە ئەكات، شێوەیەكی زۆر ناشیرین و بێزراویان ئەخاتە بەرچاو، بەجۆرێ دڵ و دەروونی ئەو دانیشتوانە ئەخاتە بزووتنەوەو پەلامار دان بۆ دەرچوون و كۆچ كردن بە خۆیان و ئایین و بیرو باوەڕەكەیانەوە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ﴾ بەڕاستی ئەوانەی كە فریشتە گیانی كێشاون ﴿ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمۡ﴾ لە كاتێك دا كە ئەوانە ستەمیان لە خۆیان كردووە بە كۆچ نەكردن و مانەوە لە ولاتی بێ بڕوایی دا و رازی بوون بە هاوسێ یەتی بێ بڕواكان ﴿قَالُواْ فِيمَ كُنتُمۡ﴾ فریشتەكان لە كاتی گیان كێشانیان دا بە تەشەرەوە بەوانە ئەڵێن: ئایا ئێوە لەچیدا بوون لەبارەی ئایینتانەوە؟ واتە لە هیچدا نەبوون و بەردەستی ئایینەكەتانەوە نەبوون و گوێتان لێ ی نەبوو، ئەوانیش هیچ شتێكیان بە دەستەوە نی یە كە بیكەن بە بەڵگە و بەرپەرچی فریشتەكانی پێ بدەنەوە، بەڵكو بیانوو ئەهێننەوە لەسەر هیچ و پووچی یەكەی خۆیان بەمەی ﴿قَالُواْ﴾ ئەڵێن: ﴿كُنَّا مُسۡتَضۡعَفِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ ئێمە داگیر كراو و ژێر دەستە بووین لەو خاك و ولاتەی كە تیای دا بووین، لەبەر ئەوە نەمان ئەتوانی هەڵسین بە پێویستی سەرشانمان لەناو ئەو زۆردارانەدا، ئینجا فریشتەكانیش بەرپەرچیان ئەدەنەوەو بیانووەكەیان وەرناگرن بەمەی ﴿قَالُوٓاْ﴾ پێ یان ئەڵێن: ﴿أَلَمۡ تَكُنۡ أَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٗ فَتُهَاجِرُواْ فِيهَاۚ﴾ ئایا خاك و ولاتی خوا فراوان نەبوو تا كۆچتان بكردایە تیای دا و لە شوێنێ خۆتانەوە دەرچوونایە بۆ ولاتێكی تر كە ئازاد و سەربەست بوونایە و بتانتوانی بایە هەڵسن بە داخوازی و پێویستی ئایینەكەتان، كەواتە بەهانە و بیانووەكەتان بێ جێ یە و وەرناگیرێ.

بەڕاستی وێنە و شێوەیەکی سامناکە و ئەو وت و وێژە زۆر کاریگەرە لە هەر دڵێکی وریادا: وێنەو چەشمەندازی کاتی گیان کێشان کە مووچرکە ئەهێنێ بە لەش دا دڵ ئەهێنێتە لەرزە، ئینجا بیر کردنەوە لە ئامادە بوونی ئەو فریشتانە و دەرکەوتنیان لەو کاتە سەختەدا بە بێزاری دەربڕین و تەشەردانەوە، هاتنیان لەسەر ئەو بارو شێوەیە بۆ گیان کێشانیان لە کاتێك دا کە ئەوانەش تاوانبار و ستەمکارن، فریشتەکانیش کردەوەی خراپ و کاتی رابردووی بەدی ئەو تاوانبارانە ئەخەنەوە بەرچاو، بەڕاستی وێنە و شێوەیەکی زۆر ئابڕووبەر و دڵ تەزێنە!! قورئان بەو جۆرە دەست کاری دەروونی مەردوم ئەکات، ئەیەوێ خێرو مرۆڤایەتی و مەردایەتی بهێنێتە بزووتنەوە و جۆش، شەڕ و لاوازی و چرووکی و تەمەڵی و سەرشۆڕێتی لێ دوور بخاتەوە، لەبەر ئەوە لێرەدا ئەو شێوە و وێنە سامناك و بێزراوەی خستە بەرچاو کە لەو کاتەدا دەستەیەك پێوە دەردەدار بوون، وەك چەند دەستەیەکی تر کە لە زۆر کات دا بوون و هەن و ئەبن. ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە دەربارەی دەستەیەك کە لەو کاتەدا کۆچیان نەکرد لە پاش کۆچ کردنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە و پەیدا بوون و پێك هێنانی دەوڵەتی ئیسلام، ئەوە بوو کۆمەڵێك مانەوە لە مەککەدا و کۆچیان نەکرد و ئەیانتوانی کۆچ بکەن، بەڵام دڵیان نەئەهات دەست هەڵگرن لە ماڵ و دارایی یان و بەرژەوەندی یان، یان مەترسی یان ئەکرد کە قورەیش رێ یان لێ بگرن و بیانگێڕنەوە و بەندیان بکەن و سزاو ئازاریان بدەن، دەربارەی ئەمانە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە و ناوی بردن بە ستەمکار لە خۆیان، چونکە خۆیان بێبەش کرد لە ژیان لە وڵاتی ئیسلام دا، ئەو ژیانە بەرز و بەڕێزو پاك و خاوێنە بە ئازادی و سەربەستی، رازی بوون بە ژیان لە وڵاتی بێ بڕوایی دا، بە ژیانی سەرشۆڕیی و ژێر دەستەیی بە ئەوپەڕی ریسوایی و چەوساوەیی، لەبەر ئەوە ئەو وێنە و شێوە سەختەی بۆ باس کردن و لە کۆتایی دا ئەم هەڕەشە سەخت و سامناکەیشی لێ کردن: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُ﴾ ئەوانەی کە باس کران جێ و شوێنیان لە رۆژی دوایی دا دۆزەخە، هەرچۆنێ لە جیهان دا جێ و شوێنیان وڵاتی بێ بڕوایی و هاوسێ یەتی بێ بڕوایان بوو.

وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾ إِلَّا ٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلۡوِلۡدَٰنِ لَا يَسۡتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهۡتَدُونَ سَبِيلًا ﴿٩٨﴾ فَأُوْلَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعۡفُوَ عَنۡهُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٩٩﴾

---

﴿وَسَآءَتۡ مَصِيرًا﴾ دۆزەخ چارەنووس و پاشەڕۆژێکی زۆر بەد و خراپە. لەپاش پەیدا بوونی دەوڵەتی ئیسلام لە مەدینەدا، لە پاش غەزای بەدرو سەرکەوتنی موسڵمانان، بت پەرستەکانی قورەیش دەستیان کرد بە سزاو ئازار دانی ئەو موسڵمانانەی کە لە مەککەدا مابوونەوە، بە هەر جۆر لە دەستیان بهاتایە و ئارەزوویان بکردایە، ئەیانویست بەوە پاشگەز ببنەوەو لە ئیسلام هەڵگەڕێنەوە. وەك هێندێ لەوانە ناچاربوون بەوەی بێ بڕوایی خۆیان دەربڕن و بەشداری بت پەرستەکانیان کرد لە پەرستنی بتەکانیان دا، لەبەر پاراستنی گیان و مافیان، ئەو خۆپارێزی یە لە یەکەمجارەوە دروست بوو، پێش پەیدا بوونی دەوڵەتی ئیسلام، بەڵام لە پاش پێك هاتنی دەوڵەتی ئیسلام کە مەردوم ئەیتوانی وڵات بەجێ بهێڵێ و پەنای پێ بەرێ، لەپاش ئەوە ئیتر ئەو خۆپارێزی یە قەدەغە بوو، بێجگە لەوانە هێندێك هەر بە تەواوی هەڵگەڕانەوە، جا وا دەرئەکەوێ ئەم ئایەت و هەڕەشەیە دەربارەی ئەوانە هاتبێ. بەڵگە لەسەر ئەوە ئەمەیە کە تەنها ئەوانەیان دەرئەکات لەو بڕیارو هەڕەشەیە کە منداڵ و ئافرەت و پەك کەوتەن و دەسەڵاتی هیچیان نی یە، ئەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلۡوِلۡدَٰنِ﴾ بێجگە لە بێ دەسەڵات و ژێر دەستە کراوان لە پیاوان و ئافرەتان و منداڵان کە ﴿لَا يَسۡتَطِيعُونَ حِيلَةً﴾ توانای هیچ هۆی دەرچوون و کۆچ کردنیان نی یە، لەبەر نەخۆشی و کەوتە کاریی یا نەبوونی و بێ نەوایی ﴿وَلَا يَهۡتَدُونَ سَبِيلًا﴾ بە هیچ جۆر ڕێ دەرناکەن و نازانن بڕۆن بۆ ئەو شوێنەی کە بیانەوێ کۆچی بۆ بکەن ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعۡفُوَ عَنۡهُمۡۚ﴾ بەهۆی ئەوەوە ئەمانە ئومێد وایە کە خوا ببورێ لێ یان لەو کۆچ نەکردنەیان، ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا﴾ خوا هەمیشە لێ خۆش بووی میهرەبانە و هەر وابووە. وتەی ﴿عسى، لعل﴾ کە هیواو ئومێد ئەگەیەنن بە پێی زمانی عەرەب، نابێ لەسەر ئەو واتا و مەبەستە بەکار بهێنرێن بۆ خوا، لەبەر ئەوە هەرکاتێ لە فەرمودەی خوادا هاتن زانایان یەکێ لەم دوو بارەیان لێ گرتوون:

١- رووت نەکرێن لە هیواو ئومێدەکە و مەبەست پێ یان هەر بەڵێنی تەواوە بە شتەکە، وەك ئەڵێن: باوی بەخشندە و میهرەبان وایە کە بەو جۆرە وتەیانە بەڵێن ئەدات.

٢- رووت ناکرێن لەو هیواو ئومێدەی کە ئەیگەیەنن، بەڵام هیواو ئومێدەکە ئەگەڕێتەوە بۆ مەردوم و بەڵێن پێ دراوەکان، ئینجا لەسەر باری دووەم لێرەدا وا نیشان ئەدات کە کۆچ نەکردن ئەوەندە تاوانێکی گەورەیە مەترسی ئەکرێ لە تۆڵە و سزای هەرچەند بەهانەی ببێ بۆ نەکردنی، هەروەها لەسەر باری یەکەمیش هەر دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوە کە بەو وتەیە بەڵێنەکە ئەدات.

لە ئایەتەکەدا وا وەرئەگیرێ کە هەر منداڵێك توانای دەرچوون و کۆچ کردنی هەبێ و کۆچ نەکات تاوانبارە و بەری ئەو هەڕەشە و سزایە ئەکەوێ. لەگەڵ ئەوەدا منداڵ تا باڵغ نەبێ هیچی لەسەر نی یە و شەرع داوای هیچی لێ ناکات، کەواتە چۆن منداڵ باس کراوە؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا چەند شتێك گوتراوە، بەلامەوە بەهێزتر و باش ترینی ئەو وەڵامانە ئەمەیە کە خاوەنی(کشاف) دەست نیشانی بۆ کردووە، کە پاڵفتەکەی ئەمەیە: هۆی دەرکردنی ئەسێ تاقمە بێ دەسەڵاتی و دەستە پاچەیی یانە، کەواتە وەك فەرموبێتی: بێجگە لە بێ دەسەڵات و دەستە پاچەکان، دەی منداڵ بێجگە لەمە بارێکی تری نی یە و هەمیشە بێ دەسەڵات و دەستە پاچەیە و گومان بارێکی تری لێ ناکرێ تاوا بگەیەنێ لەسەر ئەو باری ترە داوا لێ کراو و سزا دراو ئەبن، بەڕاستی ئەم وەڵامەم بەلاوە زۆر ورد و تەواوە لەبەر ئەوە پەسەندم کرد و هەڵم بژارد!! ئینجا لە کۆتایی دا با بزانرێ کە حوکم و بڕیاری ئەم ئایەتە تایبەتی ناکرێ بەوانەی ئەو سەردەمە و مەککە و ئەو دەروبەرە، بەڵکو گشتی یە بۆ هەموو دەستە و چەرخ و وڵاتەکانی تریش، لەمەوبەر و ئێستا و داهاتوو، کەواتە هەر موسڵمانێك لە هەر وڵاتێك دا سزا بدرێ لەسەر ئایین و رێی لێ بگیرێ لەبەجێ هێنانی پێویستی سەرشانی لەبارەی ئایین و ئیسلامەوە ئەبێ ئەو وڵاتە بەجێ بهێڵێ و بچێ بۆ وڵاتێکی تر کە بتوانێ هەڵسێ بە پێویستی سەرشانی خۆی، مەگەر بەو جۆرو شێوەیە کە باس کرا بێ دەسەڵات و دەستە پاچە بێت لە دەرچوون و کۆچ کردن، نابێ هیچ شتێکی ئەم جیهانە ببەستێتەوە و راگیری بکات لەو وڵاتە بۆگەنەدا.

وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٠﴾

---

ئینجا لەبارێکی ترەوە دەست کاریی دڵی کۆچ کەران ئەکات بە ئارامی پێدان و دڵ خۆش کردن بەبەڵێن پێدانیان بە دەست کەوتنی جێ و شوێن بە خۆشی و کامەرانی، ئەگەر نەمردن لە ڕێگەدا بەڵام ئەگەر لە ڕێگەدا مردن، ئەوا خوا ئەجرو پاداشتی تەواویان ئەداتەوە، بە مەرجێك کۆچ کردنەکە بۆ خوا بێت و لە ڕێی خوادا، ئیتر بە بێ هیچ نیازو مەبەستێکی تر، ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ هەرکەسێك کۆچ بکات لە ڕێی خوادا ﴿يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ دەست ئەکەوێ لە وڵات دا ﴿مُرَٰغَمًا كَثِيرًا﴾ چەند جێ و شوێنێ زۆر کە کۆچی بۆ بکات و ببێ بەهۆی داخی دڵ و ڕیسوایی و سەرشۆڕیی ئەو گەل و کۆمەڵە دوژمنەی کە بە جێی هێشتبن، یان وەك(مجاهد) ئەفەرموێ: ببێ بەهۆی سەرفرازی و ڕزگار بوونی لە هەرشتێك کە بێزار بێ لێی و پێی ناخۆش بێ. ﴿وَسَعَةً﴾ دەستی ئەکەوێ فراوانی لە ڕۆزی و هۆی ژیانی دا. بێگومان کۆچ کردن مەترسی ئەو جۆرە شتانەی لێ ئەکرێ، لەبەر ئەوە خوای میهرەبانی ئاگادار بەسەر خەتەرەو خەیاڵی دەروون دا ئەدا لەدڵ و ئارام و بێ باکی ئەکات لەوانە، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ﴾ هەرکەسێك لە ماڵی خۆی دەرچێ ﴿مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ بە کۆچ کردن بۆلای خوا و پێغەمبەرەکەی لە ژیانی ئەودا، بۆ ڕاگیر کردن بڵاو کردنەوەی ئایین و شەریعەتەکەی لە پاش نەمان و لەدنیا دەرچوونی ﴿ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ﴾ ئینجا مردن پێی بگات و بێتە سەری پێش ئەوەی بگاتە مەبەست و جێ وشوێنی خۆی کە ئەیەوێ کۆچی بۆ بکات ﴿فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ﴾ بێگومان ئەجرو پاداشتی ئەو کەسە جێگیر و مسۆگەر بووە لەسەر خوا و پێویست بووە بە پێی بەڵێن و میهرەبانی خوا، ئەجرو پاداشتی کۆچ کردنی تەواو و گەیشتن بۆ وڵاتی ئیسلام و ژیان لە وڵاتی ئیسلام دا، هەرکەسێك بەو نیازە لەماڵی خۆی دەرچێ، ئیتر با زیاد لە یەك هەنگاوی نەنابێ و هیچ ئەرك و زەحمەتێك نەکەوتبێتە سەرشانی، زیاد لەو ئەجرو پاداشتە دەست نیشان ئەکات بە لێ بوردن و سڕینەوەی گوناهەکانی و میهرەبانی پێ کردنی لە حیساب و پرسیاردا. ئەفەرموێ: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ هەمیشە خوا زۆر لێ بوردەی میهرەبان بووە، کەواتە ئومێد وایە لێ بوردنی

لەوماوەی کە ئەو کۆچ کەرە دانیشت لەناو بێ بڕواکان دا پێش کۆچ کردنەکەی، ئومێد وایە کە پاداشتی تەواو بدات بەو کەسەی کە لەماڵ دەرچوو بە نیازی کۆچ کردنەوەو بەڵام مەرگ و مردن رێی لێ گرت. بەڕاستی بازرگانی و مامەڵەکەی ئێجگار سوود بەخش و پڕ لە قازانج بوو! لەسەر هەریەك هەنگاو کە نای بە نیازی کۆچ کردنەوە خوا پاداشتی تەواوی پێ ببەخشێ. هەنگاوەکەی کە بۆ کۆچ کردن بردی ببوایە و نەبوایە ئەو مردنە هەر ئەبوو. بەڵام بەو هەنگاوە مردنەکەی بوو بە مردنی کۆچ کەرێك لە رێی خوادا، ئەگەر ئەو هەنگاوەی نەیایە و بمردایە مردنی کەسێکی بەدی ستەمکار ئەبوو، ئەو ئەجرو پاداشت و سڕینەوەی گوناهو میهرەبانی خوای لە کیس ئەچوو. بەڕاستی دوو شتی زۆر جیاوازی دوورن لە یەکترەوە!!

لەم ئایەتانەی کە تێپەڕیان کرد لەبارەی تێکۆشانەوە چەند شتێکمان بۆ دەرئەکەوێ، بە کورتی باسی ئەکەین پێش ئەوەی بچین بۆ ئایەتەکانی تر:

١- بۆمان دەرئەکەوێ تا چ رادەیەك ئیسلا بێزار و دژە لە دانیشتن و وازهێنان لە تێکۆشان لە رێی خوادا، بێزار و دژە لە دانیشتن و نەهاتن بۆ ناو ریز و کۆمەڵی موسڵمانانی تێکۆشەر، مەگەر ئەوانەی کە ئەو عوزرو بەهانەیان ببێ کە لە ئایەتی پێشووتردا باسی کردن.

٢- دەرئەکەوێ کە تێکۆشان و فیداکاریی بەند و بەشێکی گرنگ و سەرەکی یە لە بیرو باوەڕی ئیسلام و لە رژێم و یاسای ئیسلام دا، بە پێی داخوازەکانی بەرنامەکەی خوا، بە راستی ئەگەر لەبەر ئەو حەدیسە سەحیحە نەبوایە کە ئەرکان و بەشەکانی ئیسلام ئەکات بە پێنج، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە باوەڕ وایە کە تێکۆشان روکن و بەشی شەشەمە بۆ ئیسلام، وەك شیعە ئەمە ئەڵێن و بڕوایان لەسەریەتی.

٣- دەرئەکەوێ کە ئەم مرۆۋ و ئادەمی یە لە چاکترین چەرخ لەناو باشترین گەل و کۆمەڵیش دا هەر لەوانەیە کە لە کاتی تەنگی و ناڕەحەتی دا بەرگە نەگرێ، یان سستی و تەمەڵی بەکار بێنێ، مرۆۋ بۆ ئەوە دەست ئەدات لە کات و لەناو کۆمەڵی ئاوایش دا، چ جای لە کات و ناو کۆمەڵی تریش دا، بەرنامەی چارەسەر بۆ ئەوانە ئەمە نی یە کە نائومێدیی پەیدا بکرێ و وازیان لێ بهێنرێ، بەڵکو ئەبێ هان بدرێن و بخرێنە سۆز و پەرۆش بە ترساندن و بەڵێن پێدان، بە گوێرەی ئەوەی کە قورئان دەست نیشانی بۆ کردین.

ئینجا با بزانرێ کە کۆچ کردن پێویست و فەرز ئەبێ لەسەر هەرکام لەم سێ هۆیە:

١- هەرکەسێك لە هەر وڵاتێك دا بێت کە لەسەر ئایینەکەی سزا بدرێ و بەرگری بکرێ لە دەربڕینی بیروباوەڕەکەی و هەڵسانی بەوەی کە پێویستە لەسەری بە پێی بڕوا و بیرو باوەڕەکەی، پێویستە لەسەر هەرکەسێکی ئاوا کۆچ بکات بۆ وڵاتێك کە بە سەربەستی هەڵسێ بەوەی کە بڕواو بیرو باوەڕەکەی پێویستی کردووە لەسەری. ئەگەر ئەو کۆچە نەکات تاوانبار و ستەمکارە. مەگەر بێ دەسەڵات و دەستە پاچە بێت بەو جۆرەی کە لە ئایەتەکەدا باس کرا.

٢- لە وڵاتێك بێت کە نەشارەزا بێت لە کاروبار و پێویستی ئایینەکەی و هیچ کەسێکی دەست نەکەوێ فێری بکات، ئەمەیش پێویستە کۆچ بکات بۆ وڵاتێك کە مامۆستا و فێرکەری دەست کەوێ تیایدا.

٣- دەوڵەت و میری موسڵمانان لاواز بێت یان مەترسی بکرێ لەوەی دوژمن پەلاماری بداتێ و داگیر و ژێر دەستی بکات، لەو کاتەدا پێویستە هەموو موسڵمانان لە هەموو لایەکەوە کۆچ بکەن بۆ بەهێزکردن و زاڵ کردنی ئەو دەوڵەتە و نەهێشتنی ئەو ترس و خەتەرەیە کە رووی کردووەتە دەوڵەتەکەیان، چونکە فەرز و پێویستە لەسەر موسڵمانان کە دەوڵەتیان ببێ، کەواتە هەرکاتێ دەوڵەتی ئیسلام نەبوو پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانان کە دەوڵەت فەراهەم بێنن و دەوڵەتەکەشیان بپارێزن لە هەر ترس و خەتەرێك کە رووی تێ بکات، ئیتر با ئەو پێك هێنان و پارێزگاری یە داخواز بێ بۆ کۆچ کردن و کۆبوونەوەی هەموو موسڵمانان لە هەموو وڵات و کون و قوشبنی ئەم زەوی یەدا. ئەگینا هەموو گوناهبار و تاوانبارن!! بەڕاستی مەگەر لێ بوردن و میهرەبانی خوا چارەسەرمان بکات ئەگینا قوڕی خەست بەسەرمان و تێ چەقیوین.

لەپاش ئەوەی باسی کۆچ کردن و تێکۆشانی کرد لە رێی خوادا کە ئەو دووانە خاڵی نابن لە ترس و لە سەفەر، بێگومان نوێژیش فەرزێکی ئەوەندە پێویستە ئەبێ وازی لێ نەهێنرێ بە تایبەتی لەو جۆرە کاتانەدا زۆر پێویستی هەیە بە باوی خوا پەنا بە خوا کە ئەو یادو پەنا بردنەش نوێژ چاکترین رێ و هۆیە بۆی، ئاشکرایشە لەو کاتی سەفەر و ترسەدا نوێژ بەجێ نایەت وەك کاتی ئارام و نیشتەجێیی، یان ئەگەر بەجێ بێت زۆر ئەرك و زەحمەتی هەیە، جا لەبەر ئەوەدا ئەوا باسی چۆنێتی بەجێ هێنانی نوێژ ئەکات لەو جۆرە کات و بەسەرهاتانەدا،

وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنَّ ٱلْكَٰفِرِينَ كَانُوا۟ لَكُمْ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿١٠١﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ کاتێ کە سەفەرتان کرد و چوون بە وڵاتان دا ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ﴾ هیچ تەنگی و گوناهێکتان لەسەر نی یە و هیچ لادان نی یە لە ڕێی ئایینی خوا ﴿أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ﴾ لەمەدا کورت بکەنەوە لە نوێژ و هێندێکی بەجێ نەهێنن، بەم ڕەنگە نوێژی چوار ڕکاتی بکەن بە دوو، وەك زۆربە و جەماوەری زانایان ئەفەرمون یان بەم ڕەنگە شێوەکەی کورت بکەنەوە، بە لابردنی ڕکوع و سوژدە و دانیشتنی تەحیات، نەك ژمارەی ڕکاتەکانی وەك هێندێ لە زانایان ئەفەرمون. یان مەبەست هەردوو جۆرە کورت کردنەوەکەیە، وەك هێندێ تر ئەفەرمون، یان مەبەست ئەم ئایەتە هەر نوێژی ترسە ئیتر بە هەر جۆر لەو چوار جۆرەی کە لە حەدیسی سەحیح دا هاتووە و لە کتێبی مەزهەبەکان دا بڵاو بوونەوە، ئەمەش بە لای دەستەیەکی تر لە زانایانەوە.

ئەم ڕایانە هاتوون لە مەبەست بەم ئایەتە و هەرکام بەڵگە ئەهێنێتەوە لەسەر ڕای خۆی، بەڵام بەڕاستی فەرمودەیەکی(ئیبن و القیم) هەیە باشتر ئەچێتە دڵ و زۆر بە ئارام و ئاسایشەوە، لەسەر ئەو ڕای ئەوە ئەو ڕایانەی کە باس کران هەموو کۆ ئەبنەوە و یەك ئەکەون بە بێ دژایەتی، ئەو خوا لێ خۆش بووە لە باسی نوێژی ترس دا ئەفەرموێ: کورت کردنەوەی ژمارە و شێوەکانی لە کاتی ترس و سەفەردا، کورت کردنەوەی تەنیاژمارە لەکاتی سەفەری ڕووت دا، کورت کردنەوەی تەنیاشێوە کاتێ کەهەرترس ببێ وبە بێ سەفەر.

بەهەرحاڵ دەقی قورئانەکە ئەم مەرجەی داناوە: ﴿إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟﴾ واتە گوناهو لادان نی یە لە کورت کردنەوەکەدا ئەگەر مەترسی بکەن لەوەی دەست درێژیتان بۆ بکەن و سزا و ئازارتان بدەن بە کوشتن و بەهەرچی، ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە، ئینجا لەسەر ڕای یەکەم کە ئەڵێ: مەبەست بەم ئایەتە ڕەوادانی کورت کردنەوەی نوێژی چوار ڕکاتی یە بە دوو ڕکات، ئەبێ بڵێین: هێنانی ئەم فەرمودەیە بۆ ئەوە نی یە مەرجی ڕەوادانی کورت کردنەوە کە بێت و بە بێ ئەو مەترسی یە کورت کردنەوەو دروست نەبێ، بەڵکو هێنانی بە

پێی حاڵ و باری ئەو کاتەیە کە زۆر بە دەگمەن مەترسی نەبووبێ لەسەفەرەکانی بڕواداران دا، کەواتە ئایەتەکە هەر ئەوە ئەگەیەنێ کە لە کاتی مەترسی دا کورت کردنەوە ڕەوایە و ئیتر بێ دەنگە لە کورت کردنەوەی ئارام و ئاسایش، ئینجا بە حەدیسی سەحیح ئەمیش ڕەوا درا، لەسەر ئەو رای یەکەمە بەو جۆرە ئەڵێین. بەڵام لەسەر راکانی تر ئەڵێین هێنانی بۆ ئەوەیە مەرج بێت و بەو مەرجە نەبێ دروست نی یە ئەو سێ جۆرە کورت کردنەوەکەی تر کە باس کراوە، ئایەتەکە بێ دەنگە لە کورت کردنەوەی نوێژی چوار رکاتی بە دوو، تا بە حەدیس ئەوەیش ڕەوا درا، لەسەر هەر بار و بە هەرجۆر هۆی ئەو مەترسی یە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلۡكَٰفِرِينَ كَانُواْ لَكُمۡ عَدُوّٗا مُّبِينٗا﴾ بەڕاستی بێ بڕواکان هەمیشە دوژمنێکی ئاشکران بۆتان، کەواتە هەمیشە بۆ هەل و هەڵکەوتێك ئەگەڕێن بۆ دەست درێژیی و زیان پێ گەیاندنتان، یا لەکاتی نوێژ کردن و خوا پەرستیتان بێت! ئینجا ئەو کورت کردنەوە فەرز و پێویستە بەلای زۆر لە زانایانی ئیسلامەوە، کە هێندێ لەوانە شافیعی یەکانە، بەهەرحاڵ و لەسەر هەربار هەر کورت کردنەوەیەك بەهۆی سەفەرەوە بێت ئەبێ ئەو سەفەرە درێژ بێت بەلای کۆمەڵ و جەماوەری زانایانەوە، ئەندازی ئەو درێژی یەش چەند رایەکی تیایە لەناو ئەو رایانەدا دوانیان ئەگرین بە دەستەوە کە زۆربەی ئوممەت بەو دوانە رەفتار ئەکەن:

١- رای حەنەفی یەکان کە ئەفەرمون: لە سێ قۆناغ کەمتر نەبێ بە رۆیشتنی حوشتر بە بارەوە کە بە پێی کیلۆمەتر(٨٧) کیلۆمەتر کەمتر نەبێ.

٢- رای شافیعی و مالیکی و ئەحمەدی یەکانە کە ئەفەرمون: لە دوو قۆناغ کەمتر نەبێ کە بە کیلۆمەتر لە(٨١) کیلۆمەتر کەمتر نەبێ. ئینجا بە بۆنەی باسی نوێژی سەفەری کە ترسیشی تیا بێت، بەو بۆنەیەوە دێتە سەر باسی چۆنێتی نوێژی کاتی ترس کە دوژمن بەرامبەر وەستابێ. ئەم نوێژی کاتی ترسە چەند جۆرێکی هەیە، هەموو جۆرەکانی لەگەڵ چۆنێتی بەجێ هێنانەکەیدا لە کتێبی مەزهەبەکان دا بە درێژیی باس کراوەو روون کراوەتەوە، کەواتە با لێرەدا هیچ نەڵێین، هەر کەسێك ئەیەوێ با تەماشای ئەو کتێبانە بکات، لێرەدا هەر ئەکەوێتە شوێنی شا ڕێگەی قورئانەکە و ئیتر درێژە نادەین بە باسەکە،

وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓا۟ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُوا۟ فَلْيَكُونُوا۟ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّوا۟ فَلْيُصَلُّوا۟ مَعَكَ

---

**ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ﴾ کاتێ کە تۆ – ئەی پێغەمبەر – لەناو کۆمەڵی بڕواداران دا بویت لە کاتی جەنگ و مەترسی کردن لە بێ بڕوایان – بێگومان ئەم فەرمان و فەرمودەیە لە پاش پێغەمبەر(ص) روو ئەکاتە جێنشینەکانی و هەر یەکێ لە پێشەواو کاربەدەستی بڕواداران – ﴿فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ ئینجا ویستت بانگیان بکەیت بۆ نوێژ بە وتەکانی قامەت، وەك هێندێ ئەفەرمون، یان ویستت نوێژیان پێ بکەیت بە پێش نوێژی خۆت، وەك زۆربە لەسەر ئەمەن، بەهەرکام مەبەست بێت ئەبێ بە جارێ نوێژەکەیە بە هەموویان نەکات، بەڵکو بیانکات بە دوو تاقم ﴿فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ﴾ ئینجا با تاقمێك لەوان لەگەڵ تۆ بوەستن و نوێژت لەگەڵ بکەن، ئەو تاقمەکەی تر بمێنن بەرامبەر دوژمن و حەرەس بن. ﴿وَلْيَأْخُذُوٓا۟ أَسْلِحَتَهُمْ﴾ با چەکەکانیان هەڵگرن و پێ یان بێ لە نوێژەکانیان دا. وەك زۆربە ئەفەرمون و رووکەشی ئایەتەکەیش هەر ئەوە نیشان ئەدا. یان با ئەو تاقمەکەی تر چەکەکانیان پێ بێ وەك هێندێ لەسەر ئەوەن و وایش لە(ئیبن و عەباس) ەوە ریوایەت کراوە. ﴿فَإِذَا سَجَدُوا۟﴾ ئینجا لەکاتی سوژدە یان نوێژەکەی ئەمان دا ﴿فَلْيَكُونُوا۟ مِن وَرَآئِكُمْ﴾ با ئەو تاقمەکەی تر لە دواتانەوە بن بۆ پاس کردن و پارێزگاریتان لە دوژمن تا ئەوان رکاتێك ئەکەن لەگەڵ تۆ. ئینجا با ئەمان بڕۆن بۆ پاسەوانی و حەرەس گرتن ﴿وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّوا۟﴾ با تاقمەکەی تر کە نوێژیان نەکردووە بێن ﴿فَلْيُصَلُّوا۟ مَعَكَ﴾ ئینجا لەگەڵ تۆ نوێژ بکەن واتە یەك رکات، ئینجا لەوێدا کە ئیمام هەردوو رکاتەکەی خۆی تەواو کردووە لەپاش تەحیات سەلام ئەداتەوە، بەڵام هەر کام لەو دوو تاقمە یەك رکاتیان کردووەو ئایەتەکە بێ دەنگە لە کردنی رکاتی دووەمیان، جا لەبەر ئەوە هێندێ لە زانایان لایان وایە کە ئەم ئیمام دوو رکاتی لەسەرە و ئەمان هەر یەك رکاتیان لەسەرە. بەڵام حەدیس باسی ئەوەی کردووە، بەم رەنگە تاقمی دووەم وەك یەکەمجار ئەچنەوە شوێنەکەی خۆیان و حەرەس بن تا تاقمی یەکەم دێت و رکاتی دووەمی ئەکات و سەلام ئەداتەوە، ئینجا ئەمانیش ئەڕۆنەوە بۆ پاسەوانی و حەرەسی و تاقمی دووەمیش دێنەوە رکاتەکەی تریان تەواو ئەکەن.**

وَلْيَأْخُذُوا۟ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ ۗ وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓا۟ أَسْلِحَتَكُمْ ۖ وَخُذُوا۟ حِذْرَكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٠٢﴾

---

دەربارەی ئەم تاقمە ئەفەرموێ: ﴿وَلْيَأْخُذُوا۟ حِذْرَهُمْ﴾ با وریایی خۆیان وەرگرن و ئاگایان لە خۆیان بێت. ﴿وَأَسْلِحَتَهُمْ﴾ چەکەکانیشیان وەرگرن و پێ یان بێ، واتە بۆ ئەم تاقمە فەرمان ئەدا بە وریایی و ئاگاداریی خۆیان بێجگە لە هەڵگرتنی چەك، چونکە وەك زانایان ئەفەرمون، لە جاری یەکەم دا دوژمن نازانن کە بۆ نوێژ وەستاون و ریزیان بەستووە، بەڵکو وا ئەزانن کە خۆیان ئامادە کردووە بۆ جەنگ لەبەر ئەوە نیازی پەلامار دان ناکەن، بەڵام کە بینی یان ئەم تاقمە نوێژ ئەکەن، ئەزانن کە تاقمی دووەمیش هەر نوێژ ئەکەن ئەو کاتە بە هەلی ئەزانن و بە یەك پەلاماریان ئەدەنێ، کەواتە ئەم تاقمە زۆرتر پێویستی هەیە بە وریایی و ئاگادار کردنەوەو هەڵگرتنی چەکەکانیان، وەك وەرئەگیرێ لەم فەرمودەی کە دەست نیشانی تیایە بەهۆی فەرماندان بەو چەك هەڵگرتن و وریایی یە: ﴿وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوەو جەنگتان لەگەڵ ئەکەن پێ یان خۆش بووە و ئاواتە خوازی ئەوەن کە ئێوە بێ ئاگابن لە چەکەکانتان و لە شت و مەکەکانتان کە ئەو سەفەر و جەنگەی پێ ئەکەن، ئێوە بێ ئاگابن ﴿فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً﴾ بەهۆی ئەوەوە ئەوانیش لە ناکاودا بە یەك جار پەلامارتان بدەن و بدەن بەسەرتان دا، کەواتە با چەکەکانتان پێ بێ و وریای خۆتان بن، لە تەفسیرەکەدا فەرمانەکانمان روو کردە نوێژکەرەکان وەك زۆربەی لەسەرە، هێندێ ئەفەرمون هەر بۆ حەرەسەکانە، هێندێ تر ئەفەرمون بۆ هەمووانە، نوێژکەر و حەرەسەکان، بە هەرکام مەبەست بێت هۆی فەرمانەکان ئەوەیە کە لەم فەرمودەدا دەست نیشانی بۆ کرد. دوژمنە بێ بڕواکان بەو جۆرە بەد نیهاد و دڵ پیسن دەربارەی

موسڵمانان هەر وا بوون و هەمیشە هەروان، کەواتە با موسڵمانان هەرگیز بێ باك و ئەمین نەبن لێ یان و هەڵنەخەڵەتێن بە هیچ شتێکیان. خوای میهرەبان لەم فەرمانەدا – وەك هەموو فەرمانەکانی تر – موسڵمانان تەنگەتاو ناکات، بەڵکو لەکاتی ناڕەحەتی دا باری شان سووك ئەکات، لەبەر ئەوە لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓا۟ أَسْلِحَتَكُمْ﴾ هیچ گوناهو ئەرەجێکتان لەسەر نی یە لە دانانی چەکەکانتان، ئەگەر بەهۆی بارانەوە سزاو ناڕەحەتیتان ئەبوو لە هەڵگرتنیان، یان نەخۆش بوون بە زام دار بوون یان هەر نەخۆشی یەکی تر لەم کاتانەدا، ڕێی دانان هەیە، بەڵام نابێ بێ باك و بێ ئاگا بن لە دوژمن کە ئەو ناوەستێ و هەمیشە بۆ هەلێك ئەگەڕێ، لەبەر ئەوە لەم کاتەیش دا فەرموێ: ﴿وَخُذُوا۟ حِذْرَكُمْ﴾ وریایی خۆتان بگرنە دەست و ئاگاتان لە خۆتان بێت. ماوەی دوژمن نەدەن، فەرمانی دا بە هەڵگرتنی چەك و وریایی چونکە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا﴾ بەڕاستی خوا ئامادەی کردووە بۆ ئەو بێ بڕوایانە سزایەکی ریسواکەر کە بریتی یە لە سزای تێك شکان و ژێر کەوتنی ئەوان و زاڵ بوون و سەرکەوتنی ئێوە بەسەریان دا، واتە ئەوەی کە هۆی سەرکەوتنە وەك چەك و وریایی ئێوە بەکاری بێنن با خوایش لەسەر دەستی ئێوەدا ئەو سزاو ئازارەیان بدات. هێندێك ئەفەرمون: مەبەست بەم فەرمودەیە و هێنانی بۆ دڵخۆش کردن و بەهێزکردنی دڵی بڕوادارانە، چونکە لەوان بەهۆی فەرماندان بە هەڵگرتنی چەك و وریایی یان وا گومان بەرن کە بێ بڕواکان بەهێزن و لەوانەن سەرکەون و زاڵ بن، کەواتە بەم وتەیە ئەو گومانە لە دڵ دەرئەکات و دڵنیایان ئەکات بە زاڵ بوون و سەرکەوتنیان، ئەمەش هەر باشە و هەڵئەگرێ، زۆربەی زانایان ئەو سزایە ئەبەن بەسەر سزای ڕۆژی دوایی دا، هەرچەند راکەیان ئەگونجێ و هەڵئەگرێ، بەڵام بەڕاستی ئەوەی کە وتمان و کردمان بە تەفسیری کە رای چەند کەسێکی بڕوا پێ کراوە، ئەو رایە لە دڵ دا بەهێزترە،

﴿فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ ۚ فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوْقُوتًا ﴿١٠٣﴾﴾

﴿فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ ئینجا کاتیٚ کە نوێژەکەتان بەجیٚ هێنا بەو شێوەی کە فەرمان درا ﴿فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ﴾ ئەو کاتە باس و یادی خوا بکەن بە پێوەو بە دانیشتنەوە و بە پاڵەوەو لەسەر تەنیشتتان، واتە بێجگە لەکاتی نوێژەکەتان با لە پاش ئەویش بە هەمیشەیی پەیوەستیتان ببیٚ بە خوای خۆتانەوە لەسەر هەموو حاڵ و بارێکتان، چونکە بەڕاستی هۆی سەرکەوتن و چەکی گەورەو بەکار و پەك نەکەوتوو هەر ئەو یادو باس و پەیوەستی یەیە. لەکاتی ترس دا فەرمانی دا کە نوێژ بەو جۆرە بەجیٚ بهێنریٚ کە نموونەی باس کرا. ئینجا ئەفەرمویٚ: ﴿فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ﴾ ئینجا کاتیٚ کە دڵ ئارام و بیٚ باك بوون یان کاتیٚ کە نیشتەجیٚ بوون، وەك(قتادة و مجاهد) ئەفەرمون. چونکە لە پێشەوە فەرموی: ﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ کاتیٚ کە لەسەفەردا بوون ﴿فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ ئەو کاتە نوێژەکانتان بە ڕێك و پێکی بەجیٚ بێنن بە تەواوی و بە بیٚ ئەو کورت کردنەوەی کاتی ترس و جەنگە، چونکە ئەو نوێژە بەو جۆرەی کە باس کرا لەبەر ئەو هۆ تایبەتی یە بوو، کەواتە کاتیٚ کە ئەو هۆیە نەمابیٚ گومان ئەچێتەوە سەر بارە ئەسڵی یەکەی خۆی. بەڵیٚ بێگومان نوێژ ئەبیٚ هەر بکریٚ و نەکردنی نابیٚ، وەك خوا ئەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوْقُوتًا﴾ بەڕاستی نوێژ لە زانین و بڕیاری خوادا هەر نووسراو و پێویست کراوێکی کات و دیاریی کراو بووە، دابەش کراوە بەسەر کاتی تایبەتی خۆی دا، کەواتە نابیٚ نەکریٚ و نابیٚ لە کاتی خۆی دەرکریٚ، زانایانی زاهیری ئەم ئایەتەیان کردووە بە بەڵگە لەسەر ئەوە کە نوێژی ڕۆیشتووقەزا ناکرێتەوەوراست نی یە قەزا کردنەوەی، چونکە ڕاست و دروستی نوێژ بەستراوەبەکاتەکەیەوە،دەی کەکاتەکەی ڕۆیی تازەڕەوا نی یە قەزا کردنەوەی، بەڵام بەڕاستی بەڵگەکەیان زۆر بیٚ هێزو لاوازە و هەرگیز شیاوی ئەوە نی یە پشتی بیٚ ببەستریٚ، چونکە:

١- بەپیٚی چەند حەدیس کە یەکیٚ لەوانە حەدیسی سەحیحی بوخاری و موسلیمە نوێژێکی بەیانی کە ڕۆیشت بەهۆی خەبەر نەبوونەوە لە سەفەرێك دا، ئەو نوێژە بە

سوننەتەکەیشی یەوە پێغەمبەر(ﷺ) قەزای کردەوە بەخۆی و ئەو کۆمەڵە هاوەڵانەی کە لەگەڵی بوون بە جەماعەت وەك نوێژە نەڕۆیشتووەکانی جاران، لە جێ یە نوێژی ئاوا بگێڕرێتەوە کە دەسەڵات نەبووە لە ڕۆیشتن دا ئەبێ نوێژێك کە بە دەست قەست ڕۆیی بێ باشتر ئەبێ بگێڕرێتەوە.

٢- ڕۆژووی ڕەمەزان و نوێژ کاتی دیاریی کراوی هەیە لەگەڵ ئەوەدا کە ڕۆیشت ئەبێ قەزا بکرێتەوەو هینی هەموو ساڵە ڕۆیشتووەکان بدرێ. یان حەج نەکرا ئەبێ لە پاش مردن حەجی بۆ بکرێ.

٣- ئەو کاتەی کە دیاریی کراوە بۆ نوێژ کە بە حازر بکرێ، دەی ئەوە نابێ بە دژ بۆ ئەوەی پاش ئەو کاتە دیاریی کراوانە کاتەکانی تر کات بێت بۆ قەزا کردنەوەی نوێژە ڕۆیشتووەکان، کەواتە لە خۆڕایی نی یە کە کۆمەڵ و جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن کە پێویستە قەزا کردنەوەی هەر نوێژێك کە ڕۆیشتبێ، بێجگە لە نوێژی ئافرەت کە نەکرێ بەهۆی حەیزو منداڵ بوونەوە، ئەو نوێژی ئەوانەش کە قەزا ناکرێتەوە لەبەر ئەوە نی یە کە کاتەکەی تێپەڕی کردووە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە خوا میهرەبانی کردووە، بارو ئەرکی سەرشانی سووك کردوون وەك لە حەدیسی سەحیح دا ئەفەرموێ. ئەوەتا ڕۆژوو کە لە ساڵ دا یەك مانگە و ئەرکی گێڕانەوەی ڕۆژووەکەی کەمترە، پێویستە لەسەریان گێڕانەوەی هەرچەند لەو ڕۆژانەی کە نەگیرابن بەهۆی حەیزو منداڵ بوونەوە، مەسەلەکە ئاوا ڕوون و ئاشکرایە، بەڵام بەداخەوە هێندێ نەزان لە خۆیانەوە لە ئیزگەی سعود دا لە ساڵ دا چەند جار بڵاوی ئەکەنەوە کە قەزا کردنەوەی نوێژ ناڕەوایە، ئەوانە هیچ شەرم ناکەن لەو هەموو زانا و پێشەوایانی ئیسلامە کە بڕیارو بڕوایان لەسەر پێویستی قەزا کردنەوەی نوێژە ڕۆیشتووەکانە، بەو جۆرو شێوەی کە باس کرا، هیوادارین بیرێك بکەنەوە و شەرم بیانگرێ. ئایا چۆن موسڵمان بڕیارو فەتوای ئاوا دەرکات بە بێ بەڵگە و ڕابەرێك؟!! چۆن نەترسێ لەوەی دەیڵێ و هەواڵی ئەو خەڵکە بخاتە گەردنی؟!!

وَلَا تَهِنُواْ فِى ٱبۡتِغَآءِ ٱلۡقَوۡمِۖ إِن تَكُونُواْ تَأۡلَمُونَ فَإِنَّهُمۡ يَأۡلَمُونَ كَمَا تَأۡلَمُونَۖ وَتَرۡجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرۡجُونَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٠٤﴾

---

ئینجا کۆتایی باسەکە ئەهێنێ بە هاندان و بەهێزکردنی دڵ لەسەر بەردەوامی لە تێکۆشان و فیداکاریی، هەرچەند مانوویەتی و ئێش و ئازار و لاوازی روویدا، دەست کاری یەکی بەهێزی بەکاری دڵی بڕواداران ئەکات بۆ کوول نەبوون و واز نەهێنان، دەست نیشان ئەکات بۆ دوا رۆژو چارەنووسی بەختەوەری بڕواداراني تێکۆشەر. ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَهِنُواْ فِى ٱبۡتِغَآءِ ٱلۡقَوۡمِۖ﴾ سست و لاواز مەبن لە بە دواگەڕانی ئەو دوژمنە بێ بڕوایانەدا، بۆ جەنگ و تێ هەڵچوون لەگەڵیان، چونکە ﴿إِن تَكُونُواْ تَأۡلَمُونَ﴾ ئەگەر ئێوە ئێش و ئازارتان ئەبێ ﴿فَإِنَّهُمۡ يَأۡلَمُونَ كَمَا تَأۡلَمُونَۖ﴾ بێگومان ئەوانیش ئێش و ئازاریان ئەبێ هەرچۆنێ ئێوە ئێش و ئازارتان ئەبێ، ئینجا ئێوە ئەوەشتان هەیە: ﴿وَتَرۡجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرۡجُونَۗ﴾ ئومێدو چاوەڕوانی شتێك ئەكەن لەلایەن خواوە كە ئەوان نایكەن، واتە ئەبێ ئێوە سوورتربن لەوان لەسەر جەنگ و تێ هەڵچوون لەگەڵیان بۆ ئەوەی هێزیان بشكێ و خراپەكاریی یان نەمێنێ و هەموو مل كەچ ببن بۆ خوا، ئەبێ ئێوە سوور تربن، چونكە وەك یەك ئازارتان ئەبێ لەگەڵ ئەوەدا ئەوان خۆیان ئەگرن، دەی ئێوە شایستە ترن بە خۆگرتن، چونكە ئومێد و چاوەڕوانی و یارمەتی دانی خوا ئەجرو پاداشتی رۆژی دوایی كە ئەوان نی یانە. بێگومان لە هەموو بەربەرەكانێ و تێ هەڵچوون و جەنگێك كە لە رێی خوادا بكرێ بڕوادار ئەو ئومێد و چاوەڕوانی یەی هەیە كە ئەوەی بەسە ئیتر سەركەوێ و زاڵ ببێ یان نا؟ كەواتە بڕوادار ئەبێ خۆگربێت و هەرگیز نەڕووخێ. بێگومان وا ئەبێ لە هێندێ دوژمنی بێ بڕوا دووچار ئەبێ، ئەبێ بزانین كە لەو كاتانەیش دا قوتار نابن، لە ئێش و ئازاری دەروونی، هەمیشە دەروونی ئەتلێتەوە بە ژانی بەربەرەكانێ لەگەڵ سروشتی خۆی و سروشتی هەموو شتێك دا. ئا بەو جۆرو شێوەیە خوا هانی بڕواداران ئەدات و دڵنیا و دڵخۆشیان ئەكات ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ خوا هەر زانای

تـەواو و کاردروسـت و لێزانـی تـەواو بـووە، ئـەزانێ چـۆن چارەسـەری هـەموو دەردەکـانی دەروون ئـەکات، ئـەزانێ تیمـاری هـەموو زام و ئێشەکان بکـات. ئینجـا لـەم چـەند ئایەتـەی داهاتووەدا قسه و باسێکمان بۆ ئەکات کە هەرگیز وێنەی نەبووە لە جیهـان دا، مـرۆڤ هـەرگیز شتی وای نەبیستووە بەخۆیـەوە، ئەم قسه و باسه به تەنیا شایەتێکی راسـت و بـاوەڕ پـێ کـراوە لەسـەر ئـەوەی کـە ئـەم قورئـان و ئایینـە هـەر لەلایـەن خـواوە هـاتووە، چـونکە مـەردوم هەرچـەند بۆچـوونی بـەرز بێـت، هەرچـەند رۆح و دەروونـی پـاك و خـاوێن بێـت، هەرچـەند سروشتی رێك و راست بێ، هەرگیز ناگونجێ کە خۆی بەخۆی بگاتـە ئـەو رادە و پلەیـەی کـە ئەم ئایەتانە ئاماژەی بۆ ئەکەن، بەڵکو مەگەر هەر بە سروشتی خوا، دەست نیشان ئەکـەن بـۆ رادەو پلەیەکی ئێجگار بەرز و بڵند کە هیچ کەس پـێ‌ی ناگـات مەگـەر لـە سـایەی ئـەم ئـاین و بەرنامەدا کە ئەم قورئانە هێنای!

لە کاتێك دا کە جوولەکەکانی مەدینە بە بێ وەستان و پـەیتا پـەیتا هەرچـی تیـری ژاراوی یـان هـەبوو ئەیانگرتـە ئیـسلام و موسـڵمانان، وەك ئـەم سـورەتە و دوو سـورەتی رابـوردوو هێندێکی بۆ باس کردین، دەرکـەوت کـە تـا چ رادەیـەك ئـەو تیـرە ژاراوی یانـە کاریگـەر بـوون لـەناو گـەلی موسـڵمان دا، لـە کاتێـك دا کـە ئـەو جوولەکانـە بـە هـەموو جـۆر درۆ و هەڵبەسـتی پیسی خۆیان بڵاو ئەکردەوە، بەجارێ بت پەرستەکانیان لـێ هەڵئـەنان، هـانی ناپاکـەکانیان ئەدا بۆ هەڵسانیان بەو وتار و کردەوە ناپاکانـە، رێگـەیان بـۆ نەخـشە ئەکێـشان، مـەردومیان گومڕا ئەکرد، رەخنە و تەشەریان ئەدا لە سەرکردایەتی یەکەی پێغەمبەر(ﷺ) مەردومیان بەد گومان ئەکرد لە راستی پەیام و پێغەمبـەرێتی یەکـەیان، هـەوڵ و تەقـەلایان ئـەدا کـە نـاوخۆی گەلی موسڵمان تێك دەن و لەکاری بخەن، لە هەمان کات دا دوژمنـانی دەرەوەیـان هەڵئـەنا کـە بێن و بە جارێ بـدەن بەسـەریان دا بـۆ لـە ریـشە هێنانیـان. ئیـسلام تـازە پـەیدا بـوو بـوو لـە مەدینـەدا، بـاو و کـرداری سـەردەمی نـەفامی هێـشتا نەپـچڕا بـوو لەگـەڵ بـت پەرسـتەکان و جوولەکە و ناپاکـەکان دا، کـە ئـەوەش مەترسـی زۆر گـەورەی لـێ ئـەکرا بـۆ تێـك دانـی ریـزی

موسڵمانەکان. لەو کاتە زۆر تەنگ و ناسکەدا، ئەم ئایەتانی داهاتووە هاتنە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر و هاوەڵەکانی، بۆ ئەوەی هەق بسێنێ بۆ پیاوێکی جوولەکە کە گومان دزی پێ برابوو، بۆ ئەوەی ئابرووی ئەو کەسانە ببات کە ئەو لەکەو گومانەیان خستە شوێنی ئەو جوولەکەیە، کە ئەوانەش لە بنەماڵەیەکی مەدینەیی بوون کە مەدینەیی سەرباز و چەکی دەستی ئیسلام بوون، بەرامبەر ئەو هەموو دوژمنایەتی و پیلانەی کە ئەتەنرا بۆ ئیسلام و موسڵمانان! ئەوە چ رادەیەك بوو لە پاکی و دادپەروەریی و بەرزی دا؟! ئینجا ئایا چ وتە و وتارێك دەست ئەکەوێت کە باسی ئەو رادە بەرزەی پێ بکرێ؟ بێگومان هەرکەسێك ژیریی لەکار نەکەوتبێ باش ئەزانێ شتی وا ئەبێ هەر لە ئاسمانەوە دەست کەوت ببێ و هەر بەرنامەی خوا مەردوم ئەگەیەنێ بەو پۆپە بەرزە. ئەو قسە و باسە لە چەند ریوایەتێك و لە چەند سەرچاوەیەکەوە هاتووە کە چەند کەسێك لە ئەنساری یەکان لە خزمەت پێغەمبەر بوون(ﷺ) لە غەزایەك دا، لەو غەزادا زرێ و تاس و کڵاوی یەکێکیان دزرا و گومان برا بە یەکێ لە ئەنساری یەکان کە لە بنەماڵەیەك بوو پێ یان ئەوترا:(بنی ابریق) ئینجا خاوەن دزراوەکە هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) وتی: فلأن لەو بنەماڵەیە کە ناپاك بوون، شیعری ئەوت ئەوت لە دژی هاوەڵەکان و ئەیوت: ئەمە شیعرو هۆنراوەی هێندێکە لە عەرەبەکان، ئینجا دزەکە کە زانی گومانی ئەوەی پێ براوە، هەڵسا ماڵە دزراوەکەی فڕێ دایە ماڵی جوولەکەیەك لە جوولەکەکانی مەدینە، بۆ ئەمەی لای ئەو دەرکەوێ ئەم بە پاك دەرچێ، ئەم کردەوەیەی درکاند لای هێندێك لە خزمەکانی، ئینجا چوون بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) عەرزیان کرد: ئەم هاوڕێی ئەمە پاکە و ئەوەی کە دزە فلأنە کەسی جوولەکەیە و شتەکەی لێ دەرکەوتووە. ئەمەی کە گومانی خراوەتە سەر لە بنەماڵەیەکی موسڵمان و پیاوچاکن، کەواتە تۆ جاڕی پاکی بدە لەناو مەردومان دا با تیا نەچێ و بێ ئابرو نەبێ، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) کە زانی ئەو ماڵە دزراوەکە دەرکەوت لە ماڵی ئەو جوولەکەدا، هەڵسا و جاڕی پاکی(طعمەی کوڕی – ابیرق –) ی دا، سەرزەنشتی ئەوانەی کرد کە گومانیان خستە سەری، ئینجا ئەوەندەی پێ

نەچوو ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە و جوولەکەکەی بە پاك دەرکرد لەو گومانەداکە خرایە سەری، ئەنساری یەکەی تاوانبار کرد و بە ناپاکی دەرکرد!! بەڕاستی ئەم مەسەلە تا بیری لێ بکرێتەوە جێی خۆیەتی، چونکە بێگومان ئەگەر بە پێی باوی ئەم زەوی یە و ئەم جیهانە بوایە بەو جۆرە نەئەکرا، تەنانەت ئەگەر دەریش بکەوتایە پاکی و بێ تاوانی ئەو جوولەکە لەو مەسەلەدا ئەبوایە چاوپۆشی بکردایە و بێ دەنگ ببونایە لێ ی و باسەکە کپ بکرایەتەوە، چ جای ئەوە ئەگەر قورئان باسی نەکردایە هیچ کەس ڕێگەی هیچ قسە و باسێکی نەبوو، ماڵە و دزراوە و دۆزرایەوە لە ماڵی کابرایە، ماڵەکە ماڵی موسڵمانێکە و کابرایش جوولەکەیە، ئاشکرایە کە دوژمنێکی خوێنە خوارەیە، زۆر تینوە بە خواردنی ماڵی موسڵمان، بە پێی بیرو باوەڕی ناڕەوایی خۆیان! بەڵێ. بەڕاستی ئەگەر بە پێی باو و بەرژەوەندی ئەم زەوی و جیهانە بوایە، ئەبوو ئەو جوولەکەیە پاك دەرنەکرایە و موسڵمانێك بە ناپاك دەرنەکرایە، چونکە:

١- ئەو گومان پێ براوە جوولەکەیە - وەك گوترا - کە هەمیشە هەوڵ و تەقەلایان لەکەدار کردن و تەشەر و پلار وەشاندنە لە ئیسلام و موسڵمانان. کەواتە با پاك نەکرێتەوەو هەر بە ناپاك سەیر بکرێ.

٢- ئەو دەرخستنە و جاڕدانی بێ تاوانی ئەو جوولەکە و تاوانبار کردنی پیاوێکی ئەنساری - کە ئەنسار بە گیان و بە ماڵ فیداکاری ئیسلامن - ئەبێ بە لەکەیەك و ڕوو ئەکاتە ئەو گەل و بەرەیە، بەهۆی ئەوەش لەوانەیە ببێ بە مایەی کینە و تێك چوونی ڕیزیان، بەڵام بە پێچەوانەی ئەوە ئەگەر هەر جوولەکەیەك ناپاك بناسرایە، جوولەکە لە هەموو شتێك دا لەکەدارە با لەو مەسەلەیەش دا هەر بە لەکەدار بناسرێ.

٣- لەو جاڕدانی پاکی ئەو جوولەکە و تاوانبار کردنی ئەو ئەنساری یە، تیرێکی ژاراوی یە و ئەدرێ بەدەست جوولەکەکانەوە بۆ ئەوەی بیتەقێنە موسڵمانەکان و، مایەی دەم کردنەوەیانە کە بە ئارەزووی خۆیان زمانی تیژ و پیسیان بخەنە کار بۆ ئابڕوو

بردنیان. بەڵام لەگەڵ ئەوەدا کارەکە بە پێی زانین و تێگەیشتن و بەرژەوەندی ئەم زەوی و جیهانە نەهات، بەڵکو بە دژو پێچەوانە هات، چونکە مەبەست و ئامانجی گرنگ تر و گەورەتر لەوەدا بوو کە لە بۆچوون و زانینی ئێمە بەدەر بوو، ئەوەش کە بریتی بوو لە دەرخستن و بەدی هێنانی ئەو داد و دادپەروەری یەی کە ئیسلام هێنای بۆ ئەوەی هەر بەو ترازووە راستە رەفتار بکرێ لەناو ئادەمی دا بە تێکڕایی، ئەو داد پەروەری یە لەو رادەو پلە بەرزەدا کە هیچ کەس لە جیهان دا پێی نەئەگەیشت – بەڵکو بە دڵیشی دا گوزەری نەئەکرد – مەگەر بە فەرمانی خوا، بە کۆمەکی خوا. بەڕاستی رووداو و کردەوەیەکی زۆر گەورەو سەرسوڕهێنەرە، هەتا بیری لێ بکرێتەوە گەورەو گرنگ تر دەرئەکەوێ! وەرە ئەی ئادەمی بیر بکەرەوە ئەم دادە لەگلۀ کێ بەکار هێنرا، لە چ کاتێك دا بەکار هێنرا؟! بەکارهێنرا لەگەڵ جوولەکەیەك، لەو جوولەکانەی کە یەکەم رێگرو پلەیەکی سەخت بوون لە رێی ئیسلام دا، هەرچیان لە دەست هات لە دوژمنایەتی و خراپەکاریی کردیان دەربارەی ئیسلام و موسڵمانان، لە سەخت ترین کاتی ژیانی موسڵمانانی مەدینەدا کرا، کە لە هەموو لایەکەوە بە پیلانی جوولەکە هەموو دوژمنێك راست بووەوە لە ئیسلام و موسڵمانان!! ئا بەو جۆرو شێوەیە ئیسلام ئەو کۆمەڵە بەختیارەی پەروەردە کرد بە پێی گەیاندن، پاڵفتەی کردن لە هەموو تۆز و چڵك و چەپەڵی یەکی ئەم جیهان و زەوی یە تا بەوە شایستەی ئەوە بوون ئەو سپاردە گەورەی خوا بخەنە گەردن، هەڵسن بە کاری جێنشینی خواو سەرکردایەتی ژیان و جیهان! ئینجا ئەی ئادەمی وەرە لەو پۆپە بەرزەوە سەرنجێکی هەموو گەلەکانی جیهان بدە، تەماشایەکی لاپەڕەکانی مێژووی ژیانیان بکە لە کۆن و تازەوە، بۆ ئەوەی تێ بگەیت لە مەبەست بە داد و دادپەروەریی راستەقینە، ئەو کاتە تێ ئەگەیت لە مەبەست بەداد و دادپەروەریی لەناو گەلەکانی کۆن و تازە جیهان دا کە دوورن لە ئیسلامەوە، تێ ئەگەیت کە ئەوەی ئەوان شتێکی بۆگەنە و پڕە لە ستەم و ستەمکاری!!

إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ وَلَا تَكُن لِّلۡخَآئِنِينَ خَصِيمٗا ﴿١٠٥﴾ وَٱسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١٠٦﴾ وَلَا تُجَٰدِلۡ عَنِ ٱلَّذِينَ يَخۡتَانُونَ أَنفُسَهُمۡۚ

**ئینجا با بیینە ژێر سایەی ئایەتەکان کە هاتنە خوارەوە لەو رووداو و بەسەرهاتەدا، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ﴾ بێگومان ئێمە ناردمانەتە خوارەوە و سروشمان کردووە بۆلای تۆ نامە – واتە قورئان – بە هەق و بەڕاستی و هەق و راستی پێ یە ﴿لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ﴾ بۆ ئەوەی بڕیار بدەی لەناو ئادەمی دا بە تێکڕایی و بە بێ جیاوازی ﴿بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ﴾ بەو بڕیارەی کە خوا نیشانی داوی، واتە سروشی کرد و ئاشنای کردوی پێ ی، ﴿وَلَا تَكُن لِّلۡخَآئِنِينَ خَصِيمٗا﴾ نەبی محامی و بەرگری کەر لە ناپاکەکان، واتە(بنی ابیرق)، یان لەبەر خاتری ئەو ناپاکانە مەبە بە دژ و داواچی و بڕیاری دزی دان بە سەر ئەو جوولەکەی کە گومانی دزی درا بەسەری دا بە ناهەق، ﴿وَٱسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَۖ﴾ داوای لێ بوردن بکە لە خوا لەو گومان و قسە و سەرزەنشتەی کە ئاراستەی خاوەن ماڵەکە و هاوەڵەکانت کرد، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾ چونکە بێگومان خوا هەمیشە هەر لێ بوردەی میهرەبان بووە، ﴿وَلَا تُجَٰدِلۡ عَنِ ٱلَّذِينَ يَخۡتَانُونَ أَنفُسَهُمۡۚ﴾ بەرگری مەکە لەوانەی کە ناپاکی ئەکەن دەربارەی خۆیان بە گوناهو ستەم کاری، لێرەدا مەبەست دزەکەیە لەگەڵ ئەوانەی کە هەوڵی پاك کردنەوەیان ئەدا و تاوانبار کردنی جوولەکەکە. بێگومان تۆڵەی گوناه لەسەر گوناهبارەکەیە. کەواتە گوناهبار وەك ناپاکی و ستەمی لە خۆی کردبێ وایە، بێجگە لەوە لە دووباری ترەوە ناپاکی لەگەڵ خۆی کرد:**

**١- نەفسی خۆیان پیس کرد بەو پیلان و درۆ و بوختانە کە کردیان.**

**٢- ناپاکی یان کرد لەو کۆمەڵە و بەرنامە و بیرو باوەڕەکەیان، کە ئەمانە بەشێك بوون لەو کۆمەڵە و خاوەنی بەرنامە و بیرو باوەڕەکەیان بوون.**

إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا ﴿١٠٧﴾ يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَىٰ مِنَ ٱلْقَوْلِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا ﴿١٠٨﴾ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ جَٰدَلْتُمْ عَنْهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فَمَن يُجَٰدِلُ ٱللَّهَ عَنْهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ

---

**﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا﴾ چونكه بێگومان خوا ئەوانەی خۆش ناوێ كە زۆر ناپاك و گوناهكارن، واتە قین و خەشمی هەیە لێ یان، قین و خەشمی هەیە لەو تاقمەی كە باس كران. ﴿يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ ئەو زۆر ناپاكە گوناهكارانە خۆیان دائەشارن لە مەردوم لە شەرم دا و لەبەر مەترسی لێ یان ﴿وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱللَّهِ﴾ خۆیان ناشارنەوە لەخوا، شەرم ناكەن لە خوا، بەم رەنگە بە زانینی ئەو و لەبەرچاوی قودرەتی ئەو گوناهو تاوان ئەكەن، لەگەڵ ئەوەدا كە تەنها خوا شایستەیە بۆ ئەوەی كە مەردوم لێ ی بترسێ و شەرمی لێ بكات ﴿وَهُوَ مَعَهُمْ﴾ لەكاتێك دا خوا لەگەڵیانە ﴿إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَىٰ مِنَ ٱلْقَوْلِ﴾ لە كاتێك دا كە بە نهێنی تەگبیر ئەكەن و قسەیەك ئەكەن كە خوا پێ ی رازی نی یە، لە تاوانبار كردنی بێ تاوان و شایەتی ناهەق و پاك كردنەوەی تاوانبار! ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا﴾ خوا هەمیشە هەر زانا و ئاگا بووە بە هەر كردەوەیەك كە ئەوانە ئەیكەن، چ كردەوەی ئاشكرا، چ كردەوەی نهێنی یان، كەواتە بۆ كوێ ئەڕۆن و بۆ كوێ دەرئەچن بە خۆیان و پیلان و درۆ و ناپاكی یەكەیانەوە. ئینجا هێرش ئەباتە سەر ئەوانەی كە بەرگری ئەكەن لە ناپاكان، هێرشێكی وا كە بۆنی خەشمی لێ دێ، دەربارەی ئەو بەرگری كەرانە، ئەفەرموێ: ﴿هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ جَٰدَلْتُمْ عَنْهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ ئاگاداربن ئێوە ئائەوانەن كە بەرگریتان كرد لەو ناپاكانە لە ژیانی ئەم جیهانەدا، واتە وا دابنێن كە ئێوە تێكۆشانتان كرد و توانیتان بەرگری سزای ئەم جیهانەتان لێ كردن، ﴿فَمَن يُجَٰدِلُ ٱللَّهَ عَنْهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ دەی ئایا كێ بەرگری سزای خوایان لێ ئەكات لە رۆژی دوایی دا چەلانبەر چەلانی خوا ئەوەستێ بۆیان لەوەی هیچی یان بەسەر بێنێ؟**

أَم مَّن يَكُونُ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴿١٠٩﴾ وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١١٠﴾

﴿أَم مَّن يَكُونُ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا﴾ **یان کێ ئەبێ بە پارێزەر بەسەریانەوە و کاروباریان بدرێتە دەستی؟ واتە نەکەس ئەتوانێ بەرگری خوایان لێ بکات، نە کەس هەیە ببێ بە خاوەنی ئەوان و کاروباریان بدرێتە دەستی، کەواتە هەرچی یان بۆ بکەن لەم جیهانەدا بە هیچ ئەچێ ماتووڵ ناتوانن فریای رۆژی دوایی یان بکەون.**

**لە پاش ئەو هێرشە خەشمناکە بۆ سەر ناپاکان و سەرزەنشتی ئەوانەی کە بەرگری یان ئەکرد لێ یان، ئینجا چەند یاسایەکی گشتی گرنگ ئەهێنێ بۆ ئەو جۆرە کردەوە ناپەسەندانە و سەرەنجام و بەرهەمیان. بۆ حیساب و تۆڵەیان، بۆ یاسای پاداشت و تۆڵە بە شێوەی گشتی، یاسایەکی راست و رەوا کە خوا بە پێی ئەوە رەفتار ئەکات لەگەڵ بەندەکانی، داواش ئەکات لێ یان کە هەوڵ بدەن بەو یاسایە رەفتار بکەن لەناو خۆیان دا، پەیڕەوی رەوشتی خوا بکەن لەوەدا. سێ ئایەتی کورت ئەهێنێ بۆ ئەو مەبەستانە، لە ئایەتی یەکەم دا قاپی تۆبە و گەڕانەوە و وەرگرتنی گەڕانەوە ئەخاتە سەر پشت بۆ گوناهکار و تاوانباران، قاپی لێ بوردن بە پانی و فراوانی ئەکاتەوە، هەموو گوناهکار و تاوانبارێکی تۆبەکار ئەخاتە ئومێد و چاوەڕوانی وەرگرتنی تۆبە و لێ بوردنی گوناه، ئەفەرموێ:** ﴿وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا﴾ **هەرکەسێك کردەوەیەکی خراپ بکا کە مەردومی تری پێ غەمبار و ناڕەحەت بکات — وەك ئەو دزە کە هاوڕێ و کەسەکانی خۆی پێ غەمبار کرد — یان وەك ئەو دزە کە ئەو جوولەکەی پێ غەمبار و لەکەدار کرد.** ﴿أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ﴾ **یان ستەم و دەست درێژیی بکات لە خۆی بەم رەنگە گوناهێك بکات کە خراپی یەکەی هەر روو لە خۆی بکاتەوە وەك سوێندی درۆ و داننەنان بەو هەق و مافەی کە لە گەردنی دایە.** ﴿ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ﴾ **لە پاشان داوای لێ بوردن و سڕینەوەی ئەو کردەوە خراپە بکات. بە تۆبە و گەڕانەوەیەکی راست و شەرعی** ﴿يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ **خوای دەست ئەکەوێ بە لێ بوردەی میهرەبان، بەم رەنگە تۆبەکەی لێ وەرئەگرێ و ئەبورێ لە گوناهەکەی، ئیتر هەر جۆرە گوناهێك ببێ، سەرباقی ئەوە بەهرەمەندی ئەکات بە پاداشتی گەورە، بەه، بەه لەو میهرەبانی یە قاپی بۆ گەڕاوە هەمیشە کراوە و لەسەر پشتە، بە بێ مەرج و بە بێ قاپی یەوان!**

وَمَن يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١١﴾ وَمَن يَكْسِبْ خَطِيٓـَٔةً أَوْ إِثْمًا ثُمَّ يَرْمِ بِهِۦ بَرِيٓـًٔا فَقَدِ ٱحْتَمَلَ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿١١٢﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُۥ لَهَمَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ أَن يُضِلُّوكَ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ ۖ وَمَا يَضُرُّونَكَ مِن شَىْءٍ ۚ وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ

---

**ئایەتی دووەم بیرو باوەڕێکی گرنگی ئیسلامی نیشان ئەدات کە پێی ئەگوترێ: (فردیة التبعة) واتە هەرکەس هەر پرسیاری کردەوەی خۆی لێ ئەکرێ و تاوان و تۆڵەی هیچ کەسێکی تری ناخرێتە گەردن، ئەم بیروباوەڕە لەلایەکەوە ترس و بیم ئەخاتە دڵ، لەلایەکی ترەوە ئارام ئەدا بە دڵ، ترس لە کردەوەی خراپی خۆی، ئارام و بێ باکی لەوەی کە تاوان و تۆڵەی کەسێکی تر بدرێ بەسەریان دا،ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ﴾ هەرکەسێك هەر گوناهێك بکات بێگومان ئەو گوناهە ئەکات هەر بە دژی خۆی و ژیانی خۆی، چونکە تۆڵە و سزاکەی هەر لەسەر خۆیەتی و ناخرێتە سەر هیچ کەسێکی تر، کەواتە گوناهو تاوان بە کەلەپوور وەرناگیرێ لە هیچ کەسێکی ترەوە، هەرچۆنێ هەرکەس خۆی کەفارەتی گوناهی خۆی ئەدات، ئەو کاتە - وەك وتمان - لەلایەکەوە ترس و بیم هەیە لەسەر ئەو گوناهانەی کە ئەکرێن، لەلایەکی ترەوە بێ باکی و ئارام هەیە، ئەوە یەکێکە لە سیفەتە تایبەتی یەکانی بۆچوونی ئیسلامی، یەکێکە لە پێك هێنەرەکانی بۆچوونی ئیسلامی، کە سروشت ئارام دارو دامەزراو ئەکەن، داد و دادپەروەریی یە چەن و چون و تێرو تەواوی ئیسلامی بەدی ئەهێنن، کە پێویستە ئادەمی مرۆڤ پەیرەوی بکەن و لاسایی بکەنەوە. ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ واتە هەرکەس تاوانێك بکات بەدەستی ئەنقەست ئەوا بێگومان ئەگەڕێتەوە بۆلای خوای گەورە و ئەویش زانایە بە کردەوەکەی و داناو کاردروستە لە سزادانی دا.**

**ئایەتی سێ یەم تۆڵەی کەسێك باس ئەکات کە بوختان بکات و کردەوەی خراپی خۆی بسەپێنێ بەسەر یەکێکی تردا، وەك لەم ڕووداوەدا ئەو کۆمەڵە ویستیان ئەو دزی یە بخەنە**

ملی ئەو جوولەکەیە و بەڵام خوا نەیهێشت و مەسەلەکەی دەرخست. ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يَكْسِبْ خَطِيٓئَةً﴾ هەرکەسێك هەڵەیەك بکات یان گوناهێکی بچووك. ﴿أَوْ إِثْمًا﴾ یان بە دەستی قەست گوناهێك بکات، یان مەبەست گوناهی گەورەیە ﴿ثُمَّ يَرْمِ بِهِۦ بَرِيٓـًٔا﴾ ئینجا هەڵسێ و بیخاتە ملی یەکێکی پاك لەو کردەوەیە، بۆ ئەوەی تۆڵەی بخاتە گەردنی ئەو پاکە وەك ئەو دزە لەو رووداوەدا هەڵسی بەست بۆ جوولەکەکە. ﴿فَقَدِ ٱحْتَمَلَ بُهْتَٰنًا﴾ بێگومان ئەو کەسە درۆ و بوختانێکی گرتووەتە ئەستۆی خۆی کە مەردوم سەرسام ئەکات لەکاتی بیستنی دا ﴿وَإِثْمًا مُّبِينًا﴾ گوناهێکی ئاشکرای هەڵگرتووە و خستوویەتە گەردنی خۆی، بوختانی کرد کە بە درۆ هەڵی بەست بۆ یەکێکی پاك، گوناهێکی ئاشکرایشی کرد و لەمەدا کە گوناهەکەی خۆی کردی و نایە ملی مەردوم، کەواتە بارەکەی بوو بە دوو بار و نقەی دێت بە ژێری یەوە. بەم سێ ئایەتە کورتە نەخشەی ترازووی دادی کێشا کە هەموو تاوانبارێکی پێ موحاسەبە بکرێ، تاوانباری بەرەڵا نەکرد کە خۆی رزگار بکات و تاوانەکەی بخاتە ملی یەکێکی تر، لە هەمان کات دا قاپی تۆبە و لێ بوردنی خستە سەر پشت بۆ ئەوەی لە هەرکاتێك دا تاوانبار سەری پیا بکات بە بێ پرس و ئیزن خواستن، تا بەهۆی ئەوەوە میهرەبانی و لێ بوردنی دەست کەوێ!

ئینجا لە کۆتایی دا منەت ئەنێ بەسەر پێغەمبەرەکەی دا(ﷺ) کە پاراستی لەوەی کە بە گوێرەی پیلان و داوای ئەو کۆمەڵە رەفتار بکات، بەم رەنگە ئاگاداری کرد بەسەر ئەو پیلانەدا کە کردیان، ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُۥ﴾ ئەگەر بەهرەو میهرەبانی خوا نەئەبوو بەسەرتەوە: ﴿لَهَمَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ أَن يُضِلُّوكَ﴾ بێگومان دەستەیەك لەوانەی کە ناپاکی یان کرد نیازیان کرد کە هەڵە بکەن پێت و هەق و راستیت لێ ون بکەن تا بە قسە و شایەتی ناهەق بەهۆی ئەوەوە بریاری نارەوا بدەیت، بەم رەنگە بێ تاوان بگریت و تاوانبار بەرەڵا بکەیت، ئەو دەستەیە ئەگەر ناپاك و بێ بروا بووبن، جێگەی قسە و باس نی یە و لەلایەن ئەوانەوە شتی وا زۆر کراوە، ئەگەر ئەوانە بروادار بووبن ئەبێ بڵێین: نیازو هەوڵەکەیان سەری لەوەوە دەرئەچوو، ئەگینا خۆیان نیازی ئەوەیان نەبووە، بەڵکو خۆیان

شتەکەیان بە راست و رەوا زانیوە. بێگومان ئایەتەکە وا ئەگەیەنێ کە ئەو نیازە نەبووە، چونکە ئەفەرموێ: ئەگەر بەهرەو میهرەبانی یە نەبوایە ئەو نیازە ئەبوو. دە خۆ ئەو بەهرەو میهرەبانی یەش بوو، کەواتە نابێ ئەو نیازە بووبێ، لەگەڵ ئەوەش دا نیازو هەوڵەکە بووە، کەواتە ئەبێ بڵێین: مەبەست ئەوەیە ئەگەر ئەوە نەبوایە نیاز و هەوڵەکەی ئەوان کاری لێ ئەکردی، بەم رەنگە بە پێی قسەکەی ئەوان بڕیارت ئەدا، بەڵام خوا نەیهێشت ئەوە بکەیت بەمەی ئاگاداری کردی بەسەر ئەوەی کە راست و رەوایە، یان ئەڵێین: مەبەست ئەوەیە: ئەگەر بەهرەو میهرەبانی خوا نەبوایە ئەکەوتیتە هەڵە و بڕیاری ناڕەوا، چونکە دەستەیەك لەوان نیازو هەوڵی ئەوەی دا، بەلام خوا نەیهێشت کە بە پێی نیازو هەوڵی ئەوان بجوڵێتەوە، بێگومان ئەگەر خوا ئاگاداری نەکردایە و بڕیاری بدایە بە گوێرەی قسە و شایەتی ئەوان هەر نەئەکەوتە هەڵە و زیانبار نەئەبوو، چونکە بڕیارەکەی بە پێی دیمەن و رواڵەت و رووکەشی قسەکەی ئەوان ئەدا، کەواتە هیچ سووچی پێغەمبەر(ﷺ) نەئەبوو، بەڵکو سووچەکە ئەگەڕایەوە بۆلای ئەوان، جا لەبەر ئەوە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ﴾ ئەوانە هەر نەفسی خۆیان هەڵە پێ ئەکەن و لای ئەدەن، لەو جۆرە نیازو هەولانە زۆر بووە و روویان داوە لە ژیانی پێغەمبەردا(ﷺ) بەلام سەرەنجامی هەموو نیازو هەوڵی خراپ و پیلانێك گەڕاوەتەوە بۆ نیاز کەران و هەوڵدەران و پیلان بازان،هیچ زیانێك رووی نەکردووەتە پێغەمبەر(ﷺ) وەك ئەفەرموێ: ﴿وَمَا يَضُرُّونَكَ مِن شَيْءٍ﴾ ئەوانە زیان ناگەیەنن بە تۆ بە هیچ جۆرە زیانێك، چونکە خوا پاراستووتی لە لادان و هەڵەی کە ئەوان نیازیان کردووە پێی، ئینجا بە بۆنەی ئەو منەتە تایبەتی یەوە بەرز ئەبێتەوە بۆ باسی منەتی هەرە گەورە کە بریتی یە لە منەتی پەیام و پێغەمبەرێتی یەکەی، ئەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلَ اللَّهُ عَلَيْكَ الْكِتَٰبَ وَالْحِكْمَةَ﴾ خوا ناردی یە خوارەوە بۆ سەر تۆ قورئان کە نامەیە و زانین و رێ بردنە بە هەموو شتێکی راست و دروست، یان مەبەست بە حیکمەت و زانین و تێگەیشتنی مەبەستەکانی قورئانە و ئەو شەریعەتەی کە قورئان هێنای، یان مەبەست رەوشتی پاکی خۆیەتی و ئەو لێزانی و کاردروستی یەیە کە خوا پێی بەخشی،

وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُن تَعْلَمُۚ وَكَانَ فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا ﴿١١٣﴾ لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَىٰهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ

---

﴿وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُن تَعْلَمُ﴾ فێری کرد و ئاشنای کردی بەوەی کە لەوەو پێش نەت ئەزانی کە بریتی یە لەو قورئان و شەریعەتە، یان ئەو هەموو شتە نهێنی و دەروونی یانەیە، یان هەموو چاکە و خراپەیەك، بەهەرحاڵ و لەسەر هەربار مەبەست ئەوەی کە خوا ناردی بۆ سەر ئەم پێغەمبەرە(ﷺ) ئاشنا و زانای کرد پێ ی منەت و بەهرەو چاکەیە بەسەر هەموو ئادەمی یەوە لەم زەوی یەدا، منەت و چاکە و بەهرەیەکە ئادەمێتی پێ پەیدا بوویەوە سەر لە نوێ. پێ ی زیندوو بوویەوە جارێکی تر. بەڵام لە بەرزترین و پیرۆزترین شێوەو وێنەی ئادەمێتی و مرۆڤایەتی دا، بە جۆرێ ئادەمێتی و مرۆڤایەتی پێ گەیشتە پۆپە و پلەی هەرە بەرزی. منەت و بەهرەیەکی وایە کە هیچ کەس بە تەواوی رێزی نازانێ، مەگەر کە بە باشی تێگەیشتبێ لە ئیسلام و بە نەفامێتی کۆن و تازەو ئەو ئیسلام و نەفامێتی یەی چەشتبێ بە تەواوی، جا هەرچەند ناردنی ئەو ئایین و نامە و شەریعەتە منەت و چاکە و بەهرەیە بەسەر هەموانەوە، بەڵام لێرەدا هەر بیری پێغەمبەر(ﷺ) ئەخاتەوە چونکە ئەو یەکەم کەسە کە ناسی و تێگەیشت و چەشتی، گەورەترین و ئاشناترو زاناترە پێ ی، مەردومی تر لەوی وەرگرت و ئاشنا و زانا بوو پێ ی، کەواتە ئەو بەهرەو چاکەی کە درا پێ ی لە هینی هەموو کەسێکی تر گەورەترە، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَكَانَ فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا﴾ بەهرەو چاکە و پایە و پلەی بەرزە کە خوا داوێتی بەم پێغەمبەرە(ص) بە هیچ کەسێکی تر نەدراوە، ئەم بە چەند چەندانە بەشدارە لە هەموو خێرو چاکە و بەهرەی ئەم ئوممەتە گەورەو گشتی یەدا تا ئەم جیهانە ئەپێچرێتەوە و هەڵئەگیرێ، بە بێ ئەوەی بەشی کەسی لێ کەم بێتەوە، ئینجا لەم چەند ئایەتانەی داهاتووەدا چەند مەبەستێك ئەهێنێ کە ئەڵقەیەکن لە ئەڵقەکانی ئەو بەرنامە راست و رێگەی کە قورئان هێنای بۆ ئامادە کردن و پەروەردەکردنی ئەم ئوممەتە، تا هەڵسێ بە کارو فرمانی گرنگی خۆی کە بریتی یە لە مامۆستایەتی و سەرکردایەتی کۆمەڵی ئادەمی هەتا دواهاتنی ئەم جیهانە، بێجگە لەوەیش مەبەستەکانی ئەم چەند ئایەتانە زۆر پەیوەستن بە مەبەستی ئایەتەکانی پێشیان، بەڵکو ئەگەڕێنەوە بۆ لەسەر چوون لەو رووداوەی کە لە ئایەتەکانی پێشوودا ئاماژەی بۆ کرد وەك بۆمان دەرئەکەوێ لە کاتی تەفسیرەکەیان دا، لە

یەکەمجار باسی باوێك ئەکات لە باوەکانی ئادەمی کە بریتی یە لە چپە و نهێنی کردن بە قسە و باسێك لەلایەن چەند کەسێکەوە کە خۆیان جویٚ ئەکەنەوە لە کۆڕ و کۆمەڵ بۆ ئەو مەبەستە، ئەو کردەوە زۆربەی بەدو خراپە، جا لێرەدا چاك و بەدەکەی جویٚ ئەکاتەوە و مەردومیان پیٚ ئاشنا ئەکات، یەکیٚ لە بەدەکان ئەوەبوو کە لە ئایەتەکانی پێشوودا ئاماژەی بۆ کرد سەبارەت بەو پیلانەی کە کرا لەبارەی ئەو دزی یەوە کە کرا. ئەفەرمویٚ: ﴿لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ﴾ هیچ جۆرە خێرو چاکەیەك نی یە لە زۆر لە چپە و نهێنی کردنەکانیان دا. لە چەند ئایەتێك لە قورئان دا جڵەوگیریی کرد لەوەی کە موسڵمانان ئەو جۆرە کردەوە بکەن، بەڵکو ئیسلام ئەیویست کە هەرکەس هەر تەنگ و چەڵەمە و مەبەستێکی بوو بچێتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانەی عەرز بکات. ئیتر بە نهێنی ئەگەر شتەکە تایبەتی بیٚ بە خۆیەوە و حەز نەکات بڵاو ببێتەوە بەناو مەردومان دا، یان بە ئاشکرا ئەگەر شتەکە تایبەتی نەبیٚ بەو پرسیارە کەرەوە. مەبەست لەوەش ئاشکرایە کە با هۆنینەوە و ریزی موسڵمانان دووچاری هەڵە و کاری ناڕەوا نەبن، وەك لەو رووداوەدا ئەو چەند کەسە دووچار بوون کە ئەو ئایەتە پێشووانەیان تیا هاتە خوارەوە. بێگومان لەپاش ئەو ئەبیٚ بچنە لای کاربەدەست و جێنشینە راستەقینەکان بۆ ئەوەی سەرکردایەتی یە کە بیٚ هێز و لاواز نەبیٚ و هەموو موسڵمانان کۆببنەوە لە دەوری و پەیوەستی یان نەپچڕیٚ و یەکێتی یان هەمیشە پتەو و دامەزراو بێت، بەڵیٚ بێگومان هێندیٚ کۆبوونەوە نهێنی کردن هەیە کە ئاشکرایە خێرو چاکەی رووتەو هیچ گومانی شەڕ و خراپەی لیٚ ناکریٚ، ئەو جۆرانە قەدەغە نی یە و نابیٚ جڵەوگیریی لیٚ بکریٚ، لەبەر ئەوە ئەو جۆرە چاکانەی دەرکرد و بە خراپی دانەنان، فەرموی ﴿إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ﴾ مەگەر لە چپە و نهێنی کردنی کەسێك کە فەرمان بدات بە سەدەقە و خێرکردن، بەم رەنگە پیاوێکی چاکی خێر خوازە فەرمان بدات و هانی مەردومی تری وەك خۆی بدا و پیٚی بڵیٚ: تۆ ئەزانی فلاٚن بیٚ دەست و بیٚ نەوایە و پێویستی بە یارمەتی هەیە، کەواتە با یارمەتی بدەین و چارەسەری بکەین. بێگومان ئەمە بە نهێنی چاکە، چونکە بۆلای خوا دوورترە لە رووپامایی، بۆلای خێر پیٚ کراوەکەیش هەر ئەمە چاکە و بە هیچ رەنگ بیٚ رێزی رووی تیٚ ناکات. ﴿أَوْ مَعْرُوفٍ﴾ یان فەرمان بدات بە چاکەیەکی تر و کارێکی تری شەرعی، وەك پەنادانی ستەم لیٚ کراو و رزگار کردنی پیٚ گیراو و چەند شتی تر لەم بابەتە کە خوا پیٚی خۆشە،

أَوۡ إِصۡلَٰحِۭ بَيۡنَ ٱلنَّاسِۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِ فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿١١٤﴾ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ﴿١١٥﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ

---

﴿أَوۡ إِصۡلَٰحِۭ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ﴾ یان فەرماندان بە چاك كردنی نێوان مەردومان و نەهێشتنی ئاژاوەیان، بێگومان ئەو دووانەش بە نهێنی بكرێن چاكترە و باشتر پێك دێن، بەڵكو هێندێكیان بە ئاشكرا ناگونجێ و پێك نایەن. هەرچەند یەكەم و سێ یەم بەری دووەم ئەكەون، بەلآم لە باس كردنیانەوە بە تایبەتی وەرئەگیرێ كە ئەو دوو شتە زۆر گرنگن لە ئیسلام دا، بە هەرحاڵ و لەسەر هەربار كۆبوونەوە بۆ ئەو سێ شتە و هەوڵدان بۆ بەجێ هێنانیان خێرو چاكەی تیایە، ئیتر با – خوا نەخواستە – لەبەر خوایش نەبێ، چونكە ئاشكرایە كە سوودو قازانجی مەردومانی تیایە، ئەگەر لەبەر خوا بكرێن، ئەوا سوود و قازانجی ئەوانەشی تیایە كە هەوڵ و تەقەلا ئەدەن و كۆبوونەوەكەی بۆ ئەكەن، سوودو قازانجی گەورەیان لای خوا، وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِ﴾ هەركەس ئەوانە ئەكات لە باس كران، لەبەر نیازو بە دوا گەڕانی ڕەزامەندی و خۆشنوودی خوا ﴿فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا﴾ ئەو كەسە ئێمە پێی ئەبەخشین ئەجرو پاداشتێكی گەورە، كە خۆی ئەزانێ ڕادەو پلەی، كەواتە بە بێ ئەو نیازو مەبەستە هەرچەند كردەوەكەی سوودو بەرهەمی گەورەی هەبێ، چونكە خوا ئەجرو پاداشتی كەسێك ئەداتەوە كە كارو كردەوەكەی لەبەر خوا بێت، ئەو كەسەی كە نیازو مەبەستی شتێكی تر بێت ئەبێ ئەجرو پاداشتەكەی لەو شتە نیاز كراوە داوا بكات!! جیاوازی كردەوەی لەبەر خوا و لەبەر هەر نیازێكی تر لەوەدایە، كەواتە با بڕوادار ئاگای لە خۆی بێت، خۆی بێبەش و بەش بڕاوی لای خوا نەكات. خوا بە میهرەبانی خۆی بەش بڕاوی لای خۆیمان نەكات.

لە باس و هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم کۆمەڵە ئایەتانەدا ئەمە هەیە کە دزەکە – ناوی بەشیری کوڕی ئوبەریق، یان طعمة بوو – لەپاش ئەوەی قورئان دزی و ناپاکی یەکەی دەرخست، ئەو سیا چارەیە پاشگەز بوویەوە لە ئیسلام و چوو بۆ ناو بت پەرستەکان، لە پاش ئەوەی کە لە ریزی موسڵمانەکان بوو، ئینجا بەو بۆنەیەوە ئەم دوو ئایەتە هاتە خوارەوە و بە شێوەی یاسایەکی گشتی: ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ﴾ هەرکەس دژو دوژمنایەتی فروستادەکەی خوا بکات ورد و بەرەکی بێت لەگەڵی: ﴿مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ﴾ لەپاش ئەوەی ئەو هەق و ڕێ راستەی بۆ دەرکەوێ کە ئەو فروستادە هێنای ﴿وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ شوێنی ڕێگەیەکی تر بکەوێ غەیری ڕێی بڕواداران، واتە لەو ئایینە راستە هەڵگەڕێتەوە و ڕێی بڕواداران نەداتە بەر، ﴿نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ﴾ رووی ئەکەینەوە ئەوەی کە بە خواهیشی خۆی هەڵی بژاردووە بۆ خۆی و رووی دڵی تێ کردووە، تا ئەو کەسە بە ئارەزوو و خواهیشی خۆی لایداوە لە ڕێ و بیروباوەڕی بڕواداران کە باش بۆیشی دەرکەوتووە، لەوە لایداوە و ڕێ و بیرو باوەڕێکی تری هەڵبژاردووە بۆ خۆی، ئەو کەسە کە بەو جۆرەی کرد، ئێمەیش گومرای ئەکەین و ئەوەی بۆ بڕیار ئەدەین کە خۆی ئەیەوێ، لە جیهان دا بەو جۆرەی لێ ئەکەین ﴿وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَ﴾ لە ڕۆژی دواییش دا ئەیخەینە دۆزەخ بە جۆرێ ئەیبرژێنین و ئەیسوتێنین پێی ﴿وَسَآءَتۡ مَصِيرًا﴾ دۆزەخ دوا ڕۆژ و چارەنووسێکی زۆر بەدو خراپە بۆی.

لە چەند شوێنێك دا لەم تەفسیرەدا ئەم مەسەلەیەم بە روونی باس کردووە بە جۆرێك هیچ گەرد و تۆزێکم بەسەرەوە نەهێشتووە، لەبەر ئەوەی کە شوێنی لادان و هەڵخلیسکانە چاك وایە هەموو جارێ ئەو مەسەلەیە بێتە پێشەوە، هەر قسەی لێ بکرێ و هەوڵ بدرێ بۆ زیادە روون کردنەوەی، جا کەواتە لێرەیش دا ئەڵێین: شتێکی ئاشکرایە کە خوا پێغەمبەری نارد(ﷺ) بە بەرنامەیەکی تێرو تەواو کە هەموو بار و روویەکی ژیانی گرتووەتەوە: عەقیدە

و بیرو باوەڕو عیبادەت، یان شەریعەت و یاسا و ڕژێم. بە هەموو ئەوانە ئەو بەرنامە کە نابێ و نامێنێ! دژو دوژمنی ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) هەرکەسێکە کە بڕوای نەبێ بەو بەرنامەیە و دانی پیا نەنێ، ئیتر بە هەموو بەرنامەکە، یان بە هێندێکی و هەر بەش و پارچەیەکی! ئینجا دادو میهرەبانی خوا داخوازی ئەوە بوو کە ئەو بەرنامەیە ڕاگەیەنرێ بە مەردوم بە ڕوونی و لەگەڵ بەڵگە و ڕابەری ئاشکرادا، ئینجا دوای ئەو ڕاگەیاندن و ڕوون کردنەوە، هەرکەس ئەو بەرنامەی خوای نەدایە بەر و ڕازی نەبوو پێی و بە ویست و خواهیشی خۆی ڕێگەیەکی تری دایە بەر و بەرنامەیەکی تری هەڵبژارد بۆ خۆی، ئەو کەسە خوا گومڕایی لەسەر بڕیار ئەدا، ئەیخاتە سەر ئەو ڕێگەیە کە خۆی ئەیداتە بەر، ڕوونی دڵی ئەکاتە ئەوەی کە خۆی هەڵی ئەبژێرێ، ئەیخاتە ریزی بێ بڕواو بت پەرستان، شایستەی ئەو تۆڵە و سزا ئەبێ، لێ بوردن و لێ خۆش بوون لەو کەسە نابێ، چونکە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ﴾ بەڕاستی خوا خۆش نابێ لەوەی کە هاوبەشی بۆ بڕیار بدرێ، ئەگەر لەسەر ئەو باوەڕە بمرێ، ئیتر ئەو هاوبەش دانانە لەسەر ئەو شێوە و بارە بێ کە بووە لە سەردەمی نەفامی عەرەبی دا، یان بەم شێوە بێت، هەر سیفەت و کارو کردەوەیەك کە تایبەتی بێت بە خواوە، ڕەوا بدرێ بۆ هەرکەس و هەر شتێکی تر وەك زانینی ئەو شتانەی کە هیچ بەڵگە و نیشانەیەك نی یە لەسەریان و بە ژیریی نازانرێن و هەستیان پێ ناکرێ، هەروەها ڕەوادانی ماق دانانی یاسا و شەریعەت بۆ غەیری خوا، وەك جوولەکە و گاورەکان کە ئەو مافەیان ڕەوادا بۆ زانا و عابیدەکانیان، وەك لە چەند شوێنێك دا ئاماژەی بۆ کرا، لە پاشا – بە یارمەتی خوا – بە درێژیی باسەکەی دێت لە سورەتی تەوبەدا. هەرکەسێك هەر جۆرە هاوبەشێك بۆ خوا دابنێ و لەسەر ئەو بارو حاڵە بمرێ ئەو کەسە بەهەمیشەیی لە دۆزەخ دا ئەبێت و خوا لێ ی نابووری، واتەئەوتاوانەدەست نادات بۆلێ خۆش بوون و بە گوێرەی مەیل و خواهیشی خوا،

وەك ئەفەرمویْ: ﴿وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ﴾ خۆش ئەبیْ لەوە كەمتر بۆ هەركەسیْك كە خوا خۆی مەیل و خواهیشی لیْ ی بیْ. بەلْیْ. هاوبەش رەوا دەر ماڤ خۆیەتی كە لیْ بوردن و لیْ خۆش بوونی بۆ نەبیْ، چونكە لە سنووری خیْرو چاكە دەرچووە بە تەواوی، بە جۆریْ سروشتی تیْك چوونە كە ئەفەرمویْ: ﴿وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا﴾ هەركەسیْك هاوبەش بۆ خوا دابنیْ بە هەر جۆرو شیْوەیەك بیْگومان ئەو كەسە گومڕا بووە بە گومڕا بوونیْكی زۆر دوور، دورە لە هەق و راستی، دوورە لە فام و ژیریی، دوورە لە رادەو پلەی مرۆڤایەتی. بیْگومان ئەو كەسانەی كە بڕوایان بە بوونی پەروەردگار نی یە و وا گومان ئەبەن كە ئەم بوون و جیهانە لە خۆیەوە پەیدا بووە، ئەو كەسانە ئەگەر بە هاوبەشی رەوادەر دانەنریْن، بیْگومان گومڕا تر و بەد ترن، كەواتە پیْویست نی یە حالْ و باریان باس بكریْ. ئەم ئایەتەی دووبارە كردەوەو دووجار لەم سورەتەدا فەرمویەوە. هەركام بە گویْرەی پەیوەندی بە مەبەستی شویْنەكەوە، قورئان كتیْبی فەن و قانوون نی یە تا گوتنی مەسەلە و مەبەستەكانی یەك جاری بەس بیْت، بەلْكو كتیْبی ریْنموونی و بانگ كردنی گشتی یە، ئەوەش پیْویستی هەیەبەدووبارە كردنەوەو چەندبارەكردنەوەی مەبەستەكانی تا لەدلْ و دەروون دا جیگیر بن. سەرەتای ئەم ئایەتە لە هەردوو شویْنەكەدا وەك یەكن بە بیْ جیاوازی، بەلاّم جیاوازیی خستنە دوایی یەكەی، بەم رەنگە لە یەكەمجاری ﴿فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا﴾، لیْرەدا ئەفەرمویْ: ﴿فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا﴾ ئەو جۆرە جیاوازی یەش هۆی تایبەتی یان هەیە، هەر لە دەست قورئان هاتووە چاودیْری ئەو جۆرە شتانە! جاری یەكەم ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە دەربارەی نامەدارەكان كە بەهۆی نامەكەیانەوە گومانیان نەبوو لە راستی كارەكانی پیْغەمبەردا(ﷺ) ئەیانزانی كە پیْویستە پەیڕەوی كردنی شەریعەتەكەی، كەواتە ئەوەی كە ئەیانگوت بە دژی زانینەكەیان، هەمووی دەلەسە و دەست هەلْبەست بوون، بەلاّم لیْرەدا بە بۆنەی بت پەرستەكانەوە هاتووە كە ئەمان هەرچی یان ئەگوت لە نەفامی و گومڕایی یەوە بوو، كەواتە بۆ ئەوی بەو جۆرە ریْك بوو، وەك بۆ ئیْرەش بەم جۆرە ریْك و پیْك بوو! پاكی و بیْگەردی بۆ

ئەو خوایەی کە ئەم قورئانە بێ وێنەی نارد بۆ سەر بەندە خۆشەویستەکەی(ﷺ). ئیمامی شافیعی – خوای لێ رازی بێت – ئایەتی پێشووی کردووە بە رابەر و بەڵگە لەسەر ئەوەی کە بڕیاری ئوممەت و یەك گرتنیان لەسەر هەر رایەك بەڵگە و رابەرێکی شەرعی یە لەسەر راست و رەوایی ئەو رایە و ئەبێ پەیڕەوی بکرێن، دروست نی یە لادان و سەرپێچی لێ ی،(مزنی) یەکێکە لە هاوەڵەکان ئەفەرموێ: رۆژێك لای شافیعی بووم ئینجا پیاوێك هات و جل و بەرگی خۆی لەبەردا بوو و دار دەستێکی بەدەستەوە بوو، ئینجا کە شافیعی بینی پیاوێکی بە نرخ و بەرێزە هەڵسایەوە و خۆی کۆکردەوە، ئینجا ئەو پیاوە گوتی: ئایا چ رابەرو بەڵگەیە لە ئایینی خوادا! ئەویش وتی: نامەکەی خوا. ئینجا گوتی: ئینجا چی؟ شافیعیش فەرموی: رەوشتی پێغەمبەرەکەی(ﷺ). ئینجا گوتی: لە پاش ئەو چی تر؟ ئەمیش فەرموی: بڕیاری ئوممەت. واتە ئیجماع. ئینجا پیاوەکە گوتی: ئەم سێیەمەت لە کوێ هێنا؟ ئایا لە نامەکەی خوادا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوە؟ شافیعی هێندێ وەستا و بێ دەنگ بوو. پیاوەکە پێ ی گوت: سێ شەو رۆژ مۆڵەتت ئەدەم ئەگەر ئایەتێکت هێنایەوە بە بەڵگە لەسەری ئەوا چاکە، ئەگینا دوورکەرەوە لە مەردوم و کەنار گیر بە. شافیعیش مایەوە لە ماڵ دا دەرنەئەچوو تا رۆژی سێ یەم لە نێوان نێوەڕۆ و عەسردا هاتە دەرەوە و رەنگی تێك چوو بوو، ئینجا پیاوەکە هات و سەلامی کرد و دانیشت، فەرموی: وەلاّم و مەبەستەکەم بۆ باس بکە. ئەویش فەرموی: خوا ئەفـــەرموێ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ: ﴿ وَمَن يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا ﴾ بێگومـــان ئەگـــەر پەیڕەوی بڕواداران پێویست و فەرز نەبێ خوا ئەو هەڕەشە و سزا سەختە نادا لەسەر پەیڕەوی نەکردن، ئینجا پیاوەکە فەرموی: راست ئەکەیت و ئیتر هەڵسا و رۆیشت. ئەگێڕنەوە کە شافیعی فەرموی: لە هەر رۆژێك دا و لە هەر شەوێك دا سێ جار قورئانم ئەخوێند تا رێم کەوت لەو ئایەتە. لە ریوایەتێکی تردا ئەڵێن: سێسەد جار خوێندی تا رێ ی لێکەوت.بەڕاستی رابەرو بەڵگەیەکی بەهێزە کە خوا رێ ی ئەو ئیمامەی لێ خست – خوا لێی رازی بێت – هەرکەس هەر رەخنە و سەر لێ کردنەوەی تیا کردووە کاتی خۆی زایە کردووە.

إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ إِنَٰثًا وَإِن يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَٰنًا مَّرِيدًا ﴿١١٧﴾ لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ مِنْ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿١١٨﴾ وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ وَلَءَامُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلْأَنْعَٰمِ وَلَءَامُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيْطَٰنَ وَلِيًّا مِّن دُونِ ٱللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا ﴿١١٩﴾ يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ

---

ئینجا باسی هێندێ له گومان و خەیاڵاتی سەردەمی نەفامی عەرەبەکان ئەکات کە هەبوو لەناویان دا لە بت پەرستی یەکەیان دا، باسی هێندێ قسەی پڕو پووچی ئەو چەرخە لەبارەی مەلائیکەوە، لەبارەی پەرستنیان بۆ شەیتان، هەرچۆنێ باسی هێندێ لە شیعار و نیشانە و باویان ئەکات کە لەو سەردەمەدا بوویان، ئەفەرموێ: ﴿إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ إِنَٰثًا﴾ ئەوانە نزاو هاوار ناکەن لە غەیری خا یان ناپەرستن بێجگە لە چەند مێینەیەك، واتە چەند بتێك کە بە مێینەیان دائەنان، لەبەر ئەوەی بە وێنەی مەلائیکەیان دائەنان و مەلائیکەشیان بە کچی خوا دائەنا، لەبەر ئەوەش زۆربەیان ناوی مێینەیان لێ ئەنان،(لات، عزی منات) لە یەکەمجارەوە بەناوی ئەو مەلائیکانەوە ئەیانپەرستن بۆ ئەمەی نزیکیان بخەنەوە لە خوا، ئینجا لە پاشان ئەوەیان لە بیر نەما و یەکسەر ئەو بتانەیان ئەپەرست و هەر بە مێینەشیان دائەنان، بە هەرحاڵ و لەسەر هەربار قورئان لێرەدا سەرزەنشتیان ئەکات و دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوپەڕی نەفامی و نەزانی یان، هێندێکیان بەو جۆرە بەردیان ئەپەرست، هێندێ تریان شەیتانیان ئەپەرست، وەك(کەلبی) ئەفەرموێ:(بنو ملیح) جنۆکەیان ئەپەرست کە شەیتان لەوانە. یان بت پەرستی یەکەیان لەسەر فریودان و هەڵخەڵەتاندنی شەیتان بوو ئەمانیش گوێ رایەڵ بوون بۆ ئەو شەیتانە دوژمنە هەر لە یەکەم باوکی هەموانەوە جاڕی دوژمنایەتی دا بۆ خۆی و هەموو نەوەکان تا رۆژی دوایی، داوای مۆڵەتی کرد لە خوا بۆ ئەوەی هەرچەندی لە دەست بێت لە تیرەی ئادەمی بیانکات بە کۆمەڵ و شوێن کەوتووی خۆی، بێگومان ئەو گوێ رایەڵی یەش پەرستنی تەواوە، بەهەرحاڵ و لەسەر هەربار سەرزەنشتێکی بەتین تریان ئەکات و بە تەواوی بە نەفام دەریان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿إِلَّا شَيْطَٰنًا مَّرِيدًا﴾ ئەوانە نزاو هاوار ناکەن، یان ناپەرستن بێجگە لە

شەیتانێکی یاخی و سەرکێش لە گوێ رایەڵی خوا، شەیتانێك ﴿ لَعَنَهُ ٱللَّهُ﴾ کە خوا دەری کرد و دووری خستەوە لە میهرەبانی خۆی ﴿وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ مِنْ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا﴾ لە پاش ئەوە ئەمیش گوتی بە خوا: سوێند بە گەورەیی تۆ وەرئەگرم بۆخۆم لە بەندەکانت بەشێکی دیاریی کراو کە بۆم رێك خرابێ و بە دەستمەوە بێت ﴿ وَلَأُضِلَّنَّهُمْ﴾ سوێند بە گەورەیی تۆ گومرایان ئەکەم و دڵیان لائەدەم لە رێی راست و وەرگرتنی بیرو باوەڕی راست. ﴿ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ﴾ ئاوات و ئامانجی درۆینە ئەخەمە دڵ و دەروونیانەوە، ئیتر بە هەر جۆرێك کە پێی هەڵخەڵەتێن و رێی خوا نەدەنەبەر. ﴿ وَلَآمُرَنَّهُمْ﴾ فەرمانیان پیا ئەدەم بە گومڕا بوون یان بە بڕین و لەت کردنی گوێچکەی حوشتر و چوارپێکانیان. ﴿ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلْأَنْعَٰمِ ﴾ ئینجا ئەوانیش بە بێ گیرو گرفت حوشتر و چوارپێکانیان ئەبڕن لە بێخ وەك ئەبو عبداللە ئەفەرموێ. یان لەتیان ئەکەن، وەك(زجاج) ئەفەرموێ. لەسەر هەرکام مەبەست بێ ئەوە باوێکە لە باوەکانی سەردەمی نەفامی کە ئەو کردەوەیان ئەکرد دەربارەی هەر حوشترێك کە پێنج سکی بکردایە و پێنجەمەکەی نێر بوایە. ئیتر قەدەغەیان ئەکرد لە سواری پێ کردن و بار پێ بردن و هەر جۆرە ئیش و کاری تر. وەك بە یارمەتی خوا باسەکەی بە درێژیی دێت لە سورەتی(الأنعام)دا، ﴿ وَلَآمُرَنَّهُمْ﴾ فەرمانیان پیا ئەدەم ﴿ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ ٱللَّهِ﴾ ئەوانیش بە بێ گیرو گرفت کردوست کراوی خوا ئەگۆڕن بە پێی فەرمانی من، ئیتر مەبەست گۆڕینی ئەو ئایینە سروشتی یە بێت کە خوا ئادەمی لەسەر داڕشتووە، بە بێ ئایینی و بێ بڕوایی، یان بە گۆڕینی حەرام بە حەڵاڵ و حەڵاڵ بە حەرام. یان مەبەست گۆڕینی بارو شێوەو دیمەن و قەبارەی دروست کراوەکان بێت. وەك هەڵکۆڵینی چاو و کوێر کردنی، گوێ بڕین و خەساندن و داخ کردن و گۆڕینی دان و مووی سەر و هەر گۆڕینێکی تر کە شەرع قەدەغەی کردبێ، یان مەبەست بەکار هێنانی دروست کراوەکان بێت بە جۆرێکی بێ شەرعی، بۆ وێنە مانگ و رۆژ بۆ ئەوە دروست کراون کە سوودیان لێ وەرگیرێ و خزمەتکار بن کەچی مەردومی نەفام ئەیانپەرستن. بەهەرحاڵ و لەسەر هەربار کە هەرکام لەوانە رای چەند کەسێکیان لەسەرەو کراون بە تەفسیری ئایەتەکە. ئەو جۆرە شتانە هەموو ناڕەوا و بێ جێن و شەیتان شیرینیان ئەکا لە پێش چاو و هانی مەردوم ئەدات لەسەر کردنیان، هەموو ئەوانە تەڵە و داوێکن لەلایەن ئەو شەیتانە دوژمنەوەو ئەیەوێ لە رێگای ئەوانەوە مەردومی نەفام بکات بە بەندەی

ئەڵقە لە گوێ ی خۆی، جا کەواتە هەرکەسێك ژیر بێت ئەبێ وریا و دوور کەوێتەوە لەو تەڵە و داوانە. هەرکەسێك ئەم قورئانەی پێ گەیشتبێ هیچ بڕو بیانوویەکی بەدەستەوە نی یە، چونکە هەواڵی پێداوە بە بوونی ئەم دوژمنە کۆڵ نەدەرە و پیلان و کردەوە پیسەکانی و نیازو مەبەستە بۆگەنەکانی، کەواتە هەرکەسێك مەرد بێت ناکەوێتە شوێنی ئەم دوژمنە پیسە، بەڵکو ئەمیش ناوەستێ لە بەربەرەکانێ و بەرگری کردنی، خۆی نادزێتەوە لە جەنگ کردن لەگەڵی، چونکە ئەگەر وانەبێ و وانەکات ئەوا مل کەچی ئەکات بۆ شەیتان و شەیتان ئەکات بە دۆست و کاربەدەستی خۆی، لە دۆستایەتی خوا تێپەڕ ئەکات بۆ دۆستایەتی شەیتان ﴿وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيْطَٰنَ وَلِيًّا﴾ هەرکەس شەیتان وەرگرێ و دابنێ بە دۆستی خۆی ﴿مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ لە کاتێك دا کە بەوە تێپەڕ ئەکات لە دۆستایەتی خوا بۆلای شەیتان. بەوەی باوی ئەوە ئەدا کە شەیتان ئەیەوێ بەسەر ئەوەی کە خوا فەرمانی پێ ئەدا، هەرکەس بەو جۆرە بکات ﴿فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا﴾ بێگومان ئەو کەسە زیان ئەکات بە زیان کردنێکی روون و ئاشکرا، چونکە بە جارێ سەرمایە و دەست مایەکەی لە دەست دەرئەچێ، جێ و شوێنی بەهەشتی ئەگۆڕێتەوە بە دۆزەخ، دەست لە رەزامەندی خوا هەڵئەگرێ بۆ خواست و رەزامەندی شەیتان!! ﴿يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ﴾ بەڵێنیان پێ ئەداو ئاوات و ئامانج ئەخاتە دڵ و دەروونیان، ئەکەوێتە خوار و ژووریان تا سروشتیان ئەترازێنێ لە باوەڕ بە خواو بە تاك و تەنیایی خوا، بۆ بێ بڕوایی و هاوبەش دانان بۆ خوا، تا کردەوە خراپەکانیان بە چاك و پەسەند ئەزانن و سەیریان ئەکەن! بەڵێنیان پێ ئەدا بە سەرکەوتن و دەست کەوت و خۆشبەختی لە رێگای گوناهو تاوانەوە! ئومێدی رزگار بوون ئەخاتە دڵیان تا بە ئارامی و خۆشبەختی لە رێگای گوناهو تاوانەوە! ئومێدی رزگار بوون ئەخاتە دڵیان تا بە ئارامی و خۆشیەوە ئەمێننەوە لەسەر ئەو بارو حاڵەی کە وان لەسەری، ئیتر ئەو بەڵێن و ئاوات و ئامانجە بەهۆی ئەو خەتەرەو خەیاڵانە بێت کە لە رێگەی شەیتان خۆیەوە ئەیخاتە دڵ و دەروونیان، یان بەهۆی دۆست و شوێن کەوتووەکانی یەوە بێت لە تیرەی ئادەمی کە هەمیشە ناوەستن و ئەکەونە خوارو ژووری مەردوم تا لە رێگەی راست لایان ئەدەن،

وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ وَلَا يَجِدُونَ عَنْهَا مَحِيصًا ﴿١٢١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقًّا ۚ وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلًا ﴿١٢٢﴾

---

**بە هەربارو لەسەر هەر حاڵ ﴿وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا﴾ شەیتان بەڵێنیان پێ نادا مەگەر هەر لەبەر هەڵخەڵەتاندنیان، یان هەر بەڵێنی شتی بەتاڵ و پووچیان پێ ئەدا کە پێی هەڵئەخەڵەتێن. ئینجا ئایا ئیتر هیچی تێدا ئەمێنێ؟ لە پاش ئەم باس و بەیانی خوا ئایا هیچ کەس هەیە کە جڵەوگیریی خۆی نەکات لە شوێن کەوتنی شەیتان و هەڵنەخەڵەتێ بە بەڵێن و دەلەسە و گزاڤەکانی شەیتان. مەگەر ئەو کەسانەی کە سروشتی ئادەمێتی یان کوێر بووبێتەوە و ژیریی یان لەکار کەوتبێ؟! ئینجا باسی چارەنووس و دوا ڕۆژی شوێن کەوتوو و هەڵخەڵەتاوەکان ئەکات لەگەڵ چارەنووس و پاشەڕۆژی ئەوانەی کە بەندەی ڕاستەقینەی خوان و هەڵناخەڵەتێن بە شەیتان و بەڵێن و دەلەسەی شەیتان: دەربارەی یەکەم ئەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ﴾ ئەوانەی کە شەیتان وەرئەگرن بە دۆستی خۆیان و هەڵئەخەڵەتێن پێی، ئەوانە شوێن و ماواو نیشتەجێ یان دۆزەخە ﴿وَلَا يَجِدُونَ عَنْهَا مَحِيصًا﴾ دەستیان ناکەوێ جێ و شوێنی ڕاکردن و لادان لەو دۆزەخە، خوا پەنامان بدات لێ ی. دەربارەی دووەم ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان هێنا لەم جیهانەدا و کردەوە چاکەکانیان کرد ﴿سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ بێگومان ئەیانخەینە بەهەشتانێکەوە کە ڕووبارەکان دێن و ئەچن بە ژێریان دا ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾ لە کاتێک دا کە ئەو بڕوادارو خاوەن کردەوە چاکانە ئەمێننەوە لەو بەهەشتانەدا بە هەمیشەیی و بێ دواهاتن و بڕانەوە ﴿وَعْدَ ٱللَّهِ﴾ خوا بەڵێنی پێ داون ﴿حَقًّا﴾ خوا ئەو بەڵێنەی بەدی ئەهێنێ و بەڕاستی دەرئەکات ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلًا﴾ ئایا کێ ڕاست ترە لە خوا لەبارەی بەڵێن و قسەیەوە؟ بێگومان قسە و بەڵێنی خوا ڕاست ترە لە قسە و بەڵێنی هەموو کەس. ئەو هەموو دڵنیایی یەی لەسەر کرد بەرامبەر ئەو هەموو بەڵێن و ئاوات و ئامانجە درۆینانەی کە شەیتان ئەیاندا بە شوێن کەوتووەکانی خۆی و ئەیانخاتە دڵ و دەروونیانەوە.**

ئینجا به دوای ئەو هەڕەشە و مزگێنی یەدا یاسا گەورەکەی ئیسلام ئەمێنێ لەبارەی کردەوە و پاداشت و تۆڵەی کردەوەدا، بێگومان پاداشت و تۆڵە نابێ بە پێی ئارەزوو و ئاواتی مەردوم بێت، بەڵکو ئەبێ بگەڕێتەوە و دامەزرێ لەسەر بنەڕەتێکی دامەزراو، بە پێی باوێکی نەگۆڕاو بێت، بە پێی یاسا و قانوونێك بێت کە لایەنگیری کەس نەکات و هەموو کەس یەکسان بێت لەبەردەمی دا، خراپەکار تۆڵەی خۆی لێ بسێنرێ و چاکە کاریش پاداشتی رێك و پێکی خۆی بدرێتەوە، نەك وەك جوولەکە و گاورەکان کە ئەڵێن: ئێمە رۆڵە و خۆشەویستی خواین، ئێمە سزاو ئاگرمان بۆ نابێ چەند رۆژێکی کەم نەبێ، یان جوولەکە ئێستاش هەر لایان وایە کە ئەوان جیاوازن و وەك هیچ گەلێکی تر رەفتاریان لەگەڵ ناکرێ، چونکە ئەوان گەلی هەڵبژێرراوی خوان، رەنگە هێندێ لە موسڵمانانیش ئەو جۆرە بیرو باوەڕیان لە دەروونی خۆیان دا بووبێ، بەهۆی ئەوەوە کە ناونراون بە چاکترین ئوممەت، یان بەهۆی نەسەب و نەژادی پیرۆزەوە گوناهیان لەسەر نانوسرێ، جا بۆ نەهێشتنی ئەو جۆرە بیرو باوەڕانە، بۆ بەرگری ئەو جۆرە قسە و خەتەرە و باسانە ئەم چەند ئایەتە هاتنە خوارەوە: ﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ﴾ بەڵێنی خوا نە ئارەزوو و ئاواتەکانی ئێوەو نە ئارەزوو و ئاواتی نامەدارەکانە. بەڵکو بەم جۆرەیە کە ئەفەرموێ: ﴿مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ﴾ هەرکەس هەر خراپەیەك بکات تۆڵەی لێ ئەسێنرێ پێی و دووچاری تۆڵەکەی ئەکرێ. ئیتر لە جیهان دا یان لە رۆژی دوایی دا، نەك هەر لە رۆژی دوایی دا، بەڵگە لەسەر ئەوە چەند حەدیسێکە کە وەرگیراوو باوەڕ پێ کراون لەناو زانایانی ئیسلام دا، یەکێ لەو حەدیسانە ئەمەیە کە ئیمامی ئەحمەد ئەیهێنێ لە ئەبوبەکری کوڕی ئەبو زەهیرەوە کە ئەفەرموێ: هەواڵم پێ دراوە کە ئەبوبەکری صدیق – خوای لێ رازی بێت – گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا لە پاش ئەم ئایەتە ئیتر چارە چی یە؟ چونکە ئەبێ تۆڵەی هەموو خراپەیەکمان لێ بستێنرێ، پێغەمبەریش(ﷺ) لە وەڵامی دا فەرموی: خوا لێت خۆش بێت ئەی ئەبوبەکر، ئایا تۆ نەخۆش نابی؟ ئایا تۆ ماندوو و نارەحەت نابی؟ ئایا تۆ غەمبار نابیت؟ ئایا تۆ بەسەرهاتی بەتین و سەختت بەسەر نایە؟ ئەمیش عەرزی کرد بەڵێ! ئەویش

فەرموی: ئەوەی کە وتراوە لەوانەیە کە تۆڵەتان لیٚ ئەستێنریٚ پیٚ ی، ئەم حەدیسە حاکمیش ریوایەتی کردووە لە ریٚگەی سوفیانی سەوری یەوە. ئەبوبەکری کوڕی مەردومی یە ریوایەتی کردووە لە(ئیبن و عمر) ەوە کە لە ئەبوبەکری صدیقەوە ئەگێڕنەوە خوا لە هەموان رازی بێت، ئەفەرمویٚ: من لە خزمەت پێغەمبەر بووم(ﷺ) ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، لە پاشان پیٚ ی فەرموم: ئەی ئەبوبەکر ئایا ئایەتێکت بۆ نەخوێنم کە هاتە خوارەوە بۆ سەرم؟ منیش گوتم: بیخوێنە بۆم. ئینجا کە خوێندی وام هەست کرد کە شکانێك پەیدا بوو لە پشتم دا، تا رادەیەك پشتم بۆ دانەواند و کەوتمە لەرزە! ئینجا ئەویش فەرموی ئەوە چی یە بۆ وات بەسەر هات؟ منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا باوك و دایکم بە قوربانت بیٚ! ئایا کیٚ لە ئێمە خراپەی نەکردووە، ئێمە تۆڵەمان لیٚ ئەسێنریٚ لە باتی هەموو خراپەیەك کە کردوومانە! ئەویش فەرموی: ئەی ئەبوبەکر تۆ و هاوڕیٚ بڕوادارەکانت لەم جیهانەدا تۆڵەتان لیٚ ئەسێنریٚ، هەتا ئەگەن بە حوزوریخوا بەبیٚ گوناهو گوناهەکانتان نامێنیٚ. بەڵام ئەوانی تر – واتە بیٚ بڕواکان – هەموو خراپەیەکیان بۆ کۆئەکرێتەوە هەتا لە رۆژی دوایی دا تۆڵەی هەموویان لیٚ ئەسێنریٚ، تیرمزیش بەم جۆرەی ریوایەت کردووە.(ئیبن و ئەبی حاتەم و ئیبن و جەریر) حەدیسیٚ ئەهێنن لە دایکی ئیمانداران(عائشة) وە – خوای لیٚ رازی بێت – کە ئەفەرمویٚ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەزانم بەتین ترین ئایەتی قورئان کامەیە. ئەویش فەرموی: کامەیە: منیش گوتم: ئەم ئایەتە: ﴿مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ﴾ ئەویش فەرموی: هەرچی دووچاری بەندەی بڕوادار ببیٚ تەنانەت پیٚ هەڵکەوتنیٚ کە بەسەری بێت... هتد.(موسلیم و ترمزی و نەسائی) حەدیسیٚ لە(سوفیانی کوڕی عوییەنە) وە کە ئەوەیش لە(ئەبو هورەیرە) وە ئەیهێنیٚ: کە ئەفەرمویٚ: کاتیٚ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە زۆر قورس بوو لە دڵی موسڵمانەکان دا، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: رێی راست بدەنە بەر و دامەزراو بن لەسەری. باری ناوەڕاست و میبانە بگرنە دەست بە بیٚ زیادە رەوی و کەم و کوڕی، چونکە هەرچی دووچاری موسڵمان ببیٚ ئەبیٚ بە کەفارەتی گوناهی تەنانەت درکیٚ بچیٚ بە پێیدا یان پیٚ هەڵکەوتنێکی بەسەر بێت. بەهەرحاڵ کەواتە ئەبیٚ هەموو خراپەیەك تۆڵەی بەدوادا بێت و خراپەکار رزگاری نابیٚ لیٚی،

وَلَا يَجِدۡ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴿١٢٣﴾ وَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ نَقِيرٗا ﴿١٢٤﴾ وَمَنۡ أَحۡسَنُ دِينٗا مِّمَّنۡ أَسۡلَمَ وَجۡهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۗ

---

**﴿وَلَا يَجِدۡ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا﴾ دەستی ناكەوێ بۆ خۆی هیچ كاربەدەست و دۆستێك كە پەنای بدات و بیگرێتە خۆی، هیچ كۆمەكێكی دەست ناكەوێ كە یارمەتی بدات بۆ بەرگری سزای خوا لێ ی كە ئەو خراپەكارە تێپەڕ بكات لە كاربەدەستی و دۆستایەتی و یارمەتی و پەنا دانی خوا. موسڵمان بەو جۆرەی كە باس كرا دڵیان هاتە لەرزە لەم ئایەتە، دەروونیان بێ ئارام بوو لە سام و بیمی، چونكە ئەوان بەڕاستی تێگەیشتبوون، بەڕاستی كاری خۆیان و ئایینەكەیان گرتبوو، ئەیانزانی راست و رەوایی بەڵێنی خوا، دەروونیان لەگەڵی ئەژیان، هەر لەم جیهانەدا ئەژیان لەگەڵ رۆژی دوایی دا، وەك ئێستا ئەو رۆژە بێت، جا بەهۆی ئەوەوە ئەو ئوممەتەیان لێ پێك هات كە مێژووی ئادەمی شتی وای نەدیبوو، نایشی بینێ مەگەر جارێكی تر وەك یەكەمجار ئوممەتێكی تری قورئانی پەیدا ببێ! لەبارەی تۆڵەی گوناهو تاوانەوە بەو جۆرەی فەرمو، ئەو بۆچوونە راست و رەوای خستە دڵمانەوە، ئینجا لەبارەی پاداشتی كردەوەی چاكەوە ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ﴾ هەركەس لە كردەوە چاكەكان بەجێ بێنێ، ئیتر نێر بێ یان مێ، ﴿وَهُوَ مُؤۡمِنٞ﴾ لەكاتێك دا كە بڕوادار بێ – چونكە هەر كردەوەیەكی چاك بە بێ بڕوا هیچ نرخێكی نی یە لای خوا – ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ﴾ ئەو خاوەن كردەوە چاكانە لە بڕواداران ﴿يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ﴾ ئەچنە بەهەشتەوە ﴿وَلَا يُظۡلَمُونَ نَقِيرٗا﴾ كەم و كوڕی ناكرێ لە پاداشتیان بە كەمترین شت، ئینجا لە جێ یە هیچ لە پاداشتی گوێ رایەڵان كەم نەكرێتەوە، ئەبێ باشتر سزاو تۆڵەی یاخی و تاوانباران زیاد نەكرێ، چونكە خوا لە هەموو كەس بەخشندە و میهرەبان ترە، بێگومان تۆڵەی زیاد ناڕێك ترو نەگونجاو ترە لەگەڵ ئەو بەخشندەیی و میهرەبانی یە فراوانەدا، تا**

کەم کردنەوەی پاداشت، کەواتە لە باسی ئەمەوە ئەو ئەزانرێ و پێویست نی یە بە باس کردنی ئەو. لەم ئایەتەدا دەرکەوت کە رزگاربوون، بەڵکو خۆش بەختی بەستراوە بە بڕوا و کردەوەی چاکەوە، ئینجا ئەوا راڤەی بڕوامان بۆ ئەکات لەگەڵ دەست نیشان کردن بە رادەو پلەی هەرە بەرزی بڕواو کردەوەی چاك. ئەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ﴾ ئایا کێ چاکترو شیرین ترە لە بارەی ئایینەوە لە کەسێك کە خۆی یە بارو پاك و خاوێن کردبێ بۆ خوا بە مل کەچی و گوێ رایەڵی هەر بۆ ئەو ﴿وَهُوَ مُحْسِنٌ﴾ لە کاتێك دا کە چاکەکار بێت و دوور بێت لە خراپەکاریی، یان لە کاتێك دا کە کردەوە چاکەکان بەجێ بێنێ لەسەر ئەو بارو شێوەی کە شیاو و شایستەیە بۆ خوا، وەك لە حەدیسەکەی بوخاری و موسلیم دا فەرموی: خواپەرستی بکەیت بە جۆرێ وەك تۆ خوا ببینی بە چاوی سەر، چونکە ئەگەر تۆ خوا نابینی خوا تۆ ئەبینێ، ﴿وَاتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا﴾ شوێنی ئایینی ئیبراهیم کەوتبێ کە ئایینی خواپەرستی یە بە تاك و تەنیا، لە کاتێك دا کە ئیبراهیم لادەرو روو وەرگێڕە لە هەموو بیرو باوەڕو ئایینەکانی تر واتە هیچ کەس لەو کەسە چاکتر نی یە کە بە تەواوی مل کەچ بێ بۆ خوا و کردەوەی چاکی بێت و هەر پەیڕەوی ئایینی خوای کردبێ کە ئیبراهیم لەسەری بووە. کەواتە با هەموو میللەت و گەلەکانی جیهان بێن بۆ ژێر سایەی ئەم ئاینە و شەریعەتە کە جێگرو جێنشینی هەموو ئاین و شەریعەتەکانی خوایە و بانگی هەموو ئادەمی ئەکات کە پەیڕەوی ئیبراهیم بکەن(علیه السلام) کە هات و ئایینی خوای دایە بەر و لایدا لە هەموو ئایینەکانی تر و ئەو بت پەرستی یەی کە لە سەرەتای چەرخی ئەودا جیهانی داگیر کرد بوو بە تایبەتی وڵات و گەل و کەس و کارەکەی ئەو، ئەو ئیبراهیمەی کە سەر لە نوێ ئایینی خواپەرستی رواندەوە لە زەوی دا، چەسپاندی یەوە لە جیهان و ناو دڵی مەردومان دا. با بێن هەموو ئەم رێگە راستە بدەنە بەر بە تایبەتی جوولەکە و گاور و بت پەرستەکانی عەرەب کە خۆیان بە نەوەو شوێن کەوتووی ئیبراهیم دائەنێن. بەم وتە کورتە حەقیقەتی بڕواو خواپەرستی و کردەوەی چاکی دیاریی کرد و نەخشەی کێشا کە هەر لە دەست قورئان دێت ئەم جۆرە شتانە!

﴿وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبۡرَٰهِيمَ خَلِيلٗا ﴿١٢٥﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٖ مُّحِيطٗا ﴿١٢٦﴾ وَيَسۡتَفۡتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِۖ قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِيهِنَّ وَمَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ فِي يَتَٰمَى ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا تُؤۡتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرۡغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ وَٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلۡوِلۡدَٰنِ

---

**ئینجا سەرنجی مەردوم ڕائەکێشێ بۆ پێویستی شوێن کەوتنی ئیبراهیم و هانی ئەدا لەسەری بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبۡرَٰهِيمَ خَلِيلٗا﴾ خوا ئیبراهیمی گێڕا و وەرگرت بە خۆشەویست بۆ خۆی، بەم ڕەنگە ئەیەوێ خێرو بەهرەی بڕژێنێ بەسەردا، یان گێڕابی بە کەسێك کە بە ڕاستی خوای خۆی خۆش بوێ و خۆشەویستی خوا دڵی داگیر کردبێ و تێکەڵی هەموو دڵی بووبێ. یان گێڕای بە کەسێك کە ڕێگەی خوای خۆی ئەداتە بەر بە جۆرێ کە خوا بیەوێ و پێی ڕازی بێت، بەهەرحاڵ خوا هەڵی بژارد بە چەند ڕێز و بەهرەیەکی گەورە و تایبەتی، کەواتە با هەموو پەیڕەوی ئەو هەڵبژێراوە بکەن. شتێکی ئاشکرایە کە ئەم شەریعەتی پێغەمبەرە(ﷺ) جێنشین و جێگری هەموو شەریعەتەکانی خوایەو گەورەترو تێر و تەواو تریانە، بەجۆرێ ئەگەر هەموو پێغەمبەران(علیهم السلام) بێنەوە جیهان ئەبێ پەیڕەوی هەر ئەم شەریعەتە بکەن، کەواتە مەبەست بە فەرماندان بە پەیڕەوی ئیبراهیم پەیڕەوی کردنی ئایینی خواپەرستی ڕاستەقینەیە بە پاك و خاوێنی و بە بێ هیچ جۆرە تێکەڵی و پێکەڵی یەك، کە هەموو ئایین و شەریعەتەکانی خوا لەوەدا یەکن. ئینجا کۆتایی باسەکە و ئەو هەموو فەرمانانە ئەهێنێ بە فەرمودەیەك کە بەڕاستی هاندەرو پاڵدەرێکی بەهێزە بۆ گوێ ڕایەڵی خوا لە هەموو فەرمانەکانی دا، ئەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ هەر بۆ خوایە و موڵکی خوایە و دروست کراوی خوایە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٖ مُّحِيطٗا﴾ خوا هەمیشە دەوری هەموو شتێکی داوە بە زانین و بە توانین و بە دەسەڵات و بە تەگبیر و بە بەڕێوەبردنی هەموو کاروبارێك لە ژیان و لە پاش ژیان، لە جیهان و لە ڕۆژی دوایی دا بە بێ سنوور و بە بێ دواهاتن، بەڵکو خوا بە بوونەکەیشی دەوری هەموو شتێکی داوە کە ئەو بوونی بێ سەرەتایە و بێ دوا هاتنە، دەوری هەموو شت و بوونی هەموو شتی داوە، چونکە بوونی هەموو شتێك بەرهەم و پێك**

هێنراوی ئەو بوونی ئەوەیە لەو پەیدا بووە و ئەبێ یەکسەر لە ڕێوە و بەبێ واسیتە و دەخلی هیچ کەس و هیچ شتێکی تر!! بێگومان بڕوا بەم ئایەتە و جێگیر بوونی ئەم ئایەتە لە هەر دڵێك دا مایەی ئەوەیە کە ئەو دڵە تەنها خوا بپەرستێ بە بێ هیچ جۆرە هاوبەشێك نە لە زاتی پاکی دا، نە لە سیفەتەکانی دا، نە لە کردەوەو بڕیارەکانی دا، ئەو دڵە ئەزانێ کە هەموو شت بەدەست خوایە، هەرچی ئەو بیەوێ هەر ئەوە ئەبێ، هەرچی ئەو نەیەوێ نابێ ببێ. بە هیچ کلۆجێك دروست نی یە پەیڕەوی و شوێن کەوتنی هیچ بەرنامەیەك بێجگە لە شەریعەت و بەرنامەکەی خوا، ئینجا هەر بەم بڕوا و بۆچوونە دڵ و دەروون پاك ئەبێتەوە و دائەمەزرێ، کردارو ڕەوشت ڕێك و ڕاست ئەبێتەوە، ژیان خۆش و شیرین ئەبێ.

لەسەرەتای سورەتەکەوە هێندێ چارەسەری دانا بۆ ئەو هەموو باو و کرداری ناڕاست و ناڕەوای کە چەند ساڵە هاوچەرخ دەقیان پێوە گیرا بوو، سەبارەت بە ئافرەت و ماڵ و خێزان و چینە ژێر دەستەو بێ دەسەلاتەکان، وەك هەتیو و منداڵان، ئینجا لێرەدا ئەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەو مەبەستی یەکەمجارەو ئەو چارەسەرانە تەواو ئەکات، بۆ ئەوەی گەل و کۆمەڵی موسڵمان بە تەواوی پاك بکاتەوە، ماڵ و خێزان دامەزرێنێ لەسەر بنەڕەتێکی زۆر بەهێزو دامەزراو، کە پارێزگاری ڕێزو بەرژەوەندی پیاو و ئافرەتی تێدا بێت، پەیوەندی و پەیوەستی ماڵ و خێزان بەتین بێت، ئاژاوەو ناڕێکی نەهێڵرێ، تا ئەو پەیوەندیە نەپچڕێ و خێزان و ماڵەکان وێران و سەر لێ شێواو نەبن، بە تایبەتی منداڵ و ساواکان، هەروەها چاودێری و پارێزگاری بێ دەسەلات و لاوازەکان بکرێ تا ستەمکار مافیان ژێر پێ نەکات. لە ناوبەناوی ئایەتەکانی ئەم جزمە و لە دوا دوایی جزمی چوارو سەرەتای ئەم سورەتەدا ئەندازێك دواین لەبارەی هەموو کاروباری ماڵ و خێزان لە ئیسلام دا، لەبارەی ئەو هەموو تێکۆشانەی کە ئیسلام بەکاری هێنا لەم بەرنامەیەدا بۆ ڕزگار کردنی گەل و کۆمەڵی موسڵمان لە باو و کرداری سەردەمی نەفامی سەبارەت بە ماڵ و خێزان و ئافرەت و لاواز و بێ دەسەلاتەکان، بۆ بەرز کردنەوەی رادەو پلەی دەروونی و کۆمەلایەتی و ڕەوشتی گەل و کۆمەڵی موسڵمان، لەم بارەیانەوە دواین و ڕاو بڕیاری ئیسلاممان ڕوون کردەوە بە جۆرێ کە بەس بێت بۆ هەرکەسێك کە ژیرو خێو خواه بێت و بە دوای ڕاستی دا بگەڕێ، بە جۆرێ دواین کە دەرکەوێ بە ڕوونی بەرزی و بڵندی گەلی موسڵمان بە سەر هەمووم چین و گەلەکانی دەوروبەریان، بەسەر هەر گەل و کۆمەڵێکی تر کە بڕوای بەم ئایینە نەبێ، بەم بەرنامەیە پەروەردە نەکرابێ، مل کەچ و گوێ ڕایەڵ نەبێ بۆ ڕژێمە پاك و بێگەردەکەی، ئینجا

با بە درێژیی بدوێین و ببینە ژێر سایەی ئایەتەکان: لە یەکەمجارەوە ئەفەرموێ: ﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِ ﴾ ئەی پێغەمبەر داوای فتوات لێ ئەکەن لەبارەی ئافرەتانەوە، واتە دەرخستن و روون کردنەوەی ئەوەی کە نایزانن و گرێ یە لە دڵیان دا لەبارەی بڕیارو مافیانەوە، ئەوەی کە پێویستە بۆیان و پێویستە لەسەریان، نەك تەنها لەبارەی میراتیانەوە وەك هێندێ گومانی وا بردووە، لەبەر ریوایەتێك کە هاتووە لە هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکەدا و ئەڵێ پرسیار کرا لە پێغەمبەر(ﷺ) لەبارەی میرات پێدانیان. ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی پرسیاری زۆر کراوە لە پێغەمبەر(ﷺ) لە زۆر شتی تریش کە پەیوەندی بە ئافرەتانەوە هەیە، لەبەر ئەوەی ریوایەتێکی تریش هاتووە کە ئەڵێ ئەم ئایەتە هاتووە لەبارەی داگیر کردنی ماڵی ئافرەتە هەتیوەکان و بەرگری کردنیان لە شوو کردن و مارەیی پێ نەدانیان، لەبەر ئەوەی ئایەتەکە نەبەستراوە بە هیچ شتێکی تایبەتی یەوە، لەبەر ئەوانە تایبەتیمان نەکرد تەنها بە میرات و کەلەپوور پێدانیانەوە، بێجگە لە هەموو ئەوانە لە وەڵامەکەوە گشتی یەتی و تایبەتی نەکردن بە روونی وەرئەگیرێ.

ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ ﴾ ئەی پێغەمبەر لە وەڵامیان دا بڵێ خوا کارو بڕیارمان بۆ روون ئەکاتەوە لە بارەی ئافرەتانەوە، ئەوەی کە ئەخوێنرێتەوە بەسەرتان دا لە نامەکەی خودا. واتە ئەو ئایەتانەی کە لە سەرەتای ئەم سورەتەدا هاتنە خوارەوە و هەمیشە ئەخوێنرێتەوە بەسەرتان دا کارو بڕیارتان بۆ دەرئەخەن و روونی ئەکەنەوە بۆتان، هەرچۆنێ خوایش لێرەدا بۆتان دەرئەخات ئەوەی کە لە پێشەوە نەوتراوە، دەی ئاشکرایە کە ئایەتەکانی رابوردوو، هەروەها ئایەتەکانی ئێرەیش حوکم و بڕیاری چەند شتی تریان تیایە بێجگە لە میرات و کەلەپوور، کەواتە چاك وایە تایبەتی نەکرێ هەر بە مەسەلەی میرات پێدان و کەلەپوورەوە، وەك هێندێك لە زانایان بڕیویانە هەر بەسەر ئەوەدا وەك دەست نیشانی بۆ کرا.

خوای گەورە لەم وەڵام و فتوادا لوتف و میهرەبانی خۆی نیشان ئەدات بەمەی فتوا و بڕیارەکەی لەلایەن زاتی پاکی خۆیەوە ئاراستە ئەکات، هەرچۆنێ رێز ئەدات بە گەل و کۆمەڵی موسڵمان، بەمەی کە فەرمانی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە رووی فەرمودەی خوایان تێ بکات، چاودێریی خوایان پێ بگەیەنێ، لە فتوا و بڕیارەکەی دا دەست نیشان ئەکات بۆ ئەو بارو باوە نەفامی یەی کە ئەو گەلی موسڵمانەی لەسەر بوو، تا ئیسلام هات و دەری هێنان لەو ستەم و پەستی یە و بەرزی کردنەوە بۆ بەرزترین رادەو پلە، بەم رەنگە فەرموی: ﴿وَ

﴿يَتَـٰمَى ٱلنِّسَآءِ﴾ ئەوەی کە ئەخوێنرێتەوە بەسەرتان دا لەبارەی ئەو ئافرەتە هەتیوانە، واتە کە لە ژێر دەستتان دان ﴿ٱلَّـٰتِى لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ﴾ کە کەسانێکن ئێوە پێ یان نادەن ئەوەی کە نووسراوە و پێویست کراوە بۆیان، وەك ماڵ و میراتی و مارەیی یە کە مافی خۆیانە یان مافی شوو کردن بە خواهیش و ئارەزووی خۆیان ﴿وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ﴾ ئارەزوو و مەیلتان هەیە مارەیان بکەن ئەگەر جوان بن و ماڵیان هەبێ، بەرگری یان لێ ئەکەن لە شووکردن هەتا ئەمرن و ماڵەکەیان ئەخۆن. ﴿وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلْوِلْدَٰنِ﴾ ئەوەی کە ئەخوێنرێتەوە بەسەرتان دا لەبارەی ئەو منداڵانەی کە بێ دەسەڵاتن و بە لاواز و ژێر دەستە دائەنران و بەهۆی ئەوەوە بێبەش ئەکران لە میراتی و کەلەپوور. ئینجا بۆ زیادە روون کردنەوە هێندێ لە ریوایەتەکان ئەهێنین:(علی کوڕی ئەبو طلحة) لە(ئیبن و عەباس) ەوە – خوایان لێ رازی بێت – کە ئەفەرموێ: پیاوی وا هەبوو لە سەردەمی نەفامی دا ئافرەتێکی هەتیوی ئەکەوتە ژێر دەست ئینجا جل و بەرگی خۆی ئەخست بە ملی دا، ئیتر بەوە هیچ کەس نەیئەتوانی مارەی بکات، ئینجا ئەگەر جوان بوایە و حەزی لێ بکردایە مارەی ئەکرد. ماڵەکەیشی ئەخوارد، ئەگەر ناشیرین بوایە بەرگری ئەکرد لە شووکردن تا ئەمرد و ماڵەکەی بە کەلەپوور وەرئەگرت بۆ خۆی، ئینجا خوا ئەوەی قەدەغە کرد و جڵەوگیریی لێ کرد، لەبارەی منداڵەکانەوە ئەفەرموێ: باویان وابوو منداڵ و ئافرەتیان بێبەش ئەکرد لە کەلەپوور.(ئیبن و عەباس) ئەفەرموێ: مەبەست ئەمە بوو کە فەرموی: ﴿لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ﴾ ئینجا خوا جڵەوگیریی لەوە کرد، بەشی هەموو خاوەن بەشێکی دیاریی کرد و فەرموی: ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾ ئیتر گەورە بێ یان بچووك.(بوخاری و موسلیم) وێنەی بەشی یەکەمی ئەم ریوایەتە ئەهێنن لە دایکی ئیمانداران(عائشة) وە – خوای لێ رازی بێت -.(ئیبن وئەبی حاتەم) هەواڵێ ئەهێنێ تا ئەگاتە(عوروەی کوڕی زوبەیر) ئەویش لە دایکی ئیمانداران(عائشة) وە – خوایان لێ رازی بێت – کە ئەفەرموێ: ئەوەی کە خوا فەرموی: ئەخوێنرێتەوە بەسەرتان دا بریتی یە لەو ئایەتەی کە لە سەرەتای ئەم سورەتەدایە: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا۟ فِى ٱلْيَتَـٰمَىٰ﴾ هەروەها ریوایەتی تریش هەیە کە لە هەموویانەوە هەر ئەوە دەرئەکەوێ کە لە تەفسیری ئایەتەکەدا دەست نیشانمان بۆ کرد چ لەبارەی ئافرەتەوە، چ لەبارەی منداڵانەوە، فەرموی: ئەوەی کە ئەخوێنرێتەوە بەسەرتان دا کارو بریارتان بۆ دەرئەخات لەبارەی ئافرەتە هەتیوەکانەوە،

وَأَن تَقُومُواْ لِلْيَتَـٰمَىٰ بِٱلْقِسْطِ وَمَا تَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمًا ﴿١٢٧﴾ وَإِنِ ٱمْرَأَةٌ
خَافَتْ مِنۢ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا

---

﴿وَأَن تَقُومُواْ لِلْيَتَـٰمَىٰ بِٱلْقِسْطِ﴾ لەبارەی هەڵسانتان بە داد دەربارەی هەتیوەکان کە ئەوەش بریتی بوولەئایەتی ﴿وَلَا تَتَبَدَّلُواْ ٱلْخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِ وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَهُمْ إِلَىٰٓ أَمْوَٰلِكُمْ﴾ کە تێپەڕی کرد. ئەم ئایەتە بە چەند جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوە، ئەو جۆرانەش لە مەبەست دا هەر ئەگەڕێنەوە بۆلای ئەم تەفسیرەی کە هەڵمان بژارد، چونکە زۆربەی لەسەرە و دڵیش پێی بە ئارامترە.

ئیسلام هات و ئەو هەموو بارو کردەوە لارو نالەبارەی نەهێشت کە ئەکران دەربارەی ئافرەت و هەتیو و منداڵ و بێ دەسەلآت و بەش خوراو و ماف ژێر پێ کراوەکان، ئەو هەموو باو و کردەوانەی کە چەندەها ساڵ و چەرخ تێپەڕی کرد بوو بەسەریان دا، بووبوون بە کارو کردەوەیەکی پەسەند کراو لەناو گەل و کۆڕ و کۆمەڵ دا، بە دڵی هیچ کەس دا نەئەهات هەوڵدان بۆ گۆڕاندنیان، بەڵکو گۆڕاندنیان زۆر زۆر قورس و گران بوو لە هەست و دەروون دا، شۆڕشێکی گەورە بوو کە زۆر بە دەگمەن کەسێك بوویێ کە دژی ئەو شۆڕشە نەبێ، هیچ داخواز و پاڵدەرێك نەبوو بۆ گۆڕاندنی ئەو بۆچوون و بەرنامەی ژیان و باو و کردەوە دەق پێوە گیراوانە، هیچ نەبوو بێجگە لەوەی کە ئەم ئیسلامە لە سەرچاوەی داد و دادپەروەری یەوە هاتووە، بۆ نەهێشتن و لە ریشە هێنانی تۆوی ستەم و بەد کرداریی، هۆی سەرکەوتنەکەشی ئەوە بوو بڕیارو بەرنامەکەی رێك و راست بوو لەگەڵ ژیریی و سروشتی ئادەمی دا، بەرنامەی پەروەردە کردنەکەی ئێجگار بەهێزو تێرو تەواو بوو، بە جۆرێ باو و هێزو دەسەلآتی سەردەمی نەفامی بەرگریی پێ نەکراو توایەوە لەبەردەمی دا، بێگومان لە هەرکات و چەرخێکی تریش دا، لەناو هەر کۆڕ و کۆمەڵێکی نەفامی تریش دا، ئەگەر ئیسلام لەسەر ئەو بارو شێوە و تەرزی یەکەمجارە ئاراستە بکرێ و بهێنرێتە مەیدان، هەر سەرکەوتوو ئەبێ وەك یەکەمجار و هەر زاڵ و سەرکەوتوو ئەبێت و هیچ شتێك بەرگەی ناگرێ!! گرنگ ترو بەهێزترین هۆی سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلام ئەوەبوو و ئەوەیە کە هەموو یاسا و بڕیارەکانی پەیوەست ئەکات بە خواوەو بە ئاگاداریی و چاودێریی خوایە، پەروەردەکردنی دڵ لەسەر هەست کردن بەو ئاگاداریی و چاودێریی و چاوەڕوانی ئەجرو پاداشتی لای خواو ترسان لە سزاو تۆڵەکەی، وەك لێرەدا کۆتایی ئەم ئایەتەی هێنا بەمەی

که ئەفەرموێ: ﴿وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمٗا﴾ هەر کردەوەیەکی چاك بکەن دەربارەی ئەو خاوەن مافانەی کە لەم ئایەتەدا باس کران، یان هەموو کارو کردەوەیەکی چاك بکەن بێگومان خوا بە هەمیشەیی هەر زاناو ئاگادار بووەو زاناو ئاگادارە پێی، واتە ئەجرو پاداشتتان ئەداتەوە لەسەر ئەو کردەوە چاکانە، دەی بێگومان هەر دڵێك ئەم بروا بۆچوون و هەستەی تیا فەراهەم بێت بە سۆز و پەرۆشەوە گوێ رایەڵی ئەکات.

لەسەرەتای ئەم جزمی پێنجەمەوە باسی سەرکێشی و بێزاری و نەویستنی ئافرەتی کرد لە مێردی و چارەسەری بۆ ئەوە دانا، ئینجا لێرەدا باسی پێچەوانەی ئەوە ئەکات و چارەسەری بۆ دائەنێ، ئەمە یەکێکە لەو بەسەرهاتانەی نێوان ژن و مێرد کە لەمەوبەر هیچ باس و بڕیارێکی بۆ دەرنەکردووە و ئەوا لێرەدا بڕیارو چارەسەری بۆ دەرئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا﴾ ئەگەر ئافرەتێك مەترسی ئەکرد لە مێردەکەی و چاوەڕوانی ئەکرد ﴿نُشُوزًا﴾ دوور کەوتنەوە و خۆ بەزل زانی لە هاوسەریی و هاوڕێ یەتی، ﴿أَوۡ إِعۡرَاضٗا﴾ یان روو لێ وەرگێڕان و لێ نەپرسینەوە کە نیشانەی نەویستن و بێزاری یە لێ ی، ئەو مەترسی و چاوەڕوانی یەش هەروا لەخۆیەوە نەبێ بەڵکو بەڵگە و نیشانەی ئاشکرا ببێ لەسەری ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يُصۡلِحَا بَيۡنَهُمَا صُلۡحٗا﴾ هیچ ئەرەجێك و گوناهێکتان لەسەر نی یە لەمەدا کە نێوان خۆیان چاك بکەن و یەك کەوتنێك فەراهەم بێنن لە ناو خۆیان دا، بەم رەنگە ئافرەتەکە چاوپۆشی بکات لە هێندێ لە مافی خۆی بەسەر پیاوەکەوە بۆ ئەمەی تەڵاق نەدرێ و لە ژێر رکێفی مێردەکەدا بمێنێتەوە، یان دەست هەڵگرێ لە مارەیی و هێندێك مافی خۆی بۆ ئەمەی تەڵاقی بداو سەرفراز ببێ وەك بە شێوەی(خلع) بە مەرجێ ئافرەتەکە ناچار نەکرێ بەوە، بەڵکو بە ئارەزوو و رەزامەندی خۆی کە بەرژەوەندی خۆی ئەبینێ لەو بارەی کە هەڵی ئەبژێرێ بۆ خۆی، ئەمە بە پێی رای هێندێ لە زانایانە کە سوڵح و یەك کەوتنەکە لەسەر مانەوە بێت لە ژێر رکێفی دا، یان لەسەر جوێ بوونەوەو تەڵاق دان، بەڵام زۆربە لەسەر ئەوەن کە یەك کەوتنەکە ئەبێ هەر بۆ مانەوە بێت، چونکە تەڵاق و جوێ بوونەوە بێزراوە لە ئیسلام دا هەرچەند حەڵاڵیش بێت، وەك حەدیس ئەفەرموێ: ﴿ابغض الحلال إلى الله الطلاق﴾ بێزراوترین حەڵاڵ بەلای خواوە تەڵاقە.

ئینجا بە تێهەڵکێش دوو وتە ئەهێنێ بۆ بەهێز کردنی یەك کەوتنەکەو دڵنیا کردن لەسەری، یەکەم ئەفەرموێ: ﴿وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٞۗ﴾ سوڵح و یەك کەوتن چاکترە لە جیا بوونەوەو مانەوە بە ژیانی ئاژاوە و بێزاری لە یەکتر، واتە ئەگەر چاکە لەمانەدا ببێ بێگومان یەك کەوتنەکە چاکترە، یان مەبەست ئەوەیە یەك کەوتن چاکە، ئیتر ئەو یەك کەوتنی ئەوانە، یان یەك کەوتنی شەرعی بە شێوەی گشتی و لە هەموو کاروبارێك دا کە ئەم یەك کەوتنی پیاو و ئافرەتە یەکەم و سەردەستەیە لێرەدا. دووەم: ﴿وَأُحۡضِرَتِ ٱلۡأَنفُسُ ٱلشُّحَّۚ﴾ ئامادە کراوە لە دەروونەکان دا چرووکی و سووریی لەسەر ماڵ و ماف و ئەوەی کە ئارەزوو ئەکرێ، واتە ئادەمی بە سروشت لەسەر ئەو چرووکی یە دروست کراوە، کەواتە هەرکاتێ ئافرەت دەستی هەڵگرت لە هێندێ ماڵ و مافی خۆی بۆ مێرەدەکەی، ئەو کاتە ئەو مێردە مل دائەخات و رازی ئەبێ بە هێشتنەوەی ئەو ئافرەتە هەرچەند لە دڵەوە بێزار بێت لێ ی و خۆشی نەوێ لەبەر خاتری ئەو ماڵ و دەست کەوتەی کە بە سروشت سوورە لەسەری و خۆشەویستە لە دڵی دا، یان ئەگەر پیاوەکە دوو ژنی هەبوو، یەکێکیانی خۆش نەئەویست و بێزار بوو لێ ی، ئەو بێزراوە وازی هێنا لەماف و بەشەکەی خۆی بۆ ژنە خۆشەویستەکە، بێگومان ئەو کاتەیش پیاوەکە رازی ئەبێ بە هێشتنەوەی ئەو بێزراوەیش لە ژێر رکێفی دا، بەرامبەر پێك هێنانی ئەو مەبەست و ئارەزووەی کە پیاوەکە سوورە لەسەری، کەواتە سووری و چرووکی پیاوەکە هۆو پاڵدەرە بۆ ئافرەتەکە کە بەو ئەندازە ماڵ و مافە دڵی پیاوەکە نەرم بکات، هەرچۆنێ چرووکی و سووری ئافرەتەکەش لەسەر ماف و ماڵی خۆی هۆ و پاڵدەرە بۆ ئەوەی کە پیاوەکە بەشتی کەمیش رازی ببێ و داوای شتی زۆر نەکات لە ئافرەتەکە، کەواتە بەوە سوڵح و یەك کەوتنەکە پێك دێت کە خوا ئەفەرموێ: شتێکی چاکە. بەهەرحاڵ و لەسەر هەربار کارەکە لە دەستی ئافرەتەکەدایە و خۆی بەرژەوەندی خۆی باشتر ئەزانێ، شەرع زۆری لێ ناکات لەسەر هیچ بارێك، بەڵکو رەوای داوە کە خۆی بە ئارەزووی خۆی چی ئەکات بیکات، ئینجا لەگەڵ ئەوەدا کە دان ئەنێ بەو چرووکی و سووریی یەدا، هەر لەسەر ئەو بارە وازیان لێ ناهێنێ، بەڵکو بانگی مێردەکان ئەکات و هانیان ئەدات لەسەر رەفتار و جوڵانەوەیان بە پێچەوانەی چرووکی و سووری یەکەیان،

وَإِن تُحۡسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ﴿١٢٨﴾ وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡۖ فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلۡمَيۡلِ فَتَذَرُوهَا كَٱلۡمُعَلَّقَةِۚ وَإِن تُصۡلِحُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١٢٩﴾ وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغۡنِ ٱللَّهُ كُلّٗا مِّن سَعَتِهِۦۚ وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمٗا ﴿١٣٠﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿وَإِن تُحۡسِنُواْ وَتَتَّقُواْ﴾ ئەگەر ئێوە چاكە بكەن و بە چاكی ژیان و گوزەرانیان لەگەڵ بكەن، خۆتان بپارێزن لە خۆ بە زل زانی و نەویستن و روو لێ وەرگێڕان و لێ نەپرسینەوە، هەرچەند هۆو پاڵدەرێ ببێ بۆ ئەوە، دان بگرن بە خۆتان داو ئەو ئافرەتانە ناچار نەكەن لەسەر واز هێنان و دەست هەڵگرتنیان لەماڵ و مافی خۆیان ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا﴾ بێگومان خوا هەمیشە ئاگادارو با خەبەرە بە باشی بە هەر شتێك كە ئێوە ئەیكەن، كەواتە بێگومان ئەجرو پاداشتتان ئەداتەوە لەسەر ئەو رەفتار و كردەوە چاكانەتان، بەراستی بانگ لێ كردنی بڕواداران بە چاكە و لە خواترسی و خۆپارێزی، بانگ لێ كردن و هاندانیان بەناوی خوای با خەبەر و ئاگادار بە هەر كردەوەیەك كە ئەیكەن، بانگ كردنێكی زۆر بەهێزو بەكارە، هەر ئەوە شایستەیە بۆ گوێ رایەڵی و بە پیرەوە چوون!

ئەو خوای پەروەردگارە كە ئەم ئادەمی یەی دروست كردووە، خۆی باش ئەیناسێ و ئەزانێ كە خاوەنی هێندێ شتە كە ناتوانێ بەرگری بكات، یەكێ لەو شتانە سۆزو خۆشەویستی دڵەكە رۆیشت بۆ هەر شتێك و لكا بە هەر شتێكەوە بەرگری ناكرێ و بێجگە لە پەروەردگار هیچ كەسێك ناتوانێ نەیهێڵێ و بنەبڕی بكات، خوایش داوایەك ناكات كە لە توانادا نەبێ، جا لەبەر ئەوە داوا ناكات لە بەندەكانی كە ئەو سۆز و خۆش ویستنە لەدڵیان دەركەن، بەڵكو داوا ئەكات كە بەرەلای نەكەن، بەڵكو جڵەوی بگرنە دەست تا نەبێتە هۆی كردەوەی ناڕاست و ناڕەوا و بەندە دووچاری ستەم و كردەوەی خراپ بكات. یەكێ لەو سۆز و ئارەزووانە ئەمەیە كە یەكێك چەند ژنێكی هەبێ كە بە ناچاری یەكێكیانی خۆشتر ئەوێ لەوانی تر، جا لێرەدا ئیسلام داوا ناكات كە ئەو سۆز و خۆش ویستنە لەدڵ دەركرێ، بەڵكو

داوا ئەكات كە جڵەوی سۆزو مەیلەكەی بگرێتە دەست تا ستەم و كردەوەی خراپی نەبێ دەربارەی ئەوانی تر، وەك لەم ئایەتەدا دەست نیشان ئەكات بۆ ئەو حاڵەتە چار نەكراوە لەگەڵ چارەسەر و جڵەوگرتنەوەكەدا. ئەفەرموێ: ﴿ وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ ﴾ هەرگیز ئێوە ناتوانن دادو یەكسانی بەكار بێنن لەناو ژنەكانتان دا، لە خۆش ویستن و مەیلی دڵ دا، وەك(حسن و مجاهد) ئەفەرمون. ﴿وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡ﴾ با هەرچەند سووربن و هەوڵ بدەن بۆ ئەو داد و یەكسانی یە، ئیمامی ئەحمەد و ئەبو داود و تیرمزی و چەند كەسێكی تر حەدیسێ ئەهێنن لە دایكی ئیمانداران(عائشة) وە – خوای لێ رازی بێت – كە ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) دادو یەكسانی بەكار ئەهێنا لە هەموو كردەوەو رەفتاری دا، ئینجا ئەیفەرمو: ئەی خوایە ئەمە دابەش كردنی بەش و مافە لەوەی كە لە ژێر دەسەلآتی مندایە و پێم ئەكرێ، كەواتە لێم مەگرە لە شتێك دا كە بەدەست تۆیە و بە دەست من نی یە، ئەفەرموێ: مەبەست بەمەیلی دڵ وئەوخۆش ویستنەیە كە لە دەسەلآتی خوادایە و بە دەست ئەم نییە.

كەواتە ئەوەی كە داوا ئەكرێ لەو مێردانە و جڵەوگیریی ئەكرێن لێ ی ئەمەیە كە ئەفەرموێ: ﴿فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلۡمَيۡلِ﴾ كەواتە بە تەواوی مەیل مەكەن بۆلای خۆشەویستەكە و واز بێنن لەویتر و ستەمی لێ بكەن و بە پێ ی دەسەلآت مافی خۆی نەدەنێ ﴿فَتَذَرُوهَا كَٱلۡمُعَلَّقَةِ﴾ تا بەهۆی ئەوەوە بیهێڵنەوە وەك ئافرەتێك كە نە بەرەلآ كراو و تەلآق دراو بێت كە بچێ بۆ خۆی شوو بكات، نە مێرد دار بێت كە مافی ژن و مێردی وەرگرێ، بە كورتی ئەو خۆش ویستن و مەیلی دڵە كە چار نەكراوە هیچ گوناهێكی تێدا نی یە، ئیتر بێجگە لەوە پێویستە لەسەر مێرد داد و یەكسانی بەكار بێنێ لەناو ژنەكانی دا، تەنانەت لە قسەی خۆش و رووی خۆش و زەردە خەنەو خۆ جوان كردن و بۆن خۆش كردن دا! ﴿وَإِن تُصۡلِحُواْ﴾ ئەگەر ئێوە كردارو رەفتارتان چاك بكەن لەگەڵیان بە پێ ی توانا ﴿وَتَتَّقُواْ﴾ خۆتان بپارێزن لە ستەم و نادادی، ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾ بێگومان خوا هەمیشە لێ بوردەی میهرەبانە، ئەبورێ لەو مەیل و خۆش ویستنە دەروونی یە، یان ئەبوورێ لە ستەم و كەم و كوڕی لەوەو بەرتان، تا بكرێ و بگونجێ بەو شێوەیە پیاو و ئافرەت بژیەن پێكەوەو ئەو ژیانی ژن و مێردی یە تێك نەدەن، ئەگەر نەگونجاو ژیان بەسەر نەئەبرا ئەوا جوێ بوونەوە چاكە و خوا

دەروو ئەکاتەوە لە هەردوولا، وەك ئەفەرموێ: ﴿ وَإِن يَتَفَرَّقَا ﴾ ئەگەر پیاوو ئافرەتەکە جوێ ببنەوە ﴿يُغْنِ ٱللَّهُ كُلًّا مِّن سَعَتِهِۦ ﴾ ئەوا خوا هەرکام لەو دوانە بێ پێویست ئەکات لە دەوڵەمەندی و دەسەڵات فراوانی خۆی، ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمًا ﴾ خوا هەمیشە بێ پێویست و دەسەڵات دار و چارەسەر کەرە بە پێویست و خواهیشی خۆی و کاردروست و لێزانە لە هەموو کردەوەو بڕیارەکانی دا، ئەم فەرمودەیە دڵخۆشی دانەوەو دڵنەوایی تیایە بۆ ئەو ژن و مێردە پاش تەڵاق و جوێ بوونەوە. بەڕاستی هەرکەسێك کە تێگەیشتبێ و حاڵی بووبێ لەم بەرنامەی کە خوا ناردی، بیرێك بکاتەوە لەوەی کە ئەدوێ لە هەموو کاروبارەکانی ژیان، هەموو هەست و شتە نادیاریی و شاراوەکانی دەروون دەرئەخات و چارەسەر دائەنێ بۆ هەمووی، هەرکەسێك بەم جۆرە بیرێك بکاتەوە تێ ئەگات کە بە هیچ کلۆجێك ناگونجێ دانەرو نێرەری ئەم بەرنامەیە کەسێکی تر بێت بێجگە لە خوای پەروەردگار، ئینجا بەڕاستی سەری سوڕ ئەمێنێ لەمەی هیچ کەسێك ببێ لە جیهان دا کە بڕوا نەهێنێ بەم ئاینە و بەرنامەیە و بە سۆز و پەرۆشەوە نەیگرێتە گەردن و ملی بۆ کەچ نەکات، چ جای ئەوە دژو دوژمنی بێت و بێزاری دەربڕێ لێ ی!!

ئەم یاسا و بڕیارانەی کە باس کران و تایبەتین بە ژیانی خێزان و ژن و مێردەوە، لەبەر ئەوە بەشێکن لەو بەرنامە گشتی یەی کە هاتووە بۆ رێك و پێك کردنی هەموو ژیان، لەبەر ئەوەی ئەم بەرنامەیە بەشێکە لەو رژێم و یاسای بوونەوەرە، کە خوا داینا بۆ هەموو بوونەوەر، لەبەر ئەوە کەواتە هەر ئەم بەرنامەیە رێك و پێك و گونجاوە لەگەڵ سروشتی بوونەوەر بە شێوەی گشتی، لەگەڵ سروشتی ئادەمی بە شێوەی تایبەتی، جا لەبەر ئەوە بە دوای ئەم یاسا و بڕیارانەدا شتێ ئەمێنێ کە پەیوەستی ئەکات بە رژێمی هەموو بوونەوەرەوە، بە دەسەڵاتی خوا لەم بوونەوەرەدا، بە خاوەنێتی خوا بۆ ئەم بوونەوەرە پان و فراوانە، پەیوەستی ئەکات بە یەکێتی و فەرمانەکانی خوا لە هەموو شەریعەتەکانی دا، بە پاداشت و سزاو تۆڵەی خوا لە هەردوو جیهان دا،

﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَلَقَدۡ وَصَّيۡنَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَإِيَّاكُمۡ أَنِ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ وَإِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ﴾ هەر بۆ خوایە موڵك و دروست كراوی خوایە هەرچی وا لە ئاسمانەكان و هەرچی وا لە زەوی دا. لە زۆر شوێن لە قورئان دا بەدوای بڕیارو فەرمان و جڵەوگیریی یەكانی خوادا ئەم فەرموده و وێنەی ئەم فەرموده ئەهێنێ، بێگومان بە بیركردنەوە لەو جۆرە فەرمودانە دڵی هەموو ژیرێك دائەچڵەكێ و گەورەیی و دەسەڵاتی بێ سنووری خوای تیا جێگیر ئەبێ، ئەزانێ و هەست ئەكات بەوە كە شەریعەت و بەرنامەی ژیانی بەندەكانی خوا ئەبێ هەر لە داهێنەرو خاوەنی ئەم بوونەوەرەوە بێت و ئەبێ مل كەچی هەر بۆ فەرمانی ئەو بكرێ، بە هیچ رەنگ نابێ ئەم بەندە بێ دەسەڵاتە كە ئەژی لەم موڵكی خوادا، هیچ چاو نادا لەم موڵكە یان و فراوانی خوادا، ئەم بەندە نابێ خۆی جوێ بكاتەوە لەم بوونەوەرە مل كەچ و گوێ رایەڵە، بەڵكو ئەبێ گوێ رایەڵ تر بێت و شەرمەزار ببێ لە هەموو سەرپێچی و سەركێشی یەك. هەروەها لەم فەرمودەیەوە دەرئەكەوێ كە ئەبێ بیم و ترس و خۆپارێزیی هەر لەو پەروەردگارە بكرێ، وەك لە هەموو ئایینەكانیش دا فەرمان بەوە دراوە. ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ وَصَّيۡنَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ﴾ سوێند بەخوا بە راستی زۆر بە گرنگ فەرمانمان داوە و داوامان كردووە لەوانەی كە نامەیان پێ بەخشراوە لە پێش ئێوە ﴿وَإِيَّاكُمۡ﴾ فەرمانمان داوە و داوامان كردووە لە ئێوەیش ﴿أَنِ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ بەمەی خۆتان بپارێزن لە خوا و بترسن لێ ی و گوێ رایەڵی فەرمان و جڵەوگیریی یەكانی بن، بێگومان هەر خوا خاوەنی هەموو شتە و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێك دا هەیە، كەواتە ئەبێ هەر ئەو بیم و ترسی لێ بكرێ، هەر ئەو بیم و ترسەش كانگای هەموو چاكە و چاك بوونێكە، ئینجا هەركەسێك یاخی ئەبێت، ئەوا خۆی زیان ئەكات و خوای خاوەنی ئاسمانەكان و زەوی هیچ پێویستی نی یە بە هیچ كەس و بە بڕوا هێنان و كردەوەی چاكی هیچ كەس وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَإِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ ئەگەر ئێوە بڕوا ناهێنن و نافەرمانی ئەكەن، ئەوا بێگومان هەر بۆ خوایە و موڵك و دروست كراوی خوایە هەرچی وا لە ئاسمانەكان و زەویدا،

وَكَانَ ٱللَّهُ غَنِيًّا حَمِيدًا ﴿١٣١﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿١٣٢﴾ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ أَيُّهَا ٱلنَّاسُ وَيَأْتِ بِـَٔاخَرِينَ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرًا ﴿١٣٣﴾ مَّن كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا فَعِندَ ٱللَّهِ ثَوَابُ ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿١٣٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟

---

**﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَنِيًّا حَمِيدًا﴾ خوا هەمیشە هەر دەوڵەمەند و بێ پێویستە لە هەموو شت و خواپەرستی هەموو کەس، خوا خۆی بە خۆی سوپاس کراوە و هەر ئەو لە راستی دا شایستەی سوپاسە ئیتر با هیچ بەندەیەك لە بەندەکانی سوپاسی نەکەن. ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾ هەر بۆ خوایە و موڵك و دروست کراوی خوایە هەرچی وا لە ئاسمانەکان و هەرچی وا لە زەوی دا ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا﴾ بەسە خوا کاربەدەست و چاودێر و کاروبار حەواڵە کراو ﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ أَيُّهَا ٱلنَّاسُ وَيَأْتِ بِـَٔاخَرِينَ﴾ ئەگەر خوا مەیل بکات و بیەوێ ناتانهێڵێ و بەجارێ لە ریشەتان ئەمێنێ، لە شوێنی ئێوەدا کۆمەڵ و دەستەیەکی تر ئەمێنێ ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرًا﴾ خوا هەمیشە توانا و دەسەڵات دارە بەسەر ئەوەدا، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو تاوان و سەرکێشی و خراپەکاریی یەدا ئەوەی پێ نەکردن و ئێوەی هێشتەوە لەبەر ئەوەی مەیلی ئەوەی نەکرد لەبەر هۆیەك کە خۆی ئەزانێ، نەك لەبەر بێ دەسەڵاتی، یان هیچ شتێك کە بتوانێ بەرگری بکات و رێی لێ بگرێ!! ئیمامی رازی - خوای لێ رازی بێت - ئەفەرموێ: سێ جار(وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ) ی فەرمو. مەبەست لە یەکەم بەهێزکردن و روون کردنەوەی فراوانی کەرەم و بەخشینی خوایە کە بەڵێنی دا بەو ژن و مێردەی کە لە یەك جوێ ئەبنەوە. دووەم بۆ روون کردنەوەی بێ پێویستی خوایە بە بڕوا و گوێ رایەڵی بڕواداران و، بێ باکی لە بێ بڕوایی و سەرکێشی بێ بڕوایان، گەورەیی خوا نە بە بڕوا هێنان و گوێ رایەڵی بەندەکانی زیاد ئەکات، نە کەم و کوڕی رووی تێ ئەکات بە بێ بڕوایی و سەرکێشی یان. مەبەست لەم سێ یەم بەڵگە هێنانەوەیە لەسەر توانا و دەسەڵاتی خوا بەسەر هەموو شتێك دا کە یەکێ لەو شتانە لەناوبردن و لە ریشە هێنانی هەرچەشە لێ کراوەکانە و هێنانی چین و دەستەیەکی تر لە جێی ئەوان دا، ئینجا ئەفەرموێ: کە ماتووڵ ئەم فەرمودەیە**

بەڵگەیە لەسەر ئەو سێ شتەی کە باس کران، چاك وایە لەگەڵ هەرکام لەو سیانە بەڵگەکەی بگوترێ. ئەفەرموێ: بەم سێ بارە کردنەوە دڵ بێدار ئەبێتەوە بەوەی کە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی چەند مەبەست و حیکمەتێکی گەورەی تیایە، ئەو کاتە مەردوم باشتر بیریان لێ ئەکاتەوە و ئەیانکات بە رابەر و بەڵگە لەسەر خوایەتی خواو سیفەتە بێ وێنەکانی، ئینجا لەوێشەوە ناسین و یادی خوا لە دەروون دا بەهێزتر و دامەزراو تر ئەبێ کە ئەوەش ئەوپەڕی ئاوات و ئامانج و مەبەستە بۆ بەندەکانی خوا، مەبەست لە ناردنی قورئان دا ئەگەڕێتەوە هەر بۆ ئەوە، ئینجا باس و مەبەستەکە دوایی ئەهێنێ بە تەمێ کردن و سەرنج ڕاکێشانی ئەوانەی کە چاویان بڕیوەتە خۆشی و دەست کەوتی ئەم جیهانە، تەمێ و سەرنج ڕاکێشانیان بۆلای ئەوە کە بەهرەو بەخشایشی خوا گەورەتر و فراوان ترە، چونکە خوا دەست کەوت و بەهرەی هەردوو جیهانی لایە، ئەوانەی کە هەر چاویان بڕیوەتە ئەم جیهانە، ئەتوانن چاو هەڵخەن بۆ ئەو جیهانیش، ئومێدی خێرو خۆشی هەردوویان ببێ، ئەفەرموێ: ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا﴾ هەرکەسێك کە پاداشت و دەست کەوتی جیهانی ئەوێ ﴿فَعِندَ ٱللَّهِ ثَوَابُ ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ دە لای خوایە پاداشت و دەست کەوتی جیهان و ڕۆژی دواییش، ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا﴾ خوا بیسەری بینا بووە و بیسەری بینایە بە هەمیشەیی، بیسەری هەر نیازو خەتەرەیەك کە بە دڵ دا دێت و گوزەر ئەکات، بینایە بە هەموو بەسەرهات و ڕووداوێك چ ئاشکراو چ نهێنی، کەواتە با هەرکەس هەرچی ئەکات لەبەر خوا بیکات و نیازو مەبەستی هەر خوا بێ و بە تەمای پاداشت و دەست کەوتی ڕۆژی دوایی بێت. بەڵێ بەڕاستی ئەوپەڕی نەفامی یە کە هەرکەس بتوانێ چاوەڕوانی پاداشتی هەردوو جیهان بکات – کە ئەوەش مسۆگەرە لە پەیڕەوی کردنی ئەم بەرنامەی خوادا – کەچی لەگەڵ ئەوەدا چاو هەر بڕێتە هەر ئەم جیهانە و نیازو مەبەستی هەر ببەستێ بە پاداشت و دەست کەوتی ئەم جیهانەوە، بژی لەم جیهانەدا وەك ئەو هەموو ئاژەڵ و گیانلەبەرانی ترە، لە کاتێك دا کە بتوانێ بژی وەك ئادەمی! بە لەش بەسەر زەوی دا بگەڕێ و بە گیان و ڕۆح لە ئاسمان بێت! ئینجا لە دوایی باسەکەدا پێویستە بیر بکەینەوە لەو فەرمودە جۆر بە جۆرانەی کە قورئان هێنای لە دوای ئەو حوکم و بڕیارانەی کە لەم ئایەتانی ڕابرووانەدا هاتن، تا بۆمان دەرکەوێ کە ئەو

فەرمودانە هەرچۆنێ بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە پێویستی یەکی بەتینی ئەو بڕیارانە هەیە بەو بەرنامە گشتی یەی کە ئەم ئایینە هێنای، واتە ئەو بوونەوەرە پان و فراوانە هەموو بەش و پارچەکانی بەستراون پێکەوە، هەرچۆنێ بەڵگەن لەسەر ئەوە هەروەها بەڵگەن لەسەر زۆر گرنگی ماڵ و خێزان بەلای ئیسلامەوە، ئەوەتا تێکەڵ و پەیوەستی ئەکات بە هەموو کاروبارە گەورەکانی بوونەوەرەوە، گرنگی یەکەی دەرئەخات بەوەی کە فەرمان دراوە و وەسیەت کراوە بە پارێزگاری لەسەری لە هەموو ئایین و شەریعەتەکانی خوادا، هەڕەشە کراوە لەوانەی کە پەیڕەوی ئەو فەرمان و وەسیەتە ناکەن، بە لەناوبردنیان و هێنانی دەستە و چینێکی تر لە شوێنیان دا کە شەریعەتی خوا ڕاگیرکەن و پەیڕەوی فەرمان و وەسیەتەکەی بکەن، کەواتە کاری ماڵ و خێزان زۆر گەورەو گرنگە لای خوا و لە بەرنامەی خوادا!! ئینجا لەم چەند ئایەتی داهاتووەدا تا سەری جزمی شەشەم ئەڵقەیەکی تر نیشان ئەدات لە ئەڵقەکانی ئەو پەروەردە کردن و پێگەیاندنەی کە ئەم ئایین و قورئانە هێنای، بۆ پێك هێنانی ئەم ئوممەتەی کە خوا ناوی برد بە چاکترین ئوممەت کە هێنرایە کایە تا فریای ئادەمی و ئادەمێتی بکەوێ و بیخاتە سەر ڕێگە و ڕێبازی ڕاست، ئەمە ئەڵقەیەکە لەو بەرنامە دامەزراوە کە هاتووە بۆ چارەسەر کردنی مرۆڤ و مرۆڤایەتی، بەو دەرمان و چارەسەرەی کە داهێنەری ئەم ئادەمی و بوونەوەرە دایناوە و دیاریی کردووە، کە خەبەر دار و زانایە بە هەموو شتێك، بەهەموودەردودەرمانێك لەم جیهانەدا،خۆی ئەم ئادەمی یەی دروست کردووە،خۆی بینایەبە هەموو شتێ، خۆی زانایانە بە هەموو ئارەزوو و پێویستی یاتی، بەڕادەی توانا و دەسەڵاتی.

ئەم ئەڵقەیە هەرچۆنێ نەخشەی بنەڕەت و یاساکانی ئەو بەرنامەیە ئەکێشێ کە دانراوە بۆ هەموو ئادەمی، لە هەموو چەرخ و چینەکانی دا، بۆ ئەوەی لە چاڵی نەفامی دەریان بێنێ — هەرکەس بە پێی ڕادەو پلەی خۆی — بەرزیان بکاتەوە بەرەو پۆپەی هەرە بەرز، هەرچۆن ئەو نەخشەیە ئەکێشێ هەروەها لە هەمان کات دا شێوەی بارو حاڵی یەکەم کۆمەڵی موسڵمان نیشان ئەدات، کە لە یەکەمجارەوە ئەم قورئانەیان ئاراستە کرا و ڕووی فەرمودەیان تێ کرا، شێوەی ئەو یەکەم کۆمەڵە نیشان ئەدات لەبارەی ئادەمێتی یان و هێزو لاوازی یەك کە بوویانە لە ئادەمێتی یەکەیان دا، لەبارەی باو و ڕەوشتێکی سەردەمی نەفامی کە دەقیان

**پێوە گرتبوو بە درێژایی چەند چەرخ و زەمان، لە بارەی هەست و هێزو وزە سروشتی یەکەیانەوە، هەروەها دەرئەکەویٚ کە بە چ جۆر و لە چ ڕێگەیەکەوە ئەم بەرنامەیە چارەسەری هەر لاری و نالەباری یەکی کردن و خستنیە سەر ڕێگەی ڕاست و دامەزراوی کردن لەسەری تا بوون بە نوێنەرو ئاوێنەیەکی بالاَ نما بۆ ئەو بەرنامەیە! لە یەکەمجارەوە بانگ ئەکاتە ئەو کۆمەڵە موسڵمانە بۆ هەڵسانیان بە کارو ئەرکی سەرشانیان، لەبارەی بەدی هێنان و پێك هێنانی دادو دادپەروەریی لە ناو مەردومان دا، بەو جۆرو شێوە تاقانەی کە بەدی هات تەنها لەسەر دەستی ئەو کۆمەڵەدا، ئەو داد و دادپەروەری یەی کە تەنها لەبەر خوا بێت و ئیتر ڕووت لە هەر مەبەستێکی تر بێجگە لە خواترسان و بە دوا گەڕانی ڕەزامەندی خوا، ئەو داد و دادپەروەری یەی کە نموونەیەکمان بیست لە ڕووداو و بەسەرهاتی جوولەکە کە باسەکە ی بە درێژیی تێپەڕی کرد لە تەفسیری ئایەتی(١٠٥) تا ئایەتی(١١٣). بانگ ئەکاتە بڕواداران بۆ هەڵسانیان بەم داد و دادپەروەری یە، لەسەر ئەم بارو شێوە تاقانەی کە باس کرا، هەر ئەو کەسەی کە ئەم قورئانەی نارد بە باشی ئەزانیٚ کە هەڵسان بەو فرمانە گەورەیە تا چ رادەیەك قورس و گرانە و بەدی هێنانی چەندە ئەرك و زەحمەتی ئەویٚ. ئەفەرمویٚ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی کەسانیٚ کە بڕواتان هێناوە. ئەمە بانگ کردنی خوایە بۆ بەندە بڕوادارەکانی، بە ناوو سیفەتە تازەکەیانەوە، ئەو ناو و سیفەتەیان کە بەوە بوونێکی تازەیان فەراهەم هێنرا جیاوازە لە بوونەکەی پێش بڕوا هێنانیان، بوونێکی تازەی جیاواز، بە گیان و ڕۆحێکی ترەوە، بە هەست و هۆش و بۆچوونێکی ترەوە، بە بیرو باوەڕ و مەبەست و ئامانجێکی ترەوە، کارو کردەوەیەکی تریان پیٚ سپێررا: گەورەترین سپاردە خرایە ئەستۆیان، سپاردەی چاودێریی و سەرپەرشتی ئادەمی و ئادەمێتی، کاربەدەستی و حوکمڕانی لە جیهان دا بە ئەوپەڕی دادو دادپەروەریی، جا لەبەر ئەوە بانگ کردنیان بەم ناو و سیفەتە نرخ و ڕێزی تایبەتی خۆی هەیە، مەبەستی تایبەتی خۆی هەیە،**

كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلۡقِسۡطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ أَوِ ٱلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَۚ إِن يَكُنۡ غَنِيًّا أَوۡ فَقِيرٗا فَٱللَّهُ أَوۡلَىٰ بِهِمَاۖ

بەهۆی ئەو سیفەتەوە ئەم فەرمانە گەورەی پێ سپێررا کە ئەفەرمویٚ: ﴿كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلۡقِسۡطِ﴾ زۆر بە گرنگی و تێرو تەواوی پارێزەری داد بن و بە هەمیشەیی هەڵسن پێی لە هەموو کات و بەسەر هاتێك دا، ئەو دادە کە بەرگری هەموو دەست درێژیی و ستەمێك ئەکات لە زەوی دا ماف هەموو خاوەن مافێك ئەدات لە بڕوادار و بێ بڕوا وەك یەك لە خزم و بێگانە، لە دۆست و دوژمن بە یەکسانی و بە بێ جیاوازی ﴿شُهَدَآءَ لِلَّهِ﴾ شایەتی دەرو دان نێر بن بە هەر شتێك کە راست و رەوایە، لەبەر خواو فەرمانی خوا و رەزامەندی خوا، نەك لەبەر هیچ نیازو مەبەستێکی تر، شایەتی دەرو دان نێر بن ﴿وَلَوۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ﴾ ئیتر با ئەو شایەتی و دان نەنانە بە دژو زیانی خۆشتان بێت ﴿أَوِ ٱلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَۚ﴾ یان باوك و دایك و خزمە زۆر نزیکەکانتان ﴿إِن يَكُنۡ غَنِيًّا أَوۡ فَقِيرٗا﴾ ئەگەر شایەتی لەسەر دراوە کە دەوڵەمەند بێ نابێ سەرپێچی بکەن لە شایەتی لێ دانی، واتە نابێ لەبەر راگیر کردنی دڵی دەوڵەمەندەکە ئەو شایەتی یە بشارنەوە و نەیدەن، ئیتر لەبەر ئومێدی دەست کەوتێك لێ یەوە، یان لەبەر مەترسی لە زیان گەیاندنی پێتان، یان لەبەر خراپی و خەشم و قینتان لێ ی، هەروەها ئەگەر ئەو شایەتی لەسەر دراوە هەژارو بێ نەوا بێ، نابێ ئێوە شایەتی لەسەر نەدەن لەبەر ئەوەی دڵتان بۆی بسووتێ و بەزەییتان بێتەوە پیای دا یان بێ نرخ بێت بەلاتانەوە وەك باوە لەناو گەلە نەفامەکان دا، واتە لەسەر هەربارو بە هەرحاڵ ئەبێ شایەتی بدەن ﴿فَٱللَّهُ أَوۡلَىٰ بِهِمَاۖ﴾ چونکە خوا شایستە ترە بە دەوڵەمەند و بێ نەوا، ئەو ئەزانێ بەرژەوەندی ئەوان لە چی دایە، ئەزانێ کە راگیر کردن و پاراستنی شایەتی پێویستە و نابێ لەبەر هیچ هۆیەك بشارێتەوە و سەرپێچی بکرێ! تا بەو جۆرو شێوەیە قورئان دڵ و دەروونی بڕواداران بەهێز و دامەزراو ئەکات بەرامبەر هەر هۆو هێزێکی تر کە کاری لێ ئەکات و لای ئەدا لە رێگە راستەکەی خوا و رەزامەندی خوا، هیچ کەسێك ناگات بەو رادەو پلە بەرزە بێجگە لە کەسێك کە بە ئایینی خواو ئەم قورئانە پەروەردە کرابێ.

ئینجا ئەفەرموێ: ﴿فَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلۡهَوَىٰٓ أَن تَعۡدِلُواْۚ﴾ کەواتە شوێنی ئارەزووی نەفس مەکەون بۆ ئەمەی لانەدەن لەهەق و راستی، بەهەرکام یەك مەبەست ئەگەیەنێ، ئارەزووی نەفس چەند جۆرێکی جیاوازە و لێرەدا دەست نیشان بۆ هێندێکی کراوە، خود پەسەندی و خود پەرستی جۆرێکە، خۆش ویستنی کەس و کار جۆرێکە، بەزەیی هاتنەوە بە هەژار و بێ نەوادا لەکاتی شایەتی لێدان و حوکم بەسەردا دان دا جۆرێکە، راگیر کردنی دڵی دەوڵەمەند جۆرێکە، نیازی زیان پێگەیاندنی بە ناهەق جۆرێکە، لایەنگیری تائیفە و تیرەو بەرە و دەوڵەت و نیشتمان جۆرێکە. خەشم و بێزاری لە دژومن یا دوژمنی ئاییتیش بێت جۆرێکە، هەموو ئەمانە چەند جۆری تر لە کاتی شایەتی لێدان و حوکم بەسەردا دان هەواو ئارەزووی نەفسن و خوا جڵەوگیریی کردووە لەوەی کار بکەن لە مەردوم و لایەدەن لە هەق و راستی، پێویستی کردووە کە بڕوادار بەرهەڵستی هەموو ئەوانە بوەستێ و زاڵ بێت بەسەریان دا و رێگە راستەکەی خوا بەرنەدا لەبەر هیچ کام لەمانە و لە غەیری ئەمانە، ئەگینا بەری ئەم هەڕەشەیە ئەکەوێ کە ئەفەموێ: ﴿وَإِن تَلۡوُۥٓاْ أَوۡ تُعۡرِضُواْ﴾ ئەگەر ئێوە زمانە پێچە بکەن لە شایەتی و حوکم دان دا، بەم رەنگە بە رێکی نەیڵێن و لایەدەن لە بارە راستەقینەکەی خۆی، یان هەر بە تەواوی سەرپێچی بکەن لێ ی و هەڵنەسن پێ ی ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا﴾ ئەوا بێگومان خوا هەمیشە ئاگاو خەبەرداره بە هەرکام لەو کردەوانەی کە ئەیکەن، یان بە هەموو کردەوەکانتان کە ئەم زمانە پێچەو لادان و سەرپێچی یە هێندێکە لە کردەوەکانتان و لێرەدا سەر دەستەیە و یەکەم مەبەستە، لەسەر هەربار ئەمە هەڕەشەیەکی سەختی لێ وەرئەگیرێ و بەسە بۆ بڕوادار هەست کردنی بە ئاگاداری خوا بەسەر کردەوەکانی دا، بەسە بۆ ئەوەی کۆسپەی لێ بکەوێ و بکەوێتە دڵە لەرزە! ئەگێڕنەوە کە(عبدالله ی کوڕی رەواحە) – خوای لێ رازی بێت – کاتێ کە پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بۆ خەرس و بەرو میوە و کشتوکاڵی خەیبەر، جوولەکەکان ویستیان بەرتیلی بدەنێ بۆ ئەوەی کەمیان لەسەر دانێ! ئەویش فەرموی: سوێند بەخوا ئێوە بێزراوترن بەلامەوە لە مەیمون و بەراز، نە خۆشویستن و نە خەشم لە

ئێوە لام نادا لەوەی کە بە داد ڕەفتارتان لەگەڵ نەکەم، ئەوانیش وتیان: ئاسمانەکان و زەوی بەم دادە ڕاگیر و وەستاوە!

ئەم هاوەڵە بەڕێزە لە خوێندنگاکەی پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوو بوو، لەسەر بەرنامە تاقانەکەی خوا، ئەمە یەکێك بوو لە ئادەمی کە کەوتە ئەو تاقی کردنەوە و بە ڕێکی دەرچوو و ناجح بوو، وەك ئەو هەموو کەسانەی تر کە لە سایەی ئەو بەرنامەدا پێگەیشتن کە ئەوەش – وەك ئاماژەمان بۆ کرد – تەنها لە سایەی ئەم بەرنامەی خوادا دەست کەوت نەبێ! ئیسلام هات و زۆر بە سووك و ئاسانی داد و دادپەروەریی بەدی هێنا لە ژیان دا، بەو جۆرو شێوەی کە بە دڵی هیچ کەس دا گوزەری نەکردبوو، بە خەو شتی وا نەئەبینرا. لە پاش ئەوە لە هەموو بارو ڕوویەکەوە هەوڵ و تێکۆشان کرا بۆ لاسایی کردنەوەی ئەوەی کە ئیسلام پێی هات و بەدی هێنا، بەڵام بە هیچ جۆر و بە هیچ ڕەنگ ئەوەی کە ئیسلام هێنای و بەدی هێنا پێك نایەت تەنها لەسەر ئەو بەرنامەی ئیسلامە نەبێ و لەو ڕێگەیەوە نەبێ کە ئیسلام نەخشەی کێشا.

ئینجا بانگێکی تری بڕواداران ئەکات هەر بەو ناو و سیفەتە بەرزو پیرۆزەوە، کە جوێ یان ئەکاتەوە لە هەموو ناو ونیشان و دروشمی نەفامی و نەفامێتی، کارو پیشەیان دیاریی ئەکات، پەیوەستی یان ئەکات بەو سەرچاوەی کە هێزو کۆمەکی لێ وەرئەگرن بۆ هەڵسانیان بەو ئەرکەی کە خراوەتە سەرشانیان، بانگیان ئەکات بۆ بڕوا هێنان و بەردەوامی یان لەسەر بڕوای تەواو بە هەموو بەش و پارچەکانی یەوە، بڕوا بە خوا و بە فریشتەکانی و بە نامەکانی و بە پێغەمبەرەکانی و بە ڕۆژی دوایی، بۆ هەرکام لەم بەش و پارچانە نرخی تایبەتی خۆی هەیە لە پێك هێنانی بۆچوونی ئیسلامی، کە بەرزو زاڵە بەسەر هەموو بۆچوونەکانی تردا کە ئادەمی ناسیبێتی و ناوی بیستبێ – پێش ئیسلام و پاش ئیسلام – لەو بەرزی و زاڵی بۆچوونی یەوە هەڵئەقوڵێ و پەیدا ئەبێ هەموو بەرزی و زاڵی یەکانی تری، بەرزی و زاڵی کۆمەڵایەتی یان هەر بارێکی تر کە پێك هات لە ژیانی یەکەم چینی ئەم ئوممەتەدا – وە پێك دێت – بە هەمیشەیی بۆ هەر تاقم و چینێك کە بە ڕێکی ڕێ و ڕێبازی یەکەم تاقم بگرێ هەتا دنیا دنیایە!!

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِن قَبۡلُۚ وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ﴿١٣٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ٱزۡدَادُواْ كُفۡرٗا لَّمۡ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغۡفِرَ لَهُمۡ وَلَا لِيَهۡدِيَهُمۡ سَبِيلَۢا ﴿١٣٧﴾﴾

---

دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ﴾ دامەزراو و بەردەوام بن لە بڕوا هێنان بەخوا ﴿وَرَسُولِهِۦ﴾ بە فروستادە و ڕەوانەکراوەکەی – واتە محمد – ﴿وَٱلۡكِتَٰبِ﴾ بەو نامەی – واتە قورئان – ﴿ٱلَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ﴾ کە ناردی یە خوارەوە بەرە بەرە و بە وەجبە وەجبە، بۆ سەر فروستادەکەی کە(محمد) ە ﴿وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِيٓ﴾ بەرنامەی تری خوا کە ﴿أَنزَلَ مِن قَبۡلُ﴾ ناردی یە خوارەوە لە پێش ماوەی بیست و سێ ساڵ دا هاتە خوارەوە، ئەوەیە بۆچوونی ئیسلامی:

بڕواکردن بە هەموو ئارامێکی دڵەوە بەو خوایەی کە پەروەردگارە و فروستادەی خۆی ناردووە کە ڕێنموونی بەندەکانی بکات بۆلای خۆی، بڕوا کردن بە فروستادەیی ئەو فروستادەیە لە هەر شتێك دا کە لەلایەن پەروەردگارەوە بۆی هێناون، بڕوا کردن بەو نامەیەی کە ناردی یە سەر فروستادەکەی، کە ئەو بڕوایە بڕواداران پەیوەست ئەکات بەو بەرنامەی کە بۆی دیاریی کردوون لەو نامەیەدا، بە جۆرێ لە هیچ لایەکی ترەوە هیچ شتێك وەرناگرن کە سەرچاوەکەی ئەو نامەیە نەبێ و بەناوی ئەو نامەیەوە نەبێ، بڕوا کردن بە هەموو نامەکانی تری خوا، لەبەر ئەوەی سەرچاوەی هەمووی تەنیا خوایە، هەموو نامەکان لە بنەڕەت دا هەر یەکن، مەبەست لە هەموو مل کەچ کردنە بۆ خوای پەروەردگار. تایبەتی کردنی گوێ ڕایەڵی تەنها بۆ بەرنامەی خوا، کە هەر بڕوا بەو جۆرو شێوەیە ڕێك و ڕاستە لەگەڵ تاك و تەنیایی خوادا، لەگەڵ یەکێتی ئادەمی و ئادەمێتی دا، لەگەڵ تاك و تەنیایی هەق و ڕاستی دا کە بە هیچ کلۆجێك ناگونجێ هەق و ڕاستی تەنها یەك شت نەبێ، بێجگە لەوە ون بوونە و لادانە و گومڕایی یە وەك وەریش ئەگێڕێ لەم فەرمودەوە کە ئەیهێنێ بە دوای ئەو فەرمانەی کە

ئاراستەی کرد، ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِٱللَّهِ﴾ هەرکەس بڕوا نەهێنێ بە خوا ﴿وَمَلَـٰٓئِكَتِهِۦ﴾ بە فریشتەکانی ﴿وَكُتُبِهِۦ﴾ بە نامەکانی ﴿وَرُسُلِهِۦ﴾ بە فروستادە و نێرراوەکانی ﴿وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ﴾ بە ڕۆژی دوایی ﴿فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًۢا بَعِيدًا﴾ بێگومان ئەو کەسە گومڕا بووە بە گومڕایی یەکی دوور. زۆرتر مەبەست بە گومڕایی دوور ئەوەیە کە چاوەڕوانی ڕێنموونی و گەڕانەوەی لێ ناکرێ.

بێگومان بڕوا بە نامەی خوا بڕوا بە فریشتە و ڕۆژی دواییش ئەگرێتەوە کە هەموو نامەیەکی خوا بە گرنگی فەرمانی تیایە بەو دووانە، کەواتە لەباسی فەرماندان بە بڕواهێنان دا پێویست نەبوو باسی بڕوا هێنان بەم دووانە، بەڵام لەباسی جڵەوگیریی لە بڕوا نەهێنان دا لەم دوانەشی زیاد کردو بە تایبەتی باسی کردن، چونکە شوێنەکە شوێنی هەڕەشە کردنە، ئەو هەڕەشەش تۆڵە و سەرەنجامی بڕوا نەهێنانە بە هەرکام لەو پێنجە بە تایبەتی، چونکە بڕوا نەهێنان بە هەرکام لەو پێنجە بڕوا نەهێنانە بە هەمووی بەلای خواوە، بێجگە لەوە چەند کەس هەیە لاف لێ ئەدا کە بڕوای هەیە بە خوا بە نامە و بە پێغەمبەر(ﷺ) بەڵام بڕوای نی یە بە فریشتە و بە ڕۆژی دوایی، بەم ڕەنگە ئایەت و حەدیسەکان لە ڕووکەشەکەیان لائەدەن و تەئویلیان ئەکەن، کەواتە چاك وایە بێ بڕوایی ئەوانە روون بکرێتەوە بە دەقی قورئانەکە. لە باسی فەرماندان بە بڕوا هێنان دا فروستادەی پێش خست لەنامە، چونکە بڕوا لە یەکەم جارەوە لەلایەن پێغەمبەرەوە ئەکات بە مەردومان، بەڵام لە باسی جڵەوگیریی لە بێ بڕوایی دا نامەی پێش خست، چونکە بنەڕەتی بڕوا نەکردن بە فروستادە بڕوا نەکردنە بە نامە. ئینجا فریشتەی پێش خست لە نامەو فروستادە. چونکە فریشتە فروستادەن بۆ گەیاندنی نامە لای فروستادەکان، ئینجا نامەو فروستادەکانی بە کۆ فەرموو تا دەست نیشان بێت بەوەی کە بڕوا نەهێنان بەرهەکام لەنامە و لە فروستادەکان، بڕوا نەکردنە بە هەموو، ئەمانە چەند شتێك بوون زانایان بۆیان دەرکەوتبوو لێرەدا، لەبەر ئەوە حەزم کرد کە باسیان بکەم.

لە پاش ئەم دوو بانگ کردنەی کە ئاراستەی بڕواداران کرد، ئینجا هێرش ئەکاتە سەر ناپاکی و ناپاکان، دەست پێ ئەکات بە باسی حاڵەتێکی بەدیان کە لەو کاتەدا بووە لەلایەن هێندێکیانەوە، ئەم حاڵەت و هەڵوێستەیان لێرەدا شایستە ترە بە باس، چونکە هاتووە بەدوای باسی جڵەوگیریی لە بێ بڕوایی و هەڕەشە کردن لە بێ بڕوایان، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ

﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان هێنا ﴿ ثُمَّ كَفَرُوا ﴾ لە پاش ئەوە ئینجا بێ بڕوا بوون ﴿ ثُمَّ ءَامَنُوا ﴾ ئینجا لە پاش ئەوە بڕوایان هێنایەوە ﴿ ثُمَّ كَفَرُوا ﴾ ئینجا لە پاش ئەوە هەمیتر بێ بڕوا بوونەوە ﴿ ثُمَّ ٱزْدَادُوا كُفْرًا ﴾ ئینجا لە پاش ئەوە زیاد بوون لەبارەی بێ بڕوایی یەکەیانەوە و بێ بڕوایی یەکەیان زیاتر بوو بەم ڕەنگە سوورتر بوون لەسەری و زۆرتر درێژەیان کێشا تیای دا.(مجاهد و ئیبن و زەید) ئەفەرمون ئەمانە دەستەیەك بوون لە ناپاکەکان کە بڕوایان دەربڕی، ئینجا پاشگەز بوونەوە، ئینجا بڕوایان دەربڕی یەوە، ئینجا پاشگەز بوونەوە، ئینجا مانەوە لەسەر بێ بڕوایی هەتا مردن.(ئیبن و عەباس) – خوایان لێ ڕازی بێت – ئەفەرموێ: ئەمانە ناپاکەکانی چەرخی پێغەمبەر بوون بە شێوەی لە هەر شوێنێك بووبن، بێجگە لەمە سێ ڕای تریش هەیە، بەلأم بەڕاستی دڵ بەمە بە ئارام ترە کە گوترا، چەند بەڵگەیەك هەیە لەسەری لەبەر ئەوە لەسەر ئەم ڕایە ڕۆیشتم، هەرچەند ئەو ڕاکانی تریش هەر ئەگونجێن. ئەوانەی کە ئەوە بارو حاڵیان بوو ﴿ لَّمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلًا ﴾ خوا هەرگیز نەیویستووە نە لێ یان خۆش بێت، نە بیانخاتە سەر ڕێی هەق و ڕاست کە ڕێی ڕەزامەندی خواو بەهەشتە، واتە ئەوانە ناگەڕێنەوە، چونکە دڵیان دامەزراوە لەسەر بێ بڕوایی و دەقی پێوە گرتووە، بڕوا هێنان بێ نرخە بەلایانەوە، نەك مەبەست ئەوەیە ئەوانە با تۆبەش بکەن هەر خوا نابوورێ لێ یان، – وەك بەو جۆرە گومان براوە – چونکە بەڵگەی بەهێزی زۆر هەیە لەسەر ئەوە کە هەرکەس پێش مردن و نائومێد بوون لە ژیان بگەڕێتەوە خوا وەری ئەگرێ. خوا بە میهرەبانی خۆی پەنامان بدات لەو بەد بەختی و عاقیبەت شەڕی یە. بێگومان بێ بڕوایی یەك کە بڕوای لێ پێش نەکەوتبێ، بڕوا هێنان ئەیسڕێتەوە و ئەبێتە هۆی لێ بووردنی خوا، چونکە ئەو کەسەی کە ڕووناکی نەدیبێ بیانووی هەیە. بەلأم بێ بڕوایی یەك کە هاتبێ بە دوای بڕوادا، جارو دووجار. ئەوە تاوانێکی ئەوەندە گەورەیە ماڧ لێ بووردنی نی یە وەك هیچ بیانوویەکیش نی یە بەدەستەوە. ئینجا واز ناهێنێ لەو ناپاکانە بەوەی کە لێ یان نابوورێ و نایانخاتە سەر ڕێی ڕاست و بەهەشت، بەڵکو ئەیانگەیەنێ بە تۆڵەی زۆر سەخت و سزای گەورە،

بَشِّرِ ٱلْمُنَٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلْعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴿١٣٩﴾ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلْكِتَٰبِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا۟ مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓ ۚ

---

**ئەفەرموێ: ﴿ بَشِّرِ ٱلْمُنَٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾ مزگێنی بدە بە ناپاکەکان بەوەی کە بۆیان هەیە سزایەکی ئازار دەر، لەم فەرموودەیەدا لە دووبارەوە سزای دەروونی یان ئەدات:**

**١- لاقرتی یان پێ ئەکات کە ئەو هەواڵە سەخت و سامناکە بە مزگێنی نیشان ئەدات.**

**٢- لەکەداریان ئەکات بە سیفەتی ناپاکی کە ناپاکەکانیش ترێزی لێ ئەکەن و پێ ی تەریق ئەبنەوەو بە مایەی بێ ئابڕوویی دائەنێن.**

**ئینجا دەست نیشان ئەکات بەهۆی ئەو سزا سەختەیان و چەند سیفەت و نیشانەیەکی ناپاکی یەکەیان باس ئەکات. ئەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ کە ئەو ناپاکانە کەسانێکن کە بێ بڕواکان - واتە جوولەکە - دائەنێن و وەریان ئەگرن بە دۆست و خۆشەویستی خۆیان، لە کاتێك دا تێپەڕ ئەکەن لە بڕواداران و دۆستایەتی و خۆشەویستی ئەمان، بەڵکو هەمیشە خەریکی پیلانن و وان لە کەمین دا بۆ بڕواداران کە ئەوەش دژو پێچەوانەی ڕەزامەندی و فەرمانی خوایە، ئەوپەڕی ناڕاستی و نالەباری یە. ئینجا بە بێزاری دەربڕینەوە ئەم شێوە پرسیارە ئاراستە ئەکات: ﴿ أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلْعِزَّةَ ﴾ ئایا ئەو ناپاکانە داوای هێزو بەرزی و زاڵی ئەکەن لای ئەو بێ بڕوایانە و بەدوای ئەوەدا ئەگەڕێن کە ئەوەیان دەست کەوێ لایان بەو دۆستایەتی و خۆشەویستی یە؟ واتە نیاز و مەبەست و بۆچوونەکەیان ناڕاست و ناڕەواو بێ جێ یە. ﴿ فَإِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴾ چونکە بێگومان هێزو بەرزی و زاڵی یەکسەر هەمووی هینی خوایە و تایبەتی یە بە خواوە. خوایش نایدا بە دۆستەکانی نەبێ. ئا بەو جۆرە سروشتی ئەو ناپاکانەی دەرخست و یەکەم سیفەتی دەرخستن کە دۆستایەتی و خۆش ویستنی بێ بڕوایانە بە تێپەڕ کردن لە بڕواداران، هەرچۆنێ گومان و بۆچوونی بەد و ناڕاستیشی ئاشکرا کردن، بەم ڕەنگە بێ بڕواکانی ڕووت کرد لە هەموو هێزو زاڵی و بەرزی یەك کە ناپاکان بە تەمای دەست کەوتن بوون لای بێ بڕواکان، هەموو هێزو بەرزی و زاڵی تایبەتی کرد بە خواوە، کەواتە نەبێ ئەوە هەر لە خوا**

داوا بکرێ، ئیتر لای هیچ کەسێکی تر دەست ناکەوێ. بەڕاستی زۆر پێویستە لەسەر بڕوادار کە زۆر بە گرنگی بیر بکاتەوە لە وێنەی ئەم ئایەتە بۆ ئەوەی هەڵە نەکات و لانەدا لە ڕێگەی هێزو بەرزی و زاڵی، هەرچۆنێ پێویستە لەسەر ئەو کەسانەی کە ناوی موسڵمانێتی یان ناوە لە خۆیان و کەچی کۆمەك و یارمەتی داوا ئەکەن لە دوژمنانی خوا، پێویستە بیر بکەنەوە لەم قورئانە، ئەگەر ئەیانەوێ موسڵمانی راستەقینە بن، ئەگینا خوا هیچ پێویستی نە بە کەس هەیە نە بە خواپەرستی هیچ کەس! بێگومان ئەو کەسانەی کە شازانی ئەکەن بە باوك و باپیرو کەس و کارە بێ بڕواکانیان، یان ئەوانەی کە فەخرو شانازی ئەکەن بە فیرعەونەکان و ئاشوری یەکان و فەینیقی یەکان و بابلی یەکان، یان بە عەرەبەکانی سەردەمی نەفامی، هەموو ئەوانەو ئەمانە بەری ئەو بێزاری و سەرزەنشتە سەختە ئەکەون کە ئەم ئایەتە ئاراستەی ئەو ناپاکانەی کرد. ئەو جۆرە بۆچوونانە بۆچوونێکی نەفامین و پێویستە دڵ و دەروونیان لێ پاك بکرێتەوە و تۆبە و گەڕانەوەیەکی راستی یان لێ بکرێ! ئیمامی ئەحمەد – خوا لێ ی رازی بێ – ئەمێنێ تا ئەبیاتە سەر ئەبو رەیحانە کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: هەرکەسێك خۆی دابنێ بە نەوەی نۆ باوك و باپیری بێ بڕوا، شانازی بکات پێ یانەوە و بیەوێ بەوانە خۆی بە گەورە نیشان بدا، ئەو کەسە دەهەم کەسیان ئەبێ لە ئاگردا. ئەوەش لەبەر ئەوەیە هۆی پەیوەستی و یەکێتی گەل و کۆمەڵ لە ئیسلام دا هەر عەقیدە و بڕوایە، ئوممەت بەلای ئیسلامەوە هەر بریتی یە لە بڕواداران کە دەست پێ ئەکەن لەباوکی هەمووانەوە تارۆژی دوایی، ئیترلە هەر چین و گەلێك و لە هەرخاك و وڵاتێك،بێجگەلەوەو بەبێ یەکێتی لەبڕوادا ئیسلام نە دانی پیا ئەنێ و نە نرخی بۆ دائەنێ!

یەکەم پلەی ناپاکی ئەوەیە یەکێك دانیشێ لە شوێنێك دا کە بێ بڕوایی و لاقرتی بکرێت بە ئایین و ئایەتەکانی خوا، ئینجا ئەمیش بە بێ دەنگ دانیشێ و چاوپۆشی بکات، ئەوەش بە پێ ی باوی نەفامی تازە چەند ناوێکیان لێ ناوە: چاوپۆشی، لێزانی، دڵ و سنگ فراوانی، بڕوا بە سەربەستی و ئازادی بیرو باوەڕ!!! بەڵام نەخێر هیچ کام لەوانە نی یە، بەڵکو ئەوە بێ غیرەتی و دەربەست نەبوونە بە ئایین و ئایەتەکانی خوا، ئەوە تێکۆشانێکی دەروونی یە و سەری لە ناپاکی یەوە دەرئەچێ وەك ئەم ئایەتی داهاتووە دەست نیشانی بۆ ئەکات، کەواتە هەرکەس لەو جۆرە شوێنانەدا بوو ئەبێ بەرگری و جڵەوگیریی بکات بە پێ ی توانا، یان ئەبێ ئەو شوێنە بەجێ بهێڵێ. هێندێ لە موسڵمانەکانی مەدینە باویان دابوو دائەنیشتن لەگەڵ گەورەی ناپاکەکانی مەدینەدا – کە خاوەن دەسەڵات بوون – بێگومان وتەو قسەی

پیس بە دەمیان دا ئەهات دەربارەی ئیسلام، ئینجا قورئان ئەوانەی ئاگادار کرد بەوەی دانیشتن لەناو ئەوانەدا و بێ دەنگ بوون یەکەم پلەی تێکشکانێکی دەروونی یە، ویستی دووریان بخاتەوە لەو دانیشتنە لەو کاتانەدا، بەڵام هێشتا کاتی ئەوە نەهاتبوو بە دوور کەوتنەوە لەوانە بە تەواوی، بەهۆی ئەوەوە فەرمان درا کە لەو کاتی قسە بەد و پیسانەدا دوور کەونەوە. ئەگینا ئەو دانیشتنە بە ناپاکی دەرئەچێ و دوا رۆژ و چارەنووسیان وەك ناپاك و بێ بڕواکان ئەبێ وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ﴾ واتە ئەوانە بێ بڕواکان ئەگێڕن بە دۆست و برادەری خۆیان لە کاتێك دا کە بێگومان لەمەدا – واتە قورئان – ناردی یە خوارەوە بۆ سەرتان ﴿أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا﴾ کە کاتێ بیستتان ئایەتەکانی خوا بێ بڕوایی دەربارە ئەکرێ و لاقرتی پێ ئەکرا ﴿فَلَا تَقْعُدُوا۟ مَعَهُمْ﴾ دانەنیشتن لەگەڵ ئەو بێ بڕوا و لاقرتی کەرانەدا ﴿حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓ﴾ هەتا دەست پێ ئەکەن و ئەچنە ناو باسێکی ترەوە غەیری ئەو دەم درێژیی یەی کە ئەیکەن دەربارەی قورئان. ئەم ئایەتە دەست نیشانە بە ئایەتی سورەتی(الأنعام) کە لە مەککە هاتە خوارەوە لە کاتێك دا کە موسڵمانەکان ئەچوونە ناو کۆڕو کۆمەڵی بت پەرستەکان و ئەوانیش دەستیان ئەکرد بە دەم درێژیی و لاقرتی کردن بە قورئان ئەمانیش هیچ دەسەلاتی بەرگری یان نەبوو، لەبەر ئەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِۦ﴾ کاتێ بینیت ئەوانەی کە دەست ئەکەن بە لاقرتی کردن و دەم درێژیی لە ئایەتەکانی ئێمەدا، ئەو کاتە تۆیش روویان لێ وەرگێڕە هەتا ئەچنە ناو قسە و باسێکی ترەوە، ئەم ئایەتە هات فەرمانی دا بەو موسڵمانانە بە روو وەرگێڕان و گوێ نەگرتن لەو قسە و باسە پیسانەیان، ئینجا لە مەدینەیش دا جوولەکەکان لە کۆڕ و کۆمەڵی خۆیان دا دەستیان ئەکرد بە وێنەی ئەو دەم درێژی کردنەی بت پەرستەکانی مەککە، ئینجا ئەم ئایەتی ئێرە هاتە خوارەوە ئەوانەی سەرزەنشت کرد کە ئەچوونە لای ئەو جوولەکانە، ئەو ئایەتی(الأنعام) ی بیر خستنەوە و جڵەوگیریی کردن لەو دانیشتن و گوێ گرتنە، تاوانباری کردن بە وێنەی تاوانی ئەو جوولەکانە، ئەگەر دانیشن و گوێ بگرن لێ یان،

إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْكَٰفِرِينَ فِى جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴿١٤٠﴾ ٱلَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِّنَ ٱللَّهِ قَالُوٓا۟ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ

---

**فەرمووی: ﴿إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ﴾ واتە لەو کاتەدا دانەنیشن، چونکە بێگومان ئێوە ئەو کاتە وێنەی ئەوانن و هاوبەشی ئەوانن لە تاوان و بێ بڕوایی دا، چونکە دانیشتنەکە بە بێ دەنگ و بە بێ بەرگری وا ئەگەیەنێ کە هیچ نەبێ بێزار و ناڕازی نین بەو بێ بڕوایی و لاقرتێ کردنە، هەرگیز ئەوەش کۆ نابێتەوە لەگەڵ بڕوادا، هەروەها کارو کردەوەیەکی بێ شەرعی تریش، هەرکەس بە دیاری یەوە بێت بە بێ دەربڕینی بێزاری و ناڕەزایی ئەو کەسە بەشدارە لەو گوناهو بێ شەرعی یەدا!! بەڕاستی ئەم ئایەتە زۆر سامناك و دڵ تەزێنە و بە پێی ئەم ئایەتە هەموو کەس وا بە ژێر باری گوناهەوە، مەگەر کەم کەس کە خوا میهرەبانی لەگەڵ کردبێ و بە غیرەت بێت لەسەر ئایینی خوا و رەزامەندی خوا.**

**لەپاش ئەو تاوانبار کردنە ئینجا ئەم هەڕەشە سەختەشیان ئاراستە ئەکات: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْكَٰفِرِينَ فِى جَهَنَّمَ جَمِيعًا﴾ بەڕاستی خوا کۆکەرەوەی ناپاکەکان و بێ بڕواکانە لە دۆزەخ دا هەموو پێکەوە. بەڵێ زۆر رێك و بەجێ یە کە هەموو کۆببنەوە لە دۆزەخ دا هەرچۆنێ لە جیهان دا کۆبوونەوە لە کاتی بێ بڕوایی دەربڕین و لاقرتێ کردن بە ئایەتەکانی خوادا. ئینجا ئایا ئەوانەی کە رووی فەرمودەیان تێ کرا لەم ئایەتەدا کێن؟ هێندێ ئەفەرمون ناپاکەکانن، هێندێ ئەفەرمون ئەو موسڵمانانەن کە بە پێی پەیوەندی لەوەو بەر ئەچوونە ناو کۆڕ و کۆمەڵی ئەو جوولەکانە، وەك لە سەرەتای ئایەتەکەدا ئاماژەمان بۆ کرد، هێندێکی تر لەسەر ئەوەن کە بە شێوەی گشتی مەبەستە، بە هەرکام هەر ئەگونجێ بەڵام رای دووەم و سێ یەم لە دڵ دا بەهێزە و یەکەم بە زۆرە زمایی بچەسپێنرێ، بەهەرکام و لەسەر هەربار بە روونی دەرئەکەوێ کە ئایەتەکەی مەککە هەرچەند بە رواڵەت رووی نەکراوەتە گشتی، بەڵام ئەویش هەر بۆ گشتی بووە وەك ئایەتەکەی ئێرە، هەروەها دەرئەکەوێ کە هێندێ لەو فەرمانانەی کە روویان کراوەتە پێغەمبەر(ﷺ) تایبەتی نین بە ئەوەوە، بەڵکو ئوممەتیش مەبەستە، بەس ئەوەندە هەیە کە موسڵمانان لە مەککەدا لاوازو بێ دەسەڵات بوون و وەك ناچار وا بوون لە تێکەڵی بت پەرستەکان دا، لەبەر ئەوەی هەر فەرمان درا بە روو وەرگێڕان و پشت تێ کردن، بە وێنەی ئێرە جڵەوگیری نەکرا لە دانیشتن لەگەڵیان و نەوترا: ﴿إِنَّكُمْ إِذًا﴾**

﴿مِّثْلُهُمْ﴾ بەڵام لە مەدینە زۆر و دەسەڵات لای موسڵمانان بوو، کەواتە ئەوانەی کە دائەنیشتن و تێکەڵی جوولەکەکانیان ئەکرد بە ئارەزووی خۆیان بوو، کەواتە مافی خۆیان بوو کە جڵەوگیریی کران لەو تێکەڵی و دانیشتنە، پێ یان گوترا ﴿إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ﴾، ئینجا لەگەڵ ئەو دەسەڵاتەدا جڵەوگیریی یەکە تایبەتی یە بە کاتی ئەو بێ بڕوایی و لاقرتی دەربڕینەوە.

فەرمان نەدرا بە بڕینی پەیوەندی لەگەڵیان بە تەواوی و لە هەموو کات و لە هەموو بارو روویەکەوە، بەو جۆرە جڵەوگیریی یەکە نەهات و نەکرا، چونکە سروشتی بەرنامەکە هەر وایە و بە جاریێ پەلاماری هەموو شتێك نادات، بەڵکو بەرە بەرە، بە پەروەردە کردن و پێگەیاندن مەردومی لە چاڵی نەفامی دەرهێنا و بەرزی کردەوە بۆ پۆپەی مرۆڤایەتی و مەردایەتی، بێگومان ئەو کات و ماوەیە داخوازی ئەوە بوو کە بەو جۆرە رەفتار بکرێ لەگەڵ دوژمن دا، بە تایبەتی جوولەکەکان کە سوێندو پەیمانی بەهێزیان دابوو، کەواتە با خراپی هەر لەوانەوە داکەوێ. ئینجا بێگومان ئەو بارو حاڵەتە لەوانەیە چەند جاریێ تر روو بداتەوەو بەرژەوەندی ئیسلام و موسڵمانان داخوازی ئەوە بێت کە هەر بەو جۆرە رەفتار بکرێ لەگەڵ ئەو دوژمنانەدا، کەواتە با ئەو شێوە رەفتارو بڕیارە هەر بمێنێتەوە بۆ کاتی تایبەتی خۆی!!

ئینجا شێوە ناشیرین و قیزەونەکەی ناپاکەکان ئەخاتە بەرچاو، شێوەی ناپاکی و دوو روویی و دوو زمانی یەکەیان کە لەگەڵ موسڵمانەکان دا بە جۆرێ بوون و لەگەڵ بێ بڕواکان دا بە جۆرێکی تر، ئەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ﴾ ئەو ناپاکانە کەسانێکن کە چاوەڕوانی رۆژگار و بەسەرهاتتان ئەکەن تا بە پێی ئەوە رەفتارتان لەگەڵ بکەن، بەم رەنگە ئەگەر سەرکەوتن و زاڵ بوون، دێن بەلاتانەوە و خۆیان ئەکەن بە هاوبەشتان، ئەگەر رۆژ بە بارێکی تر بوو ئینجا ئەچن بۆلای بێ بڕواکان و هاوبەشی خۆیان دەرئەبڕن بۆیان، وەك روون ئەبێتەوە کە ئەفەرموێ: ﴿فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِّنَ اللَّهِ﴾ ئینجا ئەگەر زاڵ بوون و سەرکەوتنتان بۆ ببێ لەلایەن خواوە﴿قَالُوا أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ﴾ ئەڵێن: ئایا ئێمە لەگەڵتان نەبووین؟ مەبەست ئەوەیە لەگەڵیان، بەڵام بە نیازی ئاژاوە نانەوەو تێك دانی ریزو یەکێتی موسڵمانەکان، یان مەبەست ئەوەیە کە بە دڵ لەگەڵیان بوون، یان مەبەست ئەوەیە کۆمەکیان بوون و پشتگیریان بوون لە پاش دەرچوونی ئەوان، بە هەرحاڵ ئەیانویست خۆیان ببەنە بەرەوەو بەشداریش بن لە دەست کەوتی جەنگەکەدا

وَإِن كَانَ لِلْكَٰفِرِينَ نَصِيبٌ قَالُوٓاْ أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُم مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ

﴿وَإِن كَانَ لِلْكَٰفِرِينَ نَصِيبٌ﴾ ئەگەر بەشێك ببێ بۆ بێ بڕواکان لە جەنگەکەیان دا، چونکە جەنگی موسڵمان و دوژمنان بە نۆبە بووە ﴿قَالُوٓاْ أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ﴾ ئەڵێن: ئایا زاڵمان نەکردن و ڕێمان بۆ بەرەڵا نەکردن بۆ کوشتن و بە دیل گرتنیان؟ ﴿وَنَمْنَعْكُم مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ بەرگری ئێوەمان نەکرد لە بڕواداران. بەم ڕەنگە دڵی ئەوانمان سست و خاو کردەوە لە جەنگ کردن لەگەڵتان، سستمان کرد لە یارمەتی دانی ئەوان؟ یان ئایا ئێمە زاڵ نەبووین بەسەرتان دا و دەسەڵاتمان نەبوو بەسەر کوشتن و گرتنیان دا کەچی هیچمان پێ نەکردن؟ ئایا بەرگریمان نەکردن لە بڕواداران و بەربەستمان نەکردن لەوەی زاڵ بن بەسەرتان دا. ناوبردنی سەرکەوتنی موسڵمانەکان بە فەتح بۆ ڕێز پێدانە و لە ڕاستیش دا ئەوەیە سەرکەوتن کە خێرو خۆشی هەردوو جیهانی تیایە، وەك ناوبردنی سەرکەوتنی بێ بڕواکان بە(نصیب) بۆ بێ نرخ کردنی سەرکەوتنەکەیانە، چونکە لە ڕاستی دا سەرکەوتنەکەیان مایەی بەش بڕاوی و بەدبەختی یانە و سەری لەوەوە دەرئەچێ. پێغەمبەری ئازیزمان(ﷺ) – لەسەر فەرمانی خوا – چاوپۆشی و گوێ پێ نەدانی بەکار ئەهێنا دەربارەی ناپاکەکان لە بەڕێ کردنی پیلان و بەدکرداری یەکەیان دا! جا لەبەر ئەوە ئەوا ئەیانداتە دەست خواو حەواڵەی حوکم و بڕیاری خوایان ئەکات کە لە ڕۆژی دوایی دا تۆڵەی موسڵمانەکانیان لێ بسێنێ، ئەفەرموێ: ﴿فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ ئینجا خوا حوکم و بڕیار ئەدا لە نێوانتان دا لە ڕۆژی دوایی دا، بەم ڕەنگە پاداشتی چاکان ئەداتەوە و تۆڵەش ئەسێنێ لە ناپاکان، کە لەو ڕۆژەدا ماوە نامێنێ بۆ پیلان و بەد کرداریی و ناپاکی بەکار هێنان، بۆ نیازی بەد و ناپەسەند!! ئینجا بڕواداران دڵنیا ئەکات بە بەڵێنێکی تەواو بەمەی کە ئەو پیلانی ژێر بە ژێریی ئەوانە و ئەو یارمەتی و هاوکاری ئەوانە لەگەڵ بێ بڕواکان دا بە دژی ئیسلام و موسڵمانانە سەری لە هیچەوە دەرئەچێ و خوا نایەڵێ زاڵ بن بەسەر بڕواداران دا،

وَلَن يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لِلۡكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ سَبِيلًا ﴿١٤١﴾ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمۡ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ

---

وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَلَن يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لِلۡكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ سَبِيلًا﴾ هەرگیز خوا ڕێ نادات و ناگێڕێ بۆ بێ بڕواکان هیچ ڕێگەیەکی زاڵ بوون بەسەر بڕواداران لە ڕۆژی دوایی دا و لەکاتی حوکم و بڕیاردان دا، هەرچۆنێ لە جیهان دا لە هێندێ کات و بەسەرهات دا ڕێ ئەدا لەبەر تاقی کردنەوەی بڕواداران و خەشم و قار گرتن لە بێ بڕواکان، بەم جۆرە ریوایەت کراوە لە ئیمامی علی و(ئیبن و عەباس) ەوە – خوایان لێ رازی بێت – یان لە جیهان دا دەست و دەسەڵات بۆ بێ بڕواکان بۆ لەناو بردنی بڕواداران، بەڵکو تا جیهان جیهانە دەستەی بڕواداران هەر ئەمێنن وەك هێندێ ئەفەرمون. یان هیچ رابەر و بەڵگەیەك بە بێ بڕوان بۆ پەك خستن و دەم کوت کردنی بڕواداران، بەڵکو هەمیشە قسە و بەڵگەی بڕواداران زاڵ و سەرکەوتووە بەسەر ئەوان دا، وەك لە(سدی) یەوە گێڕراوەتەوە، یان لە هەردوو جیهان دا خوا بێ بڕواکان زاڵ و دەسەڵاتدار ناکات بەسەر بڕواداران دا، لە ڕۆژی دوایی دا شتێکی ئاشکرایە و جێی قسە و باس نی یە، لە جیهانیش دا هەرچەندە بە رووکەش و رواڵەت لە هێندێ کات دا زاڵی و سەرکەوتن بۆ بێ بڕوایان ئەبێ بەڵام رووکەش و رواڵەتێکی رووتە و زاڵ بوون و سەرکەوتنەکە بەسەر بڕوادارانی راستەقینەدا نی یە، بەڵکو بەسەر کەسانێك دایە کە بەناو بڕوادارن. هیچ گومان نی یە لەوەدا کە هەرکاتێك بڕوای راستەقینە جێگیر ببێ لە دڵی گەل و ئوممەت دا، ئەو بڕوایە بوو بە بەرنامەی ژیانیان، بوو بە رژێم بۆیان و تەنها ئەو حاکم و کاربەدەستیان بوو لە هەموو کاروباریان دا، ئەو کاتە هەرگیز خوا بێ بڕوایان زاڵ ناکات بەسەریان دا. ئەمە شتێکی راستە و لە هەموو مێژووی ئیسلام دا هەر بەو جۆرە بوو و رووی داوە، لە هەرکات و رووداوێك دا هەر تێك شکانێك رووی کردبێتە بڕواداران، بێگومان ئەبێ ناتەواوی و کون و کەلەبەرێك رووی تێ کردبن، ئیتر لە هەست و بۆچوونیان دا یان لە کردەوە و جوڵانەوەیان دا، بەشێك لە بڕوای راستەقینە ئەمەیە کە هەمیشە چەك و هێزی

پێویستیان ئامادە بێت هەر بە نیازی تێکۆشان لە رێی خوادا، هەر لە ژێر ئەو ئاڵاداو بە بێ تێکەڵ کردنی هیچ شتێکی تر، بە ئەندازی ئەو ناتەواوی و کون و کەلەبەرە تێک شکانێکی کاتی رووی داوە و لە پاشان زاڵ بوون و سەرکەوتنەکە گەڕاوەتەوە بۆ بڕواداران لە کاتی تەواوی و نەمانی کون و کەلەبەرەکەیان دا! بۆ وێنە رووداوی(احد) و(حنین) ئەگرین بە دەستەوە: لە(احد) دا نافەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) کرا و دڵی هێندێك رووی کردە دەست کەوت و غەنیمەتی جەنگەکە، لە(حنین) دا کەشخە و شانازی کرا بە زۆری و بێ ئاگایی لە پیشتوانی راستەقینە رووی کردە هێندێ لە دڵەکان! هەروەها بە درێژایی مێژوو کارەکە بەو جۆرە بووە و هاتووە. بەڵێ تێك شکان و نارەحەتی و تەنگانە روو ئەدەن لەبەر تاقی کردنەوە. بەڵام تاقی کردنەوەکەیش ئەبێت لەبەر هۆو مەبەستێکی گەورە و گرنگ بێت. بریتی یە لە پاڵفتە کردن و بەهێزکردنی بڕواو کردەوە چاکەکان کە بەرهەم و داخواز کراوەکانی بڕوای راستەقینەن – وەك قورئان باسی کرد و ئامارەی بۆ کرد لە جزمی چوارەم لە سورەتی(آل عمران) دا – هەرکات ئەو مەبەستە پێك هات ئیتر یارمەتی دان و زاڵ کردن دێت لە لایەن خواوە، بەڵێنی خوا بێگومان بەدی دێت. بێگومان بڕوا پەیوەستی یە بەهێزو دەسەڵاتی هەرە گەورەوە، کە هەرگیز لاوازی و نەمان رووی تێ نەکات، بێ بڕواییش پچڕان و دوورکەوتنەوەیە لەو هێزو دەسەڵاتە، هەرگیز هیچ هێزێکی ناتەواوی سنوور داری پچڕاو ناتوانێ زاڵ ببێ بەسەر هێزێکی پەیوەست بە سەرچاوەی هێزو دەسەڵات لەم بوونەوەرەدا. بەس پێویستە هەمیشە ئێمە بڕوای راستەقینە جوێ بکەینەوە لە بڕوای رووکەش و رواڵەتی، بێگومان بڕوای راستەقینە کە هێزێکی راستەقینەی دامەزراوە کاتێ کە بەرەنگاری بێ بڕوایی وەستا ئەتوانێ زاڵ ببێ بەسەری دا و ژێر دەستی بکات. بەڵام بێگومان بڕوای رووکەش و رواڵەتی بەرگەی بێ بڕوایی راستەقینە ناگرێ، چونکە هەموو شتێکی راستەقینە بەهێزترە لە هەر شتێکی رووکەش و رواڵەتی!! بە کورتی هۆی زاڵ بوون بەسەر بەتاڵ و ناهەق دا پێك هاتن و پەیدا بوونی هەق و راستی یە، کاتێ هەق و راستی لەسەر باری راستەقینەی خۆی بەدی هات ئەبێ بەتاڵ و ناهەق هەر بڕوا، هەرچەند گەورەو گرنگ و بەهێز بێت بە دیمەن و بە رواڵەت!

لەپاش ئەم بەڵێنە ئارام دەر و دڵنیا کەرە بۆ بڕواداران و نائومێدکەری بێ بڕوایان و ناپاکان، ئینجا لەسەر ناپاکان ئەڕوات کە دۆست و پشت بەست بوون بێ بڕواکان، لەسەریان ئەڕوات بەمەی شێوەیەکی زۆر ناشیرین و ریسوا کەر نەخشە ئەکێشێ بۆیان، بە بێ نرخ کردن و هەڕەشە کردنی خوا لێ یان، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ﴾ بەڕاستی ناپاکەکان وەك بیانەوێ فێل بکەن لە خوا وان، بەم رەنگە بڕوا دەرئەبڕن، دژو پێچەوانەی بڕواکەیان لە دڵ دایە، بەم فەرمودەیە خەشم و قینی بڕواداران هەڵئەگیرسێنێ لێ یان، چونکە بڕواداران خوای خۆیان ئەناسن و ئەزانن کە ئاگای لە هەموو شت هەیە لە نهێنی و شاراوەتر لە نهێنی، بە هیچ کلۆجێك ناگونجێ هیچ فرو فێلێکی لێ بکرێ، کەواتە هەرکەس بیەوێ و نیازی ئەوە بکات ئەو کەسە بەدەو نەفامە و بێ ئاگایە و ئەوپەڕی رادەو بێ شەرمە. بێگومان بڕوادار بەوە تێك ئەچێ و بێزار ئەبێ، ئەوپەڕی رادە قین و خەشمی بەتین ئەبێ دەربارەی ئەو نەفام و نەزان و بێ شەرمانە! هەروەها ئەگەر مەبەست فێڵ کردن بێت لە پێغەمبەر(ﷺ) و بڕواداران وەك هێندێ بەوە تەفسیری ئەکەنەوە، بەهەرکام مەبەست بێت ئەوا خوا فەرموی: ﴿وَهُوَ خَٰدِعُهُمْ﴾ خوا سزا دەر و تۆڵە سێنە لێ یان لەسەر ئەو کردەوە بەدەیان، یان خوا کردەوەیەکیان بەسەر دێنێ بە وێنەی کردەوەکەی خۆیان و زاڵە بەسەریان دا لەو پیلان و فێڵەی کە ئەیکەن، بەم رەنگە لێ یان ئەگەڕێ لە جیهان دا بە جۆرێ خوێن و ماڵیان پارێزراوە، بە خۆیان نازانن تا ئەمرن و لە پاشان ئەخرێنە ناو تەبەقی هەرە ژێری دۆزەخ دا، یان بەم رەنگە – وەك(حسن و سدی) و کۆمەڵێك ئەفەرمون – لە رۆژی دوایی دا رووناکی یەکیان پێ ئەدرێ کە پێ‌ی ئەڕۆن بەڕێدا وەك بڕواداران ئینجا لێ یان ئەسێنێتەوە و سەدو بەربەستێك ئەهێنێ بە نێوان ئەوان و بڕوادارەکان دا، وەك لە سورەتی(حدید) دا دەست نیشانی بۆ ئەکات، هەروەها لەسەریان ئەڕوات، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ﴾ کاتێ کە هەڵئەسن بۆ نوێژ هەڵئەسنەوە بە سستی و بە لەشێکی قورسەوە ﴿يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ﴾ رووپامایی مەردومە بڕوادارەکان ئەکەن بە نوێژەکەیان و ئەیانەوێ بە نوێژ کەر خۆیان نیشان بدەن بۆ ئەوەی بە خراپ و بێ نرخ سەیریان نەکەن و بە یەکێ لە خۆیان دایان بنێن

وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٤٢﴾ مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلًا ﴿١٤٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿١٤٤﴾ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ

---

**﴿وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ واته زیكر و باسی خوا ناكەن لە نوێژەكانیان دا مەگەر كەمێك، وەك وتنی الله اكبر و سمع الله لمن حمده كە بە دەنگی بەرز ئەیڵێن تا بڕواداران گوێ یان لێ بێ، یان مەبەست نوێژ كردنە، واتە نوێژ ناكەن مەگەر كەمێك، ئەوەش كاتێ كە بڕواداران بە دیارەوە بن، ئیتر كە كەوتنە پەنا نایكەن، یان یادی خوا ناكەن و خوایان لە بیر نی یە مەگەر كەمێك، بەڵكو زۆرتر یادی مەردوم ئەكەن و ئەویان لەبیرە، بە هەرجۆر و لەسەر هەربار شێوەیەكی زۆر پیس و ناشیرینیان نیشان ئەدات كە مایەی ریسوایی و بێزراوی یانە لە دڵی مەردومان دا، هۆی دووركەوتنەوە و پچرانی پەیوەندی بڕوادارانە لەگەڵیان، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ﴾ واتە رووپامایی ئەكەن لە كاتێك دا بێ ئارام و دانەمەزراون لە نێوان بێ بڕوایان و بڕواداران دا بە جۆرێ ﴿لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ نە پەیوەستی ئەكەن و بە تەواوی ئەچن بۆلای بێ بڕواكان بە تەواوی، چونكە بەدەم لاف بڕواداریی لێ ئەدەن ن نە پەیوەستی ئەكەن و بە تەواوی ئەچن بۆلای بڕواداران، چونكە لە دڵەوە بێ بڕوان، كە ئەوەش مایەی سووكی و ریسوایی یانە لە دەربوونی مەردوم دا، هەرچۆنێ بەڵگەیە لەسەر بێ نرخی و بێ هێزی یان، ئەوەتا ناتوانن خۆیان بخەن بە بارێك دا، ئینجا بەدوای باسی ئەو حاڵ و بارە بەدەیان دا ئەم فەرمودەیە ئەهێنێ: ﴿وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلًا﴾ هەركەسێك خوا گومڕای بكات هەرگیز دەست ناكەوێ بۆی هیچ رێگەیەك كە بیگەیەنێ بە هەق و راستی و رزگاریی، چ جای ئەوەی كە بیخاتە سەر رێ و بیگەیەنێ بە ئامانج، واتە ئەوانە بەهۆی نیازی بەدو كارو كردەوەی خراپی خۆیانەوە خوا یارمەتی یان ناداو گومرا ئەبن، هەركەسیش بەو جۆرە بێت ئیتر هیچ كەس ناتوانێ چارەسەرێكی بۆ بدۆزێتەوەو هیچ رێگەیەكی دەست ناكەوێ بۆی.**

له پاش ئەو هەموو بێزراندن و بێ ئابڕوو کردنە، ئینجا ڕووی فەرموده ئەکاتە بڕواداران و جڵەوگیریی یان ئەکات و ئەیانترسێنێ لەوەی ڕێگەی ئەو ناپاکانە بدەنە بەر کە بریتی بوو لەوەی بێ بڕواکان بکەن بە دۆست و خۆشەویست بۆ خۆیان، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ لە کاتێك دا تێپەڕ ئەکەن لە بڕواداران و بەسەر ئەوان دا تێپەڕ ئەکەن بۆ دۆستایەتی ئەو بێ بڕوایانە. مەبەست بەم وتەیە - وەك چەند جارێك وتمان - سەر زەنشت کردنیانە، کەواتە ئەوە ناگەیەنێ کە خۆش ویستن و یارمەتی و کۆمەکی یان قەیناکا و دروستە، هەرچەند زۆر لە موسڵمانەکان پەیوەندی خۆیانیان بە تەواوی پچڕی بە بێ بڕواکانەوە، چ جوولەکەکانی مەدینە و چ بت پەرستەکانی مەککە و دەوروبەری، تەنانەت لەگەڵ باوك و کوڕ و کەس و کاریان دا، هەرچەند زۆربە بەو جۆرە بوون، بەڵام لەم بانگ کردنەوە وا دەرئەکەوێ کە هێشتا هێندێ لە بڕواداران نەگەیشتبنە ئەو رادەو پلە بەرزە، لەبەر ئەوە بەم بانگ کردنەوە بێداری کردنەوەو جڵەوگیریی کردن لەوەی پەیوەندی یان ببێ وەك ناپاکەکان، ئینجا ئەیانترسێنێ لە خەشم و سزای خوا، ئەفەرموێ: ﴿أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُواْ لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا﴾ ئایا ئەتانەوێ بکێڕن بۆ خوا بەسەرتانەوە رابەرو بەڵگەیەکی روون لەسەر سزادانتان و شایستەییتان بۆ تۆڵە و سزای خوا، چونکە ئەو دۆستایەتی و پەیوەندی یەتان بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر شایستەییتان بۆ تۆڵە و سزای خوا، چونکە ئەو دۆستایەتی و پەیوەندی یەتان لە رەوشت و سیفەتی ناپاکەکانە. ئینجا ئەیدا بە گوێ یان دا سزای سەختی ناپاکەکان تا ئەو بڕوادارانە بترسن و خۆیان دوور خەنەوە لە کردارو رەفتاری ئەو ناپاکانە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ﴾ بەڕاستی ناپاکەکان وان لە قات و تەبەقی هەرە ژێر لە ئاگری دۆزەخ دا، واتە بەتین ترین سزایان هەیە، چونکە ئەوان وان لە بێخی دۆزەخ و قاتی حەوتەم دا، شەش قات و تەبەقی ئاگر کەوتووەتە لای سەروویانەوە، خوا پەنامان بدات، ئەوانە سەخت ترین سزایان هەیە، چونکە لەگەڵ بێ بڕوایی یەکەیان دا هەمیشە لە فێڵ و تەڵەکەو لاقرتی کردن دا بوون دەربارەی ئیسلام و موسڵمانان،

وَلَن تَجِدَ لَهُمۡ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَٱعۡتَصَمُواْ بِٱللَّهِ وَأَخۡلَصُواْ دِينَهُمۡ لِلَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَسَوۡفَ يُؤۡتِ ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿١٤٦﴾

---

ئەوانە – خوا پەنامان بدات – وان لەو سزا سەختەدا بە نائومێدی و بە بێ ئەوەی رزگار بوونیان ببێ وەکو ئەفەرموێ ﴿وَلَن تَجِدَ لَهُمۡ نَصِيرًا﴾ هەرگیز دەست ناکەوێ بۆیان یارمەتی دەرێك کە رزگاریان بکات یان سزاکەیان سووك بکات. ئەو ناپاکانە ئەوە جێ و شوێن و سزایانە لە رۆژی دوایی دا ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ﴾ بێجگە لەوانەیان کە لە جیهان دا تۆبە و گەڕانەوەیان کردبێ لە ناپاکی یەکەیان ﴿وَأَصۡلَحُواْ﴾ نیازو کردەوە بەدەکانیان چاك کردبێ ﴿وَٱعۡتَصَمُواْ بِٱللَّهِ﴾ دەستیان گرتبێ بە خواوە بەم رەنگە بە پێی نامەکەی خوا رەفتاریان کردبێ ﴿وَأَخۡلَصُواْ دِينَهُمۡ لِلَّهِ﴾ ئایینەکەیان پاك و خاوێن کردبێ بۆ خوا بەم هەموو نیازو کردەوەو هەموو کردەوەیەکیان هەر لەبەر خوا بێت بە بێ رووپامایی و هەر نیازێکی تر ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ﴾ ئەوانەی کە ئەم چوار مەرجەیان بەدی هێنابێ لەگەڵ بڕواداران ئەبن ﴿وَسَوۡفَ يُؤۡتِ ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَجۡرًا عَظِيمٗا﴾ بێگومان لە داهاتوودا خوا ئەبەخشێ بە بڕواداران ئەجرو پاداشتێکی زۆر گەورە کە ئەندازەو رادەکەی خوا خۆی ئەیزانێ، کەواتە ئەو تۆبەکارانەش هاوبەشی ئەمان ئەبن. لە چەند شوێنی تردا هەر دوو مەرج دائەنێ: تۆبە و گەڕانەوەو چاك کردنی خراپەکان. بێگومان ئەو دوو مەرجە ئەم دوو مەرجەکەی تریش ئەگرێتەوە. بەڵام لێرەدا ئەم دوانەکەشی بە تایبەتی باس کرد، چونکە ناپاکی تاوانێکی زۆر گەورەیە و سڕینەوەی هەوڵ و تێکۆشانی تایبەتی ئەوێ، ناپاکان بێ بارو دانەمەزراون و هەر دەمە بە بارێك دان، کەواتە بە تایبەتی پێویستە هەڵسان بەم چوار شتەی کە باسی کردن، ئینجا لەگەڵ هەڵسانیان بەو چوار شتە، هێشتا لە رێوە بەڵێن و مزگێنی یەکە ئاراستەی ئەوان ناکات، بەڵکو لە پەنای بڕوادارەکان دا وەری ئەگرن!! ئا بەو جۆرو شێوەیە ناپاکی دەرخست لەناو گەلی موسڵمان دا، ریسواو بێ نرخی کردن، بڕوادارانی وریا و ئاگادار کردەوە کە دوور کەونەوە لە رێ و رێبازی ئەوان تا ئەمانیش پێ یان هەڵنەکەوێ و هەڵنەخلیسکێن، ترساندنی لە چارەنووس و دوا رۆژە سەخت و بەدەکەیان، لەگەڵ ئەوەیش دا بە پێی میهرەبانی خۆی قاپی تەوبەی خستە سەر پشت بۆیان، رێگەی خۆ پاك

کردنەوەشی نیشان دان، تا هەر کەسێکیان مەیلیان ببێ چارەسەری خۆیان بکەن پێش ئەوەی بکەونە ناو قاتی هەرە ژێری دۆزەخ کە ئیتر بە هیچ کلۆجێك چارەسەر ناکرێن! لەپاش باسی ئەو سزا گەورە و دڵ تەزێن و داچڵەکێنەرە و، ئەو ئەجرو پاداشتە گەورەیە، ئینجا تێمان ئەگەیەنێ کە هیچ پێویستی بە سزادانی بەندەکانی نی یە و پێی خۆشە ئەگەر بەندەکانی بە دەستی خۆیان شایستەی سزا نەکەن، ئەفەرموێ: ﴿مَّا يَفْعَلُ اللَّهُ بِعَذَابِكُمْ ﴾ ئایا خوا چی ئەکات و چ ئیشێکی هەیە بە سزادانی ئێوە؟ ﴿إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ وَكَانَ اللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ﴾ ئەگەر ئێوە چاولەبەری چاکەکانی خوابن و سوپاسی بکەن، واتە سزادانی بۆ ئێوە تۆڵەی سپڵەیی و بێ بڕوایی یەکەتانە ئەگینا خوا سزاتان ناداو هیچ پێویست نی یە بە سزادانتان. خوا وەك زۆردار و پادشایەتی جیهان نی یە کە داخ لە دڵ بێت و بیەوێ داخی دڵی خۆی بڕێژێ، خوا وەك ئەوان نی یە کە لە خۆیەوە ئارەزووی سزادانی مەردومان بکات، خوا وەك ئەوان نی یە کە بیەوێ زۆر و دەسەڵات و پادشایەتی خۆی دەربخات، خوا پاك و بێ لەکەیە لەو جۆرە شتانە و لە هەموو ناهەقی یەك، کەواتە هەر کاتێ ئێوە خۆتان بپارێزن لەهۆی سزادانتان، بە چاولەبەری و بڕوا هێنان ئەو کاتە لێ بوردن و رەزامەندی لە کایەدایە، وەکو ئەفەرموێ: خوا هەمیشە وەرگری چاکەیە و رازی یە بە کەمێك لە گوێ رایەڵی و چاکە و ئەجرو پاداشتی چەند قات ئەداتەوە ، خوا هەمیشە ئەوپەڕی رادە ئاگا و زانایە بە هەموو شتێك کە یەکێ لەو شتانە سوپاس و بڕواکەی ئێوەیە، کەواتە بە هیچ کلۆجێك ناگونجێ ئەجرو پاداشتی چاکە نەداتەوە. سوپاسی بەندە بۆ خوا بریتی یە لە چاولەبەریی و گوێ رایەڵی بۆ پەروەردگاری، شوکری خوا بۆ بەندەکانی بریتی یە لە ئەجرو پاداشت دانەوەی خوا لەسەر چاکەکانی بەندەکانی و رەزامەندی لێ یان، بەڵام بەڕاستی وتەکە زۆر دڵڕفێن و بەکارە لە دەروون دا، زۆر پاڵدەر و سەرنج راکێشە بۆ گوێ رایەڵی کردنی بەندە بۆ ئەو پەروەردگارەی کە خۆی ناو بردووە بە(شاکر) کە لە ئێمەدا واتە سوپاس کەر و گوێ رایەڵ!!

لە ١٤٠٦/١١/٦ بەرامبەر ١٩٨٦/٧/١٢ بە یارمەتی خوای میهرەبان لێ بوومەوە لە تەفسیری جزمی پێنج، داوا ئەکەم کە یارمەتیم بدات بۆ ئەوەی کە ماوە لەم تەفسیرەو وەریشی گرێ لێم.

وصلى الله وسلم على سيدنا محمد و على آله و صحبه.

هەر لەم رۆژەدا دەستم کرد بە تەفسیرکردنی جزمی شەشەم.

ئەم جزمەپێك هاتووە لەدووبەش: بەشی یەكەم لە سورەتی(النساء) ە، وە بەشی دووەمی - كە زۆربەی جزمەكەیە - لە سورەتی(مائدة) یە.

لێرەدا بە كورتەیەك ئەدوێین لە بەشی یەكەم، وە لە بارەی بەشی دووەمەوە باسەكەی دوا ئەخەین بۆ سەرەتای(مائدة) بە یارمەتی خوا. لێرە بەدوای سورەتەكە تا دوایی هەر لەسەر بەرنامەی سورەتەكە ئەڕۆین كە لە پێشەكی جزمی چوارەم دا ئاماژەمان بۆ كرد، وەك چاك وایە لێرەیش دا بە شێوەیەكی زۆر كورت دەست نیشان بكەین بۆ ئەوەی لەوێ گوتمان:

ئەم سورەتە هەوڵ و خەریك بوونی بۆ ئەوەیە كە بۆچوونێكی ئیسلامی راستەقینە پێك بێنێ و دای ڕێژێ لە دەروونی ئەو گەل و كۆمەڵە بڕوادارەی كە ئیسلام لە چاڵی نەفامی دەری هێنان و بەرزی كردنەوە بۆ پۆپەی هەرە بەرزی زانین و مرۆڤایەتی، ئەو بۆچوونە راست و رەوا داڕێژێ لەو دەروونانە، وە رزگاریان بكات لەو هەموو بۆچوونە ناڕاست و ناڕێكانەی كە بوو بوون بە تەم و هەورێكی رەش و تاریك بەسەریانەوە، ئینجا لەسەر رووناكی ئەو بۆچوونە راست و رەوا چارەسەری ئەو گەل و كۆمەڵە بكات، وە رزگاری بكات لە هەموو خو و رەوشت و باوێكی سەردەمی نەفامی، ژیانی كۆمەلأیەتی و پەیوەندی ماڵ و خێزان بهۆنێتەوە و رێك و پێكی بكات لەسەر بنەڕەتی ئەو بەرنامە بێ وێنەی كە ئیسلام هێنای، ئینجا لەناو بەناوی ئەو باس و چارەسەر كردنەدا، بەرەنگاری چەند عەقیدەو بیرو باوەڕی پڕو پووچ ئەوەستێ و بەربەرەكانی هەڵگران و خاوەنەكانیان ئەكات، ئیتر بت پەرستان یان جوولەكەو گاورەكان كە لەو سەردەمەدا بە زۆری ئەوانە هەبوون لەو دەورو بەرەدا. ئینجا كۆمەڵی موسڵمانان ئەخاتە جەنگ و بەربەرەكانێ یەكی گەرم و گوڕ لەگەڵ نامەدارەكان دا، بە تایبەتی جوولەكە، چونكە ئەوان بە تەواوی لێ بڕابوون بۆ دوژمنایەتی و رێگرتن لە ئیسلام، بە هەر چەكێك لە دەستیان دا بووایە جەنگیان لەگەڵ ئەكرد! جا ئەم سورەتە هەڵوێست و سروشتی بۆگەنی دەرخستن و مێژووی بەدو خراپیانی ئاشكرا كرد، تەنانەت لەگەڵ پێغەمبەرەكانی خۆیان دا، كە لەوەوە دەرئەكەوێ هەڵوێستی خراپیان بەرامبەر هەق و هەر كەسێك كە بانگ بۆ رێی راست و هەق بكات! هەروەها ئەم سورەتە گەل و كۆمەڵی موسڵمان ئاگادار ئەكات بە گرنگی و گەورەیی ئەو كارو كردەوە و ئەركەی كە خراوەتە سەر شانی. ئەم سورەتە هەر بەو رێگەدا هاتووە لە هەموو ئایەتەكانی رابردووی و

ئەم ئایەتانەی تری کە لەم جزمەوە دەست پێ ئەکات تا دوایی سورەتەکە بۆمان دەرئەکەوێ لە کاتی تەفسیری ئەم ئایەتانەی تری سورەتەکە. ئەو ئوممەتەی کە ئەم قورئانە پێکی هێنا بەرز بوویەوە بەسەر هەموو دانیشتوانی تری ئەم جیهانەدا لە کردارو خو و رەوشتی گەل و ئەندامی گەل دا، بە ئەندازەی بەرزی یەکەی لە بارەی بۆچوونی عەقیدەو بیرو باوەڕەکەیەوە، ئینجا کە گەیشتە پلەو پایەی بەرزی خۆی، خوا کردی بە پاسەوانی ئایین و بەرنامەکەی، وە کردی بە سەرکردەی مرۆڤ و مرۆڤایەتی، کردی بە ئەمیندار بەسەر ئادەمێتی یەوە، لەبەر ئەوە سەرکەوت و بەرز بوویەوە بەسەر هەموو جیهانی یان دا لە زانین و شارستانێتی و ئابووری و رامیاریدا.

بەشێك لەو بەرزی و سەرکەوتنە ئەمەیە کە لەم دوو ئایەتە کورتەدا وەرئەگیرێ ﴿لَّا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلْجَهْرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلْقَوْلِ﴾ خوا پێی خۆش نی یە وتن و دەربڕینی وتەی بەد و خراپ لەلایەن هیچ کەسێکەوە، واتە خوا خەشمی هەیە لەوەی بەندەکانی باسی یەکتر بکەن بە وتەی بەدو ناشیرین کە دڵیان برەنجێ ﴿إِلَّا مَن ظُلِمَ﴾ مەگەر کەسێك کە ستەم و دەست درێژیی لێ کرابێ، دەربارەی ئەم کەسە خەشمی نی یە لەوەی کە باسی ستەم کەرەکەی بکات، بەم رەنگە بێزاری دەربڕی لێ ی، یان لە دادگا شکاتی لێ بکات و کردەوە خراپەکەی ئاشکرا بکات، یان وەڵامی جوێن و قسەی خراپی بداتەوە بە بێ زیادە رەوی، خوا خەشمی لەو جۆرە وتەیانە نی یە، هەرچەند خۆگرتن و دەنگ نەکردنی بەلاوە باشترەو ئەجرو پاداشتی گەورەشی هەیە ئەگەر خۆگرتن و دەنگ نەکردنەکە هەر لەبەر خوا بێ. ئەو ئێش و زامەی کە زیان بە وتەو قسەی ناشیرین ئەیکات ئەگەر زیاتر نەبێ هیچ کەمتر نی یە لەو زام و ئێشەی کە تیغ ئەیکات و ئەیگەیەنێ ، وە مایەی دوژمنایەتی و تێك دانی دڵی گەلە، و هۆی نەمانی ئارامی و بڕوا بە یەکترە لە ناو گەل دا، بەربەست نەکردن و جڵەوگیریی نەکردن لێ ی مایەی بڵاو بوونەوەی بەدخویی و بەد گوفتاریی ناو گەلە، تا رادەیەك دەقی پێوە ئەگیرێ و بە خراپ و ناشیرین سەیر ناکرێ، بێجگە لەوانە زۆر جار پاك و چاك لەکەدار ئەکرێ و بە خراپ و ناپاك دەرئەکرێ کە ئەوە ستەمێکی گەورەیە، کەواتە زۆر راست و بەجێ یە کە رێی ستەم لێ کراو دراوە کە باس بکات و وەڵام بداتەوە لەو سنووورەدا کە شەرع دیاریی کردووە. بێگومان ئیسلام رێزو ئابڕووی مەردوم ئەپارێزێ تا ستەم نەکات، کاتێ ستەمی کرد شایانی ئەو پاراستنە نییە، وەرەوایەبۆستەم لێ کراو کە مافی خۆی دەربڕێ و ئاشکرا بکات، بەو جۆر و شێوەیەلەبارێکەوەداد بەکارئەهێنێ، وەلەبارێکی ترەوەپارێزگاری خو و رەوشتیش نەکات!

ئینجا فەرمودەکە دوایی ئەهێنێ بەم وتە پیرۆزە ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا﴾ وە خوا هەمیشە شنەوای زانایە، کە بڕوای راستەقینە بەوە بەسە بۆ خۆگرتنەوە لە هەر قسە و وتەیەك کە خوا نایەوێ و خەشمی هەیە لێ ی. بێگومان وتە و قسەی بەدو خراپ بە نهێنیش هەر خراپە و خوا نایەوێ و خەشمی هەیە لێ ی، وەك لە ئایەتی سورەتی(مجادلة) دا جڵەوگیریی لێ کردو هەڕەشەی سەختی لەسەر کرد، بەڵام قورئان فەرمودەکانی ئاراستە ئەکات، بۆ وێنە: لە سورەتی(مجادلة) دا جڵەوگیریی ئەکات لە وتەو قسەی خراپی نهێنی، بە بۆنەی کردەوەو باوی بەدی ناپاکەکان کە سێ سێ و پێنج پێنج کەمتر یان زیاتر کۆئەبوونەوە و سەریان ئەکرد بە یەك دا بە بەرچاوی موسڵمانەکانەوە دەستیان ئەکرد بە چپە کردن، لە بارێکەوە بۆ تەدبیری خراپ و پیلان گێڕیی لە موسڵمانەکان، لە بارێکی ترەوە بۆ ئازاردانی دەروونیان و بێ ئارامی دڵیان، بەڵام لێرەدا جڵەوگیریی هەر لەو وتەو قسەیە ئەکات کە بە ئاشکرا و بە دەربڕین - بێجگە لەوەی کە رەوای دا - بە بۆنەی ئەو هەموو ئایەتانەی کە تێپەڕیان کرد و جاڕی بەدیی و خراپی یان دا لە بێ بڕواکان و ناپاکەکان، جا بەو بۆنەیەوە لێرەدا جڵەوگیریی کرد لە ئاشکرا کردن و دەربڕینی وتەو قسەی خراپ، بۆ ئەوەی هیچ کەس ئەم ئایەتانە نەکات بە بەڵگە بۆ دەم بەرەڵا کردن بە ئارەزووی خۆی، بێجگە لەوەیش زیانی ئاشکرا کردن زۆرترە و روو ئەکاتە گشتی، بەم رەنگە ئەبێ بە سەرمەشق و مەردومانی تریش چاوی لێ ئەکەن.

لەپاش خەشم و ناڕەزایی دەربڕین لە وتەی خراپ بە ئاشکرا، ئینجا بەرامبەر بەوە رەزامەندی دەرئەبڕێ لە شتی خێرو چاك بە شێوەی گشتی، ئیتر بە ئاشکرا بکرێ یان بە نهێنی، هەروەها رەزامەندی دەرئەبڕێ لە چاوپۆشی و لێ بوردن، چونکە لێ بوردن سیفەت و باوی خوایە و بڕوادارانیش ئەبێ پەیڕەوی خوا بکەن لەو جۆرە سیفەت و کردەوانەدا بە پێ ی دەسەڵات. ئەفەرموێ ﴿إِن تُبْدُوا۟ خَيْرًا﴾ ئەگەر ئێوە خێرو چاکە دەرخەن و بە ئاشکرا بیکەن - ئیتر لە وتار یان لە کردار - ﴿أَوْ تُخْفُوهُ﴾ یا بیشارنەوە و بە نهێنی بیکەن ﴿أَوْ تَعْفُوا۟ عَن سُوٓءٍ﴾ یا ببورن لە خراپەی خراپەکەران کە دەربارەتان بیکەن

﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا﴾ بێگومان خوا زۆر لێ بوردەی توانای بە دەسەڵاتە، واتە ئەگەر ببورن لە کاتێك دا کە دەسەڵاتتان بوو بەسەر تۆڵە سەندن دا، لەگەڵ ئەوەی لەلایەن خواوە ئیزن دراون بە تۆڵە سەندن بە وێنەو ئەندازەی ئەو خراپەی کە دەربارەتان کراوە، ئەگەر ئێوە بەو جۆرە بکەن ئەوا کردەوەیەکی چاك ئەکەن و ماف خۆتانە وا بکەن، چونکە خوا لەگەڵ ئەوەی دەسەڵاتی تەواوی بێ سنووری هەیە، لەگەڵ ئەوەدا هەرچی بکات ماف خۆیەتی، لەگەڵ ئەوەدا زۆر لێ بوردەیە لە تاوان و خراپەی تاوانبار و خراپەکاران، کەواتە ئێوەیش پێویستە لەسەرتان پەیڕەوی خوا بکەن، هەرچەند خێرو چاکەی ئاشکرا یان نهێنی گشتی یە و لێ بوردنەکەش ئەگرێتەوە، بەڵام لەبەر گرنگی و گەورەیی لێ بوردن جوێی کردەوە و بە تایبەتی باسی کرد، وە بە جۆرێ باسی کرد وەك مەبەست لێرەدا هەر ئەم بێت و باسی خێرو چاکە هەر بۆ پێشەکی و سەرەتا هاتبێت بۆ لێ بوردنەکە، ئەوەتا دوو سیفەتی خوای بە دوا هێنا کە پەیوەندی یان بە لێ بوردنەوە هەیە نەك بە خێرو چاکەکەوە. ئینجا لێ بوردن هەرچۆنێ زۆر گەورەو گرنگە، هەروەها بە پێی جێ و شوێنەکەیش وەك هەر ئەو مەبەست بێت لێرەدا وایە، چونکە دەست نیشانی تیایە بە هاندان لەسەر لێ بوردن لەلایەن ئەو ستەم لێ کراوەی کە لە ئایەتی پێشوودا باسی کرد و ڕەوای دا تۆڵەی خۆی بسێنێ.

ئا بەو جۆرو شێوەیە قورئان بڕوادار پەروەردە ئەکات و پێی ئەگەیەنێ بە بەرنامە بێ وێنەکەی خۆی، لە یەکەمجارەوە خەشم و بێزاری دەربڕی لە دەربڕین و ئاشکرا کردنی هەموو وتەو قسەیەکی خراپ، بێجگە لەو وتەو قسەی خراپی کەسێك کە ستەمی لێ کرا بێت، ئینجا لە جاری دووەم دا بانگی بڕواداران ئەکات کە ڕادەو پلەی خۆیان بەرز بکەنەوە بە وتن و کردنی خێرو چاکە، وە بە لێ بوردن لە خراپەکار و ستەمکار کە دەسەڵات ببێ بەسەر تۆڵە لێ سەندنی، چونکە لێ بوردنی کاتی بێ دەسەڵاتی نرخی و لە ڕاستی دا لێ بوردن نی یە. ئینجا کاتێ پەیڕەوی ئەم دوو ئایەتە بکرێ، ئیتر خێرو چاکە بڵاو ئەبێتەوە لەناو گەلی موسڵمان دا، وە لێ بوردن ئەبێ بە باو لە ناویان دا، کە ئەوەش مایەی کامەرانی و بەختەوەری یە لە هەردوو جیهان دا.

إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤۡمِنُ بِبَعۡضٖ وَنَكۡفُرُ بِبَعۡضٖ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا

---

ئینجا ئەگەڕێتەوە سەر نامەدارەکان بە شێوەی گشتی، لە پاش دا ئەگوێزێتەوە بۆ سەر جوولەکە بە تایبەتی کە جوولەکە بە ئاشکرا درۆ و بوختانێکی زۆر زل ئەکەن دەربارەی مەریەم و عیسای کوڕی – سەلامی خوا لە هەردووکیان –، لەناو بەناوی باسی تاوان و خراپەکانیان دا، باسی ئەو درۆ و بوختانەیان لێ ئەگێڕێتەوە ئەوەش هۆی پەیوەستی یەکی بەهێزی باسەکەیانە بە باسی ئەم دوو ئایەتەی کە لە پێشیانەوە وتمان، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان نی یە بە خواو پێغەمبەرەکانی، واتە ئەو بیرو باوەڕەی کە هەیانە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بڕوایان نەبێ بە خواو پێغەمبەرەکانی، ئیتر با بە دەم لاف بڕوا لێ بدەن، نەك مەبەست ئەوەیە کە خۆیان بە بێ بڕوا دابنێن، بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ﴾ ئەیانەوێ جیاوازی بخەنە نێوان خواو پێغەمبەرەکانی لە بڕوا پێ هێنان دا، بەم ڕەنگە لاف بڕوا بە خوا لێ ئەدەن، بەلأم بڕوایان بە هێندێ لە پێغەمبەرەکان نی یە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُونَ نُؤۡمِنُ بِبَعۡضٖ وَنَكۡفُرُ بِبَعۡضٖ﴾ ئەڵێن: بڕوامان بە هێندێکیان هەیە، وە بێ بڕواین بە هێندێکی تریان، ئەوانەش کە بریتین لە جوولەکە و گاورەکان: ئەوەتا جوولەکە لاف بڕوا لێ ئەدەن بە پێغەمبەرەکانیان، کەچی بڕوایان بە عیسا و محمد نی یە، گاورەکانیش ئەڵێن: بڕوامان هەیە بە پێغەمبەران تا عیسا، بەلأم بڕوایان بە محمد(ﷺ) نی یە لەگەڵ ئەوەدا بڕوا نەهێنان بە هەرکام لە پێغەمبەرەکان بڕوا نەهێنانە بە خواو بە هەموو پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێ –، بەلأم ئەوان وا نازانن، ﴿وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا﴾ ئەیانەوێ لە نێوان ئەوەدا ڕێگەیەك بدەنە بەر کە میانە بێت لە نێوان بڕوا بە هەمووان، وە بێ بڕوایی بە هەمووان، بێگومان ئەو ڕێگە میانەی ئەوانە لە ڕاستی دا بێ بڕوایی تەواوە بە خوایش و بە هەموو پێغەمبەرەکانیشی وەك وتمان،

﴿١٥٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ حَقّٗاۚ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴿١٥١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَلَمۡ يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ أُوْلَٰٓئِكَ سَوۡفَ يُؤۡتِيهِمۡ أُجُورَهُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١٥٢﴾

---

**جا لەبەر ئەوە بەم جۆرە جاڕی بێ بڕوای یان لێ ئەدا: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ حَقّٗا﴾ ئەوانەی کە باس کران بە راستی هەر ئەوانە بێ بڕوای تەواون، ئەوانە نامەدار بوون و شارەزا، بێ بڕوایی یەکەیان لە نەزانی یەوە نەبوو، کەواتە ماڤ خۆیانە بەو جۆرە مۆری بێ بڕوایی یان بەسەردا بنرێ، داخ و دیاریی بکرێن بەو پیس ترین سیفەتە، بێگومان بڕوا بە تاك تەنیایی خوا داخوازە بۆ یەکێتی هەموو ئایین و پێغەمبەرەکان، وە بڕوا نەکردن بەو بڕوا نەکردنە بە تاك و تەنیایی خوا، کەواتە ئەوانە هەرچەند لاڤ بڕوا هێنان لێ بدەن لە راستی دا بڕوادار نین، ئەوەتا خوا بە بێ بڕوای دانان، ئەم هەڕەشە سامناکەیشی ئاراستە کردن: ﴿وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا﴾ ئامادەمان کردووە بۆ بێ بڕواکان – کە لێرەدا ئەوانەی کە باس کران یەکەم و سەردەستەن – سزایەکی ریسوا کەر و ئابڕووبەر، لە تۆڵەی ئەو بێ بڕوایی یەی کە کەشخەیان پێوە ئەکرد و لایان وابوو مایەی بەرزی و گەورەیی یانە، ئینجا بەرامبەر ئەوانە ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە بە خوا و بە فروستادەکانی ﴿وَلَمۡ يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ﴾ هیچ جیاوازی یەکیان نەئەخستە نێوان هیچ کام لەوانە لە بڕوا پێ هێنان دا ﴿أُوْلَٰٓئِكَ سَوۡفَ يُؤۡتِيهِمۡ أُجُورَهُمۡ﴾ ئەوانە بێگومان لە داهاتوودا ئەجرو پاداشتی خۆیانیان پێ ئەبەخشێ، ئەو ئەجرو پاداشتەی کە بەڵێنی پێ داوە ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾ خوا هەمیشە لێ بوردەی میهرەبانە، کەواتە ئەبورێ لە هەڵە و کەم و کوڕی یان و چاکەیان چەند قات ئەکاتەوە.**

**بۆچوون و بیرو باوەڕی ئیسلام لەسەر ئەوەیە کە خوایەکی تەنیا هەیە، یەك ئایینی داناوە بۆ هەموو بەندەکانی، یەك بەرنامەی داناوە بۆیان، هەموو پێغەمبەرو فروستادەکانی رەوانە کردووە بۆ سەریان بەو تەنیا ئایینە و بەو تەنیا بەرنامەیە، هەموو بڕوا داران یەك لەشکرو یەك کۆمەڵە و سەرکردەکانیان پێغەمبەرەکانە تا ئەگاتە دواترینی هەمووان و**

سەرکردەی هەمووان محمدی کوڕی عبدالله – سڵاوی خوا لە هەمووان بێت – کە خۆی جێگرو جێنشینی هەموانە، ئایینەکەیشی جێگرو جێنشینی هەموو ئەو ئایینانەیە کە لە لایەن خواوە هاتن بە بێ گۆڕین و دەست کاری کردن، هەرکام لەو ئایینانە هەرچەند لە بنەڕەت دا لای خواوە هاتبن وەك ئەو ئایینەی کە هاتە سەر موسا و عیسا – سەلامی خوایان لێ بێ –، لە پاش گۆڕاندن و دەست کاری کردن بە ئایینی خوا نەمانەوەو خوا نایەوێن و شوێن کەوتوانیان لای خوا بێ بڕوایە و بە خوا و بە پێغەمبەرانی خوا، وەك لەم ئایەتە و لە چەند ئایەتی تردا ئاماژەی بۆ کراوە.

لە پاش دامەزراندنی ئەو یاسا بنەڕەتی یە لەبارەی بۆچوونی ئیسلامی یەوە، سەبارەت بە بڕوا و بێ بڕوایی، لە پاش ئەوە ئینجا هێندێ لە هەڵوێستە ناڕاستەکانی جوولەکە ئەخاتە بەرچاو لەبارەی پێغەمبەرێتی و پێغەمبەرانەوە، وە لەبارەی دەربڕینی وتەو قسەی پیس و ناڕەوایانەوە، لەیەکەمجارەوە بێزاری دەرئەبڕێ لەهەڵوێستیان بەرامبەربە پێغەمبەرمان(ﷺ)، وە لاری و سەرکێشی یان لە داوا کردنی بەڵگە و نیشانە لەسەر پێغەمبەرێتی یەکەی، ئەم هەڵوێستەیان جووت ئەکات لەگەڵ هەڵوێستە خراپەکانیان لەگەڵ موسا پێغەمبەر، ئینجا لەگەڵ عیسا و دایکی – سەلامی خوا لە هەمووان بێت – کە سەرنج ئەدرێ و بیر ئەکرێتەوە دەرئەکەوێ کە جوولەکە یەك سروشتی هەیە بە درێژایی هەموو چینەکانی، جا بەو پێ یەش قورئان هەموو چینەکانیان وەك یەك سەیر ئەکات: چینی چەرخی موسا و چینی چەرخی عیسا و چینی چەرخی پێغەمبەرمان – سڵاوی خوا لە هەمووان بێت –، وتەو کردەوەی هەر چینێ بە وتەو کردەوەی هەموو چینەکان دائەنێ، وەك لە سورەتی(البقرة) دا دەست نیشانمان بۆ کرد لە چەند شوێنی تریش دا. بێگومان لە نیوە دورگەدا جوولەکە هەڵوێستی دوژمنایەتی ئاشکرای هەبوو بەرامبەر بە ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ)، بە هەمیشەیی نەوەستان لە هەموو جۆرە پیلان و خراپەکاری یەك کە لە دەستیان بهاتایە، وەك لە سورەتی دوو و سێ و چواردا چەند جۆر و نموونەیەکمان بیست، ئینجا ئەوا لێرەدا چەند جۆر و وێنەیەکی تریان باس ئەکات.

يَسْـَٔلُكَ أَهْلُ ٱلْكِتَـٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيْهِمْ كِتَـٰبًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۚ فَقَدْ سَأَلُوا۟ مُوسَىٰٓ أَكْبَرَ مِن ذَٰلِكَ فَقَالُوٓا۟ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّـٰعِقَةُ بِظُلْمِهِمْ ۚ

---

**ئەوانە لاری و سەرکێشی یان بەکار ئەهێنا، بەم ڕەنگە داوایان ئەکرد لە پێغەمبەر(ص) کە نامەو نووسراوێکیان لە ئاسمانەوە بۆ بێنێ کە خۆیان ببینن و دەستی لێ بدەن، وەك ئەفەرموێ: ﴿يَسْـَٔلُكَ أَهْلُ ٱلْكِتَـٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيْهِمْ كِتَـٰبًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۚ﴾ نامەدار – واتە جوولەکە – داوات لێ ئەکەن کە نامەو نووسراوێك لە ئاسمانەوە بێنیتە خوارەوە بۆ سەریان، بە وێنەی لەوحەکانی موسا کە بە نووسراویی و بە جارێ هات، یان نامەیەك کە نووسرابێ بە خەتێکی ئاسمانی، شایەتی بدات کە تۆ پێغەمبەری بۆ سەریان، یان نامەیەکی تایبەتی بەوانەوە، یان نامەیەك کە بە چاوی خۆیان ببینن کاتێ دێتە خوارەوە، بەهەرکام مەبەست بێت، ئەوا خوای میهرەبان لە باتی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) وەڵامیان ئەداتەوە، لاپەڕەیەك لە مێژوویان ئەگێڕێتەوە بەرامبەر پێغەمبەرەکانیان کە ڕزگاری کردن و لایشیان وابوو بڕوایان هەیە پێ ی، ئەفەرموێ: ﴿فَقَدْ سَأَلُوا۟ مُوسَىٰٓ أَكْبَرَ مِن ذَٰلِكَ﴾ واتەئەگەرتۆئەوداوای ئەوانەبەگەورەتەماشائەکەیت،هیچ گوێیان مەدەرێ وهیچ سەرت سووڕنەمێنێ لەوسەرکێشی وبڕوبیانووی ئەوانە،چونکەپێشووەکانیان داوای شتی گەورەتریان کرد لە موسا: ﴿فَقَالُوٓا۟ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهْرَةً﴾ بەم ڕەنگە وتیان بە موسا: خوامان نیشان بدە بە ئاشکرا تا بە چاو ببینین، ئەگەر ئەوە نەکەیت بڕوات پێ ناهێنین.**

**ئەو هەموو موعجیزە و بەڵگە ئاشکرایانەی کە خوا لەسەر دەستی موسادا ئاشکرای کردن ئەوانە دەم کوت نەکرد و لە بڕو بیانووی نەخستن، مل کەچی نەکردن و ئارامی ی نەدا بەدڵیان، تا ئەو داوا ناڕەوا و بێ جێ یەیان کرد، کە ئەو داوایە لە کەسێکەوە نایەت کە بڕوای ڕاستەقینەی تیا جێگیر بووبێ، یان ئامادەیی تیا بێت بۆ بڕوای ڕاستەقینە ﴿فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّـٰعِقَةُ بِظُلْمِهِمْ ۚ﴾ ئینجا تریشقەیەك لێ ی دان و گرتنی بەهۆی ستەم کردنی خۆیانەوە کە سەرکێشی یان کردو خۆیان بەرز کردەوە بۆ ڕادەو پلەی زۆر زیاد و بەرزتر کە ئەوان شیاو و شایستەی نەبوون، خوایشیان بە وێنەی کەسێکی وەك خۆیان سەیر ئەکرد. ئینجا لە سەر نزاو لالأنەوەی موسا(علیه السلام) لێ یان بورد، وەك لە سورەتی(الأعراف) دا باسی ئەکات.**

ثُمَّ ٱتَّخَذُواْ ٱلۡعِجۡلَ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ فَعَفَوۡنَا عَن ذَٰلِكَۚ وَءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينٗا ﴿١٥٣﴾ وَرَفَعۡنَا فَوۡقَهُمُ ٱلطُّورَ بِمِيثَٰقِهِمۡ وَقُلۡنَا لَهُمُ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدٗا وَقُلۡنَا لَهُمۡ لَا تَعۡدُواْ فِي ٱلسَّبۡتِ وَأَخَذۡنَا مِنۡهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظٗا ﴿١٥٤﴾

---

ئینجا باسی تاوانێكی تری گەورەیان ئەكات كە كردیان لە پێش ئەم داوا ناڕەوایەوە كە بریتی بوو لە پەرستنی ئەو گوێرەكەی كە(سامیری) بۆی داڕشتن لە خشڵەكانی ئافرەتە میسری یەكان كە لێ یان خواستن بە فێڵ كاتێ كە ویستیان لە میسر دەرچن، ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ٱتَّخَذُواْ ٱلۡعِجۡلَ﴾ ئەوانە ئەو گوێرەكەیان گێڕا بە پەرستراوی خۆیان و خۆیان بەند كرد بە دیاریی یەوە لەو ماوەیەدا كە موسا(علیه السلام) چوو بۆ شاخی(تور) بۆ موناجات كردن، لەو كاتەدا كە خوا بەڵێنی پێ دا، بۆ ئەوەی لەوحەكانی بۆ بنێرێ، وەك لە سورەتی تردا ئاماژەی بۆ ئەكات بە تایبەتی. ئەو گوێرەكەیان گێڕا بە پەرستراوی خۆیان ﴿مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ﴾ لە پاش ئەوەی چەند بەڵگە و موعجیزەی روون و ئاشكرایان بۆ هات كە یەكێ لەوانە ئەوە بوو بە چاوی خۆیان بینیان كە خوا دوازدە شەقامی فەراهەم هێنا لەو دەریادا كە ئەوانی لێ پەڕینەوە و فیرعەون و لەشكرەكەی تیا خنكاندن!! ئینجا لەگەڵ ئەو تاوانە گەورەدا خوا ئەفەرموێ: ﴿فَعَفَوۡنَا عَن ذَٰلِكَۚ﴾ ئینجا ئێمە بووردین لەو گوێرەكە پەرستی یە یان كاتێ كە تۆبەیان كرد لێ ی بەڕاستی وەك لە سورەتی(البقرة) دا باس كرا. بەڵام جوولەكە هەر جوولەكەیە و ئەبێ بە زۆر و كوتەك نەبێ چار ناكرێن: ﴿وَءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينٗا﴾ بەخشیمان بە موسا زۆر و دەسەڵاتێكی ئاشكرا بەسەریان دا، بە جۆرێ كە فەرمانی پێدان بە كوشتنی خۆیان مل پێچی یان پێ نەكرا، یان مەبەست بە زۆر و دەسەڵاتەكەی ئەو شەریعەتە بوو كە پێ ی درا، كە شەریعەتی خوا زۆر و دەسەڵاتێكی گەورەی هەیە بەسەر دڵ و دەروون دا، بە جۆرێك لە پەنهانی دا گوێ رایەڵی ئەكرێ، بەڵام بە پێچەوانەی قانوون و یاسای زەوی كە هیچ زۆر و دەسەڵاتێكی نی یە بەسەر دەروون دا، لە هەركاتێك دا مەردوم بۆی رێك كەوت دژو پێچەوانەی ئەو ئەجوولێنێتەوە.

ئەوانەی سەرپێچی یان ئەکرد لەوەی پەیمان بدەن بە رەفتار کردن و پەیڕەوی کردنی شەریعەتی تەورات و ئەوەی کە پێویست کرابوو لەو لەوحانەدا کە موسا(علیە السلام) بۆی هێنان، ئەوانە لە بێخ و پاینی شاخێك دا بوون، ئینجا خوا شاخەکەی هەڵکەند و بەرزی کردەوە بەسەریان دا، تا پەیمان بدەن، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَرَفَعۡنَا فَوۡقَهُمُ ٱلطُّورَ بِمِيثَٰقِهِمۡ﴾ بەرزمان کردەوە بەلای سەرویانەوە(طور) – ئیتر مەبەست بەشاخی(توری سینا) بێت، یان شاخێکی تر – بەهۆی پەیمان دانیانەوە، واتە بۆ ئەوەی پەیمان بدەن، ئەوانیش کە شاخەکەیان بەو جۆرە بینی ترسان لەوەی بیخا بەسەریان دا، لەبەر ئەوە لە ترسا ئەو پەیمانەی کە داوا کرا لێ یان دایان، وەکو لە دوایی ئایەتەکەدا ئەفەرموێ. بەشێ لەوەی کە داوا کرا پەیمانی لەسەر بدەن، ئەمە بوو کە بچنە ناو شاری قودس بە مل کەچی و سوژدە بردنەوەو رێزی رۆژی شەممە نەشێکنن، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَقُلۡنَا لَهُمُ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدٗا﴾ گوتمان پێ یان: بچنە قاپی قودسەوە بە مل کەچی و سوژدە بردنەوە، ﴿وَقُلۡنَا لَهُمۡ لَا تَعۡدُواْ فِي ٱلسَّبۡتِ﴾ پێمان گوتن: دەست درێژیی مەکەن و سنووری خوا مەشکێنن لە شەممەدا بە خەریك بوون بە کارو فرمانی دونیایی یەوە بە راو کردنی ماسی ﴿وَأَخَذۡنَا مِنۡهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظٗا﴾ وەرمان گرت لێ یان پەیمانێکی ئەستوور، واتە بەڵێن و پەیمانێکی دڵنیایی لەسەر کراو بە ئەوپەڕی دڵنیایی، بەڵێن و پەیمان بەوەی کە فەرمان بەری خوا بن و بە پێی تەورات رەفتار بکەن، سنوورەکانی خوا نەشکێنن، بێگومان یەکێ لەو شتانەی کە لە تەورات دا هاتووەو فەرمانی پێ دراوە موژدە دانە بە هاتنی عیسا و محمد – سەلامی خوایان لێ بێت – وە بڕوا پێ هێنانیان. ئەوەش هەیە تا ئێستاش لە فەسڵی ٢٩ تا ٣٣ لە(سفر التکوین) کە دواترین تەوراتێکە کە بە دەست جوولەکەوە ماوەتەوەو هەیە. بەڵام پاش ئەو پەیمانە چی یان کرد؟ هەر بە نەمانی ترس و بیم دەستیان کرد بە هەڵوەشاندنەوەی ئەو بەڵێن و پەیمانە بەهێزە بەند بە بەندی، بێ بڕوا بوون بە ئایەتەکانی خوا، پێغەمبەرانیان بە ناهەق و ناڕەوا کوشت، سەرپێچی و سەرکێشی خۆیان دەربڕی بە بێ پێچ و پەنا، بەم رەنگە گوتیان: دڵی ئێمە هیچ ئامۆژگاری یەك وەرناگرێ، هیچ قسەیەکی تێ ناچێ چونکە قفڵ دراوە لە ئاستی هەر قسەیەك! چەند کردار و کردەوەی خراپی تریان کرد کە خوا باسی فەرموو لەم ئایەتانەدا کە دێن. لە چەند ئایەتێکی تر لە سورەتەکانی تردا،

فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ وَكُفْرِهِم بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَقَتْلِهِمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥٥﴾ وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَٰنًا عَظِيمًا ﴿١٥٦﴾ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ

---

**ئەفـەرموێ: ﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ﴾ ئینجا بـەھۆی ھەڵوەشـاندنەوەیان بـۆ پەیمانەکـەیان ﴿وَكُفْرِهِم بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ بەھۆی بڕوا نەھێنانیان بە ئایەتەکانی خوا – واتە قورئان –، یان بەوەی کە لە نامەکەی خۆیان دا ھاتبوو ﴿وَقَتْلِهِمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ﴾ بەھۆی کوشتنیان بۆ پێغەمبەران بە ناھەق، وەك(زەکەریا و یەحیا) ﴿وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌ﴾ بەھۆی وتەکەیان کە ئەیان وت: دڵەکانی ئێمە داپۆشراوە بە چەند پەردەیەکی سروشتی، یان مەبەستیان ئەوە بوو: دڵەکانیان جێگەی زانین و ناسینی ھەموو شتێکە و پڕە لەوە، کەواتە جێگەی ھیچی تری تیا نابێتەوە. ئەم وتە بەدەیان ئاراستەی پێغەمبەر کرد(ﷺ) کاتێ کە بانگی ئەکردن بۆ بڕواھێنان، مەبەستیان نائومێد کردنی بوو، یان مەبەستیان لاقرتی کردن بوو پێی، کەشخەیان ئەکرد بە بێ بڕوایی یەکـەیان، یـان ھـەردووکیان مەبەسـت بـوو! لەسـەر ھـەر بـار و مەبەسـت قورئـان لێرەدا بـە تێھـەڵکێش بەرپەرچی وتەکـەیان ئەداتـەوە و دەم کوتیـان ئـەکات و بـە درۆیـان ئەخاتـەوە، ئەفەرموێ: ﴿بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا﴾ نەخێر بەو جۆرە نی یە کە ئەوانە ئەڵێن، بەڵکو خوا مۆری ناوە بەسەریان دا، شێوەو نەخشەیەکی تایبەتی کێشاوە بەسەریان دا، وەك پارەو سکەیەکی لێ دراو ئیتر ھیچی تر ھەڵناگرن، ئیتر مەبەست بەو مۆرو نەخشەیە یارمەتی و تۆفیق نەدان بێت بۆ بیر کردنەوە لە ئایەت و بەڵگەکان و گوێ گرتن لـە تـەمێ و ئامۆژگاری یەکان، وەك زۆر لە زانایـان ئەفـەرمون. یـان مەبەسـت مـۆر کـردن و نەخـشە کێـشانێکی راسـتەقینە بێـت، وەك ھێنـدێك ئەفـەرمون و بەڵگەشـیان حەدیـسێکە کە(ئیبن و عومـەر) – خوایـان لـێ رازی بێـت – ئەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، ھەرکام مەبەست زۆر پێ ھێنان و ناچار کردنی ئەو دڵنە نی یە لەسەر بڕوا نەھێنان، بەڵکو مەبەست ئەوەیە خوا ئەوەیان بەسـەر ئەھێنێ ﴿بِكُفْرِهِمْ﴾ بەھۆی بێ بڕوایی خۆیانەوە، واتـە ئەوانە خوا زانین و دەسـەڵات و خواھیشی پـێ داون بۆ ئەوەی کام بار بگرن و کام رێگە بدەنە بەر، ئەوانیش بە زانین و دەسەڵات و مەیلی خۆیان بێ بڕوایی یان ھەڵبژارد و دایانە بەرو دانیان بەسەردا گرت، ئینجا خوایش بە پـێی کردەوە و**

ئارەزووی خۆیانی لەگەڵ کردن ﴿فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ کەواتە بڕوا ناهێنن مەگەر کەمێك لەوان، وەك(عبدالله ی کوڕی سەلام) و وێنەکانی کە ئەوانە بە مەیل و ئارەزووی خۆیان دڵیان کردەوە بۆ هەق و راستی، ئینجا خوایش یارمەتی دان و رێنموونی کردن و خستنیە سەر رێ راستەکەی خۆی و بڕوای دروست کرد تیایان دا.

دوای تێهەڵکێشەکە ئینجا ئەگەڕێتەوە سەر تاوانەکانی تریان، ئەفەرموێ: ﴿وَبِكُفْرِهِمْ﴾ بەهۆی بڕوا نەهێنانیان ﴿وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَانًا عَظِيمًا﴾ گوتن و دەست هەڵبەستیان بۆ بوختانێکی زۆر گەورەو داسەپاندنی بەسەر مەریەم دا، بوختانی زینا و داوێن پیسی لەگەڵ یوسفی نجار. – سەد جار نەفرینی خوایان لێ بێ – چۆن زاتیان بوو قسەی وا بکەن دەربارەی ئەو داکە داوێن پاکە، کە خوا بە چەند بەڵگەو نیشانەی ئاشکرا پاکی یەکەی ئاشکرا کرد!! ﴿وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللَّهِ﴾ بەهۆی ئەوەی کە گوتیان بێگومان ئێمە مەسیحمان کوشت عیسای کوڕی مەریەم.

ئەو نەفرین لێ کراوانە زۆر بە کەشخە و شانازی یەوە لاف ئەو تاوانە زۆر گەورەیان لێ ئەدا کە بە راستی مافی ئەوەی هەیە هەر بە بیر لێ کردنەوەشی تیکە لە گەروودا بوەستێ! ئینجا لەگەڵ ئەوەدا بە لاقرتی کردنەوە ئەیانگوت:(رسول الله) کە پێغەمبەری خوایە. لاقرتی یان ئەکرد بە پێغەمبەرێتی یەکەی، لەگەڵ ئەو هەموو موعجیزە گەورە گەورانەی کە خوا لەسەر دەستی دا دەری خستن کە بەڕاستی تەنیا یەکێ لەو موعجیزانە بەس بوو بۆ بڕوا پێ هێنانی لەلایەن هەر کەسێکەوە کە بە تەواوی بێ بەش نەبووبێ لە هەموو خێرو پیت و فەڕێك، خوای گەورە ئەو هەموو تاوانە گەورە گەورانەی لەسەر بار کردن و کردنی بەهۆی ئەو هەموو بەسەرهات و رووداوە سەختانەی کە بەسەری هێنان لە جیهان دا کە بەسەر هیچ گەل و کۆمەڵێکی تردا نەهاتووە، خوای گەورە لە تۆڵەی ئەو تاوانانەدا پێش مردن و هاتنی رۆژی دوایی و سزادانیان بە ئاگر، پێش ئەوە هەر لە جیهان دا خەشمی خۆی رشت بەسەریان دا، نەفرینی لێ کردن، پادشایەتی و دەسەڵاتی لێ سەندنەوە و ریسوا و ژێر دەستی کردن، سەربەخۆیی و ئازادیی لێ سەندنەوە، دەستەیەکی لێ کردن بە مەیمون و بەراز وەك لە قورئانەکەی دا باسی فەرموو جاڕی ئەوانەی لێ دان. هەرچۆنێ لە وتەکەیان دا کە گوتیان دڵەکانمان لەناو چەند پەردەیەك دایە، خوا بە درۆی خستنەوە و دەم کوتی کردن بەو جۆرەی کە تێپەڕی کرد،

وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٥٨﴾ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ

---

هەروەها لێرەیش دا ئەفەرموێ: ﴿وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ﴾ واتە ئەوانە بە کەشخە و شانازی یەوە ئەو لافەیان لێ دا کە لە کاتێك دا نە عیسایان کوشت، وە نە هەڵیان واسی. ﴿وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ﴾ واتە بەڵکو وێنەی عیسایان نیشان درا. یان لێ یان شێوێنرا و خرانە گومان و دوو دڵی یەوە، بەم رەنگە خوا وێنەو شێوەی عیسای هێنا بەسەر یەکێکی تردا و ئەو کوژرا لەباتی عیسا، ئیتر ئەو کەسە ناپاکێك بووبێ کە ویستی عیسا بدۆزێتەوە بۆ جوولەکەکان، ئینجا کاتێ چووە هۆدەکەی وێنەی عیسای بەسەردا کێشرا، یان یەکێ بێت لە هاوەڵەکانی و خۆی کرد بە فیدایی و رازی بوو بەوەی خوا وێنەی ئەوی بەسەردا بێنێ و بکوژرێ لەباتی ئەو، یان یەکێ بووبێ لەو جوولەکانەی کە نیازی کوشتنی عیسایان کرد، وە ئەو یەکە چووە هۆدەکەی عیسا و عیسای دەست نەکەوت، لە پاشان کە هاتە دەرەوە خوا شێوەی عیسای بەسەردا کێشا و ئەویان کوشت لە باتی عیسا، بەم چەند جۆرە ریوایەت هاتووە، بەهەرحاڵ و لەسەر هەربار مەسەلەی کوشتنی حەزرەتی عیسا(علیه السلام) جوولەکەو گاور بە ئارەزوو کاری قسەی تیا ئەکەن و هەرکام شتێ ئەڵێ. جوولەکە ئەڵێن: ئێمە کوشتمان بەو جۆرەی کە قورئان گێڕایەوە لێ یانەوە، گاورەکانیش ئەڵێن: کوژرا و نێژرا و لە پاش سێ رۆژ هەڵسایەوە و زیندوو بوویەوە، هیچ کام لەمان و لەوان بە بڕواوە ناڵێن و دڵنیا نین لەسەر قسەی خۆیان، ئینجا لەبەر ئەوەی رووداوی زۆر بووە لەو چەرخەدا، ریوایەتی زۆر و دژی یەکتر هاتوون، لەبەر ئەوە با پشت نەبەسترێ بە هیچ کام، بەڵکو بە تەنها قورئان بگیرێ بە دەستەوە بە بێ زیاد و کەم.

ئەو چوار ئینجیلەی کە بەناوبانگن لە ناو گاورەکان دا:(یوحنا، لوقا، متێ، مرقس) کە باسی ئەم مەسەلەیە ئەکەن، هەموویان نووسراونەتەوە لە پاش ماوەیەکی زۆر لە پاش بەرز بوونەوەی حەزرەتی عیسا، بێجگە لەم چوارە چەند ئینجیلێکی تریش نووسرانەوە، بەڵام ئەو چوارە هەڵبژێرراوە بەلایانەوە، هەڵبژێرران لە نزیکی دوا هاتنی چەرخی دووەمی پێش

زاییني دا، کران بە رەسمی. یەکیٚ لەو ئینجیلانەی کە لەو چەرخانەدا نووسراوەتەوە ئینجیلی(بەرنابا) یە کە ئەم بە جۆرێکی تر ئەو مەسەلەیە باس ئەکات، ئەڵیٚ: کاتیٚ کە سوپای جوولەکە کە لەگەڵ(یهوذا) دا بوون نزیك کەوتنەوە لەو شوێنەی کە عیسای تیا بوو، عیسا دەنگی کۆمەڵێکی نزیکی بیست، لەبەر ئەوە بە ترسەوە لەو شوێنە هەڵسا و چووەوە بۆ ماڵەوە، ئەو یازدە کەسەی کە لەگەڵی بوون خەوتبوون، ئینجا کاتیٚ خوا بینی بەندەکەی لە مەترسی و خەتەردایە، فەرمانی دا بە جوبرەئیل و میخائیل و رەفائیل و ئولیٚر، کە سەفیر و نێرراوی خوا بوون کە عیسا وەرگرن لەم جیهانە، ئینجا ئەوانیش وەریان گرت و هەڵیان و لە ئاسمانی سیٚ یەم دایان نا، بە هاوریٚ ی ئەو فریشتانەی کە خوا پەرستی ئەکەن هەتا هەتایە، ئینجا(یهوذا) بە توندی چووە ناو ئەو هۆدەی کە عیسای لیٚ بەرز کرایەوە، وە قوتابی یەکانی عیسا هەموو خەوتبوون، ئینجا خوا کارێکی زۆر نایابی کرد، بەم رەنگە(یهوذا) لە دەنگ و قسە و رووخساردا وەك عیسای لیٚ هات و بوو بە وێنەی ئەو... هتد، ئەمە رای ئینجیلی(بەرنابا) یە وەك(شێخ محمد ئەبو زەهرە) لە کتێبی خۆی دا:(محاضرات في النصرانية) باسی کردووە.

ئا بەو جۆرە ئەم را جیاوازانە هاتوون و هیچ کەس دڵنیا نی یە لە هیچ کام لەوانە و لە هیچ ریوایەتێکی تر کە هاتووە لە بارەی ئەو رووداوەی کە بەدی هاتووە لە تاریکی شەودا و پێش رۆژ بوونەوە، هەروەها خاوەن راو ریوایەتەکانیش دڵنیا نین و دوو دڵن، وەك ئەفەرمویٚ: ﴿وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ﴾ بێگومان ئەوانەی کە دووبەرەکی یان کرد لەکاری عیسادا لە گومان و دوو دڵی دا دان لە کوشتنەکەی دا، ئیتر مەبەست بەوانە هەر مەسیحی یەکان بێت کە بوون بە سیٚ تاقم، یان مەبەست هەر جوولەکان بێت کە دووبەرەکی بوون لەو کوژراوەدا، یان هەردوو مەبەست بێت، بە هەرکام مەبەست بێت ﴿مَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ﴾ نی یە بۆیان هیچ زانین و ئاگاداری یەك بە کوشتنەکەی ﴿إِلَّا اتِّبَاعَ الظَّنِّ﴾ بەڵام هەر شوێنی گومان کەوتوون، ﴿وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا﴾ واتە ئەو نەکوشتنە شتێکی راستە و جیٚی گومان نی یە، یان نەیان کوشتووە لە کاتێك دا کە خۆیشیان دڵنیا نین لە کوشتنەکەی وەك بە دەم لاف کوشتن و دڵنیایی ئەدەن ﴿بَل رَّفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ﴾ بەڵکو خوا بەرزی کردەوە بۆلای خوا، واتە بۆلای شوێنیٚ کە شوێنی هەر گویٚ رایەڵی و رەزامەندی خوایە، یان بۆ ئاسمان کە بێجگە لە خوا هیچ کەسێکی تر خاوەنێتی و دەسەڵاتێکی تیا نی یە، نەك وەك زەوی کە شوێنی خەشم و

سەركێشی یە، وە خوا خاوەنێتی و هێندی دەسەلاتی داوە بە بەندەكانی تیای دا، هەرچەند قورئان بە درێژیی باسی ئەو بەرز كردنەوەی نەكردووە، روونی نەكردووەتەوە ئایا بە لەش و بە گیان بووبیٚ یان هەر بەگیان و هەر چەند شتەكە ئاوا دیاریی نەكراوە، بەلاّم لە حەدیسی صحیح دا هاتووە كە حەزرەتی عیسا(علیه السلام) لە ئاسمانەوە دیٚتە خوارەوە لە نزیكی دوا هاتنی ئەم جیهانەدا، ئەبیٚ بە حەكەمێكی دادپەروەر و رازی نابیٚ و ماوەی هیچ كەسێك نادا كە هیچ ئایینێكی تر بگرێتە گەردن بێجگە لەم ئایینی ئیسلامە، لە حەدیسێكی تردا ئەفەرمویٚ: كە عیسا ئەمریٚ و لە هۆدەكەی پێغەمبەردا ئەنێژریٚ، یان لە(بیت المقدس) دا. بەپیٚی ئەم ریوایەتانە ئەبیٚ بە لەش و بە گیان لە ئاسمان بێت تا كاتی هاتنە خوارەوەی، وە بۆ خوا ئەوە هیچی تیٚ ناچیٚ و نابیٚ هیچ كەسێك سەر بكاتەوە لەو جۆرە شتانە ئەگەر لە حەدیس دا هاتبن، چونكە خوا زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا، ئەو مانەوەی بە زیندوویی و هاتنە خوارەوەی هیچ سەیر تر نی یە لەوەی كە بە بیٚ باوك بەخشی بە مەریەمی دایكی!

﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا﴾ خوا هەمیشە زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا و هەرچی ویست ئەبیٚ ببیٚ، ﴿حَكِيمًا﴾ كار دروست و لێزانە لە هەموو كارو كردەوەو بریارەكانی دا، لە پاش ئەوەی ئەو وتارو كردەوە خراپ و بۆگەنانەی جوولەكەی باس فەرمو، روونی كردەوە كە ئەو جوولەكانە نیازی كوشتنی حەزرەتی عیسایان كرد و بەلاّم خوا نەیهێشت ئەو نیازو ئاواتە بەدەی ئەوان بەدی بێت، پایەو پلەی بەرزی تایبەتی دا بە عیسا(علیه السلام).

لەپاش ئەوە ئینجا باسی ئەوە ئەكات كە هەموو نامەدارەكان بە جوولەكە و گاورەوە پێش مردنیان و لەكاتی گیان كێشانیان دا، بڕوا ئەهێنن بە عیسا، بڕوای راستەقینە بەو شێوەی كە لە قورئان دا هاتووەو موسڵمانان بڕوایان هەیە پیٚی، بێگومان ئەو بڕوایەی كە ئەیهێنن لەو كاتی مردنەدا وەرناگیریٚ و سوودی نابیٚ بۆیان، كەواتە با فریای خۆیان بكەون پێش ئەو كاتە بڕوا بێنن، تا لیٚ یان وەرگیریٚ و بەهرەمەند ببن، ئەفەرمویٚ: ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ﴾ هیچ كەسێك نی یە لە نامەدارەكان مەگەر سوێند بە خوا بڕوا ئەهێنیٚ پیٚی – واتە بە عیسا – پێش مردنی ئەو نامەدارە، واتە جوولەكە كە چەندە دوژمن و بیٚ بڕوان، وە گاور كە بڕوایەكی لارو نالەباریان هەیە پیٚی – ئەوەتا بە خوا یان بە كوڕی خوای دائەنێن – هیچ كەس نی یە لەوانە كە لە كاتی مردنی دا بڕوای راست و رێك نەهێنیٚ بە عیسا، چونكە لەو كاتەدا هەق و ناهەق دەرئەكەویٚ، كەواتە بە ناچاری بڕوا ئەهێنن و بیٚ ئەوەی سوودی لیٚ وەرگرن.(ئیبن و المنذر) لە(ئیبن و عەباس) ەوە – خوایان لیٚ رازی بێت –

ئەگێڕێتەوە کە ئەم ئایەتەی بەو جۆرە تەفسیر کردووەتەوە، ئینجا پێی گوترا: ئەگەر لە بانێکی بەرز بکەوێتەوە خوارەوە چۆن بڕوا ئەهێنێ؟ ئەویش وتی: هەر بە حەواوە بڕوا ئەهێنێ و ئەیلێ، وتیان ئەگەر درا لە گەردنی؟ ئەویش گوتی لەو کاتەش دا هەر زبانی ئەجولێ پێی، هەروەها ئەگێڕێتەوە لە(شهری کوڕی حوشی) بەوە کە ئەلێ:(حجاج) پێی وتم: ئەم ئایەتە هەرجارێ ئەیخوێنم لەدڵم دا گرێ یەك هەیە، چونکە جاری وا هەیە من ئەدەم لە گەردنی جوولەکە و ئەو بڕوا هێنانەی لێ نابینم، منیش گوتم: کاتێ جوولەکە کەوتە مردن مەلائیکە لە بەرو لە دواوە لێ ی ئەدەن و ئەڵێن: ئەی دوژمنی خوا عیسا هات بۆلات بە پێغەمبەری و تۆش بڕوات نەهێنا، ئینجا ئەویش ئەلێ: ئەوا بڕوام هێنا کە بەندەو پێغەمبەری خوایە، ئەڵێن بە مەسیحی: ئەی دوژمنی خوا عیسا هات بۆت بە پێغەمبەریی و بە پێغەمبەرێتی، کەچی تۆ گوتت: عیسا خوا یان کوڕی خوایە، ئەویش ئەلێ: بڕوام هێنا کە بەندەی خوایە، کەواتە هەموو نامەدارەکان لە کاتی مردنیان دا بڕوای ڕێك و ڕاست ئەهێنن، بەڵام لە کاتێك دا کە هیچ سوودی نابێ بۆیان، ئینجا ڕاست بوویەوەو دانیشت و گوتی: ئەمەت لە کێ وەرگرت؟ منیش گوتم: لە محمدی کوڕی علی کوڕی حنفیە، ئەویش سەری داخست و لە پاش دا گوتی: لە سەرچاوەی ساف و خاوێنەوە وەرت گرتووە.

هێندێ لە زانایانی تەفسیر ئەفەرمون: مەبەست پێش مردنی عیسایە لە پاش هاتنە خوارەوەی: واتە لە پاش هاتنە خوارەوەی هیچ کەسێك لە نامەداری ئەو چەرخە نی یە کە بڕوا نەهێنێ بە عیسا پێش ئەوەی عیسا لە دنیا دەرچێ، هەموو ئایینەکان ئەبنەوە بە یەك و شوێنی ئەم دواترین شەریعەتە ئەکەون کە پێغەمبەرمان هێنای – سەلامی خوا لە هەموو پێغەمبەران بێت – بەڵام ئەم ڕایە و ئەم تەفسیرە بەهێز نی یە لەبەر سێ شت:

١- ئەبێ ئەم ئایەتە – کە ڕواڵەت ڕووکەشەکەی گشتی یە بۆ هەموو نامەدار – تایبەتی بکەین بە نامەدارەکانی پاش هاتنە خوارەوەی حەزرەتی عیسا(علیە السلام)، بێگومان بە بێ بەڵگە هیچ گشتی یەك تایبەتی ناکرێ.

٢- (ئوبەی) ئەم ئایەتەی بەم جۆرە خوێندووەتەوە: ﴿لیؤمنون بە قبل موتهم﴾ ئەو کاتە نابێ بەم جۆرە تەفسیر بکرێتەوە، بەڵکو ئەبێ هەر بە جۆری یەکەم تەفسیر بکرێتەوە، چونکە ﴿هم﴾ ڕاناوی کۆیە و هەر بۆ نامەدارەکان دەست ئەدا لێرەدا.

٣- (ئیبن و عەباس) و کۆمەڵ و جەماوەری یەکەم تەفسیری ئەکەنەوە، وە چەند ریوایەتێکیش هاتووە پێی.

وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا ﴿١٥٩﴾ فَبِظُلۡمٖ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتۡ لَهُمۡ وَبِصَدِّهِمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرٗا ﴿١٦٠﴾ وَأَخۡذِهِمُ ٱلرِّبَوٰاْ وَقَدۡ نُهُواْ عَنۡهُ وَأَكۡلِهِمۡ أَمۡوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡبَٰطِلِۚ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ مِنۡهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴿١٦١﴾

---

﴿وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا﴾ لەرۆژی دواییداعیسائەبێ بەشایەت بەسەرنامەدارەکانەوە، کەواتە شایەتی ئەدات لەسەر جوولەکە بە بڕوا نەهێنانیان پێی، شایەتی ئەدا لە گاورەکانیش بەمەی کە لە پاش خۆی ئایینەکەیان تێك دا و لایان دا لە ڕێی خوا و خۆیان بەرز کردەوە بۆ پلەی خوایەتی.

لەبارەی بیرو باوەڕی گاورەکان بە کوشتن و لە سێدارە دانی حەزرەتی عیسا، وە دووبەرەکی یان لەوەدا، لە بارەی ناڕاستی و ناڕەوایی ئەو بیرو باوەڕە و بە درۆ خستنەوە بە چەند رابەرو بەڵگەیەك، وە بە روون کردنەوەی چەند رەخنەیەکی بەهێز کە روو ئەکەنە ئەو بیرو باوەڕە لەبارەی دەم کوت کردن و وەڵام دانەوەی گاورەکان لە چەند لاف و وتەیەك کە کردوویانە بەڵگە لەسەر راستی ئەو باوەڕە پڕوپووچەیانەوە. لەبارەی ئەوانەی کە باس کران و چەند شتێکی تری گرنگەوە خاوەنی تەفسیری(منار) خوای لێ خۆش بێ و پاداشتی بداتەوە، زۆر بە درێژیی و بە وردی دواوە لەو تەفسیرەدا، هەرکەس ئەیەوێ با تەماشای تەفسیری ناوبراو بکات لەسەر ئەم ئایەتەی کە تێپەڕی کرد. بەڕاستی ئاگاداری بەسەری دا زۆر خۆشە و لەبەر زۆر درێژیی من هیچم لێ نەهێنا، بەلامەوە وابوو لێرەدا ئایەتەکان و ئەو ئەندازە تەفسیرەیان بەسە، کاتێ ئەم قورئانە هەر قسە و بڕیارێکی دا ئیتر گوێ نەدرێ و نەگیرێ لە هیچی تر، کەواتە لە پاش ئەو بڕیارەی کە دەری کرد لە بارەی حەزرەتی عیساوە، ئیتر هەر کەسێکی تر هەر قسەیەکی تر بکات خۆی بێ ئابڕوو ئەکات و تا ئەم قورئانە گەورەیە وەستا بێ هیچ ژیرێك لا ناکاتەوە بەلای هیچ قسەیەکی تردا.

لەپێشەوە گوتمان: خوای تۆڵە سێن ئەو هەموو تاوانە گەورە گەورانەی لەسەر جوولەکەکان بار کرد، ئەو تاوانانە هۆی ئەو هەموو بەسەر هاتە سەختانە بوون لە جیهان دا

پـێش سـزای دۆزەخ لـە ڕۆژی دوایـی دا، ئـیتر لێـرەدا ئەگەڕێـتـەوە سـەریان و باسـی چـەند تاوانێکی تریان ئەکات لەگەڵ تۆڵەکانیان دا ئەفەرموێ: ﴿فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا﴾ ئینجا بەهۆی ستەمێکی گەورە لەلایەن ئەوانەی کە تۆبەیان کرد لە پەرستنی گوێرەکە ﴿حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَٰتٍ﴾ قەدەغەیان کرد لەسەریان چەند خۆراکێکی پاك و خاوێن و حەڵاڵ کە ﴿أُحِلَّتْ لَهُمْ﴾ حـەڵاڵ کـرا بوون بۆیان و بۆ مەردومانی تریش لە پێش ئەوانەوە.

ئـەو خۆراکە پاکانـە دەست نیـشانمان بـۆ کـردن لـە ئایـەتی(٩٣) ی سـورەتی(آل عمـران) هێندێ ئەفەرمون ئەوانەی کە لـە سورەتی(الأنعام) دا باسیان دێت لـە ئایـەتی ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُوا حَرَّمْنَا كُلَّ ذِى ظُفُرٍ﴾، ئەوانـە هـەرکاتێ تـاوان و خراپەیـەکیان ئـەکرد خـوا لـە تۆڵـەدا جۆرێکی لەسەر قەدەغە ئەکردن کە لەوەو پێش حەڵاڵ بووە بۆ خۆیـان و بۆ پێشووەکانیان، لەگـەڵ ئـەوەدا درۆیـان هەڵئەبەسـت بـە دەم خـواوە و ئـەیانگوت: ئێمـە یەکـەم کـەس نـین کـە قەدەغە کرابێ لێمان، بەڵکو ئەمە هەر قەدەغە بووە لەسەر(نوح و ئیبراهیم) و پاش ئەوان هەتا گەیشتە ئێمە.

﴿وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرًا﴾ هەر بەهۆی بەرگری کردنیان لـە ڕێی خوا، بـەرگری کردنـی زۆر، یان بەرگری مـەردومی زۆر، ﴿وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰا﴾ بـەهۆی وەرگرتنیـان بـۆ سـوو ﴿وَقَدْ نُهُوا عَنْهُ﴾ کـە جڵـەوگیریی کرابـوون لـێ ی، ﴿وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ﴾ بـەهۆی خواردنیـان بـۆ سـامان و ماڵەکانی مـەردومان بە ناهـەق و بـە بەتاڵ، وەك بـەرتیل و هـەر جۆرێکی تر کە قەدەغەیـە لـە شـەریعەتی خـوادا. ﴿وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ ئامادەمـان کـردووە بـۆ بـێ بڕواکانیـان، واتە: ئەوانەیان کە سوور و بەردەوام بوون لەسەر بێ بڕوایی، نەك ئەوانەیان کە تۆبەیان کرد و کۆتایی یان هێنا، ئامادەمان کردووە بۆ ئەوانەیان سزایەکی سەختی ئازار دەر کە لە ڕۆژی دوایی دا ئەیچەژن، وەك لە جیهان دا سزای ئەو قەدەغانەیان چەشت. بە پـێ ی تەفسیرەکە – وەك بە ڕوونـی گوتمـان – تۆڵـەی تاوانـەکانی رابردوو کـە دەسـتی پـێ کـردن لـە ﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ﴾ ەوە تا ئەگاتە ئایەتەکەی ئێـرە: ﴿فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا﴾ تۆڵـەی ئـەو تاوانانـە قورئـان لێرەدا باسی نەکردووە، ئێمە لە تەفسیرەکەدا باسمان کرد، ئـەم تۆڵـەی کە لێـرەدا باس کـرا هــەر لەســەر ئــەم چـوار تاوانانــەی ئێـرە بـوون، وە ئەمــە ڕای زۆربــەی زانایــانی تەفسیرە،

کۆمەڵێکی تر لەسەر ئەوەن کە ئەم تۆڵەی ئێرە کە لە جیهان دا بریتی بوو لە قەدەغە کردنی ئەو خۆراکانەی کە لە پێشەوە حەڵاڵ بوون بۆیان، سزای سەخت لە رۆژی دوایی دا، بەڵام بەڕاستی دڵ بەوە بە ئارامترە کە کردمان بە تەفسیر و رای زۆربەشی لەسەرە، لەبەر دوو شت:

یەکەم: ئەوهەمووتاوانەگەورە گەورانە نابێ تۆڵەی جیهانیان هەر ئەو قەدەغە کردنە بێت.

دووەم: لە شوێنەکانی تردا چەند بەسەرهات و رووداوی تری کردووە بە تۆڵەی جیهانی ئەو تاوانانەی تریان، وەك لە پێشەوە باسمان کرد. ئا بەو جۆرو شێوەیە قورئان سروشتی پیسی جوولەکە و مێژووی پڕ لە تاوان و خراپەکاریی دەرخستن، وە بێ ئابرووی کردن، بە باشی ناساندنی بە موسڵمانەکان، تێی گەیاندن کە ئەوانە هەمیشە دوژمنی حەق و حەق ناسانن، دژی رێنموونی و راستی و هەڵگرانی راستی و رێنموونین. بێگومان ئەو دەرخستن و رێنموونی یە تەنها بۆ یەکەم چینی موسڵمانان نەبووە لە مەدینەی پیرۆزدا، بەڵکو بۆ هەموو چینەکانی موسڵمانانی ئەم ئوممەتەیە لە هەموو چەرخ و وڵاتێك دا، چونکە ئەم قورئانە نامەی ئەم ئوممەتەیە تا ماوە لە جیهان، کەواتە هەرکاتێ ئەم ئوممەتە پرس بکات بە قورئانەکەی هەموو شتێکی پێویستی بۆ روون ئەکاتەوە، دۆست و دوژمنی بۆ دیاریی و جوێ ئەکاتەوە، هەرکاتێ ئامۆژگاریی لێ داوا بکات ئامۆژگاریی ئەکات و ئەیخاتە سەر رێگەی راست، وەك بۆ یەکەم چینی کرد، ئوممەت لەسەر ئەو بارە راستە بوو پیلانی جوولەکە و هیچ دوژمنێکی تر کاری لێ نەکرد، بەڵکو هەموو بە ناچاریی مل کەچ و ژێر بار و دەستە پاچە بوون بۆ ئوممەتی قورئان.. ئینجا کاتێ وازی هێنا لە قورئانەکەی جوولەکە و دوژمنەکانی زاڵ بوون و کارەکە بە پێچەوانە وەرگەڕا، وەك بە چاو ئەبینرێ، هەتا بەم جۆرە پشت بکاتە قورئانەکەی هەروا ئەبێ و لە ژێر پیلان و چەپووکەی دوژمن دا ئەبێ.. بێگومان هەموو جوولەکەکان لەسەر یەك بار نەبوون، بەڵکو کەمێکیان سروشتێکی پاکیان بوو، وەك ئەوانی تریان دڵنەخۆش و دەردەدار نەبوون، لەبەر ئەوە جوێ بوونەوە لەوانی تر و هاتنە ریزی موسڵمانان بەرێکی، جا لەبەر ئەوە قورئانیش ئەوانی جوێ کردەوەو جاڕی پاکی و رێکیدان وجوێی کردنەوە لەو هەڕەشە سامناکەی کە ئاراستەی ناپاك و بێ بڕواکانی کردن،

﴿لَّٰكِنِ ٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ مِنۡهُمۡ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَۚ وَٱلۡمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَۚ وَٱلۡمُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ أُوْلَٰٓئِكَ سَنُؤۡتِيهِمۡ أَجۡرًا عَظِيمًا ١٦٢﴾

---

فەرموی: ﴿لَّٰكِنِ ٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ مِنۡهُمۡ﴾ بەلاَم ئەوانەی کە دامەزراو بوون لە زانین دا لە یەهود وەك(عبدالله ی کوڕی سەلام و وێنەکانی)، باش لە ئاین تێگەیشتوون و ئایینەکەیان بە بەڵگە و نیشانەوە وەرگرتبوو، نە بە گومان و شوێن کەوتنی رووت ﴿وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾ بڕوادارەکان لەوان یان لەم ئوممەتە ﴿يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ﴾ بڕوایان هەیە بەوەی کە هێنراوەتە خوارەوە بۆ سەر تۆ، واتە قورئان ﴿وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ﴾ بڕوایان بەو نامەیانەی کە هێنراوەتە خوارەوە لە پێش تۆ، ئەوانە ئەو بڕوا رێك و پێکەیان هەیە، چونکە زانین و راستەقینەی دامەزراوە و بڕوای رێك و راست خاوەن و هەڵگرەکانیان رانەکێشن بۆ بڕوا هێنان بە تاك و تەنیایی خواو بڕوا بە هەموو ئایینەکانی خواو یەکێتی ئەو ئایینانەی کە لەلای خوای تاك و تەنیاوە هاتوون.

باسی زانینی راستەقینە ودانانی بەهۆی ناسینی راستەقینە، بە وێنەی بڕوای راستەقینە کە دەرگای روناکی ئەکاتەوە لە دڵ دا، سەرنج راکێشانێکی گرنگی تێدایە بەمەی کە هەمیشە ئەو زانینە هاوسەر و جووتە لەگەڵ بڕوادا، وەك دەست نیشانیشە بەوەی کە زانینی ناڕاست و ناتەواو هاوسەرو جووتە لەگەڵ بێ بڕوایی دا و بەرگریی کەری دڵن لە ناسینی راستەقینە، ئەوە شتێکە کە هەستی پێ ئەکرێ لە هەموو چەرخ و کات و ولاَتێك دا، ئەوەتا ئەبینین ئەوانەی کە تێگەیشتوون و بە قوڵی حاڵین لە ناوەڕۆك، ئەوانە بەرامبەر ئەو هەموو رابەرو بەڵگە بوونەوەری یانە دڵێکی پڕ لە ئارام و سۆزو پەرۆشیان هەیە، بە بێ گیرو گرفت بڕوا ئەهێنن کە بە هیچ کلۆجێك ناگونجێ ئەم بوونەوەرە خوا و پەروەردگارێکی نەبێ، ئەبێ ئەو خوایە زاناو بە دەسەلاَت و لێزان و کاردروست بێ و ئەبێ تاك و تەنیا و بێ وێنە بێ، هەروەها هەر دڵێك کە بە تەواوی رەش و تاریك نەبێ ئامادەیی هەیە بۆ وەرگرتنی رێنموونی و کەوتنە سەر رێی راست، بەلاَم ئەوانەی کە زانینی راستەقینەیان نی یە، بە قوڵی حاڵی نەبوون لە ناوەڕۆك و دیوی ناو، هەر ئاگایان لە رووکەش و رواڵەتی رووت هەیە،

بە بێ بیر کردنەوە وتراو و زانراوی مەردومان کۆ ئەکەنەوە و بەهۆی ئەوە لاڤ زانین و تێگەیشتن و رۆشنبیریی لێ ئەدەن، ئەوانە ئەو توێکڵ و رووکەش و روالەتە ئەبن بە پەردەیەکی ئەستوور بەسەر دڵ و دەروونیانەوە و بەرگری یان ئەکەن لەوەی کە بیر بکەنەوە لە هیچ کام لەو رابەرو بەڵگە روونانە کە پرژ و بڵاو بوونەتەوە لە هەموو ناوچە و بەش و پارچەکانی ئەم بوونەوەرەدا، تەنانەت چاوێك هەڵناخەن و تۆزێك ورد نابنەوە لە خۆیان کە چۆن دروست کران و پێك هاتن؟ ئایا خۆیان لە خۆیانەوە پەیدا بوون بە بێ کەس و بە بێ پەروەردگارێك؟!! ئایا هیچ کەسێك لاڤ ئەوە لێ ئەدا کە هیچ دەسەڵات و دەخلێکی ببێ لە دروست کردنی دا؟!! هەروەها ئەو کەسەی کە ئامادەیی تیا نەبێ بۆ بڕوا هێنان و سۆز و ئارەزووی رێنموونی تیا نەبێ، ئەم دوو جۆرە کەسە ناگەڕێن بەدوای ئەو ئارامی و دڵنیایی یەی کە بڕوا هێنان ئەیدا بە دڵ و دەروون، ئایین و بڕوا بە شتێکی پڕوپووچ و بێ نرخ سەیر ئەکەن، بەڵکو بەلایانەوە رەگەزایەتی تیایە و دووبەرەکی پەیدا ئەکات لە ناو گەل دا، وە بەش بەشیان ئەکات، بەو چاوەو بەو بۆچوونە سەرەنجی هەموو ئایین ئەدەن، ناگەڕێن بە دوای ئایینە راستەکەی خوادا کە تەنها هەر ئەو رێگەی رزگاری یە و مایەی کامەرانی و بەختەوەری یە. ئینجا چەند سیفەت و نیشانەیەکی تر باس ئەکات کە ئەو بڕوادارانە دیاریی ئەکات: یەکەمیان: نوێژ بەجێ هێنانە بە رێك و راستی، بە جۆرێ باسی ئەکات کە وەسف و سەنای ئەو نوێژکەرانەی تیایە و تایبەتی یان ئەگەیەنێ، چونکە نوێژ گەورەترین کردەوەکانی بڕوادارانە، هۆی بەهێزی پەیوەستی پەیوەندی بەندەیە بە پەروەردگاری یەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلْمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾[1] ئەوانەی کە نوێژ بە رێك و راستی بەجێ ئەهێنن، واتە بە تایبەتی باسی ئەمانە ئەکەم و وەسف و سەنایان ئەدەم، ﴿وَٱلْمُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ ئەوانەی کە زەکات ئەدەن ﴿وَٱلْمُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان هەیە بە خواو بە رۆژی دوایی، ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ سَنُؤْتِيهِمْ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ ئەوانەی کە خاوەنی ئەو سیفەتانەن بێگومان ئەجرو پاداشتێکی زۆر گەورەیان پێ ئەبەخشین.

---

[1] ئەوەش بە پێی باوی زمانی عەرەب ماڵ بۆرەی لا ئەبەن و نیشانەی سەرەی ئەدەنێ بۆ دەست نیشان بەو وەسف و سەنا و تایبەتێتی یە، یان دەست نیشان بە نەنگ و رەخنە گرتن، واتە بە گوێرەی پێش و پاش ئەبوایە(والمقیمون) بوایە، بەلام(و) کە نیشانەی بۆرە لابراوە، وە(ی) کە لێرەدا نیشانەی سەرەیە لە جێی دانراوە.

﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ﴿١٦٣﴾ وَرُسُلٗا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ وَرُسُلٗا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ

---

**لە پێشەوە فەرمووی: جوولەکە داوا ئەکەن کە لە ئاسمانەوە نامەیەکیان بۆ بێنیتە خوارەوە، ئینجا روونی کردەوە کە مەبەست لەو داوایە هەر بەکارهێنانی سەرکێشی و نالەباری یە نەك پێیانە و کە هەقیان بۆ روون ببێتەوە، جا لێرەدا دەم کوتیان ئەکات بەمەی کە رەوانە کردنی تۆ ئەی محمد وەك رەوانە کردنی ئەو هەموو پێغەمبەرانی ترە کە ئەوان دانی پیا ئەنێن، باوی خوا هەر وا هاتووە کە فروستادە و پێغەمبەرانی ناردووە، هەر پێغەمبەرێکی ناردووە بە رابەر و موعجیزەی تایبەتی خۆیەوە کە خوا خۆی زانیویەتی هەر ئەوە بەسە و پێویستە، کەواتە هەرکەس زیاد لەوە داوا بکات، ئەو کەسە ئەیەوێ سەرکێشی و دەمبازی بەکار بێنێ، شایستەی وەلام دانەوە نییە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ﴾ بێگومان ئێمە سروشمان کردووە بۆلای تۆ ئەی محمد، وە تۆمان کردووە بە فروستادە و پێغەمبەر ﴿كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ﴾ هەرچۆنێ سروشمان کرد بۆلای نوح و ئەو پێغەمبەرانەی پاش نوح ﴿وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ﴾ هەرچۆنێ سروشمان کرد بۆلای ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب ﴿وَٱلۡأَسۡبَاطِ﴾ رۆڵە و نەوەکانی یەعقوب ﴿وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ﴾ بۆلای عیساوئەیوب ویونس وهارون وسولەیمان، ﴿وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا﴾ (زەبور) مان بەخشی بە داود ﴿وَرُسُلٗا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ﴾ رەوانەمان کردووە چەند فروستادەیەك کە بێگومان باسمان کرد بۆت و داستانەکانمان بۆ گێڕایتەوە لەمەوبەر، یان لە سورەتەکانی تریش بێجگە لە ئەم سورەتە﴿وَرُسُلٗا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ﴾ چەند نێرراو و فروستادەیەکی تر کە باسمان نەکردوون و داستانەکانیانمان نەخوێندووەتەوە بە سەرت دا کە خوا خۆی ئەیانناسێ و ئەزانێ لە چ چەرخ و لە چ ولات و لە چ گەل و نەتەوەیەك بوون؟ بێگومان هەر نەتەوە و گەل و ئوممەتێك نێرراو و پێغەمبەری بووە،**

وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ﴿١٦٤﴾ رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا ﴿١٦٥﴾

---

وەكو ئەفەرمویٚ ﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا ﴾ سوێند بە خوا ناردوومانە و رەوانەمان کردووە لە هەموو ئوممەتێك نێرراو و فروستادەیەك، بەڵام خوا لەم قورئانەدا هەر باسی ئەوانەی کردووە کە خۆیان و نەتەوە و وڵاتیان ناسراو و بەناوبانگ بوون لەناو گەلی عەرەب و نامەداری ئیسرائیلی دا، چونکە باسی ئەو نێرراو ئوممەتانە دوو مەبەستی گرنگی تیایە:

١- پەندو تەمیٚ دادانی مەردومان و ترساندنی سەرپێچی کەران.

٢- باس کردنی ئەوانە و دەستان و بەسەرهاتی خۆیان و گەلەکانیان گەورەترین رابەرو موعجیزەیە بۆ ئەم پێغەمبەرە ئازیزە(ﷺ) کە نەخوێندەوار بووە و پێگەیشتووی ناو گەلێکی نەخوێندەواری دوور لە زانین و خوێندەواری بووە، کەواتە ئەگەر پێغەمبەر نەبوایە هەرگیز و بە هیچ کلۆجێك ئەو هەواڵانەی نەئەزانی، وەك هەموو گەلەکەی کە بیٚ ئاگا بوون لە هەموو ئەوانە، جا لەبەر ئەوە قورئان لە چەند ئایەت دا ئەو بەڵگە و رابەرە بەهێزەی ئاراستەی بیٚ بڕواکان ئەکردو دەم کوتی نەکردن پیٚ ی، بە جۆریٚ نە عەرەبەکان و نە گاور و جوولەکەکان هیچیان بە دەستەوە نەئەما، دەی بێگومان هیچ لە دوو مەبەستە گرنگەی کە باسمان کردن نەئەگونجا و پێك نەئەهات لە باسی داستانی ئەو نێرراوانەی کە نەزانراو و نەناسراون، کەواتە باسەکەیان بیٚ سوود ئەبوو، خوایش هەرگیز کاری بیٚ هودە و بیٚ سوودی نەکردووە و نایکات. ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا﴾ خوا قسەی کرد لەگەڵ موسادا بە قسە کردن لەلایەن خۆیەوە بە بیٚ هۆی کەسێکی تر، بێگومان ئەمەی موسا جۆرێکی تایبەتی یە لە سروش هیچ کەس نازانیٚ چۆن بووەو چۆن کراوە و بە چ شێوەیەك موسا وەری گرتووە، کەواتە ئێمە بێجگە لەوەی قورئان باسی فەرموە هیچی تر ناڵێین نە زیادو نە کەم. ﴿ رُّسُلٗا﴾ رەوانەمان کردووە چەند فروستادەیەك کە ﴿مُّبَشِّرِينَ﴾ موژدە دەر بوون بە ئەجرو پاداشتی گەورە بەوانەی کە بڕوادار و گویٚ رایەڵن، ﴿وَمُنذِرِينَ﴾ ترسێنەری ئەوانەن کە بیٚ بڕوا و تاوانبارن ﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِ﴾ لەبەر ئەوە هیچ بڕو بیانوو و عوزرێك نەمێنیٚ بۆ

مەردومان بۆلای خوا لە پاش رەوانە کردنی ئەو فروستادە و نێرراوانە، بەم رەنگە لە رۆژی دوایی دا بڵێن: نەمانزانی و کاشکێ خوایە فروستادەت بۆ بناردینایە تا شوێنی فەرمانی تۆ بکەوتینایە و ئاوا گومڕا نەبووینایە، واتە ئەگەر فروستادەی نەناردایە بە مەردوم ریٚی قسەی بوو، وە مافی سزادانی نەئەبوو لەسەر یاخی بوون و بەد کرداریی.

خوای میهرەبان هیچ بڕو بیانوویەکی نەهێشتووەتەوە بۆ بەندەکانی لە هیچ بارو روویەکەوە، ژیریی و بیرو هۆشی پێ داون، کە بتوانن ورد ببنەوە لە هەموو رابەر و بەڵگە روون و ئاشکرایانە کە بە فراوانی پرژ و بڵاوی کردوونەتەوە لە دەروونی خۆیان و لەم بوونەوەرەی کە تێیدا ئەژین، تا بەهۆی ئەوەوە خوای خۆیان بناسن، کەواتە ئەگەر پێغەمبەرانیشی نەناردایە ئەبوایە بەندەکانی هەر خوایان بپەرستایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەیش دا پێغەمبەرانی بۆ ناردن بە موعجیزەو بەڵگەی بەهێزو ئاشکراوە، بۆ رێنموونی و رێ نیشاندانیان، بۆ موژدە پێدان و ترساندنیان، ناردنی بە ئایین و شەریعەتێکی راست و رەوا و رێك و گونجاو لەگەڵ ژیریی و سروشت دا، ﴿وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ خوا هەمیشە هەر زاڵ و کاردروست و لێ زان بووە، زاڵە و بە دەسەڵاتە بەسەر هەر پاداشت و تۆڵەیەك کە مەیلی بکات، لێ زانە هەموو کارو بڕیاری بەجێ یە و لە شوێنی خۆی دایە. ئەم ئایەتە پیرۆزە سەرنج رائەکێشێ بۆ سێ شتی گرنگ:

١- ژیریی بە تەنیا بەس نی یە بۆ ئادەمی و چارەسەری هەموو تەنگ و چەڵەمە و گیرو گرفتی ناکات، چونکە ئەگەر ژیریی لەو رادە و پلەیەدا بوایە بەس بوایە بۆ رێنموونی و گەیاندنی لەو رادەیەدا بوایە خوای میهرەبان بەندەکانی ئەدایە دەستی ژیریی یەکانیان و حەواڵەی ئەوانی ئەکردن، کە بەرنامەیان بۆ دابنێن بۆ ژیانیان، بە درێژایی مێژووی ئادەمی پێغەمبەرانی بۆ نەئەناردن، تەنها ژیریی بەس بوو بۆ نەهێشتنی بڕو بیانوویان، رەوانە کردنی پێغەمبەرانی نەئەکرد بە عوزرو بیانوو بۆیان، بەڵام خوای پەروەردگار کە زانی ئەو ژیریی یەی کە بەخشیویەتی بە بەندەکانی ناتەواوە و بە بێ تەمێ و رێنموونی خوا دووچاری هەڵە ئەبن و لە رێی راست لائەدەن، لەبەر ئەوە بە میهرەبانی خۆی فروستادەکانی بۆ ناردن، وە بڕیاری دا کە سزایان نەدا لەسەر تاوان و سەرکێشی یان هەتا فروستادەکانی بۆ ناردن، وە بڕیاری دا کە سزایان ئەدا لەسەر تاوان و سەرکێشی یان هەتا فروستادەیان بۆ نەنێرێ، وەکو ئەفەرموێ لە ئایەتی سورەتی (الإسراء) دا: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾ ئێمە سزادەر نین بۆ هیچ کەس

هەتا فروستادە نەنێرین، کەواتە ئایا ئیش و کاری ژیریی ئەبێ چی بێ لە مەسەلەی بڕوا هێنان و ڕێنموونی وەرگرتن دا، لەبارەی بەرنامەی ژیان دا ؟ بێگومان ئیش و کاری ژیریی لەو بارەیەوە ئەوەیە کە لە ئایین و پەیامەکەی خواوە تەمێ و ئامۆژگاریی وەرگرێ بەهۆی فروستادەکەوە، ئەوەی کە وەری ئەگرێ و تێ ی بگات، ئیش و کاری فروستادەش ئەوەیە ئەوەی کە لە خواوە بۆی هاتووە بە روونی رایگەیەنێ، ژیریی بێدار و وریا بکاتەوە بۆ ورد بوونەوەو بیر کردنەوە لە رابەرو نیشانەکان، نەخشەی بەرنامەی راست و رەوای بۆ بکێشێ، بناغە و بنەڕەتێکی بۆ دامەزرێنێ کە بەرنامەی ژیانی لەسەر راگیر ببێ بە کردەوە، کە بیگەیەنێ بە خێرو خۆشی هەردوو جیهان.
ئیش و کاری ژیریی ئەوە نی یە کە چاودێر و بڕیار دەر بێ بەسەر ئایین و بڕیارەکانی ئایین دا، بەم رەنگە هەرچی بە دڵ بوو وەری گرێ و رەوای بدا، هەرچی بە دڵ نەبوو وەری نەگرێ و رەوای نەدا، واتە پێویستە لەسەر ژیریی بە هەموو دڵنیایی یەکەوەو بە بێ رەخنە و سەر لێ کردنەوە، پێویستە وەرگرتن و رازی بوونی بە هەر بیرو باوەڕ و بڕیارێك کە بزانێ لەلایەن خواوە هاتووە، ئەمە شتێکی ئاشکرایە و جێگەی گومان و دوو دڵی نییە.
ئەم ئایین و پەیامە لەگەڵ ژیریی ئەدوێ و فەرمان و بڕیارەکانی ئاراستەی ژیریی ئەکات، بەم شێوەیە کە بێدار و ئاگاداریی ئەکات و تەمێ ی ئەکات، بۆی روون ئەکاتەوە کە چۆن وەرگرێ و رەفتاری پێ بکات، نەك بەم جۆرە ژیریی یە بڕیاری لەسەر بداو بتوانێ دەست کاری تیا بکات و وەرگرتن و وەرنەگرتنی بە دەست بێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە بڕیارو فەرمانەکانی ئایین حەکەم و بڕیاردەر و کار بەدەستە بەسەر ژیریی دا، پێویستە لەسەر ژیریی کە وەربگرێ و گوێ رایەڵ بێت بە بێ گیرو گرفت و بە پێ ی توانا هەڵسێ بە فەرمان و بڕیارەکانی ئایین، ئیترئایائەوەی کە ئایین هێناویەتی ناسراو و دەق پێوە گیراو بێت یان نەء؟
بە کورتی: ئیش و کاری ژیریی لەبارەی ئایین و بڕیارەکانی یەوە ئەوەیە کە گوێ بگرێ و ئەوەی ئاراستەی ئەکرێ وەری گرێ و تێ بگات لە مەبەستەکەی، ئیتر دوای ئەوە بێجگە مل کەچی و گوێ رایەڵی ی ڕێ ی هیچی تری نییە.
ئاییني ئیسلام لەبارەی ژیریی یەوە — وەك لە هەموو کارو بڕیارەکانی تری دا — میبانەیە و ناوەڕاستی گرتووە: نە ژیریی ئەکات بە ترازوو و حەکەم بۆ هەڵسەنگاندنی هەموو شتێ — کە لە راستی دا ئەوە گێڕانی یەتی بە خواو پەرستراو — وە نە بە بێ نرخیش

سەیری ئەكات لەبارەی رێنموونی و ئایینەوە، وەك كەنیسە كە پێویستی ئەكرد لەسەر ژیریی كە مل كەچ و گوێ رایەڵی كوێرانە بێت بۆ هەموو كارو بڕیارەكانی هەرچەند شتێكی نەگونجاو بن و بە ئاشكرا دژو پێچەوانەی ژیریی و زانیاری راستەقینە بن!

ئیسلام لەگەڵ ژیریی ئەدوێ و قسە ئەكات تا تێ بگات لە فەرمان و بڕیارەكانی، بەرنامەی رێك وراستیشی بۆدانراوە، بەپێی ئەو تێفكرێ و ورد ببێتەوە لە هەموو بڕیارو فەرمانەكانی، هیچ شتێكیشی ئاراستە ناكات كە دژی زانیاریی و نەگونجاو بێت لەگەڵ ژیریی دا، ئینجا لەپاش ئەوە ئیتر پێویستی كردووە كە ژیریی مل كەچ و گوێ رایەڵ و فەرمانبەر بێت. ئەو بەرنامە رێك و راستەی كە داینـاوە بۆ ژیریی بەرامبەر و هەركارو بڕیارێك كە لە خواوە هاتبێ ئەمەیە: كە ژیریی بەرەنگاریی كارو فەرمانەكانی ئایین نەكات بە بیرو باوەڕ و بڕیارەكانی خۆی كە لە پێشەوە ناسراو و دەق پێوە گیراو و بێ بڕوا پێ كراویەتی، رێگەی راست و بەرنامەی راست بۆ بەندەكانی خوا ئەمەیە كە هەموو بۆچوون و بیرو باوەڕ و بڕیارەكانی دامەزرێنێ لەسەر ئەو بیرو باوەڕو بڕیارانەی كە لای خواوە هاتوون، چونكە شتێكی ئاشكرایە ئەوەی لای خواوە هاتووە راست و تێرو تەواو ترە لە هەر شتێكی تر لە جیهان دا، پاك و بێ لەكەیە بە وێنەی پاك و بێگەردی پەروەردگاریی ئادەمیی و بوونەوەر، هەر شتێك سەرچاوەكەی بەندە بێت – هەرچەندە راست و رەوایش بێت – هەر پاك و بێگەرد نی یە و دەست ئەدات بۆ هەڵە و لاری بە وێنەی ئادەمی ی، كەواتە بڕیارەكانی ئایین كاتێ دەركەوتن كە لەلایەن خواوە هاتوون، بەراورد ناكرێن لەگەڵ هیچ بڕیارێكی تر كە لەم جیهانەدا هەڵقوڵابێ، ناگونجێ ئەوانەی كە لای خواوە هاتبن هەڵسەنگێنرێن بە هیچ سەنگ و ترازوویەكی تر، هەركەسێك بڕوای لەسەر ئەمە نەبێ كە گوتمان ئەو كەسە زۆر دوورە لە ژیریی و تێگەیشتن، وە هەركەسێك بیەوێ بە بیرو ژیریی خۆی بڕیارەكانی ئایین هەڵسەنگێنێ و بژارە و دەست كاریان تیا بكات، ئەو كەسە وەك نەزان و نەفامە پەیوەندی بە ئیسلامەوە نی یە و لە ئیسلام دەرچووە. كەواتە هەر بڕیارێكی خوا گەیشت بە هەركەسێك سەبارەت بەم بوونەوەرە، یان سەبارەت بە ئادەمی ی و هەر دروست كراوێكی تر، یان لە بارەی هەر فەرمان و جڵەوگیریی و رەوا دان و قەدەغە كردنێكەوە، بێگومان هەر ئەو بڕیاری خوا راست و رەوایە و پێویستە بە هەموو ئارامی یەكی دڵەوە وەرگیرێ و بڕوای پێ بهێنرێ و گوێ رایەڵی بكرێت. بۆ وێنەكانی كە خوا ئەفەرموێ: ﴿ الله الذی خلق سبع سماوات و الأرض مثلهن ﴾ خوا كەسێكە كە حەوت ئاسمانی دروست كردووە، وە لە زەویش دا وێنەی

ئەوانی دروست کرد، ئەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَـٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴾ ئایا ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە نەیانزانیوە کە ئاسمانەکان و زەوی لە پێشەوە نووسابوون پێکەوە و یەك شت بوون، ئینجا ئێمە لە یەکمان جیا کردنەوەو جیامان کردنەوە، ئیتر مەبەست لە یەکێتی و جویێ کردنەوە هەر بارێك ببێ، وەك لە سورەتی (الأنبیاء) دا باسمان کرد لەکاتی تەفسیری دا کە لە پێش ئەم سورەتەوە تەفسیرمان کرد، هەموو شتێکی زیندوومان لە ئاو دروست کردووە، ئیتر مەبەست بە زیندوو هەر گیان لەبەر بێت، یان هەر شتێکی تر کە زیاد ئەکات و پەرە ئەسێنێ، یان ئەفەرموێ: ﴿ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِن صَلْصَـٰلٍ كَٱلْفَخَّارِ ﴾ خوا ئادەمی ی دروست کرد لە قوڕێکی وشکی رەق کە تەقەی لێ بدرێ دەنگ ئەداتەوە، بە وێنەی سواڵەت و گۆزەو دیزە، هەروەها هەر ئایەتێکی تر کە هاتبێ لەبارەی ئەم بوون و بوونەوەرو زیندەوەرو شتەکانی ترەوە، کاتێ کە ئەو جۆرە شتانە ئەفەرموێ، دیارە هەق و راست ئەوەیە کە خوا ئەفەرموێ، دەی هیچ کەسێکی تر نابێ بڵێ: زانین و بەراورد و لێکۆڵینەوەی من شتێکی تری لایە، چونکە هەرچی لای ئەوە هەمووی دەست ئەدات بۆ هەڵە و رێ پێ نەبردن و ناڕاستی، بەڵام ئەوەی کە خوا بڕیاری لەسەر دابێ بە هیچ کلۆجێك دەست نادا بۆ هەڵە و ناهەقی. کاتێ کە خوا ئەفەرموێ: ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴾ هەرکەسێك حوکم نەکات بەوەی کە خوا ناردی یە خوارەوە، ئەو کەسانە بێ بڕوای تەواون، یان ئایەتەکانی قەدەغە کردنی سوو خۆری، یان ئایەتی قەدەغە کردنی بەرەڵایی و رووتی ئافرەت، هەروەها هەر فەرمان و بڕیارێکی تر لە هەر بار و روویەکی تردا هەیە، هەرکەسێك شتی وا بڵێ بێگومان ئەو کەسە ئابڕووی خۆی ئەبات هەرچۆنێ ئەبێ بەبێ بڕوا و لە ئایینی ئیسلام دەرئەچێ و پەیوەندی بە ئیسلامەوە نامێنێ. ئەوەی کە خوا دایناوە و بڕیاری داوە لەبارەی بیرو باوەڕو بۆچوونەوە، یان لەبارەی بەرنامەی ژیان و رژێمی ژیانەوە، هەموو یەکسانە و بە هیچ کلۆجێك جیا ناکرێتەوە و دروست نی یە بۆ هیچ کەس جیاوازی بخاتە نێوانیانەوە، بەم رەنگە لەبارەی بەرنامەی ژیانەوە چەرخ و کات گۆڕاوە و ئەبێ لەگەڵ بارو بای چەرخ و رۆژگاردا بگەڕێن، بێگومان ئەگەر ئەو قسە راست بوایە خوا کاتی دیاریی ئەکرد بۆ ئەو جۆرە شتانە، دەی کە نەیکرد ئەبێ ئەوەی کە خوا دایناوە بۆ هەموو چەرخ و کاتێك چوون یەك و گونجاو و رێك و پێك بن،

هەركەسێك ئاوا نەڵێ و بڕوای بەمە نەبێ ئەبێ لای وا بێ کە خوا لە هێندێ شت بێ ئاگا بووە، بەڵام بەندەی خوێڕی زاناو ئاگادارە پێی!!

بە کورتی هەر بیرو باوەڕو بۆچوون و بڕیار و یاسایەك کە بە قەتعی لە ئیسلام دا هاتبێ ئەبێ بڕوای ڕێك و پێك ببێ پێ ی و بە بێ دوو دڵی و نیگەرانی وەرگیرێ، هەر بە ناوی ئیسلامیشەوە، وەرنەگرتن و بڕوا نەبوون پێ ی، وەرنەگرتن و بڕوا نەبوونە بە ئیسلام. بەڵام ژیریی ڕێ ی هەیە تێکۆشان بکات لە جۆرو شێوەی بەدی هێنانی ئەوەی کە ئیسلام هێناویەتی، بۆ وێنە: پرس و را وەرگرتن کە پێ ی ئەگوترێ: (شوری) بەندێکی گرنگە لە ئیسلام دا و پێویستە ببێ و رەفتاری پێ بکرێ، بەڵام کە شێوەیەکی تایبەتی نەکراوە بۆ بەدی هێنانی، ژیریی ڕێ ی هەیە تێکۆشان بکات لە شێوەو چۆنێتی بەدی هێنانی دا بە گوێرەی بەرژەوەندی ی و گۆڕانی باوی جیهان، بە مەرجێك دژایەتی روونەدا بەرامبەر هیچ بەندو بڕیارێکی ئیسلامی.

٢- لەو سێ شتە گرنگەی کە ئەم ئایەتە سەرنجی بۆ رائەکێشێ بریتی یە لەو ئەرکە زۆر گەورە و گرانەی کە خراوەتە سەرشانی ئەو فروستادانە - سەلامی خوایان لێ بێت - لە یەکەمجارەوە، ئینجا لە پاش ئەوان ئەوانەی کە بڕوایان هێنا پێ یان، ئەو ئەرکە قورس و گرانەی کە خراوەتە سەرشانیان بەرامبەر ئادەمی ی، بێگومان چارەنووس و پاشەڕۆژی ئادەمی ی لە هەردوو جیهان دا بەستراو بە فروستادەو شوێن کەوتوەکانیانەوە، بە جۆرێ بنەڕەتی خۆش بەختی و بەخت شەڕی و ئەجرو پاداشت و تۆڵەی مەردومان لە جیهان و لە رۆژی دوایی دا، لەسەر ئەو راگەیاندنی ئەوانە. بەڵێ بەڕاستی کارو پیشەکەیان زۆر گەورەو گرنگە، جا لەبەر ئەوە فروستادەکان - درودیان لەسەر بێت - ئەو کارەیان زۆر بە گەورەو قورس سەیر ئەکرد، غەم و پەژارەیان هەر بەلای ئەوەوە بوو، ئەترسان لەهەر کەم و کوڕی یەك کە بیان بێت لەو بارەیەوە، خوایش کارەکەی بەقورس و گەورە نیشان ئەدان، ئەوەتا ئەفەرموێ بە پێغەمبەر (ﷺ):

﴿إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا﴾ بێگومان ئێمە وتراوێکی قورس و گرانت ئاراستە ئەکەین و ئەیدەین بەسەرت دا، بەڵێ کارەکەیان زۆر گەورەو گرنگ بوو، کاری ژیان و مردنی مەردومان، کاری خۆش بەختی و بەخت شەڕی یان، کاری پاداشت و تۆڵە و سزایان، کاری ئەم ئادەمی ی و ئادەمێتی یە، کە ئەم ئایین و پەیامەی پێ رائەگەیەنرێ، ئینجا ئەویش وەری گرێ و شوێنی بکەوێ، یا وەری نەگرێ و بە دژی هەڵسێ، یان پێ ی

راگەیەنریٚ، ئەو کاتە ئەویش بەڵگە و بیانووی هەیە لای خوای خۆی، دەین و هەواڵی بەد بەختی و گومڕایی یان لە جیهان دا بە ئەستۆی ئەو کەسەیە کە راگەیاندنی پیٚ سپیٚررا بیٚت و ئەویش رای نەگەیاندبیٚ! ئینجا بیٚگومان فروستادەکانی خوا – سەلامی خوایان لیٚ بیٚ – هەڵسان بە راگەیاندنی خۆیان بە ریٚك و پیٚکی، سپاردەی خۆیان گەیاند بە جیٚی خۆی، بە پاك و خاویٚنی رۆیشتن بۆلای پەروەردگاریان بە سەربەرزی و روو سووری، چونکە راگەیاندنەکەیان هەر قسەی رووت نەبوو، بەڵکو لەگەڵ وتن و قسەیش دا بوون بە پیٚشەوا و نموونە لە کردەوە و تیٚکۆشانیٚکی هەمیشەیی بیٚ وچان دا، بۆ نەهیٚشتن و لابردنی هەر کۆسپ و گریٚ یەك، ئیتر ئەو کۆسپ و گریٚ یانە پڕوپاگەندە و دەم بازی و چەنە بازیی بووبیٚ، بۆ دوودڵ کردنی بڕواداران و ریٚ گرتن لە بڕوا هیٚنان و شیرین کردنی گومڕایی لە دڵ و دەروونیان دا، یان هیٚزو دەسەلاٚتیٚکی سەرکیٚش بووبیٚ کە بە زۆر ریٚی گرتبیٚ لە بانگ کردنی مەردومان بۆ ئایینی خوا، بە هەرشیٚوەیەك بۆی کرابیٚ ئازارو ئەشکەنجەی بڕواداراانی دابیٚ، وەك پیٚغەمبەرمان (ﷺ) هەڵسا بە لابردن و نەهیٚشتنی ئەو هەموو کۆسپ و گریٚ یە بە هەموو جۆرەکانی یەوە، ئینجا لە پاش پیٚغەمبەری ئازیز (ﷺ) ئەو ئەرکە گەورەیە مایەوە بەسەر شانی بڕوادارانەوە، رزگار بوونیان نی یە لیٚ ی مەگەر بە راگەیاندن، لەسەر هەمان ریٚ و بەرنامە کە پیٚغەمبەر (ﷺ) لەسەری بوو، چونکە پەیامەکەی هەر ئەو پەیامەیە، ئادەمی یەکە هەر هەمان ئادەمی یە، گومڕایی و لادان و کۆسپ و گریٚکان هەر هەمان شتن، چەند هیٚزی سەرکیٚش لە کەمین دایە کە ریٚگری ئایین و بانگ کەرانی ریٚگەی خوان کە ئەوان زۆر بەهیٚزو بەتین تر و لیٚزان ترن بۆ گومڕا کردن و ترازاندن لە ریٚگە راستەکەی خوا. هەڵویٚست هەر ئەو هەڵویٚستەیە وە خەڵکی هەر ئەو خەڵکەیە.

پیٚویستە راگەیاندن بە وتن و بە کردەوە بە جۆریٚ راگەیەنەرەکان ببن بە نویٚنەر و ئاویٚنەیەکی بالاٚنما بۆ ئەوەی کە رای ئەگەیەنن، راگەیاندن بە نەهیٚشتن و لابردنی هەموو کۆسپ و گریٚ یەك کە ریٚ ئەگرن لە بانگ کەران، ئەگەر بەو جۆرە نەکەن راگەیاندن نی یە و بەدی نایەت، بیٚگومان ئەم کارو فرمانە شتیٚکی پیٚویستی ئاشکرایە و هیچ فڕو فیٚڵیٚك ناکریٚ بۆ لادان و خۆشاردنەوە لیٚ ی، ئەگینا ئەبیٚ چ سوود و نرخیٚك ببیٚ بۆ ناردن و رەوانە کردنی ئایین و فروستادەکان، ئەبیٚ مەبەستی خوا پیٚك نەیەت لەو ناردن و رەوانە کردنەدا.

ئەو کەسە کە بڵێ: من موسڵمانم یان ئەبێ ئایینی خوا ڕاگەیەنێ و هەڵسێ بە ئەرکی سەرشانی خۆی، یان ڕزگاربوونی نابێ نە لە جیهان و نە لە ڕۆژی دوایی دا، ئەو کەسەی کە لاف موسڵمانێتی لێ ئەدات، ئینجا هەوڵ و تێکۆشان و ڕاگەیاندنی نەبێ ئەو کەسە بە کردەوە شایەتی ئەدات بە پێچەوانە و دژی ئەو لافەی کە لێ ی ئەدا، دژو پێچەوانەی ئەو شایەتمانەی کە بە دەم ئەیڵێ. شایەتی دان بۆ ئیسلام دەست پێ ئەکات لە یەکەمجارەوە لە خودی شایەتی دەرەکەوە، ئینجا ماڵ و خێزانی، ئینجا بنەماڵە و خزم و کەس و تایفەکەی، بە جۆرێ ببن بە نموونە و وێنەیەکی ڕاستەقینە بۆ ئەو ئیسلامەی کە بانگی بۆ ئەکەن.

هەنگاوی یەکەمی شایەتی موسڵمان ئەوەیە، هەنگاوی دووەمی بەمە ئەبێ کە هەڵسێ بە بانگ کردنی گەل و ئوممەت بۆ بەدی هێنانی ئیسلام لە هەموو ژیانی دا، شەخسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و پاشەکەوتی ڕامیاری ئینجا شایەتی دانەکەی دوایی دێت بە هەوڵ و تێکۆشان بۆ لابردن و نەهێشتنی هەر ڕێگرو کۆسپ و گرێ یەك کە لە ڕێگەی ئیسلام و موسڵمانان دا، ئینجائەگەرلەورێگەیەداخۆی بەخت کردوتیاچوونەوکاتە شەهیدە و بە ڕاستی شایەتیداوەلەسەرراستی ئایینەکەی، بەرووی سوورەوەئەچێ بۆحوزوری خوای خۆی.

٣- لەو سێ شتە گەورەو گرنگانەی کە لەم ئایەتەوە وەرئەگیرێن بریتی یە لەو میهرەبانی و چاکە و بەهرە و داد و چاودێری یەی کە خوای پەروەردگار بەکاری هێناوە لەگەڵ ئەم ئادەمی یەی کە زۆربەی سەرکێش و یاخی یە لە خوای پەروەردگار.

ئەو هەمووهێزو وزەی پێ بەخشیوە، وە ئامادەیی داوە بۆ ڕێنموومایی و گومڕایی و ژیریی پێداوە کە هەموو کامەرانی و بەختەوەری ی بەستراوە پێ یەوە. ئینجا لەگەڵ ئەوەدا ئەم ئادەمی یەی نەداوەتە دەستی و حەواڵەی نەکردووە تەنها بۆلای ئەو ژیریی یە، لەگەڵ ئەوەی ئەو هەموو بەڵگە و نیشانە روون و ئاشکرایانەشی خستووەتە بەرچاو کە مایەی ڕێنموونی و بڕوا هێنانن، چونکە خوا زانیویەتی کە ژیریی ئارەزوواتی نەفس زۆر جار سەری لێ تێك ئەدات بە جۆرێ چاك بە خراپ و خراپ بە چاك بزانێ، بەڵگە و نیشانە روونەکانیش زۆر جاران نەزانی و نەفامی ئەبن بە پەردەیەکی ئەستوور بەسەریانەوە و دایان ئەشارن، بە جۆرێ هەستیان پێ ناکرێ، جا بەهۆی ئەوەوە سەرەنجامی ڕێنوومایی و گومڕایی نەدایە دەستی ژیریی و حەواڵەی ژیریی نەکرد مەگەر دوای ناردنی ئایین و پەیام و ڕاگەیاندن و روون کردنەوەی ئایین و پەیامەکە، لە پاش ئەوەیش هێشتا ڕێ ی نەدا کە ئادەمی ی بەرنامەی ژیان دابنێ، بەڵکو ئەوەی کە دایە دەستی ئادەمی ی بریتی یە لە بەدی

هێنانی ئەو بەرنامەیەی کە بۆی داناوە، بە کردەوە لە ژیان و ڕووداوی ژیان دا، ئینجا پاش ئەوە ڕێی داوە، بەڵکو فەرمانی داوە کە هەوڵ و تێکۆشان بکات لەم موڵکە پان و فراوانەدا خێرو بێری ئەم موڵکە پان و فراوانە دەستی خۆی بخات و بەکاری بێنێ لە خزمەت و بەرژەوەندی خۆی و مەردومانی تردا!! ئینجا بیر ئەکەینەوە لەو داد و دادپەروەری یەی کە بەکاری هێنا لەگەڵ ئەم ئادەمی یەدا، ئەوەتا ئەگەر فروستادە و پێغەمبەرەکانی نەناردایە — درودیان لەسەر بێ — ڕێی ئادەمی ئەدا کە ئەو نەناردنە بکەن بە بەڵگە و بیانووی لای خوا بۆ تۆڵە و سزا نەدانیان لەسەر تاوان و خراپەکاری یان، لەگەڵ ئەوەدا کە ژیریی پێ دان، ئەو هەموو بەڵگە و رابەرە روون و ئاشکرایانەی بۆ داناون کە هەرکام لەوانە شایەتن لەسەر تاك و تەنیایی خوا و زانین و دەسەڵات و کاردروستی خوا. ئینجا پێویستە بیرێکیش بکەینەوە لەو چاودێریی و میهرەبانی و بەهرەو چاکەی کە بەکاری هێناوە لەگەڵ ئەم ئادەمی یەدا، کە رێزی گرت و هەڵی بژارد بۆ جێنشینی لەم جیهانەدا، لەگەڵ ئەو هەموو لاوازی و ناتەواوی و نالەباری یەی کە هەیەتی، کردی بە گەورەو ئاغای ئەم زەوی یە پان و فراوانە، کە بە نەزەر ئادەمی یەوە زۆر گەورەیە، ئەگەرچی لە چاو پادشایەتی و دەسەڵاتی خوادا هەر هیچ چاو نادا، ئینجا هەر لەم ئادەمی یە ئەو هەموو فروستادەیەی نارد بۆ ئەوەی بە پێی بەرنامەی خوا جێنشینی یەکەی بەجێ بهێنێ، چونکە ئەزانێ ئەم دروست کراوی خۆیە لە سروشتی پاکی خۆی ئەترازێ، ژیریی یەکەی هەڵە ئەکات، لەبەر ئەوە حەواڵەی سروشت و ژیریی یەکەی خۆیانی نەکردن، بەڵکو بە فروستادەکانی دا بەرنامەی بۆ ناردن، بڕیاری دا کە هەڵە و تاوان و خراپەکانیان لێ نەگرێ هەتا ئەو بەرنامەیان پێ ڕانەگەیەنرێ و پێی نەگەن!!

بەڕاستی زۆر سەر سوڕ ئەمێنێ لە نەزانی و نەفامی هەرکەسێك کە لای وابێ ئەم ئادەمی یە لەوانەیە خۆی بە خۆی بەرنامەیەك دابنێ بۆ ژیان، بە بێ پێویستی بە ڕێنموونی خوا و ئایین و فروستادەی خوا، ژیریی یە گەورەو هەڵکەوتووەکان شایستەی ئەوەن کە ئەوەی پەیام و ئایین ڕای ئەگەیەنێ، ئەمانیش ئەتوانن ڕایگەیەنن، بەڕاستی سەر سوڕ ئەمێنێ لە ڕاو بیرو باوەڕی وا!!!

ئەوە مێژووی هەموو ئادەمی یە، ئایا باسی ئەوەی تیایە کە تەنیا ژیریی یەك بووە لە جیهان دا کە لە خۆیەوە ڕێی بردبێ بەوەی کە هەر ژیریی یەکی بچووك و ئاسایی ڕێی پێ بردبێ بەهۆی ئایین و پەیامی خواوە ؟ بێگومان هیچ کەس ناتوانێ لە هەموو مێژووی ئادەمی دا ژیریی یەکی وا بدۆزێتەوە کە شتی وای توانی بێت و لە دەست هاتبێت، نە لە

بۆچوونی بیرو باوەڕیی و عەقیدەیی، وە نە لە خو و رەوشتی دەروونی، وە نە لە رژێمی ژیان دا، وە نە لە دانانی تەنیا یاسایەك بۆ ئەو رژێمە.

ئەوانەی ئەڵێن: گەورەترین ژیریی ژیریی (ئەرەسطوٚ) یە، ئینجا ئەگەر ئێمە بۆچوونەکەی ئەوان بەراورد بکەین لەگەڵ بۆچوونی هەر موسڵمانێکی ئاسایی لەو بارەیەوە، بەڕاستی بۆمان دەرئەکەوێ کە بۆچوونەکەی ئەو، وەك گڕو گاڵی مندالْ وایە، بۆ وێنە ئەڵێ: خوا ئەم بوونەوەرەی دروست کردو ئیتر لێ ی گەڕا، بۆ ئەوەی کاروباری خۆی بە خۆی بڕوا، خوا گەورەترو بەرزترە لەوەی کە تەگبیری ئەم بوونەوەرە بکات و بیر لە کاروباری بکاتەوە، بەڵکو خۆی هەر بیر لە خۆی ئەکاتەوە! هەروەها ئەو گەورەترین ژیریی یە چەند گڕو گاڵی تریشی هەیە! بەڵێ لە چەرخی کۆنی میسردا (ئەخناتون) بە ژیریی خۆی بڕوای هێنا بە تاك و تەنیایی خوا، بەڵام ئەو تاك و تەنیایی یەی کە ئەو بڕوای پێ ی بوو زۆر جیاواز بوو لەو تاك و تەنیایی یە پاك و خاوێنەی کە هەر موسڵمانێکی ئاسایی بڕوای پێ ی هەیە، ئەو بڕوای ئەوە تێکەڵ بوو لە زۆر شتی پڕو پووچ کە لە راستی دا نەئەگونجا لەگەڵ راستی دا، بە وێنەی بڕواکەی (ئەرسطوٚ). لەبارەی خو و رەوشتی یەوە سەدان و هەزاران نموونەمان دەست ئەکەوێ لە ئاسایی یەکانی گەل و کۆمەڵی موسڵمان، کە هیچ کەس لە تاقانە هەڵکەوتووەکانی گەلەکانی تری جیهان بە تۆزی پێ یان دا ناگەن، مەگەر لە دوورەوە بە چاویان بگەن بە ئاسۆی هەرە بەرزەوە.

ئەم باسە هەرچەند زۆر گرنگە و بە چەند قات لەم درێژە پێدانە دوایی نایەت، بەڵام بەم ئەندازەیە کۆتاییمان هێنا و ئەگەڕێینەوە بۆ سەر تەفسیری ئایەتەکانی تر، نامەدارەکان عیناد و سەرکێشی یان بەکار هێنا لەگەڵ ئەم پێغەمبەرە(ﷺ) دانیان نەنا پیی داو شایەتی یان نەدا لەسەر راستی خۆی و ئەو قورئان و شەریعەتەی کە خوا ناردی یە خوارەوە بۆ سەری، ئەوا بە کوێرایی چاو و داخی دڵی ئەوان خوا ئەفەرموێ بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) ﴿لَٰكِنِ ٱللَّهُ يَشْهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيْكَ ۖ﴾ بەڵام خوا شایەتی ئەدات بە راستێتی ئەو قورئانەی کە ناردی یە خوارەوە بۆ لای تۆ، ئینجا دڵنیایی ئەکات لەسەر ئەو شایەتی یە و بەهێزتری ئەکات لە دەروون دا، دەست نیشان ئەکات بە بەرزی و بڵندی قورئان کە ئەفەرموێ: ﴿أَنزَلَهُۥ بِعِلْمِهِۦ ۖ﴾ ناردی یە خوارەوە بە زانینە تایبەتی یەکەی خۆی کە بێ وێنەیە و ئەوەی کە ناردی بە دڵی هیچ کەسێك دا نەهاتووە، بە جۆرێك ناردی کە ببێ بە گەورەترین موعجیزەو ئاشکرا ترین بەڵگە و نیشانە لەسەر پێغەمبەرێتی پێغەمبەرەکەی(ﷺ)،ئەوەتا بەهۆی ئەو هەموو عیلم و زانینەی کە تیایەتی، چ ئەوەی پەیوەندی بە خواو ئایینەوە هەیە، یان ئەوەی کە پەیوەندی بە کاروباری ئادەمی یەوە هەیە لە دەروونی و کۆمەڵایەتی و رامیاری و حوکمڕانی... هتد، بەهۆی ئەو هەموو هەواڵە غەیبی یانەی کە هێنای لە رابردوو کاتی هاتنە خوارەوە و داهاتوو، بەهۆی داڕشتن و هۆنینەوەی وتەو وتارەکانی، بە شێوەیەکی نایابی بێ وێنە کە هەرگیز نەبووەو نایش بێ، چەند جاری بەری بڕی یەوە لە هەموو کەس کە بتوانن لاسایی بکەنەوەو وێنەی بڵێن، تا ئەو رادەیە بتوانن وێنەی کەمترین سورەتی بڵێن، هەوڵ و تەقەلای زۆریشیان دا و لە سەرەنجام دا دەستە پاچەیی یان ئاشکرا بوو، بێجگە لە داماویی و تەریق بوونەوە هیچیان بۆ نەمایەوە، بەهۆی ئەو زۆرو دەسەڵاتە ئاشکرای کە هەیەتی بەسەر گیان و دڵ و دەروون دا، تەنانەت گیان و دەروونی دوژمنە سەرکێشەکانی کە نەیان ئەوێرا گوێ بگرن لە خوێندنی، نەك کاریان لێ بکات، بەهۆی ئەوانە و چەند شتی تر کە بە درێژیی لەم تەفسیرەدا باسمان کرد – وەك لە چەند کتێبی تریش دا باس کراون – بەهۆی ئەوانە ئەم قورئانە بوو بە موعجیزە و بەڵگەیەکی روونی هەتا هەتایی بۆ ئەم پێغەمبەرەو ئەو ئایین و شەریعەتەی کە هێنای.

وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَشْهَدُونَۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿١٦٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ قَدْ ضَلُّوا۟ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١٦٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَظَلَمُوا۟ لَمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ طَرِيقًا ﴿١٦٨﴾ إِلَّا طَرِيقَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿١٦٩﴾

---

**خوا شایەتی ئەدا لەسەر راستی ئەو قورئانەی کە ناردی و بەو زانینە تایبەتی یەی خۆی ناردی ﴿وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَشْهَدُونَۚ﴾ فریشتەکانیش شایەتی ئەدەن، کە یەکێ لەوانە(جوبرەئیل) ی ئەمینە کە خۆی قورئانی هێنا لەلایەن خواوە، پێغەمبەر خۆیشی ئەو فریشتەی بینی کە لێ ی وەرگرت، خوا ئەو شایەتی یە ئەدات ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا﴾ خوا بەسە بە شایەت لەسەر ئەوەی کە ناردی یە خوارەوە بۆ سەر تۆ ئەی پێغەمبەر، کەواتە با جوولەکە و گاورو و بێ بڕواکان هەر چەنە بازی بکەن، ئەم شایەتی دانە دڵخۆش کردن و دڵنەوایی پێغەمبەری تیایە(ﷺ) لەو هەموو پیلان و سەرکێشی یەی کە بێ بڕوایان بەکاریان ئەهێنا بە تایبەتی جوولەکەی نەفرین لێ کراو، مایەی ئارام دان و دامەزراندن و بەهێزکردنی دڵی موسڵمانان بوو لە یەکەمجارو سەرەتای سەردەمی مەدینەیان، بەرامبەر ئەو هێرش و هەڵمەتە هەمیشەیی یەی کە جوولەکەکانی مەدینە پێ ی هەڵئەسان. جا لەم کاتەدا شوێنی ئەو هەڕەشە سامناکەیە کە ئاراستەی دڵی بێ بڕوایان ئەکات لە پاش شایەتی دانی خواو مەلائیکەتەکانی لەسەر راستێتی قورئان و هاتنی لەلایەن خواوە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان نەهێنا لە جیهان دا ﴿وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ وە رێ یان گرت لە ئایینی خوا، واتە ئیسلام ﴿قَدْ ضَلُّوا۟ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا﴾ بێگومان ئەوانە گومڕا بوون بە گومڕا بوونێکی زۆر دوور، چونکە ئەوانە خاوەنی دوو شتی پیسن: گومڕایی خۆیان، وە گومڕا کردنی مەردومی تریش، بێجگە لەوەیش گومڕا کەر کارو پیشەی شەیتان بەجێ ئەهێنێ، کەواتە دوور ترە لە رێی راست و گەڕانەوەو وازهێنان بەهێزترە لە گومڕایی دا، ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان نەهێنا ﴿وَظَلَمُوا۟﴾ ستەمیان کرد لە خۆیان بە بێ بڕوایی و کردەوەی خراپ، ستەمیان لە مەردومانی تریش کرد بە گومڕا کردنیان ﴿لَمْ يَكُنِ**

﴿ٱللَّهُ لِيَغۡفِرَ لَهُمۡ﴾ نەبووە خوا بەوەی لێ یان خۆش ببێ، واتە لە زانین و مەیلی خوادا لێ خۆش بوون لێ یان نەبووەو تێپەڕی نەکردووە ﴿وَلَا لِيَهۡدِيَهُمۡ طَرِيقًا﴾ لە زانین و ئیرادەی دا نەبووە گەیاندن و خستنیان بۆ سەر هیچ ڕێگەیەك ﴿إِلَّا طَرِيقَ جَهَنَّمَ﴾ بێجگە لە ڕێگەی دۆزەخ، کە ئەیانخاتە ناو ئەو دۆزەخە بە جۆرێك: ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗا﴾ ئەمێننەوە تیای دا بە هەمیشەیی و بێ بڕانەوە، ﴿وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا﴾ ئەوەی کە باس کرا بۆیان لەسەر خوا ئاسانە و هیچی تێ ناچێ! ئەو بەد بەختانە تەنیا ستەمی بێ بڕوایی یان نەکرد، بەڵکو لەگەڵ ئەوەدا ستەمی ڕێگرتنیان کرد لە ئایینی خوا، بەهۆی ئەوەوە بە قوڵی چوونە ناو بێ بڕوایی یەوە، بە قوڵێ چوونە ناو ستەمەوە، لەبەر ئەوە خوایش بە داد و دادپەروەریی خۆی ئەو سەرەنجام و تۆڵەی بۆ دانان. ئەوانە بە مەیل و هەڵبژاردنی خۆیان هەموو ڕێگەیەکی لێ بوردنیان لەخۆیان بڕی لەبەر ئەوە خوایش ڕێی لێ خۆش بوونی لێ داخستن، ئەوانە بە مەیل و ئارەزووی خۆیان هەموو ڕێگەیەکیان لە خۆیان بەست بێجگە لە قاپی دۆزەخ، بە قوڵێ خۆیان تێ توڕ دا، بە هۆی ئەوە شایستەی مانەوەی هەمیشەیی و بێ بڕانەوە بوون، خوا پەنامان بدات لە خەشم و سزای خۆی.

ئەم ئایەتانە هەرچەند لە جوولەکەی ئەو سەردەمەدا هاتنە خوارەوە، ئەو سیفەت و کردەوە پیسانە بە تێرو تەواوی لەوان دا بوو، هەرچەند بەو جۆرە بوو بەڵام بە شێوەی گشتی مەبەستە و نەبەستراوە بە هیچ گەل و کۆمەڵ و کات و چەرخێکەوە، ئینجا ئەگەر مەبەست بەوانە هەرکەسێکی تایبەتی بن کە خوا زانیویەتی لە جیهان دا هەر لەسەر ئەو بارو کردەوە ئەبن بە بێ تۆبە و گەڕانەوە، ئەو کاتە هیچ مەرجێك بڕیار نادرێ بۆ تۆڵە و هەڕەشەکە، ئەگەر مەبەست بەوانە بە شێوەی گشتی بێ لەوانەی کە لە جیهان دا تۆبە و پەشیمان بوونەوەیان بووبێ و ئەوانەی کە بە بێ تۆبە مردبن، ئەگەر بەم گشتی یە مەبەست بن، ئەو کاتە ئەبێ مەرجی تۆبە نەکردن و بڕوا نەهێنان بڕیار بدەین، واتە ئەوانە خوا ئەیانخاتە دۆزەخ بە بێ بڕانەوە ئەگەر لە پێش مردنیان دا نەگەڕێنەوە بۆلای خوا، لە پاش ئەو باس و بەیانە.

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُمُ ٱلرَّسُولُ بِٱلۡحَقِّ مِن رَّبِّكُمۡ فَـَٔامِنُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ وَإِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿١٧٠﴾ يَـٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ

---

ئینجا به شێوەیەکی گشتی بانگ ئەکاتە هەموو ئادەمی بۆ بڕوا هێنان بەم دواترین فروستادە و پەیامەی که خوا ناردنی، هەرکەس بڕوا نەهێنێ خوا هیچ پێویستی پێ ی نی یه و ئەو کەسە خۆی زیان ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئەی ئادەمی بە تێکڕایی، ﴿قَدۡ جَآءَكُمُ ٱلرَّسُولُ بِٱلۡحَقِّ مِن رَّبِّكُمۡ﴾ بێگومان هاتووە بۆلاتان ئەو فروستادەی که نامەدارەکان بە تەمای هاتنی بوون و موژدەیان ئەدا پێ ی و هەڕەشەیان ئەکرد پێ ی لە بێ بڕوایان، ئەو فروستادەیە هات بە هەق و ڕاستی یەوە و هەق و ڕاستی پێ یە، واتە قورئان و ئایینی پاکی ئیسلام، هاتووە بۆلاتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە، کەواتە بەم قورئانە پەروەردەتان ئەکات و ئەتانگەیەنێ بە ڕادەو پلەی تەواوی خۆتان ﴿فَـَٔامِنُواْ﴾ کەواتە بڕوا بێنن، بڕوا بێنن بەم فروستادە و بەم نامە و ئایینە ڕاستەی که پێ یەتی ﴿خَيۡرٗا لَّكُمۡ﴾ شتێ بکەن و بەدوای شتێك دا بگەڕێن که چاکە بۆتان، چونکە پاك و خاوێنتان ئەکات لە چڵك و چەپەڵی دیوی دەرو ناوتان، ئامادەو شایستەتان ئەکات بۆ خۆش بەختی و بەختەوەریی نەبڕاوە، ﴿وَإِن تَكۡفُرُواْ﴾ ئەگەر بڕوا ناهێنن ﴿فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ﴾ ئەوا بێگومان هەرچی وا لە ئاسمانەکان و هەرچی وا لە زەوی دا هەر هینی خوایە و موڵك و دروست کراوی خوایە، واتە ئەگەر بڕوا ناهێنن بێگومان خوا هیچ پێویست نی یە بە ئێوەو بە بڕوا هێنانی ئێوە، خوا دەسەڵاتی هەیە بەسەر سزادان و تۆڵە سەندن لێتان، چونکە هەرچی وا لە ئاسمانەکان و وا لە زەوی دا هەر هینی ئەوە، ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا﴾ خوا هەمیشە زانایە بە هەموو شتێ که هێندێ لەو شتانە بڕوا نەهێنانی بێ بڕوایانە، خوا لێزان و کاردروستە لە هەموو تەگبیر و کرداری دا که یەکێ لەوانە سزادانی بێ بڕوایان و تاوانبارانە.

لەو چەند ئایەتەی ڕابوردوودا گەردش و خولانەوەی کرد بە دڵ و دەروون لەگەڵ جوولەکەکاندا، لەو چەند ئایەتەدا پاکێتی عیسا و دایکە پاکەکەی دەرخست لەو دەلەسە بۆگەنانەی که جوولەکەی ناپاك دەست هەڵبەستیان کرد سەبارەت بۆ ئەو دووانە پاك و

خاوێنە، لەگەڵ باسی هێندێ لە کردەوەی ناڕاست و ناهەق و لاری و سەرکێشی و نالەباری یان، نەفرینی خوایان لێ بێ. ئینجا لەم چەند ئایەتی داهاتووەدا باوەڕی راست و عەقیدەی راست روون ئەکاتەوە سەبارەت بە حەزرەتی عیسا، ئەو زیادە رەوی یە بە درۆ ئەخاتەوە کە مەسیحی یەکان کردیان لەبارەیەوە، هەروەها ئەو هەموو قسە و رای پڕو پووچ و بیرو باوەڕی بت پەرستی یە کە وەرگیرا لە چەند گەل و میللەتەکانی ترەوە و تێکەڵی ئایین و شەریعەتە پاکەکەی حەزرەتی عیسا کرا، ئیتر راو قسەی پووچی ئیغریقی یەکان و رۆمانی یەکان، یان پڕوپووچی چەرخی کۆنی میسریی یەکان و هیندی یەکان!

قورئان ئایین و عەقیدەی نامەدارەکانی پاك و خاوێن کرد و بارە راست و رەواکەی کە خوا ناردی لە تەورات و ئینجیل دا دەرخست، بژارەی ئەو هەموو دەست کاری و شتی پڕو پووچەی کرد و بە درۆی خستنەوە، هەرچۆنێ بیروباوەڕ و عەقیدەی بت پەرستەکانیشی بە درۆو پڕو پووچ دەرکرد کە بنچ بەس بوو بوو لە نیوە دورگەی عەرەب دا، وە ئایین و عەقیدەی راست و پاکەکەی حەزرەتی ئیبراهیمی دەرخست، کە ئەوانە لاف و گزاف ئەوەیان بوو کە وان لەسەر ئەو ئایینە وە هەر تەپ و تۆز و راو بڕیاری لارو چەوت کە لەلایەن نەزان و نەفامانەوە دەست هەڵبەست کرابوون و سەپێنرا بوون بەسەر ئایینە پاکەکەی حەزرەتی ئیبراهیم دا. هەرکام لەوانەی بە درۆ خستەوەو بە پڕو پووچ و دەست هەڵبەستی دەرکرد!

قورئان تەنها ئەو بیرو باوەڕانەی رەت نەکردەوە، بەڵکو هات بۆ ئەوەی عەقیدەو بیرو باوەڕی راست و رەوا لەبارەی خواوە بە بێ گەرد و تۆز دەربخات، هەر لادان و زیادە رەوی و کەم و کوڕی یەك کە لەلایەن ئادەمی یەوە هات و رووی کردە ئەو عەقیدە و بیرو باوەڕەی هەرکام لەوانە دوور بخاتەوە و هەرچی لاری یەك پەیدا بووە راستی بکاتەوە. لە قورئانەوە دەرئەکەوێ هەر هەڵە و لادانێك کە بووە لە بۆچوونی(ئەرەسطۆ) دا لەبارەی تاك و تەنیایی خواوە کە لە(ئثینا) دا دای هێنا، هەروەها هەر هەڵە و لادانێك کە هەبووە لە بیرو باوەڕەکەی(افلاطون) ی ئەسکەندەری یە لە پاش لە دایك بوونی حەزرەتی عیسا، هەرچی بیرو باوەڕی پێش و پاشی ئەوان، قورئان هەموو ئەو هەڵە و لاری یانەی پێ راست ئەبێتەوە، کە هەرچی ئەو بیرو باوەڕانەیە هاتوون لە تروسکە روناکی ژیریی یەوە، کە ئەوەش بە

تەنیا بەس نی یە و پێویستە ژیریی پشت ببەستێ بە ڕێنموونی ئاسمان و کۆمەکی و دەست گرتنی پەیامی ئاسمان.

ئەوەی کە لەم چەند ئایەتەدا باسی ئەکات مەسەلەی بڕوا بە سێ خوایە و کوڕێتی حەزرەتی عیسا بۆ خوا کە بە نەفامی ی و نەزانی هێنران و تێکەڵی ئایینی عیسا پێغەمبەر کران و بەهۆی ئەوەوە ئایینە ڕاستەکەی خوا ڕۆیشت و ئەو عەقیدە و بڕوا پووچە هاتە کایە و شوێنی! کاتێ ئیسلام هات ئەو بیرو باوەڕەی کە هەموو مەسیحی یەکانی لەسەر بوو - بە هەموو مەزهەبە جیاوازەکانی یەوە - ئەمە بوو کە خوا یەکێکە و لە سێ ئەسڵدایە: أب، ابن، روح القدس، وە عیسا کوڕەکەیە، ئینجا لەپاش ئەوە چەند مەزهەبێك پەیدا بوو سەبارەت بە عیسا، ئایا سروشتێکی تێکەڵی هەیە لە خوایەتی و ئادەمێتی؟ یان هەر سروشتێکی خوایەتی هەیە؟ ئایا خاوەنی یەك ئیرادە و پلەیە لەگەڵ جیاوازی هەردوو سروشتەکەی دا؟ ئایا ئەمیش وەك(أب) هەر بووە و هەر قەدیمە یان دروست کراوە لە پاش نەبوون؟ بەو شێوەیە چەند کۆمەڵ و مەزهەبێك پەیدا بوون، لەسەر ئەوە چەند جەنگ و کوشتن و بڕین و ئاوارە کردن بەرپا بوو لەناو ئەو خاوەن مەزهەبانەدا، وەك لەمەو پاش لە سورەتی(المائدة) دا بە یارمەتی خوا بە درێژیی باسی ئەکەین، ئەم بیرو باوەڕە پووچە کە کەوتە ناو مەسیحی یەکان، هەمیشە ڕۆشنبیرەکانیان دژی بوون، بەهۆی ئەوەوە پیاوی کەنیسە لە هەموو بارو ڕوویەکەوە هەوڵیان داوە بۆ چەسپاندنی ئەو باوەڕە لارە، کە یەکێ لەو ڕێ یانە ئەمە بوو کە ئەیانگوت: ئەمە شتێکی نەزانراوە و ئێمە تێ ی ناگەین مەگەر ڕۆژێك کە پەردە لابرێ بەسەر هەرچی وا لە ئاسمانەکان و زەویدا!

با لێرەدا بوەستین و زیاد لەسەری نەڕۆین و بێینەوە سەر ئایەتەکان و تەفسیریان، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ ئەی نامەدارەکان - واتە مەسیحی یەکان - ﴿لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ﴾ زیادە ڕەوی مەکەن لە ئایینەکەتان دا، بەم ڕەنگە تێپەڕن لەو سنوورانەی کە بۆتان دیاریی کراوە، چونکە زیادە ڕەوی وەك کەم و کوڕی کردن هەردوو لادانە لە ئاین و ڕێگە ڕاستەکەی خوا، یەکێ لەو زیادە ڕەوی یانەیان ئەمەیە کە عیسایان لە ڕادەو پلەی بەندەیی و پێغەمبەرێتی بەرز کردەوە بۆ ڕادەی خوایەتی!

﴿وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّۚ إِنَّمَا ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلْقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۖ وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌۚ ٱنتَهُواْ خَيْرًا لَّكُمْۚ إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌۖ سُبْحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٌۘ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿١٧١﴾﴾

---

زیاده ڕەوی جوولەکەکان لە پەست کردنەوەی ڕادەو بەرزی عیسا و دایکی دا – سەلامی خوایان لێ بێ – دەست نیشانی بۆ کرا لە ئایەتەکانی پێشوودا، لەبەر ئەوە لێرەدا ئەوە ناکەین بەوێنە و نموونە، نامەدارەکەمان بڕی بەسەر مەسیحی یەکان دا. ﴿وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّۚ﴾ هیچ نەڵێن لەبارەی خواوە بێجگە لە وتەو قسەی ڕاست، کە بریتی یە لەوەی خوا بێ وێنەوتاك وتەنیایەوپاکەلەوەی کە کوڕ و هاوسەری ببێ، وە لەوەی یەك بگرێ لەگەڵ شتێکی تر، یان بگۆڕێ و ببێ بە شتێکی تر یان بچێتە ناو شتێکی تر، یان سێ یەمی سێ خوا بێت، واتە لە خۆتانەوە هیچ نەڵێن و هیچ دەست هەڵبەست نەکەن، بەڵکو شتێك بڵێن کە دەقێکی لەسەربێ لەلایەن خواوە، یان بەبێگومان ڕابەروبەڵگەیەکی ژیریی ئاشکرای لەسەر بێت.

خوا بە پێی دەقە ئاسمانی یەکان و بەڵگە و ڕابەرە ژیریی یەکان پاکە لە وێنەو هاوبەش، داهێنەرو دروست کەرە بۆ هەموو شتێکی تر، داهێنەریی و دروست کردنەکەی داخوازە بۆ ئەوەی کە جیاواز بێت لە دروست کراوەکانی، ئینجا باری ڕاستەقینەی عیسا و دایکی روون ئەکاتەوە تا ئەو زیادە ڕەوی کەرانە بگەڕێنەوە لە زیادە ڕەوی کردنەکەیان و بێنەوە بۆ سەر ڕێگە ڕاستەکەی خوا، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ﴾ پیرۆز و بەفەڕ کە عیسای کوڕی مەریەمە ﴿رَسُولُ ٱللَّهِ﴾ هەر پێغەمبەر و فروستادەی خوایە ﴿وَكَلِمَتُهُۥٓ﴾ پێك هێنراو و بەدی هێنراوی وتەی خوایە کە هەرکاتێ ویستی هەر شتێك ببێ ئەفەرموێ: ببە، ئیتر ئەو شتەش ئەبێ بە بێ دواکەوتن، یان مەبەست ئەو مزگێنی یەیە کە خوا دای بە مەریەم لەسەر زوبانی فریشتەیەك، لەسەر هەر بار ئایا مەبەست نیازو ئیرادەی خوا بە بێ وتە، یان لەگەڵ وتەکەیش دایە، بە هەر جۆر مەبەست بێ ﴿أَلْقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرْيَمَ﴾ خوا ئەو وتەیەی نارد بۆلای مەریەم و گەیاندنی پێی، بەهۆی ئەوەوە عیسای لە سکی دایکی دا دروست کرد بە بێ پێویستی بە باوك و ئاوی باوك – وەك بەو جۆرە باوە بۆ هەموو رۆڵە و نەوەکانی تری ئادەم – وە نابێ سەر بکرێتەوە لە دروست کردنی عیسا لە سکی دایکی دابەو فوەی

كه(جوبرەئيل) كردى بە يەخەى كراسەكەى مەريەم دا، وەكو ئەفەرمویٚ: ﴿أَلْقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرْيَمَ﴾ واتە دروست كرا بە فويەك لە لايەن(روح الله) وە كە(جوبرەئيل) ە. بە چەند جۆرێكى تريش تەفسیر كراوەتەوە و هەركام ئەگونجێن و وتراون، بەلاّم لەم كاتەدا ئەمەم هەڵبژارد و بەلامەوە جوان بوو.

﴿فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ﴾ كەواتە بڕوا بێنن بە خواو خوايەتى تايبەتى بكەن بە ئەوەوە و ڕەواى مەدەن بۆ هیچ كەسێكى تر ﴿وَرُسُلِهِۦ﴾ وە بڕوا بێنن بە فروستادەكانى بە تێكڕايى، هیچ كام لەوان بەرز مەكەنەوە بۆ رادەو پلەى خوايەتى ﴿وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌ﴾ نەڵێن: خواكانمان سيانن:(الله، عيسا، مەريەم). يان خوا سيانە بەم ڕەنگە يەكە بە جەوهەرى يەت، سيانە بە ئوقنومى يەت، وە مەبەست بە ئوقنومەكان سێ سيفەتە:(وجود و عليم و حيات) و هەركام لەم ئوقنومانە خوايە، ﴿ٱنتَهُواْ﴾ كۆتايى بێنن لەو وتە ناڕاست و ناڕەوايە كە دەست هەڵبەستتان كرد و داتان هێنا لە ئايينى خوادا، بە شوێن كەوتن و لاسايى كردنەوەى بت پەرستەكان ﴿خَيْرًا لَّكُمْ﴾ ئەو كۆتايى هێنانە باش ئەبێ بۆتان، يان مەبەست ئەوەيە: شتێ بكەن و بەدواى شتێك دا بگەڕێن و شتێ بڵێن كە چاكە بۆتان، ئەوەش تاك و تەنيايى و پاكى خوايە لە هەموو هاوبەش و وێنەيەك، كە هەموو پێغەمبەران بۆ ئەوە هاتوون، ﴿إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ﴾ ئەو كەسەى كە ناوى(الله) يە هەر ئەو خوايە يەكە و تاك و تەنيايە. ﴿سُبْحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٌ﴾ پاك و بێگەردە لەوەى كە هیچ كوڕ و رۆڵەيەك ببێ بۆى، چونكە سك و زاو رۆڵە بۆ ئەوانەيە كە نامێنن و لەو ڕێگەيەوە ژيانيان درێژە بكێشێ، دەى خوا هەر بووە و هەر ئەمێنێ و بێ پێویستە بە هیچ شتێك، كوڕ و رۆڵە بەش و پارچەيەكە لە باوك و دايك، دەى هەرچى وا لە ئاسمانەكان و زەوى دا يەكسەر دروست كراو و موڵكى خوايە و ناگونجێ بەش و پارچەى ئەو بن، وەكو ئەفەرمویٚ: ﴿لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ هەر هینى خوايە بە دروست كردن وبەخاوەنى و بە موڵكايەتى هەرچى وا لە ئاسمانەكان و هەرچى وا لە زەويدا ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا﴾ بەسە خوا بەوەى چاودێر و پارێزەر و هەموو شت بدرێتە دەستى و حەواڵەى ئەو بكرێ، كەواتە هەموو شت پێویستە بەو و ئەو هیچ پێویستى نى يە بە هیچ كەس و بە هیچ شتێك، كەواتە چۆن ڕەوا ئەدرێ بۆ ئەو كوڕ و رۆڵە، كە مافى كەمێكە كە پێویستى ببێ بە كۆمەك و يارمەتى دەرو لە پاش خۆى ببن بە جێنشین و جێگر بۆى!!

﴿لَّن يَسْتَنكِفَ ٱلْمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبْدًا لِّلَّهِ وَلَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ۚ وَمَن يَسْتَنكِفْ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيَسْتَكْبِرْ فَسَيَحْشُرُهُمْ إِلَيْهِ جَمِيعًا ﴿١٧٢﴾﴾

**ئینجا هەمیتر ئەڕوا لەسەر راست کردنەوەی عەقیدەو بیرو باوەڕ، بەمەی روونی ئەکاتەوە کە هەردوو شت لە ئارادایە: خوایەتی، بەندەیی: خوایەتی یەکی تەنیا بۆ خوای تاك و تەنیا، وە بەندەیەکی گشتی بۆ هەموو دروست کراوەکانی خوا بە پێغەمبەران و بە هەموو فریشتەوجنۆکە و ئادەمی یەوە، ئەفەرموێ: ﴿لَّن يَسْتَنكِفَ ٱلْمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبْدًا لِّلَّهِ﴾ هەرگیز مەسیح – واتە عیسا – سەرپێچی ناکات و بێزار نی یە و خۆی بە بەرز نازانێ لەوەی بەندەیەك بێت بۆ خوا، بەم رەنگە هەمیشەیی بێت لەسەر پەرستن و گوێ رایەڵی بۆی کە کار و پیشەی بەندە ئەبێ ئەوە بێت. بێگومان بەندەیی بۆ خوا پایە و پلەیەکی زۆر بەرزو بە نرخ و خۆشەویستە بەلای عیسا و هەموو پێغەمبەرانەوە – سەلامی خوایان لێ بێت – وە مایەی فەخرو شانازی یە، بەلأم لەباتی ئەوە لێرەدا فەرموی سەرپێچی ناکات... هتد، چونکە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لە وەلأم و بەرپەرچ دانەوەی مەسیحی یەکانی(نجران) دا، وەلأم و بەرپەرچ دانەوەیش بە پێی پرسیار ئەدرێتەوە: ئەو تاقمە گوتیان بە پێغەمبەر(ﷺ): ئایا لەبەرچی تۆ هاوەڵەکەی ئێمە لەکەدار ئەکەیت؟ ئەویش فەرموی هاوەڵی ئێوە کێ یە؟ ئەوانیش گوتیان: عیسا، ئەویش فەرموی: من چی ئەڵێم دەربارەی؟ ئەوانیش گوتیان: تۆ ئەڵێیت ئەو بەندەی خوایە. ئەویش فەرموی: هیچ عارو عەیب نی یە کە ئەو بەندەی خوا بێت. ئەوانیش گوتیان با ئەوە عار و عەیبە. ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە ئەو ئەگەیەنێ هیچ عارو عەیب لەوەدا نی یە و عیسا سەرپێچی لەوە ناکات و بە عەیب و لەکەی نازانێ، نە مەسیح سەرپێچی ئەکات لەوەی بەندەیەك بێت بۆ خوا ﴿وَلَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ٱلْمُقَرَّبُونَ﴾ وە نە فریشتە نزیك خراوەکان سەرپێچی ئەکەن و بێزارن لەوەی بەندەی خوابن ﴿وَمَن يَسْتَنكِفْ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيَسْتَكْبِرْ﴾ هەرکەسێك سەرپێچی بکات لە پەرستن و گوێ رایەڵی خوا و بیەوێ ئەوە لە خۆی بسرێتەوە، وە خۆی بە گەورەتر دابنێ لەوەی ئەو پەرستن و گوێ رایەڵی یە بکات ﴿فَسَيَحْشُرُهُمْ إِلَيْهِ جَمِيعًا﴾ بێگومان سەرپێچی کەران و گوێ رایەلأن خوا هەموویان کۆ ئەکاتەوە پێکەوە بۆلای خۆی لە رۆژی دوایی دا، ئینجا موحاسەبە و پرسیاریان ئەکات و هەرکام سەرەنجام و بەرهەمی کردەوەی خۆیان پێ ئەدات،**

فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمۡ أُجُورَهُمۡ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسۡتَنكَفُواْ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ فَيُعَذِّبُهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴿١٧٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُم بُرۡهَٰنٞ مِّن رَّبِّكُمۡ

---

**بەم جۆرەی کە ئەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ئینجا ئەوانەی کە لە جیهان دا بڕوایان هێنابێ و کردەوە چاکەکانیان کردبێ ﴿فَيُوَفِّيهِمۡ أُجُورَهُمۡ﴾ ئەوانە ئەجرو کرێکانی خۆیانیان پێ ئەدات بە تێرو تەواوی و بەو شێوەی کە شایستەن بۆی سەرو بەرە لەگەڵ بڕوا و کردەوەکانیان دا، ئینجا سەرباری ئەوە و زیاد لەوە ﴿وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦۖ﴾ زیادیان ئەکات و بەشی زیاتریان پێ ئەبەخشێ – کە لای خوارووەکەی دە قاتە – لە بەهرەو کەرەم و بەخشندەیی خۆی، ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسۡتَنكَفُواْ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ﴾ ئەوانەی کە سەرپێچی یان کرد و خۆیان بە زل ئەزانی ﴿فَيُعَذِّبُهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا﴾ ئەوانە خوا سزایان ئەدا بە سزایەکی ئازار دەر هەرچۆن شایستەن بۆی بە پێی باو زانینی خوا ﴿وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا﴾ دەستیان ناکەوێ لەلایەن غەیری خواوە هیچ دۆست و کاربەدەستێك کە کاروباریان بگرێتە دەست و تەگبیر و چارەسەریان بکات، هیچ کۆمەك و یارمەتی دەرێکیان دەست ناکەوێ کە رزگاریان بکات لە سزا سەختەکەیان.**

**ئا بەو جۆرو شێوەیە قورئان قسە و بڕیاری راست و رەوا و زاڵ و بەرگری نەکراوی خۆی دەربڕی لەبارەی حەزرەتی عیساوە(علیه السلام) کە نامەدارەکان لادان و زیادە رەوی یان تیا کرد، هەروەها دەربارەی فریشتەکانی خوا کە زۆر لە بت پەرستەکان و بێ بڕوایانی تریش لادان و زیادە رەوی یان کرد لەمان دا، بە تایبەتی نەفامانی عەرەب کە لایان دابوو، وە ناویان ئەبردن بە کچی خوای پاك و خاوێن لە هەموو وێنە و رۆڵەیەك، لێرەو لە چەند شوێنی تردا قورئان بە روونی دەری خست کە بۆچوون و باوەڕ ئەبێ لەسەر دوو شت دامەزرێ: خوایەتی و بەندەیی، خوایەتی تەنها بۆ خوا بە بێ هیچ هاوبەشێك، وە بەندەیی بۆ هەموو کەسی تر، بە گشتی و بە تێکڕایی، بەو دوو شتە پەیوەندی و پەیوەستی هەیە لە بەینی خوا و دروست کراوەکانیدا.**

خوای پەروەردگار کە داوا ئەکات لە بەندەکانی سەری بەندەیی بۆ داخەن و تەنها ئەو بپەرستن و گوێ رایەڵی هەر ئەو بن، هیچ جۆرە پێویستی یەکی نی یە نە بەوان و نە بە پەرستنەکەیان، بە پەرستن و بەندەیی ئەوان موڵك و پادشایەتی ئەو زیاد ناکات، وەك بە یاخی بوون و بێ بڕوایی یان هیچ کەم و کوڕی یەك روو ناکاتە موڵك و پادشایەتی یەکەی. بەڵام میهرەبانە و پێی خۆشە بەندەکانی بژین بە ژیانێکی بەرزو بەرێزی ئادەمی یانە و جیاببنەوە لە گیان لەبەرەکانی تر، پێی خۆشە بەندەکانی بژین بە بۆچوون و هەستێکی راست و رەواوە، بژین بە ئازادی و سەربەستی تەواو، بژین لەژێر سایە و سێبەری دادو دادپەروەری دا، دوور لە هەر جۆرە ستەم و نارەوایی،خوای میهرەبان پێی خۆشە بەندەکانی بژین بەو ژیانە بەرز و بەرێزە لەم جیهان و زەوی یەدا، پێش هاتنی ژیانی راستەقینەی ئەو جیهان، بێگومان ئەو ژیانەش کە باس کرا دەست کەوت نابێ تەنها بەوە نەبێت کە بەندەکانی خوا تەنها خوا بپەرستن و هەر گوێ رایەڵی ئەوبن و هەر شوێنی بەرنامە و شەریعەتی ئەو بکەون لە دواترین شێوەکەی دا کە پێغەمبەرمان(ﷺ) هێنای، هەرچی ناراستی و لاری و ستەم و بەدی کە لە جیهان دا روو بدا روو ئەدا، هەموو ئەوانە کانگا و سەرچاوەکەیان لادانە لە شەریعەت و بەرنامەکەی خوا.

لەپاش ئەوەی لەم سورەتەدا باسی ناراستی و نارەوایی بیرو باوەڕەکانی تری دەرخست، دەم کوتی بت پەرستان و ناپاکان و جوولەکە و گاورەکانی کرد. لە پاش ئەوە ئینجا بانگی هەموو ئادەمی ئەکات بە تێکرایی کە بێن و شوێنی پێغەمبەر و قورئانەکەی بکەون، بەڵێنی زۆر گەورەی دا بە هەر کەسێك کە گوێ رایەڵی ئەم فەرمانە ئەبێت و دێت بە دەم ئەم بانگەوە، ئەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئەی ئادەمی بە تێکرایی ﴿قَدْ جَآءَكُم بُرْهَـٰنٌ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ بەڕاستی هات بۆلاتان و پێتان گەیشت رابەرو بەڵگەی ئاشکرا لەلایەن پەروەردگارتانەوە، واتە هات محمد کە خۆی بەخۆی شایەت و رابەرو نیشانەیەکی روون و ئاشکرایە لەسەر پێغەمبەرێتی یەکەی بە لای هەرکەسێکەوە کە ئاشنا و شارەزا بێت لە مێژووی ژیانی و رەوشت و کرداری پاك و بێگەردی، هەر لە هاتنە جیهانی یەوە تاکو کۆچ کردنی لە جیهان، پەیدا بوون و پێگەیشتنی بە نەخوێندەواری و بە بێ فێرکەرو مامۆستا، لەناو گەل و کۆمەڵێکی نەخوێندەوار و نەفام و نەزانی بێ وێڵ، بە هەژاریی و شوانی، پەیدا بوون و پێگەیشتنی بەو جۆرە و لەگەڵ ئەوەدا زانین و وێڵ و رەوشت و کرداری پاك وخاوێنی پێشووەکان و پاشووەکانی پێ بوو.

وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا ﴿١٧٤﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱعْتَصَمُوا۟ بِهِۦ فَسَيُدْخِلُهُمْ فِى رَحْمَةٍ مِّنْهُ وَفَضْلٍ وَيَهْدِيهِمْ إِلَيْهِ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿١٧٥﴾

---

تەنها ئەوە بەسە بە بەڵگە و رابەری بەهێز لەسەر پێغەمبەرێتی یەکەی(ﷺ) ئای چەند شیرینی فەرمووە(ئیمامی بوصیری) - خوای لێ رازی بێت - کە بە کورتی ئامارژە ئەکات بۆ ئەوە لەم تاقە هۆنراوەدا:

**كفاك بالعلم في الأمي معجزة          في الجاهلية و التأديب في اليتم**

واتە بەسە بۆت بە موعجیزە و زانینەکەت لەناو گەلی نەخوێندەوار و لە سەردەمی نەفامیدا، وە بەسە خووڕەوشتی بەرزت لەکاتی هەتیوی و پێگەیشتنت بە هەتیویی!!

﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا﴾ ناردمانە خوارەوە بۆلای ئێوە رووناکی یەك کە خۆی بەخۆی روون و ئاشکرایە و روون کەرەوەی هەموو هەق و ناهەقێکە. واتە ئەم قورئانە پیرۆزە کە گەورەترین موعجیزەی خوایە و هەموو ئادەمی و جنۆکە دەستە پاچە و سەرگەردانە لە ئاستی، خۆی بەخۆی ئاشکرایە و بەهێزترین بەڵگە و رابەرە لەسەر راستی خۆی و روون کەرەوەری هەموو هەق و ناهەقێکە، نیشاندەری رێگە راستەکەی خوایە، دەست گیرو پشت گیرە بۆ هەرکەسێك کە دەستی بۆ راکێشێ و پشتی پێ ببەستێ، تا ئەیگەیەنێ بە خێرو خۆشی هەردوو جیهان.

خوای میهرەبان ئەم پێغەمبەرو قورئانەی نارد بۆ هەموو ئادەمی تا بەهۆی ئەم دووانە و لەرێی ئەمانەوە بەندەیانی خوا بڕوا بێنن بە خوای خۆیان و پەیوەندی بکەن پێ یەوە، ئینجا ئەم بەڵێن و مزگێنی یە ئەدات بەو کەسانەی کە بەو جۆرە ئەکەن، ئەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ﴾ ئینجائەوکەسانەی کەبڕوایان هێنالەم جیهانەدابەخوا ﴿وَٱعْتَصَمُوا۟ بِهِۦ﴾ دەستیان گرتبێ پێیەوە و خۆیان بەستبێتەوە بەهۆی گەیشتن و رەزامەندی ئەو ﴿فَسَيُدْخِلُهُمْ فِى رَحْمَةٍ مِّنْهُ﴾ ئەوانە خوا بێگومان ئەیانخاتە ناو میهرەبانی یەکی گەورە لەلایەن خۆیەوە، واتە ئەجرو پاداشتێکی زۆر گەورەیان ئەداتەوە بە میهرەبانی خۆی، نەك بەمەی ئەو ئەجرو پاداشتە پێویست بێت لەسەری وەك هێندێك نەزان وا ئەڵێن و ئەو قسە ناڕەوا ئەکەن، یان مەبەست بە(رحمة) بەهەشتە، وەك لە(ئیبن و عەباس) ەوە ئەگێڕنەوە - خوایان لێ رازی بێت

- ﴿وَفَضۡلٖ﴾ بەهرەو چاکەیەك کە گەورە و گرنگە ﴿وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَيۡهِ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا﴾ ئەیانخاتە سەر ڕێگەیەکی ڕاست بۆلای خۆی کە ئەوەش ئیسلام و مل کەچی و گوێ ڕایەڵی یە بۆی لە جیهان دا و ڕێگەی بەهەشتە لە ڕۆژی دواییدا. ئەم ئایەتە بە چەند جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوە هەرکام ئەگونجێ و ڕێکە هەرکەس ئەیەوێ با تەماشای کتێبەکانی تەفسیر بکات.

ئەم سورەتە لە سەرەتاوە زۆر بە گرنگی دوا لەماڵ و خێزان و پەیوەندی یەکانی نێوانیان لە گەلێ بارو ڕووەوە کە یەکێ لەوانە مەسەلەی میراتی و کەلەپوور بوو و میراتی بەران و میراتی لێ بەران، لەناو ئەوانەدا باسی(کلالە) ی کرد کە بە پێی فەرموودەی حەزرەتی ئەبوبەکر و کۆمەڵێك – خوایان لێ ڕازی بێت – بریتی یە لە کەسێك کە نە باوکی بەجێ هێشتبێ و نە ئەولاد، ئینجا ئەو(کلالە) یە دوو جۆرن:

١- ئەو کەسەی کە براو خوشکی پشتیشی بەجێ نەهێشتبێ، بەڵکو براو خوشکی دایکی بەجێ هێشتبێ.

٢- ئەوەی کە برا و خوشکی باوك و دایکی یان باوکی بەجێ هێشتبێ.

ئینجا لە پێشەوە هەر باسی کەلەپووری جۆری یەکەمی کرد، بەم ڕەنگە ئەو بەشەی کە دایك وەری ئەگرێ لە ڕۆڵە مردووەکەی یەك لەسەر شەش یان یەك لەسەر سێ یە کاتێ کە مرد ئەدرێ بە ڕۆڵەی، بەم ڕەنگە ئەگەر تەنیا یەکێك بوو ئیتر کوڕ یان کچ یەك لەسەر شەشی پێ ئەدرێ. ئەگەر زیاد لە یەك بوو یەك لەسەر سێی پێ ئەدرێ. وەك لە سەرەتاوە ڕوون کرایەوە. ئینجائەوا لەدوایی سورەتەکەدا ئەگەڕێتەوە بۆ سەر(کلالە) وباسی جۆری دووەمیشی ئەکات، بەمە دوایی سورەتەکە پەیوەست ئەکات بە سەرەتاوە کە ئەوەش بە پێی یاسای ڕەوانبێژیی شتێکی جوان و بەتامە. ئەوەتا ئەبینرێ ڕەوانبێژێکیش پارچە هۆنراوەیەك یان وتارێك دوایی ئەهێنێ بە شتێك کە پەیوەستە بە سەرەتاوە، بەوە ئەو هۆنراوە و وتارە جۆش ئەدا و ئەیکات بە یەك شت، بێجگە لەوەش قورئان لێرەدا دوو مەبەستی گرنگمان نیشان ئەدات:

١- دەست نیشان ئەکات بۆ مەبەست لە(کلالە).

٢- بەشە کەلەپوور و میراتی براو خوشکی باوك ودایکی یان هەر باوکی دیاریی ئەکات کە لە ئایەتەکانی ڕابوردووی میرات و کەلەپووردا نەهاتووە و نەزانراوە.

﴿يَسۡتَفۡتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِي ٱلۡكَلَٰلَةِۚ إِنِ ٱمۡرُؤٌاْ هَلَكَ لَيۡسَ لَهُۥ وَلَدٞ وَلَهُۥٓ أُخۡتٞ فَلَهَا نِصۡفُ مَا تَرَكَۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمۡ يَكُن لَّهَا وَلَدٞۚ﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿يَسۡتَفۡتُونَكَ﴾ ئەی پێغەمبەر داوای فتوات لێ ئەکەن لەبارەی(کلالة) وە، واتە دابەش کردنی میراتی و کەلەپووری کەسێك کە بمرێ و باوك و ئەولادی لێ بەجێ نەمابێ و براو خوشکی باوك و دایکی یان هەر باوکی ببێ. ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە دەربارەی(جابری کوڕی عبدالله) – خوایان لێ رازی بێت – وەك (ئیمامی ئەحمەد و بوخاری و موسلیم و ئەبو داود و تیرمزی) ریوایەتیان کردووە کە(جابر) فەرمویەتی: پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ دیارم لە کاتێکدا کە من نەخۆش بووم و هۆشم بە خۆم نەبوو، ئینجا ئەویش دەست نوێژ ئەگرێ و ئاوی دەست نوێژەکەی ئەکات بەسەرمدا و منیش هۆشم کردەوەو عەرزم کرد کە من باوك و ئەولادم نییە و براو خوشکم هەیە: واتە غەیری دایکی وەك لە حەدیسێ تردا هاتووە. ئینجا ئەمانە چۆن میراتم لێ ئەبەن؟**

**ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو خوا فەرموی بە پێغەمبەر(ﷺ): ﴿قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِي ٱلۡكَلَٰلَةِۚ﴾ بلێ خوا فتواتان بۆ دەرئەکات لەبارەی ئەو(کلالة) ی کە پرسیارتان کردووە دەربارەی، بەم جۆرەی کە ئەفەرموێ: ﴿إِنِ ٱمۡرُؤٌاْ هَلَكَ﴾ ئەگەر یەکێك بمرێ ﴿لَيۡسَ لَهُۥ وَلَدٞ﴾ کە کوڕو کچی نەبێ ﴿وَلَهُۥٓ أُخۡتٞ﴾ لەکاتێك دا خوشکی ببێ، ئیتر باوکی و دایکی یا هەر باوکی ﴿فَلَهَا نِصۡفُ مَا تَرَكَ﴾ بۆ ئەو تەنیا خوشکە هەیە بە فەرز نیوەی ئەوماڵەی کە ئەو مردووە بەجێی هێشتووە، دیارە ئەگەر کوڕی میرات بەری ببێ ئەو کاتە ئەو خوشکە هیچ نابات بە بڕیاری هەموو زانایان، وە ئەگەر کچی ببێ ئەو کاتە هەرچی مایەوە لە بەشی کچەکە و هەر خاوەن فەرزێکی تر کە ببێ، کە ئەوەش هێندێ جار نیوەیە و هێندێ جار کەمترە، وەك بە درێژیی باس کراوە لە کتێبەکانی(فقە) دا. بێگومان میرات بردنی ئەم خوشکە بە مەرجێکە کە مردووەکە باوکی لێ بەجێ نەمابێ، بێجگە لەوەیش وتەی(کلالة) هەرچۆنێ نەبوونی باوك**

نەگەیەنیٚ، هەروەها نەبوونی ئەولادیش ئەگەیەنیٚ. کەواتە ئەبوایە ئایەتەکانە یان هیچ کامی باس نەکردایە، یان باسی هەردووکی بکردایە؟ لە وەلاٌمی ئەم پرسیارەدا چەند شتیٚك وتراوە، باشترو بەهیٚزتریان ئەمەیە: میرات نەبردنی براو خوشکی مردوو لەکاتی بوونی باوکیان دا، شتیٚکی زانراوە لە ئایەتەکانی رابردووەوە، حەدیس و کردەوەی ئوممەتیش هەر لەسەر ئەوە هاتووە، کەواتە هەرچۆنیٚ وتەی(کلالـة) ئەیگەیەنیٚ پیٚویست نەبوو بە باس کردن، بەلاٌم مەرجی دووەم نەزانراو و نەناسراو بووە پیٚش هاتنی ئەم ئایەتی ئیٚرە، کەواتە پیٚویست بوو باس کردنی و ئەگەر باس نەکرایە نە ئەزانرا بەم شیٚوەی ئیٚستا کە دەقی بەسەردا نراوە، بیٚجگە لەوە ئەگەر مەرجی یەکەمیش بوترایە لەگەلٌ دووەم ئەو کاتە وا گومان ئەبرا کە ئەم دوو مەرجە یەکسانن و وەك یەك وان، کەچی وایش نی یە، ئەوەتا لەگەلٌ بوونی باوك دا خوشکەکەی بیٚ بەشە لەسەر هەموو بارو روویەك، بەلاٌم بەو جۆرە نی یە لەگەلٌ بوونی ئەولاددا، کەواتە ئەگەر ئەو مەرجەش بوترایە مانا و مەبەستی ئایەتەکەی زۆر قورس و گران ئەکرد تا رادەیەك کە زۆر کەس سەری لیٚ نەئەشیٚوا. کەواتە پاکی و بیٚگەردی بۆ قورئانەکەی خوا بە ویٚنەی پاکی و بیٚگەردی یەکەی خۆی جل جلاله و عظمت كبريائه.

ئەوەی کە وتمان لەبارەی ئەو مەرجانەوە لیٚرەیش دا هەر هەمان شتە کە ئەفەرمویٚ: ﴿وَهُوَ يَرِثُهَآ﴾ ئەو مەردومە میراتی ئەبا لە خوشکەکەی کە لە پیٚشی یەوە بمریٚ ﴿إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ﴾ ئەگەر ئەو خوشکەی هیچ کوڕ و کچی نەبیٚ، ئەگەر بووی ئەوە بەم جۆرەیە: ئەگەر هەر کچی هەبوو ئەوا میراتی ئەبا ئیتر نیوە یان کەمتر، هەرچەند ببا بە فەرز نی یە و بەلٌکو بە(عصوبة) یە و بەشی(عصوبة) یش شتیٚکی دیاری کراو نی یە لەبەر ئەوەی بە بیٚ دیاریی کردن باسی فەرمو، وە ئەگەر هەر کچی نەبوو بەلٌکو هەر کوڕی هەبوو یان کوڕ و کچ ئەوا ئەو کەسە بیٚ بەشە، خوشك بیٚت یان برا، یەکیٚ بیٚت یان هەرچەند. ئەو کەسەی کە ناو ئەبریٚ بە(كلالة) لە بارەی خوشك و براوە سیٚ حالٌەتی هەیە:

١- یەك خوشکی هەبیٚ، وەك لە ئایەتەکەدا دابەش و باسەکەی تیٚپەڕی کرد.

﴿فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ ۚ وَإِن كَانُوٓا۟ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۗ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿١٧٦﴾﴾

---

٢- دوو خوشكى هەبێ، ئەمەش بەشەكەيان بەم جۆرەيە كە ئەفەرموێ: ﴿فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ﴾ ئينجا ئەگەر ئەو كەسەی كە ميراتی ئەبات بەناوی خوشكێتی يەوە دوان بوون ﴿فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ﴾ ئەوان بۆيان هەيە دوو لەسەر سێی ئەوەی كە براكەيان بەجێی هێشتووە، بێگومان زياد لە دوو خوشك تا هەرچەند هەر ئەو دوو لەسەر سێ يەيان بۆ هەيە، هەرچەند لە ئايەتەكەدا نەيفەرموە، بەڵگە لەسەر ئەوە چەند شتێكە:

ا- ئەو حەديسە سەحيحەی(جابر) ە كە ئەم ئايەتە بە بۆنەی و لە وەڵامی دا هاتە خوارەوە، وەك باسەكەی تێپەڕی كرد، بێگومان(جابر) خوای لێ رازی بێت حەوت خوشكی هەبوو.

ب- بڕيارو كردەوەی هەموو پێشەواو زاناكانی ئوممەت كە هەر ئەو دوو لەسەر سێ يەيان دياريی كردووە و بە زياد لە دوو خوشكيش.

ت- بەپێی دەقی ئايەت بەلای هەموانەوە زياد لە دوو كچ هەر دوو لەسەر سێ ئەبات، كەواتە باشتر ئەبێ زياد لە دوو خوشك بەشيان دوو لەسەر سێ بێت، چونكە كچێتی هۆيەكی بەهێزترە لە خوشكێتی بۆ ميرات وەرگرتن. هێندێ لە زانايان وتەيەكی شيرينيان هەيە لەم شوێنەدا. بە جوانی ئەزانم باس كردنی، ئەفەرمون: لەم ئايەتی ئێرەدا باسی زياد لە دووی نەكردووە بە بۆنەی ئەوەی كە لە ئايەتی كچەكان دا زياد لە دووی باس كردووە، وە لە ئايەتی كچان دا باسی دووی نەكردووە بە بۆنەی ئايەتی ئێرە هەر باسی دووی كردووە، كەواتە بە هەردوو ئايەتەكان بەشی هەردوو تاقمەكە دياريی كرا. ئەم جۆرە كردەوە بە پێی عيلمی بديع ناوبراوە بە(إحتباك) واتە لابردن لە پێشەوە بە بۆنەی باس كردن لە پاش دا، لابردن لە دواوە بە بۆنەی باس كردن لە پێشەوە.

حاڵەتی سێ یەم بۆ(کلالة) ئەمەیە کە خوشك و برای هەبێ ئیتر هەرچەند بن، ئەوە، بەم جۆرەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَإِن كَانُوٓاْ إِخْوَةً﴾ ئەگەر ئەوانەی کە میراتی ئەبەن بە برایەتی خوشکێتی مردووەکە، ﴿رِّجَالًا وَنِسَآءً﴾ چەند برا و خوشکێك بوون ﴿فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾ ئەوە بۆ هەر یەکێکیان هەیە ... ئەلەپوور بە وێنەی بەشی دوومێینە، وەك لە سەرەتا سورەتەکەوە باس کرا لە باسی میراتی کوڕ و کچ دا. ئینجا کۆتایی سورەتەکە بە گشت ئەهێنێ و باس(کلالة) بە تایبەتی بە فەرمودەیەك کە هەموو کاروباری ئادەمی ی ئەگێڕێتە بۆلای خواو پەیوەستیان ئەکات بە شەریعەتی خواوە، هۆی ناردنی ئەم ئایەتانەش با ئەکات لەگەڵ دەست نیشان بەوە کە لادان لەوەی کە خوا ناردی، سەراسەر گومڕایی هەڵەیە: ئەفەرموێ: ﴿يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ﴾ خوا کارو فرمانی ئایین و شەریعەتەکەی باس ئەکا بۆیان بە روونی کە لەم سورەتەدا دواتریان باسی(کلالة) بوو ﴿أَن تَضِلُّواْ﴾ لەبەر نەویستن پێ ناخۆش بوونی گومڕایی و لادانتان لە ڕێی ڕاست، واتە بە بێ ئەوەی کە خوا ناردی باسی کرد بۆتان ئێوە گومڕا نەبن و لانەدەن لە ڕێی ڕاست ﴿وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌۢ﴾ خوا هەموو شتێك زانا و ئاگادارە بە ئەوپەڕی رادەی زانین و ئاگاداریی. کەواتە هەموو حوکم بڕیارەکانی لە زانینی تەواوەوە هاتووە، سەراسەر خێرو بەرژەوەندی ئێوەی تێدایە، هەمو پڕە لە حیکمەت و کاردروستی. کەواتە تەنها دوو ڕێگە هەیە بۆ ژیان و سێ یەمی نی یە ڕێگەی ڕاست و ڕێنوومایی، یان ڕێی چەوت و گومڕایی.

والحمد لله أولا و أخرا و صلى الله وسلم على سيدنا و مولانا محمد وعلى أله و صحبه و كل تابع لهم بإحسان إلى يوم الدين

دوایی هات تەفسیری سورەتی(النساء) لە بەیانی سێ شەممە ١٩ ی ذی الحجة ١٤٠٦ بەرامبەر ١٩٨٦/٨/٢٦ خوا بە میهرەبانی خۆی وەرگرێ و یارمەتی بدات بۆ ئەوەی کە ماوە لەم تەفسیرە، هەر لەم ڕۆژەدا دەستم کرد بە تەفسیری سورەتی(المائدة).

# سورەتی(المائدە)

## مەدینەیی یە و(١٢٠) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

پەیوەستی و پەیوەندی ئەم سورەتە بە سورەتی(النساء) زۆر بەهێزو بەتینە، بە وێنەی پەیوەستی و پەیوەندی(آل عمران) بە(البقرة) وە، وە هەر چوار مەدینەیین، هەر چوار چەند باس و مەبەستێکی جۆر بەجۆر و جیاوازیان تێدایە کە هەموو ئەوانە کۆ ئەبنەوە و یەك ئەگرن لە یەك مەبەست و ئامانجی سەرەکی دا کە قورئان هات بۆ پێك هێنان و بەدی هێنانی، کە بریتی یە لە داهێنان و دامەزراندن و راگیر کردنی گەل و ئوممەت و دەوڵەتێك، لەسەر بنەڕەتی بیرو باوەڕ و عەقیدەیەکی تایبەتی، بۆچوون و تێگەیشتنێکی تایبەتی و دیاریی، کە بەشی گرنگ و سەرەکی تیای داتاك و تەنیایی خوایە و تایبەتی کردنی خوایەتی و پەرستن و پەروەدگارێتی بەو خوایەوە، چاودێریی و دەسەلآت و هەڵسان بە هەموو کاروبار هەر بۆ ئەو رەوا بدرێ، شەریعەت و بەرنامەی ژیان و هەڵسەنگاندنی هەموو شتێك هەر لەو تاکە خوایە بناسرێ و وەرگیرێ، بە بێ هیچ هاوبەش و وێنەیەك، بە بێ تێکەڵ کردنی ئەوەی کە لەو وەربگیرێ، بە هیچ بیرو باوەڕو بڕیارێکی ترەوە. ئینجا ئەبێ بڕوا وابێ کە ئایین بریتی یە لەوەو ناو هەر بۆ ئەوە، بڕوا بریتی یە لە رەزامەندی دڵ و مل کەچی و دان نان بەوەدا، ئیسلام بریتی یە لە حوکم کردن و بڕیار دان هەر بەوە، ئەوانەی کە حوکم و بڕیار نادەن بەوەی کە خوا ناردی یە خوارەوە. ئەوانە بێ بڕوان و ستەمکارن و لە سنووری خوا دەرچوون. ئەوانە ئەو کاتە بەدوای حوکم و بڕیاری نەفامێتی و نەمان دا ئەگەڕێن، بڕواداری موسڵمانیش هەرگیز بە دوای ئەوەدا ناگەڕێ.

هەرکەسێك خوا بە تاك و تەنیا بزانێ و دابنێ لە خوایەتی یەکەی دا، تەنها خوا بە دروست کەرو داهێنەر دابنێ بە خاوەنی ئەم بون و بوونەوەرە، هەرکەسێك بەو جۆرە بێت نابێ رەوا بدا حوکم و بڕیار دان بە هیچ شتێکی تر بێجگە لەوەی کە خوا دایناوە و ئیزنی داوە بۆ بەندەکانی. نابێ ماف دانانی شەرع و بەرنامە رەوا بدات بۆ هیچ کەسێکی تر بێجگە لەخوا، ئەبێ بزانێ کەرازی نەبوون ولادان لە رێ و بەرنامەی خوا، بێ بڕوایی یە و دەرچوونە لە ئیسلام. بەڕاستی زۆر جێی سەرسوڕمانە هەر گومان و دوو دڵی یەك ببێ لەوەدا!

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِۚ أُحِلَّتۡ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلۡأَنۡعَٰمِ إِلَّا مَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ غَيۡرَ مُحِلِّي ٱلصَّيۡدِ وَأَنتُمۡ حُرُمٌۗ إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ مَا يُرِيدُ ﴿١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحِلُّواْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ

---

**ئینجا با زۆر بە وریایی و گرنگی گوێ بگرن لە ئایەتە پیرۆزەکانی ئەم سورەتە بەفەڕە و ـلەکانمانی بۆ بکەینەوە، لە یەکەمجارەوە ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ لەبەر ئەوەی ئەم وتە پیرۆزە زۆر بەناوبانگە و بەکار ئەهێنرێ ئەو کەسەی کە بەکاری ئەهێنێ و ـەیلێ تێ ئەگات لە مانا و مەبەستەکەی، لەبەر ئەوەی لە سورەتی(الفاتحة) تەفسیرمان کردەوە، لەبەر ئەو دوو هۆیە ئیتر بە پێویستمان نەزانی تەفسیر کردنی لە هیچ سورەتێکی تردا، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە ﴿أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِ﴾ [1] بە تەواوی و بە بێ کەم و کوڕی هەڵسن بە(عقد) ەکان و بەجێی بێنن و بە پێی ـاخوازی یان رەفتار بکەن. ئەو(عقد) انە لێرەدا بە چوار جۆر تەفسیر کراوەتەوە. یەکێ لەوانە لای زۆر لە زانایان پەسەندە و لە(ئیبن و عەباس) ەوە ئەگێڕنەوە کە بریتی یە لەو شتانەی کە خوا دایناوە لەسەر بەندەکانی و داوای کردووە لێ یان، کە ئەوەش بڕوا هێنانە بە خواو گوێ رایەڵی یەتی لە فەرمانەکانی دا، بە رەوادان و حەلاڵ کردنی هەموو رەوا دراو و حەلاڵ کراوەکانی تر، وە قەدەغە و حەرام کردنی هەموو قەدەغە و حەرام کراوەکانی.**

**کۆمەڵێك لە زانایانی تەفسیر بە گشتی ئەو وتەیەیان گرتووە، تەنانەت(راغبی ـسفەهانی) بە پێی بڕیاردەرو بڕیار لەسەر دراو ئەیکات بە(٢٤) بەش و لەو(٢٤) ە شتێکی ـناهو حەرام، یان نەکردنی چاك و خێر بێت وەك بڕیاردان لەسەر کۆمەکی نەکردنی کەسێك کە شایانی کۆمەك بێت، ئەفەرموێ: رووکەش و رواڵەتی ئایەتەکە ئەو(٢٣) ەکە ئەگرێتەوە، بەڕاستی فەرمودەکەی لە دڵ دا زۆر پەسەندو بەجێ یە، باو و رێزمانی عەرەب یارمەتی ـەریەتی، چونکە(العقود) کۆیە و(ال) ی وا بەسەرەوە، هەر وتەیەکەیش وابێ بۆ گشتی یە و بە گشتی ئەگیرێ مەگەر بە رابەر و بەڵگەیەك تایبەتی بکرێ. ئەو رابەرو بەڵگەیەش بە**

---

[1] (عقود) کۆیە و تاکەکەی(عقد)ە کە لە بنەڕەت دا بریتی یە لە بەستن و گرێ دان، ئینجا کراوە بە ناو بۆ بڕیارو دابەستن و بەڵێنێك کە بەهێز بێت و بە توندی گیرابێ.

ئاشكرا نى یه بەدەستەوە، بەڵكو بە پێچەوانەوە بەڵگە و نیشانەی گشتێتی هەیە: ئەوەتا ئەم وتە پیرۆزەی كردووە بە دەروازە بۆ ئەم سورەتە گەورە و گرنگە كە ئەو هەموو یاسا و بڕیارە زۆر جۆر بە جۆرەی تیایە لەبارەی حەلاڵی و حەرامی سەر بڕواو خۆراك و خواستراو، لەبارەی خوا پەرستی و بیرو باوەڕی راست، وە لەبارەی چاودێری و سەرپەرشتی ئەم ئوممەتە بۆ هەموو ئادەمی ی لە جیهان دا. هەروەها باس و مەبەستەكانی تر كە ئەم وتە پیرۆزە ئەیانگرێتەوە وەك كورتەیەك وایە بۆیان، بە جۆرێك كە هێنانی ئەم وتەیە لە سەرەتای ئەم سورەتەدا دانراوە بە جوانكاری یەكی رەوانبێژیی كە ناو ئەبرێ لە زانیاریی رەوانبێژیی دا بە(براعة الإستهلال) كە ئەمەیە لەسەرەتاوە شتێك بگوترێت كە دەست نیشان بكات بۆ ئەوەی كە لە پاش دا دێت و ئەگوترێ. كەواتە ئەڵێین: ئەم وتەیە گشتی یە بۆ هەر بەڵێن و پەیمان و فەرمانێ كە داینـاوە و داوای كردووە و وەری گرتووە لە بەندەكانی، كە یەكەم و بنەڕەت و سەرەكی یەكانیان بڕوا هێنانە بە بوونی خوایەكی تاك و تەنیا و ناسینی ئەو خوایە بەو جۆرەی كە خوا خۆی پێویستی كردووە و بەهۆی فروستادەكانی یەوە گەیاندوویەتی بە بەندەكانی، ئینجا هەڵسان بە داخواز و پێویستیاتی ئەو بڕواو ناسینە كە بریتی یە لە بەندەیی و گوێ رایەڵی و مل كەچی تێرو تەواو بە بێ مەرج و بە بێ سەر لێ كردنەوە، ئەم بەڵێن و پەیمانە بەو جۆرەیە خوا هەر لە یەكەمجارەوە وەری گرت لە ئادەم و حەوا بە هەموو رۆڵە و نەوەكانیشیانەوە كە لە پاشان پەیدا ئەبن. وە كردی بە مەرجی جێنشینی یەكەیان لە زەوی دا وەك باسمان كرد بە درێژیی لەكاتی تەفسیری ئایەتی(٣٨، ٣٩) ی سورەتی(البقرة) دا، هەروەها ئەم بەڵێن و پەیمانەی وەرگرت لە رۆڵە و نەوەكانی ئادەم كاتێ كە لە پشتی باوكەكانیان دا بون، وەك لە ئایەتی(١٧٢) ی سورەتی(الأعراف) دا دێت و بە یارمەتی خوا تەفسیری ئەكەین، هەروەها ئەو بەڵێن و پەیمانەی وەرگرت لە پێغەمبەرەكان و ئوممەتەكانیشیان بە تایبەتی. ئەم بەڵێن و پەیمانە بنەڕەتە بۆ دامەزران و وەرگرتنی هەر بەڵێن و پەیمانێكی تر، ئیتر ئەو بەڵێن و پەیمانانی ترە پێویست كرابێ لەسەر شانی مەردوم یان خۆی پێویستی كردبێ لەسەر خۆی، بەرامبەر بە خوا یان بەرامبەر بە بەندەكانی خوا، یان بەرامبەر بە هەر زیندەوەرو هەر شتێكی تر لەم بوونەوەرەدا.

لەپاش ئەو سەرەتا پیرۆزە كە هەموو ئەوان ئەگرێتەوە بە كورتی، ئینجا بە شێوەی تایبەتی و دیاریی دەست پێ ئەكات بە هێندێكیان، لە یەكەمجارەوە باسی حەرامی و حەلاڵی هێندێ لە گیان لەبەران ئەكات كە پەیوەندی یان بە ژیان و گوزەرانەوە هەیە، ئەفەرموێ:

﴿أُحِلَّتۡ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلۡأَنۡعَٰمِ﴾ حەلاڵ کراوە بۆتان گیانداری بێ زیان، یان چوار پێ لە حوشتر و مەڕو بزن و ڕەشە ولاخ، هەروەها لە چوار پێ کێوی یەکانیش کە وەك ئەو ماڵی یانەن وەك گاو مەڕو بزن و کەرە کێوی و ئاسك ﴿إِلَّا مَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ﴾ بێجگە لە حەرام کراوی ئەوەی کە ئەخوێنرێتەوە بەسەرتان دا لە ئایەتی سێ یەم دا ئەوانەی کە باس کران حەلاڵ کراوە بۆتان ﴿غَيۡرَ مُحِلِّي ٱلصَّيۡدِ وَأَنتُمۡ حُرُمٌ﴾ لە کاتێك دا حەلاڵ کەری ڕاو و نێچیر گرتن نی نین لە کاتێك دا کە لە ئیحرامی حەج یان عومرەدا بن، یان لە خاکی حەرەم دا بن و ئیتر لە هەر شوێنێ ببن، یان لە کاتێك دا کە لە خاکی حەرەم دا بێ ئیتر با لە ئیحرام دا نەبن. ئینجا کاری حەرام و حەلاڵەکە پەیوەست ئەکات بە سەرچاوەی حەرام و حەلاڵ کردنەوە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ مَا يُرِيدُ﴾ بەڕاستی خوا حوکم و بڕیاری هەر شتێك ئەدا کە خوا خۆی بیەوێ و مەیلی ببێ، بێگومان مەیل و ویستنەکەش بە پێی زانینی تەواو و لێ زانین و کاردروستی یە، چونکە خوا بێگەردە لەوەی کە کاری بێ سوود و بێ هوودە بکات. بە بۆنەی قەدەغە کردنی شکاندنی ڕێزی خاکی حەرەمەوە. ئینجا بانگ کردنێکی تر ئاراستەی بڕواداران ئەکات بۆ جڵەوگیریی یان لە شکاندن و ژێر پێ کردنی ئەو شتانەی کە خوا پیرۆزو ڕێزداری کردوون، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی کەسانێ کەبڕواتان هێناوە﴿لَا تُحِلُّواْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ﴾ نیشانەکانی خوا، واتە ئەو شتانەی کە خوا کردوونی بە نیشانەی خوا، پەرستن و ئایینەکەی خۆی کە بەوانە ڕێنوومایی جیا ئەکرێتەوە لە گومڕایی. ئیتر ئایا بە شێوەی گشتی مەبەست بن، یان لێرەدا مەبەست ئەو نیشانە و کردەوانە بێت کە خوا دایناون و فەرمانی پێ کردوون لە حەج و عومرەدا – بێگومان لێرەدا بەم شێوە تایبەتی یە لە دڵ و بەهێزترە – بە هەرکام مەبەست بێت خوا جڵەوگیریی بڕواداران ئەکات و ئەفەرموێ: ئەو نیشانە و دروشمانە مەشکێنن و حەلاڵیان مەکەن بەم ڕەنگە بە کەم نرخ سەیریان بکەن، یان دەست کاری و ئارەزووکاریی تیا بکەن، یان بەرگری مەردومان بکەن لێ یان لە هەڵسان پێ یان، بەڵکو بە ڕێزو سۆز و پەرۆشەوە بەجێ یان بێنن و بانگی مەردومیشیان بۆ بکەن لەسەر ئەو بارو شێوەی کە خوا داوای ئەکات.

وَلَا ٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ وَلَا ٱلۡهَدۡيَ وَلَا ٱلۡقَلَٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّهِمۡ وَرِضۡوَٰنٗاۚ وَإِذَا حَلَلۡتُمۡ فَٱصۡطَادُواْۚ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ أَن صَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۘ

---

﴿وَلَا ٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ﴾ مانگی بەڕێز حەڵاڵ مەکەن و ڕێزی مەشکێنن، بەم ڕەنگە جەنگی تیا بکەن یان بە گاڵتە بیگرن و دوا و بەری پێ بکەن، وەك بت پەرستەکان بەو جۆرە ڕەفتاریان تیا ئەکرد، بەڵکو ئێوە ڕێزی بگرن و دواوبەری پێ نەکەن و جەنگ و کوشتاری تیا نەکەن، مەگەر کاتێ کە دەست درێژیی بکرێتە سەرتان، ئەو کاتە دروستە بۆتان بەرگریی دەست درێژیی کەران بکەن، تا ڕێی ئەوەیان نەبێ لە پەنای ئەوەدا دەست درێژیتان لێ بکەن و قوتار بن، مانگی بەڕێز چوار مانگن:(رجب، ذو القعدة، ذو الحجة، محرم)، ﴿وَلَا ٱلۡهَدۡيَ﴾ (هدی) کە بریتی یە لە حوشتر یان مەڕ یان بزن یان ڕەشە وڵاخ کە حاجی یان عومرە کەر ئەیبات بۆ سەر بڕین لە پاش لێ بوونەوە لە حەج و عومرەکەی، بەوە نیشانەکانی حەج و عومرە دوایی پێ ئەهێنێ، ئەو(هدی) یە حەڵاڵ مەکەن و ڕێزی مەشکێنن بەم ڕەنگە تەنها لەبەر خوا سەری ببڕن و بە بێ هیچ نیازێکی تر، سەری ببڕن لە پاش لێ بوونەوە لە حەج و عومرە، بە گۆشت و پێست و موو و هەموو شتێکی یەوە بیدەن بە هەژارو بێ نەوایان، هەروەها نابێ داگیر بکرێن لە خاوەنەکانیان، یان بەرگری بکرێن لە ناردن و سەربڕینیان. ﴿وَلَا ٱلۡقَلَٰٓئِدَ﴾ ئەو حوشترانەش حەڵاڵ مەکەن و ڕێزیان مەشکێنن کە خاوەنەکانیان دیاری یان ئەکەن بەمەی شتێك ئەکەنە ملیان تا نیشانە بێت لەسەر ئەوەی نەزر کراون بۆ خوا، بەرەڵا ئەکرێن بۆ خۆیان بلەوەڕێن هەتا سەربڕینیان لە کات و شوێنی تایبەتی خۆیان دا، بە تایبەتی باسی ئەمانەی کرد لەبەر گرنگی یان، بە پێی ئەم ڕایە کە لە(کشاف) دا هەیە ئەبێ ئەم نیشانە دارانە هەر ئەبێ لە حوشتر بن، بەڵام بەلای چەند کەسێکی ترەوە کە ئەمەش بەهێز ترە، وەك(هدی) وایە لەو چوار ئەبێ، بەڵام ئەمان هەر نەزر ئەکرێن بۆ خواو لە ڕێی خوادا لە غەیری حەج و عومرەدا. چەند تەفسیرێکی تریشی هەیە، بەڵام ئەمەی کە گوترا بەهێزترە لەبەر ئەوە هەڵم بژارد. ﴿وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ﴾ حەڵاڵ مەکەن و ڕێزی ئەوانە مەشکێنن کە نیازی ماڵی خوا ئەکەن لە کاتێك دا کە ئەوانە ﴿يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّهِمۡ وَرِضۡوَٰنٗا﴾

بەدوای کڕین و فرۆشتن و دەست کەوتێکی حەڵاڵ دا دەگەڕێن لە لایەن خواوە و بە دوای ڕەزامەندی خوادا ئەگەڕێن، ئیتر حاجین یان نەء. ئیتر ڕێز شکاندنیان بە هەر جۆر و بە هەر شێوەیەك بێ، مەبەست بەم ڕستە زیادە سەرزەنشت و تاوانبار کردنی ئەوانەیە کە ڕێزیان ئەشکێنن و دەست درێژیی یان بۆ ئەکەن، ئەگینا پێویستە پارێزگاریی ڕێزی هەر کەسێك کە لەو خاکە پاکەدا بێت یان بچێ و بگاتە ئەو شوێنە پیرۆزە مەگەر کەسێك کە دوژمن بێت و نیازی خراپەکاریی ببێ. لەپێشەوەراوو نێچیری قەدەغە کردلەکاتی ئیحرامدا.ئینجائیزن ئەدا و ڕەوای ئەدات لەپاش ئەوماوەی ئیحرامەکە، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَٱصْطَادُواْ﴾ کاتێ لە ئیحرام دەرچوون و لە خاکی حەرەم دا نەبوون، ئەو کاتە ڕاو بکەن و نێچیر بگرن. واتە ئیزن هەیە و ڕەوایە بۆتان، چونکە قەدەغە کردنەکە هەر بۆ کاتی ئیحرامە و بوونتان لە خاکی حەرەم دا.

خوای میهرەبان ئەو ناوچە پیرۆزە و ئەو ماوەی ئیحرامەکەی گێڕاوە بە ناوچە و ماوەی ئاشتی و ئەمان و بێ باکی ی کە دەست درێژیی نەکرێ تیایان دا بۆ ئادەمی ی و پەلەوەر و ماڵات و دار و درەخت، ئاشتی ڕاستەقینە باڵی کێشاوە بەسەر ئەو ناوچە و ماڵە پیرۆزەدا بە تایبەتی بە پێی نزاو پاڕانەوەکەی حەزرەتی ئیبراهیم(علیه السلام)، هەرچۆنێ لە ساڵێك دا چوار مانگی دانا بە ماوەی ئارامی و ئاشتی گشتی و هەمیشە لە ژێر سایەی ئیسلام دا و بە پێی بەرنامە بێ وێنەکەی ئیسلام. ئینجا لەم کاتەدا کە فەرمانی دا بە ڕاگیرکردن و پارێزگاریی ڕێزداران، لەم کاتەدا کە دڵی ئامادە کرد بۆ ئارامی و ئاشتی، لەم کاتە زۆر ڕێك و پێکەدا بانگی بڕواداران ئەکات بۆ بەکار هێنانی خۆگریی و لێ بوردن، تەنانەت لەگەڵ دوژمنانیش دا، بە دەست گرتن و قۆڵگیریی و یارمەتی دانی یەکتر لەسەر چاکە و خواپەرستی و خۆپارێزیی لە هۆی خەشم و ناڕەزایی خوا، دەست گرتنەوە لە هەر کۆمەکی و یارمەتی یەك لەسەر گوناهو دوژمنایەتی و دەست درێژیی، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ أَن صَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ با خەشم و قینتان لە گەل و کۆمەڵێك لەبەر ئەوەی کە بەرگرییان کردن لە عومرەو زیارەتی ماڵی خوا – وەك لە ساڵی شەشەمی کۆچی دا ئەوە ڕووی دا لەلایەن قورەیشەوە، لە حودەیبی یەدا ڕێ یان گرت لە موسڵمانەکان – با ئەو خەشم و قینە هانتان نەدا

أَن تَعْتَدُواْ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢﴾ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحْمُ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ وَٱلْمُنْخَنِقَةُ وَٱلْمَوْقُوذَةُ وَٱلْمُتَرَدِّيَةُ وَٱلنَّطِيحَةُ وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ

---

**﴿أَن تَعْتَدُواْ﴾ لەسەر ئەوەی کە دەست درێژیی بکەنە سەر ئەو رێگرو بەرگری کەرانە، با ئەو رق و قینە بەتینە ئەوەتان پێ نەکات، بەڵکو خۆتان بگرن و چاوپۆشی بکەن.**

**یەکەم چین لە موسڵمانان کە ئەم ئایەتەیان تیا هاتە خوارەوە، فەرمانبەریی ئەم فەرمانەیان کرد – وەك هەموو فەرمانەکانی تر – ئەوە بوو لە پاش دا دەسەڵاتی تەواویان پەیدا کرد بەسەر ئەو رێگرانەدا لەگەڵ ئەوەدا چاوپۆشی یان کرد و لێ یان بووردن. بەڕاستی ئەوپەڕو پۆپەیە لە خۆگریی و چاوپۆشی دا. بەڵام ئەوە پێویستە و ئەبێ لە هەموو کردەوە و رەوشتێکی پاك و بەرزی تریش دا ئەم ئوممەتە هەر وا ئەبێ، چونکە ئەم ئوممەتە لەلایەن خواوە دانراوە بۆ ئەوەی کە کاربەدەست و چاودێریی مرۆڤ و مرۆڤایەتی بێت، هەڵسێ بە سەرکردایەتی ژیان و جیهان، بێگومان ئەوەیش گەورەترین ئەرکە کە خراوەتە سەرشانی، بە بێ ئەو خوو رەوشتە بەرزانە پێك نایە و بەجێ ناهێنرێ، پێویستە موسڵمانان ببن بە ئاوێنەیەکی بالانما بۆ ئایینەکەیان تا بە کردەوە مەردوم فێری ئیسلام بکەن، دڵ راکێشن بۆلای ئیسلام و خۆشەویستی بکەن لە دەروون دا. بەڵێ بێگومان ئەو ئەرکە زۆر گەورەو گرانە، بەڵام ئاسانە بۆ ئەوانەی کە بەڕاستی ئەبن بە وێنە و نموونەی ئیسلام.**

**ئەو کۆمەڵە بەختیارە توانی یان بەهۆی ئەم بەرنامە بێ وێنەی ئیسلامەوە گەلی عەرەبی سەرکێشی رەگەز پەرستی نەفام بەرز بکەنەوە بۆ پۆپەی هەرە بەرز، بۆ ئەو رادە و پلە بەرزەی کە لاپەڕەکانی مێژوو ئەدرەوشێتەوە بە گێڕانەوەی کردارو رەفتاری سەرسوڕ هێنەریان کە ئەوەندە زۆر و بەناوبانگن پێویست نی یە لێرەدا بە هێنانی هیچ نموونەیەك!**

**ئینجا بێگومان دەست درێژیی کۆمەڵێك بەسەر کۆمەڵێکی تردا ناگونجێ بە بێ یەك گرتن و کۆمەکی دەست درێژیی کەران، لەبەر ئەوە ئەوا شوێنی کۆمەکی و یەك گرتن دیاریی ئەکات**

و جڵەوگیریی ئەكات لە كۆمەكی كردن و كۆبوونەوە لەسەر هەر شتێكی تر،ئەفەرموێ: ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ﴾ كۆمەكی یەكتر بكەن لەسەر كارو كردەوەی زۆر چاك، لەسەر خۆپارێزیی لە هەر شتێك كە مایەی خەشم و ناڕەزایی خوایە، هەر شتێك كە زیان بگەیەنێ بە خاوەن كارو كردەوە ﴿وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ﴾ كۆمەكی یەكتر مەكەن لەسەر گوناهو تاوان، لەسەر دەست درێژیی و تێپەڕ كردن و دەرچوون لەو سنوورانەی كە خوا دایناون بۆ بەندەكانی، وەك ئەگێڕنەوە لە(ئیبن و عەباس) ەوە - خوایان لێ رازی بێت - كە تەفسیری(الإثم) ی كردووەتەوە بە نەكردنی ئەوەی كە فەرمانی دراوە. وە كردنی ئەوەی كە جڵەوگیریی لێ كراوە،(العدوان) یشی تەفسیر كردووەتەوە بە تێپەڕ كردن لەو سنوورانەی كە خوا دایناون، ئینجا كۆتایی ئایەتەكە ئەهێنێ بەم فەرمودەیە: ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ﴾ خۆتان بپارێزن لە خوا و لە خوا بترسن لە هەموو كاروبارێك دا كە هێندێ لەوانە ئەم فەرمان و جڵەوگیریی یانە بوو كە تێپەڕیان كرد، چونكە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾ بێگومان خوا تۆڵەی بەتینە دەربارەی ئەوانە كە لێ ی ناترسن و خۆیان ناپارێزن لە دژایەتی و نافەرمانی. ئینجا لەم ئایەتی سێ یەم دا باسی ئەو حەرام و قەدەغە كراوانە ئەكات كە لە ئایەتی یەكەم دا دەست نیشانی بۆ كردن، لەگەڵ چەند قەدەغەیەكی تردا، ئەفەرموێ: ﴿حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةُ﴾ قەدەغە و حەرام كراوە لەسەرتان ئەوەی لە خۆیە مردار بووبێتەوە بە بێ هۆیەكی ئاشكرا ﴿وَٱلدَّمُ﴾ وە خوێن، واتە ئەو خوێنەی كە ئەڕواو شلە، نەك ئەوەی كە ناڕوا وەك جگەر ﴿وَلَحۡمُ ٱلۡخِنزِيرِ﴾ گۆشتی بەراز ﴿وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ﴾ ئەوەی كە لە كاتی سەربڕین دا ناوی غەیری خوای لێ بڕابێ وەك باو بووە لە سەردەمی نەفامی عەرەب دا كە حوشترو ماڵاتیان سەر ئەبڕی بە دەنگی بەرز: ئەیان گوت: باسم اللات و العزی. بەناوی لات و عوزا. كە دوو بت بوون ئەپەرستران و یەكێ لە پەرستنەكەیان ئەوە بوو كە بەناوی ئەوانەوە ئەوانەیان سەر ئەبڕی. ئەو قەدەغە كردنە تایبەتی نی یە بەو بتە ئاسایی یانەوە، بەڵكو بەناوی هەركەس و هەرشتێكی ترەوە سەربڕین بكرێ ئەو سەربڕاوە حەرام ئەبێ وەك مردارەوە بوو، ماتووڵ مەبەست بە گەورەترین و رێز پێ دان بێت بەناو براو دا، خۆ نزیك خستنەوە لێ یەوە. نەك مەبەست دەربڕینی خۆشەویستی و شادی و شادمانی بێت بە یەكێك وەك باوە لەبەر پێ ی پیاوی گەورەدا ماڵات

سەر ئەبڕێ، یان لە کاتی هاتنەوەی خۆشەویستێك لە سەفەر، یان سەر ئەبڕێت بۆ پیاوێکی گەورەی ئاینی و مەبەست ئەوەیە بدرێ لە ڕێی خوادا و خێرەکەی بۆ ئەو پیاوە گەورە بێت، بەهەرکام لەم مەبەستانە ئەو سەربڕراوە حەرام نابێ. بەڵام کردەوەیەکی چاك نی یە، چونکە شێوەکەی وەك کردەوەی بت پەرستەکانەو لەلایەن نەفامەوە سەری هەر لەوەوە دەرئەچێ، وەك لە کتێبە گەورەکانی فیقهدا باس کراوە لە باسی(صید و ذبائح) دا بێگومان هەرچی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) قەدەغەیان کردبێ هیچ بڕوادارێك سەری لێ ناکاتەوەو بە بێ گێرو گرفت بڕوای هەیە بە خراپی و زیانی، ئیتر تێ بگات لەهۆی قەدەغە کردنەکەیان تێ نەگات، لەگەڵ ئەوەدا زانایان لە کۆن و لە تازە چەند هۆیەکی گرنگیان باس کردووە کە هەموو ژیرێك دڵ ئارام و دڵنیا ئەبن پێ یان، هەرکەسێك ئەیەوێ با تەماشای ئەو هۆیە بکات کە ناوبانگیان پەیدا کردووە و بڵاو بوونەتەوە لە کتێبەکان دا، بۆ نموونە: لەم تەفسیرەدا چەند هۆیەکمان باس کرد بۆ قەدەغە کردنی ئەو سیانە پێشووە لەکاتی تەفسیری ئایەتی سورەتی(البقرة) دا کە لەبارەی ئەمانەوە هاتووەتە خوارەوە با سەرنج بدرێ. بە هەرحاڵ ئەوەی کە خوا حەرامی کردووە بێگومان پیسە، ئیتر زانینی مەردوم ڕێی بردبێ بە هۆی پیسی یەکەی یان نەیبردبێ. ئینجا قەدەغە کردنی چوارەم ئاشکرایە ئەو سەربڕینە دژو پێچەوانەی ئاین و بڕوایە، چونکە ئایینی خواو بڕوا بە ئاینی خوا بە تاك و تەنیا دائەنێ، خوایەتی تایبەتی ئەکات بە تەنها کەسێکەوە کە ناوی(الله) یە، دەی یەکەم داخوازی ئەوەیش ئەمەیە کە هەموو نیازو کردەوەیەکی ڕاست و ڕەوا هەر بە ناوی خواوە بکرێ و ناوی ئەویان لێ ببرێ، کەواتەئەوەی ناوی خوای لێ نەبرێ حەرامەوپیسەبەوێنەی مردارەوە بوو و بەرازە.

قەدەغە کردنی ئەم چوارە لە سێ سورەتی تریش دا هاتووە:(البقرة، الأنعام، نحل) لە هەر سێ شوێنەکەدا بە شێوەی کورت هەڵهێنان هاتووە، واتە وا نیشان ئەدەن کە هەر ئەم چوار حەرام و قەدەغەن، بەڵام لێرەدا ئەم شەشەیش زیاد ئەکات:

١- ئەفەرموێ: ﴿وَٱلۡمُنۡخَنِقَةُ﴾ ئەوەی کە خنکابێ، ئیتر بە هەر هۆیەك.

٢- ﴿وَٱلۡمَوۡقُوذَةُ﴾ ئەوەی کە بە دار یان بە هەرشتێك لێ ی درابێ هەتا گیانی دەرچێ.

٣- ﴿وَٱلْمُتَرَدِّيَةُ﴾ ئەوەی کە لە بەرزی یەکەوە کەوتبێتە خوارەوە یان کەوتبێتە ناو چاڵ و بیرێك هەتا مردار بووبێتەوە.

٤- ﴿وَٱلنَّطِيحَةُ﴾ ئەوەی گیان لەبەرێك شاخی لێ دابێ و بەهۆی ئەوەوە مردار بووبێتەوە.

٥- ﴿وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ﴾ ئەوەی کە دڕندە خواردبێتی، واتە لێ ی خواردبێ تا بەهۆی ئەوەوە بکەوێتە مردن، نەك ئەوەی کە هەمووی خورابێ، چونکە ئەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ﴾ بێجگە لەوەی کە ئێوە لە گیانتان کردبێ بە سەربڕین ئەگەر بەر دەست کەوت پێش گیان دەرچوون، یان بە زام لێ کردنی کوشندە ئەگەر بەر دەست نەکەوت لە پێش گیان دەرچوون دا وەك ئەوەی بگیرێتەوە بە شاخەوە یا بکەوێتە ناو بیر، کەواتە ئەبێ بە تەواوی گیان دەرنەچووبێ، دەی ئەگەر بە تەواوی خورابێ ئەبێ بە هیچ رەنگ گیانی پێ نەمابێ، ئینجا مەبەست بەو گیانە گیانی دامەزراوە بەلای کۆمەڵێك لە زانایانەوە، کە شافیعی یەکێکیانە، بەم رەنگە لە پاش سەربڕینەکەی پەلە کوتێ بکات یان خوێنی هەڵقوڵێ بەهێزو نەك هەر بە لەمیسکەی رووتی بێ هێز، مەبەست بە هەر گیان پێ بوونە و نیشانەی ئەوەی پێ بێ، ئیتر با ئەو نیشانەش بریتی بێ لە گوێ جوڵاندن یان کلك یان پێڵوی چاو، وەك ئەگێڕنەوە لە(ئیمام محمدی باقرو ئیمام جعفری صادق و حسن و قتادة و ئیبراهیم و طاوس و ضحاك و ئیبن و زەید) و زۆربەی زانایان – خوا لێ یان رازی بێت. ئینجا وتەی ﴿إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ﴾ بۆ هەر پێنجەکەی رابردوو و ئەگەڕێتەوە بەلای زۆربەوە، واتە هەرکام لەوانە گیانی دەرنەچووبێ و بە شەرعی گیانی دەرکرێ حەڵاڵە. وە بۆ ﴿وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ﴾ یش بەلای هێندێکەوە کە ئەفەرمون: ئەگەر ناوی غەیری خوای لەسەر براو بە تەواوی لە گیان نەکرا و ئینجا ناوی خوای لێ برا و بە شەرعی سەری بڕا ئەوەش هەر حەڵاڵە، وە ئەگەڕێتەوە هەر بۆ ئەوەی کە دڕندە لێ ی خواردبێ بە لای هێندێ تر لە زانایانەوە، بێگومان رای یەکەم لە دڵ دا بەهێزو دامەزراوترە، رایەکی تریش هەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی دوور لە رووکەش و رواڵەتە پێویست نییە بە باس کردن، لەبەر ئەوە باسم نەکرد.

وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُواْ بِٱلْأَزْلَٰمِ ذَٰلِكُمْ فِسْقٌ ٱلْيَوْمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي

٦- ﴿وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ﴾ ئەوەی کە سەر بڕابیٚ لەسەر بەردێك یان چەند بەردێك کە بە دەوری(کەعبە) دا دامەزراوبوون و شتیان سەر ئەبڕیٚ بەسەریا و خوێنەکەیان تێوە ئەتلاند، یان ئەوانە چەند بتێك بوون و بت پەرستەکان شتیان سەر ئەبڕی لایان دا و خوێنەکەیان لیٚ ئەدان، بە هەر جۆر دیارە ئەوە شێوەیەك بووە لە بت پەرستی و ئەو سەربڕاوانە حەرام بوون با ناوی خوایشیان لیٚ ببرایە، لە هەر شوێنێکی تریش بکریٚ بێجگە لە(کەعبە) هەر بت پەرستی یە و سەربڕاوەکە پیسە و مردراه و حەلاڵ کردنی ناگونجیٚ لەگەڵ بڕوا بە تاك و تەنیایی خوادا. ئینجا زیاد کردنی ئەم شەشە لێرەدا دژی ئەو کورت هەڵهێنانەیە کە لەو سیٚ سورەتەدا هاتووە بەلای هێندیٚ لە زانایانەوە، لەبەر ئەوەی ئەم سورەتە پاش ئەوان هاتووە دای ئەنێن بە سڕەوە(ناسخ) ی کورت هەڵهێنانەکەی ئەوان. بەلاّم لە رووی راستی دا هەرکەس ورد بێتەوە ئەزانیٚ کە هیچ دژایەتی نی یە لە نێوان ئێرەو ئەو سورەتانەدا، بەڵکو ئەم شەشی ئێرە درێژەیە بۆ ئەوەی لەو سیٚ سورەتەدا هاتووە، ئەو کورتەیە لەو سورەتانەدا ئەم شەشەش ئەگرێتەوە. بەم رەنگە(میتة) گشتی یە بۆ ئەوەی لە خۆیەوە مردبیٚ بە بیٚ هۆیەکی ئاشکرا، ئەم پێنجەش کە هۆی ئاشکرای مردنیان هەیە. ﴿وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ﴾ گشتی یە بۆ ئەوەی کە بە دەنگی بەرز ناوی غەیری خوای لیٚ برابیٚ و بەناوی بتەوە سەربڕابیٚ، بۆ ئەوەی کە سەربڕابیٚ بەسەر ئەو بەردە دیاریی کراوانەدا بەو جۆرەی کە باس کرا، کەواتە ئەو دووانە بە کورتی دوانن و بە درێژیی نۆ شتن. لەبەر ئەوەی زۆر تر ﴿میتة﴾ ئەکریٚ بەناو هەر بۆ ئەوەی لە خۆیەوە گیانی دەرچووبیٚ، لەبەر ئەوەی لە سەردەمی نەفامی دا ئەم مردارەبووانەی ترە ئەخوران، لەم سورەتەدا کە لە دواترەوە هاتە خوارەوە بە درێژیی باسی فەرمو تا هیچ کەس گومانی نەمێنیٚ و ئەمانیش هەر بە مردارەوە بوو دابنیٚ. ئینجا باوڕێکی تر لە باوەکانی سەردەمی نەفامی قەدەغە ئەکات کە پیٚی ئەگوتریٚ ﴿الإستقام بالإزلام﴾ واتە بە دوا گەڕانی زانینی بەش یان چارەنووس بە هۆی چەند پیاڵەیەك یان چەند تیرێکی دارین کە بەکار ئەهێنران بۆ ئەو

مەبەستە، ئەم کردەوەش بە چەند جۆرێك ئەیگێڕنەوە، لێرەدا دوانیان باس ئەکەم کە بەناوبانگ ترن، بە تایبەتی یەکەمیان رای زۆربە و جەماوەری لەسەرە:

١- ئەو پیالأنە سیان بوون لە یەکێکیان نووسرابوو: خوای خۆم فەرمانی پێداوم، لە یەکێ تریان: خوای خۆم جڵەوگیریی کردوم، لە سێ یەم: بۆش بوو هیچی لێ نەنوسرابوو. ئینجا هەرکەسێك نیازی کارێکی گرنگی ببوایە ئەو سیانەی ئەگێڕا و چەرخەی پێ ئەکردن جا ئەگەر یەکەم دەرچووایە ئەچوو بەدەم کارەکەوە، ئەگەر دووەم دەرچووایە نەئەچوو بەدەمی یەوەو وازی لێ ئەهێنا، ئەگەر سێ یەم دەرچووایە دووبارە هەڵی ئەکردەوە.

٢- جۆری دووەم بە شێوەی قومار بەکار ئەهێنران: بەم رەنگە ئەو پیالأنە سیان بوون یان حەوت لەسەر هەرکام بەشێکی تایبەتی ئەنووسرا، ئینجا کە قورماریان ئەکرد لەسەر حوشتر ئەو پیالأنەیان چەرخە پێ ئەکرد هەرکام پیاڵەیەك لەو پیالأنەیان بۆ دەرئەچوو، هەرکەس بە پێی نووسراوی پیاڵەی خۆی بەشی ئەبرد، وا دەرئەکەوێ هەردوو جۆرەکە بەکار هێنراوە. هەر دوو جۆرەکە کردەوەو باوێکی بەدی ناڕەوایە و شتێکی پڕو پووچە لەبەر ئەوە خوا قەدەغەی کردن و فەرموی: ﴿وَأَن تَسْتَقْسِمُواْ بِٱلْأَزْلَٰمِ﴾ قەدەغە و حەرام کراوە لەسەرتان ئەو کردەوە بکەن، واتە بەدوای زانینی بەش یان چارەنووس دا بگەڕێن بەهۆی ئەو پیالأنە یان ئەو تیرانە، وەك بەڕوونی باسمان کرد، ئەو گۆشتەی حەرام کرد کە بەوە دەست کەوتیان ئەبوو، ئینجا پەیوەندی قەدەغەی ئەم کردەوە بە قەدەغە کردنی ئەوانەی کە لە پێشەوە باس کران لەسەر رای دووەم ئاشکرایە، چونکە لەسەر ئەم رایە ئەمیش یەکێکە لەو خۆراکانە و جۆرێکی ترە لەو چوار پێ یانەی کە لە پێشەوە قەدەغەی کردن، لەسەر رای یەکەم(قفّال) ئەفەرموێ: ئەم کردەوە لای(کەعبە) ئەکرا. کەواتە بە بۆنەی قەدەغەی ﴿وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ﴾ ەوە هات کە ئەویش لە پەنا و پاڵی(کەعبە) دا ئەکرا. ﴿ذَٰلِكُمْ فِسْقٌ﴾ خواردن و بەکارهێنانی ئەو قەدەغەیانەی کە باسمان کردن بۆتان گوناهێکی گەورەیە و دەرچوونە لە گوێ رایەڵی خواو لادانە لە شەریعەت و بڕیاری خوا، هێندێ ئەفەرمون: ﴿ذَٰلِكُمْ﴾ دەست نیشانە هەر بۆ ئەم دواترین قەدەغەیە کە نزیکە. بەلأم بە وتەی دوور ﴿ذَٰلِكُمْ﴾ دەست نیشانی بۆ کرد،

چونکە زۆر دوورە لە هەق و راستی یەوە، وە زۆر زیادە رەوی یە لە خراپەدا، کەواتە وەك شتی دوور وایە.

لەپاش ئەوەی باسی ئەو چەند قەدەغەیانەی کرد، لەگەڵ حەڵاڵ کردنی هێندێکیان بەو مەرجانەی کە داینا، ئینجا موسڵمانانی ترساند لە شکاندنی ئەو قەدەغەیانە بەوەی کە فەرموی: ﴿ذَٰلِكُمْ فِسْقٌ﴾. لەپاش ئەوە ئینجا پێش تەواو کردنی باسەکە – وەك تێهەڵکێش – چەند هەواڵ و مزگێنی یەکی زۆر خۆش و گەورە ئەهێنێ:

أ- ئەفەرموێ: ﴿ٱلْيَوْمَ﴾ ئەمڕۆ، واتە لەم کات و چەرخەدا، یان لەم رۆژەدا کە رۆژی هەینی یەورۆژی عەرەفەی ساڵی دەهەمی کۆچی یەوکاتی حەجی ماڵ ئاوایی پێغەمبەرە(ﷺ)، لەم رۆژەدا ﴿يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن دِينِكُمْ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە، واتە گەل و کۆمەڵی بێ بڕوایان نائومێد بوون لە ئایینەکەتان و بە تەمای ئەوە نەمان کە ئایینەکەتان لەناو بچێ و بڕواداران لێ ی پەشیمان ببنەوە، بە تەمای ئەوە نەمان کە زاڵ ببن بەسەرتان دا و ئێوە لەناوبەرن، چونکە بینی یان ئەو بەڵێنەی کە خوا دای بە بڕواداران بەدی هێنا، ئەوەتا ئایینەکەیانی سەرخست بەسەر هەموو ئایینێك دا، باك و بیمی نەهێشت لەناو بڕواداران داو زاڵی کردن لە پاش ئەوەی کە لە بیم و ترس دا ئەژیان و ژێر دەستە و بێ دەسەڵات بوون. ﴿فَلَا تَخْشَوْهُمْ﴾ کەواتە باك و بیمتان نەبێ لەو بڕوایانە و نەترسن لەوەی زاڵ ببن بەسەرتان دا ﴿وَٱخْشَوْنِ﴾ لە من بترسن و بیم و ترستان تایبەتی بکەن بە منەوە، یا بترسن بە ترسانی سام و بیم و بە گەورە گرتن. بە ترساندنی تۆڵە و سزا ئەگەر لابدەن لە رێگە راستەکەی و مل پێچی بکەن لە فەرمانی، بترسن لەبەر ئەوەی هەموو شت هەر بەدەست ئەوە.

ب- ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ ئەمڕۆ ئایینەکەتانم گەیاند بە پایان بۆتان و لەبەر سوودو بەهرەمەندیی خۆتان، نەك لەبەر ئەوەی خوا هیچ پێویستی ببێ بە هیچ کەس و بە هیچ شتێك. گەیاندی بە پایان بە جۆرێ پێویست نەما بە زیاد کردنی هیچ شتێك بۆ هیچ کەسێك و بۆ هیچ گەل و کۆمەڵ و چینێك لە هیچ کات و چەرخێك دا تا رۆژی دوایی و تا ئەم جیهانە ماوە. بەم رەنگە ئەو بیرو باوەڕو یاسایانە کە دەست نادەن بۆ گۆڕان و لە هەموو کات و چەرخێك دا وان لە کاردا و پێویستە بوونیان، ئەوانەی بە روونی باس کردووە و دیاریی کردوون، ئیتر چ حەڵاڵ و چ حەرام لە هەموو بارو روویەکی ژیانەوە.

بۆ نموونـه: خواپەرستی و کـردەوە و رەوشـتی جـوان و شـیرین کـه هەمیشه بوونیـان پێویسته نەبوونیان ئەوانیش هەر دیاریی کراون، ئەو شتانەی کە دەست ئەدەن بۆ گۆڕان و زیان نی یە لە گۆڕاندنیان دا بە پێی بەرژەوەندیی کات و چەرخ و وڵات و تاقم و چینەکانی ئـادەمی ی، بـۆ ئـەو شـتانە بـڕواو یاسـای گـشتی نـەگۆڕاوی دانـاوەو پێویستی کردووە دەرنەچوون لە چوار چێوەیان، بارو شێوەیەکی تایبەتی دانەناوە بۆ پێك هێنان و بەدی هێنانی ئەو بڕواو یاسا گشتی یانە، دەست نیشان و ڕێنموونی کـردووە بـۆ ئـەوەی موسـڵمانان بـە پـێی بەرژەوەنـدیی گـشتی ی لـە سـنوور و چـوار چێوەی ئەو بڕوا و یاسا گشتی یانەدا یاسای تایبەتی دیاریی بکەن و دەربێنن و وەری گرن! بۆ نموونە: پێویستی کردووە کە سەرۆك و کاربەدەستی گشتی بە پرس و راو هەڵبژاردنی میللەت دیاریی بکرێ. کەواتە نابێ لە سنووری ئەم بڕوایە تێپەڕ بکرێ. بەڵام دیاریی نەکردووە شێوە و ڕێگەیەکی تایبەتی بۆ وەرگرتنی ئەو راو هەڵبژاردنە. ڕێ هەیە هەر جۆر سوود و بەرژەوەندی بوو بەو جۆرە بەدی بهێنرێ، کەواتە بەم کورتە باسە تێ ئەگەین کە ئەم ئایین و شەریعەتە پێویستی نی یە بە زیاد کردنی هیچ شتێك لێ ی لە هیچ کات و چەرخ و وڵاتێك دا هەتا رۆژی دوایی، تێ ئەگەین کە ئەم ئایین و شـەریعەتە دەسـت نـادا بـۆ گـۆڕان، بـۆ هـەموو ئـادەمی ی هـەتا هەتایە. یاسـا و بڕیـارە تایبەتی یەکانی هاتوون بۆ ئەوەی بمێننـەوە وەك خۆیـان، بـڕواو یاسـا گـەورەو گـشتی یـەکانیش هـاتوون بـۆ ئـەوەی ببن بـە بنـەڕەت و چـوار چێوەیەك کـە ژیـانی ئـادەمی ی گەشت بکات و پەرە بسێنێ لەناویان دا!!

ت- ﴿وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي﴾ تـەواوم کـرد بەسـەرتانەوە چـاکە و بـەهرەی خـۆم. ئـەم چـاکە و بەهرەیە بە چەند شتێك تەفسیر کراوەتەوە. یەکێ لەوانە: بەخشینی ئەم بەرنامە تێرو تـەواوە گـشتی یـە هـەتا هـەتایی یەیـە کـە جێگـرو جێنـشینی هـەموو ئـایین و شەریعەتەکانی رابردووە، بێگومان ئەمە لە هەموو چاکە و بەهرەکانی تر گەورەترەو هەرچی چاکە و بـەهرەکانی تـر هەیـە سـەرجەم سەرچـاوەکەیان ئـەم چـاکە و بـەهرە گەورەیە، کەواتـە تەفسیری بـەم بکرێتـەوە چاکترە لـە دڵ دا جێگیر تـرە، هەرچـەند بـەم شێوە وەك دووبارە کردنەوە وایە بۆ چاکەی پێشوو.

پ- ﴿وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ﴾ هەڵم بژارد بۆتان ئیسلام بە ئایین. ئەو ئیسلامەی کە وا زاڵ و سەرکەوتووە بەسەر هەموو ئایینەکان دا، هەرچەند موسڵمانەکان بەهۆی لادان و پشت تێ کردنیان لە ئیسلامەکەیان ژێر کەوتوو و ژێر دەستە بوون، بەڵام ئایینەکەیان هەر مایەوە بە سەرکەوتوویی و سەربەرزی، هیچ کەس و هیچ گەل و کۆمەڵێک نەیتوانی هیچ بڕیار و بەندێ لە بڕیارو بەندەکانی بە درۆ بخاتەوەو بە ناڕاست و ناڕەوای دەرکات. ئەو ئیسلامەی کە چواردە چەرخە لە دەرو لە ناوەوە کەنەی لێ ئەکرێ و هەوڵ ئەدرێ بۆ نەهێشتنی دواترین نیشانە و دروشمی میریی یەکەی، زاڵ بوونی دوژمن لە هەموو لایەکەوە بەسەر وڵات و دانیشتووەکانی دا، لە پاش ئەوپەڕی بەکارهێنانی هەموو چەک و پیلانێک بۆ دوور خستنەوەی مەردومان لێ ی، لە پاش هەموو ئەوانە کەچی بیرو باوەڕەکانی هەر گەشە ئەکەن و بەهێز و دامەزراو تر ئەبن لە دڵ و دەروون دا، تەنانەت لە دڵ و دەروونی رۆڵە و نەوەکانی دوژمنەکانی دا و لەناو جەرگەی وڵاتەکانی ئەوانیشدا.

خوای میهرەبان هەواڵ و مزگێنی دا بەمەی ئەم ئایینی ئیسلامەی گەیاند بە پایان، چ لە بارەی عەقیدەو بیرو بڕواوە، چ لەبارەی شەریعەت و یاساوە، کە ئایین بریتی یە لەوە. کەواتە هەرکەس خۆی بە بڕوادار دابنێ نابێ لای وابێ کە هیچ جۆرە ناتەواوی و کەم و کوڕی یەک هەیە لەم ئایینەدا. یان بۆ هەموو شوێن و کاتێک دەست نادات و پێویستی هەیە بە دەست کاریی و بژارە کردن، ئەو کەسە بڕوادار نی یە بە خوا، باوەڕی نی یە بە راستی ئەم هەواڵ و مزگێنی یە، رازی نی یە بەوەی کە خوا هەڵی بژاردووە بۆ بڕواداران! پێویستە هەموو کەس بڕوای ببێ بەوەی کە شەریعەتەکەی ئەو رۆژەی کە ئەم ئایینەی تیا هاتە خوارەوە، هەر ئەوەیە شەریعەتی هەموو کات و چەرخ و چین و وڵاتێک تا ئەم جیهانە مابێ، چونکە بە شایەتی خوا شەریعەتەکەی ئەو رۆژە شەریعەتی ئەم ئایینەیە کە هات بۆ هەموو ئادەمی ی لە هەموو کات و شوێنێک دا، نەک بۆ تاقم و چینێک لە ئادەمی ی لە کات و چەرخ و شوێنێکی تایبەتی دا، بە وێنەی شەریعەتەکانی پێش ئەم کە پێغەمبەرەکانی – درودی خوایان لێ بێ – بەو جۆرو شێوە تایبەتی یە هێنایان، هەرکام لەوانیش تێرو تەواو بوون بۆ کات و چەرخ و گەل و وڵاتی تایبەتی خۆیان، هەرچۆنێ ئەم شەریعەتەیش هەر لە

سەرەتاوە بە تەواوی هاتووە بۆ هەموو قۆناغەکانی تا ئەو رۆژەی ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، واتە خوا خۆی ئەزانێ و ئاگایە بە هەموو شتێ، جا بە پێی ئەو زانین و لێزانی و کاردروستی یەی خۆی لە هەر قۆناغێك دا هەر ئەندازەیەکی لەم ئایین و شەریعەتە ناردووە کە تێرو تەواو و رێك و پێك بووە لەگەڵ ئەو کات و قۆناغە تایبەتی یەدا، تا بەرە بەرە رادە و پلەی بڕواداران بەرز بوویەوە تا گەیشتە ئەوپەڕی پلە لە رۆژی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەدا، ئەو کاتە بە تەواوی ناردی یە خوارەوە بە جۆرێکی وا کە رێك و پێك بێت بۆ داهاتووی ئادەمی ی هەتا رۆژی دوایی، وەك لە پێشەوە بە کورتی روونمان کردەوە!!

بەڕاستی پێویستە بڕوادار بە ئەوپەڕی سوپاس و چاولەبەریی یەوە بوەستێ لەبەردەم ئەم مزگێنی یە گەورەدا، کەوا مرۆڤ و مرۆڤایەتی نی یە و پێك نایەت بە بێ ئەم ئایین و شەریعەتە، کە خوا بەخشی بە جیهان و جیهانیان، چونکە مرۆڤ نی یە و هیچ نرخی نی یە بە بێ ناسینی خوای پەروەردگاری، بەو جۆرەی کە ئەم ئایینە پێی ئەناسێنێ و ئاشنای ئەکات پێی، وە پێش ئەوەی ئەم بوون و بوونەوەرە بناسێ لەسەر بارە راستەقینەکەیان کە ئەم ئایینە پێی ئەناسێنێ و ئاشنای ئەکات پێی، پێش ئەوەی خۆی بناسێ و رێز و رادە و پلەی خۆی بناسێ، وەك ئەم ئایینە ئەیناسێنێ پێی. مرۆڤ و مرۆڤایەتی نی یە پێش ئەوەی ئازادی تەواو وەرگرێ بەمەی کە تەنها خوا بپەرستێ بە بێ هیچ وێنە و هاوبەشێك کە ئەوەش هەر لەم ئایینەدا دەست کەوت ئەبێ کە شەریعەت و بەرنامەی ژیانی لە دەست کردی خوا بێ نەك لە دەست کردی هیچ کەسێکی تر، دیارە ئەوەش هەر لای ئیسلام هەیە.

ئاشنا بوون و ناسینی ئەو شتە راست و گرنگانە بەو شێوەی کە ئیسلام پێی هاتووە یەکەم جارو سەرەتای پەیدا بوون و لە دایك بوونی مرۆڤە، بە بێ ئەو ناسینە مرۆڤ نی یە، بەڵکو گیان لەبەرێکی ترە، ئەگەر پێی بگوترێ مرۆڤ ئەوە مرۆڤێکی زۆر ناتەواوە و هەرگیز تەواو نابێ و ناگات بە رادە و پلەی تەواوی خۆی مەگەر بە ناسینی ئەوانە لەسەر بارو شێوەکەی خۆی کە ئیسلام هێنای. ئینجا هەر بە پێك هێنانی ئەو شێوە شیرینە لە ژیان دا مرۆڤایەتی تەواو پێك دێت بۆ مەردوم و جیا ئەبێتەوە لە گیان لەبەرێکی تر.

بەڕاستی کەسێك تێ ئەگات لە رادەو پلەی بەرزی ئەم چاکە و بەهرەی خوا، رێزو نرخی راستەقینەی ئەزانێ کە ژیا بێت لەسەردەمی نەفامی دا، چەرخ و سەردەمی نەفامی لە هەرکات و لە هەر وڵاتێك دا بریتی یە لەوەی کە بەرنامەی ژیان تیای دا لە لایەن خواوە نەهاتبێ و لەلایەن هەرکەسێکی ترەوە هاتبێ، ئەو کەسەی کە ژیا بێت لە چەرخی نەفامیدا،

ئێش و ئازار و تاڵی و سوێری یەکەی چەشتبیٚ، ئازارو تاڵی و سوێریی لە بۆچوون و بیرو باوەڕدا، لە رووداوی ژیان دا، هەر ئەو کەسە بە باشی تیٚ ئەگات و هەست ئەکات بە تەواوی بە نرخ و رێزو رادە و پلەی بەرزی ئەم ئایینە کە خوا بەخشی بە جیهان و جیهانی یان، کەواتە ئەو یەکەم چین و تاقمە کە یەکەمجار ئەم فەرموەیان ئاراستە کرا لەم ئایەتە پیرۆزەدا، ئەوانە زۆر بە باشی تیٚ ئەگەیشتن لە نرخ و رێزی ئەم مزگێنی یە خۆشانە و چاکتر هەستیان ئەکرد بە تام و بۆنی ئەو وتە پیرۆزانە، چونکە خۆیان ژیا بوون لەو چەرخی نەفامی یەدا، هەموو کاروبارەکانی بە بەرچاویانەوە بوو، لە هەموو کەس چاکتر ئەیان زانی کە ئەم ئایینە لە چ پەستی و خواری و لاری و نەزانی و نەفامی یەك رزگاری کردن، بەرزی کردنەوە بۆ ئاسۆ و پۆپەی هەرە بەرز، راست و رێك و زانا و فامیدەی کردن!!

ئیسلام دەری هێنان لە پەستی و نەفامی ی لە بیرو باوەڕدا کە هەر تاقمێك شتێکی ئەپەرست، لە بت و فریشتە و جنۆکە و ئەستێرە و هەر شتێکی تری پڕو پووچ، لەو پەستی یە دەری هێنان و بەرزی کردنەوە بۆ پلەی بەرزی خواپەرستی بە تاك و تەنیا، بۆ بڕوا بە تەنها خوایەك کە توانا و زاڵ و میهرەبانە، بیسەرو بینا و ئاگا و زانایە بە هەموو شتیٚ، دادپەروەرو نزیك بە هاوارەوە هاتووە، پەنا پیٚ براو و داوا لیٚ کراو، بە بیٚ واسیتە و پرس و ئیزن خواستن.

ئیسلام بەرزی کردنەوە لە پەستی و ستەمی کۆمەڵایەتی، لە رژێمی چینایەتی و جیاوازی چین و تاقمەکانی گەل و کۆمەڵ، لە هەموو باوێکی ناڕاست و ناڕەوا کە لەو چەرخ و سەردەمەدا باو بوون، لە داگیر کردن و خود پەسەندی و خۆپەرستی کە هەرکەس چۆنی بۆ دەست بدایە دەست گێڕانەوەی نەبوو(نەك وەك هێندیٚ لە رەگەز پەرستان ئەڵێن: لەو سەردەمەدا ژیانێکی دیموکراتی بووە لەناو عەرەب دا). هەرکەسێك هێندیٚ شارەزا بێت لە مێژووی پادشا و زۆردارەکانیان دا وەك(حجری کوڕی حاریس و عومەری کوڕی هیند و نوعمانی کوڕی بەشیر و کولەیبی وایل) و چەند کەسانێکی تریان، هەرکەس لە مێژووی ئەوانە بزانیٚ تیٚ ئەگات لە بەدیی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمە.

ئیسلام دەری هێنان لە زیندە بەچاڵ کردنی کچ و سەرکردنە قومار و ئارەق و شەرواڵ پیسی و هەموو کارێکی بیٚ ناموسی، شەڕو شۆڕ و تاڵان و بڕۆ، لە دوژمنایەتی و تەفرەقەی ناوخۆ و لە ژێر دەستەیی و خۆنەگرتنیان بەرامبەر هەر هێزێکی دەرەوە کە پەلاماری بدایە بۆیان، وە رووداویساڵی فیل بەسە بە بەڵگە و نیشانەی روون لەسەر ئەوە،

ئیسلام بەرزی کردنەوە بۆ پۆپەی هەرە بەرز لە هەموو بارو روویەکی ژیانەوە، جا لەبەر ئەوە ئەو چین و تاقمە لە هەموو کەس باشتر هەستیان ئەکرد بە نرخ و گەورەیی و گرنگی ئەو چاکە و بەهرە و بەخششەی کە خوا رشتی و بەخشی بەسەریاندا.

بەڕاستی زۆر پێویستە کە بڕوادار بە قووڵی بیر بکاتەوە لەو میهرەبانی یە گەورەی کە خوا کردی – بە تایبەتی لەگەڵ بڕواداراندا – ئینجا ئەبێ بڕواداران بزانن کە ئەرك و باری سەرشانیان زۆر قورس و گرانە بەرامبەر ئەم بەخشینە، تا رادەیەك کە ئەگەر ئەم ئوممەتە بە هەموو چینەکانی یەوە ئەوەی کە لە توانایان دا هەیە بەختی بکەن لە سوپاس و بەندەیی و مل کەچیدا، هەر هێشتا بە هیچ ناگەن، ئەبێ لەگەڵ ئەوەدا هەر داوای لێ بوردن بکەن لە کەم و کوڕی یان.

هەڵبژاردنی ئەم ئایینە بۆ ئەم ئوممەتە داخوازە لە یەکەمجارەوە بۆ ئەوەی کە بە سۆز و پەرۆشەوە چاولەبەری و نرخ و رێزی ئەو هەڵبژاردنە بزانێ. ئینجا سووربێ لەسەر دامەزراندن و لانەدان بە ئەندازەی موویەك لەم ئایینە پیرۆزە، ئەبێ رازی و شادمان نەبێ بە هیچ شتێکی تر، بێجگە لەمەی کە خوا بۆی هەڵبژارد، هەر بڕوادارێك وا نەبێ نەحس و نەگبەت و نەفامە، هەر بڕوادارێك شتێکی تر هەڵبژێرێ بۆ خۆی هەرچۆنێ بە بڕوادار نامێنێ و لە ئیسلام دەرئەچێ، هەروەها بە ئامانج ناگات و خوا بێ ئابڕووی ئەکات پێش هاتنی سزای رۆژی دوایی، زۆرجار خوا مۆڵەتی بێ بڕوایان ئەدات تا ماوەیەکی دوورو درێژ بەڵام ئەوانەی کە ئیسلامیان ناسیبێ و ئینجا لێ یان هەڵتەکاندبێ، هەرگیز خوا وازیان لێ ناهێنێ و بە ماوەیەکی کەم دەردیان دەرخوارد ئەدات.

لە پێشەوە باسی حەوت قەدەغەی کرد، لە پاشان بە تێهەڵکێش حەوت رستەی هێنا وەك(طیبی) ئەفەرموێ، بەو تێهەڵکێشە قەدەغە کردنەکەی ئەوانەی بەهێز کرد و ئەوانەی بێزراو تر کرد لە دڵی بڕواداران دا، بەوەی کە خواردن و کردنی ئەوانەی کرد بە هۆی دەرچوون لە ئایین و فەرمانی خوا، ئەو قەدەغە کردنەی گێڕا بە بەشێك لە ئایینی بە پایان گەیشتوو، بەشێك لە چاکە و بەهرەی خوا بەسەر بڕوادارانەوە، بەشێك لەو ئیسلامەی کە خوا هەڵی بژارد بۆیان.

فَمَنِ ٱضۡطُرَّ فِي مَخۡمَصَةٍ غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ۝٣ يَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمۡۖ قُلۡ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ وَمَا عَلَّمۡتُم مِّنَ ٱلۡجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ ٱللَّهُۖ

لەپاش ئەو تێهەڵكێشە ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ سەر قەدەغە كراوەكان بە ڕەوادانیان لەكاتی ناچاری دا بۆ ناچار و پێ گیراوان، ئەفەرموێ: ﴿فَمَنِ ٱضۡطُرَّ﴾ ئینجا هەركەسێك ناچار كرابێ و كەوتبێتە ناچاریی لە خواردنی ئەو قەدەغە كراوانەدا، یان هەركەسێك دووچاری زیان كرابێ ﴿فِي مَخۡمَصَةٍ﴾ لەكاتی برسێتی یەكی بەتین دا كە مەترسی مردن یان سەرەتای مردنی لێ بكرێ. ﴿غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ﴾ لەكاتێك دا مەیل كەری گوناه نەبێ و بەدەستی قەست لانەدا بۆلای گوناه، بەم ڕەنگە زیاد لە ئەندازەی پێویست بخوا بۆ خۆشی وەك هێندێ لە زانایان ئەفەرمون، یان بە زۆر لە ناچارێكی تری وەك خۆی بسێنێ، یان لە سەفەرێكی حەرام دا یان بە هۆیەكی حەرام دووچاری ئەو برسێتی یە بووبێ وەك هێندێكی تر ئەفەرمون. هەركەس ئەو قەدەغەیانە بخوات لەم كاتەداو بەم مەرجە ئەو كەسە خوا لێ ی ناگرێ. ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ چونكە بەڕاستی خوا لێ بوردەی میهرەبانە.

بێگومان ئەم قورئانە گۆڕانێكی تەواوی بێ وێنەی هێنا بەسەر ئەو گەلەی كە دەری هێنان لە پەستی و حاڵی نەفامی و بەد كرداریی، ڕایچڵەكاندن و تەتەڵەی كردن، بە جۆرێ هەرچی بیرو باوەڕ و كردەوەو هەستی سەردەمی نەفامی یان تیا بوو جوێ كردنەوە و لێ ی دەركردن، لە پاش ئەوەی لەو چاڵی پەستی یە دەری هێنان و بەرزی كردنەوە بۆ پۆپەی هەرە بەرزی مەردایەتی و مرۆڤایەتی، بە تیشك و ڕووناكی بڕوا و بەرهەمەكانی بڕوا دڵ و دەروون و هەستی پاك و خاوێن كردن، پاش ئەوە تێگەیشتن لە گەورەیی و گرنگی ئەو چاكە و بەهرە گەورەیەی كە خوا ڕشتی بەسەریان دا، لەبەر ئەوە هەموو مەبەست و ئاوات و ئامانجیان ئەوە بوو كە بە موو لانەدەن لەو بەرنامەی كە خوا پێ ی بەخشین، هەمیشە ترس و بیمیان لەوە بوو كە لادەن لەو ڕێگە ڕاستە و بكەونەوە ناو چاڵی سەردەمی نەفامی، جا بەهۆی ئەوەوە لەپاش بیستنی ئایەتەكانی قەدەغە كردن دەستیان كرد بە پرسیار كردن لەو شتانەی كە حەڵاڵە بۆیان، بۆ ئەوەی نزیكی هیچ شتێك نەكەونەوە تا لە پێشەوە نەزانن

حەلاڵە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمْ﴾ پرسيارت لێ ئەکەن – ئەی پێغەمبەر – چی حەلاڵ کراوە بۆتان؟ ﴿قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَـٰتُ﴾ لە وەلاميان دا بڵێ: حەلاڵ کراوە بۆتان هەموو شتە پاکەکان، واتە ئەو شتانەی کە تەبيعەت و سروشتی رێك و پێك حەزی لێ بکات و بێزراونەبێ لای، ئەم وەلامەمەر زۆرشيرين و دڵ رفێنە، چونکە وا نيشان ئەدات کە بڕواداران بێبەش نەکراون لە هيچ شتێکی پاك، هەموو پاکێکيان بۆ حەلاڵ کراوە، ئەوەی کە قەدەغە کرابێ لێيان هەرشتە پيسەکانە، وەك لە راستيش دا هەر وايە و ئەوەی کە خوا حەرام و قەدەغەی کردووە لە خۆراك، تەبيعەت و سروشتی ساغ و نەگۆڕا و قێزی لێ ئەکاتەوە، وەك مردارەوە بوو و خوێن و گۆشتی بەراز يان دڵی بڕوادار بێزارە لێ ی و قێزی لێ ئەکاتەوە، وەك ئەوەی کە ناوی خوای لێ نەبرابێ و بەناوی يەکێکی ترەوە سەربڕرابێ و ئەوانی تر کە باس کران لە ئايەتەکەدا. ئينجا بە تايبەتی باسی جۆرێك لەو پاکانە ئەکات کە مەرجی تايبەتی خۆيان هەيە. ئەو جۆرەش بريتی يە لەو گيان لەبەرە حەلاڵانەی کە ماڵی نين و دەست کەوت ئەبن بەهۆی باڵندەی راوکەرەوە، وەك باز و سەقر، يان بەهۆی دڕندەی راوکەرەوە، وەك سەگ و وێزو شێر، بە مەرجێك خۆيان لێ ی نەخۆن، ئيتر با بەدەستيانەوە گيانی نێچيرەکەيان دەرچێ،ئەفەرموێ: ﴿وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ ٱلْجَوَارِحِ﴾[1] حەلاڵ کراوە بۆتان نێچيرو دەست گير کراوی ئەو راوکەرانەی کە فێرتان کردوون تا رام بووبن ﴿مُكَلِّبِينَ﴾ لەکاتێك دا کە بە وردی و بە چاکی ی فێرکەريان بن، يان لە کاتێك دا کە هاندەر و تێ بەردەريان بن بەرەو نێچيرەکان، لەسەر ئەم بارە ئايەتەکە ئەوە ئەگەيەنێ کە هاندان و تێ بەردان مەرجە، کەواتە ئەگەر خۆيان لەخۆيانەوە دەرچن و نێچير بگرن و بە دەستيانەوە بمرێ ئەو نێچيرە حەرامە، بەلام لەسەر تەفسيری يەکەم ئەو مەرجە لە قورئانەکەوە وەرنەگيراوە. ﴿تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ ٱللَّهُ﴾ فێريان ئەکەن لەو جۆرو شێوەی کە خوا ئێوەی فێر کردووە، بەم رەنگە خستوويەتە دڵتانەوە، يان بەهۆی ژيريی و بيرکردنەوە و بەراورد کردنەوە خوا فێری کردوون کە چۆن ئەوانە فێر بکەن و راميان بکەن،

---

[1](جوارح) کۆيە و تاکەکەی(جارحە) يە کە ناوە بۆ ئەو جۆرە دڕندە و باڵندانە کە بە کردەوەی خۆيان خۆراك و خواردەمەنی خۆيان پەيدا ئەکەن، هێندێ ئەفەرمون: مەبەست زام کەرە، ئەوانيش زۆربەی نێچيرەکانيان زامدار ئەکەن.

فَكُلُوا۟ مِمَّآ أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ وَٱذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٤﴾ ٱلْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ ۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ ۖ

---

﴿فَكُلُوا۟ مِمَّآ أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ﴾ كەواتە بخۆن لەو نێچیرانەی کە بگرەکانیان ڕاگیریان کردووە و ڕایان وەستاندووە بە دیارتانەوە و خۆیان لێ یان نەخواردووە، وەك زۆبەو جەماوەری لەسەرە، یان مەبەست ئەوەیە لەوە بخۆن کە هێشتوویانەتەوە، ئیتر لە نێچیرەکەیان خواردبێ وەك هێندێ لە زانایان ئەفەرمون، ئەگەر چی باری یەکەم بەهێزترە لە دڵ دا، هێندێ لە زانایان ئەفەرمون ئەم مەرجی نەخواردنە هەر بۆ دڕوندەکانە و مەرج نی یە لە باڵندەکان دا، چونکە بە تەواوی ڕام و ژێر دەست ناکرێ. ﴿وَٱذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ﴾ ناوی خوا ببەن لەسەری، واتە لەسەری ئەو دڕندە و باڵندەیانە کە ئەیانکەنە نێچیرەکان، بەم ڕەنگە لەکاتی هاندان و تێکردنەکەدا بڵێن: بسم الله و بەم جۆرە بەناوبانگە و حەدیسی سەحیحیش هاتووە پێ ی، یان لەسەر ئەو نێچیرەی کە ڕاگیریان کردووە بۆتان وەك هێندێ لە زانایان ئەفەرمون، لەبەر ئەوەی ئەم نزیك ترە، کەواتە ئەم مەبەست بێت چاکترە، واتە ئەوەی کە ڕاگیریان کردووە بە گیان پێ ی گەیشتن ناوی خوای لێ بێنن و بە شەرعی لە گیانی بکەن، هێندێکی تر ئەفەرمون: مەبەست ناوبردنی خوایە لەکاتی خواردنی دا لەبەر حەدیسێك کە ئەوەی لێ وەرئەگیرێ. ئینجا با بزانرێ کە نیشانەی فێر بوون و ڕام بوونی ئەو ڕاوکەرانە ئەمەی بەلای کۆمەڵ و جەماوەرەوە کە بە هاندان پەلامار بدەن، بە تێ خوڕین و جڵەوگیریی بوەستن و بگەڕێنەوە و تەقێ و ترێز نەکەن لە خاوەنەکانیان، لە نێچیرەکەش نەخۆن. ئینجا کۆتایی ئەهێنێ بە ئایەتەکە بەم فەرمودەیە کە زۆر بەهێزو بەکارە بۆ گوێ ڕایەڵی ی لە دڵی بڕواداران دا: ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ خۆتان بپارێزن لە خوا، بە فەرمانبەریی و گوێ ڕایەڵی کردن لە هەموو حەڵاڵ و حەرام کراوەکانی دا کە یەکێ لەوانە نەخواردنی نێچیرو دەست کەوتەکانی ڕاوە بەم مەرجانەی کە باس کران، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ﴾ خوا بکەنە چاودێر بەسەر کردەوەکانتانەوە، چونکە بێگومان پاداشتی خوای گەورە زۆر بە خێرایی یە. بەڵام بە پێویستی ئەزانم کە بگەڕێینەوە بۆ سەر وتەو ڕستەیەکی ئایەتەکە کە زۆر گرنگ و سەرنج ڕاکێشە بۆ بڕواداران، فەرموی: ﴿تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ ٱللَّهُ﴾ فێریان ئەکەن لەوەی خوا ئێوەی فێرکردووە!! چونکە خوا ئەوانەی ژێر بار کردووە بۆ فێر کەران، خوا دەسەڵاتداری کردوون بەسەر ئەو فێرکردنەدا،

خوا ڕێگەی فێر کردنەکەی نیشان داون و خستوونی یەتە سەر ئەوە، بێگومان ئەمە شتێکی ڕاستە و هەموو بڕوادارێك ئەبێ بڕوای پێ‌ی هەبێ، بەڵکو هەموو کەس ناچارە بە بڕوا هێنان بەو شتە ڕاستە، چونکە وەکو قورئان ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ﴾ خوا ئێوەی دروست کردووە لەکاتێك دا کە ئێوە هیچتان نەزانیوە و نازانن، خوا گوێچکە و چاو و دڵی پێداون کە هۆی زانینن، هیچ کەس لە یەکەمجارەوە هیچی نەزانیوە و هیچ دەسەڵاتیشی نەبووە لە هۆو ڕێگاکانی زانین، هیچ کەسیش لەم جیهانەدا ناتوانێ لاف ئەوە لێ بدات کە دەسەڵات و دەخلی ببێ لە فەراهەم هێنانی ئەو هۆی زانینانە نە لە خۆی دا و نە لە هیچ کەسێکی تردا. شتێکی ئاشکرایشە ئەو هۆی زانینانە لە خۆیانەوە بە ڕێکەوت پەیدا نەهاتوون و پێك نایەن، کەواتە بێ بڕوایش هەر ناچارە – ئەگەر ڕێزی خۆی بەلاوە بێت – ئەبێ هەر بڵێ: بەهێزو دەسەڵات و دروست کردنی یەکێکی تر پەیدا بوون و فەراهەم هاتوون، دەی ئەم شتە ڕاست و ڕێکە زۆر جار بڕوادار لێ ی بێ ئاگا ئەبێت و لە هەموو کاتێك دا هەستی پێ ناکات، لەبەر ئەوە لە میهرەبانی خوا بەزیاد بێت بەندە بڕوادارەکانی بێدار ئەکاتەوە تا چرکەیەك بێ هۆش و بێ ئاگا نەبن لە هەموو شت و لە هەموو کارو کردەوەو بەسەرهاتێك دا دەستی قودرەتی خوا ببینن بەچاوی دڵیان، هەمیشە خوایان لەبیر بێ، لەبیریان بێ کە هەموو شت لە خواوە دێت و بۆلای خوا ئەگەڕێتەوە، ئەو کاتە ئەو خاوەن بیرو هۆشە ئەبێ بە بەندەیەکی پاك وخاوێنی پاڵفتە کراو، لە زوبانی شەرع دا پێ‌ی ئەوترێ: بەندەیەکی(ربانی)، ئا بەم جۆرو شێوەیە پەروەردگاری میهرەبان بەندە قورئانی یەکانی پەروەردە ئەکات و پێ یان ئەگەیەنێ بەم قورئانە گەورەیە، لە لوتف و میهرەبانی یەکەی بەزیاد بێت و هەموو سوپاسێ بۆ ئەوە.

لە ئایەتی پێشوودا بە شێوەی گشتی دەست نیشانی کرد بۆ هەموو شتە حەڵاڵەکان، بەتایبەتی حەڵاڵی گۆشت و نێچیرە حەڵاڵەکانی کرد، ئینجا ئەوا لەم ئایەتەیش دا بە تایبەتی باسی هێندێکی تر ئەکات کە سەربڕاو گۆشتی دەستی نامەدارەکانە و مارە کردنی ئافرەتەکانیان، وە ئەم باسە لێرەدا هەرچۆنێ ڕێك و پەیوەستە بە پێشەکەیەوە هەروەها زۆر گرنگ و پێویستە، چونکە لە ئایەتی پێشوودا چەند شتێکی قەدەغە کرد کە لای بت پەرست و هاوبەش ڕەوا دەرەکان حەڵاڵ و ڕەوا بوون، وەك لە ئایەتی سورەتی(الممتحنة) یش دا – کە لە پێش ئەم سورەتەدا هاتووەتە خوارەوە – مارەکردنی ئافرەتەکانیانی قەدەغە کرد، نامەدارەکان هەرچەند لە بنەڕەت دا خواپەرست بوون بە تاك و تەنیا بەڵام لە پاشان لە چەند

بارێکەوە ئایینەکەیان تێکەڵی بت پەرستی کرد، وەك قورئان ئەو هەواڵەی لێدان، کەواتە ئەگەر ئەم ئایەتی داهاتووە نەهاتایە و ئەو دوو شتەی ئەوانی حەڵاڵ نەکردایە ئەمانیش هەروەك ئەو بت پەرستانە سەیر ئەکران و دائەنران، خوای لێزانی کاردروستیش نەیویست کە بە گوێرەی بت پەرستەکان لەگەڵ ئەمان رەفتار بکات لەبەر هەر هۆیەك کە خۆی باش ئەزانێ، هێندێکیشی روونە و لەلایەن بەندەکانی خواوە گوتراوە، وەك لەمەوپاش دەست نیشانی بۆ ئەکەین بە یارمەتی خوا. جا لەبەر ئەوە ئەمانی جوێ کردەوە لەوان و ئەم دوو شتەی ئەمانی حەڵاڵ کرد، لە یەکەمجارەوە فەرموی: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُۖ﴾ ئەمڕۆ حەڵاڵ کرا بۆتان شتە پاك و خاوێنەکان کە تەبیعی ساغ و سروشتی نەگۆڕاو حەزیان لێ ئەکەن و بێزراو نین بەلایانەوە، کە بەم فەرمودەیە مەردومی بڕوادار دڵ ئارام و دڵنیا ئەبێ لەسەر حەڵاڵی ئەو دوو شتە کە دێن بە دوای ئەم فەرمودەیەدا، بە چاك و خاوێن سەیریان ئەکات بە وێنەی پاك و حەڵاڵەکانی تر ﴿وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حِلّٞ لَّكُمۡ﴾ خۆراکی ئەوانەی کە نامەیان پێ بەخشراوە - واتە جوولەکە و گاور - حەڵاڵە بۆ ئێوە ﴿وَطَعَامُكُمۡ حِلّٞ لَّهُمۡۖ﴾ خۆراکی ئێوەیش حەڵاڵە بۆ ئەوان، واتە ئەوەی حەڵاڵ بێت بۆ ئێوە حەڵاڵە بۆ ئەوانیش، ئیتر با لەکاتی خۆی دا حەرام کرابێ لێ یان، ئەوەی کە حەرام کرابێ لە ئێوە حەرامە بۆ ئەوانیش، کەواتە گۆشتی حوشترو پەلەوەر و پیوی مانگا و بزن و مەڕ کە لەسەر ئەوان حەرام بووە! مەبەست بە خۆراك گۆشتی دەست و سەربڕاوی ئەوانە بەلای زۆربە و جەماوەری زانایانەوە، بە شێوەی گشتی مەبەستە بەلای دەستەیەك لە زانایانەوە، نان و میوە مەبەستە بەلای هێندێ لە زەیدی یەکانەوە. بەڵام رای یەکەم بەهێزترە و لە دڵدا جێگیر ترە، لەبەر چەند شتێك:

١- شتە حەڵاڵەکانی تر هەر حەڵاڵ بوون لە پێش ئیسرائیلی یەکان و لە پاش ئیسرائیلی یەکان، کەواتە بۆچی تایبەتی بکرێن و بە خۆراکی ئەوان دابنرێن، کەواتە مەبەست سەربڕاوەکان بێت چاکترە.

٢- ئایەتی پێشوو باسی حەڵاڵ ی گۆشتی نێچیرو سەربڕاو بوو، کەواتە چاکتر وایە مەبەست بەم خۆراکەش لێرەدا هەر گۆشت و سەربڕاو بێت.

٣- رووکەشی ئایەتەکە وا ئەگەیەنێ کە مەبەست خۆراکێکە بە کردەوەی ئەوان بووبێ بە خۆراك، دەی ئەوەش هەر سەر بڕاوەکانە و خۆراکەکانی تر بە کردەوەی ئەوان نەبووە بە خۆراك، بەڵکو هەر خۆراك بووە.

﴿وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحۡصِنِينَ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِيٓ أَخۡدَانٖۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٥﴾

یەکەم لە هێنی نامەداران کە حەڵاڵە بۆ ئێمە خۆراك بوو بەو شێوەی کە وترا. دووەم ئەمەیە کە جووتی ئەکات لەگەڵ حەڵاڵی خۆمان دا بەم جۆرەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ﴾ حەلاڵ کراوە بۆتان ئافرەتە ئازادە داوێن پاکەکان لە بڕوا داران ﴿وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ﴾ ئافرەتە ئازادە داوێن پاکەکان لەو گەل و کۆمەڵەی کە نامەیان پێ بەخشراوە لە پێش ئێوە، ئەمە بەلای دەستەیەك لە بڕوادارانەوە، وە بە لای کۆمەڵێکی ترەوە مەبەست بە ﴿المحصنات﴾ هەر ئازاردانە، وەك کۆمەڵێکی تر ئەفەرمون: مەبەست هەر داوێن پاکەکانە ئیتر با ئازادیش نەبن. هەرکام لەمانە بەڵگەی خۆیان بەدەستەوە وەك لە کتێبەکانی مەزهەبەکان دا بە درێژیی باس کراون، واتە جوولەکە و گاور، بێگومان خواستنی ئافرەتی بڕوادار دروستە با ئازاد و داوێن پاکیش نەبێ بەلای هەموانەوە، هەروەها ئازادی نامەدار با داوێن پاك نەبێ، بەڵام بەلای شافیعی یەوە نامەدارێ کە ئازاد نەبێ مارەکردنی دروست نی یە، کەواتە ئازادی و داوێن پاکی کە لە ئایەتەکەدا بۆ بڕوادار باس کراون مەرجی دروستی مارەکردنیان نین، بەڵکو مەبەست هاندانە لەسەر بە دوا گەڕان و هەڵبژاردنی ئازادی داوێن پاك و تا ئەوان دەست کەون ئەوانی تر مارە نەکرێن چاکە. هەروەها داوێن پاکی ی بۆ نامەدار مەرجی دروست نی یە، بەلای هەموانەوە، بەڵام ئازادی مەرجی دروستی یە بەلای شافیعی یەوە، ئەوانە حەلاڵ کراون بۆتان ﴿إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ کاتێ کە مارەیی یەکانیان بدەنێ، بێگومان ئەمە مەرجی حەلاڵ کردنەکە نی یە، بەڵکو بۆ دڵنیا کردنە لەسەر پێویستی مارەیی و هاندان لەسەر باری چاکترو شایستە تر ئەو مارەکردنە ﴿مُحۡصِنِينَ﴾ بەپاکی و پارێزگاریی خۆتان لە شەرواڵ پیسی بەهۆی ئەو مارەکردنە ﴿غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَ﴾ نەك بە زینا

کەرو شەروالْ پیسی بە ئاشکرا ﴿وَلَا مُتَّخِذَىٰتِ أَخۡدَانٖ﴾ نەك بە راگیر کردنی دۆستان بە ژێر بە ژێریی بۆ کاری داوێن پیسی، کە ئەو دوو جۆرە شەروالْ پیسی یە باو بووە لەو چەرخە نەفامی یەدا و ناسراو بووە لایان، وەك لە هەموو چەرخە نەفامی یەکانی تریش، واتە مەبەستی سەرەکی لە مارە کردن و ژن هێنان ئەمەیە هەرکام لە ژن و مێرد داوێن پاك بن و یەکتر بپارێزن لە داوێن پیسی و کاری بێ ناموسی. ئەوەی کە ئەدرێ بەو ئافرەتانە بە نیازی مارەیی ئەو مارە کردنە شەرعی یە بێت کە خوا دایناوە و حەلآلْی کردووە، نەك بکرێ بەهۆی گەیشتن بە ئافرەت لەهەرکام لەو دوو رێگە ناشەرعی یەی کە باس کران. ئینجا توندو تیژیی بەکار ئەهێنێ لە وەرگرتنی ئەم حوکم و بڕیارانەی کە باس کران، هەڕەشە ئەکات لەسەر مل کەچ نەکردن بۆیان، ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلۡإِيمَٰنِ﴾ هەرکەس دان نەنێ بە بڕوادار و بڕوا نەهێنێ بەو شتانەی کە پێویستە بڕوا پێ هێنانیان، واتە ئەو یاسا و بڕیارانە بەستراو و پەیوەستن بە بڕواوە، بڕوا هێنان بریتی یە لە گوێ رایەڵی و بەجێ هێنانی ئەوانە، یان بەڵگە و نیشانەی بڕوا هێنانن، کەواتە هەرکەسێك لابدا لەوانە، ئەو کەسە دان بە بڕوادا نانێت و بڕوا دائەپۆشێ، هەرکەسیش بەو جۆرە بێت ﴿فَقَدۡ حَبِطَ عَمَلُهُۥ﴾ بێگومان کردەوەی چاکی ئەو کەسە زایە ئەبێت و بەرهەمی نابێ هەرچەند کردەوەکەی بە رووکەش و رواڵەت بە گرنگ و گەورە سەیر بکرێ، بە وێنەی مالآتێ کە گیای ژاراوی بخوات و لە پاشان ئەئاوسێ و سکی با ئەکات و لە پڕێك دا ئەتەقێ و بەر و بەرهەمی سکە پڕەکەی نامێنێ، ﴿وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ ئەو کەسە لە رۆژی دوایی دا یەکێکە لە زیانباران کە زیانبار و بەش بڕاوان لە راستی دا هەر ئەوانەن کە لەو رۆژەدا زیانبار و بەش بڕاو بن.

ئا بەم جۆرو شێوە سەخت و سامناکە هەڕەشە ئەکات و ئەیهێنێ بەدوای ئەو بڕیارە شەرعی یانەدا کە هاتن سەبارەت بە حەرام و حەلآلْ کردنی هێندێ خۆراك و هێندێ لە مارەکردن و پەیوەندی بە ئافرەتانەوە. کەواتە ئەمە بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ئەوە کە ئەم بەرنامەی ئیسلامە هەموو بەش و پارچە و شتە تایبەتی یەکانی بەستراو و پەیوەستن

پێکەوەو هەرکام بەشێکی گرنگە لە ئایین و بڕوا و بە نەمان و یاخی بوون لە هەرکام بڕوا نامێنێ و ئایین لە دەست دەرئەچێ. ئینجا لە کۆتایی ئایەتەکەدا ئەگەڕێینەوە و بیرێکی لێ ئەکەینەوە و سەرنجێکی ئەو داد و دادپەروەریی و چاوپۆشی و سنگ فراوانی یە ئەدەین کە بەکاریان ئەمێنێ لەگەڵ ئەو بێ بڕوایانەی کە ئەژین لەناو گەل و کۆمەڵی موسڵمان و لە ولاّتی ئیسلام دا، یان لەگەڵ ئەوانەی کە پەیوەندی و پەیوەستی یان هەیە بە موسڵمانانەوە لە نامەداران.

ئیسلام هەر بەوە واز ناهێنێ کە ئازادیی و سەربەستی یان پێ ئەدا لە ئایینەکەی خۆیان دا، بەڵکو میهرەبانی یان لەگەڵ ئەکات بە تێکەڵی و هاوبەشی یان لە کاروباری کۆمەڵایەتی دا، بەم رەنگە خۆراکی ئەوانی حەڵاڵ کردووە بۆ موسڵمانەکان خۆراکی خۆیان دەرخواردی ئەوان بدەن، بەوە رەوای داوە هات و چۆ و میوانداریی و نان و ئاو لەگەڵ یەك خواردن، بەهۆی ئەوەوە بێزاریی و سڵەمینەوە لە یەکتر نامێنێ، بەڵکو دۆستایەتی و هۆگریی و چاوپۆشی پەیدا ئەبێ، هەروەها رەوای داوە بۆ موسڵمانان کە ئافرەتە ئازاد و داوێن پاکەکانی ئەوان مارە بکەن، خواستن و مارە کردنی ئەوانی هاوسەر کردووە لەگەڵ رەوادانی ئافرەتە ئازاد و داوێن پاکەکانی موسڵمانان، دەی ئەوە دڵ پاکی و سنگ فراوانی یە کە هەرکام ئیسلام پێی هاتووە لەناو هەموو خاوەن ئایین و مەزهەبەکانی تردا، ئەوەتا کاثۆلیکی خۆی دوور ئەگرێ لەمارەکردنی ئافرەتی ئەرثۆدکسی یان پروتستانتی یان مارونی، هەرکەس ئەوە بکات ئەو کەسە لە ئایین و عەقیدەکەی دەرئەچێ! بەڕاستی تەنها ئیسلام تاقانە بەرنامەیەکە کە رێ ئەدا بە پێك هاتنی گەل و کۆمەڵێکی جیهانی کە موسڵمانان بژین تیای دا لەگەڵ هەموو خاوەن ئایینەکانی تر و خاوەن بیرو باوەڕەکانی تر، کە لە ژێر ئاڵای ئیسلام دا بن، بژین و هەموو بە ئارامی و ئاشتی و بە بێ هیچ جۆرە دەست درێژیی و ژێر پێ کردنی ماف، ئەوە جیاوازە لەو خۆشەویستی و یارمەتی دانەی کە ئیسلام

بەرگری و جڵەوگیریی لێ ئەکات، وەك لەمەوپاش لەم سورەتەدا بە وردی و بە درێژیی باسی ئەکەین بە یارمەتی خوا لە کاتی تەفسیری ئەو ئایەتانەی کە لەو بارەیەوە هاتوون.

ئینجا بەدوای باسی خۆراك و ئافرەتە پاك و خاوێنەکان دا باسی دەست نوێژو نوێژ ئەهێنێ، هێنانی ئەم باسە لەم شوێنەدا زۆر رێك و بەجێ یە، ئەوەتا بەدوای ئەو دوو جۆرە پاکانەدا جۆرێکی تر ئەهێنێ و بەرز ئەبێتەوە لەوانەوە بۆ جۆرێکی بەرزتر لە پاکی دا، چونکە پێشووەکە پاك وخاوێنی ی لەشن، ئەم پاك و خاوێنی گیانە و خۆشی و لەزەتی گەیشتن بە خوای تیایە کە هیچ خۆشی و لەزەتێکی پێ ناگات و بەرزترین خۆشی و لەزەتە لە هەردوو جیهان دا، بەمە مرۆڤ ئەگات بە پایانی خۆی، بێجگە لەوەیش بێ دەست نوێژیی زۆرتر لە دوو شتەوە پەیدا ئەبێ، کە باس کران: خۆراك و پەیوەندی لەگەڵ ئافرەت دا، کەواتە لەم بارەیشەوە زۆر رێك و بەجێ یە هێنانی بەدوای ئەو دوو شتەدا. ئینجا هێنانی ئەم باسە بەدوای ئەو یاسا و بڕیارانی ترە لە سەرەتای سورەتەکەوە تا ئێرەو تێکەڵ کردنی ئەو هەموو شتە جیاوازو جۆر بە جۆرە کە هێندێکیان هەر بەشتێکی جیهانی رووت سەیر ئەکرێن، هەروەها تێکەڵ کردنی لەگەڵ هەموو یاسا و بڕیارەکانی داهاتووی سورەتەکە، هێنان و تێکەڵ کردنی ئەو هەمووە ئەوە نیشان ئەدات کە رەفتار کردن و پەیڕەوی هەرکام لەوانە خواپەرستی یە، هەرکام لەوانە بەشێکە لە ئایینی خوا، بە هەمووی ئایین و شەریعەتی خوا پێك دێت و تەواو ئەبێ، هەموو پەیوەستن پێکەوەو نابێ بپچڕێن و جوێ بکرێنەوە لە یەکتر، هەرکام یەکێکە لەو شتانەی کە خوا داینان و بە بێ جیاوازی داوای کرد لە بڕواداران کە هەڵسن پێ یان، بە یەکەم ئایەتی سورەتەکە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِ﴾ وەك بە روونی تێپەڕی کرد. ئەو جیاوازی و جوێ کردنەوە کە هەیە لە کتێبەکانی زاناکان دا، بەم رەنگە هەر کۆمەڵێك جوێ کراوەتەوە و ناوی تایبەتی بۆ دانراوە: عبادات، معاملات، مناکحات... هتد، ئەوە بە پێی بەرژەوەندی و داخوازیی دانانی کتێبەکە کراوە لەبەر ئاسان کردنی فێرکردن و فێر بوون.

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا فَٱطَّهَّرُواْۚ

---

**ئەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی كەسانێ كەبڕواتان هێناوە ﴿إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ﴾ كاتێ ویستتان هەڵسن و ڕاست ببنەوە بۆلای نوێژ دەست نوێژ بگرن وەك ئەفەرموێ: ﴿فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ﴾ دەم و چاوەكانتان بشۆرن و دەستەكانتان بشۆرن تا ئانیشكەكانتان، واتە لەگەڵ ئانیشكەكانیش، چونكە بەلای هەمووانەوە پێغەمبەر(ﷺ) شۆریونی، لە هیچ ریوایەتێك دا نەهاتووە كە جارێ نەیشۆری بن، ئەوەیش بەڵگەیە لەسەر پێویستی شۆرینیان، ئینجا ئەوەی كە كراوە بە بەڵگە لەسەر پێویست نەكردن، بەمەی لە زوبانی عەرەب دا ئەوەی كە لە پاش وتەی ﴿إِلَى﴾ وە بێت حوكم و بڕیاری ئەوەی نی یە كە لە پێشی یەوە بێت. ئەو بەڵگەیە بۆ ئێرە دەست نادات، لەبەر ئەوەی دەستەیەك لە زانایانی زمانی عەرەب كە یەكێكیان(سیبویە) یە ئەفەرمون: ئەوە بۆ شوێنێكە كە ئەوەی لە پاش وتەی ﴿إِلَى﴾ یە لە جۆری پێشەكەی نەبێت و شتێك نەبێ لە پێشەكەی، بۆ وێنە وەك شەو و ڕۆژ لە ئایەتی: ﴿ثُمَّ أَتِمُّواْ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيۡلِ﴾، نەك بۆ شوێنێك كە لە جۆرێك بن وەك لەم ئایەتەدا. ﴿وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ﴾بەدەستی تەڕدەست بێنن بەسەرەكانتاندا،واتەبەهێندێ لەسەرەكانتاندا، یان دەست پیا هێنان بە تەڕیی بگەیەنن بە سەرەكانتان، لەسەر هەر بار ئایەتەكە وا نیشان ئەدات كە پێویستە دەست هێنان بە هەموو سەردا، كەواتە هەر ئەندازە كە پێی بگوترێ دەست پیا هێنان بەسە، وەك شافیعی لەسەرە، بەڵام بێگومان چەند حەدیسێك هەیە لەم بارەیەوە، وەك لە كتێبەكانی(فقە) دا بڵاو بوونەتەوە، كەواتە با لا نەدرێ لە سنووری ئەو حەدیسانە، ﴿وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِ﴾ پێكانتان بشۆرن تا هەردوو قاپتان و بەوانیشەوە، بە وێنەی ئەوەی كە گوترا لە دەست و ئانیشكەكان دا، لە مەسەلەی پێ داچوار ڕا هەیە:**

**١- كۆمەڵ و جەماوەری موسڵمانان لەسەر ئەوەن كە پێویست و فەرزە شۆرین.**

**٢- شیعەی ئیمامی لەسەر ئەوەن كە هەر دەست پیا هێنان فەرزە.**

**٣- (داود و ناصر للحق)ی زەیدی لەسەرئەوەن كەهەردووفەرزەوتەنیایەكێكیان بەس نییە.**

٤- (ئـیبن و جـەریر) لەسـەر ئەوەیـە کـە بەنـدە هـەرکام هەڵئەبـژێرێ چـاکە و ئـارەزووی خۆیەتی، هەرکام لە خاوەن راکان بەڵگەی خۆی بەدەستەوەیە و لێکۆڵینـەوەی کردووە بـۆ بـەهێز کـردن و بـاودانی رای خـۆی. بـەڵام بێگومـان حـەدیس و ریوایـەتی زۆر و کردەوەی هاوەڵەکان و مەدینـەیی یـەکان پاش ئەوان و یەکەم چینی موسڵمانان، رای یەکەم باو ئەدەن و بەهێزی ئەکەن. لەبەر ئەوە تەفسیرەکەم بە پـێی ئـەوە کـردەوە. ئـەم چوار شتە کە لە دەقی ئایەتەکەدا هاتوون فەرز و پێویستن بەلای هەموو ئوممەتەوە.

ئینجا ماوەتەوە چوار شتی تر کە دووبەرەکی هەیە لە پێویستی و فەرزێتی یان دا:

ا- نیەت هێنان لە یەکەم جاری شۆرینی دەم و چاو.

ب- ریز کردنی کردەوەکان لەسەر شێوەی ئایەتەکەدا.

ت- دەست هێنانی بە شۆراوەکاندا.

پ- بەدوا هێنانی کردەوەکان و نەپچراندنیان لە یەکتر.

یەکـەمیان فەرزێکـە لـە فـەرزەکان بـەلای(مالـك و شـافیعی و ئەحمـەد و رەبیعـە و لیـث و ئیسحاق) و زانا بەناوبانگەکانی تـری شـارەکان، لـە ئیمامـەکانی(ال بیت) ەوە ئـەوە ریوایـەت کراوە – خوا لە هەمووان رازی بێت – بەلای(حەنەفی یەکان) ەوە فەرز نی یە، دووەمیـان فـەرز نـی یـە بـەلای(حەنـەفی و مالیـك) ەوە. بـەڵام ئـەمیش فەرزێکـە لـە فـەرزەکانی دەسـت نوێـژ بەلای(شافیعی) یەوە. سێ یەمیان فەرزە بەلای(مالیك) ەوە نەك لای ئـەوانی تـر. چـوارەم فـەرز نی یە بەلای(شافیعی و حەنەفی) یەوە، فەرزە لای(مالیك)، هەروەها دووبەرەکی هەیە لـە چـەند شـتی تـریش دا لـەبارەی دەسـت نوێـژ و خۆشـۆرینەوە، ئەمانـەی کـە لێـرەدا بـاس کـران و ئەوانەی کە باس نەکراون لەگەڵ بەڵگەی خاوەن رایـەکان دا بـە درێـژی بـاس کـراون لـە گـەڵ کتێبی مەزهەبەکان دا و لێرەدا پێویست نی یە باس کردنیان.

دەربارەی دەست نوێژ بەو جۆرەی فەرمو، لەبارەی بێدەست نوێـژیی گـەورەوە کەبریتییـە لە لەش گرانی، ئەفەرموێ:﴿وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا﴾ ئەگەرئێوە لەش گران بوون، ئیتر بەهۆی ئیحتلام و ئاوهاتنەوەیان بەهۆی کاری ژن و مێردی یەوە ﴿فَٱطَّهَّرُواْ﴾ ئەو کاتە بە باشی پاکی وەرگرن بە شۆرینی هەموو لەشتان بە پێست و مووەوە، وەك باس کراوە لە کتێبەکانی (فقه)دا،

﴿وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُۚ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ﴾

**ئینجا دێته سەر باسی تەیەموم،ئەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ﴾ ئەگەر ئێوە نەخۆش بوون – واتە نەخۆشی یەك كە بەكار هێنانی ئاو زۆر زیانی ئەبوو – ﴿أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ﴾ یان لە سەفەردا بوون، ئیتر سەفەری كورت یان درێژ، ﴿أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ﴾[1] یان هەركەسێك لە ئێوە هاتەوە لە شوێنی پێویستی دەركردن و پێویستی خۆی دەركردبوو بە دەركردنی ئەو شتانەی كە لە پێش و پاشی مەردوم دەرئەچن. ﴿أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ یان كەوتن لە یەك لەگەڵ ئافرەتان دا بە لێ كەوتنی پێست لە پێست ئیتر بە بێ كاری ژن و مێردیی یان لەگەڵ ئەو كارەدا كە لەسەر باری یەكەم هەر دەست نوێژ ئەشكێ، لەسەر باری دووەم لەشیش گران ئەبێت.(ئیمامی شافیعی) و چەند كەسێكی تر بەم جۆرەی تەفسیر ئەكەنەوە. دەستەیەكی تر هەر ئەیبڕن بەسەر باری یەكەم دا. لەسەر هەردوو راكە بە لێ كەوتنی پێست دەست نوێژ ئەشكێ.(ئیمامی حەنەفی) و كۆمەڵێكی تر لە زانایانی ئوممەت لەسەر ئەوەن كە مەبەست بەم وتەیە هەر كاری ژن و مێردی یە، كەواتە بە لێ كەوتنی رووت دەست نوێژ ناشكێ. لە سورەتی(النساء) دا و لەبەر چەند بەڵگەیەك باوی ئەم رایەم دا كە لێرەدا مەبەست هەر لێكەوتنی پێست لە پێستە با سەرنج بدرێ. ﴿فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ﴾ ئینجا ئاوتان دەست نەئەكەوت كە بەكاری بێنن بۆ لابردنی بێ دەست نوێژیی و لەش گرانی، لەبەر ئەوەی ئاو نەبوو، یان بەكارهێنانی زیانی سەختی ئەبوو. یان ئەو ئاوە پێویست بوو بۆ خواردنەوەی گیان لەبەرێكی بەڕێز. كاتێ كە ئێوە بەو جۆرە بوون و ئەتانویست نوێژ بكەن و هەروەها هەر كردەوەیەكی تر كە دەست نوێژو لەش پاكی ی پێویستە ﴿فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا﴾ ئەو**

---

[1](غائط): ئاوە بۆ شوێنێكی چاڵ كە نەبێ بە بەرچاوەوە، لەو سەردەمەدا باو بووە، بۆ پێویستی دەركردن و دەست بە ئاو گەیاندن چوونەتە ئەو جۆرە شوێنانە، ئینجا لەبەر ئەوەی ناوبردنی ئەو شتە پیسانە شایستە نی یە ئەو وتەیە بەكار ئەهێنرێ لە شوێنی ئەوانەدا، تەنانەت كراوە بە ناو بۆ پیسی.

کاتە نیازی خۆڵ و خاکێکی پاك بکەن و دەستی پیا بماڵن ﴿فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُۚ﴾ ئینجا دەست بێنن بە دەم و چاو و دەستەکانتان دا لەو خاك و خۆڵە پاکە. بە پێ ی ئەم تەفسیرە وتەی ﴿فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ﴾ ئەگەڕێتەوە بۆ هەر چوارەکە: نەخۆش، سەفەری، ئەو کەسەی کە پێویستی دەرکردبێ، ئەو کەسەی کە کەوتبێ لە ئافرەت. کە ئەمە راو بڕیاری زۆربە و جەماوەری زانایانە. لەسەر ئەم بارو رایە هۆی تەیەموم تەنیا یەك شتە: نەبوونی ئاو. بەڵام مەبەست بە نەبوونی ئاو بۆ نەخۆش ئەوەیە کە بەکارهێنانی زیانی گەورەی ببێ – وەك لە پێشەوە دەست نیشانمان بۆ کرد – شەرع رێگەی بەکار نەهێنانی پێ دابێ، کەواتە وەك هەر نەبێ وایە. هێندێ لە زانایان لەسەر ئەوەن کە وتەی ﴿فَلَمۡ تَجِدُواْ﴾ ئەگەڕێتەوە هەر بۆ سێ یەم و چوارەم. بە پێ ی ئەم رایە هۆی تەیەموم سێ شتە: نەخۆش، سەفەر، دەست نەکەوتنی ئاو. کەواتە هەرکام لە نەخۆشی و سەفەر بە تەنیا هۆی تەیەممومە.

وەك لە چەند شتی تردا بە تەنیا ئەبن بە عوزر، وەك نەگرتنی رۆژوو و کورت کردنەوەی نوێژ، بەڕاستی راکەیان زۆر وردە و باش دڵ وەری ئەگرێ. بەڵام لەبەر ئەوەی هیچ کام لە مەزهەبەکان و کۆمەڵ و جەماوەری ئوممەت شتی وایان نەگوتووە مەردوم زاتی نی یە رەفتاریان پێ بکات و هەر نەش کرێ چاکە، وەك حەدیس ئەفەرموێ: ﴿دع ما یریبك إلى ما لا یریبك﴾ واز لە شتێ بێنە کە گوماندارت ئەکات و برۆ بۆلای شتێ کە گوماندارت ناکات و دڵنیا و ئارامی پێ ی.

لەم باسەدا دووبەرەکی زۆر هەیە لەگەڵێ شتی تردا. بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر گرنگ نین و بە درێژیی باس کراون لە کتێبی مەزهەبەکان دا هیچ پێویست نی یە باس کردنی ئەوانە و زیاد لەم ئەندازەیە بە درێژەی پێ نادەین و ئەگەڕێینەوە بۆ سەر ئایەتەکە با دڵخۆشمان بکات لەسەر دانان و پێویست کردنی ئەم یاسا و بڕیارانە، دەست نیشانمان بۆ بکات بۆ کاردروستی خواو هۆی دانان و پێویست کردنیان: لە یەکەم جارەوە گەورەترین یاسای ئەم شەریعەتەمان پێ رائەگەیەنێ، ئەفەرموێ ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ﴾ خوا نایەوێ هیچ جۆرە تەنگی و ناڕەحەتی بخات بەسەرتان دا لەوەی کە دایناوە لەم ئایەتە و لە هەر ئایەتێکی تردا، چونکە خوا بێ پێویستە لە هەموو شتێ، میهرەبانە بە بەندەکانی، هیچ شتێکی دانەناوە بۆیان مەگەر خێرو سوود و بەرژەوەندی تیایە بۆیان،

وَلَـٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٦﴾ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمِيثَـٰقَهُ ٱلَّذِى وَاثَقَكُم بِهِۦٓ إِذْ قُلْتُمْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٧﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟

---

وەك ئاماژە ئەكات لێرەدا كە ئەفەرموێ: ﴿وَلَـٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ﴾ بەڵام ئەیەوێ پاكتان بكاتەوە لە هەر شتێكی پیس و چەپەڵ بەو دەست نوێژو خۆشۆرینە، پیس و چەپەڵی ئاشكرا و نهێنی و نادیاریی، وەك ئەو گوناهانەی كە دەست نوێژ و خۆشۆرین ئەبن بەهۆی سڕینەوەیان كە لە حەدیس دا هاتووە. ﴿وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكُمْ﴾ ئەیەوێ چاكە و بەهرەی خۆی تەواو بكات بەسەرتانەوە، بە دانان و پێویست كردنی ئەمانەی كە مایەی پاكی لەش و رۆح و گیانن، یان بە دانانی تەیەموم لە باتی دەست نوێژ و خۆشۆرین دا، بە سووك كردنی باری شان لەكاتی تەنگی و ناڕەحەتیدا، ﴿لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ بەڵكو سوپاسی چاكە و بەهرەكەی بكەن بە مل كەچی و گوێ رایەڵی بۆ فەرمانەكانی.

لەپاش ئەو حوكم و بڕیارانەی كە باس كران و دوایی پێ هێنان بەم باسی دەست نوێژ و خۆشۆرین و تەیەمومە، لە پاش ئەوانە ئینجا هانیان ئەدا لەسەر گوێ رایەڵی كردن، بەمەی فەرمان ئەدات بە بیر كردنەوەی بڕواداران لە چاكەی خوا بەسەریانەوە، ئیتر مەبەست هەر چاكە و بەهرەیەك یان هەموو چاكە و بەهرەكانی كە ئەزانن و ئاشنان پێ یان، یان بە تایبەتی یەكەم چین كە لە هەموو كەس باشتر رێزو نرخی ئەم ئیسلامەیان ئەزانی، چونكە دەرد و ناڕەحەتی و ناڵەباریی بێ بڕوایی و بەد كرداریی سەردەمی نەفامی یان چەشتبوو، لە ئیسلام بە چاكی تێگەیشتبوون، بە گیان و رۆح و هەست و فام و ژیریی یەوە وەریان گرتبوو، هەروەها ئەو بەڵێن و پەیمانەیان ئەخاتەوە بیر كە خوا لێ ی وەرگرتبوون لەسەر بیستن و گوێ رایەڵی لە خۆشی و ناخۆشی دا، ئەیانترسێنێ لە پاشگەزبوونەوەو سەرپێچی كردن، ئەفەرموێ: ﴿وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ﴾ باسی چاكە و بەهرەی خوا بكەن بەسەرتانەوە و بیری لێ بكەنەوە ﴿وَمِيثَـٰقَهُ ٱلَّذِى وَاثَقَكُم بِهِۦٓ﴾ باسی عەهد و پەیمانە بەهێزەكەی خوا بكەن كە بە توندی لێ ی وەرگرتن ﴿إِذْ قُلْتُمْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا﴾ لەو كاتەدا كە گوتتان: بیستمان و گوێ رایەڵی بووین. بێگومان هەركەسێك بڕوای ببێ و شایەتمان بێنێ

ئەو کەسە لە راستی دا پەیمانی بەهێزی داوە بە خوا بە بیستن و گوێ رایەڵی بە بێ گێروگرفت و سەر لێ کردنەوە، ئەو بڕوادارانە بێجگە لەو پەیمانە چەند پەیمانێکی تایبەتیشیان دا، وەك پەیمانی(عقبة) ی یەکەم و دووەم، پەیمانێ کە ناو ئەبرێ بە پەیمانی(بیعة الرضوان) لە سودەیبی یەدا، ئەو پەیمانانە هەرچەند بە پێغەمبەر دران(ﷺ) بەڵام خوا پەیمان دان بە پێغەمبەرو گوێ رایەڵی لێ کردنی ئەوی داناوە بە پەیمان دان و گوێ رایەڵی کردنی خۆی لەبەر ئەوە ئەفەرموێ: کە خوا لێ ی وەرگرتن چەند ریوایەتی تریش هەیە لەبارەی مەبەست بەم پەیمانە بەهێزە کە لێرەدا ئەفەرموێ: پێویستی کرد لەسەر ئەو بڕوادارانە کە باس بکەن و بیری لێ بکەنەوە، هەرچەند ئەوانەش ئەگونجێن و هەڵئەگرن، بەڵام هەرکام لەوانەی پێشوو بەهێزتر و دامەزراو ترە لە دڵ دا، بەهەرحاڵ و لەسەر هەربار پەیمان دان بە خوا و باس و بیر لێ کردنەوەی و پارێزگاری کردنی تایبەتی نی یە هەر بەو یەکەم چین و تاقمەی کە یەکەم جار ئەم قورئانەی چوو بە گوێچکەدا، بەڵکو پێویستی سەرشانی هەموو بڕوادارێکە تا رۆژی دوایی، بڕوا و ئیسلامەکەی داخوازی ئەوەیە و بە بێ ئەوە نە بڕوا هەیە و نە ئیسلام!

ئینجا کۆتایی ئایەتەکە ئەهێنێ بەم فەرمودەیە کە بە راستی وریاکەرەوە و دڵ داچڵەکێنەرە: ئەفەرموێ: ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ خۆتان بپارێزن لە خوا و بترسن لەوەی چاکە و بەهرەی ئەوتان لەبیر بچێتەوە، بترسن و خۆتان بپارێزن لە هەرچی هەڵئەسن پێ ی و هەرچی وازی لێ ئەهێنن ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ چونکە بەڕاستی خوا زانا و ئاگایە بە هەر نیازو خەتەرە و هەست نهێنی و خەیاڵێك کە لە سنگ و دڵەکان دایە، شاراوە و پۆشیدەیە لە هەموو کەس بێجگە لە خوا.

هێندێ لەو پەیمانەی کە خوا وەری گرت لە بڕواداران، بریتی بوو لە چاودێریی و هەڵسان بە کاربەدەستی ی ئادەمی ی بە داد و داد پەروەریی یەکی تێرو تەواو، بەجۆرێ هیچ هێزێك کاری تێ نەکات و لە ناوەڕاستی رێگە راستەکەی نەیترازێنێ. نە خۆشەویستی و دوژمنایەتی، نە خزمایەتی و بەرژەوەندی و ئارەزووکاری، دادو دادپەروەریی یەکە هەر لەبەر خوا و فەرمانبەریی خوابێ، لەگەڵ هەست کردن بە ئاگاداریی خوا بە هەر نیاز و خەتەرەیەك، جا لەبەر ئەوە ئەم بانگە گرنگەیان ئاراستە ئەکات: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە

كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعۡدِلُواْۚ ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿٨﴾

---

﴿كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ﴾ زۆر بەڕێکی هەڵسن بە بێ کەم و کوڕی بە هەر ماف و بە هەر پەیمانێك کە پێویستە هەڵسان پێی بۆ خوا، زۆر بە ڕێکی هەڵسن پێی هەر لەبەر خوا و بە بێ هیچ نیازێکی تر ﴿شُهَدَآءَ بِٱلۡقِسۡطِ﴾ شایەتی دەر بن بە داد و بەڕاستی: ئەوەی ڕاستە بیڵێن لای داد بەدەستان. ئەوەی ڕاستە بڕیاری لەسەر بدەن، ئەوەی لەسەرتانە و لەگەردنتان دایە بەڕاستی دانی پیا بنێن. ﴿وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعۡدِلُواْ﴾ با رق و کینەتان لە دەستە و کۆمەڵێك، یان رق و دوژمنایەتی و کینەی دەستە و کۆمەڵێك لێتان پاڵتان پێوە نەنێ و نەتان هێنێتە سەر ئەوەی کە داد و ڕاستی بەکار نەهێنن، لە هەر بارێك لەو سێ بارەی کە گوتمان. ئینجا هەر بەوە کۆتایی نەهێنا، بەڵکو فەرمانی دا کە بڕواداران پلەیەکی تر بەرز ببنەوە، کە ئەو پلەیە هیچ کەس پێی ناگات مەگەر لە ژێر سایەی پەروەردە و پێگەیاندنی ئەم قورئانە و ئەم شەریعەتەدا، فەرموی: ﴿ٱعۡدِلُواْ﴾ هەڵسن بە داد و داد بەکاربێنن لەگەڵ ئەوانەی کە دوژمنایەتی و رق و کینەتان هەیە لێ یان یان رق و کینەیان هەیە لێتان، چ جای دۆست و خزم و خۆشەویست!! ئینجا هۆکەیشی باس ئەکات ئەفەرموێ: ﴿هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰ﴾ چونکە داد نزیك ترین نیشانە و بەڵگەیە بۆ سیفەتی(تقوى) کە ئەوپەڕی گوێ ڕایەڵی یە بۆ خوا. یا نزیك ترین گوێ ڕایەڵی یە لەو سیفەتەوە و پەیوەستی بەو سیفەتەوە زیاترە. ئینجا فەرمانەکە بەهێزتر ئەکات و زیاتر هانی بڕواداران ئەدات لەسەری بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ خۆتان بپارێزن لە تۆڵە و سزای خوا، بە فەرمانبەری و گوێ ڕایەڵی خوا. دوور کەوتنەوە لە سەرپێچی و نافەرمانی، کە گوێ ڕایەڵی فەرمانی داد و سەرپێچی نەکردن لێ ی لێرەدا یەکەم و سەر دەستەیە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾ چونکە بێگومان خوا بە ئەوپەڕی ڕادە زانا و ئاگایە بە هەر کردەوەیەك کە ئێوە ئەیکەن، کەواتە بە پێی کردەوەکان تۆڵە و پاداشت ئەدرێنەوە. وێنەی ئەم ئایەتە تێپەڕی

کرد لە سورەتی(النساء) دا ئایەتی(١٣٥). لەم دووبارە کردنەوەدا زیادە گرنگی نیشان ئەدات کە یاسا و بنەڕەتە بۆ هەموو خێرو چاکەیەك، مایەی کامەرانی و خۆش بەختی هەردوو جیهانە. هەروەها زیادە هاندان وەرئەگیرێ لەسەر کوژاندنەوەی ئاگری کینە و دوژمنایەتی، بێجگە لەوەیش هۆی هاتنە خوارەوەکەشیان جیاوازە. ئینجا لە پێشەوە وتەی ﴿القسط﴾ ی دواخست و لێرە پێشی خست، ئەوەش – وەك هێندێ لە زاناکان ئەفەرمون – لەبەر ئەوەیە لە پێشەوە باسەکە باسی داننانە بە ماف و بە هەق دا، با بە دژی خودی کابرا و باوك و دایکی و خزمەکانی بێت. کە ئەوە ئەوپەڕی بەکارهێنان و هەڵسانە بە داد، کەواتە پێش خستنی دادەکە بۆ ئەویّ ڕێك و پێك ترە، بەڵام لێرە هاتووە لە باسی واز هێنان و توڕدانی ناکۆکی و دوژمنایەتی، بۆ ئەمەش ئەمە ڕێك ترە کە ئەفەرمویّ: ﴿كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ﴾ واتە هەڵسن بەوەی کە پێویستە لەسەرتان بۆ خوا کە یەکێ لەوانە واز هێنانە لە دوژمنایەتی. بێگومان – مێژوویش شایەتە – ئەم ئوممەتە ئەم ئایەتە و ئایەتی سورەتی(النساء) ی بەدی هێنا بە تێرو تەواوی لە ژیانی دا. هەڵسان بەو ئەرکە زۆر گەورەو بێ وێنەیە، لە ڕۆژێك دا کە بە ڕێکی لەسەر ئیسلام دامەزرا، بەدی هێنا لە ژیان دا بە جۆرێ کە ئادەمی ی شتی وای نەدیوە مەگەر لەو کاتە پیرۆزانەی ئیسلام دا، ئاشکرایە جارێکی تر نایبینێتەوە مەگەر لەکاتێکی تردا کە ئیسلام بە شێوە ڕاستەقینەکەی خۆی بێتەوە کایە.

هەرکاتێ مەردوم لەو پۆپە هەرە بەرزەوە سەرنجێك ئەدات و ئەڕوانێتەوە بەسەر سەردەمەکانی نەفامی دا لە هەموو چەرخ و وڵاتەکانی دا کە دواترەکەیان بریتی یە لەم سەردەمی نەفامی تازەدا، کە ناونراوە – بە درۆوە – بە سەردەمی پێش کەوتن و ئازادی و ڕووناکی، کاتێ کە ئەو سەرنجە بدات و ئەو بەراوردە بکات، ئەو کاتە تێ ئەگات لەو جیاوازی یە و ئەو هەموو ماوە دوورو درێژەی کە هەیە، لە نێوان بەرنامەیەك کە خوا دایناوە بۆ بەندەکانی، وە ئەو هەموو بەرنامانە کە ئادەمی داینـاوە بۆ خۆیان لە کۆن و لە تازەوە. بێگومان – بەپێی میهرەبانی خوا – ئەبێ پاداشتێکی گەورە ببێ بۆ ئەو بڕوادارانەی کە بەرنامە بێ وێنەکەی خوا بەدی ئەهێنن، هەرچۆنێ بە پێی دادی خوا ئەبێ تۆڵە و سزایش ببێ بۆ بێ بڕواکان و ئەوانەی دژی بەرنامەکەی خوان،

وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٩﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ هَمَّ قَوْمٌ أَن يَبْسُطُوٓاْ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ

---

جا ئەوا ئەو دوو بەڵێنە ئەدات و ئەفەرموێ: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ خوا بەڵێنی داوە بەوانەی کە بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووە بەمەی ﴿لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ بۆیان هەیە سڕینەوەی گوناهو کەم و کوڕی یان، وە ئەجرو پاداشتێکی گەورە. جا شتێ خوا پێی بفەرموێ: گەورە، ئەبێ رادەو پلەی ئەوە چۆن بێ، ئەبێ خەیاڵ و بیری ئێمە بەچی دا بگات. بەڕاستی بەڵێنەکە ئەوەندە گەورەیە بەسە بۆ بڕواداران لە باتی هەرشتێك کە لەم جیهانەدا لە دەستیان دەرچێ لە پێناوی هەڵسانیان بەو ئەرکەی کە خراوەتە سەرشانیان لەلایەن خواوە، بەسە لەباتی هەر لاری و ناڵەباریی و دەست درێژیی یەك کە هاتبێتە رێ یان لە رێی خوادا، هەرچۆنێ ئەم هەڕەشە سامناکە و ئەو سزا سەختەی کە دانراوە بۆ بێ بڕواو سەرکێشەکان بەسە سەرو بەرە لەگەڵ تاوانەکانیان و هەقی بەرو دوایان لێ ئەکاتەوە: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ﴾ وە ئەوانەی کە بڕوایان نەهێنا لەم جیهانەدا، ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ دائەنا، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ﴾ ئەوانە هاوڕێ و هاوسەری ئاگرێکی زۆر بەتینی بڵێسەدارن، بەڕاستی ئەمەیە دادو دادپەروەری کە چاکان و پاکان بەو جۆرە جوێ بکرێنەوە لە بەدان و ناپاکان، هەموو سوپاسێ بۆ خوا.

ئینجا هێندێکی تر هەستی داد و دادپەروەریی و چاوپۆشی و لێ بوردن بەهێز ئەکات لە دەروونی بڕواداران دا، هەستی دەستی درێژیی و دوژمنایەتی و مەیلی تۆڵە سەندن کزو بێ هێز ئەکات تیایان دا، بەم رەنگە رووداو و بەسەرهاتێکیان بیر ئەخاتەوە کە زۆر بەکارە بۆ ئەو مەبەستانە، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿ٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ﴾ بیر بکەنەوە و باسی چاکەی خوا بکەن بەسەرتانەوە ﴿إِذْ هَمَّ قَوْمٌ أَن يَبْسُطُوٓاْ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ﴾ لەو کاتەدا کە کۆمەڵ و دەستەیەك نیازیان کرد دەستیان راکێشن بۆتان، بۆ کوشتن و لەناوبردنتان،

فَكَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ ۖ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾ وَلَقَدْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَبَعَثْنَا مِنْهُمُ اثْنَيْ عَشَرَ نَقِيبًا ۖ وَقَالَ اللَّهُ إِنِّي مَعَكُمْ ۖ

---

﴿فَكَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ ۖ﴾ ئینجا خوایش بەرگری دەستەکانی ئەوانی کرد لێتان. چەند ریوایەتێك هاتووە لەبارەی مەبەست بەو کۆمەڵە نیاز پیسەوە. بەڵام بەهێزتریان ئەمەیە کە مەبەست ئەو کۆمەڵەن کە لە رۆژی(حديبية) دا نیازیان کرد بە پەنهانی و لەناکاودا بە چەکەوە بدەن بەسەرپێغەمبەر(ﷺ) و یارەکانیدا، ئینجاخوا کارێکی وایکرد کە موسڵمانەکان بە ئاسانی هەموویان گرتن بەدیل و هێنانیانە بەر دەستی پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش هەمووی بەرەڵا کردن بە بێ ئازار دان. ئەوانە مەبەست بێ یان هەرکەسێکی تر، ئەوەی گرنگ بێت پەندو ئامۆژگاریی کردنەکەیە، بەمەی کە خوا ئارامی خستە دڵیان، ئەو چاوپۆشی و لێ بوردنە گەورەیە کرا. وەك لە لایەکی ترەوە چاولەبەریان ئەکات بەمەی کە یارمەتیدان و دەستی میهرەبانی بۆ خستنە کار، کەواتە ئەبێ ئەمانیش شەرم بکەن لەوەی هەڵنەسن بەوەی کە لەلایەن خواوە خراوەتە ئەستۆیان. ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ ۚ﴾ لەخوا بترسن و خۆتان بپارێزن لە هۆی خەشم و نارەزایی خوا ﴿وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ ئینجا با بڕواداران هەر پشت بەخوا ببەستن، چونکە هەموو شت هەر بەدەست ئەوە، هەر ئەو بەرگریی زیان و ئازار ئەکات لەهەرکەسێ مەیلی ببێ، هەرئەوچاکەو بەهرەو خۆشی ئەبەخشێ بەهەرکەس کە مەیلی ببێ.

لەم ئایەتانی رابوردووەدا خوا سەرنجی بڕوادارانی راکێشا و ئەو پەیمانەی کە لێ ی وەرگرتبوون خستی یەو بیریان، هەروەها هێندێ لە چاکە و بەهرەکانی خۆی بیر خستنەوە لە سەرەنجامی هەڵسانیان بەو پەیمانە. ئینجا لەم چەند ئایەتی داهاتووەدا هەڵوێستەکانی نامەداران ئەخاتە بەرچاو بەرامبەر ئەو پەیمانەی کە لەلایەن خواوە لێ یان وەرگیرا، هەروەها ئەو تۆڵە و سزا سەختانەی کە دووچاریان بوو لە سەرەنجامی پاشگەز بوونەوەو هەڵوەشاندنەوەی دا بۆ ئەو بەڵێن و پەیمانە بەهێزانەی کە دایان بەخوا. ئەوانە ئەخاتە بەرچاو تا بڕواداران پەند و ئامۆژگاریی وەرگرن لە کردەوەو بەسەرهاتی ئەوانەوە و خۆیان وەك ئەوان دووچار نەکەن، ئەوە لە لایەکەوە، لەلایەکی ترەوە تا دەرکەوێ کە باو و رەوشتی خوا گۆرانی نی یە و لایەنگیریی هیچ کەس ناکات، بێجگە لەوانە تا دەرکەوێ بۆ بڕواداران باری راستەقینەی ئەو نامەدارانە و هەڵوێستە ناڕەواکانیان، تا بەهۆی ئەوەوە باش بناسرێن

لای بڕواداران، بۆ ئەوەی نەخەڵەتێن و پیلان و فڕو فێڵیان لی نەكات. لە یەكەمجارەوە ئەو پەیمانە ئەخاتە بەرچاو كە خوا وەری گرت لە گەلەكەی موسا(علیه السلام)، لە كاتێك دا كە رزگاری كردن لە ریسوایی و ژێر دەستەیی لە میسردا، ئینجا ئەوانیش پەیمانەكەیان نەبردە سەر و پاشگەزبوونەوە لی ی، بەهۆی ئەوەوە دووچاری دەردی خۆیان بوون، نەفرینیان لی كرا و گومڕا بوون، ئەو پەیمانەش ئەخاتە بەرچاو كە لە مەسیحی یەكانی وەگرت و ئینجا ئەوانیش پاشگەز بوونەوە، لە سەرەنجام دا خوا دووچاری كردن بەو جۆرەی كە لە ئایەتەكەدا بۆمان باس ئەكات. ئینجا ئەگەڕێتەوە سەر جوولەكەكان و باسی پەیمان دان و هەڵوەشاندنەوەیان ئەكات بەرامبەر خاكی پاكی قودس، لەناو بەناودا باسی لادانیان ئەكات لە ڕێگەو ئایینی خوا، بە هۆی پاشگەز بوونەوەكەیان، وەك بۆمان دەرئەكەوێ بە جوانی لە دەقی ئایەتەكاندا، ئینجا بانگیان ئەكات بە گەڕانەوە بۆ ئایین و ڕێنموونی خوا كە لەم دواترین پەیامەدا هاتە خوارەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ سوێند بەخوا، خوا پەیمانی بەهێزی وەرگرت لە نەوەو بەرەكانی ئیسرائیل، ئیتر ئەو پەیمانە ڕەفتار كردن بی بە تەورات، وەك هێندێ ئەفەرمون، یان پەیمانی ڕۆیشتن بۆ سەر كەنعانی یە ستەمكارەكان لە خاكی فەلەستین دا، وەك لە هێندێ ریوایەت دا هاتووە، یان هەر پەیمانی بی. بەو جۆرەی كە لەمەو پاش وەرئەگیری لە دەقی ئایەتەكە، وەك هێندێكی تر ئەفەرمون. ﴿وَبَعَثْنَا مِنْهُمُ اثْنَيْ عَشَرَ نَقِيبًا﴾ وە گێرامان لە خۆیان و دیاریمان كرد دوانزە كەس كە چاودێر و لێپرسراو و دەستەبەری بوون بۆیان، هەركام لەوانە نوێنەری پەلێك بوو لە بنەماڵە و خانەوادەی(یعقوب) كە پێك هاتبوو لەبەرەو نەوەی دوانزە كوڕەكەی(یعقوب)(علیه السلام). لەسەر رای سی یەم ئەو پەیمانەی كە پی ی دان و لی ی وەرگرتن ئەمەیە كە ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ اللَّهُ﴾ خوا پی ی فەرمون: خوا بە موسای فەرمو ئەویش رایگەیاند بەوان ﴿إِنِّي مَعَكُمْ﴾ بێگومان من لەگەڵتانم، واتە بە زانین و بە دەسەلات و بە یارمەتی دان، واتە تا ئێوە لانەدەن و پارێزگاریی پەیمانەكە بكەن، بێگومان ئەوە بەڵێنێكی زۆر گەورەیە، هەركەسێك خوا بەو جۆرە لەگەڵی بێت هیچ كەس و هیچ شتێ ناتوانێ دژایەتی لەگەڵ بكات، هەرگیز لە ڕێی راست لانادا، بەلام خوا لە خۆڕایی و بە بی مەرج ئەو بەڵێنە نادات،

لَئِنْ أَقَمْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَيْتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ وَءَامَنتُم بِرُسُلِي وَعَزَّرْتُمُوهُمْ وَأَقْرَضْتُمُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَلَأُدْخِلَنَّكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ فَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٢﴾ فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ لَعَنَّٰهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَٰسِيَةً ۖ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ ۙ وَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ

---

**بەڵكو مەرجەكانی ئەمەیە كە لەم فەرموودەیەدا هەیە: ﴿لَئِنْ أَقَمْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر ئێوە بە رێكی نوێژ بەجێ بێنن ﴿وَءَاتَيْتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ زەكات بدەن ﴿وَءَامَنتُم بِرُسُلِي﴾ بڕوا بێنن بە فرۆستادە و نێرراوەكانم كە یەكێ لەوانە و دواتری هەموویان(محمد)ە(ﷺ) ﴿وَعَزَّرْتُمُوهُمْ﴾ یارمەتی یان بدەن و بە گەورە بیان گرن ﴿وَأَقْرَضْتُمُ ٱللَّهَ﴾ قەرزتاندا بە خوا بەخت كردنی زیاد لە زەكات و پێویست كراو ﴿قَرْضًا حَسَنًا﴾ بە قەرز دانێكی جوان و شیرین، بەم رەنگە لە حەڵاڵ بێت و بە پێ خۆش بوونەوە بدرێ. ئەگەر ئێوە ئەم پێنج مەرجە بەجێ بێنن ﴿لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ﴾ بێگومان ئەسڕمەوە لێتان گوناهو خراپەكانتان، ئەوەیش بە پێی باوی خوا كە بە چاكەكان خراپەكان ئەسڕێتەوە و دروشمیان ناهێڵێ بە دڵ و دەروونەوە، هەرچۆنێ ئاو و سابوون چڵك و چەپەڵی و پیسی لائەبەن و ئەیسڕنەوە، ﴿وَلَأُدْخِلَنَّكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ ئەتانخەمە بەهەشتانێك كە رووبارەكان دێن و ئەچن بە ژێریان دا ﴿فَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ مِنكُمْ﴾ ئینجا لەپاش ئەو مەرج و پەیمانە بەهێزە هەركەسێك لە ئێوە بێ بڕوا ببێ ﴿فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ﴾ بێگومان ئەو كەسە هەڵەیە و لایداوە لە رێگەی راست كە ئەو ئایین و شەریعەتە كە خوا بۆی داناوە، واتە هەڵە و لادانی ئەو كەسە خراپتر و ئاشكراتر و گەورەترە لە لادان و هەڵەی هەركەسێكی تر بەو جۆرە پەیمانی تەواوی و بەڵێنی لێ وەرنەگیرابێ، ئەم كەسە تازە كاری تێپەڕی كردووە و چاوەڕوانی گەڕانەوەو رێنموونی لێ ناكرێ.**

**ئەوانە وەك پەیمانیان دا نەیان بردە سەر و پاشگەز بوونەوە، بەهۆی ئەوە خوا دووچاری كردن، وەكو ئەفەرموێ: ﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ﴾ ئینجا بەهۆی پاشگەزبوونەوە و هەڵوەشاندنەوەیان بۆ پەیمانەكەیان، چەند پێغەمبەرێكیان كوشت، لە پاش ئەوانە نیازی**

کوشتنی عیسایان کرد کە دواترین پێغەمبەریان بوو، دەستکاری تەوراتیان کرد بە پێی ئارەزووی خۆیان، یاسا و شەریعەتەکەیان خستە پشت گوێ، هەڵوێستێکی زۆر بەد و ناپاکانەیان بەکارهێنا لەگەڵ دواترین و گەورەترین فروستادە و نێرراوی خوادا کە رەوانە کرا بۆ سەر هەموو جیهان و جیهانی یان، بەهۆی ئەو پاشگەزبوونەوە و ئەو کردەوە پیسانەیان خوا ئەفەرموێ: ﴿لَعَنَّٰهُمْ﴾ دوورمان خستنەوە و دەرمان کردن لە میهرەبانی ی و بەزەیی خۆمان ﴿وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَٰسِيَةً﴾ دڵەکانمان گێران بە دڵێکی رەق و وشک، بە جۆرێ پەند و بەڵگە و نیشانە و موعجیزە کاریان لێ نەکات. ئینجا دڵ رەقی یەکەیان روون ئەکاتەوە بەمەی کە دەست کاری نامەی خوا ئەکەن، درۆ بە دەم خواوە هەڵئەبەستن کە ئەوە ئەوپەڕی خراپی و دڵ رەقی یە. ئەفەرموێ: ﴿يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ﴾ وتە و فەرمودەی خوا لائەدەن لە شوێنەکانی خۆی و پاش کەناری ئەکەن، ئیتر بە گۆڕینیان بە شتێکی تر بە لابردن و زیاد و کەم کردن یان بە بادان و لادان لە مەبەستەکەی خۆیان و سەپاندیان بەسەر واتا و مەبەستێکی تردا، بە پێی حەزو ئارەزووی ناڕەوای خۆیان، ئەو کردەوە ناپەسەندە رابوردووەو زۆر لە پێش چەرخی پێغەمبەردا(ﷺ) کردوویانە، بەڵام بەوتەی ئێستابۆمان باس ئەکات،ئەوەش دوو شتی تیایە:

١- وا نیشان ئەدات کە ئەو کردەوە هەر پیشەیانە و هەموو جارێ ئەیکەن کە بۆیان دەست بداو هەمیشە نیازی دڵیانی لەسەرە.

٢- ئەو کردەوە پیسە حازرو بزر ئەکات و ئەیخاتە بەرچاو و سەرنجی بۆ رائەکێشێ تا بیری لێ بکرێتەوە و سەرسوڕبمێنێ لە بەدیی و خراپی ئەو کردەوەو خاوەن کردوەیە، ئەوەش باوێکە لە باوەکانی رەوانبێژیی کە شتی رابوردوو بەم شێوەی ئەخرێتە بەرچاو بۆ سەرنج راکێشان و سەرسوڕهێنان، ئیتر لەبەر چاکی و نایابی یان لەبەر بەدیی و ناهەمواریی ئەو شتە!

ئەم قورئانی ئێمەیە هەرچەند دەستی نەداوە و دەست نادا بۆ گۆڕاندن و دەست کاری وتەکانی، بەڵام - بەداخەوە - هەر لە کۆنەوە تا ئێستاش دەست کاریی کراوە و ئەکرێ لە تەفسیر و واتا و مەبەستە پیرۆزەکانی دا و وتەکانی سەپێنراون و ئەسەپێنرێن بەسەر مەبەستی دوورو ناڕاست دا، بەوە نەفام و نەزانی زۆر لادراون و لە رێگە راستەکەی ئیسلام

ترازێنراون، له خوا بەزیاد بێ هەرچۆنێ وتەکانی پاراستووە و دەست نادەن بۆ دەست کاریی، هەروەها تەفسیر و مەبەستە راستەکانیان دەرخست و روونیان کردنەوە بۆ هەر ژیرو تێگەیشتوویەك، هەر لادان و دەست کاری یەك کە کرا، هەمووی بە ناهەق و ناڕاست دەرکرا. ﴿وَنَسُواْ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ﴾ وازیان هێناوە و رەفتاریان نەکرد بە شتێکی گەورەو گرنگ لە نامەکەیان و لەوەی کە ئامۆژگاریی کران پێی، ئیتر ئەوە باس و نیشانەی پێغەمبەرمان بێت و فەرماندان پێ یان بە شوێن کەوتنی یان هەر شتێکی تریش، ئەم تەفسیرە بە پێی فەرمودەی کۆمەڵێك لە زانایانە، هەرچەند ئەگونجێ و دەست ئەدات، بەڵام هێندێ لە زانایان وتەی ﴿نَسُوا﴾ لە واتاو مەبەستەکەی خۆی لانادەن، بەم رەنگە ئەفەرمون: ئەوانە لەبیریان کرد و لەبیریان نەما ئەو بەشە گەورەیە لە تەورات. ئیتر ئەو لەبیرچوونەوە بەهۆی گوناهو تاوانی زۆریانەوە بوو کە هۆی لەبیرچوونەوەیە. وەك هێندێك ئەفەرمون: یان بەهۆی ئەوەوە بوو لەبەر خراپی خۆیان بابلی یەکان زاڵ بوون بەسەریان دا و هەیکەل و نامەکەیان سوتاندن و پایتەختەکەیان وێران کرد و هەرچی کوژرا کوژرا و ئەوانەیان نەکوژران بە دیل گیران، ئینجا لە پاش ئەوەی کە ئەندازەیەك سەربەستی یان پەیدا کردەوە هەرچی یان لەبەر مابوو لە تەورات کۆیان کردووە، لەگەڵ هەر ئەندازەیەکە دەستیان کەوت لەناو بەناوی کتێب و نووسراوەکانی خۆیان دا، ئیتر بێجگە لەوانەیان لەبیر نەما، ئەم بەسەرهات و رووداوە هیچ کەس لە عەرەب لەو چەرخەدا بە خەیاڵیشی دا نەهاتبوو، تا لە مێژووەوە وەرگیرا و دەرکەوت بە چەند چەرخێك پاش هاتنی ئیسلام. مێژوو دەری خست کە جوولەکە ئەوەیان بەسەر هات و نامەکەیان زایە بوو کە بنەڕەتی ئایینەکەیانە، لە پاشان نووسەرێك لە خۆیان لەو وڵاتی بت پەرستانەدا تەوراتێکی بەو جۆرە بۆ نووسینەوە، بە ناتەواوی و بە زیاد و کەم لێ کردنەوە. بەڕاستی ئەم هەواڵە یەکێکە لە موعجیزە گەورەکانی قورئان، کەواتە لەبەر ئەوە تەفسیری ئایەتەکە بەم جۆرە رێکە لەگەڵ رووکەش و رواڵەتی وتەی ﴿نسوا﴾ دا، وە هیچ لادانێك روونادا لە حەقیقەت و واتا راستەقینەکە، لەبەر ئەمانە دڵ هەر بەم تەفسیرە خۆش نوود و بە ئارامە، هەق وایە هەر لەسەر ئەم بارە تەفسیر بکرێتەوە، وەك ئایەتی(٢٢) لە سورەتی(آل عمران)، و(٤٤ و ٥٠) لەسورەتی(النساء) هەر ئەم تەفسیرە بەهێزە ئەکەن لە دڵدا.

وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَآئِنَةٍ مِّنْهُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱصْفَحْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣﴾ وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ أَخَذْنَا مِيثَٰقَهُمْ فَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَاوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ وَسَوْفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴿١٤﴾

---

ئینجا رووی فەرموده ئەكاتە پێغەمبەر(ﷺ) بارو حاڵی جوولەكەكانی مەدینە ئاشكرا ئەكات، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَآئِنَةٍ مِّنْهُمْ﴾ بە بێ كۆتایی و دوا هاتن ئاگادار ئەبی بەسەر ناپاكی و كردەوەی ناپاك لەلایەن ئەوانەوە. واتە باو و پیشەی ئەوانە هەر ناپاكی بووە و هەروا هاتووە لە باوك و باپیرو پێشووەكانیانەوە دەربارەی پێغەمبەرەكانیان، هەروەهایش ئەبن لەگەڵ تۆ ئەی پێغەمبەر، كۆتایی ناهێنن لەو بارو پیشەی خۆیانە ﴿إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ﴾ مەگەر كەمێك لەوان – وەك عبدالله ی كوڕی سەلام و وێنەی ئەو – بەڵێ ئەوە بارو حاڵی جوولەكە بوو لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) تا لە مەدینە بوون و لە ژیانی ئەودا، لەگەڵ ئەوەی بە دادو راستی تەواو رەفتاری لەگەڵ كردن، ئینجا لەپاش ئەو بارو حاڵیان هەر بەو جۆرە هەر بە پیسی و ناپاكی بوو لە نیوە دوورگەدا، بە درێژایی مێژوو هەروا بوون و هەروا هاتن لەناو گەل و كۆمەڵی موسڵمانان دا، لەگەڵ ئەوە كە ئیسلام و گەلی موسڵمانان یەكەم و تاقانە بوون كە ئەوانیان پەنادا، دەست درێژیی و چەوسانەوەی لەسەر لابردن، بە كردەوەی شیرین رەفتاریان لەگەڵ كردن، ژیانی خۆش و كامەرانی بۆ پێك هێنان لەناو گەلی موسڵمان دا، بەڵام ئەوان هەمیشە مارو دووپشك و گورگ و رێوی بوون لەناو موسڵمانان دا، بەهەر جۆرو لە هەر رێگەیەكەوە دەستی دابێ نەوەستاون لە هەر پیلان و ناپاكی و دەست درێژیی یەك، ئەگەر خۆیان دەسەڵاتی ئەوانەیان نەبووبێ نەوەستاون لە دانانی كەمین و داو نانەوە، هەمیشە دەستیان تێكەڵ كردووە لەگەڵ دوژمنانی ئیسلام و موسڵمانان دا بۆ لێدانی ئیسلام و موسڵمانان، گوێ یان نەداوە بە هیچ بەڵێن و پەیمانێك، زۆربەی جوولەكە هەروا هاتووە

وەکو قورئان هەواڵی پێ داین، خوای پەروەردگار لە قورئانەکەی دا باسی ئەمانەی بۆ کردین کە رووی کردە جوولەکە، کاتێ کە پەیمانیان هەڵوەشاندەوە لەگەڵ خوادا، تا ئەم ئوممەتە بترسێ لە پاشگەزبوونەوەو هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکەیان کە دایان بەخوا، تا ئەمانیش دووچار نەبن بە وێنەی جوولەکە، ئینجا تا پارێزگاریی بەڵێن و پەیمانەکەیان کرد خوا سەربەرز و سەرکەوتوو و کامەرانی کردن، جڵەوی ژیان و جیهان کەوتە دەستیان، بەڵام کاتێ کە لایان دا لە رێگە راستەکەی خۆیان، خوا ئەو سەربەرزی و سەرکەوتن و سەرکردایەتی یەی لێ دارنین، کردنی بە شوێن کەوتە و داوێن و پێشێل کراو، هەروایش ئەبن تا ئەگەرێنەوە بۆلای پەروەردگاریان، ئەچنەوە سەر پەیمانەکەیان، ئەو کاتە خوایش بەڵێن و میهرەبانی یەکەی ئەگێرێتەوە بۆ سەریان.

پەندو ئامۆژگاریی خوا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی ئەو جوولەکانە لەو کاتەدا ئەمەبوو: ﴿فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱصۡفَحۡۚ﴾ ببورە لێ یان و چاوپۆشی بکە، چونکە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ بەڕاستی خوا چاکە کەرانی خۆش ئەوێ، واتە لێ بوردن لەو تاوان و خراپەکاری یەیان چاکەیە، چاوپۆشی لە ناپاکی کەرانی خۆش ئەوێ، کەواتە ببورەو چاوپۆشی بکە. بەڵام ئەو لێ بوردن و چاوپۆشی یەش کاتی خۆیان هەبوو، لەپاش ئەوە نابێ ببن، لەبەر ئەوە لە پاشان فەرمانی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە لە مەدینە دەریان کات، ئینجا لە هەموو نیوە دوورگە دەریان کات. ئەویش بەو جۆرەی لێ کردن: خۆی لە مەدینە دەری کردن، لەپاش خۆی لەسەر فەرمانی ئەو لە نیوە دوورگە دەرکران.

ئینجا باسی پەیمان لێ وەرگرتن و پاشگەزبوونەوەی نەسرانی یەکانیش ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ﴾ لەوانەی کە ئەیانگوت: بێگومان ئێمە یارمەتی دەرانی ئاینی خواین یان ئێمە لەسەر ئایینی نەسرانین و شوێن کەوتەی عیساین، لەسەر هەرکام ئەمە پلاری تیایە بۆیان بەمەی کە لاف لێدانی رووت بووە، نەک لە راستی دا بەو جۆرە بووبن. ﴿أَخَذۡنَا مِيثَٰقَهُمۡ﴾ بەڵێن و پەیمانی بەهێزی خۆیانمان وەرگرت ﴿فَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ﴾ ئینجا ئەمانیش وازیان هێنا، یان لەبیریان چوو و لەبیریان نەما بەشێکی

گەورە و گرنگ لەوەی ئامۆژگاری یان پێ کرا لەسەر زمانی عیسا(علیه السلام)، بێگومان بنەڕەت و ناوەڕۆکی ئەو پەیمانە بڕوا بوو بە تاك و تەنیایی خوا بە بێ هیچ جۆرە هاوبەشێك، لەلادان لەمەوە هەموو لادان و لاریی یەك رووی کردە ئەو ئوممەتە، هەر بۆ ئەوە بوو بەهۆی ئەو هەموو دووبەرەکی و ئاژاوەو جەنگ و کوشتارەی بەرپابوو لە ناویان دا، بوو بەهۆی دامەزران و جێگیر بوونی کینە و دوژمنایەتی یەکی نەبڕاوە تا رۆژی دوایی، لەسەر ئەو پاشگەز بوونەوە دووچاری ئەوە بوون پێش سزاو تۆڵەی سەختی دۆزەخ لە رۆژی دوایی دا، وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَأَغۡرَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَاوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ﴾ بەهۆی ئەوەوە دوژمنایەتی و کینە بەریمان خستە نێوانیان، واتە نێوان تیرەو بەرەو خاوەن مەزهەبەکانیان، یان نێوان ئەوان و جوولەکە، تا رۆژی دوایی، لە جیهان دا ئەوەی بەسەر هێنان، ﴿وَسَوۡفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ﴾ بێگومان لەمەوپاش - واتە لە رۆژی دوایی دا لەکاتی حیساب و پرسیاردا - خوا هەواڵیان پێ ئەدات بەوەی کە کردیان لە جیهان دا، واتە لەو رۆژەیش دا خوا دووچاری سزاو تۆڵەی سەختیان ئەکات بەجۆرو شێوەیەك کە شایستەن بۆی و خوا خۆی ئەزانێ.

لەپاش ئەوەی هەڵوێستی جوولەکەو گاورەکانی خستە بەرچاو لەبارەی ئەو پەیمانەی کە لێ یان وەرگیرا، ئینجا رووی فەرمودە ئەکاتە هەموویان و بانگیان لێ ئەکات بە تێکڕایی بە سیفەتی نامەداریی، بۆ ئەوەی پێ یان راگەیەنێ کە دواترینی پێغەمبەران و فروستادەکانی خوا هاتووە بۆ سەر هەمووان، چ نامەدار و چ عەرەب و چ هەموو گەلەکانی تری جیهان، هەموو چوون یەك ئەبێ بڕوا بێنن و پەیڕەوی بکەن، ئەوە بەشێکە لەو پەیمانەی کە لەو نامەدارانە وەرگیرا.

ئەم پێغەمبەرە هاتووە بۆ ئەوەی ئاشکرا بکات زۆر لەو شتانەی کە ئەو نامەدارانە شاردیانەوە لە نامەکانیان، لە کاتێك دا کە پەیمانیان دابوو بە دەرخستن و دەربڕینی، وەك چەند شتێکی تر بوو کە شاردبوویانەوە، بەڵام ئەم پێغەمبەرە باسی نەکردن چونکە باس کردنیان پێویست نەبوو لەم شەریعەتە تازەدا،

﴿يَـٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَـٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ كَثِيرٗا مِّمَّا كُنتُمۡ تُخۡفُونَ مِنَ ٱلۡكِتَـٰبِ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖۚ قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَـٰبٞ مُّبِينٞ ١٥﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَـٰبِ﴾ئەی نامەدارەکان ﴿قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا﴾ بێگومان هات بۆلاتان فروستادەونێرراومان -واتە محمد(ﷺ) -بە جۆرێ ﴿يُبَيِّنُ لَكُمۡ كَثِيرٗا مِّمَّا كُنتُمۡ تُخۡفُونَ مِنَ ٱلۡكِتَـٰبِ﴾ باس ئەکات بۆتان بە روونی زۆر لەوەی کە ئێوە شاردوتانەوەو بەردەوام بوون لەسەر ئەو شاردنەوەی. ﴿وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖۚ﴾ چاوپۆشی ئەکات لە زۆر لەوانەی کە شاردتانەوەو باسیان ناکات.**

**لەم بانگ کردنەدا بە روونی رائەگەیەنێ بە نامەدار چ ئەوانەی کە خۆیان بە شوێن کەوتووی تەورات دائەنێن، چ ئەوانەی کە خۆیان بە شوێن کەوتووی ئینجیل دائەنێن، پێ یان را ئەگەیەنێ کە ئەوانە بانگ کراو و داوا لێ کراون بە بڕوا هێنان بەم فروستادەیە، بە یارمەتی دانی، هەرچۆنێ پەیمانی لێ وەرگرتوون لە نامەکانیان دا، هەروەها پێ یان رائەگەیەنێ شایەتی دانی خوا لەسەر ئەوەی کە ئەم پێغەمبەرە(ﷺ) بۆ سەر ئەوانیشە، هەرچۆنێ بۆ سەر عەرەب و هەموو گەلانی تریشە، کەواتە لە پاش شایەتی دانی خوا هیچ کەس رێگەی نی یە کە دان نەنێ بەمەی کە فروستادەی خوایە، و هیچ کەس رێ‌ی نی یە کە بڵێ: فروستادەیی یەکەی هەر بۆ سەر عەرەبە. یان بڵێ: نەنێرراوە بۆ سەر نامەدارەکان، بەڵکو ئەبێ هەموو کەس بە بێ گومان و دوو دڵی بڕوای وابێ کە نێرراوە بۆ سەر نامەدارەکانیش، هێندێ لەو کارو کردەوەی لەگەڵیان ئەمەیە: زۆر لەو شتانەی کە ئەوان شاردیانەوە بۆیان باس بکات، وەك رەجم و بەردەباران و قەدەغەکردنی سوو خواردن، کە جوولەکە ئەیانشاردەوە، وەك تاك و تەنیایی خوا کە یەکەم بنەڕەت و سەرەکی یە لە هەموو ئایین و پەیامەکانی خوادا، گاورەکان شاردیانەوە، هەروەها باس و ناونیشانی پێغەمبەرمان(ﷺ) کە لە تەورات و ئینجیل دا هاتبوو، لەگەڵ ئەوەدا جوولەکە و گاورەکان شاردیانەوە، ئەوانەی کە باسمان کردن و هەر شتێکی تر کە پێویست بوو باس کردنی دەری خستن کە ئەوەش موعجیزەیەکی گەورەو بەڵگەیەکی ئاشکران لەسەر پێغەمبەرێتی ئەم**

پێغەمبەرە(ﷺ) کە نەخوێندەوار و لە گەلێکی نەخوێندەواری دوور لە زانیاریی و خوێندەواری بوو، کەواتە هەرکەس نەفام نەبێ ئەبێ بزانێ و بڕوای ببێ کە هەواڵ و زانینی ئەوانە هەر لە خواوە هاتووە.

ئەوانەی باس کرد بۆیان، زۆر شتی تری لەو شاراوانە باس نەکرد، چونکە ئەو شتانە بۆ کات و ماوەیەکی تایبەتی و گەل و کۆمەڵێکی دیاریی هاتبوون و ئیتر پێویست نەما بە رەفتار کردن پێ یان و دەستیان نەئەدا بۆ ئەوەی بکرێن بە بەشێك لەم دواترین شەریعەتە هەمیشەیی و نەبڕاوە، سڕرانەوەو پێویست نەبوو باس کردنیشیان لەم شەریعەتەدا، بەو باس نەکردنەش میهرەبانی بەکار هێنا کە زیاتر بێ ئابڕووی نەکردن و راستی هەموو شتێکی لێ نەگوتن، ئینجا لەبارێکی ترەوە ئەم هەواڵی باس نەکردنەیان پێ ئەدا تا بزانن کە پێغەمبەر(ﷺ) زانایە بە هەموو داشاردراوەکانیان، بەهۆی ئەوەوە بترسن و کۆتایی بێنن لە داشاردن بۆ ئەوەی بێ ئابڕووتر نەبن. ئینجا باسی سروشت و کارو کردەوەی ئەم دواترین شەریعەتە ئەکات، سوود و بەرو بەرهەمی لە ژیان دا روون ئەکاتەوە بە تایبەتی سەرنجی نامەدارەکان رائەکێشێ بۆلای، ئەفەرموێ: ﴿قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ﴾ بێگومان هات بۆتان لەلایەن خواوە ﴿نُورٌ وَكِتَٰبٌ مُّبِينٌ﴾ رووناکی یەکی گەورەو نامەیەکی روونی روون کەرەوە، بێگومان و بەلای هەمووانەوە مەبەست بەم نامەیە قورئانە، ئینجا ئایا مەبەست بە رووناکی یەکەش هەر قورئان بێت، وەك هێندێ ئەفەرمون، چونکە لە چەند ئایەتێکی تردا هاتووەو مەبەست پێ‌ی قورئانە، یان مەبەست لێرەدا ئیسلام بێت وەك هێندێکی تری لەسەرە، یان مەبەست پێ‌ی پێغەمبەری ئازیزە(ﷺ) کە رووناکی رووناکی یەکانە و هەموو رووناکی یەکی تر لەو وەرگیراوەو بەهۆی ئەو گەیشت بە مەردومان،(قتادة و زجاج) ئەمەیان هەڵبژاردووە. هەرکام لەم سێ بارە ئەگونجێ و رێکە و بەڵگە هەیە لەسەری، لەسەر هەر بار بەکارهێنانی وتەی(نور) زۆر بەجێ یە و سەروبەرە، چونکە سەرچاوەی رووناکی دڵ و دەروون و گیان ئەم پێغەمبەرەو ئەم قورئانە و ئەم ئیسلامەیە، بڕواداری راستەقینە هەست ئەکات بە رووناکی یە لە هەموو بارو روویەکی ژیانی یەوە، بە تایبەتی کاتێ کە سەرنجێکی ئەو هەموو تاریکی و وێڵی و سەرگەردانی یە بدات کە لە هەموو بیرو باوەڕی نەفامی یەکان هەڵئەقوڵێ لە کۆن و لە تازەوە،

## يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ

﴿ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ﴾ بەم نامەیە خوا ڕێنموونی هەرکەسێك ئەکات کە شوێن ڕەزامەندی و خۆش نوودی خوا کەوتبێ، واتە هەرکەسێك کە شوێن کەوتنەکەی لە زانینی خوادا تێپەڕی کردبێ خوا بەم نامەیە ڕێنموونی ئەکات ﴿سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ﴾ بۆ ڕێگەکانی ئارامی و بێ باکی لە هەر شتێك کە بیمی لێ بکرێ، ڕێگاکانی ڕزگار بوون لە سزاو تۆڵەی خوا، ڕێگەکانی ئارامی و ئاشتی لەگەڵ ژیریدا، لەگەڵ دەروون دا، لەگەڵ ئەندامەکانی لەش دا، ئارامی و ئاشتی ماڵ و خێزان، ئارامی و ئاشتی گەل و ئوممەت و ئەندامەکانیان، ئارامی و ئاشتی لەگەڵ هەموو مرۆڤ و جیهان دا، ئارامی و ئاشتی لەگەڵ ژیان دا، لەگەڵ بوونەوەردا، لەگەڵ پەروەردگاری بوونەوەردا. ئارامی و ئاشتی یەك کە هیچ کەس دەستی ناکەوێ - هیچ ڕۆژێك دەستی نەکەوتووە - مەگەر لەم ئایینەدا، مەگەر لە بەرنامە و شەریعەتی ئەم ئایینەدا، مەگەر لەناو ئەو گەل و کۆمەڵەی کە لەسەر بیرو باوەڕو شەریعەتی ئەم ئایینە بەرپا و ڕاگیر بووبێ و دامەزراو و ڕاگیر بێ. بەڵێ بەڕاستی هەر بەم ئایینە ئەو پایە و پلە بەرزانە و ئەو ئامانجانە بە تەواوی ئەم تام و بۆنە خۆشە ئەچەژێ، کە گوزەری کردبێ بە ڕێگەکانی جەنگ و ئاژاوەکان کە نەفامی کۆن و تازە هێنایان و نەخشەیان کێشان، بێگومان یەکەم چێن و تاقم کە یەکەمجار ئەم ئایەتەی چوو بە گوێچکەدا، وە لە ڕێوە لە نەفامی هاتبوونە ناو ئیسلام و ئەو هەموو جەنگ و ئاژاوە و بێ ئارامی یەیان بەسەرهاتبوو، ئەو یەکەم تاقمە زۆر بە وردی و بە چاکی ئەم تام و بۆنە خۆش و شیرینەی ئارامی و ئاشتی بەیان هەست پێ ئەکرد کە ئیسلام هێنای و ڕشتی بەسەر جیهان دا. ئای ئێمەی ئەمڕۆ کە ئەژین لەناو تاریك و دووکەڵی ڕەشی نەفامی تازەدا ئێمە ئەمڕۆ چەند پێویستین بە گەڕانەوەی ئەو ئارامی و ئاشتی یەی کە ئەم ئوممەتە چەند کات و ماوەیەك تیا ژیاین!!

وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿١٦﴾ لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ

**ئیتر سزاو ئازاری نەفامی تازە ئەچەژین و نقوم بووین تێیدا، ئیسلامیشمان لێوە نزیکە، داماوین بە دەست جەنگی چەرخی نەفامی تازەوەو ئاشتی و ئارامی ی ئیسلامیش لەبەر دەستمان دایە ئەگەر بمانەوێ و ئارەزووی بکەین، کەواتە ئای چەند زیانبارو رەنجەڕۆ و ماڵ وێرانین! خۆمان بەدەستی خۆمان گومڕایی ئەکڕین بە ڕێنموومایی! بێ ئارامی و جەنگ هەڵئەبژێرین بۆ خۆمان و باوی ئەدەین بەسەر ئارامی و ئاشتی دا!! بێگومان ئەم ئوممەتە ئەتوانێ هەموو جیهان رزگار بکات لە هەموو جەنگ و بێ ئارامی و بەدبەختی یەك لە هەموو بارو رووبەکەوە، بەڵام بە مەرجێ کە لە پێشەوە خۆمان رزگار بکەین، بگەڕێینەوە بۆ سایە و پەنای ئیسلام، بگەڕێینەوە بۆ لای رەزامەندی خوا و شوێنی ئەوە بکەوین کە خوا هەڵی بژارد بۆمان و بچینە ریزی ئەوانەی کە خوا ڕێنموونی کردن و خستنیە سەر ڕێگاکانی ئارامی و ئاشتی، ﴿يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ﴾ بەهۆی ئەو نامەیە خوا دەریان ئەهێنێ لە تاریکی یەکان بۆلای رووناکی بە مەیل و ئیرادەو زانینی خۆی.**

**لێرەو لە شوێنەکانی تردا رووناکی بە تاك(نور) ئەفەرموێ، تاریکی یەکان(ظلمات) بە کۆ، ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە ڕێگەی خوا تەنیا ڕێگەیەکە، ڕێگەی شەیتان و شوێن کەوتووەکانی چەندەها ڕێگەن، واتە خوا بەم نامەیە ئەوانە دەرئەهێنێ لە هەموو جۆرە ئایین و بیرو باوەڕ و بۆچوونە ناڕاست و ناڕەواکان بۆلای بڕوا بە خواو ئەوەی خوا ناردی بۆ بەندەکانی. ﴿يَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ ڕێنموونی یان ئەکات بۆلای ڕێگەیەکی راست، واتە ئایینی پاکی ئیسلام و دەست گرتن بەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) هێنای، هەرچۆنێ یەکەم چینی ئەم ئوممەتە دەستی پێوە گرت، کە هەر ئەوەش ڕێکە لەگەڵ سروشت و ژیریی ئادەمی و ژیان و ئەم بوونەوەرە گەورەو فراوانەدا.**

ئەو خوایەی کە ئادەمی ی و سروشتی ئادەمی ی دروست کرد، وە ئەم بوونەوەرەی دروست کرد لەسەر ئەم بارو شێوەی کە دەست نادا بۆ گۆڕان و دەست تێ خستن، هەر ئەو خوایە ئەم بەرنامەی دانا بۆ ئەم ئادەمی یە، کەواتە ئەبێ هەر ئەم بەرنامەیەش راست و رەواو گونجاو بێت، هیچ بەرنامەیەکی تر ناگونجێ لەگەڵی و دووچاری زیان و بەدبەختی ئەکات، ئینجا باسی هێندێ لە بیرو باوەڕو وتەی نامەدارەکان ئەکات کە دژو پێچەوانەی ئەو نورو نامەیە کە خوا ناردی بۆ هەمووان، کە یەکەم بەندو یەکەم بنەڕەتی سەرەکی تیای دا بریتی یە لە تاك و تەنیایی خواو بێ وێنەیی خوا، باسی ئەکات و بە درۆی ئەخاتەوە و دەم کوتی ئەو نامەدارانە ئەکاتەوە ئەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ ﴾ سوێند بەخوا بێ بڕوا بوون و لە ئایینی خوا دەرچوون ئەوانەی کە گوتیان: بەڕاستی خوا هەر مەسیحی کوڕی مەریەمە، واتە عیسا(علیە السلام)، بێگومان ئەوەی کە عیسا لای خوا تاك و تەنیایی خوا بوو، وەك هەموو پێغەمبەرو فروستادەکانی تری خوا، داننان و شانازی کردن بە بەندەیی یەکەی تەواو بۆ خواو بیرو باوەڕ و کارو پیشەی هەموویانە، بەڵام ئەو ئایینە پاکەی کە عیسا هێنای(علیە السلام) چەند گۆڕاندن و دەست کاریی یەکی تیا کرا، بەهۆی هاتنی بت پەرستان بۆ ناو عیسایی یەکان، تێکەڵ بوونی بت پەرستی بە بیرو باوەڕەکانی ئەوان. ئەو گۆڕاندن و دەست کاری کردنە بە یەك جار نەبوون، بەڵکو بەرە بەرە و هەر جارێ شتێ ئەهات، هەتا گەیشتە ئەم رادەیە لە تێکەڵ کردنی ئەو هەموو بۆچوون و شتی پڕوپووچانە کە سەرسوڕئەمێنێ لێ ی، ژیریی تێیدا سەرگەردانە!!

بیروباوەڕی تاك و تەنیایی خوا لە پاش عیسا(علیە السلام) مایەوە لەناو قوتابی و شوێن کەوتوەکانی دا، یەکێ لەو ئینجیلە زۆرانەی کە لە پاش عیسا(علیە السلام) نووسرانەوە، یەکێ لەوانە کە ئینجیلی(برنابا) یە باسی عیسا بەمە ئەکات کە نێرراوێکە لەلایەن خواوە، ئینجا دوبەرەکی زۆر پەیا بوو لەناو عیسایی یەکان دا: هێندێ ئەیانگوت: نێرراو و فروستادەیەکە وەك نێرراو فروستادەکانی تر، هێندێ ئەیانگوت: کوڕی خوایە، چونکە بە بێ باوك پەیدا بووە، بەڵام دروست کراوی خوایە، هێندێکی تر ئەیانگوت: کوڕی خوایە، چونکە بە بێ باوك پەیدا بووە، بەڵام دروست کراوی خوایە، هێندێکی تر ئەیانگوت: کوڕی خوایە و

دروست کراویش نی یە، بەڵکو هەر بووە وەك باوکی. بۆ نەهێشتنی ئەم دووبەرەکی یانە لە ساڵی(٣٢٥) ی زایینی دا کۆڕ و کۆمەڵێ گیرا کە پێك هات لە(٤٨) هەزار بەتریریك و ئوسقوف،(ئیبن البطریق) کە یەکێکە لە مێژو نووسانی نەسرانی یەکان لەبارەی ئەوانەوە ئەڵێ: ((ئەوانە لە ئایین و رادا بەم جۆرە بوون: بەربەرانی یەکانیان ئەیانگوت: عیسا و دایکی دوو خوان بێجگە لەخوایە کە ناوی(الله) یە.(سابلیوس) و تاقمەکەی لەسەر ئەوە بوون کە عیسا لەگەڵ باوکی دا وەك پارچە ئاگرێك وایە کە جوێ ببێتەوە لە پارچە ئاگرێکی تر.(الیان) و تاقمەکەی لەسەر ئەوە بوون: کە عیسا لە سکی دایکی دا نەماوەتەوە نۆ مانگ بەڵکو گوزەری کرد بە سکی دا بە وێنەی گوزەر کردنی ئاو بە پلوسك دا.(بولس شمشاطی) کە بەتریریکی ئەنطاکیە بوو لەگەڵ شوێن کەوتووەکانی لەسەر ئەوەبوون کە عیسا ئادەمی یە و لە لاهوت دروست کراوە، لە مەریەم پەیدا بووە لە یەکەمجارەوە، خوا هەڵی بژارد بۆ ئەوەی ببێ بە دڵسۆز بۆ بەشە ئادەمێتی یەکەی، چاکە و بەهرەی خوا بوو بە هاوڕێ، تێکەڵی بوو و دامەزرا، وە لەبەر ئەوە ناوبرا بە کوڕی خوا، وە ئەڵێن خوایەکی جەوهەری هەربووە بە بێ سەرەتا. بڕوایان بە(کلمة) و(روح القدس) نی یە.(مرقیون) و هاوەڵەکانی لەسەر ئەوەن کە سێ خوا هەن و بە بێ سەرەتا هەر هەربوونە، ئەڵێن:(مرقیون) سەرۆکی هاوەڵەکان عیسا نەك(بطرس).(بۆلس) و(٣١٨) ئوسقوف لەو کۆڕ و کۆمەڵە لەسەر ئەوەن کە عیسا خوایە...)) ئینجا قوستەنتین کە ئیمپراتۆرێکی رۆمانی بوو، لە بت پەرستی یەوە هاتبوو هیچی نەئەزانی لە نەسرانێتی ئەم رایە هەڵبژارد، خاوەکانی ئەم رایەی زاڵ کرد بەسەر خاوەن راکانی تردا بە جۆری ئاوارە و دەربەدەر کران، بە تایبەتی ئەوانەیان کە ئەیانگوت: تەنها باوك خوایە و مەسیح ئادەمی یە. ئینجا خاوەنی(تأریخ الأمة القبطیة) ئەڵێ:((جامیعەی موقەدەسە و کەنیسەی رەسولی یە قەدەغەی کردووە کە هیچ بڵێ: کاتێ بووە کە ئیبن الله نەبووبێ، نەبووبێ پێش ئەوەی لە دایك بووبێ، لە نەبوونەوە پەیدا بووبێ، یان هەرکەس بڵێ: ئیبن لە مادە پێك هاتووە یا لە جەوهەرێکی تر بێجگە لە جەوهەری خوا کە باوکە. بڵێ: دروست کراوە، یان بڵێ: دەست ئەدا بۆ گۆڕان)). بەڵام ئەو کۆڕ و کۆمەڵە نەیتوانی بەم بڕیارانە بیرو باوەڕی خواپەرستەکان لەناوبەرێ، کە دەستە و تەبەعەی(اریوس) بوون. ئینجا

خیلاف و دووبەرەکی یەکی تازە پەیدا بوو لەبارەی(روح القدس)ەوە: هێندێ گوتیان: خوایە. هێندێکی تر ئەیانگوت: خوا نی یە! بەهۆی ئەوەوە مەجمەعی یەکەمی قوستەنتینی یە کۆبوونەوە لە ساڵی(٣٨١) ی زاینی دا بۆ بڕینەوەی ئەو دووبەرەکی یە،(ابن البطريق) بڕیاری دا ئەو مەجمەعە ئەگێڕێتەوە بە پێی قسەی ئوسقۆفی ئەسکەندەری یە بەم شێوەیە:

بەتریریکی ئەسکەندەری یە ئەڵێ:(روح القدس) بەلامانەوە هەر ڕۆحی خوایە، ڕۆحی خوایش هەر بوون و ژیانەکەیەتی، کەواتە ئەگەر بڵێین(روح القدس) دروست کراوە ئەبێ بڵێین: ڕۆحی خوا دروست کراوە، ئەگەر بڵێین: ڕۆحی خوا دروست کراوە، ئەبێ بڵێین: بوون و ژیانەکەی خوا دروست کراوە، ئەبێ بڵێین: زیندوو نی یە، ئەگەر بڵێین: زیندوو نی یە، ئەبێ بڕوامان نەبێ پێی، هەرکەس بڕوای نەبێ پێی نەفرینی لێ ئەکرێ!!!

بەو جۆرو شێوەیە بڕیاری خوایەتی(روح القدس) درا لەو مەجمەعەدا، هەرچۆنێ بڕیاری خوایەتی عیسایش درا لە مەجمەعی نێ قییەدا، بەوە پێك هات سێ خوا لە: أب، إبن، روح القدس. ئینجا دووبەرەکی یەکی تر بەرپا بوو لەبارەی کۆبوونەوەی سروشتی خوایەتی و ئادەمێتی لە عیسادا، لەبەر ئەوە مەجمەعی(أفسس) گیرا لە ساڵی(٤٣١) دا لە پاشان دووبەرەکی و ئاژاوە لەوەیش بەرپا بوو، بەهۆی ئەوەوە مەجمەعی(خلقيدونيە) گیرا لە(٤٥١) دا و بڕیاریان دا کە مەسیح دوو سروشتی هەیە، هەرکام لەو دووانە سەربەخۆن، لە مەسیح دا یەکیان گرتووە، وە نەفرینیان کرد لە مەجمەعی(أفسس) ی دووەم! ئینجا میسری یەکان دانیان نەنا بە بڕیاری ئەم مەجمەعەدا، ئاژاوە و خوێن ڕێژیی ڕووی دا لە نێوان مەزهەبی میسری(منوفيسى) وە مەزهەبی(ملوكانى) کە دەوڵەتی ئیمپراتۆریەتی گرتی یە گەردن.

بەم ئەندازە کۆتایی ئەهێنین بە ڕوون کردنەوەی ئەو بۆچوون و مەزهەبە لارو ناڕاستانەی کە پەیدا بوون لەناو نەسرانی یەکان دا، بوو بەهۆی ئەو هەموو دوژمنایەتی و کینە و دووبەرەکی یەی کە تا ئێستاش هەر هەیە، نایش بڕێتەوە تا دنیا دنیایە، پێویست بوو بەم کورتەیە ئەو باسە بکرێ تا باش تێ بگەین لە دەم کوت کردنەکەی قورئان، باشتر دەرئەکەوێ کە قورئان موعجیزەیە، ئەوەتا ئاگای هەیە لەو هەموو بیرو باوەڕو قسە لارو پووچەی ئەو نەسرانی یانە!

قُلْ فَمَن يَمْلِكُ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا إِنْ أَرَادَ أَن يُهْلِكَ ٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ۗ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٧﴾ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ۚ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم ۖ بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ ۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ

**قورئان هات دەم کوتی ئەوانەی کرد و باری راستەقینەی لە مەسەلەکەدا ئاشکرا کرد: فەرموی: ﴿ لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ﴾، وەك تەفسیرمان کرد، ئینجا ژیریی و سروشت ئەبزوێنیٚ و سەرنجیان رائەکێشیٚ بۆ ئەوەی کە بە ئاشکرا راست و رەوایە، ئەفەرمویٚ: ﴿قُلْ فَمَن يَمْلِكُ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا﴾ بلێ دەی ئایا کێ رێ ئەگریٚ و کیٚ ئەتوانیٚ رێی هیچ شتیٚ بگریٚ لە خوا ﴿إِنْ أَرَادَ أَن يُهْلِكَ ٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا﴾ ئەگەر خوا بیەویٚ لەناو بەریٚ عیسا کوڕی مەریەم و دایکی و هەرکەس وا لە زەوی دا هەموو پێکەوە؟ واتە عیسا و دایکی و هەرکەس لە زەوی دا وەك یەك مل کەچ و دەستە پاچەن بەرامبەر مەیل و دەسەڵاتی خوا و هیچ کەس ناتوانیٚ بەرگریی مەیل و دەسەڵاتی خوایان لیٚ بکات، کەواتە جیاوازی تەواو هەیە لە نێوان خوا و ئەوان دا، خوا تاك و تەنیایە و مەیل و ئیرادەی بەرەبەرەڵایە و رێگری نی یە، وە دەسەڵات و توانای تاقانە و جیاوازە، ئەوان بیٚ دەسەڵات و دەستە پاچەی تەواون بەرامبەری، خوا خاوەنی هەموو شتێکە و دروست کەرو داهێنەری هەموو شتێکە و دەسەڵات دارە بەسەر هەموو شتێك دا، وەکو ئەفەرمویٚ: ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا﴾ هەر بۆ خوایە موڵك و خاوەنێتی هەموو ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی وا لە نێوانیان دا، ﴿يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ﴾ دروست ئەکات و داهێنیٚ هەرچی مەیل بکات، ئەوەتا هێندیٚ شتی دروست کردووە لە هیچ و بە بیٚ بنەڕەت و کەرەسە، وەك ئەو شتەی کە یەکەم دروست کراوە، ئیتر ئەو شتە روناکی یە یان هەرچی. هێندێکی دروست کرد لە بنەڕەت و کەرەسە، وەك هەر دروست کراوێکی تر پاش یەکەم دروست کراو، هێندێکی تر دروست کردووە لە کەرەسەیەك کە لە دیمەن و شێوەدا زۆر جیاوازو دوورن لە یەکەوە، وەك یەکەمی هەموو گیان لەبەران لە خاك دروستی کردوون،**

هێندێکی دروست کردووە لە شتێك کە لە وێنەو شێوەی خۆیەتی، ئیتر لێ دروست کراوەکە نێری تەنیا بێت وەك(حواء) کە لە ئادەم دروستی کرد، یان ئافرەتی تەنها بێت وەك عیسا کە لە مەریەم دروست کرا، یان لە هەردوو جۆرەکە وەك هەموو رۆڵە و نەوەکانی تری ئادەم و حواء، هێندێکی دروست کردووە بە دەستی قودرەتی خۆی نەك لەسەر دەستی هیچ کەسێکی تردا وەك ئەرز و ئاسمان و ئەو هەموو شتانەی تر، هێندێکی دروست کردووە لەسەر دەستی یەکێ لە دروست کراوەکانی دا، دروست کراوەکەش گیان لەبەرە وەك ئەو پەلەوەرەی کە لەسەر دەستی عیسادا دروستی کرد، هێندێکیشی دروست کردووە لەسەر دەستی بەندەکانی دا و گیان لەبەر نین، وەك ئەم هەموو شتانەی کە بە کردەوە و پیشە سازی بەندەکانی فەراهەم ئەهێنرێن لەم جیهانەدا، کەواتە دروست کردنی عیسا لە تەنها دایکی، یا دروست کردنی پەلەوەر و زیندوو کردنەوەی مردوو لەسەر دەستی عیسادا نابێ بە نیشانە و بەڵگە لەسەر خوایەتی عیسا، وەك بە نەفامی کراون بە بەڵگە لەلایەن ئەو مەسیحی یە سەر لێ تێك چووانە﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ﴾ خوا بەسەر هەموو شتێك دا توانایە، کەواتە هەرکەسێك بێ بەش نەبێ لە ژیریی هەر ئەو داهێنەرو توانا بەخوا ئەزانێ و ئیتر بێجگە لەو هەموو شت و هەموو کەس بە دروست کراو و مل کەچ ئەزانێ و نزیکی سنووری خوا و خوایەتی یان ناخاتەوە. ئینجا قسە و لافێکی زۆر ناڕاست و ناڕەوا ئەهێنێ لەلایەن هەردوو تاقمی نامەدارەوە، دەم کوت و بەرپەرچیان ئەداتەوەو بە درۆیان ئەخاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ﴾ هەرکام لە جوولەکە و گاور گوتیان و ئەڵێن، ﴿نَحۡنُ أَبۡنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ﴾ ئێمە کوڕانی خواو خۆشەویستانینی!! هەرکەسێك کتێبی ئەو دوو تاقمە بخوێنێتەوە ئەبینن کە بە ئادەم و بە یعقوب و بە ئەفرام و بە عیسا وتراوە کوڕی خوا. هەروەها بۆ فریشتە و پیاوچاکانیش ئەو وتەیە بەکار هێنراوەو باوکێتی بۆ خوا رەوا دراوە، ئەگەر مەبەستیان باوکێتی لەش و جەستە نەبووبێ، بێگومان باوکێتی گیان و رۆح بووە، بەهەرحاڵ ئەو بۆچوون و بڕوایە ناگونجێ لەگەڵ بڕوا بە تاك و تەنیایی خوا، لەگەڵ ئەو جیاوازی یە تێرو تەواوەی کە هەیە لە نێوان خوایەتی و بەندەیی دا، کە بە بێ بڕوا بەو تاك و تەنیایی و جیاوازی یە هیچ شتێك نرخی نی یە و هیچ کارێك بە راستی ناڕوا و ئایینی خوا نامێنێ و هەموو لاری و نالەباری و خراپەیەك روونەدا. جوولەکە و گاور بە پێی ئەو

لافەیان لایان وابوو کە خوا سزایان نادا لەسەر تاوان و خراپەکانیان، هەر ئەوان ئەچنە بەهەشت، ناچنە دۆزەخ مەگەر چەند رۆژێکی کەم، ئەوەش ئەوە نیشان ئەدا کە داد و دادپەروەریی خوا لەسەر باری راستەقینە ناڕوا، ئەبێ خوا لایەنگیریی بەکاربێنێ لەگەڵ هێندێ لە بەندەکانی دا، بەم رەنگە لێ یان ئەگەڕێ بە ئارەزووی خۆیان خراپەکاری بکەن و هیچ سزایشیان نەدا وەك خراپەکارانی تر! دەی ئایا چ بۆچوون و بیرو باوەڕێك لەوە خراپترە؟ بەوە چ شێوان و ناڕێکی یەك روو ئەدا لە ژیان دا؟

جا لەبەر ئەوە قورئان ئەدا لە دەماخیان و دەم کوتیان ئەکات و ئەوەی کە راست و رەوایە دەری ئەخات بە روونی، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە: ﴿فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم﴾ ئەگەر ئەو لاف و قسانی ئێوە راستن، دەی بۆچوونی سزاتان ئەدا بەهۆی گوناهەکانتانەوە، باوکو خۆشەویست سزای کوڕو خۆشەویستی خۆی نادا. سزا و ئازاردانی خوا بۆ ئەوانە لە جیهان دا شتێکی ئاشکرایە بەلای هەرکەسێك کە زانایە بە مێژووی بەسەرهاتی ئەوانە، خۆیشیان بە باشی ئەزانن و ناتوانن دانی پیا نەنێن، ئەوە خوا بت پەرستی زاڵ کرد بەسەر جوولەکەدا بە کوشتن و بڕین و ئاوارە کردن، بە وێران کردنی شارو مزگەوتە هەرە گەورەکەیان، هەروەها بە بەدیل گرتنیان و گێڕانیان بە بەراز و مەیمون، گاورەکانیشی سزا دا بە زاڵ کردنی میللەتەکانی تر بەسەریان دا، بە جەنگ و دوژمنایەتی ناوخۆیان کە ئەوە لە هەموو شت خراپترە، ئەوانەیان لە جیهان دا بەسەرهات پێش هاتنی سزای دۆزەخ لە رۆژی دوایی دا کە خۆیشیان دانی پیا ئەنێن کە چەند رۆژێك ئەسوتێنرێن. کەواتە ئێوە کوڕو خۆشەویستی خوا نین ﴿بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ﴾ بەڵکو ئێوە مرۆڤێکن لەو مرۆڤانەی تر کە خوا دروستی کردوون، کەواتە پەیوەندی یەکی تایبەتیتان نی یە بە خواوە، ئینجا لێ بوردن و سزادان بە پێی خواهیش و مەیلی خوایە، کە ئەو مەیل و خواهیشەیش بە دادی تەواوە و بە پێی چاکی و خراپی کردەوەیە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿يَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ﴾ ئەبووری و خۆش ئەبێ لە هەرکەسێك کە خوا مەیل بکات و بیەوێ، سزای هەرکەسیش ئەدات کە خوا خۆی بیەوێ.

وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٨﴾ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ قَدْ جَآءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ عَلَىٰ فَتْرَةٍ مِّنَ ٱلرُّسُلِ أَن تَقُولُوا۟ مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٍ وَلَا نَذِيرٍ ۖ فَقَدْ جَآءَكُم بَشِيرٌ وَنَذِيرٌ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٩﴾

---

﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ﴾ هەر بۆ خوایە خاوەنێتی و موڵکی ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی وا لە نێوانیان دا، کەواتە هەرچی لەم بوونەوەرەدایە پەیوەندی بە خواوە بە موڵکایەتی و بەندەیی و ژێر دەستەیی یە، کەواتە ئەوانە ئەو لاف کوڕێتی یەیان لە کوێ هێنا، ﴿وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ﴾ هەر بۆلای ئەویشە گەڕانەوە لە ڕۆژی دوایی دا بۆ پاداشت و تۆڵە لەسەر کردەوە، بە پێی زانینی خوا و دادپەروەریی خوا، بە بێ لایەنگیریی و هیچ هۆیەکی تر، کەواتە هیچ لافێکی ئەو نامەدارانە ڕاست نی یە و بێ بنج و بنەوانە.

ئینجا باس و بەیانەکە دوایی ئەهێنێ بە بانگ کردنێکی تری نامەدارەکان بەمەی هیچ برو بیانوویەکیان نی یە لە ڕۆژی دوایی دا، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ ئەی نامەدارەکان بە تێکڕایی ﴿قَدْ جَآءَكُمْ رَسُولُنَا﴾ بێگومان فروستادەو نێرراوەکەی ئێمەتان بۆ هات، واتە ئەوەی کە لە نامەکانتان دا موژدە درا بە هاتنی، ئێوەش چاوەڕوانی هاتنی بوون، لە کاتێك دا ﴿يُبَيِّنُ لَكُمْ﴾ بەڕوونی باس ئەکات بۆتان بەرە بەرە، واتە باسی ئەوەی کە پێویست بێت بۆتان لە ئاین و شەریعەتی خوا، ئەو نێرراوەش هات ﴿عَلَىٰ فَتْرَةٍ مِّنَ ٱلرُّسُلِ﴾ لەکاتی پچڕان لە نێرراوان، واتە لە کاتێك دا هات کە ماوەیەك بوو نێرراو نەنێررابوو، کەواتە لە کاتێکی پێویست دا هات، ئیتر ئەو ماوەیە(٦٠٠) ساڵ یان(٥٥٠) ساڵ یان(٥٤٠) یان(٥٠٠) بووبێ وەك بەو چەند رایە ریوایەت کراوە. ئەو نێرراوەمان هات ﴿أَن تَقُولُوا۟﴾[1] لەبەر ئەوەی نەڵێن، یان لەبەر بێزاری لەوەی بڵێن: ﴿مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٍ وَلَا نَذِيرٍ﴾ نەهات بۆلامان هیچ موژدەدەر و هیچ ترسێنەرێك،

---

[1] لەم شوێنە و لە وێنەی دا دوو را هەیە: رای کوفەیی یەکان کە(لا) بڕیار نەدەن، واتە(لئلا تقولوا)، رای بەسرەیی یەکان کە نەڵێن: وتە(کراهە) بڕیار نەدرێ، لەبەر ئەوە لە تەفسیرەکەی دا دەست نیشانم کرد بۆ هەردوو راکە.

واتە لەبەر ئەوەی ئەوە نەکەن بە بەڵگە و بیانووی لادان و گومڕاییتان، کەواتە ئەو بەڵگە و بیانووە نەهێننەوە ﴿فَقَدۡ جَآءَكُم بَشِيرٞ وَنَذِيرٞۗ﴾ چونکە ئەوا هات بۆتان مـوژدەدەرو ترسێنەر. ئینجا ئاگاداریان ئەکات بە دەسەڵات و توانای خوا بەسەر هەموو شتێك دا، تا تەمێ وەرگرن و بزانن کە بۆ خوا هیچی تێ ناچێ ناردنی پێغەمبەرێك لە نەخوێندەواران، هەروەها ئەتوانێ تۆڵە بسێنێ لە نامەدارەکان لەسەر لادان و کردەوەی بەد و خراپی یان، ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ خوا تونا و دەسەڵات دارە بەسەر هەموو شتێك دا، بەو جۆرو شێوەیە ئەو گەردش و گەڕانەوەی کرد لەگەڵ نامەدارەکان دا، دەری خست لادانیان لە ئایین و شەریعەتە راستەکەی خوا کە پێغەمبەرەکانیان هێنایان بۆیان، بەڕوونی باسی ئەو عەقیدە و بیرو باوەڕەی بۆ کردن کە خوا داوای ئەکات لە بڕواداران و رازی یە پێ ی، بڕوبیانووی نەهێشتنەوە بەرامبەر پێغەمبەرەکەی لە دواترین پێغەمبەران دا رەوانەی کرد بۆ سەر هەموو جیهانی یان - درودی خوا لە هەمووان بێت - بەهۆی ئەوەی کە باس کرا لەبارێکەوە بانگیان ئەکات بۆ سەر رێ ی راست، لەبارێکی ترەوە پیلان و فڕو فێڵیان بێ هێزو لاواز ئەکات لەناو موسڵمانان دا، رێگەیش روناك ئەکاتەوە بۆ کۆمەڵی موسڵمان و بۆ هەر کەسێك کە بە دوای رێ ی راست دا ئەگەڕێن.

ئینجا باسی دواترین هەڵوێستی ئیسرائیلی یەکان ئەکات کە بوویان بەرامبەر پێغەمبەرو رزگار کەریان کە موسایە(علیه السلام). ئەمەی کە لێرەدا باسی ئەکات زنجیرەیەکە لە داستان و سەرگوزەشتەی ئیسرائیلی یەکان کە قورئان زۆر بە درێژیی و فراوانی باسی کرد، ئەوەیش لەبەر چەند هۆ و بەرژەوەندی یەکە. یەکێ لەوانە ئەمەیە کە ئیسرائیلی بە تایبەتی جوولەکە یەکەم کەس بوون بەرەنگاریی ئەم ئیسلامە وەستان بە دوژمنایەتی و پیلان و تەڵەکە و هەر جۆرو شێوەیەك کە لەدەستیان هات و بۆیان کرا، ئەوان بوون ناپاکەکانیان گرتە کۆش و باوەشی خۆیان لە مەدینەدا، یارمەتی یان ئەدان بە بەکارهێنانی هەموو پیلان و فێڵێ دەربارەی موسڵمانان و ئایین و بیرو باوەڕەکەیان، ئەوان بوو هانی بت پەرستەکانیان

دا به دژی ئیسلام و موسڵمانان، بەڵێنیان بە پشت گیریی کردن و یارمەتی دانیان، ئەو هەموو تاوانەیان ئەکرد بە ژێر بە ژێریی، پێش ئەوەی بە ئاشکرا دوژمنایەتی یان دەربڕی و جاڕی جەنگیان دا، کەواتە پێویست بوو ئاوا بە روونی دەرخرێن بۆ موسڵمانان، تا بیان ناسن و بزانن کێ دوژمنیانە. سروشتیان؟ مێژوویان چۆنە و چی یە؟ بە چ چەکێ دوژمنایەتی ئەکەن؟ مەبەستیان چی یە لەو دوژمنایەتی و جەنگە بەتینەی کە ئەیکەن؟ بێگومان زانیویەتی کە ئەوانە ئەبن بە دوژمنی ئەم ئوممەتە لە داهاتوودا تا رۆژی دوایی، وەك لەمەو پێش هەر دوژمنی رێی راست و راستی بوون، لەبەر ئەوە کارو پیشەیانی دەرخست بۆ ئەم ئوممەتە، هەموو پیلان و چەکەکانیانی ئاشکرا کرد. یەکێ تر لەو هۆو بەرژەوەندی یانە ئەوەیە کە ئیسرائیلی یەکان خاوەن دواترین ئاین بوون لە پێش ئیسلام دا، مێژوویان ماوەیەکی زۆر درێژەی کێشا، گۆڕان و لادانی زۆریان هێنا لە ئایینەکەیان دا، چەند جار پەیمانی خوایان شکاند، بەرهەم و سەرەنجامی ئەو کردەوانەیان لە ژیانیان دا روویدا و بەدی هات، هەرچۆنێ کاری کرد لە کردەوە و رەوشتیان دا، بەهۆی ئەوەوە پێویست بوو ئەم ئوممەتە – کە جێنیشین و جێگری هەموو ئایینەکانی خوایە – بە باشی شارەزا بن بە مێژووی ئەو گەلە، ئاگادار بن بەهۆی لادان و هەڵخلیسکانیان لە رێی خوا، تا بەهۆی ئەوەوە سوود وەرگرێ و خۆی بپارێزێ لەو لادان و هەڵخلیسکانەی ئەوان هەتا هەتایە. هۆیەکی تر لەو هۆیانە ئەمەیە ئیسرائیلی یەکان بەهۆی درێژە کێشانی ماوەو مێژووەکەیانەوە دڵیان رەق بوو ئەو هەموو لادان و کردەوە بەدانەیان بەسەر هات، بێگومان ئەم ئوممەتە درێژە ئەکێشێ، بەهۆی ئەوەوە لەوانەیە وێنەی بەسەرهاتی ئەوان بەسەر ئەمانیش بێت، کەواتە پێویستە ئەو بەسەرهاتانەی ئەوان بخرێتە بەرچاو تا پێشەواو بانگ کەرانی ئەم ئوممەتە فریا کەون و چارەسەر دانێن بۆ هەر هەڵە و لادانێك کە روو بکاتە ئەم گەل و ئوممەتە. بێجگە لەمانە کە باس کران چەند هۆیەکی تریش هەیە بۆ باس کردن و درێژە دان بە داستان و سەرگوزەشتەی گەلی ئیسرائیلی بۆ ئەم ئوممەتە،

وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ يَـٰقَوۡمِ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ جَعَلَ فِيكُمۡ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا

بەڵام ئەو ئەندازەیە بەسە و با بگەڕێینەوە بۆ سەر ئەم ئەڵقەیە کە لێرەدا باسی کرد، ئەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ ﴾ باسی ئەو کاتە بکە کە موسا گوتی بە گەلەکەی: ﴿يَـٰقَوۡمِ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ ﴾ ئەی گەلەکەم باسی چاکە و بەهرەی خوا بکەن بەسەرتانەوە، باسی بکەن بە چاو لەبەریی و سوپاس و گوێ رایەڵی کردن کە ئەوە هۆی زیاد بوونی چاکەیە، نەبوونی مایەی نەمانی چاکە و بەهرەیە و دابارینی سزاو ناخۆشی، لەناو چاکە و بەهرەکانی خوا بەسەرمانەوە باسی سیانی زۆر گەورەو گرنگی کردن کە هەموو چاکە و بەهرەکانی تر ئەگرنەوە:

١- فەرموی: ﴿إِذۡ جَعَلَ فِيكُمۡ أَنۢبِيَآءَ ﴾ باسی چاکەی خوا بکەن بەسەرتانەوە لە کاتێك دا کە گێڕانی لە ئێوە چەند پێغەمبەرانێك، لە هیچ ئوممەت و گەلێکی تردا خوا وای نەکردووە و ئەوەندە پێغەمبەرانی لێ هەڵنەخستووە.

٢- ﴿وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا﴾ گێڕانی بە پادشا.

هەرچەند ئیسرائیلی چەند پادشایەکیان لێ هەڵکەوت، بەڵام ئاشکرایە کە هەموو پادشا نەبوون بە تایبەتی وا دەرئەکەوێ کە لە چەرخی موسادا پادشایان نەبووبێ، کەواتە بێگومان ئەم فەرمودەیە لەسەر رووکەش و رواڵەتەکەی نی یە، بەڵکو وەك(سدی) ئەفەرموێ: مەبەست ئەوەیە خوا گێڕانی بە ئازاد و سەربەست و خاوەنی کاروباری خۆیان لە پاش ئەوەی کە پێشێل کراو و کۆیلەی ئەڵقە لە گوێی قیبتی یەکان بوون، یان بەهۆی پێغەمبەرو نامەکەیانەوە بە گوێ کراو و دەم راست و فەرمان رەوا بوون، هەرکەسیش وا بێ وەك پادشا وایە، یان ناوبردنیان بە پادشا لەبەر ئەوەیە کە چەند پادشایەکیان تیا هەڵکەوت، هەر گەلێکیش بەو جۆرە بن بە پادشا ناو ئەبرێن،(ضحاك) ئەفەرموێ: ناوبران بە پادشا، چونکە خوا جێ و شوێنی فراوان و ماڵ و سامان و بەردەست و خزمەتکاریی زۆری پێدان، هەرکەسیش وا بێ پادشایە لە ماڵ و جێ و شوێنی خۆیدا.

٣- ﴿وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ پـێی بەخـشیون شـتێ کـە نەیبەخـشیوە بـە هـیچ کەسێکی تر لە جیهانی یان، ئەو شتە بە حەوت جۆر تەفسیر کراوەتەوە، لەت کردنی دەریا و گێڕانی بە دوانزە شەقام تا گوزەریان کرد پێ یان دا، لەناوبردنی ئەو دوژمنە ناڵەبارە و سارا کردنەوەی جێ و شوێن و سامانەکەی بۆیان. باراندنی گەزۆ و شەلاقە بەسەریان دا، دەرهێنانی دوانزە کانی بۆیان لەو بەردەی کە موسا دار دەستەکەی پیا ماڵی، سێبەر کردنی هەور بۆیان، پادشایەتی و پێغەمبەرێتی کە بە هیچ گەلێکی تر نەدرا بوو لە پێش ئەوان دا لەو چەرخەدا هەر ئەوان خواناس و زانا بوون، وە خۆشەویستی خواو یارمەتی دەری ئایینەکەی هەر ئەوان بوون، ئینجا دوور نی یە مەبەست هەموو ئەوانە بن، بەڵام دڵ بە ئارام نی یە بە هێندێ لەم تەفسیرانە، چونکە بێگومان ئەبێ موسا(علیه السلام) سەرنجی بۆ چاکە و بەهرەیەك ڕاکێشابن کە ناسراو و زانراو بووبێ لایان، دەی هێندێ لەو چاکە و بەهرە گەورانەی بیر خستنەوە، تا چاو لەبەر بن و گوێ ڕایەڵ بن، ئینجا فەرمانی پێدان بە غەزا و تێکۆشان و جەنگ کردن لەگەڵ دوژمنی بێ ئایین کە خاکی قودسی داگیر کردبوو، فەرمانی دا بە پاك کردنەوەی ئەو خاکە لەو ستەمکارانە، بەڵێنی پێدان بە کۆمەکی و یارمەتی خوا ئەگەر ئەوان گوێ ڕایەڵ بن. فەرموی: ﴿يَٰقَوْمِ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْأَرْضَ ٱلْمُقَدَّسَةَ﴾ ئەی گەلەکە بچنە ناو ئەو خاك و وڵاتەی کە پاك کرا لە بت پەرستی کاتێ کە پێغەمبەرانی تیا ڕەوانە کرا و بوو بە قەرارگای ئەوان و بڕواداران لە پێش داگیر کردنی لەلایەن ئەو ستەمکار و بێ بڕوایانەوە،(مجاهد) ئەفەرموێ: مەبەست بە(المقدسة) پیرۆز و پیت و فەڕدار کراوە. ئەو خاك و وڵاتەی نێوان عریش و فوراتە وەك لە(معاذ کوڕی جبل) ەوە ڕیوایەت کراوە، لە(قتادة) وە ڕیوایەت کراوە بریتی یە لە شام کە سوریە و لوبنان و فەلەستینی ئێستا ئەگرێتەوە.

ٱلَّتِي كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَارِكُمْ فَتَنقَلِبُوا۟ خَٰسِرِينَ ﴿٢١﴾ قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىٰ يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ﴿٢٢﴾ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمَا ٱدْخُلُوا۟ عَلَيْهِمُ ٱلْبَابَ

فەرمووی: ﴿ٱلَّتِي كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ﴾ ئەو خاكەی كە خوا نووسیویەتی بڕیاری داوە بۆتان، وەك زۆربە ئەفەرموون. چونكە ڕیوایەت كراوە كە خوا فەرمانی دا بە حەزرەتی ئیبراهیم(علیه السلام) كە بەرز ببێتەوە بۆ سەر شاخی لوبنان، لەوێوە سەرنج بدات تا چاوی بڕ ئەكات بۆ خۆی و نەوەكانی بێت،(قتادة و سدی) ڕایە تریان هەیە هەرچەند بە دوور دائەنرێ، ئەفەرموون: مەبەست بە ﴿كَتَبَ ٱللَّهُ﴾ ئەوەیە خوا فەرمانی داوە و پێویستی كردووە لەسەریان كە تێی بچن، بەهەرحاڵ و لەسەر هەربار حەزرەتی موسا(علیه السلام) ئیسرائیلی یەكانی هێنا بۆ ئەوەی لەو خاكە پاكەدا نیشتەجێ یان بكات، بەجۆرێ مافی نیشتەجێ ی یان ببێ تیای دا نەك ببێ بە جێ و شوێنی تایبەتی و موڵكی تایبەتی ئەوان، وەك جوولەكە ئەو لافە لێ ئەدەن، ئەگەر بیسەلمێنن كە بۆ ئەوەو بەو نیازە هێنابنی ئەوە هەر بۆ ئەو چینە بووە لەو كاتەدا و بۆ هەر چینێكی داهاتووی ئەوان كە لە ئایینی خوا لایان نەدابێ و دژی ئایینی خوا نەوەستابن، هەر كات بەم جۆرە بوون نە مافی موڵكایەتی یان ئەمێنێ و نە مافی نیشتەجێیش، وەك(بنی قینقاع و بنی نضیر) كە دژی خوا و پێغەمبەر وەستان خوا دەری كردن لە خاك و وڵات و جێ و شوێنی خۆیان، بەڵكو هێندێ جار مافی مانەوەیان نامێنێ لە هیچ خاك و وڵاتێك دا ئەبێ بكوژرێن، وەك(بنی قورەیزە) كە خوا فەرمانی دا بە كوشتن و داگیر كردنیان، حەزرەتی موسا ئەو فەرمانەی پێدان و ئینجا فەرمووی: ﴿وَلَا تَرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَارِكُمْ﴾ پاشەڵپاش وەرنەگەڕێنەوە لە ئایینەكەی خوا، یان نەگەڕێنەوە لەو خاكە پاكەی كە فەرمانتان پێ دراوە بە تێ چوونی، بەڵكو بڕۆن و مل بنێن، لەسەر هەر بار وەرنەگەڕێنەوە ﴿فَتَنقَلِبُوا۟ خَٰسِرِينَ﴾ تا بەهۆی ئەوەوە بگەڕێنەوە بە زیانباریی و نائومێدیی و ڕەنجەڕۆیی لە هەردوو جیهان دا. بێگومان لە فەرمودەكانی موسا پێغەمبەرەوە(علیه السلام) دەرئەكەوێ كە مەترسی بووە لە دوو دڵی و گوێ ڕایەڵی نەكردنی گەلەكەی، چونكە لەوەو پێش بەراوردی كردبوون و شتی ناڕەوای زۆری لێ دیتبوون. بینی كە ئەوانەی لە خاكی میسر هێنایە دەرەوە و ڕزگاری كردن لە زەبوونی و ڕیسوایی، بەناوی خواو و بەو دەسەڵاتە گەورەی خوا كە دوانزە شەقامی

خسته ناو ئەو دەریا و گوزەریان کرد پیای دا، فیرعەون و لەشکرەکەی تیا خنکاند، کەچی لەپاش ئەوە کە رابوردن بەلای کۆمەڵێکی بت پەرست دا، داوایان کرد کە موسا چەند بتێکیان بۆ دانێ بە وێنەی ئەو بت پەرستانە، هەر کە موسایان لانەما و چوو بۆ شاخی توور، بە قسەی سامیری هەڵخەڵەتان و بوون بە گوێرەکە پەرست، ئەوانەی بینی کە لە بیابان دا ئاوی بۆ هەڵقوڵاندن لە بەرد، گەزۆ و شەلاقەی بەسەردا باراندن کە ببێ بە خۆراکیان، کەچی ئەو خۆراکە پاك و خۆشەیان نەئەویست و داوای گژو گیاو سیر و پیازەکەیان ئەکرد کە لەکاتی خۆی دەقیان پێوە گرتبوو لە میسردا، کە خاکی چەوسانەوە و زەبوونی و ریسوایی بوو بۆیان، ئەم خۆراکە پاك و خاوێنەیان نەئەویست کە بێ ئەرك و زەحمەت خوا پێی دابوون لە خاکی سەربەرزی و ئازادی دا!!! ئەوانەی بینی کە لە مەسەلەی سەربڕینی ولآخەکەدا چەند لاری و گیرو گرفتیان بەکارهێنا! بینینی کاتێ کە گەڕایەوە لە شاخی توور و نامە و پەیمانی خوای بۆ هێنان، سەرکێشیان کرد لە وەرگرتنی تا خوا شاخەکەی بەرز کردەوە بەسەریان دا و لە ناچاری دا پەیمانەکەیان وەگرت! چەند شتێ تری لێ بینین و هەر لاری و نالەباری بینی لێ یانەوە، کەواتە ماڤ خۆی بوو کە مەترسی یان لێ بکات و بەو جۆرو شێوەیە ئەو فەرمانە پیرۆزەیان پیا بدا کە چوو بە گوێچکەمان دا، کە ماڤ ئەوەیان بوو زۆر بە سۆز و پەرۆشەوە پەلامار بدەن بۆ گوێ رایەڵی، کەچی بەم جۆرە بوون کە ئەفەرموێ: ﴿قَالُواْ﴾ وتیان ﴿يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوۡمٗا جَبَّارِينَ﴾ ئەی موسابەڕاستی لەوشارەدایەگەل وکۆمەڵێکی زۆر زۆرداری ستەمکار، ﴿وَإِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَا حَتَّىٰ يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا﴾ ئێمەهەرگیزناچینە ئەو شارە هەتا ئەوان لێی دەرنەچن، ﴿فَإِن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ﴾ ئینجا ئەگەر ئەوان لێی دەرچوون ئەو کاتە بێگومان ئێمە تێ ئەچین!!! ئیتر هیچ گوێ یان نەدا بەو بەڵێنە گرنگەی کە پێی دان، هۆی ئەوەش لاوازیی بڕواکەیان بوو، ئەگەر بڕواکەیان تەواو و بەهێز بوایە هیچ سەریان لێ نەئەکردەوە، وەك دەریش ئەکەوێ لە حاڵی ئەم دووانە کە باسیان ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ﴾ دوو پیاو لەوانەی کە لە خوا ئەترسان، نەك لەو دوژمنانە وەك ئەوانی تر، یان دوو پیاو لەو گەلەی کە ئەترسان لەو زۆردارانە، کە ئەو دووانە ﴿أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمَا﴾ خوا چاکەی خۆی رشت بەسەریان دا بە بڕوای بەهێز و دامەزراویی، ئەو دووانە – کە بەناوبانگن بە یوشع و کالب – وتیان بە گەلەکەیان بە زات وەبەرنان و هاندانەوە: ﴿ٱدۡخُلُواْ عَلَيۡهِمُ ٱلۡبَابَ﴾ کوت و پڕ بدەن بەسەریان دا لە قاپی شارەکەوە و قاپی یەکەیان لێ بگرن،

﴿فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ غَٰلِبُونَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٣﴾ قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَآ أَبَدًا مَّا دَامُوا۟ فِيهَا ۖ فَٱذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ﴿٢٤﴾﴾

---

**﴿فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ غَٰلِبُونَ﴾ ئینجا کاتێ کە ئێوە چوونە قاپی یەکەو بەو جۆرە داتان بەسەریان دا بێگومان ئێوە زاڵ ئەبن بەسەریان دا.**

**ئەو پەلامار دانە لەناکاودا و دان بە ملی دوژمن لەجێ و شوێنی خۆی دا سەری لێ ئەشێوێنێ و بیم و ترس ئەخاتە دڵی و ئەشکێ، هەرچۆنێ دڵی پەلامار دەران بەوە بەهێزو دامەزراو ئەبێ، هەرچەند شتەکە وایە، بەڵام هەر خوا حیسابە و هەموو کارێ بە دەست خوایە، لەبەر ئەوە پێ یان گوتن: ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓا۟﴾ پشت هەر بە خوا ببەستن، واتە هەرچەند پێویست دەست گرتن و بەکارهێنانی ئەو شتانەی کە خوا کردوونی بە هۆو رێگەی گەیشتن بە مەبەست و ئامانج، بەڵام لە هەمان کات دا ئەبێ پشت هەر بە خوا ببەسترێ، چونکە هیچ شتێ تر کار ناکات، بەڵکو هەموو شتێ خوا فەراهەمی ئەمێنێ و ئەیکات، ئەو پشت بەستن بە خوا کارو پیشەی بڕوادارانە و بڕوای راستەقینە داخوازە بۆی لەبەر ئەوە فەرموویان: ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە بڕوادارن، بەو جۆرە زاتیان نانە بەر و هانیان دان و بەڵێنی سەرکەوتنیان پێدان، بەڵام ئەو قسانەیان بۆ کێ کرد؟ بۆ ئەو ئیسرائیلی یانە؟ نەخێر بێ کەڵك بوو، هەرچی یان گوت زایە بوو و گوێی بۆ نەگیرا ئەوەتا ﴿قَالُوا۟﴾ وتیان: ﴿يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَآ أَبَدًا﴾ ئەی موسا بەڕاستی ئێمە هەرگیز ناچینە ئەو شارە هیچ کاتێ ﴿مَّا دَامُوا۟ فِيهَا﴾ تا ئەوانە تیای دا بن، ﴿فَٱذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ﴾ کەواتە بڕۆ تۆ و خواکەت جەنگ بکەن و ئەوانە دەرکەن تا ئێمە بچینە ناو شارەکە، بەڵێ ئەبێ وابڵێن، چونکە باوی ترسنۆك وایە لە کاتی تەنگانەدا دنیای لێ دێتە یەك و دەست ئەکات بە دەم درێژیی کاتێ زۆری پێ بهێنرێ!!**

**زۆر سەیرە کە وتیان: خواکەت! وەك خوای ئەوانیش نەبێ و بەخوای خۆیانی دانەنێن، چونکە داوای جەنگیان لێ ئەکات، ﴿إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ﴾ بێگومان ئێمە لێرەدا دانیشتووین لە جەنگ کردن و جەنگ ناکەین، نە پادشایەتی و موڵکمان ئەوێ، نە سەربەرزی و ئازادیمان ئەوێ، نە وڵات و خاکی بەڵێن پێ دراومان ئەوێ، ماتوڵ جەنگ و بەربەرەکانێ ی ئەو زۆردارانەی تیا بێت.**

قَالَ رَبِّ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ إِلَّا نَفۡسِي وَأَخِيۖ فَٱفۡرُقۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيۡهِمۡۛ أَرۡبَعِينَ سَنَةٗۛ يَتِيهُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ فَلَا تَأۡسَ عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾

دواترین بەرهەمی هەوڵ و تێکۆشان و خەریك بوونی موسا لەگەڵ ئەو گەلەدا ئەو لاری ونالەباری و بێ شەرمی یە بوو لەگەڵ موسا پێغەمبەردا، لەبەر ئەوە موسا(علیه السلام) هیچی بۆ نەمایەوە بێجگە لەوەی غەم و پەژارەی خۆی دەربڕێ و سکاڵای خۆی کردە لای خوای خۆی کە ئاگادارە بە هەموو شتێ، یەخەی خۆی هەڵتەکاند لەوانەی کە پەیمانیان شکاند و لە سنووری خوا دەرچوون، بەم رەنگە ﴿قَالَ﴾ وتی: ﴿رَبِّ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ إِلَّا نَفۡسِي وَأَخِيۖ﴾ ئەی پەروەردگارم بەڕاستی من خاوەنی هیچ کەسێك نیم بێجگە لە خۆم و براکەم، یان من هەر خاوەنی خۆمم و براکەیشم هەر خاوەنی خۆیەتی، واتە من کاری هیچ کەسم بەدەست نی یە و ناتوانم گوێ رایەڵی بە هیچ کەس بکەم، بەس خۆم و براکەم نەبێ کە ئەپەرمووموەوە بە هەموو جۆر گوێ رایەڵ بین. وا دەرئەکەوێ ئەوەندە بێزار بووبێ لە گەلەکەی تا ئەو رادەی متمانەی نەمابێ بە دوو پیاوە چاکەکەیش لەبەر ئەوە باسی ئەوانیشی نەکرد و نیشانی نەدا کە بڕوای بەوانیش هەیە! ﴿فَٱفۡرُقۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾ کەواتە جیاوازی بخەرە نێوان ئێمە و ئەو گەلە کە لە سنووری خوا دەرچوون و فەرمانبەری یان نەکرد. مەبەست بەو جیاوازی خستنە ئەوەیە: هەرکام شایستەی چی یە خوا بە سەری بێنێ وەك لە(ئیبن و عەباس و ضحاك) ەوە ریوایەت کراوە و زۆربەی زانایانی تەفسیر لەسەر ئەوەن.

خوا نزاکەی وەرگرت بەم رەنگە ﴿قَالَ﴾ فەرموی: ﴿فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيۡهِمۡۛ أَرۡبَعِينَ سَنَةٗۛ﴾ بەڕاستی ئەو خاکە پیرۆزە قەدەغە کراوە لەسەریان و بەرگری کراوە لێ یان ماوەی چل ساڵ، وە بێبەش کراون لێ ی بەم رەنگە ﴿يَتِيهُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ بە سەرگەردانی ئەگەڕێن و ئەخولێنەوە لە چۆڵ و بیابانی زەوی دا. وا دەرئەکەوێ و رای بەهێز لەسەر ئەوەیە کە ئەو چینەی بێبەش کرد لەو خاکە پاك و پیرۆزە و لەو ماوەیەدا ئەوان مردن و چین و گەلێکی تازە پێگەیشت، کە تەمێ خوار بوون لە چینەکەی پێشیانەوە، کە ئەوان – بەهۆی ژیانی زەبوونی و کۆیلەیی یەوە کە چەشتیان و بەسەریان برد لە چەرخی فیرعەون – تێك چوو

بوون و کەڵکیان نەمابوو، شیاوی ئەوە نەبوون کە ببن بە هەڵگری ئاڵای خوا. لەبەر ئەوە خوا ئەوانی لابرد و چینی تازەی شیاو و بەکەڵکی هێنایە جێ یان.(مقاتل) ئەفەرموێ: حەزرەتی موسا بەزەیی هاتەوە بە گەلەکەی دا لەبەر ئەوە پەشیمان بوو لەو نزایەی کە کردی، ینجا خوا پێی فەرمو: ﴿فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ﴾ ئینجا داخ مەخۆ و غەمبار مەبە لەسەر ئەو گەلە کە لە فەرمانی خوا دەرچوون، واتە ئەوانە شایستەی ئەو تۆڵە و سزان، کەواتە غەمبار مەبە و داخیان بۆ مەخۆ. ئینجا ئایا موسا و هارون(علیە السلام) لەگەڵ ئەو گەلەدا بوون لەو چۆڵ و بیابانەدا، بەڵام خوا کارەکەی لەسەر ئەوان سووك و ئاسان کرد، هەرچۆنێ ئاگری سووك و سارد کردەوە لەسەر ئیبراهیم(علیە السلام) یان لەگەڵیان نەبووبن؟ لەسەر باری یەکەم لەو ماوەدا وەفاتیان کردبێ، یان مابنەوە هەردووکیان یان هەر موسا تا پاش ئەو ماوەیە؟ ئەمانە و چەند شتێ تر وتران بە چەند ریوایەتێك، بەڵام هیچ کام لەوانە مەبەستێکی سەرەکی پەیوەندی نی یە پێ یەوە، هیچ پەند و تەمێ یەکی داستانەکەیان تیا نی یە، کەواتە با خۆمان خەریك نەکەین بەو جۆرە شتانەوە، بێجگە لەوەش ئەوەندە ئیسرائیلیات زۆرە لەم جۆرە شوێنانەدا دڵنیا نین لەسەر راو بارێك کەواتە هەرچاك وایە بێ دەنگ بین و زیاد لە قورئانەکە و ئەوەی لێ ی وەرئەگیرێ هیچ نەڵێین.

موسڵمانەکان پەند و تەمێ یان وەرگرت لەم داستانە، ئەوەبوو کاتێ کە بە کۆمەڵێکی کەمەوە وەستاون بەرامبەر لەشکری بەهێزی قورەیش، وتیان بە پێغەمبەر(ص) ئێمە ناڵێین بە تۆ وەك ئیسرائیلی یەکان وتیان بە موسا:(برۆ تۆ و خواکەت جەنگ بکەن، ئێمە لێرەدا دائەنیشین. بەڵکو ئێمە ئەڵێین: برۆ و تۆ و خواکەت جەنگ بکەن بێگومان ئێمەش لەگەڵتان جەنگ ئەکەین لەگەڵ دوژمن). ئینجا داستانێك ئەمێنێ کە پەیوەندی هەیە لە چەند بارێکەوە بە ئایەتەکانی پێشی یەوە:

١- لە پێشەوە زانرا کە هۆی بەهێز لە دوژمنایەتی جوولەکە و بڕوا نەهێنانیان حەسادەت بوو، ئینجا لەم داستانەدا دەرئەکەوێ کە حەسادەت شتێکە هەر لە کۆنەوە دامەزراو بووە لەناو تیرەی ئادەمی دا، کەواتە با سەر سوڕ نەمێنێ لە جوولەکە کە دوژمنایەتی و حەسادەتی بەتینیان هەبووە، وە لەم داستانەدا دڵنەوایی پێغەمبەر ئەکات(ﷺ).

٢- له پێشەوە فەرموی بە نامەدارەکان: ئەم پێغەمبەری ئێمەیە بە روونی باسی زۆر شتیان بۆ ئەکات کە لە نامەکەتان دا هاتبوو و ئێوە شاردبووتانەوە، دەی ئەم داستانە یەکێکە لە نهێنی یەکانی تەورات.

٣- پەیوەندی هەیە بەم باسەی کە گێڕایەوە لە حەرزەتی موساوە، لەم رووەوە کە ئەیکات بە سەرەتا بۆ باسی دەست درێژیی یەکانی ئیسرائیلی یەکان کە لەمەولا باسیان ئەکات.

٤- ئەم داستانە پەیوەستە بەو قسە و لافەی کە ئیسرائیلی یەکان لیێ یان ئەدا و ئەیان گوت ئێمە کوڕ و خۆشەویستی خواین. ئەو لافەیش بەهۆی ئەوەوە بوو کە نەسەب و نەژادی پاکیان هەبوو، کەواتە ئەم داستانە دەم کوتیان ئەکات کە ئەو کوڕی ئادەمە باوکێتی ئادەم هیچ سوودی پیێ نەگەیاند لە کاتێك دا کە خۆی خراپ بوو و لای دا لە رێگە و رێبازی باوکی. بێجگە لەمانە چەند شتێکی تر هەیە کە زانایانی تەفسیر فەرمویانە لەبارەی پەیوەندی ئەم داستانە بە ئایەتەکانی پێش و پاشیانەوە، بە پێویستی نازانم باسیان بکەم و بەم چوار شتە کۆتایی ئەهێنم و باسی ئەوانی تر ناکەم، ئەم داستانە دوو نموونە لە ئادەمی نیشان ئەدا:

یەکەم: نموونەی سروشتی شەڕو دەست درێژیی و دوژمنایەتی یەکی ئاشکرا و بیێ هۆ و بیێ جیێ.

دووەم: نموونەی سروشتی خێرو چاوپۆشی و ئاشتی و بیێ زیانی، ئەو دوانە بەرامبەر یەك ئەوەستێنیێ، هەرکام لە پیێی سروشتی خۆی رەفتار ئەکات و ئەجولێتەوە، شێوەو نەخشەی یەکەم ئەکێشیێ بە جۆریێ هەست و دەروون دائەچڵەکێنیێ و بێداری ئەکاتەوە بە پێویستی بوونی یاسا و شەریعەتیێ کە بەرگری ئەو نموونە بەدە بکات و دەستی ببەستیێ لە دەست درێژیی کردن، ئەگەر هەڵسا بە تاوان و دەست درێژیی یەکەی تۆڵەی رێك و پێکی خۆی وەرگریێ، هەرچۆنیێ پارێزگاریی نموونەی خێرو ئاشتی بکات و بەرگریی دەست درێژیی لیێ بکات، چونکە نموونەی ئاوا مافی ژیان و مانەوەی هەیە بە بیێ باك و لە سایەی شەریعەتێکی راست و دادپەروەردا.

**ئینجا با گوێ شل کەین بۆ قورئان ئەو داستانە گرنگە بدا بە گوێچکەماندا، ئەفەرموێ:**

﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱبۡنَيۡ ءَادَمَ بِٱلۡحَقِّ﴾ **ئەی پێغەمبەر بخوێنەرەوە بەسەر نامەدارەکان دا، یان بەسەر ئوممەت دا بە تێکڕایی بە بڕوادار و بێ بڕوایەوە، هەواڵە گرنگەکەی دوو کوڕەکەی ئادەم بە خوێندنەوەیەك کە هەق و ڕاستی دەرئەخات، یان هەواڵێ کە هەق و ڕاستە و هەق و ڕاستی پێ یە. کۆمەڵ و جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن کە ئەم دووانە کوڕی تەواوەتی ئادەمن، نەك لە کوڕەزا و نەوەی بن، ناوی دەست درێژیی کەر(قابیل) ەو دەست درێژیی لێ کراو(هابیل)، هۆی ئاژاوە و دەست درێژیی کردنی قابیل حەسادەت بووە. لەسەر وەرگرتنی قوربانی یەکەی هابیل و وەرنەگرتنی قوربانی یەکەی خۆی. یان حەسادەتی ئەوەی کە خوشکەکەی کە جوان بووە بدرێ بە هابیل و خوشکی هابیل کە جوان نەبووە بدرێ بەم کە لەو کاتەدا لەبەر ناچاریی خوشکی هەرکەسێك مارە کراوە لە برای هەرکەسێکی تر، وەك بە درێژیی ئەو باسە هاتووە لە چەند ریوایەتێك دا کە چاکتر وایە پشت نەبەستین بەو ریوایەتانە، چونکە ئەو ریوایەتانە رێکن لەگەڵ ئەوەی کە لە چەرخی کۆنی ئیسرائیلی یەکان دا هاتووە، کەواتە دڵنیا نین کە سەرچاوەی ئەم ریوایەتانە ئەو ئیسرائیلی یەتانە نەبن کە ئیسرائیلی یانیش جێگەی بڕوانین بەپێی حەدیس و بڕیاری زانایانی ئوممەت، لەبەر ئەوەی کە بە ئاشکرا درۆ و دەلەسەی زۆریان تێکەڵ کراوە، تاقانە حەدیسێکی سەحیح کە هاتبێ لە ئیسلام دا لەبارەی ئەو داستانەوە ئەمەیە کە ئیمامی ئەحمەد لە موسنەدەکەی دا هێناویەتی لە(ئیبن و مەسعود) ەوە، هەروەها لە چەند رێگەیەکی ترەوە هاتووە کە(ئیبن و مەسعود) ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: هەرکەسێك بە ناهەق بکوژرێ بەشێك لە خوێنەکەی لەسەر یەکەم کوڕی ئادەمە، چونکە ئەو یەکەم کەسێکە کە کوشتنی داهێنا، لەم حەدیسەدا هیچ درێژەیەکی نەداوە بە هیچی تر، کەواتە با ئێمەیش هیچی تر نەڵێین بێجگە لەوەی کە قورئانەکە نیشانی ئەدا، بەس لەم حەدیسە سەحیحەدا وا وەرئەگیرێ کە ئەو رووداوە زۆر کۆنە و لە کاتی سەرەتای هاتنی ئەم ئادەمی یەدا رووی داوە، ئەوە یەکەم کوشتن بووە، بکوژەکە هێشتا نەیزانیوە مردوو چی لێ ئەکرێ و چۆن ئەشاردرێتەوە. کەواتە با پشت نەبەستین بەو راو ریوایەتانە هەرچۆنێ پشت نابەستین بەو رایەی کە ئەڵێ ئەو دووانە دوو پیاو بوون لە ئیسرائیلی.**

إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ ٱلْءَاخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَىَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِى مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٍ يَدِىَ إِلَيْكَ لِأَقْتُلَكَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ إِنِّىٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثْمِى وَإِثْمِكَ فَتَكُونَ

---

فەرمودەی: بخوێنەرەوە بەسەریان دا هەواڵی دوو کوڕەکەی ئادەم ﴿إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا﴾ هەواڵ و داستانی ئەو کاتەی کە ئەو دووانە قوربانی یان کرد، واتە هەرکام کردەوەیەکیان کرد کە خواپەرستی بوو و مایەی نزیك بوونەوە بوو لە خواوە، ئیتر سەربڕینی ماڵاتێك بووبێ، یان هەر خێرو سەدەقەیەك، ﴿فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا﴾ ئینجا ئەو قوربانی یە لە یەکێکیان وەرگیرا، چونکە لەخوا ترس بوو، هەر لەبەر خوا کردی بە خۆشی و پێخۆش بوونی دڵەوە، ﴿وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ ٱلْءَاخَرِ﴾ لەوی تر وەرنەگیرا، چونکە ئەم وەك ئەوی تر نەبوو و خوای خۆی ئاگادارە بە هەموو شتێ و بەندەی خۆی ئەناسێ، ریوایەت کراوە لە(ئیبن و عەباس و ئیبن و عومەر) و کەسانی ترەوە کە یەکەم خاوەن گەلە و ماڵات بووە، باشترین و قەڵەوترین و جوانترینی کرد بە قوربانی، بە سۆز و خۆشی دڵەوە. ئەویتر خاوەن کشت و کاڵ بوو، بێ کەڵك و بێ فەڕترینی کشت و کاڵەکەی کرد بە قوربانی، بە بێزاری و پێ ناخۆش بوونەوە، ئینجا بە هەر هۆیەك بوو - کە قورئان باسی ناکات - بۆیان دەرکەوت ئەو وەرگرتن و وەرنەگرتنە، لەبەر ئەوە وەرنەگیرا و ﴿قَالَ﴾ وتی: ﴿لَأَقْتُلَنَّكَ﴾ سوێند بەخوا ئەتکوژم!!

ئا بەو جۆرە هەڕەشە ناڕەوا و ئەو قسە بێ جێ یەی کرد کە هیچ هۆیەکی نی یە بێجگە لەو هەستە بۆگەنە، هەستی حەسادەت، کە هەر لە دڵ و دەروونی پیس و بۆگەن دا جێگیر ئەبێ. ئینجا با گوێ بگرین و بیر بکەینەوە لە وەڵام و کردەوەی برا دڵ پاك و لە خوا ترسەکە بەرامبەر ئەو نیازو هەڕەشە پیسەی کە برا دڵ پیس و لە خوا نەترسەکەی کەدی.

ئەم لەخواترسە ﴿قَالَ﴾ وتی پێی: ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ﴾ خوا هەر لە خوا ترسەکان و خۆپارێزەکان کردەوەی چاك وەرئەگرێ، واتە وەرنەگرتنی قوربانی یەکەی تۆ هیچ دەسەڵات و تاوانێکی منی تیا نی یە، کەواتە تۆ نابێ خەشم لە من هەڵگری، واتە سوچی وەرنەگرتنەکە لەلایەن خۆتەوەیە، بەڵام بەو جۆرو شێوە نەرم و ناسکە پێی ڕاگەیاند، بە

جۆرێ نەیوت کە هەست و دەروونی زامدار بکات. ئینجا هەر بەوە کۆتایی نەهێنا، بەڵکو وتەیەکی ئاراستە کرد ئەبوایە شەرم بیگرتایە و هیچ نیازێکی بەد لە دڵیا نەمایە، بەڵام نەخۆشی حەسادەت مەگەر هەر خوا چارەسەری بکات. ئەم برا دڵپاکە وتی: ﴿لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقۡتُلَنِي﴾ سوێند بەخوا ئەگەر تۆ دەستت راکێشی و دەستت درێژ بکەیت بۆلای من بۆ ئەمەی بم کوژی ﴿مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٖ يَدِيَ إِلَيۡكَ لِأَقۡتُلَكَ﴾ من نیم بە راکێشەری دەستم بۆلای تۆ بۆ ئەوەی بت کوژم. واتە کاری من و نیازی من ئەوە نی یە و شتی وا بە دڵم دا نایە، چونکە ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ بەڕاستی من ئەترسم لە خوا کە پەروەردگاری هەموو جیهانی یانە، واتە دەست رانەکێشانەکەم لەبەر بێ دەسەڵاتی نی یە، بەڵکو لەبەر لە خوا ترسانە، وا دەرئەکەوێ کە مەبەستی زیادە تەمێ و جڵەوگیریی براکەی بێت لەو تاوانە گەورەیە، وەك پێی گوتبێ: لە کاتێك دا کە تۆ خەریکی کوشتنی من بیت، من هێشتا لە ترسی خوا ناوێرم تۆ بکوژم و بەرگریت بکەم چ جای ئەوەی کە بە ناهەق بمەوێ بت کوژم، یان وەك(مجاهد) ئەفەرموێ: لەو شەریعەتەدا دروست نەبووبێ بە کوشتن و بەرگریی کوشتن بکرێ، یان مەبەستی ئەوە بوو وەك(ئیبن و عەباس) و چەند کەسی تر ئەفەرمون: ئەگەر تۆ بە ستەم و بە ناهەق دەست درێژ بکەیت بۆلای من، من بە ستەم و ناهەق دەست درێژ ناکەم، بەهەرحاڵ ئەم ئایەتە هیچ گرێ ی تیا نی یە و کردەوەی ئەو لە خوا ترسە جێی رەخنە و قسەو باس نی یە، پێویست نی یە بە هێنانی چەند وەڵامێکی تر کە زانایانی تەفسیر لەو شوێنە فەرمویانە، ئینجا هەمیتر کوشتنی ناهەقی لەبەرچاو بێزراو و ناشیرین کرد، ترساندی بە خەشم و تۆڵەی خوا لەسەر کوشتنی ناهەق، فەرموی: ﴿إِنِّيٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثۡمِي وَإِثۡمِكَ فَتَكُونَ﴾ بەڕاستی بەمەی کە دەستت بۆ درێژ ناکەم ئەمەوێ کە تۆ بگەڕێیتەوە بۆلای خوا بە گوناهی من و بە گوناهی خۆتەوە و هەردوو بارەکە هەڵگری، واتە گوناهی کوشتنەکەی من و ئەو گوناهەی کە لە پێش من بەسەرتەوە بووە، وەك(ئیبن و عەباس و ئیبن و مەسعود و حسن و قتادة) ئەفەرمون – خوا لێ یان رازی بێت –، یان بە گوناهی کوشتنەکەی من و ئەو گوناهەی کە لەسەرت بوو، بە هۆی ئەوەوە خوا قوربانی یەکەی وەرنەگرتی، وەك(زجاج) ئەفەرموێ. بە سێ جۆری تریش ئەم فەرمودەیە تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام ئەم دووبارو جۆرەم باس کرد، چونکە خاوەنی ئەم دوو رایە بەهێزتر و زیاد تر جێگەی بڕوان لەناو زانایان دا.

مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَطَوَّعَتۡ لَهُۥ نَفۡسُهُۥ قَتۡلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُۥ فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٣٠﴾ فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابٗا يَبۡحَثُ فِي ٱلۡأَرۡضِ

لەسەر هەر بار وتی: من ئەمەویٚ تۆ ئەوەت بەسەر بیٚ ﴿مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِۚ﴾ تا بەهۆی ئەوەوە تۆ یەکیٚ بیت لە هاوەڵ و نیشتەجیٚی ئاگر، واتە من نامەویٚ تۆ ئەو گوناهە گەورەیە بکەیت و حەز و ئارەزووم لەسەر ئەوە نی یە، بەڵام ماتووڵ ئەم کوشتنە رووبدا لەلایەن یەکێکمانەوە، دەی من نایکەم با تۆ بیکەیت و ببی بە هاوەڵی ئاگر و من نەبم، ﴿وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ئەو هاوەڵێتی و نیشتەجیٚی ئاگرە تۆڵەی ستەمکارانە. بێگومان ئەو برا موسڵمانە لەخوا ترسە هیچی تێدا نەهێشتەوە و ئەوەی لەدەستی هات بەکاری هێنا بۆ گەڕانەوەی برا خراپەکەی لەو تاوانە گەورەیە، بەڵام سروشتی بەدو لار هیچ شتێك کاری لیٚ ناکات، لەبەر ئەوە هەر وازی نەهێنا وەکو ئەفەرمویٚ: ﴿فَطَوَّعَتۡ لَهُۥ نَفۡسُهُۥ قَتۡلَ أَخِيهِ﴾ ئینجا نەفسی ئەو تاوانبارە هانی داو کوشتنی براکەی ئاسان کرد بۆی و لە پێش چاوی شیرینی کرد، واتە ئەو کوشتنە هەرچەند زۆر سەخت و یاخی بوو، پاڵدەر و بەرگری کەر زۆر بوو بۆ نەکردنی، بەڵام نەفسی بەدی ئەو کوشتنە یاخی یەی بۆ مۆچان و ئاسانی کرد. هەر کۆست و گریٚ و بەرکەرێکی دەروونی هەبوو ﴿فَقَتَلَهُۥ﴾ ئینجا کوشتی ﴿فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ بەهۆی ئەوەوە گەڕا بە یەکیٚ لە زیانباران و چووە ریزی ئەوانەوە، زیانبار و خەسارەت مەندی هەردوو جیهان، لە جیهان دا نەگەیشت بە ئامانج، بێزراو و خەشم لیٚ گیراو و نەفرین لیٚ کراو بوو لەلایەن مەردومانەوە، لە رۆژی دواییش دا شایستەی ئاگری بڵێسەداری دۆزەخ بوو بە بەش براوی و نەفرین لیٚ کراویی، بە جۆریٚ کە بەشدار بێت لە هەر کوشتنێکی ناهەق دا سەرباقی تۆڵەی ئەو کوشتنە گەورەیە کە کردی!!

ئەو بەد بەختە ئەو کردەوە بەدەی کرد و ئەو برایەی بە بیٚ گیان کەوتە سەر زەوی، بێگومان لەشی مردوو بە تایبەتی کە کوژراو بێت زۆر شێوەیەکی بێزراو و سامناکە. ئەو تاوانبارەش نەیئەزانی مردوو چی لیٚ ئەکریٚ و چۆن لە پێش چاو نەمێڵریٚ، چونکە لەوەو پێش شتی وای نەدیبوو، ﴿فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابٗا يَبۡحَثُ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ لەبەر ئەوە خوا قەلەڕەشەیەکی نارد کە بەرە بەرە زەوی یەکەی هەڵئەدایەوە و چاڵی هەڵئەکەند،

لِيُرِيَهُۥ كَيْفَ يُوَٰرِى سَوْءَةَ أَخِيهِ ۚ قَالَ يَٰوَيْلَتَىٰٓ أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَٰذَا ٱلْغُرَابِ فَأُوَٰرِىَ سَوْءَةَ أَخِى ۖ فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلنَّٰدِمِينَ ﴿٣١﴾ مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِى ٱلْأَرْضِ

---

**﴿لِيُرِيَهُۥ كَيْفَ يُوَٰرِى سَوْءَةَ أَخِيهِ﴾ بۆ ئەوەی نیشانی بدات و فێری بکات کە چۆن لەشی براکەی بشارێتەوە، واتە – وەك لە ریوایەتیش داهاتووە – بە فەرمانی خوا ئەو قەلە رەشە هات قەلە رەشێکی تری کوشت، یان لەشی قەلە رەشێکی بێ گیانی پێ بو، یا لەوێ دا لەشێکی دەست کەوت وبینی، ئینجا ئەو چاڵەی هەڵکەند بە دەنووك و قاچەکانی، لە پاشان لەشی قەڵە رەشەکەی خستە ناو چاڵەکە و خۆڵەکەی دایەوە بەسەری دا، ئیتر ئەو هەڵکەندن و داشاردنە بە پێی باوی قەلە رەشان بووبێ کە لەشی مردووی خۆیان ئەشارنەوە، وەك هێندێ وا ئەڵێن، یان ئەوە شتێکی پێچەوانەی باو بووبێ و خوا لەوێ دا بەو قەلە رەشە کردبێتی، بەهەرکام جێگەی سەرسوڕمان نی یە، بەهۆی ئەو کردەوەوە ئەو تاوانبارە حاڵی بوو، لەو قەلە رەشە فێر بوو کە مردوو چی لێ بکرێ، وەك دەرئەکەوێ کە ﴿قَالَ﴾ وتی: ﴿يَٰوَيْلَتَىٰٓ﴾ ئای داخی سەختم، ئەی مەرگ و لەناو چوون بێ بۆلای من، ئامادەم بە، ئەمە کاتی هاتنی تۆیە، ﴿أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَٰذَا ٱلْغُرَابِ﴾ ئایا من دەستە پاچە بووم لەوەی وەك ئەو قەلە رەشەبم ﴿فَأُوَٰرِىَ سَوْءَةَ أَخِى﴾ ئایا من دەستە پاچە و نەزان بووم لەوەی تەرم و عەورەتی براکەم بشارمەوە؟! ئایا من کەمتر بووم و نەفام تر بووم لە قەلە رەش؟!! واتە بەڵێ زۆر بەداخەوە من لەو قەلە رەشە کەمتر بووم، ﴿فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلنَّٰدِمِينَ﴾ ئینجا گەڕا بە یەکێ لەوانەی کە پەشیمانن لە کردەوەی خراپی بێ سوودی خۆیان، چووە ریزی ئەوانەوە، ئەو پەشیمانی ئەوە لەبەر ئەوە نەبوو کە کارێکی گوناهی کرد و ئەبێ بگەڕێتەوە بۆلای خوا، بەڵکو ئەوە پەشیمانی یەکی سروشتی یە کە هەرکەس کارێکی نارەوا بکات و بزانێ هیچ خێری تیا نی یە و دووچاری نارەحەتی و زەحمەت ببێ تیای دا، ئەو کەسە زۆر پەشیمان ئەبێتەوەو زۆرجار لەوانەیە مەرگی خۆی بە ئاوات ئەخوازێ و هیچ لەبەر خوایش نی یە، بێگومان پەشیمانی وا نابێ بە تۆبە و گەڕانەوە بۆلای خوا، یان پەشیمانی یەکەی لەسەر ئەوە بوو کە**

ماوەیەك – وەك لە ریوایەت دا هاتووە – تەرمی براکەی بە کۆڵی یەوە بوو، چونکە نەی ئەزانی چی لێ بکات تا لەو قەلە رەشەوە فێربوو، کەواتە پەشیمانی یەکەی لەسەر ئەرکی ئەو هەڵگرتنە بوو، داخ و مەراقی ئەوە بوو کە رێی نەبرد بەو چارەسەرەی کە لە قەلە رەشەکەوە فێر بوو، بێگومان لە داستانەکەدا دەست نیشانی کرد بەوەی کوشتنی ناهەق تاوانێکی زۆر بەدو گەورەیە، مایەی زیانباریی هەردوو جیهانە، هۆی پەشیمانی و ئێش و ئازاری دڵ و بێ ئارامی دەروونە، شتێکی ئاشکرایشە کە ئەو یەکەم کوشتن و تاوانە گەورەیە لە حەسادەتەوە پەیدا بوو، بێگومان ئادەمیزاد – بێجگە لەوانەی خوا پاراستوونی – بەشدارە لەو سیفەتە بەدەدا، کەواتە چاوەڕوانی ئەکرا، بۆ دووبارە بوونەوەی ئەو تاوانە گەورەیە و بڵاوبوونەوەی لەناو هەموو چینەکانی ئادەمی دا، بە تایبەتی تیرەی جوولەکە و ئیسرائیلی یەکان، کە یەکەم و سەردەستەن لەو سیفەتەدا، بەهۆی بەهێزیی ئەو سیفەتە تیایان دا بڕوایان نەهێنا و ئەو هەموو ناهەقی و دوژمنایەتی یەیان بەکارهێنا لەگەڵ پێغەمبەر(ص) و لەگەڵ قورئان و ئیسلام و موسڵمانان دا، لەگەڵ ئەوەی کە بە باشی لایان روون بوو کە خۆیان لەسەر ناهەقن، وەك قورئان ئاگادارمان ئەکات بە هەموو ئەوانە، جا لەبەر ئەو هۆیانە کە باس کران، لەبەر ئەوەی تەمێ و ئامۆژگاری و ترساندن سوودیان نی یە و کار ناکەن لەوانەی کە بە سروشت بەدو خراپەکار و دەست درێژیی کەرن، بێگومان پێویستیشە پارێزگاری چاکان و پاکان، لەبەر هەموو ئەوانە بەم جۆرو شێوە سامناکەی کە دێت توندو تیژیی بەکار هێنرا لەلایەن خواوە دەربارەی کوشتنی ناهەق و بکوژان، بە تایبەتی باسی ئیسرائیلی کرا و ئەو تۆڵە سەخت و هەڕەشە گەورەیان لەسەر نووسرا لە تەوراتدا، وەکو ئەفەرموێ: ﴿مِنۡ أَجۡلِ ذَٰلِكَ﴾ هەر لەبەر ئەوەی کە لەو داستانەدا باس کرا و وەرگیرا، وەك روونمان کردەوە ﴿كَتَبۡنَا عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ بڕیارمان دا و نووسیمان لەسەر ئیسرائیلی یەکان ﴿أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفۡسَۢا﴾ کە بڕیار ئەمەیە هەرکەسێك تەنیا کەسێك بکوژێ ﴿بِغَيۡرِ نَفۡسٍ أَوۡ فَسَادٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ کەسێکی بە ناهەق کوشتبێ، یان خراپەکاری و ئاژاوەی نابێتەوە لە وڵات دا کە مایەی کوشتنی بێت وەك هاوبەش دانان بۆ خوا یان رێ گرتن و دەست درێژیی کردن بۆ سەر مەردومان،

فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًاۚ وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ ﴿٣٢﴾

---

**هەرکەسێك کوشتنی ئاوا ناهەق بکات ﴿فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا﴾ وەك هەموو ئادەمی ی کوشتبێ وایە، بێگومان مەبەست ئەوە نی یە کە رادەی گەورەیی گوناهی کوشتنی تەنیا کەسێك بە ناهەق یەکسانە لەگەڵ رادەی گوناهی کوشتنی هەموو کەس دا بە ناهەق، بەڵکو مەبەست ئەوەیە: کوشتنی تەنیا کەسێك وەك کوشتنی هەمووانە لە یەکێ لەم بارانەوە کە زانایان فەرموویانە:**

**١- کوشتنی هەرکەسێك بە ناهەق دەست درێژیی یە بۆ سەر ژیان و مافی ژیانی ئەو کەسە، ژیان و مافی ژیان بۆ هەمووانە، کەواتە دەست درێژیی یەکە روو ئەکاتە ئەو شتەی کە مافی هەمووانە و بۆ هەمووانە.**

**٢- لە پێویستی بەرگری کردن دا، واتە هەرچۆنێ پێویستە و فەرزە بەرگریی دەست درێژیی لە هەموو، هەروەها پێویستە و فەرزە بەرگریی دەست درێژیی لە تەنیا کەسێکیش.**

**٣- هەرکەسێك ئەو کوشتنە ناهەقە بکات ئەبێ هێزی ئارەزوو خەشمی زاڵ بووبێ بەسەری دا، کەواتە ئامادەیە بۆ کوشتن و دەست درێژیی یە دەربارەی هەرکەسێکی تریش هەر کاتێ ئەو هێزە زاڵ ببێ بەسەریدا.**

**٤- کوشتنی تەنیا کەسێك بە ناهەق سەرکێشی و یاخی بوونە لە خوا، مایەی خەشم و سزادانی خوایە بۆئەو بکوژە، مافی کوشتنەوەی، هەرچۆنێ هەمووانیش ئەوانەی تیایە.**

**هەر بە پێی ئایین و شەریعەتی خوا ئەبێ ئەوپەڕی یەکێتی ببێ لەناو هەموو ئادەمی دا، تا رادەیەك وەك یەك لەش و جەستە بن، ئەو کاتە بێگومان دەست درێژیی بۆ سەر هەر ئەندامێکی دەست درێژیی یە بۆ سەر هەموو. ئینجا هەر بەم پێ یە و بەرامبەر ئەم بارانەی کە باس کران، ئەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَحْيَاهَا﴾ هەرکەسێك ئەو کەسە بێ تاوانە زیندوو بکاتەوە، واتە بەرگریی بکات لە گیان و ژیانی و رزگاری بکات لە هەر شتێ کە مایەی لەناوچوون و مردنی یەتی ﴿فَكَأَنَّمَآ أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًا﴾ وەك هەموو ئادەمی زیندوو کردبێتەوە وایە، ئەم داستانە و ئەم ئایەتەی کە بەدوای دا هات. چەند گرێ و قسە و باسێك هێنراون تیایان**

دا وەك دەرئەكەوێ بۆ هەر كەسێك كە تەماشای كتێبەكانی تەفسیر بكات. لەپاش لێكۆڵینەوەیەكی دوورو درێژ لە فەرمودەی ئەو زانایانەدا، تەفسیرەكەیانم بە جۆرێ كرد كە رێك و پێكی لەگەڵ رای زۆربەو باوەڕ پێ كراوان دا، سوپاس بۆ خوا! بە جۆرێ هات كە ئەو گرێ یانە بكاتەوە و بەرگری ئەو قسە و باسانە بكات.

ئینجا ئایا ئەو ئیسرائیلی یانە بەو توند و تیژیی و بڕیارە گرنگە كۆتایی یان هێنا بە خراپەكاری، تەمێ و ئامۆژگاری خوایان وەرگرت؟ ئەوا قورئان ئەویشمان بۆ باس ئەكات.

ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ سوێند بەخوا فروستادەكانمان هات بۆلایان بە ئایەتە روونەكانەوە كە بە باشی روونیان كردەوە بۆیان ئەوەی نووسرا بوو لەسەریان. یان هاتن بە موعجیزەو بەڵگە روون ئەكاتەوە، ﴿ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ﴾ كەچی لە پاش ئەوە بێگومان زۆر لەوانە زیادەڕەویی یان كرد لە وڵات دا بە ناهەقی و كوشتنی ناهەق، بەبێ ئەوەی گوێ یان ببێ لەو تاوانە گەورانە و بترسن لە تۆڵە و سزا سەختەكەیان.

ئەوانە ئەوپەڕی رادەیان گرت لە زیادە رەوی لە تاوان و ناهەقی دا، ئەوانە زیادە رەوی یان كرد بە شكاندنی سنوورەكانی خوا، بە دەستكاری كردن و گۆڕاندنی نامەی خوا، كوشتنی پێغەمبەرەكان و رێ نیشاندەرەكانیان!!

لە ئایەتەكانی رابردوودا خراپەكاریی لە وڵات دا و رێ گرتن و ئاژاوە نانەوەی كرد بە هاوسەری كوشتنی ناهەق، هەركامی كرد بەهۆی رەوادانی كوشتن. ئەوەش لەبەر ئەوەیە كە پێویستەوناچاریی هەیەبەپاراستنی ئەمن وئاسایشی گشتی لە وڵاتی ئیسلام دا، پارێزگاری یاسا و رژێمی ئیسلام كە گەل و كۆمەڵ لە سایەی دا بە سەربەستی بحەوێنەوە، هەڵسێ بە كاروباری پێویستی خۆی بە ئارام و ئاشتی، پاراستنی ئەوانە پێویست ترە لە پاراستنی ئەوانە، كەواتە هەركەسێك و هەر تاقمێك بیەوێ ئەو ئاسایشە گشتی یە نەمێڵێ و سنووری ئەو یاسا و رژێمە بشكێنێ، بێگومان ئەو كەسە و ئەو تاقمە زۆر پیس و بەدو خراپن، پێویستە لە ریشە بهێنرێن ئەگەر نەگەڕێنەوەو تەوبە نەكەن، جا ئەوا لەم ئایەتەدا تۆڵە و سزای ئەوانە دیاریی ئەكات كە لە شەریعەتی ئیسلامدا پێی ئەگوترێ(حد الحرابة)،

إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسْعَوْنَ فِي ٱلْأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوْ يُصَلَّبُوٓاْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَٰفٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ ٱلْأَرْضِ ۚ ذَٰلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَهُمْ فِي ٱلْـَٔاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٣٣﴾

**ئەفەرموێ:** ﴿إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسْعَوْنَ فِي ٱلْأَرْضِ فَسَادًا﴾ **بەڕاستی ئەوانەی کە جەنگ و دوژمنایەتی ئەکەن لەگەڵ خوا و پێغەمبەرەکەی یاخی بوون و پێچەوانە کردنی فەرمان و بڕیارەکانیان، تێکۆشان ئەکەن لە وڵات دا بە چەتەیی و ڕێگرتن و خراپەکاری، بەڕاستی تۆڵەی ئەوانە هەر یەکێکە لەم چوارە:**

**١- ﴿أَن يُقَتَّلُوٓاْ﴾ بکوژرێن، بە کوشتنێکی راستەقینە بەم ڕەنگە واز نەهێنرێ لە کوشتنەکەیان نە بە لێ بوردن و نە بە ڕازی بوون بە وەرگرتنی خوێن لێ یان. چونکە کوشتنەکەیان بە حەدێکی شەرعی یە و ئەبێ هەر جێ بەجێ بێت.**

**٢- ﴿أَوْ يُصَلَّبُوٓاْ﴾ یا هەڵبواسرێن بە داردا، چاك وایە کە لە ڕێ و بان و شوێنی گوزەر کردنی مەردومان دا بێت بۆ تەمێ خواریی هەرکەسێك کە نیازی خراپەکاری ببێ.**

**٣- ﴿أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَٰفٍ﴾ یان دەست و قاچیان ببڕێ بە پێچەوانە، واتە دەستی ڕاست و قاچی چەپیان.**

**٤- ﴿أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ ٱلْأَرْضِ﴾ یان دوور بخرێنەوە لە وڵات، واتە بکەونە سەریان لەم شار بۆ ئەو شارو هەر بە دوایان دا بگەڕێن هەتا لە ترسان تۆبە ئەکەن و ئەگەڕێنەوە بۆ ڕێگەی خوا. زۆربەو شافیعی لەسەر ئەوەن. هێندێ ئەفەرمون: دوور ئەخرێنەوە بۆ شارو وڵاتێك با نزیکیش بێت، هێندێ تر ئەفەرمون: بۆ وڵاتی زۆر دوور. حەنەفی یەکان ئەفەرمون: بەند ئەکرێ. لەناو زانایانی ئیسلام دا دووبەرەکی هەیە: ئایا ئەم تۆڵەیانە خراونەتە ڕاو بڕیاری کاربەدەست و هەرکام بە کاری بهێنێ ڕێی هەیە؟ هێندێ لە زانایان لەسەر ئەمەن. بەڵام زانایانی مەزهەبی حەنەفی و شافیعی و ئەحمەد ئەفەرمون: هەر تۆڵەیەك دانراوە بۆ تاوانێکی تایبەتی، بەم شێوە کە باسی ئەکەین. هەرکەس هەر کوشتنی کردبێ و ماڵی نەبردبێ تۆڵەی هەر کوشتنە. هەرکەس هەر ماڵی بردبێ تۆڵەی**

هەر دەست و قاچ بڕینە. هەرکەس هەردوو تاوانەکەی کردبێ ئەکوژرێ و هەڵئەواسرێ، ئیتر بە زیندوویی و لە پێش کوشتن دا و چاروبار لێ ی بدرێ هەتا ئەمرێ وەك هێندێ لەسەر ئەوەن. یان لەپاش کوشتن هەڵئەواسرێ ڕۆژێ یان سێ ڕۆژ یان ماوەیەکی زۆر وەك بەو جۆرە دووبەرەکی تێدا هەیە، هەرکەس ترس و ئاژاوەی نابێتەوە لە وڵات دا بە بێ کوشتن و ماڵ بردن، ئەوا دوور ئەخرێتەوە بەو شێوەی کە باسمان کرد. بەلای ئیمامی مالیکەوە ئەگەر کەسیان کوشت ئەبێ هەر بکوژرێ ئیتر هەڵیش بواسرێ یان نەء. ئەگەر ماڵی برد تۆڵەی یا کوشتنە یان هەڵواسین یان ڕاست و چەپ بڕین. ئەگەر ترس و بێ ئارامی خستە وڵات بە هەرکام لەو چوارە تۆڵە ئەدرێ بە پێ ی هەڵبژاردنی کاربەدەستی موسڵمان، ئیتر کاربەدەست خۆی ئەزانێ چۆن بەرژەوەندی تێدایە. بەم ڕەنگە ئەگەر ئەو خراپەکارە لێزان و خاوەنی تەگبیرە ئەوا چارەی کوشتنە یان هەڵواسین، چونکە بە بڕین و دوور خستنەوە هەر ڕێ ی خراپەکاریی و سەر لێ تێك دانی هەیە و ئەمێنێ، ئەگەر هیچ کام لەو دووانە نی یە ئەوا ئاسانترین تۆڵەی لێ ئەسێنرێ کە دوور خستنەوەو تەمێ کردنە بە هەر جۆرێ کە پێ ی تەمێ خواربێ. هەرکەس زیاتر درێژە پێدانی ئەوێ با تەماشای کتێبی زانایانی مەزهەبەکان بکات. لێرەدا هەر ئەم ئەندازەیەم بە پێویست زانی کە باسم کرد. ئینجا با بزانین کە ئەم تۆڵەیانە چەند مەرجی بۆ دانراوە بۆ بەجێ هێنانیان بە بێ ئەوانە نابێ بەجێ بهێنرێن:

١- ئەوانە هێزو کۆمەڵێك بن کە مەترسی یان لێ بکرێ.

٢- ئەبێ چەکیان هەڵگرتبێ، ئیتر هەر جۆرە چەکێك بێت. بەڵام ئیمامی حەنەفی ئەفەرموێ: ئەبێ چەکەکەیان کوتەك ودارو بەرد نەبێ، لەناو شاردا نەبن، بەڵکو لە دەشت و دەربن.

٣- ئەبێ بە ئاشکرا ڕێ بگرن و بە زۆر ماڵ داگیر کەن و چەتەیی بکەن.

٤- ئەبێ هەڵسابن و یاخی بووبن لە دەوڵەت و سەرۆکی موسڵمانان کە بە شەریعەتی ئیسلام ڕەفتار و حوکمڕانی بکات. بە بێ ئەم مەرجانە بە تایبەتی چوارەمیان ئەم تۆڵانە ناسەنرێن و بەجێ ناهێنرێن.

پێویستە ئەم مەرجی چوارەمە بە گرنگ بگیرێ، چونکە زۆر لە ئایین فرۆشان هەن ئەم ئایەتە ئەگرن بەدەستەوە و فتوای پێ دەرئەکەن بۆ ئەو سەرۆك و کاربەدەستانەی کە رەفتار و حوکمڕانی بە شەریعەتی خوا ناکەن و نایانەوێ بە ناوی رووتی ئیسلامیشەوە حوکمڕانی بکەن، بەڵکو بە ئاشکرا و بێ شەرمانە لە ژێر ئالأیەکی تر و بەناوێکی ترەوە حوکمڕانی ئەکەن، بیروباوەڕێکی تریان هەیە بێجگە لە ئیسلام و بانگی مەردومیشی بۆ ئەکەن، هەرکەس بە پێچەوانەی بجولێتەوە ئاسن و ئاگری بۆ تاو ئەدەن، ئینجا هەر کۆمەڵێك یان هەر کەسێك راپەڕی لەودوژمنانی ئیسلامە دەست بەجێ ئەو دوژمنانە ئیسلام ئەهێننەوە کایە و لاف موسڵمانێتی لێ ئەدەن، ئەو ئایین فرۆشانەی فتوایان بۆ دەرئەکەن بەناوی ئیسلامەوە و ئەم ئایەتەیان بۆ ئەهێننەوە بە بەڵگە!! خوای تۆڵەسێن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە دەربارەی ئەوانەی کە یاخی ئەبن و هەڵئەسن لە کاربەدەستی موسڵمان و لە ولأتی ئیسلام دا، واتە هەر ولأتێ کە هەر شەریعەتی ئیسلام یاسا و شەریعەت بێت تیای دا، دەست درێژیی بکەنە سەر دانیشتوانی ئەو ولأتە بە چەتەیی و کوشتن و ئاژاوە نانەوە، بێگومان هەر کۆمەڵێك بەو جۆرە بجولێتەوە لە راستی داله خواو پێغەمبەر یاخی یە و جەنگ و دوژمنایەتی لەگەڵ شەریعەتی خوا ئەکەن، ئیتر ئەوانە موسڵمان بن یان موسڵمان نەبن، ئەوانە تۆڵەیان لێ ئەسێنرێ بەوشێوەی کە باس کرا. ئەوەی کە دەربارەیان ئەکرێ زۆر رێك و سەر بەسەرە لەگەڵ کردەوەی خۆیان، هەرکەس ئەو تۆڵەیە بە زۆر دابنێ، ئەو کەسە نەزان و نەفامە، هەرچەند بە زانا و فامیدە دابنرێ، با بزانرێ کە تۆڵەکەی هەر ئەوە نی یە کە باس کرا، وەکو ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا﴾ ئەو بڕیارو تۆڵەیە کە باس کرا زەبوونی و بێ ئابڕوویی یەکە بۆیان لە جیهان دا، تا ببن بە عیبرەت و مەردومی تریان پێ تەمێ خوار ببێ. ﴿وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ بۆیان هەیە لە رۆژی دوایی دا سزایەکی گەورە. پەنا بەخوا لە سزایەك کە خوا پێی بفەرموێ: گەورە!!

﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبۡلِ أَن تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهِمۡۖ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٣٤ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾

**خوای میهرەبان هەمیشە قاپی میهرەبانی یەکەی لەسەر پشتە بۆ بەندە گوناهکارەکانی کە بگەڕێنەوەو پەنا بێننەوە بەر پەروەردگاریان، لەبەر ئەوە لێرەیش دا ئەفەرموێ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ﴾ واتە تۆڵە و سزای ئەو تاوانبارانە هەر ئەوە بوو کە باس کرا، بێجگە لەوانەی کە گەڕابنەوە و تۆبەیان کردبێ ﴿مِن قَبۡلِ أَن تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهِمۡۖ﴾ لە پێش ئەوەی دەسەلاتتان ببێ بەسەریان دا و ژێر دەستیان بکەن، ئەمانە لەبەر ئەوەی لەکاتی دەسەلات دا واز ئەهێنن گەڕانەوەو کۆتایی هێنانەکەیان لە راستی یەوە دێت لەبەر ئەوە دەربارەیان ئەفەرموێ: ﴿فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ بزانن کە خوا لێ بوردەی میهرەبانە، واتە لێ یان ئەبورێ و میهرەبانی یان لەگەڵ ئەکات، بە لابردنی هەر سزای رۆژی دوایی و ئیتر حەددە شەرعی یەکە و ماڧ ماف دارانیان بەسەرەوە ئەمێنێ و ئەکەونە دەستی خاوەن ماڧ خۆی ئەگەر دەستی هەڵگرت چاکە و ئەگەر دەستی هەڵنەگرت ئەوا ماڧ خۆی ئەسێنێ. بە وێنەی دزی تۆبە کار کە هەر سزای رۆژی دوایی بەسەرەوە نامێنێ، ئیتر دەست بڕین و دانەوەی دزراوەکەی هەر لەسەر ئەمێنێ، ئەمەش بەلای هێندێ لە زانایانەوە، یان بە لابردنی هەموو ماڧ خواو ماڧ بەندە وەك هێندێ لەسەر ئەمەن. بەڵام راکەیان زۆر لاوازە بەلای کۆمەڵ و جەماوەری زانایانەوە، یان بەلابردنی هەموو ماف و تۆڵەی خوا لە هەردوو جیهان دا، واتە ئەم حەددە شەرعی ئایەتەیان لەسەر نامێنێ لەگەڵ سزای رۆژی دوایی کە هەردوو ماڧ خوان، بەڵام ماڧ بەندەیان لەسەر لاناچێ و ئەکەونە دەستی بەندەی خاوەن ماف. رای بەهێز و زۆربە لەسەر ئەم سێ یەمەیە. ئینجا(ئیبن و جەریر) ئەفەرموێ:(ئیبن و عەباس و عیکریمە و حسن ی بەسری و مجاهد و قتادة) لەسەر ئەوەن کە کاتێ ماڧ بەندەیان بەسەرەوە ئەمێنێ کە موسڵمان بووبن، ئەگەر موسڵمان نەبووبن و بگەڕێنەوە بە موسڵمان بوون ئەوا ماڧ بەندەیشیان بەسەرەوە نامێنێ، فەرمودەکەیان زۆر رێکە لەگەڵ ئەو بڕیارەی کە لە ئیسلام دا هەیە: ﴿الإسلام يجب ما قبله﴾ ئیسلام هەرچی تاوان و دەست درێژیی لەوەو پێش هەیە ئەیبڕێ و نایهێڵێ. ئەوانەی کە بەو جۆرە تۆبە ئەکەن پێش زەبوون بوون و کەوتنە ژێر**

دەست بەو جۆرە باریان سووك ئەكرێ، بەو جۆرو شێوەی كە باس كرا، بەپێی جیاوازی رای زانایان. ئەوبارسووك كردنەبەرژەوەندی وكاردروستی ئاشكرای تیا هەیە لە دوو بارەوە:

یەكەم: رێزگرتنی تۆبەوگەڕانەوەكەیان بۆلای خواكەنیشانەی چاك بوون ورزگار بوونیانە لە نەخۆشی سەركێشی و بەد كرداریی، ماتوولێ لەكاتی دەسەلآت و هێزدا گەڕاونەتەوە.

دووەم: هاندانی تیایەلەسەرتۆبەوگەڕانەوە، هۆی رزگاربوونەلەجەنگ وكوشتاربەئاسانی.

ماوەتەوە ئەوانەی كە لە پاش گرتن و زەبوون بوون تۆبە بكەن، بێگومان ئەوانە هیچ سوودێك وەرناگرن لە جیهاندا، نە لە بارەی ماڧی خواو نە لەبارەی ماڧی بەندەی خوا وەك زانایان ئەفەرمون. كە یەكێ لەوانە شافیعی یە لە راست ترین رای دا. بەلآم بێگومان گەڕانەوەیان بە دڵ – كە هەر خوایش ئاگادارە پێی – ئەبێ سوودێكی هەر ببێ بۆیان بۆ سزای رۆژی دوایی ئیتر با بە تەواوی رزگار نەبێ. چەند ریوایەتێك هاتووە لەبارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە. بەلآم لەبەر ئەوەی حوكم و بڕیارەكەی گشتی یە و نابەسرێتەوە بە هیچ كەسێكی تایبەتی یەوە، وە هیچ مەبەستێكی زیادە ناگەیەنن، لەبەر ئەوە بە پێویستم نەزانی باسی بكەم و درێژە بدەم بەو ریوایەتانە. ئیسلام نایەوێ هەر بە شمشێر و بە زۆری شەلاق بەندەكانی خوا بگێڕێتەوە لە خراپە و بە رێگەی راست دا بیانبات، چەك و زۆر نیشان ئەدات بۆ ترساندن و كۆتایی هێنان بەوانەی كە بەوە نەبێ ناگەڕێنەوە و رێی راست نادەنە بەر، بەڵكو یەكەم شتێ كە ئیسلام بەكاری بێنێ و پشتی پێ ببەستێ بۆ ئەو مەبەستە پەروەردە كردنی دڵە و راست كردنەوەی سروشتە، ئەوەش بە رێنموونی كردن و رام كردن لەسەر یادی خوا و سام و بیم و شەرم لە خوا، جا لەبەر ئەوە ئەبینین كاتێ بەندەكانی ترساند و هەڕەشەی لێ كردن بە تۆڵە و سزادان، بەدوای ئەوەدا روو ئەكاتە دڵ و دەروون، بێداری ئەكاتەوە و هەستی لە خوا ترسی ئەهێنێتە جۆش، هانی بەندە ئەدا لەسەر ئەوەی تا زووە فریای خۆی كەوێ و رێی رەزامەندی خوا بداتە بەر، وەك لێرەدا ئەم ئایەتەی هێنا بەدوای ئایەتی پێشوودا و ئاراستەی بڕوادارانی كرد: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ﴾ ئەی كەسانێ كە بڕواتان هێناوە بترسن و خۆتان بپارێزن لەهۆی خەشم و نارەزایی و تۆڵەی خوا بە وازهێنان و دوور كەوتنەوە لە گوناهو یاخی بوون لە خوا كە یەكێ لەوانە ئەو گوناهو تاوانە گەورەیە بوو كە ئایەتی پێشووی تیا هاتە خوارەوە و بە درێژیی تەفسیر كرایەوە، بە گوێرایەڵی و بەجێ هێنانی ئەوەی كە خوا فەرمانی پێداوە كە یەكێ لەوانە تۆبەكردن و داوای لێ بوردن لە خواو بەرگریی كردنی خراپە و خراپەكارانە.

بەڵێ بەڕاستی ترس و خۆپارێزی ئەبێ هەر لە خوا بێت، هەر ئەو ترس و خۆپارێزی یە شیاو و شایستەی ئادەمی و ئەو ڕێزو گەورەیی یەیە کە خوا بەخشی بە ئادەمی، هەر ئەو ترس و خۆپارێزی یەش بەکارەو هەمیشە لەگەڵ مەردوم دایە لە ئاشکراو نهێنی دا، هەر ئەوە جڵەوگیریی و بەرگریی ئەکات لەکاتێك دا کە کەس بەدیارەوە نەبێ و یاسا و زۆری مەردوم دووربن و دەستیان نەگات بە تاوانکار. بەبێ ئەو ترس و سامە لە خوا هەرگیز یاسا بە تەنیا چارەسەر نی یە، هیچ کەسێك و هیچ کۆمەڵ و گەلێك بە یاسای تەنیا چاك نابێ و پاك نابێتەوە، بە بێ سام و بیم کردنی دەروون لە دەسەڵاتی خوا، ﴿وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ﴾ داوا بکەن بۆ خۆتان و بگەڕێن بەدوای هەر شتێك دا کە هۆی گەیشتنتانە بۆلای خواو ڕەزامەندی خوا و نزیك بوونەوەتان لەخواوە، وا دەرئەکەوێ مەبەست بەمە هەر فەرمانە پێشووەکە بێت – واتە ترس و خۆپاراستنەکە – وەك لە فەرمودەی(قتادة) وە دەرئەکەوێ. چونکە بەو ترس و خۆپارێزی یە هەموو چاکەیەك دەست کەوت ئەبێ، هۆی هەموو خێرو فەڕێکە، مایەی ڕزگار بوونە لە هەموو زیان و شەڕێك. ئەو کاتە هێنانی بەدوای ئەو فەرمانە پێشووەدا بۆ ڕوون کردنەوەی ئەوەو زیادە هاندان لەسەری و سەرنج ڕاکێشانە بۆ ئەوەی کە هۆی گەیشتن بە ڕەزامەندی هەر ئەوەیە، هێندێ ئەفەرمون: هەر کردەوەیەك کە هۆی گەیشتن بێ بەخوا. هێندێ تر ئەفەرمون: یەکەم فەرماندانە بە دوور کەوتنەوەو نەکردنی هەر شتێ کە جڵەوگیریی لێ کراوە، دووەم فەرماندانە بە نەکردنی هەر شتێ کە فەرمانی پێ دراوە لە فەرز و سوننەت، ئینجا ئەم دوو شتە ئەرك و زەحمەتیان هەیە، لەبەر ئەوە فەرمانی سێ یەمی هێنا و داوای تێکۆشانی کرد لە ڕێی خوادا، لە(ئیبن و عەباس) ەوە – خوایان لێ ڕازی بێت – ئەگێڕنەوە کە مەبەست بە(الوسیلة) پێویستی یە. واتە داوای پێویستی خۆتان هەر لە خوا بکەن و ڕوو مەکەنە کەسی تر، چونکە هەموو شت هەر بەدەست خوایە. بە جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوە کە بریتی یە لە رادەو پایە و پلە لای خوا. ئەم دوو جۆرەیش هەر دەست ئەدات. بێجگە لەمانە هەر تەفسیرێکی تری هەیە لە کتێبەکان دا ئەگەڕێتەوە بۆ ئەمانەی کە

لێرەدا باسمان کردن، کەواتە بە هەرکام لەو مەبەستانە تەفسیر بکرێتەوە باشە و ئەگونجێ یا هێندێکیان بەهێز نی یە، ئیتر بێجگە لەوانە دروست نی یە بکرێ بە تەفسیر، چونکە نە لە قورئان و نە لە حەدیس دا نەهاتووە، هەروەها هاتووە لەلایەن هاوەڵەکان و زانایانی تەفسیر و زانایانی چینی یەکەم و دواتر کە تەفسیری قورئان لەوەوە وەرئەگیرێ، لەبەر ئەوە لە هیچ کتێبێکی تەفسیردا تەفسیر نەکراوەتەوە بە غەیری ئەوانەی کە باس کران. بەڵێ ئەو وتە پیرۆزە لە حەدیس دا هاتووە کە ناوە بۆ بەرزترین جێگا و پلە لە بەهەشت دا کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمان ئەدا بە بڕواداران داوای بکەن لە خوا بۆی، بەڵام دیارە ئەو مەبەستە بۆ ئێرە دەست نادات. بێگومان لە زووەوە بووە بە باو لەناو موسڵمانان دا لە کاتی نزاو لاڵە کردن دا ئەڵێن: خوا لەبەر خاتری فلاَن ئەوەم بۆ بکە یان داوا ئەکەن لە کەسێك کە نزاو هاواریان بۆ بکات لای خوا، ئەم ئایەتە ئەکەن بە بەڵگە لەسەر ئەوە و لایان وایە کە ئەم جۆرە شتانەش بەشێکن لەوەی کە مەبەستە لەم ئایەتەدا و وتەی(الوسیلة) ئەیانگرێتەوە، کەواتە پێویستە ئەم مەسەلەیە بە رێکی روون بکرێتەوە و راو بڕیاری زانایانی ئیسلام و هەڵگرانی شەریعەت باس بکرێ، تا ئەوەی دروست و شەرعی یە بکرێ، هەرچی ناڕەوا و ناشەرعی یە خۆپارێزی لێ بکرێ.

لەپاش پشکنین و لێکۆڵینەوەیەکی زۆر لە کتێبە باوەڕ پێ کراوەکان دا، رێم کەوت لە باسێکی(شێخی ئالوسی) لە تەفسیرەکەی دا کە زۆر بە جوانی و بە بێ لایەنی مەسەلەکەی روون کردووەتەوە، لەبەر ئەوەی خۆی یەکێ بووە لە زانا خواناسەکانی ئیسلام، باسەکەیشی تێرو تەواوە و ئەوەی پێویست بێت لە بەڵگە و راو بڕیاری زانایانی تێدایە، لەبەر ئەو دوو هۆیە باسەکەی ئەوم کرد بە سەرچاوەو هەر شتێ بڵێم لێرەدا لەو باسی ئەوە هێناومە و هەرکەس ئەیەوێ با تەماشای تەفسیرەکەی ئەو بکات.

بە یارمەتی خوای میهرەبان ئەڵێم: داوا کردن لە هەرکەسێکی زیندوو کە نزا و لاڵە بکات لای خوا بۆ داواکەر شتێکی راست و رەوا و شەرعی یە بەلای هەمووانەوە، ئیتر با داواکەر گەورەتر بێت لە داوا لێ کراو. بەڵگە لەسەر ئەوە چەند حەدیسی سەحیحە:

١- داوای کرد لە ئوممەت کە داوای(وسیلة) ی بۆ بکەن لە خوا.

٢- داوای کرد لە ئوممەت کە سەڵاواتی لەسەر بدەن.

٣- (عمری فاروق) - خوای لێ رازی بێت - ئیزنی خواست کە بچێ بۆ عومرە ئەویش ئیزنی داو فەرمووی پێی: برای خۆم ئێمەت لەبیر نەچێ لە نزا کردنت دا.

بەڵام ئەگەر داوا لێ کراو مردوو بێت یان نەبێ بە دیارەوە ئەوە هیچ گومانێکی تیا نی یە لای هیچ زانایەك کە ناڕەوایە و لەو شتە بیدعەتانەیە کە هیچ کەس لە پێشووەکان(سلف) ی ئوممەت نەیکردووە، بەڵێ. سەلام کردن لە مردووان دروستە و رووی قسە تێ کردنیان رەوایە، لەسەر ئەم بارەی کە لە حەدیسی سەحیح دا هاتووە: کە پێغەمبەر(ﷺ) هاوەڵەکانی فێر ئەکرد کە کاتێ ئەچنە سەر گۆڕستان بڵێن:(السلام علیکم اهل الدیار و المؤمنین و إنا إن شاء الله بکم لاحقون، یرحم الله المستقدمین منا و منکم و المستأخرین نسأل الله تعالی لنا و لکم العافیة، اللهم لا تحرمنا اجرهم و لا تفتنا بعدهم واغفر لنا و لهم) لە هیچ کەس لە هاوەڵەکانەوە نەهاتووە - لە کاتێك دا لە هەموو کەس سوور تر بوون لەسەر هەر شتێکی خێروچاکە - کە داوای هیچ شتێکی کردبێ لە مردوویەك، بەڵکو لە ریوایەتی سەحیح دا هاتووە کە(ئیبن و عمر) - خوایان لێ رازی بێت - کاتێ بچوایە بۆ زیارەتی حوجرەی سعادەت ئەیگوت:(السلام علیك یا رسول الله، السلام علیك یا ابا بکر، السلام علیك یا ابت) ئینجا ئەڕۆیشت و زیادە لەوەی نەئەگوت، داوای هیچ شتێکی نەئەکرد لە سەرداری عالەم و هەردوو هاوەڵەکەی، بەڵێ. پاڕانەوە و لاڵە لەخوا لەو شوێنە پیرۆزە و لە(روضة المطهرة) دا شتێکی شەرعی و چاکە، یار و هاوەڵەکان - خوا لێ یان رازی بێت - لەو شوێنە پیرۆزەدا روو بە قیبلە نزایان ئەکرد، نەبیستراوە کە نزاکەیان روو بە گۆڕی بەفەڕی بووبێت، لەگەڵ ئەوەدا گەورەترین شتە لە ئەرزو ئاسمان دا، رای زانایان جیاوازە لە روو تێ کردنی لە کاتی سەلام لێ کردن دا، لە ئیمامی حەنەفی یەوە هاتووە کە لەکاتی سەلام لێ کردنیش دا وەك کاتی نزا هەر ئەبێ روو بە قیبلە بێت. بەڵام رای راست تر ئەوەیە هەر لەکاتی نزادا روو بە قیبلە بێت، لەکاتی سەلام دا روو بەرەو گۆڕی بەفەڕی بێت، ئینجا کاتێ باری شەرعی ئەمە بێ کە گوترا لەکاتی زیارەتی گەورەترین دروست کراوی خوادا، ئەبێ زیارەتی یەکێکی تر چی بێ کە زیاد لەوەی تیا بگوترێ، یا داوا بکرێ لە زیارەت کراو هەر شتێ و هەر مەبەستێ

که لەکار و پیشەی ئەو نی یە و هەر بەدەست خوایە؟! ئینجا ماوەتەوە سوێند لە خوا خواردن بە حەقی یەکێ یا شتێ لە دروست کراوەکانی، یان داوا کردن لە خوا بۆ خاتری یەکێ لە دروست کراوەکانی، نزا کردن بەم جۆرانە و وێنەیان نەهاتووە لە هیچ ریوایەتێکی سەحیح دا، نەهاتووە لە هیچ نزاو لاڵەیەکی ئال و بەیت و ئیمامانی تردا، بەڵام لە سەحیحی بوخاری دا هەیە کە عمری فاروق - خوای لێ رازی بێت - لە کاتی قاتی و بێ بارانی دا داوای ئەکرد لە خوا بە عباسی مامی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەیفەرمو: ئەی خوایە لەکاتی ژیانی پێغەمبەردا(ﷺ) ئەومان ئەکرد بە وەسیلە بۆلای تۆ و بارانت بۆ ئەباراندین. ئێستا مامی پێغەمبەرەکەمان ئەکەین بە وەسیلە، کەواتە بۆمان ببارێنە و خوایش بارانی بۆ ئەباراندن، ئەم حەدیسە سەحیحە هەیە بەڵام مەبەست ئەوەیە کە لەکاتی پێغەمبەردا(ﷺ) داوایان ئەکرد کە تکایان بۆ بکات ئەویش تکای ئەکرد و خوا وەری ئەگرت. نەك خۆیان وتبێتیان: خوایە بۆ خاتری ئەو بۆمان ببارێنە، دیارە باشتر ئەبێ ئەوەیان مەبەست بووبێ بۆ حەزرەتی عەباسیش. وەك دەرئەکەوێ لە ریوایەتەکەدا کە حەزرەتی عباس دەستی ئەکرد بە نزاو لاڵە و ئەوانیش ئەیان گوت: آمین. هەروەها لە ریوایەتی سەحیح دا هاتووە لە(ئیبن و عمر و ئەنەس) و غەیری ئەوانەوە کە ئەفەرمون: کە بێ بارانی ببوایە نزاو لاڵەی پێغەمبەریان ئەکرد بە وەسیلە بۆ داوای باران، دەی بێگومان بە بێ دووبەرەکی هیچ کەس رەوا و شەرعی یە داوای نزا کردن لە هەرکەسێك، وەك لە پێشەوە بە چەند حەدیسێك روونمان کردەوە. سوپاس بۆ خوا بەڵگەیەکی تر کەوتە دڵمەوە کە لە هیچ شوێنێك دا نەم دیبوو، لام وایە زۆر بەهێزە، بەڵگە لەسەر ئەوەی کە مەبەست لە حەدیسەکەی فاروق دا داوای نزا بووە لە پێغەمبەر(ص) نەك گێرانی جاهو خاتری بە وەسیلە: ئەگەر مەبەست ئەمە بوایە لە پاش لە دنیا دەرچوونیشی هەر ئەو جاهو خاترەی ئەکرد بە وەسیلە، لای نەئەدا بۆ جاهو خاتری مامی بەرێزی، چونکە بێگومان جاهو خاتر و پایە و پلەی سەرداری هەمووان، لەپاش نەمانی هەر هەیە و نەگۆڕاوە. بەڵکو ئەبێ بەرزتر بووبێتەوە، چونکە هەمیشە و تا بێت رادەو پلەی هەر لە بەرز بوونەوەدایە، شتێکی ئاشکرایشە هیچ کەس خاتر و جاهی نەگەیشتووەتە ئەو، کەواتە مەبەستی فاروق - خوا لێ ی رازی بێت - هەر ئەوەیە کە لە کاتی ژیانی دا

داوایان لیٚ ئەکرد کە تکاو نزایان بۆ بکات، بەلاّم لە پاش لە دنیا دەرچوونی ئەوە نەئەکرا، کەواتە داوایان ئەکرد لە مامی بەرِێزی. جا لەبەر ئەوەی نزاو لالّە لەو شێوەی کە باس کرا پێشەوا و پێشووەکانی ئوممەت نەیان کردووە، هەر حەدیسیٚ لەو بارەیەوە هاتبیٚ زانایانی حەدیس بە حەدیسی دانانێن و لە هیچ کتێبێکی حەدیس دا نەنووسراونەتەوە، بەلّکو هەر بە دەماو دەم کەوتوونەتە ناو، ئەگەر حەدیسێك هاتبیٚ و بە حەدیس دانرابیٚ و لە کتێبی حەدیس دا نووسرابێتەوە ئەوە یا لە ریوایەتەکەی دا لاوازی هەیە، یان بە واتا و مەبەستێکی رێك و رەوان تەفسیر کراوەتەوە کە نەکریٚ بە بەلّگە لەسەر ئەو جۆرە نزایانە، لەبەر ئەوە زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کە نزا و لالّە لە خوا بەو جۆرانەی کە باس کران و بوون بە باو لەناو مەردومان، ئەم نزایانە رەوا و شەرعی نین، کەواتە چاك وایە بۆ ئێمە کۆتایی بێنین لەو جۆرە نزایانە و لە راستە شەقامەکە لانەدەین و نزا لە خوا بە جۆریٚ بکەین کە لای هیچ کەس جێگەی رەخنە و دوو دلّی نی یە و خۆمان نەخەینە ناو کارو کردەوەیەك کە دووبەرەکی و گومانی تێدایە، وەك لە حەدیسی سەحیحیش داهاتووە ئەم یاسا شیرینە:(دع ما یریبك إلی ما یریبك) وازبێنە لە هەرشتیٚ کە ئەتخاتە گومان و دوو دلّی و بچۆ بۆ شتێك کە ناتخاتە گومان و دوو دلّی. کەواتە با یەکسەر داوا لە خوا بکە و هیچ شتیٚ مەکە بە وەسیلە بۆ وەرگرتنی نزاکەت یان ناو و سیفەتی خوا یان کردەوەی چاکی خۆت بکە بە وەسیلە وەك لە حەدیسی سەحیح دا ئەودووجۆرەهاتووەوهەموزاناو پێشەواکانی ئیسلام پەسەندی ئەکەن.

ئەو جۆرە نزاو لالّەیە کە بەلای زۆربەوە شەرعی و پەسەند نی یە، مەترسی یەکی گەورەیشی تیا هەیە کە زیادە رەوی ئەکریٚ و ئەوەی کە کابرا ئەیەویٚ داوای بکات لە خوا لەبەر خاتری خاتر داران، ئەو شتەی کە ئەبیٚ هەر داوا لە خوا بکریٚ و بەجیٚ هێنانی تایبەتی یە بە خواوە، کابرای نزاکەر داوای ئەکات لەوەی کە بە خاترداری دائەنیٚ لای خوا، ئیتر با زۆر بیٚ خاتریش بێت، بەلّکو با گوناهبار و خەشم لیٚ گیراویش بێت. زۆر بە داخەوە ئەو مەترسی لیٚ کراوە بەدی هات و پەرەی سەند و بلاّو بوویەوە لەناو موسلّمانان دا، مەگەر تاك و تەرایەکی تێگەیشتوو خۆی لیٚ بپارێزیٚ، ئەوەتا ئەبینین بە تایبەتی مەردومان ئەچن بۆ سەر گۆری پیاوە خواناسەکان دەست ئەکەن بە ئەلّقەی بێشکەکانیان دا و داوای کوڕ و

سامان و تەمەن درێژیی و ئاسان کردنی هەموو تەنگ و چەڵەمەیەکیان لێ ئەکەن، هەر پێ یەکیان هەڵکەوێ دەستبەجێ یا فلأن ئەکەن و خوایان هەر بیریش ناکەوێتەوە و زۆربەیان لایان لە ڕێوە ناگەنە خواو ئەبێ خواناسێك بکەن بە وەسیلە، با بزانرێ ئەمانە و وێنەی ئەمانە پەیوەندی بە ئیسلامەوە نی یە و ڕێك ناکەون لەگەڵ ئایەت و حەدیس و فەرمودەی پێشەواکان و زانا و خواناسەکانی ئیسلام دا، لە جزمی(٢٣) سورەتی(الزمر) بە یارمەتی خوا لەبارەی ئەم زیادە رەوی کردنانەوە ئەندازێکی پێویست دواوم و ئەوەی کە شەرعی یە وتومە، هەرکەس ئەیەوێ با سەرنجێکی بدات.

زۆر جێگەی سەرسوڕمانە کە هێندێ حەدیس دەست هەڵبەست کراوە و بە دەما و دەم کەوتووەتە ناو و ئەگێڕرێتەوە، وەك ئەم درۆ زلە: ﴿إذا اعیتکم الأمور فعلیکم بأهل القبور، أو فاستغیثوا بأهل القبور﴾ کاتێ کە کاروبارتان لەسەر سەخت بوو و ماندووی کردن پێویستە لەسەرتان پەنا ببەن و هاوار بکەن لە مردووەکانی گۆڕستان!! لەگەڵ ئەمەدا دەست هەڵبەستە بە بڕیاری هەموو زانایانی حەدیس، لە هیچ کتێبێکی باوەڕ پێ کراوی حەدیس دا نەنووسراوەتەوە، پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) جڵەوگیریی و نەفرینی کردووە لەوەی گۆڕەکان بکرێن بە مزگەوت و جێگەی خواپەرستی، ئیتر چۆن ئەبێ بڕوا بکرێ بەوە کە مەردوم هاوار بکەن و داوا بکەن لە خاوەن گۆڕەکان، بێگومان هەموو ژیرێ ئەبێ بزانێ کە ئەوە درۆ و دەست هەڵبەستە، بەڵێ. بێگومان زیارەتی گۆڕ سوننەتە. بەلأم بەو جۆرو شێوە شەرعی یەی کە لە حەدیس و فەرمودەی زانایانی ئیسلام دا روون کراوەتەوە، کەواتە هیوادارین کە موسڵمانان شوێنی ئارەزووی نەفس نەکەون، بەڵکو شوێنی ئیسلام و زانایانی ئیسلام بکەون، هیوادارین لە هێندێ لە موسڵمانان بە تایبەتی هێندێ لە مامۆستایانی ئایینی کە لە خۆیانەوە ئاڵۆز نەبن لەم جۆرە قسە و باسە راستانە، دەست نەکەن بە تەئویل و پینە و پەڕۆ بۆ ئەو بیدعەتە ناڕاست و ناڕەوایانە، بەڵکو بە ڕێکی بارە شەرعی یەکەیان تێ گەیەنن، هەرچەند دژو پێچەوانەی باوی لەمەو پێشیان بێت.

وَجَٰهِدُواْ فِي سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٣٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡ أَنَّ لَهُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا وَمِثۡلَهُۥ مَعَهُۥ لِيَفۡتَدُواْ بِهِۦ مِنۡ عَذَابِ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنۡهُمۡۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٣٦﴾ يُرِيدُونَ أَن يَخۡرُجُواْ مِنَ ٱلنَّارِ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنۡهَاۖ

**ئینجا با بگەڕێینەوە بۆ سەر ئایەتەکە و بە مل کەچی و گوێ ڕایەڵی گوێ بگرین لە فەرمانی سێیەم: ﴿وَجَٰهِدُواْ فِي سَبِيلِهِۦ﴾ تێکۆشان بکەن لە ڕێی خوادا بە دژایەتی و دوژمنایەتی و تێ جەنگین لەگەڵ دوژمنە نهێنی و ئاشکراکانی خوادا کە لە ڕاستی دا دوژمنی ئێمەن و زیانیان بۆ ئێمە هەیە ﴿لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ واتە ئەم فەرمانانە بەجێ بێنن بە ئومێد و چاوەڕوانی گەیشتنتان بە ئازو نیعمەتی نەبڕاوە و ڕزگار بوونتان لە هەموو سزاو ناخۆشی لە ڕۆژی دوایی دا. ئینجا بەرامبەر ئەوان باسی شێوەی سەخت و سامناکی بێ بڕوایان ئەکات، کە سەرکێشی و سەرپێچی کەرن لەو فەرمانانە، دوا ڕۆژ و چارەنووسی دڵ تەزێنیان ئەخاتە بەرچاو، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە لە جیهان دا بێ بڕواو سەرکێشن و هەر لەسەر ئەو بارە ئەمرن، ئەوانە لە ڕۆژی دوایی دا ﴿لَوۡ أَنَّ لَهُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا﴾ ئەگەر هینی ئەوان بێت هەرچی وا لە زەوی دا بە تێکڕایی و پێکەوە ﴿وَمِثۡلَهُۥ مَعَهُۥ﴾ وێنەو ئەندازی ئەوەیشیان ببێ لەگەڵی دا، ئەگەر هەموو ئەوەی کە باس کرا هینی ئەوان بێت ﴿لِيَفۡتَدُواْ بِهِۦ مِنۡ عَذَابِ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ بۆ ئەوەی فیداکاری پێ بکەن و بیدەن لە باتی سزای ڕۆژی دوایی دا ﴿مَا تُقُبِّلَ مِنۡهُمۡۖ﴾ لێ یان وەرناگیرێ ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ بۆیان هەیە سزایەکی ئێش و ئازار دەر کە گەیشتبێتە ئەوپەڕی ڕادە. ﴿يُرِيدُونَ أَن يَخۡرُجُواْ مِنَ ٱلنَّارِ﴾ ئەیانەوێ دەرچن لە ئاگر. بەم ڕەنگە کاتێ بڵێسە و شەپۆلی ئاگر بەرزیان ئەکاتەوە تا نزیکی لێوار ئەبنەوە و ئەکەونە سەر ئاگرەکە، یان ئەوەندە بەرزیان ئەکاتەوە نزیکن لە دەرچوونەوە، یان ئاواتیان دەرچوونە، بەهەر جۆر مەبەست بێت، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنۡهَاۖ﴾ بێگومان ئەوانە دەرچوو نین لە ئاگرو هەرگیز لێی دەرناچن،**

وەك زیادە دڵنیایی ئەكات لەسەر ئەوە كە ئەفەرموێ: ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّقِيمٞ﴾ بۆیان هەیە سزایەكی دامەزراوی نیشتەجێ كە بار ناكات لێ یان، خوا بە میهرەبانی خۆی پەنامان بدات لەو بەد بەختی و بەش براوی یە، بەڕاستی زۆر پێویستە لەم جۆرە شوێنانەدا بوەستێ و بە قووڵی بیر بكاتەوە لە سەخت و سامناكی ئەوەی لەم جۆرە ئایەتانەدا خوا بەندەكانی پێ ئەترسێنێ، وەرە موسڵمان با بیرێك بكەینەوە: ئەوپەڕی ئەوەی كە دڵ بۆی بڕوا ئەمەیە كە یەكێ خاوەنی ئەم هەموو جیهانە بێت. بەڵام ئایەتەكە بەوەیشەوە ناوەستێ بەڵكو وا دائەنێ ئەگەر وێنەو ئەندازی ئەوەیشی ببێ، ئەگەر ئەو كەسە لە دۆزەخ دا بێت هەوڵ ئەدات كە بە جارێ ئەوە بدا لە ڕێی ڕزگار بوونی دا، شێوەی هەوڵەكەی نیشان ئەدات كە ئەیەوێ دەرچی لەو ئاگرە كەچی ناگات بەو ئاوات و ئامانجە، پەنا ئەگرین بە بەزەیی خوا و بە لێ بوردنی خوا كە دووچارمان نەكات. لە پاش ئەوەی باسی تۆڵە و تاوانی ئەوانەی كرد كە بە ئاشكرا و بە زۆر و بە تاڵان ماڵی مەردوم داگیر ئەكەن، پەندو ئامۆژگاری كرد بەو كردەوانەی كە بڕوا بەهێز ئەكەن و دڵ و دەروون پاك ئەكەنەوە و گوناهو حەرام بێزراو ئەكەن، لە پاش ئەوە ئەوا باسی تۆڵەی ئەوانە ئەكات كە دزی ئەكەن و بە دزی یەوە ماڵی مەردوم ئەخۆن: ئەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا﴾ ئەو پیاوەی كە دزی بكات و ئەو ئافرەتەی كە دزی بكات دەستیان ببڕن. بێگومان ئیسلام بریتی یە لەم شەریعەتە گشتی و جیهانی یە كە هەموو كاروبار و ڕووداو و بەسەرهاتی ژیانی تێدایە و سەرجەم هەمووی ئەگرێتەوە، هەموو بەش و پارچەكانی بەستراون پێكەوەو ناگونجێ پچڕین و جیا كردنەوەی هیچ كامی لەوانی تر، هەركامی تەواوكەری ئەوی تریەتی، جا لەبەر ئەوەن هۆی دانانی زۆربەی یاسا و بڕیارەكانی نازانرێ و كاردروستی خوا دەرناكەوێ تیایان دا مەگەر كاتێ كە سەرنجی هەموو بەرنامە و ڕژێمەكە بدرێ لەگەڵ ئەو هەموو بڕوا گرنگانەدا كە داینراون بۆ هەموو بارو ڕوویەكی ژیان، ئەو یاسا تایبەتی یانە دەست نادەن بۆ بەدی هێنان و ڕەفتار پێ كردن مەگەر كاتێ كە هەموو بەرنامە و ڕژێمەكە وەرگیرێ و بە تەواوی ڕەفتاری پێ بكرێ. كەواتە وەرگرتن و

رەفتار پێ کردنی بڕیاری لە بڕیارەکانی، یان بڕوایە لە بڕواکانی و پچڕانی لە باقی تر، ئەوە نە ئەو سوود و بەرهەمەی ئەبێ کە ئیسلام داوای ئەکات، نە بەوە ئیسلام بەدی دێت، چونکە - وەك وتمان - ئیسلام چەند بەش و پارچەیەکی جیاواز نی یە. ئیسلام ئایینێکە کە هەموو بەشەکانی بەستراو و پەیوەستن پێکەوە کە بەدی هێنانی هەموو ناوچەکانی ژیان ئەگرێتەوە.

بەشێوەی گشتی ئیسلام بەو جۆرەیە، هەروەها بۆ هەموو یەکەیەکەی بەندو بڕیارەکانی، بۆ وێنە بە بۆنەی شوێنەکەوە مەسەلەی دزی ئەگرین بەدەستەوە: ئیسلام قەسابخانەیەکی دانەناوە بۆ کوشتن و دەست و قاچ بڕین، بەڵکو لە یەکەمجارەوە ئەوەی کە هۆی دزی کردن بێت نایهێڵێتەوە، کارێکی وا ئەکات کە هەرکەس ئەوپەڕی رادە لارو چەوت نەبێ هەرگیز نیازی دزی کردن بەدڵی دا گوزەر ناکات، هۆی ژیان و گوزەران فەراهەم ئەهێنێ و مافی هەموو کەس دان پیا ئەنێ و بڕیاری لەسەر ئەدا، لەناو گەل و کۆمەڵی موسڵمانان دا لە وڵاتی ئیسلامدا، هەموو کەس مافی خواردن و نۆشین و پۆشین و جێ و شوێنی حەوانەوەی هەیە، پێویستە لەسەر کۆمەڵ و دەوڵەت چارەسەر کردن و دەست خستنی ئەو مافە پێویستانە بۆ هەموو کەس لە رێگەی سازاندن و فێرکردن و ئاسان کردنی کارو کردەوەوە. بۆ هەرکەس کە بە توانا بێت. ئەگەر ئەوە نەگونجا لەبەر نەتوانین، یان لەبەر نەبوونی کارو کردەوە، یان لەبەر بەش نەکردن و دەرنەهێنانی بۆ ئەوەی کە پێویستە، ئەبێ ئەو پێویستی یانەی بۆ پێك بهێنرێ لە چەند رێگەیەکی ترەوە کە دیاریی کراوە:

١- لەلایەن کەس و کارو دەسەڵات دارەوە.

٢- لەلایەن دەسەڵات داری شوێن و ناوچەکەیەوە.

٣- لەلایەن - بيت المال - ەوە لەو بەشە زەکاتەی کە دیاریی کراوە بۆ هەژار و بێ نەواو پەك کەوتووەکانەوە.

ئینجا ئەگەر ئەوە بەشی نەکرد و دەوڵەت نەیبوو، ئەو کاتە ئەندازی پێویست بڕیار ئەدات لە ماڵ و سامانی دەسەڵات دارو دەوڵەمەندەکان، بە مەرجێ نەگاتە دەست درێژیی و ستەم کردن لە موڵکایەتی تایبەتی، ئینجا لەگەڵ هەوڵدان بۆ فەراهەم هێنانی ئەو پێویستی یانە ئیسلام هەوڵ ئەدات بە تەمێ و ئامۆژگاریی مەردوم پەروەردە بکات و هەموو لاری

یەکان ڕاست بکاتەوە، لە بارێکی تریشەوە توندو تیژیی بەکار ئەمێنێ لە کۆکردنەوەی ماڵ و سامان دا کە ئەبێ لە ڕێگەی ڕاست و حەڵاڵەوە کۆ بکرێتەوە، کەواتە بوونی ئەو ماڵ و سامانە کە بە حەڵاڵی پەیدا بکرێ و ئەو مافانەی لێ بدرێ، نابێتە هۆی کینە و حەسادەت لەلایەن بێ نەوایانەوە تا هەوڵی دزی و داگیر کردنی ئەو ماڵ و سامانە بدەن.

ئیسلام هەمیشە دڵ و دەروونی مەردومان بەو جۆرە پەروەردە ئەکات، خو و ڕەوشتیان پاك و خاوێن ئەکاتەوە، بیرو هۆشیان ڕوو ئەکاتە کارو کردەوە لە ڕێگەیەکی پاك و شەرعی یەوە، نەك لە ڕێگەی دزی و دەخەڵی و داگیر کردن بە شێوەیەکی بەد و ناشەرعی، ئەگەر کارو کردەوەی ڕەوا و شەرعی دەست نەکەوت، یان بەشی نەئەکرد، ئەو کاتە لە ڕێگەیەکی تری شەرعی یەوە پەکیان ناخات، وەك دەست نیشانمان بۆ کرد. کەواتە ئەبێ دز بۆچی دزی بکات؟ بێگومان پێویستی نی یە لە سایەی ئیسلام دا تا بە دزی چارەسەری بکات، بەڵکو دزی ئەکات لەبەر تەماع بازیی و ئەیەوێ بەو شێوە پیسە ماڵ و سامان بنێ بەیەکەوە، ئەیەوێ سامان کۆبکاتەوە لە ڕێگەیەکەوە کە گەل داچڵەکێنێ لە وڵاتی ئیسلام دا، بێ بەشی بکات لەو ئارامی و ئاسایشەی کە ئیسلام پێی ئەدا، خاوەن ماڵە پاك و حەڵاڵەکان بێ بەش بکات لەوەی بە بێ بیم و بە دڵنیایی بحەوێنەوە لەسەر ماڵە حەڵاڵەکەیان، کەواتە ئەو دزە تاوانبارە بە جێگەی بەزەیی نامێنێ و ئەبێ بەربەست بکرێ لەوەی دەست درێژیی بکاتە سەر بێ تاوان و بە ناهەق و ناڕەوا ماڵە حەڵاڵەکەی بخوات، بە بێ ئەوەی هیچ بیانوویەکی بەدەستەوە ببێ، ئینجا با بزانین لە شەرع دا دز کامەیە، کەی دەستی دز ئەبڕرێ؟ دزی لە شەرع دا بریتی یە لە بردنی ماڵی کەسێك کە بە دزی خاوەنەکەیەوە و ماڵەکەیش لە شوێنێك دا بێت کە شوێنی دانان و قایم کردنی ئەو ماڵە بێت، کەواتە ئەبێ ئەو دزراوە بەنرخ بێت و توڕ دراو نەبێت، زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوەن کە کەمتر نەبێ لە چارەکە دینارێکی ئەو سەردەمە کە ئاڵتوون بووە، ئەبێ هەڵگیراو و قایم کراو بێت لە شوێنی تایبەتی خۆی دا و دزەکە لەو شوێنە تایبەتی یەدا دەری هێنابێ، کەواتە کەسێ کە کرابێ بە ئەمیندار بەسەر ماڵێکەوە ئەگەر دزی کرد دەستی نابڕرێ هەرچەند ئەو دزی یە گوناهێکی گەورەیە، هەروەها خزمەتکارێ کە ڕێی هاتوچۆی ناو ماڵی لێ نەگیرێ، چونکە ماڵە دزراوەکەی لێ قایم

نەكراوە، كەسێ ماڵێكی خواستبێ و لە پاش دا دەستی بەسەردا بگرێ و نەچێتە ژێر ئەوەی لایەتی دەستی نابڕێ، بە دزینی میوە تا نەخرێتە عەمارو كۆگا دەست نابڕێ، هەروەها هەر شتێكی تر كە لە جێ و شوێنی قایم كردنی خۆی دا نەبێ، ئەبێ ئەو ماڵە دزراوە هیچ ماف و بەشی دزەكەی پێوەنەبێ، كەواتەلەسەردزینی ماڵی شەریكی دەست نابڕێ، هەروەها لەسەر دزینی -بیت المال- چونكەدزەكە بەشدارە تیای دا، لەم كاتانەدا كە دەست نابڕێ تۆڵەكەی بریتی یەلەبەند كردن و جەلدە لێدان و هەر شتێ كە حاكم بە باشی بزانێ. ئینجا بۆ یەكەمجاری دەست بڕین دەستی راست ئەبڕێ لەجمگەكەیدا، ئەگەرلەپاش ئەوە دزی دووبارە كردەوە قاچی چەپی ئەبڕێ لە قولە قاپی دا بە پێ ی بڕیاری هەموو زانایانی ئیسلام، ئینجا بۆ جاری سێ یەم و چوارەم دووبەرەكی هەیە و رای زانایان جیاوازە وەك لە كتێبەكانداباس كراوەباسەرنج بدرێن.ئیمامی حەنەفی دووشتی ترئەكات بەهۆی دەست نەبڕین:

١- ئەو ماڵە لە بنەڕەت دا حەڵاڵ نەبێ بۆ گشتی و مافی گشتی پێوە نەبێ، وەك ئاو و نێچیر و وێنەیان، دزینی ئەمانە لە خاوەنەكانیان نابێتە هۆی دەست بڕین، لەبەر ئەو بیانووی ماف و بەشداریی یە.

٢- ئەو ماڵە شتێ نەبێ كە زوو خراپ و بێ كەڵك ببێ، وەك میوەی تەڕو گۆشت و نان و گژوگیا و وێنەیان، لەسەر دزینی ئەمانەش دەست نابڕێ بەلای ئیمامی حەنەفی یەوە.

ئینجا زیاد لەمە با درێژە نەدەین بە باسەكە لەبارەی رای زانایانەوە، هەركەس ئەیەوێ با تەماشای كتێبەكان بكات، ئەوەی كە گوتمان بەسە بۆ رابەرو بەڵگە لەسەر چاوپۆشی و بەزەیی ئیسلام و سووریی ئیسلام لەسەر ئەوەی كە بە هەرجۆر بگونجێ بەهانەیە ببێ بە دەستەوە حەز ئەكات كە ئەم تۆڵە و سزایانە بەكار نەهێنێ. لەبەر ئەوەیە كە پێغەمبەرمان(ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿ادرؤا الحدود بالشبهات﴾ حەددەكان بەرگری بكەن - واتە بەكاریان مەهێنن - بە عوزرو بەهانەكان. واتە بەو عوزرو بەهانانەی كە دەست ئەدەن ببن بە هۆی بەرگریی، وەك ئاماژەمان كرد بۆ هێندێكیان، كەواتە عمری فاروق - خوا لێ ی رازی بێت - زۆر چاكی فەرمووە: حەددو تۆڵەكان بەكار نەهێنم بە هۆی عوزرو بەهانەكانەوە پێم خۆش ترەتائەوەی بەكاریان بێنم بەگومان ودوو دڵی یەوەو رابەرێكی بەهێزم نەبێ لەسەری.

خوای پەروەردگار فەرمانی دا بە دەست بڕینی دز - بەو شێوەو مەرجانەی کە باسمان کردن - ئینجا هۆکەیشمان بۆ باس ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا﴾ واتە دەستیان ببڕن لەبەر جەزاو تۆڵە سەندن لێ یان بەهۆی ئەو دزی یەی کە کردیان بەدەستی خۆیان، ئەوەش ﴿نَكَٰلٗا مِّنَ ٱللَّهِۗ﴾ لەبەر بەرگری کردن و پەك خستنە لەلایەن خواوە لە دووبارە کردنەوەو گەڕانەوە بۆ سەر ئەو کردەوە بەدە، هەروەها مایەی پەك خستن و تەمێ خواری یە بۆ مەردومانی تریش، ﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٌ﴾ خوا زاڵ و بەدەسەڵاتە لە هەموو کاروبار و بڕیارەکانی دا و هیچ کەس ناتوانێ بەربەرەکانێ و دژایەتی بکات ﴿حَكِيمٌ﴾ لێزان و کاردروستە و هەرچی بکات بەرژەوەندی و کاردروستی تیایە، بەڕاستی هەرکەسێك چاوی دڵی کوێر نەبێ و سەمەسای لێ نەبڕابێ ئەزانێ کە ئەم دەست بڕینە زۆر بەجێ یە و سەرو بەرە لەگەڵ کردەوەی دزەکەدا، ئەو دزە بەدە کە لە ئیسلام دا چارەسەری هەموو پێویستی و ناچاری یەکی ئەکرێ، بە ئەندازێ کە بەس بێ هۆی ژیانی بۆ پێك ئەهێنرێ، دەستی بەرەڵا ئەکرێ و یارمەتی ئەدرێ کە لە ڕێگەیەکی شەرعی و حەڵاڵەوە بە ئارەزووی خۆی ماڵ و سامان پێکەوە بنێ، ئەو دزە بەدە بەوە واز ناهێنێ، بە ناهەق و ناڕەوا نیازی ماڵی مەردومان ئەکات و ئەیەوێ لەو ڕێگە بەدەوە سامان زۆر و فراوان بکات، دڵی مەردومان دائەچڵەکێنێ و بێ ئارامیان ئەکات، زۆر جار دەستە پاچەیان ئەکات و بەش بڕاو لەو ماڵەی کە بە ڕەنجی شان پێکی یەوە ناوە!! بەڕاستی زۆر ئاشکرایە کە بەجێ یە ئەو دەستە تاوانبارە لەکار بخرێ و ئیتر مەردومان بەو جۆرە لێ نەکات، هێندێ لە نەفامان بەزەیی یان دێتەوە بەو دزە تاوانبارەدا و ئەڵێن تۆڵەکەی سەختە. بەڵام بەزەیی یان نایەتەوە بە مەردومی دزی لێ کراوی ستەم لێ کراو. بەڕاستی زۆر جێگەی سەرسوڕمانە بەزەیی هاتنەوە بە ستەمکار و تاوانباردا، بەزەیی نەهاتنەوە بە تاوان و ستەم لێ کراوان!!! نەفام بەزەیی نایەتەوە بە گەل و کۆمەڵ دا کە بەرگریی نەکردنی دزی مایەی تێك چوون و بێ ئارامی یانە، بەڵام بەزەیی یان

دێتەوە بە دزی بەد کرداردا!! نازانێ خوای کار دروست لە دانانی ئەو تۆڵەدا میهرەبانی بەکار هێناوە لەگەڵ ئەوانەی کە ئەیانەوێ و نیازی ئەو کردەوە بەدەیان هەیە، بۆ ئەوەی خۆیان بەرگری بکەن و دووچاری ئەو کردەوە پیسە نەبن کە دژی مرۆڤایەتی یە، هەرچۆنێ میهرەبانیشە لەگەڵ گەل و کۆمەڵ کە بە ئارامەوە لە ماڵی خۆیان دا دانیشن و غەمی دزینی ماڵەکەی خۆیان نەخۆن، ئینجا ئەو نەفامانە نازانن کە ئەو نەخۆشی یە بەدە – دزی – پێویستە چارەسەر کردن و نەهێشتنی لەناو گەل و کۆمەڵ دا، چارەسەریشی تەنها بەو تۆڵە سەختەیە – واتە لەگەڵ ئەو مەرج و شەرتانەی کە باس کران – وەك دەرکەوت بە بەراورد کردن لە ژیان دا، ئەوەتا لەپاش هاتنە خوارەوەی بە بڕینی چەند دەستێك تاوانی دزی لە ریشە هێنرا، لە ماوەی ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) و هەر چوار خەلیفەکەدا ژمارەی دەست بڕین لە شەش تێ نەپەڕین، لە پاش ئەوەیش لە هەر شوێن و ناوچەیەك کە لە وڵاتی ئیسلام داتا ناوی دەست بڕین ما دزی نەما مەگەر زۆر بەدەگمەن، تەنانەت لەم چەرخ و سەدەمەیش دا لە وڵاتی(سعودیە) دزی نەماوە لەناو دانیشتوانی ئەو وڵاتەدا، هەر دزی یەك کە روو ئەدا – بە تایبەتی لەکاتی حەج دا – ئەدۆزرێتەوە و دەرئەکەوێ کە لەلایەن دانیشتوانەوە نی یە، بەڵکو لەلایەن ئەوانەوەیە کە لە دەرەوەی وڵاتەوە هاتوون، بەڵام لە هەر ناوچەیەك دا کە باس و ناوی دەست بڕینی تیا نەما، ئەو ناوچەیە پڕ بوو لە دزی و جەردەیی، بەڵێ بەڕاستی هەر خوا عەزیز و حەکیمە و ئەزانێ دەرمانی هەر دەردێ چی یە.

یاسا و قانوونە دەست کردەکان تۆڵەی دزی یان کرد بە بەند کردن، ئەو تۆڵەیە وەك شتێکی ئاشکرایە کە چارەسەر نەبوو، هەروەها ئاشکرایە کە لە چەند بارێکەوە زیانی هەیە:

١– یەك خستن و وەستانی دزەکان لە کەسب و کار، لەگەڵ گرتنە گەردنی ئەرکی بەخێو کردن و ژیانیان، کە ئەوەش بە زیانی خۆیان و گشتی تەواو ئەبێ.

٢– دوورخستنەوەیان لە ماڵ و منداڵ و کەس و کار کە ئەوەش وەك سزایەکی دەروونی یە بۆ هەردوولا، لە هەمان کات دا زۆر لەو دزانە خاوەنی ژن و منداڵی وردن، کەواتە ئەبێ ئەوانە بەرەلا بن و لەوان دووچاری گەلێ شتی خراپ بن.

٣- زۆر لەو دزانە - وەك بە ئاشكرا بینراوە - دووچاری كردەوەی بەد و بەد خویی و بێ ناموسی ئەبن.

٤- رادێن و رام ئەبن لەسەر تەمەڵی و تەوەزەلی و كەڵكی كۆمەڵایەتی یان پێوە نامێنێ.

بەڵێ هەر خوایە عەزیز و حەكیم، هەركەس ژێر بێ هەرگیز سەرناكاتەوە لە هیچ كارو بڕیارێكی خوا، مەبەست لەم لێكۆڵینەوە روون كردنەوەی بەرزی و پاكی كارو بڕیارەكەی خوایە بۆ ئەو نەفامانە، بەڵكو بەهۆی ئەوەوە ژێر ببن و بڕوا بێنن و دووچاری بەد بەختی رۆژی دوایی نەبن، خوا پەنامان بدات. ئینجا بە گوێرەی راو مەزهەبی ئیمامی مالیك و شافیعی یەكان مەرجی بڕین هاتە جێ ئەبێ دەستی دزەكە ببڕێ و رزگار بوونی نی یە، بەلای ئیمامی مالیكەوە ئەبێ ئەوەی دزیویەتی بیداتەوە بە خاوەنی ئەگەر مابێ، ئەگەر نەمابێ ئەبێ بیبژێرێ، ئەگەر دزەكە دەوڵەمەند بێ، بەلای شافیعی یەوە ئەگەر هەژاریش بێ هەر ئەو ماڵەی لەسەرە، بەڵام بەلای(ئیمامی حەنەفی و ئیمامی ئەحمەد و ثوری و ئیسحاق) ەوە یەكێ لەو دوو شتەی لەسەرە: بڕین، یا بژاردن. هەردووی لەسەر كۆناكرێتەوە، هەركام لەم دوو كۆمەڵە بەڵگەو رابەری خۆیان هەیە، بەڵام بەڕاستی بەڵگەی مالیك و شافیعی لەدڵ دا بەهێز ترە، خوا خۆی باش ئەزانێ. ئینجا بەگوێرەی باوی خۆی قاپی تۆبە و گەڕانەوەی لەسەر پشتە بۆ هەركەسێك كە مەیلی ببێ، بەڵام تەنها پەشیمانی و گەڕانەوە بەس نی یە، بەڵكو ئەبێ خۆی چاك بكات لە باتی خراپەكاری یەكەی، چونكە ئەگەر لە پاش ئەو تاوان و خراپەیە و پەشیمان بوونەوە، نەكەوێتە بزووتنەوەو بەرە و چاكە نەڕوا و بە بۆشی و دەست خاڵیتی بمێنێتەوە، ئەگەڕێتەوە بۆ تاوان و خراپە، بەڵام كە خەریك بوو بە چاكەوە دەستی ئەگیرێ و ناگەڕێتەوە،

فَمَن تَابَ مِنۢ بَعۡدِ ظُلۡمِهِۦ وَأَصۡلَحَ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ عَلَيۡهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿٣٩﴾ أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿٤٠﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿فَمَن تَابَ مِنۢ بَعۡدِ ظُلۡمِهِۦ﴾ ئینجا هەرکەس لە دزەکان تۆبەی کرد و گەڕایەوە بۆلای خوا لەپاش تاوانەکەی - واتە دزی یەکەی - تۆبەی کرد و پەشیمان بوویەوە بڕیاری دا لەسەر نەگەڕانەوە بۆ سەر ئەو تاوانە: ﴿وَأَصۡلَحَ﴾ کاروباری خۆی چاك کرد بە رازی کردنی خاوەن هەقەکە، یان بە کردەوەی چاك لەباتی ئەو تاوان و خراپە کە کردی بەم رەنگە دامەزراو و بەردەوام بێ لەسەر تۆبە و گەڕانەوەکەی ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ عَلَيۡهِۚ﴾ بێگومان خوا تۆبە و گەڕانەوەکەی لێ وەرئەگرێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ﴾ چونکە بەڕاستی خوا زۆر لێ بوردەی میهرەبانە، هێندێ لە زانایانی پاش هاوەڵەکان لەسەر ئەوەن کە بەو تۆبە و گەڕانەوە دەست بڕینەکەی لەسەر نامێنێ،(ئیمامی شافیعی) ش لەسەر ئەو رایەیە لە وتەیەکی دا، بەڵام کۆمەڵ و جەماوەر لەسەر ئەوەن کە لە سەری لا ناچێ و هەر ئەبێ دەستی ببڕێ.

لەپاش باسی ئەو تاوان و تۆڵە و لێ بوردنە، ئینجا یاسا و بڕوایەکی گشتی ئەمێنێ بە دوایان دا کە تۆڵە و پاداشت لەسەر ئەوە راگیرە لە هەردوو جیهان دا، ئەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ ئایا نەتزانیوە کە هەر بۆ خوایە خاوەنێتی و پادشایەتی ئاسمانەکان و زەوی ﴿يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ﴾ سزای هەرکەسێك ئەدا کە خوا خۆی مەیلی ببێ، ئەبووریٚ لە هەرکەسێکیش کە مەیلی ببێ، هەرچەند لێ بوردن و میهرەبانی خوا لە پێشە، بەڵام لێرەدا شوێنی هەڕەشەیە، کەواتە پێش خستنی سزادان رێك و پێك ترە، هەموو وتەیەکی قورئان ئەبێ لە جێ و شوێنی خۆی دا بێ و دەست نادا بۆ گۆڕان، ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ﴾ خوا بەسەر هەموو شتێك دا توانا و دەسەڵات دارە، کەواتە ئەو خاوەنێتی و پادشایەتی یە سەرچاوەیە بۆ هەموو شتێ، سەرچاوەیە بۆ دروست کردن و بەدی هێنانی

ئەم ئاسمان و زەوی یە، هەر ئەویش سەرچاوەیە بۆ دانان و بڕیار دانی ئەم یاسا و شەریعەتە لە جیهان دا و تۆڵە و پاداشت لە ڕۆژی دوایی دا، بە هیچ کلۆجیێ جیا کردنەوەو دابەش کردن نابێ، ئەبێ هەموو شتێ بگەڕێتەوە بۆلای ئەو تاقانە دەسەڵاتە، ئەبێ هەر لەو بناسرێ و تایبەتی بکرێ هەر بەو تەنیا دەسەڵاتەوە.

ئینجا لێرە بە دواوە تا ئایەتی(٥٠) باسی گرنگ ترین مەسەلە ئەکات لە ئایین دا کە، ئەو مەسەلەی کە قورئان لە چەند شوێن دا ئەیهێنێ، بە چەند شێوەو لە چەند بارو ڕوویەکەوە ئەیەوێ دایمەزرێنێ و بیچەسپێنێ لە دڵ و دەروون دا، مەسەلەی حاکمێتی و حوکمڕانی و دانانی بەرنامە و یاسا، قورئان ئەیەوێ بە ڕوونی ڕایگەیەنێ و بیچەسپێنێ لە وڵات دا کە حاکمێتی و حوکمڕانی و دانانی یاسا و شەریعەت تایبەتی یە بە خواوە و نابێ هیچ کەسێك و هیچ کۆمەڵێکی تیا بەشدار بکرێ، بەشدار کردنی هەر کەسێکی تر لەوەدا دژو پێچەوانەی بڕوا هێنانە بە تاك و تەنیایی خواو بە هیچ کلۆجێك ئەو دوو شتە کۆنابنەوە، وەك بۆمان دەرئەکەوێ بە ڕوونی و بە بێ پێچ و پەنا لەناو بەناوی ئەم ئایەتانەدا.

هەرکەسێك لای وابێ بڕوای هەیە بە خواو لاف ئەوە لێ بدا نابێ هیچ گومان و دوو دڵی یەکی ببێ لەم مەسەلەیەدا، چونکە:

١- بڕوا بە خوا بریتی یە لە ڕەزامەندی دڵ و مل کەچی دڵ بۆ هەموو فەرمان و شەریعەتەکەی، دەی هەرکەسێك فەرمان و شەریعەتەکەی ئەو لابا و لە جێگەی ئەودا یاسا و بەرنامە و شەریعەتی تر دابنێ، چۆن ئەو کەسە بڕوای هەیە بە خوا؟!!

٢- هەرکەس بڕوای ببێ بە خوا ئەبێ بڕوای وابێ کە شەریعەت و یاسای خوا دوورە لە هەموو هەڵە و ناڕێکی و نەگونجاوی یەك، چاکترو شیاوترە، هەرکەس وا نەزانێ ئەبێ لای وابێ کە خوا - پاکی و بێگەردی بۆ ئەو - نەزان و لێ نەزانە و کاردروست نی یە، دەی ئایا چ تاوان و ستەم و بێ بڕوایی یە لەوە خراپترو گەورەترە؟!

يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَلَمۡ تُؤۡمِن قُلُوبُهُمۡۛ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْۛ سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوۡمٍ ءَاخَرِينَ لَمۡ يَأۡتُوكَۖ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ مِنۢ بَعۡدِ مَوَاضِعِهِۦۖ يَقُولُونَ إِنۡ أُوتِيتُمۡ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمۡ تُؤۡتَوۡهُ فَٱحۡذَرُواْۚ وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتۡنَتَهُۥ فَلَن تَمۡلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔاۚ

---

**وەك لە چەند شوێن دا باس كرا و ئایەتەكان دەست نیشانمان بۆ ئەكەن، جوولەكەكانی مەدینە و ناپاكەكانیش لە پەنای ئەوان و بە هاندانی ئەوان، بە هیچ جۆر كۆتایی یان نەهێنا و رۆژێ لە رۆژان نەوەستان لە هەر پیلان و پرووپاگەندەیەك كە لە دەستیان هات بە دژی ئیسلام و موسڵمانان، بێگومان ئەو كردەوە پیسانە هۆی ئازاری دڵ و غەم و پەژارە بوون بۆ پێغەمبەر(ﷺ) جا لەبەر ئەوە خوای میهرەبان زۆر جار ئایەتی ئەنارد بۆ دڵنەوایی و دڵخۆش كردنی، یەكێ لەو ئایەتانە ئەمەیە كە لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ﴾ ئەی فروستادە و نێرراو ﴿لَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ﴾ با غەمبارت نەكەن ئەوانەی كە چەسپانی ئەكەن لە بێ بڕوایی دا، بێ بڕوایی بە تۆو بە ئایینەكەت، واتە بەوە غەمبار مەبە و گوێت نەبێ لەوەی ئەوانە بە چەسپان یو بە خۆشی دڵەوە پەلاماری بێ بڕوایی ئەدەن و ئەیگرنە گەردن، ئەوانەش كە ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفۡوَٰهِهِمۡ﴾ لەوانەن بەدەم ئەڵێن: بڕوامان هێناوە ﴿وَلَمۡ تُؤۡمِن قُلُوبُهُمۡۛ﴾ لە كاتێك دا دڵەكانیان بڕوای نەهێناوە - واتە ناپاكەكان - ﴿وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْۛ﴾ لەوانەی كە جوولەكەن و خۆیان بە یەهودی داناوە. ﴿سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ﴾ ئەوانە زۆربیسەرو وەرگرن بۆدرۆ، بیسەرو وەرگری ئەودرۆیانەن كەئەیبیستن لەسەرۆك وزاناكانیان، دەربارەی ئایینی خوا و گۆڕاندنی نامەی خوا و تانە و رەخنە گرتن لە پێغەمبەرمان(ﷺ) یان زۆر بیسەرن لە تۆ - ئەی پێغەمبەر - بۆ ئەوەی درۆت بە دەمەوە بكەن و ئەوەی كە لێت ئەبیسن گۆڕان و زیاد و كەمی تیا بەكار بێنن، ﴿سَمَّٰعُونَ لِقَوۡمٍ ءَاخَرِينَ لَمۡ يَأۡتُوكَۖ﴾ زۆر بیسەرن لە تۆ لەبەر دەستەیەكی تر كە نەهاتوون بۆلای تۆ و ئامادەی كۆڕ و كۆمەڵی تۆ**

نەبوون، واتە زۆر بە گرنگی هەواڵ لە تۆ وەرئەگرن و ئەیبەن بۆ ئەوانە و جاسووسن بەسەر تۆوە. ئینجا سیفەت و نیشانەیەکی تریان باس ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ مِنۢ بَعۡدِ مَوَاضِعِهِۦۖ﴾ وتەکانی نامەی خوا ئەگۆڕن و لای ئەدەن، لە پاش ئەوەی خوا لە شوێنەکانی خۆیان دا دایناون، واتە ئەوەی فەرز و پێویستی کردووە، ئەوەی حەڵاڵی کردووە، ئەوەی حەرام و قەدەغەیە حەرام و قەدەغەی کردووە، ئەوانە درۆ بەدەم نامەی خواوە ئەکەن و بە ئارەزووی خۆیان دەستکاری نامەی خوا ئەکەن. چەند ریوایەتێك هاتووە لەبارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانەوە، وەك بە درێژیی خوا لیێ خۆش بوو(ئالوسی) لە تەفسیرەکەی دا هێناونی، کە کورتە و پاڵفتەکەیان ئەمەیە دەستەیەك لە جوولەکە تاوانێکیان کردبوو: زینا، یان دزی، یان کوشتن. کە لە تەورات دا حەد و تۆڵەیان بۆ دیاریی کرابوو، بەڵام ئەوان لە یەکەمجارەوە بڕیاریان دا کە ئەو حەدد و تۆڵەیانە لە گەورەو پیاو ماقووڵ نەسێنن، بەڵکو هەر لە هەژار و ژێر دەستەکان دا بەکاریان بێنن، ئینجا دەستکاریی تریان تیا کرد و تۆڵە و حەددەکانیان گۆڕی بە شتی سووك، وەك لەناو موسڵمانانیش دا زۆر لە زانایانی بەناو موسڵمان بە چەند تەئویل و پینە و پەڕۆ بڕیارەکانی ئیسلامیان گۆڕی، تا گەیشتە ئەو رادەیە بە تەواوی حوکمی خوا لابرا و حوکم و بڕیاری بێگانەکان لە شوێنیان دا دانرا و چەسپێنرا، ئینجا کاتێ کە پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە حوکم و دەوڵەتی ئیسلام دامەزرا، ئەو جوولەکانە بە پیلان ناردیانە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بۆ پرسیار لەبارەی تۆڵە و حەددی یەکێ لەو تاوانانەی کە لە دەستیان قەوما، بڕیاریان دا کە ئەگەر بە پێی ئەوە نەبوو وەری نەگرن، وەك ئاماژە ئەکات بۆ ئەوە کە ئەفەرموێ: ﴿يَقُولُونَ إِنۡ أُوتِيتُمۡ هَٰذَا فَخُذُوهُ﴾ ئەگەر ئەمەتان پێ گوترا و راگەیەنرا – واتە ئەوەی کە دەست هەڵبەستی خۆیان و بە پێی ئارەزووی خۆیانە – ئەوا وەری گرن و بە پێی ئەوە رەفتار بکەن، ﴿وَإِن لَّمۡ تُؤۡتَوۡهُ فَٱحۡذَرُواْۚ﴾ ئەگەر ئەمەتان پێ نەگوترا، بەڵکو شتێکی تر بوو ئەوا خۆتان بپارێزن لە وەرگرتن و رەفتار پێ کردنی!! ئەو جوولەکانە گەیشتنە ئەو رادەیە لەلاری و بێ شەرمی و سەرکێشی دا، لەگەڵ خوا و ئایینی خواو پێغەمبەری خوادا(ﷺ)، ئەمە وێنە و شێوەی تەواوی ئەو

نامەدارانە بوو کاتێ کە دوور کەوتنەوە و دڵیان ڕەق بوو و گەرمی بیرو باوەڕەکەیان ساردبوویەوە و ڕووناکی ئایینەکەیان کوژایەوە، ئەیانویست و ئامانجیان ئەوەبوو بە هەر فێڵ و تەڵەکەیە دەرچن لە ئاینەکەیان و بە پێی ئارەزووی نەفسیان بجووڵێنەوە و ئایینە ڕاستەکەیان لار بکەنەوە بەلای ئارەزووی ناڕاست و ناڕەوای خۆیان دا، دەی ئایا لەم ئوممەتەیش دا وێنەی ئەوانە نەبووە و نی یە؟ ئایا نەبووە و نی یە زانایانی بەناو موسڵمان: کە بەدەم ئەڵێن موسڵمانین و بەڵام دڵیان بێ بەشە لە بڕوا، کە بە هەمیشەیی هەوڵیان داوە و هەوڵ ئەدەن بۆ لادان و خۆ دزینەوە لە مەبەستی ئایینی خواو رووکەش و پۆشاکی ئایینی ئەکەن بە بەر ئەو لادانەدا، شێوەیەکی ئایینی ئەهێنن بەسەر خۆیان دا بۆ ئەوەی پیلان و تەڵەکەیان لێ وەرگیرێ! بەڵام کاتێ کە باری ڕاست هاتە پێشەوە خۆیانی لێ ئەپارێزن، ڕێك و پێك بە وێنەی ئەو نامەدارانە! بەڕاستی وەك ئەم ئایەتە دەربارەی ئەمانەی ئێستا هاتبێتە خوارەوە، ڕەنگە لەبەر ئەمە خوای پەروەردگار داستان و سەرگوزەشتەی ئەو ئیسرائیلی یانە بەم درێژیی یە باس ئەکات، تا هەموو چینەکانی موسڵمان بترسێنێ لەو کردەوە بەدانەی ئەوان، ئەوانەی کە ژیرو تێگەیشتوون پەندو ئامۆژگاری وەرگرن و وریای خۆیان بن، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی خوا نەترازێن بە وێنەی ئەوان، ئەوانە بە کردەوەی خراپی خۆیان، خۆیان شایستەی سزاو خەشمی خوا کرد، شایستەی ئەوەبوون کە خوا ئیرادە و مەیلی سزایان بکات، هەرکەسیش وای لێهات هیچ کەس چارەسەری دەردی ناکات، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتْنَتَهُۥ﴾ هەرکەسێك خوامەیلی سزادانی بکات،وەك(حسن و قتادة) ئەفەرمون. یان لەناوبردنی، وەك(سدي و ضحاك) ئەفەرمون، یان ڕیسوا کردن و ئابڕووبردنی، وەك (زجاج) ئەفەرموێ. یان گومڕایی وبێ بڕوایی، وەك هێندێ ترئەفەرمون. هەرکەس خوا مەیلی ئەوەی بکات ﴿فَلَن تَمْلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا﴾ هەرگیز تۆ خاوەنی هیچ شتێك نابی بۆی لەلایەن خواوە، واتە هەرگیز ناتوانی بەرگری هیچ شتێکی لێ بکەیت کە خوا بیەوێ بەسەری بێنێ.

أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَمۡ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمۡۚ لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿٤١﴾ سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِۚ فَإِن جَآءُوكَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡۖ وَإِن تُعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيۡـٔٗاۖ وَإِنۡ حَكَمۡتَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ﴿٤٢﴾

---

ئەوانە دڵیان پیس بووە بە ناپاکی و بێ بڕوایی و گومڕایی، خۆیان ئەو پیسی یەیان هەڵبژاردووە بۆ خۆیان، لەبەر ئەوە خوایش ئەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ﴾ ئەوانە کەسانێکن ﴿لَمۡ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمۡ﴾ کە خوا نەیویست دڵەکانیان پاك و خاوێن بکاتەوە، لەبەر ئەوە دووچار بوون لە هەردوو جیهان دا، وەکو ئەفەرموێ: ﴿لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞ﴾ بۆیان هەیە لە جیهان دا ریسوایی و بێ ئابڕوویی یەکی گەورە، ناپاکەکان بە دەرکەوتنی ناپاکی یەکەیان و سەرکەوتن و هێزی موسڵمانان، جوولەکەکانیش بە دەرکەوتنی درۆ و دەست هەڵبەستەکەیان بە دەم خواوە، بە دەرکردن و ئاوارە کردنی(بنی نضیر) و لە پاش کوشتن و بەدیل کردنی(بنی قریظة)، ئەو زەبوونی و ریسوایی یە هەر مایەوە لە نەوەو چینەکانی پاش یەکەم چین کە ئەم ئایەتەیان تیا هاتە خوارەوە ﴿وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾ بۆیان هەیە لە رۆژی دواییش دا سزایەکی زۆر گەورە کە هەمیشەیی یە لە ئاگری دۆزەخ و ئەوەی بۆیان ئامادە کراوە، خوا پەنامان بدات لە خەشم و سزای خۆی، کەواتە با پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) غەمبار نەبێ بە چەسپانی کردنی ئەوانە و سۆز و پەرۆشیان بۆ بێ بڕوایی و بەدکرداریی، با هیچ گوێ ی نەبێ لێ یان، هەروەها با رابەرانی ئەم ئایینە پیرۆزە هەر خەریکی هەوڵ و تێکۆشانی خۆیان بن و غەمبار نەبن و گوێ یان نەبێ لەوانەی کە بەدەستی خۆیان خۆیان دووچاری بەدبەختی و سزای هەردوو جیهان ئەکەن و خۆیان بەش بڕاو ئەکەن لە بەختەوەری و نازو رێزی بەهەشت. ئینجا هەمیتر ئەڕوا لەسەر ئەو ناپاك و جوولەکانە، بە دەرخستنی بەدخویی و بەد کرداریی تریان، پێش ئەوەی روونی بکاتەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کە چۆن رەفتاریان لەگەڵ بکات کاتێ کە بێن بۆ دادگاکەی و داوای بڕیاری لێ بکەن، ئەفەرموێ: ﴿سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ﴾ ئەوانە زۆر بیسەری درۆن و بە خۆشی و باشی وەری ئەگرن

بەو جۆرەی کە لە پێشەوە وتمان، ئەم سیفەتە بەدەی دووبارە کردەوە بۆیان تا نیشان بدات کە ئەوە بووە بە سیفەتێکی دامەزراو تیایان دا و تێکەڵی سرووشتیان بووە، یان مەبەست بەمەیان حاکمەکانیانە، وەك لە فەرمودەی(حسن) موە وەرئەگیرێ کە مەردوم ئەچوون بۆلای یان بە بەرتیل درۆیان لێ وەرئەگرتن و بڕیاری ناهەقیان بۆ ئەدان، یان مەبەست هەژارەکانیانە کە بە پارە درۆ و دەلەسەی دەوڵەمەندەکانیان ئەبیست و وەرئەگرت، لەسەر هەر بار لێرەدا ئەم سیفەتە بەدەی تریشی بۆ باس کردن، ﴿أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِ﴾ زۆر بخۆری حەرامن، ئەو حەرامەی کە وەرگرتن و خواردنی عارە و سووکی و ریسوایی تیایە وەك وەرئەگیرێ لە فەرمودەی(عمرو عثمان و علی و ئیبن و عباس و ئەبو هورەیرە و مجاهد) موە – خوایان لێ رازی بێت – کە یەکەم و سەردەستەکەیان سوودو بەرتیل و کڕینی فتوای ناهەقە کە زۆر بوو بوو بە باو لەناو ئیسرائیلی یەکان دا، یان هەر مەبەست بەرتیلە وەك(حسن) ئەفەرموێ. یان مەبەست ئەو کڕین و پارەیە کە هەژارەکان وەریان ئەگرت لە دەوڵەمەندەکان لەسەر ئەو درۆ و دەلەسانەی کە لێ یان وەرئەگرتن، وەك هێندێك لەسەر ئەمەن، بە هەرکام ئەگونجێ، بەڵام دڵ بۆ یەکەم باشتر ئەڕوا بێجگە لەوەی کە فەرمودەی ئەو باوەڕ پێ کراوانەی لەسەرە کە باس کران.

لەپاش ئەوەی کە هێندێ لە حاڵ و باری ئەو جوولەکانەی باس کرد، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿فَإِن جَآءُوكَ﴾ ئەگەر ئەوانە هاتن بۆلات و دادیان هێنا بۆلای تۆ بۆ بڕینەوەی ئاژاوەی ناو خۆیان و بڕیار دەرکردن بۆیان ﴿فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ﴾ بڕیار دەربکە لە بەینیان دا، ﴿أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ﴾ یان وازیان لێ بێنە و گوێ یان مەدەرێ، واتە مەیلی خۆتە هەرکام لەم دووبارە ئەکەیت، ﴿وَإِن تُعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيۡـٔٗا﴾ ئەگەر وازیان لێ بێنی و گوێ یان نەدەیتێ، هەرگیز ئەوان زیانی هیچ شتێکت پێ ناگەیەنن، واتە هەرچەند ئەو گوێ پێ نەدانە لەوانەیە دوژمنایەتی و کینە بەریی لێ پەیدا ببێ، بەڵام هیچ باکت نەبێ لەوە، چونکە خوا تۆ ئەپارێزێ و ئەوانە ناتوانن زیانت پێ بگەیەنن ﴿وَإِنۡ حَكَمۡتَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِۚ﴾ ئەگەر حوکم و بڕیارت هەڵبژارد و ویستت ئەوە بکەیت، ئەو کاتە حوکم و بڕیار بدە لە نێوانیان دا بەو داد و دادپەروەری یەی کە فەرمانت پێ دراوە، واتە بە قورئان و بە پێی شەریعەتی

ئیسلام بڕیار بده له نێوانیان دا و هیچ گوێت نهبێ له لاری و نالهباریی ئهوان ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ﴾ چونکه بهڕاستی خوا دادگهرانی خۆش ئهوێ.

شتێکی ئاشکرایه که ئهم ئایهته کارهکهی خسته دهست و مهیلی پێغهمبهر(ﷺ) و به مهیلی خۆی ههرکام لهو دووباره هه‌ڵبژێرێ، بهڵام له ئایهتی داهاتودا پێویستی ئهکات لهسهری حوکم و بڕیار دان به پێی ئهوهی خوا بۆی ناردووه، جا لهبهر ئهوه وهك(جصاص) ئهفهرموێ له کتێبی(الأحكام) دا: زانایان دووبهرهکین، دهستهیهك لهسهر ئهوهن که ئهم ئایهته سڕرایهوه به ئایهتی داهاتوو، زۆربهی زانایانی پێشووی ئوممهت لهسهر ئهمهن، وهك ریوایهتیش کراوه له(ئیبن و عهباس) هوه – خوایان لێ رازی بێت –. بێگومان ئهوانه له خۆڕایی ئهوه نافهرمون و ئهبێ بهڵگهی تهواویان بهدهستهوه ههبێ، هێندێ ئهفهرمون: ئهم ئایهتی ئێره بۆ ئهوانهیه که پهیمان و زیممهیان لهگهڵ نهکرابێ، ئایهتی داهاتوو بۆ ئهوانهیه که ئهو پهیمانهیان لهگهڵ کرابێ که پێ یان ئهوترێ:(اهل الذمة)، هێندێکی تر ئهفهرمون. ئهم ئایهتی ئێره گشتی یه و ئایهتی داهاتوو تایبهتی یه بهوانهوه که(جزية) یان لێ ئهسێنرێ.

بهههرحاڵ دژایهتی نی یه لهنێوان ئهم ئایهتهو ئایهتی داهاتوودا، ههروهها لهسهر ههموو بارێ حوکم و بڕیاری ئیسلام که بدرێ بهسهریان دا و ناچار بکرێن لهسهری بۆ شتێکه که حوکم و بڕیارهکهی له شهریعهتهکهی خۆی دا هاتبێ وهك تۆڵه و حهددی زینا و دزی و سوود خواردن، بۆ شتێك که پهیوهندی به ڕژێم و یاسای گشتی یهوه ببێ، وهك ئاژاوه نانهوه و خراپهکاریی له وڵات دا، نهك بۆ شتێکه که تایبهتی بێت به خۆیانهوه و لهناو خۆیان دا بهکاری بێنن وهك خواردنی گۆشتی بهراز و ئارهق و ههر شتێکی تری تایبهتی به خۆیانهوه لهناو خۆیان دا بهکاری بێنن.

ئهو جوولهکانه هێندێ مهسهلهیان ئههێنا بۆلای پێغهمبهر(ﷺ) بۆ ئهوهی بڕیاری لهسهر دهرکات، یهکێ لهوانه مهسهلهی پیاو و ئافرهتێك بوو که زینایان کردبوو، وهك(ئیمامی بوخاری و موسلیم) ئهیهێنن له(ئیمامی مالیك) هوه و ئهویش له(ئیبن و عومهر) هوه ئهیهێنێ – خوا له ههموویان رازی بێ، که ئهفهرموێ: جوولهکهکان هاتن و پرسیاریان کرد که پیاو و ئافرهتێکیان زینایان کردووه، پێغهمبهریش(ﷺ) فهرموی: ئایا له تهورات دا بڕیاری رهجم کردن ههیه؟ ئهوانیش وتیان نهخێر نی یه و بهڵکو ئێمه زینا کهرهکان بێ ئابڕوو ئهکهین و

جەڵدەیان لیٚ ئەدەین و دارکاری یان ئەکەین،(عبدالله ی کوڕی سەلام) یش فەرموی: درۆ ئەکەن لە تەورات دا ڕەجم و بەردە باران هەیە، ئینجا تەوراتیان هێنا و کردیانەوە، یەکێکیان دەست ئەخاتە سەر ئایەتی ڕەجم و پێش و پاشەکەی ئەخوێنێتەوە، ئینجا عبدالله ئەفەرمویٚ: دەستت بەرز بکەرەوە و لایبە، ئەویش دەست بەرز ئەکاتەوە و ئەزانن ئایەتی ڕەجمی تیایە، ئینجا ئەڵێن: ئەی محمد ڕاست ئەکات ئایەتی ڕەجمی تێدایە! ئەمیش فەرمان ئەدا و ڕەجم ئەکرێن.

یەکێکی تر لەو مەسەلانە ئەمەیە کە(ئیمامی ئەحمەد) ئەیهێنیٚ لە(ئیبن و عباس) ەوە – خوا لیٚ یان ڕازی بێت – ئەفەرمویٚ: خێڵی(بنی نضیر) زالٚ و بەدەسەڵات بوون بەسەر(بنی قریظة) دا لە پێش ئیسلام دا، بڕیاریان دا و ڕازی بوون بەوە کە هەرکەسێك لە(بنی قریظة) یەکێکی(بنی نضیر) بکوژیٚ خوێنەکەی پەنجا بێت، هەرکەسێکی(بنی نضیر) کەسێکی(بنی قریظة) بکوژیٚ خوێنەکەی سەد بێت، واتە خوێنی(بنی قریظة) نیوەی خوێنی(بنی نضیر) بێت، لەسەر ئەو بار و بڕیارە مانەوە هەتا پێغەمبەر(ﷺ) هاتە مەدینە، ئینجا(بنی قریظة) ئەڵێن: چۆن دوو خێڵ کە لە یەك تیرەو نەژاد بن، لەسەر یەك ئاین بن و لە وڵاتێك دا بن، خوێنی هێندێکیان نیوەی خوێنی ئەوەی ترە؟ ئێمە تا ئێستا کە وامان کردووە و بەوە ڕازی بووین لە ترسا بووە و ئێوە ستەمتان لیٚ کردووین، ئێستا کە محمد هاتووە بەو جۆرە ناکەین! بەهۆی ئەوەوە خەریك ئەبن بکەونە جەنگ لە پاش دا بڕیار ئەدەن کە پێغەمبەر(ﷺ) بکەن بە حەکەم لە نێوان خۆیان دا، ئینجا(بنی نضیر) بیر ئەکەنەوە و ئەزانن کە قسەکە ڕاستە و هەرگیز پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی نابیٚ بە بڕیاری وا، لەبەر ئەوە چەند کەسێك لە ناپاکەکان ئەنێرن تا بزانن ڕاو بڕیاری پێغەمبەر(ﷺ) چۆنە؟ ئەگەر بە پێی دڵی ئەمان بوو ئەوا ڕازین بەوەی بیکەن بە حەکەم، ئەگەر وا نەبوو نەیکەن بە حەکەم. ئینجا کە هاتن خوا پێغەمبەری(ﷺ) ئاگادار کرد بە کارو نیازەکەی ئەوان و ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە، ئەوانە بەدوای حەقیانەت و ڕاستی دا نەئەگەڕان، بەڵکو ئەوان لایان دابوو لە تەورات کە بڕوایان پیٚی بوو و بە نامەی خوایان ئەزانی، لەبەر ئەوە حوکم و بڕیارەکەی سەخت و قورس بوو، ئەیانویست حوکم و بڕیارێکی سووك تریان دەست بکەویٚ لای پێغەمبەر(ﷺ) جا ئەوا خوا بە شێوەی سەرسوڕهێنان و بێزاری دەربڕین لەو هەڵوێستە ناڕەوایانە،

وَكَيۡفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِندَهُمُ ٱلتَّوۡرَىٰةُ فِيهَا حُكۡمُ ٱللَّهِ ثُمَّ يَتَوَلَّوۡنَ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَۚ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٤٣﴾ إِنَّآ أَنزَلۡنَا ٱلتَّوۡرَىٰةَ فِيهَا هُدٗى وَنُورٞۚ يَحۡكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسۡلَمُواْ

---

ئەفەرموێ بە پێغەمبەر(ﷺ) ﴿وَكَيۡفَ يُحَكِّمُونَكَ﴾ ئایا ئەوانە چۆن تۆ ئەکەن بە حەکەم ﴿وَعِندَهُمُ ٱلتَّوۡرَىٰةُ﴾ لەکاتێك دا کە تەوراتیان لایە ﴿فِيهَا حُكۡمُ ٱللَّهِ﴾ کە تیای دا هەیە حوکم و بڕیاری خوا، واتە سەرت سوڕ بمێنێ لەوانە کە تۆ ئەکەن بە حەکەم لە کاتێك دا کە بڕوایشیان نی یە پێت، لا ئەدەن لە تەورات کە بڕوایان پێ ی هەیە و حوکم و بڕیاری خوایشی تیایە، کەواتە گێڕانی تۆ بە حەکەم بۆ ئەوە نی یە کە هەق و ڕاستی یان بۆ دەرکەوێ، بەڵکو بە تەمای ئەوەن کە حوکم و بڕیارێکی سووك و ئاسانتریان دەست کەوێ لای تۆ، ئیتر هەرچەند بڕوایشیان پێ ی نەبێ و بە حوکم و بڕیاری خوا نەزانن!! سەیر تر ئەوەیە کە ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ يَتَوَلَّوۡنَ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَۚ﴾ ئینجا لەپاش ئەوەی کە گێڕایتیان بە حەکەم ڕوو وەرئەگێڕن و ڕازی نین بە حوکم و بڕیارەکەت!! یان لەپاش ئەوەی کە حوکم و بڕیاری خوایان دەست کەوت لە تەورات دا، ئەوەی لە تەورات دا بوو ڕێك و دەقی قورئانیشە لەو مەسەلەدا، کەواتە دەرکەوت نەفامی و سەرکێشی ئەوانە لە سێ بارەوە:

١- لادانیان لە حوکم و بڕیاری نامەکەی خۆیان کە بڕوایان پێ ی هەیە.

٢- هاتنیان بۆلای تۆ ڕازی بوونیان بە حوکم و بڕیاری تۆ کە بڕوایشیان پێ ی نی یە و بە ناهەقی ئەزانن.

٣- ڕوو وەرگێڕان و ڕازی نەبوونیان بە حوکم و بڕیارەکەت لە پاش گێڕانت بە حەکەم و ڕازی بوونیان پێت، کەواتە نابێ کەس هەڵخەڵەتێ بەوانە و بە بڕوادار یان دابنێ، چونکە لادانیان نیشانەی بێ بڕوایی یانە، وەك قورئان بە توندی لە بڕوادارانیان دەرئەکات و دڵنیایی ئەکات لەسەر بێ بڕوایی یان، کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ بێگومان ئەوانە نین بە بڕوادار، بڕوادار نین بە تەورات هەرچەند لاف بڕوا لێ بدەن، چونکە لایان دا و ڕازی نەبوون بە حوکم و بڕیارەکەی، هەرچۆنێ بڕوا دار نین

به پێغەمبەر(ﷺ) بە حوکم و بڕیارەکەی هەرچەند گێڕایان بە حەکەم و لە پێشەوە لاف ڕەزامەندی یان لێ دا بە حوکم و بڕیاری، بەلاَم کە بۆیان دەرکەوت وەك تەوراتە پشتیان تێ کرد و ڕازی نەبوون پێی!!

خوای گەورە لەم ئایەتی پێشوەدا بڕیاری بێ بڕوایی دا بەسەر ئەو کەسانەی کە حوکم و بڕیاری خوایان بەسەردا ئەدرێ و ڕازی نابن بەو حوکم و بڕیارە، ئینجا ئەوا بڕیاری بێ بڕواییش ئەدا بەسەر ئەو حاکم و بڕیار دەرکەرانەی کە بڕیار نادەن بە گوێرەی ئەوەی کە خوا ناردویەتی یە خوارەوە، حوکم و بڕیارێك ئەدا بەسەریان دا کە هەموو ئایینەکانی پێشووی پێ هاتووە: لە یەکەمجارەوە دەست پێ ئەکات بە تەورات: ئەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ ﴾ بێگومان ئێمە تەوراتمان نارده خوارەوە ﴿فِيهَا هُدًى وَنُورٌ﴾ بەجۆرێ ڕێنموونی و ڕووناکی تیایە، ڕێنموونی مەردومان بۆ ڕێی ڕاست، ڕێنموونی بۆ بیروباوەڕی ڕاست و بڕیاری ڕاست کە هێندێ لەو بڕیارانە ئەوانەن کە ئەو جوولەکانە لێ یان لائەدا و ئەیانویست بیان گۆڕن بە سووك و ئاسانتر بە پێی ئارەزووی ناڕاستی خۆیان، ڕووناکی تیایە و ئەوەی لێ یان بشێوێ و تاریك بێ لە دڵ و دەروونیان دا، بۆیان دەرئەخات و ڕوونی ئەکاتەوە وەك(ئیبن و عەباس) تەفسیری ئەم دوو وتەی بەو جۆرە کردووەتەوە، ﴿يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ ﴾ لەکاتێك دا کە حوکم بکەن بە بڕیارەکانی تەورات ئەو پێغەمبەرانەی کە موسڵمان و مل کەچ بوون بۆ خوا، وە ئایینەکەیان پاك و خاوێن کرد بۆ خوا لەسەر ئایین و میللەتی ئیبراهیم.بە دیمەن و ڕواڵەت بەم موسڵمانێتی و مل کەچی یە وەسف و سەنای ئەو پێغەمبەرانە ئەکات، بەلاَم – وەك ئیبن و منیر – ئەفەرموێ: مەبەست دەرخستنی گەورەیی و بەرزی ئیسلامە کە ئەوەندە سیفەتێکی گەورەیە کراوە بە سیفەتێکی تایبەتی دیاریی بۆ پێغەمبەران کە خاوەنی بەرزترین پلەن لەناو دروست کراوەکانی خوادا، وەك لە ئایەتی سورەتی(غافر) دا وەسف و سەنای هەڵگرەکانی عەرشی کردووە بە سیفەتی بڕوا بە خوا تا دەرکەوێ کە بڕوا بە خوا تا ئەو ڕادەیە بەرز و گەورەیە وەسف و سەنای ئەو فریشتانەی پێ کراوە، بێگومان ئەوەش ئەبێ بە هاندەر و پاڵدەرێکی بەهێزو گەورە بۆ مەردومانی تر بۆ تێکۆشانیان لە بەشدار بوونیان لەو دوو سیفەتە بەرزەدا.

حوكم بكەن بەو تەوراتە ﴿لِلَّذِينَ هَادُواْ﴾ بۆ ئەوانەی کە ناوبراون بە یەهود کە ئەوانەش دەست پێ ئەکەن لەو یەکەم چینەی کە حەزرەتی موسای بۆ ڕەوانە کرا تا ئەگاتە ناردنی حەزرەتی عیسا – سەلامی خوا لە هەموویان بێت – ئەو شەریعەتی تەوراتە تایبەتی بووە بەوانەوەو گشتی نەبووە، وەك شەریعەتی عیسایش گشتی نەبووەو هاتووە تا ناردنی شەریعەتی قورئان کە بۆ گشتی یە و هەمیشەیی یە هەتا دنیا دنیایە، ئەو تەوراتە هات بۆ ئەو گەل و ئوممەتە کە بە پێی ئەوە ڕەفتار بکەن بۆ هەموو کاروباری هەردوو جیهان، شەریعەتێکی تێرو تەواو بووە بۆ ئەو ماوەیە و دەستی نەداوە بۆ گۆڕاندن و لابردن تا کاتی هاتنی ئینجیل و ڕەوانە کردنی عیسا(علیه السلام)، هەر بڕیارێکی تەورات کە بە پێی زانین و بڕیاری خوا لابرابێ لە شەریعەتی ئینجیل دا لابراوە و هەرچی مابێتەوە ماوەتەوە لەگەڵ هەر حوکم و بڕیارێکی تازە کە لە ئینجیل دا هاتبێ، موسا و هارون و هەرچی پێغەمبەرانی پاش ئەوانە تا هاتنی ئینجیل ئەبێ بە پێی تەورات ڕەفتاریان کردبێ، وەك عیسا و پێغەمبەرێکی تر کە پاش ڕەوانە کردنی عیسا هاتبێ ئەبێ بە پێی ئینجیل ڕەفتاریان کردبێ، تا هاتنی قورئان، جا لەبەر ئەوە فەرموی ﴿یحکم بها النبیون﴾ دیارە لەجێ یە پێغەمبەرەکانی شوێنی تەورات کەوتبن و ڕەفتاریان بە پێی ئەو کردبێ، ئەبێ خواناسان و زاناکانیش کە جێنشینن لەوە لانەدەن، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ﴾ زانا زۆر بەرزەکان و زاناکانی تر کە ڕادەیان لە زانین دا کەمترە لەوان حوکم و بڕیار بدەن بە تەورات لەپاش پێغەمبەرەکان، یان لەکاتی بوونی ئەوانیش دا لەسەر فەرمانی ئەوان کاتێ کە ئەوان ئامادە نەبن و بە دیارەوە نەبن، هێندێ ئەفەرمون: مەبەست بە یەکەم عابید و خواناسەکانە کە بە تەواوی لێ بڕاون بۆ خواپەرستی، مەبەست بە دووەم: زاناکانە ئیتر لە بەرز و لە نزم، بە هەرکام مەبەست بن، پێویست بووە حوکم هەر بە تەورات بکەن ﴿بِمَا ٱسۡتُحۡفِظُواْ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ﴾ بەهۆی ئەو شتەی کە داوای پارێزگاری کرابوو لێ یان لەلایەن پێغەمبەرەکانیانەوە، کە تەوراتە و نامەی خوایە، واتە پێغەمبەرەکان داوایان کرد لەو خواناس و زانایانە کە پارێزگاری ئەو تەوراتە بکەن لە هەر گۆڕاندن و دەست کاری یەك، کەواتە تەورات بە سپاردە درابوو پێ یان بۆ پاراستن و پارێزگاری و ڕەفتار پێ کردن و ڕاگەیاندنی بە بێ گۆڕان و

دەست كاری كردن[1]، ﴿وَكَانُواْ عَلَيۡهِ شُهَدَآءَۚ﴾ پێغەمبەرەكان و خواناس و زاناكان شایەت بوون لەسەر ئەوەی هەرچی لە تەورات دا هاتووە هەقە و راستە و لەلایەن خواوە هاتووە، كەواتە بێگومان بڕیارەكانیان بەجێ هێناوە و پاراستوونیان لە هەر گۆڕاندن و لادانێك، یان مەبەست ئەوەیە: ئەو خواناس و زانایە هەرچۆنێ داوای پاراستنیان لێ كرا، هەروەها چاودێرو پارێزەر بوون بەسەری یەوە، بێگومان هەموو ئایینەكانی خوا هاتوون بۆ ئەوەی بن بە بەرنامەی ژیان، بەرنامەیەك كە بە كردەوە بەدی بهێنرێ لە ژیان دا، هاتوون بۆ ئەوەی خاوەنی سەركردایەتی ژیان بن بۆ ئەوانەی كە ئەو ئایینەیان بۆ رەوانە كراوە، نەهاتوون بۆ ئەوەی تەنها بیرو باوەڕێك بن لە دەروون دا، نەهاتوون بۆ ئەوەی تەنها نیشانە و دروشمێكی خواپەرستی بن و بەجێ بهێنرێن لە شوێنە تایبەتی یەكانی خواپەرستی دا، چونكە ئەو دوو شتە – هەرچۆنێ زۆر پێویستن بۆ ژیانی ئادەمی و زۆر گرنگ و بەكارن لە پەروەردە كردنی دەروونی ئادەمی دا – بە تەنیا بەس نین بۆ گرتنە دەستی جڵەوی ژیان و سەركردایەتی ژیان و هۆنینەوەی كاروباری ژیان و پاراستنی لە لاری و گرێ و كۆسپە فراوانەكەی ژیان و جیهان، ئەو دووانە بە تەنیا بەس نین و چارەسەر نین تا لەسەر ئەو بنەڕەتە بەرنامە و رژێم و شەریعەتێك نەبێ كە بە كردەوە بەدی بهێنرێن لە ژیان دا، یاسا و دەسەڵاتێك نەبێ كە زاڵ بێت و بتوانێ مەردوم بگێڕێتەوە بۆلای ئەو بەرنامە و شەریعەتە و تۆڵە بسێنێ لە دژو دوژمنان. هەروەها ژیانی ئادەمی رێك و راست نابێتەوە، مەگەر كاتێ كە ئەو بیرو باوەڕو خواپەرستی و شەریعەت و یاسایە، هەموو پێكەوە لە یەك سەرچاوەوە نەهاتبن، كە خاوەنی دەسەڵات بێت بەسەر دڵ و دەروون و پەنهانی دا، هەرچۆنێ دەسەڵات دار بێت بەسەر كردەوە و رەوشتەكان دا، بتوانێ پاداشت و تۆڵە بسێنێ بە پێی شەریعەتەكە لە ژیانی جیهان دا، هەرچۆنێ پاداشت و تۆڵەی ببێ بۆ رۆژی دواییش. بەڵام كاتێ كە سەرچاوە و دەسەڵات زیاد لە یەك شت بوو، كاتێ دەسەڵات درا بە خوا هەر لە دەروون و بۆ دروشم و نیشانەی خواپەرستی، دەسەڵات و كاربەدەستی درا بە غەیری خوا لە رژێم و یاسا و شەریعەت دا، كاتێ كە دەسەڵات درا بە خوا هەر لە پاداشت و تۆڵەی رۆژی دوایی دا، لە تۆڵەی جیهان دا دەسەڵات و كاربەدەستی بۆ غەیری خوا دانرا، لەو كاتانەدا دەروونی

---

[1] لەسەر ئەم بارە(ب) بۆ سەبەبی یەتە. رایەكی تر لەسەر ئەوەیە كە(ب) بەسترلوە بە(یحکم) و بڕیارە، واتە ئەو دوو تاقمە حوكم بكەن بەو تەوراتەی كە داوای پارێزگاری كراوە لێ یان كە نامەی خوایە، بەم جۆرەش هەر ئەبێ، بێجگە لەم دوو جۆرە بە چەند جۆرێكی تریش تەفسیر كراوەتەوە، بەڵام دوورن.

مـەردوم بـەش بـەش ئـەبێ لـە نێـوان دوو دەسـەڵاتی جیـاوازدا، لـە نێـوان دوو بەرنامـەی جیاوازدا، ئەو کاتە ژیان تێک ئەچێ، دژایەتی لە دەروون و لە کردەوەدا روو ئەدا، وەک لە چەند شوێنێک دا قورئان دەست نیشانی بۆ ئەکات. جا لەبەر ئەوە هەموو ئایینەکانی خوا هاتوون بۆ ئەوەی ببن بە بەرنامەی ژیان، ئیتر ئەو ئایینە بۆ شارو ناوچەیەک هاتبێ، یا بۆ ئوممەت و تیرەیەک هاتبێ، یان بۆ هەموو ئادەمی هاتبێ بە هەموو چین و چەرخ و کاتەکانی دا، هەموو ئەو ئایینانە هاتوون بە شەریعەتێکی دیاریی کە حاکم و کاربەدەست بێت بۆ هەموو ناوچە و بارو روویەکی ژیانی ئەوانەی کە ئەو ئایینەیان بۆ هاتووە، ئایینەکانی خوا پێک هاتوون لەم سێ بەشە: عەقیدەو بیروباوەڕی دەروون. نیشانە و دروشمی بەندەیی و خواپەرستی. یاسا و شەریعەتێکی دیاریی کە حوکمڕان بێت لە ژیان دا. چونکە ژیان رێک و راست و چاک نابێ مەگەر لە کاتێک دا کە هەر ئایینی خوا بەرنامەی ژیان بێت.

لە قورئان دا بەڵگەی زۆر هەیە لەسەر ئەوەی کە ئایینە پێشووەکان، کە بۆ شارێک هاتبن، بەو جۆرە هاتوون و پێک هاتوون لەو سێ بەشە. وەک ئایینەکەی هوود و شوعەیب و صالح و لوط کە لە چەند سورەتێک دا باسیان هاتووە و بە روونی ئەوەمان نیشان ئەدەن، وەک لێرەیش دا مەسەلەکە بە تەواوی ئاشکرا ئەکات لەم سێ ئایینە گەورەیەدا، یەهوود، نەسرانی، ئیسلام، وەک بەڕێز باسیان ئەکات و ئێمەیش خەریکین بە تەفسیری ئایەتەکانی یەکەمەکەیانەوە و گەیشتبنە ئێرە کە رووی فەرمودە ئەکاتە زانا و سەرۆکی جوولەکەکانی چەرخی پێغەمبەر(ﷺ) وەک(ئیبن و عەباس و سدی و کەلەبی ئەفەرمون)، ئامۆژگاری یان ئەکات بەوەی رێگە راستەکەی خوا بدەنە بەر کە لە تەورات دا بۆی دیاریی کردوون، بە بێ لادان و گۆڕاندن و شاردنەوە، یان رووی فەرمودەکە بۆ هەمووانە، وەک(ئیبن و مەسعود) ی لەسەرە. یان بە تێهەڵکێش مەبەست زاناکانی ئەم ئوممەتەیە کە لەبەر هیچ هۆیەک لانەدەن لە قورئان و دەستی لێ هەڵنەگرن و نەیفرۆشن بە هیچ شتێک، وەک(حسن ی بەسری) ئەفەرموێ و لە قسەی(شەعەبی) یەوە وەرئەگیرێ. بێگومان لادان لە رێگە راستەکەی خوا یان لەبەر مەترسی یە لە زۆردارێک، یان لەبەر ئومێد و چاوەڕوانی گەیشتن بە ئامانج و دەست کەوتێکە، لەبەر ئەوە ئەوا جڵەوگیریی ئەکات لەوەی لەبەر هەرکام لابدرێ و واز بهێنرێ لە ئایین و فەرمانی خوا، لەبەر ئەوەی ترس و بیم بەهێزترە پێشی ئەخات،

فَلَا تَخْشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنًا قَلِيلًاۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥۚ

---

**ئەفەرموێ: ﴿فَلَا تَخْشَوُاْ ٱلنَّاسَ﴾ کەواتە مەترسن لە خەڵکی تا بەهۆی ئەوەوە لابدەن لە نامە و فەرمانی خوا ﴿وَٱخْشَوْنِ﴾ لەمن بترسن و نافەرمانی من مەکەن و بە پێی نامە و ئایینەکەم رەفتار بکەن، ﴿وَلَا تَشْتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنًا قَلِيلًاۚ﴾ مەکڕن بە ئایەتەکانی من پوول و پارەو دەست کەوتێکی ئەم جیهانە کە هەرچەند زۆر بێت و با هەموو جیهان بێت هەر کەمە و چاو نادا لەچاو بەش و دەست کەوتی رۆژی دوایی دا کە بێ بەش ئەبن لێ ی بەهۆی ئەو دەست هەڵگرتن و لادانە. بەڵێ بەڕاستی هەموو جیهان هیچ نی یە لەچاو لە دەست چوونی نازو رێزی نەبڕاوەی رۆژی دوایی دا و دووچار بوونی سزای ئاگری دۆزەخ دا، هەموو جیهان کەم و بێ نرخە چ جای پوول و پارە و مووچە خۆری یان ناو و شۆرەت و پلە و پایەیەکی رووکەش یان هەر دەست کەوت و بەرژەوەندی یەکی تری ئەم جیهانە کە ئەو زانا ئەمیندارانەی پێ هەڵئەخەڵەتێن و خۆیان ئەکەن بە ناپاك و شەرمەزار و بەش بڕاوی لای خوا!! ئینجا باسەکە دوایی ئەهێنێ بەم بڕیارە سامناکە: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ هەرکەس حوکمی نەکردبێ بەو بڕیارانەی کە خوا ناردنیە خوارەوە، هەروەها هەرکەس حوکمیان پێ نەکات، ئەوان بێ بڕوان و موسڵمان نین.**

**لەم بڕیارەدا قسە و باسی زۆر هەیە و لێکۆڵینەوەی زۆر تیا کراوە، ئەوەی کەوا راست و رێکە ئەمەیە ئەم بڕیارە یاسایەکی گشتی یە بۆ هەموو کات و چینێ و نەبەستراوە بە هیچ کات و شوێنێکەوە. هۆی ئەم یاسا گشتی یەشی ئەمەیە کە دانانی بەرنامە و شەریعەت تایبەتی یە بە خواوە و تەنها مافی خوایە، وەك سوژدە بردن و پەرستن و هەرشتێ کە نیشانەی پەرستنە، کەواتە هەرکەس لافی ئەو مافە لێ بدا بۆ خۆی یا بۆ هەرکەسێك لە راستی دا لافی خوایەتی لێ ئەدا بۆ خۆی یا بۆ ئەو کەسە ئیتر با بەدەم هیچ نەڵێ، با لافی بڕوا لێ بدات و نوێژ و رۆژوو و فەرزەکان بەجێ بێنێ، هەرکەسێك لانەدا لە راستە شەقامی قورئان و**

حەدیس ئەم مەسەلەی بە لاوە روون و ئاشکرایە، ئینجا ئەمەش شتێکی روون و ئاشکرایە کە هەرکەسێك هەر جۆرە گومان و دوو دڵی یەکی ببێ لە راستی هەر بڕیارێکی ئیسلام دا یان بەلایەوە وابێ کە ئیسلام ناگونجێ و دەست نادا بۆ هەموو کات و چەرخ و وڵاتێ، بێگومان ئەو کەسە بێ بڕوایە و پەیوەندی بە ئیسلامەوە نامێنێ، کەواتە ئەو کەسانەی لە حوکم و بڕیارەکانی ئیسلام لائەدەن و شوێنی بڕیارو یاسایەکی تر ئەکەون، ئەگەر بەلایانەوە وایە کە یاسا و بڕیاری ئیسلام ناڕاستە و ئەو یاسا و بڕیارانی ترە راست و گونجاون، ئەو کەسە ئەبێ خۆ بەخۆی بزانێ کە لە ئیسلام دەرچووە و فڕی بە ئیسلامەوە نەماوە، وەك ئەو کەسانەی کە لایان وایە بێجگە لە خوا هیچ کەسێکی تر هەیە مافی دانانی شەریعەت و یاسای هەیە، وەك لە پێشەوە باسمان کرد. ئەگەر هیچ جۆرە گومانێکیان نی یە لە راست و رەوایی بڕیارەکانی ئیسلام دا، بڕوایان وایە کە لادانەکەیان گوناهو تاوانە، ئەوانە ئومێد وایە لە ئیسلام دەرنەچن بە پێی رای جەماوەر و زۆربەی زانایانی ئیسلام کە لایان وایە کردەوە بەش و پارچەیەك نی یە لە بڕوا، بەڵکو بڕوا هەر بریتی یە لە ئارامی و رەزامەندی دڵ و دڵنیایی بەو شتانەی کە ئیسلام پێویستی کردووە بڕوا هێنان پێی، بەڵام بەلای هێندێ لە زانایانەوە هەرچەند لە دڵەوە بەو جۆرە بن هەر لە ئیسلام دەرئەچن، چونکە ئەو حوکم و بڕیارەی بە غەیری ئەوەی خوا ناردویەتی و لادان لەوەی کە خوا ناردویەتی نیشانەی بێ بڕوایی یە و هەر بڕوایەکی دەروونی ببێ لێ ی وەرناگیرێ وەك کەسێك سوژدە ببا بۆ بتێك بەو شوژدە بردنە لە ئیسلام دەرئەچێ هەرچەندە لە دڵەوە بڕوای بە خوا ببێ و بتەکەی بەلاوە پووچ و ناڕەوا بێ.

لەپاش ئەوەی ئەو یاسا بنەڕەتی یەی دامەزراند، ئینجا چەند نموونەیەك ئەخاتە بەرچاو لە شەریعەتی ئەو تەوراتەی کە ناردی بۆ ئەوەی رەفتاری پێ بکرێ. ئەفەرموێ: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ﴾ نووسیمان و پێویستمان کرد لەسەریان لەو تەوراتەدا ﴿أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ﴾ واتە هەرکەسێك بە ناهەق و بەدەستی ئەنقەست بکوژێ ئەکوژرێتەوە لە باتی دا. ﴿وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ﴾ چاو لەباتی چاو ﴿وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ﴾ لووت لەباتی لووت دا ﴿وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ﴾ گوێچکە لەباتی گوێچکەدا ﴿وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ﴾ ددان لەباتی ددان دا، واتە ئەم ئەندامانەش تۆڵەیان ئەسێنرێ لە دەست درێژیی کەر بە وێنەی کردەوەکەی خۆی ﴿وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ﴾

زامەکانیش تۆڵەیان زامدار کردنی دەست درێژیی کەرانە بە وێنەی کردەوەکەی خۆیان، بە بێ زیاد و کەم بەو شێوەی کە بگونجێ.

ئەم بڕیارانەی کە لە تەورات دا هاتن لەم دواترین شەریعەتەیش دا هەر مانەوە بۆ هەموو ئادەمی ی هەتا هەتایە، چونکە دادی رووتە و زۆر راست و رەوایە، ئەگەرچی ئەبێ هەر لە ولاتی ئیسلام دا بەجێ بهێنرێن و دەسەلات نی یە بۆ ولاتانی تر، واتە بڕیاری خوا بەو جۆرەیە، ئیتر فەرمانبەریی بکرێ یان نەء، بەس ئەوەندە هەیە لە شەریعەتی تەورات دا فەرز و پێویست بووە بەجێ هێنانی ئەو تۆڵەیە و هیچ بارێکی تر رەوا نەدراوە، بەلام لەم شەریعەتەدا ئەم بارەیش زیاد کرا کە ئەفەرموێ: ﴿فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ﴾ هەرکەسێك خێرو سەدەقە بکات بەو تۆڵەیە، بەم رەنگە لەبەر خوا ببورێ لە تاوانبارەکەی، ئیتر بە خۆڕایی و بە بێ هیچ کە ئەمە باشترو گەورەترە، یان بە سەندنی ماڵ و خوێنی ئەو تاوانە، ئەو لێ بوردنە ئەبێ بە کەفارەتی گوناهی لێ بوردەکەو سڕینەوەی گوناهو تاوانی، بە پێی ئەندازەی لێ بوردنەکەی، وەك(دیلە) حەدیسێ ئەهێنێ لە(ئیبن و عمر) ەوە – خوا لێ یان رازی بێت – کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێند، ئینجا فەرمویی: ئەمە کەسێکە کە دانی شکێنرا بێ یان لەش زامدار کرابێ و ئەویش ئەبوورێ لەوەی تۆڵەی بسێنێ، بەهۆی لە گوناهەکانی لائەبرێ بە ئەندازی خوێنی ئەوەی لێ ی بوردووە، ئەگەر خوێنی ئەو تاوانە نیوە خوێن بێ ئەوا نیوەی گوناهەکانی لائەبرێ لەباتی لێ بوردنەکەی، ئەگەر یەك لەسەر چوار بێ ئەوا یەك لەسەر چواری گوناهەکانی، ئەگەر یەك لەسەر سێ بێ یەك لەسەر سێ ی، ئەگەر خوێنی تەواو بێ ئەوا هەموو گوناهەکانی لا ئەبرێ، بەم جۆرە تەفسیرەکەی زۆر باش ئەچێتە دڵەوە. بەلام(ئیبن و ئەبی شەیبە) ئەگێڕێتەوە لە(ئیبن و جەریر و مجاهد) ەوە کە(ئیبن و عەباس) – خوا لێ یان رازی بێت – فەرمویەتی: مەبەست ئەوەیە: ئەو لێ بوردنە ئەبێ بە کافرەت بۆ تاوانبارەکە، بەم رەنگە ئەو تۆڵەی کە کەوتووەتە سەری نامێنێ و لائەچێ، هێندێکی تر ئەفەرمون: هەڵئەگرێ مەبەست ئەوە بێ: هەرکەس لەدەست درێژیی کەران سەدەقە بکات بە دان نان بەو تۆڵەی کە ئەکەوێتە سەری، مل کەچی بۆی ئەو دانـان و مل کەچ کردنە بۆ بڕیاری خوا ئەبێ بە کەفارەت بۆ ئەو تاوان و گوناهەی کە کردوویەتی، بەم دوو جۆرەش تەفسیر کراونەتەوە، بەلام بەراستی تەفسیری بەم دوو جۆرە لە دڵ دا دامەزراو نی یە و هەر یەکەم بەهێزو دامەزراوە. ئینجا بە جوانی ئەزانم لێرەدا هێندێ بدوێم لەبارەی ئەم تۆڵە سەندنەی کە لە ئایینی خوادا داهات و دامەزرا.

یەکەم شتێ کە لەم تۆڵە سەندنەدا دەرئەکەوێ و پێك دێت بیرو باوەڕی یەکسانی یە، یەکسانی لە خوێن و یەکسانی لە تۆڵەدا، بێجگە لە شەریعەتی خوا هیچ شەریعەتێکی تر دانی نەناوە بەم یەکسانی یەدا، هیچ گوێی نەبێ لە جیاوازی بەرزی و نزمی رادەو پلەی مەردومان، گوێی نەبێ لە جیاوازی چین و نەژاد و خوێن و تیرە، جاڕی یەکسانی هەموان بدات لەبەردەم شەریعەتی خوا و بڕیاری خوادا. بەڕاستی دانان و هێنان و رەفتارکردن بەم بیرو باوەڕە، جاڕدانە بە هاتنە دنیا و لەدایك بوونی ئادەمیزاد، ئەو ئادەمیزادەی کە هەموو یەکێکی مافی یەکسانی پێ بدرێ، یەکسانی لە دادگاو لە تۆڵە سەندن و بەرگریی ستەمکاری و ستەم لێ کراوی! بەڵێ ئەوە یەکەم جاڕێك بوو کە هەر ئایین و شەریعەتی خوا هێنانی و بە کردەوە لە بەرزترین پۆپەدا بەدی هێنا، هەموو یاسا و شەریعەتە دەست کردەکان بە دەیان چەرخ دواکەوتن لەوەی دان بەشتی وەهادا بنێن و بەڕاست و رەوای دابنێن، تا لەم دوایی یەدا بە ناچاری دانیان پیا نا، بەدەم و بە نووسین دەیان بڕی. بەڵام بە بێ بەدی هێنان لە ژیان دا بە کردەوە.

جوولەکەی ستەمکاری تاوانبار کە ئەو بیرو بڕوا گەورەیان بۆ هات لە نامەکەیان دا لە هەموو کەس خراپتر لایان دا لێ ی و پشتیان تێ کرد، نەك تەنها سەبارەت بە خۆیان و مەردومانی تر کە جوولەکە نین، کە بە دەلەسە و دەست هەڵبەست یاسا و بەندێکیان داهێنا و کردیان بە ئایین بۆ خۆیان و هەر لەسەر ئەوەیشن: ﴿لَيۡسَ عَلَيۡنَا فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ سَبِيلٞ﴾ بە کورتی هەرچی بکەین دەربارەی ئەوانەی کە نامەدار نین هیچ رەخنە و گوناهێکمان لەسەر نی یە!! بەڵکو بۆ ناو خۆیشیان و دەربارەی خۆیشیان ئەوانەیان کە زۆردار و دەسەڵاتدارن نابێ یەکسان بن لەگەڵ بێ دەسەڵات و ژێر دەستەکان دا، وەك بەو جۆرو شێوەیە رەفتاریان ئەکرد(بنی نضیر) لەگەڵ(بنی قریظة) دا، وەك بە درێژیی باسمان کرد لەکاتی تەفسیری ئایەتی(٤٢) ی ئەم سورەتەدا، هەتا پێغەمبەر(ﷺ) هاتە مەدینە و گێڕانی یەوە بۆلای شەریعەتی خوا کە شەریعەتی یەکسانی یە و سەری زەبوون و بێ دەسەڵاتان بەرز ئەکاتەوە و یەکسانیان ئەکات لەگەڵ سەری دەسەڵاتدار و خۆ بەزل زانەکان دا!! ئەم تۆڵە و هەق سەندنەی کە ئایینی خوا دای هێنا، هەرچۆنێ بەرز و بەڕێزو پیرۆزە و سەری مرۆڤایەتی بەرز ئەکاتەوە، هەروەها بەراورد کرا کە زۆر بەکارە لە بەرگری کردنی دەست درێژیی تاوان دا، بە جۆرێ ئەگەر بە تەواویش لە ریشەیان نەهێنێ زۆر زۆر کەمیان ئەکاتەوە تا رادەیەك هیچ چاو نادەن و کاروباری کۆمەڵایەتی تێك نادەن.

وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾ وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٦﴾ وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ ٱلْإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ ۚ

**لەپاش باسی ئەو بەشە لە شەریعەتی خوا کە لە تەورات دا ناردی و بوو بە بەشێك لە شەریعەتی قورئانیش، ئینجا ئەم یاسا و بڕیارە گشتی یە ئەهێنێ بەدوای دا: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ هەرکەسێك حوکمی نەکردبێ و حوکم نەکات بەوەی کە خوا ناردویەتی یە خوارەوە، هەر ئەو کەسانە ستەمکاری تەواون.**

**ئینجا هەمیتر ئەڕوا لەسەر ئەو بڕیارە گشتی یە کە حوکم کردنە بە شەریعەتی خوا، روونی ئەکاتەوە کە لە پاش تەوراتیش هەر ئەوە بڕیاری خوایە، ئەفەرموێ: ﴿وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ﴾ ئینجا لەپاش ئەو پێغەمبەرانەی کە حوکمیان بە تەورات ئەکرد عیسای کوڕی مەریەممان رەوانە کرد و هێنامان بە دوای ئەوان دا لەسەر رچە و رێباز و رەوشتی ئەوان ﴿مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ﴾ بڕوادار و بەڕاست گێڕە بۆ ئەو تەوراتەی کە لە پێش خۆیەوە هات، بەم رەنگە بە رێکی دانی نا بەوەی نامەی خوایە و راستە و پێویستە رەفتار پێ کردنی، مەگەر ئەو بڕیارانەی کە بسڕێتەوە، بەم رەنگە خۆیشی بە پێی تەورات رەفتاری کردووە ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ﴾ ئینجیلمان پێ بەخشی ﴿فِيهِ هُدًى وَنُورٌ﴾ لەکاتێك دا کە رێنموونی تیایە و رووناکی، وەك لە تەورات دا هەیە و باسمان کرد، ﴿وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ﴾ پێمان بەخشی بەڕاست گێڕ بۆ تەورات کە لە پێشی یەوە هات، بەم رەنگە رێك و پێك بوو لەگەڵی، وە لە ئینجیل دا هاتبوو کە تەورات راستە و نامەی خوایە، کەواتە هەرچۆنێ عیسا راست گێڕ بوو بۆ تەورات، هەروەها ئینجیلیش هەر راست گێڕ بووە بۆی بەو جۆرەی کە گوتمان. لە پێشەوە فەرموی: رێنموونی و رووناکی تیایە، ئینجا بەرز ئەبێتەوە لە وەسف و سەنای دا، بەم رەنگە هەمووی ئەکات بە رێنموونی، چونکە وەك تەوراتی بەڕاست گێڕا،**

هەروەها موژدەی ئاشکرای تیا بوو بە هاتنی پێغەمبەرمان(ﷺ)، کەواتە هاتنی رێنموونی بوو بۆ شتێ کە بەتین ترین ئاژاوەی جوولەکە و گاورەکان لەوەدا بوو، کەواتە ئەوەندە مایەی رێنموونی بوو وەك هەموو بووبێ بە رێنموونی وایە. ئەفەرموێ: ﴿وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ﴾ ئینجیلمان پێ بەخشی بە رێنموونی و ئامۆژگاریی بۆ پارێزەران و لەخوا ترسەکان، وا دەرئەکەوێ ئینجیل زیادە مەسەلەی رۆحی و ئامۆژگاریی دەروونی و رەوشتی تێدا بووبێ بۆ بەرگری و نەهێشتنی ئەو چرووکی و ماڵ خۆشەویستی و لە خۆگۆڕان و خۆ بە زل زانی یە کە جوولەکە سەریان تێ کردبوو، بەهۆی ئەوەوە زۆر دوور کەوتبوونەوە لە ئاین و رێگە راستەکەی خوا، ئینجا پەند و ئامۆژگاری هەرچەند بەسۆز و بەهێز بێ سوودی بۆ ئەو کەسانە دەبێت کە لە خوا ترس بن، یان ئامادەیی یان تێدایە و شیاوی لەخوا ترسین، لەبەر ئەوەی فەرموی ﴿لِّلْمُتَّقِينَ﴾. ئەم ئینجیلەش وەك تەورات خوا ناردی بۆ ئیسرائیلی یەکان و گێڕای بە بەرنامەی ژیان و شەریعەتێك کە حوکم و بڕیاری پێ بکرێ بۆیان، کەواتە داوا لێ کراون لەلایەن خواوە کە هەموو کاروبارێکیان بگێڕنەوە بۆلای ئینجیلەکەیان، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ الْإِنجِيلِ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فِيهِ﴾ با ئەوانەی کە ئەهلی ئینجیلن و ئینجیلیان بۆ رەوانە کرا حوکم بکەن بەوەی کە خوا ناردی یە خوارەوە تیای دا، چونکە یاسا و بڕیاری خوا هەر ئەوەیە کە ئەبێ هەر حوکم بەوە بکرێ کە لە لایەن خواوە هاتبێ، نەك هیچ شەریعەت و یاسایەکی تر کە لەلایەن هەرکەسێکی ترەوە هاتبێ. کەواتە ئیسرائیلی یەکان پاش ناردنی تەورات پێویست بوو لەسەریان رەفتار کردن هەر بە تەورات تا ئینجیل هات، لەپاش هاتنی ئینجیل ئیتر پێویست بووە بێن بۆلای ئینجیل هەتا قورئان هات ئیتر پاش هاتنی قورئان پێویست کرا لەلایەن خواوە لەسەر ئەوان و لەسەر هەموو ئادەمی ی و جنی کە پێکەوە و بە یەکجاری بێن بۆلای قورئان کە دواترین نامە و شەریعەتی خوایە کە ناردی بۆ هەمووان هەتا هەتایە.

وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ

---

**﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ هەرکەس حوکمی نەکردبێ و حوکم نەکات بەوەی کە خوا ناردی یە خوارەوە، ئەوانە بە تەواوی یاخین و لە فەرمان و شەریعەتی خوا دەرچوون.**

**ئەوانەی کە حوکم ناکەن بە شەریعەتی خوا، لەم ئایەتانی رابردووەدا خوا تاوانباری کردن بە سێ تاوان و بە سێ ناو ناوی بردن: ﴿کافرون، ظالمون، فاسقون﴾ لەمەدا زانایانی تەفسیر دووبەرەکین بە دوورا:**

**١- رای زۆربە و بەهێز لەسەر ئەوەیە کە مەبەست یەك تاقم و کۆمەڵە و ئەو کەسانەی کە حوکم نەکەن و سەرپێچی بکەن لە شەریعەتی خوا بێ بڕوان، چونکە لە راستی دا سەرپێچی ئەکەن لە خوایەتی خوا و رازی نین بە خوایەتی یەکەی، ستەمکارن لە خۆیان و مەردومانیش بەمەی لائەدەن لە حوکمی خوا کە سەراسەر دادو دادپەروەری یە، ئەڕۆن بۆ حوکم و بڕیاری غەیری خوا کە پڕە لە هەڵە و ستەم، یاخین بەمەی لە بەرنامەی خوا دەرچوون و شوێنی رێگەیەکی تر کەوتن، ئینجا هەرکام لەم سێ ناو و سیفەتە زیادە پێویستی هەیە بە مەبەستی ئەو ئایەتەی کە ئەم هاتووە بە دوای دا و ئایەتەکانی پێ تەواو کراوە بەم جۆرە ئایەتی یەکەم کە باسی دانانی شەریعەت و ناردنی نامەی خوا و مل کەچی پێغەمبەران و خواناس و زانایانی ئوممەت ئەکات بۆ حوکم و بڕیاری خوا، دەی دیارە هەرکەسێك روو وەرگێڕێ لەو حوکم و بڕیارەی خوا و پشت بکاتە رێنموونی و رووناکی یەك کە خوا ناردوویەتی و باوی حوکم و بڕیاری تر بدا بەسەر حوکم و بڕیارەکەی خوادا، بێگومان هەرکەسێك وابێ بێ بڕوایە و لە ئایینی خوا دەرچووە، کەواتە ئەبێ بفەرموێ: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾، ئایەتی دووەم باسی تۆڵەی دەست درێژیی کەران ئەکات کە خوا دایناوە بە دادو یەکسانی، دەی هەرکەسێك لەوە لابدا و رەفتاری پێ نەکات، بێگومان ئەو کەسە ستەمکاری تەواوە، کەواتە لەو شوێنەدا رێك ترە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾، ئایەتی سێیەم باسی رووناکی و رێنموونی و ئامۆژگاری ئینجیل ئەکات، هاندان لەسەر راگیر**

کردنی شەریعەت و رەفتار کردن پێ ی، بێگومان هەرکەس لەو فەرمان و مەبەستانە لابدا ئەو کەسە گوناهبارە و لە سنووری تەمێ و ئامۆژگاریی دەرئەچێت، کەواتە لە دوایی ئەو ئایەتەدا راست و رێك تر ئەوەیە کە ئەفەرموێ: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ لا إله إلا الله محمد رسول الله، امنا بالله العظيم و بكتابه الكريم و برسوله الرؤف الرحيم.

٢- رای دووەم لەسەر ئەوەیە ئەو سێ ناو و سیفەتە هەرکام بۆ تاقمێکە:

یەکەم: بۆ ئەوانەیە کە بڕوایان نەبێ بە شەریعەتی خواو شتێکی تر بە راست بزانن.

دووەم و سێ یەم: بۆ ئەوانەن کە بڕوایان هەیە، بەلأم رەفتاری پێ ناکەن و ئەچن بۆ حوکم و بڕیارێکی تر، ئینجا ئەو حوکم و بڕیاری ترە ستەم و دەست درێژیی تیا بێت و ماف یەکێکی پێ ژێر کرابێ ئەوا بەری دووەم ئەکەون، ئەگەر بەو جۆرە نەبێ و هەر نافەرمانی خوای تیا بێ ئەوا بەری سێ یەم ئەکەون. بەلأم بەڕاستی سەر سوڕ ئەمێنێ لەم رایە، چونکە:

ا- کاتێ بیربکەینەوە و ئایەتەکانی قورئان بپشکنین تێ ئەگەین کە وتەی(ظلم و فسق و ظالم و فاسق و ظلموا، فسقوا) هەموو ئەو وتەیانە لە قورئان دا بەکار هێنراون بۆ کافرو بێ بڕوا کاتێ کە بە روونی و بە بێ قەید بن.

ب- ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە دەربارەی جوولەکەکان کە گومان نی یە لە کوفرو بێ بڕوایی یان دا، کەواتە مەبەست بە هەر سێ ناو و سیفەتەکە هەر یەك تاقم و کۆمەڵە، کە ئەو جوولەکانە مەبەستی یەکەم و سەردەستەن.

ت- دیمەن و رووکەش و رواڵەتی هەر سێ رستەکە گشتی یە رووتە لە هەر مەرج و قەیدێك، دەی بە بێ رابەر و بەڵگەیەك لانادرێ لە رووکەش و رواڵەت و هیچ گشتی یەك تایبەتی ناکرێ و هیچ مەرج و قەیدێك بڕیار نادرێ، تەنانەت ئایەتەکان تایبەتی ناکرێن بە هۆی هاتنە خوارەوەکەیانەوە و هەرکام گشتی بن هەر بە گشتی دائەنرێن و وەرئەگیرێن، کەواتە ئەبێ مەبەست بەم سێ رستەیە هەر یەك تاقم و کۆمەڵ بێت، وەك تایبەتیش ناکرێن بە جوولەکە و گاورەکانەوە. ئینجا دێتە سەر باسی دواترین پەیامی خوا، دواترین شەریعەتی خوا کە هات بۆ ئەوەی ببێ بە ئایین و شەریعەتی هەموو جیهانی یان هەتا رۆژی دوایی، بۆ ئەوەی ببێ بە بەرنامەیەکی گشتی هەتا هەتایی، بەرنامەیەك کە ژیانی لەسەر راگیر ببێ لە هەموو بارو روویەکی یەوە، شەریعەتێك کە ژیان لە چوار شێوەی دا بژی و گەشە بکات، بۆچوون و بیرو باوەڕی لێ وەرگرێ، هەروەها رژێمی کۆمەلأیەتی و کردەوە و رەوشتی کۆمەڵ و ئەندامەکانی کۆمەڵ، ئەم

شەریعەتە هات بۆ ئەوەی حاکم بێت و حوکمی پێ بکرێت، نەك تەنها بۆ ئەوەی بزانرێ و بخوێنرێ، ببێ بە رۆشنبیریی یەکی رووت لە کتێب و نووسراوەکان دا بڵاو ببێتەوە! هات بۆ ئەوەی پەیڕەوی بکرێ و هەموو کەس شوێنی بکەوێ و زۆر بە وردی و گرنگی، بە رێکی بهێڵرێتەوە بە بێ گۆڕاندن و دەست کاری، ئینجا ئەبێ بەو جۆرو شێوەیە بگیرێ یا لەوە ترازا ئیتر نەفامی و ستەم و شوێن کەوتنی هەواو ئارەزوو پەیدا ئەبێ و سەر لە زیانباریی هەردوو جیهانەوە دەرئەچێ، هیچ کەس رێی بڕوبیانوویەکی نی یە بەوەی بڵێ: با بە هێواشی و پەلە نەکرێ و بەرە بەرە خەریك بین، بەڵکو بەوە هەموو کەس کۆ بکەینەوە لەسەری، ئەمەو هەر بڕوبیانوویەکی تر هیچ نرخی نی یە لای خوا، چونکە ئەگەر خوا مەیلی ببوایە هەمووی ئەکرد بە یەك ئوممەت و میللەت، خوا ئەوەی ئەوێ کە هەر شەریعەتەکەی خۆی حوکمڕان بێت، ئیتر پاش ئەوە کاری مەردومان چۆن ئەبێ با ببێ.

بەڕاستی هەرکەسێك ئەم سێ ئایەتەی داهاتووە ببیستێ ئیتر نابێ هیچ بڕوبیاوویەکی لەدڵ دا بمێنێ ئەگەر بڕوادار بێ، جا با بە وردی گوێ بگرین لێ یان. ئەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ﴾ ناردمانە خوارەوە بۆلای تۆ نامەیە – واتە قورئان – بە هەق و راستی یەوە، هەق و راستی پێ یە و هێناویەتی لە هەموو بارو روویەکی یەوە. بەڵێ. هەق و راستە و هەق و راستی پێ یە، چونکە لە سەرچاوەی راستەوە هاتووە، لەلایەن خواوە هاتووە کە ناردنی شەریعەت و بەرنامە و یاسا هەر مافی ئەوەو تایبەتی یە بەوەوە. کەواتە هەرچی هێناوە هەموو هەق و راستە و بەجێ یە. ﴿مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ﴾ واتە ئەو نامەیەمان نارد بە راست گێڕ و بڕیاردەری راستی ی بۆ هەر نامەیە کە لە پێشی یەوە هاتووە: وەك تەورات و ئینجیل و زەبوور کە بەناوی تایبەتی خۆیانەوە ناوی بردوون و هەواڵی داوە بە راستی یان و هاتنیان لەلایەن خواوە، هەروەها هەموو نامەکانی تریش کە بە شێوەی گشتی و بە بێ ناوی دیاریی و تایبەتی باسی کردوون و هەواڵی داوە بە راستی یان و هاتنیان لەلایەن خواوە بۆ سەر پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت –

﴿وَمُهَيۡمِنًا عَلَيۡهِ﴾ بە چاودێرو پارێزەرو شایەت و ئەمیندار بەسەر نامەی خوا کە لە پێشی یەوە هاتووە، بەم ڕەنگە باری ڕاستەقینەی خۆیان ڕوون ئەکاتەوە، لەگەڵ هەواڵ دان بە گۆڕاندن و دەست کاری کردنێك کە بەسەر هێندێکیان هێنرا، لە لایەن هێندێ لە ئوممەتەکانیانەوە، کەواتە ئەم قورئانە دواترین وێنەو شێوەی ڕاستەقینەی ئایین و نامەکانی خوایە، دواترین بەرنامەی ژیان و یاسا و شەریعەتی مەردومان و ڕژێمی ژیانیان بە بێ گۆڕاندن و دەست کاری کردن، ئەمەیە کە لەم قورئانەدایە، کەواتە هەرچی دوبەرەکی و ئاژاوەی لەمەوپێش و ئێستا و داهاتوو لەلایەن نامەدارو بێ نامە و هەموو ئادەمی، لەهەر بارو ڕوویەکەوە ئەبێ هەموو کاری جێ بەجێ بکرێ، هەر بۆچوون و ڕاو بیرو باوەڕ و بڕیارێك نەگەڕێتەوە بۆ قورئان و لەمەوە وەرنەگیرابێ، هیچ نرخێکی نی یە، کەواتە دوای ناردنی قورئان هەر ئەم شایستەی ئەوەیە ناو ببرێ بە نامەی خوا، هەرکاتێ ناوی نامەی خوا براهەربە دڵدا بێت، جا لەبەر ئەوە دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوە - وەك زانایان ئەفەرمون - لێرەدا بەناوی تایبەتی خۆی ناوی نەبرد، بەڵکو بە نامە ناوی برد، وەك نامەی خوا هەر ئەم بێت، ئەوەی کەخواناردبێتی یەخوارەوە هەر ئەم بێت، ئەوەتا بە بێ دیاریی کردن ئەفەرموێ: ﴿فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُۖ﴾ کەواتە حوکم و بڕیار بدە لە ناو نامەدارەکان دا بەوەی کە خوا ناردی یە خوارەوە، چونکە دیاریی کردن پێویست نی یە و دڵ هەر بۆ قورئان ئەڕوا.

ئەم فەرمانەی لە یەکەمجارەوە ڕووی کردە پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە نامەدارەکان کە ئەهاتن بۆ خزمەتی بۆ ئەوەی حوکم و بڕیاریان بۆ دەربکات لەو چەند مەسەلەیەدا کە لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کردن، بەڵام تایبەتی نی یە بەوەوە، بەڵکو گشتی یە هەتا دنیا دنیایە، چونکە ئەم شەریعەتە دواترین شەریعەتە و هیچ پەیام و پێغەمبەرێکی تر نایە کە گۆڕان و دەست کاری بکەن تیایدا!

ئەم ئایین و شەریعەتە خوا بە تێرو تەواوی ناردی، کردی بە بەرنامەی ژیانی هەموو ئادەمی، هیچ ڕێگە نەما بۆ بژارە و گۆڕاندن و دەست تێ خستن تیای دا، بە هیچ کلۆجێك

نابێ وازی لێ بهێنرێ و شتێکی تر بخرێته شوێن و جێگەی ئەم، خوا زانیویەتی کە ئەمەی ناردوویەتی بەسە بۆ هەموو جیهانی یان، خێرو خۆشی یەك ئەمێنێ بۆ هەمووان ئەگەر پەیڕەوی بکرێ، هەر گۆڕاندن و دەست تێ خستنێ – چ جای لادان لێ ی بە تەواوی – بڕوا نەکردنە و دان نەنانە بەوەی کە خوا زانیویەتی و بڕیاری لەسەر داوە، کەواتە هەرکەس ئەوە بکات لەم ئایینە دەرئەچێ هەرچەند بەدەم خۆی بە موسڵمان دابنێ! بێگومان خوا زانیویەتی کە بڕو بیانووی زۆر ئەهێنرێتەوە، زۆر شت ئەکرێ بە کۆسپ و گرێ لە رێگەی رەفتار کردن بەو شەریعەتەی کە خوا ناردویەتی، بە تایبەتی ئەو حوکم و بڕیارانەی کە ئەدەن لە لووتی ستەمکارو تاوانبار، ئەو حوکم و بڕیارانەی کە دژو پێچەوانەی هەواو ئارەزووی ناڕاست و ناڕەوای خاوەن دڵ و دەروونە نەخۆشەکانن، لەبەر ئەوە فەرمانی دا بە وریایی و خۆپاراستن لەوەی ئەو جۆرە شتانە کاربکەن و ببن بە رێگر، فەرموی: ﴿وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ﴾ شوێنی هەواو هەوەسی ئەوانە نەکەوی ﴿عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ﴾ واتە لانەدەی لەو حوکم و بڕیارە هەق و راستەی کە بۆت هاتووە بە شوێن کەوتنی ئارەزووی ئەوان. بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) زۆر دوور بووە لەوەی لابدا و شوێنی ئارەزووی هیچ کەس بکەوێ. هەرگیز چاوەڕوانی ئەوەی لێ نەکراوە، بە تایبەتی خوا خۆی بەندەکەی خۆی ناسیوە و زانیویەتی لانادا و بە جۆرێکی دروست نەکردووە کە دەست بدا بۆ لادان لەو رێگە راستەی کە بۆی داناوە، کەواتە مەبەست بەم جڵەوگیریی یە و وێنەی ئەمە کە لە قورئان دا زۆر هەیە، مەبەست بەمانە – وەك زانایان ئەفەرمون – ئەوەیە کە زیاتر دڵ و دەروونی بەهێزتر ببێ و سۆز و پەرۆشی بەتین تر ببێ لەسەر گوێ رایەڵی و هەڵسانی بە رابەریی و فروستادەیی یەکەی، بێجگە لەوەش ئەم جۆرە فەرمودانە ترساندن و تەمێ دادانێکی بەهێزی تیا هەیە بۆ هەرکەسێکی تر لەم ئوممەتە کە رێگە راستەکەی خوا بەرنەدات. ئینجا هۆی فەرمان و جڵەوگیریی یەکە روون ئەکاتەوە – واتە فەرمان بە حوکم کردن بەوەی خوا ناردویەتی لەم دواترین شەریعەتە و جڵەوگیریی لە شوێن کەوتنی هەواو ئارەزووی مەردومان و نامەداران – هانی نامەداران ئەدا لەسەر مل کەچ کردن و فەرمانبەریی بۆ هەموو فەرمانەکانی ئەم دواترین شەریعەتە،

لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٤٨﴾ وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ

**رووی فەرمودە ئەکاتە هەمووان بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾ گێرامان و دامان نا بۆ هەر ئوممەتێك لە ئێوە ئەی نامەدارەکان و موسڵمانەکان یاسا و شەریعەتێك و ڕێگەیەکی روون و ئاشکرا کە رەفتاری پێ بکەن و بیدەنە بەرو لێ ی لانەدەن، بەم رەنگە تەوراتمان دیاریی کرد بە ڕێگەو شەریعەت بۆ ئەو ئوممەتەی کە لە رەوانەکردنی موساوە دەست پێ ئەکات تا رەوانەکردنی عیسا، ئینجیلمان دیاریی کرد بە شەریعەت و ڕێگە بۆ ئەو ئوممەتەی کە لە رەوانەکردنی عیساوە دەست پێ ئەکات تا رەوانە کردنی محمد(ﷺ)، قورئانمان دیاریی کرد بە یاسا و شەریعەت بۆ ئوممەتی ئیسلام کە لە رەوانەکردنی(محمد) هوە دەست پێ ئەکات هەتا رۆژی دوایی، کەواتە هەرچۆنێ لە هاتنی تەوراتەوە تا هاتنی ئینجیل ئەبێ هەر تەورات شەریعەتی ئەو ئوممەتە بووبێ، لە هاتنی ئینجیلەوە تا هاتنی قورئان ئەبێ هەر ئینجیل شەریعەتی ئەو ئوممەتە بووبێ، هەرچۆنێ ئەوانە وابووبن ئەبێ لە هاتنی قورئانیشەوە هەتا رۆژی دوایی هەر قورئان شەریعەت و ڕێگە بێت بۆ هەمووان، چ نامەدار و چ بێ نامە، کەواتە ئەبێ هەموو بڕوا بێنن بە قورئان و رەفتار هەر بەوە بکەن کە قورئان هێنای بۆ هەمووان، ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ هۆی دانان و دیاریی کردنی ئەو شەریعەتە جۆر بە جۆر و جیاوازانە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً﴾ ئەگەر خوا بیویستایە ئێوەی ئەگێڕا بە یەك ئوممەت و کۆمەڵ، بەم رەنگە یەك ڕێگە و یاسا و شەریعەتی دائەنا بۆ هەمووتان، ﴿وَلَٰكِن﴾ بەڵام ئەوەی نەویست، بەڵکو ویستی هەر ئوممەتێکتان ڕێگە و شەریعەتی تایبەتی ببێ ﴿لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ﴾ بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە لەو شەریعەت و یاسایانەی کە پێ ی بەخشیون کە کێ مل کەچ و گوێ رایەڵە و کێ یاخی و**

سەرکێشە، واتە هەرچۆنێ خوا ئەیان ناسێ و چاك و خراپ ئاشكرایە لای، هەروەها با دەرکەوێ و مەردومانیش ئەوە بزانن، چونکە خوای میهرەبان باوی واهات کە هەر بە پێی زانینی خۆی رەفتار نەکات لەگەڵ بەندەکانی لە پاداشت و تۆڵەی کردەوەکانیان دا بەڵکو پاداشت و تۆڵەی کاتێ ئەبێ کە ئەوەی خۆی زانیویەتی بەندەکانی بە کردەوە بەدی بێنن.

خوای لێزانی کاردروست ئەو شەریعەتە جۆر بە جۆر و جیاوازانەی داناوەو دیاریی کردن بۆ ئەو ئوممەتانە، بۆ هەرکام کە بەرژەوەندی تەواوی تیا بێت و شایستە و شیاوی ئەو چەرخ و گەلە بێت کە بۆی نارد، بۆ نموونە: شەریعەتی تەوراتی نارد بۆ گەل و کۆمەڵێك کە رام بوو بوون و دەقیان گرتبوو بە زەبوونی و ژێر دەستەیی و بەندەیی ستەمکاران، کەواتە ئەبێ بە توند و تیژیی رەفتاریان لەگەڵ بکرێ و گوێ نەدرێ بە راو رەزامەندی یان، بەهۆی ئەوەوە ئەو شەریعەتە بەو جۆرە و لەسەر ئەوبارە هات، ئینجا ئەو گەلە لە رێگە راستەکەی خوا لای دا و دووچاری دڵ رەقی وسەرکێشی و چرووکی و دنیا پەرستی بوون، کەواتە پێویستیان پەیدا کرد بە شەریعەتی ئینجیل کە هات لەسەر بناغە و بنەڕەتی بەرز کردنەوەو باودانی گیان و داخوازەکانی بەسەر لەش و داخوازەکانی دا، لەسەر چاوپۆشی و دڵ نەرمی و دوورکەوتنەوە لە مل ملانێ و بەر بەرەکانێ و هەوڵدان بۆ بەرزی و سەرکەوتن، رازی بوون و سەر داخستن بەرامبەر هەر ستەم و ریسوایی یەك کە روو بدا، بەو جۆرە ئەو دوو شەریعەتە کاتی یە هاتن بۆ چارەسەر کردنی ئەو دووبارو حاڵەتە ناڕەوا کە روویان کردە ئەو گەلە. بەڵام ئیسلام کە یاسا و شەریعەتێکی هەمیشەیی و هەتا هەتایی هێنا، ئەبێ میانە بێ و ناوەڕاست بگرێ لە هەموو شتێك دا، بەم رەنگە هەڵسێ بە پێك هێنانی پێویست و داخوازەکانی لەش و گیان پێکەوە و بەجۆرێ ماوە نەدا بە زاڵ بوونی هیچ لایەك بەسەر لایەکی تردا، کەواتە ناردنی ئەم شەریعەتە جیاوازانە، وەك بەرژەوەندی بەندەکانی خوای تیایە، هەروەها تاقی کردنەوەیە بۆ دەرکەوتن و جیا بوونەوەی چاکان لە خراپان، چاکان مل کەچ ئەکەن و خۆشنوود و دڵ ئارامن بە هەموو یاسا و فەرمانەکانی خوا بە بێ سەر لێ

کردنەوەو دوو دڵی، دڵنیان کە هەر یاسا و شەریعەتەکانی خوا راست و رەوانە هەرکام لە کات و چەرخی تایبەتی خۆیان دا، هەر سڕینەوەیەك خوا کردی لە شەریعەتەکانی دا راست و رەوایە و بێجگە لەوە ناڕاستە!! بە پێچەوانەی خراپان کە نەفام و سەرکێش و یاخین و شوێنی هەواو ئارەزووی ناڕەوای خۆیان ئەکەون و بێ ئاگان و بێ بەشن لەوەی کە چاکان بەشدارن تیایدا، ﴿فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ﴾ کەواتە پێش بڕکێ بکەن و چەسپانی بکەن بۆ ئەو شتانەی کە چاکن بۆتان لە هەردوو جیهان دا، لە بیروباوەڕی چاك و هەموو کردەوە چاکەکان کە لە قورئان دا هاتوون و پاش هاتنی قورئان هەر لای قورئان دەست ئەکەون، بە چەسپانی فریاکەوتن تا کات و هەلی ژیانیان لەدەست دەرنەچووە، چونکە ﴿إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا﴾ هەر بۆلای خوایە گەڕانەوەتان بە کۆمەڵ و پێکەوە، چاك و خراپتان، گوێ ڕایەڵ و سەرکێشتان. ﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ ئینجا لەو رۆژەدا هەواڵتان پێ ئەدا بەوەی کە لە جیهان دا دووبەرەکی بوون تیای دا، واتە لەکاتی حیساب و پرسیاردا هەواڵتان پێ ئەدا بە جۆرێ کەستان گومان و دوو دڵیتان نەمێنێ و هەموو هەق و ناهەقێکتان بۆ دەرکەوێ، یان مەبەست ئەوەیە لەو رۆژەدا هەمووتان ئەگەن بە بەرهەم و پاداشتی کردەوەکانتان بەهۆی ئەوەوە چاك و خراپ روون ئەبێتەوە و جوێ ئەبنەوە لە یەکتر، دەرئەکەوێ کامتان لەسەر هەق بووە و کام لەسەر ناهەق.

لە ئایەتی پێشوودا فەرمانی دا بەوەی کە حوکم و بڕیار بدا بەوەی کە خوا ناردویەتی، شوێنی ئارەزووی مەردومان نەکەوێ، ئینجا ئەو مەبەستە دووبارە ئەکاتەوە بۆ زیادە دڵنیایی لەسەری، لە جاری دووەم دا بە جۆرو شێوەیەکی روون تر و بەهێزتر، بەمەی ئەیکات بە سەرەتا بۆ ئەوەی لادان لە هێندێ لەوەی کە خوا ناردوویەتی – با کەمترین شت بێت – هەر لادانە وەك لادان لە هەمووی، ئەفەرموێ: ﴿وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ﴾ واتە ناردمانە خوارەوە بۆلای تۆ ئەمەی کە حوکم بکەیت لەنێوان نامەدارەکان دا بەوەی کە خوا ناردی یە خوارەوە،

وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَٱعۡلَمۡ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعۡضِ ذُنُوبِهِمۡۗ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ﴿٤٩﴾ أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكۡمٗا

---

**شوێنی حەزو ئارەزوویان نەکەوی ﴿وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَ﴾ وریای خۆت بەو خۆت بپارێزە لێ یان کە بت ترازێنن و لات بدەن لە هێندێ لەوەی کە خوا ناردی یە خوارەوە بۆلات.(ئیبن و ئەبی حاتەم و بەیهەقی) ئەگێڕنەوە لە(ئیبن و عەباس) ەوە – خوایان لێ رازی بێت – کە زانا بەرزەکانی جوولەکە لەناو خۆیان دا ئەڵێن: با بڕۆین بۆلای محمد بەڵکو لایدەین لە ئاینەکەی، ئینجا دێن و ئەڵێن: تۆ ئەزانی کە ئێمە زانای جوولەکەین، ئەگەر ئێمە شوێنت بکەوین هەموو جوولەکە شوێنت ئەکەوێ، ئێمە و کەلەکەمان ئاژاوەمان هەیە لە مەسەلەیەك دا و دێن بۆلای تۆ، حوکم بدە بۆ ئێمە بەسەر ئەوان دا ئەو کاتە بڕوات پێ ئەهێنین، پێغەمبەریش(ﷺ) بە گوێی نەکردن، ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، کەواتە مەبەست لە هاتنی ئەم ئایەتە دەرخستنی راست و بەجێ ی کردەوەو هەڵوێستەکەی پێغەمبەر(ﷺ) و فەرماندان بوو بە دامەزراوی و بەردەوامی و مانەوەی لەسەر ئەو بارو رێگە راستەی کە داوێتی یە بەر. ئینجا زیادە هێزو ئارامی ئەدا بە دڵی بەفەڕی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ئەو بارەی کە لەسەریەتی بەمەی بڕوا نەهێنان و پشت تێ کردنی ئەو جوولەکانە هیچ زیانێکی ناگەیەنێ بەم، بەڵکو خۆیان زیانبار ئەبن، ئەفەرموێ: ﴿فَإِن تَوَلَّوۡاْ﴾ ئینجا ئەگەر ئەوانە روویان وەرگێڕا لە وەرگرتنی حوکم و بڕیار بەوەی خوا ناردوویەتە خوارەوە ﴿فَٱعۡلَمۡ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعۡضِ ذُنُوبِهِمۡ﴾ ئەوا بزانە کە خوا ئەیەوێ ئەوانە دووچار بکات بەهۆی هێندێ لە گوناهەکانیانەوە، کە گوناهی پشت تێ کردن و روو وەرگێڕانەکەیانە کە لە هەموو گوناهێکیان گەورەترە و دیارە ئەبێ تۆڵە و سزایشی لە هەموو تۆڵە و سزاکانی تریان سەخت تر و گەورەتر بێت. یان مەبەست ئەوەیە: خوا ئەیەوێ دووچاریان بکات بە تۆڵەی هێندێ لە گوناهەکانیان لە جیهان دا بە زاڵ کردنی پێغەمبەر(ص) بەسەریان دا و سزادانیان بە کوشتن و گرتن و ئاوارە کردن، بە هەرحاڵ ئەوا بەو روو وەرگێڕانە دووچار بوون، نەك**

پێغەمبەر(ﷺ) یان ئاین و شەریعەتەکەی یان کۆمەڵی موسڵمانان کە دەستیان گرت بەو ئایینە پیرۆزەوە، نابێ سەر سوڕ بمێنێ لەو کردەوە و هەڵوێستە ناپەسەندەی ئەوانە، چونکە زۆر لە ئادەمی هەر بەو جۆرە لارو نالەبارە وەك ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ﴾ بێگومان زۆر لە ئادەمی یاخی و سەرکێشن و لە سنووری خوا دەرئەچن، واتە خۆیان بە سروشت لارو خراپن و سووچ لە خۆیانەوەیە، بێگومان ئەم فەرمودەیە دڵنەوایی تیایە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هەروەها لە پاش ئەو دڵنەوایی یە بۆ ئەوانەی کە لەسەر رێبازەکەی ئەو بانگی مەردوم ئەکەن بۆلای خوا نابێ بەوجۆرە هەڵوێست و کردەوانە بێ ئارام بن و پەکیان بکەوێ لە کارو فرمانی خۆیان، ئینجائەیانوەستێنێ لە دوو رێگانەدا و بە روونی تێیان ئەگەیەنێ کە دوو رێگە لەبەردەمیاندا هەیە، یاحوکم و شەریعەتی خوا، یان حوکم و شەریعەتی نەفامی.

بە سەرسوڕمان و بێزاری دەربڕینەوە ئەفەرموێ: ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ﴾ دەی ئایا ئەوانە کە روو وەرئەگێڕن لە حوکم و بڕیاری خوا داوای حوکم و بڕیاری نەفامی ئەکەن و بەدوای ئەوەدا ئەگەڕێن؟!! واتە یا ئەبێ حوکم و بڕیاری خوا لەزەوی دا ببێ، شەریعەتی خوا بەجێ بهێنرێ لە ژیان دا، بەرنامەی خوا کاربەدەست و سەرکردە بێت بۆ ژیانی ئادەمی ی، یان ئەبێ حوکم و بڕیاری نەفامی ی و شەریعەتی هەواو ئارەزووی نەفس و بەرنامەی بەندە ببێ لە مەیدان دا. جا ئایا ئەوانە کام لەو دووانەیان ئەوێ و هەڵی ئەبژێرن بۆ خۆیان؟ ئەم ئایەتە بە روونی نەفامی ی و چەرخی نەفامی ی دیاریی ئەکات، دەری ئەخات کە چەرخی نەفامی ناو نی یە بۆ کات و ماوەیەکی تایبەتی، بەڵکو ناوە بۆ هەرکات و لە هەر شوێنێك دا یان هەر رەفتار بە شەریعەتی خوا ئەکەن و حاکمیان هەر شەریعەتی خوایە بە بێ لادان لە هیچ بەندو بەش و پارچەیەکی، هەموو رازین و مل کەچن بەدڵ بۆی، ئەوا ئەوانە وان لە ئایینی خوادا و بەڕاستی موسڵمانن، یان حوکم و بڕیارو رەفتاریان بە شەریعەتێکی ترە بێجگە لە شەریعەتی خواو رازین پێ ی، ئەوا ئەوانە لە نەفامیی دا ئەژین و لە ئایینی خوا دەرچوون، وان لە ئایینی ئەو کەسەدا کە پەیڕەوی حوکم و شەریعەتەکەی ئەکەن، هەرکەسێك بەدوای حوکم و بڕیاری خوادا نەگەڕێ، بێگومان بەدوای حوکم و بڕیاری نەفامیی دا ئەگەڕێ، پەیوەندی بە ئایینی خواوە نییە.

ئەمە دوو ڕێگایەکەیە کە خوا مەردومانی تیا ئەوەستێنێ، ئینجا ئەوانیش بە ئارەزووی خۆیان هەر ڕێگەیەکیان ویست هەڵی ئەبژێرن! ئینجا پرسیارێك ئاراستە ئەکات لە بارێکەوە بۆ بێزاری دەربڕین لەوەی کە بەدوای حوکم و بڕیاری نەفامی دا ئەگەڕێن، لەبارێکی ترەوە بۆ دانان و روون کردنەوەی چاکی ی و ڕاستی ی حوکم و بڕیاری خوا، ئەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا﴾ ئایا کێ چاکترو ڕاست ترە لە خوا لەبارەی حوکم و بڕیارەوە؟ واتە ئەوانە نیازی حوکم و بڕیاری نەفامی ی ئەدەن لە کاتێك دا کە حوکم و بڕیاری خوا چاکترو ڕاست ترە لە هەموو حوکم و بڕیارێك. بەڵێ. ئایا کێ ئەتوانێ بڵێ: کە حوکم و بڕیاری هیچ کەسێك چاکترە لە حوکم و بڕیاری خوا؟ ئایا ئەگەر کەسێك ئەوەندە نەفام بێ لاف ئاوا لێ بدا، بە چ بەڵگەیەك ئەو لافە لێ ئەدا؟ ئایا ئەتوانێ بڵێ: هیچ کەس هەیە لە خوا زاناتر بێ؟ ئایا هیچ کەس ئاشنا تر و زانا ترە بە بەندەکانی خوا، لە پەروەردگار و داهێنەری ئەو بەندەیانە؟ ئایا هیچ کەس هەیە میهرەبانتر و بەزەیی دارتر بێت لە خوا یان زاناتر بێ بە بەرژەوەندی بەندەیانی خوا؟ ئایا ئەو خوایەی کە دواترین یاسا و شەریعەتی خۆی نارد، بە دواترین ڕابەرو فروستادەی خۆی دا، ئەو دواترین شەریعەتەی گێڕا بە جێگرو جێنشینی هەموو شەریعەتەکانی، گێڕای بە شەریعەتێکی هێجگاری هەتا هەتایی، ئایا ئەو خوایە بێ ئاگا بوو لەوەی کە چەند بەسەرهات و ڕووداو پەیدا ئەبێ، بەهۆی ئەو بێ ئاگایی یە هیچ بڕیارو چارەسەرێکی دانەنابێ بۆ ئەوانە، هەتا لەم دوایی یەدا دەرکەوتن بۆ هێندێ لە بەندەیانی خوا و چارەسەر و بڕیاریان بۆ دۆزینەوە و دیاریی یان کردن؟!! ئایا ئەوانەی کە شەریعەتی خوا دوور ئەخەنەوە لە ژیان، لەباتی ئەودا شەریعەتی نەفامی ئەهێنن، هەواو ئارەزووی خۆیان یان ئارەزووی گەلێ لە گەلانی جیهان یان تاقم و چینێ لە چینەکانی ئادەمی ی باو ئەدەن و بەرزی ئەکەنەوە بەسەر حوکم و شەریعەتی خوادا، ئایا ئەوانە چی ئەڵێن و چییان بەدەستەوە هەیە، بەتایبەتی ئەگەر ئەوانە لاف موسڵمانێتی لێ بدەن و خۆیان بە موسڵمان دابنێن؟! ئایا ئەڵێن: چی بکەین کات و رۆژ یارمەتی نادەن؟ ئایا بێ مەیلی و خراپی مەردومان ئەکەن بە بەڵگە؟ ئایا زۆریی دوژمنایەتی ئیسلام و مەترسی یان ئەکەن بە بیانوو؟ ئایا خوا هەموو ئەوانەی نەزانیوە، لە کاتێك دا کە فەرمانی داوە بە موسڵمانان لەسەر ئەو

بەرنامەی کە بۆی دیاریی کردوون، جڵەوگیریی کردن لە هەر لادانیان لەو شەریعەتەی کە بۆی ناردن، لادان لە هەر هێندێکی وەك لادان لە هەر هەمووی؟! ئایا ئەوانە ئەڵێن: شەریعەتەکەی خوا کەم و کورِی تیا هەیە و ناگات بە هەموو رووداو و بەسەرهات و پێویستی یەکان دا؟ بێگومان هەرکەسێك زانا و ژیر بێ هەرگیز شتی وا ناڵێ، چونکە ئەزانێ کە ئەم شەریعەتی خوا بە جۆرێ هاتووە دەست ئەدات بۆ هەموو چەرخ و کاتێ، هەموو رووداو و بەسەرهات و پێویستی یەك داگیر ئەکات و ئەیانگرێتە کۆشی خۆی، چونکە دەق و یاسا و دەستووره گشتی یەکانی بە جۆرێکن کە حوکم و بریاری هەموو شتێکیان لێ وەرئەگیرێ و زاناکانی ئیسلام ئەتوانن کە چارەسەر وەرگرن بۆ هەر کۆسپ و گرێ یەك کە بێتە رێگەیان و دەقی قورئان و حەدیسی پێ نەهاتبێ، وەك توانی یان ئەو هەموو حوکم و بریارو چارەسەرەیان وەرگرت و دیاریی یان کرد و کردیان بەو هەموو کتێبە گەورە گەورەو پان و پۆرەی کە کتێبخانەی ولأتانیان پر کردووە و هەموو داواکارانیان بێ پێویست کرد ئەرك و زەحمەت و هەرچی پێویست بوو حازر و ئامادەیان کرد لە بەردەمیان دا – خوا پاداشتیان بداتەوە بە چەند چەندانەی کردەوە پیرۆزەکانیان –.

هەرکەس موسڵمان نەبێ هەرچی ئەڵێ بە ناشارەزایی یان بە دوژمنایەتی ماڤ خۆیەتی با بڵێ. بەلأم موسڵمان، یان کەسێ کە لاف موسڵمانێتی و خوێندەواریی لێ ئەدا، ئایا لەم بارەیەوە چی ئەڵێن و چییان بەدەستەوە هەیە کە بیکەن بە بەڵگە و بیانوو بۆ لادان لە حوکم و بریاری خوا و حوکم کردن بە قانوون و یاسای نەفامی ی غەیری ئیسلام؟ ئایا ئەو لادەرانە چۆن خۆیان بە موسڵمان دائەنێن؟ چۆن روویان هەیە خۆیان بە موسڵمان دابنێن؟ بەراستی زۆر جێگەی سەرسورمانن!! بەراستی ئاشکرایە کە هیچ کەسێك رێگەی هیچ دواو بەرێکی نی یە و ئەبێ یەکێ لەم دوو رێگەیە بداتە بەر بە بێ پێچ و پەنا: یان ئیسلام یان نەفامی ی. یا بروا یا بێ بروایی. یا حوکم و بریاری خوا یان حوکم و یاسای نەفامی ی. ئەوانەی کە حوکم و بریاریان بە شەریعەتی خوا نی یە هەر برو بیانوویەك بهێننەوە لای خوا وەرناگیرێ و روویان سپی ناکاتەوە، ئەوانە لە ئیسلام دەرئەچن و ستەمکار و لە سنووری خوا دەرچوون، ئەوانەی کە رازی نین بەوەی حوکم و بریاری خوایان بەسەردا بدرێ بروادار نین.

لِقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ﴿٥٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡ

خوای میهرەبان ئەو فەرمودە و پرسیارەی ئاراستە کرد. بەڵام هەموو کەس لەو پرسیارە و لە مەبەستەکەی تێ ناگات. بەڵکو ئەوانە تێ ئەگەن کە بیر ئەکەنەوە و زانان و بەهۆی ئەوەوە بۆیان دەرئەکەوێ کە حوکم و بڕیاری خوا ڕاست و پاکتر و بەرزترە لەهەر حوکم و بڕیارێکی تر، جا لەبەر ئەوە فەرموی: ﴿لِقَوۡمٖ يُوقِنُونَ﴾ واتە ئەو پرسیار و وتەیە بۆ گەل و کۆمەڵێکە کە بڕوا و زانینی تەواویان هەیە بە ئارامی دڵەوە.

بێگومان شتێکی ئاشکرایە – وەك لە کتێبە باوەڕ پێ کراوەکانیش دا هاتووە – کە ڕەوشتی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ بێ بڕواکان دا بەم جۆرە بووە: لە پاش هاتنی بۆ مەدینە بێ بڕواکان بوون بە سێ بەشەوە: بەشێك سوڵح و ئاشتی لەگەڵ بەکارهێنان بە مەرجێ جەنگی لەگەڵ نەکەن و پشتگیریی دوژمن و جەنگ کەرانی نەدەن، ئەوانە بێ باك بن لەسەر خوێن وماڵیان، بەشێك نە جەنگیان لەگەڵ کرد و نە پەیمانی ئاشتی یان دا، بەڵکو وەستان و چاوەڕوانی یان کرد تا بزانن کاری ئەم دوژمنەکان بەرەو چی ئەڕوا و چی یان بەسەر دێت، ئینجا هەرکام لەو سێ تاقمە بە فەرمانی خوا کردەوەو ڕەفتاری تایبەتی لەگەڵ کردن، بەم ڕەنگە سوڵح و ئاشتی بەکارهێنا لەگەڵ جوولەکەکانی مەدینە کە سێ خێڵ بوون، نامەی سوڵح و ئاشتی نووسراو ئیمزا کرا بە خۆشنوودی و ڕەزامەندی هەردوو تەرەف، ئینجا یەك بە یەك ئەو سێ خێڵە ناپاکی تەواویان بەکار هێنا و کەوتنە جەنگ و پیلانی خراپ کە مایەی لەناوچوونی پێغەمبەر(ﷺ) و ئیسلام و موسڵمانان بێت، ئینجا خوا بڕیاری داد و ڕاستی دا و فەرمانی دا بە تۆڵە سەندن لە هەر سێ خێڵەکە، وەك بە درێژیی لە کتێبەکانی تەفسیردا باس کراوە، بێگومان گاورەکانی عەرەب – هەروەها گاورەکانی ڕۆم – بە وێنەی جوولەکە دژبوون و ئامادەی جەنگ کردن بوون بە هەر جۆر بۆیان بکرێ. ئەوە لەبارێکەوە، لە بارێکی ترەوە قورئان ئەیەوێ بڕواداران بکات بە یەك ڕیز و بەیەك کۆمەڵ، دایان بڕێژێ و پەروەردەیان کات لەسەر بنەڕەتی ڕاستی و خۆشەویستی یان بۆ خوا و پێغەمبەر و ئاین و عەقیدەکەیان، پچڕان و جیابوونەوەیان لەهەر دژو دوژمنێك کە نایەوێ ئاڵای خوا بەرز ببێتەوە و شوێنی سەرکردایەتی پێغەمبەر(ﷺ) ناکەوێ و نایەوێ گەل و کۆمەڵی بڕواداران بەهێزو دامەزراو و یەکبار و یەك مەبەست و ئامانج بن، جا بەهۆی ئەوەوە ئەم ئایەتانە هاتنە

خوارەوە هەر جۆرە خۆشەویستی و دۆستایەتی و یارمەتی دان و سوێند خواری قەدەغە کرد لەلایەن بڕوادارانەوە سەبارەت بە جوولەکە و گاورەکان، خۆشەویستی و دۆستایەتی و یارمەتی دانی بڕوادارانی کورت هەڵهێنا لەخواو پێغەمبەرو بڕواداران دا، ئەوە بە شێوەی گشتی، بە تایبەتی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە ئەمەیە کە زانایانی تەفسیر هێناویانە لە(عبادەی کوڕی صامت) ەوە کە ئەفەرموێ: کاتێ کە خێڵی(بنی قینقاع) جەنگیان کرد لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ)(عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول) – کە سەرۆکی ناپاکەکانی مەدینە بوو – سوێند خواریان بوو بەرگری لێ کردن،(عبادە) ش کە وەك ئەو سوێند خواریان بوو هات بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و خۆی لێ بەری کردن و لە سوێند خواری یەکەیان دەرچوو، گوتی: من خواو پێغەمبەرو بڕواداران ئەکەم بە دۆست و خۆشەویست و یارمەتی دەری خۆم، من بەریم لە دۆستایەتی و سوێند خواری ئەو جوولەکانە، هەروەها لە چەند ریوایەتێکی تردا هاتووە کە هێندێ لە موسڵمانان نامەی دۆستایەتی یان نووسی بۆ گاورەکانی شام،(ئیبن و جەریر) ئەگێڕێتەوە کە هێندێ لە بەناو موسڵمانەکان لە ڕۆژی(احد) دا کە مەترسی یان کرد لە زاڵ بوونی بت پەرستەکان نیازیان کرد پەنا ببەن بە جوولەکەیەك و ببن بە جوولەکە، هێندێ تر نیازیان کرد کە پەنا ببەن بە گاورێك و ببن بە گاور، ئینجا بە بۆنەی ئەم ڕووداوانەوە ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی کەسانێ بڕواتان هێناوە بە ڕواڵەت و ڕووکەش ئیتر ئایا بە دڵیش بڕوادارن یان هەر بە ڕواڵەت و دیمەن بڕوادارن. ﴿لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَ﴾ جوولەکەو گاور مەگێڕن بە دۆست و خۆشەویستی و سوێند خوار و پشت پێ بەستراوی خۆتان، یارمەتی یان بدەن و داوای یارمەتی یان لێ بکەن، چونکە ﴿بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ﴾ ئەوان هێندێکیان دۆست و خۆشەویست و یارمەتی دەری هێندێکی تریانن، واتەجوولەکە لەناو خۆیان دا دۆست و یارمەتی دەری یەکترن، هەروەها هەردوو کۆمەك و یارمەتی دەری یەکترن بە دژو بەرامبەری ئیسلام و موسڵمانان. کەواتە ئێوەکەبڕوادارین نابێ ببن بەدۆست و یارمەتی دەر و خۆشەویستی هیچ کام لەوان ﴿وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ﴾ هەرکام لە ئێوە ئەوان بکات بە دۆست و خۆشەویست و یارمەتی دەری خۆی. بێگومان ئەو کەسەتان لەوانە و لە ڕیزی گاورو جوولەکەیە لە بێ بڕوایی دا. ئەگەر بڕوادارە ئەوا بڕواکەی وەرناگیرێ، چونکە ئەو خۆش ویستن و دۆستایەتی و یارمەتی دانە دژو پێچەوانەی بڕواکەیەتی، هەر بڕوایەك دژو پێچەوانەی لەگەڵ بێ وەرناگیرێ، شتێکی

ئاشکرایە کە گاورو جوولەکە و هەر بێ بڕوایەکی تر دوژمنی خوا و پێغەمبەرو قورئان و ئایینی پاکی ئیسلامن، دەی ئایا چۆن خۆش ویستنی ئەمان کۆ ئەبێتەوە لە هیچ دڵێک دا لەگەڵ خۆش ویستنی دژو دوژمنەکانیان. بەڕاستی ئەمە شتێکی زۆر روونە و جێگەی دوو دڵی و سەر لێ کردنەوە نی یە و ئەوەندە ئایەت و حەدیس لەم بارەیەوە زۆر هیچ رێگەیەک ناهێڵێتەوە بۆ هیچ تەئویل و پینەو پەڕۆیەک، وەک ئەوەی کە گوتراوە: مەبەست شوێن نەکەوتنیانە لە ئاین دا، یان مەبەست خۆش ویستن و یارمەتی دانیانە بە دژی موسڵمانان، بێگومان هیچ کام لەم دوو تەئویل و پینە و پەڕۆیەک ناکەوێ لەگەڵ رووکەش و رواڵەتی ئەو هەموو ئایەت و حەدیسانە، هەروەها یەک ناکەون لەگەڵ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانی ئێرەو ئایەتەکانی تریش، وا دەرئەکەوێ ئەوانەی کە ئەیانەوێ ئەم جۆرە تەئویل و پینە و پەڕۆیانە بکەن لەبەر ئەو ئایەتانەیە کە فەرمان ئەدەن بە دادو چاکە کردن لەگەڵ بێ بڕوایان دا، وەک بە پێی ئەو ئایەتانەش رەفتار کرا لەلایەن موسڵمانانەوە و لەو دەوڵەت و میری یانەی کە بە پێی ئیسلام رەفتاریان ئەکرد، بە تایبەتی لەگەل گاورو جوولەکەکان کە ژیاون لەناو موسڵمانان دا بە ئازادی و سەربەستی لەبارەی هەڵسانیان بەکاروباری ئایینی یان، بە چاودێری و پارێزگاری مافیان تا ئەو رادەیە بەندێ لە بەندەکانی شەریعەتی ئیسلام دەربارەیان ئەمەیە: ﴿لهم ما لنا و عليهم ما علينا﴾ هەر ماف و قازانجێک کە بۆ ئێمە هەیە، بۆ ئەوانیش هەیە، هەر ئەرک و زیانێک بکەوێتە سەر ئێمە ئەکەوێتەسەر ئەوانیش، واتە ئەوان یەکسانن لەگەڵ ئێمە لەماف و پێویستی سەرشان دا، بێجگە لەوەش خۆراک و خواستنی ئافرەتی ئەوان حەلاڵە بۆ ئێمە، کە ئەو تێکەڵی و دەست و پەیوەندی یە زۆر گرنگە و هەر لە دەست ئیسلام هاتووە کە بەوجۆرە کردەوەو رەفتاری شیرین بکات لەگەڵ دوژمنانی، بەڵام ئەو هەموو چاوپۆشی و چاکە کردن و بەکارهێنانی دادە شتێکە و، خۆش ویستن و دۆستایەتی و سوێند خواری شتێکی تری جیاوازە، نابێ تێکەڵ بکرێن و وەک یەک سەرنج بدرێن و وەک یەک رەوا بدرێن. بەڵکو ئەبێ بزانین کە پێویستە لەسەر موسڵمانان چاوپۆشی و بەکارهێنانی داد لەگەڵ نامەداردا، بەڵام لە هەمان کات دا قەدەغەیە لەسەری یارمەتی دان و کۆمەکی و سوێند خواریی لەگەڵیان، تەنانەت بەدژی بێ بڕوا و ماددی یەکانیش! بێگومان سوێند خواریی لەگەڵ نامەدار وا ئەگەیەنێ و وا نیشان ئەدا کە موسڵمان رازی بێ بە مانەوەی نامەدار لەسەر ئایینەکەی و بەجێ هێنانی رژێم و یاساکەی، ئاشکرایە کە نابێ موسڵمان رازی بێ بە بوون و مانەوەی هیچ بیرو باوەڕێک لەجیهان دا، هەروەها ئەو کۆمەکی

و سوێند خواری یە وا نیشان ئەدات کە موسڵمان دان ئەنێ بە ئایینێکی تردا بێجگە لە ئیسلام، بێگومان لە پاش هاتنی ئیسلام نابێ دان بنرێ بە هیچ ئایینێکی تردا، بەڵێ ئیسلام بە زۆر هیچ کەس موسڵمان ناکات، بەڵام لە هەمان کات دا هیچ ئایینێکی تر بە ئایین دانانێ و هەموو بە بێ ئایینی دائەنێ، بەس ئەوانەی کە لە وڵاتی ئیسلام دا بن و هەر ئایینێکی پڕوپووچیان گرتبێتە گەردن و رێ نەگرن لە ئیسلام و بە ئاشکرا بەدژی ئیسلام رانەوەستن، ئیسلام لەوانە بێ دەنگ ئەبێت و مافیان ئەپارێزێ و لەپەنای خۆی دا ئەیان ژیەنێ و بەرگریی هەموو ستەمێکیان لێ ئەکات، هەرچەند رازی نی یە و دان نانێ بە ئایین و بیرو باوەڕەکەیان دا، لە سورەتی(محمد) دا بەدرێژیی ئەم باسەم کردووە با سەرنج بدرێ. ئەبێ موسڵمان بەم جۆرە تێ بگات لە ئیسلام و هەموو بیرو باوەڕ و ئایینێکی تر لە پاش هاتنی ئیسلام. کەواتە هەر موسڵمانێ لای وابێ کە دروستە بۆ موسڵمانان دەست بخەنە ناو دەستی خاوەن ئایین و نامەدارەکان و ببن بە سوێند خوار لەگەڵیان و پێکەوە راوەستن بەرامبەر ماددی و بێ ئایینەکان، بەناوی ئەوەوە کە ئەمان هەموو کۆمەڵێکی بڕوادار و خاوەن ئایینن و ئەوەستن بەرامبەر کۆمەڵی بێ بڕواو بێ ئایین! هەر موسڵمانێ کە بڕوای وابێ و ئەوە رەوا بدا. ئەو موسڵمانە زۆر سادەیە و بێ ئاگایە لە ئیسلام، زۆر سادەیە کە پشت ئەبەستێ بە نامەدار و لای وایە کە ئەوانە راستی لەگەڵ ئەکەن و ئەبن بە دۆست و دەستە برای، لەگەڵ ئەوەدا ئەبینێ نامەدار نەوەستاوە و هەر لە یەکەمجاری هاتنی ئیسلامەوە تا ئێستا – بێگومان لەداهاتوویشدا – لە پیلان و دوژمنایەتی لەگەڵ ئیسلام و موسڵمانان دا، بە هەر جۆر لە دەستیان هاتبێ، لەگەڵ ئەو هەموو چاکە و داد و چاوپۆشی یەی کە ئیسلام و موسڵمانان بەکاریان هێناوە لەگەڵیان، ئەگەر نەشکەڕێتەوە بۆ دوور و سەرەتای ئیسلام و موسڵمانان بەکاریان هێناوە لەگەڵیان، ئەگەر نەشکەڕێتەوە بۆ دوور و سەرەتای ئیسلام چەند بەڵگە و نیشانەو رووداوی ئاشکرامان بەدەستەوەیە، ئایا هەر نامەدار نەبوو کە جەنگی سەلیبی هەڵگیرساند ماوەی دووسەد ساڵ؟ هەر نامەدار نەبوو کە هەڵسا بەو هەموو کردەوە پیسانە لە(ئەندەلوس) دا کە مرۆڤایەتی شەرمەزارە لە ئاستیان، بوون بە خاڵێکی رەشی دیاریی بەسەر لاپەڕەی مێژووی مرۆڤ و مرۆڤایەتی یەوە، هەروەها نامەدار نەبوو کە لەگەڵ ماددی و بێ ئایینەکان دا یەکیان گرت و لەسەر رای هەردوو فەلەستینی یەکانیان دەرکرد لە جێ و شوێنی خۆیان و باوك و باپیریان، جوولەکەکانیان چنی یەوە لە ناوچەکانی جیهان دا و لە شوێنی ئەو فەلەستینی یانەدا نیشتەجێ یان کردن؟ هەر نامەدار نەبوون کە

موسڵمانەکانیان ئاوارە کرد لە حەبەشە و سۆماڵ و ئەریتریا وشوێنەکانی تر؟ هەر ئەمان نەبوون کە بوون بە دۆست و دەستە برای بێ ئایین و ماددی و بت پەرستەکان، بە دژی موسڵمانان لە یوغسلافیا و چین و ترکستان و هیندو شوێنەکانی تر؟ بێ ئاگان لە قورئان کە لە چەند ئایەتێك دا هەواڵمان پێ ئەدا بە خەشم و کینە و نیازی بەدو دوژمنایەتی نەبڕاوەی نامەداران، بێ ئاگان لەوەی کە ئیسلام دان نانێ بە هیچ ئاییینێکی تردا، بەڵکو ئیسلام باوەڕ و فەرمانی لەسەر ئەوەیە کە لە پاش هاتنی ئیسلام لە جیهان دا هەریەك ئایین هەیە کە ئیسلامە و بێجگە لەو ئیتر ئاییینێکی تر نی یە کە ئیسلام یەك بکەوێ لەگەڵی و پێکەوە بوەستن بەرامبەر بێ ئاییینی و بێ ئاییینانەوە، بەڵکو بێجگە لە ئیسلام و موسڵمانان ئیتر بێ ئاییینی یە و بێ ئاییینانە، لە پاش هاتنی ئیسلام هەرکەس بڕوای ببێ و دەست بگرێ بەهەرکام لەو ئاییینانەی کە پێش ئیسلام هاتوون و لەماوەو چەرخی خۆیان دا ئاییینی خوا بوون، ئەو کەسە بە بێ بڕوا و بە بێ ئایین دائەنرێ. کەواتە نابێ هیچ موسڵمانێ بڕوای ببێ و دان بنێ بەو بیرو باوەڕە ئیستیعماری یەدا کە چەند ساڵێکە ئیستیعمار هەوڵی بۆ ئەداو ئەیەوێ بیچەسپێنێ: ئەوەش ئەمەیە کە لە جیهان دا دوو کۆمەڵ و دوو جەبهە هەیە:

١- کۆمەڵ و جەبهەی ئایین کە پێك بێت لە ئیسلام و ئەو بیرو باوەڕەکانی تر کەناو ئەبرێن بە ئایین، ئیتر ئەوانەی کە بە نامەدار دائەنرێن، یان بە بێ نامە.

٢- کۆمەڵ و جەبهەی ماددی و بێ بڕوا کە پێك دێن لە مارکسی و هەموو بێ ئایین و ماددیەکانی تر.

ئینجا پێویستە کۆمەڵ و جەبهەی یەکەم سوێند خواری یەکتر بن و یەك کەون بەناوی ئەوەوە کە هەموو خاوەن ئاییینن، ئەمانە یەکێتی و کۆمەکی یان ببێ بەرامبەر کۆمەڵ و جەبهەی دووەم. ئێمەی موسڵمان ئەبێ ئاگامان لەخۆمان بێت و هەڵنەخەڵەتێین بەو جۆرە پیلانانە، پێویستە هەمیشە وێنەی ئەم ئایەتەمان لەبیر بێ کە ئێستا ئەژین لەگەڵی دا، ئەبێ بزانین کە وێنەی ئەم ئایەتانە بۆ کات و چەرخێکی تایبەتی نەهاتبوون، بەڵکو هەمیشەیین و بۆ هەموو کاتن هەتا هەتایە لە هەر شوێن و وڵاتێك دا، ئەبێ بزانین کە ئەوان هەمیشە دۆست و یارمەتی دەری یەکترن بەرامبەر بە ئیسلام و موسڵمانان، کەواتە وەك ئایەتەکە فەرموی هەرکەس لەبڕواداران ببێ بەسوێندخوارویارمەتی دەری ئەوان ئەوکەسە لە ریزی موسڵمانان دەرئەچێ و ئەچێتە ریزی ئەوان، بەهۆی ئەوەوە ئەبێ بە ستەمکار لە خۆی و لە ئاییینی خوا و لەکۆمەڵی موسڵمانان، بێگومان ئەوکاتەخوایش گومڕای ئەکات و نایخاتە سەر رێی راست،

إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمۡ يَقُولُونَ نَخۡشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٞۚ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَ بِٱلۡفَتۡحِ أَوۡ أَمۡرٖ مِّنۡ عِندِهِۦ فَيُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ نَٰدِمِينَ ﴿٥٢﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ

---

**چونکه ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بێگومان خوا ڕێنموونی ئەو کۆمەڵە ستەمکارانە ناکات و نایانخاتە سەر ڕێی ڕاست. بێگومان هەڵوێستی مەسیحی یەکان لە سەرەتای هاتنی ئیسلام و چەرخی یەکەم دا زۆر جیاواز بووە لە هەڵوێستی زۆر بەد و خراپی جوولەکەکان لەو سەردەمەدا بەرامبەر ئیسلام و موسڵمانان، وەك دەرئەکەوێ لەو حەدیس و هەواڵانەی کە هاتوون لە بارەی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانی ئێرەدا، هەروەها وەك ئایەتی(٨٢) ی ئەم سورەتە دەست نیشانی بۆ ئەکات لەسەرەتای جزمی حەوتەم دا، هەرچەند هەڵوێستی ئەو دوو تاقمە زۆر جیاواز بووە لەو سەردەمەدا، بەڵام قورئان هەردووەکەی جوت کردن وەك یەك بڕیاری ئەم ئایەتەی بۆ دەرکردن، هەردووی یەکسان کرد، وەك لە ئایەتی(٥٧) ی داهاتویش دا یەکسانیان ئەکات لەگەڵ بت پەرست و بێ بڕواکانی تردا، قورئان بەم جۆرەی کرد کە گوتمان، چونکە ویستی بۆچوونێکی هەمیشەیی و پەیوەندی یەکی هەمیشەیی و بارو حاڵەتێکی هەمیشەیی دابمەزرێنێ لەنێوان کۆمەڵی موسڵمان و هەموو کۆمەڵەکانی تردا، ئیتر چ نامەدار و چ بت پەرست و بێ بڕواکانی تر، قورئان ویستی کە یاسایەکی بنەڕەتی هەمیشەیی دابنێ بۆ موسڵمانان، کە ئەبێ موسڵمان دۆستی و یەکێتی و سوێند خواری و یارمەتی هەر لەگەڵ موسڵمان بێت، هەر لەگەڵ خوا و پێغەمبەربێت(ﷺ) بێجگە لەوەیش ئەو خوایە کە ئەو یاسا و بڕیارە گشتی و هەمیشەیی یەی دانا، ئاگا و زانایە بە هەموو شتێ ئەو خوایە زانیویەتی کە لە دوا ڕۆژدا گاورەکان بە وێنەی جوولەکەکان هەموو جۆرە دوژمنایەتی و کردەوەی بەد بەکارئەهێنن لەگەڵ ئیسلام و موسڵمانان دا، بڕوادارو بێ بڕوا ئەگەر سەرنجێکی مێژوو بدا بە باشی ئەوەی بۆ ڕوون و ئاشکرا ئەبێ، ئەوەتا ئەبینین – بێجگە لە مەسیحی یەکانی عەرەب و میسر کە بە جوانی هاتن بە پیری ئیسلامەوە – لە هەموو وڵات و ناوچەکانی جیهان دا گاورەکان هیچ کات دەستیان نەگێڕاوەتەوە لە هەر خراپەکاری یەك کە لە دەستیان هاتبێ دەربارەی ئیسلام و موسڵمانان، تەنانەت حەبەشە کاتی خۆی پاشاکەیان بەو جۆرە مەردایەتی یە موسڵمانەکانی**

گرته خۆی، لەم دوایی یەدا مەسیحی یەکانی ئەو وڵاتە و تا ئێستاش ئەوپەڕی رادە دژو دوژمنی موسڵمانەکانن، ئەو هەموو کردەوە بەدانەی کە ئەوان پێی هەڵساون و پێی هەڵئەسن، ئەو کردەوانەی ئەمانە هیچ کەمتر نی یە لە کردەوە بەدەکانی جوولەکەکان، کەواتە با بزانین و تێ بگەین کە هەر ئەوە راست و رەوایە کە قورئان کردنی بە هاوسەری جوولەکەکان لە ئایەتەکەدا! کەواتە با هەمیشە ئێمەی موسڵمان ئاگامان لە هەڵوێستی خۆمان بێت بەرامبەر گاورەکان و جوولەکەو هەموو کۆمەڵە بێ بڕواکانی تر، بەم رەنگە هەمیشە چاوپۆشی و داد بەکار بێنیٚ لەگەڵ ناموسڵمانەکان دا، بەڵام لە هەمان کات دا نابێ لەدڵ دا خۆشمان بوویٚن، نابێ پشتیان پێ ببەستین و بیانکەین بە دەستە برای خۆمان، نابێ هیچ جۆرە یەکێتی و سوێند خواری و یارمەتی دان و یارمەتی یان لێ داوا بکەین!!

بەو شێوە بانگی کردە بڕوادارەکان بە شێوەی گشتی، بە پاك و بڕواو راست و ناپاك و دڵ نەخۆشەوە، بێگومان پاکو بڕوا راست بە بێ گیرو گرفت گوێ رایەڵی کرد و خۆی پاك و خاوێن و بەری کرد لە دۆستایەتی و یەکێتی و خۆشەویستی بێ بڕواو دوژمنانی ئیسلام، بۆ وێنە: وەك(عبادەی کوڕی صامت) – خوای لێ رازی بێت – کە چووە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: من دۆست و خۆشەویستی زۆرم هەیە لە جوولەکە، من خۆم بەری ئەکەم لەوان و خۆم ئەپچڕم بە تەواوی و دێم بۆلای خوا و پێغەمبەرەکەی و هەموو خۆشەویستی و دۆستایەتیم ئەدەم بەوان، ئەوەی کە ناپاك و دڵ نەخۆش بوو، وەك کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بەو جۆرەی نەکرد، بەڵکو بەم شێوەیە بوو کە خوا دەربارەیان ئەفەرموێ: ﴿فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ ئینجا ئەی پێغەمبەر، یان هەرکەسێك کە سەرنج بدات. ئەبینی ئەوانەی کە لە دڵەکانیان دا نەخۆشی هەیە. نەخۆشی ناپاکی و دوو دڵی، ﴿يُسَٰرِعُونَ فِيهِمُ ٱلَّذِينَ﴾ چەسپانی ئەکەن لە خۆش ویستن و سوێند خواریی ئەو جوولەکە و گاورانەدا، واتە بەهێزو دامەزراون لەسەر ئەوبارە و ئەیانەوێ زیاترە پەرەی پێ بدەن، هۆ و بیانووەکەشیان ئەمەیە: ﴿يَقُولُونَ نَخۡشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٞ﴾ مەترسی ئەکەن کە بەسەرهاتی خراپ و ناخۆشی چەرخ و رۆژگار دووچارمان ببێ، واتە ناتوانین خۆمان بپچڕین لە دۆستایەتی و تێکەڵی یان، چونکە مەترسی ئەکەین کە رۆژی سەخت و بەسەرهاتی خراپ دەورمان بدات و وپێویستیمان ببێ بە یارمەتی ئەوان، کەواتە بەم دۆستایەتی و سوێند خواری یە دەست پێشخەری بکەین بۆ ئەو رۆژو بەسەرهاتەمان، ئیتر مەبەستیان بەسەرهاتی گرانی و قاتی و قڕی بووبێ و

نامـەدارەكان كـە دەوڵەمەنـد بـوون كۆمـەكی و دەسـت گیرۆیـی یـان بكـەن، وەك كەلـەبی ئەفەرموێ. یان مەبەستیان زاڵ بوون و سەركەوتنی بت پەرستەكان و جوولەكە و گاورەكان بـووبێ، وەك(مجاهـد و قتـادة و سدی) ئەفـەرمون. بەهـەرجۆر و لەسـەر هـەربار ئـەوا خـوا بەرپەرچیان ئەداتـەوەو ئەیانترسێنێ و ئەفەرموێ: ﴿فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَ بِٱلْفَتْحِ﴾ ئینجا ئومێدە كە خـوا سـەركەوتن و زاڵ كردنـی تـەواو بـێنێ بـۆ پێغەمبەرەكـەی بەسـەر دوژمنـەكانی دا، ئایینەكەی زاڵ بكات بەسەر هەموو ئایینەكان دا، موسڵمانەكان بەسەر گاورو جوولەكە و بت پەرست و بێ بڕواكان دا ﴿أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِۦ﴾ یان كارێكی تر بێنێ لەلایەن خۆیەوە بە بـێ ئـەوەی لەسـەر دەسـتی هـیچ كـەس دا بـەدی بـێنێ و دەخلـی هـیچ كەسـێكی تێـدا بێـت، وەك دەركردنی(بنی نضیر) لە مەدینە بە بێ ئەرك و زەحمەت، ئەو(بنی نضیر) ەی كە خاوەنی زۆر دەسەڵات بوون و ناپاكەكان پشتیان قایم بوو پێ یان و ئومێدیان وابوو كە فریایـان كـەون لە بەسەرهاتی خراپ و رۆژی تەنگی دا ﴿فَيُصْبِحُوا۟ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ نَـٰدِمِينَ﴾ ئەو كاتـەو بـەهۆی ئەوەوە ئەو ناپاكانە بگەرێن بە پەشیمان لەسەر ئەوەی كە لـە دەروونـی خۆیـان دا نهێنی یان كردبوو، دەریان نەئەبڕی، ئەوەیش بریتی بوو لـە ناپـاكی و بڕوا و ئومێدیان بە پێچەوانەی ئەوەی كە خوا بەدی هێنا و هێنایە كایە.

ئەم فەرمودەیە كە بەرپەرچی ئـەو ناپاكانـەی پـێ دایـەوە، هەرچەند بە شێوەی ئومێدو چاوەڕوانی نیشانی دا، بەڵام بەڵێن بوو، چونكە – وەك بەناوبانگە – وتەی(لعل، عسی) كە بۆ گەیانـدنی چاوەڕوانین، لەلایـەن خـواوە مەبەسـت پـێ یـان بـەڵێنی تـەواوە، خـوا ئـەم بەڵێنـەی بـەدی هێنـا بـە كوێرایی چاوی ناپاكـان و دوژمنـان، هـەموو سوپاسـێ بـۆ خـوا، لـەو كاتـەدا بڕواداران سەریان سوڕ ئەمێنێ لە حاڵی ئەو ناپاكانە، بێزاری دەرئەبڕن لـە ناپـاكی یەكـەیان، تەشەریان لێ ئەدەن بەو زیانباری یەی كە تێ ی كەوتن، وەك لەم فەرمودەیشەوە دەرئەكەوێ: ﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ لەو كاتـەدا ئەوانـەی كە بڕوایـان هێنـاوە ئـەڵێن لـەناو خۆیـان دا دەربـارەی ئەو ناپاكانـە ﴿أَهَـٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ﴾ ئایا ئەوانـە ئـەو كەسانـە بوون كـە سوێندیان ئەخوارد بە خوا بۆتان بە ئەستورترینی سوێندەكانیان كە

إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْۚ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فَأَصْبَحُواْ خَٰسِرِينَ ﴿٥٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ

---

﴿إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْ﴾ بەڕاستی ئەوان لەگەڵتانن بە کۆمەکی و یارمەتی دانتان بەسەر دوژمنانتان دا، کەچی ئەوەتا دەرکەوت کە ناپاك بوون و لەگەڵ دوژمنانتان بوون؟! بەم جۆرەش تەفسیر کراوەتەوە: کە بڕواداران لەو کاتەدا ئەڵێن: بە جوولەکەکان بۆ غەمبار کردنیان و پلار دان لە ناپاکەکان: ئایا ئەوانە بوون ئەو کەسانەی کە بە توندی سوێندیان بۆ ئەخواردن لەسەر ئەوەی کە یارمەتیتان ئەدەن و لەگەڵتانن، بەم جۆرەش هەر باشە و وێنەی هاتووە لە سورەتی(حشر) دا کە ناپاکەکان سوێندیان خوارد بۆ جوولەکەکان کە ئەگەر دەرکرێن ئەوانیش لەگەڵیان دەرئەچن، ئەگەر جەنگیان لەگەڵ کرا یارمەتی یان ئەدەن، لەپاش دا درۆیان کرد و لەکاتی تەنگی دا لێ یان کشانەوە! ﴿حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ﴾ کردەوەکانی ئەو ناپاکانە زایە بوون و بە هیچ دەرچوون، ئەو کردەوانەیان کە بە ناپاکی ئەیانکرد بۆ دڵنیا کردنی موسڵمانەکان بەوەی کە لەگەڵیانن و بەڕاستی موسڵمانن، ئەو کردەوانەیان بە هیچ دەرئەچن چ لای موسڵمانەکان، چ بۆ ڕۆژی دوایی، چونکە لە راستی دا ناپاك بوون و دەستە برای دوژمنانی ئیسلام بوون، ئەوەش دەرئەکەوێ لەو کاتەدا بۆ بڕواداران. یان مەبەست ئەو هەموو کردەوە دۆستانەیە کە ئەیانکرد لەگەڵ جوولەکە و دوژمنانی ئیسلام دا، کە بە تەمای ئەوەبوون ئەوان سەرکەون بەسەر ئیسلام و موسڵماناندا، ئەو کاتە پاداشتیان بدەنەوە، ئەو هەوڵ و کردەوانەیان بە هیچ دەرچوون، چونکە خوا ئیسلام و موسڵمانانی سەرخست و زاڵی کردن، بە پێچەوانەی ئەوەی ئەو ناپاکانە بە تەما بوون. ئەو بێ بڕواو دوژمنانە تیا چوون و ناپاکانیش هەر سەرکزی و بێ ئابڕووی یان بۆ مایەوە، وەك ئەفەرموێ: ﴿فَأَصْبَحُواْ خَٰسِرِينَ﴾ بەهۆی ئەوەوە ئەو ناپاکانە گەڕان بە زیانکەرو رەنجەڕۆ و لە جیهان دا بە بێ ئابڕوویی و بە بەدی هاتنی دژو پێچەوانەی ئەوەی بە تەمای بوون، لە ڕۆژی دواییش دا بە زایە بوونی کردەوەکانی جیهانیان و دووچاربوونیان بە سزای نەبڕاوەی دۆزەخ. ئەو بەڵێن و هەواڵە غەیبی یانەی کە لەم دوو ئایەتە بوون، خوای میهرەبان بەدی هێنان: ئەو فەتح و سەرکەوتن و زاڵ کردنەی هێنا، نیازی بەدی بەد نیازان و ناپاکان دەرکەوت، چەند تاقم و زیانکەرو رەنجەڕۆ بوون، ئەو جۆرە بەڵێنانە تایبەتی نین بە هیچ چین و چەرخێکەوە، بەڵکو

لەهەرکاتێك دا ئەم ئوممەتە بەڕاستی دەست بگرێ بە ئیسلامەوە، هەوڵ و تێکۆشانی هەر لە ڕێی خوا و بۆ ڕەزامەندی خوا بێ، هەموو دۆستایەتی و خۆش ویستنی بگەڕێتەوە بۆلای خوا، لە هەرکات و چەرخێك دا ئەم ئوممەتە بەم جۆرە بێ خوا بەڵێنی ئەم ئایەتە بەدی ئەهێنێتەوە بۆی.

لەمەوپێش بانگی کردە بڕواداران کە کۆتایی بێنن لە دۆستایەتی و خۆش ویستنی گاورو جوولەکەو کۆمەکی کردنیان و یارمەتی دانی یەکتر، تا بەهۆی ئەوە ئەمان نەچنە ڕێزی ئەوان و لە ڕیزی موسڵمانان دەرنەچن، ئینجا بانگ کردنێکی تر ئەمێنێ بەدوای بانگ کردنەکەدا، هەڕەشە ئەکات بە شێوەی گشتی لە هەرکەسێك، کە بە هەرهۆیەك هەڵگەڕێتەوە لە ئیسلام، هەڕەشەیان لێ ئەکات بەمەی هیچ نرخێکیان نی یە لای خوا، لە دەستی خوا دەرناچن و هیچ زیانێك ناگەیەنن بە ئایینی خوا، ئایینی خوا دۆست و یارمەتی هەیە و لە زانینی خوادا دیاریی کراون، سیفەت و نیشانەی ئەوانەی دیاری کراون نەخشە ئەکێشێ، هەروەها بە روونی دیاریی ئکات ئەو تاقانە تەرەفەی کە بڕواداران خۆشەویستی و دۆستایەتی ئاراستە بکەن، ئینجا باسەکە دوایی ئەهێنێ بەدیاریی کردنی دوا ڕۆژ و چارەنووسی ئەو جەنگ و بەربەرەکانێی کە هەیە لە نێوان کۆمەڵی خواو کۆمەڵەکانی تردا.

ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ﴾ ئەگەر هەرکەس لە ئێوە هەڵگەڕێتەوە لە ئایینەکەی ﴿فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ﴾ خوا لەباتی ئەوان و لە شوێنی ئەوان دا لە پاش ئەمان و لەناوچوونیان گەل و کۆمەڵێکی تر ئەهێنێ هەموویان سیفەت و نیشانەیان ئەمانەیە کە دێن:

١- ﴿يُحِبُّهُمۡ﴾ خوا ئەوانی خۆش ئەوێ، بەو خۆش ویستنەی کە شایستەیە بە زاتی پاکی بێ وێنەی، ئەو خۆش ویستنەی کە بێ وێنەیە وەك زاتی پاکی و هەموو سیفەتەکانی تری کە بێ وێنەن و ژیریی و زانینی ئێمە کۆڵ و کولن لە پەی پێ بردنیان، کەواتە ئەبێ بڵێین: ئەو بەندەیانەی خۆش ئەوێ بەو جۆرو شێوەی کە خۆی ئەزانێ و مەبەستێتی. بێگومان ئەو خۆش ویستنەی خوا بۆ بەندەکانی بەهرەو بەخششێکە مەگەر هەر خواناسان تێ بگەن لە نرخ و رادە و پایە و پلەی بەرزی، ئەوانیش بە پێی جیاوازی یان لە رادەو پلەی خواناسی یان دا، بەڕاستی هەتا بیربکرێتەوە لە گەورەیی و گرنگی ئەوە بەهرەیە هەر کەمە و دڵ و دەروون و ژیریی پیای دا ناگات! خوای داهێنەرو پەروەردگاری ئەم بوونەوەرە لە کوێ و ئەم بەندە بێ هێزو لاوازە لە کوێ؟!

ئەم بەندەیە کە هیچ چاونادا لە چاو ئەو هەموو بوون و بوونەوەرەدا، کە بوون و بوونەوەرەکەیش وردیلکە و تۆزێکی نادیاریی یە لە چاو دەسەڵاتی بێ سنوور و نەبڕاوەی پەروەردگاردا، جا ئەبێ ئەم بەندەیە چی بێ، تا خوا ئەو بەهرەو بەخششەی پێ ببەخشێ و لە نامە هەتا هەتایی یەکەی دا باسی بفەرموێ!!!

٢- ﴿وَيُحِبُّونَهُ﴾ ئەو گەل و کۆمەڵەش خوایان خۆش ئەوێ، خۆش ویستنی خوا بۆ بەندە، چونکە بێ وێنەیە هەق وایە هەر بەو جۆرە لێ ی بدوێین کە گوتمان، زیادە ڕەوی نەکەین و هیچ تەئویل نەکەین و مەبەستی تری بۆ دیاریی نەکەین، بەڵام خۆش ویستنی بەندە بۆ خوای خۆی، لەبەر ئەوەی وێنەو نموونەی هەیە لای بەندە، هیچ پێویست نی یە لابدەین لە رووکەش و رواڵەتەکەی و تەئویلی تیا بکەین و بیبڕین بەسەر گوێ رایەڵی و بەدواگەڕانی هۆی ڕەزامەندی خوا، کە بێگومان ئەوجۆرە شتانە جیاوازن لە خۆش ویستنەکە و بەرو بەرهەمن بۆی. بەڵکو تەفسیر و راڤەی ئەکەین لەسەر ئەو بارو شێوەی کە لە دەروونی خۆمان دا هەستی پێ ئەکەین، کە بریتی یە لە مەیل و سۆز و پەرۆشی دڵ بۆ خۆشەویستەکە، لەم ڕێگەیەوە ئەپۆین بۆ خۆش ویستنی بەندە بۆ خوای خۆی، هەرچەند ئەو خۆش ویستنە تام و بۆنێکی تری هەیە زۆر جار جیاوازە لە خۆش ویستنی هەر خۆشەویستێکی تر، بەروبووم و بەرهەمێکی تری هەیە مەگەر هەر ئەو کەسانە لێ ی تێ بگەن کە خوا بەهرەمەندی کردوون بەو چاکە و بەهرە گەورەیە،(ئیمامی غەزالی) لە(احیاء) دا بە درێژیی ئەم باسەی کردووە، بە جۆرێ کە هۆی ئارامی دڵە، لەبەر ئەوەی باسەکە زۆر درێژە نەکێشێ ئەو باسەم نەهێنا، هەرکەس ئەیەوێ با تەماشای بکات، ئەگەر خوا رێکی خست بۆمان لە شوێنێکی تردا ئەو باسە ئەهێنین، ئەو باسە دوا ئەخەین بۆ سورەتی(التوبة) لەکاتی تەفسیری: ﴿أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ﴾ بە یارمەتی خوای میهرەبان.

ئەوەی کە زۆرتر سەرنج رائەکێشێ و خۆش و شادمانی ئەدا بە دڵ ئەم تەعبیرە نایابەیە: ﴿يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ﴾ وەك خوا لەگەڵ ئەو بەندەیانەدا دوو تەرەف بن. هاوتا و هاوکێشی یەکتر و پەیوەندی نێوانیان خۆش ویستنی یەکتربێ، لە لوتف و میهرەبانی یەکەی بەزیاد بێ، یاخوا بەشدار بین تیایدا.

٣- ﴿أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ سۆز و بەزەیی دارن بۆ بڕواداران، بەشێوەی رادەی پەستی و خۆ بە بچووك دانان. واتە لە ئاستی بڕواداران نەرم و نیان و سووك و ئاسان و گوێ رایەڵن، بە بێ رەقی و سەرکێشی.

٤- ﴿أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ بەهێزو خۆ بەزل زانن دەربارەی بێ بڕوایان، دەربارەی بڕواداران بەو جۆرەن کە باس کرا، چونکە بەهۆی بەشداریی و هاوبەشی یان لە بڕوادا – کە بەرزترین سیفەتە و بەرێزو پیرۆزترینە بەلای خواوە – بێجگە لە برایەتی و یەکێتی و تێکەڵی و خۆشەویستی هیچ شتێکی تر نامێنێتەوە لە نێوانیان دا، ئەمان و بڕوادارانی تر خوایان خۆش ئەوێ و خوایش ئەمانی خۆش ئەوێ، ئیتر چۆن لەدڵیان دا هیچ شتێکی تر هەیە بەرامبەر ئەوان بێجگە لە نەرم و نیانی و خۆشەویستی و سۆز و بەزیی و یەکێتی؟! بەڵام بە پێچەوانەن لەگەڵ بێ بڕوایان دا، چونکە ئەمان بڕوا و بیروباوەری بەرزیان پێ یە، لە ژێر بەرزترین ئاڵادان، بێ بڕوایان پەست ترین بیروباوەڕیان پێ یە و لە ژێر پەست تر و بێ نرخ ترین ئاڵادان، ئەمان بڕوای بەهێزیان هەیە بە زاڵ بوونی ئایینی خوا بەسەر ئایینی پڕوپووچی هەواو ئارەزووی نەفس دا، بەزاڵی هێزی خوا بەسەر هەر هێزێکی تردا، بەزاڵی و بەرزی کۆمەڵی خوا بەسەر هەموو کۆمەڵەکانی تردا، کەواتە خۆ بە زاڵ و بە زل زانی یەکەیان بۆ خۆیان و لەبەر خۆیان نی یە، بەڵکو بۆ خوایە و لەبەر خوایە، دەی ئەوەش زۆر راست و بەجێیە.

٥- ﴿يُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ تێکۆشان ئەکەن لە رێی خوادا، بۆ دامەزراندن و جێگیرکردنی بەرنامەی خوا لە زەوی دا، بۆ گێڕانی ئایین و شەریعەتی خوا بە حاکم و کاربەدەست لە ژیان دا، بۆ پێك هێنانی خێرو خۆشی و چاکە بۆ بەندەیانی خوا، ئەوانە تێکۆشان لەبەر خۆیان ناکەن، بەڵکو لەبەر خوا ئەیکەن، لە رێی خوادا ئەیکەن، نەك لە رێی خۆیان دا، نەك لە رێی گەل و کۆمەڵ دا، نەك لە رێی بەرەو تیرەیان دا، نەك لە رێی نیشتمانیان دا. تێکۆشان چەند بارو جۆرێکی هەیە، گەورەترینیان بەخت کردنی ماڵ

و گیانە لە ڕێی خوادا و لە جەنگ و کوشتاری دوژمنانی ئیسلام دا، خوا بێ بەشمان نەکات لێ ی، ئینجا ئایا مەبەست لێرەدا تێکۆشان و جەنگ بێت لەگەڵ ئەوانەی کە پاشگەز ئەبنەوە و هەڵئەگەڕێنەوە، یان بە گشتی مەبەست بێت. وا دەرئەکەوێ بە شێوەی گشتی مەبەست بێت، بێگومان جەنگ و کوشتار لەگەڵ ئەوانەی یەکەمجاری ئەم ئوممەتە مەبەستی یەکەم سەردەستەیە لێرەدا.

٦- ﴿وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَائِمٍ﴾ ئەوانە مەترسی ناکەن و باکیان نی یە لە هیچ ڕەخنە و تەشەری هیچ ڕەخنەگرو تەشەر دەرێ، واتە لەو تێکۆشانەدا کە ئەیکەن گوێ یان لە قسەی هیچ کەس نی یە، نەك وەك ناپاکەکان کە کاتێ بچوونایە لەگەڵ موسڵمانەکان بۆ جەنگ و کوشتار، هەمیشە دڵیان لای دۆست و سوێند خوارەکانیان بوو لە جوولەکەکان و مەترسی یان ئەکرد لە تانە و تەشەری ئەوان، یان مەبەست گشتی یە لە تێکۆشان و هەر کردەوەیەکی تری ئیسلامی، واتە بەهێز و دامەزراون لە هەموو کارو باری ئایینەکەیان دا، ئیازو مەبەستیان هەر ڕەزامەندی خوایە و ئیتر گوێ یان لە هیچ کەس و لە هیچ شتێك نی یە، نە بە وەسف و سەنای کەس شادومان ئەبن و نە بە تانە و تەشەرو ڕەخنەی کەسیش غەمبار و دڵ ڕەنجەڕۆ ئەبن، ئەبێ چۆن مەترسی بکەن لە لۆمە و ڕەخنەی هیچ کەس، لە کاتێك دا کە ئەوان خۆش ویستنی وا دڵی داگیر کردوون و ئومێد و چاوەڕوانی ئەوەیان هەیە کە خوایش ئەمانی خۆش بوێ؟ ئەبێ چۆن گوێ یان لە قسەی کەس بێت لە کاتێك دا کە ئەمان بەستراون تەنها بە بەرنامەی خواوە و هەموو کاروکردەوەی خۆیان بە تەرازووی خوا کێشانە ئەکەن و هەر بە سەنگ و مەنی شەریعەتەکەی خوا کێشانە و پێوانە ئەکەن و ئیتر گوێ یان لە هیچ سەنگ و مەنێکی تر نی یە و هیچ تەرازوو سەنگ و مەنێکی تر بە ڕاست و دروست دانانێن؟

ئەمانە هێزو بەرزی بۆ خۆیان هەر لە خوا داوا ئەکەن، لە هێزی بڵندی و بەرزی خواوە دەست کەوتیان ئەبێ، کەواتە هەرکەس هەرچی ئەڵێ با بڵێ و هەرکەس هەرچی ئەکات با بیکات. ئێمە کاتێ گوێمان لە قسە و کردەوەی مەردومە، کاتێ سەرنجی باو و خواستی مەردومان ئەدەین کە بێ ئاگایین و هۆشمان لای خۆمان نەمێنێ کە چین و بۆچی دروست

کراوین، ئێمە ئەبێ بزانین کە بەندەی خواین و دروست کراوین بۆ گوێ رایەڵی خواو فەرمانبەریی، ئەبێ تەنها شوێنی نامەو شەریعەتی خوا بکەوین، تەنها ئەوە بە هەق و راست بزانین، بێجگە لەو بە ناڕاست و ناهەق بزانین با هەموو ئادەمی بکەونە شوێنی و بە راست و رەوای دابنێن و هەموو بیکەن بە باو. جا لەبەر ئەوەی کە گوتمان ئەو کۆمەڵە بڕوادارە کە بەهرەمەند بوون بەو بڕواو بیرو باوەڕە راستە، لە هەموو تێکۆشان و هەموو کارو کردەوەیەکی تریان دا مەترسی ناکەن و گوێ یان نی یە لە هیچ رەخنە و لۆمەی هیچ رەخنە گرو لۆمە کەرێ. بێگومان ئەم ئایەتە هەواڵێکی غەیبی بوو کە لە پاش دا بە روونی بەدی هات: ئەوە بوو یانزە دەستە و کۆمەڵ پاشگەز بوونەوە لە ئیسلام. سیانیان هەر لە چەرخی پێغەمبەردا(ﷺ):

ا- هۆزی مدلج بە سەرۆکایەتی ئەسوەدی عەنەسی کە لە یەمەن دا لاف پێغەمبەرێتی لێدا. ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) نامەی نووسی بۆ(معاذ کوڕی جبل) کە والی ئەوێ بوو، نووسی بۆ گەورەکانی یەمەن، ئینجا خوا لەناوی برد لەسەر دەستی(فیروزی دەیلەمی) دا لە شەوێکدا، پێغەمبەریش(ﷺ) هەواڵی کوشتنەکەیداوموسڵمانان خۆش حاڵ بوون بەوە.

ب- تیرەی(بني حنيفة) بە سەرۆکایەتی(موسەیلەمەی کذاب) کە ئەویش لاف پێغەمبەرێتی لێدا، وەك بە درێژیی لە کتێبی حەدیس و سیرەت دا باس کراوە. لە پاشان حەزرەتی ئەبوبەکر – خوای لێ رازی بێت – بە لەشکری موسڵمانان کەوتە جەنگ کردن لەگەڵیان و ئەو پیسە کوژرا بەدەستی(وحشی) کە لەکاتی خۆی دا حەزرەتی(حمزە) ی شەهید کرد لە جەنگی(احد) دا، جا ئەو(وەحشی) یە ئەیگوت: لەکاتی بێ بڕوایی و نەفامیم دا چاکترین کەسم کوشت، لەکاتی موسڵمانێتیم دا خراپترین کەسم کوشت.

ت- هۆزی ئەسەد بە سەرۆکایەتی(طلحەی کوڕی خویلد) کە لاف پێغەمبەرێتی لێ دا لەناو گەلەکەی دا، لە پاشان حەزرەتی ئەبوبەکر – خوای لێ رازی بێت – لەشکری بۆ نارد بە سەرکردایەتی خالدی کوڕی وەلید، ئەویش شکاندی لەو جەنگەدا، لە پاشان(طلحة) رای کرد بۆ شام، لەوێ بە باشی موسڵمان بوو، ئینجا لەپاش پێغەمبەری ئازیز(ص) حەوت تیرەو کۆمەڵی تر هەڵگەڕانەوە: ١- (فەزارە) کۆمەڵی(عوبەینەی کوڕی حیسن).

٢- (غطفان) كۆمەڵی(قەرەی كوڕی سەلەمە). ٣- هۆزی(بنی سلیم) كۆمەڵی(عبد یا لیل). ٤- هۆزی(یربوع) كۆمەڵی(مالك ی كوڕی نویره). ٥- هێندێ لە هۆزی(تمیم) كۆمەڵی(سجاح كچی منذر). كە ئەو(سجاحە) لافی پێغەمبەرێتی لێ ئەدا و لە پاشان شووی كرد بە موسەیلەمەی كذاب كە داستانەكەیان بەناوبانگە لە كتێبی سیرەتدا، بەڵام لە پاشان بەڕاستی موسڵمان بوو. ٦- (كیندە) كۆمەڵی(ئەشعەسی كوڕی قەیس). ٧- هۆزی(بەكری كوڕی وائیل) لە بەحرەین.

هەمووئەمانەش خوالەسەردەستی یاری غاردا چارەسەری كردن و ئەو پاشگەزبوونەوەی نەهێشت، خوا ڕازی بێ لە یاری غارو هاوەڵەكانی تر لە كۆچ كەران و یارمەتی دەران كە فریای ئەم ئوممەتە كەوتن. ئەمان بوون بە یەكەم چین و تاقم كە ئەو شەش سیفەتەیان تیا كۆبوویەوەو لە سەر دەستی ئەوان دا ئەو هەواڵی غەیبی یە بەدی هات و بوو بە یەكێ لە موعجیزەكانی قورئان! لە چەرخی خەلیفەی دووەمیش دا گەل و كۆمەڵی(جەبەلەی كوڕی ئەیهەم) پاشگەز بوونەوەو بەڵام جەنگیان لەگەڵ نەكراو خۆیان لە خۆیانەوە نەمان. چەند ڕایەك هەیە لای زانایان لەبارەی مەبەست بەو كۆمەڵەی كە لە ئایەتەكەدایە:(سدی) ئەفەرموێ: مەبەست كۆمەڵی یارمەتی دەرانە - الأنصار -.(مجاهد) ئەفەرموێ: یەمەنی یەكانن. وەك لە حەدیسێك دا هاتووە كە كاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەست نیشانی كرد بۆ ئەبوو موسای ئەشعەری و فەرمووی: كۆمەڵەكەی ئەمن. وتراوە كە مەبەست فارسە، چونكە پێغەمبەر(ﷺ) دەستی دا بەسەر شانی سەلمان دا و فەرمووی گەل و كۆمەڵەكەی ئەمن، ئینجا فەرمووی: ئەگەر ئایین بەسترابێ بە ئەستێرەی گۆوە چەند پیاوێك لە ڕۆڵەكانی فارس پێی ئەگەن و دەستی ئەخەن. تاقمێكی تر ئەڵێن: مەبەست عەلی كوڕی ئەبو تالیبە.(ئیمامی عەلی و حسن و قتادة و ضحاك و ئیبن و جورەیج ئەفەرمون: مەبەست ئەبوبەكرو هاوەڵەكانی یەتی كە جەنگیان كرد لەگەڵ كۆمەڵ و جەماوەری هەڵگەڕاوەو پاشگەز بووانی ئوممەت لە پاش پێغەمبەر(ﷺ)، بە تەواوی شكاندنیان و لەناویان بردن، هەرچەند ئەو ڕایە ڕیوایەت كراوە بەو جۆرەی كە باسمان كردن، بەڵام لە پاش هێندێ بیركردنەوە و لێكۆڵینەوە بە ڕوونی دەرئەكەوێ كە ئەو شەش سیفەت و نیشانانەی كە لە

ئایەتەکەدا هاتوون بەتێرو تەواوی بەدی هاتوون لە ئەبوبەکرو ئەو کۆمەڵ و لەشکرەی کە ئەو ئاگرەیان کوژاندەوەو هەموو تیرەو تاقمە هەڵگەڕاوەیان شکاندو مل کەچیان کردن بۆ ئیسلام و ئاڵای ئیسلامیان راست کردەوە لەناو خاك و وڵاتەکەیان و سەری موسڵمانانیان بەرزکردەوە، هەرکەس ژیر بێت و رێزی خۆی بەلاوە بێ هەرگیز سەر ناکاتەوە و هیچ گومان و دوودڵی یەك روناکاتە دڵی. یەکێ لەو کردەوە گەورانەی کە مێژوو تیای دا سەرسامە و دوژمنیش دان ئەنێ بە گەورەیی و گرنگی دا، یەکێ لەو کردەوە گەورانەی مێژوو ئەو راپەڕین و بێ باکی و نەترسی یە بوو کە ئەو کۆمەڵە بەرزو بەرێزە پێی هەڵسان بە سەرکردایەتی ئەبوبەکری صدیق - خوا لێ یان رازی بێت - هەڵسان پێی لەو کاتە زۆر ناسکەدا بەرامبەر ئەو هەموو تیرەو بەرەی عەرەبە. کەواتە هەر ئەم رای دوایی یە وەرئەگرین کە ئیمامی عەلی و ئەو چەند کەسەی تری لەسەرە. وەك باسمان کردن. ئەم ئایەتە بەڵگە و نیشانەیەکی زۆر ئاشکرایە لەسەر راست و رەوایی جێنشینی یەتی ئەبوبەکر - خوا لێ ی رازی بێت -، هەرچۆنێ بەهێزترین رابەرو بەڵگەیە بۆ ناهەقی و ناڕاستی راو مەزهەبی رافزی یەکان کە ئەڵێن: ئەبوبەکرو ئەوانەی کە رازی بوون بە جێنشینی ئەبوبەکر هەموو لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، تەنانەت ئەڵێن: ئەو تیرەو تائیفانەی کە هەڵگەڕانەوە لە ئەبوبەکر ئەوانە موسڵمان بوون و راستیان کرد!! هەرکەس قسەی ئاوا بەد و ناڕاست ببیستێ هەق وایە زۆر بە سەرسوڕمان و سەرسامی یەوە بڵێ: سبحان الله!! بڵێ: پەنا ئەگرم بەخوا لەو نەفامی و سەر لێ تێك چوونە، چونکە ئەگەر ئەو قسەی ئەوانە راست بوایە ئەبوایە بە پێی دەقی ئایەتەکە خوا گەل و کۆمەڵێکی بهێنایەتە کایە بۆ نەهێشتن و لەناوبردنی ئەبوبەکرو کۆمەڵەکەی. کەچی بە پێچەوانەوە خوا باڵی ئەبوبەکرو کۆمەڵەکەی درێژ کردو بە تەواوی زاڵی کردن، هەر بەوەوە نەوەستا، بەڵکو بە تەواوی باڵی ئەو کەسەیشی درێژ کرد تا بە خۆی و کۆمەڵەکەیەوە بوون بەهۆی بڵاو بوونەوەی روناکی ئیسلام لە جیهان دا، تەخت و بەختی کیسراو قەیسەریان لەناوبرد!! بێگومان شتێکی ئاشکرایە ئەگەر ئیمامی عەلی - خوای لێ رازی بێت - ببوایە بە یەکەم جێنشین بە رێکی لەسەر رێگەو رێبازە راستەکەی پێغەمبەر(ص) ئەڕۆیشت و بەموو لای نەئەدا، بەڵام خۆی داوای نەکردو رازی بوو بە

جێنشینی جێنشینەکانی پێش خۆی، یارمەتی دان و هیچ نەنگ و رەخنەیەکی نەگرت لێ یان، چونکە بە راست و رێکی زانین، بەڵام لە پاش ئەوەی خۆی کرا بە جێنشین و پەیمانی پێ دراو زانی جێنشینی یەکەی راست و رەوایە. لەپاش ئەوە سەری دانەخست و بێ دەنگ نەبوو لە هەرکەس کە سەرپێچی لێ کردو لێ ی هەڵسا، بەڵکو جەنگی لەگەڵ کردن، هەرچەند جەنگ و کوشتار رووی دا لەناودا بەڵام ئەوانە هەر موسڵمان بوون، لەدڵی خۆیان دا و بە نیازی خۆیان هەوڵیان هەر بۆ ئیسلام بوو، بەدوای هەق و راستی دا ئەگەڕان، بەڵکو هێندێکیان لە هەڵبژێرراوەکان و هاوەڵان بوون، ئیمامی عەلیش هەر بە موسڵمانی دائەنان، تەنانەت ئەو تاقمەش کە پێ یان ئەگوترا(خوارج) کە لە گەلێ بارەوە ترازا بوون لە رێگە راستەکەی ئیسلامیش، تەنانەت ئەوانەشی بە بێ بڕواو ناپاك دانەئەنا و بەڵکو وای دائەنان کە موسڵمانێکن لە ئیمامی راستەقینە هەڵگەڕاونەتەوە، هەر زەکات و جۆرە شتێك کە لە موسڵمانانیان سەندبوو لە ماوەی حوکمڕانی یان دا، لەو ناوچانەی کە لە ژێر دەستیان دا بوو، هیچکامی هەڵنەوەشاندەوەو بە ناڕەوای دەرنەکرد، کەواتە بە هیچ کلۆجێك ئەو ئایەتە نابڕرێت بەسەر ئیمامی عەلی و ئەو کۆمەڵانەی کە رازی نەبوون بە جێنشینی یەکەی و پەیمانیان پێ نەئەدا و لێ ی هەڵگەڕانەوە، ئەو رافزی یانەی کە عەلی ئەبێ لەسەر ناهەق بن و بە درۆزن و هەڵە دەرچن، بێجگە لەوەیش – وەك لە پێشەوە گوتمان – ئایەتەکە و ئەوەی کە بەدی هات ئەیانخاتەوە بە درۆوە، چونکە ئەگەر ئەو لاف و قسەی ئەوانە راست بوایە، ئەبوایە هەموو ئەوانە لەناو چوونایە و هەر شوێن کەوتووەکانی ئیمامی عەلی جێگیر و کاربەدەست بوونایە، کەچی بە پێچەوانەوە ئەوە بوو هەموو کاروباری گەڕایەوە بۆ ژێر دەستی(معاویة) و ئەوانەی کە لەگەڵی بوون. مەبەست بەم ئەندازە لێکۆڵینەوە و روون کردنەوەی راستی و باری راستەقینەیە، نەك خوا نەخواستە بەشەڕ دان و بەربەرەکانێ ی ناڕەواو بەکارهێنانی رەگەزایەتی، ئێمەی موسڵمان ئەبێ دوور بین لەوجۆرە شتە بێ نرخانە کە هیچ سوودێکیان نی یە و زیانی زۆریان لێ پەیدا ئەبێ و رێزی موسڵمانان تێك ئەدات و ئەیانپچڕێ لەیەکتر، خوای میهرەبان ئەو شەش سیفەتەی دانا بە نیشانەی ئەو کۆمەڵە بەختەوەرو بەڕێزە،

ئینجا ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ﴾ ئەوەی کە باس کرا لەو سیفەتە بەرزانە، چاکە و بەهرەی خوایە ﴿يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ﴾ ئەیبەخشێ بەهەرکەس کە خوا خۆی مەیلی ببێ و بیەوێ. خۆی ئەزانێ کێ شایستە و شیاوی ئەو فەزڵ و بەهرەیە، ﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ خوا دەسەڵاتی فراوانە و زانایە، هەرچی ئەبەخشێ لە دەسەڵات و فراوانی یەوە دێت، هەرچی ئەکات لە زانینەوە دێت، واتە هەر شتێ مەیل بکات ئەیکات، لە دەستی دەرناچێ، ئاگای لە هەموو شتێکە، کەواتە ئەو بەڵێنەی کە دای بەدی ئەهێنێ و پێچەوانەی بەڵێنەکەی ناکات.

لە ئایەتەکانی رابردوودا بەو توندی یە جڵەوگیریی کرد لە دۆستایەتی و خۆشەویستی و یارمەتی دانی بێ بڕوایان، ئینجا لەم ئایەتەدا بە روونی دیاریی ئەکات ئەوەی کە بڕواداران ئەبێ دۆستایەتی و خۆشەویستی و یارمەتی دانیان هەر بۆ ئەوە ببێ. ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ﴾ دۆست و یارمەتی دەری ئێوە تەنها خوایە ﴿وَرَسُولُهُۥ﴾ نێرراو و پێغەمبەرەکەیەتی ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ بڕوادارانن، ئا بەوجۆرە دۆستایەتی و خۆشەویستی و یارمەتی دانی کورت هەڵهێنا لەوانەدا، بەجۆرێ هیچ رێگەی نەهێشتەوە بۆ هیچ فێڵ و تەڵەکە و خۆ لادانێك، رێگەی نەهێشتەوە بۆهیچ لاوازی و شل و شۆڵی یەك لەبۆچوون و بزووتنەوەوکردەوەی موسڵماندا، ئەبێ کارەکە هەر بەو جۆرە گرنگ و توندو تیژ بێت، چونکە مەسەلە و کارەکە – لە راستیدا – ئەگەڕێتەوە بۆ عەقیدە، شتێکی بنەڕەتی و سەرەکی یە، ئینجا لەبەر ئەوەی خۆش ویستن و دۆستایەتی یەکە پاك و خاوێن بێ، لەبەر ئەوەی پشت بەستن و دڵنیایی تێرو تەواو بێ، لەبەر ئەوەی ئیسلام ئایین بێ، لەبەر ئەوەی جیا بوونەوەی رێزی موسڵمانان ببێ لە رێزی ئەوانەی کە ئیسلام ناگرنە گەردن و نایکەن بە ئایین و نایگێڕن بە بەرنامەی ژیان، لەبەر هەموو ئەوانە ئەبێ دۆستایەتی و راستی و گوێ رایەڵی هەر بۆ سەرکردایەتی یەك ببێ و لە ژێریەك ئاڵادا بێ، ئەبێ یارمەتی و داوای یارمەتی بڕوادار هەر لە بڕوادار بێ، بەڵام بڕواداری راستەقینە نەك هەرکەسێك کە لاف بڕواداری لێ بدا بابەدەمی رووت و قسەی رووتیش بێ،

ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ ﴿٥٥﴾ وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٥٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ دِينَكُمْ هُزُوًا وَلَعِبًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَٱلْكُفَّارَ أَوْلِيَآءَ

---

جا لەبەر ئەوە ئەوا چەند نیشانە و دروشمێك دائەنێ بۆ ئەو بڕوادارە راستەقینانەی كە لەم ئایەتەدا مەبەستن، ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ﴾ كە ئەو بڕوادارانە كەسانێكن:

١- ﴿يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ بە رێك و پێكی نوێژ بەجێ ئەهێنن، بە جۆرێ ئەو نوێژە بیانگێڕێتەوە و جڵەوگیریی یان بكات لە كاروكردەوەی زۆر پیس و بێ شەرعی، وەك قورئان ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ﴾، ئەوانەی كە نوێژەكانیان نایانگێڕێتەوە لەكارو كردەوەی پیس و بێ شەرعی، ئەوانە دیمەن و رواڵەتی نوێژیان بەجێ هێناوە نەك نوێژی راستەقینە.

٢- ﴿وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ زەكات ئەدەن.

٣- ﴿وَهُمْ رَٰكِعُونَ﴾ لەكاتێك دا ئەو نوێژكەرو زەكات دەرانە مل كەچن بۆ فەرمانی خواو دەروونیان شادمانە پێی، نەك بەجێ یان ئەهێنن لەبەر ترس یان رووپامایی و ناو و شۆرەت و هەر نیازێكی تر بێجگە لە نیازی فەرمانبەریی خواو بە دوا گەڕانی رەزامەندی خوا، یان مەبەست ئەوەیە ئەو نوێژ و زەكات دانە كارو پیشەیانە وەك هەمیشەیی بن بۆیان وایە، هێندێ لەسەر ئەوەن كە رستەی سێ یەم پەیوەستی هەر بە دووەمەوە هەیە، مەبەست كەسێكی تایبەتی یە، ئیتر ئەو كەسە(ئەبوبەكری صدیق) ە - خوای لێ رازی بێت - وەك عیكریمە ئەفەرموێ. یان ئیمامی عەلی یە - كرم الله وجهه -، وەك عطا لە(ئیبن و عەباس) ەوە ئەگێڕێتەوە، هەروەها لە(ئەبو زەڕو عبدالله ی كوڕی سەلام) یشەوە ئەگێڕنەوە كە مەبەست(ئیمامی عەلی) یە، چەند هەواڵێ ئەهێنن لەو بارەیەوە كە(ئیمامی عەلی) لە نوێژدا بووە و سواڵ كەرێك داوا ئەكات ئەویش لەكاتی نوێژەكەی دا لەكاتی ركوع دا بە پەنجە تووتەی كە ئەنگوستیلەیەكی تیا بووە دەست نیشان ئەكات بۆ سواڵ كەرەكەو ئەویش دێت وەری ئەگرێ لێ ی، بەلام هەرچەند ئەو هەواڵە راست بێت و ئەم ئایەتە لەوەوە هاتبێتە خوارەوە، نابێ

بڵێین مەبەست تەنها ئەوە، چونکە بە پێی بڕیاری زانایان هەر ئایەتێك کە بە شێوەی گشتی هاتبێ تایبەتی ناکرێ بەهۆی هاتنە خوارەوەکەیەوە، بێجگە لەوە دابڕینی ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بەسەر تەنیا کەسێك دا، دابڕینی دانی زەکات تەنیا بەسەر بەخشینی ئەو ئەنگوستیلەدا دوورە لە باوو یاسای ڕەوانبێژیی، لە وتاری مەردومیش دا، چ جای لە قورئان دا کە موعجیزەی خوایە، هەروەها ئەو دابڕینە ناڕێکە لەگەڵ ئایەتەکانی پێش و پاشی و مەبەست لە هێنانی ئەم ئایەتانەدا، کەواتە هەق وایە دوور کەوینەوە لەم جۆرە تەفسیرانە،(عبدالملك کوڕی سلیمان) ئەفەرموێ: پرسیارم کرد لە(ئیمامی محمد باقر) – سەلامی خوای لێ بێ – لەبارەی ئەم ئایەتەوەو گوتم: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ کێن؟ ئەویش فەرموی: کۆمەڵی بڕواداران، ئینجا وتم: چەند کەسێك ئەڵێن: مەبەست تەنیا عەلی یە. ئەویش فەرموی: عەلی کوڕی ئەبو تالیب یەکێکە لە بڕواداران. کەواتە ئەمەش بەڵگەیەکی تێرو تەواوە لە یەکێ لە ئیمامەکانی ئەهل و بەیتەوە کە سەرچاوەو کانگای زانینی ڕاستەقینەن، بەڵگەیەکی روونە لەسەر ئەوەی کە ئەم ئایەتە لەسەر شێوە گشتی یەکەی ئەگیرێ و تایبەتی ناکرێ، ئینجا کۆتایی ئایەتەکە ئەمێنێ بەم بەڵێنە کە مایەی ئارامی و شادمانی یە: ﴿وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ هەرکەسێك خوا و پێغەمبەرەکەی و بڕواداران دابنێ بە یارمەتی دەرو دۆستی خۆی ﴿فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ﴾ بێگومان هەر کۆمەڵی خوا زاڵ و سەرکەوتوون، واتە ئەو کەسانەی کە بەو جۆرە بن هەر ئەوان زاڵ ئەبن، بۆ ڕێز گرتن و نرخ پێدان ناویان ئەبا بە کۆمەڵی خواو نەیفەرمو: هەر ئەوان... هتد. یان مەبەست ئەوەیە ئەو کەسانەی کە بەوجۆرەن ئەوانە تاقم و کۆمەڵی خوان، بێگومان هەر کۆمەڵ و دەستەی خوا زاڵ و سەرکەوتوو ئەبن، لەسەر هەربار ڕێگەی زاڵ بوون بۆ بڕواداران هەر ئەوەیە کە ببن بە کۆمەڵی خوا، بوون بە کۆمەڵی خوایش بەوە دەست کەوت ئەبێ کە بڕواداران تەنها خوا دابنێن بە دۆست و یارمەتی دەرو یارمەتی دراوی خۆیان، بە تەواوی خۆیان دابڕنن و ڕووت بکەن لە خۆشەویستی و دۆستایەتی و یارمەتی دان و داوای یارمەتی لە هەموو دوژمنانی خواو ئایینی خوا، هەر ئەمە بناغە و بنەڕەتی بڕوایە، تا ئەمە بەدی نەیەت سەرکەوتن نابێ، هەروەها بەڵێن بە سەرکەوتنیش نادرێ، کەواتە بڕوادار کە ئیسلام بگرێتە گەردن هەر لەبەر ئەوە ئەیگرێتە گەردن کە شتێکی ڕاستە و هەر ئەبێ ئەو بدرێتە بەر! نەك بە هەر نیازێکی تر، هەر نیازێکی تر بێجگە لە ڕەزامەندی خواو فەرمانبەریی بۆ خوا، مایەی کەم و

کوڕی و دواکەوتنە لە پلە و رادەی بەرزی موسڵمانێتی، لەگەڵ ئەوەیش دا خوای میهرەبان بەندەکانی خۆی ئەناسێ و ئەزانێ پێویستی یان هەیە بە یارمەتی و بەهێزکردنی دڵ و دەروونیان، لەبەر ئەوە هەرچۆنێ بەڵێنی پاداشتی رۆژی دوایی یان پێ ئەدا، هەروەها بەڵێنی سەرکەوتن و زاڵ بوونیشیان پێ ئەدا، ئەو بەڵێنانەش نەبەستراون بە هیچ کات و چەرخێکەوە، بەڵکو بەستراون هەر بەو مەرجانەی کە دانراون لەلایەن خواو پێغەمبەرەوە(ﷺ).

دامەزراندنی ئەو یاسا و بنەڕەتەی کە باس کرا، قورئان زۆر بە گرنگ گرتوویەتی لە چەند ئایەتێك دا بە تایبەتی لەم سورەتەدا، ئەوەتا لەمەو پێش چەند بانگ کردنێکی کرد: لە یەکەم بانگ کردن دا بە روونی جڵەوگیریی کرد لە دۆستایەتی و خۆشەویستی دوژمنان، ناپاکەکانی ترساند لەوەی کە خوا کارێکی وابێنێ ناپاکی یەکەیان دەربخات و بێ ئابڕوویان بکات، لە بانگ کردنی دوەم دا ترساندنی لەوەی کە بەهۆی ئەو دۆستایەتی و خۆش ویستنەوە لە ئیسلام دەرچن، کەواتە با خۆیان بپارێزن لەوە، با لەگەڵ ئەوانەدا بن کە خوا خۆشی ئەوێن و ئەوانیش خوایان خۆش ئەوێ، با لەگەڵ ئەوانەدا نەبن و بچنە ریزی کۆمەڵی خواکەپاشەڕۆژیان سەرکەوتن و زاڵ بوونە. ئینجائەوابانگێکی تریان ئەکات بەجۆرێ هانیان ئەدات وغیرەت ئەنێتە بەریان بەرامبەر ئایینەکەیان، بەمەی نابێ دۆستایەتی و خۆشەویستی بەکار بێنن لەگەڵ ئەوانەی کە لاقرتی ئەکەن بە ئایینەکەی ئەمان، لاقرتی ئەکەن بە نوێژ و خواپەرستی یەکەیان، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە ﴿لَا تَتَّخِذُواْ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَكُمْ هُزُوٗا وَلَعِبٗا﴾ ئەوانەی کە ئایینەکەی ئێوە دائەنێن بە شتێکی گاڵتە و لاقرتی پێ کراو و بە شتێکی بێ نرخ و بێ سوود ﴿مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ﴾ کە ئەوانەش کەسانێکن کە نامەیان پێ بەخشراوە لە پێش ئێوە ﴿وَٱلۡكُفَّارَ﴾ بێ بڕواکانیش – واتە هاوبەش رەوا دەران و بت پەرستان – ئەوان و ئەمان دامەنێن ﴿أَوۡلِيَآءَ﴾ بە دۆست و خۆشەویست و یارمەتی دەران بۆ خۆتان و یارمەتی دراوان لەلایەن خۆتانەوە، واتە نابێ پەیوەندی دۆستایەتی و یارمەتی دان ببەستن لە نێوان خۆتان و ئەوان دا، ئەبێ لەو بارەیەوە بە تەواوی دوور کەونەوە لێ یان، بەڵام – وەك چەند جارێ گوترا – چاکە کردن و بەکارهێنانی داد لەگەڵیان رەوایە بە مەرجێ جەنگ نەکەن لەبەر ئایین و لەگەڵ موسڵمانان دا، موسڵمانان ئاوارە نەکەن و سزایان نەدەن، ئەو پەیوەندی یە کە قەدەغەیە جیاوازە لەگەڵ ئەم چاوپۆشی و کردەوەی چاك و دادپەروەری

یە کە ڕەوایە لە ئیسلام دا، پێویستە موسڵمانان تێگەیشتوو ئاگادار بن ئەم دوو شتەیان لێ نەگۆڕێ بە یەکترو بەهۆی ئەوەوە بکەونە هەڵە و ناڕەوایی.

هەرچەند مەسیحی یەکان لەو کاتەدا کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، زۆر هەڵوێستیان جیاواز بووە لە هەڵوێستی جوولەکە و بت پەرستان، کردەوەی مەسیحی یەکان زۆر نەرم و ئەهوەن بووە لەچاو ئەوان دا، بەڵام خوا کە ئاگادارە بە هەموو شتێ زانیویەتی کە لە دوا ڕۆژدا کردەوەی مەسیحی یەکان زۆر خراپتر دەرئەچێ، ئەوەتا ئەبینین لە چەرخی ئەبوبەکرو عومەرەوە – خوا لێ یان ڕازی بێت – کە ئیسلام تێك چوو لەگەڵ دەوڵەتی ڕۆمانی یەکان دا، مەسیحی یەکان کەوتنە جەنگ بە بێ دەست گێڕانەوە و کۆتایی هێنان، ئینجا جەنگی سەلیبی یان دامەزراند لەگەڵ موسڵمانان دا، ئەو جەنگەی کە زۆر بەناوبانگە و ئەو هەموو کردەوە پیسەیان تیا کرد، بە جۆرێ لاپەڕەی مێژوویان ڕەش و بۆگەن کرد لەسەر خۆیان، هەر بە قسەی زۆر لە نووسەرانی خۆیان، زۆر سەیرە ئەوان لایان وایە کە جوولەکە حەزرەتی عیسای کوشتووە و دای لە سێدارە، ئەشزانن کە موسڵمانان بڕوایان هەیە بە خۆی و بە بەرنامەکەی، کەواتە ئەبوایە سەلیبیان هەر بۆ جوولەکە بکردایەتە مل، کەچی وازیان لەوان هێنا و بە جارێ روویان کردە موسڵمانان و پەلاماری موسڵمانانیان دا، بە جارێ بوون بە پشتیوان و پشتگیری جوولەکە تا لەناو جەرگەی وڵاتی ئیسلام دا دەوڵەتیان بۆ دروست کردن، بێجگە لەوەی کە بە جارێ هەموو بوون بە یەك و بە جارێ پەلاماری خەلافەتی عوسمانی یان دا و رووخاندیان، ئینجا بەناو جەنگی سەلیبی یان کوژاندەوە بە رووکەش و رواڵەت، بەڵام ئیستعماریان هێنایە پێشەوەو لەپەنای ئەوەدا هەر نەوەستان لە جەنگەکەی خۆیان!! ئینجا بزووتنەوەی(تنصير) لە هەموو لایەکەوە ئەوەی لەدەستیان هات بەکاریان هێنا بە دژی ئیسلام و موسڵمانان، ئینجا چوار قۆڵی لەگەڵ جوولەکەو گا پەرست و هەموو بت پەرستەکان و بێ ئایین و ماددی یەکان دا پەلاماری هەر بزووتنەوەیەکی ئیسلام ئەدەن لە هەر وڵاتێك دا کە سەر هەڵ دا، ئەو خوایەی کە زانا و ئاگایە بە هەموو شتێ زانی کە گاورەکان لە جوولەکە و بت پەرستەکان و بێ بڕواکان کەمتر نین لە دوژمنایەتی ئیسلام و موسڵمانان دا، لەبەر ئەوە لەم ئایەتەدا جڵەوگیریی بڕوادارانی کرد لە دۆستایەتی و پەیوەندی دەستە برایەتی یان لەگەڵ جوولەکەو گاور و هەموو بێ بڕواکانی تردا، بە یەکسان و بە بێ جیاوازی،

وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾ وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ٱتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ ﴿٥٨﴾

ئینجا ترساندنی لەگوێ رایەڵی نەکردن و وفەرموی:﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ خۆتان بپارێزن و بترسن لە خوا لە سەرکێشی و گوێ رایەڵی نەکردنی، ئەمەی کە جڵەوگیریی لێ کردن دەربارەی ئەو دوژمنانە، یان سەرکێشی و گوێ رایەڵی نەکردنی هەموو جڵەو گیریی یەك کە جڵەوگیریی ئەم ئایەتە لێرەدا یەکەم و سەردەستەیە، ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە بڕوادارن، واتە بڕواکەتان داخوازە و داوای ئەو خۆپارێزی یەتان لێ ئەکات. ئینجا دێتە سەر باسی کردەوەیەکی بەد و خڕپیان و بە چەپەڵ و ناشرین دەری ئەکات، وەك بەوەیش هانی بڕواداران ئەدات لەسەر گوێ رایەڵی ئەوەی کە جڵەوگیریی کردن لێ ی، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ﴾ کاتێ بانگی یەکتر بکەن بۆ نوێژ، یان کاتێ بانگ بدەن و بەوە بانگی بڕواداران بکەن بۆلای نوێژ کردن، ﴿ٱتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا﴾ ئەو بانگ کردنە یان نوێژەکەتان ئەگێڕن بە شتێکی گاڵتە و لاقرتی پێ کراو و بە شتێکی بێ نرخ و بێ سوود، واتە گاڵتە و لاقرتی پێ ئەکەن و بە بێ سوود و بێ نرخ دای ئەنێن و دەری ئەخەن، وەك بەیهەقی هەواڵێ ئەهێنێ لە(ئیبن و عەباس) ەوە – خوایان لێ رازی بێت – کە ئەفەرموێ: کاتێ بانگ بێژی پێغەمبەر(ﷺ) بانگی ئەدا و موسڵمانان هەڵئەسان بە نوێژ، جوولەکەکان ئەیانگوت: ئەوا هەڵسان راست نەبنەوە، ئینجا کە ئەیان بینین رکوع و سوژدەیان ئەبرد پێ ئەکەنین پێ یان و لاقرتی یان پێ ئەکردن.(ئیبن و جەریر) هەواڵێ ئەهێنێ لە(سدی) یەوە کە ئەفەرموێ: پیاوێکی مەسیحی هەبوو لە مەدینەدا کاتێ کە بانگ بێژ ئەیگوت:(اشهد ان محمدا رسول الله) ئەو مەسیحی یە ئەیگوت:درۆزن بسووتێ. ئینجا شەوێك لە شەوان کارەکەرەکەی ئاگر ئەباتە ماڵەوە و کابرایش نووستوو ئەبێ لەگەڵ ماڵ و منداڵی دا، پزیسکەیەك دائەکەوێ و ماڵەکەی ئەسووتێ، ماڵەکەش خۆی و منداڵەکانی ئەسووتێنێ. بەهەرحاڵ ئەوانە نەفام و نەزان و گێل بوون بۆیە بەو جۆرە بوون، وەك ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ﴾ ئەو بە گاڵتە کردن و لاقرتی و نرخ پێ نەدانی ئەوانە بەهۆی ئەوەوەیە کە ئەوانە کۆمەڵ و دەستەیەکی نەفام و گێلن و ژیر نین، کەواتە چاکە بە خراپ دائەنێن و خراپ بە چاك.

قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ هَلۡ تَنقِمُونَ مِنَّآ إِلَّآ أَنۡ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلُ وَأَنَّ أَكۡثَرَكُمۡ فَٰسِقُونَ ﴿٥٩﴾

لەپاش ئەو بانگ کردنە، ئینجا ڕووی فەرمودە ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) کە ڕوو بەڕووی ئەو نامەدارانە بوەستێ و پرسیاریان لێ بکات کە ئایا داخی چیان لەدڵ دایە بۆ موسڵمان؟ ئایا هیچ هۆیەك هەیە بۆ ئەو خەشم و ڕقەی ئەوان، بێجگە لەوەی کە موسڵمانەکان بڕوایان هێناوە بە خوا و بەو نامەی کە خوا ناردی یە سەریان و نامەکانی تری پێش ئەمان؟ بێجگە لەوەی کە ئەوان لە ئاین و بڕوا دەرچوون؟ ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ بڵێ: ئەی نامەدارەکان ﴿هَلۡ تَنقِمُونَ مِنَّآ﴾ ئایا هیچ ڕەخنە و لەکەیەکتان هەیە لە ئێمە، هیچ شتێك هەیە لەلایەن ئێمەوە کە ئێوە بێزار بن لێ ی و پێتان ناخۆش بێت، ﴿إِلَّآ أَنۡ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلُ﴾ بێجگە لەوەی کە ئێمە بڕوامان هێناوە بە خواو، بەوەی کە هێنراوەتە خوارەوە بۆلامان – واتە قورئان –، و بەوەی کە هێنراوەتە خوارەوە لە پێش ئەمەوە – واتە تەورات و ئینجیل و هەموو نامەکانی تری خوا – ﴿وَأَنَّ أَكۡثَرَكُمۡ فَٰسِقُونَ﴾ بێجگە لەوەی کە زۆربەی ئێوە سەرکێشە و لە سنووری بڕوا دەرچووەو ئێمە دەرنەچووین و پێچەوانەی ئێوەین؟ واتە نەخێر هیچ شتێکتان بە دەستەوە نی یە و هیچ هۆیەك نی یە بۆ خەشم و بێزاریتان لە ئێمە بێجگە لەوەی کە باس کرا کە ئەوەش ئەبوایە هۆی خۆش ویستن و ڕێز گرتن بوایە.

ئەم پرسیارە لە بارێکەوە بۆ دەرخستن و ڕوون کردنەوەی هۆی بێزاری و ڕق و خەشمەکەیانە لە موسڵمانان، لە بارێکی ترەوە بۆ بێزاری دەربڕینە لەو بارو حاڵەتەی کە ئەوانی لەسەرن، لەکەدار کردن و دەم کوت کردن و بێ ئابڕوو کردنیانە پێ ی، لە هەمان کات دا وریا کردنەوەی موسڵمانەکانی تێدایە، کە بێزار بن لەو دوژمنە بەدانە و هەرگیز نەخەڵەتێن، دۆستایەتی و دەستە برایەتی یان لەگەڵ بکەن و یارمەتی یان بدەن و داوای یارمەتی یان لێ بکەن، بەڵێ شتێکی ئاشکرایە کە هۆی دوژمنایەتی ئەو نامەدارانە هەر ئەوە بووە لە یەکەمجارو لە چەرخی پێغەمبەردا، هەر ئەوەیشە لە هەموو چەرخ و سەردەمەکانی پاش یەکەمجار. هەر بەو هۆیەوە ئەو هەموو ڕق و خەشمی بەتینە و ئەو هەموو پیلان و

دوژمنایەتی یە بەکار ئەهێنن لەگەڵ هەرکەسێك دا کە هەوڵ بدات بۆ بزووتنەوەیەکی ئیسلامی راستەقینە، بیەوێ موسڵمانان بگەڕێنەوە بۆ سەر رێگە راستەکەی خۆیان.

ئەو نامەدارانە و هەموو بێ بڕواکانی تریش هەر رق و داخ و دوژمنایەتی یەکیان هەیە لە موسڵمانان لەسەر ئایینەکەیانە و بەس، تا موسڵمانان موسڵمان بن ئەوان بە هیچ رەنگ ناوەستن لە هەر پیلان و بەدیی و خراپەکاری یەك کە لە دەستیان بێت دەربارەی موسڵمانان. خوای پەروەردگار لەم ئایەتە و لە چەند ئایەتێکی تردا دەست نیشانی کردووە بۆ ئەوە، یەکێ لەو ئایەتانە ئەم ئایەتەیە کە ئێستا لەگەڵی ئەژین، ئەوەتا بەڕوونی تێمان ئەگەیەنێ کە داخ و رقی ئەوان لە ئێمە بڕوا و ئایینەکەمانە، کەچی نامەدارەکان و زۆر لە بێ بڕواکانی تریش لە زووەوە تا ئێستاش هەوڵی ئەوە ئەدەن کە پەردەیەکی ئەستوور بێنن بەسەر ئەم شتە راستەدا، ئەو هەست و وریای یەی کە قورئان خستی یە دڵی بڕواداران، ئەو هەست و وریایی یە زۆر لاواز بکەن یان هەر نەیهێڵن، چونکە ئەوان باش ئەزانن کە بەهۆی ئەوەوە توانی یان بێنە ناو خاك و وڵاتمان، ئەزانن کە تا ئەو هەست و وریایی یە هەبوو لە دەروونی موسڵمانان دا، تا موسڵمانان رق و کینەیان لەبەر خواو لەبەر بڕواو ئایینەکەیان بوو ئەوان خۆیان بۆ نەئەگیرا بەرامبەر ئیسلام و موسڵمانان، جا لەبەر ئەوە ئەم پیلان رێگەیەیان دایە بەر کە ئەو هەست و وریایی یە نەهێڵن و مەردومان وا حاڵی بکەن کە مەسەلەی ئایین و جەنگ و بەربەرەکانێ لەسەر ئایین دوایی هات و ئەو بیرو باوەڕو هەستە شتێکی ناڕەوا بوو لە ماوەیەکی رەش و تاریك دا کە هات بەسەر جیهان دا، بەڵام لەپاش ئەوە ئەو ماوە تاریك و رەشە نەما و رووناکی زانین کەوتە دڵ و دەروونی جیهانی یان، جیهان پێشکەوت، پاش ئەوە تازە لە دەروون و مێشکانەوە نەما کە ئاژاوە و جەنگ بەرپا ببێ لەسەر ئایین و بڕوا، بەڵکو ئاژاوە و جەنگ ئەبێ لەسەر بەرهەم و بەروبووم و دەست کەوتی ئەم جیهانە بێت! کەواتە با رۆڵەی موسڵمانان بخەڵەتێنن و بیانکەنە ئەو خەوی بێ ئاگایی یە، ئیتر ئەو کاتە بە ئارەزووی خۆیان، بە بێ باك و بیم لنگ ئەهێنن بەسەر خاك و وڵات و هەموو خێرو بێری وڵاتەکەمان دا، بە جارێ زاڵ ئەبن و ئەو دوو دەست کەوتە گرنگەیان دەست کەوت ئەبێ: نەمانی عەقیدەو بیروباوەڕەکەمان، داگیر کردن و دەست بەسەردا گرتنی هەموو خێرو بێری وڵاتمان.

ئەو نامەدارانە توانی یان لە هەموو ناوچەکانی ولآتی ئیسلام دا چەند بەکرێ گیراوێك فەراهەم بێنن لە رۆڵەی موسڵمانان بە ئاشکرا یان بە نهێنی کە لە باتی خۆیان باشتر خۆیان ئەو کاری ئەوانە بەجێ بێنن و هەڵسن پێی، باشتر لەوان توانی یان مەبەست و ئامانج و ئاواتی ئەوان بڕوێنن لە دڵ و دەروونی بەچکەی موسڵمانەکان دا، ئەم بەکرێ گیراوانە توانی یان بیروباوەڕی نەتەوایەتی و نیشتمان بێننە کایە و بیخەنە جێی ئایینەکەیان، ئەو تێکۆشان و فیداکاری یە کە کاتی خۆی لە پێناوی ئاین دا ئەکرا، وەریان گێڕا بەم باردا و کارێکی وایان کرد کە ئەو تێکۆشان و فیداکاری یە لە پێناوی نەتەوایەتی و نیشتمان دا بکرێ!! تا ئەوا هەموو موسڵمانەکانیان بەردایە یەکترو بەش بەشیان کردن و تیکە تیکەیان کردن تا بە ئاسانی قوت بدرێن بۆ ئاغاکانیان. سەیر تر لە هەموو شت ئەمەیە کە ئەو نامەدارانە لە نەوەکانی سەلیبی یە داخ لە دڵەکان، هەر بەوە کۆتایی یان نەهێنا کە کردیان و هێنایان بەسەر ئیسلام و موسڵمانان و ولآتەکەیان دا، بەڵکو ویستیان و ئەیانەوێ بچینە ریزی ئەوان و قۆڵ بکەین بە قۆڵیان دا و سوێند خواریان ببین، بەرامبەر ماددی و بێ ئایینەکان، بانگی موسڵمانان ئەکەن کە وەرن با بە جارێ ببین بە یەك و بەرگری بکەین لە ئاین! ئێمە و ئێوە کە ئاین دارین با یەك ریز بوەستین و هەڵسین بە دژی بێ ئاین و ماددی یەکان!! ئینجا زۆرکەس هەیە لەناو موسڵمانەکان دا – بەزانین یان بە نەزانین – ئەو بانگ و بانگەوازەی بە دڵە و بە شتێکی شەرعی و پیرۆزی دائەنێ!! ئایا هەرکەسێك ژیریی و تۆزێك بیر بکاتەوە و ئاوڕێ بداتەوە بەلای مێژوودا نازانێ کە نەوەکانی سەلیبی یەکان هەمیشە بە یەك ریز وەستاون لەگەڵ ئەو بێ ئاین و ماددی یانەدا، لە هەرکات و لە هەر شوێنێك دا کە جەنگ و ئاژاوە لەگەڵ موسڵمانەکان دا بەرپا بووبێ، هەمیشە ئەو سەلیبی یانە لەم کاتانەدا پشتیوان و کۆمەك بوون بۆ بت پەرستان و بێ ئایینەکان!! کەواتە چۆن ئەبێ موسڵمان بخەڵەتێ بەو جۆرە فرو فێڵە؟ چۆن ئەبێ موسڵمان بێ ئاگا بێ لەوەی کە ئەو سەلیبی یانە هەمیشە جەنگی موسڵمانیان بەلاوە گرنگ ترە لە جەنگی ماددی و بێ ئایینەکان، نەمان و لەناوچوونی موسڵمانان مەبەست و گرنگ ترە لایان لە نەمان و لەناوچوونی بێ ئاین و ماددی یەکان، چونکە چاك ئەزانن کە بێ ئایینی و ماددێتی شتێکی کاتی یە و ئەڕوا و هۆی مانەوەی لەگەڵ نی یە، بەڵام ئیسلام شتێکی بنەڕەتی یە و دامەزراوە و هۆی مانەوەو

پەرەسەندن و زاڵ بوونی زۆر بەهێزی پێ یە! مەبەستیان لەو بانگ و بانگەوازە ئەمەیە کە موسڵمانەکان بخەڵەتێنن و بیانکەن بە سووتەمەنی جەنگەکەیان، با موسڵمان وریا و ئاگادار بێ کە ئەوان و بێ ئایین و ماددی یەکان وەك یەك دژو دوژمنی ئیسلام و موسڵمانانن، چەکی دەستی موسڵمان ئەو وریایی و تێگەیشتنەیە کە بەرنامەی خوا هەمیشە دەست نیشانی بۆ ئەکات، چەکی چار نەکراوی دەست گرتنی یەتی بەو ئایینە چار نەکراوەی و گەڕانەوەیەتی بۆ ژێر سایەو ئاڵاکەی، لەسەر ئەو بارو شێوەی کە راستەکانی ئوممەت دەستیان پێوە گرت و چوونە ژێر سایەو ئاڵاکەی. سەیرتر ئەوەیە کە زۆر کەس هەیە لەوانەی کە بە زانا ناوئەبرێن ئەیانەوێ ئەوەی کە سەلیبی زادەکان بانگ و بانگەوازی بۆ ئەکەن، بە شتێکی راست و رەوا و شەرعی دابنێن، بە ئایەت و حەدیس بەڵگەی زۆر ئەهێننەوە لەسەر راست و رەوایی یەکەی، بەم رەنگە ئەو ئایەت و حەدیسانە کە فەرمان ئەدەن بە چاوپۆشی و داد بەکار هێنان و چاکە کردن لەگەڵ نامەدارەکان دا، ئەو ئایەت و حەدیسانە ئەکەن بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە دروستە یەکێتی و دۆستایەتی و سوێند خواری و یارمەتی دانی گاورو جوولەکەکان، بە تایبەتی بەرامبەر بێ بڕواو ماددی و بێ ئایینەکان!! بەڵام ئایا خۆیان نابەڵەد ئەکەن و نەشارەزان یان بە دەستی ئەنقەست خۆیان لێ گێل ئەکەن، کە ئەو ئایەت و حەدیسانە بەڵگە نین بە هیچ کلۆجێك لەسەر دروستی و رەوادانی ئەوە، چونکە چاوپۆشی و دادپەروەریی شتێکە و سوێند خواریی و قۆڵگیریی و یارمەتی دان شتێکی تری جیاوازەو دوورن لە یەکتر، رەوادانی یەکێکیان نابێ بە هۆی رەوادانی ئەوی تر، وەك لەمەوبەر بە روونی جیامان کردنەوە لە یەکتر، ئەوانەی کە ئەیانەوێ ئەو ئایەت و حەدیسانە بکەن بە بەڵگە، لە راستی دا ئەیانەوێ قورئان و حەدیسەکان بەش بەش بکەن، ئەوەی کە بگونجێ وەری ئەگرن و رێکی ئەکەن لەگەڵ مەبەستەکەی خۆیان دا، ئەوەی کە نەگونجێ و بە هیچ رەنگ رێگەیان نەبێ لاری بکەنەوە بۆلای مەبەستەکەیان، ئەوانە پشت گوێ ئەخەن و وەك هەر نەیان بیستبێ!! بەڕاستی بڕیارو حوکمەکەی خوا ئەوەندە ئاشکرایە هەرکەسێك لەوانە ئەگەر بە تەواوی چاوی خۆیانی لێ نەنووقێنن ناتوانن خۆیان لادەن لێی.

﴿قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِ ۚ مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ ٱلْقِرَدَةَ وَٱلْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٦٠﴾﴾

**لە ئایەتی پێشودا بەوجۆرەی کە تێپەڕی کرد بێزاری دەربڕی لەو نامەدارانە و دەم کوتی کردن، ئینجا لەم ئایەتەدا فەرمان ئەدا کە دەم کوتێکی بەتین تریان بکات و ئابڕوویان بۆ نەهێڵێ بەوەی کردەوەو مێژووی بەدی خۆیان بهێنێتەوە یاد و بەرچاو، کەواتە ئەوەی کە شایستە بێ بۆ خەشم و لەکە لێ گرتنی خۆیانە و ئەو ئایینە پڕوپووچەیە کە ئەوانی لەسەرە، نەك موسڵمان و ئایینە بەرزەکەیان، مەسەلەکەیان زۆر بە بەد و ناهەموار نیشان ئەدات بەمەی لە پێشەوە سەرنجی بۆ رائەکێشێ بە شێوەی پرسیارێك کە ئەوە ئەگەیەنێ بە پێی باوی عەرەب کە گف و گۆیان دا. ئەفەرموێ کە پێغەمبەر(ﷺ): ﴿قُلْ﴾ بڵێ پێ یان: ﴿هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ﴾ ئایا هەواڵتان پێ بدەم بە خراپتر لە خاوەنی ئەو ئایینەی کە ئێوە خەشمتان هەیە لێ ی ﴿مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِ﴾ لەبارەی تۆڵە و پاداشتی خراپەوە لای خوا، خراپتر لەو کەسە ﴿مَن﴾ کەسێکە کەتۆڵە و سزای بەتین درابێ بەم جۆرانەی کە دێن، یان ئایا هەواڵتان پێ بدەم بە ئایین و کردەوەی خراپتر لەو ئایین و کردەوەی کە ئێوە خەشمتان هەیە لێ ی. ئەو ئایین و کردەوە خراپترە، ئایین و کردەوەی کەسێکە کە بەم جۆرەیە:**

**١- ﴿لَّعَنَهُ ٱللَّهُ﴾ خوا نەفرینی لێ کردووەو دووری خستووەتەوە لە میهرەبانی خۆی.**

**٢- ﴿وَغَضِبَ عَلَيْهِ﴾ خەشمی لێگرتووەوخەشمی هەیەلەسەری.ئەوەی کەئەوەیان بەسەرهات نامەدارەکان بون نەك تەنیا کەسێك وەك دەریش ئەکەوێ لەم خاڵەدا کە ئەڵێن:**

**٣- ﴿وَجَعَلَ مِنْهُمُ ٱلْقِرَدَةَ وَٱلْخَنَازِيرَ﴾ گێڕانی و فەراهەمی هێنا لەو نامەدارانە چەند مەیمون و چەند بەرازێك، واتە ئادەمێتی سڕی یەوە لە هێندێکیان و شێوەی مەیمون و بەرازی بەسەردا کێشان، ئیتر مەبەست سڕینەوەو شێوەیەکی ئاشکرایە، وەك زۆربە و جەماوەری زانایانی لەسەرە و ئینجا لە ریشە هێنرا و خوا بەو شێوە مراندنی، چونکە نابێ بمێننەوە لەسەر ئەو بارە، یان مەبەست سڕینەوەیەکی نهێنی و سروشتی دڵەکانیانی بردبێتە سەر سروشتی مەیمون و بەراز وەك(مجاهد) ئەفەرموێ. بە هەرکام تۆڵەیەکی زۆر سەختە کە خوا دەربارەی کردن لەسەر بەدکرداریی خۆیان. ئینجا ئایا هەردوو سڕینەوەکە هەر بۆ جوولەکە بووبێ، ئەوانەی کە فێڵ و تەڵەکەی رۆژی شەممەیان**

بەكار هێنا، بەهۆی ئەوەوە خوا گەنجەكانی گێڕان بە مەیموون و پیرەكانیان بە بەراز، وەك لە(ئیبن و عەباس) ەوە ریوایەت كراوە؟ یان یەكەم دەربارەی جوولەكە كرابێ و دووەم دەربارەی گاورەكان كە پەلیپیان گرت بە هێنانە خوارەوەی خوان و خۆراكێ لە ئاسمانەوەو لە پاش دا هەر لایان دا لە رێگەی خوا وەك لەمەوپاش لەم سورەتەدا بەدرێژتر ئەو باسە ئەكەین بە یارمەتی خوا؟ بەهەر جۆر و لەسەر هەربار خوا ئەوەی بەسەر نامەدارەكان دا هێنا كە نەوەكانیان لە چەرخی پێغەمبەرماندا(ﷺ) گاڵتەو لاقرتی یان ئەكرد بە ئاین و كردەوەی بەرز و شیرینی ئەم ئوممەتە.

٤- ﴿وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَ﴾ شتی زۆر ناهەق و لە سنوور تێپەڕكەری پەرست، واتە لای دا لە شەریعەتی خوا و شوێنی یاسا و بڕیارێكی تر كەوت، ئەوانە گوێرەكەیان پەرست، زاناو عابیدەكانیان گێڕا بە خوای خۆیان، بەم رەنگە شوێنیان كەوتن لەو بیروباوەڕو كردەوانەی كە ئەوان دایان هێنا و هەڵیان بەست بە پێچەوانەی ئایینی خوا كە ئەو شوێن كەوتنە پەرستنە، وەك لە چەند شوێن دا باسمان كرد و بەڵگەمان لەسەر هێنایەوە بە ئایەت و بە حەدیس. ئینجا ئەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ شَرّٞ مَّكَانٗا وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ﴾ ئەوانەی كە باس كران و بەسەرهات و نیشانەیان ئەوانە بوون كە باس ران، ئەوانە خراپترن لەبارەی جێ و شوێنەوە، ئەوانە گومڕا تر و ترازاوترن لە ناوەڕاستی رێگەی راست. بێگومان ئەو ئایین و كردەوەی كە ئەو نامەدارانە خەشم و رەخنەیان بوو دەربارەی خێرو بەهرەی رووتە و پاك و خاوێنە لە هەر خراپەیەك، هەروەها ئەو موسڵمانانەی كە خاوەنی ئەو ئایین و كردەوانەن پاك و خاوێن و دوورن لە هەر خراپە و لەكەیەك كە ئەو نامەدارانە ئاراستەیان ئەكرد، لەگەڵ ئەوەدا رووكەش و رواڵەتی ئایەتەكە وا ئەگەیەنێ كە ئەو ئایین و خاوەن ئایینەش خراپن، بەڵام ئەمان و ئایینەكەیان خراپترن. كەواتە بە هیچ كلۆجێك نابێ ئەو رووكەش و رواڵەتە مەبەستی ئایەتەكە بێت، بەڵكو مەبەست بە هێنان و هۆنینەوەی ئایەتەكە لەسەر ئەو بارو شێوەیە ئەوەیە بە تەواوی پەكی ئەو نامەدارانە بخات و بەجۆرێ دەم كوتیان بكات كە هیچ رێگەیەكیان بۆ نەهێڵێتەوە و هیچ ملە جەڕێ یان پێ نەكرێ، بەم رەنگە لەگەڵیان ئەڕوا و جڵەویان بۆ شل ئەكات تا قوڕ ئەدا بە دەمیان دا، ئەم جۆرە لێكۆڵینەوە زۆر بەكار ئەهێنرێ و زۆر لێزانی ی و كاردروستی ی تێدایە، چونكە بە شێوەیەك كە رق و سەركێشی دوژمن و ناحەز ئەهوەن و هێواش ئەكاتەوە و بە ناچاری سەریان پێ شۆڕ

ئەکات، لێرەدا وەك فەرمویێتی: پێ یان بڵێ: ئەو ئایینەی کە ئێوە خەشمتان هەیە لێ ی و بە خراپی ئەزانن، ئەگەر وا دابنێن بەو جۆرەش بێ هەر هێشتا ئێوە ڕێی ڕەخنە و خەشمتان نی یە لێ ی، چونکە هەر بە قسەی خۆیشتان ئایینە پووچەکەی خۆتان و هەڵگرەکانی لە هەموو شت و لە هەموو کەس خراپترن، ئیتر چۆن ئێوە رووتان هەیە باسی موسڵمانەکان و ئایینەکەیان بکەن. هێندێ ئەفەرمون: ئەم ئایەتە هاتووە بۆ وەڵام و بەرپەرچ دانەوەی جوولەکەکان، لەسەر بارو شێوەی قسە و وتەی خۆیان، وەك(ئیبن و ئیسحاق و ئیبن و جەریر) هەواڵێ ئەهێنن لە(ئیبن و عەباس) هوە - خوایان لێ رازی بێت - کە ئەفەرموێ: دەستەیەك لە جوولەکە هاتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاریان لێ کرد لەو پێغەمبەرو فروستادانەی کە بڕوای پێ یان هەیە. ئەویش فەرموی: بڕوام هەیە بە خوا، بەوەی کە هێنرایە خوارەوە بۆلای ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و ئەسبات، بەو نامەی کە بەخشرا بە موسا و عیسا و بەوەی کە بەخشرا بە هەموو پێغەمبەران لەلایەن پەروەردگاریانەوە، ئینجا کاتێ باسی عیسای کرد، ئەوانە بێزار بوون و دانیان نەنا بە پێغەمبەرێتی عیسادا، وتیان: ئێمە بڕوامان نی یە بە عیسا بەو کەسەش کە بڕوای بە عیسا هەیە، ئینجا وتیان - وەك لە ریوایەتی(تەبەرانی) دا هاتووە - نازانین هیچ ئایینێ ببێ خراپتر لە ئایینی ئێوە، ئینجا خوا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە، بەرپەرچی دانەوە بە دژو پێچەوانەی قسە و وتەکەی ئەوان، کە ئەوەش باوێکە لە باوەکانی لێکۆڵینەوە و بەرپەرچ دانەوە، کەواتە بە هەر جۆر و لەسەر هەر بار هیچ قۆرت و گرێ یەك روو ناکاتە ئایەتەکە و ئایەتەکە ئەوە ناگەیەنێ کە خراپی هەیە لە ئایینی ئیسلام و لە موسڵمانان دا، هێندێکی تر لە زانایان تەفسیری ئایەتەکە بە جۆرێ تر ئەکەنەوە کە گومان نەبرێ بۆ ئەو قۆرت و گرێ یە و پێویست نەکات بەو دوو وەڵامەی کە درانەوە، با بە وردی گوێی بۆ شل کەین بەڕاستی زۆر وردە: لە ئایەتی پێشوودا تێ ی گەیاندین کە نامەدارەکان خەشم و رقیان هەیە لە ئایینی موسڵمانان. ئینجا لەم ئایەتەدا فەرمان ئەدا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە بڵێ پێ یان: ئایا هەواڵتان بدەمێ بە خراپتر لەو خەشمی ئێوە؟ خراپتر لەوە خەشمی خوایە کە بەو جۆرەی بەسەر هێنان کە لە ئایەتەکەدا باس کرا، کەواتە خەشم و پیلان و ئازار دانی ئەو نامەدارانە دەربارەی موسڵمانان لە کوێ و خەشمی خوا دەربارەی ئەو نامەدارانە لە کوێ کە خوا ئەوەی بەسەرهێنان کە باس کرا؟!

وَإِذَا جَآءُوكُمْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَقَد دَّخَلُواْ بِٱلْكُفْرِ وَهُمْ قَدْ خَرَجُواْ بِهِۦۚ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُواْ يَكْتُمُونَ ﴿٦١﴾ وَتَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَۚ لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٦٢﴾ لَوْلَا يَنْهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ عَن قَوْلِهِمُ ٱلْإِثْمَ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَۚ لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَصْنَعُونَ ﴿٦٣﴾

---

لەپاش ئەوە مێژوو بەد و تۆڵە و پاداشتی بەدیانی خستە بەرچاو، ئینجا هەمیتر لەسەریان ئەڕوات بە دەرخستنی هێندێکی تر لە کردەوەو نیشانەی بەدیان، بۆ ئەوەی ناشیرین ترو بێزراوتریان بکات و بڕواداران دوور بکەونەوە لە دۆستایەتی و خۆش ویستنیان، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا جَآءُوكُمْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا﴾ کاتێ دێن بۆلاتان ئەڵێن: بڕوامان هێناوە، ﴿وَقَد دَّخَلُواْ بِٱلْكُفْرِ وَهُمْ قَدْ خَرَجُواْ بِهِۦۚ﴾ لەکاتێك دا بە بێ بڕوایی یەوە هاتوون، هەر خۆیان بە بێ بڕوایی یەوە دەرئەچن، ﴿وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُواْ يَكْتُمُونَ﴾ خوا زاناترە بەوەی کە ئەیشارنەوە، بەڵێ. بێگومان خوا لە هەموو کەس زاناترو ئاگادار ترە بە ناپاکی ی و پیلانەکانیان، کەواتە با بڕوادارەکان دڵنیا و دڵئارام بن بە چاودێریی یەکەی پەروەردگاریان و پاراستنیان لە پیلان و کردەوە بەدەکانیان، ئینجا با ئەو ناپاك و پیلان گێڕانە کۆتایی بێنن و بترسن لە خوای زانا و ئاگادار. ﴿وَتَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَۚ﴾ ئەبینی زۆر لەوان بە جۆرێ بە پەلە چەسپانی ئەکەن لە گوناهو ستەم و دەست درێژیی و خواردنیان بۆ حەرام بەشێوەیەکی گشتی یان وەك(حسن) ئەفەرموێ: مەبەست بەرتیلە بە تایبەتی کە زۆر باو بووە لەناویان دا، ﴿لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ بێگومان شتێکی بەد بوو ئەوەی کە ئەیانکرد. ئایا چی لەوە خراپتر کە بەو شێوە سەریان کردبووە تاوان و خراپەکاری؟! هەر بە قورئان ئەکەوێ و هەر قورئان باش ئەزانێ باری ڕاستەقینەی شت دەرخات، با بە وردی بیر بکەینەوە لەو دیمەن و شێوە بەدەی ئەوانە کە قورئان نیشانمان ئەدات. ئەوانە ئەخاتە بەرچاو وەك کۆمەڵێك بن پەلامار بدەن و پێشبڕکێ بکەن لەو کردەوە بەدانەدا، ئەو شێوە و دیمەنەی نەخشە کێشان بۆ ناشیرین کردن و ئابڕوو بردنیان، لە هەمان کات دا تا شێوەو دیمەنێکی ڕاستەقینەی ئەو دەروونانە و ئەو کۆمەڵانەیە کە فەساد و خراپەکاریی تیا بلاو ببێتەوە، شەڕو خراپەی تیا زاڵ ببێ، لەو جۆرە گەلانەدا ئەبینرێ کە دەست بێ دەست قوت ئەدا، بەهەرجۆر و شێوەیەك بگونجێ کۆتایی هێنان و دەست گێڕانەوە نی یە لە هەر تاوان و کردەوەیەکی خراپ! گەلی جوولەکە لەو سەردەمەدا وای لێ هات و شێوەی ئادەمێتی تیا نەما، خراپتر و بەد تر لە هەموو تاوانێ

ئەوەبوو کە فەرمان بە چاکە و جڵەوگیریی لە خراپەی تیا نەما، نە لەلایەن زاناکان و نە لە لایەن عابیدەکانیانەوە، بەهۆی ئەوەوە شایستەی ئەوەبوون کە خوا نەفرینی لیٚ کردن، وەك لەمەوپاش لەم سورەتەدا دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوە لەئایەتی(٧٨ – ٧٩)، وەك لێرەیشدا ئەو کردەوەی ئەوانە بە خراپتر نیشان ئەدات و ئەفەرموێ: ﴿لَوۡلَا يَنۡهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ﴾ با جڵەوگیریی ئەوانە بکەن زاناکان و عابیدەکان، ﴿عَن قَوۡلِهِمُ ٱلۡإِثۡمَ وَأَكۡلِهِمُ ٱلسُّحۡتَۚ﴾ لە وتەو قسەی گوناهیان وەك درۆ، خواردنیان بۆ حەرام وەك بەرتیل ﴿لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ﴾ بەڕاستی شتێکی بەد بوو ئەوەی کە ئەو زانا و عابیدانە کردیان بە پیشە بۆ خۆیان!! بەڵیٚ نیشانە و شێوەی گەل و کۆمەڵی خراپ ئەوەیە، ئەو کەسانەیان کە زانان و کاروباری ئایینیان بەدەستە بیٚ دەنگ بن لە هەر کارو کردەوەیەکی بەدو خراپ، بەرگری و جڵەوگیریی نەکەن لە خراپەکار و هەوڵ نەدەن بۆ نەهێشتنی تاوان و خراپە، تا بۆ خۆی ئەو گەل و کۆمەڵە دائەڕزیٚ و لەناوئەچیٚ، نیشانە و شێوەی گەل و کۆمەڵی چاك و بەهێزو دامەزراو و یەککگرتوویش ئەمەیە کە فەرمان بە چاکە و جڵەوگیریی لە خراپە زاڵ وبەهێز بێت تیای دا، واتە لەناو ئەو گەل و کۆمەڵەدا کەسیٚ ببیٚ کە هەڵسیٚ بەو کارە، گویٚ گرو فەرمانبەریشی تیا بێت تا رادەیەك ئەوانەی کە بەدو خراپن نەتوانن و زاتیان نەبیٚ بە ئاشکرا خراپەکاریی بکەن و تەریق ببنەوە لەوەی پیٚ یان بزانریٚ و بە خراپەکار سەیر بکرێن، نەتوانن بەرگریی ئەو کەسانە بکەن کە فەرماندەرن بە چاکە و جڵەوگیریی کەرن لە خراپە، کەواتە پێویستە پێك هێنانی دەسەلاتێك کە ئەو فەرمان و جڵەوگیریی یەی پیٚ بەجیٚ بهێنریٚ، لەپاش بانگ کردن و روون کردنەوەی ئایین و فەرمانەکانی خوا.

لەهەر بارێکەوە بیر بکرێتەوە لە قورئان تا بێت نهێنی و ناپاکی یەکەی ئەوان دەرئەکەویٚ، بۆ نموونە: دەربارەی نەزان و نەفامەکانیان فەرموی: ﴿لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ﴾، چونکە(عمل) کردەوەیەکە بە نیازو دەستی قەست بکریٚ و بە زانینەوە بکریٚ یان نەء. بەلأم(صنعت) کردەوەیەکە بە نیازو دەستی قەست و بە زانینەوە بکریٚ و بە خەریك بوونەوە تا رام ئەبیٚ لە سەری و ئەکریٚ بە پیشە، کەواتە بۆ ئەوان وتەی پێشوو رێك و پێك ترە، بۆ ئەمانیش وتەی دووەم رێك ترە و زیادتر لەکەداریان ئەکات و نەنگ و رەخنە لیٚ گرتنەکەیان بەهێزتر ئەکات، بێگومان تاوان و کردەوەکەی ئەمان کە زانا و پێشەوان سەخت ترو گەورەترە، ئەمان بەشدارن لە گوناهو تاوانی نەزانەکانیشدا.

وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغۡلُولَةٌۚ غُلَّتۡ أَيۡدِيهِمۡ وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْۘ بَلۡ يَدَاهُ مَبۡسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيۡفَ يَشَآءُۚ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ طُغۡيَٰنٗا وَكُفۡرٗاۚ

---

بەڕاستی زۆر سامناك و ترسێنەرە بۆ زانایان لە هەموو چەرخ و وڵاتێك دا، وەك(ئیبن و عەباس) یش ئەفەرموێ: ئەمە بەتین ترین ئایەتە لە قورئان دا سەبارەت بە زانایان،(ضحاك) ئەفەرموێ: لە قورئان دا نی یە هیچ ئایەتێك کە لەم ئایەتە سامناك تر بێت بەلای منەوە – خوا لێ یان رازی بێت – بەڕاستی زۆر چاکیان فەرمووە. ئینجا نموونەیەکی زۆر بەد و ناڕاست و ناڕەوای ئەو جوولەکانە باس ئەکات لە وتە بەدو خراپەکانیان کە زانا و عابیدەکانیان بێ دەنگ ئەبوون و جڵەوگیریی یان نەئەکرد لێ یان، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ﴾ جوولەکەکان وتیان: ﴿يَدُ ٱللَّهِ مَغۡلُولَةٌۚ﴾ ئەم وتە بەدەی ئەوان بە چەند جۆرێ تەفسیر کراوەتەوە، بەهێزتریان کە زۆربەشی لەسەرە ئەمەیە: خوا – پاکی بۆ ئەو – چرووك و چنگ و گوشراوە و بەخشینی نی یە،(ئیبن و عەباس و ضحاك و عیکریمە) – خوا لێ یان رازی بێت – ئەفەرمون: خوای گەورە بە لێشاو رۆزی و سامانیدا بە جوولەکە، ئینجا کاتێ سەرکێشی یان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) خوا ئەوەی لێ گرتنەوە و بێ دەسەلاتی کردن، ئینجا(فنحاسی کوڕی عازوراء) کە سەرۆکی جوولەکەکانی(بنی قینقاع) بوو لە ریوایەتێ تر لە(ئیبن و عەباس) ەوە(نەباشی کوڕی قەیس) ئەو وتەی گوت. لەبەر ئەوەی هیچ کام لە جوولەکەکانی تر جڵەوگیریی یان نەکرد و بێزاری یان دەرنەبڕی لە وتەکەی، هەرکەس رازی بێت بە هەر گوناهێك، یان بێ دەنگ بێت و دەسەلاتی ببێ، ئەو کەسە هاوبەشە لەو گوناهو تاوانەدا، جا لەبەرئەوەئەم وتەیەهەر بەوتەی ئەوجوولەکانی ترەیش دانراو وەك یەك گێڕایەوە لێیانەوە.

ئەو نەفرین لێ کراوانە لەبەر ئەوەی خوانەناس بوون بۆچوونیان بەدو خراپ بوو دەربارەی خوا، بەهۆی ئەوە ئەو سیفەتە ناشیرینانەیان بۆ خوا رەوا ئەدا، ئینجا بەوە نەوەستان، بەڵکو ئەوەندە نەفام و بێ شەرم بوون ئەم وتە بێزراوەیان بۆ خوا بەکار هێنا لە گەیاندنی ئەو سیفەتە ناپەسەندەدا، کە واتاکەی لە زمانی عەرەب دا ئەمەیە: خوا دەستی

بەستراوە و زنجیر کراوە بە ملیەوە!! ئەو ناپەسەندانە خۆیان شایستەی ئەوە کرد کە خوا دەربارەیان فەرموی: ﴿غُلَّتۡ أَيۡدِيهِمۡ وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْ﴾ ئەم فەرمودەیە هەڵئەگرێ نزا بێ لەلایەن خواوە کە نزای ئەو بریتی یە لە بڕیارو بەدی هێنانی ئەوەی کە نزاکەی پێ ئەکات، هەڵئەگرێ هەواڵ دان بێت بەوەی کە بەسەریان دێت، بە هەردوو جۆرەکە تەفسیر کراوەتەوە، کەواتە با ئێمەیش لەسەر هەردووبار تەفسیری بکەینەوە: لەسەر باری یەکەم: یا خوا ئەوان چرووك و چنگ قوچرا وو دەست بەستراو بن لە خێرو چاکە، یان یا خوا دەستی ئەوان زنجیر بکرێ و ببەسترێ بە ملیانەوە لەناو ئاگری دۆزەخ دا، نەفرین لێ کراو و دوور خراوبن لە میهرەبانی و بەزەیی خوا بەهۆی ئەوەوە کە وتیان. لەسەر باری دووەم: ئەوانە چرووك و چنگ قوچراو و دەست بەستراون لە بەخشین و خێرو چاکە، یان بێگومان دەستیان ئەبەسترێ بە ملیانەوەو زنجیر ئەکرێن و ئەخرێنە ناو دۆزەخ، ئەوانە نەفرینیان لێ کراوەو دوور خراونەتەوە لە میهرەبانی خوا بەهۆی ئەو وتە بەدەی کە وتیان دەربارەی خوا، لەسەر هەربار ئەو سیفەتە بەدە بە تێرو تەواوی لە جوولەکەدا هەیە و ئەوان لە هەموو کەس چرووك ترن، بێگومان هەرچۆنێ لە جیهان دا زۆر جار بەدەستی بەستە بەدیل گیراون، لە رۆژی دواییش دا بەو شێوەیە تووڕ ئەدرێنە دۆزەخ، دووریش خراونەتەوە لە هەردوو جیهان دا لە میهرەبانی خوا و ئەکەونە بەر خەشمی نەبڕاوەی خوا. ئینجا بەرپەرچیان ئەداتەوە و دەم کوتیان ئەکات بەوەی بەخشینی خوا بە لێشاوەو بێ وێنە و بێ سنوورە، ئەفەرموێ: ﴿بَلۡ يَدَاهُ مَبۡسُوطَتَانِ﴾ نەخێر خوا بەوجۆرە نی یە کە بەهرەو بەخشینی نەبێ یان کەم بێت، بەڵکو هەردوو دەستی قودرەتی هەمیشە کراوەو راکێشراون بۆ بەخشین، واتە ئەوپەڕی رادە بەخشندەیە، ﴿يُنفِقُ كَيۡفَ يَشَآءُ﴾ بەخشین ئەکات و رۆزی و سامان ئەدات چۆن بیەوێ و مەیل بکات، خۆی خاوەنی هەموو شتە، خاوەنی رۆزی و سامان و پێ بەخشراوانە، خۆی ئەزانێ کێ شایستەی چی یە بەو پێ یە ئەیدات، هەر کەم کردنەوەو گرتنەوەیە بکات لە لێزانی و کاردروستی یە، نەك لەبەر نەبوونی و پیا نەگەیشتن و دەرنەهێنان بێ، لە حەدیسی قودسی دا هاتووە کە ئەفەرموێ: ئەگەر ئەوەڵ و ئاخرتان و جنۆکە و ئادەمیتان، هەموو کۆببنەوە لە دەشت و

سارایەك دا، ئینجا هەركەس هەرچی ئەوێ داوای بكات و منیش داواكانیان بەجێ بێنم، هەموو ئەوە كەم ناكاتەوە لەوەی كە لای منە و دەسەڵاتم هەیە بەسەریدا، مەگەر بە ئەندازەی ئەوەی دەرزی یەك بخرێتە ناو دەریایەكەوە، ئەو دەرزی یە چەندێ لەو دەریا كەم ئەكاتەوە!!

دەك نەفرینی خوا لە جوولەكەی تاوانبار كە چەندە بێ شەرم و بەد وتار و بەد كردارە! بێگومان ئەو جوولەكانە – بە تایبەتی زاناكانیان – ئەبوایە بێ گیروگرفت بڕوایان بهێنایە و ببوونایە بە سەربازێكی فیداكار بۆ ئەم قورئانە، چونكە ئەوان شارەزا بوون و ئاگادار بوون بە گەلێ شتی زۆر نهێنی لە كاروبار و بەسەرهاتی خۆیان و پێشووەكانیان و نامەكەیان و مێژووی دوور ودرێژیان كە ئەم قورئانە هات و ئەو شتە نەناسراو و نهێنی یانەی دەرخست، ئاشكرایشە ئەم قورئانە لە كەسێكی نەخوێندەواری پەیدا بوو و پێگەیشتوو لەناو گەلێكی نەخوێندەواری نەفام دا، كە بە هیچ رەنگ ئەو شتانە بەدڵیان دا بە خەتەرەو خەیاڵیش نەهاتبوو، كەواتە ئەبێ ئەو هەواڵانە لەخواوە هاتبن، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا لەبەر حەسەد و خود پەرستی و رەگەزایەتی بڕوایان نەهێنا، بەڵكو بەو بەڵگە ئاشكرایانە و بەو هەواڵە غەیبی یانە سەركێش و یاخی تر بوون، لێرەدا دەست نیشان ئەكات بەو بارو حاڵەتە بەدەیان و هەواڵەكەیان ئەدا بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَانًا وَكُفْرًا﴾ سوێند بەخوا ئەوەی كە هێنراوەتە خوارەوە بۆلای تۆ لەلایەن پەروەردگارتەوە زۆر لەوانە – واتە زانا و سەرۆكەكانیان – زیاد ئەكات بە سەركێشی و بێ بڕوایی، واتە زیاد لەو سەركێشی و یاخی بوون و بێ بڕوایی یەی كە بوویان، ئیتر زیاد بوون لە بەتینی و زیادە رەوی یان زۆری دا بەم رەنگە هەر ئایەتێك ئەهاتە خوارەوە بە تایبەتی بێ بڕوایی و سەركێشی یان ئەبوو بۆی، ئەوەی بە وێنەی خۆراكێكی چاكی خۆشی بەهێزە تا نەخۆش زیاتر لێ ی بخوا نەخۆشی یەكەی زیاترو سەخت تر و زۆرتر ئەبێ. بێگومان ئەوان كە ئەوەندە بەدو خراپ بن ئەبێ خوایش بە میهرەبانی خۆی بەرگری لە موسڵمانان بكات و رێگەی ئەو بەدانە ئەدا كە بە گوێرەی سروشتی بەد و خراپیان دەست بوەشێنن و خراپەكاریی بكەن،

جا ئەوا دەست نیشان ئەکات بۆ ئەو بەرگریی و ڕێگرتنە لەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾ خستوومانەتە ناویان و نێوانیان دوژمنایەتی و کینە و ڕقە بەری تا ڕۆژی دوایی، بە پێی ئەم چەند ئایەتەی کە تێپەڕی کرد لە باسی جوولەکەدا بەتایبەتی مەبەست بەمانە هەر جوولەکەیە، وەك زۆر لە زانایانی تەفسیریش لەسەر ئەوەن.
جا هەرکەس نازانێ با بزانێ ئەوەتەی جوولەکە لای دا لە پەیڕەوی حەزرەتی موسا تا ئێستا لەناویان دا دوژمنایەتی و کینەبەری پەیدا بووە و ئەگەر لە کاتێك دا بە ڕووکەش و ڕواڵەت ئەو دوژمنایەتی و ڕقە بەری یە بە ئاشکرا نەبووبێ لە دڵەوە هەر بووە، چونکە بوون بە چەند کۆمەڵ و تیرەو بەرەیەك، هەرگیز یەکیان نەگرتووە و یەك ناگرن، تەنانەت لەم دوایی یەش دا کە سەلیبی جیهانی کۆی کردنەوە لەگەڵێ وڵاتەوەو یەکێتی خستە ناویان، تا میری یەکەیان بۆ فەراهەم هێنان لە خاکی داگیر کراوی فەلەستین دا، لەم کاتەیش دا هەر دەرئەکەوێ کینە و دوژمنایەتی ناویان، بەڵام لە ترسی بەناو موسڵمانان و زۆر پێ هێنانی دەوڵەتە سەلیبی یەکان ناوێرن و زاتیان نی یە کینە و دوژمنایەتی ناوخۆیان دەرخەن، با بزانرێ ئەم ئاوات و ئامانجە بچووکەی کە دەست کەوتیان بوو شتێکی کاتی یە تا موسڵمانەکان هۆش ئەکەنەوە و ئەگەڕێنەوە بۆ ڕێگە ڕاستەکەی خۆیان، ئەو کاتە ئەوەی کە دەستیان خستن لە دەستیان دەرئەچێ و هیچ کەس ناتوانێ پشتگیر و ڕزگار کەریان بێ، ناگەن بەو ئاوات و ئامانجە بەدەی کە سەهوێنێتی جیهانی بە تەمایەتی، چونکە دەربارەیان خوا ئەفەرموێ: ﴿كُلَّمَا أَوْقَدُوا نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا اللَّهُ﴾هەرجارێ هەڵیان گیرساندبێ ئاگرێك بۆ ئاژاوە نانەوە و تێکدانی وڵات و نەهێشتنی ئاشتی و جەنگ و خراپەکاریی و کوشتار، خوا ئەو ئاگرەی کوژاندووەتەوە، ئیتر مەبەست بەو ئاگر نانەوە هەر بۆ چەرخی پێغەمبەرو لەگەڵ ئەو بێت(ﷺ) وەك(حسن و مجاهد) ئەفەرمون. یان مەبەست گشتی ترە لەوەو هەر لە کۆنەوە وەك هێندێ تر لە زانایان ئەفەرمون. ئەوەتا کاتێ کە لایان دا و پێچەوانەی تەورات ڕەفتاریان کرد خوا(بختنسری) زاڵ

کرد بەسەریان دا، ئینجا خراپەکاریی تریان کرد تا خوا(فطرس) ی رومی زاڵ کرد بەسەریان دا، ئینجا خراپەکاری تریان کرد تا خوا مەجوسی زاڵ کرد بەسەریان دا، ئینجا دەستیان کردەوە بە خراپەکاری تا خوا پێغەمبەری(ﷺ) زاڵ کرد بەسەریان دا، ئینجا دەستیان کردەوە بە خراپەکاری تا خەلیفەی دووەمی زاڵ کرد کرد بەسەریان دا و دەری کردن بۆ شام، لە پاش ئەو رووداو و بەسەرهاتانەیان هەر کۆڵیان نەدا تا خوا لەم دوا دوایی یەدا(هتلر) ی زاڵ کرد بەسەریان دا و ئەوەی پێ کردن کە کردی! بێگومان ئەم جاری دوایشە کە سەلیبی کۆی کردنەوە لە فەلەستین دا لە ساڵی(١٩٤٨) دا تا ئێستا هەر خەریکی تاوان و خراپەکاریین، بۆ ئەم جاری دوایی یەش ئەوا موسڵمانان لە هەموو لایەکەوە خەریکن هۆش ئەکەنەوەو ئەگەڕێنەوە بۆلای ئیسلام و بە رێکی و دەست بەرداری هەموو بیروباوەڕە بۆگەنەکانی تر ئەبن، بۆ ئەم جاری دوایی یە بە تەواوی خوا لەناویان ئەبات لەسەر دەستی کۆمەڵی موسڵمان دا، وەك لە حەدیسی سەحیح دا هاتووە. لەم ماوەیەدا کە میریی یان بۆ پێك هێنرا و ئەو هەموو دەست درێژیی و ستەمە ئەکەن و کردیان، هەرچەند ژیانیان زۆر تاڵە و هەمیشە وان لە ترس و بیم و سزادا، بەڵام ماوەیان ماوە، تا جەنگ ئەکەن لەگەڵ موسڵمانی راستەقینەدا و جەنگەکەیان ئەکەوێتە نێوان جوولەکە و ئیسلام نەك نێوان جوولەکە و ئەو کۆمەڵە عەرەبە کە بە هەموو جۆر ئەیانەوێ ناوی ئیسلام و موسڵمانان لە ئارادا نەبێ، تا موسڵمانان هەر لەبەر خواو بەناوی خوا و هەر لە ژێر ئاڵای ئیسلام دا جەنگ بکەن نەك لە ژێر ئاڵایەکی تر و بەناوێکی تر و لەبەر هەر شتێکی تر، چونکە ئاشکرایە خوا یارمەتی ئەو کەسانە ئەدات کە یارمەتی ئایینی خوا ئەدەن، بە بێ هیچ نیازێکی تر، هەرکاتێ ئەو کۆمەڵە موسڵمانە راستەقینە هاتە کایە یارمەتی دانی خوا و زاڵ کردنی خوا بۆ ئەو کۆمەڵە مسۆگەرە و هیچ گومانی تێدا نی یە، سەلیبی و سەهیۆنێتی جیهانی بە باشی تێگەیشتوون لەوە، لەبەر ئەوە ئەوەی لە دەستیان بێت و پێ یان بکرێ بەکاری ئەهێنن لە بەرگری و رێگرتن و پیلان نانەوە بۆ ئەو کەسانەی کە ئەیانەوێ هەر ناوی ئیسلام بێنن و هەر ئاڵای ئیسلام بەرز بکەنەوەو هەموو کاروباریێ بگێڕنەوە بۆلای ئیسلام.

وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادٗاۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَوۡ أَنَّ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ لَكَفَّرۡنَا عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَأَدۡخَلۡنَٰهُمۡ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٦٥﴾ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ أَقَامُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِم مِّن رَّبِّهِمۡ

---

﴿وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادٗاۚ﴾ ئەوانە تێكۆشـان ئەكـەن لـە زەوی و وڵات دا لەبـەر تێـك دان و وێـران كردنـی وڵات و لەبەر تێك دانـی دانیـشتوانی، كەواتـە هەرچـۆنێ كردەوەكانیـان بـەدو خراپـە، هـەروەها نیـازو مەبەستیـشیان هـەر بـەدو خراپـە. ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾ خـوایش ئەوانەی ناوێ كە تێك دەرو شێوێنەری وڵات و مـەردومانن. دەی ئـەبێ خوایش بـەو جۆرەی خۆی ئـەزانێ تۆڵـەیان لـێ بسێنێ و دەستیان ببەستێ لـەو خراپـەكاریی یـەی كـە هەمیـشە بەدوای دا ئەگـەڕێن، یەكـەم و سەردەستە و سەرچاوەی خراپـەكاری یـەكانیان لادانیانـە لـەو ئایین و نامەی خوا و ڕێگرتنیایە لە پێغەمبەرو ئیسلام و موسڵمانان.

لـە پێشەوە وتمـان بـە پـێی ئـەم چەند ئایەتـەی كـە تێپـەڕی كـرد مەبەست بەمانـە هـەر جوولەكەیـە، بـەڵام لـە(حسن و مجاهـد)ەوە ئەگێڕنـەوە كـە مەبەسـت بـە گـاورو جوولەكەیـە پێكەوە. چونكە لە سـەرەتاوە ئایەتـەكان دەربارەی نامـەدار هـاتن كە گشتی یـە بۆ ئـەو دوو كۆمەڵە یەكەم ئایەت كە ئەم باسەی پێ دامەزرا ئایەتی(٥١) بوو كە فـەرموی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَ﴾ بـەم جۆرەش هـەر باشـە و ئـەگونجێ، گاورەكانیش شـان بـە شـانی لەگەڵ جوولەكەكان لەو سیفەتە بەدانـەدا كە باسمـان كـردن، بەڵكو لـەم دوایـی یـەدا هەرچـی خراپـەكاری و دەست درێژیی یـەك كە جوولـەكە كردی بـە یارمـەتی دان و پشتگیریی گـاور، جوولەكە توانی بیكات، ئەوانیش وەك جوولەكە نەوەستاون لە هەڵگیرساندنی ئاگری هـەموو دوژمنایـەتی و پـیلان و خراپـەكاری یـەك دەربـارەی ئیـسلام و موسـڵمانان، بـەڵام خـوا ئاگرەكانیـان ئەكوژێنێتـەوە و نـاهێڵێ بگـەن بـە ئامـانجی بـەدی خۆیـان بـەوجۆرەی كـە ئـەوان ئەیانـەوێ، هـەر ئەنـدازێك مەبەسـت و ئامانجیـان پێـك هـاتبێ بـەهۆی ئـەوە بـووە كـە موسـڵمانەكان لایـان داوە لـە ڕێگـە ڕاستەكـەی خۆیـان، ئـەو گاورانـە ویستیان ئیسلام نـاوی نەمێنێ تەنانەت لە خاك و وڵاتەكانی ئیسلامیش دا كەچی خوا كارێكی وای كرد كە ئیسلام

لەم چەرخی تازەدا بەرەبەرە کشا و ئەکشێ بۆ ناو جەرگەی وڵاتەکانی ئەوانیش هەموو سوپاس و سەنایە بۆ خوای میهرەبان.

ئینجا بە بۆنەی باسی لادانی نامەدارەکان لە ئایینی خوا، حەرام خۆری یان، دەست کاری کردنیان لە نامەی خوادا بۆ ئەوەی دەست کەوتێکی کەمی ئەم جیهانەیان بۆ ببێ، بەو بۆنەیەوە رێنموونی و ئامۆژگاری یەکی زۆر گەورەو گرنگ ئاراستە ئەکات لەم دوو ئایەتەدا، رێگەی بەختەوەری و کامەرانی هەردوو جیهان دیاریی ئەکات و بە روونی نەخشەی ئەکێشێ بۆ ئەو نامەدارانە کە خۆیان بە دەستی خۆیان دووچار کرد و خۆیان ترازان لەو رێگە پیرۆزە.

لەبارەی گەیشتن بە کامەرانی و بەختەوەری رۆژی دوایی یانەوە ئەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ أَنَّ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ ءَامَنُواْ﴾ ئەگەر نامەدارەکان – لەگەڵ ئەو هەموو تاوان و خراپەکاری یەی کە هەیانە – بڕوایان بهێنایە بە دواترینی پێغەمبەران و رەوانە کراوەکانی خوا ﴿وَٱتَّقَوۡاْ﴾ خۆیان بپارێزایە لەهۆی خەشم و نارەزایی خوا کە یەکێ لەوانە پێچەوانە کردنی نامەکەیانە، ﴿لَكَفَّرۡنَا عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ﴾ بێگومان ئەمانسڕی یەوە و دامان ئەشارد لێ یان گوناهو خراپەکانیان هەرچەند گەورە بوونایە، ﴿وَلَأَدۡخَلۡنَٰهُمۡ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾ ئەمانخستنە ناو بەهەشتانی نازو نیعمەت، کە بەختەوەری ئەو رۆژە ئەو دوو شتەیە. لەبارەی گەیشتنیان بە کامەرانی و بەختەوەری ئەم جیهانیان ئەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ أَنَّهُمۡ أَقَامُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ﴾ ئەگەر ئەو نامەدارانە تەورات و ئینجیلیان بە رێك و راستی کردایە، هەڵسانایە بە پەیرەوی کردن و بەجێ هێنانی فەرمان و بڕیارەکانیان، کەیەکێ لەوانە بەڵگە و نیشانەکانی پێغەمبەرێتی پێغەمبەرمانە(ﷺ) موژدە دەری رەوانە کردنی ئەون، ﴿وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِم مِّن رَّبِّهِمۡ﴾ هەڵسانایە بە پەیرەوی کردن و گوێ رایەڵی ئەوەی کە هێنراوەتە خوارەوە بۆلایان لەلایەن پەروەردگاریانەوە، ئیتر مەبەست بەمە قورئان بێت کە نێرراوە بۆ هەموو ئادەمی و جین، وەك لە(ئیبن و عەباس) ەوە ریوایەت کراوە – خوا لێ یان رازی بێت –، چەند کەسێکی تریش ئەوەیان بەدڵە، یان ئەو نامەیانەی تر بۆ دانیال و حزقیال و اشعیا و غەیری ئەوان، وەك هێندێ لەسەر ئەوەن کە یەکێکیان(ئەبو حیان) ە ئەو نامانەش موژدەیان تیایە بە هاتنی پێغەمبەرمان(ﷺ) یان مەبەست گشتی بێت، لەسەر هەربار ئەگەر ئەو نامەدارانە بەو جۆرە بوونایە

لَأَكَلُواْ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ مِّنْهُمْ أُمَّةٌ مُّقْتَصِدَةٌ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ سَآءَ مَا يَعْمَلُونَ ﴿٦٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ

﴿لَأَكَلُواْ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ﴾ ئەیانخوارد لەلای سەرویانەوە و لە ژێر پێ یان، واتە خوا دەرگای پیت و فەڕی لەسەر ئەکردنەوە و لە ئاسمان و لە زەوی یەوە بە فراوانی ڕۆزی و هەر شتێ پێویست بوایە پێ ی ئەبەخشین، بەڵام هەموو ئەو نامەدارانە بەو جۆرەیان کرد، بەڵکو بەم جۆرە بوون کە ئەفەرموێ: ﴿مِّنْهُمْ أُمَّةٌ مُّقْتَصِدَةٌ﴾ تێیاندا بوو دەستە و کۆمەڵێکی ڕێك و پێك بە بێ زیادە ڕەوی و کەم و کوڕی، ئەوانەی کە بڕوایان هێنا و شوێنی پێغەمبەر کەوتن(ﷺ) وەك(مجاهد و سدی و ئیبن و زەید جبائی) ئەفەرمون ﴿وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ سَآءَ مَا يَعْمَلُونَ﴾ زۆر لەوان ئەوەی کە کردیان زۆر بەدو خراپ بوو، وەك ئەو هەموو عیناد و سەرکێشی و ڕوو وەرگێڕان لە هەق و ڕاستی و دەست کاری کردنی نامەو ئایینی خوا و دان نەنان بەوەی کە ئەیانزانی. ئەم دوو ئایەتە شتێکی زۆر گرنگ نیشان ئەدەن لە ژیان دا، بۆچوونێکی گەورەیان لێ وەرئەگیرێ لە بۆچوونەکانی ئیسلام، کە لە هەموو کاتێك دا – بە تایبەتی لەم چەرخ وە سەردەمەدا – پێویستە ڕوون کردنەوەی ئەو شتە زۆر گرنگە و ئەو بۆچوونە گەورەیە ئەوەش ئەمەیە: کە بڕوا هێنان و لە خواترسی و خۆپارێزی و پێك هێنان و بەدی هێنانی بەرنامەی خوا لە ژیان دا لەم جیهانەدا، هەر تەنها ئەجرو پاداشتی ڕۆژی دوایی مسۆگەر ناکات، ئەگەرچی هەر ئەویش لە پێشەوە نەبڕاوەیە، بەڵکو هەروەها بەختەوەری و کامەرانی ئەم جیهانیش مسۆگەر ئەکات، کەواتە هەر لە یەك ڕێگەوە هەردوو شتەکە دەست کەوت ئەبێ بە تێرو تەواوی، نەك وەك زۆر کەس گومانی وا بردووە و وا ئەبا کە ژیانی ئەم جیهانە و ڕۆژی دوایی لە دوو ڕێگەوە دەست کەوت ئەبن و هەرکام ڕێگەی جیاوازی تایبەتی خۆی هەیە و لە هەرکام لادرا ئەویتر لە کیس ئەچێ، نەخێر ئەوە بۆچوونێکی هەڵەیە و دوورە لە ڕۆح و باری ڕاستەقینەی ئایینەوە.

هەرکەسێك تێگەیشتوو و زانا بێ ئەزانێ کە بەرنامەی خوا تەنها بەرنامەی عەقیدە و بڕواو هەستێکی دەروونی و لە خواترسی نی یە، بەڵکو لەگەڵ ئەوەدا بەرنامەی ژیانێکی

راستەقینەی ئادەمی یە کە ژیانی لەسەر راگیر ئەکرێ بە هەموو داخوازو پێویستە رەواکانی یەوە. شتێکی ئاشکرایە لە ئیسلام دا کە ئادەمی گەورەو ئاغای ئەم زەوی و جیهانەیە، هەرچی وا لەم زەوی یەدا بۆ ئادەمی وا دروست کردووە، ئەم بوونەوەرەی ژێر بار کردووە بۆی بە هەموو هێزو وزەکانی یەوە، خوا کردوویەتی بە جێنشین و کاروباری داوەتە دەستی کە بە پێی بەرنامەی خوا کەشتی ژیان بخاتە کارو بیبا بەڕێوە، هەموو هێزو وزەکانی ئەم جیهانە بەکار بێنێ لە ژیانی بەختەوەری و کامەرانی دا بۆ گەل و ئەندامی گەل، پێویستە لەسەری هەموو پیشەسازی و کارو کردەوەیەکی سوود بەخش و بەرهەم دار، هەڵسان بەمانە لەسەر بەرنامەی خوا خواپەرستی یە و بڕوادار ئەجرو پاداشتی لەسەر وەرئەگرێ لە رۆژی دوایی دا و پایە و پلەی پێ بەرز ئەبێتەوە لای خوا بێگومان کاتێ بەندە بەو بڕواو هەست و هۆش و بۆچوونەوە هەوڵ بدات باشتر خوا رێنموونی ئەکات بۆ هەر کارو کردەوەیەکی خێرو چاکە، باشتر پیت و فەڕ ئەڕێژێ بەسەری دا لە هەموو لایەکەوە، هەموو دەست کەوت و بەرهەمەکانیان نۆشی گیانیان ئەبێ و بە شادمانی ئەحەوێنەوە لێ ی بە هەموو ئارامی و ئاشتی دڵەکانیانەوە، بە پێچەوانەی ئەو کارو کردەوە و هەوڵ و تەقەللا و خەریك بوونەی کە لەسەر بەرنامەی خوا نەبێ و ئەو بڕواو هەست و بۆچوونەی لەگەڵ نەبێ، ئەوە هەرچەند بەرو بەرهەمی گەورەو بەرز زو سوود بەخش بێ، هەرگیز نۆشی گیان نابێ و هەمیشە تێکەڵی داخ و مەراق و بێ ئارامی یە، وەك بە چاو ئەبینرێ لەو هەموو شوێن و ولاتە بێ بڕواو لەخوا نەترسانەدا کە بە لێشاو هەموو هۆی ژیانی خۆش و کامەرانی هەیە و بەلام لە راستی دا پڕە لە بێ ئارامی و هەموو نەخۆشی یەکی دەروونی و جەستەیی!! ئینجا ئیتر با بوەستێ ئەو هەموو ستەم و ناڕەوایی یەی کە هەیە لەو رژێمە ئابووریی و کۆمەلایەتی یە دەست کردانەی کە لەم زەوی یەوە هەڵ ئەقوڵێن و بێ بەشن لە رێنموونی ئاسمان، ئەو پچڕان و دژایەتی یەی کە دروست کرا لە نێوان رێگەی بڕواو خواناسی و لەخواترسی، لەگەڵ رێگەی ژیانی ئەم جیهانە، لە نێوان کردەوە بۆ جیهان و کردەوە بۆ رۆژی دوایی، لە بەینی خواپەرستی و رۆح لەگەڵ بەکار هێنان و وداهێنانی بەرهەمی ماددی، لە بەینی بەرز بوونەوەو سەرکەوتنی ژیانی ئەم جیهانە، لەگەڵ بەرز بوونەوەو گەیشتن بە نازو رێز و ئامانجی رۆژی دوایی، دروست کردنی ئەو پچڕان و دژایەتی یە تاوان و ستەمێکی زۆر

گەورە بوو دەربارەی مرۆڤ و مرۆڤایەتی، بوو بەهۆی شێوان و ناخۆشی ئەم ژیانە و لە دەست دەرچوونی خۆشی و ژیانی ئەو جیهان، ئەگەر مرۆڤ بەو جۆرو شێوەیە لانەدرایە لە ڕێگەی ڕاست و ڕێگە و بەرنامەی خوای بدایەتە بەر بە ڕێك و ڕاستی، بە پێی ڕێنموونی ئایینی خوا تێکۆشان و کۆشش بۆ هەردوو جیهان بە ڕێکی و بە دەستە مل بهاتایەن، ئەو کاتە لەم ژیان و جیهانە بەرزتر ئەبوونەوە و ئەبوون بە نموونە بۆ ژیانی کامەرانی ئەو جیهان لە بەهەشت دا!! پێویستە لەسەرمان بە باشی تێ بگەین و وەری گرین ئەوەی کە بە کورتی گوتمان و وەرگێرا لەم دووئایەتە کورتەکەتەفسیرمان کرد، هەرکەس بێ ئاگا بێ لەوە بێگومان بۆچوونی ئیسلامی ئەو کەسە ناتەواوە و ئەو کەسە هەڵەیە و دوورە لە بارە ڕاستەقینەکەی ئیسلام، خوا بە میهرەبانی خۆی شارەزاو ئاگادارمان بکات لە ئیسلام بەڕاستی.

ئینجا لەم ئایەتانی داهاتووەدا هەمیتر ئەدوێ لە نامەدارەکان و لادان و ترازانیان لە عەقیدەو بیروباوەڕەکانیان دەرئەخات، هەروەها خراپی و بەدی کردەوەکانیان هەر لە کۆنەوە و لە مێژووی رابردوومان دا – بە تایبەتی جوولەکە – هەروەها ئەدوێ لە جۆری پەیوەندی یان لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) لەگەڵ کۆمەڵی موسڵمانان دا، کردەوەو ڕەفتاری ئەمان لەگەڵ ئەوان دا، لەمانە ئەدوێ لەگەڵ چەند شتی سەرەکی و بنەڕەتی تر وەك – بە یارمەتی خوا – پێیان ئەگەین و دەست نیشانیان بۆ ئەکەین.

لە یەکەمجارەوە بانگ ئەکاتە فروستادەکەی بەناوی فروستادەیی یەوە کە لە قورئان دا دووجاریەم ناوەبانگی لێ کردووە، هەردوو جارەکەش لەم سورەتەدایە و ئەمە دووەمەکەیانە، هەردوو جارەکەش هاتووە لە باسی بانگ کردنی نامەدارەکان بۆ ئیسلام و لێکۆڵینەوە لەگەڵیان لەبارەی ئایینەوە، لەم جاری دووەمەدا بانگی لێ ئەکات و فەرمانی پێ ئەدا بە ڕاگەیاندنی هەرچی بۆی هاتووە لە لایەن خواوە، بە بێ کەم و کوڕی و بە بێ ئەوەی هیچ شتێکی لێ دەرکات، یان دوای بخات لەبەر هەر هۆیەك، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ﴾ ئەی فروستادە و نێرراو ﴿بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ﴾ ڕاگەیەنە بە مەردومان هەرچی هێنراوەتە خوارەوە بۆلای تۆ لەلایەن پەروەردگارتەوە، واتە بە بێ ئەوەی باکت لە هیچ کەس ببێ، بە بێ ئەوەی گوێ بدەیت بە هەر ناخۆشی یەك کە دووچار ببی لەو ڕاگەیاندنەدا،

وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥۚ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٦٧﴾

﴿وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥۚ﴾ ئەگەر ئەو راگەیاندنە گشتی و هەموو نەکەیت، بەم رەنگە واز بێنی لە هەر هێندێکی و راینەگەیەنی، ئەوا فروستادەیی یەکە و راسپێری یەکەی خوات رانەگەیاندووەو بەجێت نەهێناوە، واتە وەك هیچ شتێکت رانەگەیاندبێ وایە لای خوا بە وێنەی بڕوا نەهێنان بە هەر هێندێ لە ئایەت و نامەی خوا وەك بڕوا نەهێنانە بە هەموو، یان مەبەست ئەوەیە: ئەوەی پێویست کراوە لەسەری راگەیاندنی هەمووە، دەی بێگومان بە رانەگەیاندنی هەر بەش و هەر هێندێکی هەمووەکە نامێنێ و بەدی نایە، بە وێنەی نوێژێك کە هەر بەشێکی لابرێ بە نوێژ نامێنێ و نوێژەکە بەجێ نەهاتووە، بێگومان ئەو سپاردە گەورەیە کە درا بە پێغەمبەر(ﷺ)، ئەو ئەرکە زۆر گرانەی کە خرایە سەر شانی، گەورەیی و گرانی یەکەی لە رادەیەك دایە – ئەگەر پشتیوانی خوا نەبوایە – لە توانا بەدەرە و بە هیچ رەنگ بەجێ نەئەهات، هەرکەسێك بە وردی ئەندازێك بیر بکاتەوە سەرسام ئەبێت لە گەورەیی و گرنگی یەکەی، با بیر بکرێتەوە لەوەی کە بە جاڕێ بانگ بکرێتە هەموو ئادەمی بە نامەدار و بێ نامە، بە زانا و نەزان، بە دەسەڵات دار و بێ دەسەڵات، بانگ بکرێ کە هەموو هەڵە و گومڕان و تەنها رێگەی رزگاریتان هەر ئەمەیە بێنە ژێر ئاڵای من و بڕوام پێ بێنن!! بێگومان کاری وا گەورە مایەی ئەوەیە کە بە جاڕێ لە هەموو لایەکەوە مەردوم هەڵسێ و کەمەرو پشتوێنی دوژمنایەتی ببەستێ و ئەوەی لە توانادا هەیە بەکار بهێنرێ لە بەرگری ئەوەی کە بانگەکە ئەکات، لە هەوڵ دانی لەناوبردنی، کەواتە بە پێی سروشتی ئادەمی کارێکە زۆر سامناکە و مەترسی تیاچوون و نەمانی لێ ئەکرێ لە هەموو وڵاتێك دا، جا خوای میهرەبان وەك ئەو فەرمانە گەورەیی پێ دا ئەوا دڵنیاشی کرد لەوەی کە مەردوم بتوانێ لەناوی بەرێ، فەرموی: ﴿وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ﴾ خوا تۆ ئەپارێزێ لە مەردومان کە بتوانن لەناوت بەرن و پەکت بخەن لەکارەکەت، دیارە مەبەست بەم مەردومانە بێ بڕواکانە، چونکە بڕواداران فیداکار و باڵا گەردان بوون بۆی چ جای ئەوەی هەوڵی کەمترین ئازاریان دابێ، واتە ئەوەی پێت سپێرراوە رایگەیەنە و باکت نەبێ لە بێ بڕوایان، وەك بەم فەرمودەیەش دەست نیشانی بۆ ئەکات ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ واتە خوا ئەتپارێزێ، چونکە ئەوانەی کە هەر ئەیانەوێ تۆ لەناوبەرن و بەرت لێ بگرن بێ بڕوان و خوایش ئەوان ناگەیەنێ بەو ئاوات و

ئامانجەیان کە هەیانە دەربارەی تۆ. خوا بەو جۆرە دڵنیای کرد بەو بەڵێنە، ئەگەر ئەو بەڵێنەشی بەدی هێنا بەم رەنگە هەرچی تەگبیر و پیلانی بت پەرست وجوولەکە و ناپاکان کە ماوەی(٢٣)ساڵ بەکاریان هێنا بۆ لەناوبردنی یان رێگرتن و پەك خستنی هەموو ئەوانەی بە بۆش دەرکرد تا کارەکەی خۆی بەتەواوی بەجێ هێنا و بردیە سەر بە کوێرایی چاوی دوژمنان. کەواتە بەدی هاتنی ئەو بەڵێنەش بوو بە یەکێ لە موعجیزەکانی وەك هەموو هەواڵە غەیبی یەکانی تری خۆی و قورئانەکەی، سوپاس بۆ خوا لەبارەی هۆ و کاتی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە چەند ریوایەتێك هاتووە حەز ئەکەم ئەندازێ بە درێژیی باسیان بکەم:

زانایانی تەفسیر لە تاقمی پێشووەکان دووبەرەکین لە کاتی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەدا،(ئیبن و مەردەویە و ضیاء) لە(المختارة) دا لە(ئیبن و عەباس) ەوە ریوایەت ئەکەن – خوا لێ یان رازی بێت –، وە(ئەبو الشیخ) لە(مجاهد) ەوە وا ئەگێرنەوە و شتێ ئەڵێن کە وا ئەگەیەنێ ئەم ئایەتە لە سەرەتای هاتنی ئیسلامەوە هاتبێتە خوارەوە، جا بە پێی ئەوە دانانی لە سورەتی(مائیدة) دا کە لە دوا دوایی دا هاتووە، وەك لە بیر خستنەوە و یادی یەکەمجار بێت لەگەڵ دواترین دا، پەیوەست کردنی دواترین بێت بە یەکەمجارەوە،(ئیبن و ئەبی حاتەم و ئیبن مەردەویە و ئیبن و عساکر) لە(ئەبو سەعیدی خدری) یەوە ریوایەت ئەکەن کە فەرمویەتی هاتووەتە خوارەوە لە رۆژی غدیری خم دا دەربارەی گەورەیی علی کوڕی ئەبی تالیب – کرم الله وجهه –، بێجگە لەم دوو رایە هەشت رای تریش هاتووە لە هۆی هاتنە خوارەوەی دا و وەك ئیمامی رازی هێناویەتی لە تەفسیرەکەی دا، لەبەر ئەوەی زۆر درێژە نەکێشێ باسی ئەو هەشتەم نەکرد و هەرکەس ئەیەوێ با تەماشای تەفسیری ناوبراو بکات، بەڵام ئەمەوێ ئەندازێ بدوێم لەسەر رای دووەم، چونکە کراوە بە جێگەی ئاژاوەو هۆی دووبەرەکی: چەند ریوایەتێك هاتووە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەری ئازیز(ص) کاتێ گەڕایەوە لە حەجی ماڵ ئاوایی(حجة الوداع) لە شوێنێك دا کەناوی(غدیر خم) ە خوتبەی دا بۆ هاوەڵەکانی، لەو خوتبەدا باسی بەهرەو هونەری علی کوڕی ئەبو تالیبی کرد، ئەو ریوایەتانە هەرچەند سەرجەمیان نەنگ و رەخنەیان تیایە بەلای کۆمەڵ و جەماوەری زانایانی ئوممەت، بەڵام لەو ریوایەتانەدا فەرمودەیەکی تیایە کە بەهێزە و وەرگیراوە لای زانا باوەڕ پێ کراوەکان، زۆر لە زانایانی حەدیس ریوایەتیان کردووە، وەك ئیمامی ئەحمەد لە مسندەکەی دا، وە ترمزی و نسائی و ئیبن و ماجە لە سەحیحەکانی خۆیاندا،(ضیاء) لە(المختارة) دا، ئەو فەرمودەش ئەمەیە: ﴿من كنت مولاه فعلي مولاه﴾ یان فەرمودەیەکی تر

که هەر ئەمە ئەگرێتەوە، ئینجا لەناو ئەو ریوایەتانەدا ریوایەتێك هەڵ ئەبژێرم کە زەمەبی بە سەحیحی دائەنێ لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ئەیهێنێ کە زەید فەرمویەتی: کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە لەو حەجە و لەو شوێنەی کە ناوی(غدیر خم)ە خستی و فەرمانی دا بە گسك دان و پاك کردنەوەی چەند درەختێکی گەورە کە لەو شوێنەدا بوون، ئینجا فەرموی: لام وایە بانگ کراوم بۆ رۆیشتن بۆ ئەو دنیا و منیش گوێ رایەڵم و ئەچم بەدەنگ ئەو بانگەوە، من لەناوتان دا دوو شتی قورس بەجێ ئەمێڵم: نامەی خوا و ئال و بەیتم، کەواتە سەرنج بدەن و بزانن کە چۆن لەمن بەجێ ئەمێنن و چۆن ئەکەن دەربارەیان، ئەو دوانە لە یەکتر جوێ نابنەوە و هەتا دێن بۆلای لەسەر(حوض المورود)، خوا یارمەتی دەرو دۆستی منە، من دۆست و یارمەتی دەری هەموو بڕواداریکم، ئینجا دەستی علی گرت – کرم الله وجهه – ئینجا فەرموی: هەرکەس من دۆست و یارمەتی دەری بم ئەمەیش دۆست و یارمەتی دەری یەتی، ئەی خوایە دۆست و یارمەتی دەری هەرکەسێك بە کە دۆست و یارمەتی دەری یەتی، وە دوژمنایەتی بکە لەگەڵ هەرکەس کە دوژمنی یەتی، ئینجا زەید ئەفەرموێ: لە ژێر ئەو دارانەدا هیچ کەسێك نەبووە کە بە چاوی خۆی نەیدیبێ و بەگوێچکەی خۆی نەیبیستبێ. برادەرانی شیعە ئەمە ئەکەن بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە جێنشینی یەتی پێغەمبەر(ﷺ) پاش خۆی هەر ئیمامی علی یە و ناهەق و ناڕەوایە جێنشینی هەرکەسێکی تر، ئینجا پاش ئەم جێنشینی ئەڕوا بۆ ئیمامی حسن و ئینجا بۆ ئیمامی حسین و ئینجا بۆ کوڕ و نەوەکانی تا ئەگاتە ئیمامی دوانزە کە پێی ئەڵێن ئیمام محمدی غائب کە خۆی شاردەوە لە سەردابەکەی سامەڕادا تا نزیکی دواهاتنی ئەم جیهانە، ئەو کاتە دێتە دەرەوە خۆی ئاشکرا ئەکات و ئیتر بەجارێ هەموو کەس ئەکەوێتە شوێنی و هەموو کەس موسڵمان ئەبێ، بەو جۆرو شێوەی کە بەدرێژیی لە کتێبەکانی خۆیان دا نووسراوەو هەموو شیعەیەك بڕوای لەسەر ئەوە دائەمەزرێنێ. ئینجا پێش ئەوەی کە دەست بکەین بە لێکۆڵینەوە لەگەڵ برادەرانی شیعە چاك وایە راو بیروباوەڕی زۆربە و کۆمەڵ و جەماوەری ئوممەت باس بکەین کە ناو ئەبرێن بە ئەهلی سوننەت، لەم چەند خاڵانەدا:

ا- ئیمامی علی – خوای لێ رازی بێت – هەرلەمنداڵی یەوەموسڵمان بوولەژێرچاودێری و پەروەردەی تایبەتی پێغەمبەردا(ﷺ) وە لە ماڵی پیرۆزی ئەودا پێگەیشت و گەورەبوو.

ب- هەر لەو کاتی منداڵی یەوە تا هەموو ماوەی ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) جێگەی میهرەبانی و رەزامەندی ئەو بووە.

ت- یەكێ بووە لە پێشكەوتوو و یەكەم دەستەی ئەم ئوممەتە كە خوا لەوان رازی بووە و ئەوانیش لەخوای خۆیان رازی بوون بە دەقی ئایەتی سورەتی(التوبة).

پ- خاوەنی زانین و بەهرەو هونەرێكی تایبەتی بووە تا رادەیەك زانایان ئەفەرمون: سێ سەد ئایەت هاتووەتە خوارەوە لە شانی دا. وە ئیمامی ئەحمەد ئەفەرموێ: ئەوەی لە شانی ئەوداهاتووەلەئایەت وحەدیس، لەشانی هیچ كەسێكی ترلەهاوەڵەكان نەهاتووە.

ج- ئیمامی علی - خوای لێ رازی بێت - لە هەموو بارو روویەكەوە شیاو و شایستەی جێنشینی بووە، ئەگەر یەكەم جێنشین بوایە ئوممەتی بە رێگە راستەكەی خوادا ئەبرد، وەك ئیمامی ئەحمەد لە ئیمامی عەلی یەوە حەدیسێ ئەهێنێ كە ئەوەی تیایە: ئەفەرموێ: عەرزی پێغەمبەر(ﷺ) كرا ئایا كێ بكەین بە فەرماندار و كاربەدەست لە پاش تۆ؟ ئەویش فەرموی: ئەگەر ئەبوبەكر بكەن دەستتان ئەكەوێ بە پیاوێكی پاك كە دنیای ناوێ و حەزی لە رۆژی دوایی یە، ئەگەر عمر بكەن دەستتان ئەكەوێ بە پیاوێكی بەهێزی پاك كە لە رێی رەزامەندی خوادا ناترسێ لە رەخنەو تانەی هیچ رەخنەگر و تانە دەرێ، ئەگەر علی بكەن - وە لام وا نی یە بیكەن - دەستتان ئەكەوێ بە كەسێكی رێنموونی كەری رێنموونی كراو كە بە رێگەی راست دا بتانبات.

ح- بەهیچ جۆر داوای جێنشینی نەكرد و لەپاش دیاریی كردن و هەڵبژاردنی جێنشین هیچ شتێك رووی نەئەدا، ئەوەتا(سعدی كوری عبادة) داوای كرد و ئەندازێ بەربەرەكانیشی بۆ كرد و نەیش كرا و هیچ شتێكیش رووی نەدا، كەواتە داوا نەكردنی لەبەر ئەوە بووە خۆی نەیویستووە، ئەگەر بیویستایە و بەلایەوە باش بوایە داوای ئەكرد، چونكە هیچ مەترسی یەكی تیا نەبوو، ئەگەر خوا نەخواستە جێی مەترسی بوایە ئەوا لە هەركام لە هاوەڵەكان بەهێزترو بەدەسەلات تر بوو، بێجگە لەوەی كە خوا ترس و بیمی تیادا دروست نەكردبوو.

خ- بێگومان ئەم پێغەمبەرو ئوممەتە گەورەتر و بەرێز تری هەموو پێغەمبەرو ئوممەتەكانی تر بوون، كەواتە ئەم بارە باشتر و خێر تر بوو كە خوا هەڵی بژارد بۆ ئەم ئوممەتە، ئەگەر بەرژەوەندی ئەم ئوممەتە لە غەیری ئەو بارەدا بوایە خوا ئەوەی ئەكرد، بێگومان هەموو ژیرێ ئەزانێ دیاریی نەكردن و هەڵنەبژاردنی ئیمامی عەلی ئەوە نیشان ئەدا كە ئیسلام ئەوپەڕی رادە دوورە كە كاربەدەستی و حوكمڕانی رەوا بدا بە شێوەی پادشایەتی و بە كەلەپوور وەرگیرێ، بەڵكو ئەبێ بە شێوەی یەكسانی و هەڵبژاردنی

روت بیَ، دەی هەر ئەمە بۆ ئێمە بەسە کە بیکەین بە هۆ و بەرژەوەندی لە دیاریی نەکردن و هەڵنەبژاردنی ئیمامی علی دا.

د- پێغەمبەر(ﷺ) کەسی دیاریی بکردایە، بێگومان ئەو دویاریی کردنە دەنگی ئەدایەوەو بەناوبانگ ئەبوو و نەئەشارایەوە، دەی لە ڕۆژی کۆبوونەوەی هاوەڵەکان لەو شوێنەدا کە پێی ئەوترێ (سقیفەی بنی ساعدە) – کە کۆبوونەوەیەکی ئاشکرا و بەربەرەڵاش بوو – بۆ تەگبیرو راوێژ لەسەر دیاریی کردنی جێنشین، لە پاش دەمە قاڵێ و لێکۆڵینەوەیەکی زۆر ئەبوبەکر دیاریی کرا – خوا لیَ ی رازی بێت – هیچ شتێکی ئاشکرا نەبوو کە بکرێ بە بەڵگە بێجگە لەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) لە پێش لە دنیا دەرچوونی کردی بە ئیمام و پێش نوێژی بەو سپارد، هاوەڵەکانیش فەرمویان ئەو هەڵیبژارد بۆ پێشەوایی بچوك – واتە پێش نوێژیی – ئەوا ئێمەیش هەڵی ئەبژێرین بۆ ئیمامەت و پێشەوایی گەورە، کەواتە ئەگەر کەسێکی دیاریی بکردایە هیچ پێویست نەئەبوو بە تەگبیرو راوێژ و دەمە قاڵێ، بەڵکو بە بیَ گیرو گرفت و سەر لیَ کردنەوە پەیمان ئەدرا بە دیاریی کراوەکەی پێغەمبەرەکەیان(ﷺ) کە لەگەڵیان و سەر وماڵیان خۆشەویست تر بوو بەلایانەوە و هەرگیز لایان نەئەدا لە فەرمانی، لە هیچ ئوممەتێکی تردا بە وێنەی ئەوانە دەست نەکەوتووە لە فەرمانبەریی و گویَ رایەڵی دا، هەرکەس رێزی خۆی بەلاوە بێت هەرگیز گومانی ئەوە نابات کە ئەو کۆمەڵە بەختیارە بە جاریَ یەك کەوتبن و یەکیان گرتبیَ لەسەر نافەرمانی و شاردنەوەی ئەو دیاریی کردنە!! کەواتە شتێکی ئاشکرایە کە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) هیچ کەسێکی دیاریی نەکردووە، مەگەر ئەو پێش نوێژیی پیَ سپاردنە کە هاوەڵەکان کردیان بە بەڵگە لەسەر راست و رەوایی جێنشینی ئەبوبەکر – خوا لیَ یان رازی بێت –.

ژ- حەدیسی ترمزی کە لە(حذیفە) وە ئەیهێنیَ کە عەرزی پێغەمبەریان کرد(ﷺ): خۆزگە جێنشینت دائەنا، ئەویش فەرموی: ئەگەر کەسیَ بکەم بە جێنشین و ئینجا ئێوە نافەرمانی بکەن و گویَ رایەڵ نەبن سزا ئەدرێن، کەواتە کەس دیاریی ناکەم. بەڵام(حذیفە) هەر قسەو هەواڵێکی پێدان بڕوای پیَ بکەن، وە عبدالله هەر جۆر قورئانی پیَ خوێندن وەری گرن و بیخوێنن.

لەپاش ئەم خاڵانە ئینجا دێینە سەر لێکۆڵینەوە لەم مەسەلەدا لەگەڵ برادەرانی شیعە، بە شێوەیەکی راستی و بەدوای راستی دا گەڕان، بە بیَ لایەنگیریی و رەگەزایەتی بەکار هێنان،

به یارمەتی خوای گەورە: هەرچەند لەم مەسەلەدا زۆر زۆر قسە وباس و لێکۆڵینەوە کراوەو بەتایبەتی باس کراوە لە کتێبەکانی(عقائد) دا بەڵام بە بۆنەی ئەم ئایەتەوە حەزم کرد هێندێك بدوێم بە شێوەیەکی زۆر نەرم و ناسك کە بۆنی دووبەرەکی لێ نەکرێ. وە نەیکەم بە موجادەلە و دەمە قاڵێ، هیوادارم کە رێم لە بارە راستەقینەکە کەوتبێ، کەواتە با باش سەرنج بدرێ. ئەوان ئەڵێن و لایان وایە: کە لەلایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) بەفەرمانی خوا ئیمامی عەلی دیاریی کراوە بە جێنیشین و کاربەدەست بەسەر ئوممەتەوە. ئەڵێن ئەم ئایەتەی کە تێپەری کرد هاتووەتە خوارەوە لەبارەی جێنشینی علی یەوە – کرم الله وجهه –، مەبەست بە ﴿مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ﴾ گشتی نی یە لێرەدا، بەڵکو ئەو شتە تایبەتی یەیە: واتە ئەی پێغەمبەر راگەیەنە ئەو جێنشینی علی یە کە هێنراوەتە خوارەوە بۆلات لەلایەن پەروەردگارتەوە، چەند ریوایەتێك ئەهێنن کە مەبەست ئەوەیە:

١- لە(ئەبو جعفر و ئەبو عبدالله) وە کە خوا سروشتی کردە لای پێغەمبەر(ﷺ) بەمەی علی بکات بە جێنشین، ئەویش مەترسی کرد کە ئەوە قورس بێت لە دڵی دەستەیەك لە هاوەڵەکانی دا و پێ یان ناخۆش بێت، بەهۆی ئەوەوە خوا ئەم ئایەتەی نارد بۆ هاندانی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر راگەیاندنی ئەو فەرمانەو ئەویش رایگەیاند.

٢- وێنەی ئەم ریوایەتە ئەهێنن لە(ئیبن و عەباس) ەوە – خوا لێ یان رازی بێت – لەم ریوایەتەدا ئەمەش هەیە کە لە رۆژی(غدیر خم) دا هەڵسا بەو فەرمانە، هەروەها ئەم وێنەیە ئەهێنن لە(ئەبو حاتەم و ئیبن و مەردەویە و ئیبن عساکر) و ئەوانیش لە(ئەبو سعیدی خدری) یەوە، وە(ئیبن و مەردەویە) لە(ئیبن و مەسعود) وە ریوایەت ئەکات کە فەرمویێتی: ئێمە لە چەرخی پێغەمبەردا(ﷺ) ئەم ئایەتەمان بەم جۆرە ئەخوێندەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥ﴾.

به کورتی ئەوەی کە پشتی پێ ئەبەستن بۆ ئەو مەبەستە و بنەرەتە بۆ تایبەتی کرتدنی وێنەی ئەم ئایەتە بە ئیمامی علی یەوە، هەواڵ و ریوایەتەکانی(غدیر خم) ە کە بێجگە لەو ریوایەتانەی کە باسمان کردن چەند ریوایەتی تریان هێناوەو چەند شتی بێ تام و بێزراویان تیا هەیە، بەتایبەتی ئەوەی کە(سەعلەبی) هێناویەتی لە تەفسیرەکەی دا و تەفسیری منار ئەیگێرێتەوە لێ یەوە، کە ئاشکرایە دەست هەڵبەستە و درۆیە، چونکە لە چەند لایەکەوە دژایەتی تیایە و هێندێکی ئەوی تری ئەخاتەوە بە درۆوە، جا لەبەر ئەوە ئەو ریوایەتەم نەهێنا، بەڵێ ئەوەی کە پشتی پێ ببەستن ئەو هەواڵانەیە کە هێندێکمان باس کردن بە

تایبـەتی ئـەو ریوایەتانـەیان کـە وتەیـەکیان تیایـە سـەحیح و راسـت و رەوایـە لای ئـەهلی سـوننەتیش کـە پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمویـەتی: ﴿مـن کنـت مـولاه فعلـی مـولاه﴾ بـە پـێی ئـەو ریوایەتانە ئەو ئایەتانە بەو جۆرە تەفسیر ئەکەنەوەو تایبەتی یان ئەکەن و لە رووکەش و رواڵەتەکانیان لایان ئەدەن. ئینجا هەرکەسێك سەرکێشی نەکات و رەگەزایەتی بەکار نەهێنێ و بە دوای راستی دا بگەڕێ بێگومان دڵنیا ئەبێ بەم خاڵانەی خوارەوە و ئیتر دووبەرەکی بەکار ناهێنێ:

ا- شتێکی ئاشکرایە ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) هەرکەسێکی دیاریی بکردایە بە جێنشین هیچ کەسێك سەرپێچی و ملەجەڕێ ی نەئەکرد نە لەکاتی ژیانی پێغەمبەردا و نە لەپاش لەدنیا دەرچوونی، بە تایبەتی بۆ یەکێکی وەك ئیمامی عەلی کە ڕێزی تایبەتی بووە لەناو هەموو موسڵمانان دا، هەموو کەس دانی ناوە بە هونەر و گەورەیی ئەو زاتەدا کە نزیك ترین پیاو بووە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) لە هەموو بارێکیشەوە بە دەسەڵات تر بووە لە هەرکام لە هاوەڵەکان.

ب- ئەگەر جێنشینی دیاریی بکردایە رایئەگەیاند لە وتارو خوتبەکەی رۆژی عەرەفات و حجة الوداع دا، لەوێ دا ئەیفەرمو کە گەورەترین کۆڕ و کۆمەڵی موسڵمانان بوو لەو کاتەدا، وتارو فەرمودەکەیشی زۆر بە گرنگ گرتبوو، ئەوەبوو ئەوانەی هەموو کرد بەشایەت و داوای شایەتی لێ کردن لەسەر راگەیاندنەکەی، ئەوانیش هەموو شایەتی یان دا، ئینجا خوای کرد بە شایەت لەسەر ئەوە، فەرمانیشی دا کە ئەو کەسەی ئامادەی ئەو شوێنەیە وتارەکەی راگەیەنێ بەوانەی کە ئامادەی ئەوێ نین.

ت- ئەگەر ئیمامی علی بکردایە بە جێنشین لەسەر فەرمانی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) ئەو کاتە پێویست بوو لەسەری کە دەست بەجێ لە پاش پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسایە بە کاروباری جێنشینی یەکەی بە بێ پرس و راو گوێدان بە هیچ کەس، ئەگەر هەرکەسێك رازی نەبوایە و سەرپێچی بکردایە ئەبوو ئامۆژگاری بکردایە بە ئاراستە کردنی ئەو ئایەتە یان ئەو حەدیسەی کە پێی کراوە بە جێنشین، ئینجا ئەگەر هەر سەرپێچی بکردایە پێویست بوو لەسەری بە زۆری چەك هەوڵی بدایە بۆ مل کەچ کردنی، وەك بەو جۆرەی کرد کاتێ کرا بە جێنشین لەپاش عثمان - خوایان لێ رازی بێت - لەگەڵ ئەوەدا دیاریی کردنەکەیشی لەسەر بڕیاری ئەو کۆمەڵە بوو کە لەو کاتەدا ئامادەی مەدینە بوون، بەهیچ کلۆجێك بێ دەنگ بوونی دروست نەبوو، کەواتە بێ دەنگ بوون و داوا

نەكردنی لە چەرخی ئەو سیانە پێشووەدا، لەبەر ئەوە بووە كە جێنشینی یەكەی ئەوانی بەڕاست زانیوە، بێ دەنگ نەبوون و جەنگ كردنی لە پاش دیاریی كردنی خۆی، لەبەر ئەوەبوو جێنشینی یەكەی خۆی بەڕاست زانی و سەرپێچی ئەوانەی بە ناڕاست و ناشەرعی دانا كە جەنگی لەگەڵ كردن، بێ دەنگ بوونی لە چەرخی ئەو سیانەی پێشووەدا لەبەر تەقێ و ترێز نەبوو، چونكە ئەو خوا ترس و بیمی تیا دروست نەكردبوو، بە هیچ رەنگ نەبینراوە لێ ی كە سەر بكاتەوە لە پەلامار دانی هیچ ناهەقی و بێ شەرعی یەك، لە رێی خوادا باكی نەبووە لە هیچ رەخنە و تانەی هیچ رەخنەگر و هیچ تانەدەرێ، ئەگەر ئەو هەواڵی تەقێ و ترێزی بزانی پایە ئەبوایە لە چەرخی جێنشینی یەكەی خۆی باشتر تەقێ و ترێزی بكردایە، چونكە كاتەكە زۆر زۆر ناسك بوو و رەشی و تاریكی لاسەری موسڵمانانی گرتبوو، بە راستی ئەو كەسانەی كە ئەڵێن: لە كاتی ئەو سیانەدا تەقێ و ترێزی بەكار هێنا، ئەو كەسانە پایە و پلەی بەرزی ئەو شێری خوا پەرست و نزم ئەكەنەوە، بە تاوانبارو گوناهبار و ترسنۆك دەری ئەكەن، ئای چەندە شیرین و جوانی فەرمووە(ئیمامی حسنی مثنی) – خوا لێ ی رازی بێت – وەك(ئەبو نعیم) ریوایەتی كردووە و لێ یەوە: سوێند بەخوا ئەگەر خوا و پێغەمبەرەكەی(ﷺ) علی یان هەڵبژاردبێ بۆ ئەو كارە، وە علی – كرم الله وجهە – هەوڵ و هەڵمەتی نەدابێ بۆی، ئەبێ لە هەموو كەس تاوان و هەڵەی گەورەتر بێ، بەڕاستی مەردوم سەرسامە لەمەی كە چۆن شتی وا رەوا دراوە و بیرێك نەكراوەتەوە لەو تاوانە زۆر گەورەی كە خراوەتە ملی زاتی ئاوا؟!! چۆن رەوا درا كە حكومەتەكەی پێغەمبەر(ﷺ) لە پاش خۆی دەست بەجێ گەڕا بێ بە حكومەتێكی ناشەرعی ستەمكار – چونكە ئەگەر علی دیاریی كرابێ ئەبێ جێنشینی ئەو سیانە ناهەق و ناشەرعی بووبێ – ماوەی(٢٤) ساڵ ئەو تاوان و ستەمە درێژەی كێشابێ بە بەرچاوی علی یەوە،(علی) یش ملی داخستبێ وەك سەربازێك بە مل كەچی و گوێ رایەڵی و بە بێ ئەوەی دوو لێوە بكاتەوە و ناوچەوان بهێنێتە یەك بە دژی ئەو حكومەت و كاربەدەستە ناشەرعی یانە؟!! بێگومان هەر ئەم باس و لێكۆڵینەوەیە روون و ئاشكرا ئەبێتەوە كە بە هیچ كلۆجێك نابێ مەبەست بە حەدیسی ﴿من كنت مولاه فعلی مولاه﴾ دیاریی كردنی علی بێت بە جێنشین، وەك برادەرانی شیعە ئەڵێن و ئەیبڕن بەسەر ئەوەدا، بەڵكو پێویستە ببڕێت تەنها بەسەر باسی پایە و پلەی بەرزو هونەرێ كە خوا پێ ی

بەخشیوە، وەك چەند حەدیسێکی تر کە هاتووە دەربارەی لەو بارەیەوە. بەم رەنگە مەبەست بە(مولی) دۆست و خۆشەویست یان یارمەتی دەرە، واتە هەرکەس من دۆست و خۆشەویستی بم(علی) ش دۆست و خۆشەویستی یەتی، یان هەرکەس من یارمەتی دەری بم(علی) ش یارمەتی دەری یەتی. لە هێندێ ریوایەتەوە وا دەرئەکەوێ کە ئەم حەدیسە هاتبێت لەبارەی پاکێتی ئیمامی علی لە هێندێ رەخنە کە لێ ی گیراوە، یەکێ لەو ریوایەتانە ریوایەتی(محمدی کوری ئیسحاق) ە لە(یەحیای کوری عبدالله) ەوە ئەویش لە(یزیدی کوری طلحة) وە کە ئەڵێ: هێندێ لەو لەشکرەی کە لەگەڵ علی بوون کاتێ چوو بۆ سەر یەمەن بە گلەیی بوون لێ ی و بێزار بوون لەوەی کە بە کەم و کوری ئەیژیاندن و نەیئەهێشت هیچ شتێك سەرف بکرێ بە بێ پێویستی، یەکێکی تر لەو ریوایەتانە ئەمەیە کە(ئیبن و عەباس) ئەیگێرێتەوە لە(بریدەی ئەسلەمی یەوە) – خوا لێ یان رازی بێت – کە ئەفەرموێ: لەگەڵ علی چووم بۆ غەزای یەمەن، بینیم کە زۆر دەستی پێوە ئەگرت و بەخشینی کەم بوو، ئینجا کاتێ گەیشتمە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) باسی(علی) م کرد و شکاتم لە دەست کرد، ئینجا بینیم رووی پێغەمبەر(ﷺ) تێك چوو، ئینجا فەرموی: بریدە ئایا من شایستە تر و خاوەن ماف تر نیم بۆ بڕواداران، لە خۆیان بۆ خۆیان؟ منیش گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، ئینجا فەرموی: ﴿من کنت مولاه فعلی مولاه﴾ واتە هەرکەس منی گەرەك بێت ئەبێ(علی) شی گەرەك بێت. هەروەها چەند ریوایەتێکی تریش هەیە هەموو ئەوە ئەگرنەوە کە هێندێ زۆر بە گلەیی بوون لە ئیمامی علی لەو سەفەری یەمەنەدا، ئەو دادو یەکسانی و دەست پێوە گرتنەیان دائەنا بە ناهەقی و ستەم و چرووکی، بێگومان ئەو رەخنە گرانە هەڵەبوون و لەسەر ناهەق بوون لەو قسانەی کە کردیان دەربارەی کاتێ کە گەرانەوە لە یەمەن و هاتن بۆ ئەو حەجە لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) ئەویش کە گەرایەوە لە حەجەکەی لەو شوێنەی کە ناوی(غدیر خم) ە لای دا و خوتبەی دا بۆ ئەو موسڵمانانە و لە خوتبەکەی دا باسی هونەرو گەورەیی علی کردو بە پاك و خاوێن دەری کرد لەو شکات و قسە و باسانە، رەزامەندی و خۆیش ویستن و دۆستایەتی خۆی دەربڕی لێ ی بە جۆرێك کە پێویستە لەسەر بڕوادارانیش وابن لەگەڵی. ئینجا کاتێ کە بەو هەموو باس و لێکۆڵینەوە دەرکەوت هیچ حەدیسێك نی یە کە بەڵگە بێت لەسەر جێنشینی

ئیمامی علی – کرم الله وجهه – کەواتە با بگەڕێینەوە بۆ سەر ئەم ئایەتەش هێندێ لێکۆڵینەوە لەویش دا بکەین:

١- بێگومان بە پێی هێندێ ریوایەت ئەم ئایەتە و وێنەی لانەدرێن لە رووکەش و رواڵەتەکانیان، ئەی کاتێ ریوایەتەکان بەو جۆرە بوون کە باس کران، دەرکەوت کە هیچ دەقێکی حەدیس نی یە لەسەر ئەو جێنشینی یە – ئایش گونجێ ببێ – کاتێ کارەکە بەو جۆرەیە، ئیتر بە هیچ رەنگ دروست نی یە لادانی ئایەتەکە لەرووکەشەکەی، بێجگە لەوەیش بڕینی ئەو ئایەتە بەسەر مەسەلەی جێنشینی دا هێنینەوەو پەیوەستی ئایەتەکە ئەپچڕێ لە ئایەتەکانی پاش و ئایەتەکانی پێشی یەوە، چونکە مەسەلەی جێنشینی هیچ پەیوەندی یەکی بە مەبەستی هیچ کام لەو ئایەتانەوە نی یە، وەك ئاشکرایە بۆ هەر کەسێك کە بیرێك بکاتەوەو سەرنجێکی ئەو ئایەتانە بدات، ئەو پچڕینەش لە وتراو و وتاری بەندەیشدا، ناگونجێ لەگەڵ رەوانبێژیی و یاسای رەوانبێژیی یان دا، چ جای قورئان کە پاك و بێگەردە لە هەر لەکەو رەخنەو لەنگێك بە وێنەی پاکی و بێگەردی ئەو خوایەی کە ئەم قورئانەی نارد، کەواتە پێویستە لەسەرمان کە تەفسیری ئەو ئایەتە بەو جۆرە نەکەینەوەو نەیبڕین بەسەر ئەو مەسەلەدا، بەڵکو ئەڵێین: ئەم ئایەتە فەرمان ئەدات بە راگەیاندنی گشتی و لەسەرەتای هاتنی ئیسلامەوە هاتووە، وەك لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد کە ئەوە رای کۆمەڵێکە لە زانایانی چینی یەکەمی تەفسیر، بە تایبەتی ئەگەر ئەم حەدیسە سەحیح بێ کە(ئیبن و مەردەویە و ضیاء) ئەیگێڕنەوە لە(ئیبن و عباس) ەوە – خوایان لێ رازی بێت – ئیتر رێگەی هیچ قسەیەك نامێنێ و ئەبێ هەر فەرمان بێت بە راگەیاندنی گشتی، ئەفەرموێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەر(ﷺ) کام ئایەت کەلە ئاسمانەوە هات بەتین تر بوو لەسەرت؟ ئەویش فەرموی: لەمینادا بووم لەکاتی کۆبوونەوەی مەردومان دا، بت پەرستەکانی عەرەب و لە هەموو جۆرەکانی تر کۆبووبوونەوە، ئینجا جوبرەئیل هاتە سەرم و گوتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ﴾، ئەفەرموێ: منیش هەستام لای عقبەدا و گوتم: ئەی مەردومینە ئایا کێ یارمەتیم ئەدات لەسەر ئەوەی سپێردراوەکانی خوای خۆیم بگەیەنم و بەهەشت بۆتان بێت؟ ئەی مەردومەکان بڵێن(لا إله إلا الله و انا رسول الله إليكم)، ئەگەر وا بڵێن ئەگەن بە ئامانج و سەرئەکەون و بەهەشتیشتان بۆ ئەبێ. ئەفەرموێ: ئینجا لەوێ دا هیچ پیاو و ئافرەت و کەنیزەك و هیچ منداڵێ نەما

مەگەر هەموو خۆڵ و بەردیان تێ گرتم و وتیان: ئەمە درۆزنە و لە ئایینی خۆی هەڵگەڕاوەتەوە. ئینجا فریشتەیەك خۆی دەرخست لێمەوەو گوتی: یان بە خەتەرەیەك هات بە دڵم دا و گوتی: ئەگەر تۆ پێغەمبەری خوای ئەوا کاتی ئەوەیە کە نزا بکەیت لە گەلەکەت هەرچۆنێ نوح نزای کرد لە گەلەکەی بە نەمان و لەناوچوون، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: ئەی خوایە ڕێنموونی گەلەکەم بکە، چونکە نازانن و نەفامن. من زاڵ بکە بەسەریان دا بەمەی گوێ ڕایەڵیم بکەن بۆ پەرستن وگوێ ڕایەڵی تۆ، ئینجا عباسی مامی دێت و رزگاری ئەکات لێ یان و ئەوان دوور ئەخاتەوە لێ ی. ئەگەر بە پێ ی ئەو راو ریوایەتانە ئەم ئایەتانە تەفسیر نەکەینەوە و نەڵێین فەرمان ئەدا بە راگەیاندنی گشتی بە هەمووان، ئەگەر بەو جۆرە نەکەین، ئەو کاتە بە پێ ی شوێنەکە ئەڵێین: مەبەست فەرمانە بە راگەیاندنی ئەو ئایەتانەی داهاتوو بە نامەدارەکانی رابوردوو وەك ئایەتەکە هەرکام لەم ئایەتانە ئەدا بە بەنۆکەی دڵیاندا و دایان ئەچڵەکێنێ دنیایان لەسەر تاریك ئەکات و ئەوپەڕی خەشم و قینیان ئەهێنێتە جۆش. ئاشکرایە کە راگەیاندنی شتی وا و ڕووبەڕوو وەستانیان قورس و گرانە و پێویستی هەیە بەم فەرمانە تایبەتی یەی کە تێپەڕی کرد،

قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَسْتُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ ۗ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا ۖ فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٦٨﴾

---

به تایبەتی بۆ راگەیاندنی ئەم ئایەتەی کە دێت بە دوای دا و ئەفەرموێ: ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ئەی نامەدارەکان ﴿لَسْتُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ﴾ ئێوە لەسەر هیچ شتێك نین، واتە هیچ ئایینێك کە گوێی پێ بدرێ و شایستە و شیاوی ئەوە بێت ناو ببرێ بە ئایین ﴿حَتَّىٰ تُقِيمُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ﴾ هەتا بە رێك و راست تەورات و ئینجیل نەگرن و پەیڕەوی رەفتاری پێ نەکەن کە ئەوەش داخوازە بۆ ئەوەی بە رێکی بڕوا بێنن بەم پێغەمبەرە(ﷺ) کە ناو و نیشانیان تیایە و موژدەیان داوە بە هاتنی و پەیمانیان لێ وەرگیراوە بە بڕوا هێنان و پەیڕەوی کردنی. ﴿وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ﴾ بەرێکی پەیڕەوی و رەفتار نەکەن بەوەی کە هێنراوەتە خوارەوە بۆلاتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە – واتە قورئان – کە بۆ هەمووان هاتووە یانی نامەکانی تری پێغەمبەرەکانیان یان هەموو نامەکانی تری خوا، بەهەرکام مەبەست بێت ئەوە ئەگەیەنێ کە هیچ ئایینێکیان نی یە هەتا نەکەونە شوێنی ئیسلام و پەیڕەوی ئەم پێغەمبەرە نەکەن(ﷺ) وەك لە پێشەوە باس کرا لە کاتی تەفسیری ئایەتی(٦٩) لەم سورەتەدا. هەرچەند ئەو نامەدارانە خۆیان بە بڕوادار و خاوەن نامە دائەنا، بەڵام ئەوەتا قورئان دان نانێ بە هیچ شتێك کە ئەوان لافیان لێ ئەدا پێی بۆ خۆیان، چونکە ئایین، نە وتەو قسەی رووتە کە بەدەم بگوترێ، نە نامەیە بخوێنرێتەوە بە ئاوازەو دەنگ لەراندنەوە، نە ناو و نازناوێکە بە کەلەپوور و وەرگیرێ و بڵاوبێتەوە، بەڵکو ئایین بەرنامەی ژیانە، بەرنامەیەك کە لە بڕواو عەقیدەی دەروونی یەوە دەست پێ ئەکات تا هەموو خو و رەوشت و کردەوەکان لە هەموو بارو رووبەکی ژیانەوە، ئەبێ هەموو ئەمانە دامەزرێن و داڕێژرێن لەسەر ئەو بەرنامەیە. دەی کاتێ کە ئەو نامەدارانە ئایینەکەیان بەو شێوە نەگرت، بەڵکو بە ئارەزوو دەست کاری یان کرد و هەرچیان بە دڵ نەبوو وازیان لێ هێنا و پشت گوێ یان خست، لەبەر ئەوە خوا هیچی لێ وەرنەگرتن و قورئان دانی نەنا بە هیچ شتێك بۆیان لەبارەی ئایینەوە، چونکە بڕوا نەبوون بە هەر هێندێ وەك بڕوا نەبوونە بە هەمووی بەلای خواوە، بێجگە لەوەیش هەر ئەندازێکیان هێشتبێتەوە لەبەر خوا نەبووە، بەڵکو بەرژەوەندی خۆیان تیا بەدی کردووە. کەواتە واز لێ هێنراو و واز لێ نەهێنراو هەر بە ئارەزوو کاریی

بووە نەك لەبەر خواو گوێ ڕایەڵی خواو پەیڕەوی فەرمانی خوا، کەواتە هیچ شتێك لە ئایین و عەقیدەو بڕوایان لانەبووەو بە دەستیانەوە نەبووە. ئینجا دڵنیایی ئەکات لەسەر ئەوپەڕی سەرکێشی و یاخی بوونی زۆربەی ئەو نامەدارانە تا ئەو رادەیە کە بە ناردنی ئەم قورئانە و راگەیاندنی سەرکێش ترو یاخی تر ئەبن. ئەم قورئانەی کە بەتین و بەهێزترین بەڵگە و رابەرە، لەگەڵ ئەوەدا خوا فەرمانی دا بەو راگەیاندن و روو بە روو وەستانە کە زۆر سەخت و بەتین بووە لەدەروونیان دا، چونکە کاردروستی خوا لەوەدایە کە بە روونی و بە بێ پێچ و وتەی هەق و راست راگەیەنرێ، ئینجا کێ وەری گرێ وەری گرێ و هەرکەس دژە و وەری ناگرێ هەر با دژ بێ و وەری نەگرێ، پێویستە ئەو راگەیاندنە تا ئەوەی وەری ئەگرێ و رێی راست ئەداتە بەر بە زانین و بە روونی وەری گرێ و بیداتە بەر، ئەوەی کە وەری ناگرێ بە روونی و بە زانینەوە وەری نەگرێ و رێی لارو چەوت بداتە بەر، هیچ بڕو بیانوویەکی نەمێنێ، ئەفەرموێ: ﴿وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَانًا وَكُفْرًا﴾ سوێند بەخوا ئەوەی کە هێنراوەتە خوارەوە بۆلای تۆ زۆر لەوانە زیاد ئەکات لە بارەی سەرکێشی و بێ بڕوایی یەوە، ئینجا دڵنەوایی پێغەمبەر ئەکات(ﷺ) لەسەر ئەوە، ئەفەرموێ: ﴿فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ کەواتە غەمبار و دڵ غەمگین مەبە لەسەر گەل و کۆمەڵی بێ بڕوایان، کاتێ کە بەو جۆرە ئەیانبینی، چونکە سووچ لە خۆیانەوەیە، خۆیان شیاو و شایستەی ئەوەن خۆیان وتەی راست و هەقیان ناوێ و بێزارن لێ ی، دڵ و دەروونی خۆیان خێرو چاکەیان ناوێ، کەواتە لێزانی و کاردروستی خوا داخوازە بۆ ئەوەی وتەی هەق و راستی بدرێ بە ناوەڕاستی دڵ ودەروونیان دا تا ئەوەی شاراوەیە تیایان دا دەرکەوێ، سەرکێشی و یاخی بوونەکەیان ئاشکرا ببێ، شایستەی تۆڵەی سەخت و سامناکی خۆیان ببن! ئەم ئایەتە دەست نیشانمان بۆ ئەکات بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە:

أ- لەپاش هاتنی ئیسلام و قورئان نابێ دان بنرێ بە هیچ ئایینێکی تردا، هیچ کەس بە خاوەن ئایین دانانرێ بێجگە لە کەسێك کە بە رێکی بڕوای هێنابێ بە ئیسلام و بە قورئان، کەواتە – وەك لە پێشەوە بە درێژیی گوتمان – دروست نی یە بۆ موسڵمانان دۆستایەتی و سوێند خواری بکەن لەگەڵ گاورو جوولەکەدا بە دژی بێ بڕواو ماددی یەکان، بەناوی ئەوەوە کە ئەوان ئایین دارن و ئەمان بێ ئایین، چونکە ئەوا قورئان بڕیاری ئاشکرای دا لەسەر بێ ئایینی گاورو جوولەکە هەتا تەورات و ئینجیل بە رێك

و راستی نەگرن و پەیڕەوی ئەو دووانە نەکەن کە پەیڕەوی راستی ئەوانە بەمە ئەبێ کە بە رێکی پەیڕەوی قورئان بکەن.

ب- پێویستە لەسەر موسڵمانان کە بە ئاشکرا و بە بێ پێچ و پەنا ئەو وتە راستەی کە ئایەتەکە فەرمانی پێ دا، هەموو موسڵمانێ بڕوای لەسەری بێ و بە زمان بیڵێ و بە ئاشکرا ئاراستەی گاورو جوولەکەی بکات، هەرچەند بەو وتەیە ئەوان ئاڵۆز بن و زیاتر یاخی و سەرکێش بن و دوژمنایەتی و پیلانیان بەتین و بەهێزتر بکەن، هەرچەند لە ژمارەو چەك و دەسەلأت دا چەند قات و چەند چەندانە بن. بەڵێ پێویستە بانگ کردنی مەردوم بۆ ئیسلام و رێگەی خوا بە نەرم و نیانی و ئامۆژگاریی شیرین بێت، بە لێزانی و کاردروستی بکرێ، بەلأم ئەوە جیاوازە لەگەڵ راگەیاندنی ئەوەی کە پێویستە راگەیەنرێ، ئەوەی کە پێویستە راگەیەنرێ ئەبێ بە روونی و بە بێ قۆرت و گرێ و بە بێ دەمە پێچە راگەیەنرێ، ئیتر شێوەی راگەیاندنەکە جۆر بە جۆر ئەبێ بە پێی لێزانی بانگ کەرەکە و بەرژەوەندی ئیسلام، بۆ نموونە: بت پەرستەکان ئەو هەموو هەوڵ و تەقەلایان دا بۆ ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەندە باسی پڕوپووچی بتەکانیان نەکات و خۆیان و باوك و باپیریان بە گومڕایی دەرنەکات، ئیتر چی ئەکات بیکات و چۆن خواپەرستی ئەکات بیکات، بەلأم ئەو هەوڵی ئەوانە هیچ سوودی نەبوو، رۆژێ لە رۆژان وازی نەهێنا و هیچ جۆرە کەم و کوڕی یەکی بەکار نەهێنا لەو مەسەلەدا کە ئەوانی پێ ئاڵۆز ئەبوون وزۆریان یاخی تروسەرکێش ترئەبوون پێی، بەلأم لەهەمان کاتدا شێوەی باس کردنەکەی بەو جۆرو شێوە راست و رەوا و شیرینە بوو کە خوا فێری کردبوو.

ت- ئەوەی کە دەربارەی نامەداران هات لەم ئایەتەدا شتێکی ئاشکرایە بۆ ئەم ئوممەتەیشە، واتە ئەوانەی کە قورئان بە رێك و پێکی راناگرن و هەموو حەرامەکانی حەرام نەکەن و هەموو حەلأڵەکانی حەلأڵ نەکەن لە هەموو بارو روویەکەوە، ئەوانەش بە وێنەی گاورو جوولەکەکان لە ئایینی خوا دەرچوون و هیچ ئایینێکیان نی یە کە بە شت دابنرێ و شایستەی ئەوەبێ کە بە ئایینی خوا ناوببرێ. هەرچەند لاف ئایین داریی لێبدات، خوا ئەیخاتەوە بە درۆوە.

إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـُٔونَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٩﴾ لَقَدْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ رُسُلًا ۖ كُلَّمَا جَآءَهُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُهُمْ فَرِيقًا كَذَّبُواْ وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ ﴿٧٠﴾

ئینجا باس و بڕیارێك دەرئەكات لەبارەی ئەو ئایینەی كە خوا وەری ئەگرێ لەمەردومان بە شێوەی گشتی، ئیتر لە هەر میللەت و تیرەو بەرەیەك بن، هەر بیرو باوەڕ و مەزهەبێكیان بۆ خۆیان دانابێ لە پێش هاتنی ئیسلام و لە پاش هاتنی ئیسلام،ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی كە بڕوایان هێناوە، ئیتر بە دەمی رووت وەك ناپاكان، یان بەدڵیش، ﴿وَٱلَّذِينَ هَادُواْ﴾ ئەوانەی چوونەتە ئایینی یەهودیتی ﴿وَٱلصَّٰبِـُٔونَ﴾ ئەم تاقمە بە چەند جۆرێك تەفسیر كراوەتەوە، ئەوەی كە زۆرتر بچێتە دڵەوە ئەوەیە ئەوانە تاقم و كۆمەڵێك بوون لە پێش هاتنی ئیسلام دا بت پەرستی یان نەئەكرد و هەر خوایان ئەپەرست و بە بێ ئەوەی مەزهەبێكی دیاریی یان بۆ خۆیان دانابێ، لەناو عەرەبیش دا تاك و تەرایەكیان هەبوو ئەمانەش ﴿وَٱلنَّصَٰرَىٰ﴾ ئەوانەی كە ناو ئەبرێن بە شوێن كەوتوی حەزرەتی عیسا(علیه السلام) ﴿مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ﴾ هەركەس لەوانە بڕوای هێنابێ بەخواو بە رۆژی دوایی ﴿وَعَمِلَ صَٰلِحًا﴾ كردەوەی چاكی كردبێ و لەسەر ئەو بارە بمرن و لەم جیهانە دەرچن. بێگومان شتێكی ئاشكرایە كە مەبەست بەو بڕواو كردەوە چاكە ئەمەیە كە ئەبێ بە گوێرەی ئەم دواترین ئایین و شەریعەتە بێت، هەركەس لەوانە بەم جۆرە بێ ﴿فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ نە هیچ مەترسی یەكیان لەسەر ئەبێ، نە غەمبار ئەبن لەرۆژی دوایی دا، ئەم بڕیارەی كە ئەم ئایەتە دای یەكێكە لەو بڕیارو بەندانەی كە لەم شەریعەتەدا زانراون بە ئاشكرا، پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك بە بێگومان بڕوای پێ ی ببێ، بە بێ گیرو گرفت و پێچ و پەنا بیلێ و هیچ دەمە پێچەی تیا نی یە. ئینجا بەشێك لە مێژووی جوولەكە ئەخاتە بەرچاو كە هەر لە كۆنەوە هەڵوێستی بەدو خراپیان بووە دەربارەی پێغەمبەرە تایبەتی یەكانی خۆیشیان!

کەواتە ئەو هەڵوێستە بەدەیان دەربارەی ئیسلام و فروستادەی ئیسلام یەکەمجارو دواترین جار نی یە، بەڵکو هەر پیشەی کۆنیانە، ئەفەرموێ: ﴿لَقَدْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ سوێند بەخوا وەرمان گرت پەیمانی بەهێزی ئیسرائیلی یەکان لە تەورات دا، بەمەی کە بە پێی تەورات رەفتار بکەن، بەڵام وەك چەند جارێك باس کرا پەیمانەکەیان شکاند و بە دژو پێچەوانەی جوڵانەوە، ﴿وَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ رُسُلًا﴾ ناردمان بۆلایان چەند نێرراو فروستادەیەك کە ئامۆژگاری یان بکات و فێری ئایینی خوایان بکات، کەچی دەربارەی ئەو فروستادانە و کردەوەیان لەگەڵیان بەم جۆرە بوو: ﴿كُلَّمَا جَآءَهُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُهُمْ﴾ هەرجارێ فروستادەیەك بهاتایە بۆلایان هەر فەرمانێ کە بە دڵیان نەبوایە و نەفسیان ئارەزووی نەکردایە، سەرکێشی یان ئەکردو دوژمنایەتی یان بەکار ئەهێنا بەم رەنگە﴿فَرِيقًا كَذَّبُوا﴾ دەستەیەکیان بە درۆزن دائەنان و بروایان پێ نەئەهێنان ﴿وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ﴾ دەستەیەکیشیان ئەکوشتن، وەك لە ئایەتی(٧٨) ی سورەتی(البقرة) دا بەدرێژیی باس کرا. هەرچەند کوشتنەکەش رابردووە بە وتەی ئێستا باسی کرد: ﴿يَقْتُلُونَ﴾ نەیفەرمو: ﴿و فريقا قتلوا﴾ بۆ ئەوەی ئەو شێوە بەد و دڵتەزێنە بخاتە بەرچاو تا سەرزەنشتەکەیان بەهێز تر ببێ و تەشەرو تانە لێدانەکەیان بەتین تر ببێ، مێژووی ئیسرائیلی یە هەر ئاوا بەدو خراپ هاتووە، وەك قورئان لە چەند شوێن دا باسیان ئەکات. جا رەنگە ئەو هەموو باسە بۆ ئەمە بێ ئەم ئوممەتە بترسێ و خۆی بپارێزێ لەو کردەوە بەدانە، لەبەر ئەوەی خۆیان لادەن لە شوێنی هەڵخلیسکان لە رێگەی خوا، یان لەبەر ئەوە بێ ئەو ئیسرائیلی یانەی ئێستا کە قورئان ئەو کردەوە بەدانەی پێشووەکانیان ئەدا بە ناوچاوانیان دا، ئەمانەی ئێستا بیرێك بکەنەوەو تەمێ خوار بن و رێبازی ئەوان نەدەنە بەر، یان لەبەر ئەوە بێ کە بانگ کەران رێگەی خوا چاو بکەن لە پێغەمبەرەکانی ئیسرائیلی، کاتێ ئەمان وەك ئەوان رێ یان بکەوێ لە نەوەو خراپەکانی موسڵمانان و نەوەکانی ئیسرائیلی چی یان کرد ئەمانیش وا بکەن. چاو بکەن لەو پێغەمبەرانە و خۆگرو دامەزراو بن لەسەر بانگ کردنی خۆیان.

وَحَسِبُوٓاْ أَلَّا تَكُونَ فِتۡنَةٞ فَعَمُواْ وَصَمُّواْ ثُمَّ تَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ ثُمَّ عَمُواْ وَصَمُّواْ كَثِيرٞ مِّنۡهُمۡۚ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ﴿٧١﴾

---

ئەو ئیسرائیلی یە گومڕایانە ئەو هەموو تاوان و خراپەیان ئەكرد، لایان وابوو كە خوا دووچاریان ناكات و تۆڵەیان لێ ناسێنێ، وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَحَسِبُوٓاْ أَلَّا تَكُونَ فِتۡنَةٞ﴾ وایان ئەزانی و لایان وابوو كە تۆڵەو سزاو دووچار بوونیان نابێ لەلایەن خواوە، چونكە خۆیان بە كوڕو خۆشەویستی خوا دائەنا وەك(زجاج ئەفەرموێ)، یا لەبەر ئەوەی خوا ماوەو مۆڵەتی دان و بەزوویی دووچاری نەكردن، یا لەبەر ئەوەی لایان وابوو كە باوك و باپیرە چاكەكانیان تكایان بۆ ئەكەن وەك هێندێ ئەفەرمون. یان لەبەر هەر شتێكی تر ﴿فَعَمُواْ وَصَمُّواْ﴾ ئینجا كوێر بوون و كەڕ بوون، واتە دڵیان لە بینین و بیستنی هەق و بەڵگە و نیشانەكانی خوا و ئامۆژگاری نامەی خواو پێغەمبەرەكانی، بەهۆی ئەوەوە رەفتاریان نەكرد بە پێی رێنموونی یەكانی خوا تا خوا دووچاری كردن ﴿ثُمَّ تَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ﴾ لە پاشان خوا تۆبە و گەڕانەوەی لێ وەرگرتن، كاتێ كە بیریان كردەوەو تۆبەیان كرد ﴿ثُمَّ عَمُواْ وَصَمُّواْ كَثِيرٞ مِّنۡهُمۡۚ﴾ ئینجا لەپاش ئەوە زۆر لەوان كوێر و كەڕ بوون﴿وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ﴾ خوا بینایە بە هەر كردەوەیەك كە ئەیكەن، كەواتە تۆڵەیان لێ ئەسێنێ بەوجۆرەی كە خۆی ئەزانێ. ئینجا مەبەست بەو دووجار كوێر بوون و كەڕ بوونە ئەوە بێ كە یەكەمیان ئەوەبوو كە سەریان كردە سەركێشی و تاوان تا خوا بابلی یەكانی زاڵ كرد بەسەریان دا، ماڵ و وڵات وسامانیان لێ داگیر كردن و خۆیانیان ژێر پێ و زەبوون كردن و دەسەڵات و حوكمڕانی یان لێ سەندن و مزگەوتی قودسیان سووتاند. ئینجا پەشیمان بوونەوەو روویان كردەوە خواو خوایش میهرەبانی لەگەڵ كردنەوەو تۆبەكەی وەرگرتن و دەسەڵات و بەرزی پێدانەوە، ئینجا دووەم جار دەستیان كردەوە بە سەركێشی و تاوانە بەدەكانی خۆیان كە وێنەی نەبینراوە لە ئوممەتەكانی تردا، تا خوا تۆڵەی لێ سەندنەوە بە زاڵ كردنی فارس و ئینجا رۆم بەسەریان دا ئەوەیان پێ كردن كە پێ یان كردن، وەك لە سەرەتای سورەتی(الإسراء) دا ئاماژەی بۆ

ئەكات. مەبەست ئەو دوو جارە كوێر بوون و كەڕ بوونە بێ وەك هێندێك لە زانایان ئەفەرمون. یان یەكەمیان گوێرەكە پەرستی یەكە بوو كە لە چەرخی موسا پێغەمبەردا(ﷺ) دووەمیان ئەوە بوو كە لە پاش حەزرەتی موسا كردیان، ئینجا خوا میهرەبانی لەگەڵ كردن بە رەوانە كردنی حەزرەتی عیسا، ئینجا دووەمیان ئەوەبوو كە بڕوایان نەهێنا بە ئیسلام و پێغەمبەری هەمووان(ﷺ)، وەك هێندێكی تر ئەم مەبەستە هەڵئەبژێرن، هەركام مەبەست بێت ئەگونجێ و مێژووی بەدی جوولەكە ئەوانەی تێدا بووە و هەر سروشتیان لەسەر ئەوەیە و كۆتایی یان نەهێنا و نایهێنن، ئەوەتا لەپاش هاتنی ئیسلام هەر نەوەستان لە تاوان و خراپە كاریی، خوایش تۆڵەیان لێ ئەسێنێ و لەپاش داماوی و زەبونی ئەبووژێنەوەو دەست پێ ئەكەنەوەو خوایش هەر بۆیان ئەگەیەنێ، وەك لە ئایەتەكەی ئیسراء دا لەپاش دووجارەكە فەرموی: ﴿وَإِن تَعُودُواْ نَعُدۡ﴾ ئەگەر ئێوە بگەڕێنەوە سەر تاوان و خراپەكاریی ئێمەیش ئەگەڕێینەوە سەرتان بە سزادان و تۆڵەسەندن، بە گوێرەی حەدیس وا وەرئەگیرێ ئەمەی كە لەم دوایی یەدا كردیان و ئەیكەن لە فەلەستین دا دواترین جاریان بێ و بە یارمەتی خوا ئەم جارە موسڵمانان ئەگەڕێنەوە بە راستی بۆلای ئیسلامەكەیان، ئینجا بە تەواوی لێ یان ئەدەن، بەڵام كاتێ ئەوە ئەبێ كە موسڵمانان هیچ ئاڵا و ناوێكی تریان نەمێنێ بێجگە لە ئاڵای ئیسلام و ناوی ئیسلام، تا موسڵمانان ئەوە نەكەن ئەوانە هەر ئەمێنن و لەناو ناچن، هەرچەند ئەم ماوەیش كە هەن وماون ژیانێكی زۆر تەنگ و تاریك و رەش بەسەر ئەبەن. بەڕاستی لێرەیش دا كە ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ﴾ كە بە وتەی ئێستا و داهاتوو و فەرموی، نەك بە وتەی رابردوو: ﴿بما عملوا﴾ هەر دەست نیشان بێ بۆ كردەوە بەدەكانیان كە پێ ی هەڵسان و پێ ی هەڵئەسن، لە پاش هاتنی ئیسلام بە وێنەی ئایەتەكەی(الإسراء)، نەك مەبەست بەوە رابردوو بێ وەك زۆربە لەسەر ئەوەن كە ئەفەرمون: مەبەست لە ﴿يَعۡمَلُونَ﴾ ﴿عملوا﴾ ە، واتە خوا بینایە بەوەی كە ئەوانە كردیان، بەڵام لەبەر ئەوەی كردەوە بەدەكانی رابردوویان ئامادە بكات و بیخاتە بەرچاو لە باتی ﴿عملوا﴾ ﴿يَعۡمَلُونَ﴾ ی فەرمو، وەك ئەو باوە لە یاسای رەوانبێژی دا و لە قورئانیش دا زۆر هاتووە.

لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ۖ وَقَالَ ٱلْمَسِيحُ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۖ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٧٢﴾ لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ

---

**ئینجادێتەسەرباسی خراپەولادانی نەسرانی یەکان لەئایینەپاکەکەی حەزرەتی عیسا-(علیه السلام) ئەفەرموێ:﴿ لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ﴾بێگومان بێ بڕوا بوون ئەوانەی کە گوتیان: بێگومان خوا مەسیحی کوڕی مەریەمە، واتە عیسا ﴿وَقَالَ ٱلْمَسِيحُ﴾ مەسیحیش کاتێ رەوانە کرا گوتی: ﴿يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ ئەی نەوەکانی ئیسرائیل ﴿ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ﴾ خوایەك بپەرستن کە ناوی(الله) یە و پەروەردگاری منە و پەروەردگاری ئێوەیشە ﴿إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ﴾ بەڕاستی کار بەم جۆرەیە: هەرکەس هاوبەش بۆ خوا دابنێ ﴿فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ﴾ بێگومان خوا بەهەشتی لەسەر قەدەغە و حەرام ئەکات ئەگەر لەسەر ئەوە بمرێ ﴿وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ﴾ جێ و شوێنی ئاگر ئەبێ لە رۆژی دوایی دا ﴿وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ﴾ نی یە بۆ ئەو ستەمکارانە هیچ یارمەتی دەران کە بەرگری ئەو سزایانەی لێ بکەن و یارمەتی یان بدەن. با بزانرێ کە هاوبەش رەوادان هەر ئەو شێوە سادەی بت پەرستی ئەو کاتە. بەڵکو هەروەها هاوبەش رەوادان لە سیفەت و کردەوەکانی دا، یان هاوبەش لە یاسا و بڕیاری دا، وەك چەند جارێ بە روونی گوتمان. ئەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ﴾ سوێند بەخوا بێ بڕوا بوون و لە ئایینی خوا دەرچوون ئەوانەی کە گوتیان: بێگومان خوایە کە ناوی(الله) یە یەکێکە لە سێ خوا کە بریتین لە خوای پەروەردگار و عیسای دایکی.**

**لەپێشەوە بە کورتی تێپەڕی کرد کە چۆن و لە کوێوە ئەم جۆرە بیرو باوەڕە پووچە هات و تێکەڵی ئەو ئایینە پیرۆزە بوو. ئینجا لێرەیش دا بە کورتی باسێکی ئەوە ئەکەین کە هەموو بڕیاریان هاتە سەر ئەم بیروباوەڕە و خوایەتی حەزرەتی عیسا(علیه السلام)، باسی دووبەرەکی یان لە پاش دا لەناو خۆیان دا بەوجۆرەی کە لە پێشەوە تێپەڕی کرد. مامۆستای بەناوبانگ محمد ئەبو زەهر ئەگێڕێتەوە لە کتێبی(سوسنة سليمان) دانراوی(نوفل بن نعمة الله ی کوڕی جرجیسی مەسیحی)، کە ئەڵێ: عەقیدەو باوەڕی نەسرانی یەکان کە**

بڕیاری هەموو کەنیسەکانی لەسەرە، بناغەیە بوو بۆ ئەو دەستوورەی کە مجمعی فتاوی داینـاو دەری خست، بڕوایە بە یەك پەرستراو کە پێی ئەڵێن: اب، کە هەموو شتی ڕاگیر کردووە و دروست کەری ئاسمانەکان و زەوی یە، ئەوەی ئەبینرێ و ئەوەی نابینرێ، بڕوا بە یەك پەروەردگار کە(یسوع)ە پێی ئەگوترێ(ابن) کە پەیدا بووە لە(اب) لە پێش چەرخ و زەمان دا لە نووری خوا، خوایەکی ڕاستە و لە خوای ڕاستەقینە پەیدا بووە و دروست کراوی نی یە، یەکسانە لەگەڵ(اب) دا لە جەوهەردا، هەموو شتێ بەو پەیدا بووە، بەهۆی ئەو ئێمەی ئادەمی هەین، لەبەر گوناهو تاوانی ئێمە لە ئاسمان هاتە خوارەوە، لەش و جەستەی بۆ پەیدا بوو لە(روح القدس) بەهۆی مەریەمەوە بۆ ئادەمی، لە چەرخ و سەردەمی(بیلاطس) دا درا لە سێدارە، مردو خرایە گۆڕ، لە ڕۆژی سێ یەم دا لەناو مردووان دا هەڵسایەوە لە گۆڕەکەی، بەرز بوویەوە بۆ ئاسمان دانیشت لای ڕاستی خواوە، لە داهاتوودا دێت بۆ پاداشت و مل کەچ کردنی زیندووەکان و مردووەکان، موڵك و پادشایەتی یەکەی هەر ئەمێنێ و نەمان رووی تێ نەکات، بڕوا بە(روح القدس) کە خوایەکی زیندوو کەرەوەیە و هەڵقولاّوە لە(اب) هوە، کە ئەم لەگەڵ(ابن) دا سوژدەی بۆ ئەبەن. دکتۆر بوست لەمێژووی(الکتاب المقدس) دا ئەڵێ: سروشتی خوا بریتی یە لە سێ(اقنوم) کە یەکسانن: الله الأب، الله الإبن، الله الروح القدس، لەبەر ئەوەی ئەم بۆچوونە ناچێتە دڵەوە تێ ناگەین لە کۆبوونەوەی بڕوا بە تاك و تەنیایی و بڕوا بە سێ تاکی خوا، نووسەرەکانی مەسیحی لەبارەی خواو کاروباری خوایەتی یەوە ویستیان تێ ڕوانین و بیر کردنەوەی ژیری لەم مەسەلەدا دوابخەن کە ژیری هەر لە یەکەم جارەوە وەری ناگرێ، یەکێ لەو نووسەرانە ئەمەیە کە قەشە(بوطر) نووسیویەتی لە نامێلکەی(الأصول والفروع) دا کە ئەڵێ: بە پێی توانای ژیریمان ئەم مەسەلەمان وەرگرت، ئومێدمان وایە کە لە داهاتوودا زۆرتر وەری گرین و تێی بگەین کاتێ کە پەردە لابرا لە هەرچی وا لە ئاسمانەکان و زەوی دا، بەڵام لەم کاتەدا ئەم ئەندازەیە بەسە. ئەو وتەو بڕیارانی ئەوانە – وەك بۆمان دەرکەوت – داننان و بڕیاردان هەیە لەسەر خوایەتی حەزرەتی عیسا، داننان و بڕیار دان لەسەر ئەوە کە حەزرەتی عیسا یەکێکە لە سێ خوا وەك قورئانیش ئەو دوو وتەی گێڕایەوە لێ یانەوە، ئینجا خوایش کە وتەو بڕیار هەر هینی ئەوە و لە پاش ئەو هیچ کەس خاوەنی وتەو بڕیار نی یە، ئەو خوایە لە پێشەوە لە ئایەتی(١٧) و لێرەدا لەئایەتی(٧٢، ٧٣) ئەو دوو وتەیانەی بە ناهەق دەرکرد و بڕیاری بێ بڕوایی دا بەسەر ئەو کەسانەی کە ئەو وتە ناهەقانە ئەڵێن.

وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌۚ وَإِن لَّمْ يَنتَهُوا۟ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُۥۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٧٤﴾ مَّا ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌۖ

---

بەڵكو هەمووكەس هەر ئەمە بڵێ و بڕوای بەمە ببێ کە خوا ئەفەرموێ: ﴿وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌۚ﴾ هیچ خوایەك نی یە بێجگە لە تەنیا یەك خوا، ئینجا ئەم هەڕەشە سامناكە ئاراستە ئەکات: ﴿وَإِن لَّمْ يَنتَهُوا۟ عَمَّا يَقُولُونَ﴾ ئەگەر ئەوانە کۆتایی نەهێنن لەو وتە ناهەق و بەدانە ﴿لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ سوێند بەخوا دووچاری ئەوانەیان ئەبێ کە بڕوای نەهێنابێ – واتە هەر بەو بێ بڕوایی یە مردبن – سزایەکی زۆر سەخت و ئێش و ئازار دەر.

ئینجا بەدوای ئەو هەڕەشە سەختەدا هانیان ئەدا لەسەر گەڕانەوەیان بۆلای خوا و قاپی گەڕانەوەیان بۆ ئەخاتە سەر پشت، ئەفەرموێ: ﴿أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُۥۚ﴾ دەی ئایا تۆبە ناکەن و ناگەڕێنەوە بۆلای خوا و داوای لێ بوردن و سڕینەوەی تاوانەکەیان ناکەن، واتە با بگەڕێنەوە و داوای سڕینەوەی بکەن ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ لە کاتێك دا کە خوا زۆر لێ بوردەی میهرەبانە، ئینجا بیروباوەڕی ڕاست و ڕەوایان نیشان ئەدا لە بارەی عیساوە(علیه السلام) ئەفەرموێ: ﴿مَّا ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ﴾ مەسیحی کوڕی مەریەم هەر فروستادەو نێرراوی خوایە، نە خوایە و نە کوڕی خوایە وەك ئەو نەفامانە ئەڵێن، بەڵكو هەر بەندەیەکی فروستادەیەکە ﴿قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ﴾ تێپەڕی کرد لە پێش ئەوەوە چەند فروستادە و نێرراوەکانی تر ﴿وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌۖ﴾ دایکیشی هەر ئافرەتێکی زۆر ڕاستە لەگەڵ خوا خۆی، یان خاوەن بڕوایەکی بەهێزە

كَانَا يَأْكُلَانِ ٱلطَّعَامَۗ ٱنظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلْآيَٰتِ ثُمَّ ٱنظُرْ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٧٥﴾ قُلْ أَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًاۚ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٧٦﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُواْ فِي دِينِكُمْ

---

﴿كَانَا يَأْكُلَانِ ٱلطَّعَامَۗ﴾ ئەو دوانە خۆراکیان ئەخوارد کە خواردن و پێویستی بە خواردن و بەڵگەیەکی روونە لەسەر ئەوەی دوورن لە سنووری خوایەتی، چونکە خوا خۆی بە خۆی زیندووە و خۆی هەیە و راگیرە و خۆی بەخۆی ئەمێنێتەوە و نەبوونی بەسەردا نایەت، هەرکەس پێویستی بە خواردن و خۆراك ببێ بۆ ئەوەی بەوە بژی، چۆن گومانی خوایەتی ئەبرێ بە کەسێکی ئاوا؟ واتە عیسا هەر بەندەیەکە وەك ئەو هەموو ئادەمی یە، جیابووەتەوە لەناو هاوسەرانی دا بە سیفەتی فروستادەیی وەك هەموو فروستادەکانی تر کە لە هاوڕێ و هاوسەرانیان جوێ بوونەتەوە لە زۆربە بەو سیفەت و بەهرەیە کە باس کرا، کە ئەوەش پلەو پایەیەکی بەرزە دێت بە دوای پلە و پایەی پێغەمبەرێتی دا. ئینجا لەبەر زۆر روونی مەسەلەکە، بە جۆرێ هەرکەسێك ژیر بێ هەرگیز دەمبازی و دەمە قاڵێ ی تیا ناکات، لەبەر ئەوە سەرنج رائەکێشێ بۆ روونی مەسەلە و بەم بەڵگە روونە، ئەفەرموێ: ﴿ٱنظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلْآيَٰتِ﴾ سەرنج بدە کە چۆن بە روونی باس ئەکەین بۆیان ئایەت و بەڵگە ئاشکراکان لەسەر ناڕاستی و ناهەقی وتەکانیان ﴿ثُمَّ ٱنظُرْ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ﴾ ئینجا بەسەرسوڕمانەوە سەرنج بدە کە چۆن ئەوان لادراون لە گوێ گرتن لە هەق و وەرگرتنی هەق؟!! ئینجا سەرەڕای ئەو بەڵگە روونانەی کە ئاراستەی کرد و بە شێوەی سەرسوڕهێنان و بێزاری دەربڕین ئەو شێوە پرسیارەی کرد، سەرەڕای ئەوانە لە بارێکی ترەوە بێزاری یەکی تر ئاراستە ئەکات بەم شێوە پرسیارەی کە فەرمان ئەدا بە پێغەمبەر(ﷺ) ئاراستەیان بکات بۆ دەم کوت کردنیان ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە: ﴿أَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ

لَكُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا ﴾ ئایا ئەپەرستن بێجگە لە خوا شتێك كە نە خاوەنی زیانە بۆتان و نە خاوەنی سوود و قازانجە، واتە نە ئەتوانێ زیانتان پێ بگەیەنێ ئەگەر نافەرمانی بكەن، ناتوانێ سوودتان پێ بگەیەنێ لەسەر پەرستن و مل كەچی بۆی. مەبەست بەو شتە لێرەدا یا هەر عیسا و دایكی یەتی بە تایبەتی، یان هەموو پەرستراوەكانە بێجگە لە خوا كە ئەو كاتە لێرەدا عیسا و دایكی ئەبێ یەكەم مەبەست و سەردەستە بن، لەبەر ئەوەی ئایەتەكە بۆ دەم كوت كردنی مەسیحی یەكان هاتووە، بە هەركام مەبەست بێ عیسا و دایكی و نە هەرچی وا لەسەر زەوی دا زیان و قازانجی نە خۆی و نە هیچ كەسێكی تری بەدەستە، بەڵكو هەموو زیان و قازانجێك بەدەست خوایە و ئەو ئەیكات، ئیتر ئایا ئەو زیان و قازانجە یەكسەر لە خواوە بێت و بە بێ ئەوەی هیچ كەسێكی تری كردبێ بە هۆ، یان لەسەر دەستی یەكێك دا و بەهۆی یەكێكەوە ئەو زیان و قازانجە فەراهەم بێت، كەواتە بەهەرحاڵ و لەسەر هەر بار تەنیا خوا شایانە و شیاوە بۆ پەرستن و بێجگە لە خوا شایانی پەرستن نی یە، ﴿وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾ واتە بێجگە لە خوا هیچ شتێك مەپەرستن كە خاوەنی هیچ زیان و سوودێك نی یە بۆتان لە كاتێك دا كە هەر تەنیا خوا بیسەری هەموو شتێكە و زانایە بە هەموو شتێ، كە یەكێ لەوانە هەموو قسە و وتەكانتان و هەموو شتێ كە لە دڵ و دەروونتان دایە كەواتە ئەبێ هەر لە خوا بترسن و بێجگە لەو نەپەرستن و هیچ شتێك نەڵێن كە هۆی خەشم و ناڕەزایی ئەو بێت، چونكە هەرچی بڵێن ئەیبیستێ و زانایە بە عەقیدەو بیرو باوەڕەكانتان، یان مەبەست ئەوەیە: بێجگە لە خوا بێ دەسەڵات و دەستە پاچەیە دەی ئایا ئێوە دەستە پاچە ئەپەرستن لە كاتێك دا كە تەنها خوا بیسەری زانایە و هەركەسیش وابێ ئەبێ زیندوو توانابێ.

لەپێشەوە بە تایبەتی باسی كارو كردەوە ناهەق و ناڕەواكانی جوولەكەی كرد، ئینجا بە تایبەتی باسی مەسیحی یەكانیشی كرد و ئەندازێ كە پێویست بێ دوا لە ناڕاستی و ناهەقی قسە و بیرو باوەڕە ناڕاست و پڕوپووچەكانیان كە هەردوو كۆمەڵەكە زیادە ڕەوی و

له سنوور دەرچوونیان بەکار هێنابوو، لە پاش ئەوانە ئینجا فەرمان ئەدا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە بە شێوەی گشتی ئەم ئایەتە ئاراستەی هەردووەکەیان بکات و جڵەوگیریی یان بکات لەو زیادە رەوی و لە سنوور دەرچوونە و شوێن کەوتنی گومڕایانی گومڕاکەران. ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ﴾ ئەی نامەدارەکان ﴿لَا تَغْلُوا فِي دِينِكُمْ﴾ زیادە رەوی مەکەن و لە سنوور تێپەڕ مەکەن لە ئایینەکەتان دا، بەم رەنگە بە رێکی دەست بگرن بەوەی کە خوا سروشی کرد و بۆی ناردن، بە بێ کەم و کوڕی و زیادە رەوی، واتە نەوەك جوولەکە بن کە عیسا و دایکی لەو رادە پەستەدا تەماشا کەن، نە وەك گاورەکانیش بن کە رادەو پلەی عیسا و دایکی بەرز ئەکەنەوە بۆ پلە و رادەی خوایەتی کە هەردوو هەر ناهەقە و هەق و راست ئەوەیە کە قورئان دایناوە و مییانەیە و لە ناوەڕاست دایە، کە هەق هەمیشە لە هەموو شتێك دا لە ناوەڕاست دایە وەك ناوەڕاستی تەرازوویەکی راست، کە بە هەر بارێك دا بترازێنرێ بەلارو خوار دەرئەچێ، هەق هەمیشە ناوەڕاستە و لە نێوان زیادە رەوی و کەم و کوڕی دایە، وەك شاعیری راست ئەفەرموێ:

علیك بأوسط الأمور فإنه کلا طرفی أوساط الأمور ذمیم

بنووسێ بە ناوەڕاستەکانی هەموو کاروبارەوە و بە هیچ بارێك دا لامەدە نە بۆ زیادە رەوی، نە بۆ کەم و کوڕیی، چونکە هەردوولای ناوەڕاستەکان نەنگ لێ گیراوە و خەشم لێ گیراوە. ئینجا ئایا هەموو لادان و لە سنوور ترازان ناهەقە، یان هێندێکی هەق و راستە وەك زیادە رەوی کردن لە پارێزکاری و بە گرنگ گرتنی ئایین و کاروباری ئایین دا، کۆمەڵێك لە زانایان لەسەر راو باری یەکەمن، کۆمەڵێکی تر راو باری دووەمیان هەڵبژاردووە.

غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓاْ أَهۡوَآءَ قَوۡمٖ قَدۡ ضَلُّواْ مِن قَبۡلُ وَأَضَلُّواْ كَثِيرٗا وَضَلُّواْ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٧٧﴾

جا لەسەر راو باری یەکەم مەبەست بەم وتەیە لێرەدا: ﴿غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ﴾ بۆ دڵنیایی کردنە لەسەر ناڕەوایی زیادە ڕەوی کردن. واتە زیادە ڕەوی مەکەن لە ئایینەکەتان دا کە زیادە ڕەوی کردن ناهەقە، لە سەر رای دووەم مەبەست بەو وتەیە جیا کردنەوەیە لە زیادە ڕەوی ناهەق و ڕاست، واتە زیادە ڕەوی ناهەق مەکەن لە ئایینەکەتان دا، بەم ڕەنگە ئەو زیادە ڕەوی یە دژی ئایینەکەی خوا بێت. ﴿وَلَا تَتَّبِعُوٓاْ أَهۡوَآءَ قَوۡمٖ قَدۡ ضَلُّواْ مِن قَبۡلُ﴾ مەکەونە شوێن ئارەزوواتی کۆمەڵ و دەستەیەك کە لە پێشەوە گومڕا بوون، واتە پێشەواکانیان کە ئەو مەزهەب و بیرو باوەڕە ناڕاستانەیان دایە بەرو لە ئایینی ڕاستی خوا لایان دا لە پێش هاتنی ئیسلام دا ﴿وَأَضَلُّواْ كَثِيرٗا﴾ زۆر کەسیشیان گومڕا کرد و ترازاندنیان لەوانەی کە شوێنیان کەوتن و ڕێبازی ئەوانیان دایە بەر. ﴿وَضَلُّواْ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ﴾ گومڕا بوون و لایان دا لە ناوەڕاستی ڕێگەی ڕاست لە پاش هاتنی ئیسلام کە ئەم ئایینە میانەیە و لە هەموو شتێکی دا ناوەڕاستی گرتووە، وتەی ﴿ضَلُّواْ﴾ بە چەند جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوە لە هەردوو شوێنەکەدا و جیاکراونەتەوە لە یەکتر، بەو جۆرانەش هەر ڕێکن و ئەگونجێن. لە پێشەوە گوتمان: ئەم ئایەتە دەربارەی جوولەکەو گاور هاتووەتە خوارەوە و ئاراستەی هەردوو کراوە، لەسەر ئەو بارە تەفسیرمان کردووە کە ئەوە رای زۆر کەسە لە زانا بەرزەکانی تەفسیر، بەڵام کۆمەڵێکی تر لەسەر ئەوەن کە هەر دەربارەی گاورەکان هاتووە، وەك ئەو چەند ئایەتەی پێش ئەم، بەڕاستی ئەم رایە لەگەڵ رووکەش و ڕواڵەتی ﴿لا تغلوا﴾ دا ڕێك ترە، چونکە زۆرتر زیادە ڕەوی بەکار ئەهێنرێ لە زیادە بەرز کردنەوەی رادەو پلەدا نەك پەست کردن دا، دەی ئاشکرایە کە گاورەکان ئەو زیادە ڕەوی یەیان کردووە لە حەزرەتی عیسا و دایکی دا – سەلامیان لەسەر بێت –.

لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ ﴿٧٨﴾ كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوۡنَ عَن مُّنكَرٖ فَعَلُوهُۚ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴿٧٩﴾

**ئەگەر كەسێك پرسیار بكات: ئایا چۆن ئەو ئیسرائیلی یانە بەوجۆرە گومڕا بوون، چۆن شوێن كەوتنی هەواو هەوەسیان هەڵبژارد بەسەر ڕێنموونی پێغەمبەران دا؟ ئینجا ئایا خوا چی دەربارەی ئەوانە كرد كە بەوجۆرە بوون؟ هەركەسێك ئەو پرسیارانە بكات وەڵامی دەست ئەكەوێ لەم سێ ئایەتی داهاتووەدا، ﴿لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ﴾ نەفرین كرا لەوانەی كە بێ بڕوا بوون لە بەرەو نەوەكانی ئیسرائیل، نەفرینیان لێ كرا لەسەر زمانی داود و عیسای كوڕی مەریەم، ئیتر ئایا ئەو نەفرینە لە زەبوور و ئینجیل دا هاتبێ و لەسەر زمانی ئەوان ڕاگەیەنرابێ، یان هەر لەلایەن ئەوانەوە كرابێ بە شێوەی نزاو داوا كردن لە خوا كە بێ بەشیان بكات لە میهرەبانی وەك چەند ریوایەتێك هاتووە، كە ئەگەر بەم جۆرەش بووبێ هەر لەسەر ئیزنی خوا بووە، لەسەر هەر بار شایستەی ئەوە بوون، چونكە دەستیان نەگێڕاوە لە یاخی بوون و دەست درێژیی: نامەی خوایان گۆڕی و دەست كاری كرد، شەریعەتی خوایان نەئەكرد بە حوكمڕان بەسەر خۆیان دا - وەك لەم سورەتە و لە چەند سورەتێكی تردا هاتووە - پەیمانی خوایان هەڵوەشاندەوە، وەك بە كورتی لێرەش دا دەست نیشان ئەكات بە گوناهو دەست درێژیی یان، ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ﴾ ئەو نەفرینەی كە باس كرا بەهۆی یاخی بوون و نافەرمانی یان بوو، بەهۆی دەست درێژیی یەك بوو كە ئەیكەن بە هەمیشەیی و بەردەوامن لەسەری، یاخی بوون و دەست درێژیی یەكەیان لە عەقیدەو بڕوا و ڕەوشت و كردەوەدایە بە تێكڕایی و پێكەوە وەك بە درێژیی قورئان باسی فەرمووە. ئینجا ئەو یاخی بوون و دەست درێژیی یە لەلایەن تاك و تەراو یەكەیەكە نەبوو، بەڵكو پەرەی سەند بوو تا ڕادەیەك بوو بوو بە وێنەو شێوەی كەلەكە، بە بێ بەرگری و جڵەوگیریی و بێزاری دەربڕین لێ یان، وەك دەرئەكەوێ لەمەی كە ئەفەرموێ: ﴿كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوۡنَ عَن مُّنكَرٖ فَعَلُوهُۚ﴾ ئەوانە جڵەوگیریی یەكتریان نەئەكرد لە هەر كارێكی بێزراوی بێ شەرعی كە ئەیانكرد و بەردەوام لەسەر ئەو جڵەوگیریی**

نەکردنە ﴿لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ﴾ سوێند بەخوا زۆر بەد بوو ئەوەی کە ئەیانکرد، واتە ئەو جڵەوگیریی نەکردن و بێ دەنگ بوونە. بێگومان تاوان و خراپەکاریی روو ئەدەن لەناو هەموو گەل و کۆمەڵێك دا لە لایەن خراپانەوە، ولات خالّی نابێ لە شەڕو خراپە، گەل و کۆمەڵ خالّی نابن لە لاری و نالەباریی، بەڵام ئەگەر گەل و کۆمەڵ چاك بن رێ بەرەڵا ناکەن بۆ تاوان و بێ شەرعی پەرە بسێنن و ببن بە باو، بە سووك و ئاسان هەرکەسێك ویستی سەریان تێ بکات، لە کاتێك دا تاوان و خراپە بە ئاسانی دەستیان نەئەدا بکرێن لەناو هەر گەل و کۆمەڵێك دا، گەل و کۆمەڵ ئەوەستان بۆ بەرگری کردن، چاوپۆشی یان نەئەکرد و تۆڵەیان ئەسەند لە تاوانکار، ئەو کاتە شەڕو خراپە بەرە بەرە بێ هێزو لاواز ئەبێ و خۆی ئەشارێتەوە، خراپەکاریی ئەمێنێتەوە لەلای چەند کەسێك و لەهەر لایەکەوە دەرکەوێ گەل دەری ئەکات و ئەیتارێنێ، رێ ی ئەوەی نادا زاڵ ببێ و بڵاو ببێتەوە، شێوەی پیسی دیار نابێ بە گەلەوە، وەك گەلی ئیسرائیلی، جا قورئان کە ئەو شێوەیە نیشان ئەدا بەو هەموو بێزاری دەربڕینە، ئەیەوێ کە گەلی موسڵمان وریای خۆیان بن ئەو شێوە پیسەی بەسەردا نەکشێ، ئەیەوێ کە رەق و چالاك بن و سەر دانەخەن لە ئاستی تاوان و خراپەکاریی و دەست درێژیی یە کە روویان تێ بکات، ئەیەوێ لەوانەی کە کراون بە پاسەوان و پارێزگاری ئایینەکەیان، بە باشی هەڵسن بەو سپاردەیەی کە خراوەتە گەردنیان، بەم رەنگە بوەستن لە رووی شەڕو سەرکێشی و دەست درێژیی دا، بە بێ هیچ ترس و بیمێك لە تەشەرو لۆمەی تەشەر دەرو لۆمە کەران، ئیتر ئەو شەڕو سەرکێشی و دەست درێژیی یە لە لایەن زۆردار و کاربەدەستان بێت، یان لەلایەن ساماندارانەوە بێ کە بەو ماڵ و سامانە زاڵ بوون، یان لەلایەن پیاو خراپانەوە بێ کە وەك دڕندەیان لێ دێت بە راست و بە چەپەدا دەست و دەم ئەوەشێنن، یان لەلایەن کۆمەڵ و جەماوەرەوە بێت کە بە هەواو ئارەزووی نەفس زۆریان سەندووە، چونکە بەرنامەی خوا بۆ هەمووانە، ئەوەی کە سەرپێچی لێ بکات یاخی یە و ئەبێ بەرگری بکرێ، ئیتر بەرز بێت یا پەست بێ یەکسانە.

ئیسلام لە بارەیەوە زۆر توند و تیژیی بەکار هێناوە، ئەوەتا گەل و کۆمەڵ تاوانبار ئەکات بە هەر گوناهو تاوانێك کە بکرێ و لێ ی بێ دەنگ بن، هەروەها هەموو یەکەیەکەش تاوانبار ئەکات لەسەر هەر گوناهو تاوانێك کە بکرێ و هەوڵ و تێکۆشان نەکرێ بۆ بەرگری و نەهێشتنی بەپێی توانا. ئینجا با گوێ بگرین بۆ ئەم چەند حەدیسە کە هاتوون لەم بارەیەوە:

١- ئەبو داود حەدیسی ئەهێنێ لە(ئیبن و مەسعود) ەوە کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ص) فەرموی: یەکەم جار کەم و کوڕی و پەستی رووی کردە ئیسرائیلی یەکان ئەمە بوو پیاوێك ئەگەیشتە پیاوێکی تر کە خەریکی گوناهێك بوو ئینجا پێی ئەگوت: لە خوا بترسە و خۆت بپارێزە لە خوا و واز بێنە لەوەی کە ئەیکەیت، چونکە دروست نی یە بۆت، ئینجا لە بەیانی دا توشی ئەبووەوە، ئەو گوناهەی کە بینی پێ یەوە بەرگری ئەمی نەئەکرد لەوەی نان و ئاوی لەگەڵ بخوات و لەگەڵی دانیشێ، واتە خەشمی لێ هەڵنەگرت لەسەر ئەو گوناهەی کە بینی پێ یەوە، هیچ ترێزی لێ نەئەکرد. ئینجا کاتێ کە بەو جۆرەیان کرد خوا دڵی هەردووی مۆر کرد. ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە خەریکین پێ یەوە، ئینجا فەرموی: نەخێر سوێند بەخوا ئەبێ فەرمان بدەن بە چاکە و جڵەوگیریی بکەن لە خراپە، ئەبێ دەستی ستەمکار بگرن و بدەن بەسەر دەستی دا، ئەبێ ناچاری بکەن بۆ هەق بە ناچار کردن. کەواتە تەنها فەرمان و جڵەوگیریی بەس نی یە، کارەکە بەوە لەکۆڵ ناکەوێ و دوایی نایەت، بەڵکو ئەبێ کۆڵ نەدرێ، دۆستایەتی نەمێنێ و تاوانبار موقاتەعە بکرێ، بە زۆر بکرێ لە شەڕ و خراپەکاریی و گوناهو دەست درێژیی، وێنەی ئەو حەدیسە ئیمامی ئەحمەدیش هێناویەتی لە(ئیبن و مەسعود) ەوە.

٢- (ئیمامی موسلیم) حەدیسی ئەهێنێ لە(ئەبو سعید خودری) یەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: هەرکەسێك لە ئێوە بێ شەرعی یەکی بینی ئەبێ بە قسە و بە زمان هەوڵ بدات بۆ بەرگری و نەهێشتنی، ئینجا ئەگەر دەسەڵات و توانای ئەوەی نەبوو ئەبێ بەدڵ هەوڵ بدات. ئەمە لاواز ترین رادەی بڕوایە. دیارە هەوڵی دڵ ئەمەیە کە روودانی ئەو گوناهو تاوانەی پێ ناخۆش بێ و خەشم و رقی ببێ لێ ی و پێشی لێ بخواتەوەو بڕیاری دڵی لەسەر ئەوە بێ کە هەر کاتێ بۆی کرا بە زۆر یان بە زمان وازی لێ نەهێنێ و کۆتایی لێ نەدات.

٣- ئیمامی ئەحمەد حەدیسی ئەهێنێ لە عدی کوڕی عومەیرەوە کە ئەفەرموێ: بیستم لەپێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: بێگومان خوا سزای گشتی نادا بەهۆی کردەوەی خراپی هێندێکەوە، هەتا بێ شەرعی نەبینن بە ئاشکرا لەناویان دا – دەسەڵاتیان ببێ بەسەر بەرگری داو کەچی بەرگری نەکەن – کاتێ کە بەو جۆرەیان کرد خوا سزای گشتی ئەدات لەگەڵ ئەو هێندەی کە بێ شەرعی ئەکەن.

٤- ئەبو داود و ترمزی حەدیسێ ئەهێنن لە ئەبو سعیدەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی:
گەورەترین تێکۆشان لە ڕێی خوادا وتەیەکی هەق و ڕاستە لای کاربەدەست و ئیمامێکی ستەمکار.

هەروەها ئایەت و حەدیسی زۆر هاتووە لەم بارەیەوە و لەم مەبەستەدا، بە هیچ کلۆجێك دروست نی یە بۆ هیچ بڕوادارێك کە بێ شەرعی ببینێ و بڵێ: جا من چیمە بەسەریەوە؟ یا بڵێ: من چی بکەم ئەگەر باسی خراپە و خراپەکار بکەم دووچار ئەبم، کەواتە من چی بکەم؟ بەڵکو پێویستە کۆڵ نەدرێ و بە پێی دەسەڵات و توانین هەوڵ بدرێ بۆ ڕێ گرتن لە خراپە بە هەر جۆر بگونجێ و لە توانادا ببێ تا ئەگاتە لاوازترین بڕواوە وەك لە حەدیسەکەدا ئاماژەی بۆ کرد.

بەڵام با بزانرێ کە تێکۆشانی ڕاستەقینە و و فیداکاریی لە یەکەم جارەوە ئەبێ لەبارەی پێك هێنانی گەل و کۆمەڵێکی موسڵمانەوە بێت، پێك هێنانی ئەوەش دەست پێ ئەکات لە پێك هێنانی یەکە یەکەی ئەندامی گەلەوە، جا کاتێ گەل و کۆمەڵێکی وا فەراهەم هات کە یاسا و قانوونی خۆی هەر لە شەریعەتی خوا وەرگرێ، ژیانی خۆی لەسەر خوا ڕاگیر بکات - کە گەل و کۆمەڵی موسڵمان هەر بریتی یە لەوە - کاتێ گەل و کۆمەڵێکی وا فەراهەم هات زۆر بە ئاسانی ئەو فەرمان بە چاکە و جڵەوگیریی لە خراپە بەجێ ئەهێنرێ و زۆر بەکار و سوود بەخش ئەبێ، ئەبێ بە بەربەست و بەرهەڵستێکی بەهێز لەبەردەم خراپە و خراپەکەران دا، ماوەی خراپە و خراپە کەران نادا کە شێوەو دیمەنی گەل و کۆمەڵ چەپەڵ و ناشیرین بکەن، بەڵام ئەگەر گەل و کۆمەڵ موسڵمان نەبوو، بەم ڕەنگە یاسا و قانوونی خۆی لە غەیری شەریعەتی خوا وەرگرت، ژیانی خۆی لەسەر بەرنامەیەکی تر دامەزراند و ڕاگیر کرد، بڕوای لەسەر ئەوەبوو کە گوناهو خراپەکاریی شتێکی شەخسی یە و هیچ کەس نابێ هەقی بەسەر هیچ کەسێکی ترەوە ببێ و مەردوم ئازاد و سەربەستە، لەلایەن میری و کاربەدەستەوە قەدەغەی گوتنی هەر وتەیەکی هەق و ڕاست، بە تاوان و دەست درێژیی دابنرێ هەر نەنگ و ڕەخنەیەك کە ئاراستەی میری و کاربەدەستان بکرێ، لەناو گەل و کۆمەڵی واو لە ژێر دەستی دەستی میری و کاربەدەستانی وەهادا ئەو فەرمان و جڵەوگیریی یە هەرگیز ناگونجێ و دەست نادا یان زایەیە و هیچ کەڵکی نابێ، کەواتە هەرکەسێك کە دڵسۆزە و ئەیەوێ خزمەتی ئیسلام بکات و هەڵسێ بە پێویستی سەرشانی خۆی لەناو ئەم گەل و کۆمەڵە بەناو موسڵمانانەی ئەمڕۆدا کە گەڕاوەتەوە بۆ نەفامی کۆن و تێکەڵی کردووە لەگەڵ نەفامی

تـازەیش دا و بـەجارێ ئـاڵای هـەردووی بـەرز کردووەتـەوە، لـە ژێـر دەسـت ئـەم مـیری و کاربەدەستانەدا ئەو کەسە ئەبێ لە خۆیەوە دەست پێ بکات تا خۆی ئەکات بە موسڵمانێکی راستەقینە، ئینجا هەوڵ بدات بۆ پێك هێنانی گەل و کۆمەڵێگی موسڵمان، ئەوەش لـە رێگـەی هـاورێ یـەتی و پەیوەندی و پەیوەسـتی تایبـەتی بە یەکە یەکـەی گەلـەوەو هۆنینـەوەی ئـەو ئەندامـە موسـڵمانانە، هەرکـەس دڵسۆزە و ئەیـەوێ خزمـەتی ئیـسلام بکـات و هەڵـسێ بـە پێویـستی سەرشـانی خـۆی رێگـەی هـەر ئەوەیـە و هـەر رێگەیـەکی تـر بداتـە بـەر ناگـات بـە مەبەست و ئامانج، تەنها ئەمە رێگەی موسڵمانان بووە لـەکاتی هـاتنی ئیسلام دا، وەك هـەر ئەمە رێگە بووە لە کاتی هـاتنی هـەموو ئایین و شـەریعەتەکانی خوادا، کەواتـە هـەر ئەوەیـە رێگەی راستی و گەیشتن بە مەبەست و ئامانج و گەیشتن بە رەزامەندی خوا، بێجگە لەوەیش گوتمان، گەورەترین گوناهو تاوان لادانە لە شەریعەتی خـوا و دان نەنانـە بـە حـاکمێتی خـواو شەریعەتی خوادا، هەموو تاوان و خراپەکانی تر هەر لەم تاوانە گەورەوە پەیدا ئەبێ و هـەڵ ئەقوڵێ. کەواتـە تـا ئـەم تاوانـە گـەورە وەسـتابێ راسـت نـی یـە واز بهێنـرێ و هـەوڵ بـدرێ بـۆ نەهێشتنی تاوانە بچووکەکانی تر!! ئینجا بێجگە لەوەیش پێویستە تەرازوویەکی راست ببێ و دامـەزراو بـێ دانـی پیـا بنـرێ و بە راسـت دابنـرێ تـا بـەو تـەرازووە کێشانەی کردەوەکـان بکـرێ و چـاك و خـراپ و قـورس و سـووکیان دەرکـەوێ، ئـەو تـەرازووەیش هـەر شـەریعەتی خوایە، دەی تا ئەو تەرازووە وەرنەگیرێ و بـڕوای پـێ نـەکرێ چـۆن بـە مـەردوم بگـوترێ ئـەوە چاکە و بیکە، ئەوە خراپە و مەیکە، ئەگەر ئەو تەرازووە دیاریی نـەکرێ و وەرنـەگیرێ چـاك و خراپ دەرناکەوێ بۆ مەردوم و سەر ئەشێوێ لێ ی،چونکە یەکێ بڵێ ئـەوە چاکـە یـان خراپـە و کەسێ تر بە پێچەوانەوە قسە ئەکات، کەواتـە ئـەبێ لـە پێش هـەموو چاکەیـەك دا فـەرمان بـدرێ بـە گـەورەترین چـاکە کـە دان نـان و بـڕوای تـەواوە بـە حـاکمێتی خـوا و شـەریعەت و بەرنامەی خوا، لە پێش هـەموو شتێکەوە جڵـەوگیریی بکـرێ لـە خراپـە و بـێ شـەرعی هـەرە گـەورە کـە داننـان و بـڕواو مل کـەچ کردنـە بـە حـاکمێتی غـەیری خـواو بەرنامـەی، لـە پـاش دامەزراندن و داڕشتنی ئـەو بناغـە و بنەڕەتـە باش ئـەگونجێ فەرمانـدان بـە هـەر چاکەیـەك و جڵەوگیریی لە هەر خراپەیەکی تر، کەواتە با هەموو تێکۆشانەکان کۆ بکرێتەوە بۆ داڕشتن و دامەرزاندنی ئەو بناغە و بنەڕەتە.

تَـرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِى ٱلْعَذَابِ هُمْ خَـٰلِدُونَ ﴿٨٠﴾

بەڕاستی سەر سوڕ ئەمێنیٚ لە زۆربەی کەس کە بە نیازێکی پاك هەوڵ و تێکۆشان ئەکەن لە فەرماندان و جڵەوگیریی کردن لە چاکە و گوناهە بچووکەکان دا لەناو گەل و کۆمەڵێك دا کە ئەو بناغە و بنەڕەتەی تیا دانەمەزراوە، بەڵکو هەر بیٚ ئاگایشن لەوە! یان هەوڵ و تێکۆشان بەخت ئەکەن لە ڕێی چاك کردن و گۆڕینی هێندیٚ گوناهی بچوك، لە کاتێك دا گەل و مەردومەکە ئەژین لە ژێر ئاڵایەکی تردا کە بە ئاشکرا دژی ئاڵای خوایە و جاڕی دژایەتیشی داوە، بە بیٚ پێچ و پەناو شاردنەوە بەرنامەو شەریعەتی خوا فڕیٚ دراوە و بەرنامە و یاسای دوژمنانی خوای لە جێگەدا دانراوە، بە هیچ ڕەنگ بیریٚ لەوە ناکەنەوە و داوای گۆڕینی هێندیٚ لەو شتە بچووکانە ئەکەن، وەك هیچ کەم و کوڕیی و ناتەواوی یەك نەبیٚ بێجگە لەو شتە بچووکانە!! کەواتە ئەو هەوڵ و خەریك بوونە لەم بارەوە زیانی زۆرترە و هەر نەکریٚ چاکترە، چونکە وا نیشان ئەدات بۆ نەزان و ناشارەزا کە هیچ ڕەخنە و بێزاری یەك نی یە لە هیچ ڕوویەکەوە تەنها دەربارەی ئەو گوناهە بچووکانە نەبیٚ، ئەگەر ئەوانە چاك بکرێن ئیتر هەموو شتێك ڕێك و ڕاستە، کەواتە وەك بڕوا هێنرابیٚ و هیچ بێزاری و ڕەخنەیەك نەبیٚ لە گەورەترین گوناهو تاوانەکە! مەبەست بەم وتارو قسەیە ئەمەیە کە مەردوم بیٚ دەنگ بیٚ و هەقی نەبیٚ بەسەر ئەو هەموو گوناهانەی کە ڕوو ئەدەن لەناو ئەو گەل و کۆمەڵانەدا کە نەفامین و شەریعەت و بەرنامەی خوا کاربەدەست و حاکم نین تیایان دا؟ نەخێر مەبەست ئەمە نی یە، لە کاتێکدا کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمان ئەدات و ئەفەرمویٚ: هەرکەس لە ئێوە هەر بیٚ شەرعی یەکی بینی ئەبیٚ بیگۆڕیٚ و هەوڵ بدات بۆ نەهێشتنی بە پیٚی توانا بەو جۆرەی کە تێپەڕی کرد لە حەدیسەکەی ئەبو سەعید کە ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کرد، مەبەست ئەوە نی یە و کەس گومانی ئەوە نەبات، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە گوناهو بیٚ شەرعی هەرە گەورە شایستە ترە بە هەوڵ دان و تێکۆشان بۆ نەهێشتنی، لە هەموو گوناهو بیٚ شەرعی

یەکانی تر، هەوڵ و تێکۆشان بۆ بەرگری و نەهێشتنی گوناهو بێ شەرعی یەکانی تر، لەگەڵ بوونی گوناهو بێ شەرعی هەرە گەورەدا بە زایە و بێ هودەیە، یا کەم سوود و کەم نرخە.

لەم دوو ئایەتەی پێشوودا باسی ئەو نامەدارانەی کرد بەو شێوە سامناکە، ئینجا لێرەدا باسی ئەوانەی چەرخی پێغەمبەر(ﷺ) ئەکات بەم فەرمودەیە: ﴿ تَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾ ئەبینی ئەی پێغەمبەر زۆر لەوان بە جۆرێ ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە و بێ ئایینن – لەو کاتەداوا بت پەرستەکانی عەرەب – ئەوانە وەرئەگرن بە دۆست و خۆشەویست وکۆمەك بۆخۆیان – بەدژی ئیسلام وموسڵمانان – ﴿لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ﴾ سوێند بەخوا بەد و خراپە ئەوەی کە خۆیان پێشیان خست بۆ خۆیان لە جیهان دا، واتە ئەو دۆستایەتی و دەستە برایی و کۆمەك پێ کردنە کە بەستیان لەگەڵ ئەو بێ ئایین و بێ بڕوایانەدا کە ئەوەش ﴿أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ﴾ هۆی خەشم و قینی خوابوو لێ یان، ﴿وَفِى ٱلْعَذَابِ هُمْ خَـٰلِدُونَ﴾ لە کاتێك دا کە ئەوانە لە سزای دۆزەخ دا ئەمێننەوە بە بێ بڕانەوە، خوا پەنامان بدات لە سزای ئەو دۆزەخە. یان سوێند بەخوا بەرهەم و دەست کەوتێکی بەد و خراپیان پێش خست بۆ خۆیان کە خەشم و قینی خوایە و لەو کردەوە بەدانەیانەوە پەیدا بوو. زۆر لە نامەدارەکانی چەرخی پێغەمبەر(ﷺ) – لەو کاتەدا واتە جوولەکەکان – بەو جۆرە دژی ئیسلام و موسڵمانان بوون، ئەو بارو حاڵە بەدە تەنها بۆ ئەوانە نەبوو، بەڵکو لە هەموو چەرخ و شوێنێك دا هەر بەو جۆرە بوون و هەر بەو جۆرەیشن هەتا دنیا دنیایە و ئەوان مابن، هۆو پاڵدەریشیان ئەوەیە کە بێ بڕوان بە خواو پێغەمبەرو نامەی خوا، وەکو ئەفەرموێ: ئەگەر ئەوانە بڕوایان بهێنایە بە خواو بە پێغەمبەرو بەو نامەی کە هێنراوەتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر ، ئەو بێ بڕواو بێ ئایینانەیان نەئەگێڕا بە دۆست و دەستە براو کۆمەك بۆ خۆیان، چونکە ئەو دۆستایەتی و خۆش ویستنی بێ بڕوایانە ناگونجێ لەگەڵ بڕوا بە خوا و بە پێغەمبەر و بە نامەی خوا، ئیتر مەبەست بەو پێغەمبەرو نامەیە موسا و تەورات بێت کە لاف بڕواو شوێن کەوتنیان لێ ئەدا بۆیان، یان مەبەست پێغەمبەری هەمووان و قورئان بێت؟ هەرکام مەبەست بن ئەگەر ئەو جوولەکانە بڕوادار بوونایە دۆستایەتی و

خۆشەویستی یان بەکار نەئەهێنا لەگەڵ ئەو بت پەرستە بێ بڕوایانەدا، بەڵام زۆر لەوان لە ئاین دەرچوون و یاخین لە خوا. گوتمان زۆر لە نامەدارەکان لە هەموو کات وچەرخ و شوێنێك دا بەو جۆرە دژی ئیسلام و موسڵمانانن، بۆ روون کردنەوەی ئەوە بەسە چاو گێڕانێك بە مێژوویان دا، ئەوەتا لە چەرخی پێغەمبەردا(ﷺ) جوولەکەکانی مەدینە چوون بۆ مەککە و پەیمانی دۆستایەتی و هاوکاری یان بەست لەگەڵ بت پەرستەکانی مەککەدا و هانیان دان لەسەر جەنگ کردن لەگەڵ موسڵمانەکان و بەڵێنی یارمەتی و کۆمەکیشیان پێ دان، شایەتی یان دا کە ڕێ و ڕێبازی ئەوان چاکترو راست ترە لە بڕوادارەکان، وەك لە جەنگی خەندەق دا بە باشی ئەوە دەرکەوت، هەروەها بەوجۆرە هاتن تا ئێستایش، ئەو کۆکردنەوەیان لە خاکی داگیر کراوی فەلەستین دا و گێڕانیان بە دەوڵەت بە کۆمەکی و یارمەتی دانی هەموو بێ بڕوا مادی یەکانی فەراهەم هات. ئینجا بە شێوەی گشتی گاورو جوولەکەکان هەمیشە دەستیان تێکەڵە و دەستە بران لەگەڵ گا پەرست و ماددی یەکان دا، هەر کاتێ کە جەنگ و بەربەرەکانێ لەگەڵ موسڵمانان بێت! تەنانەت ئەوانەش کە بەناو موسڵمانن و نوێنەری ئیسلام نین!

وصلى الله وسلم على سيدنا محمد و على أله و صحبه و من تبعهم بإحسان إلى يوم الدين.

بە یارمەتی خوای گەورە جزمی شەشەم کۆتایی هات دەست ئەکەین بە جزمی حەوتەم.